# خولاصەی

# تەفسیری نامی

دانراوی

مەلا عبدالکریمی مدرّس

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

هەنگاوێک بەرەو ڕاگەیاندنێکی کوردیی ئیسلامیی هاوچەرخ

+964(0)7703587100 - +964(0)7501069589 - +964(0)7480134669

ناونیشان: ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا - عێراق - سلێمانی - شەقامی پیرەمێرد

ara.m@hotmail.com

چاپی دووەم



لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٣٠٧)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێ دراوە

١٤٣١ کۆچی - ٢٠١٠ زاینی

پەروەردگارا سەرچاوەی ئیحسان

بۆگشت گیانداران بەتایبەت ئینسان

هەروەک بە ئیحسان کەرەمت فەرموو

ئەم خولاسەمە بۆجێ بەجێ بوو

وەهایش بەفەیزی کەرەم وئینعام

بیکە بە رەحمەت بۆگشت خاص وعام

بیکە بە هاوڕێی ڕێگەی باریکم

بیکە بە چرای جێگەی تاریکم

بیکە بە پایەی ئەمن و سەلامم

بیکە بە مایەی حوسنی خیتامم

نامێ بۆ مەولای ساداتی کیرام

دیاریی ئەبیری بە بەستەی سەلام

بۆ خۆی و هەموو برادەرانی

بۆ گەلی یاری فیداکارانی

بۆ ئالی ئەهلی کەرەم وئیحسان

بۆ باقی زومرەی ئەعیانی ئینسان

## سُورَةُ الفَاتِحَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

وَآيَاتُهَا سَبْعٌ

جوزئی یەکەم

### سوورەتی (الفاتحة)

مەککەیی یەو حەوت ئایەتە

(١) بەناوی خودای میهرەبان و بەخشندەی نیعمەتی گەورە و بچووك. (٢) هەرچی ستایش و سوپاسە بۆ ئەو خودایە کە ناوی (الله)یەو پەروەردگاری هەموو عالەم خۆیەتی. (٣) خوای میهرەبان و بەخشندەی نیعمەتی گەورەو بچووك. (٤) کە خاوەنی جەزاو پاداشی بیروباوەڕو کردەوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا. (٥) خودایا، هەرتۆ ئەپەرستین و بەندەیی بۆ تۆ ئەکەین و هەر لە تۆ داوای یارمەتی ئەکەین. (٦) بماغخەرە سەر ڕێگای ڕاستو داد، ڕێگای بەختیاریی هەردوو جیهان. (٧) ڕێگای ئەوانەی نیعمەتت پێ داون، نەك غەزەب لێ گیراوان و ڕێ ون کردوان.[1]

# سُورَةُ البَقَرَةِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾

وَآيَاتُهَا مِائَتَانِ وَثَمَانُونَ وَسِتٌّ

## سوورەتی (البقرة)

مەدینەیی یەو (٢٨٦) ئایەتە

(١) ڕەمزێکە لە بەینی خوداو پێغەمبەری خودادا. (٢) ئەو قورئانە کە هاتووە بۆ پێغەمبەر گومان نییە لەوەدا کە لای خوداوە هاتووەو هۆی شارەزایی یە بۆ ئەوانەی کە لە خودا ئەترسن. (٣) کە باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت هەیەو نوێژەکانیان بە ڕاستو ڕەوانیو ڕەسایی بەجێ دێنن و لەو ڕزقو ڕۆزی یەی پێمان داون لە ڕێگای خوادا صەرف ئەکەن. (٤) ئەوانەی باوەڕیان هەیە بەو کتێبەی نێرراوەتە خوار بۆ تۆ کە قورئانەو، بەو کتێبانەیش نێرراونەتە خوار لەپێش تۆدا بۆ پێغەمبەرەکان و، باوەڕێکی ساغ و تەواویان بە ڕۆژی دوایی هەیە کە ڕۆژی قیامەتە. (٥) ئەوانەن دەستیان گیربووە لەو شارەزایی یەی خودا پێی داون و ئەوانەن کە لە سزای ڕۆژی قیامەت ڕزگارن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓا۟ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ ۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٦﴾



(٦) بێگومان ئەوانەی باوەڕیان بە خوداو پێغەمبەری خودا نی‌یە یەکسانە لایان بیانترسێنی یا نەیانترسێنی ئیمان ناهێنن.

(٧) خودا بە غەزەبی خۆی مۆری ناوە بەسەر دڵ و بەسەر گوێچکەیانداو بەسەر چاویانەوە پەردەی عەناد هەیە، لە قیامەتیشدا سزایەکی گەورەیان هەیە.

(٨) لە بنیادەمە کافرەکان هی وا هەن بە زمان ئەڵێن: ئیمانمان هەیە بەخوداو بە ڕۆژی قیامەت، کەچی درۆ ئەکەن ئیمانیان نی‌یە.

(٩) ئەوانە فێڵ ئەکەن لەگەڵ خوداو لەگەڵ خاوەن ئیمانەکاندا، بەڵام لە ڕاستیدا فێڵەکەیان هەر بۆ سەر خۆیان ئەگەڕێتەوەو نافامن.

(١٠) ئەمانە لە دڵیانا نەخۆشیی دووڕوویی هەیەو خودایش نەخۆشی‌یەکەی زیاترکردوون، ئەمانە بە هۆی درۆو نیفاق و دووڕوویی‌یەوە سزای نالەبار ئەدرێن.

(١١) ئەم جۆرە بنیادەمانە ئەگەر پێیان بڵێن: دووڕوویی مەکەنو ئاژاوە مەنێنەوەو کافرەکان پڕ مەکەن لە موسوڵمانەکان و، مەبنە هۆی خراپەکاری لەسەر زەوی. ئەڵێن: قسەی وەها چۆن لەگەڵ ئێمە ئەکرێت؟ ئێمە کاروکردەوەمان تەنها چاکەکردن و ئاوەدانی خۆش کردنە.

(١٢) ئەی موسوڵمانینە وریا بن لێیان. بەڕاستی ئەمانە خۆیان بەدکارنو ئاژاوە ئەنێنەوە، بەڵام شعووریان نی‌یەو نازانن بەدکاری چی‌یەو، خراپەیان لێ‌گۆڕاوە بە چاکەو سەریان لێ تێکچووە.

(١٣) ئەگەر پێیان بڵێن وەرن ئێوەیش وەك ئەو خەڵکەی ئیمانیان هێناوە ئیمان بهێنن، ئەڵێن: ئێمە چۆن وەك ئەو سەفیهانە ئیمان ئەهێنین؟ ئاگادار بن ئەوانە خۆیان سەفیهن بەڵام بە خۆیان نازانن کە سەفیهـ و نەزان و عەقڵ سووکن.

(١٤) ئەو دووڕووانە کە بە موسوڵمانەکان ئەگەن ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان هێناوەو موسوڵمانین، کە ئەیشڕۆنەوە بۆ لای شەیتانەکانیان و هەرخۆیان بن ئەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین و ئێمە هەر گاڵتە ئەکەین بە موسوڵمانەکان.

(١٥) لە ڕاستیدا خودا گاڵتە بەوان ئەکات و درێژە ئەدا بەو حاڵەیان و بەهۆی ئەو ڕێگا چەوتەوە کە گرتوویانەتەبەر لەو گومڕاهیی‌یەیاندا ئەیانهێڵێتەوە.

(١٦) ئەوانە کەسانێکن گومڕایی‌و سەرلێشێواوییان بە شارەزایی‌و خوداناسی کڕیوەو مامەڵەکەیان هیچ قازانجی نەکردووەو نایکاتو شارەزا نەبوون بۆ لای خوداو شارەزایش نابن.

مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِى ظُلُمَٰتٍ لَّا يُبْصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾



(١٧) حاڵی ئەم بنیادەمە دووڕووانە، کە لە سەرەتاوە بە هاتنی پێغەمبەر دەم بە مـوژدە بـوون و لـە پاشـاندا پەشـیمان بوونەوەو سوودیان لە هیدایەتی پێغەمبەر وەرنەگرتو بە دەم شتێ ئەڵێن و بە دڵ شتێکیتڕن، وەك حاڵی کەسێکە بیەوێ ئاگرێ بکاتەوە بۆ ڕووناکی دەوروبەریو کە ئاگرەکەکرایەوەو دەوروبەری ڕووناك کردەوە خودای گەورە ڕووناکییەکەیان لاببـاو لـە تاریکییەکی وەهادا جێیان بهێڵێ چاو چاو نەبینێ.

(١٨) ئەمانە کەڕو لاڵو کوێرن و واز لەو گومراییيە ناهێنن.

(١٩) یا لە دڵەڕاوکێوترس و لەرزو خۆحەشاردانی بێسوودیاندا بەدیمەن پۆشاکی ئیمانیان لەبەر کردووەو لەناخی دڵیانەوە کافرنو دیوی دەرەوەی خۆیان بە فڕوفێڵ ڕازاندووەتەوە لە ترسی کوشتنو تووشی زیان بوون. حاڵیان وەك حاڵی ئەوانەیە لەژێر باران و ڕەهێڵەیەکی تاریك و نووتەکی پڕ لە تریشقەو برووسکەدا بن و لە ناخۆشی دەنگی هەورەتریشقە و چەخماخەی هەورە برووسکە پەنجە بخەنە گوێیان و لە مەرگو لەناوچوون بترسن. خودا گەمارۆی ئەمانەی داوەو بە هیچ جۆرێ لە غەزەبی ڕزگار نابن و تۆڵەیان لێ دەسەنرێتەوە.

(٢٠) ئەوانە لە کاتی ئەم لێزمەی باران و هەوروهەڵایەدا لەوانەیە هەورە برووسکە ئاوی چاویان بەرێو، کە ڕێیان بۆ ڕووناك ئەکاتەوە ملی ڕێگا ئەگرن و دەڕۆن و کە لێی تاریككردن لە شوێنی خۆیاندا ئەمێننەوە، نازانن ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ بە بێ برووسکەو هەورە تریشقەیش بێ کەڕوکوێریان ئەکات و چاوو گوێیان ئەباتەوە. بێگومان خوا دەستی بەسەر هەموو شتێکدا ئەڕواتو توانایە.

(٢١) ئەی ئادەمزادەکان! بەندەیی پەروەردگاری خۆتان بکەن، ئەو پەروەردگارەی ئێوەو خەڵکی پێش ئێوەیشی دروست کردووە بەڵکو خۆتان لە ئازار بپارێزن.

(٢٢) ئەو پەروەردگارەی زەوی بۆ کردوون بە ڕایەخ و ئاسمانی بۆ کردوون بە خێوەت بەسەر سەرتانەوە یا بە باڵەخانەو، لە ئاسمانەوە ئاوی باراندووە بەسەرتاناو بەو ئاوە بەروبوومو ڕزقو ڕۆزی بۆ دەرکردوون، کەواتە هاوڕێوهاوچەشن بۆ خودا دامەنێن کە زۆر باشیش ئەزانن بێوێنەیە.

(٢٣) ئەگەر دوودڵن لە ڕاستیی ئەو قورئانەی ناردوومانەتە خوار بۆ سەر بەندەی خۆمان کە (محمد)ە (د.خ)و، بە وتاری ئادەمزادی ئەزانن، دەی ئەگەر وایەو ئازان تاقە سوورەتێ لە وێنەی ئەو قورئانە بێننو بێجگە خودا، هەموو ئەوانەیش بانگ بکەن کە بە یاریدەدەری خۆتانیان ئەزانن، تا یارمەتیتان بدەن . بێگومان بە هەمووتانەوە ناتوانن وێنەی بێنن.

(٢٤) ئەگەر ئەمەتان پێنەکرا، کە بێگومان پێشتان ناکرێت، دە خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی ئادەمزادو ئەو بتە بەردانەیە لە دنیادا ئەیانپەرستن و بەتەمای قازانجیان. ئەو ئاگرە بۆ کافران ئامادە کراوە.

وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقًا ۙ قَالُوا هَٰذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ ۖ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهًا ۖ وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ ۖ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٥﴾ ۞ إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلَّا الْفَاسِقِينَ ﴿٢٦﴾ الَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٢٧﴾ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنْتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾



(٢٥) مـوژده بـده بەوانـەی ئیمانیـان هێناوەو چاکەیان کردووە کە لـە قیامەتـدا ئەبنە خاوەنی بـاغ و باغـاتی وەهـا جۆگـا بەناویانا ئەڕوات، کە لە بـەری ئـەو بـاغ و بەهەشتانە ڕزقێکیان بۆ بێت ئەڵێن: ئەمـە ئەو خواردەمەنی‌یەیە کە لە دنیـادا بۆمـان ئەهێنراو ئەمانخوارد چونکە ڕزقیان لەسـەر وێنـەی هـی دنیـا بـۆ ئـەهێنرێ. یـاخۆ مەعنای ئەوەیـە هـەر لـە بەهەشـتدا هـەر جاری خواردنێکیان بۆ ئەهێنن کە بە وێنـە لە خواردەمەنی پێشووئەکات و لە تام و لە زەتدا لە یەك جیان. ئەم خاوەن ئیمانانە لە بەهەشـتدا خێزانـی پـاكو پوختـەو بێ‌خەوشـیان هەیـەو هـیچ شـتێ ئـەو خۆشی‌یەیان لێ تێك نادات و هەتا هەتایـە لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە.

(٢٦) بێ‌گومان خودا باکی لەوە نی‌یـە بـۆ تێگەیانـدنی ئێـوە مێشـوولەیێك یـا لـە مێشووله گەورەترێ بکاتە نموونەو حاڵیتـان بکـات. جـا ئەوانـەی باوەڕیـان بـە خـوداو پێغەمبـەری خـودا هەیـە بـە دڵ باوەڕیـان هەیـەو ئـەزانن ئـەو نموونەیـە ڕاستـەو ئـەو باسـکردنە جوانـە لای خـوداوە هـاتووە. ئەوانەیش کە کافرو بێ‌باوەڕن ئەڵێن: ئـەوە ئەبێ خودا مەبەستی لەم نموونەهێنانەوە چی بێ؟ خودا بەم نموونە هێنانەوە زۆر کەس گـومڕا ئـەکات کـە لـە ڕێگـای ڕاست لائەدەن و لە یاسای ئیسلام دەرئەچن.

(٢٧) ئەوانەی پەیمانی خودا هەڵئەوەشێننەوە، ئەو پەیمانەی خودا لە جیهانی ئەرواحدا لەگەڵی بەستوون و بـە نـاردنی پێغەمبەران و کتێبەکان و بە پێدانی هێزی عەقڵو بە دروستکردنی ئەو جیهانە فراوانە دووپاتی کردووەتەوە، ئەوانەی ئەوەی خودا ئەمری کردووە بە ڕاگرتنی ئـەیبڕنو بـەجێی نـاهێنن، وەك صیلەی ڕەحـمو چـاکەو خۆشویسـتنی خـوداو پێغەمبەرو بەگوێ‌کردنیانو ڕاگرتنی ئایینو خێرخواهی، ئەوانەی خراپە دەکەنو لە ڕێگای ڕاسـت لائـەدەن، بێ‌گومـان ئەوانەی ئەمە حاڵیان بێ ماڵوێران و ڕەنجبەخەساری هەردوو دنیان.

(٢٨) ئێوە لە چ حاڵێکداو بـە چ ڕوویەکـەوە ئینکـاری بـوونی خـودا ئەکـەن کـە سـوور دەیشـزانن ئێـوە لەمـەوپێش مادەیێکی بێ‌گیان بوون و خوا گیانی بەبەراکردن و دواییش ئەتانمرێنێ، پـاش مـردنیش زینـدووتان ئەکاتـەوە؟ دیـارە ئەوی بتوانێ لە نەبوونەوە ئینسان دروست بکا لە پاش نەمانیشی چاکتر ئەتوانێ دروستی بکاتـەوە، ئـەنجا پـاش ئـەو زیندووکردنەوەیە ئەبرێنەوە بۆ بەردەمی خودا بۆ حیساب و کیتاب.

(٢٩) خودا ئەو خودایە پاش ئەوەی ئێوەی لە نەبوونەوە دروست کرد زەوییشی دروست کرد بۆ هەمووتان، بۆ ژیـان و مانەوەتان و بۆ ئەوەی لەپێناوی قازانجی ئەمڕۆو سبەینێتان و، دنیاو قیامەتتاندا بەکاری بێننو سوودی لێ وەربگرن، دوایی ڕووی خواستی کردە دروستکردنی ئاسمان و شتە شوێن‌بەرزەکان و حـەوت ئاسمـانی دروسـت کـرد، ئـەو خودایـە هەموو شت ئەزانێو لە هەمووی ئاگادارە.

وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ
قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ
نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ
﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ
فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ
سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ
﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ
أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا
تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ
لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ
﴿٣٤﴾ وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا
حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾
فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ
بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٣٦﴾
فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾

(٣٠) باسی ئەوە بکە کە خودا فەرمووی بە فریشتەکان: من دەمەویّ لەسەر ڕووی زەوی جێنیشینیّ بۆ خۆم دروست بکەم کە خاوەنی هێزی زانیاریو ئارەزووی نەفس و ڕق و قین بیّ. ئەوانیش عەرزیان کرد: جۆرە مەخلووقی وەهات بۆچی‌یە کە لەویّ ئاژاوە بنێتەوەو خراپەکاری بکاتو خوێن برێژیّ، لە حاڵێکدا کە ئێمە سوپاسو ستایشت ئەکەینو تەقدیست ئەکەینو بە گەورەت ئەزانین؟ خوا لە وەڵامیاندا فەرمووی: ئەوەی من ئەیزانم ئێوە نایزانن.

(٣١) جا لەبەرئەوە کە خودای گەورە ئادەمی هەڵبژاردبوو بۆ جێنشینیی خۆی، ناوی هەموو شتە پێویستیەکانی فێرکردو تێی‌گەیاند. پاش ئەوە وێنەی ئەو شتانەی پیشانی فریشتەکان داو پێی فەرموون: ئادەی ئەگەر ڕاست ئەکەن ئێوە شایانی جێنشینیی منن، یا ئەگەر ڕاست ئەکەن دروست کردنی ئادەم و ئادەمزاد کە ئەمە حاڵیان بیّ بۆ شانی خودای گەورە ناشیّ، ناوی ئەم شتانەم پیّ بڵێن.

(٣٢) کە فریشتەکان ناوی شتەکانیان نەزانیو دامان وتیان: خودایا تۆ پاکو بێخەوشیو ئێمە هیچ نازانین ئەوە نەبیّ کە تۆ فێرت کردووین، هەر تۆ خۆت زانای بەهەموو شتێك و هەر خۆت لەهەموو کارێکدا خاوەن حیکمەتیتو هەر خۆت ئەزانی چی ئەکەیت.

(٣٣) ئەنجا خوای گەورە فەرمووی: ئادەی ئادەم ناوی ئەو شتانەیان پیّ بڵێو حاڵی‌یان بکە. کە ئادەم تێی‌گەیاندن خودا فەرمووی: ئەی پێم نەوتن من پەنامەکی‌یەکانی زەویو ئاسمان ئەزانمو هیچم لیّ ون نابیو، ئەوەی دەری ئەبڕنو ئەوەی ئەیشارنەوە هەمووی پیّ ئەزانم؟

(٣٤) یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە فەرمانمان بە فریشتەکان دا سوجدەی قەدرگرتن بەرن بۆ ئادەم، هەموو گورج سوجدەیان بۆ برد ئیبلیس نەبیّ، ئەو لە فەرمانی ئێمە دەرچوو خۆی لە ئادەم بە گەورەتر داناو بوو بە یەکیّ لە کافرە بێ‌ئیمانەکان.

(٣٥) جا وتمان بە ئادەم: خۆت و حەووای هاوسەرت لە بەهەشتا دانیشن و لە هەر شوێنیّ ئارەزووتان لیّیەتی بە ڕەسایی لە خواردەمەنی بەهەشت بخۆن و، هەرگیز نزیکی ئەم دارگەنمە مەکەونەوە: ئەگەرنا دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوە.

(٣٦) پاش ئەوە شەیتان خەڵەتاندنیو هەڵیخلسکاندنو لە بەری دارگەنمەکەی دەرخوارد دانو لەو ژیانو نازو نیعمەتەی کردن. جا ئێمەیش پێمان وتن: لە بەهەشت دەرچن و دابەزنە خوار بۆ سەرزەوی. هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان ئەبن و زەوی ئارامگاو شوێنی ژیانتان ئەبیّ تا کاتی دیاریکراو.

(٣٧) ئەنجا ئادەم چەند کەلیمەیەکی لەخوداوە وەرگرتو کەوتە سەر ڕێگای پەشیمان بوونەوەو لە خودای گەورە پاڕایەوە. ئەویش نزاو پاڕانەوەو پەشیمان بوونەوەکەی پەسەند کردو لێی خۆش بوو. بیّ‌گومان خودا تەوبە وەرگرەو زۆر میهرەبانە.

قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ
هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾
يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِىٓ
أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّٰىَ فَٱرْهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلْتُ
مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوٓا۟ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ ۖ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى
ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّٰىَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلْبِسُوا۟ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ
وَتَكْتُمُوا۟ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟
ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ۞ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ
وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾
وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ
﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾
يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ
عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا
يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾



(٣٨) جا وتمان بە ئادەم و حەووا: هەمووتان لە بەهەشت داپەڕنە خوار، لەپاشاندا ئەگەر لەلایەن منەوە ڕینومایتان بۆ هات هەرکەسێ پەیڕەویی ئەو ڕینومایییە بکات لە پاشەڕۆژیدا نە ترس ڕوویان تێئەکات و نە خەفەت ئەخۆن، واتە بەختیار ئەبن و لەوانە ئەبن کە خودا لێیان ڕازییە.

(٣٩) ئەوانەیش کە کافرن و ئایەتەکانی ئێمە بەدرۆ دائەنێن و باوەڕیان پێ ناکەن، ئەوانە هاوڕێو برادەری ئاگری دۆزەخن و هەتا هەتایە لە سزادا ئەبن و تیایا ئەمێننەوە. (٤٠) ئەنجا خودا قسە لەگەڵ بەنیئیسرائیلدا ئەکات و پێیان ئەڵێ: ئەی بەنیئیسرائیل یادی ئەو نیعمەتانەم بکەنەوە کە ڕژاندوومە بەسەرتاندا، وەك ئەوەی کە پێغەمبەرانمان لە خۆتان بۆ ناردن و لە سزای فیرعەون و هامان ڕزگارمان کردن و گەزۆو پەلەوەری شەلاقەمان بۆ ناردن و نیعمەتی زۆرمان بەسەرتاندا ڕژاند. ئەو پەیمانەی لەگەڵ من بەستتان، کە بمپەرستن، بیهێننەجێ تا منیش پەیمان و بەڵێنی خۆم بەجێبهێنم، هەر لە من بترسن. بەڵێنی ئەوان خوداپەرستن و بەگوێکردنی پێغەمبەرانەو، بەڵێنی خودای گەورەیش بەهەشت و ژیانی پڕ لە بەختەوەریی پاشەڕۆژە.

(٤١) ئیمان بێنن و باوەڕبکەن بەو قورئانەی ناردوومەتە خوار بۆ سەر (محمد). دروودی خوای لێ بێ، ئەو قورئانەی تەصدیقی ئەو کتێبانە ئەکات کە بۆ پێغەمبەرانی ئێوە نێرراون. ئێوە یەکەم کافر مەبن بەو قورئانە چونکە خۆیشتان خاوەن کتێبن. ئەو ئایەتانی منە کە لە تەوراتدان و نیشانەکانی (محمد) باس ئەکەن مەیانگۆڕنەوە بە ماڵێکی کەم و نرخێکی ناچیزو، بە بەرتیل و دیاری لە خەڵکی نەخوێندەواری مەگۆڕن. خۆتان لەسزام بپارێزن و تەنها لە من بترسن. (٤٢) ئەو ئامۆژگاریو ڕاستییانەی لای خوداوە پێتان گەیێنراون لەگەڵ درۆو دەلەسەی خۆتان تێکەڵیان مەکەن، ڕاستی لە خەڵکی مەشارنەوە کە خۆیشتان سوور ئەزانن کامە ڕاستەو کامە درۆیە.

(٤٣) ئەو نوێژەی لەسەر موسوڵمانان فەرزکراوە بیکەن، ئەو زەکاتەی لەسەر ئەوان فەرزکراوە بیدەن، لەگەڵ جەماعەتیاندا نوێژ بکەن و کوڕنووش بۆ خودا بەرن. (٤٤) ئەی زاناکانی بەنیئیسرائیل ئەوە چۆن ئەمر ئەکەن بە خەڵك کە کرداری چاك بکەن، کەچی خۆتانتان لە بیر ئەچێ؟ خۆ ئێوە لای خۆی تەورات ئەخوێننەوەو شت ئەزانن؟ ئایا هۆشێك ناکەنەوە لە کاری خۆتان و عەقڵ ناخەنە کار لەم شتانەدا؟ (٤٥) بە نوێژکردن و خۆگرتن و بوردەباریو لە بیرنەکردنی نیعمەتەکانی خودا داوای یارمەتی لێ بکەن بۆ زاڵبوونتان بەسەر نەهامەتیو کۆسپی ژیانتانداو بۆ جێبەجێ بوونی پێویستییەکانتان، چونکە نوێژو خۆگرتن و شوکرانەبژێری پوختەی ڕوولەخودا کردنەو لووتکەی بەندەیییە. ئەم نوێژکردن و خۆگرییەیش بارێکی گرانەو هەڵگرتنی لە وزەی شانی هەموو کەسدا نییە ئەوانە نەبێ کە بەڕاستی لەخوداترسن. (٤٦) ئەوانەی دڵنیان ئەگەنە خودای خۆیان و لە بەردەم ئەودا حەشر ئەکرێن. (٤٧) ئەی بەنیئیسرائیل یادی ئەو نیعمەتانە بکەنەوە کە من پێم داون، یادی ئەوە بکەنەوە کە گەورەییم پێدان بەسەر ئەهلی جیهاندا لە چەرخی خۆتاندا. پێغەمبەرانم لێتان هەڵبژارد بۆتان، پادشام بۆ دانان، کتێبم بۆ ناردن و، لە دەستی ستەمکار ڕزگارم کردن. (٤٨) خۆتان لە ئازاری ڕۆژی قیامەت بپارێزن کە ڕۆژێکی وەهایە کەس سوودی بۆ کەس نییەو فریای ناکەوێ و، کەس تکای لێ وەرناگیرێ بۆ کەسێکی ترو، کەس فیدیەو برێتی لێ وەرناگیرێ کە ببێتە هۆی ڕزگاربوونی لە سزاو، یارمەتی نادرێن. جا ئەم سەختگیرییە هەموو بۆ کافرانە، ئەگەرنا بە ئیجماعی ئوممەت شەفاعەت و تکاکردن بۆ ڕزگارکردنی موسوڵمانی تاوانبار هەیە.

وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾



(٤٩) بیری ئەوە بکەنەوە کە چۆن ڕزگارم کردن لە چنگی دەستەو بەستەی فیرعەون کە بە سزای نابار سزایان ئەدان و تالاّویان ئەکرد بە قوڕگتاندا، کە منداڵێکتان لەدایك دەبوو کوڕ بوایە ئەیانکوشت و کچ بوایە ئەیانهێشتەوە. ئا لەم نەگبەتیی و تووشی سزابوونەدا یا لەم ڕزگارکردنەدا یا لە هەردوکیاندا تاقی کردنەوەیەکی گەورەیە لە لایەن خوداوە بۆ ئێوە: ئاخۆ شوکرانەبژێر ئەبن لەسەر نازو نیعمەت و ئازادی، یا خۆگر ئەبن لەبەر باری سزاو ئازاری دژوار، کە هەردوو حاڵەکە، شوکرو سەبر، نیشانەی بڕواداران؟

(٥٠) یادی ئەوە بکەنەوە کە چۆن دەریای نیلمان دوولەت کردو ڕێگای هاتووچۆمان پێیدا کردەوە تا ئێوە بەسەلامەتی تێپەڕن، دارو دەستەی فیرعەونیشمان نوقمی ئاو کردو بە بەرچاوتانەوە خنکان.

(٥١) یادی ئەوە بکەنەوە کە چۆن وەعدەی چل شەومان دا بە مووسا خۆی تەرخان بکات بۆ ئەوە تەورات وەربگرێ، بەلاّم کە ئەو هات بۆ (میقات)و ماوەیەك بەجێیهێشتن ئێوە گوێرەکەتان کرد بە خودای خۆتان. ئێوە بەم کارە نارەوایە ستەمتان لە خۆتان کردو زیانتان لە خۆتان دا.

(٥٢) پاش ئەو کردەوە نالەبارە عەفومان کردن بە هیوای ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ڕاستەڕێو سوپاسی خودا بکەن.

(٥٣) هەروەها یادی ئەوە بکەنەوە کە پاش ئەو کارەساتانە تەوراتمان دا بە مووساو لەو تەوراتەدا شتی حەق و ڕاستمان لە شتی نارەواو ناڕاست جیاکردەوە چ لە بیروباوەڕو چ لە کردەوەو گوفتارو شتی تر، تا ئێوە ئاگایی پەیدا بکەن و بکەونە سەر ڕێی ڕاست و چاکە بکەن و لە خراپە دوور بکەونەوە.

(٥٤) باسی ئەوە بکە کە مووسا وتی بە ئوممەتەکەی: ئەی پەیڕەوانی من بێگومان ئێوە بە هۆی پەرستنی گوێرەکەکەوە ستەمتان لە خۆتان کردو تاوانبار بوون: دە لە گوناهەکەتان پەشیمان بنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خودای خۆتان. نەفسی خۆتان بکوژن بە مەنع کردنی لە ئارەزووی بەدو کرداری نارەوا، یا هەر بەڕاستی یەکتری بکوژن چونکە ڕیوایەت کراوە خودای گەورە لە کەففارەتی ئەو تاوانەدا ئەمری پێ کردوون یەکتر بکوژن، یا ئەوانە بکوژن کە گوێرەکەیان پەرستووە. ئەمە بۆ ئێوە باشترە لای خودا. خودا تەوبەی لێ قبووڵ کردن. خودا زۆر تەوبە وەرگرەو زۆر میهرەبان و دەهەندەیە.

(٥٥) یادی ئەوە بکەنەوە کە وتتان بە مووسا: ئیمان ناهێنین بەوەی کە خودا قسەت لەگەڵ ئەکا تا خودا بە ئاشکراو بەرەوڕوو نەبینین. ئەمجا لە تۆڵەی ئەم داوا نارەوایەدا تریشقەمان لێ دان و خۆتان چاوتان لە یەکترەوە بوو کە ئەمردن.

(٥٦) لە پاشاندا بە نزاو پاڕانەوەی مووسا پاش مردنتان زیندووم کردنەوە بەشکم باوەڕتان بەهێز ببێ و سوپاس و ستایشی خودای خۆتان بەجێ بهێنن.

(٥٧) یادی ئەوە بکەنەوە کە چۆن لە تەیهدا هەورمان کردە سێبەر بە ڕاسەری باوباپیرانتانەوە بۆ دەفعی گەرما لێیان و لە ئاسمانەوە گەزۆمان بۆ باراندن کە وەك هەنگوین شیرین بوو. هەروەها پەلەوەری شەلاقەیشمان باراند بەسەرتاناو پێمان وتن: دەی بخۆن لەو ڕۆزییە پاکە کە بۆمان ئاسان کردوون. کەچی سوپاسی خودایان نەکردو شوکرانەبژێر نەبوون. ئەو سپڵەیی و سوپاس ناگوزارییەیان زیانی لە ئێمە نەدا بەڵکو بۆ خۆیان خراپ بوو زیانیان لە خۆیان دا.

وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾



(٥٨) یادی ئەوە بکەنەوە کە لە پاش مردنی مووسا بە یووشەعی پێغەمبەرمان وت پێتان بڵێ بڕۆنە ناو (بیت المقدس)و لەوێ بە فراوانی لە هەرچی ئەتانەوێ بخۆنو بە سوجدەوە بڕۆنە ناو دەرگاکەیەوەو سوپاسی خودا بکەنو بڵێن: خودایا ئەم کڕنووش بردنەمان بۆ ئەوەیە لێمان خۆش بیءوگوناهمان بپۆشی، ئەنجا لێتان خۆش ئەبم و پایەی ئینسانە باشەکانیشتان زیاد دەکەم.

(٥٩) کەچی ئەو ستەمکارانە فەرمانەکەی خودایان گۆڕی بە غەیری ئەوەی پێیان وترابوو، ئێمەیش لە تۆڵەی ئەوەدا لە ئاسمانەوە سزاو ئازارمان ناردە سەر ستەمکارەکان چونکە لە سنووری فەرمانی خودا دەرچووبوون و فەرموودەی خودایان گۆڕیبوو.

(٦٠) یادی ئەو نیعمەتەیش بکەنەوە کە مووسا داوای ئاوی لێ کردین بۆ قەومەکەی، ئێمەیش پێمان وت: بە عاساکەت لەو بەردە بدە. کە لێیدا بە ئەمری ئێمە دوانزە کانیی لێ هەڵقوڵی بۆ دوانزە تیرەی بەنی ئیسرائیل و هەر تیرەیێك چاوگەی ئاوی خۆی ئەزانی. ئەنجا پێمان وتن: دەبخۆن و بخۆنەوە لە ڕزق و ڕۆزیی خوداو بەدکاری مەکەن لەسەر ئەرز.

(٦١) یادی ئەوە بکەنەوە کە بە مووساتان وت: ئەی مووسا بەتەنها خواردەمەنییەك قنیات ناکەین. لە خودای خۆت داوا بکە لەوەی زەویی دەیڕوێنێ بۆمان دەربکات وەك پاقلەو خەیارو سیرو نیسك و پیاز، ئەویش پێی وتن: ئەتانەوێ شتی خراپ و ئایەخ وەربگرن لەجیاتیی شتێ لەو چاکتر بێ؟ ئەگەر ئەمەتان ئەوێ داپەڕنە خوارەوە بۆ میسر، بێگومان لەوێ چیتان بوێ دەستتان ئەکەوێ. ئیتر بەهۆی ئەم کارو ڕەفتارە نالەبارانەوە داماویو زەبوونی درا بەسەر جوولەکەدا و خودا غەزەبی لێگرتن؛ چونکە ئیمانیان بە ئایەتەکانی خودا نەبوو و پێغەمبەرانیان بە ناحەق ئەکوشت. گوناهبار بوون و دەستدرێژییان ئەکردو لە سنوری ئەمری خودا دەرئەچوون.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ
مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ
عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ وَإِذْ
أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم
بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ
بَعْدِ ذَٰلِكَ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ
ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْاْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ
فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا
بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ وَإِذْ قَالَ
مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةً قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا
هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ
ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ
وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾
قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ
إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾



(٦٢) ئەوانەی ئەمڕۆ بە زمان ئیمانیان هێناوەو موسوڵمانن لە ئوممەتی موحەممەدو، ئەوانەی وەختی خۆی لە سەردەمی ئایینی خۆیاندا یەهوودی یان نەصرانی یا صابیئە بوون، ئەمانە هەموویان ئەگەر هەروەك بەدەم ئیمانیان هێناوە لە دڵیشەوە ڕاست بووبن و بەڕاستی باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی جەزا بووبێ‌وكردەوەی باشیان كردبێ، ئەوا پاداشیان لای خودای خۆیانەو نە ترسیان هەیەو نە خەم. ئیستەیش كە ئایینی ئیسلام دوا ئایینە، ئەبێ هەموو موكەللەفێك ئیمانی پێ بێنێ چونكە ئایینەكانی لەوەو پێشی نەسخ كردووەتەوە. پوختەی مەبەست ئەوەیە چوونە بەهەشت و پاداشتی چاك تەنها بۆ پەیڕەوانی ئایینێكی تایبەتی نییە، بەڵكو ئەهلی هەر ئایینێ لە ڕۆژو سەردەمی خۆیاندا ئەوی بە ڕاستی بووبێ پاداشی چاكی لای خودایە.

(٦٣) ئەی بەنی ئیسرائیلەكان یادی ئەوە بكەنەوە كە پەیمانم لێ وەرگرتن و بەڵێنتان دامێ كە پەیڕەویی مووسا بكەن، ئەوەبوو كێوی توورم بەسەردا بەرزكردنەوە تا پەیمانەكەتان قبووڵ كردو، پێم وتن: ئەو كتێب و پەیمانە توند وەربگرن و بەو حوكمانە وان لەناویدا ڕەفتار بكەن، بەڵكو لە ئازاری ڕۆژی سزا بپارێزرێن.

(٦٤) لە پاشان پشتتان لێ هەڵكردو ڕەفتارتان پێ نەكرد، جا ئەگەر زیادە میهرەبانیی خودا نەبوایە لەگەڵتان ئەكەوتنە زیانەوە. خودا بە میهرەبانیی خۆی لێ‌گەڕا تا تۆبەتان كردو عەفوی كردن.

(٦٥) بەڕاستی ئێوە بەوانە ئەزانن كە لە فەرمانی خوا لایان دا لە ڕۆژی شەممەداو، لەباتی ئەوەی عیبادەتی تێدا بكەن چوون بۆ ڕاو، جا لە تۆڵەی ئەوەدا فەرمانمان داو وتمان: دەبڕۆن ببنە مەیموونی بێ‌نرخ. ئەوەبوو بوونە مەیموون و پاش سێ شەوو سێ ڕۆژ مردن.

(٦٦) ئەو عقووبەت و سزای مەسخەمان كردە پەندو عیبرەت بۆ ئەو ئوممەتانەی هاوچەرخیان بوون و ئەو ئوممەتانەی پاش ئەوان هاتن. هەروەها كردمانە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی لە خودا ئەترسن و خۆیان لە گوناه ئەپارێزن.

(٦٧) بیری ئەوە بكەنەوە كە مووسا بە قەومەكەی وت: بەڕاستی خودا ئەمرتان پێ ئەكا گایێ سەرببڕن و پارچەیێ لە گۆشتی ئەو گایە بدەن لە لەشی كوڕە كوژراوەكەی ناوخۆتان تا بێتە زمان و قاتیلەكەتان بۆ ناونووس بكا. قەومەكەی مووسایش لە وەڵامی ئەمەدا وتیان: ئەی مووسا ئەوە گاڵتەمان پێ ئەكەی؟ مووسایش فەرمووی: پەنا بە خودا لەوەی ببمە نەفام و گاڵتەتان پێ بكەم.

(٦٨) قەومەكەی مووسا وتیان: ئەی مووسا لە خودای خۆت بپاڕێرەوە تا بۆمان ڕوون بكاتەوە ئەو گایە چلۆنە؟ مووسا پێی وتن: خودا ئەفەرموێ: ئەو گایە پیرێكی وەها نییە لە كاركەوتبێ‌وجوانێكی وەهایش نییە كاری نەكردبێ، وا لەو بەینەدا، ناونجییە. ئیتر ئەوەی ئەمرتان پێ كراوە جێ‌بەجێی بكەن.

(٦٩) وتیان: ئەی مووسا لە خودای خۆت بپاڕێرەوە بۆمان ڕوون بكاتەوە ڕەنگەكەی چۆنە؟ مووسا وتی: خودا ئەفەرموێت ڕەنگەكەی زەردێكی جوانی وایە تەماشاكەران دڵخۆش ئەكات.

قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّا إِن شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ الْأَرْضَ وَلَا تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا قَالُوا الْآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوا أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَاجُّوكُم بِهِ عِندَ رَبِّكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾



(٧٠) وتیان: ئەی مووسا بپاڕێرەوە لە خودای خۆت کە بۆمان بەیان بکا چی‌یەو چۆن گایێکە؟ بەڕاستی لێمان تێکچووە. ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ بۆمان ڕوون ئەبێتەوەو ئەمرەکەی بەجێ‌ئەهێنین.

(٧١) مووسا وتی: خودا ئەفەرموێ: گایێکە تۆڕەو ڕام نەبووە تا ئەرز هەڵبگێڕێتەوەو جووت بکا، ئاوی کشتوکاڵیش نادا. بێ‌عەیبەو یەکڕەنگەو ڕەنگی وەهای پێوە نی‌یە لە ڕەنگی پێستەکەی جیا بێ. وتیان ئا ئیستە ڕاستەکەت هێناو بەتەواوی ڕوونت کردەوە. ئەوە بوو گایێکی وەهایان سەربڕیو نزیک بوو سەری‌نەبڕن.

(٧٢) یادی ئەوە بکەنەوە کە ئەفسێکتان کوشت و یەکتریتان تاوانبار ئەکرد بە کوشتنی ئەوکەسەو بوو بە هەراو دەمەقاڵتان. خودایش ئەوەی پەنهانتان کردبوو دەریخست و ئاشکرای کرد.

(٧٣) جا وتمان پێتان: پارچەیێ لە گۆشتی ئەو گایەی سەرتان بڕیوە بدەن لەو کوژراوە زیندوو ئەبێتەوەو پێتان ئەڵێ کێ کوشتوویەتی. خودا بە هێزو دەستەڵاتی بێ سنووری خۆی وەك ئەم تاقە مردووەی زیندوو کردەوە، لە قیامەتیشدا هەموو مردووان زیندوو ئەکاتەوەو نیشانەکانی هێزی خۆیتان پیشان ئەدا تا عەقڵ بخەنەکارو بفامن.

(٧٤) پاش ئەوە دڵتان ڕەق بوو جا یا وەکوو بەردی لێ هات یا ڕەقتر لە بەرد. بێ‌گومان هەندێ بەردی وا هەیە چەند ڕووباریان لێ هەڵئەقوڵێن. هی وایش هەیە لەت لەت ئەبێ‌وئاوی لێ دەرئەچێ. هەندێکیشیان هەن لە ترسی خودا لە بەرزییەوە دێنە خوارێ یا ڕۆدەچن. خودای پەروەردگار بێ‌ئاگا نی‌یە لە کردەوەتان.

(٧٥) ئایا ئێوە بەتەمای ئەوەن ئەم ناکەسە بەدخووانە ئیمان بێنن بەدین و ئایینی ئێوە؟ کەچی پێش ئەمانە کۆمەڵێ لە زاناکانیان کەلامی خودایان ئەبیست و پاشان ئەو کەلامەیان لە مەعنا ڕاستەکەی لائەدا بۆ مەعنای ناڕاست، پاش ئەوەی کەلێی تێگەیشتبوون، ئەیشیانزانی ئەو کارەی ئەیکەن ناڕەوایە. ئەمە حاڵی زاناکانیان بوو، ئیتر بەتەمای چیت لە نەزانەکانیان؟

(٧٦) جوولەکە منافقەکان کاتێ بە موسوڵمانەکان ئەگەن ئەڵێن باوەڕمان بەوە هەیە کە ئێوە لەسەر حەقن و پێغەمبەرتان لە تەوراتدا موژدە بە هاتنی دراوە، بەڵام کە لەناو خۆیاندا کۆئەبنەوە هەندێکیان بە سەرزەنشتەوە بە منافقەکانیان ئەڵێن: ئەوە ئێوە بۆچی ئەو قسە ڕاستانە بۆ موسوڵمانەکان ئەگێڕنەوە کە لە تەوراتدا هەن دەربارەی صیفەتەکانی (محمد) تا بە ئاسانی بیکەنە دەلیل لەسەرتان؟ واتە: بڵێن ئێوە بە پێغەمبەرایەتیی (محمد) ئەزانن بەڵام ئەیشارنەوە، ئاخر نازانن ئەمەی ئێوە ئەیکەن زیانە بۆ خۆتان و پێی قەرزاربار ئەبن؟

أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾



(٧٧) ئایا ئەوانە ئەوە نازانن خودا ئاگای هەیە لەوەی ئەیشارنەوەو لەوەی دەری ئەبڕن.

(٧٨) ئەم جوولەکانە هی وایان هەیە نەخوێندەوارن و نازانن شت بخوێننەوە تا بچن سەیری تەورات بکەن و بیخوێننەوە، تەنها باوەڕیان بەوانە هەیە کە دوایان کەوتوون. ئەوانە قسەی ڕاست نەگۆڕن، تەنها گومانیان هەیە و حەقیقەتی شت نازانن.

(٧٩) جا هاوارو خەم وخەفەت یا شیوێ لە شیوەکانی دۆزەخ کە ناوی وەیلە بۆ ئەو کەسانە بێ کە ئەو شتە هەڵگەڕاوانە بە دەستی خۆیان ئەنووسن و لە پاشاندا ئەڵێن ئەم نووسراوە لەلای خوداوەیە تا نرخێکی کەمی دنیایی پێ پەیدا بکەن. وەیل بۆ ئەوانە لەوەی دەستیان نووسیویەتی. وەیل بۆ ئەوانە لەوەی کە لەو ڕێگاوە پەیدای ئەکەن.

(٨٠) وتیان: ئاگری دۆزەخ چەند ڕۆژێکی کەم نەبێ لە کەسمان نادا: ئەی (محمد) پێیان بڵێ: ئاخۆ پەیمانتان لە خودا وەرگرتووە، کە دیارە خودا هەرگیز لە پەیمانی خۆی پاشگەز نابێتەوە، یا شتێکتان بە دەم خوداوە هەڵبەستووە خۆیشتان نایزانن و درۆو ساختەیە؟

(٨١) نەخێر وا نییە بەڵکو هەرکەسێ کەسبی کاری نابار بکات و تاوان لە هەموو لاوە گەمارۆی بدات و سووسەیێ خێر لە کردەوەیدا نەبێ، ئەو جۆرانە وان لە ئاگری دۆزەخداو هەتا هەتایە تێیدا ئەمێننەوە.

(٨٢) ئەوانەیش باوەڕیان هەیەو کردەوەی باش ئەکەن خاوەنی بەهەشتن و هەتا هەتایە تێیدا ئەمێننەوە.

(٨٣) یادی ئەوە بکەنەوە کە وەختی خۆی بەڵێنمان لە بەنی ئیسرائیل وەرگرت بێجگە خودا هیچی تر نەپەرستنو، لەگەڵ باوك و دایکدا چاك بن، هەروەها لەگەڵ خوێشان و هەتیوان و هەژاراندا چاك بن و، لەگەڵ خەڵکدا قسەتان باش وخێرو خۆشیو ڕێنومایی بێ، پەیمانمان لێ وەرگرتن نوێژ بکەن و زەکات بدەن، بەڵام لەپاشان کەمێکتان نەبێ هەمووتان هەڵگەڕانەوەو رووتان لەو پەیمان و بەڵێنانە وەرچەرخاند.

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْيٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾



(٨٤) بەنی ئیسرائیلییەکان ! یادی ئەوە بکەنەوە کە پەیمانمان لێ وەرگرتن خوێنی یەکتر بە ناحەق نەڕێژن و یەکتر نەکوژن و یەکتر لە نیشتمان و ماڵ و حاڵی خۆیان دەرنەکەن. لەپاش ئەوەیش دانتان بەوەدا نا کە پێویستە ئەم پەیمانە بەرنە سەرو خۆتان ئاگاتان لەم کەین و بەینە بوو.

(٨٥) پاشان ئێوە خۆتانتان ئەکوشت و، کۆمەڵێکتان لە خۆتان لە ماڵ وحاڵ و وڵاتی خۆیان دەرئەکردو لەو کوشتن و دەرکردنەدا پشتی یەکترتان ئەگرت و بە هەمووتانەوە تاوانەکەتان ئەکرد کەچی ئەگەر ئەوانە بەدیلی دەستی دوژمن بکەوتنایە فیدیەتان بۆ ئەدان و ڕزگارتان ئەکردن لە دیلی. دیارە ئەم دەرکردنی خەلکە لە ڕێوشوێنی خۆیان، کارێکی حەرامەو نابێ بکرێ. ئێوە چ جۆرە بنیادەمێکن؟ ئیمانتان بە هەندێ لە پەیمانەکە هەیە کە لە کیتاب و پەیماننامەکەدا نووسراوەو ئیمانتان بە هەندێکی تری نی‌یە! بۆ فیدیەو لە دیلی ڕزگارکردنیان حازرن، کەچی بە بێ‌سووچ و گوناه لە ڕێوشوێنی خۆیان دەریان ئەکەن یا بە کوشتنیان ئەدەن. پاداشی ئەوەتان ئەم جۆرە کارانە بکات هیچ نی‌یە بێجگە لە ڕسوایی لە ژیانی دنیادا. بێ‌گومان لە ڕۆژی قیامەتیشدا سزای سەخت ئەدرێن و باریان سووك ناکرێت. خودا هەرگیز بێ‌ئاگا نی‌یە لەوەی ئێوە ئەیکەن.

(٨٦) ئەوانە ژیانی دنیایان کڕیوەو لەباتی ژیانی ئەبەدیی قیامەت دنیایان پەسەند کردووە بەسەر قیامەتدا. بۆیە سزاو ئازاریان سووك ناکرێت و یارمەتی نادرێن.

(٨٧) بەڕاستی تەوراتمان دا بە مووساو، بە شوێنی ئەودا کۆمەڵێ لە پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردن و موعجیزەو ئایەتی گەورەو ڕووناکمان دا بە عیسای کوڕی مەریەم، دروودی خودا لەسەر هەموویان بێت، هەروەها هێزی غەیبمان دایە بەهۆی جیبرەئیلەوە کە ئەمینە لامان. بۆ هەر کاتێ پێغەمبەرێ ڕەوانە بکرێ بۆ سەرتان و، یاساو شەریعەتێ بهێنێ بۆتان لەگەڵ ئارەزووی نەفستانا ڕێك نەکەوێ، ئەبێ خۆتان بە گەورە بزانن و کۆمەڵێ لەو پێغەمبەرانە بکوژن و کۆمەڵێکی تریشیان ئینکار بکەن و بە درۆزنیان دابنێن؟

(٨٨) ئەڵێن بەرامبەری تۆ دڵمان داخراوەو پەردەی بەسەردا کێشراوەو لە قسەکانت تێناگەین. نەخێر بەهۆی کافرییانەوە خودای گەورە نەفرینی لێ کردوون و لە بەزەیی خۆی دووری خستوونەتەوە. ئەمانە زۆر کەمیان ئیمان دێنن و دوای ئامۆژگارییەکانت ئەکەون.

وَلَمَّا جَآءَهُمۡ كِتَٰبٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ وَكَانُواْ مِن قَبۡلُ يَسۡتَفۡتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦۚ فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ نُؤۡمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا وَيَكۡفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَهُمۡۗ قُلۡ فَلِمَ تَقۡتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبۡلُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٩١﴾ ۞ وَلَقَدۡ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱسۡمَعُواْۖ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ بِكُفۡرِهِمۡۚ قُلۡ بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٩٣﴾



(٨٩) له كاتێكدا لەسەر دەستی پێغەمبەر (د.خ) قورئانیان بۆ هات كە باوەڕی بە كتێبەكەی ئەوان بوو تەصدیقی ئەكرد، ئەمان ئینكاریان كردو باوەڕیان پێ نەكرد كەچی لەوەپێش، واتە پێش نازڵبوونی قورئان و نێررانی پێغەمبەر(د.خ) بە موشریكەكانیان ئەوت: ئەگەر خودا دەرووی لێ كردینەوەو پێغەمبەری ئاخر زەمان هات ئێمە زاڵ ئەبین بەسەرتاندا، بەڵام كە پێغەمبەر نێرراو قورئان نازڵكرا خۆیان بەهۆی ئەوەوە كە ناردنی ئەم پێغەمبەرە لە كتێبەكەیاندا باس كرابوو، ئەیانزانی دێ، بەڵێ كە ئەم پێغەمبەرە هات ئەوان پاشگەز بوونەوەو ئیمانیان پێ نەهێنا. لەعنەت و نەفرینی خودای گەورە لە كافران و بێبڕوایان بێ.

(٩٠) شتێكی زۆر خراپ و نرخێكی زۆر نالەبار بوو بەختیاریی خۆیان پێ فرۆشت، ئەوەیش بریتی بوو لە باوەڕپێ نەكردن و ئینكاركردنی ئەو قورئانەی خودا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری ئاخر زەمان. سیرڕی ئەم فرۆشتنە پڕ لە زیانەیش ئەوە بوو حەزیان نەئەكرد خودای گەورە بەفەزڵی خۆی كتێب بنێرێ بۆ سەر كەسێ كە مەیلی ئەوە بێ بەرزی بكاتەوە، كە حەزرەتی موحومەدە(د.خ). جا بەهۆی ئەم مامەڵە ناشیرینەوە گەڕانەوە بۆ سەر حاڵی خۆیان بە غەزەب لەسەر غەزەب. بێگومان كافرەكان سزاو ئازارێكی سەرشۆڕكەرو ئابڕووبەر ئەدرێن.

(٩١) كە پێیان بڵێن: ئیمان بێنن و باوەڕ بكەن بەو قورئانەی خودای گەورە ناردوویە بۆ موحەمەد(د.خ) لەوەڵامدا ئەڵێن: ئیمان دێنین و باوەڕ ئەكەین تەنها بەو تەوراتەی هاتووە بۆمان ئیتر ئینكاری غەیری ئەوە ئەكەن، كەچی قورئانی پیرۆز ڕاستەو لای خوداوە هاتووەو باوەڕیشی هەیە بە كتێبەكەی ئەوان و ئەڵێ: ڕاستە. جا ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئێوە ئەگەر ڕاست ئەكەن باوەڕتان بە تەوراتەكەی خۆتان هەیە ئەی بۆچی لەمەوپێش پێغەمبەرە فروستادەكانی خوداتان ئەكوشت؟ (٩٢) لە كاتی خۆیا مووسا هاتە لاتان بە پێغەمبەریو بەچەند موعجیزەی دیارەوە، كەچی هەر كە نەختێ بەجێیهێشتن و لەناوتانا ئەما گورج (سامری) لە خشتەی بردن و دەستتان دایە پەرستنی هەیكەلی گوێرەكەیەكی قوڕەكەرو خوای گەورەتان لەبیرچوویەوەو ئێوە بەم كارە ستەمكارن.

(٩٣) یادی ئەوە بكەنەوە كە پەیمانمان لێ وەرگرتن وكێوی طوورمان بەرزكردەوە بەسەرتانەوەو پێمان وتن: ئەو تەوراتە كە بۆمان ناردوون چی تیایە بەڕاستیو ئیمانەوە وەری بگرن و فەرمانمان ببیستن و بێگوێییمان مەكەن. ئەوانیش وتیان، واتە ئێوەیش وتتان: بەڵێ بیستمان بەڵام بەگوێمان نەكردی. خۆشەویستی گوێرەكەكە چووبووە ناخی دڵ و دەروونیان و نەیان ئەتوانی وازی لێ بێنن چونكە كافر بوون و وایان ئەزانی خوا چووەتە لەشی ئەو گوێرەكەوە، یا خودا جیسمە(والعیاذ باللە). جا پێیان بڵێ: ئەوەی ئیمانەكەتان ئەمرتان پێ ئەكات، ئەگەر ڕاست بێ ئیمانتان هەبێ، شتێكی زۆر بەدو نارەوایە. مەبەستی خوای گەورە ئەوەیە ئەمانە هەر لە بنەڕەتدا ئیمانیان نییە، چونكە ئیمان بەدسروشتیو ئینكاركردنی ئەمری خودا پەسەند ناكات. ئەگەر ئیمانیان هەبوایە باوەڕیان بە پێغەمبەری خوداو كتێبی خودا ئەكردو سەرپێچییان لێ نەئەكرد.

قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن
دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾
وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ
﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ
أَشْرَكُوا۟ ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ
مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قُلْ
مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ
مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ
﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ
وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ
إِلَيْكَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾
أَوَكُلَّمَا عَـٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ
لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ
مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ
كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾



(٩٤) پێیان بڵێ: ئەگەر ڕاستە خانووی قیامەت و بەهەشت هەر تەنها بۆ ئێوەیەو وەك ئێوە ئەڵێن غەیری جوولەکەو گاوری تێ ناچێت، دەی تەمەننای مردن بکەن، چونکە خۆتان واتەنی هەر کەمردن فڕکەو بەهەشتن.

(٩٥) بێگومان هەرگیزاوهەرگیز تەمەننای مردن ناکەن، چونکە خۆیان چاك ئەزانن چەند کردەوەی بەدیان کردووەو یارای ئەوەیان نییە بەرەو ڕووی حیساب و کیتابی ڕۆژی قیامەت و پاش مەرگ ببنەوە. خودای گەورە بە ستەمکارەکان ئەزانێو ئاگادارە چییان کردووەو، بێگومان تۆڵەیان لێ ئەسێنێتەوە.

(٩٦) بەڕاستی ئەو جوولەکانە ئەبینی لە هەمووکەس حەریصترن بۆ ژیانی دنیا تەنانەت لە کافرەکانیش کە شەریك بۆ خودا دائەنێن هەرکامێکیان حەزئەکا هەزار ساڵ بژی، خۆ ئەگەر هەزار ساڵیش بژی ئەو عومرە درێژە لە سزای ڕۆژی قیامەت و تۆڵەی خودایی ڕزگاری ناکات. خودای گەورە بینایە و ئاگای لەو کردەوە ناشیرینانەیە کە ئەیکەن.

(٩٧) بەو جوولەکانە بڵێ: هەرکەس دوژمنی جیبرەئیل بێ (س.خ) لای خودای گەورە نرخی نییە چونکە جیبرەئیل لە فریشتەکانی بارەگایە و خودای گەورە بە قورئانەوە ناردوویەتی بۆ سەر دڵی تۆ ئەی موحەممەد. ئەو قورئانەیش باوەڕی بەو کتێبانە هەیە کە لای خوداوە هاتوون، هەروەها ئەو قورئانە هۆی شارەزاییە بۆ شارێگەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و موژدەی بە ختیاریی دوارۆژ ئەدات بە موسوڵمانان.

(٩٨) هەرکەس دوژمنی خوداو فریشتەکانیو پێغەمبەرەکانیو جیبرەئیل و میکائیل بێ ئەوە خودا دوژمنیەتی چونکە ئەو کەسە کە ئەمە خووی بێ کافرەو خودایش دوژمنی کافرانە.

(٩٩) بەڕاستی ئێمە چەند ئایەتێکی ئاشکراو دیارمان بۆ ناردوویو تەنها بەدکاران و لەڕێلادەران ئینکاریان ئەکەنو ئیمانیان پێ ناهێنن.

(١٠٠) ئەمانە بۆ ئەوەندە ناپیاون؟ هەرکاتێ پەیمانێ ببەستن برێ لەوانە دێن پەیمانەکە تێك ئەدەن و نایبەنە سەر. تۆ واز لە پەیمان بێنە. زۆرتری ئەم جۆرە کەسانە هەر لە بنەڕەتدا باوەڕیان بە خودا نییە.

(١٠١) کاتێ لەلایەن خوداوە پێغەمبەرێکی وەها دێتە لایان، وەك موحەممەد و عیسا، کە باوەڕی بە کتێبەکەی ئەوان هەیەو بەڕاستی ئەزانێوقەدری ئەگرێ، کۆمەڵێ لەوانەی وەختی خۆی لە لایەن خوداوە کتێبیان دراوەتێ کتێبەکەی خودا فڕێئەدەنە لاوەو پشتگوێی ئەخەن و بەگوێرەی ئەوەی تیایەتی ناجووڵێنەوە، وەك بڵێی هیچیان نەزانیبێو هەر کتێبیشیان نەدیبێ.

وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقُولُوا۟ رَٰعِنَا وَقُولُوا۟ ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾



(١٠٢) ئەوانە سەرەڕای ئەوەی کتێبی خودایان خستە لاوەو بەگوێیان نەکرد کەوتیشنە شوێنی ئەوەی شەیتانەکان لە سەردەمی سولەیمان پێغەمبەردا ئەیانخوێندەوە. سولەیمان کافر نەبوو بەڵام شەیتانەکان کافربوون، جادوویان فێری خەڵك ئەکرد. هەروەها دوای ئەو جۆرە جادووە ئەکەوتن کە نێررابوو بۆ دوو فریشتە لە (بابل)، کەناویان هارووت و مارووت بوو، بۆ تاقیکردنەوەی خەڵك. خودا ناردبوونی. ئەو دووانەش جادوویان فێری کەس نەئەکرد تا پێیان نەوتایە ئێمە فیتنەین فێری جادوو مەبن و خۆتان کافر مەکەن. جا خەڵکی لەوانەوە فێری جادووی وەها ئەبوون پیاوو ژنیان لەیەك ئەکردو ناکۆکییان ئەخستە نێوانیانەوە کە پێکەوە نەیانکرایە. ئەمانە بە ئیزنی خودا نەبوایە نەیانئەتوانی زیان بەکەس بگەیێنن. هەروەها شتی وەها فێرئەبوون کە سوودی نەبوو بۆیان و زیانی پێ ئەگەیاندن. ئەمانە زۆر باشیش ئەیانزانی ئەوەی فێری ئەو جادووگەرییە ببێ‌وله زیانی خەڵکا بەکاری بێنێ لە پاشەڕۆژدا لەخێر بێبەشەو لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ پاداشێکی چاکی دەس ناکەوێ. لەڕاستیدا ئەگەر بەخۆیان بزانن ئەوەی ئەوان خۆیانیان پێ فرۆشت شتێکی زۆر بەدو خراپ بوو.

(١٠٣) ئەگەر ئەوانە ئیمانیان بهێنایەو لە خودا بترسانایە بۆیان دەرئەکەوت کە پاداشی خێر لەلای خوداوە چاکترە لەو دنیایە کە دەستیان ئەکەوێ. ئەگەر ئەمەیان بزانیایە وەهایان نەئەکرد.

(١٠٤) ئەی موسوڵمانینە کە قسە لەگەڵ پێغەمبەر ئەکەن پێی مەڵێن: (راعنا)و پێی بڵێن: (انظرنا). ئەم دوو ڕستەیە یەك مەعنایان هەیە، واتە تەماشامان بکەو لەسەرخۆ موتابەعەمان بکە، تا ئەوەی پێمان ئەفەرمووی تێیبگەین و لێی حاڵی ببین. بەڵام جوولەکەکان لەگەڵ پێغەمبەر (راعنا)یان بەکار ئەهێنا بە مەبەستی جنێودان و ناتۆرەنان لە پێغەمبەر، بۆیە خودا مەنعی موسوڵمانانی کرد لە بەکارهێنانی وشەی (راعنا). هەروەها گوێ لە ئەمری خوداو ئیرشادی پێغەمبەر بگرن و دڵنیا بن کە کافرەکان سزایێکی سەخت ئەدرێن.

(١٠٥) کافرەکان، چ کیتابی‌و چ موشریك، پێیان خۆش نی‌یە لەلایەن خوداوە خێرو بەرەکەتتان بۆ بێت. خودا بە میهرەبانی خۆی ئەیەوێ بەتایبەتی خێر بڕژێنێ بەسەر ئەوکەسەدا کە خۆشی ئەوێ، ئەوان چ کارەن؟ بەهرەی گەورە لای خودای مەزنە.

۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾



(١٠٦) ئەو ئایەتەی لەفزو مەعنای پێکەوە لاببەین یا یەکێکیان بەتەنها یا لەبیری خەڵکی بەرینەوە، ئەوە چاکتر لەو ئایەتەو لەو حوکمەی لێی وەرئەگیرێ، یا وەك ئەو لە جێگەیدا دائەنێین. ئەی نازانی خودا بەسەر هەموو شتێکدا توانایە؟

(١٠٧) ئایا نازانی موڵکی ئاسمان و ئەرز هەر هی خودایەو، بۆ ئێوە بێجگە لە خودا سەرپەرشتیکەرێ یا یارمەتیدەرێ نی‌یە؟

(١٠٨) یاخۆ ئەتانەوێ ئێوەیش داوای ئەو شتانە بکەن لە پێغەمبەری خۆتان کە بەنی ئیسرائیل لەمەوپێش داوایان ئەکرد لە مووسا؟ نە شتی وا مەکەن با کافر نەبن. هەرکەس ئیمان بگۆڕێتەوە بە کوفر ئەوە ڕێگای ڕاستی ون کردووە.

(١٠٩) گەلێ لە ئەهلی کیتاب، پاش ئەوەی ڕاستییان بۆ دەرکەوت، لە حەسوودیو بەخیلی خۆیان و بەدنیازییان زۆریان پێ خۆشە ئێوە لەسەر ئەم ئایینی ئیسلامە نەمێنن و بگەڕێنەوە بۆ کوفرو بێدینی. ئێوە لێیان گەڕێن و چاوپۆشییان لێبکەن تا ئەمری خودا دێ یا بە ڕێکەوتن لەگەڵیان یا بە جەنگ. خوا بەسەر هەموو شتێکدا دەستەڵاتی هەیەو توانایە.

(١١٠) نوێژەکانتان باش بەجێبێنن و زەکات بدەن بە موستەحەققان. هەر خێرو چاکەیەك ئەمڕۆ بیکەن و پێش مردنی خۆتانی بخەن ڕۆژی خۆی لای خودای گەورە بێ‌کەمیو بەزیادەوە دەستتان ئەکەوێتەوە. خودا بینایەو ئاگای لە هەموو کردارتانە.

(١١١) کیتابی‌یەکان ئەڵێن: جوولەکەو گاور نەبێ کەس ناچێتە بەهەشت. ئەمە ئارەزوو خەیاڵاتی پڕوپووچی ئەوانە. پێیان بڵێ ئەگەر ڕاست ئەکەن ئیسباتی بکەن و دەلیلی لەسەر بێننەوە خۆ بەتەنها قسەو گەزاف نابێ.

(١١٢) نەخەیر وا نی‌یە بەڵکو ئەو کەسەی ڕوو بکاتە قاپیی خوداو خۆی بداتە دەستی خوداو کردەوەیشی چاك بێ ئەوە پاداشی شایستەی لای خودایەو ئەم جۆرە کەسانە لە پاشەڕۆژا واتە لە ڕۆژی قیامەتدا نە ترسیان هەیەو نە خەم.

وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ
لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ كَذَٰلِكَ قَالَ
ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ
ٱللَّهِ أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ
لَهُمۡ أَن يَدۡخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ
وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١٤﴾ وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ
فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿١١٥﴾
وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿١١٦﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ
وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ
قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ
قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ
بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٩﴾



(١١٣) جووەکـان ئـەڵێن: گـاور لەسـەر ئایینی ڕاست نین. گاورەکـانیش ئـەڵێن: جووەکان لەسەر ئایینی ڕاست نین. کەچی کتێبیش ئەخوێننـەوە. نەزانـەکانی پـێش ئەمانیش هەر هەمان قسەیان ئەکرد. جا خـودا لـەڕۆژی قیامەتـدا حـوکم ئـەکا لـەنێوانیانا لـە هەرشـتێکدا ئیختیلافیـان هەبێ تیایاو ئەو ئەیبڕێتەوە.

(١١٤) کـێ سـتەمکارترە لـەو کەسـەی ڕێگای مزگەوتەکانی خودا ئەگرێو نایـەڵێ ناوی خودایان تیا ببرێو عیبادەتی بۆ تیـا بکرێ، هەوڵ ئەدا کاولیان بکـات. ئەوانـە ئەبوایـە بـە لەخوداترسـان و خوشـووعەوە نەبوایە نەچوونایەتە ناو ئەو مزگەوتانەوە، نـەك جورئـەتی ئـەوەیان هـەبێ کاولیـان بکەنو ڕێگا لە عیبـادەت بگـرن تیایانـا. ئیسـتە کـە وەهـا بێشـەرمی ئەکـەن، تۆڵەیان لـە دنیـادا ڕیسـوایی‌یەو لـە ڕۆژی قیامەتیشـدا سـزای گـەورەو سـەخت ئەچێژن.

(١١٥) خۆرهـەڵات وخۆرنشـین هـەموو مـولکی خودایـە و، بـۆ هـەر شـوێنێك ڕووتان وەرچەرخێنن لەوێدا نیشانەی زاتی پـەروەردگار هەیـە، مزگـەوت بـێ یـا شوێنێکی تر. چونکە هێزو توانایی خودا فراوانەو بە هەموو لایەکدا ئەگات و ئاگای لە هەموو شتێکتان هەیە.

(١١٦) جوو ئەڵێن: عوزەیر خودایەو، گاور ئەڵێن: عیسا کوڕی خودایـە و، موشـریکەکان ئـەڵێن: فریشـتەکان کچـی خودان. نەخەیر وا نی‌یە، بەڵکو خودا ئافەرینندەی هەموو ئەو شتانەیە کە لە ئـەرزو ئاسمانـدان بـە عـوزەیرو عیسـاو فریشتەکانیشەوە، هەموو ئەم کەون و کائیناتە ملکەچی ئەون و لەژێر دەسەڵات و خواسـتی ئـەودان. جـا شـتێ ئـاوا موحتاج و ملکەچ بێ چی لەگەڵ خالیق کۆی ئەکاتەوە؟ ئەولاد ئەبێ هاوجینسی باوك بێ.

(١١٧) خودا ئاسمان و ئەرزی داهێناوەو دروستی کردوون. خودا بۆ دروستکردن دانامێنێو هەرکاتێ بیەوێ شتێ بـبێ پێی ئەڵێ ببەو شتەکەش یەکسەر ئەبێ.

(١١٨) موشریکە نەزانەکان یا کیتابی‌یە خۆبەنەزان کردووەکان ئەڵێن: بۆ خـودا قسـەمان لەگـەڵ ناکـات وەك لەگـەڵ مەلائیکەی ئەکات؟ بۆ دەلیل و بەڵگەیەکمان بۆ نایەت ئیسپاتی ڕاستگۆییت بکـات؟ نەتـەوەکانی پـێش ئـەمانیش هـەروەك ئـەمان قسـەیان ئـەکردو ئـەیان وت: بـۆ خـوا بـە ئاشـکرا قسـەمان لەگـەڵ ناکـات؟ بـۆ خـوانێکی پـڕ لـە خواردەمەنیمان بۆ نابارێنێ؟ ئەمان و ئەوان دڵیان وەك یەکەو یەك جـۆر عـەنادو سەرکەشییان هەیـەو کـوێرن. ئێمـە گەلێ ئایەت و نیشانەمان ڕوون کردوەتەوەو دەرخستووە بۆ ئەوانەی بە دوای حەقیقەت و ڕاستیدا ئەگەڕێن.

(١١٩) ئێمە تۆمان بە ڕاستی ڕەوانە کردووە کە موژدەدەرو ترسێن بی، ئیتر کە تۆ نامەی ڕاستی خۆت گەیاند کەس حەقی نی‌یە بەسەرتەوەو تۆ بەرپرسیار نیت لە دۆزەخییەکان و سزایان، بۆ تۆ کە ترساندنت بە گوێیان نەکردی؟

وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾ ۞ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَإِذۡ جَعَلۡنَا ٱلۡبَيۡتَ مَثَابَةٗ لِّلنَّاسِ وَأَمۡنٗا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ وَعَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنٗا وَٱرۡزُقۡ أَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلٗا ثُمَّ أَضۡطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾



(١٢٠) جوولەکەو گاور هەرگیز لە تۆ ڕازی نابن تا نەکەویتە دوای یاساو ڕەوشتی ئەوان، بەلاّم تۆ بە هەمووان ڕابگەیەنە کە تەنها هیدایەتی خودا هیدایەتەو ئایین و میللەت ئەوەیە ئەو پەسەندی بکات بێگومان ئەگەر بکەویتە دوای ئارەزووی ئەوان پاش ئەم زانیاری و یەقینە کە لای خوداوە بۆت هاتووە، خودا نە سەرپەشتیت ئەکات و نە یارمەتیت ئەدات.

(١٢١) ئەو کیتابییانەی کیتابمان پێ داون و بە جوانی ئەیخوێننەوەو لە فزەکەی ناگۆڕن و لە مەعناکەی ورد ئەبنەوە، ئەوانە بەڕاستی باوەڕیان پێی هەیە، نەك ئەوانەی ئەیگۆڕن. بێگومان ئەوانەی باوەڕیان پێی نیەو ئەیگۆڕن، ئەوانە زیانبازن و نائومێدی دنیاو قیامەتن.

(١٢٢) ئەی بەنی ئیسرائیلی‌یەکان بیر لەو نیعمەتانە بکەنەوە کە وەختی خۆی کردمنە خەلاّتتان، بیریَ لەوە بکەنەوە کە چۆن گەورەم کردن و فەزلّم دان بەسەر ئەهلی جیهانی سەردەمی خۆتاندا.

(١٢٣) لەگەلّ یادکردنەوەی نیعمەتەکاندا خۆیشتان بپارێزن لە سزاو ئازاری ئەو ڕۆژە سەختەی بە هیچ جۆرێ هیچ نەفسێ بەکاری هیچ نەفسێ نایەتو، فیدیەو باتی لە کەس وەرناگیرێ و، تکابۆکردن فریای ناکەوێو کافرانو خودانەپەرستان یارمەتی نادرێن.

(١٢٤) یادی ئەوەبکەنەوە کە چۆن خودای گەورە ئیبراهیمی تاقی کردەوەو چەند ئەمرو نەهییێکی پێ ڕاگەیاندو ئەویش جێبەجێی کردن، بە باوکی وت: بۆچی بت ئەپەرستی؟ بە نەمروودی وت: خودای تۆ ئەو کەسەیە کە خۆر لە خۆرهەلاّتەوە دەهێنێ، هەروەها پێی وت: باکم نی‌یە ئەگەر لە ئاگریشدا بمسووتێنی. کە ئەمانەی هەموو تەواو کرد ئەنجا خودا فەرمووی: ئەتکەم بە پێشەوای بەختەوەرانی جیهانی خۆت. ئیبراهیمیش عەرزی بارەگای خودای کردو وتی: لە نەوەکانیشم. خودا فەرمووی: پەیمانی من ستەمکاران ناگرێتەوە.

(١٢٥) یادی ئەوە بکەنەوە کە خانووی کەعبەی پیرۆزمان کردە مەلّبەندو جێحەسانەوەی زیارەتکەران بۆ هەرکەس ڕووی تێ بکات، هەروەها کردمانە شوێنێکی پیرۆزی وەها کە زیارەتکردنی هۆی پاداش بێوکردمانە شوێنی ئەمن و ئاسایش و هەرکەسێ لەوێ بێ ئەمینە لەوەی دەستدرێژی بکرێتەسەرو، ئەو بەردەی شوێن پێی ئیبراهیمی لەسەرە یا ئەو شوێنە کە بەردەکەی تیایەو ئیبراهیم لەسەری ڕاوەستاوەو بانگی خەلّکی کردووە بۆ حەج، یا هەموو حەرەم بکەنە شوێن نوێژی خۆتان و خودا پەرستی تیا بکەن. یادی ئەو وەختە بکەنەوە کە بە ئیبراهیم و ئیسماعیلمان وت: خانووی من کەعبەی پیرۆز، پاك بکەنەوە بۆ ئەوانەی بە دەوریا ئەسووڕێنەوەو بۆ ئەوانەی لەوێ ئەمێننەوە بۆ خودا پەرستیو بۆ ئەوانەی لە ڕکوع و سجووددان بۆ خودای گەورە.

(١٢٦) یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە ئیبراهیم دوعای کردو وتی: خودایا ئەم شوێنە بکە بە شارێکی هێمن و لە بەش و بارەی ژیواریش ڕۆزیی خەلکەکەی بدە ئەوانەیان باوەڕیان هەیە بە خوداو ڕۆژی قیامەت. خودا فەرمووی: تەنانەت کافرەکانیش هەر دلّخۆش ئەکەم بۆ ماوەیەکی کەم کە بریتی‌یە لە دنیا. جا ناچاریان ئەکەم بۆ سزای دۆزەخ. بێگومان دۆزەخ مەئوایەکی ناهەموارە.

وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُسْلِمَةً لَكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَنْ سَفِهَ نَفْسَهُ وَلَقَدِ اصْطَفَيْنَاهُ فِي الدُّنْيَا وَإِنَّهُ فِي الْآخِرَةِ لَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَىٰ لَكُمُ الدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمْ كُنْتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنْ بَعْدِي قَالُوا نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَٰهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُمْ مَا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٤﴾



(١٢٧) یادی ئەو کاتە بکەنەوە کە وەختی خۆی ئیبراهیم و ئیسماعیل بناخەی کەعبەیان بەرز ئەکردەوە، ئیبراهیم بینای ئەکردو ئیسماعیل بەردو شتومەکی ئەدایە دەست و لەگەڵ بەرزکردنەوەی بیناکەیدا لە خودا ئەپاڕانەوە ئەیانوت: خودایا بە نەوازشی خۆت ئەم کارەمان لێ قبوڵ بفەرموو. بێگومان هەر تەنها تۆی هەموو دەنگێ ئەبیسیو هەر تۆی بە هەموو شت ئەزانی.

(١٢٨) خودایا، وامان لێ بکە گەردنکەچی تۆ بین و باوەڕمان پێت هەبێ. لە بەرەو نەوەیشمان کۆمەڵێ دروست بکە گەردنکەچی تۆ بن و باوەڕیان پێت هەبێو. ڕێوشوێنی چۆنیەتیی بەندەییو خوداپەرستیشمان پیشان بدەو، تەوبەو لە گوناه پەشیمان بوونەوەمان لێ قبووڵ بکە. هەر تۆی زۆر تەوبە لە بەندەکانی خۆت قبوڵ ئەکەیت و هەر تۆی بەزەیی بێپایانت دێتەوە پیایاندا.

(١٢٩) خودایا هەرلە خۆیان پێغەمبەرێکیان بۆ ڕەوانە بکە ئایەتەکانی تۆ بخوێنێتەوە بەسەریانداو قورئانیان فێربکات و زانیاریو شتی وایان پیشان بدا کە بگەنە کەماڵ و لە هاوڕێ بۆخودادانانو گوناه پاکیان بکاتەوە، هەر تۆ دەستەڵاتدارێکی وەهای کەس دەستی نییە بەسەرتاو چیت بوێ ئەیکەیت و چاکیشی ئەکەیت. شایەنی باسە ئەو پێغەمبەرەی لە نەوەی ئیبراهیم و ئیسماعیل بێ پێکەوە تەنها حەزرەتی موحەممەدە، کەوابوو (کتاب)ەکەیش هەر قورئانە.

(١٣٠) ئەوە کێ بێ لە ئایین و ڕێوشوێنی ئیبراهیم لابدات کەسێ نەبێ کە خۆی بێنرخ بکات و بە سووکی سەیری خۆی بکات؟ ئێمە ئیبراهیممان لە دنیادا هەڵبژاردووە بۆ پێغەمبەریو لە ڕۆژی قیامەتیشدا لە زومرەی پیاوچاکانە، ئیتر چۆن نەبێ خەڵك لە ڕێی ئەو لادەن؟

(١٣١) ئەو کاتە کە خودا فەرمووی بە ئیبراهیم ملکەچ بە بۆ خوداو لە ئەمری دەرمەچۆ، ئەویش وتی: وا ملکەچ و گوێڕایەڵ بووم بۆ خوداو پەروەردگاری هەموو جیهانەکان، دنیاو قیامەت .

(١٣٢) ئیبراهیم و یەعقووبی کوڕەزاشی هەر بەمە وەصیەتیان کرد بۆ کوڕەکانیان: کوڕەکانم خودا ئەم ئایینەی بۆ ئێوە هەڵبژاردووە، ئاگاتان لێی بێ‌ولە کیسی مەدەن و لەسەر غەیری ئایینی ئیسلام مەمرن.

(١٣٣) ئێوە لەوێ نەبوون ئاگاتان لێ نەبوو کە لە کاتی سەرەمەرگدا یەعقووب قسەی لەگەڵ کوڕەکانی کردوو وەصیەتی بۆ کردن. ئیتر چۆن ئەڵێن یەعقووب یەهوودی بوو؟ یەعقووب وتی پێیان: کەمن مردم ئێوە چی ئەپەرستن؟ وتیان: خودای تۆو باو باپیرت، ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاق، کە خودایەکی تاكو تەنیاو بێشەریکە. ئێمە ملکەچی ئەوینو ئەو ئەپەرستین، بەم جۆرە خودا ڕووی قسەی کردووەتە جوولەکەکان. لەوانەیشە قسەکە لەگەڵ موسوڵمانان بێ، واتە: ئەی موسوڵمانەکان ئێوە خۆتان لەوێ نەبوونو ئەم کەینوبەینەتان لەڕێگای ئەو وەحیەوە زانیوە کە بۆ پێغەمبەر هاتووە (د.خ).

(١٣٤) ئەوانە ئوممەتێ بوون ڕابووردن. کەسبی خێری خۆیان بۆ خۆیانەو ئێوەیش کەسبی خێری خۆتان بۆ خۆتانە، کەس لە بەشی کەس نابات و کەس حەقی بەسەر کەسەوە نییەو ئێوە بە تاوانی ئەوان تاوانبار ناکرێن هەروەك بە چاکەیشیان پاداشتان نادرێتەوە.

وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُواْۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ
حَنِيفًاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ
أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ
وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ
مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾
فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا
هُمْ فِي شِقَاقٍۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ
﴿١٣٧﴾ صِبْغَةَ ٱللَّهِۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةًۖ وَنَحْنُ لَهُۥ
عَٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾ قُلْ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ
وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمْ
تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ
وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُۗ
وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ
وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْۖ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾



(١٣٥) جوولەکەکان وتیان بە خەڵك: وەرن ببنە جوولەکە تا ڕێگای ڕاست بگرن و بگەنە حەق .گاورەکانیش وتیان بە خەڵك: وەرن ببنە گاور تا ڕێگای ڕاست بگرنو بگەنە حەق .. تۆیش، ئەی پێغەمبەری من، پێیان بڵێ: نەخەیر، ئێمە دوای میللەتو ئایینی ئیبراهیم ئەکەوین کە ڕێگای ڕاستی گرتبوو و لە ڕێگای چەوت لایدابوو. بێگومان ئیبراهیم هاوڕێی بۆ خودا بڕیار نەئەدا، خودای تاكو تەنیای ئەپەرست، وەك ئێوە نابین کە بەدەم خۆتان بە پەیڕەوی ئیبراهیم دائەنێن کەچی شەریکتان بۆ خودا قەرارداوە!

(١٣٦) ئەی موسوڵمانەکان بڵێن: ئێمە ئیمانمان هێناوە بە خوداو بەو کتێبانەی نازڵ کراونەتە خوار بۆ ئیبراهیم و لە ڕێگای ئەوەوە گەیشتوون بە ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و کوڕو کوڕەزاکانی. ئیمانمان هەیە بەوەی بۆ مووسا هاتووەو بەوەی بۆ عیسا هاتووە. ئیمانمان هەیە بەو کتێب و سەحیفانەی لای خوداوە بۆ پێغەمبەران هاتوون. جیاوازی ناکەین لە نێوانیانداو ئیمانمان بە هەموویان هەیەو قەدریان ئەگرین. ئێمە ملکەچ و بەندەی خوداین.

(١٣٧) جا ئەگەر ئەهلی کیتابیش ئیمانیان هێنا بە خودا بەو شێوەیە کە ئێوە ئیمانتان هێناوە ئەوە ئەکەونە سەر ڕێی ڕاست. خۆ ئەگەر ڕوویان وەرچەرخاندو پشتیان هەڵکرد لەم ئیمانهێنانە ئەوا بێگومان ئەکەونە عەنادو سەرپێچی لەگەڵ خودادا، ئیتر خودا چاریان ئەکات لەباتی ئێوە. خودا زۆر شنەواو زانایەو ئەزانێ بە دڵسۆزیو بە کردەوەتان و پاداشتان ئەداتەوە. (١٣٨) ئێمە خودا خستوویننیە سەر ڕێی ڕاست و دەلیلی پیشان داوین و دڵ و دەروونی پاك کردووینەتەوە. بەڵێ ئێمە ئاوەها خودا ڕەنگی کردووین و دیاری کردووین، کێ لە خودا جوانتر ڕەنگ ئەکات و هیدایەت ئەدات؟ چ ئایینێ لە ئاینی ئەو پاکترە؟ ئێمە هەر ئەو ئەپەرستین و تەنها ملکەچی ئەوین.

(١٣٩) ئەی جوولەکەکان بۆ لە ئیشوکاری خودادا موجادەلەمان لەگەڵ ئەکەن و ئەڵێن پێغەمبەر هەر لە ئێمە ئەبێو ئەگەر تۆ پێغەمبەر بوویتایە لە ئێمە ئەبووی؟ خودا خودای ئێمەو ئێوەیەو تەنها خودای نەتەوەیەك نی‌یە. هی هەموو جیهانەو، ئارەزووی خۆیەتی ڕووی ڕەحمەتی بکاتە هەرکەسێك و بیکاتە پێغەمبەر. ئێمە کردەوەی خۆمان بۆ خۆمانەو ئێوەیش کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە، ئێمە تەنها خودا ئەپەرستین و عیبادەت بۆ ئەو ئەکەین.

(١٤٠) یاخۆ ئەڵێن: ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و کوڕەزاکانی جوولەکە بوون یا گاور. سووریش ئەزانن کە تەورات و ئینجیل گەلێ پاش ئیبراهیم نازڵ کراون و مووسا و عیسایش زۆر پاش ئەو بوونەتە پێغەمبەر. ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ئایا ئێوە لە خودا باشتر ئەزانن؟ بێگومان نا.. دە قسەی ڕاست بکەن. ئەوانە نە جوولەکە بوون و نە گاور. ئێوەیش ئەو ڕاستی‌یانە مەشارنەوە کە لە کتێبەکانتانا باس کراون وەك ئەوەی کە ئیبراهیم حەنیفی بووە، هەروەها وەصفی پێغەمبەری ئاخر زەمان کە موژدەیان داوە بە هاتنی. کێ لەوە ستەمکارترە کە شایەتی ڕاستی نەدات و بیشارێتەوەو ئەوەی لای خوداوە پیشانی دراوە سەرنگوومی بکات؟ بێگومان خودا زانایەو بێئاگا نی‌یە لەوەی ئێوە ئەیکەن. (١٤١) ئەوانە ئوممەتێ بوون ڕابووردن، کەسبی خێری خۆیان بۆ خۆیانەو ئێوەیش کەسبی خێری خۆتان بۆ خۆتانە و کەس لە بەشی کەس نابات و کەس حەقی بەسەر کەسەوە نی‌یە. ئێوە بەرپرسیار نین لە کردەوەی ئەوان و، بە تاوانی ئەوان تاوانبار ناکرێن، هەروەك بە چاکەیشیان پاداش نادرێنەوە.

سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُۚ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسْتَقِيمٖ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدٗاۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٣﴾ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةٗ تَرْضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبْلَتَهُمْۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٖ قِبْلَةَ بَعْضٖۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ إِنَّكَ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾



## جوزئی دووەم

(١٤٢) بنیادەمە نەفامەکان، ئەوانەی نینکاری گۆڕینی قیبلە ئەکەن لە جوولەکەو منافق و موشریکەکان، ئەڵێن بۆ موسوڵمانەکان ڕوویان لەو قیبلە وەرچەرخاند کە ئەوسا ڕوویان تێ ئەکرد، واتە (بیت المقدس)؟ ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: خۆرهەڵات و خۆرنشین هەردوو هی خودان. خودا، هەرکەسێ کە ئیرادەی لەسەر بێ ڕێگای ڕاستی پیشان ئەداو ئەیخاتە سەری، بەپێی حیکمەتی خۆی و جارێ کەعبە ئەکاتە قیبلەو جارێ (بیت المقدس).

(١٤٣) ئەی موسوڵمانینە! هەروەك هیدایەتمان دان بۆ ڕێگای ڕاست وەهایش کردمانن بە ئوممەتێکی میانەڕەوی چاك کرداری دادپەروەر، کە بە وردبوونەوە لە قورئان و تێفکرین لە بەڵگە ئاشکراکانی خودا بزانن خودای گەورە زوڵمی لە ئوممەتە پێشووەکان نەکردووەو بەخیل نەبووە لەگەڵیانا، بەڵکو پێغەمبەرانی ناردووەتە سەریان و ڕێی پیشان داون، بەڵام ئەو ئوممەتانە خۆیان دوای ئارەزووی نەفس کەوتبوون و گوێیان نەدابووە قسەی پێغەمبەرەکانیان. بەڵێ ئێوەی کردووەتە ئوممەتێکی ئاوەهایی تا لە ڕۆژی قیامەتدا ببنە شایەت لەسەر ئەو ئوممەتانەو پێغەمبەریش واتە موحەممەد(د.خ) لەوێدا ببێتە شایەت لەسەر ڕاستیی شایەتییەکەتان. بۆیە وەختی خۆی کەعبەمان کردە قیبلەتان یا بۆیە کە چوونە (مەدینە) قیبلەمان گۆڕی بە (بیت المقدس) تا بزانین کێ دوای پێغەمبەر ئەکەوێو بەگوێی ئەکاتو کێ سەرپێچیی ئەکاتو لێی پاشگەز ئەبێتەوە، تا ئەم دوو تاقمە لە ناو خەڵکدا لە یەك جیا بکەیەوە، ئەگینا خودا ئارەزووی خۆیەتی کوێ ئەکاتە قیبلە. ئەم گۆڕینو گۆڕینکارییە گرانە لەسەر شانی خەڵك و تەنها لای ئەوانە سەهل و ئاسانە کە خودا ڕێگای ڕاستی پیشان داون و، لەسەر ئیمان بە خوداو بە حوکمەکانی خودا ئەمێننەوەو ناگۆڕێن. خودا ئیمانو نوێژو عیبادەتی کەس زایە ناکات. چ ئەوانەی وەختی خۆی ڕوو لە (بیت المقدس) نوێژیان کردووە چ ئەوانەی ئیستە بەگوێی پێغەمبەر ئەکەنو ڕوو لە کەعبەو نوێژ ئەکەن. خودا لەگەڵ هەموو خەڵك بە بەزەییو میهرەبانە. (١٤٤) ئێمە بەڕاستی ئاگادارین کە ڕووت لە ئاسمانەو چاوەچاوتەو نزا ئەکەیت و بە تەمای ئەوەیت وەحیت بۆ بێت و کەعبەی قیبلەی باووباپیرت بکرێتەوە بە قیبلەتان. ئەوا ئێمەیش ڕووت بەرەو مزگەوتی حەرام(کەعبە) وەرئەچەرخێنین، کەواتە لەم ساتەوە ئیتر ڕووی خۆت لە نوێژدا بەرەو(مسجد الحرام) لە مەککە هەڵسووڕێنە. ئەمە نەك تەنها لە شاری مەدینەوە، بەڵکو لە هەر شوێنێ بوون لە کاتی نوێژکردندا ڕووتان بەرەولای (مسجد الحرام)ی مەککە وەرچەرخێنن. ئەوانەی تەوراتیان پێ دراوە زۆر باش ئەزانن ئەم وەرچەرخانی ئێوەیە بۆ لای کەعبەی پیرۆزو گۆڕینی قیبلەیە لە (بیت المقدس)ەوە بۆ کەعبە، حەقە، چونکە ئەمە لە تەوراتدا نووسراوە. خوا غافڵ نییە لەو کردەوانەی ئێوە ئەیانکەن.

(١٤٥) ئەگەر هەرچی ئایەتی خودایە بیهێنی بۆ ئەهلی کیتاب شوێنی قیبلەکەت ناکەون و ڕووی تێناکەن. ئەوان خۆیان لەناو خۆیاندا ڕوو ناکەنە قیبلەی یەکتر. گاورەکان ڕووئەکەنە خۆرهەڵات و جوولەکەکان ڕوو ئەکەنە سەخرە لە (بیت المقدس)و، تۆیش هەرگیز ڕوو ناکەیتە قیبلەی ئەوان. ئەگەر پاش زانین و پاش ئەوەی وەحیت بۆ هات ڕووت کردە قیبلەی ئەوان ئەوا دەچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە.

ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ
فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن
رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ
فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ
وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا
ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ
شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ
شَطْرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟
مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِى وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِى عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ
تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ
يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ
وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ
أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾



(١٤٦) زاناكانی ئەهلی كیتاب، ئەوانەی تەوراتمان پێدان، پێغەمبەری ئاخر زەمان، موحەممەد، زۆرباش دەناسن وەك چۆن كوڕەكانی خۆیان دەناسن. بەڕاستی كۆمەڵێ لەوانە حەق و ڕاستی دەشارنەوەو زۆرچاكیش دەزانن حەقە.

(١٤٧) ڕاستی ئەوەیە كە سابت بووە لە خوداوەیە، ئەوەیە كە تۆ لەسەری دەڕۆی، نەك ئەوەی ئەوان لەسەرینی، كەواتە هەرگیز دوودڵ مەبە لەوەی كە ئەمەی تۆ لە خوداوەیە. دوودڵ مەبە لەوە كە ئەوانە دەیشارنەوە.

(١٤٨) هەر ئوممەتێ قیبلەیێكی هەیە، یا موسوڵمانەكان هەر یەك لە لایێكەوە ڕووئەكەنە قیبلە. لە پەیداكردنی خێرو چاكەو ڕوو لە قیبلە كردندا پێشبڕكێ بكەن، لە هەركوێ بن و هەرچۆن بن خودا گیانتان ئەكێشیو لە ڕۆژی قیامەتدا كۆتان ئەكاتەوە. خودا دەستی بەسەر هەموو شتێكدا ئەڕواو ئەتوانێ بیكات.

(١٤٩) لە هەر شوێنێكەوە دەرچوویت بۆ سەفەر لە نوێژكردندا ڕوو بكەرە(مسجد الحرام). ڕووكردنە(مسجد الحرام) شتێكی حەقەو لای خوداوەیەو. خودا بێئاگا نییە لە كردارتان.

(١٥٠) لە هەرشوێنێكەوە دەرچوویت لە كاتی نوێژكردندا ڕووبكەرە (مسجد الحرام)و لەهەركوێ بوون لەكاتی نوێژكردندا ڕووتان بەرەو (مسجد الحرام) وەرچەرخێنن تا قسەی جوولەكە ببڕن كە لەمەوپێش دەیانوت لە تەوراتی ئێمەدا نووسراوە موحەممەد لە نوێژدا ڕوو ئەكاتە كەعبە، كەچی ئێستە لەگەڵ ئێمە ڕوونەكاتە (بیت المقدس). ئیتر گوێ مەدەنە قسەی ستەمكارەكان كە هەمیشە سەركەشی ئەكەن و لە ڕووتا ئەوەستن. لەوانە مەترسن و تەعنەو تەشەری ئەوان كارتان تێنەكات. لە من بترسن و بێگوێیيم مەكەن و چیم پێوتن جێبەجێی بكەن. ئەمەوێ نیعمەتی تەواوتان بدەمێ چ لە مەسەلەی قیبلەداو چ لە قیامەت و ڕۆژی سزادا. لە من بترسن بەڵكو ڕێگای ڕاست بگرن و بە پاداشی چاكی خۆتان بگەن.

(١٥١) هەروەكو پێغەمبەرێكمان هەر لە خۆتان بۆ ناردن ئایەتەكانی ئێمەتان بەسەرا ئەخوێنێتەوەو ئەتانخاتە سەر ڕێگای پاكی و خاوێنی و قورئانتان فێرئەكات و عەقڵ و ژیریتان پیشان ئەدات و شتی واتان فێرئەكات كە ئێوە لەوەپێش نەتانزانیوە، چونكە ئەو جۆرە شتانە لە ڕێگای وەحیەوە نەبێ نازانرێن، وەك ڕێوشوێنی ژیانی پڕبەختیاریو، وەك سەرگوزەشتە و بەسەرهاتی ئوممەتە پێشووەكان.

(١٥٢) ئێوە بە زمان باسی من بكەن و بە دڵ یادم بكەن و بێگوێیيم مەكەن تا منیش پاداشتان بدەمەوە. سوپاسی نیعمەتەكانم بكەن و كوفرانی ئەو هەموو نازو نیعمەتە مەكەن كە پێم بەخشیون و لەبەرچاوتان بێ.

(١٥٣) ئەی موسوڵمانینە! خۆتان بەسەر گوناهدا زاڵ بكەن، بە صەبرو خۆگری و بە نوێژكردن، كە سەرچاوەی هەموو خواپەرستی‌یەكانەو، بەرزبوونەوەی موسوڵمانە بەرەو عالەمی قودسیو پاڕانەوەیە لە خودای گەورە. بێگومان خودا هەمیشە لەگەڵ خۆگراندایەو یارمەتییان دەدات.

وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن
لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ
وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ
﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ
﴿١٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ
فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ
بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ
لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ
﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ
عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ
كُفَّارٌ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ
﴿١٦١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ
﴿١٦٢﴾ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾



(١٥٤) ئەوانەی لە ڕێگای خودادا ئەکوژرێن پێیان مەڵێن مردوو. ئەوانە زیندوون، بەڵام ئێوە هەستی پێ ناکەن و نایزانن.

(١٥٥) ئێمە تاقیتان ئەکەینەوەو دوچاری هەندێ ترس و برسێتی و کەمیی دارایی‌و مردن و کەمیی بەروبوومتان دەکەین، تا بزانین کێ خۆگر دەبێ‌و کێ بێزاری دەرئەبڕێ. ئەی موحەممەد موژدە بدە بە خۆگرەکان کە خودای گەورە ڕووی میهرەبانی لێیانەو ڕەحمەتیان بەسەردا ئەبارێنێ.

(١٥٦) ئەو خۆگرانەی کاتێ تووشی بەڵایەك ئەبن بێزار نابن و ڕەخنە لە کاری خودا ناگرن و ئەڵێن: ئێمە هەموومان موڵکی خوداین و لە پاشەڕۆژیشدا بۆ لای ئەو ئەگەڕێینەوە، چیمان بەسەردێنێ ئارەزووی خۆیەتی.

(١٥٧) ئەوانە بەش و بەهرەی پیرۆزیان لەلایەن خودای خۆیانەوە بەسەردا دەبارێ‌و، ئەوانە شارەزان و ڕێگای ڕاستی ڕەزامەندیی خودایان گرتووەتەبەر.

(١٥٨) کێوانی صەفاو مەروە نیشانەی عیبادەتن و سەرەتای حەج و عومرەن. هەرکەس حەج یا عومرە بکات گوناهی ناگات لە بەینی صەفاو مەروەدا سەعی بکا، واتە هات و چۆ بکات. با چاویان لەوە نەبێ کە ئەوسا پێش ئیسلام لەسەر هەریەك لە صەفاو مەروە بتێك هەبووە موشریکەکان دەچوون دەستیان پیا دەهێنان، ئیستە ئیسلام هات و بت شکێنرا، ئیتر قەیناکا هاتوچۆ بکەن لە بەینیاندا. ئەوەی کارێکی خێر بکات، فەرز یا سوننەت، هەرکەس زیاد لە فەرز خوداپەرستییەك بکات، چ حەج چ عەمرە چ هاتوچۆی بەینی صەفاو مەروە، ئەوە خودا پاداشی ئەداتەوە. خودا بە هەموو شتێك ئەزانێ.

(١٥٩) بێ‌گومان ئەوانەی دەلیل و نیشانەی پێغەمبەرایەتی موحەممەد دەشارنەوە پاش ئەوەی کە لە تەوراتدا نازل کراو ئێمە بۆ خەڵکمان ڕوون کردەوە، ئەوانە خودا لەعنەتیان لێ ئەکات و هەروەها ئینس و جینن و مەلائیکەیش لەعنەتیان لێ ئەکەن و لە ڕەحمەتی خوداوە دوورن.

(١٦٠) ئیللا ئەوانەی لەو پەنهان کردنەو لە گوناهەکانی‌تر پەشیمان ئەبنەوەو بەلابردن و نەهێشتنی کردەوە خراپەکان خۆیان چاك ئەکەن و ئەوەی شاردوویانەتەوە دەری ئەخەن و ڕاستی ئەڵێن، ئەوانە تەوبەیان لێ قوبووڵ ئەکەم و ئەیانبەخشم. من تەوبە وەرگرو میهرەبانم.

(١٦١) ئەوانەی کافرن و ڕاستی دەشارنەوەو بە کافری ئەمرن ئەفرینی خوداو فریشتەو بنیادەمیان لەسەرە، هی هەموویان.

(١٦٢) هەتا هەتایە لە نەفرین و لە دۆزەخدا دەمێننەوە و سزاو ئازاریان لە سەرشان سووك ناکرێ‌و مۆڵەتیش نادرێن، واتە: سزایان دواناخرێت و عوزریان لێ قوبووڵ ناکرێت.

(١٦٣) خودای ئێوە تاقە خودایێکەو خودای تر نی‌یە ئەو نەبێ‌و بەخشندەو میهرەبانە.

إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾ إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾



(١٦٤) بێگومان لە دروست کردنی ئەرزو ئاسمان و دوابەدوای یەکاهاتنی شەوو ڕۆژو جیاوازییان لە کورتی و درێژی و قازانج و مەبەستدا و، لە دانی بیرو هۆشدا بە بنیادەم بۆ دروست کردنی کەشتیی هەمەجۆرە کە لە دەریادا هاتوچۆ ئەکەن و قازانج بە خەڵك ئەگەیێنن بە بازرگانی و شتی تر، هەروەها لەو ئاوو بارانەدا کە خودا لە ئاسمانەوە ئەیبارێنێو زەوی پێ زیندوو ئەکاتەوە پاش مردنی و سەوزی ئەکا پاش وشك بوونی و، ئەو هەمووە گیان لەبەرانەی تێیدا بڵاوی کردوونەتەوە، هەروەها لە ڕامکردن و وەرچەرخاندنی هەورو با لەنێوان ئاسمان و ئەرزدا، لە هەموو ئەمانەدا نیشانەو دەلیلی گەورەییو دەستەڵاتداری و تاقانەیی خودا هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن عەقڵن و بیرئەکەنەوە.

(١٦٥) بنیادەمیوا هەن چەند شتێکیان کردووە بە مەعبوودی خۆیان و هاوڕێیان بۆ خودا داناوە لە بت یا لە سەرەکەکانیان، ئەم بنیادەمانە ئەوانەیان بە قەد خودا خۆش ئەوێ بەڵام خاوەن ئیمانەکان لەو خۆشویستنەی ئەوان زیاتر خودایان خۆش ئەوێ. خۆشویستنەکەی ئەوان کاتییە و، هی ئەمان هەمیشەییە. جا ئەگەر ئەم ستەمکارانە کە هاوڕێیان بۆ خودا داناوە. ڕۆژی سزایان ئەدی بۆیان ڕوون ئەبوویەوەو زۆر باش ئەیانزانی هەموو هێزو توانێ هەر هی خودایەو، خودا سزای توندو تۆڵەی سەختی هەیە.

(١٦٦) ئا لەو کاتەدا کە پەیڕەویکراوەکان لە پەیڕەویکەرەکان تەبەرا ئەبن و بە هیچ جۆرێ بە کەڵکیان نایەن و، بە چاوی خۆیان سزای توند دەبینن و هیچ جۆرە پێوەندییەك نامێنێ لە نێوان ئەمان و ئەواندا.

(١٦٧) جا پەیڕەویکەرەکان لە قووڵایی دڵیانەوە ئاوات ئەخوازن و ئەڵێن: خۆزگا جارێکی تر ئەگەڕاینەوە بۆ دنیا تا لێیان تەبەڕا ببین وەك ئەوان ئا لەم تەنگانییەدا لە ئێمە تەبەڕا بوون. بەم جۆرە خودا کردەوەکانیان دێنێتەوە بەرچاویان و ئەیانکا بە مایەی خەم و خەفەت بۆیان و لە ئاگری دۆزەخیش دەرناچن.

(١٦٨) خەڵکینە! لەو شتانەی کە لە ئەرزدا هەن بخۆن، ئەوەی بەپێی یاسای ئایین ڕەوابێو لەگەڵ زەوقی ساغا بگونجێو مەکەونە دوای گومان و هەنگاوی شەیتان، نارەوای ئایینی و لەگەڵ زەوق نەگونجاو مەخۆن، شەیتان دوژمنی ڕاستەقینەو ئاشکرای ئێوەیە.

(١٦٩) شەیتان تەنها فەرمانی ئەوەتان پێ ئەدا خراپە بکەن چ لە بیروباوەڕو چ لە کردەوەدا. هەروەها فەرمانتان پێ ئەدا کاری بێ شەرمانە بکەن و درۆ هەڵبەستن دەربارەی خوداو بڵێن: هاوبەشی هەیەو ئەولادی هەیە!.

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءًۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًاۙ أُوْلَـٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِۚ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾



(١٧٠) کاتیٚ بەو کافرانە بوتریٚ شویٚنی ئەوە بکەون کە خودا ناردوویەتی بۆ پیٚغەمبەر(د.خ)، ئەڵیٚن: شویٚنی ئەوە ئەکەوین کە باوك و باپیرمان کردوویانە، ئایا ئەوەندە بیٚ هۆش و نەفامن ئەگەر باوك و باپیرەکانیان هیچیشیان نەفامیبیٚو شارەزا نەبووبن بۆ ڕیٚگەی ڕاستی، ئەمانە هەر شویٚنیان ئەکەون؟

(١٧١) حاڵی ئەو کافرانە کە گویٚ نادەنە ئامۆژگاریی ڕەهبەرەکانیان وەکو ئەوەتە کە شوانیٚ هەرا بکات بەسەر گەلەڕان و گاگەلەکەیدا، کە هەر دەنگ و ئاوازە ببیسن و لە هیچ حاڵی نەبن، ئەو کافرانە کەڕو لاڵ وکویٚرن و هیچ نافامن.

(١٧٢) ئەی ئەوانەی ئیمانتان بە خوداو پیٚغەمبەری خودا هەیە لەو ڕزق و ڕۆزییە پاکانە بخۆن کە پیٚمان بەخشیون و، ئەگەر خودا ئەپەرستن سوپاسی بکەن.

(١٧٣) بەڕاستی خودا مردارەوەبوو و خویٚنو گۆشتی بەرازی لە ئیٚوە حەرام کردووە، هەروەها ئەو حەیوانە سەربڕاوەیش کە لە کاتی سەربڕینیدا ناوی غەیری خودای لەسەر بڕابیٚ وەکو بلٚیٚن: (بەناوی فلاٚن بت). جا ئەگەر کەسیٚ ناچار بوو بۆ خواردنی ئەوانە، بە مەرجیٚ دەستدریٚژی نەکاتە سەر ناچاریٚکی ترو لەو سنوورە لانەدات کە خودا دایناوە، ئەوە گوناهبار نابیٚ. خودا زۆر بەبەزەیی و گوناه پۆشە.

(١٧٤) بەڕاستی ئەو زانایانەی ئەوەی لە تەوراتدایە ئەیشارنەوە، مەبەستی نیشانەکانی پیٚغەمبەری ئاخرزەمانەو، لە باتی ئەوە نرخیٚکی کەم و بیٚمایە وەرئەگرن، ئەوانە لە پاشەڕۆژدا پڕبەپڕی سکی خۆیان ئاگری دۆزەخ ئەخۆن و خودا لە ڕۆژی قیامەتا قسەیان لەگەڵ ناکات و ناویان بە پاك نابات، هەروەها سزاییٚکی ئیٚجگار سەختیان هەیە.

(١٧٥) ئەوانە ئەو کەسانەن کە لە باتی شارەزایی و هیدایەت گومڕاهی و سەرلیٚشیٚوانیان کڕیوەو لە باتی تاوانپۆشیو لوتفی خودای گەورە سزاو ئازاری قیامەتیان پەسەند کردووە. ئەوانە چ خۆگرییەکیان هەیە بەرامبەر سزای ئاگرو چۆن ئاوەها خەریکی گوناه و شاردنەوەی ڕاستی ئەبن و خۆیان تووشی نەگبەتی ئەکەن؟!

(١٧٦) ئەو سزایەیش لەبەر ئەوەیە کە خودا قورئانی بە حەق ناردووەتە خوارو ئەوان ئیمانیان پیٚ نەهیٚناوە. ئەوانە باوەڕ بە هەندیٚ کتیٚب ئەکەن و باوەڕ بە هەندیٚکی تر ناکەن و لە ڕیٚگای حەق لائەدەن و ڕاستی ئەشارنەوە، زۆر لە ڕاستییەوە دوورن.

۞ لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا ۖ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى ۖ الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنثَىٰ بِالْأُنثَىٰ ۚ فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ۗ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ ۗ فَمَنِ اعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَن بَدَّلَهُ بَعْدَمَا سَمِعَهُ فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾



(١٧٧) چاکەو کرداری باش ئەوە نی‌یە روویکەنە خۆرنشین وەك گاورو جوولەکە ئەڵێن و خوویان داوەتە مەسئەلەی قیبلەگۆڕانی موسوڵمانان. بەڵکو چاکەو کرداری باش ئەوەیە ئینسان ئیمان بێنێ بە خوداو، بە پێغەمبەرو، بە ڕۆژی قیامەت و، بە فریشتەو، بەو کتێبانەی خودا ناردوونی بۆ پێغەمبەران و، دارایی خۆی ببەخشێ، ئەگەرچی خۆشی بویّ، بە خزمان و هەتیوان و داماوان و ڕێبواران و سواڵکەران و بەو بەندانەی موحتاجی پارەو ماڵن بەرامبەر ئازادکردنیان. کرداری چاك ئەوەیە ئینسان نوێژ بکات و زەکاتی ماڵ بدات و، کە پەیمانێکی خێری دا بەجێی‌بهێنێ‌و لە خۆشی و لە کاتی ڕووبەڕووبوونی دوژمنی ئاییندا خۆڕاگر بێت. ئا ئەوانەن لەگەڵ خودا ڕاست ئەکەن و بەئیمانن. ئا ئەوانەن خۆیان لە کوفرو لە کردەوەو ڕەوشتی بەد ئەپارێزن.

(١٧٨) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بە خوداو بەو پێغەمبەرەی خودا لە دینی ئیسلاما ڕێوشوێنی تۆڵەسەندنەوەو حەق وەرگرتنەوەتان بۆ دانراوە لە کاتێکا کەسێکتان لێ بکوژرێ، ئەوەیش بەم جۆرە: لە باتی ئینسانی ئازاد ئینسانی ئازاد و، لەباتی بەندە بەندە ئەکوژرێتەوە، مێینەیش بە مێینە. پێویستە ئەوەیش بزانین کە مەعنای ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە نی‌یە ئازاد لە باتی بەندە یا پیاو لە باتی ژن ناکوژرێن. جا ئەگەر بکوژ لەلایەن حەقداری کوژراوەوە کە برای دینییەتی، بەرامبەر بە پارەو ماڵ عەفو کرا، با بەپێی ڕێوشوێنی ئایین بجووڵێتەوەو ئەو حەقە بە پیاوانە جێبەجێ بکات. ئەم عەفوکردنە بارسووکی و ڕەحمەتە بۆتان لەلایەن خوداوە. ئیتر پاش ئەو عەفوکردن و خوێنبایی وەرگرتنە ئەگەر خاوەن کوژراو دەستدرێژی کردو بکوژەکەی کوشتەوە ئەوە سزای گەورەو توندی ئەدرێ.

(١٧٩) ئەم قیصاص دانانە ژیانە بۆ ئێوە، چونکە کە قیصاص بوو و ئینسان ترسی کوشتنەوەی هەبوو، ئیتر ناتوانێ دەست باتەبەرو خەڵك بکوژێ .ئەمەش دڵنیایی و ئارامییە بۆ ئەوەی نیازی دەستدرێژی هەبێ‌و بۆ ئەوەی لەوانەبێ دەستدرێژی لێ بکرێ و بۆ کەسوکاریان و بۆ کۆمەڵ بە شێوەیێکی گشتی.

(١٨٠) واجب کراوە لەسەرتان بۆ ئەوەتان کە نیشانەی مردنی لێوە دیاری داو ئەسبابەکانی ئاشکرا بوون، ئەگەر ماڵی زۆری بوو، وەصیەت بکا بۆ باوك و دایك و خزمە نزیکەکانی بە شێوەیێکی عادلانەو ئەبێ بە دەوڵەمەند زیاتر نەدا لە فەقیرو وەسیەتەکەی لە سێ‌یەکی ماڵی زیاتر نەگرێتەوە. ئەمە واجبە لەسەر ئەوانەی لە خودا ئەترسن. شایانی باسە ئەم ئایەتە بە ئایەتی میرات نەسخ بووەتەوە.

(١٨١) جا هەر کەسێ ئەو وەصیەتە بگۆڕێ پاش ئەوەی بیستی و دڵنیا بوو لە ڕاستی ئەو وەصیەتە ئەوا ئەوباڵی لەسەر ئەوانەیە کە ئەیگۆڕن. خودا بیسایەو زانایە.

فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ
عَلَيْهِ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ
عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ
لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم
مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى ٱلَّذِينَ
يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ
لَّهُۥ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهْرُ
رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ
وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ
فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ
أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ
ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُواْ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا
هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ وَإِذَا سَأَلَكَ
عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ
فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِى وَلْيُؤْمِنُواْ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾



(١٨٢) جا ئەگەر کەسێ ترسی ئەوەی بوو کە وەصیەتکەر ناعادلّ بێ و بەشی هەندێکی لە بەشی هەندێ زیاتر دانابێ، یا بە جۆرێ وەصیەتی کردبێ کە زیان لە میراتگرەکان بداو ئەو کەسە هات و ناوبژیی کرد لەنێوان وەصیەت بۆکراوەکاندا. یا لە نێوان ئەوان و میراتگرەکانداو بەجۆرێ گۆڕی کە حەق و شەرعی بێ ئەوە هیچ گوناهبار نابێ. خودا گوناهپۆش و میهرەبانە.

(١٨٣) ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە خوداو پێغەمبەری خودا هەیە ڕۆژووتان لەسەر فەرزکرا هەر وەك لەسەر ئوممەتەکانی پێش ئێوەیش فەرزکراوە لە سەردەمی پێغەمبەرە پێشووەکاندا (د.خ) بەلکو بە هۆی ئەو ڕۆژووەوە خۆتان لە عەزابی خودا بپارێزن.

(١٨٤) ئەو ڕۆژووەی لەسەرتان فەرزکراوە چەند ڕۆژێکی کەمی ژمێرراوە کە مانگی ڕەمەزانە. جا ئەگەر یەکێکتان نەخۆش بوو یا لە سەفەردا بوو کە لەگەلّ ئەو نەخۆشیو سەفەرەدا ڕۆژوو گران بوو بۆی، ئەوا لەو حالآنەدا بەڕۆژوو نابێو چەند ڕۆژێکی تر غەیری مانگی ڕەمەزان بە قەدەر ئەو ڕۆژانەی شکاندوونی بەڕۆژوو ئەبێ، واتە: لە کاتی چاکبوونەوەی نەخۆشییەکەیو لە کاتی نیشتەجێبوونیا.

بەلاّم ئەوانەی کە ناتوانن بەڕۆژوو بن، بە کولەمەرگی نەبێ، لەسەریان فەرزە لەباتی هەر ڕۆژێ لەو سیی ڕۆژە فیدیە بدەن، فیدیەکەیش بریتییە لە خواردەمەنیی میسکینێ. ئەم فیدیە مشتێکی تەواوە لە دانەوێلە لای ئیمامی شافیعی(ر.خ)و قیمەتی خواردەمەنی ئینسانێکە بۆ دووجار لای ئیمام ئەبو حەنیفە (ر.خ). جا ئەگەر یەکێ زیاتر بدا بە میسکین ئەوە چاکترە. خۆ ئەگەر هەر بەڕۆژوو بن ئەوە ئەگەر بزانن باشترو بەسوودترە بۆتان.

(١٨٥) ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی مانگی ڕەمەزانن کە قورئانی پیرۆزی تێدا هاتووەتە خوار، ئەو قورئانەی کە هۆی شارەزایی ئادەمزادەو ئایەتی زۆر ڕووناکن و هۆی شارەزایی و جیاکردنەوەی حەقن لە ناحەق، جا کەسێ لەو مانگەدا ساغ و سەلامەت بوو با بەڕۆژوو بێ. کەسێکیش نەخۆش بێ یا ڕێبوار بێ با چەند ڕۆژێکی تر بەڕۆژوو بێ. خودا ئەیەوێ کارتان ئاسان بکات نەك گران. کە ڕۆژووی مانگەکەتان تەواو کرد با تەکبیری خودا بکەن و بلّێن (الله اکبر) لەسەر ئەوە کە هیدایەتی داون بۆ ئەو ڕۆژووە. هیوایە سوپاسی خودا بکەن.

(١٨٦) ئەگەر بەندەکانم دەربارەی من لێیان پرسیت پێیان بلّێ: من لێیانەوە نزیکم و ئاگام لە حالّ و کردەوەیانە، هەرکەس بانگم لێ بکات ئاگام لێیەو، وەلاّمی ئەدەمەوەو فریای ئەکەوم. کەواتە کە بانگم کردن بۆ عیبادەت و بەگوێکردنم با ئەوان بەگوێم بکەن و، ئیمانم پێ بهێنن بەلکو بگەنە حەق و ڕێگای ڕاستی بگرنەبەر.

أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾ وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾



(١٨٧) له شەوانی مانگی ڕۆژوودا چوونە لای ژنەکانتان بۆ حەلاڵ کراوە. ئەوان بەرگ و پۆشاکن بۆ ئێوەو عەیبتان دائەپۆشن، ئێوەیش بەرگ و پۆشاکن بۆ ئەوان و عەیبیان دائەپۆشن، خودا ئەیزانیو ئاگای لێبوو ئێوە زوڵمتان لە خۆتان کردو خۆتان گوناهبار کرد کە لە شەوانی مانگی ڕۆژوودا پێش ئەوەی بۆتان حەلاڵ بکرێ، ئەچوونە لای ژنەکانتان، جا کە تەوبەیان کرد خودا تەوبەی لێ قبووڵ کردن و عەفوی کردن. دەی ئیستە لە شەوەکاندا بڕۆنە لایان و داوای ئەوە بکەن کە خودا بۆی نووسیون لە ئەولاد، هەروەها لە شەوەکاندا بخۆن و بخۆنەوە تا خەتی سپی ڕووناکی سبەینێ لە خەتی تاریکی ڕەشی شەو جیا دەبێتەوە. بەڵام لە شەوەکاندا ئەگەر لە مزگەوتەکاندا گۆشەنشین بوون بۆ عیبادەت و خوداپەرستی مەڕۆنە لای ژنەکانتان. ئەمانە کە بۆم ڕوون کردنەوە سنووری فەرمانی خودان لێیان نزیك مەبنەوە نەبادا سنوور ببڕن و تەجاوز بکەن. خودا ئاوەها فەرمانەکانتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، کەچی پەیڕەودییەو چی سەرپێچی‌یە؟ بەڵکو خۆتان لە گوناه و سەرپێچی بپارێزن.

(١٨٨) ئەی خەڵکینە لە ناو خۆتاندا ماڵ و دارایی خۆتان بە ناڕەوا حەرام مەخۆن و ماڵتان مەدەن بە فەرمانڕەواو کاربەدەستەکان بۆ ئەوەی لایەنتان بگرن و ناحەقتان بۆ بکەنە حەق و ماڵی خەڵك بە ناحەق بخۆن و گوناهبار بن، کە زۆر باشیش ئەزانن ناحەقە.

(١٨٩) پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی گەورەبوون و بچووك بوونەوەی مانگ، کە لە سەرەتاوە یەك شەوەو باریکە و، دوایی وردە وردە گەورە ئەبێو ئەبێتە چارەك و، لە چواردە ڕۆژیدا تەواو گەورە ئەبێو، دوای ئەوە دووبارە دەست ئەکاتەوە بە بچووك بوونەوە. پێیان بڵێ ئەوە خودا وای لێ ئەکات تا کاتەکانی بنیادەم بۆ حەج کردن و مامەڵە و کشتوکاڵ کردن دەربکەون و لەسەری بڕۆن. خێرو چاکە ئەوە نی‌یە لە کاتی دابەستنی ئیحرامی حەجدا لە دەرگای ماڵ و خێوەتەوە نەچنە ژوورەوەو لە پشتیەوە بچنە ژوورەوە، ڕەفتاری چاك و خێر ئەوەتە لە خودا بترسن. لە دەرگای عادەتییەوە بچنە ناوماڵ و لە خودا بترسن و فەرمانی بەجێبێنن بەڵکو ڕزگار بن.

(١٩٠) لە پاش صوڵحی (حدیبیە) کە بەپێی ڕێکەوتنی هەردوولا حەزرەت (د.خ) لە ساڵی دواییدا هات بۆ جێبەجێکردنی عومرەی قەزاو، موسوڵمانەکان ترسان لەوە کە کافرەکان وەعدەکەیان نەبەنەسەرو لە حەرەمدا یا لە مانگی حەرامدا شەڕیان لەگەڵ بکەن، ئەم ئایەتە نازڵ کرا واتە: کە چوونە حەرەم و کافرەکان هاتن شەڕتان لەگەڵ بکەن، ئێوە دەستدرێژی مەکەن بەوەی پێشدەستییان لێبکەن و شەڕیان لەگەڵ بکەن، بەڵام ئەگەر ئەوان پێشدەستییان کرد ئەوا ئێوەیش لێیان مەوەستن و شەڕیان لەگەڵ بکەن، خودا بنیادەمی دەستدرێژکەری خۆش ناوێ.

وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ فَإِنِ انتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿١٩٣﴾ الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ فَإِذَا أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾



(١٩١) له هەركوێ بەردەستتان كەوتن و زاڵ بوون بەسەریاندا بیانكوژن. له مەككە دەریان بكەن وەك ئەوان ئێوەیان دەركرد، ئینسان دەربەدەر كردن و بێحاڵو ماڵ لە وەتەن دەركردنی ئازاری زیاترە لە كوشتنی، یا ئەو ئاژاوەو كوفرە كە ئەوان بەرپای ئەكەن لە كوشتنەكە توندترو خراپترە، بەڵام ئێوە لە (مسجد الحرام)دا شەڕیان لەگەڵ مەكەن تا ئەوان دەستپێشخەری نەكەن، كە كردیان بیانكوژن. ئەمەیە پاداشی كافران.

(١٩٢) جا ئەگەر وازیان لە شەڕكردن و كوفر هێنا ئەوا خودا گوناه پۆش و میهرەبانەو لە گوناه و تاوانی ڕابووردوویان خۆش ئەبێ.

(١٩٣) شەڕیان لەگەڵ بكەن تا ئاژاوەی كوفر نەمێنێ و، دین هەمووی ببێتە خودابەیەك ناسین و عیبادەت هەر بۆ ئەو بێ. جا ئەگەر وازیان هێنا لەوەی نەهیی لێ كراوە ئیتر دەسدرێژی نامێنێ بۆ ئەوانە نەبێ كە ستەمكارن، جوان نی‌یە زوڵم بكرێ لە یەكێ نەبێ كە زوڵم بكات.

(١٩٤) لەم مانگی (ذی القعده)دا كە عومرەی قەزای تیا دەكەن شەڕ بكەن لەگەڵ كافرەكان وەك ئەوان هەر لەم مانگەدا شەڕیان لەگەڵ كردن و نەیانهێشت عومرەكە بكەن. هەتكی حورمەتیش قیصاصی هەیە، وەك ئەوان هەتكیان كرد. ئێوەیش درێغی مەكەن، كە واتە هەركەس دەستدرێژی لێ كردن ئێوەیش وەڵامی بدەنەوە بە وێنەی ئەو دەستدرێژییەی ئەو. لە خودا بترسن و لەو سنوورە لامەدەن كە بۆی دیاری كردوون. زۆر چاك بزانن خودا لەگەڵ لەخوداترسانەو سەریان ئەخات.

(١٩٥) ماڵ و دارایيتان لە ڕێگای خوداو جیهاد و بەرزكردنەوەی قسەی خوداداو لە ڕێگای یارمەتیدانی كەسوكارو داماواندا صەرف بكەن. دەستتان مەنووقێنن و زیادەڕەوییش مەكەن. خۆتان مەخەنە هیلاكەتەوە بە هۆی جیهاد نەكردنەوە، كە كافرەكان بەسەرتاندا زاڵ بن و بتانفەوتێنن. هەروەها خۆتان مەفەوتێنن بە هۆی ئیسراف یا دەست گرتنەوەوە، كە هەردووكیان خراپن. كردارتان چاك بكەن و یارمەتی داماوان بدەن، خودا چاكەكارانی خۆش ئەوێ.

(١٩٦) كاتێ ئیحرامتان بەست بۆ حەج یا بۆ عومرە تەواویان بكەن و لە خۆتانەوە دەرمەچن لێیان. ئەگەر مەنعیش كران لەوە كە تەواویان بكەن هەر لەو شوێنەدا حەیوانێ سەربڕن لەوەی كە دەس ئەكەوێ، مەڕ یا بزن یا غەیری ئەوانە، هەروەها سەر مەتاشن و لە ئیحرام دەرمەچن تا ئەو فیدیە ئەگاتە شوێنی خۆی و دڵنیا ئەبن كە گەیشتووەتە ئەو شوێنەی پێویستە لەوێ سەربڕرێ واتە: خاكی حەرەم.

جا ئەگەر یەكێكتان نەخۆش بوو یا خۆ سەری بریندار بوو یا سپێ تێی‌دابوو پێویستی بە تاشینی سەر بوو و تاشیی، ئەوە پێویستە فیدیەی بدا كە بریتییە لە ڕۆژوو یا دانی خواردەمەنی بە داماوان، یا حەیوانێ سەربڕێ، جا هەر كاتێ ئێوە هێمن بوونەوەو مانیع نەبوو بەسەرتانەوەو ئیحرامتان بەست بۆ عومرەو، ویستتان پاش عومرەكە حەج بكەن، ئەوە بۆ فیدیەی ئەو ئیستیراحەتە كە لە بەینی عومرەو حەجەكەدا ئەیكەن پێویستە ئەوەی بتوانێ حەیوانێ سەربڕێ و، ئەوەی دەستی نەڕواو نەتوانێ حەیوان سەربڕێ ئەبێ سێ ڕۆژ لە مەككە بەڕۆژوو بێ حەوت ڕۆژیش پاش گەڕانەوەی بۆ نیشتمانی خۆی. ئەم فەرمانە بۆ ئەوانەیە كە نیشتمانیان لە نزیكی (مسجد الحرام) ەوە نەبێ بە كەمتر لە مەسافەی نوێژ كورتكردنەوە. لە خودا بترسن و زۆر چاك بزانن كە خودا سەختگیرە لە سزادانا.

ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ
وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ
يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ۚ وَٱتَّقُونِ
يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن
تَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ
عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ
وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ
لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ
ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٩﴾
فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ
ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن
يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ
خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا
حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾
أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾



(١٩٧) کاتی ئیحرام بەستن شەووال و(ذی القعده)و دە ڕۆژی (ذی الحجه)یە. کە یەکێ ئیحرامی بەست بۆ حەج ئیتر چوونە لای ژن نی‌یەو قسەی ناشیرین نی‌یەو، کاری تاوانباری و دەمەدەم و وتەی پڕوپووچ نی‌یە. بێ‌گومان هەر کارێکی چاکە بکەن لە ماڵبەخشین و نوێژکردن و تەوافی کەعبەو خێراتی تر ئەوە خودا پێی ئەزانێ‌و پاداشتان ئەداتەوە، توێشوو لەگەڵ خۆتان هەڵگرن بۆ دوارۆژ، باشترین توێشوو کە ئینسان لەگەڵ خۆی هەڵیگرێ بۆ قیامەت لەخوداترسانە. لە من بترسن ئەی خاوەن عەقڵەکان.

(١٩٨) گوناهبار نابن ئەگەر لە ڕۆژانی حەجدا کەسبی قازانجێکی دنیایی و ڕزقێ بکەن و لە خودای گەورەوە بە تەمای بن. جا کاتێ ڕاوەستانی عەرفات تەواو بوو و بەرەو موزدەلیفە کەوتنەڕێ لای (مشعر الحرام) ناوی خودا بهێنن و (لبیك لبیك..الخ) بکەن و (لااله الا الله) و دوعاو پاڕانەوە بکەن، ناوی خودا بهێنن و یادی بکەن و شوکرانەبژێر بن کە ڕێگەی ڕاستی نیشان داون و خستوونیە سەر ئەم خوداپەرستییە کە ئەگەر بە دڵسۆزییەوە بیکەن ئەبێتە هۆی بەختیاریتان، ئەگەرچی لەمەوپێش گومڕاه بوون.

(١٩٩) ئەی دانیشتوانی حەرەم ئێوەش لەگەڵ خەڵکی تر لە عەرەفات ڕاوەستن و لەوێوە وەك ئەوان داپەڕنە خوارو، بەشێوەیێکی تایبەتی و جیا لە خەڵك لە موزدەلیفە مەوەستن، واتە خەڵکی تر لە عەرەفات بن و، ئێوە بە بەهانەی ئەوەی کە ئەهلی حەرەمن، لە موزدەلیفە. نا، لەگەڵ ئەوان بوەستن و لەگەڵ ئەوان داپەڕن و داوای لێخۆشبوون و گوناهپۆشی لە خودا بکەن، خودا گوناهپۆش و میهرەبانە.

(٢٠٠) کە کاروباری حەجتان تەواو کرد دەس مەکەن بە مەدح و پیاهەڵدانی باوك و باپیرتان، وەك سەردەمی جاهیلییەت، ئەوە سوودی تێدا نی‌یە بۆتان، بەڵکو ناوی خودا بهێنن و باسی گەورەیی و دەستەڵات و بەخشندەیی ئەو بکەن، وەکو چۆن ناوی باوك و باپیرتان بە حورمەتەوە ئەبەن، بەڵکو لەوەیش زیاترو بەهێزتر. بنیادەمی وەها هەن ئەپاڕێنەوە ئەڵێن خودایا سامان و ماڵی دنیامان بدەرێ و، ئیتر داوای شتێ ناکەن بۆ دوارۆژیان باش بێ. ئەمانە لە قیامەتدا بەش و بەهرەیان نی‌یە.

(٢٠١) هی وایش هەن ئەپاڕێنەوە لە خودا ئەڵێن: خودایا لە دنیادا چاکەمان پێ ببەخشە لە لەشساغی و ئاسایش و ماڵ و خێزانی باش و خزمی باش و بەشی حاڵی خۆمان دارایمان پێ ببەخشە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا پاداشی چاکمان پێ‌ببەخشە و لە سزای ئاگر بمانپارێزە.

(٢٠٢) ئەمانەیان بەشێکی باشیان هەیە لە ئەنجامی کردەوەی چاك و پاڕانەوەی بەجێیان و داواکردنی چاکەی دنیاو قیامەتیان. خودا گورج موحاسەبەی خەڵك ئەکات و زوو پاداشی کرداری چاك و سزای کرداری خراپ ئەداتەوە.

۞ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْدُودَٰتٍ فَمَن تَعَجَّلَ فِى يَوْمَيْنِ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ ٱتَّقَىٰ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٢٠٦﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدْخُلُواْ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾ فَإِن زَلَلْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْكُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٠٩﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٢١٠﴾



(٢٠٣) ناوی خودا بێنن لە چەند ڕۆژێکدا، کە لە سبەینێی عەرەفەوەیە تا عەسری ڕۆژی چوارەمی جەژن، ئەمەیش لەپاش نوێژەکان و لە کاتی سەربڕینی قوربانی و لە کاتی بەردفڕێدانا بۆ سەر کۆگابەردەکانی بەردبارانی شەیتان. تەکبیرەکەش بەم جۆرەیە: ( الله اکبر. الله اکبر. الله اکبر. لااله الاالله والله اکبر. الله اکبر ولله الحمد).

جا ئەگەر یەکێ پەلەی کردو لە دوو ڕۆژدا ڕەجمی کردو گەڕایەوە ئەوە تاوانی لەسەر نی‌یەو گوناهی ناگات، خۆ ئەگەر دواکەوت تا سێ ڕۆژ تەواو بوو ئەوەیش هەر گوناهی ناگات. ئەم تەخییرەش بۆ کەسێکە کە لە خودا بترسێ. لە خودا بترسن و دڵنیابن کە لە دوارۆژدا کۆ ئەبنەوەو ئەگەڕێنەوە بۆ لای خودا.

(٢٠٤) بنیادەمی وا هەیە دەربارەی کاروباری دنیایی قسەت بۆ ئەکات، قسەکانیت بەدڵە، چونکە بەدیمەن باش قسە ئەکات و گفتی شیرینە. هەروەها خودا ئەگرێ بە شاهید لەسەر ئەوەی لە دڵیایەتی کە گوایا ڕاستگۆیەو دڵسۆزە، کەچی لە دڵا بەدترین دوژمنە.

(٢٠٥) بنیادەمی وا کە پشتی هەڵکردو لای تۆ دەرچوو یەکسەر ئەچێت خراپە ئەکات و دەغڵودان ئەسووتێنێ‌و حەیواناتی موسوڵمانان ئەکوژێ. یا مەبەست ئەوانەن کە ئەگەر کاروباری خەڵکیان کەوتە دەست و بوون بە فەرماندار خراپە ئەکەن و زوڵم و زۆرداری ئەکەن. خودا خراپەکاریی پێ ناخۆشە.

(٢٠٦) ئەگەر بەم بنیادەمە بوترێ: لە خودا بترسەو بەدکاری مەکە، غیرەت و نەفامیی جاهیلییەت ئەیگرێ‌و تووڕە ئەبێ‌و ئەو گوناهە ئەکات کە لێی مەنع کراوە. ئەوکەسە سزای دۆزەخی بەسە. شوێنێکی زۆر بەدە ئەو شوێنەی لە دوارۆژدا ئەوی تێدا جێگیر ئەبێ.

(٢٠٧) بنیادەمی وایش هەیە خۆی ئەفرۆشێ‌و سەروماڵی خۆی باخت ئەکا لە پێناوی ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپەو، جیهاد لە ڕێی خودادا، تا خودای لێ ڕازی بێ. خودا لەگەڵ بەندەکانی خۆی میهرەبانەو پاداشیان ئەداتەوە.

(٢٠٨) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ملکەچ بن بۆ ئایینی ئیسلام لە هەموو ڕوویەکەوەو لە هەموو کاروباردا. دوای شتی تر مەکەون و ئەحکامی قورئان لەگەڵ ئەحکامی تەورات تێکەڵ مەکەن و دوای هەنگاوی شەیتان مەکەون، شەیتان دوژمنی ئاشکراو ناحەزی ئێوەیە.

(٢٠٩) ئەگەر پاش ئەوەی دەلیلی ئاشکراتان بۆ هات لەسەر ڕاستیی ئایینی ئیسلام، هەڵخلیسکان و لە ڕێی ڕاست لاتان داو بێ‌گوێییتان کرد، زۆر چاك بزانن خودای گەورە بەدەستەڵاتەو حەکیمە لە تۆڵەسەندنەوەداو، بە حەق نەبێ تۆڵە ناسەنێتەوە.

(٢١٠) وادیارە ئەو کافرانە چاوەڕوانی ئەوەن و ئەوەیان ئەوێ کە خوداو مەلائیکەکانی خودا لەناو چەند پەڵە هەورێکی سپیدا بێن بۆیان، کە چاوەڕوانی ڕەحمەتی لێ ئەکرێ کەچی مەلائیکەی سزان و لە دیمەنی هەوری سپیدا دەرئەکەون و غەزەبی خودایان بەسەردا ئەبارێ‌و هەمووشت ئەبڕێتەوەو حوکمی خودا جێ‌بەجێ ئەکرێ؟ ئەمە کاری بنیادەمی هۆشیار نی‌یە، باشتر ئەوەیە تەوبە بکەن و بێنە سەر ڕێی ڕاست و چاوەڕوانی ڕەحمەتی خودابن، هەموو شت بۆ لای خودا ئەگەڕێتەوە.

سَلْ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ
ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ۘ وَٱلَّذِينَ
ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ
﴿٢١٢﴾ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّۦنَ مُبَشِّرِينَ
وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ
فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ
مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ
صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا
يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ
وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِۗ
أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلْ
مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ
وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾



(٢١١) پرسیار بکە لە بەنی‌ئیسرائیلی‌یەکان چەند موعجیزەی دیاری و ئاشکرامان دانێ. ئەو کەسانەی خودا نیعمەتیان پێ ئەدات و ئەوان ونی ئەکەن و سوپاسی ناکەن، خودا دەربارەی ئەوانە سەختگیرەو سزای توندیان ئەدات.

(٢١٢) ئەوانەی کافرن ژیانی دنیایان لە بەرچاو جوان کراوەو ڕازێنراوەتەوە. ئەمانە گاڵتە ئەکەن بە خاوەن ئیمانەکان، ئەوانە کە لە خودا ئەترسن لە ڕۆژی قیامەتدا لە ژووری کافرەکانەوەن. خودا بۆ هەرکەس بیەوێ ڕۆزی و بەهرە بە بێ‌حیساب و ژمارە ئەبەخشێت.

(٢١٣) بنیادەم لە بەینی ئادەم و ئیدریس دا یەك جۆر ئوممەت بوون هەموو لەسەر حەق بوون، پاشان لەناوخۆیاندا تێکچوون، ئەنجا خودا پێغەمبەرانی بە موژدەدەرو ترسێن ناردو کتێبی لەگەڵ ناردن بە ڕاستی، تا خودا فەرمانی حەق بدا لەو شتانەدا کە خیلافیان تیا هەبوو، کەچی کەس ئیختیلافی نەئەکردوو لە ڕێگای ڕاست لای نەئەدا ئەوانە نەبێ کتێبیان بۆ هاتووە لەگەڵ موعجیزەدا. ئەمانە بە ناحەق و زوڵم لایاندا چونکە حەزیان لە ماڵی دنیا ئەکرد. بەڵام خوا موسوڵمانەکانی هیدایەت دا بۆ لابردن و نەهێشتنی ئەو زوڵم و ئیختیلاف و لەڕێ لادانانە، خودا بۆ هەرکەس مەیلی لەسەر هیدایەتی بێ، شارەزای ئەکات و ئەیخاتە سەر ڕێگای ڕاست و ڕەوان.

(٢١٤) لاتان وایە هەروا بەئاسانی ئەچنە بەهەشت کە هێشتا بەسەرهاتی ئەوانەتان بەسەردا نەهاتووە کە لەپێش ئێوەوە بوون و سەختی و سزاو ئازاری زۆریان تووش بوو لەپێناوی بڵاوکردنەوەی ئایین و جیهاداو ناڕەحەتییان گەیشتبوە دواپلە، بە ڕادەیێکی وەها پێغەمبەرەکە و ئەوانەی ئیمانیان هێنابوو لەگەڵی ئەوەندە لە تەنگوچەڵەمەدا بوون و بەجۆرێ تەنگاو بووبوون ئەیانوت: ئیتر کەی لەلایەن خوای گەورەوە یارمەتیمان بۆ دێ؟ کەی ڕزگار ئەبین؟ خودایش وەحیی کرد بۆ پێغەمبەرەکەیان کە پێیان بڵێ: یارمەتی خودا نزیکە و ئەوەندەی نەماوە ڕزگاربن، واتە: ئەمە ڕەوشتی خودایە لەناو بەندەکانیدا کە لەپاش تەنگانە فەرحانی‌یەو لەدوای خۆڕاگرتن سەرکەوتنە.

ئەم ئایەتە لە غەزای (ئەحزاب)دا هاتووەتە خوار.

(٢١٥) لێت ئەپرسن چی لە ڕێگەی خودا صەرف کەین؟ پێیان بڵێ: هەرچی صەرف ئەکەن لە ڕێگەی خودا لەپێش هەموو کەسا بیدەن بە باوك و دایکتان و بە خزمە زۆر نزیکەکانتان و بە هەتیوان و داماوان و ڕێبوارانی بێ‌دەس. هەر خێرێ بکەن و هەر ماڵێ ببەخشن خوا ئاگای لێیەتی.

چەند جوانە، ئەوان لێی ئەپرسن چی صەرف بکەن، کەچی ئەو لە وەڵامدا ئەوکەسانە باس ئەکات کە ئەبێ لەپێش هەموو کەسدا یارمەتییان بدەن، بەڵێ موهیم نی‌یە چی صەرف ئەکەن، موهیم ئەو شوێنەیە تیایا صەرف ئەکەن.

كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ وَهُوَ كُرۡهٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَكۡبَرُ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمۡ عَن دِينِكُمۡ إِنِ ٱسۡتَطَٰعُواْۚ وَمَن يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢١٨﴾ ۞ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِۖ قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَاۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلۡعَفۡوَۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾



(٢١٦) واجب كراوه لەسەرتان لە پێناوی پاراستن و دامەزراندنی ئایینی ئیسلام و لە ڕێگەی خوادا شەڕ بکەن، دیارە شەڕکردن لەسەر شانتان گرانەو پێتان ناخۆشە بەڵام ئەم پێ‌ناخۆشبوونی ئێوە ئەساس نی‌یە، لەوانەیە شتێکتان پێ ناخۆش بێ، کەچی خێری تیابێ بۆتان، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێ، کەچی زیانتانی تێدا بێ. خوا بە نهێنی کار ئەزانێ و ئەزانێ چی خێری تیایە بۆتان، ئێوە نایزانن.

(٢١٧) پرسیارت لێ ئەکەن لە حوکمی جەنگ کردن لە مانگە حەرامەکاندا کە (ذوالقعده) و (ذوالحجه) و (محرم) و (رجب)ن. تۆ لە وەڵامدا پێیان بڵێ: جەنگکردن لە مانگی حەرامدا تاوانێکی گەورەیە. بەڵام ڕێگەی دینی خودا گرتن لە خەڵك و ئینکاری خوداو ئینکاری حورمەتی (مسجد الحرام)و تەجاوزکردنە سەری‌و دەرکردنی ئەهلەکەی، کە موسوڵمانەکانن، لای خودا ستەمێکی گەورەترە. مەنعی خەڵك کردن لە دین بە ئازاردان و دەرکردن و شێوەکانی تر لە کوشتنی نەفس گەورەترە. ئەم کافرانە واز ناهێنن و بەردەوام جەنگتان لەگەڵ ئەکەن بەهیوای ئەوەی، ئەگەر بتوانن، لە دینی ئیسلام هەڵتانبگەڕێننەوە. ئەکەن هەڵخەڵەتێن چونکە هەرکەس لە ئێوە ئەگەر لە دینی خۆی وەرگەڕێ کە دینی ئیسلامەو، بە کافری بمرێ، ئەوە کردەوە چاکەکانی بێ‌سوودو بێ‌نرخن لای خودا لە دنیاو قیامەتداو دەبێتە هاوڕێی ئاگری دۆزەخ و هەتا هەتایە تیایا ئەمێنێتەوە.

(٢١٨) ئەوانەی ئیمانیان هێنا بە ئایینی ئیسلام و لە پێناوی ڕەزای خوادا کۆچیان کردو ماڵ وحاڵ و نیشتمانی خۆیان جێهێشت و جیهادیان کرد، ئەوانە بە تەمای میهرەبانی و بەخشندەیی خودان و خودایش زۆر گوناهبەخش و میهرەبانە.

(٢١٩) پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی خواردنەوەی شەراب و قومارکردن، لە وەڵامدا پێیان بڵێ: لە خواردنەوەی شەراب و قومارکردندا گوناهێکی گەورە هەیە. لە هەمان کاتیشدا سوودو قازانجی دنیاییشیان تیا هەیە، بەڵام زیان و تاوانەکەیان لە سوودو قازانجەکەیان گەورەترەو بۆ ئەوە ناشێ بۆ قازانجە دنیاییەکە بنیادەم خۆی تووشی گوناه و سزای دوارۆژ بکات.

هەروەها پرسیارت لێ ئەکەن چی صەرف کەن لە ڕێگەی خوادا؟ بڵێ: ئەوەی بەئاسانی دەس بدا بۆیان و گران نەبێ لەسەر شانیان. خودا وەها حوکم و فەرمانی خۆیتان تێئەگەیێنێ تا بیربکەنەوە لە فەرمانەکانی خوداو لە ئەنجامو دوارۆژی خۆتان و، بۆ دین و دنیای خۆتان بە ڕێکوپێکی هەوڵ بدەن.

فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٠﴾ وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ أُو۟لَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾ وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَٰنِكُمْ أَن تَبَرُّوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَتُصْلِحُوا۟ بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾



(٢٢٠) که ئایەتی (ان الذین یأکلون أموال الیتامی ظلما) (النساء ١٠) نازڵ بوو موسوڵمانەکان ترسان و لە هەتیوان دوورە پەرێز بوون. بۆیە ئەم ئایەتە هاتە خوار. واتە: دەربارەی تێکەڵی لەگەڵ هەتیوان پرسیارت لێ ئەکەن، بڵێ: تێکەڵی لەگەڵیان بۆ چاك کردنیان و چاك کردنی ماڵ و سامانیان چاکترە لەوەی کە لێیانەوە دوور بن. ئێوە ئەگەر تێکەڵیان بن ئەوان براتانن و حەقی برا لەسەر برا ئەوەیە دڵسۆز بێ لەگەڵیاو چ چاکەیەکی بۆ خۆی ئەوێ بۆ ئەویشی بوێ. خودایش ئاگادارەو ئەزانێ کێ تێکەڵی ئەکا لەگەڵیان بە نیازی چاکە و بە دڵسۆزیو کێیش تێکەڵی لەگەڵیان ئەکا بە نیازی بەدو دڵپیسی و بە تەمای ماڵخواردنیان. خودا ئەگەر بیویستایە تووشی باری گرانی ئەکردن و نەیئەهێشت تێکەڵیان بکەن. خودا دەستەڵاتدارەو ئەتوانێ تۆڵە لە پیاوخراپ بسێنێو، فرمانەکانی پڕحیکمەتن.

(٢٢١) ژنێ کە شەریك بڕیار بدا بۆ خودا یا ئیمانی بە خودا نەبێ، تا ئیمان نەهێنێ بە خودای تەنیا مارەی مەکەن. جاریەیەکی موسوڵمانی خاوەن ئیمان چاکترە لە ژنێکی شەریك بۆخودابڕیاردەر هەرچەند ئەو ژنە موشریکەتان لا پەسەند بێ لەبەر جوانی یا سامان یا نەسەب.

هەروەها ژن مەدەن بە پیاوی کافر، موشریك بێ یا کیتابی، تا موسوڵمان نەبێ. بەندەیێکی موسوڵمان و خاوەن ئیمان چاکترە لە کافر هەرچەند کافرەکەتان بەلاوە جوان و خاوەن ماڵ و حەسەب و نەسەب بێ. کافرەکان خەڵك بانگ ئەکەن بۆ کارو کردەوەی بەد کە بنیادەم ئەخاتە ئاگری دۆزەخ. خودایش بانگی خەڵك ئەکات بۆ کردەوەو بیروباوەڕی چاك و ڕەزامەندیی خۆی کە بنیادەم دەباتە بەهەشت و ژیانی بەختیاریی ئەبەدی. خودا ئایەتەکان و حەرام و حەڵاڵ بۆ خەڵك روون ئەکاتەوە بەلکو بیربکەنەوەو ڕێگای ڕاست بگرن. (٢٢٢) پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی حوکمی حەیزو ژن و تێکەڵییان لەگەڵیان. تۆیش وەڵامیان بدەرەوە کەوا حەیز شتێکە بنیادەم ترێزی لێ ئەکات و بە پیسی ئەزانێ. ئێوە لەکاتی حەیزدا جیماع لەگەڵ ژنەکانتان مەکەن و صەبر بکەن تا بەتەواوی پاك ئەبنەوە، کە پاك بوونەوە لەو ڕێگایەوە کە خودا بۆتانی حەڵاڵ کردووە، جیماعیان لەگەڵ بکەن. خودا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە زۆر تەوبە ئەکەن و لە گوناه پەشیمان ئەبنەوەو، ئەوانەی خۆش ئەوێ کە پاکن و لەکاتی حەیزدا جیماع ناکەن لەگەڵ ژنیان و لە ڕێگای حەڵاڵ و شەرعییەوە ئەچنە لایان. ئەهلی جاهیلییەت، کە ژنەکانیان دەکەوتنە حەیزەوە تێکەڵییان لەگەڵ نەئەکردن و نانیان لەگەڵ نەئەخواردن و لەگەڵیان دانەئەنیشتن، بۆیە بەم ئایەتە پیرۆزە خودای گەورە ڕوونی کردەوە کە چی لەکاتی حەیزدا حەرامەو چی حەڵاڵە. (٢٢٣) ئەی موسوڵمانینە! ژنەکانتان جێگەی کشتوکاڵی ئێوەن، جێگەی ناوس بوون و منداڵ بوونن بۆ ئێوە. بچنە لای ژنەکانتان لەو ڕێگایەوە کە دەبێتە هۆی منداڵ بوون، ئیتر کە ڕێگای کشتوکاڵتان گرت هەرچۆن بچنە لایان قەی ناکات! بە دانیشتنەوە یا لەسەر پشت. مەبەست و نیازی باش بخەنە پێش خۆتانەوە، واتە ناوی خودای لێ بێنن و دڵخوازتان نەوەی ڕەفتار باش بێ. لەخودا بترسن و ڕێگای ناشەرعی بەکار مەهێنن. دڵنیا بن ڕۆژی پاداش بە خودا ئەگەن. ئەی پێغەمبەر! موژدە بدە بە خاوەن ئیمانەکان کە لای خودا پاداشی باشیان هەیە.

(٢٢٤) ناوی خودا مەکەن بە جێگەی سوێندتان و بەو سوێنەتان ڕێگا لە کاری خێر مەگرن لە خۆتان، خوا ئەیەوێ خێر بکەن و ناوبەینی خەڵك چاك بکەن و لە خودا بترسن. خودا شنەواو زانایەو ئاگای لە هەموو شت هەیە.

لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُواْ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓاْ إِصْلَٰحًاۚ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِي عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمْسَاكُۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحُۢ بِإِحْسَٰنٍۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾



(٢٢٥) خودا سزاتان نادا لەسەر سوێنی بێ مەبەست کە بە دەمتانا دێت، بەڵام لەسەر سوێنێ کە لە دڵەوە دەربچێ و بشکێنرێ سزاتان ئەدات. خودا تاوانبەخش و خاوەن حیلمە.

(٢٢٦) بۆ ئەو کەسانەی سوێند ئەخۆن نەڕۆنە لای ژنەکانیان مۆڵەتی چوار مانگ هەیە کە نەڕۆنە لایان و لەو ماوەدا زۆریان لێ ناکرێ بچنە لای ژنەکانیان یا تەڵاقیان بدەن. ئەگەر پاش چوار مانگەکە گەڕانەوە بۆلایان، باشەو خودا تاوانبەخش و میهرەبانە لەبارەی دووریی چوار مانگەکەوە.

(٢٢٧) خۆ ئەگەر هەر عەزمیان لەسەر تەڵاق‌دانی ژنەکانیان بوو ئەوا با تەڵاقیان بدەن. خودا شنەوایەو بە هەموو شت ئەزانێ.

(٢٢٨) ئەو ژنانەی تەڵاق دراون ئەبێ پەلە نەکەن و خۆیان ڕاگرن و لەسەر حاڵی خۆیان ڕاوەستن تا ماوەی سێ حەیزی تەواو یا سێ(طهر) پاکی تەواو. ئەوسا ئەتوانن شوو بکەن. ئەگەر ئیمانیان بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت هەیە ئەبێ چی لە منالّدانیاندایە نەیشارنەوە، چ منالّ و چ حەیز. مێردەکانیان حەقدارترن لە بێگانە بۆ ئەوەی لەو ماوەی ڕاوەستانەدا، پێش تەواوبوونی عیددەکان بیانگێڕنەوە ژێر نیکاحی خۆیان ئەگەر ئەم گەڕاندنەوەیان بەنیازی چاکەو خێرو ڕێکەوتنی نێوانیان بێ، نەك بەنیازی زیانگەیاندن بە ژنەکە. ژنەکان هەر وەك واجباتیان لەسەرە ئەوەندەش حقووقیان هەیە. ئەبێ پیاوانە بۆیان جێبەجێ بکرێ وەك ژیانی ڕێك و ڕێزلێ‌گرتن و هەموو پێویستییەکانی ژیان. بەڵام پیاوەکان زیادەیان هەیە بەسەر ژنەکانیانەوە، بۆ نموونە ژنەکان بەبێ ئیزنی پیاوەکانیان نابێ لە ماڵ دەربچن، چونکە پیاوان سەرپەرشتی کاروباری ژنانیان ئەکەن. خودا بەدەستەڵاتەو فەرمانەکانی پڕحیکمەتن.

(٢٢٩) ئەو تەڵاقەی گەڕانەوەی ژن لە پاش ئەو دروست بێ هەر دوو جارە، ئیتر پاش ئەم دووجارە تەڵاقە یا ڕاگیرکردنی ژنەکەیە بەپێی یاسای ئیسلام کە بەدرێژی باس کراوە، یا تەڵاقدانی جاری سێیەمە.
جا ئێوە ئەی پیاوەکان! ڕەوا نی‌یە بۆتان ئەو شتانە لە ژنەکانتان بسێننەوە کە پێتان‌داون و کردووتانن بە موڵکیان، چ مارەیی و چ غەیری مارەیی، بۆتان نی‌یە لێیان بسێننەوە نە پێش تەڵاقدان و نە پاش تەڵاقدان، مەگەر ژن و پیاوەکە لەوە بترسن کە نەتوانن بەپێی ڕێوشوێنی ئایین پێکەوە بژین و بیانەوێ لە یەك جیا ببنەوەو، ژنەکە ڕەغبەتی ئەوەی هەبێ بە ماڵ دان بە پیاوەکە خۆی ڕزگار بکات و لێی جیاببێتەوە. بەڵێ ئا لەم حاڵەتەدا نە ژنەکە بە دانی ماڵەکە گوناهبار ئەبێ و نە پیاوەکەیش بە وەرگرتنی.

(٢٣٠) جا ئەگەر پاش دوو تەڵاقەکەی باسمان کرد پێکەوە نەیانکراو پیاوەکە ژنەکەی تەڵاق دا، ئەوە ئیتر ئەم ژنەی بۆ حەڵاڵ نی‌یەو ناتوانێ بیگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی تا ئەو ژنە تەڵاق دراوە شوو نەکا بە یەکێکی‌تر، کە شووی کرد بە یەکێکی‌ترو، پاشان ئەم مێردە دووهەمەی تەڵاقی‌دا، ئەوە هیچ گوناهبار نابن لەگەڵ مێردە پێشینەکەی بگەڕێنەوە بۆ یەك بە مارەبڕینێکی تازە، ئەگەر وایان ئەزانی سنووری فەرمانەکانی خودا ڕانەگرن و زیان بە یەکتری ناگەیێنن و بە پێی ئەمری خودا لەگەڵ یەکتر ئەجووڵێنەوە. خودا ئەم سنوورانە ڕوون ئەکاتەوە بۆ ئەوانەی تێئەگەن.

وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ
سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ۚ وَمَن يَفْعَلْ
ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًاۚ وَٱذْكُرُوا۟
نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ
يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾
وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ
أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ
مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُۗ وَٱللَّهُ
يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾ ۞ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ
حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ
وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَاۚ لَا تُضَآرَّ
وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَۗ
فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَاۗ وَإِنْ
أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ
ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾



(٢٣١) که ژنەکانتان تـەلاق داو گەیشتنە ئاخر موددەی خۆیان بە چاکە ڕایـان بگـرن ئەگـەر ویـستیان لاتـان بمێننـەوە، یـا بـە چاکەو ڕێکی و بێ زوڵم لێکردن بـەڕەڵایان بکەن. مامەڵەیان لەگەڵ مەکەن بە جـۆرێ کە خیلافی ئایینی ئیسلام بێ بۆ ئەوە کـە زیانیان پێ بگەیێنن بە بێمێردی، واتە نە وابکـەن بیانگێڕنـەوە لای خۆتـان بـە ڕەزامەندیو، نە بەڕەڵایان بکەن شووی تـر بکەن. هەرکـەس وەهـا بکـا زیـان بـەخۆی ئەگەیێنیو ستەم لە خۆی ئـەکات. ئایـەت و فەرمانـەکانی خـودا مەکـەن بـە جێـی گاڵتـە. یـادو باسـی نیعمەتـەکانی خـودا بکـەن لەسـەرتان کـە بـە پایـەی ئیسـلام گەیشـتوون. سوپاسـگوزاری خـودا بکـەن لەسەر ئەو ئایەتانەی ناردوونیەتە خوار بـۆ سـەرتان و پەنـدو ئامۆژگاریتـان ئـەکات پێیـان. لـە خـودا بترسـن و بـزانن خـودا بەهەمووشت ئەزانێ.

(٢٣٢) کـاتێ ژن تـەلاق دراو عیـددەی تـەواو بـوو و مێـردە پێشـووەکەی ویسـتی جارێکی تر مارەی بکاتەوەو، هەردوو لا، ژن و پیاو، ڕازی بوون بەم دووبارە ڕێکەوتنە بـە چـاکەو لەسـەر ڕێوشـوێنی ئایین، ئێوە ئەی خاوەن ژنەکان ڕێگایان لێ مەگرن، با بگەڕێنەوە بۆ لای مێردە پێشووەکانیان، ئـەم ئامۆژگارییـە بـۆ کەسێکە باوەڕی بە ڕۆژی دوایی ببێ. پەیڕەویکردنی ئەم حوکمانەو بە گوێی ئـەمری خـودا کـردن پـاکترو چـاکترە بـۆ دنیاو قیامەتی ئێوە، خودا زانایە، ئێوە نازانن بەختیاری لە چیدایە.

(٢٣٣) ئەو ژنانەی تەلاق دراون دوو ساڵی تەواو شیر ئەدەن بە منداڵەکانیان بۆ یەکێ بییەوێ ماوەی شیرپێدان تـەواو بکات. لەسەر خاوەن منالەکەیشە بەپێی عادەت و نەریتی وەخت خۆراك و بەرگی ئەو ژنانـە بـدا، کەسـیش زیـاد لـە توانی خۆی هیچی لێ داوا ناکرێ. زیـان نـادرێ لـە هـیچ دایکـێ بـەهۆی منداڵەکەیـەوە بـەو جـۆرە کـە منداڵەکـەی لێبسێنرێتەوە. هەروەها زیانیش نادرێ لە باوکی منداڵەکە بەهۆی منداڵەکەیەوە بەوەی منداڵەکـەی لـە شیرەخۆریدا بدرێتـەوە بەسـەریدا. ئـەو حوکمـەی لەسـەر بـاوکی منداڵەکـە هەیـە لەسـەر میراتگرەکەیشـی هەیـەو پێویسـتە میراتگرەکەیشی نەفەقەو کرێی ژنە شیردەرەکە بدات. ئەگەریش باوك و دایکەکە، بـە ڕەزامەنـدی هـەردووکیان و بـێ ئەوەی زیان بە منداڵەکەیان بگات، ویستیان منداڵەکە لە شیر ببڕنەوە، ئەوە هیچ تاوانێکیان نایێتە سـەر. ئەگـەریش ویستتان دایەنی شیردەر بۆ منداڵـەکانتان بگـرن و، لـە لای دایکـەکانیان نـەمێنن ئـەوە گوناهبـار نـابن ئەگـەر ئـەو ئوجرەیە، کە بڕیارتان داوە بیدەن بە شیردەرەکان، بە ڕێکوپێکیو بە پێی ڕێوشوێنی ئایین پێیان بدەن. لە خودا بترسنو بزانن خودا سەختگیرەو ئاگای لە کارو کردەوەتانە چاك و خراپی.

وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٣٤﴾ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٣٥﴾ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾ وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ۚ وَأَن تَعْفُوٓا۟ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۚ وَلَا تَنسَوُا۟ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾



(٢٣٤) ئەو کەسانە کە ئەمرن و ژنانی خۆیان بەجیٚ ئەهیٚلن، لەسەر ژنەکانیان واجبە چوار مانگ و دە شەو خۆیان ڕاگرن، شوو نەکەن. جا کە گەیشتنە ئاخیری عیددەی خۆیان هیچ گوناهیٚ نایەتە سەرتان، ئەی موسولمانەکان، بەوەی کە ژنەکان بەپێی یاسای شەریعەت بیکەن وەك خوازبێنی لیٚ کردن و بە صەراحەت جواب دانەوەو خۆ ڕێکوپێك کردن لە سنوری شەریعەتدا، بەلاّم ئەگەر لە سنووری شەریعەت دەرچوون ئەوا ئێوە گوناهبار ئەبن ئەگەر مەنعیان نەکەن؛ چونکە ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە واجبە. خودایش ئاگای لەوەیە کە ئەیکەن.

(٢٣٥) گوناهتان ناگات ئەگەر بە (تعریص) خوازبێنی لەو ژنانە بکەن نەك بە عیبارەتی ئاشکرا، بەلکو بەجۆریٚ کە مەبەستەکە بگەیەنێت و ئاشکرایش نەبیٚ، بۆ نموونە پیٚی بلیٚ: ژنی وەك ئێوە باشەو لایقی پیاوی باشە. ئیتر بە مەیل و حەزکردن لە خوازتنیان لە دلەوە هیچ گوناهتان ناگات. خودا ئەزانیٚ ئێوە خۆتان پیٚ ڕاناگیریٚو باسیان ئەکەن، بەلاّم بە پەنامەکی بەلێنی نیکاح و موعاشەرەیان مەدەنیٚ، هەر تەنها قسەی باش و شەرعییان لەگەلٚ بکەن. هەروەها تا عیددەکەیان تەواو نەبیٚ عەزمی مارەکردنیان مەکەن. خودا ئەزانیٚ چی لە دلتانایە، کەواتە لیٚی بترسن چونکە ئاگای لە هەموو شتتانە. بەڕاستی خودا گوناهپۆش و میهرەبانە.

(٢٣٦) ئەگەر ژنتان هیٚناو، لەپێش ئەوەی بڕۆنە لایان و لە پێش ئەوەی مارەییان بۆ دابنێن تەلاّقتان دان گوناهبار نابن. بەلاّم لەسەرتان واجبە بۆ چارکردنی دلگرانیی ژنە تەلاّقدراوەکان، میقداریٚ مالیان بدەنیٚ، تا دلیان خۆش ببیٚ. ئیتر لەسەر داراو دەولەمەند بەپێی خۆیو لەسەر بیٚدەسەلاّت و نەدارا بەپێی خۆی. ئەمە حەقێکە واجبە لەسەر ئەوانەی پیاوچاکن و ڕەفتاریان موسولمانانەیە.

(٢٣٧) ئەگەریش پێش ئەوەی بڕۆنە لایان تەلاّقتان دان، بەلاّم مارەییتان بۆ دیاری کردبوون، ئەوە تەلاّقدراو نیوەی ئەو بڕیاردراوەی ئەکەویٚو پێویستە بیاندەنیٚ، مەگەر ژنەکان چاوپۆشی لە مێردەکانیان بکەن و ئەو نیوە مارەییەی خۆیان ئەویٚو هیچ وەرنەگرن، یا ئەوانەی عەقدی نیکاحیان بەدەستە کە پیاوەکانن چاوپۆشی بکەن و هەموو مارەیی تەلاّقدراوەکە بدەن، واتە واز لە نیوەکەی خۆیان بێنن. بیٚگومان چاوپۆشی لەلایەن مێردەکانەوەو دانی هەموو مارەییەکە بە ژنە تەلاّق دراوەکە نزیکترە لە ترس لە خوداوە. هەروەها پایەی شەرافەت و فەزلتان لەبیرنەچێتەوە. خودا چاوی لێتانەو ئاگای لە هەموو کردەوەتانە.

حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ
قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ
فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ
﴿٢٣٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً
لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ
فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِى مَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ مِن
مَّعْرُوفٍ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ
بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ
ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ
إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ
فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحْيَٰهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى
ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾
وَقَٰتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾
مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا
كَثِيرَةً وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾



(٢٣٨) ئاگـاداری نوێـژەکانتان بـن لـە وەختـی خۆیانـاو لەسـەرەتای وەختـا بـە هـەموو شـەرت و ڕوکنەکانیانـەوەو بـە شـێوەیەکی ڕاسـت و ڕەوان جیٚبـەجێیان بکەن، بەتایبەتی نوێژی ناوەڕاست، واتـە: نوێژی عەسر کـە ئەکەوێتـە مابـەینی دوو نوێژی ڕۆژو دوو نوێژی شـەو. ڕاوەستن بـە عیبادەت کردنەوەو قسەی دنیایی مەکەن.

(٢٣٩) ئەگەر لـە کـاتی نوێـژەکانا ترسـی دوژمنتان بوو ئەوا بـە پیـادەو بـە سـواری هەرچۆن نوێژ بکەن بۆتـان دروسـتە. ئـەنجا کە ئەمین بوونەوەو ترسـتان نـەما، بـەپێی ئەو ئاداب و یاسـایە کـە لەلایـەن خـوداوە فێرکراون و ئەوسا نەتانئەزانین نوێژەکانتان جیٚبەجێ بکەن.

(٢٤٠) ئەو پیاوانەی ئەمرن و ژنیان لەدوا بەجیٚئـەمێنێ خـوای گـەورە بڕیـاری داوە ئەو ژنانە لە ماڵی خۆیاندا بژین تا ماوەی ساڵێك بێ دەرچوون لەو ماڵە. خۆ ئەگـەر ژنەکان خۆیان دەرچوون ئیتر تاوان لە سـەر ئێـوە نی‌یـە ئـەوان چـی لـە خۆیـان بکـەن بەپێی ڕێوشوێنی ئایین. شایانی باسـە ئـەم ئایەتە بە ئایەتی (والـذين يتوفـون مـنكم ويذرون ازواجا يتربصن بأنفسهن أربعة أشهر وعشرا..) نەسخ بووەتەوە. خودا غاڵبەو دەستەڵاتدارەو هەموو کارەکانی پڕ لە حیکمەتن.

(٢٤١) ژنە تەڵاق دراوەکان بێجگە لەوانەی وتمان حەقی موتعەیان هەیـە بـە یاسـای دیـن و لەسـەر لـە خواترسـەکان واجبە بە چاکی ئەم حەقە جیٚبەجێ بکەن.

(٢٤٢) خوا بەم جۆرە حوکمە ڕێوشوێنی تەڵاق و عیددەتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە تا لێی حاڵی بن و هۆشتان بەکاربێنن.

(٢٤٣) ئایا تەماشای ئەوانە ناکەن کە هەزاران کەس بوون لە ماڵی خۆیان دەرچوون و لە ترسی مردن بە تـاعوون یـا لە ترسی دوژمن ڕایان کرد! جا خـودا ئـەمری فـەرموو پێیـان کـە بمرن و ئـەوانیش مـردن. پـاش مردنەکـەیان خـودا زیندووی کردنەوەو حاڵی‌کردن و تێیگەیاندن کە کەس لە دەستی خودا دەرناچێ‌و سەرئەنجام هـەرلای ئـەوە. بێ‌گومـان خودا فەضل و ڕەحمەتی زۆرە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام ئەوان گەلێکیان سوپاسی خودا ناکەن و دان بە نیعمەتی خـودادا نانێن!

(٢٤٤) ئەی موسوڵمانان! لەپێناوی ڕەزای خودادا دژی کافران بجەنگن و ئـایینی ئیسـلام بـەرز بکەنـەوەو، زۆر بـاش بزانن خودا شنەواو زانایەو ئاگای لە هەموو کەس و لە هەموو شت هەیە.

(٢٤٥) کێیە ئەو کەسەی ماڵی خۆی بە قەرز بدا بە خودا، قەرزێکی وا جوان و بەجێ بێ، واتە تەنها بۆ ڕەزامەندیی خودا بێ، تا خودایش چەند قات و چەند قات جەزای بداتەوە؟ هەر خودایە ماڵ و ڕزق و ڕۆزی فراوان ئەکات و، هـەر خودایشە کەمی ئەکاتەوەو، هەموویشتان دوایی بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوەو حیساب و کیتابتان لای ئەو ئەبێ.

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلْمَلَإِ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰٓ إِذْ قَالُوا۟ لِنَبِىٍّ لَّهُمُ ٱبْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُوا۟ ۖ قَالُوا۟ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبْنَآئِنَا ۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ تَوَلَّوْا۟ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ ۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ ۖ وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٧﴾ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾



(٢٤٦) تەماشای ئەو کۆمەڵە ناکەن لە بەنی ئیسرائیلییەکانی پاش مووسا، کە بە پێغەمبەرێکی خۆیانیان وت: پادشاییێکمان بۆ بنێرە با لەژێر سەرکردایەتی ئەودا لەپێناوی ڕەزای خوداو بەرزکردنەوەی ئاییندا جەنگ بکەین. جا پێغەمبەرەکەیان پێیانی فەرموو: ئەگەر جەنگ فەرز کرا لەسەرتان خۆ لەوانە نییە پەشیمان بنەوە؟ ئەوانیش وتیان: چۆن پەشیمان ئەبینەوە؟ چۆن لەپێناوی ڕەزای خودا ناجەنگین لەکاتێکا کە ئێمە لە خانوو و بەرەو جێوڕێی خۆمان دەرکراوین و، لە ماڵ و سامان و منداڵمان دوور خراوینەتەوە؟ بەڵام کە لە لای خوداوە جەنگیان بەسەردا فەرز کرا، کەمێکیان نەبێ، هەموو پەشیمان بوونەوەو پشتیان لەو واجبە هەڵکردو فەرمانەکەی خودایان ڕەد کردەوە. خودا بە ستەمکاران ئەزانێو ئاگای لە گوفتارو ڕەفتاریانە.

(٢٤٧) جا پێغەمبەرەکەیان پێی فەرموون: ئەوا لەسەر داواکردنی خۆتان کە خوا پادشایەکتان بۆ بنێرێ، (تالووت)ی کردە پادشاتان و ئەو فەرمانڕەوا ئەبێ بەسەرتانەوە. وتیان چۆن تالووت دەکرێتە پادشاو گەورەو فەرمانڕەوامان؟ ئێمە لەو لایەقترو شایستەترین کە ببینە فەرمانڕەوا؛ ئەو سامان و دارایی نییە، پێغەمبەرەکە پێی فەرموون: خودا هەڵیبژاردوەو بۆ پادشایەتی پەسەندی کردووە، لە ئێوەی زیاتر زانست و هەیکەل داوەتێو لە ئێوەی چاکتر دروست کردووە. بێگومان خودا فەرمانداری بە کەسێ ئەدا کە خواستی خۆی لە سەری بێ، خودا زانیاری فراوانەو لە کارەکانیدا حیکمەتی زۆرە.

(٢٤٨) پێغەمبەرەکەیان پێی وتن: نیشانەی فەرمانڕەوایی تالووت ئەوەیە صندووقە داگیرکراوەکەتان بێتەوە دەستتان، کە بەهۆی ئەو صندووقەوە لەلایەن خوداوە ئارامیو دڵ دامەزراویتان دەست ئەکەوێ، هەروەها لەو صندووقەدا هەندێ پاشماوەی حەزرەتی مووساو هاروونی برای هەیە وەکو کتێبی تەورات و عەسای مووساو مێزەرو قاپووتی ئەوو هاروون و هەندێ شتی تر. فریشتەکانی خودا ئەو صندووقە هەڵئەگرن و بۆتانی ئەهێننەوە. بە ڕاستی لەم ڕووداوەدا دەلیلی ئاشکرا هەیە بۆ ئێوە لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرەکەتان و بڕیاری کردنی تالووت بە سەرکردەو فەرمانڕەواتان، ئەگەر ئێوە ئیماندارین.

فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم
بِنَهَرٖ فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ فَإِنَّهُۥ
مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦۚ فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا
مِّنۡهُمۡۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ قَالُواْ
لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ قَالَ ٱلَّذِينَ
يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ
غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾
وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ
عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ
ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ
دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ وَٱلۡحِكۡمَةَ
وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم
بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو
فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ
نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾



(٢٤٩) جا ئەو شتانە هاتنەجێو، تالووت بوو بە فەرمانڕەواو دامەزراو سوپای ڕێکخستن بۆ سەر عەمالیقە لە وڵاتی لوبنان. کە تالووت لەگەڵ سوپاکەی، بە ئیزنی (ئیشمەویل)ی ڕەهبەریان، لە شاری قودس دەرچوو وتی بە میری سوپاکەی: خودا تاقیتان ئەکاتەوە بە ئاوی ئەو ڕووبارە کە ڕوونە؛ هەر کەس لێی بخواتەوە لە ئێمە نی‌یەو هەرکەس لێی نەخواتەوە لە ئێمەیە، مەگەر یەکێ بەلالەوێچی دەستی ئاو هەلگرێ و دەمی پێ تەڕ بکا. جا هەموویان سەرپێچییان کردو لە ئاوی ڕووبارەکەیان خواردەوە، کۆمەلێکی کەمیان نەبێ، کە بە گوێیان کردو لێیان نەخواردەوە. ئەنجا کاتێ تالووت و موسولمانەکانی هاوڕێی لە ڕووبارەکە پەڕینەوەو، چاویان بە سوپای جالووت و، پادشای عەمالیقەکان کەوت، وتیان: ئێمە ئەمڕۆ چاری جالووت و سوپاکەی ناکەین، ئەوان زۆرن و ئێمە کەم. بەڵام ئەوانەی باوەڕیان وا بوو ئەگەنە حزووری خودا وتیان: ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ زۆر تاقمی کەم سەرئەکەون بەسەر تاقمی زۆردا. خودا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆگرن و یارمەتییان ئەدات.

(٢٥٠) کە چوونە مەیدانەوە بۆ جالووت و سوپاکەی پاڕانەوە لە خواو وتیان: خودایا صەبر بڕژێنە بەسەر دڵماندا‌و، پێمان لە جێی خۆیدا دامەزرێنەو ترس و دوودڵیمان لە دڵ دەرکەو زاڵمان بکەو بەسەر ئەو کۆمەڵە کافرە خودانەپەرستانەدا سەرمان بخە.

(٢٥١) ئیتر بە ئیزنی خوا سوپای جالووتیان شکاندو، داوود جالووتی کوشت و، خودای گەورە پاش ئەوە سەرەکیو گەورەییو زانیاری بەخشی بە داوودو کردی بە پێغەمبەر بۆ سەر بەنی‌ئیسرائیلی و، ئەوەی خودا خۆی ویستی پێی نیشان دا. بێگومان ئەگەر خودا هەندێ کەسی ستەمکار بە هەندێ کەسی‌تر چارنەکاو لەناوی نەبا سەرزەوی وێران ئەبێ. بەڵام خودا خاوەن فەزڵ و بەزەیی‌یە بەسەر هەموو عالەمدا.

(٢٥٢) ئەو ئایەتانە کە خوێندمانەوە بەسەرتا ئایەتی خودان کە بەڕاستی پێمان گەیاندوویو تۆ لەو پێغەمبەرانەی ڕەوانە کراون بۆ سەر خەڵك و بۆ تێگەیاندنیان.

۞ تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾





(٢٥٣) ئەو پێغەمبەرانە هەندێکیانمان بەرزکردوونەتەوە بەسەر هەندێکیاندا، هی وایان هەیە خودا ڕاستەوخۆو بە بێ واسیتە قسەی لەگەڵ کردوون وەکو مووسا. هەندێکیشیانمان بە چەند پایە بەرزکردوونەتەوە بەسەر هەندێکیاندا، وەك حەزرەتی موحەممەد (د.خ) کە بەسەر هەموو پێغەمبەرانی تردا بەرز کراوەتەوە بەوە کە کراوە بە پێغەمبەری هەموو ئوممەت و نەتەوەکان، هەروەها بەوە کە موعجیزەیەکی پێدراوە لەپاش خۆیشی پایەدارە، ئەویش قورئانی پیرۆزە. یەکێکی‌تر لە دەلیلی بەرزکردنەوەی ئەوەتە کە ئوممەتەکەی لە ئوممەتی هەموو پێغەمبەرانی‌تر چاکترە. چەند موعجیزەی دیاریشمان بە عیسای کوڕی مەریەم دا وەك ئەوەی کە هێشتا لە بێشکەدا بوو قسەی لەگەڵ خەڵك ئەکرد، یا وەك زیندووکردنەوەی مردوو و چاك کردنەوەی کوێری زگماك و بەڵەك. هەروەها جیبرەئیلمان کرد بە یارمەتیدەرو پشتیوانی کە بە هێزی قودسیی ئێمە یارمەتی ئەدا. دیارە ئەگەر خودا خواستی لەسەر نەبوایە ئوممەتەکان لەناو خۆیاندا جەنگیان نەئەکردو نەئەچوون بە گژی یەکترداو، لەپاش پێغەمبەرەکان و، پاش ئایەتە ئاشکراکان کە بۆیان هاتبوو، ئاژاوەو دووبەرەکی نەئەکەوتە مابەینیان. بەڵام ئەوەبوو جیاوازی کەوتە ناویان، هەندێکیان ئیمانیان هێناو ڕێگای ڕاستیان گرت و، هەندێکیشیان کافر بوونو، ڕێگای لاریان گرت. بەڵێ ئەگەر خودا بیویستایە جەنگ نەکەنو، ئیرادەی لەسەر نەبوایە، جەنگیان نەئەکرد. بەڵام خودا هەرچی ویست ئەیکا. (٢٥٤) ئەی خاوەن ئیمانەکان لەو ماڵ و سامانەی خودا پێی‌داون لە ڕێگای خوادا صەرف بکەن پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێت کە نە ماڵ فرۆشتن و مامەڵەی دنیاو، نە دۆستی و برادەریی دنیا سوودی هەیە، ئەو ڕۆژەی کە تکاو ڕجای تێدا نی‌یە بە ئیزنی خودا نەبێ، بەڵێ لەو ڕۆژەدا تەنیا کافرەکان بە ستەمکار دادەنرێن. (٢٥٥) (الله) زاتی(واجب الوجود)ی خاوەن کەماڵە. لە هەموو عەیب وکەم و کووڕییەك پاکە. لە صیفات و کردەوەیدا هیچ جۆرە کەم و کووڕییەك نی‌یە، کەس نی‌یە شایستەی پەرستن بێ و بەندەیی بۆ دروست بێ ئەو نەبێ؛ چونکە هەر ئەوە زیندوو بە زاتی خۆی و لەو زیندوویەتییەدا موحتاجی کەس نی‌یەو نابێ. ئەوە کە خۆی بە خۆیەوە ڕاوەستاوەو بەڕاستی خاوەنی بوونی خۆیەتی و ئەوە هۆی بوونی غەیری خۆیەتی؛ واتە هەموو مەوجوودێ ئەو دروستی کردووە. کەوابوو هەرئەو شایانی پەرستن و بەندەیی بۆ کردنەو کڕنووش هەر بۆ ئەو ئەبرێ. ئەو (الله)یە بە ئان بێ‌ئاگایی بەسەردا نایێ، وەنەوز نایگرێ و خەوی لێ‌ناکەوێ، هەرچی لە ئاسمان و زەویدا هەیە مولکی ئەوە، ئەو دروستی کردوون و بوون و نەبوون و مان و نەمانیان بە دەستی توانای ئەوە. ئەوەندە خاوەن پایەیە کێ بێ وکێ‌یە بتوانێ بە بێ‌ئیزنی ئەو تکا بۆ تاوانبارێ بکات؟ زاناو ئاگادارە لە هەرچی لە بەردەستی عالەمدا هەیەو هەرچی لەدوای ئەوان پەیدا ئەبێ. هیچ شتێ لەوەی ئەو ئەیزانێ کەس ناتوانێ بیزانێ پەی پێ بەرێ، شتێ نەبێ کە خۆی ڕێگای زانینی پێ بدات، واتە مەعلوماتی غەیری خوداو زانیارییان هی خۆیان نی‌یە؛ خودای گەورە پێی بەخشیون. کورسیی خودا گەورەو فراوانەو هەموو ئاسمان و زەوی ئەگرێ و، پاراستنی ئاسمان و زەوی خودا ماندوو ناکات. خودا بە پایە بەرزەو بە زات گەورەیە. (٢٥٦) زۆرکاری نی‌یە لە وەرگرتنی ئایینی ئیسلامدا، واتە قازانج و چاکیی ئەم دینە ئەوەندە دەرکەوتووە چ لەلایەن دینو چ لەلایەنی دنیاو خوورەوشت و کۆمەڵایەتییەوە، پێویست نی‌یە زۆر لە کەس بکرێ بۆ وەرگرتنی. ڕاستی و ناڕاستی‌و شارەزایی و گومڕاهی لەیەك جیا بوونەتەوەو قازانجی ئەوو زیانی ئەم دەرکەوتووەو هەموو شت ئاشکرا بووە. ئەوەی ئینکاری ڕێگەی شەیتان ئەکات و ئیمان بە خودا دێنێ ئەوە بەڕاستی دەستی گرتووە بە دەسووی ڕشتەیێکەوە پچڕانی نی‌یە. خودا عیلمی فراوانەو هەموو شت ئەزانێ و هەموو شت ئەبیسێ و لە هەموو لایێ ئاگادارە.

ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥٧﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِي بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ أَوْ كَٱلَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٖۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِاْئَةَ عَامٖ فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرْ إِلَى ٱلْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمٗاۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٥٩﴾



(٢٥٧) ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بە خوداو پێغەمبەری خوداو دوایان کەوتوون، خودا سەردارو کارهەڵسووڕێنیانە، لە تاریکیی خامی و نەفامی، تاریکیی چاوکوێری و نەزانی و، لە تاریکیی کوفرو ئارەزووپەرستی ڕزگاریان ئەکات و ئەیانخاتە ڕووناکیی فام و شعوورو زانیاریو خوداپەرستی. ئەوانەیش کە بێ ئیمانن و خوداو پێغەمبەرەکەی ناناسن سەردارو سەرکردەیان شەیتان و دەستەوبەستەکەینی، کە بەپێچەوانەی موسوڵمانەکان، لە ڕووناکیی فام و زانین و ئیمان و بیروهۆش دەریان ئەکەن و، تووشی تاریکیی نەزانی و نەفامیو بێئیمانیو بێئەقڵییان ئەکەن، ئەم کافرانە لایقی ئاگری دۆزەخو سزای پڕئازاری دوارۆژن و لە ئاگردا هەتا هەتایە ئەمێننەوە. شایانی باسە (تاغووت) بە مەعنای زاڵم و لە سنوورلادەرەو، لێرەدا مەبەست شەیتانە.

(٢٥٨) سەیری ئەو کەسە ناکەن کە لەگەڵ ئیبراهیم کەوتە موجادەلەو غەوغا دەربارەی خودا، چونکە خودا دەسەڵاتی پێ دابوو لە خۆی گۆڕابوو. ئیبراهیم پێی وت: خودای من ئەو زاتە بێ وێنەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا مردوو زیندوو ئەکاتەوەو لە دنیادا ئەیمرێنێ. ئەویش وتی: منیش مردوو زیندوو ئەکەمەوەو زیندوویش ئەمرێنم؛ واتە: مەحکووم بە ئیعدام عەفو ئەکەم و لە مردن ڕزگاری ئەبێ، هەروەها زیندوو ئەکوژم! ئەنجا ئیبراهیم وتی: خودای من خۆر لە ڕۆژهەڵاتەوە ئەهێنێ، تۆ ئەگەر ئازای لە خۆرنشینەوە بیهێنە. کابرای کافری چەنەباز مات بوو و دەمی بوو بە تەڵەی تەقیوو هیچ پێ نەکرا. خودای بەخشندە کۆمەڵی ستەمکار هیدایەت نادات.

(٢٥٩) ئەی سەیری عوزەیر ناکەی کە بەلای قودسدا ڕابوورد، هەموو خانووەکانی تەپیبوون و هیچی بەسەر هیچەوە نەمابوو، عوزەیر سەری سووڕماو وتی: خودا چۆن ئەم کاولە وێرانە زیندوو ئەکاتەوە؟ هەر لەوێدا خودا بۆ ماوەی صەد ساڵ عوزەیری مراندو، پاش ئەوە زیندووی کردەوەو لێی پرسی: چەند بەو حاڵە مایتەوە، واتە: بە مردوویی؟ وتی: ڕۆژێ یا نیوەڕۆژێ. خودا فەرمووی: نەخەیر صەد ساڵە مردووی، لەگەڵ ئەوەش سەیری خواردەمەنی و ئاوەکەت بکە هیچ نەگۆڕاون، هەروەها سەیری گوێدرێژەکەت بکە چۆن بووە بە ئێسك و پرووسك و مردووە، یا سەیری بکە چۆن ئەم ماوە دوورودرێژە نەمردووە. ئەمانەوێ بتکەینە عەلامەت و نیشانەی دەسەڵاتمان و بە خەڵکی نیشان بدەین چۆن مردوو زیندوونەکەینەوەو، چۆن وێرانە ئاوەدان دەکەینەوە؟ سەیری ئێسقانەکان بکە، ئێسقانی گوێدرێژەکەی یا هی مردوویتر، چۆن گیانیان بەبەردا دەکەین و هەندێکیان ئەخەینە سەر هەندێکیان و پاشان گۆشتیان ئەکەینەوە بەبەردا؟ کە عوزەیر(د.خ) ئەم ڕاستییەو ئەم دەسەڵات و توانی خودایەی بۆ دەرکەوت وتی: وا بە یەقین زانیم خودا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەڕواو ئەتوانێ هەر شتێ بیەوێ، بیکات.

وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّائَةُ حَبَّةٍ ۗ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَا أَنفَقُوا مَنًّا وَلَا أَذًى ۙ لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ ۞ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَا أَذًى ۗ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالْأَذَىٰ كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاءَ النَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۖ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا ۖ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٢٦٤﴾



(٢٦٠) ئەوە بێنە یادت کە وەختێ ئیبراهیم وتی: خودایە پیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو ئەکەیتەوە؟ خوداش پێی فەرموو: ئەی تا ئیستە ئیمانت نەهێناوە؟ ئیبراهیم عەرزی خودای کرد: بەڵێ ئیمانم بووەو، هەیە، بەڵام حەز ئەکەم دڵنیابم و دڵم ئاو بخواتەوەو ئارام بگرێ. خودا فەرمووی: دە چوار دانە پەلەوەر بهێنەو ڕایان بکێشە بۆ لای خۆت و سەریان ببڕەو، لەسەر هەر شاخێك هەندێ لەوانە دانێ، ئەنجا بانگیان بکە بۆ لای خۆت، بە ڕاکردن دێن بۆ لات، هەروەها باش بزانە خوا بەسەر کردەوەی خۆیا زاڵەو ئەتوانێ هەموو شت دروست بکات و، هەموو کارەکانی پڕ حیکمەتن.

(٢٦١) ئەوانەی ماڵی خۆیان لەپێناوی ڕەزامەندیی خودادا صەرف ئەکەن وەکو یەکێکن دەنکە تۆوێ بوەشێنێ و تۆوەکە سەوز ببێ و حەوت گوڵی لێ ببێ و هەر گوڵێکی صەد دانەی تێدابێ. خودا بۆ ئەو کەسەی بیەوێ مایەی خێرو چاکەی چەند قات زیاد ئەکات. خودا ڕەحمەتو بەزەیی فراوانەو بە هەموو شت ئەزانێ.

(٢٦٢) ئەوانەی ماڵی خۆیان لە پێناوی ڕەزامەندی خودادا صەرف ئەکەن و دوای صەرف کردنەکە منەت ناخەنە سەر ئەو هەژارانەی یارمەتییان داون و ئازاری دڵیان نادەن، ئەوانە پاداشی باشیان لەلایەن خوداوە ئەدرێتێ و، لە قیامەتدا ناترسن لە مەئمووری سزاو، دڵگران نابن.

(٢٦٣) قسەیەکی باش‌و شیرین و، چاوپۆشییەك لە تاوان و کەموکوڕیی خەڵك، چاکترە لە صەدەقەو بەخشینێ کە ئازاری دڵ و منەتی لەگەڵ بێ، خودا دەوڵەمەندەو موحتاجی یارمەتی و ماڵ نی‌یەو بەحیلم و لێ بووردووە.

(٢٦٤) ئەی خاوەن ئیمانەکان! خێرو چاکەی خۆتان بە منەت دانان لەسەر داماوەکان و بە ئازاردانیان بەتاڵ مەکەنەوە وەکو یەکێ ماڵی خۆی بە داماوان بدات لەبەر ڕیاو بەرچاوێنێ و، کەچی باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەبێ، ئەوە حاڵی وەکو حاڵی بەردێکی سافە کە خۆڵی لەسەر بێ و بارانێکی گەورەی دڵۆپ زل بدا بەسەریاو بە ڕەق و ڕووتی بەجێی بێلێ و خۆڵەکەی لەگەڵ خۆی بەرێت. ئەم ڕیابازە بێ‌ئایینانە ناتوانن کەم و زۆر بڕێتیی ئەو چاکەیان لە خودا وەربگرنەوە. بێ‌گومان خودا هیدایەتی قەومی کافر نادات.

وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٢٦٧﴾ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦٨﴾ يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٦٩﴾



(٢٦٥) ئەوانـەیش کـە مـاڵی خۆیـان لەپێناوی دەسکەوتنی ڕەزامەندیی خوادا صەرف ئەکەن و هەندێ لە نەفسی خۆیان لەسەر ئیمـان دائەمـەزرێنن، کارەکـەیان وەك باخێك وایە لەسەر شـوێنێکی بـەرز بـێو بـارانێکی دڵـۆپ گـەورە بەسـەریا بباریٚ و ئەو باخە دووقات بەر بدات، یـا ئەگـەر بـارانی قـەترە گـەورە گـەورەیش بەسەریا نەباریٚ، لەبەر باشـی و بـەپیتیی شـوێنەکەی تـەنها شـەونم لێیبـداو پێـی بگەیێنیٚ. خودای گـەورە بـە کردەوەتـان ئـەزانیٚ و بینایـەو هیچـی لـیٚ ون نـابیٚ. (شـایانی باسـە بەخشـینی مـاڵی دنیـا لـەڕێی خـوادا دامەزرانـدنی هەنـدێك لـە نەفسە لەسەر ئیمان، بەڵام بـەختکردنـی ماڵ وگیان لەپێناوی خوادا دامەزرانـدنی هەمووی نەفسە لەسەر ئیمان).

(٢٦٦) ئایا کـەس هەیـە لـە ئێـوە حـەز لـەوە بکـا بـاخێکی دارخورمـاو مێـوی هەبیٚ و لەبەینی ئەو دارانەدا جۆگا هەبیٚ و باخەکە هەموو جۆرە بەرێکی تێدا بـیٚ و، کـابرا پـیرو بـیٚهێز بـبیٚ و چـەند منداڵێکی وردەڵەی هـەبیٚ تـوانی ئیش و کارو نان پەیداکردنیان نەبیٚ، کەچی لـەپڕ گێژەڵووکەیـەکی ئـاگرینی بـەهێزی تـیٚ بەربیٚ و هەمووی بسووتیٚ؟ ئاوەها خـودا ئایەتەکانیتان بۆ بەیان ئەکات بەڵکو بـیر بکەنەوە لـە چـاکەو خراپـەو ڕێـی ڕاسـت گرتن. ئەم نموونەیە کە خوای گەورە باسی فەرمووە بۆ ئەوانەیە کردەوەی چاك ئەکەن و خێرو صەدەقە ئەکـەن و کـاری وای تێکەڵ ئەکەن وەك ڕیاو ئەزیەتی دڵ دان کە پاداشەکەیان بفەوتێنیٚ و هیچیان لیٚ دەست نەکـەویٚ و لـە قیامەتـدا کە پێویستییان بە پاداشە، دەستیان لە هەمانەی خاڵییەوە دەرچیٚ و ناهومێد بن.

(٢٦٧) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە بە خوداو بـە پێغەمبـەری خـودا! لـەو شـتە جـوان و مەقبووڵانـەی لـە کاسـبیدا دەستتان ئەکەون و، لەو شتە جوان و مەقبووڵانـەی کـە ئێمـە لـە زەوی بۆمـان دەرهێنـاون، خێـر بکـەن و لـەپێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوادا یارمەتی و دەستگرۆیی داماوان و هەژارانی پیٚ بکەن. مەچن بەلای ماڵە ناشـیرینە بیٚکەلکەکانتانا بۆئەوەی بە هەژارانی بدەن و پیاوەتیی لەسەر بکەن، کەچی خۆتان بێزتان نەییٚ ئەو جۆرە ماڵە لەباتی حەقی خۆتان وەربگرن، مەگەر چاوپۆشی لیٚ بکەن و لەبەر هەندیٚ هۆ وەریبگرن. بزانن خودا دەوڵەمەندەو موحتـاجی ماڵ و دارایی ئێوە نییەو، بۆ خۆتان چاکە لە شتی بـاش و بـەنرخ بـە موسـتەحەققان بـدەن، هـەروەها خـودا حەمـدو سوپاس ئەکریٚ، چ لەسەر قبووڵ کردنی کاری خێری ئێوەو، چ لەسەر پاداش دانەوەتان. (٢٦٨) شـەیتان ئەتانترسـێنیٚ بە هەژاری ئەگەر ماڵتان لەڕێگەی خـوادا صـەرف بکـەن و، ئـەمرتان پـیٚ ئـەکا کـە بـەخیل بـن و صـەدەقە نەکـەن. خودایش وەعدەی عەفوی قیامەت و دەوڵەمەندیی دنیاتان ئەداتیٚ. خودا نیعمەتی فراوانەو زانایەو ئاگای لەو کەسەیە کە ماڵی لە ڕێگەی ئەوا بەخت کردووەو، نایەڵیٚ فەقیرو هەژار بکەویٚ. شەیتان دوژمنتانەو ڕێگای گـەداییتان پیشـان ئەداو خوو و کردەوەی ناشیرینتان فێر ئەکات، بەگوێی مەکەن با لە خشتەتان نەباو ماڵ وێرانتان نەکات.

(٢٦٩) خودای عالەم زانایی‌و هێزو فام و توانای کردەوەی ڕێك و ڕاست ئەدات بـە هەرکەسـیٚ خواسـتی لەسـەر بـیٚ. بیٚگومان ئەوەی ئەو زانایی‌و ژیری‌و حیکمەتەی بدرێتیٚ ئەوە خێرێکی زۆری پیٚ دراوە. تەنها ئەو کەسانە بیردەکەنەوە لەم مەبەستە وردە بە سوودە بەرزانە کە خاوەنی هۆش و بیرێکی دامەزراو بن.

وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾ ۞ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾



(٢٧٠) ئەوەی لە دارایی خۆتان خەرجی بکەن و بیدەن بە موستەحەققان لە واجبات وەکو کەففارەتو زەکات، یا لە سوننەت وەکو خێراتو، ئەوەی نەزری بکەنو بیکەنە لازم لەسەرگەردنی خۆتان لە ڕێگای خودادا، ئەوە خودا پێی ئەزانێو پاداشتتان ئەداتەوە. بەلام ئەوانەی کە ستەمکارن و، پێویستییەکانی سەرشانیان جێبەجێ ناکەن، ئەوانە هیچ یارمەتیدەرو پشتیوانێکیان نییە.

(٢٧١) ئەگەر خێرو صەدەقەکانتان بەئاشکرا بکەنو بۆ ڕەزای خوداو بێ‌ڕیا بێ، ئەوە کارێکی زۆر باشە. ئەگەریش بە پەنامەکی بیکەنو خۆتانو خوداو خێرپێکراوەکە نەبێ کەس پێی نەزانێ، ئەوە سوودو پاداشی زۆرترە بۆتان لای خودای گەورەو، تاوانەکانتان دائەپۆشێو لە کۆڵتانیان ئەخات. خودا ئاگادارە لەو کردەوانەی ئێوە ئەیانکەن و هیچی لێ ون نابێ.

(٢٧٢) لەسەر تۆ واجب نییە خەڵك بکەیتە هیدایەت داروو؛ تۆ تەنها ڕێ پیشاندانت لەسەرە. خودا هیدایەتی ئەو کەسە ئەدا کە بیەوێ هیدایەتی بدات. هەرچی بە چاکە سەرف بکەن قازانجەکەی بۆ خۆتانە، ئەگەر تەنها لە ڕێی ڕەزامەندیی خوادا سەرفی بکەن. کەواتە منەت مەخەنە سەر خەڵك و لە ماڵە بەدە بێ‌نرخەکانتان سەرف مەکەن و لە ماڵە باشەکانتان سەرف بکەن. هەر خێرێ کە بیکەن و هەرچی بە فەقیرو هەژار بدەن لە ڕێی خوادا، پاداشتان ئەدرێتەوەو، هەرگیز ستەمتان لێ ناکرێ و حەقتان نافەوتێ.

(٢٧٣) ئەو خێرو صەدەقانەتان بەو هەژارانە بدەن کە ڕێیان لە ماڵ و حاڵ و دارایی خۆیان لێ گیراوە چونکە لە ڕێگای خوادا کۆچیان کردووەو ناتوانن بگەڕێن بە وڵاتا بۆ کاسبی، یا ئەوانەی کە جیهاد ئەکەن لە ڕێی خواداو لەپێناوی بەرزکردنەوەی ئایینی ئیسلامداو، ماوەی ئەوەیان نییە کەسابەت بکەن، یەکێ نەیانناسێ و ئاگاداری حاڵیان نەبێ بە دەوڵەمەندیان ئەزانێ؛ چونکە نەفسیان بەرزەو دەست لە خەڵك پان ناکەنەوەو موحتاجیی خۆیان دەرنابڕن، بەلام بە شێوەو حاڵیاندا دیارە کە بێ دەرامەت و هەژارن، بە لەکۆڵنەبوونەوەو یەخەبەرنەدانەوە داوای شت لە خەڵکی ناکەن. ئێوە هەرخێرێ بکەن و هەر ماڵێ لە ڕەزامەندیی خوادا سەرف بکەن خودا پێی ئەزانێ و پاداشتتان ئەداتەوە.

(٢٧٤) ئەوانەی لە پێناوی ڕەزامەندیی خوادا، شەوو ڕۆژ بە نهێنیو بە ئاشکرا ماڵی خۆیان سەرف ئەکەن، پاداشیان لای خودای خۆیان هەیەو لە ڕۆژی قیامەتدا ترسی سزایان نییەو خەفەت ناخۆن.

ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي
يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ
مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ
مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ
فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ يَمۡحَقُ
ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ
وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ
وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ
فَأۡذَنُواْ بِحَرۡبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَإِن تُبۡتُمۡ فَلَكُمۡ رُءُوسُ
أَمۡوَٰلِكُمۡ لَا تَظۡلِمُونَ وَلَا تُظۡلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ
ذُو عُسۡرَةٖ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيۡسَرَةٖۚ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ
إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى
ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٨١﴾



(٢٧٥) ئەوانەی سوود ئەخۆن هەر وەك ئەوانە ڕاست ئەبنەوە لە قەبر کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبن و شێتی کردبن، ڕائەوەستن و ئەکەون و خۆیان پێ ڕاناگیرێ، ئەمەیش پاداشی ئەوەیە کە لە دنیادا ئەیانوت: موعامەلەی بێسوود وەك موعامەلەی سووددارەو فەرقیان نییەو، هەردووکیان حەلاڵن، کەچی خودای گەورە فرۆشتنی شەرعی و بێسوودی حەلاڵ کردووەو سوودو ڕیبای حەرام کردوە. جا هەرکەس لای خوداوە ئامۆژگاریی بۆ هاتو حەرامیی پێ ڕاگەیێنراو لە سوودخواردن وازی هێناو دەس بەرداربوو، ئەوا ئەو سوودەی کە لە زەمانی جاهیلی و نەزانیدا، پێش ئەوەی حەرام بکرێ، وەریگرتوەو خواردوویەتی، خودا عەفوی ئەکات و ئەنجامی کاری و پاداشی وازهێنانی لای خودایە. بەلام هەرکەس بگەڕێتەوە بۆ سوودخواردن ئەوانە هاوڕێی ئاگرن و هەتا هەتایە تیایا ئەمێننەوە.

(٢٧٦) خودا دەستکەوتی ڕیبا بەرباد ئەکات و، صەدەقەو خێر ئەکات بە هۆی زیادبوونی بەهرەو بەرەکەت. بێگومان خودا هیچ کافرێکی تاوانبار و ستەمکاری خۆش ناوێ.

(٢٧٧) ئەوانەی ئیمانیان بە خودا هێناوەو، کردەوەی باش ئەکەن و، نوێژەکانیان بە چاکی و ڕێکوپێکی بەجێدێنن و، زەکاتی ماڵیان ئەدەن بە داماوان، ئەوانە پاداشیان لای خودا هەیەو، لەڕۆژی قیامەتدا ترسیان نابێ لە سزاو، دلگران نابن و خەفەت ناخۆن..

(٢٧٨) ئەی ئەوانەی ئیمانتان بە خودا هێناوە! ئەگەر بەڕاستی ئیمانتان بەخودا هێناوە لە خودا بترسن و دەسبەرداری ئەو سوودە بن کە بە حیسابی خۆتان ماوتانە لەسەر کابرای مامەڵە لەگەڵ کراوو شەرتتان کردوە لەگەڵیا.

(٢٧٩) جا ئەگەر وا ناکەن و وازناهێنن، ئەوا بانگەوازی جەنگ بدەن لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خودادا. خۆ ئەگەر تەوبەتان کردو پەشیمان بوونەوە لەم سوودخواردنە ئەوا ڕاستە سەرمایەکەتان حەڵاڵتانەو وەریبگرنەوە، نە زوڵم لە خەڵك بکەن بەوەی زیادەیان لێ وەربگرن و، نە زوڵمتان لێ بکرێ بەوەی قەرزەکانتان دوابخەن و سەرڕاستیتان لەگەڵ نەکەن.

(٢٨٠) ئەگەر قەرزارەکە لات بوو مۆڵەتی بدەن تا دارا ئەبێ و ئەتوانێ قەرزەکەی بداتەوە. هەڵمەکوتنە سەری و تەنگاوی مەکەن. خۆ ئەگەر بتانەوێ ئازادی بکەن و پێی ببەخشن ئەوە زۆر چاکترەو خێری زیاتر تیایە بۆتان ئەگەر بزانن.

(٢٨١) لەو ڕۆژە بترسن کە ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوداو پاشان هەموو نەفسێ پاداشی کاری خۆی وەرئەگرێ و تۆزقاڵێ ستەمیان لێ ناکرێ.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى
فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ
كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ
ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ
فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ
أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ
مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ
مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ
إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ
أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ
عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ إِلَّآ أَن تَكُونَ
تِجَٰرَةً حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ
أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ وَأَشۡهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ
وَلَا شَهِيدٞۚ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ وَٱتَّقُواْ
ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٨٢﴾



(٢٨٢) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بە خودا، کە قەرزتان دا بە یەکێ یا ماڵێکتان فرۆشت بە پارەیێ تا کاتێکی دیاری کراو، ئەو مامەڵەو قەرزە بنووسن تا لەبیرنەچێتەوەو کەس زیانی لێ نەکەوێ. با نووسەرێکی باش بە شێوەیێکی ڕاست و عادلانەو بێ و کەموزیاد بینووسێ. با ئەو نووسەرە خۆگری نەکات لەو نووسینە و، وەکو خودا فێری نووسینی کردوە با ئەویش خۆگری نەکات لە نووسین و لە یارمەتیدانی خەڵك. با ئەوکەسە کە حەقەکەی لەسەرە خۆی بە زمانی خۆی قسە بکا تا نووسەرەکە بینووسێت. با نووسەریش و کابرای حەق بەلاوەبوویش لە خودا بترسنو کەم و زیادی تیانەکەن تا زیان لە کەس نەکەوێ. جا ئەگەر ئەو کەسە حەقەکەی لەسەرە عەقڵی سووك بوو و قسەی جێی ئیعتبار نەبوو، یا بێهێز بوو و نەیئەتوانی بە ڕەسایی قسە بکات، یا هەر نەیئەتوانی قسە بکات، وەکو لاڵ، با ئەو کەسەی بەپێی شەریعەت سەرپەرشتی ئەکات، بۆ نموونە وەك باوکی، قسە بۆ بنووسەکە بکات تا بینووسێ. لەسەر ئەم بەیان و نووسینەیش دوو شاهید بگرن لە پیاوانی ڕاساڵ و دەمڕاست. ئەگەر دوو پیاو نەبوون با پیاوێك و دوو ژن ببنە شاهید لەوانەی کە ڕازی بن لێیان، تا ئەگەر یەکێ لەو دوو ژنە شایەتییەکەی لەبیرچوو و واقیعەکەی فەرامۆش کرد ئەویتریان بیخاتەوە بیری. با شاهیدەکان خۆگری نەکەن کە بانگ کران، چ بۆ بوون بە شاهید و چ بۆ شایەتیدان و بەیانی ڕاستی کردن. بێزار مەبن لەوەی بینووسن، ماددەکە بچووك بێ یا گەورە، مادام وادەی هەیە. ئەم نووسینە ڕاسترە لە لای خوداو، باشتر شایەتییەکە جێگیر ئەکات، هەروەها باشترە بۆ ئەوەی لە وەختی خۆیا نەکەونە گومانەوە. سا مەگەر مامەڵەکە دەست بەدەستییەکی بەرچاوی بێ کە لەناو خۆتانا ڕایبوێرن، ئەوە ئەگەر نەینووسن تاوانبار نابن. کاتێ کە مامەڵەتان کرد شاهید بگرن لەسەری. پێویستە زیان لە بنووس نەدرێ و زیاتر لەوەی پێنەکەن کە بۆی دیاری کراوەو حەقی نووسینەکەی بدەنێ، شاهیدیش نابێ زیانی پێبگەیێنرێ و ئەگەر مەسافەی هاتوچۆی زۆر بوو با مەسرەفی بۆ بکرێ. ئەگەر زیان لە بنووس و شاهیدەکان بدەن ئەوە ئەبێتە هۆی تاوانباریتان. لە خودا بترسن، خودا حوکمی ئایینتان بۆ ڕوون ئەکاتەوەو ڕێگای ڕاستتان پیشان ئەدات و، ئەوەی قازانجی هەبێ بۆتان فێرتان ئەکات. خودا زانایەو ئاگای لە هەموو شت هەیە.

۞ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا۟ كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ۖ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ ۗ وَلَا تَكْتُمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾ لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾



(٢٨٣) ئەگەر لەكاتی مامەڵەكەدا لە سەفەردا بوون و، بنووستان دەست نەكەوت، با لەبەینی ئێوەدا، لەباتی ئەو قەرزە كە بەسەر موقابیلەوەیە، ڕەهنێ ببێ و ماڵە ڕەهنكراوەكە وەربگرن. خۆ ئەگەر لەناو یەكدا متمانەتان بە یەكتر هەبوو و، خاوەن حەق داوای ڕەهنی نەكرد، با ئەو قەرزارە كە متمانەی پێ كراوەو بە ئەمین و سەرڕاست دانراوە، ئەو قەرزەی كە وەك ئەمانەت وایە لای لە وەختی خۆیدا بیداتەوە بە خاوەن حەق و، لە خودای خۆی بترسێ و ئینكاری نەكات. لە ناو خۆتاندا شایەتیی مەشارنەوە، هەركەس شەهادەت ون بكاتو بیشارێتەوە ئەوە دڵی تاوانبارە. خودا لە هەموو كردارێكی ئێوە ئاگادارەو هیچی لێ ون نابێ.

(٢٨٤) ئەوەی لە ئاسمانەكاندایەو ئەوەی لە زەویدایە هەمووی هی خودایە. هەر كارێكی نابار كە عەزمتان كردوە لەسەر كردنی، دەریببڕن و بیكەن یا هەر لە دڵتاندا بیشارنەوە، خودا موحاسەبەتان ئەكات لەسەری، دیارە تاوانی كراوەكە زیاترە لەوەی كە هەر لە دڵدا پەنهانە، جا خودا ئەوەی مەیلی لەسەر بێ گوناهی ئەپۆشێ و لێی خۆش ئەبێ، ئەوەیش مەیلی لەسەر بێ سزای بدا سزای ئەداو لێی خۆش نابێ. خودا توانایی بەسەر هەموو شتێكدا هەیەو شت نییە لە دەستەڵاتی ئەو بەدەر بێ.

(٢٨٥) پێغەمبەری خودا ئیمانی هێناوە بەوەی لە لایەنی خودای خۆیەوە بۆی نێرراوە. خاوەن ئیمانەكانیش هەموو ئیمانیان هێناوە بە خودای پەروەردگارو، بە فریشتەكانی و، بەو كتێبانەی كە بۆ پێغەمبەران نێرراون. بەدڵ باوەڕیان هەیەو بە زوبان ئیعتیراف و ئیقرار ئەكەن و ئەڵێن: ئێمە هیچ فەرق و جیاوازی ناكەین لە بەینی پێغەمبەرەكانی خودادا. هەروەها هەموو وتوویانە: ئێمە فەرمانی خودامان بیستووەو وەرمانگرتوەو ملكەچین بۆی و ئەڵێن: خودایا تاوانبەخشی هەر بۆ تۆیەو لە تۆی داوا ئەكەین و، لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ لای تۆ ئەگەڕێینەوەو سەرەنجامان هەرلای تۆیە.

(٢٨٦) خودا لە هەر نەفسێك هەر ئەوە داوا ئەكات كە لە توانیا هەیە. هەركەس هەر كارێكی چاك بكات قازانج و پاداشی چاكی بۆ خۆیەتیو هەر كارێكی خراپ بكات زیانو سزای خراپی هەر خۆی ئەگرێتەوە. خاوەن ئیمانەكان لە خودا ئەپاڕێنەوەو ئەڵێن: خودایا لێمان مەگرەو سزامان مەدە ئەگەر واجبێكمان لەبیرچوو یا هەڵەیێكمان كرد. خودایا! باری گران مەخەرە سەرشانمان وەك ئەو بارە گرانەی خستبووتە سەر شانی نەتەوەكانی پێش ئێمە. خودایا! بارێكمان مەدە بەسەردا توانمان بەسەریا نەشكێ، لە گوناهمان ببوورەو تاوانمان بپۆشەو بەزەییت پیاماندا بێتەوەو میهرەبانیمان لەگەڵ بفەرموو. تۆ پەروەردگارمانیو سەرپەرشتیمان ئەكەیت، زاڵمان بكە بەسەر كافرە بێدینەكاندا.

## سُورَةُ آلِ عِمۡرَانَ

مدنية ٣ — آياتها ٢٠٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴿٢﴾ نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبۡلُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلۡفُرۡقَانَۗ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخۡفَىٰ عَلَيۡهِ شَيۡءٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٥﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ كَيۡفَ يَشَآءُۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿٩﴾



## سووڕەتی (آلِ عِمۡرَان)

**مەدینەیی‌یەو (٢٠٠) ئایەتە**

(١) ڕەمزێکە لە بەینی خواو پێغەمبەری خوادا.

(٢) (الله) زاتێکە بوونی واجبەو نەبوونی مەحاڵـە، خـاوەنی صـیفاتی کەماڵـەو، لەهەموو خەوش و کەمییەك پاکـە. هـیچ کەس نی‌یە بەڕاستی عیبادەتی بـۆ بکـرێ ئەو نەبێ. زیندووەو دامـەزراوەو، جیهـان بەو ڕاگیر ئەبێ و دائەمەزرێ.

(٣) قورئـانی بـە پارچـە پارچـە نـاردووە بۆت بەڕاستی و بەڵگـەوەو، ئـەو قورئانـە باوەڕی هەیە بەو کتێبە خوداییيانە کە لە بەردەسـتیدان و بـە ڕاسـتیان دەزانـێ و، تەورات و ئینجیلیشی ناردووە.

(٤) بەرلـەوەی قورئـان بنێـرێ، بـۆ شارەزاکردن و ڕێپیشاندانی خەڵك هـەموو کتێبەکانی خۆی ناردووە بۆ ئەوەی حەق و ناحەق لە یەك جیابکەنەوە. بێ‌گومان ئەو کەسانەی ئیمانیـان نی‌یـە بـە ئایەتـەکانی خودا سزایەکی سەخت و ناباریان ئـەدرێت لـە ڕۆژی حیسـابدا. خـودای گـەورە بـە دەستەڵاتەو کەس نـاتوانێ دەسـت بێنێتـە ڕێگـای و بەتونـدی تۆڵـە ئەسـتێنێ لـە تاوانبار.

(٥) بێ‌گومان خودا نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا هیچی لێ ون نابێ و لە هەموو شت ئاگادارە.

(٦) ئەو خودایەکی گەورەو بەدەستەڵاتی وەهایە لەناو منداڵدانا لە سکی دایکدا وێنـەی ئێـوە ئەکێشـێ هەرچـۆن کـە مەیلی هەبێ و خواستی لەسەر بێ. هیچ کەس نی‌یە بەڕاستی بپەرسترێ و بەنـدەگی بـۆ بکـرێ ئـەو نـەبێ. خـودا بـە دەستەڵاتەو کارەکانی پڕ لە حیکمەتن.

(٧) خودایەکی وەهایە کتێبی ناردوەتە خوار بـۆ سـەر تـۆ. لـەو کتێبـەدا چـەند ئایـەتێك هـەن مـەعنایان زانـراوەو، ئیحتیمالی ئەم‌لاولای نی‌یە، ئەوانـە بناخـەی کتێبەکـەن. ئایـەتی وایشـی تیایـە چـەند مـەعنا هەڵئـەگرێ. جا ئـەو کەسانەی دڵیان کرمێ‌و نەخۆشە شوێنی ئەو ئایەتە موتەشابیهانە ئەکەون بە نیازی فیتنە بەرپاکردن و گومان خستنە ناو دڵی خەڵکەوە، ئیتر یا زاهیرەکەی ئەگرن یا بە ئارەزووی خۆیان مەعنای بۆ دائـەنێن، کـە مـەعناو تـەئویلی ئـەو جۆرە ئایەتانە نازانێ خودا نەبێ. خۆ ئەگەر زانینیان بۆ زانایانی لـە عیلمـا دەسـت ڕۆیشـتوویش بشـێ ئـەوا خودای گەورە نیعمەتی زانینەکە بەوانیش دەبەخشێ. هـەروەها ئـەو زانـا دامەزراوانـە ئـەڵێن: باوەڕمـان بـە قورئـان هەیـە، هەمووی لە لای خوداوە هاتووەتە خوار. تەنها ئەوانە بەوردی بیر ئەکەنەوە کە خاوەن هۆش و فامن و بەدوای ڕاستیدا ئەگەڕێن و دوای ئارەزووی نەفس ناکەون و ئاژاوەیان ناوێ.

(٨) لە خودای گەورە ئەپاڕێنەوەو ئەڵێن: خودایا! پاش ئەوەی کە شـارەزات کـردین و کەوتینـە سـەر ڕێگـای ڕاسـت، دڵمان لە حەق و ڕاستی لامەدەو ڕەحمەتی خۆتمان پێ ببەخشە، بێ‌گومان تۆ زۆر زۆر بەخشندەی.

(٩) ئەی پەروەردگاری ئێمە بێ‌گومان تۆ ئەم هەموو خەڵکە لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکەیتەوە بۆ حیسـاب و کیتـاب و پاداش و سزا. هاتنی ئەو ڕۆژە شتێکی بێ‌گومانە. بەڕاستی تۆ لە وەعدەی خۆت لانادەیت و بەجێی دێنێ.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَاۖ فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿١٣﴾ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿١٥﴾



(١٠) بێ‌گومان ئەوانەی کافرن سامان و دارایی‌و ئەولادیان ڕێگا لە هیچ زیانێ ناگرن کە لای خوداوە بۆیان بێ‌و ئەم شتانە کە لە دنیادا شانازییان پێوە ئەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا فریایان ناکەون. ئەو کافرانە سووتەمەنیی ئاگری دۆزەخن.

(١١) حاڵی ئەم کافرانەی ئەمڕۆ وەکو حاڵی کافرەکانی دەستەی فیرعەون و پێش ئەوانە، هەموو بێ باوەڕ بوون بە ئایەتەکانی ئێمە، بۆیە خودا بەهۆی تاوانەکانیانەوە غەزەبی لێ گرتن‌و سزای دان. بێ‌گومان خودا بەتوندی‌و سەختی تۆڵە ئەسێنێت.

(١٢) ئەی پێغەمبەر بڵێ بەوانەی کافرن: هەر لەم دنیایەدا بەم زوانە ئەبەزن و، لە قیامەتیشدا ئەدرێنەبەر بۆ دۆزەخ و سزای نالەبار ئەبینن. دۆزەخ قەرارگاهێکی ناخۆش و پڕ لە ئازارە!.

(١٣) بەڕاستی نیشانەی گەورەیی و دەسەڵاتی خواتان بۆ دەرکەوت لە دوو کۆمەڵدا کە یەکێکیان لەپێناوی ڕەزای خوداو سەرخستنی ئایینی ئیسلامدا ئەجەنگان و، ئەو کۆمەڵەکەی تر کافر بوون و دژی ئایینی ئیسلام شەڕیان بەخەڵك ئەفرۆشت و ئەجەنگان. موسوڵمانەکان بە چاوی خۆیان کافرەکانیان ئەبینی کە دوو ئەوەندەی ئەمانن، بەڵام خودا بە یارمەتیی خۆی ئەوەی مەیل و خواستی لەسەر بێ یارمەتی ئەدات، ئیتر کەم و زۆری لە بەردەم توانایی خودادا نانوێنێ. لەم سەرخستنەدا پەندو بەرچاو ڕوون کردنەوە هەیە بۆ ئەوانەی وریان و ڕاستی ئەبینن و کوێراییان دانەهاتووە. (شایانی باسە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەربارەی غەزای بەدری گەورەیە کە موسوڵمانەکان لەگەڵ کەمیشیاندا بەسەر کافرەکانی قورەیشدا سەرکەوتن و زۆریان لێ کوشتن و گەلێکیشیان لێ بەدیل گرتن).

(١٤) جوان کراوە لای بنیادەم حەز لە ئارەزووی نەفس کردن، وەك ژنی جوان و کچ و کوڕی زۆرو کۆمەڵە ئاڵتوون و زیوی یەك لەسەر یەك و زۆرو زەبەندە. هەروەها وەك ئەسپی نیشانەدارو دیاریکراوو وشترو مەڕو بزن و کشتوکاڵ. ئەمانە هەموو هۆی ڕابواردنی ژیانی دنیان و موسوڵمان و کافر تیایا شەریکن. ئەنجامی جوان و پاداشی جێگرو بەکەڵکیش لای خودایە.

(١٥) ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئایا خەبەرتان بدەمێ بە نیعمەتی چاکتر لەوانە کە باسمان کردن؟ بۆ ئەوانەی خۆیان لە گوناه ئەپارێزن و لە خودای خۆیان ئەترسن چەند باخێکی زۆر جوان و ڕازاوەی وەها هەیە کە چەند جۆگای پاك و خاوێن بە بەینیاندا ئەڕوا. ئەو لەخوداترسانە لەو باغ و لالەزارانەدا ئەمێننەوە هەتا هەتایە لەگەڵ ژنی پاك و خاوێن، بێجگە ئەوەی کە نیعمەتی هەرە گەورەی ڕەزامەندیی خوایا ن هەیە. خودا بینایەو ئاگای لە بەندەکانی خۆی و لە کرداریان هەیە.

ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ﴿١٧﴾ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٩﴾ فَإِنۡ حَآجُّوكَ فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٢٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَيَقۡتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡقِسۡطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾



(١٦) ئەوانـەی کـە ئـەڵێن: پـەروەردگارا! ئێمە بەڕاستی ئیمانمان هەیە بە تـۆو بـە پێغەمبەری تۆ. لە گوناهمـان خـۆش ببـەو لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

(١٧) ئەوانەی کە خۆگرن و ئەتوانن بەسەر نەفسی خۆیاندا زاڵ بـبن و گونـاه نەکـەن و لە بیروبـاوەڕو کـردارو گوفتـارا ڕاسـتگۆن. ئەوانەی کە عیبادەت ئەکەن و بەندەیی بۆ خـودا ئەکـەن و لـە ڕێگـای ڕەزای خـوادا مـاڵی خۆیـان صـەرف ئەکـەن و لـە بەرەبەیانـدا لـە خـودا ئەپاڕێنـەوەو تکـای ئەوەی لێ ئەکەن لە گوناهیان ببووری.

(١٨) خودا شەهادەت ئەدا کە هیچ کـەس نی‌یـە بەڕاسـتی عیبـادەت و بەنـدەگی بـۆ بکرێ خۆی نەبێ. فریشـتە خـاوەن زانسـتە وریاکـانیش ئـەم شـایەتییە ئـەدەن. خـودا دادپەروەرە لە حوکمیـداو لـە ڕۆژی دانیـدا بـە خـەڵك و، لـە هـەموو کردەوەیەکیـدا. بێ‌گومان شاهیدی ڕاستەقینە لـە هـەموو کارێـك و لـە هـەموو شـتێکدا خودایـە، جیهانی دروست کردوەو هـەر ئـەویش ئـەو دەلیلانەی دروست کردوە کـە دەلالـەت لـە بـوون و یەکیـەتیی خـودا ئەکـەن و هـەر ئـەویش تـەوفیقی زاناکـانی داوە کـە ئـەو دەلیلانە بزانن. خودا نی‌یـە ئـەو نـەبێ کـە دەستەڵاتدارەو خاوەن حیکمەتە.

(١٩) بێ‌گومـان ئـایین لای خـوا ئـایینی ئیسلامە کە خودابەیەك زانینەو پەیڕەوی کردنی ئەو شەریعەتەیە کە حەزرەتی محمد(د.خ) هێناویەتی. کیتابی‌یـەکان، گاورو جوولەکە، پاش ئەوەی ڕاستییان بۆ دەرکـەوت و لایـان ئاشـکرا بـوو کـە ئیسـلام حەقـە کەوتنـە ئاژاوەنانـەوەو دوژمنایـەتی لەگـەڵ دینـی ئیسـلام. ئەمانـە لـە کاروبـاری پێغەمبـەرە پێشووەکانیشـدا هـەروا دەسـتیان دابـووە جیاوازی‌نانـەوەو درۆو دەلەسـە لەگـەڵ ئـەوەیش کـە ڕاسـتییان بـۆ دەرکـەوتبوو. جوولەکـە ئـەیانوت (عـوزەیر)کـوڕی خودایەو، گاورەکانیش عیسایان بە کوڕی خودا دائەنا! ئەم کارانە زوڵم بوون لەلایـەن ئەوانـەوە. بێ‌گومـان هەرکـەس کافر بێ و ئیمان و باوەڕی بە ئایەتەکانی خودا نەبێ خودا بەتونـدی تۆڵـەی لێ ئەسـێنێتەوە. خـودا زۆر زوو حیسـاب لەگەڵ ستەمکاران ئەکات.

(٢٠) جا ئەگەر لە بابەتی دینەوە موجادەلەیان لەگەڵتا کرد تۆ پێیان بڵێ: من و ئەوانەی پەیڕەویم ئەکەن بە هـەموو ئیخلاصەوە خۆمان داوەتە دەستی خوداو تەنها ئەو ئەپەرستین کە تاك و بێ هـاوڕێو بـێ وێنەیـە. بڵـێ بەوانـەی کـە خاوەن کتێبن وەك جوولەکەو گاور، هەروەها بڵێ بەو ئومییانەی کە کتێبیان نی‌یە، وەك موشریکەکانی قورەیش: ئایـا ئێوەیش خۆتان تەسلیم کردوە بە خوداو ئایینی ئیسـلامتان قبـوڵ کـردوە؟ جانەگـەر موسـوڵمان بـوون ئـەوا ڕێگـای ڕاستیان گرتوە. خۆ ئەگەر بەگوێیان نەکردی و سەرپێچییان کردو ڕێی چەوتیان گرت ئـەوا تـۆ ئـەی پێغەمبـەر تـەنها ئەوەت لەسەرە خەبەریان بـدەیتێ و ڕێگـای ڕاسـتیان پیشـان بـدەیت خـودایش بینایـەو بەنـدەکانی خـۆی و کرداریـان ئەبینێ. (٢١) بێ‌گومان ئەو کەسانە کە ئینکـاری خـودا ئەکـەن و باوەڕیـان بـە ئایەتـەکانی خـودا نی‌یـەو بەناحـەق پێغەمبەران ئەکوژن، هەروەها ئەو کەسانەیش ئەکوژن کە ئەمر ئەکەن بە دادو ڕاستی، ئەوانە تۆ موژدەیان بدەرێ بە سزایەکی سەختی پڕ ئازار.

(٢٢) ئەو کەسانە ئەوانەن کە لە دنیادا کردەوەی چاکیان بەزایەچووەو لە قیامەتیشدا بێ سوودو پاداشن. ئـەم جـۆرە کەسانە هیچ یارمەتیدەریان نی‌یە لە سزای قیامەت ڕزگاریان بکات.

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۖ وَغَرَّهُمْ فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَٰهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۖ وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ۖ وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾



(٢٣) سەیری ئەوانە ناکەی بەشیان لە کتێبی ئاسمانی پێ دراوەو بەش بەحاڵی خۆیان شت ئەزانن؟ کەچی کە بانگ ئەکرێن بۆ لای قورئان یا تەورات تا حوکم بدەن لەبەینیانداو ئیسپاتی بکەن کە ئیبراهیم یەهوودی نەبووە، بەڵێ کە بانگ ئەکرێن بۆ ئەم مەبەستە هەندێکیان پشت هەڵئەکەن و ڕوو لە ڕاستی وەرئەچەرخێننو ڕازی نابن بەحوکمی ئەو کتێبانە.

(٢٤) ئەم حاڵی ئینکارو ڕوو وەرچەرخاندنەیان لەبەر ئەوەیە کە ئەڵێن ئێمە چەند ڕۆژێ نەبێ ئاگری دۆزەخ لە لەشمان ناکەوێ. ئەم مەغرووری و لەخۆباییبوونەیان لەبەر ئەو درۆو دەلەسەیە کە هەڵیانبەستوەو ئەڵێن: چەند ڕۆژێك نەبێ سزا نادرێین و، باوباپیرە پێغەمبەرەکانمان تکامان بۆ ئەکەن لای خودا، گوایا خودای گەورە وەعدی داوە بە یەعقووب کە نەوەی ئەو سزا نەدات !

(٢٥) ئەبێ حاڵی ئەم جۆرە بنیادەمانە چۆن بێ لەو ڕۆژەدا کە کۆیان ئەکەینەوە تیایا کە هاتنی ئەو ڕۆژە گومانی تیا نییەو ڕاستە کە ڕۆژی قیامەتەو هەر نەفسێ لە دنیادا پاداشی خۆی وەرئەگرێتو بێجگە حەقی ڕەوای خۆیان ستەمیان لێ ناکرێ؟

(٢٦) تۆ ئەی پێغەمبەری خودا بڵێ:
پەروەردگارا! خاوەن مولکی هەموو جیهان! بتەوێ مولك و دەستەڵات بە هەرکەس بدەیت ئەیدەیتێو بتەوێ لەهەرکەسی بسێنیتەوە لێی ئەسێنیتەوە، بتەوێ گەورەییو شان و شکۆ بەکەسێ بدەیت ئەیدەیتێو، بتەوێ هەرکەس سووكو ڕیسوا بکەی ئەیکەی. تۆ بەسەر هەموو شتێکا توانای و هیچ شتێ لەژێر دەستەڵاتت دەرناچێ.

(٢٧) خودایەکی بەدەستەڵاتی وەهایت شەووڕۆژ ئەدەیتە دەمی یەك و بەدوای یەکدا ئەیانهێنی. گیانلەبەر ئەمرێنیتو لە مادەکەی خۆی زیندووی ئەکەیتەوە، یا ئینسان لە نوتفە دروست ئەکەیت و لە ئینسانیش نوتفە، یا نەوەی موسوڵمان لە ئینسانی کافر دەخەیتەوەو، نەوەی کافر لە ئینسانی موسوڵمان. دیارە موسوڵمان وەك زیندووەو کافر وەك مردوو. ئەوەندەیش بەدەستەڵاتی بێجگە لەمانە هەرکەس بتەوێ ڕزقو ڕۆزیو سامانی بێشومارو فراوانی پێ ئەبەخشی.

(٢٨) نابێ موسوڵمانەکان، بەهۆی خوێشایەتی و دۆستایەتیی سەردەمی جاهلییەتەوە، کافرەکان بگرن بە دۆست و برادەری خۆیان لەباتیی موسوڵمان. ئەبێ دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی موسوڵمان بۆ خودا بێ. تەنها موسوڵمانەکان شایانی ئەوەن بکرێنە دۆست. هەرکەس شتی وەها بکات لەلایەن خوداوە پایەو نرخی نییەو دۆستایەتیی لای خودا نییە، مەگەر لە شەڕی ئەو کافرانە بترسن و دۆستایەتییەکە بۆ ئەوەبێ تووشی ئازار نەبن. لەم حاڵەدا دروستە دۆستایەتی پیشان بدەن. خودا لە عەزابی خۆی ئەتانترسێنێ. گەڕانەوەو سەرەنجامتان بۆ لای ئەوە، کەواتە ئاگاتان لە کردارتان بێ.

(٢٩) پێیان بڵێ ئەوەی لە دڵتانایە وەك دۆستایەتیی کافران، ئەگەر بیشارنەوە یا دەریبڕن خودا پێی دەزانێ. خودا هەرچی لە ئاسمان و ئەرزایە ئەیزانێ و ئاگای لێیەتی و دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا ئەشکێ و توانایە.

يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ
مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا وَيُحَذِّرُكُمُ
ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ
فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ
وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةًۢ بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ وَٱللَّهُ
سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ
مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا
وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ
وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ
وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ
حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا
زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا
قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾



(٣٠) لەو ڕۆژەدا کە هەر نەفسێ هەرچی چاکەی کردبێ و هەرچی خراپەی کردبێ لەبەردەمیا حازر کراوەو سزاو پاداشی دیاری کراوە ئاواتە خوازەو حەزئەکا لە بەینی ئەوو ترسی ئەو ڕۆژەدا ماوەیەکی دوور ببوایەو گورج نەهاتایە. خودا ئەتانترسێنێ لە سزای خۆی. خودا لەگەڵ بەندەکانی خۆیا میهرەبانە.

(٣١) ئەی موحەممەد! بە خەڵکی ڕابگەیێنەو پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خوداتان خۆش ئەوێ پەیڕەوی من بکەن تا خودا خۆشتانی بوێ و لە گوناهتان ببوورێ. خودا تاوانبەخش و میهرەبانە.

(٣٢) پێیان بڵێ: بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا بکەن و بەو ڕێگایەدا بڕۆن پێغەمبەر بۆی دیاری کردوون. جائەگەر سەرپێچییان کردو دوای ئامۆژگاریت نەکەوتن، ئەوا بێگومان خودا کافرانی خۆش ناوێ و لە ڕۆژی خۆیدا تۆڵەیان لێ ئەکاتەوە.

(٣٣) بێگومان خودا ئادەم و نووح و ئیبراهیم و ئالی عیمرانی هەڵبژاردووە بەسەر ئادەمیزادی چەرخی خۆیاندا. ئالی ئیبراهیم ئیسماعیل و ئیسحاق و نەوەکانیانن کە حەزرەتی موحەممەدیشیان بەرئەکەوێ. ئالی عیمرانیش یا مووساو هاروونی براینی یا عیساو مەریەمی دایکینی.

(٣٤) ئەمانە نەتەوەیێکن هەندێکیان لە هەندێکیانەوە بوون و لقوپۆپیان لێ بووەتەوە. خودا شنەواو زانایەو زانینەکەی فراوانەو هەمووشت ئەگرێتەوە.

(٣٥) یادی ئەوە بکەرەوەو باسی ئەوە بکە کە حەرەمی عیمران موناجاتی لەگەڵ خودادا کردو عەرزی کرد: خودایا! ئەوەی لە سکمایە نەزری تۆ بێ و تەرخان بێ بۆ خزمەتی (بیت المقدس). لێم قبووڵ بکە، تۆ شنەواو زانایت و هیچت لێ ون نابێ.

(٣٦) کاتێ کە حەرەمی عیمران سکەکەی داناو مناڵەی لێ بوو، وتی: خودایا منالەکەم کچە- خودا لەو باشتر ئەیزانی کە کچە-و دیاریشە نێرینە وەك مێینە نی‌یە. وا من ناوم نا مەریەم و خۆی و نەوەی ئەخەمە پەنای پارێزگاریی تۆ لە شەڕی شەیتانی دوور لە ڕەحمەتی خودا.

(٣٧) خودا لەباتی نێرینە قبووڵی کرد بە نەزرو جوان پێی گەیاندو بە پاکی و خاوێنی گەورەی کرد. کە گەیشتە تەمەنی تەمیز هێنایان بۆ (بیت المقدس). زەکەریا، کە لەو وەختەدا پێغەمبەر بوو و(بیت المقدس) ی بەدەستەوە بوو، سەرپەرشتی و چاودێریی مەریەمی گرتە ئەستۆو لە شوێنێکی ئەمیندا داینا. هەرکاتێ زەکەریا ئەڕۆیشتە ژوورەکەیو سەری لێ ئەدا سەیری ئەکرد ڕزق و میوەو خواردەمەنییەکی جوانی لا دانراوە. لە مەریەمی ئەپرسی: ئەمەت لەکوێ بوو؟ ئەویش وەڵامی ئەدایەوە ئەیوت: لەلایەن خوداوە بۆم دێت. بێگومان خودا هەرکەسی مەیلی لێ بێ ڕزقو ڕۆزیی بێ شوماری پێ‌ئەدات بێ‌ئەوەی ئەو کەسە بزانێ لە کوێوە بۆی ئامادە کراوە.

هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥۖ قَالَ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ
طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتۡهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٞ
يُصَلِّي فِي ٱلۡمِحۡرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحۡيَىٰ مُصَدِّقَۢا بِكَلِمَةٖ مِّنَ
ٱللَّهِ وَسَيِّدٗا وَحَصُورٗا وَنَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ
أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَقَدۡ بَلَغَنِيَ ٱلۡكِبَرُ وَٱمۡرَأَتِي عَاقِرٞۖ قَالَ
كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ
قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمۡزٗاۗ وَٱذۡكُر
رَّبَّكَ كَثِيرٗا وَسَبِّحۡ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٤١﴾ وَإِذۡ قَالَتِ
ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصۡطَفَىٰكِ
عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ وَٱسۡجُدِي
وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ
إِلَيۡكَۚ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يُلۡقُونَ أَقۡلَٰمَهُمۡ أَيُّهُمۡ يَكۡفُلُ
مَرۡيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ إِذۡ قَالَتِ
ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٖ مِّنۡهُ ٱسۡمُهُ ٱلۡمَسِيحُ
عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ وَجِيهٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾



(٣٨) جا كه زەكەرییا هەستی بەم كەرەمەی خودا كرد ڕووی كردە بارەگای خواو لێی پاڕایەوەو وتی: خودایا! بە بەخشندەیی و میهرەبانی خۆت نەوەیەكی پاك و پوختەم پێ ببەخشە. بێگومان تۆ ئاگات لە نزاو پاڕانەوەی بەندەتەو چاكی ئەبیسی.

(٣٩) پاش ئەو تكاو نزایە جبرەئیل بە ئەمری خودا بانگی لێ كرد، لەو كاتەدا لە میحرابدا نوێژی ئەكرد. موژدەی پێ داو وتی: خودای گەورە موژدەت ئەداتێ بە كوڕێكی ڕێكوپێك كە ناوی یەحیایەو باوەڕی بە كەلیمەی خودا هەیە، واتە عیسا، كە بە ئەمری خودا بە بێ باوك بووە. یەحیا ئینسانێكی پڕقەدرەو پارێزگارو خودا پەرستەو خۆی زۆر دوور ئەخاتەوە لە گوناه و یەكێكە لە پێغەمبەران و پیاوچاكان.

(٤٠) زەكەرییا وتی: خودایا! من چۆن ئەولادم ئەبێ؟ خۆم پیری تەنگی پێ هەڵچنیوم و ژنەكەیشم نەزۆكە! خودا وەڵامی دایەوە فەرمووی: بەڵێ ئەبێ. خودا مەیلی لە هەرچی بێ ئەیكات.

(٤١) زەكەرییا عەرزی خودای كرد: نیشانەیەكم بۆ دابنێ بەو نیشانەدا بزانم (ئیشاع) ی ژنم سكی هەیە. خودا فەرموی: نیشانەی سك بوونەكەی ئەوەیە كە تۆ لەوكاتەدا سێ ڕۆژ ناتوانی قسە لەگەڵ خەڵك بكەی بە ئیشارەو ڕەمز نەبێ، واتە یا بە سەر یا بە دەست و هاوچەشنی ئەمانە. لەو ڕۆژانەدا زیكری خودا زۆر بكەو بە ئێوارەو بەیانییان تەسبیحاتی بۆ بكە.

(٤٢) یادی ئەوە بكەرەوە كە چۆن فریشتە فەرمووی بە مەریەم: ئەی مەریەم بێگومان خودای گەورە تۆی هەڵاوێردوەو پاكی كردوویتەوە لە پیسی و لەناو ژنانی جیهاندا هەڵیبژاردووی بەسەر هەموویاناو پایەی تایبەتی پێ بەخشیوی.

(٤٣) خودا خستیە دڵی مەریەمەوە، یا زەكەرییا بەو صیفەتەی كە پێغەمبەر بووە پێی‌وتووە، یا جیبرەئیل لە كاتی دەركەوتنیا پێی وتوە: ئەی مەریەم عیبادەت بكە بۆ خودای خۆت و سوجدەی بۆ ببەو لەگەڵ ئەوانەدا كە ڕوكووع ئەبەن بۆ خودا ڕوكووع بەرە.

(٤٤) ئەمانەی پێم گەیاندی ئەی پێغەمبەر! دەنگوباسی عالەمی غەیبن و بە وەحی بۆمان ناردووی. ئەگەر ئاگادارمان نەكردیتایە نەتئەزانین. تۆ لای ئەوان نەبووی كە زەكەرییاو زاناكانی (بیت المقدس) قورعەیان ئەكرد تا بزانن سەرپەرشتی كردنی مەریەم (د.خ) بەر كامیان ئەكەوێ؟ لایان نەبووی كە لەسەر ئەو مەسەلە لەناو خۆیانا بوو بە دەمەقاڵەیان و لەسەر بەخێوكردنی مەریەم مونافەسەی یەكتریان ئەكرد.

(٤٥) یادی ئەوە بكەنەوە كە فریشتە وتی بە مەریەم: ئەی مەریەم خودا موژدەت پێ ئەدا كە كوڕێكت ئەبێ بە كەلیمەی خوداو بە ئەمری (كن فیكون) بێ‌باوك. ناوی نازناوی مەسیحەو ناوی ئەسڵیی عیسای كوڕی مەریەمە. لای خودا خاوەن پایەو شانە لە دنیاو لە قیامەتدا یەكێكە لەوانەی لە خوداوە نزیكن و پایەی تایبەتییان هەیە.

وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ الصَّالِحِينَ ﴿٤٦﴾
قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ
اللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ إِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾
وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾
وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ
أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ
فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ
وَأُحْيِي الْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ
فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾
وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم
بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ
فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ
هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ ۞ فَلَمَّا أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ
الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ
أَنصَارُ اللَّهِ آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾



(٤٦) له بێشکەداو به گەورەییش لەگەڵ خەڵك قسه ئەكات و باسی پێغەمبەریی خۆی ئەكاتو له پیاوچاكه كرداریاشەكانه.

(٤٧) مەریەم وتی: خودایا من چۆن منالّم ئەبێ كه هەرگیز بنیادەمێ دەستی لێ نەداوم و شووم نەكردوه؟! خودا فەرمووی: خودا وەهایە، هەرچی بوێ دروستی ئەكات. خودا كه خواستی لەسەر بوونی شتێك بوو هەر تەنها ئەوندەیه پێی ئەڵێ: ببەو ئەویش ئەبێت.

(٤٨) خودای گەوره كتێبی فێر ئەكات و هۆی زانیاری و هۆشیاری بۆ ئامادە ئەكات و تەورات و ئینجیلی فێر ئەكات. واته ئەی مەریەم دڵنیا بەو له خەڵك مەترسه كه پێت بڵێن بێ مێرد منالّت بووه.

(٤٩) ئەیكاته پێغەمبەرو ئەینێرێ بۆ بەنی ئیسرائیل و پێیان ئەڵێ: من هاتووم بۆ لای ئێوه به موعجیزەی گەورەوه كه لەلایەن خوداوه پێم دراوه. من له قوڕ شتێ دروست ئەكەم لەسەر شێوەی پەلەوەرو فووی پیا ئەكەم به ئیزنی خودا گورج ئەبێته پەلەوەری ڕاستەقینه. كوێری زگماك و بەڵەك چاك ئەكەمەوەو به ئیزنی خودا مردوو زیندوو ئەكەمەوەو پێتان ئەڵێم كه چی ئەخۆن و چی هەڵئەگرن له ماڵدا. بێگومان ئەم موعجیزانه دەلیلی گەورەن لەسەر توانایی خودا ئەگەر ئێوه خاوەن ئیمان بن.

(٥٠) من كه به پێغەمبەری نێرراوم بۆ لای ئێوه باوەڕم به تەورات هەیەو هەندێ شتتان بۆ حەڵاڵ ئەكەم كه له شەریعەتی مووسادا حەرام بوون لەسەرتان، وەك خواردنی بەزو ماسی و گۆشتی وشترو كاركردن لەڕۆژی شەممەدا. لای خوداوه ئایەتێكم بۆ هێناون كه بریتییه لەوەی (الله) خودای من و خودای ئێوەیشه، یاخۆ مەبەست له ئایەت موعجیزەیه، واته: موعجیزەم بۆ هێناون بۆ ئیسپاتی ڕاستیی قسەكانم. لەخودا بترسن و بەگوێم بكەن و وەرنه سەر ڕێگای ڕاست.

(٥١) بێگومان (الله) ی پاك و له خەوش بەری خودای من و خودای ئێوەیه، كەواته عیبادەتی بۆ بكەن و هەر ئەو بپەرستن. ئەمه ڕێگای ڕاستەو ئەتانگەیەنێته ئامانج و ئەنجامی چاك.

(٥٢) جا كاتێ كه عیسا تێگەیشت و هەستی كرد بەوەی ئەوانه كافرو بێئیمانن، ڕووی كرده قەومەكەیو وتی: كێ یارمەتیم ئەدا له ڕێگای خوداداو لەپێناوی ئایینی ڕاستدا؟ هاوڕێ ڕاستەكانی وتیان: ئێمه یارمەتیدەرتین بۆ ڕێگەی خوداو، باوەڕمان به خودای تاك و بێعەیب هەیه. تۆیش له ڕۆژی قیامەتدا لای خودا شایەتیمان بۆ بده كه موسوڵمانین و ئیمانمان پێی هەیه.

رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَأُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتۡلُوهُ عَلَيۡكَ مِنَ ٱلۡأٓيَٰتِ وَٱلذِّكۡرِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿٦٠﴾ فَمَنۡ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ فَقُلۡ تَعَالَوۡاْ نَدۡعُ أَبۡنَآءَنَا وَأَبۡنَآءَكُمۡ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمۡ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمۡ ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾



(٥٣) خودایا باوەڕمان بەو کتێبە هەیە کە ناردووتەو پەیڕەویی پێغەمبەرمان کرد کە عیسایە. کە واتە لە زومرەی ئەوانە بماننووسە کە شاهیدی وەحدانییەتی تۆن، یا لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانە کە شایەتیی ئەدەن بۆ پەیڕەوەکانیان لە ڕۆژی قیامەتدا.

(٥٤) ئەو جوولەکانەی عیسا هەستی بە کوفریانْ کرد دەستیان دایە فڕوفێڵ و یەکێکیان دیاری کرد عیسا بکوژێ. خودای گەورەیش بەرانبەری ئەوە سەری لێ تێکدانو شێوەی عیسای خستە سەر ئەو کابراو کابرا خۆی کوژراو عیسا بەرز کرایەوە بۆ ئەو پایەی کە خودا بۆی دانابوو. خودا زۆر توانایەو چاکترین تۆڵەسێن و بەدەسەڵاتە بۆئەوەی دەست بوەشێنێ و زیان بگەیێنێ.

(٥٥) یادی ئەوە بکە کە خودا فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم من ئەجەلی تۆ دوائەخەم بۆ وەختێکی دیاریکراوو لە کوشتنی ئەوان ئەتپارێزم، یا من لە زەوی وەرتئەگرم یا من بە خەوتوی بەرزت ئەکەمەوە، یا من لە ئارەزووی نەفس پاکت ئەکەمەوەو وات لێ ئەکەم شایانی ئەوە بی بەرز بیتەوە بۆ عالەمی مەلەکووت. من بەرزت ئەکەمەوە بۆ بارەگای کەرامەت و شوێنی مەلائیکەکانم. من پاکت ئەکەمەوە لە بەدیی دراوسێیەتیی کافران. من وا ئەکەم لە پەیڕەوانت و دەستەڵاتی وەهایان ئەدەمێ کە هەمیشەو تا قیامەت بەسەر کافراندا زاڵ و سەرکەوتوو بن. پاش ئەوە سەرەنجامتان، ئێوەیش و ئەوانیش، بۆ لای منەو لای من کۆئەبنەوەو، ئەو وەختە من حوکمی خۆم ئەدەم لەبەینتانا لەو شتانەدا کە ئیختیلافتان تیایانا هەبوو.

(٥٦) هەرچی ئەوانەن کە باوەڕیان بە خودا نییەو پەیڕەویی پێغەمبەران ناکەن، ئەوانە لە دنیاو قیامەتدا بەتوندی سزایان ئەدەم و کەس نییە یارمەتییان بدات و لە سزای من بیانپارێزێ.

(٥٧) ئەوانەیش کە ئیمانیان هەیەو کردەوەیان باشە خودا پاداشیان بەتەواوی ئەداتەوە. بێگومان خودای گەورە ستەمکارانی خۆش ناوێ. (٥٨) ئەمانە ئەخوێنینەوە بەسەرتا، لە ئایەتەکانی خودان و زیکری پڕ لە حیکمەتن.

(٥٩) لەدایکبوونی عیسا بە بێباوك، کە لای هەندێ کەس شتێکی سەیرە وەك چۆنیەتی دروستکردنی ئادەمە، ئەمی بە بێباوك و بە بێدایك لە خۆڵ دروستکردو پێی وت ببەو بوو. دیارە خودای گەورە بەدەستەڵاتە. ئیتر بۆ دروستکردنی عیساو لەدایکبوونی بێ باوکیتان لا سەیرە؟

(٦٠) ڕاست ئەوەیە کە لەلایەن خوداوە بۆت هاتووە. هیچ شوبهەو گومان مەکە. قسەکە لەگەڵ پێغەمبەرایە بۆئەوەی زیاتر دامەزراو بێ. مەبەس هەموو ئەوانەیە کە ئەم ڕاستییانە ئەبیسن.

(٦١) ئیتر پاش ئەو زانیاری و ئایەتانەی بۆت هاتووە هەرکەس موجادەلەت لەگەڵ بکا لە وەڵامدا پێیان بڵێ: وەرنە مەیدان. کوڕەکانمان و کوڕەکانتان و ژنەکانمان و ژنەکانتان و خۆمان و خۆتان بانگ بکەین و هەموومان کۆببینەوەو ڕووبکەینە خودا، هەردوو لامان لەعنەت لە درۆزن بکەین و بڵێین: نەفرین و بێ بەش بوون لە ڕەحمەتی خودا، لە درۆزن.

إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٧٠﴾



(٦٢) بێگومان ئەمەی بۆمان باس کردی قسەی ڕاستەو کەس نی‌یە عیبادەتی بەڕاستی بۆبکرێ زاتی خودای پاك و بێخەوش نەبێ. بێگومان خودا بەدەستەڵاتەو کارەکانی پڕحیکمەتن.

(٦٣) جا ئەگەر نەهاتن بۆ موباهەلەکەو ڕوویان لە بانگەکەت وەرچەرخاند، ئەوا گوێیان مەدەرێ. خودا بە بەدکاران و ئاژاوەگێران ئەزانێ و هیچی لێ ون نابێ و خۆی ئەزانێ چۆن تۆڵەیان لێ ئەسێنێ.

(٦٤) بڵێ: ئەی کیتابییەکان وەرن بۆ وەرگرتنی وتەیەك کە هەموو پێغەمبەران و هەموو کتێبە خوداییەکان یەك قسەن تییاو هیچ جیاوازییەکیان نی‌یە، ئەوەیش ئەوەیە کە عیبادەت بۆ کەس نەکەین بۆ (اللە) نەبێو هاوڕێی بۆ دانەنێین لە پەرستنداو بەتەنها ئەو بپەرستین و، هەندێکمان هەندێکی‌ترمان نەکەینە خوداو نەیانپەرستین، جا ئەگەر ڕوویان وەرچەرخاندو بەگوێیان نەکردی ئەوا پێیان بڵێن، دەی ئێوە شاهید بن کە ئێمە ئیمانمان بەم ڕاستییانە هەیەو ئێوە ئیمانتان پێیان نی‌یە.

(٦٥) ئەی ئەهلی کیتاب! بۆچی دەربارەی ئیبراهیم دەمەقاڵە ئەکەن، هەندێکتان بە جوولەکەی دائەنێن و هەندێکی‌ترتان بە گاوری حسێب ئەکەن؟ تەورات و ئینجیل پاش وەفاتی ئیبراهیم نازڵ بوون و ماوەی بەینی ئەم کتێبانەو ئیبراهیم زۆرە، بۆ عەقڵ و هۆشتان بەکارناهێنن کە بزانن چۆن ئیبراهیم ئەبێتە جوولەکە یا گاور؟!.

(٦٦) بەهەر حاڵ ئێوە موجادەلەتان کرد لە هەندێ شتدا کە لە تەورات و ئینجیلدا هەن و لەوانەیە بە ڕاست و بە درۆ شتێکی لێ بزانن. ئەی بۆ لە شتێکدا کە هیچی لێ نازانن موجادەلە ئەکەن وەك وەزعی حەزرەتی ئیبراهیم کە خودا خۆی ئەیزانێ و بە هەمووشت ئەزانێ و ئێوە نازانن؟.

(٦٧) ڕاستەکەی ئەوەیە ئیبراهیم نە جوولەکە بووەو نە گاور، بەڵکو ئینسانێك بووە لە ڕێگای گومڕاهی و بەتاڵ لای داوەو ڕێگای ڕاستی گرتوەو ملکەچی پەروەردگار بووەو لەوانە نەبوە هاوبەش بۆ خوا دانەنێن.

(٦٨) بێگومان نزیکترین کەس لە ئیبراهیمو دۆستترین کەس بۆی ئەوانەن لە ئومەتەکەی خۆی کە وەختی خۆی ئیمانیان پێ‌هێناوەو پەیڕەوییان کردوە، هەروەها ئەم پێغەمبەرەیە، واتە حەزرەتی موحەممەد، کە لە شتە بناغەییەکانی ئایینا موافیقیەتیو باوەڕی پێی هەیە، ئەوانەیش ئەمڕۆ موسوڵمان بوون و ئیمانیان بە خوداو پێغەمبەر هەیە لەوانەن کە زۆر لە ئیبراهیمەوە نزیکنو دۆستینی. خودا پشتی موسوڵمانان ئەگرێتو یارمەتییان ئەدات. (٦٩) هەندێك هەن لە ئەهلی کیتاب زۆر پێیان خۆش ئەبێ و زۆر حەز ئەکەن گومڕاتان بکەن و لە ئاینی ئیسلام وەرتانچەرخێنن. لە ڕاستیدا ئەمانە گەلۆری وەك خۆیان نەبێ ناتوانن کەس گومڕا بکەن و هەر هەوڵێکی گومڕاکردنیش بدەن گوناە و تاوانەکەی ئەستۆی خۆیان ئەگرێتەوەو گومڕایی و سزای خۆیان زیاد ئەکات.

(٧٠) ئەی کیتابیەکان بۆچی ئیمان بە ئایەتەکانی خودا ناهێنن و سەرپێچی ئەکەن لە پەیڕەویی موحەممەد کە خۆیشتان زۆر باش ئەزانن ئەم ئایەتانە ڕاستن و بە پێی ئەوەی لە تەورات و ئینجیلدا بەرچاوتان کەوتووە ئەم ئایینی ئیسلامە ڕاستەو حەققە ؟

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٧١﴾ وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٧٣﴾ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٥﴾ بَلَىٰ مَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٧٧﴾



(٧١) ئەی ئەهلی کیتاب بۆ رووکەشی بەتاڵ ئەکەن بە بەر حەقداو، ڕاست بە ناڕاست پیشان ئەدەن و ناڕاست ئەکەنە ڕاست لە بەرچاوی خەڵقدا؟ بۆ بەئاشکرا حەق و بەتاڵ لە یەك جیا ناکەنەوە؟ بۆ لەگەڵ خۆیشتان و لەگەڵ خەڵقیشدا ڕاست ناکەن؟ بۆ پێغەمبەرایەتی موحەممەد ئەشارنەوە کە خۆیشتان چاك ئەزانن حەق کامەیەو بەتاڵ کامەیە؟.

(٧٢) هەندێ لە ئەهلی کیتاب ئەڵێن بەڕۆژدا ئیمان بێنن بەو قورئانەی نێرراوە بۆ موسوڵمانەکان کە لەگەڵیان هەڵئەستێنو دائەنیشن و بە شەو کە لەناو خۆماندا کۆئەبینەوەو لەوان جیا ئەبینەوە ئیمانی پێ مەهێنن بەڵکو ئەو موسوڵمانانە کە ئەمەیان بیست لە دینەکەی خۆیان وەرگەڕێن و پەشیمان بنەوە، گوایا موسوڵمانەکان بڵێن: ئەهلی کیتابەکان لە ئێمە زاناترن، کە ئەوان هەڵگەڕابنەوە با ئێمەیش هەڵگەڕێینەوە!.

(٧٣) ئەهلی کیتاب لەناو خۆیاندا ئەڵێن: کەس بە ئیماندار مەزانن و باوەڕ بە کەس مەکەن بەوانە نەبێ دوای ئایینتان کەوتوون. جا تۆ پێیان بڵێ: بێگومان هیدایەت تەنها هیدایەتی خودایە. ئێوە کە لەناو خۆتاندا ئەو قسانە ئەکەن و ئەو پیلانانە ئەنێنەوە هەمووی لە حەسادەتەوەیەو پێتان ناخۆشە کەسیتر کتێب و ئایینی بۆ بنێررێ وەك ئەوەی بۆ ئێوە نێرراوە. داختان لێ دێ موجادەلەتان لەگەڵ بکەن لای خودا. ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: گەورەیی‌و کەرامەت بەدەستی خودایە ئەیدا بە هەرکەس خۆی مەیلی لێ بێ. خودا سیفەتەکانی فراوانن و بەهەموو شت زانایە. (٧٤) خودا مەیلی لە بەرزکردنەوەی هەرکەس بێ بەتایبەتی لەناو خەڵکدا هەڵیئەبژێرێ و ڕووی میهرەبانی و ڕەحمەتی خۆیی تێ ئەکات، خودا خاوەنی بەخشش و بەهرەی گەورەیە و، هەر ئەو ئەتوانێ بەڕاستی چاکە لەگەڵ خەڵك بکات.

(٧٥) کیتابیی وا هەیە ئەگەر صەدهەزار دیناریشی لا دابنێی بەئەمانەت بەئاسانی ئەیداتەوە دەستت و خیانەتی تیا ناکات. هی وایش هەیە جێگای بڕوا نی‌یە، تەنانەت ئەگەر دینارێکیشی لا دابنێی بۆت ناگەڕێنێتەوە مەگەر لەسەر سەری ڕاوەستی و وازی لێ نەهێنی تا لێی وەرئەگریتەوە! ئەم جۆرە کیتابییە دەست ناپاکانە ئەڵێن: هیچ گوناهبار نابین ئەگەر ماڵ و سامانی ئەوانە بخۆین کە لەخۆمان نین. درۆ بە دەم خواوە هەڵدەبەستن و خۆیشیان ئەزانن کە درۆ ئەکەن ، خواردن و داگیرکردنی ماڵی خەڵك ڕەوا نی‌یەو تاوانە.

(٧٦) نەخەیر، دین بە قسەی ڕووت نی‌یە. هەرکەس پەیمانی خودا بەجێبێنێ و لێی بترسێ ئەوە خودا خۆشی ئەوێ! چونکە خودا بنیادەمی لەخوداترس و لەگوناه پارێزگاری خۆش ئەوێ.

(٧٧) ئەوانەی وەختی خۆی پەیمانیان بە خودا دابوو کە ئیمان بە پێغەمبەر بێنن و یارمەتیی بدەن کەچی لەپاشاندا وەفایان بەو پەیمانە نەکردو بەرامبەر بە ماڵی بێ مایەی دنیا گۆڕییانەوەو پەیڕەویی پێغەمبەریان نەکرد، ئەوانە لە قیامەتدا بێ بەش ئەبن لە کەرەمی خودا، خودای گەورە لەو ڕۆژە پڕسامەدا قسەیان لەگەڵ ناکات و ناڕوانێ بۆیان و بەبێ گوناهیان دانانێ و مەدحیان ناکات و سەرباری ئەمانەیش سزای توند ئەدرێن.

وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّۦنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّۦنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّۦنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾



(٧٨) کیتابیی وا هەن خۆیان شتێ بە زمانی عیبری ئەنووسن دێن ئەیخوێننەوەو زوبانی خۆیان پێچ ئەدەن لە خوێندنەوەیدا، وەك تەورات بخوێننەوە! بۆ ئەوەی خەڵك گومان بەرن کە قسەی تەوراتە، کەچی قسەی خۆیانەو هی تەورات نی‌یە، ئەڵێن: ئەمە کە ئەیخوێنینەوە لای خوداوە هاتووە، کەچی لای خوداوە نەهاتووە، درۆ هەڵئەبەستن بە زمانی خوداوەو، خۆیشیان زۆر چاك ئەزانن کە لای خوداوە نی‌یەو خۆیان دایانناوە!.

(٧٩) ڕەوا نی‌یە بنیادەمێ خودا کتێب و ژیری و دەستەڵاتی بداتێ و بیکاتە پێغەمبەر، کەچی بە خەڵکی بڵێ: عیبادەتی من بکەن و هی خودا مەکەن و بەندەی من بن! بەڵکو ئەبێ پێیان بڵێ: ئەبێ پێوەندیتان بە خودای خۆتانەوە هەبێو ئەو بپەرستن، چونکە کتێب فێربوونو دەرستان بە خەڵك وتوەو، گەیشتوونەتە پایەیێ ڕابەریی خەڵك بکەن.

(٨٠) ئەوکەسەی خودا پایەی پێغەمبەرایەتی پێ ئەدات نابێ ئەمر بکا بە ئێوە کە فریشتەکان و پێغەمبەرەکان بپەرستن و بیانکەنە خودا. چۆن ئەمری واتان پێ ئەکات پاش ئەوەی ئایینی ئیسلامتان قبووڵ کردوە؟.

(٨١) یادی ئەوە بکەو باسی ئەوە بکە کە خودا لە کاتی خۆیدا پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرت و، ئەوانیش ئەو پەیمانەیان ڕاگەیاند بە نەوەو پەیڕەوەکانیان. خودا پێی وتن: ئەوەی بۆم هێناون لە کتێب و حیکمەت ئەبێ باوەڕی پێ بکەن و ئیشی پێ بکەن و کە لای خوداوە پێغەمبەرێ ڕەوانە کرا (مەبەست حەزرەتی موحەممەدە) کە باوەڕی بە کتێب و ئایینی ئێوە هەیە، ئەبێ نەوەکانتان و پەیڕەوەکانتان باوەڕی پێ بکەن و ئیمانی پێ بهێنن و پشتگیریی لێ بکەن. ئەنجا پاش ئەم پەیمانە ڕووی تێ کردن و پێی وتن: ئایا ئیقرارتان کردو بەتەواوی پەیمانتان پێدام؟ ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان: بەڵێ بڕیارمان داوە پەیمانەکەت بەجێ‌بێنین. خودایش فەرمووی: دە شایەتی بدەن لەسەر ئەم پەیمانەو منیش یەکێکم لە شایەتەکان لەگەڵتان.

(٨٢) بێ‌گومان ئەوانەی لەوەپاش ڕوو لەو پەیمانە وەردەچەرخێنن و پەیڕەویی ناکەن، ئەوانە فاسقن و پەیمانی خودایان تێکداوە.

(٨٣) ئایا کارێکی تەواوو ژیرانەیە سەرپێچی ئەکەن و غەیری دینی خودایان ئەوێ؟ ئەو خودایەی هەرچی لە ئەرزو ئاسماندایە ملکەچیەتی، بە خواهیش و ئارەزوو بێ یا بە زۆر، بەئیختیار بێ وەك ملکەچیی مەلائیکەکان، یا موسوڵمانەکان کە وردئەبنەوە لە دەلیل و موعجیزە، یا بە زۆر بێ وەك کافرەکان کە بە زۆر ئیسلام ئەبن یا دوچاری تەنگانە ئەبن وەك غەرق بوون و زەوی قووتدان کە ناچار ئەبن ئیمانی پێ بهێنن. لەئەنجامیشدا هەرچی کائینات هەیە سەرەنجامی هەمووی لای خودایە.

قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ كَيْفَ يَهْدِى ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾



(٨٤) تـۆ ئـەی موحەممـەد! حـەق ڕوون بکەرەوەو بڵـێ: ئێمـە باوەڕمـان هەیـە بـە خوداو بەو قورئانەی کە نازڵ کراوەتە سـەر من و، لە ڕێگای منەوە بـە خـەڵکی‌تریش گەیشتووە. باوەڕمان هەیە بـەو کتێبانـەی لەلایەن خوداوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی نێـرراون. باوەڕمان هەیە بە تەورات کـە بـۆ مووسـا نێرراوەو بە ئینجیل کـە بـۆ عیسـا ڕەوانـە کـراوە. باوەڕمـان هەیـە بـە هـەموو ئـەو کتێبانەی لەلایەن خوداوە بۆ پێغەمبەرانی تـر نێـرراون. وەکـو یـەك باوەڕمـان بـە پێغەمبەران هەیەو هیچیان لەوی‌تریان جیا ناکەینـەوە. هـەمووومان ملکەچـی خـوداو فەرمانی خوداین.

(٨٥) هەرکەس غەیری ئـایینی ئیسـلامی بـوێ هـەرگیز لیـێ قبـووڵ نـاکرێ و، لـە قیامەتدا ڕەنج بەخەسارە.

(٨٦) خودا چۆن هیدایەتی ئەوانـە ئـەدات کە پاش ئەوەی ئیمانیان هێناو شـایەتییان دا کە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممـەد ڕاسـتەو لەسـەر ئـەم ڕاسـتییە دەلیـل و موعجیزەیـان دی، لـە دیـن وەرگەڕانـەوەو ڕێگای گومڕاهییان گرت؟! خـودا هـەرگیز هیدایەتی کۆمەڵی ستەمکاران نادات.

(٨٧) ئەوانـە پاداشـی ڕەوایـان ئەوەیـە نـەفرین‌و لەعنـەتی خـوداو فریشـتەکان و موسوڵمان و غەیری موسوڵمانانیشیان لەسەرە، چونکە تەنانەت ئینسـانی کـافریش ڕقیـەتی لـەو کەسـەی مـونکیری ڕاستی بێ و بزانێ ڕاستەو لێی هەڵگەڕێتەوە، بەڵام کافرەکە نازانێ ڕاستییەکە کامەیە؟

(٨٨) ئەوانە هەتاهەتایە لەبەر لەعنەت و نەفرینی خوداو فریشتەو بنیادەمدان و لێی ڕزگار نابن. هەروەها بەرامبەر بەتاوانی گەورەی هەڵگەڕانەوەیان سزاو ئازاریان سووك ناکرێت و مۆڵەت نادرێن.

(٨٩) ئەوانە نەبێ کە پاش ئەو هەڵگەڕانەوەیە پەشیمان ئەبنـەوەو ڕووئەکەنـەوە خـوداو ئـەو خراپەکارییـەی دەسـیان دابوویە وازی لێ ئەهێنن و دەست ئەدەنە چاکەکردن. دەربارەی ئەوانە بێ‌گومان خودای گەورە گوناهبەخش‌و بـەڕەحم‌و میهرەبانە.

(٩٠) مەبەست ئەو جوولەکانەیە کە ئیمانیان بە حەزرەتی مووساو تەورات هێناو پاشان کە حـەزرەتی عیسـا ڕەوانـە کرا باوەڕیان پێ‌نەکرد. پاش ئەوەیش کە حەزرەتی موحەممەد کرا بە پێغەمبەر زیاتر کافر بوون و باوەڕیان بەخۆی و بە قورئانەکەی نەکرد کە لەلایەن خوداوە نازڵ کراوە.

یا مەبەست ئەوەیە ئەو جوولەکانە کە لە کتێبەکەی خۆیاندا باسی پێغەمبەر کرابوو، پێش ئەوەی بکرێ بە پێغەمبەر باوەڕیان پێی هەبوو، کەچی پاشان کە بە پێغەمبەری نێررا ئیمانیان پێ نەهێناو سەرپێچییان کردو ئاژاوەیان نایـەوەو ئینکاری قورئانیـان کـرد. ئەوانـە تەوبـەیان لێ وەرنـاگیرێ، جـا یـا لەبەرئـەوە کـە تەوبەکـەیان بەڕاسـتی نی‌یـەو لـە نیفاقەوەیە، یا مەبەست ئەوەیە: کاتێ تەوبە ئەکەن کە ئەکەونە حاڵی سەرەمەرگ و دەستیان لـە هـەموو لا ئـەبڕێ. ئەوانە بێ‌گومان گومڕاهن.

(٩١) ئەوانەی کافرن و بەکافری ئەمرن ئەگەر پـڕی ئـەرزیش فیدیـە بـدەن لێیـان قبـووڵ نـاکرێ. ئەوانـە سزای توند ئەدرێن‌و هیچ کەس نی‌یە یارمەتییان بدات.

لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ﴿٩٢﴾ ۞ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلّٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۗ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ مَّقَامُ إِبۡرَٰهِيمَۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗاۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ تَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَأَنتُمۡ شُهَدَآءُۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾





(٩٢) پاداش‌و جەزای ڕاستەقینەی هەرەچاکتان دەست ناکەویٚ تا لە ڕێگای خوادا لەو شتە سەرف نەکەن کە خۆشتان‌ئەویٚ، وەك مالّی پاك و پوختە بۆ هەژارو خویٚش و، وەك جاەو پایە لە یارمەتیدانی خەلّکداو، وەك بەدەن لە خودا پەرستنداو، وەك گیان لە جیهاددا. بیٚ‌گومان هەرچی سەرف بکەن لە ڕێگای خودا، چ خۆشەویست‌و چ ناخۆشەویست، خودا ئاگادارەو پیٚی ئەزانیٚ‌و لیٚی ون نابیٚ.

(٩٣) لەچەرخەکانی پیٚش پیٚغەمبەرایەتیی مووساو نازڵبوونی تەوراتدا هەموو خواردەمەنی‌یەك حەلاڵ بوو بۆ بەنی ئیسرائیلییەکان، واتە لە چەرخەکانی نووح‌و ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و ئیسحاق‌و یەعقووبدا، ئەوە نەبیٚ کە ئیسرائیل واتە یەعقووب، بەتایبەتی لەسەر خۆی حەرام کردبوو، بەلاّم کە مووسا ڕەوانە کرا بە پیٚغەمبەری‌و تەوراتی بۆ نیٚررا هەندیٚ خواردەمەنی لە بەنی ئیسرائیلییەکان حەرام کرا وەك گۆشت و شیری وشتر، ئەمەیش لەبەر کوفرو زولّم و خراپی‌و بەدڕەوشتییان. دە بڕۆن ئەی جوولەکەکان ئەگەر ڕاست ئەکەن تەورات بیٚنن. بیخویٚننەوە، تا بزانن ئەو خواردەمەنییانە کە لە بەنی ئیسرائیلییەکان حەرام کراون پیٚش نازڵ بوونی تەورات یان پاش نازڵ بوونی حەرام کراون؟.

(٩٤) ئیتر پاش دەرکەوتنی ڕاستی هەرکەس درۆ بە دەم خوداوە هەڵبەستی‌و بلّیٚ: خودا پیٚش هاتنی تەورات فلاّنە شتی لە بەنی ئیسرائیلی حەرام کردوە، ئەوە بە ستەمکارو لەڕیٚ لادەر حسیٚب ئەکریٚ.

(٩٥) پیٚیان بلّیٚ: خودا ڕاست ئەکات‌و هەرچی ئەو ناردوویەتی حەقە، وەرن دوای ئایین و ڕەوشتی ئیبراهیم بکەون کە لە بتپەرستی لایداو ڕووی کردە خوداپەرستی‌و، هەرگیز لەوانە نەبوو هاوڕیٚ بۆ خودا بڕیار بدات.

(٩٦) بیٚ‌گومان یەکەم خانوویێ دروست کرابیٚ بۆ خوداپەرستی ئەو خانووەیە کە لە شاری مەککەدایە کە خانوویەکی پیرۆزەو هۆی شارەزایی هەموو ئینسانیٚکە چونکە قیبلەو شویٚنی عیبادەتیانە.

(٩٧) لەو خانووە پیرۆزەدا چەند نیشانەیەکی ڕووناك هەن دەلالەت لە پایەی لای خودا ئەکەن. یەکیٚ لەو نیشانانە مەقامی ئیبراهیمە، ئەو شویٚنەی کە ئیبراهیم لەسەری ڕاوەستاوە لە کاتی دروستکردنیدا. هەرکەس بە ئیمان‌و بیروباوەڕی ئیسلامەتییەوە بچیٚتە ئەو مالّە، ئەوە لە دنیاو قیامەتدا ئەمین ئەبیٚ. هەروەها واجبە لەسەر خەڵك ئەوی توانی هەیەو ئەتوانیٚ بیگاتیٚ، زیارەتی بکات. ئیتر هەرکەس کافر بیٚ‌و حەج نەکا ئەوە خودا لە عیبادەتی خەڵك بیٚ‌نیازەو موحتاجی کەس نی‌یە، ئەوەی خوداپەرستی بکات بۆ خۆی ئەکات.

(٩٨) بلّیٚ: ئەی کیتابییەکان بۆچی باوەڕ ناکەن بەو هەمووە دەلیلانە کە دەلالەت ئەکەن لەسەر ڕاستگۆیی پیٚغەمبەرو ڕاستیی ئایینەکەی؟ بۆ کافر ئەبن کە خودا ئاگای لە هەموو کردەوەیەکتانەو هیچی لیٚ ون نابیٚ ؟

(٩٩) بلّیٚ: ئەی کیتابییەکان بۆچی ڕیٚگا لە موسولّمانان ئەگرن و ئاژاوەیان لەنیٚوانا ئەنیٚنەوە؟ ئەتانەویٚ ڕیٚگا لارو لە ئیسلام دوور بیٚ؟ خۆ ئیٚوە خۆتان ئەزانن ئەم ئایینە ڕاستەو موسولّمانان ڕیٚگای ڕاستیان گرتووە. خوا هەرگیز بیٚ‌ئاگا نی‌یە لە کردارتان و ئەزانیٚ چی ئەکەن. (١٠٠) ئەی موسولّمانینە! ئەگەر بەگوێی تاقمیٚ لەوانە بکەن کە ئەهلی کیتابن و قسەیان بە ڕاست بزانن هەڵتانئەگیٚڕنەوە بۆ کافری پاش ئەوەی کە خودا هیدایەتی دان و موسولّمان بوون، ئەکەن بەگوێیان بکەن، ئەو تاقمە دوژمنی ئایینتانن.

وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمۡ
رَسُولُهُۥۗ وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٠١﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم
مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ
وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ
فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ
فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ
﴿١٠٣﴾ وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ
وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلَا
تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخۡتَلَفُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ
وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٥﴾ يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ
وُجُوهٞۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ
فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ
وُجُوهُهُمۡ فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ
ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾



(١٠١) ئێوه چۆن كافر ئەبن كە ئایەتەكانی خوداتان بەسەردا ئەخوێنرێنەوەو پێغەمبەری خودا لەناوتانایەو هەمووكات ئامۆژگاریتان ئەكات؟ هەركەس دەست بە فەرمانی خوداوە بگرێو پشت بە خودا ببەستێ ئەوە هیدایەت دراوە بۆ ڕێگای ڕاست.

(١٠٢) ئەی خاوەن ئیمانەكان بە ڕاستی لە خودا بترسن، ترسێكی ڕاستەقینە كە شایانی گەورەییو بەدەسەڵاتیی خودا بێ‌و، هەوڵ بدەن و تێكۆشن كە لەسەر ئایینی پاكی ئیسلام نەبێ نەمرن.

(١٠٣) هەمووتان دەست بە دینی ئیسلامەوە بگرن تا لە كەوتن و هەڵدێران ڕزگاربن. مەبن لە ناو خۆتانا وەك ئەهلی كیتاب لەناو خۆیانا بوون بە تاقم تاقم. یا مەبەست ئەوەیە وەك سەردەمی جاهیلییەت مەمێننەوە كە بەگژی یەكترا ئەچوون. بیری ئەو نیعمەتە بكەنەوە كە خودا ڕژاندی بەسەرتاناو ئەوەبوو ئێوە لەناو خۆتانا دوژمن بوون و ماوەیێكی دوورو درێژ لە یەكترتان ئەكوشت. ئەنجا خودا بەهۆی نیعمەتی ئیسلامی پیرۆزەوە ئاشتی كردنەوەو لەناو خۆتانا بوون بە برای یەكتر. ئێوە لەسەر لێواری چاڵی ئاگری دۆزەخ بوون و ئەگەر دینی ئیسلام فریاتان نەكەوتایەو ئیسلام نەبوونایە لەوانە بوو تێبكەون. خودا هیدایەتی دان و ڕزگاری كردن لەو ئاگرە. خودا بەمجۆرە ئایەتەكانتان بۆ ڕوون ئەكاتەوە تا زیاتر شارەزابن و ڕێگای ڕاستی ئایینی ئیسلامی پیرۆز بەرنەدەن.

(١٠٤) با بەردەوام لەناو ئێوەدا كۆمەڵێ هەبن ئەمر بە چاكەو نەهی لە خراپە بكەن، ئامۆژگاری خەڵك بكەن و ڕێی ڕاستیان پیشان بدەن. ئەم جۆرە كەسانەن لە هەموو كەس چاكترو سەركەوتووترن.

(١٠٥) ئەی موسوڵمانەكان! ئێوە وەك ئەو كیتابییانە مەبن كە سەبارەت بە خودابەیەك زانین و ئەحواڵی ڕۆژی قیامەت جیاوازییان كەوتە بەین پاش ئەوەی كە ئایەتیان بۆ هات و ڕێگای ڕاستیان پیشان دراو پێغەمبەران ئامۆژگارییان ئەكردن! ئەوانە سزایەكی گەورە ئەدرێن.

(١٠٦) بیر لەو ڕۆژە سامناكە بكەرەوە كە هەندێ ڕوخسار سپی ئەبێ‌و هەندێكیش ڕەش! هەندێكیان ڕووگەش و هەندێكیتر ڕوودرژو مۆن و خەفەتبارن. ئەوانەیان كە ڕوویان ڕەشەو خەجاڵەتی دەرگای خودان پێیان ئەوترێ: بۆچی پاش ئەوەی ئیمانتان هێنا لە دین وەرگەڕانەوەو كافربوون؟ دەی ئەمڕۆ سزا بچێژن بەهۆی تاوانی هەرەگەورەتانەوە كە كافربوونتانە.

(١٠٧) ئەوانەیشیان كە ڕوویان سپییەو ناوچاوانیان گەشە ئەوانە ئەو ڕۆژە لەناو نازو نیعمەتی خودادان و هەتا هەتایە تیایا ئەمێننەوە.

(١٠٨) ئەمانە ئایەتی خودان ئەیانخوێنینەوە بەسەرتا. بەڕاستی خودا هەرگیز نایەوێ ستەم لە عالەم بكات.

وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿١٠٩﴾ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ۖ وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾ ۞ لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾



(١٠٩) هەرچی لە ئەرزو ئاسماندایە هەمووی مولکی خودایەو سەرئەنجامی هەموو کاروبارو هەموو شتێك هەر لای خودایە.

(١١٠) ئێوە ئەی ئوممەتی موحەممەد؟ چاکترینی ئەو ئوممەتانەن کە بۆ خەڵك دەرکەوتوون و کراونەتە ئوممەتی پێغەمبەران، چونکە ئێوە ئوممەتێکن ئەمر ئەکەن بەچاکەو نەهی ئەکەن لە خراپەو شارەزایی خەڵك ئەکەن و بەڕاستی ئیمانتان بە خودا هەیە. ئەگەر کیتابییەکان بەڕاستی ئیمانیان بهێنایە چاکتر ئەبوو بۆیان بەڵام بەشی زۆریان لە ڕێگای دین لایانداوەو کافرن.

(١١١) ئەوکیتابییانە ناتوانن زیانتان پێبگەیەنن بە مەنعی بڵاوکردنەوەی دین ئەوە نەبێ کە ئازاری دڵتان ئەدەن. ئەگەر شەڕیشتان لەگەڵ بکەن ناتوانن لەڕووتانا بوەستن، بەڵکو پشت هەڵئەکەن و لە مەیدانی جەنگا ڕائەکەن. پاش ئەوەیش هەرگیز یارمەتی نادرێن.

(١١٢) ئەم کیتابییانە لە هەر شوێنێ بن و لە هەرلایێ دەرکەون کزی و سووکی دراوە بەسەریاندا وەك خێوەت، ئیللا بەهۆی پەیمانی سەلامەتییەوە نەبێ کە جیزیەدانە کە لە زەمانی پێغەمبەرەوە (د.خ) بووە تا ماوەیەکی زۆر، یا بەهۆی پشتگیری دەستەڵاتداران وەك ئەمڕۆ چۆن دەوڵەتەکانی ئەورووپاو ئەمریکاو شوێنەکانی تر یارمەتییان ئەدەن و ئەیانپارێزن. یا مەبەست ئەوەیە کە زەلیل و کزئەبن مەگەر دەست بگرن بە ئایینی خوداو بە پەیمانی موسوڵمانانەوە. ئەم سووکییەیش لەبەرئەوەیە کە ئینکاری ئایەتەکانی خودایان ئەکردو کافر بوون و بە ناحەق پێغەمبەرانیان ئەکوشتو ئازاریان ئەدان و، بەدکارو تاوانبارو دەستدرێژ بوون.

(١١٣) کیتابییەکان هەموو وەك یەك نین. هی وایان هەیە ڕێکن و ڕێگای ڕاستیان گرتوەتەبەرو شەونخوونی ئەکێشن بۆ خوداپەرستیو ئایەتی خوای تیا ئەخوێننەوەو سوجدە بۆ خودا ئەبەن و نوێژ ئەکەن.

(١١٤) ئەوکیتابییە چاکانە باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی جەزا هەیەو ئەمر ئەکەن بە چاکەو نەهی ئەکەن لە خراپەو، لە کاری خێرو چاکەدا پێشدەستی ئەکەن و زوو بەدەمیەوە ئەڕۆن. ئەوانە لە زومرەی پیاوچاکان و خوداپەرستانن.

(١١٤) ئەمانە هەر چاکەیێ بکەن ئینکار ناکرێو نادرێتەوە بەسەریانداو پاداشی شایانی لەسەر وەرئەگرن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٧﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةٗ مِّن دُونِكُمۡ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَـٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾ إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿١٢٠﴾ وَإِذۡ غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾



(١١٦) بێگومـــان ئەوانـــەی ڕێگـــای کوفریـان پەسـەند کـردو ئیسـلام نـەبوون هەرچـی دارایـیو مـاڵو منداڵیـان هەیـە سـوودیان پێناگـەیێنن لـە قیامەتـداو فریایـان ناکـەون، بـەڵکو ئەوانـە هـاوڕێی هەمیشـەیی ئـاگری دۆزەخـن و هـەتا هەتایە تیایا ئەمێننەوە.

(١١٧) ئەوەی کافرەکان و منافقەکان لەم دنیایـەدا بـۆ ڕیـاو خۆبەچـاكپیشـاندان و شـانازیکردن سـەرفی ئەکـەن، هـیچ سوودێکی نییە بۆیـان. ئـەو سـەرفکراوە وەکو بایەکـە سـەرماو سـۆڵەیێکی تیژی تێدا بێو بدا لە کشتوکاڵی قـەومێك کـە بە کوفرو لە دین لادان زوڵمیان لە خۆیـان کردبێ و، ئەو کشتوکاڵەیان بەرباد بکات و لـەناوی بـەرێت، ئـەم کـافرو منافقانـە خودا هەرگیز زوڵمی لێ نەکردوون، خۆیان ستەمیان لە خۆیـان کـردووە بـەهۆی ئـەو ڕێگا خراپەوە کەوا گرتوویانەتە بەر.

(١١٨) ئەی خـاوەن ئیمانـەکان! بێجگـە لە خۆتان، واتە: موسوڵمانەکان، دۆسـتی وا مـەگرن قسـەی نهێنییـان لا بکـەن و ڕازی دڵـی خۆتانیـان لابـدرکێنن. ئەوانـە کۆتایی ناکەن لە بەدناوکردنتان و تێکدانتان و حەزئەکەن ئێوە تووشی زیان بن و بفـەوتێن، ئەوانـە ڕقو کینـەیان لـە قسەو گوفتاریانا دەرئەکەویو ناتوانن بیشارنەوە! بەڵام ئەو ڕقو کینەو دوژمنایەتییەی لە دڵیاندایە زۆرتـرە. وا ئێمـە ئەم ئایەتەمان دەربارەی پێویستی دۆستایەتیی موسـوڵمانان و دوژمنایـەتیی کـافران بـۆ ڕوون کردنـەوە ئەگـەر ئێـوە زیرەك بن و تێیبگەن.

(١١٩) ئەوەتە ئێوە، کە بەهەڵەدا چوون لە دۆستایەتیی کافراندا، ئەوانتان خۆش ئـەوێ کەچـی ئـەوان هـیچ ئێوەیـان خۆش ناوێ. ئێوە ئیمانتان بە هەموو کتێبێکی خودایی هەیە، هی خۆتان و هی ئەوان و پێش ئەوانیش، کەچی ئەوان ئیمانیان بە قورئانەکەی ئێوە نییە، بـەڵکو پێیـان ناخۆشـە ئێـوە ئیمانتـان بـە کتێبەکـەی ئـەوانیش هەیـە! کـە لـە ڕێگەوبانا یا لە دانیشتنا پێتـان ئەگـەن بـە منـافقیو دووڕوویـی ئـەڵێن ئیمانمـان هێنـاوە، کەچی کـە لـەناو خۆیانـا کۆئەبنەوە لەرقانا پەنجەی خۆیان ئەگەزن کە ناتوانن تۆڵەتان لێ بستێنن. بڵێ پێیان: دەسـا بـەو ڕق و کینـەو داخـەوە بمرن. خودا ئاگادارە ئەزانێ چ ڕقێ لە دەروونتانا پەنگی خواردووەتەوە.

(١٢٠) ئەگەر بەش و بارەییێکی باشتان دەستکەوێ پێیان ناخۆشە، بەڵام ئەگەر زیانێکتان پێ بگا پێی دڵخۆش ئەبن و ئەگەشێنەوە! ئێوە ئەگەر خۆتان بگرن و لە خودا بترسـن ئـەوان بـە فێـڵ و پـیلان نـاتوانن زیانتـان پـێ بگـەیێنن. بێگومان خودا ئاگای لەهەموو کارێکیان هەیەو تۆڵەیان لێ ئەسێنێتەوە.

(١٢١) بیری ئەوە بکەرەوە کە چۆن لـە سـەرەتای غـەزای ئوحـوددا سـەرلەبەیانی لـە مـاڵ دەرچوویت، جێگـات بـۆ موسوڵمانان ئامادە ئەکردو ڕێوشوێنی جەنگت پێشان ئەدان. خودا شنەوایەو زانایەو ئاگای لە هەمووشت هەیە.

إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ ۚ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ۗ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا۟ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوا۟ ٱلرِّبَوٰٓا۟ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾



(١٢٢) ئا لەوكاتەدا کە دوو تاقم لە ئێوە، بەنووسەلەمەی خەزرەج و بەنووحاریشەی ئەوس خەتەرەی ئەوە ئەهات بەدڵیانا کە بێهێزی پیشان دەن و بترسن و ئەوەندەی نەمابوو دوای جەماعەتی ئیبنوئوبەی بکەون و هەڵێن، بەڵام خودا لەو خەتەرەیە پاراستنیو لەجەنگدا بەردەوام بوون. ئەبێ موسوڵمانان هەر پشت بە خودا ببەستن و داوای یارمەتیو سەرکەوتن تەنها لەو بکەن.

(١٢٣) خودا لە مەعرەکەی بەدردا یارمەتیدان و سەری خستن بەسەر دوژمندا ئەگەرچی ئێوە لەو ڕۆژەدا بێحاڵ بوون و ژمارەتان کەم بوو تفاقی جەنگتان کۆك نەبوو. سا لە خودا بترسن بەڵکو ئەو لەخوداترسانە ببێتە شوکری ئەو نیعمەتی سەرکەوتنە گەورەیە.

(١٢٤) کە لەو مەعرەکەی بەدرەدا خودا یارمەتیدان و تۆ ئەی موحەممەد ئەتوت بە موسوڵمانە جەنگاوەرەکان ئایا ئەوەتان بەس نییە کە خودا یارمەتیتان بدا بە سێهەزار مەلائیکەی نازڵ کراو؟ مەبەست ئەوەیە بەڵێ بەسە.

(١٢٥) نەخەیر بەستانەو، ئەگەر خۆگر بن لە ڕێگای خوداداو لێی بترسن و کافرەکان ئائیستە بگەڕێنەوەو بدەن بەسەرتانداو تەنگاوتان بکەن، خودا یارمەتیتان ئەداتو پێنج هەزار فریشتە ئەنێرێ بۆ یارمەتیتان کە خۆیان یا ئەسپەکانیان نیشانەدارن، یا مەبەست ئەوەیە ئەو دەستەی ئەیوەشێنن لە کافرەکان دیارییەو نیشانەی دیارە. شایانی باسە ئەم پێنج ئایەتە دوابەدوای ئوحود نازڵ بوونو باس باسی ئوحودەو، بۆ دڵنیاکردنی موسوڵمانەکان و دووپات کردنەوەی یارمەتیدانیانە لەلایەن خوداوە.

(١٢٦) ئەم یارمەتیدان و فریشتەناردنە موژدەیە بۆ ئێوەو دڵنیایی کردنتانە. یارمەتیو سەرکەوتن هەر لە خودای بەدەستەڵاتی خاوەن حیکمەتەوەیە.

(١٢٧) ئەم یارمەتیدانەیشتان بۆ ئەوەیە خودا لە کۆمەڵی ئەو کافرانە کەم بکاتەوە بە کوشتن و بەدیل کردن و بۆئەوەیە زەبوون و داخ لەدڵیان بکات و بە نائومێدیو سەرشۆڕی بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان.

(١٢٨) لە کاروباری ئەم کافرانەدا تۆ دەستەڵاتت نییەو، بەدەستی خودایە، ئەگەر بیەوێ پاش ئیسلام بوونیان تەوبەیان لێ قبووڵ بکات و لێیان خۆش ببێ، یا سزایان بدات ئەگەر لەسەر کافریی خۆیان سوور بن و لەڕێی گومڕاهی لانەدەن. بێ گومان ئەمانە ستەمکارن.

(١٢٩) هەرچی لەئاسمان و ئەرزایە هەمووی مولکی خودایەو لەژێر دەستی ئەودایە، ئەوەی مەیلی لێ بێ لێی ئەبووریو لە تاوانی خۆش ئەبیو ئەوەیشی بیەوێ سزای ئەدا. خودا گوناهپۆش و میهرەبانە.

(١٣٠) ئەی خاوەن ئیمانەکان! سوود مەخۆن لە مامەڵەتانا بە چەند قات، لە خودا بترسن بەڵکو لە تۆڵەو سزای ڕۆژی قیامەت ڕزگار بن. کافرەکان هی وایان هەبوو پارەی ئەدا بەسوود بۆ ماوەیەك و پاشان زیادی ئەکرد تا وای لێ ئەهات بە پارەیێکی کەم ماڵی قەرزارەکە هەمووی تیائەچوو!

(١٣١) خۆتان بپارێزن لە سزای ئەو ئاگرەی بۆ کافران ئامادە کراوە.

(١٣٢) بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا بکەن و لە فەرمانیان دەرمەچن بەڵکو خودا بە میهرەبانیی خۆی ڕەحمتان پێ بکات.

۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾



(١٣٣) ئەی موسوڵمانینە! پێشدەستی بکەن و بەپەلە کردەوەی باش بکەن و زوو دەس بدەنە کاری خێر. ئەو بەهەشتە دەست خۆتان بخەن کە زۆر گەورەو بەر بڵاوەو بەقەدەر ئەرزو ئاسمانەکانەو ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی لەخودای خۆیان ئەترسن‌و نزیکی گوناھ و نا فەرمانیی خودا ناکەونەوە.

(١٣٤) ئەو لەخوداترسانەی کە لە خۆشی‌و ناخۆشیدا ماڵی خۆیان لەپێناوی خودای خۆیانا سەرف ئەکەن‌و لە کاتی تووڕەبوونا ڕقی خۆیان ئەخۆنەوەو، ئەوانەی تاوانیان بەرانبەر کردوون چاوپۆشییان لیّ ئەکەن و لێیان ئەبوورن، بیّ گومان خودا چاکەکەرانی خۆش ئەویّ.

(١٣٥) ئەوانەی هەرکاتیّ تاوانێکی ناڕەوایان کرد یا ستەمیان لە خۆیان کرد بە گوناهێکی تر، بیری گەورەیی خودا ئەکەنەوەو داوای لێخۆشبوونی لیّ ئەکەن و پەشیمان ئەبنەوە لەو تاوان و ستەمە. کێیش ئەتوانیّ گوناه بپۆشیّ لە خودا بەولاوە. هەروەها بەردەوام نابن لەسەر ئەو گوناهەی کردوویانەو ئەزانن ئەوکارەی کردوویانە تاوانەو مایەی سزایە.

(١٣٦) پاداشی ئەمانە لێخۆشبوونە لەلایەن خوداوەو چەند باغێکە لە بەهەشتا کە جۆگای ئاوی سازگار بەناویانا ئەڕوات. ئەمانە لەو بەهەشت و باغانەدا هەتا هەتایە ئەمێننەوە. بەخ بەخ لەو پاداش و دوارِۆژەی خودا بە چاکەکەرانی ئەبەخشیّ.

(١٣٧) بیّ‌گومان لەپێش ئێوەدا گەلیّ ڕووداو قەوماوەو گەلیّ تۆڵەی تیژ لەو کۆمەڵانە سەنراوە کە پێغەمبەرانیان بە درۆخستوەتەوەو ئیمانیان پیّ نەهێناون. بڕۆن بگەڕێن و بە وردی سەیر بکەن تا بۆتان دەرکەویّ ئەنجامی ئەو کافرو بەدکارانە چۆن بوو؟

(١٣٨) ئەمەی کە بۆم باسکردن ڕوونکردنەوەیە بۆ خەڵك و ڕیّ پیشاندانەو پەندو دەرسە بۆ ئەوانەی خۆیان لە گوناه ئەپارێزن.

(١٣٩) سست و بیّ‌هێز مەبن. زویرو خەمبار مەبن. ئێوەن کە لە خەڵکی‌تر بەرزترن ئەگەر ئیمانتان بە خوداو بە پێغەمبەر ببیّ‌و دڵنیا بن کەوا سەرکەوتن لە خوداوەیە.

(١٤٠) ئەگەر ئێوە لە مەعرەکەی ئوحوددا تووشی ئازار بوون کافرەکانیش لە ڕۆژی بەدردا تووشی ئازاری وەها بوون، لێیان کوژراو لێیان بەدیل گیرا. ئەوان بۆ ترسنۆکییان پێشان نەداو کزی ڕووی تیّ‌نەکردن و خۆیان ئامادە کردەوە بۆ هەرای ئوحود؟ ئەبیّ ئێوە زیاتر چاونەترس بن. ئێوە موسوڵمانن و ئەوان کافر. ئەمە ڕۆژگارەو دەستاودەستی پیّ ئەکەین. ئەمڕۆ ئەم کۆمەڵە سەرئەکەون و سبەی کۆمەڵێکی‌تر تا دەرکەویّ، وەك خودا ئەیزانیّ، کیّ باوەڕی ڕاستەقینەی بە خودا هەیەو کیّ نی‌یەتی، هەروەها تا هەندێکتان بە پایەی شەهیدی بگەن لە ڕێگای خودادا، یا تا شاهیدی عادڵتان تیا دەرکەویّ بەهۆی خۆگری‌و نەترسانەوە لە ڕۆژی سەخت و دژواردا. خودا هەرگیز ستەمکارانی خۆش ناویّ.

وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَيَمْحَقَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ ٱلْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِي۟ن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَـٰبًا مُّؤَجَّلًا ۗ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِىٍّ قَـٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾



(١٤١) هەروەها تاخودا بەو ئازاردانە خاوەن ئیمانەکان لە گوناه پاك و خاوێن بکاتەوەو کافرەکان لەناوبەرێت.

(١٤٢) یا گومانتان وابوو هەروەها بەخۆڕایی ئەچنە بەهەشت کە هێشتا لە ڕێگەی خوادا جیهادتان نەکردوەو سەبرو خۆگریتان پیشان نەداوە؟.

(١٤٣) خۆ ئێوە ئاواتەخوازی جەنگ و مەرگ بوون لە ڕێگای خوادا پێش ئەوەی پێی بگەن، ئەوا دیتان و چاك زانیتان جەنگ خۆگری ئەوێو جیهاد کارێکی ئاسان نی‌یە.

(١٤٤) موحەممەدیش لە پێغەمبەرێك بەولاوە نی‌یە لەو پێغەمبەرانەی پێش ئەو هاتن کە یا کوژران یا بە عادەتی مردن. ئایا ئەبێ ئەگەر ئەمیش بە عادەتی مرد یا کوژرا ئێوە پاشەوپاش بگەڕێنە دواوەو لە دین وەرگەڕێن؟ بێ‌گومان هەرکەس هەڵگەڕێتەوەو هەڵبێ زیان بە خودای گەورە ناگەیێنێ. خودا پاداشی شایانی ئەوانە ئەداتەوە کە شوکری ئەکەن لەسەر نیعمەتی ئیسلام و لەسەری ئەمێنن و خۆگر ئەبن.

(١٤٥) مومکین نی‌یە کەسێ بمرێ بە ئیزنی خودا نەبێ. ئەمە بڕیار دراوەو کاتی بۆ دانراوە. جا هەرکەس پاداشی دنیای بوێ بەشی ئەدەین و، هەرکەس پاداشی ڕۆژی دوایی بوێ بەشی ئەدەین. لەمەوپاشیش پاداشی موسوڵمانە شوکرانەبژێرەکان ئەدەینەوە.

(١٤٦) گەلێ پێغەمبەری وا هەبوون زۆر لە پیاوچاکان و لەخوداترسان لەگەڵیان جیهادیان کردوەو بەو ئازارانەی لە ڕێگای خوادا تووشیان ئەبوو سست و بێ هێز نەئەبوون و، ڕووبەڕووی دوژمن کز نەئەبوون و ملیان بۆ کەچ نەئەکردن، بێ‌گومان خودا ئەم جۆرە ئیمانداره خۆگرانەی خۆش ئەوێ.

(١٤٧) ئەوانە لە کاتی مەعرەکەو ناڕەحەتیدا هیچیان نەئەوت ئەوە نەبێ کە لە خودا ئەپاڕانەوەو ئەیانوت: خودایە! گوناهمان بپۆشەو لەو زیادەڕەوییەی کردوومانە لە کاروبارماندا ببوورەو، دڵمان دامەزرێنەو بەسەر کافراندا سەرمان بخە.

(١٤٨) جا خودا بەرامبەر بەو سەبرو خۆگریو لێ پاڕانەوەیە پاداشی چاکەی دانەوە لە دنیاداو، پاداشێکی جوانترو چاکتریشیان ئەداتەوە لە دواڕۆژداو خوا چاکەکەرانی خۆش ئەوێ.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَاسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ اللَّهُ مَوْلَاكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ النَّاصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا ۖ وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ ۚ وَبِئْسَ مَثْوَى الظَّالِمِينَ ﴿١٥١﴾ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّن بَعْدِ مَا أَرَاكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ الْآخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ ۞ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰ أَحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ فَأَثَابَكُمْ غَمًّا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَا أَصَابَكُمْ ۗ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾



(١٤٩) ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە پێغەمبەر هەیە ئەگەر ئێوە دوای کافرەکان بکەون و بەگوێیان بکەن، ئەوانە پاشەوپاش وەرتان ئەگێڕنەوە بۆ سەر کافرێتیو لە قازانجدارییەوە ئەگەڕێنەوە بۆ زیانباریو ماڵتان وێران ئەبێ.

(١٥٠) شتی وەها مەکەن، دوای کافران مەکەون، هەر خودا سەردارو گەورەو پشتو پەناتانەو هەر ئەو چاکترین یاریدەدەرە.

(١٥١) لەمەوپاش بیم و ترس ئەخەینە دڵی ئەوانەوە کە کافرن چونکە شتی وا پڕوپووچیان کردوە بە هاوڕێی خودا کە هیچ دەلیلێکی بۆ دانەنراوە لە لای خوداوە. ئەمانە جێگای دوارۆژیان ئاگرە، چەند ناخۆش و ناشیرینە دواشوێنی ستەمکاران؟

(١٥٢) بەڕاستی خودا ڕاستی کرد لەگەڵتانا کە بەڵێنی سەرکەوتنی دانێ؛ ئەوەبوو ڕووبەڕووی دوژمنەکانتان وەستان و لێتان کوشتن، تا ئێوە خۆتان تووشی ناکۆکی بوون و نیزاع کەوتە بەینتان، گوێتان نەدایە ئامۆژگاریی پێغەمبەر، پاش ئەوەی سەرکەوتنان دی کە پێتان خۆش بوو، هی واتان هەبوو ماڵی دنیای ئەویست و ڕووی کردە تاڵانی. هی وایشتان هەبوو پاداشی دوارۆژی ئەویست و شوێنی خۆی جێ‌نەهێشت. ئەنجا خودا ڕووی وەرچەرخاندن لە دوژمنەکانتان و خەریکی تاڵانی بوون و، سەرەنجام ئەوان زاڵ بوون. ئەمەیش تاقیکردنەوەیەك بوو بۆ ئێوە تا دەرکەوێ کێ خۆگرەو کێ ورەبەرئەدا یا دوای تەماع ئەکەوێ. خودا خاوەن لوتف و کەرەمە لەگەڵ موسوڵمانان.

ئەمە لە غەزای ئوحوددا بوو، کە لە سەرەتاوە موسوڵمانەکان بەسەر کافرەکاندا سەرکەوتن و ڕاویان نان و جا دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی تاڵانی. کە هێزە تیروەشێنەکەی ژێر دەستی (عبداللّه)ی کوڕی (جبیر) (ر.خ) ئەمەیان دی زۆریان بەگوێی ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەریان نەکرد (د.خ) کە پێی فەرمووبوون ئەو شوێنەی تیان بەری نەدەن و پشتی شەڕکەرەکان چۆڵ نەکەن، ئەوەبوو بێجگە (عبداللّه) و چەند کەسێ بەشی زۆریان ئەو شوێنەیان بەجێ‌هێشت و پشتی شەڕکەرەکانیان چۆڵکردو چوون بۆ کۆکردنەوەی تاڵانی. لەم هەلەدا هەندێ لە سوارەی کافرەکان بەمەیان زانیو لەپشتەوە هێرشیان بۆ سەر موسوڵمانەکان هێناو سەرکەوتن؛ چونکە لەوێوە ئەوەندە تیروەشێن نەمابوون ڕێگایان لێ بگرن و ئەوانەیش مابوون لەناوچوون و شەهیدکران. جا لەبەرئەوە لەو موخالەفەو بەگوێ نەکردنە پەشیمان بوونەوەو تەوبەتان کرد خودا عەفوی کردن، خوا کەرەمی زۆرە لەگەڵ موسوڵمانان و نیعمەتی زۆری بەسەریانەوە هەیە.

(١٥٣) ئەوکاتە کە ڕۆیشتن و دوورکەوتنەوەو لاتان لە کەس نەئەکردەوە، پێغەمبەریش لە دواوە بانگی ئەکردن و خۆیو دواکۆمەڵتانی بانگ ئەکردو ئەیوت: بۆ لای من وەرن ئەی موسوڵمانان؛ هەرکەس هێرش بەرێ بەهەشت مسۆگەر ئەکات، جا لەبەرئەوەی دڵی پێغەمبەرتان عاجز کردو بەگوێتان نەکرد خوایش دڵی ئێوەی عاجز کردو لە مەعرەکەکەدا شکان، تا لەسەر ئەوە ڕا بێن کە بۆ لەکیس چوونی قازانج غەم نەخۆن و بەو زیانەی تووشتان بوو زویر نەبن و، لە جیهاددا قاڵ بن و بە گوێی ئامۆژگاریی پێغەمبەر بکەن. خودا ئاگای لە کردەوەو نیازتانە.

ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنۢ بَعۡدِ ٱلۡغَمِّ أَمَنَةٗ نُّعَاسٗا يَغۡشَىٰ طَآئِفَةٗ
مِّنكُمۡۖ وَطَآئِفَةٞ قَدۡ أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ
ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ
قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ يُخۡفُونَ فِيٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبۡدُونَ لَكَۖ
يَقُولُونَ لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَاۗ قُل لَّوۡ كُنتُمۡ
فِي بُيُوتِكُمۡ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡۖ
وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ
وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ
يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا
كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿١٥٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ إِذَا
ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَوۡ كَانُواْ غُزّٗى لَّوۡ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا
قُتِلُواْ لِيَجۡعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسۡرَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۗ
وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
أَوۡ مُتُّمۡ لَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحۡمَةٌ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿١٥٧﴾



(١٥٤) جا پاش ئەو غەم و خەفەتە خودا هێمنیو ئارامی خستە دڵتان و وەنەوز هەندێکتانی بردەوەو ئیسراحەتیان کرد. تاقمێکی تریش کە هەر خۆیان مەبەس بوو، کەسی تریان بە خەیاڵدا نەئەهات، گومانی بەدیان بە خودا ئەبرد وەك گومانی سەردەمی پێش ئیسلام، ئەیانوت: ئایا ئێمە لەو یارمەتیو نەصرەی کە خودا وەعدەی پێ‌داوین بەشێکمان هەیە؟ تۆ ئەی موحەممەد! بلێ: هەرچی کار هەیە هەمووی بۆ خودایە، ئەوانە ئەوەی لە دڵیاندایە دەریناخەن، واتە لە دڵدا باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام و قسەی پێغەمبەر (د.خ) نییە. لە دڵی خۆیاندا لەگەڵ جەماعەتی خۆیاندا ئەڵێن: ئەگەر وەك موحەممەد ئەڵێ ئێمە لە سەرکەوتن و یارمەتیدانیدا بەشمان بوایە ئا لێرەدا لێمان نەئەکوژراو زیانمان لێ نەئەکەوت! تۆ ئەی موحەممەد! پێیان بلێ: ئێوە ئەگەر لە ماڵ و حاڵی خۆیشتانا بوونایە، ئەوانەتان، کە لە عیلمی خودادا ڕابوردووە ئەوانە ئەبێ بکوژرێن، ئەبوا لە ماڵ دەرچوونایەو بڕۆیشتنایە بۆ ئەو شوێنەی تیایا ئەکوژران، ئەمە چارەنووسێکەو خودا دیاری کردوە. ئەم ڕووداوانە هەمووی بۆ ئەوەیە ئەوەی لە دڵتانایە دەربکەوێو دەروونتان لە وەسوەسەو خەیاڵات پاك بکاتەوە. خودا هەرچی لە دەروونتانایە پێی ئەزانێو هیچی لێ ون نابێ.

(١٥٥) بێ‌گومان ئەوانەتان کە لە کاتی بەیەك گەیشتنی دوو تاقمەکەدا هەڵاتن و شوێنی خۆیان بەجێ‌هێشت و بێ‌گوێیی پێغەمبەریان کرد، شەیتان لە خشتەی بردن و هەڵیخەڵەتاندن، سا یا بۆ تاڵانی کۆکردنەوە یا بۆ ڕزگارکردنی گیان. خودا پاش پەشیمانبوونەوەو تەوبەکردنیان عەفوی کردن، خودا بەحیلمەو گوناهپۆشە.

(١٥٦) ئەی ئەوانەی ئیمانتان بە خوداو بە پێغەمبەر هەیە! ئێوە وەکو منافقەکان مەبن و وەك ئەوان بیرمەکەنەوەو مەبنە هاوفکریان، با ببێتە داغ لە دڵیاناو شەق بەرن؛ ئەوانە دەربارەی ئەو خزمانەیان کە ئەڕۆن بەم لاولادا بۆ بازرگانی یا ئەچن بۆ غەزا ئەڵێن: ئەگەر لای ئێمە بوونایەو ئەولاولایان نەکردایە نەئەمردن و نەئەکوژران. ئەم منافقە درۆزنانە هەر بە دەم خۆیان بە موسوڵمان پیشان ئەدەن و لە دڵەوە باوەڕیان بە خوداو ئیرادەو دەسەڵاتی خودا نییە. خودا هەر خۆی ئینسان و خەڵك ئەژیێنیو ئەیانمرێنێ. خودا ئاگای لە هەموو کردارێکتانە.

(١٥٧) ئەگەر لە ڕێگای خوادا بکوژرێن یا بمرن ئەوە خودا لێتان خۆش ئەبێ؛ ئەو لێخۆشبوونەو ئەو میهرەبانییەی ئەو گەلێ بەسوودترە لەو دارایی دنیایەی کە ئەو کافرانە کۆی‌ئەکەنەوە.

وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى اللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ إِن يَنصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا الَّذِي يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ ۗ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَن بَاءَ بِسَخَطٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾



(١٥٨) ئەگەر بیشمرن یا بکوژرێن حەشرتان لای خودایەو ئەو حیساب و کیتابتان لەگەڵ ئەکات.

(١٥٩) لەبەرئەوەی کە خودا بە میهرەبانی دروست کردووی‌و دڵت پڕ بەزەییە، ئەرم بوویت بۆیان و لەگەڵیان گونجای. خۆ ئەگەر ئینسانێکی توندخوو بوویتایە بڵاوەیان لێ ئەکردو لێت دوور ئەکەوتنەوەو ئەڕۆیشتن بەم لاولادا. کەواتە لێیان ببوورەو داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە لە خودای گەورەو، لە کاروبارا پرسیان پێ‌بکەو ڕاوێژیان لەگەڵ بکە، جا کە بڕیارت دا کارەکە بکەی پشت بە یارمەتیی خودا ببەستەو، دەست لە دەست و قەوەت لە خودا؛ بێ‌گومان خودا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە پشتی پێ ئەبەستن.

(١٦٠) ئەگەر خودا یارمەتیتان بدات کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێت، خۆ ئەگەر وازتان لێ بهێنێ‌و لێتان نەپرسێتەوە ئیتر کێیە یارمەتیتان بدات پاش ئەوە کە ئەو شکستتان بدات؟ دەبا موسوڵمانان هەر بە خودا پشت ببەستن.

(١٦١) بۆ هیچ پێغەمبەرێ ڕەوا نەبووەو ڕووی‌نەداوە خیانەت لە تاڵانیدا بکات‌و بە ناعادیلانە تاڵانی کافران بەسەر موسوڵمانانا دابەش بکات. هەرکەس خیانەت بکا لەو تاڵانییەداو بە ناحەق شتێ بۆ خۆی هەڵبگرێ ڕۆژی قیامەت ئەوەی کە خیانەتی تیا کردوە بە کۆڵ هەڵیئەگرێ‌و ئەیهێنێتەوەو هەموو پێی ئەزانن. جا پاش ئەوە هەموو نەفسێ پاداشی کارو کردەوەی خۆی وەرئەگرێ، نە چاکەکەر لە پاداشی کەم ئەکرێتەوەو نە خراپەکەر زیاد لە تاوانی بۆ ئەکرێتە سەربار.

(١٦٢) ئایا کەسێ بە دوای ڕەزامەندیی خودادا بگەڕێ‌و هەمیشە خەریکی کرداری چاك بێ، وەك ئەو کەسەیە کە بەهۆی کرداری نارەوایەوە تووشی ڕقی خودا بووبێ‌و خودا غەزەبی لێ گرتبێ کە ئەنجامی دۆزەخەو ئەوەیش ناخۆشترین ئەنجامە!؟ بێ گومان ئەم دوانە وەك یەك نین. (١٦٣) ئەمانە خاوەنی پلەو پایەی جیاجیان لە لای خودا، هی وایان هەیە لە دوارۆژا لە نازو نیعمەتا ئەژین و هی وایان هەیە سزای دۆزەخ پاداشیانە، خودا هەموو کارو کردەوەییێکیان ئەبینێ‌و هیچی لێ ون نابێ. (١٦٤) خودا چاکەییێکی زۆر گەورەی لەگەڵ موسوڵمانان کرد کە هەر لە خۆیان‌و لە هۆزی خۆیان و لە هاوزوبانیان پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردن ئایەتەکانی قورئانیان بۆ بخوێنێتەوەو لە تاوانی کوفرو گوناهو ڕەوشتی ناشیرین پاکیان بکاتەوەو قورئان و سوننەتیان فێر بکات، ئەگەرچی لەوەوپێش لە گومڕاهیی‌و جەهالەتدا بوون. بەتایبەتی مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە قەومەکەی پێغەمبەرە (د.خ) کە ئیمانیان پێ هێنا. دیارە ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کە زیاتر لە خەڵکی‌تر سوودیان لێ وەرگرتو ڕاستەوخۆ لەگەڵیا بوون و چاك ئەیانناسی. ئەگینا پێغەمبەر (د.خ) بۆ هەموو عالەم نێرراوە.

(١٦٥) ئەوە ئێوە بۆچی کە مسیبەتێکتان تووش بوو و لە غەزای ئوحوددا حەفتا کەستان لێ کوژرا، وتتان: ئەم مسیبەتەمان لە کوێوە تووش بوو؟ خۆ خودا بەڵێنی پێ دابووین یارمەتیمان بدات و سەرمان بخات! کەچی ئێوە لە غەزای بەدردا دوو ئەوەندەتان زیان لە کافرەکان دا؛ حەفتاتان لێ کوشتن و لێ بەدیل گرتن؟ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەو بەڵاو کزییەی تووشتان بوو خەتای خۆتان بوو کە بەگوێی پێغەمبەرتان نەکرد. خودا بەسەر هەموو شتێکدا توانایەو، ئەتوانێ سەرتان بخات و ئەشتوانێ زیانتان لێ بدات.

وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞ يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٧١﴾ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾

الحزب ٨



(١٦٦) ئەوەی تووشتان هات، لە ڕۆژی ڕووبەڕووبوونی موسوڵمانان و کافران لە غەزای ئوحوددا، بە ئیزنی خودا بوو، تا عیلمی عەلاقەمەند ببیێ بە موسوڵمانە ساغەکانەوە. دیارە مەبەست ئەوەیە موسوڵمانە ساغەکان جیا ببنەوە لە منافقەکان.

(١٦٧) هەروەها تا منافقە دووڕووەکان دەرکەون بۆ خەڵق و لە موسوڵمانەکان جیا بکرێنەوە، کە ئەمان موسوڵمانن و بە ڕاستی جیهاد ئەکەن و ئەوان دووڕوو و درۆزنن. بەم منافقانە وترا: وەرن یا لە ڕێگای خوادا شەڕ بکەن یا هەر هیچ نەبێ دوژمن لە خۆتان و لە ماڵتان دوور بخەنەوە! لە جوابا وتیان: ئەگەر ڕێوشوێنی شەڕمان بزانیایە دواتان ئەکەوتین و ئەجەنگاین. ئەمانە بەم وەزعەیانەوە لە کافرییەوە نزیکترن تا لەموسوڵمانی، ئەوەی بە دەم ئەیڵێن غەیری ئەوەیە کە لە دڵیاندایە. خوا ئاگادارترە لە هەموو کەس لەوەی کە لە دڵا ئەیشارنەوە.

(١٦٨) ئەو منافقانەی لەکاتێکا کە خۆیان دانیشتبوون و شەڕیان نەئەکرد، سەبارەت بە برادەرەکانیان ئەیانوت: ئەگەر بەگوێی ئێمەیان بکردایە نەئەکوژران، واتە چوون بۆ جەنگ بۆیە کوژران! دیارە ئەم منافقانە باوەڕیان بە قەزای خودا نەبوو! جا ئەی موحەممەد تۆ بەو زەلامانە بڵێ: ئەگەر ڕاست ئەکەن مەنعی مردن لە خۆتان بکەن بزانم ئەتوانن !؟

(١٦٩) ئەوانەی لە ڕێگای خوادا کوژراون هەرگیز وا مەزانن مردوون، نەخێر؛ ئەوانە زیندوون و لای خودا ڕۆزییان ئەدرێتێ.

(١٧٠) شادمانن بەو بەش و بەهرەی خودا بە لوتف و گەورەیی خۆی پێی بەخشیون، خۆش وەخت و شادمانن بە حاڵی ئەو موسوڵمانە ساغانەی کە لە دوایان ماون و ئەزانن ئەوانیش پاداشیان جوان و پایەیان گەورە ئەبیۆ هیچ ترس و ناخۆشییان لەسەر نابیۆ لە سێبەری لوتفی خوادا ئەحەسێنەوەو بە پاداشی ڕەوای خۆیان ئەگەن.

(١٧١) خۆش وەخت و شادمانن بەو نیعمەتەی لەلای خوداوە پێیان گەیشتووە لەگەڵ پایەی بەرزو پاداشی زیادەدا. دڵنیان کە خودا هەرگیز پاداشی خاوەن ئیمانەکان زایە ناکات و بە زیادەوە پێیان ئەبەخشێت.

(١٧٢) ئەوانەی پاش ئەو زیان وکوشتارەی تووشیان بوو چوون بەدەنگی ئەمری خوداو ئامۆژگاریی پێغەمبەرەوە، بۆ ئەوانەیان کە کرداری چاك ئەکەن و لە خودا ئەترسن و خۆیان لە گوناه ئەپارێزن پاداشێکی گەورە هەیە.

(١٧٣) ئەو موسوڵمانانەی کە بیستیان ئەبووسوفیان و جەماعەتەکەی دووبارە گەڕاونەتەوە بۆ شەڕکردن، دوای پێغەمبەر کەوتن و، لەگەڵ برین و ئازاریشدا بەرەو دوژمن ڕۆیشتن و نەیانویست لەو پاداشە بێبەش بن، لە ڕێگا تووشی جەماعەتێکی هۆزی (عبدقیس) بوون پێیان وتن: ئەبووسوفیان و جەماعەتەکەی خۆیان کۆکردووەتەوە بۆتان، بەم قسەیە ویستیان موسوڵمانەکان بترسێنن، بەڵام ئەمان نەترسان، بەڵکو ئیمانیان بە خودا زیاتر بوو و وتیان ئێمە خودامان بەسە بۆ یارمەتیدانمان، خودا باشترین پشت و پەنایە.

فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِۚ إِنَّهُمۡ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٧٩﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١٨٠﴾



(١٧٤) جا کە شەڕ تازە نەبوویەوەو کافرەکان بەرەو مەککە گەڕانەوە، ئەو موسوڵمانانە شوێنەکەیان بەجێهێشت و، بە کۆڵێ نیعمەت و کەرەمی خوداوە گەڕانەوەو، باوەڕیان بە خوداو یارمەتیدانی بەهێزتر بوو. هەروەها لەو شوێنەدا هەندێ مامەڵەیان بۆ ڕێککەوت کە قازانجێکی باشیان تیا دەس کەوت. بێجگە لەمانەیش هیچ جۆرە زیانێکیان تووش نەبوو. هەوڵیان دا بۆ ڕەزامەندیی خودا کە سەرچاوەی هەموو بەختیارییەکە. بێگومان خودا خاوەنی بەخششێکی گەورەیە.

(١٧٥) قسەی پڕوپووچی وا کە عەزیمەتی ئینسان سست ئەکات وەسوەسەی شەیتانە کە دۆستانەکانی خۆی ئەترسێنێ، ئەوانەی دانیشتن و لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەی جەنگ نەبوون. ئێوە ئەی موسوڵمانەکان لە کافرەکان مەترسن، ئەو بێئابیینانە پیاوی ئەوە نین ئێوە لێیان بترسن. لە من بترسن و پشت بە یارمەتیی من ببەستن ئەگەر خاوەن ئیمانن.

(١٧٦) خەفەت مەخۆ کە منافقەکان گورج ئەچنە ناو بەرەی کوفر، یا لە ئیسلام هەڵئەگەڕێنەوە. لەوە مەترسە کە ئەوانە کافرەکان بەهێز بکەن و زیانت پێبگەیێنن. ئەوانە ناتوانن زیان بە دۆستانی خودا بگەیێنن. خودا ئەیەوێ هیچ بەش و بەهرەو پاداشتێکیان نەداتێ. ئەمانە لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی گەورە ئەدرێن.

(١٧٧) بێگومان ئەوانەی کوفر پەسەند ئەکەن و پشت لە ئیمان ئەکەن، ئەوانەی بەختیاریی ئەبەدی ئەگۆڕنەوە بە خۆشییەکی کاتیی دنیا، ئەوانە هیچ زیانێ بە خودا ناگەیێنن، بەڵکو زیان بە خۆیان ئەگەیێنن و لە ڕۆژی قیامەتدا سزای توندو بەئازار ئەدرێن. (١٧٨) با کافرەکان وا نەزانن ئێمە کە مۆڵەتیان ئەدەین و عومریان درێژ ئەکەین قازانجی ئەوانە! نەخەیر بەڵکو بۆیە مۆڵەتیان ئەدەین تا زیاتر گوناهبار بن و تاوان بخەنە سەر تاوان. ئەوانە سزاو ئازارێکی تیژ ئەدرێن کە هۆی سووکیو شەرمەزارییانە.

(١٧٩) خودا هەروەها بەو تێکەڵییە ناتانهێڵێتەوە کە موسوڵمان لە منافق جیا نەبێتەوە! نەخەیر بەڵکو لە ڕێگای وەحییەوە بۆ پێغەمبەر موسوڵمانەکان لە منافقەکان جیا ئەکاتەوە. هەروەها لە ڕێگای داواکردنی کاری گران و جیهادو بەخشینی ماڵ و خۆگرییەوە لە ڕێگای خوادا تاقیتان ئەکاتەوە، تا بۆ خەڵك دەرکەوێ کێ موسوڵمانەو ئەیکات و، کێ منافقەو نایکات. بەڵێ خودا ئاوا جیاتان ئەکاتەوە، تا پیس لە پاك جیابکاتەوە. خودا ئاگادارتان ناکا لە کاریغەیبیو لەوەی لە دڵی خەڵکدا هەیە، بەڵکو ئەوەی مەیلی لێ بێ لە پێغەمبەران هەڵیئەبژێریو بە وەحی ئاگاداری ئەکا کە کێ موسوڵمانەو کێ منافقە. بەڕاستی ئیمان بە خوداو بە پێغەمبەران بێنن. بێگومان ئەگەر ئیمانتان ببێو خۆتان لە گوناه و کاری ناڕەوا بپارێزن پاداشی گەورەتان لەلایەن خوداوە دەس ئەکەوێ.

(١٨٠) ئەو کەسانەی ڕژدی ئەکەن لەو خێرو بێرەی خوا پێی داون بە لوتفی خۆی، با وا نەزانن ئەو ڕژدییە چاکە بۆیان، نەخەیر شەڕو مایەی نەگبەتییە بۆیان و، لە قیامەتدا ئەو ماڵەی لەڕێگای خوادا سەرفیان نەکردوە، واتە: ئەو حەقەی لەسەریانەو جێبەجێیان نەکردوە، واتە ئەو زەکاتی ماڵەی نەیانداوە، ئەبێتە تەوق و ئەخرێتە گەردنیان. میرات و سامانی ئەرزو ئاسمان هەر بۆ خودایە و، خودا ئاگای لە هەموو کردەوەیەکتانە.

لَقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ۞ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًا وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾



(١٨١) خودا قسەی ئەوانەی بیست کە ئەیانوت: بۆ زەکات بدەین؟ دیارە خودا فەقیرەو ئێمە دەوڵەمەندین! خودا ئاگای لێیانەو ئەم قسە نارەوایەیان ئەنووسێ. کوشتنی بەناحەقی پێغەمبەرانیشیان لەسەر ئەنووسێ. قسەی وەها لەمانەوە شتێکی سەیر نییە. یەکێ پێغەمبەرێ بە ناحەق بکوژێ لەمە خراپتریش ئەکات. ئێمەیش لە ڕۆژی دواییدا ئەڵێین: ئەوە دەردتان بێ، سزای نابارى ئاگری دۆزەخ بچێژن.

(١٨٢) ئەو سزایە پاداشی ئەو کارانەیە لە دنیادا کردتانن و لە خودا نەترسان و بێگوێیی پێغەمبەرتان کرد، ئەگینا خودا هەرگیز ستەم لە بەندەی خۆی ناکات.

(١٨٣) ئەو جوولەکانە کە وتیان: خودا پەیمانی لەگەڵ کردووین باوەڕ بە هیچ پێغەمبەرێ نەکەین بەمەرجێ نەبێ قوربانییێکمان لە ئاسمانەوە بۆبهێنێو داوا لە خودا بکات ئاگرێ لە ئاسمانەوە بێت ئەو قوربانییە بخوات و بیکاتە ئاگر. تۆئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: خودا پەیمانی وای لەگەڵ نەکردوون و ئێوە درۆ ئەکەن. موعجیزە هەر موعجیزەیە چ قوربانییەکی وەها بێ کە ئێوە ئەیڵێن و چ غەیری ئەوە. ئەوا فەرزمان کرد ڕاستتان کرد، خۆ پێش هاتنی من چەند پێغەمبەرتان بۆ هات بە ئایەت و موعجیزەوە تەنانەت ئەو موعجیزەیەیشیان پیشان دان کە ئێستە وتتان و داوای ئەکەن، ئەگەر ڕاست ئەکەن بۆچی کوشتنتان ؟!.

(١٨٤) جا ئەگەر باوەڕیان پێ نەکردی زویر مەبە، پێش تۆیش گەلێ پێغەمبەر بە درۆزن دانراون و باوەڕیان پێ نەکراوە، ئەگەرچی موعجیزەو کتێب و ئامۆژگاریو کتێبی شەریعەت و حوکمیشیان هێنا بوو!

(١٨٥) هەموو گیانلەبەرێ ئەبێ تاڵاوی مەرگ بچێژێو ئەم دنیایە بەجێبێڵێ. جا لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتان پێ ئەدرێت. ئیتر ئەوەی لە سزای ئاگری دۆزەخ لادراو خرایە بەهەشت، ئەوە بەختیارو سەرکەوتووەو ڕابواردنی دنیاو دارایىو سامانى هەموو بێسوودن و هۆی لە خۆباییبوون و خەڵەتانی بنیادەمن.

(١٨٦) قەسەم بە خودا ئێوە ئەی موسوڵمانەکان لەلایەن خوداوە تاقی ئەکرێنەوەو تووشی زیان ئەبن لە ماڵ و سامانتاندا لەسەر دەستی کافرەکان، لێتان ئەکوژرێ وەك لە بەدرو ئوحودا. هەروەها لە ئەهلی کیتاب و لە موشریکەکانەوە قسەی وەها ئەبیستن ئازاری دڵتان ئەدات، وەك بوختان و جنێوو قسەی ناشیرینی تر. بەڵام ئێوە ئەگەر خۆتان بگرن و لەخودا بترسن و خۆتان بپارێزن، ئەو خۆگرىو لە خوداترسان و خۆ لە گوناه پاراستنە کارێکی ئێجگار گەورەیەو پاداشی چاکی لەسەر وەرئەگرن.

وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ
وَلَا تَكۡتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ وَٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦ ثَمَنٗا
قَلِيلٗاۖ فَبِئۡسَ مَا يَشۡتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡرَحُونَ
بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحۡمَدُواْ بِمَا لَمۡ يَفۡعَلُواْ فَلَا تَحۡسَبَنَّهُم
بِمَفَازَةٖ مِّنَ ٱلۡعَذَابِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِي
خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ
لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا
وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾
رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدۡ أَخۡزَيۡتَهُۥۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ
أَنصَارٖ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ
ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا
سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا
عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾



(١٨٧) یادی ئەوە بکەنەوە کە وەختی خۆی خودا پەیمانی لە زاناکانی ئەهلی کیتاب سەندو ئەمری پێ کردن فەرمانەکانی خوداو ئەوەی لە کتێبەکەیاندا هەیە بۆ خەلکی ڕوون بکەنەوەو شارەزاییان بکەن و حوکمی خودا نەشارنەوە. کەچی ئەوان پەیمانەکەی خودایان خستە پشتەوەو گوێیان پێ نەداو لەباتی ئەوە نرخێکی کەم و بێبایەخی دنیاییان وەرگرت. ئای کە شتێکی زۆر ناشیرین و بەد بوو ئەوەی کڕییان !.

(١٨٨) ئەوانەی بە کردەوەی ناشیرینی خۆیان شادمان ئەبن و حەز ئەکەن بەرامبەر بە چاکەیێ کە نەیانکردووە مەدحو ستایش بکرێن، هەرگیز گومان نەبەی لە سزا ڕزگار ئەبن، نەخەیر ئەوانە ڕزگاربوونیان نییەو سزایەکی بە ئازار ئەدرێن لە ڕۆژی قیامەتدا.

(١٨٩) هەرچی موڵك و سامانی ئەرزو ئاسمانەکانە هەمووی هی خودایەو هەر ئەو خاوەنی ڕاستەقینەیەتی، خودا دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو هەموو شتێکی پێ ئەکرێ.

(١٩٠) بێگومان لە دروستکردنی ئاسمانەکان و ئەرزو یەك بەدوای یەکا هاتنی شەوو ڕۆژدا چەند دەلیل و نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن فام و هۆشن، دەلالەت ئەکەن لە گەورەییو دەستەڵاتی خوداو، لەوەی کە یەکەو هاوبەشی نییە. ئەم ئایەتانە بەئاشکرا ئەوە ئەگەیێنن کە ئەم کەون وکائیناتە بە بێ دروستکەرێ نابێ.

(١٩١) ئەوانەی بە پێوەو بە دانیشتنەوەو بە ڕاکشانەوە، واتە: لە هەموو حاڵێکدا ناوی خودا ئەهێنن و بیر لە دروستکردنی ئەرزو ئاسمانەکان ئەکەنەوەو ئەڵێن: خودایا! تۆ ئەمانەت بەخۆڕاییو بێکاکڵ دروست نەکردووە، پاکیو بێخەوشی بۆ تۆیە، خوایە! تۆ لەوە دووری کە شتی بێهوودە دروست بکەیت. خودایا بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ.

(١٩٢) ئەڵێن: خودایا ئەو کەسەی بیخەیتە دۆزەخ ئەوە بەتەواوی ئابڕووت بردوەو ماڵوێرانت کردوە. بێگومان ئەو ستەمکارانەی ئەیانخەیتە ئاگری دۆزەخ، هیچ یارمەتیدەرێکیان نییە.

(١٩٣) ئەڵێن: خودایا! ئێمە: گوێمان لە بانگدەرێ بوو خەلکی بانگ ئەکرد بۆ ئیمان و بۆ ئایینی ئیسلام، ئەیوت: ئیمان بەو خودایە بێنن کە پەروەردەی کردوون! ئێمەیش ئیمانمان هێناو موسوڵمان بووین. خودایا! لە گوناهە گەورەکانمان ببوورەو بە گەورەییو میهرەبانیی خۆت لە گوناهە بچووکەکانمان خۆش ببەو، لەگەڵ زومرەی پیاوچاکان و دۆستەکانی خۆتا بمانمرێنەو لەگەڵ ئەوان حەشرمان بفەرموو.

(١٩٤) ئەڵێن: خودایا! ئەو پاداشەی بەڵێنت پێ داوین بەرامبەر بە باوەڕکردن بە پێغەمبەران و ئەوەی لە ڕێگای ئەوانەوە بەڵێنت پێ داوین، پێمان کەرەم بفەرموو و لە ڕۆژی قیامەتدا سەرشۆڕو ماڵوێران و ناهومێدمان مەکە. بێگومان تۆ هەرگیز خیلاف وەعدەیی ناکەیت و بە لوتفی خۆت ئەوەی بەڵێنت دابێ جێبەجێی ئەفەرمووی.

فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى سَبِيلِى وَقَٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾

## سُورَةُ النِّسَاءِ

ترتيبها ٤ — آياتها ١٧٦



(١٩٥) خودا تکاکەی قوبوولّ کردن و ئاواتیانی هێنایەدی و، وتی: من هەرکەس لە ئێوە کارێکی چاك بکا پاداشی لەکیس نادەم پیاو بێ یا ئافرەت، کە هەندێکتان لە هەندێکتانن، یا تێکەلّیتان هەیەو پێکەوە هەلّئەستن و دائەنیشن و یەك ئایین کۆتان ئەکاتەوە، ئەوانەی مالّ و حالّی خۆیان بەجێهێشت و لە شوێن و بەرەی خۆیان دەرکران و، لەپێناوی ڕەزامەندیی مندا ئازاردران و چوونە ڕیزی جیهادو لەگەلّ کافرەکان جەنگان و لێیان کوژرا، ئەوانە گوناهەکانیان ئەسڕینەوەو ئەیانخەینە چەند باغچەیێکی ڕازاوەو جوان لە بەهەشتدا کە چەند جۆگایێکی جوان و ڕوون و سازگاریان پیا ئەڕوات. ئەمە پاداشی کردەوەی چاکیانە کە لەلایەن خوداوە پێیان ئەدرێ، خودا پاداشی جوانی لایە.

(١٩٦) با دەست ڕۆیشتن و ڕابواردن و هاتوچۆی کافرەکان بەم لاولادا بۆ بازرگانیو دیدەنیو شتی تر، نەتخەلّەتێنن.

(١٩٧) ئەمەی ئەیبینی ڕابواردنێکی کەموکورتە، لەپاشاندا دواشوێنیان دۆزەخە، کە پیسترین سەرەنجامە.

(١٩٨) بەلّام ئەوانەی لە خودا ئەترسن چەند باغ و لالەزاریان هەیە لە بەهەشتا کە جۆگای پاك و جوانیان بەناودا دەڕوا. ئەوانە هەتا هەتایە لەم شوێنەدا ئەمێننەوە. ئەم پاداشە نیعمەتێکە لە لای خوداوە بۆیان ئامادە کراوە. بۆ ئەوانەی لەخوداترس و کردەوەچاکن بەش و بەهرەی خودا لە هەموو شت چاکترە.

(١٩٩) کیتابیی وا هەن ئیمانیان هەیە بە خوداو، بە قورئان کە بۆ ئێوە نێرراوەو، بەو کتێبەی بۆ خۆیان نێرراوە، لە خودا ئەترسن و خۆیان لە گوناه ئەپارێزن و ئایەتەکانی خودا بەرامبەر دەستکەوتێکی بێ بایەخ نافرۆشن. ئەوانە پاداشیان لای خودایە. خودا گورج موحاسەبە ئەکات و گورج پاداش ئەداتەوە.

(٢٠٠) ئەی موسولّمانینە! خۆگر بن لە خوداپەرستیداو، لە کاتی ناڕەحەتیدا. بە سەبرو خۆگرتن بەسەر دوژمنەکانتاندا زالّ بن، بە خۆتان و ئەسپ و ئەسبابی جەنگەوە لەسەر سنوور بن و، ئامادەبن بۆ جەنگ لەگەلّ کافران. هەروەها نەفسی خۆتان لەسەر خواپەرستیو لەخواترسان ڕابهێنن، تا بەتەواوی سەرئەکەون و ئەگەنە ئەوپەڕی بەختەوەری.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُوا۟ ﴿٣﴾ وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا ﴿٤﴾ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾ وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا۟ ۚ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾



## سوورەتی (النِّسَاءِ)

**مەدینەیی‌یەو (١٧٦) ئایەتە**

(١) ئەی ئادەمزادینە! لە خودای خۆتان بترسن، ئەو خودایەی ئێوەی لە نەفسێکی تەنیا، کە ئادەمە، دروست کردوەو، هەر لەویش هاوجووتەکەیی دروست کردوەو، لەم دوانەوە پیاوان و ژنانی زۆری دروست کردوەو بلاّوبوونەتەوە. لەو خودایە بترسن کە بە ناوی ئەوەوە لەناو خۆتاندا داوای شت لە یەکتر ئەکەن، بۆ نموونە: ئەڵێن توخودا فلاّنە شتم بدەریّ، فلاّنە ئیشم بۆ جیّبەجیّ بکە. هەروەها خزمایەتی ڕاگرن و مەیپچڕێنن. بیّگومان خودا ئاگای لێتانەو ئەتانپارێزیّ.

(٢) هەرچی ماڵێکی هەتیوانتان لایە کە گەورە بوون و پێگەیشتن بیاندەنەوە. ماڵی حەلاّڵی پاك و خاوێنی خۆتان مەگۆڕنەوە بە ماڵی حەرام، واتە: حەلاّڵی خۆتان بخۆن و لە ماڵی حەرامی هەتیوان خۆتان دووربخەنەوە، ماڵی هەتیوان تێکەڵ مەکەن لەگەڵ ماڵی خۆتان و پێکەوە مەیانخۆن؛ چونکە ماڵی خۆتان حەلاّڵە بۆتان و ڕەوایە بیخۆن، بەلاّم هی ئەوان حەرامەو ئاگرە ئەچێتە سکتانەوەو، خواردنی ماڵی هەتیو گوناهێکی گەورەیە.

(٣) ئەگەر ترسان لەوەی کە عەدالەت نەکەن لەگەڵ کچە هەتیوەکان کە مارەیان ببڕن، ئەوا واز لە ئافرەتی هەتیو بێنن و، ئەوانەی بەدڵتانن لە کچانی ناهەتیو مارە بکەن، دوان، یا سیان، یا چوار، ئەگەر ترسان لەوەی لەنێوان ئەم ژنانەتاندا عەدالەت نەکەن ئەوا هەریەك ژن بێنن، یا لەگەڵ ژنە (جاریە)ی کڕراوتان دا ڕابوێرن. ئەم ڕێگایە نزیکترین ڕێگایە بۆئەوەی لە حەق لانەدەن.

(٤) مارەیی ژنەکانتان بدەن بە ڕەزای دڵ و بە بیّ موقابیل. جا ئەگەر ئەوان بە ڕەزای خۆیان لە بەشێکی ئەو مارەییە خۆش بوون ئەوا بیخۆن و نۆشی گیانتان بیّ.

(٥) ئەو ماڵ و سامانەی هی سەفیهەکانەو لەژێر دەستی ئێوەدایەو ئێوە سەرپەرشتی ئەکەن، مەیدەنە دەست ئەو سەفیهانە چونکە زایەی ئەکەن. بەلاّم ئەو ماڵە بخەنەکارو مامەڵەی پیّ بکەن تا قازانج بکات و لە قازانجەکەی ڕۆزییان مسۆگەر بکەن و بەرگ و پۆشاکیان بۆ بکەن. بەشێوەیێکی چاك و بەشەرع ڕەوا قسەیان لەگەڵ بکەن با دڵیان خۆش بیّ.

(٦) چاوتان لە هەتیوەکانەوە بیّ و، ئیشیان پیّ بکەن و فێری مامەڵەیان بکەن و، ئاگاداریان بن بزانن لە کاروباری دینیو دنیاییو مامەڵەیاندا چۆنن تا ئەگەنە کات و تەمەنی شووکردن و ژن هێنان. جا گەر بۆتان دەرکەوت وریاو لیّهاتوون ئەوا بە بیّدواخستن هەموو ماڵەکانیان بدەنەوە. بە پەلەو ئیسراف ماڵەکانیان مەخۆن لە ترسی ئەوەی گەورە بن و بیبەنەوە. با ئەو کەسە کە وەصی یا وەلیی هەتیوەکانە ئەگەر دەوڵەمەند بوو خۆگری بکا لە خواردنی ماڵی هەتیوەکان و لێیسەرف نەکا. خۆ ئەگەر هەژار بوو ئەوا بەرامبەر سەرپەرشتیکردن و هەڵسووڕاندنی ئەو ماڵە تەنها بە ئەندازەی پێویست لێی بخوا. جا کە ماڵەکانتان دانەوە لە کاتی دانەوەکەیدا شاهید بگرن؛ تا ماوەی ئینکار کردن نەمێنیو حەقی کەس نەفەوتیّ. خودا باشترین ئاگادارو چاودێرە.

لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾



(٧) پیاوان لە میراتی باوك و دایكیان و لە میراتی ئەو خوێشە زۆر نزیكانەیان كە میرات لە یەك ئەبەن، بەشیان هەیە. هەروەها ژنانیش لە میراتی باوك و دایك و ئەو جۆرە خوێشانە كە وتمان بەشیان هەیە. ئەم بەشە حەقێكەو خودا دایناوەو، نابێ لێیان داگیر بكرێ.

(٨) ئەگەر خزمانی غەیرە میراتبەرو هەتیوو گەداو بێ دەستەلاَت حازری مەجلیسی بەشكردنی میراتەكە بوون، لەو میراتە بەشیان بدەن و قسەی خۆشیان لەگەڵ بكەن و دڵیان مەشكێنن‌و منەتیان مەخەنە سەرو، ئەوەی ئەیاندەنێ بە شتێكی كەمی بزانن و دۆعای خێریان بۆ بكەن.

(٩) با ئەوانەی میرات وەرئەگرن و، خزم‌و هەتیوو هەژارانیان لا كۆئەبنەوە، وا فەرز بكەن كە خۆیشیان ئەمرن و منالەكانیان دەستەپاچەو لانەواز داماون و ئەڕۆنە ئەو شوێنانەی میراتیان تیا بەش ئەكرێ‌و چاوەڕوانی دەست و دەهەنەیان ئەبن. هەروەكو حەز ئەكەن بەشیان بدەن و ئیحتیاجییان جێبەجێ بكەن، بەشی ئەو هەتیوو خوێش و هەژارانەیش بدەن و دڵیان خۆش بكەن. با لە خودا بترسن و قسەی دامەزراوی شەرعییان لەگەڵ بكەن.

(١٠) بەڕاستی ئەوانەی بە ناحەق و بە ستەم و دەستدرێژی ماڵی هەتیو ئەخۆن ئەوە ئاگر ئەخۆن و ئەو ماڵە ئەبێتە ئاگر لە سكیاناو، لە قیامەتیشدا ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخ و تیا ئەبرژێن.

(١١) خودا دەربارەی میرات وەرگرتنی ئەولادەكانتان ئامۆژگاریتان ئەكات و پێتان ڕائەگەیێنێ كە نێرنیە دوو ئەوەندەی مێینەی هەیە. جا ئەگەر ئەولادەكان ئافرەت بوون و زیاتر لە دوان بوون ئەوە لە سێ بەشی میراتەكە دووبەشی وەرئەگرن. بەلاَم ئەگەر یەك ئافرەت بوو ئەوە نیوەی میراتەكە ئەبا. باوك و دایكی مردوو هەریەكی شەشیەكی میرات ئەبەن ئەگەر مردووەكە منالی هەبوو نێر یا مێ، خۆ ئەگەر باوك و دایكی لێ بەجێ مابن و هیچ ئەولادی نەبوو ئەوە دایكەكەی لە سێبەشی میراتەكە بەشێكی ئەبات و ئەوی تری هی باوكەكەیەتی. ئەگەریش مردوەكە دایكی لێ بەجێ مابێ‌و چەند براو خوشكێكیشی هەبێ، واتە دوو برا یا دوو خوشك یا براو خوشكێ یا زیاتر، ئەوە لەو حاڵەتانەدا دایكەكە شەشیەكی میراتەكە ئەبات، ئەمەیش پاش دەركردنی وەسیەتی مردووەكەو دانەوەی قەرزوقۆڵەی، واتە وەسیەتەكەی جێبەجێ ئەكرێت و قەرزەكانی ئەدرێنەوە، ئەنجا ماڵەكە ئەكرێتە شەش بەش‌و دایكەكە بەشێكی ئەبا. ئێوە نازانن كام كەس لە باوك و دایك و ئەولادەكانتان سوودی زۆرترە بۆ دنیاو قیامەتتان. خودا خۆی ئەزانێ. ئیتر ئەم بەشانە كە دیاریكراون واجباتێكن لەلایەن خوداوە دانراون. خودا زانایەو كارەكانی پڕ حیكمەتن.

۞ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ فَإِن كَانُوٓاْ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾



(١٢) ئێوه ئەی پیاوەکان! لە میراتی ژنەکانتان نیوەی هی ئێوەیە، ئەگەر ئەولادیان نەبێ، بەڵام ئەگەر ئەولادیان هەبێ ئەوە چواریەکی میراتەکەیان هی ئێوەیە. ئەم نیوەو چواریەکەیش پاش لێدەرکردنی قەرزی ژنەکان و جێبەجێکردنی وەسیەتێکە کردبێتیان. ژنەکانیش لە میراتی ئێوە چواریەك ئەبەن ئەگەر ئەولادتان نەبوو، ئەگەر ئەولادیشتان بوو ئەوە هەشتیەکیان بەرئەکەوێ. ئەمانەیش پاش جێبەجێکردنی وەسیەتی ئێوەو دانەوەی قەرزتان. ئەگەر پیاوێ یا ژنێ مردو (کەلالە) بوو، واتە: نە باوکی هەبوو نە ئەولاد، بەڵام برایەکی یا خوشکێکی هەبوو ئەوە هەر یەکێ لەوانە شەشیەکی میراتەکەی ئەبات، بەڵام ئەگەر زیاتر بوون، دووبرا، یا دوو خوشك ئەوە بە هەموویانەوە سێیەکی میراتەکەی ئەبەن بەبێ جیاوازی لەنێوان براو خوشکدا. ئەمەیش پاش جێبەجێ کردنی وەسیەتی مردوەکەو دانەوەی قەرزی، بەو شەرتەی وەسیەتەکەی وەها نەبێ زیان لە میراتبەرەکان بدات و لە سێیەکی میراتەکە زیاتر نەبێ. ئەمە ئامۆژگارییە بۆ ئێوە لەلایەن خوداوە. خودا زانایەو خاوەن حیلم و لێ بووردوەو گورج تۆڵە ناسێنێت و مۆڵەتی تاوانبار ئەدات.

(١٣) ئەمانەی کە باسکران فەرمانی خودان و سنوورن بۆی داناون، جا هەر کەس لە سنوور لانەدات و بەگوێی فەرمانەکانی خوداو ڕاسپێرییەکانی پێغەمبەر بکات ئەوە خودا ئەیخاتە چەند باغچەو لالەزارێ لە بەهەشتدا کە جۆگای جوان و سازگاریان پیا ئەڕوات و هەتا هەتایە بە سەربەرزی تیا ئەمێننەوە. بێگومان هەر ئەمەیش سەرکەوتنی گەورەیە.

(١٤) هەروەها هەرکەسێ بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا نەکات و لەو سنوورە لابدا کە خودا دیاری کردوە، ئەوە خودا ئەیخاتە ئاگرێکەوە هەتا هەتایە تیا ئەمێنێتەوەو، سزایەکی وەها ئەدرێ هۆی سووکیو سەرشۆڕییەتی.

وَٱلَّٰتِي يَأْتِينَ ٱلْفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَٱسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي ٱلْبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا ﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأْتِيَٰنِهَا مِنكُمْ فَـَٔاذُوهُمَا فَإِن تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾



(١٥) ئەو ژنانەتان کە زینا ئەکەن داوا لەو کەسە بکەن کە نیسبەتی زینای لێ داون بۆ ئیسباتی ئەو توهمەتە چوار شاهیدی عادڵ و شەرع ڕەوا بێنێ، جا ئەگەر چوار شاهیدەکە شایەتییان لێ دان لە ماڵا حەپسیان کەن تا ئەمرن یا تا خودا ڕێگایان بۆ دائەنێ.

(١٦) ئەو پیاوو ژنەی زینا ئەکەن بە قسەو سەرزەنشت و بە سووکێ تەماشاکردن ئازاریان بدەن. جا ئەگەر پەشیمان بوونەوەو، تەوبەیان کردو ڕەوشتی خۆیان چاك کرد ئەوە وازیان لێبێنن. خودا زۆر زۆر تەوبە قبووڵ ئەکات و زۆر میهرەبانە. هەندێ لە ئەهلی تەفسیر ئەڵێن: ئەم ئایەتە پێش ئایەتی پێشوو نازڵ بووە، واتە: سزای زیناکەر بە سێ قۆناغ بوو: یەکەم بەم ئازاردانە کە ئێستە وتمان، دووهەم بە حەپس، سێهەم بە جەڵدەلێدان.

(١٧) ئەو تەوبە قبووڵ کردنە کە خودا وەعدی داوە بۆ ئەوانەیە بە ئەزانیو سەفاهەت گوناه ئەکەن و پاشان بە زوویی پەشیمان ئەبنەوە. ئەم جۆرە تاوانبارانە خودا تەوبەیان لێ قبووڵ ئەکات، خودا زانایەو کارەکانی پڕ لە حیکمەتن.

(١٨) خودا تەوبەی ئەوانە قبووڵ ناکا کە تا مردن یەخەیان ئەگرێ هەر کردەوەی خراپ ئەکەن و ئەو وەختە ئەڵێن: تەوبە بێ لە گوناه. نەخێر ئەوانە تەوبەیان لێ قبووڵ ناکرێت و، وەك ئەوانەن بە کافری ئەمرن. ئەوانە سزایەکی پڕ لە ئازارمان بۆ ئامادە کردوون. (١٩) ئەی موسوڵمانینە! بەشەرعی ئیسلام ڕەوا نییە بۆتان ژنی مردووەکانتان بە میرات بەرن، ئەو ژنانە ماڵ و سامان نین تا وەکوو بە میرات ببرێن، خاوەن کەرامەتن و ئارەزوویان بە دەستی خۆیانە. هەروەها ڕێیان لێ مەگرن کە پاش بەسەرچوونی عیددەیان بۆ خۆیان بەگوێرەی شەریعەت شوو بکەن. ڕێگایان لێمەگرن و بەهانەیان پێمەگرن بۆئەوەی چییان لە ماڵی مردووەکە بە میرات بەرکەوتووە لێیان بسێننەوەو جا پاش ئەوە ڕێگایان بدەن شوو بکەن! ئەم ڕێلێگرتنە کارێکی خراپ و ناڕەوایە مەگەر وەختێ کارێکی فاحیشە بکەن لەو وەختەدا بۆتان ڕەوایە فیدیەیان لێ وەربگرن و ئەنجا ڕێگای شووکردنیان بدەن.[ب] مەگەر فاحیشەیەکی ئاشکرا بکەن، وەك لە تاعەت دەرچوون و بەدخوویی لە ڕەفاقەتدا، یا داوێن پیسی. هەروەها پێیان ئەفەرموێ: موعامەلەی باش لەگەڵ ژنەکانتان بکەن و بە چاکە بجووڵێنەوە لەگەڵیان و، لەبەر حەزلێنەکردن لێیان جیا مەبنەوەو خۆگر بن، زۆر نزیکە ئێوە شتێکتان بەدڵ نەبیو حەزی لێ نەکەن کەچی خودا بیکاتە هۆی خێرێکی زۆر بۆتان.

وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّـٰتُكُمْ وَخَـٰلَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَـٰتُكُمُ ٱلَّـٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَـٰعَةِ وَأُمَّهَـٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَـٰٓئِبُكُمُ ٱلَّـٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّـٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَـٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَـٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾



(٢٠) ئەگەر ویستتان ژنێ تەڵاق بدەن و ژنێکی تر مارە بکەن و، وەختی خۆی ماڵێکی زۆرتان دابوو بە ژنە تەڵاقدراوەکە، ئەو ماڵەی لێ مەسێننەوە بە هیچ جۆرێ. ئایا ڕەوایە لە ڕێگای بوختان بۆکردن و گوناهەوە ئەو ماڵەیان لێبسێننەوە؟! هەی وایان هەبوو بوختانێکی بۆ ژنەکەی هەڵدەبەست تا ناچاری بکات ئەو ماڵەی کە وەختی خۆی پێیداوە بە فیدیە لێی بسێنێتەوەو ژنێکی تری پێ بهێنێ! بەم ئایەتە ئەم کارە بەدە قەدەغە کرا.

(٢١) چۆن ئەو مارەییو ماڵەیان لێ ئەسێننەوە لەکاتێکا کە ئێوە بە ڕێگای شەرعی لەگەڵیان تێکەڵ بوون و چوونەتە لایان و عەقدی نیکاحتان لەبەینا بووەو ژنەکانتان پەیمانێکی گەورەیان لەگەڵ بەستوون کە هەڵسان و دانیشتن و موعامەلەتان لەگەڵیانا بەگوێرەی شەرع بێ، کە ئەمری پێ کردوون بەچاکەکاری ؟

(٢٢) ئەو ژنانە مارە مەکەن کە باوك و باپیرتان مارەیان کردوون، حەرامن بۆتان، گوناهبار ئەبن لەسەر ئەو مارەبڕینە، ئەوە نەبێ پێش هاتنی ئەم ئایەتە بووبێ، بەوە گوناهبار نابن. هێنان و خواستنی ژنی باوکو باپیر زینایەو مایەی غەزەب و ڕقی خودایەو ڕێگایەکی زۆر خراپە.

(٢٣) حەرامە لەسەرتان مارەکردنی دایکەکانتان، واتە دایك و دایکی دایك هەتا بڕوا، یا دایکی باوك و دایکی تا بڕوا. حەرامە لەسەرتان مارەکردنی کچانتان و کچانی کچانتان تا بڕوا بەرەو خوار. حەرامە لەسەرتان مارەکردنی خوشکتان چ خوشکی باوکیو دایکیو، چ خوشکی باوکی، یا خوشکی دایکی. حەرامە لەسەرتان مارەکردنی پوورتان، خوشکی باوکتان، یا خوشکی دایکتان. حەرامە لەسەرتان مارەکردنی کچی براو خوشکتان. ئەمانەی باسمان کردن دەربارەی حەرامی نەسەب بوو. هەروەها حەرامە لەسەرتان مارەکردنی دایکی شیریتان یا خوشکی شیریتان. حەرامە لەسەرتان مارەکردنی دایکی ژنتان. حەرامە لەسەرتان مارەکردنی ڕەبیبەتان، واتە کچی ژنەکانتان لە پیاوێکی تر، ئەوانەیان لاتان بوون و ئێوە پەروەردەتان کردوون، بە شەرتێ حەرامە کە چووبنە لای دایکەکانیان، بەڵام ئەگەر نەچووبنە لای دایکەکانیان ئەوە گوناهبار نابن ژنەکانتان تەڵاق بدەن و کچەکانیان مارەبکەن بۆ خۆتان. هەروەها حەرامە ژنی کوڕتان مارە بکەن، ئەو کوڕانەی لە پشتی خۆتانن، واتە: ئەو کوڕانە نەبن کە تەبەننی کراون و کوڕی خۆتان نەبن، بەڵام لەناو خەڵکدا بە کوڕتان ناسرابن، چونکە ئەو جۆرە کوڕە تەبەننی کراوانە کوڕی ئێوە نین و، ئەگەر مردن یا ژنەکانیان تەڵاق دا، بۆتان ڕەوایە مارەیان بکەن بۆ خۆتان.

هەروەها حەرامە دوو خوشك مارەبکەن و پێکەوە لەژێر نیکاحتانا بن، واتە: ئەگەر ژنێکتان مارە کرد حەرامە خوشکەکەیشی مارە بکەن تا پێشووەکە ئەمرێ یا تەڵاق ئەدرێ.

هەموو ئەم جۆرە مارەکردنانە گوناهن و ئەبنە هۆی سزای ڕۆژی قیامەت، ئەوە نەبێ کە پێش حەرامکردنی ڕوویدابێ، ئەوە پێی گوناهبار نابن، بەڵام ئەبێ گورج لە یەك جیا بنەوە. خودا گوناهپۆش و میهرەبانە.

۞ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَۚ فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا تَرَٰضَيۡتُم بِهِۦ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡفَرِيضَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٢٤﴾ وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذۡنِ أَهۡلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ مُحۡصَنَٰتٍ غَيۡرَ مُسَٰفِحَٰتٖ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٖۚ فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡۚ وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٥﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمۡ وَيَهۡدِيَكُمۡ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَيَتُوبَ عَلَيۡكُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٢٦﴾





(٢٤) ئەو ژنانەی شوویان هەیەو بە نیکاح پارێزراون لە ئێوە حەرامن، بەڵام ئەو ژنە شوودارانەی لە جەنگدا دەستتان ئەکەون و، بەدیل ئەگیرێن و مێردەکانیان کافرن، ئەوانە حەڵاڵن بۆتان: چونکە بە گرتنەکە عیصمەتی مێردە کافرەکانیان نامێنێ. ئەم حەرامانەی باس کران خودا بڕیاری داوون و ئەو حەرامی کردوون. ئیتر غەیری ئەمانەی باس کران بۆتان حەڵاڵەو ئەتوانن بە ماڵ و سامانی حەڵاڵتان ژن بخوازن و مارەییيان بدەنێو ماڵیان بۆ سەرف بکەن و، خۆتان لە گوناھ بپارێزن و زینا نەکەن. ئەو ژنانەی ئەیانخوازن کە چوونە لایان فەرزە مارەییيەکانیان بدەنێ. ئیتر پاش دانی مارەییيە فەرزەکە تاوانبار نابن ئەگەر ئێوەو ژنەکانتان لەبەینی خۆتانا ڕێك بکەون، بۆ نموونە: ژنەکە هەندێ لەو مارەییيە ببەخشێ بە مێردەکەی یا مێردەکە زیاتر لە مارەییيە فەرزەکە بدا بە ژنەکەی، خودا زانایەو کارەکانی پڕ لە حیکمەتن.

(٢٥) کەسێکتان کە لەبەر هەژاری دەستی نەڕوات و نەتوانێ ژنی بە عیصمەتی موسوڵمانی ئازاد مارە بکات، با لە ئافرەتە مەملووکە موسوڵمانەکان مارە بکات. خودا لە هەموو کەس باشتر ئاگاداری ئیمانتانەو چاکتر ئەزانێ کێ موسوڵمانی ڕاستەقینەیە، ئێوە تەنها ظاهیرەکە ئەبینن. ئێوەو ئەو جاریانە کە مارەیان ئەکەن لەگەڵ یەك تێکەڵن و، ئایینی ئیسلام و نەسەب کۆتان ئەکاتەوەو، ڕەوایە مارەیان بکەن، جا کە وایە ئیزن لە خاوەنەکانیان وەربگرن و مارەیان بکەن و بە شێوەیەکی باش و عادەتی و بە بێ کەموکوڕی و دواخستن مارەییيەکانیان بدەنێ. لەو جاریانە پەسەند بکەن کە خۆیان لە زینا پاراستوەو داوێن پاکن و دۆستی پەنامەکییان نی‌یە.

جا کە مارەتان بڕین و هاتنە ژێر عیصمەتتانەوە ئەگەر هات و زینایان کرد ئەوا نیوەی ئەو حەددەیان بەسەردا جێبەجێ ئەکرێ کە بەسەر ژنە ئازادەکانا جێبەجێ ئەکرێ، بۆ نموونە: لەباتی صەد جەڵدە کە لە ژنی ئازادی زیناکردوو ئەدرێ ئەوان پەنجا جەڵدەیان لێ ئەدرێ، بەڵام ڕەجم ناکرێن، چونکە ڕەجم نیوەی نی‌یە. ئەم مارەبڕینی جاریەیە بۆ ئەوانەتانە کە ئەگەر ژن نەخوازن بترسن لەوەی تووشی زینا بن، بەڵام ئەگەر سەبر بکەن و دان بەخۆتانا بگرن و، ئافرەتی جاریە مارە نەبڕن، چاکترە بۆتان. خودا گوناھی بەندەی خۆی ئەپۆشێ و میهرەبانە.

(٢٦) خودا ئەیەوێ حوکمەکانی حەڵاڵ و حەرامتان بۆ ڕوون بکاتەوەو، شارەزای ڕێوشوێن و ڕەوشت و یاسای ئەو پێغەمبەرانەتان بکات کە لە پێش ئێوەدا بوون وەکوو ئیبراهیم و ئیسماعیل. هەروەها ئەیەوێ لە گوناھتان خۆش بێ و تەوبەتان لێ قبووڵ بکات و ئەیەوێ بتانخاتە سەر ڕێگایێ کە ئەنجامەکەی بەختیاری و سەربەرزی هەردوو دنیا بێ. خودا زانایەو کارەکانی پڕ حیکمەتن.

وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾ وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٣٢﴾ وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾



(٢٧) خودا ئەیەوێ ڕێگای ڕاستتان پیشان بدات و لە گوناهتان خۆش ببێ. ئەو گوناهبارە لەخودانەترسانەیش کە دوای ئارەزووی نەفس کەوتوون، دەیانەوێ دوای ئەوان بکەون و ڕێگای چەوت بگرن و بەتەواوی لە ڕێگای ڕاست لابدەن و تووشی سزای ڕۆژی جەزا بن.

(٢٨) خودا ئەیەوێ باری سەرشانتان سووك بکا بە دامەزراندنی یاسای نیکاح و جێگیرکردنی خێزان بە جۆرێ کە دوور بن لە غائیلە. بەڕاستی ئینسان بە ضەعیف و کەم توان دروست کراوەو، ئەگەر حوکمەکان سووك نەبن پێی هەڵناگیرێن.

(٢٩) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە ! ماڵ و دارایی خۆتان لەناو خۆتانا بە شێوەی بەتاڵو بێبەدەڵ، بە ستەمکاری، یا بە وەرگرتنی ڕیبا، یا بە خەڵەتاندن، مەخۆن. ئیللا مەگەر لەناو خۆتانا بازرگانی و مامەڵە هەبێ و لەسەر حەزو ڕەزای هەردولا ئیستیفادە لە ماڵی یەکتر بکەن. خۆتان مەکوژن بە بەخیلی یا بە ئیسراف یا بە خۆتووشیناڕەحەتیکردن. خودای گەورە کە ئەم حوکمانەتان بۆ دائەنێ میهرەبانە لەگەڵتاناو ڕەحمتان پێ ئەکات.

(٣٠) هەرکەس خۆی بکوژێ یا ئەو کارە حەرامانە بکا کە باسمان کردوون و لە حەق لابداو کاری ناڕەوا بکات، ئەیخەینە ئاگری بەتاوی دۆزەخەوە. ئەم سزادان و تۆڵەلێسەندنەوەیە شتێکی گران نیيە بۆ خوداو، خودا دەستی بەسەر هەموو شتێکدا ئەڕوات.

(٣١) ئەگەر خۆتان لە گوناهی گەورە بپارێزن، ئێمە، چاو لە گوناهە بچووکەکانتان ئەپۆشین و ئەتانخەینە شوێنێکی پڕقەدرەوە.

(٣٢) تەمەنناو خۆزگە مەخوازن بەو سامان و جێگە کە خودا داویەتی بە هەندێکتان و زیادەیان هەیە بەسەر هەندێکی ترا چونکە ئەم تەمەنناو خۆزگەخوازتنە ئەکێشێتەوە یا بۆ حەسەد یا بۆ ناڕەزایی لە کاری خوداو ڕەخنەلێگرتنی، ئەم دوانەیش ئەبنە هۆی ماڵوێرانیی دینو دنیا. پیاوان لە کاسبیی خۆیان بەشیان هەیەو ئافرەتانیش لەو کەسابەتەی ئەیکەن بەهرەمەندن و بەشیان هەیە. ئێوە تەمەننای فەزڵ و میهرەبانیی خودا بکەن، بەتەمای لوتفو کەرەمی ئەو بن. خودا ئاگای لە هەموو شت هەیەو زانایە.

(٣٣) بۆ هەر ماڵێ لە باوك و دایك و خزمە هەرەنزیکەکان پاش مردن بەجێ ئەمێنێ، میراتبەرمان داناوە هەر میراتبەرێ بەشی خۆی ئەبا. هەروەها ئەوانەیش پەیمانیان بەستوە کە میرات لە یەکتر بەرن، بە مردنی یەکێکیان ئەویتریان میراتی لێ ئەبا. جا کە مادام وایە بەشی شەرعیی میرات بەرەکان بدەن بێ کەم و کووڕی، خودا ئاگای لە هەموو شت هەیە.

شایانی باسە میراتبردنی هاوپەیمانان لە یەکتر بە ئایەتی (وأولو الارحام بعضهم أولى ببعض) نەسخ بووەتەوە.

ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ﴿٣٤﴾ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا ﴿٣٥﴾ ۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٣٧﴾



(٣٤) پیاوان بەڕێوەبەرو سەرپەرشتی‌كەری نافرەتانن. خودا فەزڵی پیاوانی بەهێزو تواناو گورج وگوڵی داوە بەسەر ژناندا. ئەوەتە پیاوان ئەتوانن كاری گران بكەن و غەزا بكەن و سنوور بپارێزن. بێجگە لەوەیش ژنان لە كاتی حەمل و شیرداندا ئیشیان پێ ناكرێ و، لە كاتی عوزری شەرعی (ماوەی حەیز)دا بۆ هاتنە ناوكۆمەڵ ناشێن. هەروەها بەراورد كراوە ژنان دڵیان لە پیاو ناسكترەو سەبریان لەسەر زەحمەت كەمترە. هەروەها پیاوان ماڵی خۆیان خەرج ئەكەن بۆ ژنەكانیان چ بۆ مارەیی و چ بۆ نەفەقە. جا مادام ژن لە ئیدارەی پیاودا بێت و كاروباری ناومالی بۆ ڕابگرێ پێویستە پیاویش خەرجی و نەفەقەی ناوماڵ بگرێتە ئەستۆ. جا ئەو ژنانە كە صالحن و عیبادەتكارن و لەسەر ماڵ و نامووسی خۆیان و مێردەكانیان ئەمێنن و بە یارمەتی خودا پارێزگاری لە وەزعی خۆیان و مێردەكانیان ئەكەن، ئەو ژنانەیش كە ئەیانبینن لە ڕێگا لائەدەن ئامۆژگارییان بكەن، ئەگەر تەمێ كردن و ئامۆژگاری سوودی نەبوو ئەوا لە جێگەنووستندا لەگەڵیان مەبن، واتە لەگەڵیان مەخەون. ئەگەر ئەوەیش سوودی نەبوو ئەوا لێیان بدەن لێدانێكی بێ‌زیان. جا ئەگەر گوێڕایەڵ بوون و هاتنە سەر باری خۆشی و پێكەوەژیانی بەئاسوودەیی، ئیتر ڕێیان لێ مەگرن و بەهانەیان پێ‌مەگرن و سەرزەنشتیان مەكەن و، وا فەرزكەن هیچ لە بەینتانا ڕووی نەداوە. خوا بەرزەو پایەی باڵایەو لە ئێوە بەدەستەڵاتترەو گەورەیە، كەواتە لێی بترسن و خۆتان لە گوناه بپارێزن.

(٣٥) ئەگەر ترسان لە دوژمنایەتی و ناحەزی لەنێوان ژن و مێردا ئەوا دوو حەكەم بنێرنە لایان یەكێ لە كەسوكاری پیاوەكەو یەكێ لە كەسوكاری ژنەكە، ئەگەر نیازیان لەسەر ڕێككەوتن بێ خودا ڕێكیان ئەخا، خودا زانایەو كارەكانی پڕ حیكمەتن.

(٣٦) عیبادەت بۆ خودا بكەن و هیچ جۆرە شەریكێكی بۆ بڕیار مەدەن، نە بت نە غەیری بت. وە لەگەڵ دایك و باوكتان چاك بن و ئازاریان مەدەن و زۆر بە نەوازش دڵیان ڕاگرن. لەگەڵ خزم و خوێشدا چاك بن و یارمەتییان بدەن. بەزەییتان بە هەتیواندا بێتەوە. لەگەڵ دراوسێی نزیك و دراوسێی دوورتان چاك بن. لەگەڵ ئەوانە كە لە ئیش و كارو سەفەرو مەدرەسەو غەیرەدا لەگەڵتانن چاك بن. یارمەتی موسافیرو لە ماڵ و كەسوكار بڕاو بدەن. لەگەڵ ئەو عەبدو جاریانەدا كە مولكتانن مامەڵەو هەڵسوكەوتتان چاك بێت. خودا ئەو كەسەی خۆش ناوێ كە فیز بەسەر خەڵكدا بكات و خۆی لەوان بە گەورەتر بزانێ.

(٣٧) خودا ئەوانەی خۆش ناوێ كە خۆیان ڕژدو پیسكەن و، تەنها بەوەیشەوە ڕاناوەستن بەڵكو ئەمر بە خەڵكیش ئەكەن كە ڕژدو دەس نووقاو بن، هەروەها ئەو دارایی و دەستەڵاتەو ئەو زانایی و بەهرەیە كە خودا پێی‌داون ئەیشارنەوە واتە ئینكاری نیعمەتەكەی خودا ئەكەن بەوەی كە خەڵكی لێ بێ‌بەش ئەكەن، ئەوەیش ئینكاری نیعمەتی خودا بكا كافرەو ئێمە سزایەكی سەختی سەرشۆڕكەرمان بۆ كافران ئامادە كردووە.

وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾



(٣٨) خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە ماڵی خۆیان بۆ خودا سەرف ناکەن، بەڵکو بۆ ڕیاو ڕووپامایی سەرفی ئەکەن. ئەمانە بێجگە گوناهی ڕیاکە موسریفیشن و بوونەتە برای شەیتان و باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی نی‌یە، ئەگینا کارێکیان ئەکرد کە هۆی ڕەزامەندیی خودا بێ و بۆ ڕۆژی دوایی بەکاریان بێ. ئەمانە شەیتان هاوڕێ و ڕابەریانە. هەرکەسیش شەیتان هاوڕێ و ڕابەری بێ ئەوە بەدترین ڕەگەز هاوڕێیەتی و بۆ ناخی دۆزەخی ڕائەکێشێ.

(٣٩) چییان لێ ئەهات و، تووشی چ زیانێ ئەبوون ئەگەر بە ڕاستی ئیمانیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی ببوایەو، لەو ماڵ و سامانەی خودا پێی بەخشیون بەشی خەڵکیان بدایەو لەپێناوی ڕەزای خودادا سەرفیان بکردایە؟ بێ‌گومان خودا ئاگای لێیانەو بە هەموو کردەوەو بیروباوەڕێکیان ئەزانێ.

(٤٠) خودا لە پاداشی کردەوەی چاکدا بە ئەندازەی تۆزقاڵێ کەم ناکاتەوەو، بە ئەندازەی تۆزقاڵێ لە تۆڵەی کردەوەی خراپ زیاد ناکات. خۆ ئەگەر تۆزقاڵەکە چاکە بوو، ئەوا خودا پاداشەکەی چەند قات ئەکاتەوەو لە کەرەم و لوتفی خۆی پاداشی گەورە ئەبەخشێ.

(٤١) ئەبێ حاڵی ئەوکافرانە، لە جوولەکەو لە گاورو غەیری ئەوان، چۆن بێ کە لە ڕۆژی قیامەتدا شاهیدێ لەسەر هەر ئوممەتێ بێنین، واتە کە پێغەمبەرەکەیان شایەتی لەسەر بێ‌باوەڕیو کردەوەی خراپی کافرەکان بدات و تۆیش بێنین بۆ شاهیدی لەسەر ڕاستیی قسەی پێغەمبەرەکانیان ؟

(٤٢) ئا لەو ڕۆژە سەختەدا ئەو کافرانە ئاواتە خوازن لەگەڵ زەوی تەخت بکرێن و بشاررێنەوە. لەو سەعاتەدا ناتوانن هیچ لە خودا بشارنەوە، چونکە ئەگەر نەیڵێن ئەندامەکانی لەشیان دێنە جواب و شایەتییان لێ ئەدەن.

(٤٣) ئەی خاوەن ئیمانەکان ! لە کاتی مەستی و بێهۆشیدا نزیکی نوێژ مەکەونەوە، واتە: نوێژ مەکەن، تا هوشیار دەبنەوەو ئاگاتان لە قسەی خۆتان ئەبێ، واتە: بە خۆتان ئەزانن کە چی دەڵێن. هەروەها ئەگەر لەش‌پیس بوون، پیاو یا ژن، نزیکی نوێژ مەکەونەوە تا خۆتان ئەشۆن و لەش‌پیسیتان لائەچێ، مەگەر لە سەفەردا بن، بەڵێ ئەگەر لە سەفەردا بوون یا نەخۆش بوون بە نەخۆشییەکی وەها کە ئەترسان لە بەکارهێنانی ئاو، یا دەستنوێژتان شکا، یا لەشتان کەوتبێ لە لەشی ئافرەت، بە تەنها لەش لێکەوتن یا بە جیماع و ئاوتان دەست نەکەوت بۆ دەستنوێژگرتن یا بۆ خۆشۆردن، ئەوا ڕوو بکەنە شوێنێکی پاك لە زەویداو دەستی پیا بدەن و دەست بێنن بە ڕوخسارتانداو بە هەردوو دەستتاندا بە نییەتی حەڵاڵ کردنی نوێژ، بێ‌گومان خودا خاوەن عەفوو تاوانبەخشە.

(٤٤) ئەی پێغەمبەر! سەیری ئەو زانا جوولەکانە ناکەی کە بەشێکی باشیان لە زانیاری دراوەتێ و تەوراتیان هەیەو باشی ئەزانن، کەچی لەباتی ئیمان گومڕاهی ئەکڕن و لەباتی ئەوەی بەگوێی تەورات بکەن و ئیمان بە ئایینی ئیسلام بێنن، ئیختیاری کوفرو گومڕاهی ئەکەن و بەوەشەوە ناوەستن، بەڵکو ئەیانەوێ ئێوەیش گومڕا بن و لە ڕێی ڕاست لادەن.

وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَآئِكُمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾



(٤٥) ئەمانە دوژمنی ئێوەن. خودا لە ئێوە باشتر بە دوژمنەکانتان ئەزانێ، بەڵام خودا بەسە بۆ سەرپەرشتیی ئێوەو، خودا بەسە بۆ یارمەتیدانتان.

(٤٦) جوولەکەکان هی وایان هەن تەورات لە مەعنای خۆی لائەدەن و مەعنای بەتاڵ و نارەوای بۆ دائەنێن، بە زوبان ئەڵێن (سمعنا) واتە: بیستمان و فەرمانبەردارین، کەچی بە دڵ ئەڵێن (عصینا) واتە بەگوێت ناکەین. هەروەها پێت ئەڵێن: قسەمان ببیسە یا خوا کەڕ بی و نەیبیسی. پێت ئەڵێن: (راعنا) کە بەزاهیر واتە: چاودێریمان بکە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم کەلیمەیان ئەبردەوە بۆ مەعنایەکی تر کە نەفامی بگەیێنێ و جوێن بێ و گاڵتەکردن بێ بە دین. لەڕاستیدا ئەگەر لە باتی ئەم قسانە بیانوتایە: ئەی موحەممەد ! ئەمری تۆمان بیست و بەگوێت ئەکەین، قسەمان ببیسەو بڕوانە بۆمان، گەلێ باشتر ئەبوو بۆیان. ئەمانە بەهۆی کافرییانەوە خوا لەعنەتی لێ کردوون و لە ڕەحمەتی ئەو دوورکەوتوونەتەوەو، کەمێکیان نەبێ ئیمان ناهێنن.

(٤٧) ئەی کیتابییەکان ! ئیمان بێنن بەو قورئانەی ناردوومانە بۆ موحەممەد کە تەصدیقی تەوراتەکەی ئێوە ئەکات. ئیمان بێنن لەپێش ئەوەدا کە هەندێ ڕوخسار مەحو بکەینەوەو هەڵیسووڕێنینەوە بۆ لای پشتەوە، یا لەعنەتیان لێ بکەین و بێبەشیان بکەین لە ڕەحمەتی خودا، وەکو لەعنەتمان کرد لەوانەی لە مەوزووعی ڕۆژی شەممەدا موخالەفەیان کرد. خودا هەموو شتێکی پێ ئەکرێ و ئەمرو خواستی خودا بەجێهاتووەو کراوەو کەس ڕێی پێ لێ ناگیرێ.

(٤٨) بێگومان خودا هەرگیز لەوە نابوورێ کە هاوبەشی بۆ بڕیار بدرێ، بەڵام لە هەرچی گوناهێ لە خوار ئەم گوناهە گەورەوەوە بێ ئەبوورێ بۆ هەرکەس کە خۆی مەیلی لێ بێ. ئەو کەسەی هاوبەش بۆ خودا بڕیار بدا ئەوە تاوانێکی گەورەی کردوەو درۆیەکی زلی هەڵبەستوە.

(٤٩) سەیری ئەو کیتابییانە ناکەی کە خۆیان بە چاك ئەزانن و لاف و گەزافی ئەوە لێ ئەدەن کە گوایا خۆشەویستی خودان؟! هەر خودا تەزکیەی کەسێ ئەکا کە خواستی لەسەر بێ و بەچاكزانین ئەوەیە لەوەوە بێ. خودا تەنانەت بە قەدەر ئەو تاڵە باریکەی لەناو ناوکی خورمادایە ستەم لە کەس ناکات و هەرکەس بە ئەندازەی تاوانی خۆی سزا ئەدرێ.

(٥٠) سەیریان بکە چ درۆیێکی زل بە دەم خوداوە هەڵئەبەستن؟ چ بوختانێ ئەکەن کە ئەڵێن ئێمە کوڕی خوداین یا خۆشەویستی خوداین؟ ئای کە ئەوە گوناهێکی گەورەو ئاشکرایە !

(٥١) سەیری ئەو جوولەکانە ناکەی کە بەشێکیان لە کتێبی خودا پێ دراوە، واتە تەورات، ئیمان ئەهێنن بە بت و شتی هیچوپووچ و، دەربارەی کافرەکانی قورەیش ئەڵێن: ئەوانە، واتە: کافرەکان لە موسوڵمانەکان باشترن و ڕێگای ڕاستریان گرتووە!

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا ﴿٥٤﴾ فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن صَدَّ عَنۡهُۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾



(٥٢) ئەو کیتابییە درۆزنانە ئەوانەن کە خودا لەعنەتی لێ کردوون و، هەرکەس خودا لەعنەتی لێ بکات هیچ یارمەتیدەرێکی دەست ناکەوێ و لە ڕۆژی دواییدا کەس ناگاتە فریای.

(٥٣) درۆنەکەن کە ئەڵێن لەمەوپاش پادشایەتی و فەرمانداری هیی ئێمە ئەبێ ! خۆ ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان حوکمیان بەدەس بێ‌و داراییان هەبێ بەقەدەر چاڵی ناوکە خورمایەك بە کەس نادەن و خێریان لە دەست نابێتەوە.

(٥٤) نەخەیر، ئەم کیتابییانە هەر بەخیلی ئەبەن بە موسوڵمانەکان، بە موحەممەد و هاوڕێکانی، یا بە عەرەب هەموویان، یا بەرەی ئادەمزاد بە شێوەیێکی گشتی. پێیان ناخۆشە خودا پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون و ڕێگای ڕاستی پیشان داون و، بەسەر کافرەکاندا زاڵی کردوون و سەری‌خستوون. ئێمە کە ئەم بەهرەیەمان بە موحەممەد داوە شتێکی سەیرو عەجایەب نی‌یە، ئەوەتا پێش ئەمیش کتێب و زاناییمان بەخشی بە ئیبراهیمی باپیری و بە ئالەکەی و فەرمانداری و دەستەلاتێکی گەورەمان پێ دان. خودا هەر ئەو خودایەو بەهرە بە هەرکەس بدات مەیلی خۆیەتی.

(٥٥) جوولەکەکان هی وایان هەیە ئیمانی هێنا بە پێغەمبەر یا بەو قسەی دەربارەی حەزرەتی ئیبراهیم کردی، هی وایشیان هەیە ڕووی لێ وەرچەرخاند و ئیمانی پێ نەهێنا. یا لە خزمەکانی ئیبراهیم هی وایان هەبوو ئیمانی بەو کتێب و حیکمەتە هێناو، هی وایشیان هەبوو ئیمانی پێ نەهێنا، کە واتە تۆ ئەی پێغەمبەری خودا عاجز مەبە لەوەی کە ئەم جوولەکانە ئیمان ناهێنن و، هەرگیز ورە بەرمەدە. ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ بەسە بۆ سزای کافران و بێ‌باوەڕان کە تیا هەڵقرچێن.

(٥٦) بێ‌گومان ئەوانەی کافرن و باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە نی‌یە لەمەوپاش ئەیانخەینە ئاگرو ئەیانسووتێنین، کەئەو پێستەیان پیشاو کولاَ، ئاثاری سووتانەکەی لێ لائەبەین و جارێکی تر هەر ئەو پێستە ناسکە دەسووتێنینەوە بۆ ئەوەی باشتر سزای سووتانەکە بچێژن، یاخۆ ئەو پێستانە بە تەواوی لادەبەین و پێستێکی تازەیان دەکەین بە بەرداو هەم دیسان دەیانسووتێنین. بەڕاستی خودا بەدەستەلاتەو شتێ نی‌یە لە ژێر دەستەلات و توانایی ئەودا نەبێ، هەروەها کارەکانی پڕ حیکمەتن. (٥٧) ئەوکەسانەیش کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باش ئەکەن لەمەوپاش ئەیانخەینە چەند باغ و لالەزارێك کە جۆگای جوان و سازگاریان بە ناودا ئەڕوات و هەتا هەتایە لەو شوێنە خۆشەدا دەمێننەوە. لەو بەهەشتە خۆشەدا هاوسەری پاك و پوخت و بێ عەیبیان هەیە. ئەم موسوڵمانانە لە سێبەرێکی هەمیشە سێبەردا بە سەربەرزی ئەیانحەسێنینەوە. (٥٨) خودا ئەمرتان پێ ئەکات ئەمانەت بدەنەوە بە خاوەنەکەی و داگیری نەکەن. هەروەها ئەمرتان پێ ئەکات کە کاتێ داوەریتان کرد لە بەینی خەڵکدا بە دادو هەق حوکم بکەن و، لایەنی یەکێکیان مەگرن لەسەر حیسابی لایەکی تر. خودا بە باشترین ئامۆژگاری ئامۆژگاریتان ئەکات. خودا شنەواو بینایەو ئاگای لێتانە.[ت] (٥٩) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە بە گوێی ئەمرەکانی خوداو پەیامی پێغەمبەر بکەن کە لای خوداوە بۆی نێرراوە، هەروەها بەگوێی ئەوانە بکەن کە کاروباری موسوڵمانان ئەبەن بەڕێوە. مەبەستی سەرکردەی موسوڵمانانە چ لە سەردەمی حەزرەتداو (د. خ) و چ دوای ئەو، کە واتە خولەفای ڕاشیدین و قاضی و سەرکردەکانی سوپای ئیسلامیش ئەگرێتەوە.

أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ
وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ
وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ
ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ
ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ
صُدُودٗا ﴿٦١﴾ فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا
قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ
إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا
فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ
أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا
لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ
جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ
لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ
حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ
فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ﴿٦٥﴾



(٦٠) سەیری ئەو منافقانە ناکەی کە پێت ئەڵێن: باوەڕمان بەوە هەیە کە بۆ تۆ نێرراوەو بەوەی بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ ڕەوانە کراوە، کەچی لەباتی ئەوەی بێنە لای تۆو ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بۆ بڕینەوەی کارو گیروگرفتیان، ئەیانەوێ بڕۆنە لای ئەوەی کە بەتاڵەو ناتوانێ بە حەقیانەت حوکم بکات، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئەمریان پێ کراوە باوەڕ نەکەن بەو بەتاڵەو بەو حوکمدەرە ناحەقە.

(٦١) ئەگەر بە منافقەکان بوترێ: وەرن بۆ پەیڕەویکردنی ئەوەی لەلایەن خوداوە هاتووەو وەرن بۆ لای پێغەمبەر (د. خ)، ئەیانبینی بەتەواوی ڕووت لێ وەردەچەرخێنن و پشتت لێ هەڵئەکەن!

(٦٢) حاڵیان چۆنە کە بەهۆی نەهاتنەلای حوکمی خوداو پێغەمبەرەوە تووشی بەڵایێك ببن، کە ئەنجامی کردەوەی خۆیانە؟ لەپاشاندا دێن بۆ لات عوزرت بۆ دەهێننەوەو داوای لێ بوردنت لێ ئەکەن و ئەڵێن: ئێمە کە موحاکەمەکانمان ئەبرد بەم لاولادا مەبەستمان چاکەکردن و ڕێکخستن و ئاشتی بوو.

(٦٣) ئەو منافقانە خودا ئاگاداری نیازو کرداریانەو ئەزانێ چی لە دڵیاندایە. پاکانەکردن و عوزرهێنانەوە دادیان نادات، گوێیان مەدەرێ و بیر لەوە مەکەرەوە کە تۆڵەیان لێ بسێنی و موعاقەبەیان بکەی. ئامۆژگارییان بکەو بە نەرمی تێیانبگەیێنە کە ئیمان چۆن ئەبێ. بە تەنهایی، کە کەس بەدیارەوەنەبێ، ئامۆژگارییەکی وەهایان بکە کاریان تێ بکاتْ و بێگومان ئەگەر دووبەدوو ئامۆژگاریی یەکێ بکرێ زیاتر کاری تێ ئەکات.

(٦٤) ئێمە هەر پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردبێ بۆ ئەوەمان ناردوە کە بە ئەمرو ڕەزای خودا بەگوێی بکرێ و پێڕەوی بکرێ. ئەو منافقانە کە ستەمیان لە خۆیان کردو، مورافەعەیان بردە لای ئینسانی بەتاڵ و لەخودانەترس، ئەگەر یەکسەر پاش ئەوە بهاتنایەتە لات و پەشیمان ببونایەتەوەو عوزریان بۆ بهێنایتایەتەوەو داواو نزای لێخۆشبوونیان لە خودا بکردایەو، پێغەمبەریش تکای لێخۆشبوونی لە خودای گەورە بۆ بکردنایە، بۆیان دەرئەکەوت کە خوای پاك و بێگەرد زۆر لە پەشیمانی ڕاستەقینە ئەبوورێ و زۆر بەبەزەیی و میهرەبانە.

(٦٥) بێگومان ئیمان بەو جۆرە نابێ کە ئەوان گومان ئەبەن، قەسەم بەو خودایەی دروستی کردوویت! ئەمانە نابنە ئیمانداری ڕاستەقینە تا وایان لێ دێ کە بە ڕەزای دڵ و باوەڕەوە تۆ ئەکەنە حەکەم لەو ناکۆکییانەدا کە لەناویاندا ڕوونەدەن و، هیچ گرێ لە دڵیاندا نەبێ لەو حوکمە تۆ ئەیدەیت و بەتەواوی ملکەچت ئەبن و بەگوێت ئەکەن.

وَلَوۡ أَنَّا كَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَنِ ٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ أَوِ ٱخۡرُجُواْ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٞ مِّنۡهُمۡۖ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَشَدَّ تَثۡبِيتٗا ﴿٦٦﴾ وَإِذٗا لَّأٓتَيۡنَٰهُم مِّن لَّدُنَّآ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيۡنَٰهُمۡ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡفَضۡلُ مِنَ ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمٗا ﴿٧٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعٗا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمۡ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنۡ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَالَ قَدۡ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيَّ إِذۡ لَمۡ أَكُن مَّعَهُمۡ شَهِيدٗا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنۡ أَصَٰبَكُمۡ فَضۡلٞ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمۡ تَكُنۢ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُۥ مَوَدَّةٞ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ مَعَهُمۡ فَأَفُوزَ فَوۡزًا عَظِيمٗا ﴿٧٣﴾ ۞ فَلۡيُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشۡرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَن يُقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقۡتَلۡ أَوۡ يَغۡلِبۡ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٧٤﴾



(٦٦) ئەگەر ئێمە ئەمریان پێ بکەین و فەرزی بکەین لەسەریان کە خۆیان لە ڕێگای خودادا بدەنە کوشت، یا ئەگەر پێیان بڵێین لە وڵاتی خۆتان دەرچن، کەمێکی خاوەن باوەڕی ڕاستەقینەیان نەبێ کەسیان نایکەن. بێگومان ئەگەر ئامۆژگارییەکانیان ببیستایەو، پێڕەوییان بکردایە بۆخۆیان چاکتر ئەبوو و زیاتر لەسەر ئایین دائەمەزران.

(٦٧) ئەو وەختە ئێمە لە لای خۆمانەوە پاداشێکی گەورەمان ئەدانەوە.

(٦٨) هەروەها شارەزامان ئەکردن و ڕێگاییێکی ڕاست و ڕەوانمان پیشان ئەدان.

(٦٩) هەرکەس بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا بکات و لە ئەمریان دەرنەچێ، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا هاوڕێی پێغەمبەران و هی ئەوانەیە کە نەفسیان بەرز بووەتەوە بۆ لووتکەی خوداناسی، هەروەها هاوڕێی ئەوانەیە کە لە ڕێگای ئایینی ئیسلامی پیرۆزو لە پێناوی ڕەزای خوادا گیانیان بەخت ئەکەن و شەهید ئەبن و، لەگەڵ ئەوانە ئەبن کە عومریان لە ئیطاعەتی خوداوماڵیان لە ڕێگای ڕەزامەندیی ئەوا سەرف کردووە. ئەمانەیش باشترین و جوانترین هاوڕێن و ئەوەی لە گەڵیان بێ سەرفرازە.

(٧٠) ئەم پاداش و نیعمەتی هاوڕێیەتی پیاوچاکانە بەهرەییێکە لەلایەن خودای گەورەوە. خودا ئەزانێ پاداشی باش بە کێ دەبەخشێ‌و، کێ شایانیەتی.

(٧١) ئەی خاوەن ئیمانەکان ! خۆتان بپارێزن و هەمیشە ئامادە بن بۆ وەستان لە ڕووی دوژمنداو دەرچن بۆ بەرەنگاری کردنی دوژمن بە چەند کۆمەڵی جیاجیا یا هەمووتان پێکەوە.

(٧٢) خودای گەورە باسی ئۆردووەکەی حەزرەت دەکا (د. خ) کە هەم موسوڵمان و هەم منافقیشی تێدا بوو، جا ئەفەرموێ: هی واتان تێدایە خۆی دوادەخات و لەگەڵتان تێهەڵناچێ. جا ئەگەر ئێوە زیانێکتان لێ کەوت ئەوا دەست دەهێنێ بەسەر دڵیداو دەڵێ: خودا ڕەحمی پێکردم و نیعمەتی دامێ کە لەگەڵ شەڕکەرەکان نەبووم و تووشی ئەو زیانە نەهاتم.

(٧٣) بەڵام ئەگەر خێرێکی خواتان دەسگیر بوو، وەك یەکێ هیچ دۆستایەتییەك لە بەینی ئێوەو ئەودا نەبووبێ، ئەڵێ: خۆزگا لەگەڵیان بوومایەو منیش بەهرەییێکی گەورەم دەست بکەوتایەو بەشێکی باشم وەربگرتایە.

(٧٤) جا ئەگەر ئەم منافقانە، کە سستی ئەکەن و خۆیان لە مەعرەکە دوائەخەن و لەپێناوی ڕەزامەندیی خوادا ناجەنگن، با ئەوانە کە ژیانی بێ بەقای دنیایان بە ژیانی نەبڕاوەی قیامەت فرۆشتووە، لەپێناوی جێگیرکردنی ئایین و ڕەزامەندیی خوادا بجەنگن. بێگومان ئەوەی لە ڕێگای خوادا شەڕ بکات، بکوژرێ یا سەربکەوێ، لە ڕۆژی پاداشدا پاداشێکی گەورەی ئەدەینەوە.

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٧٩﴾



(٧٥) ئەوە چیتان لێ قەوماوە؟ بۆ دانیشتوون؟ بۆچی لەپێناوی ڕەزامەندیی خوادا ناجەنگن؟ بۆچی بۆ ڕزگارکردنی ئەو ژن و پیاوو منالّە موسولّمانە بێدەستەلاّتانە ناجەنگن کە لە مەککە ماونەتەوەو، لەسەر دەستی کافرەکاندا تووشی ئازارو سزا ئەبن و بەتەواوی گەیشتوەتە گیانیان و لە خودای گەورە ئەپاڕێنەوەو ئەلّێن: خودایا ڕزگارمان بفەرموو لەم دێیە کە کۆمەلّێکی زالّم و ستەمکار دەستیان بەسەریا گرتووەو سزامان ئەدەن. خودایا، لای خۆتەوە یارمەتیمان بدەو لای خۆتەوە پشتیوانمان بۆ بڕەخسێنە؟

(٧٦) بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هەیە لە ڕێگای خودادا ئەجەنگن و، ئەوانەی کافرن لە ڕێگای شەیتان و لەپێناوی شتی بەتالّ و هیچوپووچدا ئەجەنگن. دەی ئێوە ئەی خاوەن ئیمانەکان دژی دۆستەکانی شەیتان بجەنگن، فڕوفێلّی شەیتان بێهێزەو بەرگەی جیهادی ئێوە ناگرێ.

(٧٧) سەیری ئەوانە ناکەی کە حەزیان لە جەنگ ئەکردو پێیان وترا: جارێ واز لە جەنگ بێنن و دەستی مەدەنێ و، خەریکی نوێژ بن و زەکاتی مالّتان دەرکەن، بەلاّم کە جیهادیان لەسەر فەرز کرا کۆمەلّێکیان لە کافرەکان ئەترسان وەك چۆن لە خودا ئەترسن یا زیاترو، ئەیانوت: خودایا بۆچی تۆ جیهادت لەسەرمان فەرزکرد؟ خۆزگا ئێمەت مۆلّەت بدایە تا وادەیەکی نزیك. جا تۆ پێیان بلّێ: ڕابواردنی دنیا شتێکی زۆر کەم و بێبەقایە، بەلاّم بۆ ئەو کەسەی لە خودا بترسێ ڕۆژی قیامەت و خۆشی و پاداشەکەی زۆر چاکترە. بێگومان خودا عادلّ و بەڕەحمە و، ئێوە بە قەدەر پەردەی ناو دەنکە خورمایەك ستەمتان لێ ناکرێت.

(٧٨) لە هەرکوێ بن مردن پێتان ئەگات و ناتوانن لێی ڕزگار بن، ئەگەرچی لە قەلاّی بەرزو سەختو قایمکراودا بن. جوولەکەکان ئەگەر نیعمەتو خۆشییەك ڕوویان تێبکات ئەلّێن: ئەمە لە خوداوەیە، بەلاّم ئەگەر ناخۆشی و بەلاّیەك تووشیان ببێ ئەلّێن: ئەمە لە نەگبەتی تۆوەیە. ئەی موحەممەد، پێیان بلّێ: خۆشی و نیعمەت و نەگبەتی هەمووی هەر خودا دروستی ئەکات و سەرچاوەی دروست کردنی هەر ئەوە. ئەم کۆمەلّە چییان لێقەوماوە کە تۆ قورئانیان بۆ دەخوێنیتەوەو ئامۆژگارییان ئەکەی تێیناگەن ؟

(٧٩) ئەی بنیادەم ! هەر چاکەو نیعمەتێکت پێ بگا لە خوداوەیەو هی لوتف و مەرحەمەتی ئەوە. تۆ، هەرچی تاعەتە بیکەیت بەرامبەر بە نیعمەتی بوونەکەت نییەو لێی نامێنێتەوە بۆ پاداش. هەر بەلاّو نەگبەتی و مایە سزاییەکیشت تووش بێ لە نەفس و ئارەزووی خۆتەوەیە: ئەو ڕات ئەکێشێ بۆ ئەو ئەنجامە، بەلاّم نیعمەت و مصیبەت، وەك شتێکی دروستکراو، کردەی خودان. ئەی موحەممەد ئێمە تۆمان ناردوە بە پێغەمبەری بۆ هەموو بەرەی ئادەمزاد، خودا باشترین شاهیدە لەسەر پێغەمبەرایەتیت و بە موعجیزە یارمەتی داویت.

مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ
عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٞ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنۡ
عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُۖ وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ
مَا يُبَيِّتُونَۖ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا
﴿٨١﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ
فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ﴿٨٢﴾ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ
أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي
ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ وَلَوۡلَا فَضۡلُ
ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٣﴾
فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ
عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا
وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا ﴿٨٤﴾ مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةٗ يَكُن لَّهُۥ
نَصِيبٞ مِّنۡهَاۖ وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةٗ سَيِّئَةٗ يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٞ مِّنۡهَاۗ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ
بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾



(٨٠) هەركەس بەگوێی پێغەمبەری خودا بكا ئەوە بەگوێی خودای كردوە، چونكە ئەوەی پێغەمبەر (د. خ) ئەیگەیێنێ لای خوداوە بۆی هاتووە. ئەوەیش سەرپێچی كردو بەگوێی نەكردی ئەوا تۆمان بۆ ئەوە نەناردوە بیانپارێزی. تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە ڕێگای ڕاست و لاریان پیشان بدەی، تۆ پێغەمبەرو فروستادەیتو خودا نیت.

(٨١) كە دێنە لات و ئەمرێكیان پێ ئەكەیت ئەڵێن: حازرین و لە قسەت دەرناچین، كەچی كە لای تۆ دەرچوون غەیری ئەوە ئەڵێن كە بە تۆیان وتوە. خودا ئاگای لەوەیە كە ئەیلێن و بڕیاریان داوەو لێی ناشاررێتەوە. كە واتە گوێیان مەدەرێ و موبالاتیان پێ‌مەكە. تۆ ئەوەی لەسەرتە كردووتە. پشت بە خودای گەورە ببەستە. خودا باشترین كەسێكە لە زیانی ئەوانە بتپارێزێ.

(٨٢) بۆ لەم قورئانە وردنابنەوە؟ بۆ باش بیری لێ ناكەنەوە تا بۆیان دەركەوێ كەلامی خودایەو لە غەیبەوە هاتووە؟ ئەگەر قسەی خودا نەبوایەو هی یەكێكی تر بوایە جیاوازی و ناكۆكییەكی زۆریان تێدا ئەبینییەوە، هەندێكی فەصیح و هەندێكی نافەصیح و، هەندێكی بەلیغ و هەندێكی نابەلیغ و، هەندێكی لەگەڵ عەقڵ و گونجاوو هەندێكی نەگونجاو دەبوو. (٨٣) هەندێ لە موسوڵمانەكان ئەگەر جاروبار دەنگوباسێكی وەهایان ببیستایە ئاسایش و هێمنی موسوڵمانانی تێدا بوایە، یا ترس و دوودڵی و نائارامی بخستایەتە ناویانەوە بڵاویان ئەكردەوە بەناو خەڵقا، ئەگەرچی ببوایەتە هۆی پەرێشانیی موسوڵمانان. ئەم جۆرە كەسانە وا باش بوو ئەو دەنگ و باسە یەكسەر بەرنە لای پێغەمبەر (د. خ) و لای كاربەدەستان و تێگەیشتوانیان، جا ئەوان لە شتەكەیان ئەكۆڵییەوەو ئەیانزانی چۆن باس ئەكرێ و لەئەنجامدا ئەوانیش تێئەگەیشتن. ئەگەر گەورەیی و میهرەبانیی خودایش نەبوایە لەگەڵتان كەمێكتان نەبێ دوای شەیتان ئەكەوتن و گومڕا ئەبوون.

(٨٤) تۆ لە ڕێگای خوداو ئایینی خودادا بجەنگەو جیهاد بكە. تۆ لە كاری خۆت نەبێ بەرپرس نیت. ئەوەی لەسەرتە نەفسی خۆتە، بۆ خەڵكی تر تەنها تەبلیغت لەسەرە. هانی موسوڵمانەكان بدە لە ڕێگای خودادا بجەنگن. بەڵكو خودا شەڕی كافرانتان لێ لادا. خودا لە كافرەكان بەهێزترەو لەوان باشتر ئەتوانێ سزاو ئازار بدا.

(٨٥) هەركەس تكایێ بۆ جێ‌بەجێ‌كردنی كارێكی حەڵاڵ و بۆ قازانجی برای موسوڵمانی بكا، ئەوە پاداشی چاكی لەو تكایە دەست ئەكەوێ و لە خێرەكەیدا هاوبەش ئەبێ. هەروەها هەركەس تكایێ بۆ جێ‌بەجێ‌كردنی كارێكی حەرام و ناڕەواو كردنی ناحەق بە حەق بكا ئەوە لە گوناهەكەداو لە سزای ئەو تاوانەدا هاوبەشە. خودا دەستی بەسەر هەموو شتێكدا ئەڕوات.

(٨٦) ئەگەر سەلامتان لێ كرا ئێوەیش بە سەلامێكی جوانتر وەڵام بدەنەوە، یا هەر هیچ نەبێ وەك ئەو وەڵام بدەنەوە. بۆ نموونە ئەگەر یەكێك سەلامی لێ كردیت و وتی: (السلام علیك) تۆ لە وەڵامیا بڵێ: (وعلیك السلام ورحمة الله) ئەگەر وتی: (السلام علیك ورحمة الله) تۆ بڵێ: (وعلیك السلام ورحمة الله وبركاته). خۆ ئەگەر وایش ناكەیت ئەوا بەقەدەر سەلامەكەی ئەو وەڵام بدەرەوە، واتە: لە نموونەی یەكەمدا بڵێ ( وعلیك السلام) و، لە نموونەی دووهەمدا بڵێ: (وعلیك السلام ورحمة الله). لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەرئەكەوێ جوابی سەلام واجبەو نابێ پشتگوێ بخرێ.

ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ
وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾ ۞ فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ
فِئَتَيۡنِ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ
أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿٨٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ
تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ
حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ
حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾
إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ
حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ
ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ
وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾
سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ كُلَّ
مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ إِلَيۡكُمُ
ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ
ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿٩١﴾



(٨٧) (الله) کەس نی‌یە بەڕاستی عیبادەتی بۆ بکریّ ئەو نەبیّ. بە خودا قەسەم لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوەو لە هەرکویّ بن بەرەو مەحشەر ئەکرێنەوە. ئەم کۆکردنەوەیە ڕاستەو هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نی‌یە. کیّ بیّ لە خودای پەروەردگار و گەورە ڕاستگۆتر بیّ؟

(٨٨) ئەوە بۆچی لە حالّی ئەو منافقانەدا کە لە مەدینە دەرچوون بۆ بادیەو گەیشتنە کافرەکان، ئێوە بوون بە دوو تاقم، تاقمێکتان بە کافریان ئەزانن و تاقمێکی ترتان بە کافریان دانانێن؟ خودا ئەوانەی سەرەوەژێر کردوەتەوە بەرەو دۆزەخ بەهۆی کردەوەی خراپیانەوە. تازە ئێوە ئەتانەویّ هیدایەتی کەسیّ بدەن کە خودا گومڕای کردوە؟ هەرکەس خودا گومڕای بکات تۆ هیچ چارێکی بۆ نادۆزیتەوە.

(٨٩) کافرەکان حەزئەکەن ئێوەیش وەك ئەوان کافر بن و وەك یەکتان لیّ بیّ. هەگیز دۆست و برادەر لەمانە ڕامەگرن و دۆستایەتییان لەگەلّ مەکەن تا دلّنیا ئەبن لەوەی کە ئیمانیان هەیەو کۆچیان لەپێناوی ڕەزای خوداو پێغەمبەری خودادایە. جا ئەگەر سەرپێچییان کرد ئەوا بە دیل بیانگرن و لە هەرکویّ بەردەستتان کەوتن بیانکوژن و، هەرگیز بە دۆست و یارمەتیدەرو پشتگیریان حسێب مەکەن.

(٩٠) ئەوانە نەبیّ کە ئەچنە لای قەومێك کە لە بەینی ئێوەو ئەوقەومەدا پەیمان هەبیّ و، بەلّێنتان بە یەکتر دابیّ کە شەڕ لەگەلّ یەك نەکەن و، هەرکەس پەنا بە یەکیّ لە ئێوەو ئەوان بەریّ دەستی لیّ نەوەشێنریّ، یا ئەوانەی کە دێن بۆ لاتان و حەز ناکەن شەڕ لەگەلّ ئێوە یا لەگەلّ قەومەکەی خۆیان بکەن، ئەوانە وازیان لیّ بێنن. ئەگەر خودا بیویستایە ئەوانەی بەسەرتانا زالّ ئەکرد و دژی ئێوە ئەجەنگان، جائەگەر کەنارگیر بوون و دژتان نەجوولاّنەوەو بە هێمنی دانیشتن لەگەلّتان، خودا ڕێگای ئەوەتان پیّ نادا بیانکوژن یا بە دیل بیانگرن.

(٩١) هەندێکی تر ئەبینن ئەیانەویّ ئەمین بن لە ئێوەو ئەمینیش بن لە کۆمەلّەکەی خۆیان، هەر کاتیّ بانگ بکرێن بۆ فیتنە هەلّگیرساندن و ئاژاوەنانەوە دژی موسولّمانان چاکتر تێهەلّئەچنەوەو خراپتر تێیدا هەلّدەسووڕێن ! جا ئەگەر ئەمانە واز لە دوژمنایەتیی ئێوە نەهێنن و کەنار نەگرن و داوای ئەمانتان لیّ نەکەن و دەستبەردار نەبن لە زیاندان لە ئێوە ئەوا بیانگرن و بیانکوژن لە هەر شوێنیّ دەستتان بڕوا بەسەریاندا. سەبارەت بەمانە ئێمە حوججەتێکی ڕووناکو حەقمان پیّ داون کە بیانکوژن.

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٩٤﴾



(٩٢) بۆ هیچ خاوەن ئیمانێ ڕەوا نی‌یە موسولمانێ بکوژێ، بە هەڵەو لەدەس دەرچوون نەبێ. جا ئەگەر موسولمانێ بە هەڵە موسولمانێکی تر بکوژێ ئەوە پێویستە لەسەری لە کەفارەتی ئەو کوشتنەدا بەندەیێکی موسولمان ئازاد بکات، هەروەها خوێنبایی کوژراوەکەیش، کە صەد وشترە، بە میراتبەرەکانی بدات، سا مەگەر لەو خوێنبایی‌یە خۆش بن و پێی ببەخشن. خۆ ئەگەر کوژراوەکە لە قەومێ بوو کە دوژمن بە ئێوە بوون، بەڵام موسولمان بوو، ئەوە لە کەفارەتی دا واجبە بەندەیێکی موسولمان ئازاد بکرێ، وە ئەگەر کوژراوەکە لە قەومێ بوو کە لەبەینی ئێوەو ئەواندا پەیمان هەبوو ئەوە پێویستە خوێن بابییەکەی بە میراتبەرەکانی بدرێ و بەندەیێکی موسولمانیش ئازاد بکرێ. جا ئەگەر دەستی نەئەڕۆیشت بەندەیێکی موسولمان ئازاد بکات واجبە دوومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێ. ئەمە لای خوداوە کراوە بەهۆی تەوبەی ئەو پیاوکوژە. خودا زانایەو کارەکانی پڕ لە حیکمەتن.

(٩٣) هەرکەسێ موسولمانێ بە عەمدی بکوژێ ئەوە جەزاکەی دۆزەخێکە هەتاهەتایە تیا ئەمێنێتەوەو، خودا ڕقی لێی هەڵئەستێ و نەفرینی لێ ئەکاو سزایێکی گەورەی بۆ ئامادە کردووە.

(٩٤) ئەی خاوەن ئیمانەکان ! کاتێ چوون بۆ سەفەری جیهاد لە ڕێگەی خودادا زۆر چاك ورد ببنەوە لە ئەحواڵی خەڵك تا کافرو موسولمان لەیەك جیابکەنەوە. پەلە مەکەن و مەڵێن بەو کەسەی سەلامتان لێ ئەکات: تۆ موسولمان نیت و لەبەر پاراستنی گیانی خۆت سەلام ئەکەیت ! پەلە مەکەن لە کوشتنیدا بۆ تاڵان و سامانی دنیا؛ لای خودا سامان و دەوڵەتی زۆر هەیە. ئێوەش لەمەوپێش وا بوون و بۆ پاراستنی سەروماڵتان کەلیمەی شەهادەتتان بە دەما ئەهات، لەپاشان خودا لوتفی لەگەڵ کردن و لەسەر ئیمان و ئیسلام دایمەزراندن و جێگیری کردن؛ کەواتە لە دەست وەشاندندا پەلە مەکەن، با هەموو شتتان لێ ڕوون بێتەوە. خودا لە کردەوەتان ئاگادارەو هیچی لێ ون نابێ.

لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ عَلَى ٱلۡقَٰعِدِينَ دَرَجَةٗۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلۡقَٰعِدِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٖ مِّنۡهُ وَمَغۡفِرَةٗ وَرَحۡمَةٗۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡۖ قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةٗ وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلٗا ﴿٩٨﴾ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا ﴿٩٩﴾ ۞ وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗۚ وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنۡ خِفۡتُمۡ أَن يَفۡتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ إِنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ كَانُواْ لَكُمۡ عَدُوّٗا مُّبِينٗا ﴿١٠١﴾



(٩٥) ئـەو موسـولمانانەی سـاغ و سەلیمن‌و دەردو نەخۆشییان نی‌یە، کەچی دانیشتوون‌و ناچن بۆ جیهاد، هەرگیز پایەیان وەکوو ئەو موسولمانانە نی‌یە کە بە سەرو ماڵ لە ڕێگای خودادا جیهاد ئەکەن. ئەوانە کە بە سەرو ماڵ لە ڕێگای خودادا جیهاد ئەکەن خودا فەزڵی داون بەسەر ئەو دانیشتوانەدا کە عوزریان نی‌یەو جیهاد ناکەن. جیهادکاران پایەی بەرزو باڵایان هەیە. خودا بەڵێنی بە هەموو موسولمانان داوە کە پاداشی چاکیان بداتەوە، بەڵام جیهادکارانی فەزڵ داوە بەسەر دانیشتوانداو پایەو پاداشی گەورەی بۆ داناون.

(٩٦) ئەو پاداشە بریتی‌یە لە چەند پایەیێکی بەرزو لەگوناه‌خۆشبوون و بەزەیی و میهرەبانییە. خودا گوناهپۆش‌و میهرەبانە.

(٩٧) ئەوانەی مەلائیکە گیانیان ئەکێشی‌و لە دنیادا ستەمیان لە خۆیان کردوەو، کۆچیان نەکردوە لەپێناوی یارمەتیدانی پێغەمبەرو ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا مەلائیکەکان پێیان ئەڵێن: لەکوێ بوون؟ هەڵوێستتان سەبارەت بە دین و بە یارمەتیدانی پێغەمبەر چۆن بوو؟ بۆ هیچتان نەکرد !؟ ئەوانیش لە وەڵامدا ئەڵێن: ئێمە کۆمەڵێکی بێ‌هێزو ژێردەستە بووین هیچمان پێ نەئەکرا ! مەلائیکەکان پێیان ئەفەرموون: ئەی مولکی خودا پان و پۆڕ نەبوو و دنیا بەربڵاو نەبوو؟ بۆ وەکوو ئەوانەی چوون بۆ مەدینەو بۆ حەبەشەو مەککەیان بەجێ‌هێشت ئێوەیش کۆچتان نەکردو وڵاتی ستەمتان بەجێ‌نەهێشت؟ ئەوانە جێگایان دۆزەخە کە ناخۆشترین شوێنە.

(٩٨) ئەوانە نەبێ کە داماوو بێ‌دەستەڵاتن لە پیاوو ژن و منداڵانی بێ سەروبەر کە ناتوانن کاری خۆیان ڕاپەڕێنن و دەستەوەستانن و ڕێگای وڵاتان شارەزا نین.

(٩٩) ئەوانە هیوا وایە خودا عەفویان بکات. خودای گەورە تاوانبەخش و گوناهپۆش و میهرەبانە.

(١٠٠) هەرکەس وڵاتی خۆی بەجێ‌بێڵێ لەپێناوی یارمەتیدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامداو کۆچ بکات، ئەوە ئارامگای باش و شوێنی حەسانەوەی زۆری لەسەر زەوی دەست دەکەوێ و، ژیانی ئەکەوێتە خۆشی و لە تەنگانەیی‌و دەستکورتی ڕزگار ئەبێ. هەرکەس لە ماڵ و حاڵی خۆی دەرچێ و کۆچ بکات بۆ لای خواو پێغەمبەری خودا بۆ یارمەتیدانی ئایین و لەڕێگەدا بمرێ ئەوە بێ‌گومان پاداشی لای خودایە خودا تاوانبەخش و میهرەبانە.

(١٠١) کە کەوتنە سەفەر، ئەگەر ترستان بوو لەوەی کافرەکان تووشی ئازارتان بکەن و زیانتان لێ بدەن، گوناهبار نابن ئەگەر هەندێ لە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە، واتە: چوار ڕکاتی بکەن بە دوو ڕکات؛ بەڕاستی کافرەکان دوژمنێکی ئاشکراتانن.

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُواْ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾



(١٠٢) کاتێ تۆ ئەی پێغەمبەر لەناو سوپادا بووی و ویستت نوێژیان بە جەماعەت لەگەڵ بکەیت، ئەوە پێویستە سوپاکە ببنە دوو تاقم، جا با تاقمێکیان لەگەڵت نوێژ بکەن و ڕاوەستن لەگەڵت، با ئەوانەی لەگەڵتن چەکەکانیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرن بۆ قایمەکاری. ئەنجا کە ئەم تاقمە سوجدەیان برد لەگەڵت با ئەوانە کە نوێژ ناکەن لەدواوە پاستان بکەن، جا ئەو تاقمەی کە تا ئەو وەختە پاسیان کردوە با بێن و نوێژت لەگەڵ بکەن. با ئیحتیات بکەن و چەکەکانیان هەڵگرن لەگەڵ خۆیان. کافرەکان زۆریان پێ خۆشە ئێوە بێئاگا بن لە چەك و شتومەکەکانتان تا بە گورجی ڕووتان تێبکەن و هێرش بەرنە سەرتان و زیانتان لێ بدەن و پەرێشانتان بکەن. بەڵام ئەگەر نەخۆش بوون یا باران و تەڕوتوشی بوو ئەوە قەیناکا هەڵینەگرن، بەڵام ئاگادارو وریابن. خودای گەورە سزایێکی ئابڕووبەری بۆ کافرەکان ئامادە کردوە.

جارێکیان پێغەمبەر (د. خ) و هاوڕێکانی لە(بطن نخلة) لە جەنگا بوون دژی کافرەکان، دووجار ئیمامەتی کرد بۆ موسوڵمانان، واتە: تاقمی یەکەم نوێژەکەیان بەتەواوی لەگەڵ پێغەمبەر کرد. کە لێبوونەوەو چوون بۆ ڕووبەڕوویی دوژمن، تاقمەکەیتر هاتن و حەزرەت (د. خ) ئیمامەتی بۆ ئەمانیش کردو، ڕۆیشتن بۆ ڕووبەڕوویی دوژمن. هەروەها جارێکی تریش لە غەزای (ذات الرقاع )دا، لە نوێژێکی دوو ڕکاتیدا بەم جۆرەی خوارەوە نوێژی بۆ کردن: ڕکاتێکی بە کۆمەڵی یەکەم کرد. کە ڕاست بوویەوە بۆ ڕکاتی دووهەم ئەوان ڕکاتەکەی تریان بە تەنها کردو سەلامیان دایەوەو ڕۆیشتن بۆ ڕووبەڕوویی دوژمن. پێغەمبەر(د.خ) بە ڕاوەستانەوە چاوەڕوانی کۆمەڵی دووهەمی کرد، کە هاتن ڕکاتێکی بەوانیش کردو سەلامی نەدایەوە، بەڵکو چاوەڕوانی کردن تا ئەوانیش ڕکاتەکەی تریان کرد، ئەنجا سەلامی پێ دانەوە. (١٠٣) کە لەو نوێژە بوونەوە لە یادی خودا غافڵ مەبن و هەمیشە ناوی بهێنن لە حاڵی وەستاندا کە ڕووبەڕووی دوژمنن و شەڕەشیر دەکەن و لەکاتێکدا کە دانیشتوون و تیر ئەهاوێن و، لەکاتێکدا کە پاڵ کەوتوون و بریندارن. ئەنجا کە بێترس بوون و دڵنیا بوون نوێژەکانتان بە هەموو شەرتەکانیانەوە بە تەواوی جێبەجێ بکەن، هەریەك لە کاتی خۆیدا بێگومان نوێژ لەسەر ئەهلی ئیمان فەرزێکەو کاتی تایبەتی بۆ دانراوەو پێویستە بکرێ.

(١٠٤) سست مەبن لە کەوتنەدوای دوژمن و بەگژاچوونیان، ئەگەر ئێوە ئازارتان پێ ئەگات، ئەوانیش وەك ئێوە ئازاریان پێ ئەگات، زیاد لەوەیش ئێوە بەتەمای لوتف و سەرکەوتنن لەلایەن خوداوەو ئەوان ئەو هیوایەشیان نییەو لەڕێی شەیتاندا ئەجەنگن. خودا زانایەو لە هەموو کارەکانیدا خاوەن حیکمەتە.

(١٠٥) بێگومان ئێمە بۆیە قورئانمان بۆ ناردووی تا بەو جۆرەی خودا پیشانیداوی ئاوەها لەناو خەڵقا داوەری بکەیتو گیروگرفتیان چار بکەیت. هەرگیز نابێ لەبەر خاتری خائینان و بۆ یارمەتیدانیان دژی هاودەعوایان بیت.

بۆ ڕوون کردنەوەی زیاتر دەگێڕنەوە طوعمەی ئوبەیریق لە خێڵی بەنی ظەفەر زرێ کراسێکی لە قەتادەی کوڕی نەعمانی دراوسێی دزیبوو و لای زەیدی کوڕی سەمینی جوولەکە دایبنابوو. گومان کەوتە سەر طوعمە. کە داوایان لێ کرد ئینکاری کردو سوێنی خوارد کە ئاگای لێ نییەو ئەو نەیدزیوە. وا ڕێکەوتبوو ئەو توورەکەی زرێکراسەکەی تیا هەڵگیرابوو ئاردیشی تیابوو بوو. لەبەرئەوە زرێکە ئارداوی بووبوو لەڕێدا ئاردی لێ وەریبوو خەڵکەکە شوێنی

وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ ۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ۚ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴿١١٣﴾



ناردەکەیان هەڵگرت تا بردنیە دەرگای ماڵی زەیدی کوڕی سەمین و کراس لای زەید بوو، بەڵام وتی: طوعمە دایناوە لام. ئیتر دزییەکە ئاشکرابوو و ماوەی ئینکارکردن و پاساودانی نەما. لەبەرئەوە کەسوکاری طوعمە ڕۆیشتنە خزمەتی پێغەمبەر (د.خ) و تکایان لێ کرد ئەو لەباتی طوعمە موجادەلە لەگەڵ کابرای زرێ دزراو بکات ئەگینا ئابڕوویان ئەچێ. پێغەمبەریش (د.خ) نیازی بوو بیکات. لەوکاتەدا ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتەخوار بۆ سەر پێغەمبەر (د.خ) و ڕێگای شەرعی و دادپەروەرانەی بۆ ڕوون کردەوە.

(١٠٦) داوای لێخۆشبوونیش بکە لە خوا ئەگەر نیازێکی وات هاتوە بەدڵدا، خودا زۆر گوناهبەخش‌و میهرەبانە بەتایبەتی لەگەڵ ئەوکەسەی لێی بپاڕێتەوەو داوای لێخۆشبوونی لێ بکات.

(١٠٧) جیدال مەکەو دیفاع لەو کەسانە مەکە کە خیانەت لەگەڵ نەفسی خۆیان ئەکەن، خودای گەورە ئەوەی خۆش ناوێ کە واز لە خیانەت نەهێنێ و زیادەڕەوی بکا لە خیانەتداو بەجۆرێ خۆی پێوە خەریك کردبێ لێی دەرنەچێ.

(١٠٨) شەرم ئەکەن لە خەڵك و خۆیان ئەشارنەوە لێیان، کەچی لەخودای گەورەو ئافەریدگار شەرم ناکەن کە خودا لەگەڵیاندایەو ئاگای لێیانە چۆن ڕاوێژ و تەدبیر ئەکەن بۆ بێ‌تاوانکردنی گوناهبارو تاوانبارکردنی بێگوناەو شایەتیی درۆدان کە خودا هەرگیز بەم جۆرە قسەو ڕاوێژانە ڕازی نابێ. خودا ئاگادارەو دەوران دەوری کارو کردەوەی داون و هیچی لێ ون نابێ.

(١٠٩) وا ئێوە لە دنیادا لەباتی ئەمانە جیدالتان کردو دیفاعتان لێ کردن، ئەی کێ لە ڕۆژی قیامەتداو لە حوزووری خودادا دیفاعیان لێ ئەکات و موجادەلەیان لەباتی ئەکات؟ یا کێ ئەبێتە وەکیلیان لەسەر کاروبارو پارێزگارییان لێ ئەکات ؟. (١١٠) هەرکەس کارێکی خراپ بکا کە زیان بە خەڵك بگەیێنێ، یاخۆ کارێکی بەدی وەها بکا ببێتە هۆی ستەم بۆ خۆی و، لەپاشاندا لە خودای خۆی بپاڕێتەوەو تکای لێخۆشبوونی لێ بکات و پەشیمان ببێتەوە لەو خراپەو ستەمە کە لە خۆی یا لە خەڵکی کردوە، ئەوا بۆی ڕوون ئەبێتەوە کە لە قاپیی خوایەکی گوناهپۆش و خالیقێکی میهرەباندا ڕاوەستاوەو بە ناهومێدی ناگەڕێتەوە.

(١١١) هەرکەس تاوانێ بکا سزای ئەو تاوانە هەرخۆی ئەگرێتەوە. خودا زانایەو ئاگای لێتانەو کارەکانی پڕحیکمەتن. (١١٢) ئەوەی گوناهێکی بچووك یا گەورە بکاو لەپاشا گوناهەکە بخاتە ئەستۆی یەکێکی بێ‌تاوان و ئەوی پێ گوناهبار بکا، وەك طوعمە دزییەکەی خستە ئەستۆی زەیدی جوولەکە، ئەوە تاوانێکی ئاشکراو بوختانێکی دیاری کردوە، کە ئەیەوێ خۆی دەرباز بکاو یەکێکی بێ تاوان تاوانبار بکا.

(١١٣) ئەگەر فەزڵ و ڕەحمەتی خودا نەبوایە لەسەرت تاقمێ لە خێڵی بەنی طەفەر ئەیانویست لە ڕێ لاتدەن و بە ظاهیری کار حوکم بدەیت، بەڵام خودا بە وەحی ئاگاداری کردیت و، ڕێگای ڕاستی پیشان دایت و هەوڵەکەی ئەوان هیچ کاری تێ نەکردیت. ئەوانە هەر خۆیان گومڕاە ئەکەن و، مادام خودا ئەتپارێزێ ناتوانن زیانت پێ بگەیێنن. خودا قورئان و حیکمەتی بۆ ناردوویت و، شتی وای فێر کردوویت لەوەوپێش نەتئەزانی. فەزڵ و ڕەحمی خودا لەسەر تۆ زۆر گەورەیە.

۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ
أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَـٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ
ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ وَمَن
يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ
سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ
مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ
ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا
﴿١١٦﴾ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَـٰثًا وَإِن يَدْعُونَ
إِلَّا شَيْطَـٰنًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ ٱللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ
مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ
وَلَـَٔامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَـٰمِ وَلَـَٔامُرَنَّهُمْ
فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَـٰنَ وَلِيًّا
مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾
يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾
أُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾



(١١٤) زۆر لە چپەو قسە پەنامەکییەکانیان بێ‌خێرەو هیچی تێدا بەستە نی‌یە، چپەیێ کە باسی ئەمر بە چاکەو پیاوەتی کردن و ناوبەین چاککردنو ئاشتکردنەوەی خەڵك بکات، چپەی وەها جوان و ڕەوایەو هەرکەس کاری وا باش بکات لەپێناوی دەستکەوتنی ڕەزامەندیی خودادا ئەوە پاداشێکی گەورەی ئەدەینێ.

(١١٥) ئەوەی بێ‌گوێیی پێغەمبەری خودا بکات، پاش ئەوەی ڕێگای ڕاستی بۆ دەرکەوت و موعجیزەی بینی و، بە پێچەوانەی فەرمانی ئەو بجوولێتەوەو غەیری ڕێگای موسوڵمانان بگرێتەبەر لە باوەڕو لە کرداردا، ئەیخەینە شوێن ئەو ڕێگایەی گرتوویەتیەبەرو ئەیخەینە دۆزەخ، کە بەدترین شوێن و سەرەنجامە.

(١١٦) خودا لەوە خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ قەرار بدرێ، ئیتر لە هەر گوناهێ لەخوار ئەوەوە بێ، بۆ هەرکەس مەیلی لێ بێ، خۆش ئەبێ. ئەوەی هاوڕێ و هاوبەش بۆ خودای گەورە بڕیار بدات ئەوە ڕێی ون کردوەو ماوەیەکی زۆر دوور کەوتوەتەوە لە ڕێی ڕاست.

(١١٧) ئەو شتانەی ئەوان عیبادەتیان بۆ ئەکەن مێیینەن چونکە موشریکەکان خۆیان بە بتی هەر خێڵێکیان ئەوت: مێیینەی ئەو خێڵە. یا مەبەست مەلائیکەیە کە کافرەکان خۆیان بە کچی خودایان دائەنان. ئەم کافرانە کە عیبادەت بۆ ئەم شتانە ئەکەن لە ڕاستیدا عیبادەت بۆ شەیتانی سەرکەش و لەعنەتی ئەکەن و، ئەو ئەمریان پێ ئەکات و ئەوانیش بە گوێی ئەکەن.

(١١٨) ئەو شەیتانەی کە خودا دووری خستەوە لە ڕەحمەتی خۆی و نەفرینی لێ کرد ئەوەندە ڕقیەتی لە ئادەمزاد وتی: بەشێکی دیاری لە بەندەکانت داگیر ئەکەم و ئەیانخەمە سەر ئارەزووی نەفس و ڕێگای چەوت. ئەوبەشە بۆ من جیاکراوەتەوە.

(١١٩) هەروەها وتی: ئەم بەشە بەندانەت لە ڕێی ڕاست لائەدەم و بە ئارەزووی هیچوپووچ ئەیانخەڵەتێنم، کە گوایا تەمەنیان درێژ ئەبێ و ئیتر زیندووکردنەوەو حیساب و کیتاب نابێ و تۆڵەیان لێ ناسەنرێ ! ئەمریان پێ ئەکەم کە گوێی مەڕو ماڵاتیان بقڵیشێنن بۆ حەرام کردنی ئەوەی خودا حەڵاڵی کردوە. فەرمانیان پێ ئەدەم ئەم شێوانە بگۆڕن کە خودا دروستی کردوون وەك: چاوهەڵکۆڵینی نێرەوشتری گەورەو، خەساندنی عەبدو، پەرستنی خۆرو مانگ و، لادان لە فیطرەتی پاکی ئیسلام. بێ ئەوەی شەیتان بکاتە دۆست و یاریدەری خۆی و واز لە پەرستنی خودا بهێنێ زیانێکی ئێجگار گەورەو ئاشکرا ئەکات.

(١٢٠) شەیتان بەڵێنی درۆیان ئەداتێ و ڕاست ناکا لەگەڵیان و ئەیانخاتە سەر ڕێگای بەتاڵ. شەیتان تەنها سەرکەشییان فێر ئەکات و شتی نارەوایان لەبەرچاو جوان ئەکات.

(١٢١) ئەوانە شوێنیان دۆزەخەو ناتوانن خۆیانی لێ ڕزگار بکەن.

وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۖ وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا ۚ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾ لَيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ ۗ مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ وَلَا يَجِدْ لَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَاتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُحِيطًا ﴿١٢٦﴾ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ ۖ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْوِلْدَانِ وَأَنْ تَقُومُوا لِلْيَتَامَىٰ بِالْقِسْطِ ۚ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِهِ عَلِيمًا ﴿١٢٧﴾



(١٢٢) ئەوانەی ئیمانیان هەیەو کردەوەی چاك ئەکەن ئەیانخەینە چەند بەهەشتێکی ڕازاوەو جوان و ئاووهەوا سازگار کە ڕووباری ڕوون و شیرینیان پێدا ئەڕوات و لەو بەهەشتانەدا ئەمێننەوەو هەرگیز لێی دەرناچن. ئەمانە بەڵێنی ڕاست و ڕەوانن کە خودا بە موسوڵمانانیان ئەدا. کێ لە خودا قسە ڕاست ترو وەفابەوەعدەکردووترە؟.

(١٢٣) چوونە بەهەشت و بەختیاری لە ڕۆژی قیامەتدا نە بە ئارەزووی ئێوەیەو نە بە ئارەزووی گاورو جوولەکەکانەو نە بە قسەو گەزافی موشریکەکانە. گاورو جوولەکە ئەڵێن: ئێمە نەبێ کەس ناچێتە بەهەشت. کافرەکانیش ئەڵێن: هەر لەبنەڕەتدا نە بەهەشت هەیەو نە دۆزەخ. نەخەیر بە قسەی کەس نی‌یە بەڵکو هەرکەس خراپە بکات لێی دەپرسرێتەوەو تۆڵەی لێ ئەسەنرێ و بێجگە خودا نە کەس هەیە پشتی ببەستێ و نە کەس هەیە یارمەتیی بدات.

(١٢٤) هەرکەس کردەوەیێکی باش بکات، پیاو بێ یا ژن، بەو مەرجەی موسوڵمان و خاوەن ئیمان بێ ئەوە ئەوانە ئەڕۆنە بەهەشت و، بە قەدەر توێکڵی ناوکە خورمایەك ستەمیان لێ ناکرێ.

(١٢٥) کێ لە بابەت ئایینەوە لەو کەسە باشترە کە ڕووی کردبێتە خوداو ملکەچی فەرمانی بێت و چاکەکەرو پیاوچاك بێت و پەیڕەویی ئایینی ئیبراهیمی کردبێ، کە خودابەیەك زانین و تەرکی بت پەرستییە. خودا ئیبراهیمی کردوەتە دۆست و خۆشەویستی خۆی و هەرکەس دوای ئایینی ئەو بکەوێ هەرگیز زیان ناکات چونکە ڕێگەی دۆستانی خودای گرتوەتە بەر.

(١٢٦) هەرچی لە ئەرزو ئاسماندایە هەمووی موڵکی خودایەو توان و دەسەڵاتی خودا هەموو شتێکی گرتووەتەوەو، هیچ شتێ لە دائیرەی توانایی ئەو دەرناچێ و هیچی لێ ون نابێ.

(١٢٧) دەربارەی میراتبردنی ئافرەت لێت ئەپرسن و داوای حوکمی شەریعەتی ئیسلام ئەکەن. کە یەکێ بمردایە بەشی ئافرەتیان لە میراتەکەی نەئەدا. تۆ ئەی پێغەمبەر، پێیان بڵێ خودا پیشانتان ئەدات و قورئان حوکمی شەریعەتتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە دەربارەی میراتوەرگرتنی ئەو ئافرەتە هەتیوانە کە هیچ میراتتان نەئەدانێ و، ئەگەر جوان بوونایە خۆتان مارەتان ئەکردن و بەشە میراتەکەیانتان ئەخوارد. خۆ ئەگەر بەدڵتان نەبوونایە نە خۆتان مارەتان ئەکردن و نە ئەتاندان بەشوو و، تەماعیشتان ئەکردە بەشەکانیان. هەروەها حوکمی شەریعەتتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە دەربارەی میراتبردنی منداڵە بێ دەسەڵاتەکان و مەحرووم نەکردنیان. ئەبێ لەگەڵ هەتیودا بە عەدالەت بجووڵێنەوەو جوامێرانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن تا پێ ئەگەن. بێگومان چاکەو پیاوەتی لای خودای گەورە ون نابێ و هەر چاکەیەك ئەکەن خودا ئاگای لێیەتی و پێی ئەزانێ.

وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ۚ وَإِن تُحْسِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓا۟ أَن تَعْدِلُوا۟ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ۖ فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ۚ وَإِن تُصْلِحُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿١٣٤﴾



(١٢٨) ئەگەر ژنێ لە هەڵسوكەوتی مێردەكەیەوە چاوەڕوانی ئەوەی ئەكرد كە خراپ لەگەڵیا بجووڵێتەوەو، ئەترسا لەوەی مافە شەرعییەكانی جێبەجێ نەكات یا پشتی تێ بكات و لە مافی خۆی كەمتر لەگەڵیا بێ قەیناكا لەناو خۆیاندا ڕێك بكەون و هەردوولایان بەپێی پێویست نەختێ تەنازول بۆ ئەوی تریان بكەن. بێگومان ڕێككەوتن و ئاشتی باشە نەك تێكچوون و ئاژاوەو لەیەك جیابوونەوە. ئەم جۆرە ناكۆكییانە ڕووئەدەن چونكە ڕژدی بەشێكە لە خووی نەفسی ئادەمزاد، بۆیە ژنەكە خۆی پێ ڕاناگیرێ و پێی‌ناخۆشە مێردەكەی پشتی تێ بكات و لووتەلا بێ لێی. هەروەها مێردەش ناتوانێ بەسەر نەفسی خۆیا زاڵ ببێ و مافی ژنەكەی بەتەواوی بەجێبێنێ. جا ئێوە ئەگەر هەڵسوكەوتتان چاك و شەرعی بێ و خۆتان لە كاری ناشەرعی بپارێزن و لە حەق لانەدەن، ئەوە خودا ئاگای لێتانەو بە كردەوەی چاك و خراپتان ئەزانێ‌و هیچی لێ ون نابێ.

(١٢٩) ئێوە هەرگیز ناتوانن بە تەواوی عەدالەت لە بەینی ژنەكانتانا بكەن و بێكەم و زیاد لە دڵ و دەرەوە یەكسان بن لەگەڵیان، با زۆریش ئەم عەدالەتەتان مەبەست بێ و بتانەوێ بیكەن بەڵام هەتا ئەتوانن لە عەدالەت لامەدەن و، ژنەكانتان وەك (معلقة) مەهێڵنەوە كە نە ژنێكی خاوەن مێردو حاڵ و ماڵ بن و نە ژنێكی تەڵاقدراو بن بتوانن بۆ خۆیان شوو بكەن. جا ئەگەر ئەو ناوبەینەی كە تێكتاندابوو چاكتان كردەوەو، لە خودا ترسان و خۆتان لە ناشەرعی پاراست، ئەوا خودا لەوەی پێشووتان چاوپۆشی ئەكات. خودا گوناهبەخش و میهرەبانە. (١٣٠) ئەگەر پێكەوە نەتانكراو بە تەڵاق لە یەك جیابوونەوە ئەوە كەستان پەكی ناكەوێ و، خودا گەورەیەو لە ڕۆزیی فراوانی خۆی ئەوەندەتان ئەداتێ كە موحتاجی یەكتر نەبن. میهرەبانی و كەرەمی خودا فراوانەو كارەكانی پڕ لە حیكمەتن.

(١٣١) هەرچی لە زەوی و ئاسمانەكاندایە هەمووی مولكی خودایەو هەموو موحتاجی ئەون. ئێمە ئامۆژگاریی ئەوانەمان كردوە كە لەلایەن خوداوە پێش زەمانی ئێوە بەهۆی پێغەمبەرانەوە كتێبیان بۆ نێرراوە. هەروەها ئامۆژگاریی ئێوەشمان كرد كە لە خودا بترسن، چونكە ئەگەر كافر بن خودا موحتاجی ئیمانی ئێوە نییەو خۆتان زەرەر ئەكەن. هەرچی لە زەوی و ئاسمانەكاندا هەیە هەمووی مولكی خودایە. خودا موحتاجی كەس نییەو دەوڵەمەندەو خۆی لە خۆیا ستایش كراوە. هەرچی لە زەوی و ئاسماندایە كڕنووشی بۆئەبەن، ئێوە سوپاس و ستایشی بكەن یا نەیكەن.

(١٣٢) هەرچی لە زەوی و ئاسمانەكاندایە هەمووی مولكی خودان و خودا بوونی پێ بەخشیون. خودا زەوی و ئاسمانەكان و هەرچییان تێدایە بەخێو ئەكات و سەرپەرشتییان ئەكات.

(١٣٣) ئەی خێڵی بنیادەم! خودا ئەگەر بیەوێ ئێوە بەتەواوی لە ناوئەبات و مەخلووقێكی غەیری بنیادەم دروست ئەكات. یا ئەی قەوم، ئەی كۆمەڵە خەڵكەكە لە خۆتان بایی مەبن، خودا ئەگەر بیەوێ ئەتانفەوتێنێ و شوێنەوارتان كوێر ئەكاتەوەو، كۆمەڵێكی تر دێنێتە ڕووی كار. خودا توانایی ئەمەی هەیەو زۆر لای ئاسانە.

(١٣٤) ئەوەی تەنها پاداشی دنیای ئەوێ وەك ئەوانەی بۆ تاڵانی و ماڵی دنیا جیهاد ئەكەن، بۆچی داوای پاداشی دنیاو قیامەت ناكات یا داوای چاكترەكەیان ناكات كە پاداشی قیامەتە؟ خودا پاداشی دنیاو قیامەتی لایەو خودا شنەواو بینایەو ئاگای لەهەموو كاروبارتان هەیە.

۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا ﴿١٣٧﴾ بَشِّرِ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَٱلْكَـٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾



(١٣٥) ئەی خاوەن ئیمانەكان! هەمیشە لەگەڵ دادپەروەری و حەقدا بن. شایەتی بەجۆرێ بدەن خودا پێی ڕازی بێ واتە حەق نەكات بە ناحەق و ناحەق نەكات بە حەق. شایەتیی ڕاست بدەن با لەسەر خۆتان و باوك و دایكتان وخوێشە زۆر نزیكەكانیشتان بێ، واتە لەبەر خزمایەتی و برادەری چاو لە حەق مەپۆشن ئەگەر شایەتیبۆدراو یا شایەتیلەسەردراو دەوڵەمەند بێ یا هەژار، خودا مەسڵەحەتیان باش ئەزانێ و چاكتر سەرپەرشتییان ئەكات. حوكمی شەرع و، بە ڕاستی شایەتی بۆدان و شایەتی لەسەردانیان قازانجی ئەوانە، نە كەسیان حەقی ئەفەوتێ و، نە كەسیان گوناهبار ئەبێ. مەكەونە دوای ئارەزووی نەفس تا لە حەق لابدەن. خۆ ئەگەر لە شایەتیدا زوبانتان گۆڕی و حەق و ڕاستیتان كرد بەژێرەوە، یا بە تەواوی گوێیخۆتان لێ كەڕ كردو شایەتیتان تیا نەدا، ئەوا زیان لە خۆتان ئەدەن، خودا ئاگای لە هەموو كردەوەتان هەیەو هیچی لێ ناشاررێتەوە.

(١٣٦) ئەی موسوڵمانەكان، یا ئەی منافقەكان، یا ئەی ئیماندارە كیتابییەكان ئیمان بێنن بە دڵ و زمان و بەڕاستی بە خوداو بە پێغەمبەری خوداو بەو قورئانەی بۆی ناردووەو بەو كتێبەی كە خودا پێش موحەممەد ناردوویەتی و، لەسەر ئەم ئیمانە بەردەوام بن، بێگومان هەركەس ئیمانی بە خودا نەبێ یا ئیمانی بە مەلائیكەی خودا نەبێ، یا ئیمانی بە پێغەمبەرانی خودا یا بە ڕۆژی قیامەت نەبێ، ئیتر ئیمانی بە هەموو ئەمانە نەبێ یاخۆ بە یەكێكیان، ئەوە ئەوكەسە زۆر زۆر گومڕاه بووەو زۆر لە حەق دووركەوتوەتەوە.

(١٣٧) ئەو منافقانەی خۆیان وا پێشان دا كە موسوڵمان بوون و لەپاشاندا بەئاشكرا لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو جارێكی تر هاتنەوەو خۆیان وا پیشان دا كە بە تەواوی موسوڵمان بوون، كەچی دووبارە هەڵگەڕانەوەو لە جاران گەرمتر دەستیان دایەوە ئاژاوەو پیلان دژی ئیسلام و دژی پێغەمبەر، یا مەبەست هەموو منافقێكی سەردەمی پێغەمبەرە (د. خ) كە كارو پیشەیان لە ئیسلام دان بووە، ئەوانە خودا لێیان خۆش نابێ و نایانخاتە سەر ڕێگای ڕاست چونكە زۆر دوورە تەوبە بكەن و بە دین و ئیمانەوە بمرن.

(١٣٨) ئەی پێغەمبەری خودا! موژدە بدە بەو منافقانە كە هەر جارێ بەبارێكدا ئەگۆڕێن و خەریكی ئازاردانی تۆو ئاژاوە نانەوەن، كە وا سزایێكی زۆر ئازاردار چاوەڕوانییان ئەكات و تۆڵەی بەرودوایان لێ ئەسەنرێ.

(١٣٩) ئەوانەی كە كافرەكان ئەكەنە دۆستی خۆیان و پشت لە موسوڵمانەكان ئەكەن، ئایا وا ئەزانن كە بەو دۆستایەتییە گەورەیی‌و دەستەڵات پەیدا ئەكەن؟ نەخەیر، گەورەیی و سەربەرزی هەمووی هی خودایەو، بەوە دەست ئەكەوێ كە ئینسان دۆستی لەگەڵ دۆستانی خودا بكات.

(١٤٠) خودا لە قورئاندا بەیانی كردووە بۆتان: ئەگەر بیستتان لە مەجلیسێكدا ئینكاری قورئان ئەكرێ و گاڵتەی پێ ئەكرێ، لەگەڵیان دامەنیشن تا ئەو باسە ئەگۆڕن و ئەچنە سەر باسێكی تر. ئەگەر دانیشتن و گوێتان لێ گرتن ئەوا ئێوەیش وەك ئەوان ئەبن. خودا كافرەكان و منافقەكان كە لەگەڵیان دائەنیشن و گوێ لە قسەیان ئەگرن لە ڕۆژی قیامەتدا پێكەوە موحاكەمە ئەكات و لە ئاخی دۆزەخدا كۆیان ئەكاتەوە.

ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَٱعْتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُواْ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾



(١٤١) ئەو منافقانەی چاوەڕوانی ئەوە ئەکەن کاریٚ ڕوو‌بدا، جەنگیٚ لەبەینی ئیٚوەو کافرەکاندا بقەومیٚ، جا ئەگەر خوای گەورە ئیٚوەی سەرخست و کافرەکانی شکاند ئەوا دیٚنە پیٚشەوەو ئەڵیٚن: ئەی ئیٚمە لەگەڵتان نەبووین و لەناو جەنگکەراندا نەبووین؟ ئەمەش بۆئەوەی لە دەسکەوتی موسوڵمانەکان شتیٚکیان بەرکەویٚ. خۆئەگەر کافرەکان شتیٚکیان لە مەعرەکەکە دەست کەوت ئەڕۆنە پیٚشەوەو پیٚیان ئەڵیٚن: ئەی ئەوە نەبوو ئیٚمە بەسەرتاندا زاڵ بووین کەچی لەگەڵ ئەوەیش دەستمان لیٚ نەدان و نەمانهیٚشت موسوڵمانەکان بتانکوژن و ترساندمانن و فیٚڵمان لیٚ کردن تا ئیٚوە تووشی زیان نەبن ؟! ئەمانە، خودای ئاگادار لە ڕۆژی قیامەتدا موحاکەمەیان ئەکات و تۆڵەیان لیٚ ئەکاتەوە. خودا هەرگیز دەلیل نادا بە کافرەکان دژی موسوڵمانەکان.

(١٤٢) ئەو کارەی منافقەکان ئەیکەن کە بەدیمەن خۆیان بە موسوڵمان پیشان ئەدەن و لە دڵەوە کافرن و پیٚغەمبەریش بەپیٚی ظاهیر وەك موسوڵمان موعامەلەیان لەگەڵ ئەکات، وەکو ئەوەیە کە گوایا فیٚڵ لە خودا بکەن. نەخەیر فیٚڵ لە خودا ناکریٚ. خودا ئاگادارە، ئەنجامی ئەمکارەیان خۆیان ئەگریٚتەوەو خودا زاڵ ئەبیٚ بەسەر ئەواندا. کە هەڵئەستن بۆ نویٚژ بە سستی و تەمەڵی و نابەدڵی هەڵئەستن و بۆ ڕیاو ڕووپامایی نویٚژ ئەکەن و لەڕاستیدا کەمیٚ نەبیٚ ناوی خودا ناهیٚنن چ جای بیر لیٚ کردنەوەی.

(١٤٣) ئەم منافقانە دوودڵ و ڕاڕان. نە ئەوەتە بەتەواوی بیٚنە لای موسوڵمانەکان و نە ئەوەتە بەئیٚجگاری بڕۆنە پاڵ کافرەکانی برادەریان. بەڵیٚ کەسیٚ بەهۆی تاوانباری و دڵڕەشیی خۆیەوە خودا سەری لیٚ بشیٚویٚنیٚ، هەرگیز ڕیٚگای ڕاستی خۆی نادۆزیٚتەوەو هەر سەرگەردان ئەبیٚ.

(١٤٤) ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە خوداو پیٚغەمبەری خودا هەیە هەرگیز نەکەن کافرەکان بکەن بەدۆستی خۆتان و واز لە موسوڵمانەکان بهیٚنن. ئەمە کاری منافقەکانە، ئەوان شتی وا ئەکەن. ئایا ئەتانەویٚ دەلیلی ئاشکرا بدەنە دەستی خودا دژی خۆتان تا سزاتان بدات؟ ئایا بە دەستی خۆتان خۆتان تووشی سزا ئەکەن؟.

(١٤٥) بیٚگومان منافقەکان لە ناخی هەرە خوارووی دۆزەخدان لە قیامەتداو، هەرگیز یەکیٚکیان دەست ناکەویٚ یارمەتیدەریان بیٚ.

(١٤٦) ئەوانە نەبیٚ کە واز لە منافقی ئەهیٚنن و ئەو خراپانەی لەگەڵ موسوڵمانان کردوویانە چاکی ئەکەن و واز لە ئازاردانیان ئەهیٚنن دەست بە دینی خوداوە ئەگرن و بڕوایان پیٚی ئەبیٚو تەنها بۆ ڕەزامەندیی خودا عیبادەت ئەکەن نەك بۆ ڕیا. ئەوانە لە زومرەی موسوڵمانانن لە دنیاو قیامەتدا. خودا لە ڕۆژی دواییدا پاداشتیٚکی گەورە بە موسوڵمانان ئەدات.

(١٤٧) خودا چیئەکات بە سزادانی ئیٚوە ئەگەر سوپاسگوزاری خودا بن و ئیمانتان بە خوداو پیٚغەمبەر هەبیٚ؟ خودا تاعەت قبووڵ ئەکات و ئاگای لە هەموو کردارتان هەیە.

۞ لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلۡجَهۡرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ إِلَّا مَن ظُلِمَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبۡدُواْ خَيۡرًا أَوۡ تُخۡفُوهُ أَوۡ تَعۡفُواْ عَن سُوٓءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٥٢﴾ يَسۡـَٔلُكَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيۡهِمۡ كِتَٰبٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ فَقَدۡ سَأَلُواْ مُوسَىٰٓ أَكۡبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓاْ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلۡمِهِمۡۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَعَفَوۡنَا عَن ذَٰلِكَۚ وَءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمۡ وَقُلۡنَا لَهُمُ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا وَقُلۡنَا لَهُمۡ لَا تَعۡدُواْ فِي ٱلسَّبۡتِ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ﴿١٥٤﴾



(١٤٨) خودا پێی خۆش نی‌یە بەئاشکراو بە دەنگی بەرز باسی خراپەی خەڵك بکرێ بۆ کەسێ نەبێ ستەمی لێ کرابێ، ئەو بۆی ڕەوایە بە دەنگی بەرزو بەئاشکرا باسی ستەمەکەی بکات و خودا لێی‌ناگرێ. خودا سکاڵای ستەم لێکراو ئەبیسێو ئاگای لە ستەمی ستەمکارە.

(١٤٩) ئەگەر تاعەت و چاکەی خۆتان بە ئاشکرا بکەن یا بیشارنەوە یا لە خراپەی یەکێك دەربارەتان چاوپۆشی بکەن، خودا زۆر گوناهبەخشەو زۆر بە دەسەڵاتەو پاداشی چاکتان پێ ئەبەخشێ.

(١٥٠) ئەوانەی ئیمانیان بە خوداو بە پێغەمبەرانی خودا نی‌یەو، بەم جۆرە ئەیانەوێ ئیمان بە خوداو ئیمان بە پێغەمبەران لەیەك جیابکەنەوەو ئەڵێن: باوەڕمان بە هەندێ لە پێغەمبەران هەیەو باوەڕمان بە هەندێکیان نی‌یەو، ئەیانەوێ بۆ خۆیان ڕێگایەکی مامناوەندی بگرن !

(١٥١) ئەوانە بەتەواوی کافرن چونکە ئیمان بەخودا جیاناکرێتەوە لە ئیمان بە پێغەمبەران. ئینسان وەختێ ئیمانی بە خودا ئەبێ کە باوەڕ بەو پێغەمبەرانەیش بکا کە ئەو ناردوونی‌و بەو کتێب و ئایینانەی بەوانا ناردوونی. ئیتر چۆن ئەبێ ئینسان ئیمانی بە خودا هەبێ کەچی ئیمانی بە ڕاستیی پێغەمبەرەکانی نەبێ؟! ئێمە سزایێکی توندو ئابڕووبەرمان بۆ کافران ئامادە کردووە.

(١٥٢) ئەوانەی ئیمانیان بە خوداو بە هەموو پێغەمبەرەکانی هەیەو، جیاوازیی ناخەن لەبەینی ئەو پێغەمبەرانەدا، ئەوکەسانە لە دوارۆژدا پاداشیان ئەدەینەوە. بە ڕاستی خودا بەخشندەو میهرەبانە.

(١٥٣) ئەهلی کیتاب داوای ئەوەت لێ ئەکەن کتێبێکیان لە ئاسمانەوە بۆ بهێنیتە خوارەوە! ئەمانە لەمە گەورەتریان لە مووسا داوا کرد. پێیان ئەوت: خودامان بە ئاشکرا پیشان بدە! جا بەهۆی ئەم ستەم و بێ‌ئیمانییەیانەوە خودا هەورەتریشقەی دا بەسەریانداو سووتاندنی. بەوەیش وازیان نەهێنا بەڵکو لەگەڵ ئەوەیش کە دەلیل و موعجیزەیان پیشان درا، کە مووسا چوو بۆ کێوی طوور، دەستیان کرد بە پەرستنی گوێرەکە! ئێمە چاوپۆشیمان لەوە کردو دەسەڵاتی ئاشکرامان دا بە مووساو داوای لێ کردن لەباتی تەوبەکردن لە پەرستنی گوێرەکە خۆیان بکوژن.

(١٥٤) لەبەر ئەوەی پەیمانەکەیان قبووڵ نەکرد کە بەپێی تەورات کار بکەن و لێی لانەدەن، ئەو کێوی طوورەی لە پاڵیا خانوویان کردبوو، وەك سێبەر بەرزمان کردەوە بە ڕاسەریانەوە، ئەنجا پەیمانەکەیان قبووڵ کرد! دوایی کە مووسا وەفاتی کردو یووشەع کرا بە پێغەمبەریان، پێمان وتن: لە دەرگای (بیت المقدس)ەوە بە سوجدە بردن بڕۆنە ژوور. هەروەها لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیی داووددا پێمان وتن: ڕۆژانی شەممە لە سنووری خودا لامەدەن. لەو ڕۆژەدا ڕاوەماسی مەکەن کە لێتان حەرام کراوە. لەسەر ئەم شتانە هەریەکە لە ڕۆژی خۆیدا پەیمانێکی گەورەمان لێ سەندن.

فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ
بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ
فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ
بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ
رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ
ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ
وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا
﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟
حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ
كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ
بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّٰكِنِ
ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ
أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ
وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾



(١٥٥) جا لە بەر ئەوە کە پەیمانیان تێکداو دەستیان دایە کوفرو بێئیمانی بە ئایەتەکانی خوداو، لەبەر ئەوە کە پێغەمبەرانی وەك زەکەریاو یەحیایان بە ناحەق ئەکوشت و، هەروەها لەبەر قسە نارەواکانیان کە ئەیانوت: دڵمان پڕو لێوانە لە زانیاریو موحتاجی ئامۆژگاری پێغەمبەران نین، کەچی درۆیان ئەکرد هیچیان نەئەزانیو خودا دڵی مۆر کردبوونو کەمێکیان نەبێ لێیان موسوڵمان نەبوو، بەڵێ لەبەر ئەمە هەمووی خودا غەزەبی لێ گرتن و تۆڵەی لێ کردنەوە.

(١٥٦) هەروەها خودا غەزەبی لێ گرتن چونکە ئیمانیان بە عیسای پێغەمبەر (د.خ) نەهێناو بوختانێکی گەورەیان بۆ حەزرەتی مەریەمی دایکی عیسا هەڵبەست و نیسبەتی زینایان لێدا.

(١٥٧) هەروەها خودا لەبەر ئەوە غەزەبی لێگرتن کە درۆیان ئەکردو ئەیانوت: ئێمە عیسای کوڕی مەریەممان کوشت کە پێغەمبەری خودا بوو. نەخەیر نەیانکوشتو نەشیانکرد بە داردا، بەڵکو کارەکەیان لێ گۆڕراو سەریان لێ تێکچوو، یەکێکی تر بوو کوژرا کە خودا ڕەنگی عیسای دا بە سەریداو بەویان زانیو کوشتیان. ئەوانە کە ئیختیلافیان هەیە لە کارەکەداو هەر یەکێکیان بەجۆرێ باسی ئەکا، گومانێکی تەواویان هەیەو دڵنیا نین و زانیاریی ڕاستەقینەیان نییە دەربارەیو، دوای گومان کەوتوون و بە یەقین نازانن کوشتوویانەو، بەڕاستی نەیانکوشتووە.

(١٥٨) بەڵێ ئەوان نەیانکوشت، خودا پایەی بەرزی دایەو، بەرزی کردەوە بۆ ئەو شوێن و پایەی خۆی بۆی دیاری کردووەو هەر خۆیشی ئەیزانێ. خودا تواناییەو کارەکانی پڕحیکمەتن.

(١٥٩) قەسەم بە خودا! پێش ئەوەی عیسا وەفات بکا هەموو ئەهلی کیتاب لەم دنیایەدا ئیمانی پێ ئەهێنن، ئەنجا وەفات ئەکات. لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەبێتە شاهێد لەسەر هەموویان، لەسەر جوولەکەکان کە باوەڕیان پێ نەکردو لەسەر گاورەکانیش کە کردیانە کوڕی خودا!.

(١٦٠) جا بە هۆی ئەو ستەمانەوە کە جوولەکەکان کردیان، گەلێ خواردەمەنی پاك و پوختمان لێ حەرام کردن کە لەوەوپێش حەڵاڵ کرابوون بۆیان. بەڵێ لەبەر ستەم و لە بەر ئەوەی مەنعی خەڵکیان ئەکرد لەوە کە ئیمان بهێنن و بە زۆر ڕێیان لێئەگرتن ئەو خواردەمەنییانەمان لێ حەرام کردن.

(١٦١) هەروەها لەبەر ئەوەی سوودیان ئەخوارد کە حەرام کرابوو لێیان و ماڵی خەڵکیان بە ناحەق ئەخوارد بە بەرتیل و ڕێگا ناشەرعییەکانی تر، بێگومان بۆ ئەوانەیان کە کافر بوون و تەوبەیان نەکرد، سزایێکی زۆر ئازاردەرمان ئامادە کردووە. (١٦٢) بەڵام ئەو کیتابییانەی لە زانیاریدا دامەزراون و ئیمانیان بە ئایینی ئیسلام هێناوەو، موسوڵمانانی موهاجیرین و ئەنصار کە ئیمانیان هێناوە بەو قورئانەی بۆ تۆ نێرراوەو، ئەوانەی نوێژ ئەکەن و زەکات ئەدەن و ئیمانیان بە خوداو بە ڕۆژیی دوایی هەیە، ئەوانە پاداشێکی گەورەیان ئەدەینەوە.

إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٦٥﴾ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدۡ ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿١٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧٠﴾



(١٦٣) ئێمە وەحیمان بۆ تۆ کردووەو قورئانمان بۆ ناردووی تا ڕێوشوێنی ئایین و ڕاستیو چاکەو خراپە بە خەڵك ڕابگەیێنی تا لە دواڕۆژدا کە موحاسەبە ئەکرێن بەهانەیان نەمێنێو نەڵێن ئێمە چاك و خراپمان نەئەزانیو کەس ئاگاداری نەکردووین، هەروەك چۆن بۆ هەمان مەبەست وەحیمان کرد بۆ نووح و بۆ پێغەمبەرەکانی پاش ئەوو، وەحیمان بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و کوڕەکانی کردو وەحیمان کرد بۆ عیساو بۆ ئەییووب و یوونس و هاروون و سولەیمان و زەبووریشمان دا بە داوود. دروودی خوای گەورە لە هەموویان بێ.

(١٦٤) پێغەمبەرانی وەهامان ناردووە بۆ ڕەهبەریی خەڵك کە باسمان کردوون بۆت، پێغەمبەرانی وەهایشمان ناردوون کە باسمان نەکردوون بۆت. خودا مووسایشی بەوە هەڵاوێردووە کە قسەی لەگەڵ کردووە.

(١٦٥) ئەم پێغەمبەرانە کە خودای گەورە ناردوونی هەموویان موژدەیان داوە بە خاوەن باوەڕان کە پاداشیان باش ئەبێو هەڕەشەیان کردووە لە بێباوەڕان و ترساندوونیان بە سزای توندو تیژ لە ڕۆژی قیامەتدا. ئەم پێغەمبەرانە بۆیە بەم حاڵەوە نێرران بۆ لای خەڵك تا لە ڕۆژی داددا کە حیساب و کیتابیان لەگەڵ ئەکرێ قسەیان لەسەر خودا نەمێنێو بەهانەیان بڕێو نەڵێن ئێمە لە دنیادا کەس ئاگاداری نەکردووین. خودا بەهێزەو کارەکانی پڕ حیکمەتن.

(١٦٦) بەڵام خودای گەورە شایەتی ئەدا بەوە کە قورئانی بۆ ناردوویت و بە زانین و ئاگاداریی خۆی ناردوویە بە شێوەیێکی فەصیح و بەلیغ کە کەس نەتوانێ وێنەی بهێنێو، بە جۆرێك کە قازانجی دین و دنیای خەڵکی تێدا بێو ئایینی ئیسلام دامەزرێنێ مەلائیکەکانیش شایەتی ئەدەن. بێگومان خودا بەسە بۆ شایەتیو باشترین شاهیدە.

(١٦٧) بێگومان ئەوانەی ئیمانیان نییە بە خوداو پێغەمبەرو، ڕێگا لە خەڵکی ئەگرن و ناهێڵن ڕێگای ئایینی پیرۆزی ئیسلام بگرنەبەر، ئەوانە بە شێوەیێکی زۆر قووڵ گومڕا بوون، چونکە هەم خۆیان گومڕان و هەم خەڵکیش گومڕا ئەکەن.

(١٦٨) بێگومان ئەوانەی ئیمانیان نەهێنا بە خوداو بە تۆو بەو قورئانەی بۆی ناردوویت، ئەوانەی کە ستەمیان لە خۆیان کردووە بە بێئیمانیو ستەمیان لە خەڵکیش کردووە کە ناهێڵن بکەونە سەر ڕێی ڕاست، ئەوانە خودا هەرگیز لێیان خۆش نابێو، تا وەها سوور بن لەسەر گومڕایی، نایانخاتە سەر ڕێی ڕاست.

(١٦٩) بێجگە ڕێگایەك کە ئەیانباتە دۆزەخ و هەتا هەتایە تیادا ئەمێننەوە. ئەمە بۆ خودا ئاسانەو خودا توانایی بەسەر هەموو کارێکدا هەیە. (١٧٠) ئەی بەرەی ئادەمزاد! وا بەڕاستی موحەممەدتان بە پێغەمبەری بۆ هات لەلایەن خوداوەو ئایینی ئیسلامی بۆ هێناون، ئیمانی پێ بهێنن و پەیڕەوی بکەن. خۆ ئەگەر ئیمانی پێ نەهێنن و بەگوێی نەکەن، ئەوا خودا موحتاجی ئیمانی ئێوە نییە، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە مولکی خودایە، خودای گەورە زانایەو کارەکانی پڕ حیکمەتن.

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٧٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴿١٧٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿١٧٥﴾



(١٧١) ئەی ئەهلی کیتاب! زیادەڕەوی مەکەن لە دینی خۆتاندا. خودای تەنیا بە خودا بزانن و پێغەمبەرەکان بە بەندەی خودا قەرار بدەن. بێگومان حەزرەتی مەسیح عیسای کوڕی مەریەم پێغەمبەری خودایەو بەهۆی کەلیمەییێکەوە پەیدا بووە کە تەعبیرەکەی (کن فیکون)ە، خودا وتی: ببەو، بوو، ئەو کەلیمەی حەواڵەی مەریەم کردو، ویستی بیکات بە شوێنی کارکردنی ئەو کەلیمەیە. عیسا ڕۆحێکە بە ئیرادەی خودا پەیدا بووە، دەسا ئیمان بێنن بە خوداو بە پێغەمبەرەکانیو، هەرگیز مەڵێن: خودا سیانن و دەس بەرداری ئەو قسە نارەوایە بن و ڕوو بکەنە خێرێ بۆ خۆتان. بێگومان خودای بەحەق یەك خودایە، دوورەو پاکە لەوەی ئەولادی بێ. هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هی خودایەو لەژێر دەسەڵاتی ئەودایە. خودا باشترین وەکیلە.

(١٧٢) بێگومان مەسیح، عیسای کوڕی مەریەم، لای عار نییەو سەرپێچی ناکات لەوەی کە بەندەی خودا بێ. خۆی بە بەندەی خودا ئەزانێو شانازی پێوە ئەکات. هەروەها مەلائیکە پایەبەرزەکانیش خۆیان بە بەندەی خودا ئەزانن. ئەوەی پێی ئەنگ بێ خودا بپەرستێو، خۆی بە گەورە بزانێ، خودا لە ڕۆژی قیامەتدا هەموویان کۆئەکاتەوە لای خۆیو حیساب و کیتابیان لەگەڵ ئەکات.

(١٧٣) جا ئەوانەی ئیمانیان هەیەو کردەوەی چاك دەکەن، خودا بەتەواویو بێ کەموکووڕی پاداشیان ئەداتەوەو، لە گەورەییو دەهەنەیی خۆی زیادەیشیان بۆ ئەخاتە سەر. ئەوانەیش کە عاریان لێ دێ خودای گەورە بپەرستن و خۆیان بە گەورە ئەزانن و لە خۆبایی ئەبن، ئەوانە سزایەکی توندو زۆر بەئازاریان ئەدات و، لەوێ کەس فریایان ناکەوێو بێجگە خودا کەسیان دەست ناکەوێ سەرپەرشتییان بکات و کەسیان دەست ناکەوێ یارمەتییان بدات.

(١٧٤) ئەی خەڵکینە! بەڕاستی لەلایەن خوداوە دەلیلی زۆر بەهێزتان بۆ هاتووە بۆ ئیسپاتی گەورەییو بێهاوتایی خودای تواناو دەسەڵاتدار، وەك موعجیزەکان کە پێغەمبەر (د.خ) پیشانی دان. هەروەها ڕووناکییەکی ئێجگار پڕتەودارمان بۆ ناردن کە قورئانی پیرۆزەو پڕە لە زانیاریو ئامۆژگاریو هۆیە بۆ بەختیاریی دنیاو قیامەت. ئیتر بەهانەتان نەماو، ئەگەر ڕێگای ڕاست نەگرنە بەر خۆتان زیانبار ئەبن.

(١٧٥) ئەوانەی ئیمانیان هەیەو دەستیان بە دینی ئەوەوە گرتووە، ئەوانە خودا دەیانخاتە ناو دەریای ڕەحمەتی بێپایانی خۆیو پاداشیان ئەداتەوەو، ئەیانخاتە سەر ڕێگای ڕاست لە دنیادا کە ڕێگای لە خواترسانەو، لە قیامەتیشدا کە ڕێگای بەهەشتە.

يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾

## سُورَةُ المَائِدَة

ترتيبها ٥ — آياتها ١٢٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ ۚ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحِلُّوا۟ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُوا۟ ۚ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا۟ ۘ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾



(١٧٦) داوای حوکمی خودات لێ ئەکەن دەربارەی چۆنیەتی میراتی (کەلالـە)، تۆ پێیان بڵێ: خودا بەیانی حوکمەکەتان بۆ ئەکات: ئەگەر ئینسانێ مردو ئەولادی نەبوو و خوشکێکی هەبوو ئەو خوشکە نیوەی میراتی مردووەکە ئەبا، ئیتر خوشکەکە خوشکی باوك و دایکی بێ یا خوشکی باوکی. خۆ ئەگەر خوشکەکە مردو ئەولادی نەبوو ئەوا براکەی میراتی لێ ئەبا. هەروەها ئەو کەلالەی کە باس کرا ئەگەر دوو خوشکی هەبوو ئەوە دوو بەش لە سێ بەشی میراتەکەی ئەبەن. خۆ ئەگەر هەر خوشکی تەنها نەبوون بەڵکو خوشك و برا بوون ئەوا نێرینە دوو ئەوەندەی بەشی مێیینە ئەبات.

خودا ئەو حوکمەتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە نەبادا ڕێگا ون بکەن و گوناهبار بن. خودا ئاگای لە هەموو شت هەیەو هیچی لێ ون نابێ. شایانی باسە: کەلالە بەو کەسە ئەوترێ بمرێو ئەصڵو فەرعی لەدوا بەجێ نەمابێ. واتە: باوك و باپیرو کوڕو کچی نەبێ، چونکە شەخصی وەها زۆر ماندووەو دڵی عاجزە لەوەی کە نە باوك باپیرەی هەیەو نە ئەولاد.

## سوورەتی (المائدة)

مەدینەییەو (١٢٠) ئایەتە

(١) ئەی خاوەن ئیمانەکان! وەفا بکەن بەو پەیمانانەی لەگەڵ خودا یا لەگەڵ خەڵك و خۆتاندا بەستووتانن. گۆشتی هەموو چوارپێکان وەك مەڕ، بزن، وشتر، گا، حەڵاڵە بۆتان و بیخۆن، ئەوانە نەبێ کە باسی حەرامییان ئەکەین. کە لە ئیحرامی حەجدا بوون، نابێ ڕاو بکەن، نابێ گۆشتی ڕاوکراو بخۆن، بە ڕەوای مەزانن و خۆتانی لێ لادەن. خودا چۆنی بوێ وەها حوکمتان بۆ دائەنێو بەپێی حیکمەتی خۆی کار ئەکات.

(٢) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە حورمەتی عیبادەت و ڕێوشوێنی حەج مەشکێنن. حورمەتی مانگی حەرام مەشکێنن. حەیوانێ بۆ هەدی دیاری کراوە داگیری مەکەن. حەیوانی خاوەن گەردنبەند داگیر مەکەن. گەردنبەندەکانیان مەبەن. دەست مەبەن بۆ ئەو کەسانە کە ئیحرامیان بەستووە بە قەصدی حەجی ماڵی خودا مادام داوای فەزڵو ڕەحمەتی خودا ئەکەن. کاتێ کە لە ئیحرام دەرچوون ڕاوو شکاری خۆتان بکەن، بۆتان ڕەوایە. کینەو دوژمنایەتیی کۆمەڵێ کە وەختی خۆی دەستیان هێنایە ڕێتان و مەنعی (مسجد الحرام)یان لێ کردن، هەڵتاننەنێو واتان لێ نەکات دەستدرێژی بکەن و تۆڵەی خۆتان بسێننەوە. لەناو یەکدا لەسەر کاری چاکەو خێرو لەخوداترسی هاوکاری بکەن، لەسەر گوناهو دەستدرێژی گەلەکۆمەکێ مەکەن. لە خودا بترسن، خودا بەتوندی تۆڵە ئەسێنێتەوەو سزای تاوانبار ئەدات.

حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣﴾ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٤﴾ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾



(٣) حەرامە لەسەرتان گۆشتی مردارەوەبوو بخۆن،کە ئەوەتە بە بێ سەربڕین گیانی دەرچووبێ. هەروەها خوێنی ڕژاوی حەیوان خواردنی حەرامە، نەك خوێنی گیرساوی وەك جگەرو سپڵ. حەرامە لەسەرتان خواردنی گۆشتی بەرازو، گۆشتی ئەو حەیوانەی لەسەر غەیری ناوی خودا سەربڕابێ، وەك ئەو حەیوانەی لەباتی ناوی خودا بەناوی بتەکانەوە سەربڕابێ. حەرامە لەسەرتان خواردنی گۆشتی حەیوانی خنکاو بە هەر هۆییێك خنکابێ. هەروەها حەرامە لەسەرتان خواردنی گۆشتی حەیوانێ کە لە سەری یا لە ئەندامێکی تری بدرێ تا ئەمرێ، حەرامە لەسەرتان خواردنی گۆشتی حەیوانێ لە شوێنێکی بەرزەوە کەوتبێتە خوار، یا کەوتبێتە بیر یا چاڵێك و مردبێ، یا حەیوانێ بە قۆچی حەیوانێکیتر کوژرابێ، یا دوڕندە لێی خواردبێ تا مراندبێتی، مەگەر فریای بکەون و گیانی تێدا مابێو سەری ببڕن و خوێنەکەی بازرەقە ببەستێ یا لەکاتی سەربڕینەکەدا پەلەقاژە بکات. هەروەها حەرامە لەسەرتان گۆشتی ئەو حەیوانەی ئەوسا عەرەبی زەمانی جاهیلییەت لەسەر (٣٦٠) بەردەکەی دەوری کەعبە سەریان ئەبڕیو ئەمەیان بۆ خۆنزیكکردنەوە لە بتەکان ئەکرد. هەروەها حەرامە لەسەرتان پێڕەوی ئەزلام بکەن (ئەزلام تیرە)[ث]. ئا لەم ڕۆژەدا (عەصری ڕۆژی جومعەی حجة الوداع) کافرەکان بەتەواوی ناهومێد بوون لێتان و دەسیان لێ شۆردوون! ئیتر لێیان مەترسن، لە من بترسن، بەگوێم بکەن با سزاتان نەدەم. ئەمرۆ ئایینم بۆ تەواو کردن و ئایەتەکانم هەموو بۆ ناردن و، ڕێوشوێنی ئایینی ئیسلامتان بۆ ڕوون بوویەوەو نیعمەتی خۆمم ڕژاند بەسەرتاندا، ئەوەتە دەستان گرت بەسەر مەککەدا کە بنکەو مەڵبەندی هێزی کافرەکان بوو، نیشانەکانی کوفرتان تێدا نەهێشت. منیش لەناو هەموو ئایینەکاندا ئایینی ئیسلامم بۆتان هەڵبژارد. جا ئەگەر لە قاتوقڕیو برسێتیدا ناچاری خواردنی ئەو شتە حەرامانە بوون کە باس کراون و حەزتان لە گوناه نەئەکردو بە ناچاری ئەتانخوارد نەك بە ڕەغبەت و زیادەڕەویتان نەکردو، زیاد لە پێویستتان نەخواردو دەستدرێژیتان نەکردە سەر خەڵك، ئەوا خودا زۆر لە گوناه خۆش ئەبێو زۆر میهرەبانە.

(٤) ئەی پێغەمبەر! لێت ئەپرسن چ خواردەمەنی‌یەك حەڵاڵە بۆیان بیخۆن؟ پێیان بڵێ: هەرچی خواردەمەنی‌یەك کە نەفسی ساغ و عادەتی پێی خۆش بێو بێزی لێ نەکاتەوە حەڵاڵە بۆتان بیخۆن. هەروەها حەڵاڵە بۆتان خواردنی گۆشتی نێچیری ئەو دڕندە ڕاوییانەی کە بەو بەهرەی خودا پێی داون فێری ڕاوتان کردوون، یا بەو جۆرەی خودا تێیگەیاندوون فێریان بکەن چۆن ڕاکەن بەدوای نێچیرەکەداو بیگرن و لێی نەخۆن، یا ئەگەر تێتان خوڕین بە گوێتان بکەن و کە هانتان دان بڕۆن. تاد. لەو نێچیرە بخۆن کە بۆیان گرتوون و لێیان نەخواردووە. لەو کاتەدا کە دڕندە ڕاوییەکە ئەنێرن ناوی خودا بێنن، یا کە نێچیرەکەی هێناو بە چەقۆدا گەیشت ناوی خودای لێ بێنن و سەری ببڕن. لەخودا بترسن و بەگوێی ئامۆژگارییەکانی بکەن. خودا بە گورجی تۆڵە لە تاوانبار ئەکاتەوەو، لەسەر گەورەو بچووك لێتان ئەپرسێتەوە. (٥) بۆتان حەڵاڵە خواردەمەنیی پاك و پوختە، بۆتان حەڵاڵە خواردەمەنی‌یەك کیتابییەکان کردبێتیان. هەروەها گۆشتی حەیوانێ ئەوان سەریان بڕیبێ، واتە: ئەوانەی پێش ئایینی ئیسلام کیتابیان بۆ هاتووە وەك گاورو جوولەکە، خواردەمەنیو گۆشتی سەربڕاوی ئێوەیش بۆ ئەوان حەڵاڵە،واتە: حەڵاڵە بۆتان بیاندەنێ یا پێیان بفرۆشن. هەروەها حەڵاڵە بۆتان ژنە داوێن پاکە موسوڵمانەکان یا ژنە داوێن پاکە کیتابییەکان بخوازن و مارەیان بکەن، بەو شەرتەی مارەییەکانیان بدەنێ، کە بەم نیکاحە پاك و پوختەیە خۆتان لە زینا ئەپارێزن و ئافرەتی بێگانەو حەرام ناکەن بە دۆستی پەنهانیتان کە بە حەرامی لەگەڵیان ڕابوێرن. هەرکەس باوەڕ بە ئایینی ئیسلام نەکا هەرچی ئەکات ڕەنج بەخەسارەو، لە ڕۆژی قیامەتیشدا زیانبارو دۆڕاوە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٦﴾ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿٩﴾



(٦) ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هەیـە بـە خـوداو بـە پێغەمبـەری خـودا، ئەگـەر ویـستتان هەسـتن بـۆ نوێـژکردن واتـە نیازتـان بـوو نوێـژ بکـەن، لەپێشـدا دەموچاوو ڕوخسارتان بشۆرن‌و ، هەردوو دەستان بشۆن لەگەڵ ئەنیشکەکانتان و، دەستی تەڕ بێنن بە سـەرتاندا. هـەردوو پێیشتان بشۆرن لەگـەڵ قولەقاپـەکانتان. جـا ئەگـەر لـەکاتی هەسـتان بـۆ نوێـژدا لەشـتان پـیس بـوو، یانـێ جەنابـەتتان هەبوو ئەوا خۆتان بشۆرن واتـە: هـەموو لەشـتان چ پێسـت و چ مـوو. ئەمـە بـۆ حاڵێکـە کـە ئاوتـان هـەبێ‌و هـیچ مانیعێکتان نەبێ لە بـەکارهێنانی ئـاو. خۆ ئەگەر هـەر ئـاو نـەبوو یـا هـەبوو و نەتانئـەتوانی بـەکاری بێـنن لەبـەر نەخۆشی، یا لـە سـەفەردا بـوون، چ بـێ دەستنوێژ بن و چ لەش پیس، یا دەست نوێـژتان هـەبوو لـەپڕ موحتـاجی قـەزای حاجەت بوون بە میز یا پیسی یا شتی‌تر کـە دەسـت نوێـژ بشـکێنێ، یـا لـە ژنەکانتان کـەوتبوون چ بـە دەس‌لێ‌دان و چ بـە جیمـاع کـردن و، ئاوتـان دەسـنەکەوت دەس‌نوێـژی پـێ بگـرن یـا لـەش‌پیسـیی خۆتـانی پـێ دەرکـەن، لـە هەموو ئەم حاڵانەدا بگەڕێن بە دوای خاکێکی پاکداو دەستانی پیادەن و بیهێـنن بـە دەم و چـاوو ڕوخسـارتان و بـە هەردوو دەستتاندا تا ئانیشکتان. خودا نایەوێ باری گران بخاتە سەرتان و ناچارتان بکـات بـۆ بـەکارهێنانی ئـاو لـە هەموو کاتێکدا، بەڵام ئەیەوێ پاکتان بکاتەوە چ بە دەس‌نوێژو خۆشۆردن و چ بە تەیەمموم و خاك بەکارهێنان. ئەیەوێ نیعمەتی خۆی بەسەرتاندا تەواو بکات، بەشکو شوکرانەبژێریی خودا بکەن و لە فەرمانی دەرچن.

(٧) یادی ئەو نیعمەتە گەورە بکەن کە خودا پێی بەخشین، واتـە: ئـایینی ئیسـلامی بێ‌گـەرد، تـا سوپاسـی بکـەن و شوکرانەبژێر بن. ئەو پەیمانەتان لە بیر نەچێ کـە خـودا لـەکاتی ئیسـلامبوونتاندا بەسـتی لەگـەڵتان، کـە وتتـان بـە پێغەمبەر: بەگوێت ئەکەین و لە فەرمانت دەرناچین. لە خودا بترسن و خۆتان لە گوناه دوور بخەنەوە، خودا ئاگای لەو نیازەیە کە لە دڵتاندایە، چ جایێ ئەو کارانەی کە بە ئاشکرا ئەیانکەن.

(٨) ئەی ئەوانەی بەڕاستی باوەڕتان بە خوداو بە پێغەمبەر هەیـە هـەموو کـات بـە عادڵانـەو دادپەروەرانـە شـایەتی بدەن‌و ڕاستگۆ بن لەپێناوی ڕەزای خودادا. یا ڕق و قینتـان لـە کافرەکـان واتـان لێ نـەکات بـە ناڕاسـتی‌و ناعادڵانـە بجووڵێنەوە لەگەڵیان و دەسدرێژییان لێ بکەن: دادپەروەرو حەق گۆو حەق کردار بن. دادو ڕاستی نزیکترتـان ئەکاتـەوە لە گوناه نەکردن و لەخوداترسان. لە خـودا بترسـن، خۆتـان لـە گونـاه دوور بخەنـەوە کـە خـودا ئاگـادارە لـە هـەموو کردەوەتان و هیچی لێ ون نابێ.

(٩) خودا بەڵێنی داوە بەوانەی ئیمانیان هەیەو کردەوەی باشیان کردوە لە گوناهیان خۆش ئەبێ‌و پاداشێکی گەورەیان ئەداتەوە.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ ٱثْنَىْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مَعَكُمْ ۖ لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِى وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ۙ وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱصْفَحْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣﴾



(١٠) ئەو کەسانەیش کە بێ‌ئیمانن و ئایەتەکانی ئێمە دەخەنەوە بەدرۆوەو پشتی تێ ئەکەن ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن‌و لەوێ ئەحەسێنەوە.

(١١) ئەی موسوڵمانینە! هەموو کات یادی نیعمەتە زۆرەکانی خودای گەورە بکەنەوەو لەبیرتان نەچن و شوکرانەبژێر بن، ئەوەبوو کۆمەڵێ لە کافرەکان ویستیان دەستتان بۆ درێژکەن، ئازارتان بدەن یا خۆ بتانکوژن، بەڵام هێزو توانایی خودا دای بە بەردەستیانداو ڕێگای لێ‌گرتن. هەر خودا شایەنی لێ‌ترسانە. خاوەن ئیمانەکان ئەبێ هەر بەو پشت ببەستن.

(١٢) بەڕاستی خودا پەیمانی لە بەنی ئیسرائیلییەکان وەرگرت کە لەگەڵ مووسادا بڕۆن بۆ جەنگ دژی ئەو زۆردارانەی لە خاکی شام بوون. بۆ ئەم مەبەستە دوازدە (مفتش)ی وشیارمان هەڵبژارد تا بڕۆن ئەحواڵی ئەو زۆردارانەو دەنگوباسیان بزانن. خودا فەرمووی بە بەنی‌ئیسرائیلییەکان : من لەگەل ئێوەدام و یارمەتیتان ئەدەم ئەگەر ئێوە نوێژبکەن و، زەکاتی ماڵتان دەرکەن و، ئیمان بە پێغەمبەرانم بێنن و پشتیان بگرن و بەهێزیان بکەن و، قەرزە باش بدەن بە خودا، واتە یارمەتیی جیهاد بدەن و دەستگرۆیی هەژاران و داماوان بکەن، ئەوا لە گوناهەکانتان ئەبوورم و ئەتانخەمە چەند بەهەشت و باغ و لالەزارێکەوە کە جۆگای ئاوی ڕوون و گەوارا بە ناویاندا دەچێت. ئیتر هەرکەس لە ئێوە پاش ئەم پەیمانە پەشیمان ببێتەوەو کافر ببێتەوە ئەوە بەبێ عوزرو بەهانە ڕێگای ڕاستی ون کردووەو سزای زۆر خراپ ئەبێ.

(١٣) جا لەبەر ئەوەی پەیمانەکەیان نەبردەسەرو تێکیان دا دوورمان خستنەوە لە ڕەحمەتی خۆمان و دڵمان ڕەق و ڕەش کردن و، دەستیان دایە گۆڕینی تەورات و مەعنایان بە ئارەزووی خۆیان لێکئەدایەوەو ئەوەی پێیان وترابوو لە بیریان چووەوە. ئیتر خیانەت و ناڕاستییان لێ نابڕێ‌و هەموو جار خائینیان تیا دەبینی، کەمێکیان نەبێ کە ئیمانیان هێناوەو ڕێگای ڕاستیان گرتووەتە بەر.
لێیان ببوورەو چاوپۆشییان لێ بکە ئەگەر تەوبەیان کرد یا بە ڕێکوپێکی جیزیەیان دا، یاخۆ وازیان لێ‌بێنەو گوێیان مەدەرێ. خودا چاکەکەرانی خۆش ئەوێ.

وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ
فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ
وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ
بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴿١٤﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ
قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا
كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن
كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ
مُّبِينٞ ﴿١٥﴾ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ
سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى
ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ
﴿١٦﴾ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ
ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ
أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي
ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗاۗ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾



(١٤) پەیمانمان لەوانەیش سەند کە وتیان: ئێمە نەصرانین و پەیڕەوی عیساین، بڕیارمان دا خودا بە یەك بزانن و پەیڕەوی عیسا بن و ئیمانی پێ بێنن و ئەو پێغەمبەرەیش دوای ئەو دێت کە موحەممەدە (د.خ) ئیمانی پێ بێنن. ئەوانیش پەیمانیان هەڵوەشاندەوەو بەشێ لەوەی فێرکرابوون و پێیان وترابوو لەبیریان چوو، خودایان کرد بە سێ. عیسایان لە پلەی پێغەمبەرییەوە گەیاندە پایەی بەرزی خوداییو ئیمانیان بە پێغەمبەری ئیسلامیش نەهێنا. ئێمەیش دوژمنایەتیو ڕق و کینەمان خستە ناو خۆیانەوە، یا ناوبەینی ئەوان و جوولەکەوە تا ڕۆژی قیامەت. لەوێیش ڕووبەڕوو ئەبنەوە لەگەڵ خوداداو پێیان ئەڵێ چییان کردووە لە دنیادا!

(١٥) ئەی کیتابییەکان بەڕاستیو بێگومان پێغەمبەری ئێمە هات بۆ لاتانو گەلێ شتی واتان بۆ ڕۆشن ئەکاتەوە لەوانەی لە تەورات و ئینجیلدا هەن و ئێوە لە خەڵکتان شاردوونەتەوەو بۆتان باس نەکردوون! هەروەها چاوپۆشی لە زۆر شت ئەکات لەوانەی شاردووتانەتەوە. بەڕاستی لای خوداوە قورئان و نوورتان بۆ هاتووە کە ڕێگای ڕاستتان بۆ ڕوون ئەکاتەوەو لە گومڕاهی ڕزگارتان ئەکات.

(١٦) ئەو کەسانەی دوای ڕەزامەندیی خودا بکەون و مەبەستیان بێ لێیان ڕازی بێ، خودا بە ئیزنی خۆی بەهۆی ئەو قورئانەوە لە تاریکی کوفر دەریان ئەهێنێو ئەیانخاتە ڕووناکی ئیسلام و، شارەزای ڕێگای ڕاستیان ئەکات کە بەرەو بەختیاریی دنیاو قیامەتیان ئەبات.

(١٧) ئەوانەی کافرن کە ئەڵێن: عیسای مەسیحی کوڕی مریەم خودایە! تۆ پێیان بڵێ: کێ هەیە بتوانێ ڕێ لە خودا بگرێو دەست بێنێتە بەر دەستی ئەگەر بیەوێ عیسای مەسیحی کوڕی مریەم و دایکیو هەرچی خەڵکی سەرزەویشە بیانکوژێو لەناویان بەرێ؟ هەرچی مولکی ئاسمانەکان و زەویو ناوبەینیان هەیە هەموو هی خودایە. خودا هەرچی بوێ دروستی ئەکات. خودا بەسەر هەموو شتێکدا تواناو دەسەڵاتدارە.

وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ
فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن
يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ
رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُوا۟ مَا جَآءَنَا
مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ۖ فَقَدْ جَآءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٩﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟
نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا
وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟
ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ
فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ
وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا
فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ
أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ
فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾



(١٨) جوولەکەو گاور ئەڵێن: ئێمە کوڕی خوداین و خۆشەویستینی. پێیان بڵێ: ئەگەر وایە بۆ بەرامبەر بە گوناهتان سزاتان ئەدات؟ نەخێر وا نی‌یە کە ئێوە ئەڵێن، بەڵکو ئێوەیش بنیادەمن و لەوانەن کە خودا دروستی کردوون. ئەوەی مەیلی بێ لە گوناهی خۆش ئەبێ، واتە: ئەوانەی ئیمانیان هێنابێ بە خوداو پێغەمبەرانی. ئەوەیش مەیلی لێ بێ سزای ئەدا، واتە ئەوانەی کە ئیمانیان نی‌یەو کافرن. هەرچی مولکی ئاسمانەکانو زەوییە هەموو هی خودایەو، چارەنووسو ئەنجامی هەموو هەر لای خودایەو ئەو پاداشی چاکەکەر ئەداتەوەو سزای تاوانبار ئەدات.

(١٩) ئەی کیتابییەکان! بە ڕاستی پێغەمبەری ئێمە هات بۆتان ئایین و خوداناسیتان بۆ ڕوون بکاتەوە. لە وەختێکدا ئەم پێغەمبەرەتان بۆ نێررا ماوەیێك بوو خودا پێغەمبەری نەناردبووە سەرتان. بۆیە ئەم پێغەمبەرەمان بۆ ناردن نەبادا دوایی لە ڕۆژی حیسابدا بڵێن: کەسێك نەهاتە لامان لە دنیادا باسی چاکەو خراپەمان بۆ بکات و موژدەدەرو ترسێنەر بێ! ئەوا پێغەمبەرێکتان بۆ هات موژدەی بەهەشت و پاداشی چاك ئەدات بە موسوڵمانان و کردەوە چاکان. هەروەها کافران و بەدکاران لە دۆزەخ و سزای توند ئەترسێنێ. خودا توانایە بەسەر هەموو شتدا، ئەتوانێ زووزوو پێغەمبەر بنێرێو ئەیشتوانێ بەیناوبەین بینێرێ، خۆی ئەزانێ کەی ئەینێرێ.

(٢٠) یادی ئەوە بکەنەوە کە مووسا قەومەکەی خۆی ئامۆژگاری ئەکردو پێی ئەوتن: بیر لەو هەموو نیعمەتانە بکەنەوە کە خودا پێی بەخشیون، کە چەندین پێغەمبەر لەناو ئێوەدا هەلکەوت و چەندین پادشاو دەستەڵاتدارتان تێدا پەیدا بوو و، شتی‌وای پێ‌دان بە کەسی نەداوە، دەریای بۆ دوولەت کردن تا بپەڕنەوەو فیرعەونی بۆ لەناوبردن و هەوری بۆ کردن بە سێبەرو، گەزۆو هەنگوینی بۆ باراندن.

(٢١) مووسا پێی وتن: ئەی قەومەکەم بڕۆنە ئەو زەوییە کە خودا بۆی دیاری‌کردوون. ئەگەر خاوەن ئیمانن هەڵمەگەڕێنەوە بەرودواو مەترسن، تا سەرگەردان و ماڵوێران و ڕەنج‌بەخەسارنەبن.

(٢٢) وتیان: ئەی مووسا لەو شوێنەدا قەومێکی بەهێزو ستەمکار هەن، ئێمە ناچینە ناوی تا ئەوان لێی دەرنەچن. ئەگەر دەرچوون ئەنجا ئێمە ئەڕۆینە ناوی.

(٢٣) لەوێدا دوو کەس لەوانەی لەخودا ئەترسان و خودا نیعمەتی ئیمان و ڕاستگۆیی‌و دامەزراوی پێ دابوون، بە خەلکەکەیان وت: بڕۆنە سەریان و پێش ئەوەی لە خەو خەبەریان بێتەوە دەرگایان لێ بگرن و هێرش بەرنە سەریان. ئەگەر واتان کرد بێ‌گومان سەرئەکەون و زاڵ ئەبن. گەر باوەڕتان بە خودا هەیە پشت هەر بەو ببەستن، هەر ئەو یارمەتیدەرە.

قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِى وَأَخِى ۖ فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ۛ أَرْبَعِينَ سَنَةً ۛ يَتِيهُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ۞ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱبْنَىْ ءَادَمَ بِٱلْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْـَٔاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ ۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَىَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِى مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِىَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلنَّارِ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ ۚ قَالَ يَـٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَـٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى ۖ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّـٰدِمِينَ ﴿٣١﴾



(٢٤) لەگەڵ ئەمەیش هەر بە گوێیان نەکردو نەڕۆیشتن، وتیان: ئەی مووسا! ئێمە هەرگیز ناڕۆینە ئەوێ تا ئەوانی تێدا بن. جا ئەگەر تۆ حەزت لە ڕۆیشتنە ئەوا تۆو خوداکەت بڕۆن بجەنگن و، ئێمەیش ئا لێرە دانیشتووین. ئەمەیش گاڵتەکردن بوو بە خوداو بە مووسای پێغەمبەری.

(٢٥) مووسا ڕووی کردە خودای خۆیو پاڕایەوەو وتی: خودایا! من تەنها دەستم بەسەر خۆم و هاروونی برامدا ئەڕوات. جیامان بکەرەوە لەم کۆمەڵە فاسقە لەڕێلادراوەو، هەر لایەکمان بە پێی کردارمان حوکم بفەرموو بەسەرمانداو بە تاوانی ئەوان غەزەب لە ئێمە مەگرە.

(٢٦) جا خودا فەرمووی بە مووسا: بێگومان لە سزای ئەم بێگوێیی‌یەدا ئەرزی موقەددەسیان لێ حەرام کرا بۆ ماوەی چل ساڵو لەم ماوەدا ئەسووڕێنەوە بە زەویدا بەجۆرێ کە نازانن لە کوێوە هاتوون و بۆ کوێ ئەچن. تۆیش خەفەت مەخۆ کەوا ئەو تۆڵەیە لەو کۆمەڵە فاسقە کرایەوە. با بیخۆن، ئەوە دەردیان بێ.

(٢٧) ئەی پێغەمبەر بەسەرهاتی دوو کوڕەکەی ئادەمیان بۆ بگێڕەرەوە، واتە: قابیل و هابیل، کە ئادەم ئەمری پێ‌کردن هەریەکێکیان خوشکی لف(توأم)ی ئەوی تریان مارە بکات. قابیل پێی ناخۆش بوو چونکە خوشکە لفەکەی خۆی جوانتر بوو و حەزی نەئەکرد بۆ هابیل بێو خۆی حەزی لێ ئەکرد. ئادەم فەرمووی: هەر یەکێکتان قوربانی‌یەك بکەن، لە هەرکامتان قبووڵ کرا، خوشکەکە بۆ ئەوەتان بێت. قوربانییان کرد، قوربانی‌یەکەی هابیل قبووڵ بوو. ئاگرێ لە ئاسمانەوە هات و قووتی‌دا. بەڵام هی قابیل قبووڵ نەکراو ئەوەندەی‌تر ڕقی هەستاو هەڕەشەی لە هابیلی برای کردو وتی: بە خودا ئەتکوژم. هابیل پێی وت: خودا قوربانی لە یەکێ قبووڵ ئەکات کە لە خودا بترسێو خۆی لە گوناە دوور بخاتەوە. (٢٨) بەخودا قەسەم ئەگەر تۆ دەستت ڕابدەی بۆ ئەوەی بمکوژی من هەرگیز دەستم ڕانادەم بۆ ئەوەی بتکوژم. من لەو خودایە ئەترسم کە پەروەردگاری هەموو عالەمە.

(٢٩) من ئەمەوێ گوناهی من و تۆیش بکەوێتە ئەستۆی تۆو بچێتە ئاگری دۆزەخەوە. ئەوەیە سزای ستەمکاران و دەستدرێژیکەران.

(٣٠) نەفسی ڕێگای کوشتنی هابیلی برای لەبەرچاو ئاسان و جوان کردو کوشتیو بەهۆی ئەو تاوانە گەورەوە کە کردی زیانبار بوو و دین و دنیای دۆڕاند.. هەر لە دنیای ڕۆشندا لە تەمەنی بیست ساڵییەوە ئاوارە بوو و لە بەرچاوی خەڵك نەفرین‌لێکراو بوو و لە ڕۆژی دواییشدا بە سزای خۆی ئەگات.

(٣١) پاش ئەوەی کە براکەی کوشت نەیزانی چۆن لاشەکەی بشارێتەوە. ڕیوایەت کراوە کە قابیل هابیلی برای کوشت بە دەستییەوە داماو نەیزانی چۆنی بشارێتەوە. خودای گەورە دوو قەلەڕەشی نارد لە بەرچاویا شەڕیان کردو یەکێکیان ئەوی‌تریانی کوشت و بە دەنووك چاڵێکی بۆ هەڵکەندو شاردیەوە! کە قابیل ئەمەی دی وتی: ئای نەگبەت خۆم. بە قەدەر ئەم قەلە ڕەشەم لێ نایێ کە لاشەی براکەم بشارمەوە!؟ لەو کاتەدا دای بە ئەژنۆی خۆیداو پەشیمان بوویەوەو زانی چ تاوانێکی کردووە؟

مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُا۟ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓا۟ أَوْ يُصَلَّبُوٓا۟ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓا۟ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُوا۟ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُوا۟ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾



(٣٢) جا لەبەر نارەوایی‌و ناشیرینی ئەو تاوانە کە بوو بە هۆی ئەوەی خەڵك چاو لە قابیل بکەن لە کوشتنی ناحەزیانـدا، بڕیارمان داو واجبمان کرد لەسەر بـەنی ئیســـرائیلییەکان هەرکـــەس نەفســـێ بکوژێ بێ‌ئەوەی قیصاصی لەسەر بێ یا خراپەی لە سەرزەوی کردبێ یا شەریکی بۆخودا قەرار دابێ یا ڕێگری کردبێ لـە خـەڵك و خـەریکی ڕاوورووت بووبـێ، ئـەوە بکوژەکـە وەك ئەوەیـە هەرچـی بنیادەمـــە هــــەمووی کوشــــتبێ. هەرکەسـیش یـەکێ ڕزگـار بکـات لـە مردن، بە هەوڵبۆدان یا یارمەتی یا هەر هۆیێکی ڕەوای تر، ئەوە وەك ئەوە وایـە هەمووی ڕزگار کردبێ. پاش ئەوەی ئەم حوکمە توندەمان ڕاگەیانـد پێغەمبـەران لەلایەن ئێمەوە چوونە سەریان و ئایـەت و موعجیزەیـان پیشـان دان و حـوکمی خودایـان بـۆ دووپـات کردنـەوە، لەگـەڵ ئەوەیشدا زۆرێ لەوان زیادەڕەوییان کـرد لەسـەر زەوی‌و دەسـتیان لـە پیـاوکوژی هەڵنەگرت.

(٣٣) پاداشی ئەوانە کە شەڕ لەگەڵ خوداو پێغەمبەر ئەکەن بە سەرکەشـی لـە دیـن و تێنەکۆشـن بـۆ بڵاوکردنـەوەی خراپە لە ڕووی زەویدا، هیچ نی‌یە ئەوە نەبێ کـە بکـوژرێن و بکـرێن بـە دارا یـا دەسـت و پێیـان بـە ڕاسـت و چـەپ ببڕێتەوە، واتە دەستی ڕاست و پێی چەپیان ببڕێت، یا شاربەدەر بکـرێن و لـە وڵاتـی خۆیـان دوور بخرێنـەوە. ئەمـە ئابڕووچوونی دنیای ڕۆشنیانەو لە ڕۆژی دواییشدا سزایێکی زۆر گەورە ئەدرێن.

(٣٤) ئەوانە نەبن کە پێش ئەوەی ئێوە زاڵ بن بەسەریانداو دەردەستیان بکەن، لەو تاوانانە پەشیمان بوونەتەوە. بزانن خودای دەستەڵاتدار گوناهپۆش و میهرەبانە.

(٣٥) ئەی موسوڵمانینە! لە خودا بترسن، ڕێگای خوداپەرستی‌و چاکەکردن بگـرن تـا بگەنـە ڕەزامەنـدی خـوداو، لـە پێناوی بەرزکردنەوەو سەرخستنی ئایینی خودادا تێبکۆشن و هەوڵبدەن، بەڵکو سەرکەون و بەختیاری دنیاو قیامـەت بن.

(٣٦) ئەوانەی کافرن ئەگەر هەرچی لە زەویدا هەیە هی ئـەوان بـێ‌و ئەوەنـدەی تریشـیان هـەبێ‌و بیانـەوێ بیـدەن لـە فیدیەی خۆیاندا، بۆ ئەوەی لە سزای ڕۆژی قیامەت ڕزگار بن، لێیان قبووڵ ناکرێ‌و سزای سەخت و بەئازار ئەدرێن.

يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا ۖ
وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٧﴾ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟
أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ
﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ
عَلَيْهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ ۗ
وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٠﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ
لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ
قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ
هَادُوا۟ ۛ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ
ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ
يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُوا۟ ۚ
وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ فِى
ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾



(٣٧) ئەو کافرە ماڵوێرانانە ئەیانەوێ لە ئاگر دەرباز بن و لە سزای بێئامانی ڕزگار بن، بەڵام هەرگیز لێی دەرباز نابنو سزایێکی هەمیشەییان هەیە.

(٣٨) ئەو پیاوەی دزی ئەکات و ئەو ژنەی دزی ئەکات، بە مەرجێ بالغ و عاقڵ بن و، شوبهەیان نەبێ لە حەرامیی ماڵەکە بۆیان، نەك وەك ماڵی شەریکی یا ماڵێ کە وەقفی عامە بێ کە گومانی حەڵاڵی تێدایە بۆیان، هەروەها بەو مەرجەی دزراوەکە نرخی چواریەکی دینارێکی ئاڵتوون بێو، لەشوێنی خۆیدا دانرابێو پارێزراو بێ، ئەوە دەستیان ببڕن لە مووچا تا ببێتە تۆڵەی ئەو گوناهە نالەبارە کە کردوویانە، کە ئەمەیش عوقووبەتێکە لە لایەن خوداوە. خودا توانای بەدەستەڵاتەو کارەکانی پڕ حیکمەتن.

(٣٩) جا هەر کەس پاش ئەو ستەمەی کردوویەتی پەشیمان بوویەوەو گەڕایەوە بۆ لای خوداو بەگوێکردنیو، دەستی کرد بە چاکەکردن و عەزمی جەزم کرد نەگەڕێتەوە بۆ سەر گوناهەکە، ئەوە بێگومان خودای میهرەبان تەوبەی لێ وەرئەگرێو لە گوناهی خۆش ئەبێ. خودا زۆر گوناهپۆش و میهرەبانە.

(٤٠) ئایا نەتزانیوە هەرچی مولکی زەویو ئاسمانەکانە هەمووی هی خودایەو ئەو ئارەزووی خۆیەتی بیەوێ سزای هەرکەس بدات ئەیدات و، بۆ هەرکەسیش بیەوێ گوناهی ئەبەخشێ؟ خودا بەسەر هەموو شتێکدا دەستی ئەڕوات و توانایە.

(٤١) ئەی پێغەمبەر! دڵت نارەحەت نەبێو غەمگین مەبە لە ڕەوشتی بەدی ئەوانەی گورج کافرێتی خۆیان دەرئەخەنو بەدەم کوفرەوە ڕائەکەن، لەو دووڕووە درۆزنانە کە بە دەم ئەڵێن ئیمانمان هەیە، کەچی لە دڵەوە بێ ئیمانن. خەم مەخۆو غەمگین مەبە لە ڕەوشتی بەدی ئەو جوولەکانە کە زۆر چاك ئامادەن بۆ بیستنی قسەی درۆی خوێندەوارە بەدڕەوشتەکانیان و گوێ لە تۆ ناگرن و قسەت نابیسن، بەڵام ئامادەن گوێ لە قسەی خەڵکی تر بگرن لە ناموسوڵمانەکان! نەهاتوونەتە مەجلیسی تۆ، تا دەنگوباسی خوداپەرستیو ئایینی ئیسلامت لێ ببیسن، قسەی خودا ئەگۆڕن و هەرچی موافیقی قسەی تۆ بێو بە باری تۆدا بێ ئەیشارنەوە، بە کۆمەڵەکەی خۆیان ئەڵێن: ئەگەر موحەممەد وەك قسەی ئێمەی پێ وتن قبووڵی بکەن و، ئەگەر وەك ئەو نەبوو وەریمەگرن و خۆتانی لێ بپارێزن! بێگومان ئەوەی خودا بیەوێ گومڕاهی بکات تۆ ناتوانی هیچی بۆ بکەیت. ئەو کافرو دووڕووانە خودا نایەوێ دڵیان پاك بکاتەوەو بە نووری ئیمان دەروونیان ڕووناك بکاتەوە. لە دنیادا بەشیان سەرشۆڕییەو لە ڕۆژی دواییشدا سزایێکی گەورەو توند ئەدرێن.

سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ ۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔا ۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٣﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾



(٤٢) ئەوانە زۆر درۆبیسن دەربارەی تۆو یارانی تۆ. هەرچی قسەیێکی خراپ بکرێ لەسەر پێن بۆ بیستن و هەڵگرتنی. هەروەها ئەوانە حەرام خۆرن، ڕیبا ئەخۆن، بەرتیل وەرئەگرن، بۆ ماڵو سامانی دنیا تەورات ئەگۆڕن. جا ئەگەر ئەمانە هاتنە لات بۆ موحاکەمە ئەوە تۆ ئارەزووی خۆتە، مەیلت هەبوو موحاکەمەیان بکەو، مەیلت نەبوو گوێیان مەدەرێو ڕوویان لێ وەرچەرخێنە، ئەگەر گوێت نەدانێ ئەوان ناتوانن هیچ جۆرە زیانێکت پێبگەیێنن، خودا ئەتپارێزێ. خۆ ئەگەر هات و موحاکەمەت کردن ئەوا بە دادپەروەرانەو بە ڕاستی موحاکەمەیان بکە. بەڕاستی خودا دادپەروەرانی خۆش ئەوێ.

(٤٣) ئەوانە چۆن تۆ ئەکەنە حەکەم لە کاتێکا کە تەوراتیان لایە کە کتێبی خۆیانەو حوکمی خودای تێدایە کە موافیقی حوکمەکەی تۆیە، کەچی باوەڕی پێناکەن و پشتی تێ ئەکەن!؟ ئەوانە کە دێنە لات بۆ تەحکیم و حوکمی خودایيت پیشان دان، کە هەڵسان لات پشتی تێ ئەکەن و گوێی نادەنێ! باوەڕیان نیيە نە بە کتێبەکەی خۆیان و نە بە تۆو کتێبی تۆیش!

(٤٤) ئێمە تەوراتمان ناردەخوار کە ڕێپیشاندەرەو نووری تێدایە. پێغەمبەرە موسوڵمانەکانی پێش ئایینی ئیسلام بەو تەوراتە حوکمیان ئەکرد لەناو جوولەکەکاندا، هەروەها زانا لەخوداترسەکان و دنیا تەرککردووەکانیان بەو حوکمیان ئەکرد، چونکە خودا فەرمانی پێ دابوون کە ئەبێ بیپارێزن و نەهێڵن لەناوبچێو بگۆڕرێ. ئەوانیش ئاگاداری بوون و بەگوێرەی فەرمانەکەی خودا پاراستیان و، مەعنا پەنهانەکانیان بۆ خەڵك ڕوون ئەکردەوە. ئێوە لەکاتێکدا کە موحاکەمە ئەکەن لە بەینی خەڵقدا بە قسەی کەس حوکم مەکەن و لە کەس مەترسن، بەپێی فەرمانی من حوکم بکەن و لە من بترسن. ئایەتەکانم مەگۆڕن و، بەرامبەر تەماعی هیچوپووچی دنیایی مەیاندۆڕێنن. ئەوانەیش حوکم بە ئایەتی خودا نەکەن کافرن.

(٤٥) لەو تەوراتەدا قیصاص و تۆڵەسەندنەوەمان فەرزکرد لەسەریان بەم جۆرە: نەفسێك بەرامبەر نەفسێك، چاوێك بەرامبەر چاوێك، لووت بەرامبەر لووت، گوێ بەرامبەر گوێ، ددان بەرامبەر ددان. هەروەها برینەکانیش قیصاصیان هەیە، واتە: برین بەرامبەر برین، ئەگەر ئەندازەی برینەکە زانراو بێ. خۆ ئەگەر خاوەن حەق وازی لە حەقی خۆی هێناو کابرای بەخشی ئەو بەخشینە دەبێتە کەففارەتی گوناهیو باری سووك ئەکات. پاش ئەم ڕوونکردنەوانە ئەوانەی بەپێی ئەو ڕێوشوێنەی خودا ناردوویەتی حوکم نەکەن ئەوە بەڕاستی ستەمکارن.

وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾



(٤٦) بەشوێن ئەو پێغەمبەرانەدا عیسای کوڕی مەریەممان نارد کە باوەڕی بەو کتێبانە هەبوو لە پێش ئەو هاتبوون وەك تەورات و زەبوور. ئینجیلمان بۆ نارد کە پڕی بوو لە نوورو ڕووناکی ڕێپیشاندان، ئەو ئینجیلە باوەڕی بەو کتێبانە هەبوو کە پێش ئەو نێررابوون بۆ پێغەمبەران و بەڕاستی ئەزانین و لایەنگریی لێ ئەکردن و، ئامۆژگاریو ڕێپیشاندەریی زۆری تێدابوو بۆ ئەوانەی بە دڵ ڕێگای ڕاست ئەگرن و لە خودا ئەترسن.

(٤٧) هەر لەو کاتەدا ئەمرمان کرد کە پێویستە ئەوانە پەیڕەویی ئەوە بکەن کە لەو ئینجیلەدایە خودا ناردوویەتی بۆیان و، هەرکەس بەوە حوکم نەکا کە خودا ناردوویە ئەوانە فاسقن و لە ڕێگای ڕاست دەرچوون.

(٤٨) ئێمە بەڕاستی قورئانمان نازڵ کرد بۆت کە باوەڕی بە کتێبە خوداییە پێشووەکان هەیەو لە ئوصوول و بناخەی ئاییندا پشتگیرییان لێ ئەکات و ئەیانپارێزێ لە گۆڕان و ئاگای لێیانە. تۆ ئەی پێغەمبەر بە پێی فەرمانی ئەو قورئانەی خودا ناردوویەتی بۆت لە ناو خەڵکدا حوکم بکەو، مەکەوەرە دوای ئارەزووی کافران و منافقان کە لە ڕێی حەق و قورئان لات بدەن کە بۆت هاتووە. ئێمە بۆ هەر کۆمەڵێکتان شەریعەت و ڕێبازێکمان داناوە لەسەری بڕۆن و لێی لانەدەن. خودا ئەگەر مەیلی لێ بوایە ئەیکردنە یەك ئوممەت و لەسەریەك شەریعەت دایئەنان، ئێوەو ئوممەتانی پێشوو، بەڵام ئەیەوێ تاقیتان بکاتەوەو تەجرەبەتان بکات ئاخۆ ئیمان بە شەریعەتە جیاجیاکان ئەهێنن و باوەڕتان بەوە ئەبێ کە خوا بە حیکمەتی خۆی ئەو شەریعەتە جیاجیایانەی داناوە؟ کاری خێرو چاکە بکەن بۆ دواییتان. ئێوە بۆ لای خودا ئەگەڕێنەوەو لە دادگای ئەودا موحاکەمە ئەکرێن و ئەو وەختە ئەو شتانەتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە ئیختیلافتان تیایاندا هەبووەو بۆتان ڕوون ئەکاتەوە کێ لەسەر حەق بووەو کێ لە حەق لایداوە.

(٤٩) هەروەها ئەمرمان کرد بە تۆ کە لە بەینی خەڵکدا بەو قورئانە حوکم بکەی کە خودا بۆی ناردوویەو دوای ئارەزووی نەفسی ئەوان نەکەوی. خۆتیان لێ بپارێزە نەبادا لە هەندێ حوکمی خودا لات بدەن و سەرت لێ بشێوێنن. تەنها بە گوێرەی فەرمانی خودا حوکم بکە. جا ئەگەر ئەوان سەرپێچییان کرد لە حوکمی خوداو ملکەچ نەبوون بۆی ئەوە زۆر چاك بزانە کە خودا ئەیەوێ بەهۆی هەندێ گوناهیانەوە، کە سەرپێچییە لە حوکمی خودا، تووشیان بکات. زۆر کەسی وا هەن سەرکەشن و لە حەق لائەدەن و ڕێگای کوفر ئەگرنەبەر.

(٥٠) ئایا ئەوانە داوای حوکمی چەرخی کوفرو پێش هاتنی ئایینی ئیسلام ئەکەن، کە ئەیانەوێ بە ئارەزووی نەفسی ئەوانە حوکم بکەیت و لەگەڵیان ڕێك بکەوی لەسەر حیسابی ڕاستی؟ نەخێر، ئەوانە بە هەڵە چوون، لای کەسێ کە باوەڕی بە خودا هەبێو ژیرو تێگەیشتوو و ورد بێ کێ هەیە حوکمی لە حوکمی خودا جوانتر بێ؟ حوکم هەر حوکمی خودایەو، ئەوانەی کە بە پێی حوکمی خودا ڕازی نین گومڕاهن.

۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٥١) فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ (٥٢) وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ (٥٣) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (٥٤) إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ (٥٥) وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ (٥٦) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٥٧)



(٥١) ئەی ئەوانەی ئیمانتان بە خوداو بە پێغەمبەری خودا هەیە جوولەکەو گاور مەکەنە دۆست و برادەری خۆتان و، وەك دۆست و خۆشەویست تێکەڵییان مەکەن. ئەوان هەموویان یەك قسەن لە دوژمنایەتیی ئێوەداو لەناو خۆیاندا دۆست و برادەری یەکترن. هەر یەکێ لە ئێوە ئەوانە بگرێ بە دۆست ئەوە ئەویش لەوانە. بێگومان خودا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

(٥٢) ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندایەو دووڕوون ئەیانبینی پەلەپەلیانە بۆ لای گاورو جوولەکەکان و تێکەڵییان لەگەڵ دەکەن و دۆستایەتیو پێوەندییان لەگەڵ ڕائەگرن. بۆ پاساودانی کارەکەیشیان ئەڵێن: ئەترسین موسوڵمانەکان تووشی نوشوستی بێن و جارێکیتر کار بکەوێتەوە دەستی ئەوان، با ئەم پێوەندییەمان هەر بێ! بەڵکو ئەمە خودایە خودا سەرکەوتن بدات بە موسوڵمانەکان و جێگەیان پتەو بێو زیاتر خۆیان بگرن، یا خودا کارێکی وەها بکات جوولەکەکان بەتەواوی دوایان بڕێو دەرکرێن و لەناودا نەمێنن، ئەو کاتە ئەو دووڕووە ناڕاستانە پەشیمان بنەوە لەو نەخۆشییەی لە دڵیاندا شاردبوویانەوەو، ڕووزەردییان بۆ بمێنێتەوە.

(٥٣) جا لەو ڕۆژی سەرکەوتنەدا کە خودا بۆ موسوڵمانانی ئەسازێنێ، خاوەن ئیمانەکان بە جوولەکەکان ئەڵێن: ئا ئەم دووڕووە درۆزنانە بوون سوێنی زۆر گرانیان بە خودا بۆ ئەخواردن و پێیان ئەوتن: لەگەڵتانین و لەکاتی پێویستدا یارمەتیتان ئەدەین!؟ دەی کوان بۆ دیار نین ئا لەم کاتەدا کە ئێوە پێویستتان بەیارمەتی هەیە!؟ ئای چۆن کاریان پووچ بوویەوەو شکایە دەستیان؟ ئای چەند زیانبارو ڕەنج بەخەسارن!

(٥٤) ئەی موسوڵمانینە! هەرکام لە ئێوە لە دینی خۆی هەڵگەڕێتەوە ئەوە خودا بێباکە لێیو موحتاجی نییەو، لەمەوپاش خودا کۆمەڵێ دێنێتە ڕووی کار کە خۆشیئەوێن و ئەوانیش خودایان خۆش ئەوێ. میهرەبان و دڵنەرمن لەگەڵ موسوڵمانان و، توندو بەدەستەڵاتن لەسەر کافران، لەپێناوی ڕەزامەندیی خوداداو بۆ بەرزکردنەوەی ئایینی ئیسلام جیهاد ئەکەن. بیروباوەڕیان پتەوەو لەپێناوی خودادا لە لۆمەو سەرزەنشتی ئەم و ئەو ناترسن. ئەمە بەهرەو پایەیێکی گەورەیە لە خوداوە ئەیبەخشێ بە هەرکەس مەیلی لێ بێ. خودا فەزڵو بەخششی زۆرەو ئەزانێ کێ شایانی ئەو فەزڵو بەخششەیە.

(٥٥) دۆستی ئێوە خوداو پێغەمبەری خوداو ئەوانەن کە خاوەن ئیمانن و بەردەوامن لەسەر نوێژو زەکاتیماڵیان دەرئەکەن و، لەکاتی نوێژکردن و زەکاتداندا لە خودا ئەترسن و بە هیوای ڕەزامەندیی خودان.

(٥٦) هەرکەس خودای گەورەو پێغەمبەری خوداو موسوڵمانان بکاتە دۆستی خۆیو خۆشی بوێن، ئەوانە بەختەوەر ئەبن، چونکە گرۆهی خوداپەرست و لەخوداترس سەرکەوتوون و پاشەڕۆژ هی ئەوانە.

(٥٧) ئەی موسوڵمانینە! ئەو کیتابییە منافقانەی گاڵتە بە دینەکەتان ئەکەن و، بە دەم ئەڵێن ئیمانمان هەیەو بە دڵ بێ ئیمانن و دوژمنتانن، هەرگیز دۆستایەتییان لەگەڵ مەکەن. هەروەها دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانە مەکەن کە هاوبەش بۆ خودا قەرار ئەدەن، ئەوانە بۆ ئەوە ناشێن دۆستایەتییان لەگەڵ بکەن. ئەوانە دوژمنی ئێوەن، دوژمنی ئایینتانن. ئەگەر مەسوڵمانن لە خودا بترسن و بێگوێیی مەکەن.

وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ
لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا
بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٥٩﴾ قُلْ
هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ
عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ
مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا
وَقَد دَّخَلُوا۟ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا۟ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْتُمُونَ
﴿٦١﴾ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ
ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٢﴾ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ
وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟
يَصْنَعُونَ ﴿٦٣﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟
بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا
مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ
وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ۚ
وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾



(٥٨) کە ئێوە بانگ ئەدەن بۆئەوەی موسوڵمانان بێن بۆ نوێژو ڕوو بکەنە خودا، ئەم منافقانە گاڵتە بە بانگەکە ئەکەن و پێغەمبەر بە فروستادەی خودا دائانێن. دیارە ئەمانە گرۆهێکی نەفامن. ئەوی نەفام بێ گاڵتە بە ڕاستی ئەکات.

(٥٩) ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەی کیتابییەکان! ئایا هیچ شتێ هەیە بیکەنە عەیبە لە ئێمە ئەوە نەبێ کە باوەڕمان بە خودا هەیەو باوەڕمان بەو کتێبە هەیە کە نازڵ کراوە بۆمان و بەو کتێبانەیش کە لەمەوپێش خودا نازڵی کردوون بۆ پێغەمبەران!؟ هەروەها ئێوە بۆیە عەیبەمان لێ ئەگرن چونکە بەشی زۆرتان لە ئایین لاتانداوەو باوەڕتان بە ئایین نی‌یە.

(٦٠) ئەی موحەممەد! بڵێ: پێتان بڵێم کێ لەمانە بەدترە لای خودا؟ ئەوانەی کە خودا نەفرینی لێ کردن و غەزەبی لێ گرتن و کردنی بە مەیموون و بەرازو مەسخی کردن. ئەوانەی کە گوێرەکەیان پەرست یا کاهینەکانیان پەرست، ئەوانە پایەیان زۆر خراپتر بوو و زیاتر گومڕاه بوون و لە ڕێی ڕاست و ڕەوان لایاندابوو.

(٦١) ئەو منافقانەی کە دێن بۆ لاتان ئەڵێن ئیمانمان هێناوە بە ئایینی ئیسلام، کەچی درۆ ئەکەن و بە کافرییەوە هاتوون بۆ لاتان و بە کافریشەوە لاتان دەرچوون و ئامۆژگاریو قسەی ئێوە کاری تێ نەکردن، خۆ بەدرۆی ئەوان نابێ، خودا باشتر ئاگای لەوەیە کە لە دڵیاندا دەیشارنەوە کە بێ‌ئیمانیو دوژمنایەتیی ئیسلامە.

(٦٢) زۆریان ئەبینی بە پەلەو پەرۆشن بۆ کاری گوناەو دوژمنایەتیی ئیسلام. هەروەها لە هەڵپەدان بۆ خواردنی ماڵی حەرام وەك سوودو بەرتیل. ئەو کارانەی ئەوانە ئەیکەن کارێکی ئێجگار بەدو ناشرینە.

(٦٣) بۆچی زانا خوداپەرستەکان و گەورەکانیان مەنعیان ناکەن لە واتەی گوناه، لە درۆو بوختان و، لە خواردنی ماڵی حەرام. ئیشێکی زۆر خراپ ئەکەن مەنعیان ناکەن.

(٦٤) جوولەکەکان وتیان: خودا دەستی زنجیر کراوەو ڕزق بە خەڵك نادا! یاخودا دەستیان زنجیر بکرێو زەلیل بن و هەمیشە فەقیر بن و لەعنەتی خودایان لێ بێ لەسەر ئەو بوختانەی کردیان. نەخێر، خودا هەردوو دەستی بڵاوەو بە ئارەزووی خۆی ڕۆزی ئەدا. زۆر کەس لەو جوولەکانە ئەو ئایەتانەی خودا بۆ تۆیان ئەنێرێ زیاتر گومڕاهیان ئەکات و زیاتر کافریان ئەکات، چونکە دوژمن بە بەرزیی دوژمنی دەماغی تێکئەچێ. ئێمە دوژمنایەتیو ناکۆکیمان خستووەتە ناویان و تا ڕۆژی قیامەت ناکەونە یەك و ڕقیان لە یەکترە. هەرچی جارێ ئاگری شەڕ هەڵئەگیرسێنن خودا ئەیکوژێنێتەوەو هەوڵو کۆششیان پووچ دەکاتەوە. ئەمانە هەمیشە خەریکی ئاژاوەنانەوەن لەسەر زەویو هەمیشە بەدکارن. بێ‌گومان خودا هەرگیز بەدکاری خۆش ناوێ.

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَاهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِمْ مِنْ رَبِّهِمْ لَأَكَلُوا مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ مِنْهُمْ أُمَّةٌ مُقْتَصِدَةٌ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ سَاءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴿٦٦﴾ ۞ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٦٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئُونَ وَالنَّصَارَىٰ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٩﴾ لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَأَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ رُسُلًا كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَىٰ أَنْفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾



(٦٥) ئەگەر ئەم کیتابییانە ئیمانیان بهێنایەو لە خودا بترسانایەو خۆیان لە گوناه بپاراستایە چاوپۆشیمان لە تاوانەکانیان ئەکردو بۆمان دائەپۆشین و ئەمانخستنە بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت.

(٦٦) ئەگەر ئەوان تەورات و ئینجیلیان ڕاگرتایەو، بەوەی لای خوداوە بۆیان نێرراوە کاریان بکردایە، لە خێرو بەرەکەتی بارانی ئاسمان و بەرهەمی زەوی تێریان ئەخوارد، وەك ئەڵێن لە سەریانەوە ئەهات و لە پێیانەوە دەرئەچوو و نوقمی نازو نیعمەت ئەبوون. ئەم کیتابییانە هی وایان هەیە کۆمەڵێکی میانەڕەوو دادخواهن و دوای حەق ئەکەون، بەلام زۆریان پیاوخراپ و بەدکردارن.

(٦٧) ئەی پێغەمبەر! هەرچیت لە لای خوداوە بۆ نێرراوە بۆ ئەوەی بیگەیێنی بە خەڵك، هەمووی بگەیێنە پێیان، لە هەمووی ئاگاداریان بکەو هیچی مەشارەوە. چاوت لە کەس نەبێو لە زیان مەترسە. بێگومان ئەگەر هەمووی نەگەیێنی ئەوە وەك ئەوەتە هیچت نەگەیاندبێت. خودا خۆی دەتپارێزێ لە خەڵکی ناحەزو کەس ناتوانێ لەناوتبەرێ. هەرگیز خودا هیدایەتی کۆمەڵی کافر نادات‌و ماوەی ئەوەیان ناداتێ تووشی زیانت بکەن.

(٦٨) ئەی پێغەمبەر! بڵێ: ئەی ئەهلی کیتاب! ئێوە بە دیندار حیساب ناکرێن و هیچ ئایینێکتان نی‌یە تا تەورات و ئینجیل ڕانەگرن و کاری پێ نەکەن، هەتا پەیڕەویی ئەوە نەکەن کە لە لای خوداوە بۆتان نێرراوە، وەك باوەڕکردن بە پێغەمبەری ئیسلام و پەیڕەوی‌کردنی ئایینەکەی. زۆر کەس لە ئەهلی کیتاب بەوەی خودا بۆ تۆی ئەنێرێ زیاتر گومڕاه ئەبن و ڕێگای کوفر ئەگرنەبەر. لە کردەوەی بەدی ئەم کافرانە خەم مەخۆ، ئەوانە خۆیان زەرەر ئەکەن و ئەنجامی کوفرەکەیان بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوە.

(٦٩) بەڕاستی ئەو منافقانەی بە زوبان ئیمانیان هێناوە بە ئایینی ئیسلام و، ئەوانەی جوولەکەن و ئیمانیان بە حەزرەتی مووسا هێناوەو، ئەوانەی صوببین و ئیمانیان بە حەزرەتی نووح یا حەزرەتی ئیبراهیم هەیەو، ئەوانەی نەصرانین‌و ئیمانیان بە حەزرەتی عیسا هەیە، ئەمانە هەموو ئەگەر بە ڕاستی‌و بە دڵ‌و بە زوبان باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەبێ‌و کرداریان چاك بێ، بە پێی ئەو ئایینەی لەلایەن خوداوە نێرراوە بۆ موحەممەد، ترسیان نابێ لە سزای ڕۆژی قیامەت و خەفەت ناخۆن، وەك کافرەکان کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە سزاو ئازار ئەترسن و خەفەت ئەخۆن بۆ ئەو عومرەی بە خۆڕایی‌و لە گومڕاهیدا بەختیان کردو خۆیان تووشی ئەو ئەنجامە ناخۆشە کرد.

(٧٠) ئێمە پەیمانمان لە بەنی‌ئیسرائیلییەکان وەرگرت و پێغەمبەرانمان بۆ ناردن کە بیخەنەوە بیریان و ئاگاداریان بکەنەوە. بەڵام هەر جارێ پێغەمبەرێکیان ئەگەر ئامۆژگاری کردبن کە بە ئارەزووی نەفسی ئەوان نەبووبێ، باوەڕیان پێ‌نەکردووەو هەندێکیان خستوونەتەوە بە درۆوەو هەندێکیان کوشتوون!

وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿٧١﴾ لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴿٧٢﴾ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٧٥﴾ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٧٦﴾



(٧١) ئـەو بەنیئیسـرائیلییانە وایـان ئـەزانی دوای ئـەو ئینکـارو کوشـتنی پێغەمبەرانە تووشی هیچ بەڵاییێك نـابن، بۆیە کوێر بوون لە بینینـی حـەق و کـەڕ بوون لـە بیسـتنی حـەق. پـاش ئـەوەیش خودا چاوپۆشی لێ کردن. پاش ئـەوەیش هەم بەشێکی زۆریان خۆیـان کـوێرو کـەڕ کـرد! خـودایش هـەموو کردەوەییێکیـان ئەبینێ‌و بەپێی ئەو کردەوانـە حیسـابیان لەگەڵ ئەکات.

(٧٢) ئەوانـەی وتیـان مەسـیحی کـوڕی مەریەم خودایە کافر بوون، مەسیح پێـی وتن: بەنیئیسـرائیلییەکان! ئـەو خودایـە بپەرسـتن کـە خـودای مـن و ئێوەیشـەو پەروەردگاری عالەمـە، ئـەوەی هاوبـەش بۆ خودا دابنێ خودا بەهەشتی لێ حەرام ئەکات و جێگای ئاگر ئەبێت. بێ‌گومـان سـتەمکاران و کـافران هـیچ یارمەتیدەرێکیان نی‌یە.

(٧٣) بەڕاستی ئەوانە کـافرن کـە ئـەڵێن خودا سێهەمی سێ خودایـە، واتـە: (١) عیسی (٢) مەریەم (٣) "الله" . هیچ خودایێ نی‌یە بەڕاستی عیبادەتی بۆ بکرێ یەك خودا نـەبی ئـەویش (الله)یـە. ئەگەر واز لەم قسە کوفرە نەهێنن ئەوا لەلایـەن خـودای پـەروەردگاری عالەمـەوە سزاییێکی زۆر بـەئازارو ناڵـەباریان تووش ئەبێ.

(٧٤) ئەوە بۆ لەو گوناهە پەشیمان نابنەوەو داوای لێخۆشبوون ناکەن لە بارەگای خودا، کـە خـودا گوناهپۆشـەو زۆر میهرەبانە؟

(٧٥) عیسای مەسیحی کوڕی مەریەم تەنها ئەوەندەیە پێغەمبەرێکـە خـودا ناردوویـەتی بـۆ سـەر خـەڵك و لـەپێش ئەویش پێغەمبەران نێرراون و مردوون. دایکی عیسا ئافرەتێکی زۆر ڕاستوێژ بووەو لە حەق لای نەداوە، هـەردوکیان خواردەمەنییان ئەخوارد وەك هەموو گیانلەبەرێ. دیارە هەرکەس خواردەمەنی بخوات بۆ خودایی ناشێ. جا سەیر بکە چۆن خودا ئایەتەکانی تەوحیدی خۆییان بۆ بەیان ئەکات؟ سەیریش بکـە چـۆن ئـەوان ڕوو لـە حـەق وەرئەچـەرخێنن و دوای بەتاڵ دەکەون؟

(٧٦) پێیان بڵێ ئایا ڕەوایـە شـتێ بپەرسـتن کـە نـە بتوانـێ زیانێکتـان پـێ بگـەیێنێ‌و نـە بتوانـێ قازانجێکتـان پـێ بگەیێنێ!؟ کەچی خودای پەروەردگارو پەرستراوی بەحەق ئاگای لە هـەموو شـت هەیـە، هـەموو شـت ئەبیسـتێ‌و بـە هەموو شت ئەزانێ.

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾



(٧٧) پێیان بڵێ: ئەی کیتابییەکان! بە ناحەق زیادەڕەوی لە ئایینی خۆتاندا مەکەنو مەکەونە شوێنی ئارەزووی نەفسی کۆمەڵێ کە لەمەوبەر گومڕاه بوونو گەلێ خەڵکیشیان گومڕاه کردو، لە ڕێگای ڕاستو ڕەوان لایاندابوو.

(٧٨) لە ئینجیل و لە زەبووردا لەسەر زمانی عیساو داوود لەعنەت کراوە لەو بەنیئیسرائیلییانەی کافر بوون چونکە سەرپێچییان کرد لە فەرمانی خوداو دەستدرێژییان ئەکردو لە سنووری ئایین لایاندابوو.

(٧٩) ئەمانە ڕەوشتیان وا بوو دەسبەرداری خراپە نەدەبوون و، یەکتریان لە کاری خراپ نەئەگێڕایەوە. ئەوەی ئەوان ئەیانکرد کارێکی زۆر ناشیرین بوو.

(٨٠) ئەبینی زۆر لە ئەهلی کیتاب لە ڕقی ئێوەو ئایینی ئیسلام دۆستایەتی لەگەڵ کافران ئەکەن. کارێکی زۆر خراپیان کرد، سەرمایەیێکی زۆر ناشیرینیان خستە پێش خۆیان بۆ ڕۆژی قیامەتیان، خودا بەهۆی ئەو کردەوانەوە غەزەبی لێ گرتنو، لەو دنیا هەتا هەتایە لە ئازارو سزادا ئەمێننەوە.

(٨١) ئەوانە ئەگەر باوەڕیان بە خوداو بە پێغەمبەرو بەو قورئانە هەبوایە کە بۆی نێرراوە، ئەو کافرانەیان نەدەگرت بە دۆستو برادەر، بەڵام زۆریان لە دین دەرچوونو لە ڕێگای ڕاست لایانداوە.

## جوزئی حەوتەم

(٨٢) قەسەم بە خودا! ئەبینی ئەوانەی لە هەمووکەس توندو تیژتر دوژمنی موسوڵمانانن جولەکەکانن و ئەوانەن کە هاوبەشیان بۆ خودا داناوە. ئەیشبینی ئەوانەی لە ڕووی خۆشویستنەوە لە هەموو کەس زیاتر لە موسوڵمانانەوە نزیکن ئەوانەن کە ئەڵێن: ئێمە نەصرانین و پەیڕەوی مەسیحین، چونکە هەندێ لەمانە زانان و زۆر بەدوای زانین و دۆزینەوەی ڕاستیدا ئەگەڕێن. هەروەها هی وایان تێدایە لەخوداترسن و لە پێناوی ڕەزامەندیی خودادا وازیان لە ڕابواردنی دونیا هێناوەو خۆیان لە خەڵك بە گەورەتر نازانن و دەعیەو دەماریان نییە.

وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ۖ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾



(٨٣) ئەم جۆرە نەصرانییانە کاتێ ئایەتێ ئەبیستن کە بۆ پێغەمبەر نازڵ کراوە ئەبینی چاویان پڕ ئەبێ لە فرمێسکو سەرڕێژ ئەکات. لەبەر ئەو ڕاستییەی زانییان و بۆیان دەرکەوت، هەروەها ئەڵێن: خودایا! ئیمانمان هێنا بە موحەممەدو بەوەی بۆی نێرراوە، خودایا لە زومرەی ئەوانەمان بنووسە کە شایەتییان داوە بە ڕاستی ئەم ئایینە.

(٨٤) چیمانە، بۆ ئیمان ناهێنین بە خوداو بەو ئایەتە ڕاستانەی بۆمان هاتوون و بەتەمای ئەوەیشین کە خودا لەگەڵ کۆمەڵی چاکاندا کۆمان بکاتەوەو بمانخاتە نێو نیعمەتی بەهەشت؟

(٨٥) خودا بەرامبەر بەو باوەڕە ڕاستەیان پاداشی دانەوە کە بریتییە لە چەند بەهەشتو باغ و گوڵزارێ کە جۆگای ئاوی جوان و سازگاریان بەناودا ئەڕوات. لەو بەهەشتانەدا هەتا هەتایە ئەمێننەوەو لێی دەرناچن. ئا ئەوەیە پاداشی چاکەکەران.

(٨٦) ئەوانەیش کە کافر بوون و ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ خستەوەو باوەڕیان پێ نەکردن، ئەوانە یارو یاوەری ئاگری دۆزەخن.

(٨٧) ئەی موسوڵمانینە! ئەو نیعمەتە پاك و بەلەزەتانەی خودای میهرەبان بۆی حەڵاڵ کردوون حەرامیان مەکەن و لە خۆتانیان مەگرنەوەو زیادەڕەوی مەکەن. بیشخۆن و خوداپەرستیش بکەن، بەڵام لەو شوورەیە لامەدەن کە خودا بۆی داناون، خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە لە سنووری ئایین لائەدەن.

(٨٨) لەو ڕۆزییەی خودا پێی بەخشیون بخۆن کە حەڵاڵەو پاك و پوختەیەو لەو خودایە بترسن کە باوەڕتان پێی هەیەو، لەو سنوورە لامەدەن کە بۆی دیاری کردوون.

(٨٩) خودا لێتان ناگرێ لەسەر ئەو سوێنانەی هەروەها بە بێ‌قەصدو نی‌یەت دێن بە دەمتاندا، وەك لەوەڵامدا ئەڵێن: بەڵێ بەخودا، نە بەخودا، ئەو جۆرە سوێنانە قەصدیان لەگەڵ نی‌یەو هەروا بە فێربوون بە دەمتاندا دێن. خودا لەسەر ئەو سوێنانە لێتان ئەگرێ کە لەگەڵ وتنیاندا قەصدتان هەبێ‌و، بەڕاستی سوێن بخۆن لەسەر کردن یا نەکردنی شتێ. بەڵێ لەم جۆرە سوێنانەدا ئەگەر شکاندتانن، ئەوا پێویستە کەفارەت بدەن. کەفارەتەکەیش خواردەمەنی‌دانە بە هەژار لە مامناوەندیی ئەو جۆرە خواردەمەنییانەی ئەیدەن بە خێزانی خۆتان، یا پۆشاك کردن بۆ دە هەژار، یا ئازادکردنی بەندەیێ. جا ئەگەر ئەمانە هیچ کامتان نەبوو ئەوا ئەبێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بن. ئەمەیە کەفارەتی سوێندی ڕاستەقینەتان ئەگەر شکاندتان و نەتانبردەسەر، خۆتان ڕاگرن لە شکاندنی سوێنەکانتان، مەگەر شکاندنەکە خێرێکی تێدا بێ. خودا ئا بەم جۆرە ئایەت و حوکمەکانی ئایینتان بۆ ڕۆشن ئەکاتەوە بەڵکو بەجێیان بهێنن و شوکرانەبژێری خودا بن لەسەر ئەم هیدایەتە.

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَـٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَـٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَـٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٩٢﴾ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٤﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّـٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾



(٩٠) ئەی خاوەن ئیمانەکان! شەراب و قومارکردن و سەربڕینی حەیوان لەسەر بەردەکانی دەوری کەعبە، یا لای بتەکان، هەروەها پەیڕەوی کردنی ئەزلام و بەکارهێنانی، کارێکی پیس و قیزەونن و کرداری شەیتانی نەفرینلێکراون، کاری ئینسانی ژیرو لەخوداترس نین، خۆتان لەمانە بپارێزن و لێیان دوورکەونەوە بەڵکو سەرکەون و بەختەوەر بن.

شایەنی باسە لە لێکدانەوەی ئایەتی پیرۆزی سێیەمی ئەم سوورەتەدا بە درێژی باسی (ئەزلام)مان کرد، بۆیە لێرەدا دووبارەمان نەکردەوە.

(٩١) شەیتان تەنها ئەوەی ئەوێ بە هۆی شەراب و قومارەوە دوژمنایەتی و ڕقەبەری بخاتە ناوتان و خەریکتان بکات و ڕێگای ناوهێنانی خوداو بیرلێکردنەوەی و نوێژکردنتان لێ بگرێ، جا ئاخۆ ئێوە دەسبەردار ئەبن و خۆتان لەم شتە بەدانە دوور ئەخەنەوە؟

(٩٢) بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا بکەن و، خۆتان لە بێگوێیی کردنی بپارێزن. ئەگەر پشتتان هەڵکردو سەرپێچیتان کرد ئەوا پێغەمبەری ئێمە هەر ڕاگەیاندنی ئاشکراو بێ پێچو پەنای لەسەرە، ئیتر بەگوێکردن و بەگوێنەکردن پێوەندی بە خۆتانەوە هەیە.

(٩٣) ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بە خوداو پێغەمبەرو ئایینی ئیسلام و کردەوەی چاك ئەکەن هەر شتێك بخۆن تاوانبار نابن ئەگەر خۆیان لە خواردەمەنیی حەرامکراو بپارێزن و لەسەر ئیمان و کردەوەی چاك پایەدار بن، پاش ئەوەیش خۆیان لەو شتانە بپارێزن کە لە دواییدا حەرامکراون وەك شەراب و، ئیمانیان بە حەرامکردنەکە هەبێ و، دوای ئەوە لەسەر ئەو خۆپاراستنە بەردەوام بن و بە دوای کردەوەی چاك و موسوڵمانانەدا بگەڕێن و خۆتان بە چاکەوە مەشغوڵ بکەن. خودا بنیادەمی چاکەکەری خۆش ئەوێ.

(٩٤) ئەی موسوڵمانینە! بە خودا قەسەم خودا بە هەندێ نێچیر تاقیتان ئەکاتەوە، کە دەستتان پێیان ئەگات یا ئەتوانن بە تیر ڕاویان بکەن، تا ئەوانەتان کە لە پەنهانیدا لە خودا ئەترسن و لە کاتی ئیحرامدا ڕاوناکەن لەوانەتان جیا ببنەوە کە گوێ نادەنێ. جا پاش ئەم تاقی کردنەوەیە هەرکەس لە سنووری خودا لابدا ئەوا سزایێکی پڕئازار ئەدرێ. ئەم ئایەتە پیرۆزە دەربارەی ئەوانە نازڵ بووە کە لە عەمرەی (حدیبیە)دا بوون، کە حەیوانی کێوی ئەهاتنە ناویان و لێیان نزیك ئەبوونەوە، بە ڕادەیێ ئەیانتوانی بە دەست بییانگرن، یان بە تیر برینداریان بکەن.

(٩٥) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە لە کاتێکدا کە لە ئیحرامدان نێچیر مەکوژن. هەرکەس نێچیرێ بە عەمدی بکوژێ، واتە لەبیری بێ کە لە ئیحرامدایەو بزانێ کوشتنەکە حەرامە، ئەوە جەزاکەی حەیوانێکە کە لە چەشنی کوژراوەکە بێو دووکەسی عادڵ پەسەندی بکەن، ئەو حەیوانە بکەنە خێرو ئەبێ بگاتە هەژارانی کەعبە، واتە لە حەرەمدا سەر ببڕێ و بدرێ بە هەژارەکانی، ئەگەر ئەوەتان نەبوو بەقەدەر قیمەتی ئەو نێچیرە بکەنە خواردەمەنی بۆ هەژاران. ئەگەر ئەوەیشتان نەتوانی لەباتی خواردەمەنی هەر هەژارێ ڕۆژێ بەڕۆژوو بن. بۆیە ئەم جەزایە بڕیاردرا تا ئەوەی نێچیرەکەی کوشتووە ئەنجامی کارەکەی بچێژێ؛ چونکە لە سنوور لایداوەو ڕاوی کردووە. خودا عەفوی کردن لە هی لەوەپێشتان، هی سەردەمی جاهیلیەت، یا هی سەردەمی ئیسلام پێش حەرام کردنی ئەم کوشتنە، یا لە هی ئەم جارەتان. بەڵام هەر کەس بگەڕێتەوە سەری، ئەوە خودا تۆڵەی لێ ئەکاتەوە؛ خودا بەدەستەڵاتەو تۆڵەسێنە.

أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩٦﴾ ۞ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ۚ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾ قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ۚ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا۟ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ ۙ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾



(٩٦) بۆتان حەڵاڵ كراوه نێچیری دەریا بۆ ئەوەی لە ئیحرامدا بێ‌و ئەوەی لە ئیحرامدا نەبێ حەڵاڵە بۆتان بیخۆن و حەڵاڵە بۆ موسافیرەكانتان هەڵیگرن لەگەڵ خۆیانداو لە رێگادا بیخۆن و سوودی لێ‌وەرگرن. بەڵام تا لە ئیحرامدا بن نێچری وشكانیتان لێ حەرامە. لە خودا بترسن و لە سنووری فەرمانی دەرمەچن، چونكە بۆ لای خودا ئەگەڕێنەوەو لای ئەو حەشر ئەكرێن.

(٩٧) كەعبە كە خانوویەكی بەحورمەتە خودا حورمەتی داوەتێ‌و كردوویە بە هۆی بووژانەوەی خەڵك لە كاری دین و لە كاری دنیایاندا، ئەوەی بترسێ پەنای پێ‌ئەبا، ئەوەی بێ‌دەست بێ لەوێ ئەحەوێتەوە، ئەوەی بازرگانی بكا لەوێ ئیشی خۆی ڕائەپەڕێنێ. ئەوەی بییەوێ حەج و عومرە بەجێ‌بێنێ ڕووی تێ‌ئەكات و بۆی ئەڕوات. هەروەها خودای میهرەبان قوربانی لە مەڕو بزن و گاو وشتری گەردنبەند لەملی بۆ خێردیاریكراوی لەو شوێنە پیرۆزەدا كردووەتە هۆی ژیانی خەڵك و بووژانەوەی داماوان. ئەم كارانەی خودا كە هەموو حیكمەتیان تێدایە؛ بۆ ئەوەن بزانن خودا ئاگای لە هەموو ئەو شتانەیە كە لە ئاسمانەكان و لە زەویدا هەن و، خودا هەمووشت ئەزانێ‌و، ئاگاداری قازانج و خێرو خۆشیی بنیادەمە.

(٩٨) بزانن كە بەڕاستی خودا بە توندی تۆڵە ئەسێنێ‌و، بەڕاستی خودا گوناهبەخشەو زۆر میهرەبانە.

(٩٩) پێغەمبەر تەنها ئەوەی لەسەرە كە پەیامەكە بگەیێنێ‌و فەرمانی خوداتان بۆ ڕوون بكاتەوە، لەوەبەدوا خۆتان بەرپرسن. خودا ئاگاداری هەموو شتێكتانە، ئەوەی دەریئەبڕن و ئەوەی ئەیشارنەوە. (١٠٠) پایەی كردەوەی چاك و پاك و هی خراپ و ناپاك، یا ئینسانی خاوێن و چاكەكەرو ئینسانی پیس و بەدكردار، یا كردەوەی مرۆی پاك و ناپاك هەرگیز لای خوا یەكسان و وەك یەك نین، ئەگەرچی زۆریی پیسەكەت لا سەیر بێ، چونكە عیبرەت بە چاكی و خراپییە نەك بە زۆری و كەمی، كەواتە لە خودا بترسن لە ئیختیاركردنی چاك و پاك و لە خۆلادانەدا لە بەدو ناپاك، بەڵكو بەختیارو سەركەوتووی هەردوو دنیا بن.

(١٠١) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە لەشتی وەها مەپرسن لە پێغەمبەر (د.خ) كە ئەگەر بۆتان دەركەوێ‌و وەڵام بدرێنەوە پێتان ناخۆش بێ‌و زیانی هەبێ بۆتان. ئەگەر لەو كاتەدا پرسیارەكە بكەن كە قورئان نازڵ ئەبێت بۆتان ڕوون ئەبێتەوە. خودا عەفوی كردن لە پرسیارە پێشووەكانتان. لەمەوپاش پرسیاری وەها مەكەن. خودا گوناهبەخش و میهرەبانە.

(١٠٢) قەومێ پێش ئێوە پرسیاریان لە پێغەمبەرەكانیان كردو دوایی ئیمانیان پێ‌نەهێنا، وەك جەماعەتی عیسا كە داوای (مائیدە)یان كردو دوایی ئیمانیان پێ‌نەهێنا، یا قەومی صالح پێغەمبەر كە داوای وشترێكیان كردو هەرچوار پەلیان بڕییەوە، یا بەنی ئیسرائیلییەكان كە پرسیاریان لە پێغەمبەرەكانیان ئەكردو، كە وەڵامیان ئەدانەوە ئیمانیان پێ نەئەهێنان.

(١٠٣) ئەهلی جاهیلییەت، پێش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەگەر وشترێكیان پێنج سكی بكردایەو دواییینەكەیان نێر بوایە گوێی دایكانەكەیان دوو لەت ئەكردو ئەیانقلیشاندو بەرەڵایان ئەكرد، نە سواری ئەبوون و نە ئەیاندۆشی. ئەگەر زەلامێكیان نەخۆش بكەوتایە ئەیوت: ئەگەر چاك ببمەوە فڵانە وشترم بەرەڵڵا بێ، واتە سوودی لێ وەرنەگیرێ. ئەگەر مەڕێك مێنگەی ببوایە بۆ خۆیان ئەبوو. ئەگەر نێرەی ببوایە بۆ بتەكانیان ئەبوو. خۆ ئەگەر بە سكێ نێرو مێیەكی ببوایە ئەوا نێرەكەیش دەخرایە پاڵ مێنگەكەو نەئەدرا بە بتەكان. هەروەها ئەگەر لە پشتی نێرێك دە سك بهاتایە حەرامیان ئەكرد سواری ببن و لە ئاوو لەوەڕگا مەنعیان نەئەكردو بە ئارەزووی خۆی ئەسووڕایەوە. جا قورئانی پیرۆز ئەم عادەتانەیان بەتاڵ ئەكاتەوەو ئەفەرموێ ئەم عادەتانە كە كافرەكان خوویان پێیانەوە گرتووە، هیچ ئەصڵ و ئەساسیان نییەو خودا حوكمی وای نەداوەو پێی ڕازی نییە. بەڵام كافرەكان درۆ بە دەم خوداوە هەڵئەبەستن و بەشی زۆریان بێ‌هۆش و نەفامن و حەڵاڵ و حەرام نازانن و گوێیان نادەنێ.

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَأَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةُ ٱلْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِى بِهِۦ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ وَلَا نَكْتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْـَٔاثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَٰنِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يَأْتُواْ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ أَوْ يَخَافُوٓاْ أَن تُرَدَّ أَيْمَٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُواْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾



(١٠٤) کە پێیان ئەوترێ وەرن بۆ پەیڕەوی‌کردنی ئەو فەرمان و حوکمانەی خودا لە ڕێگای پێغەمبەرەوە بۆی ناردوونو، وەرن دوای ئامۆژگاریی پێغەمبەر بکەون، ئەڵێن: نایەین، ئەو داب و نەریتەمان بەسە کە باوباپیرمان دیوە لەسەری ئەڕۆیشتن، ئایا تەنانەت ئەگەر ئەو باوباپیرانەشیان هیچیان نەزانیبێو ڕێگای ڕاستیان نەدۆزیبێتەوە هەر دوایان ئەکەون و پەیڕەوی داب و نەریتیان ئەکەن!؟

(١٠٥) ئەی خاوەن باوەڕەکان! ئاگاتان لە بیرو باوەڕو کردەوەی خۆتان بێ، ئەگەر ئێوە ڕێگای ڕاست بگرنەبەر کافرە گومڕاکان زیانتان پێ‌ناگەیێنن، گومڕایی ئەوان کار لە ئێوە ناکات. هەمووتان سەرەنجامتان لای خودای گەورەو ئاگادارە، ڕۆژی خۆی پێتان ئەڵێ لە دنیادا چیتان کردووە؟

(١٠٦) ئەی خاوەن ئیمانەکان! یەکێ لەو حوکمانەی بۆتان دانراوە ئەوەیە، ئەگەر یەکێکتان لە سەفەردا بوو و نیشانەی مردن دیاری‌دا لێیو وەصیەتی کرد، با لە کاتێ وەصیەتەکەدا دوو پیاوی عادڵ و ڕاستگۆ لە خۆتان، واتە لە موسوڵمانان یا دوو پیاوی تر لە ئەهلی ذیمە حازری ئەو وەصیەتە بنو ئاگادار بن لەوەی خاوەن وەصیەت ئەیڵێ. جا پاش مردنەکە ئەگەر میراتبەری مردوو لە ڕاستی شایەتەکان دوودڵ بوون ئەوا لە پاش نوێژی عەصر کە خەڵك جەمە، شایەتەکان ڕاگرن تا سوێند بخۆن بە خوداو بڵێن: ئێمە ڕاستی شایەتییەکەمان بە هیچ نرخێ ناگۆڕینەوەو ئەوەی خاوەن وەصیەت وتوویە بێ‌کەم و زیاد ئەیڵێین و، ئەو کەسە کە شایەتییەکە قازانجە بۆی ئەگەر خزمیشمان بێ هەر لە ڕاستی لانادەین و لایەنگری کەس ناکەین و، ئەو شایەتییەی خودا ئەمری پێ‌کردووین نایشارینەوە. ئەگەر شتی وا بکەین، واتە لە ڕاستی لابدەین، ئەوا ئێمە لە زومرەی گوناهبارانین.

شایانی باسە شایەتیی ذیمی لە سەرەتای ئیسلامدا بووە کە موسوڵمانان کەم بوون. دوایی حوکمەکە نەسخ کراوەتەوە. ئەمە ڕەئیی ئیمامی شافیعی و ئیمام مالیك و ئەخەعییە، بەڵام ئیمام ئەبووحەنیفە ئەڵێت: لە هەموو کاتێکدا ڕاستو بەجێیە بەتایبەتی لەکاتی ناچاریدا.

(١٠٧) جا پاش شایەتیی ئەو دوانە ئەگەر دەرکەوت درۆیان‌کردووەو، بەو شایەتییەی داویانە گوناهبار بوون، با شاهیدی تر بێن لەو کۆمەڵە میراتبەرانە کە دوو شاهیدە پێشووەکان زیانیان لێ‌داون. ئەمانە بەرامبەری دوو شاهیدە پێشووەکان دانیشن و سوێند بخۆن کە شایەتیی ئێمە ڕاستترە لە شایەتیی دوانە پێشووەکان و، ئێمە لەم شایەتییەماندا دەستدرێژی لە کەس ناکەین. ئەگەر دەستدرێژی بکەین لە زومرەی ستەمکارانین.

(١٠٨) سوێن‌دانی ئەم شایەتانە کە وەصیەتەکەیان لا کراوە شتێکی بەجێیەو ئەبێتە هۆی ئەوە کە وەصیەتەکە بەڕاستی بگەیێنن و شایەتیی ڕاست بدەن، چونکە ئەترسن لەوەی پاش سوێندەکەی ئەمان داواکارەکان دوودڵ بن و گومان لە ڕاستییان بکەن و ئەنجام سوێن بخۆن و بخرێنەوە بە درۆوەو ئابڕوویان بچێ. لە خودا بترسن و گوێ لە فەرموودەی خوداو ئامۆژگاریی پێغەمبەر بگرن. بێ‌گومان خودا هیدایەتی ئەوانە نادات کە لە ڕێگای ڕاستی ئایین لائەدەن.

۞ يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ
لَنَآ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ
ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ
ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ
ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۖ وَإِذْ تَخْلُقُ
مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا
بِإِذْنِى ۖ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ تُخْرِجُ
ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ
جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ
مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّۦنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى
وَبِرَسُولِى قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾ إِذْ قَالَ
ٱلْحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن
يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۖ قَالَ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم
مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا
وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾



(١٠٩) باسی ئەو ڕۆژە بکە کە خودا پێغەمبەرەکان کۆ ئەکاتەوەو لێیان ئەپرسێ: ئوممەتەکانتان چۆن جوابیان دانەوە؟ چۆن بە دەنگتانەوە هاتن؟ ئەوانیش ئەڵێن: ئێمە نازانین، هەر تۆی هەمووکارە نادیارەکان و شتە پەنهانەکان ئەزانیو لە هەموویان ئاگاداری.

(١١٠) ئەی پێغەمبەر! یادی ئەوە بکە کە خودا بە عیسای فەرموو: عیسای کوڕی مەریەم! یادی ئەو نیعمەتانە بکە کە بە تۆو بە دایکتم داون، کە بە جوبرەئیل یارمەتیمدای قسەت لەگەڵ خەڵك ئەکرد کە هێشتا لە بێشکەدا بوویت و بە گەورەییش، واتە خودا توانی پێ بەخشیت بە مەلۆتکەیی وەك حاڵی گەورەیی قسەیان لەگەڵ بکەیت. بیر لەوە بکەرەوە کە فێری نووسینم کردی، فێری قسەی ڕاست و دامەزراوو حیکمەتدارم کردی، تەوراتم فێر کردی کە پێش تۆ بۆ مووسا هاتبوو، ئینجیلم فێر کردی کە بۆ خۆت هات. یادی ئەو نیعمەتە بکە کە چۆن بە ئیزنی من لە قوڕ هەیکەلی باڵندەت دروست ئەکردو فووت تێ ئەکردو بە ئیزنی من ئەبووە باڵندەی ڕاستەقینە. هەروەها کوێری زگماك و بەڵەکت بە ئیزنی من چاك ئەکردەوە. بیری ئەوە بکەرەوە کە چۆن بە ئیزنی من مردووت زیندوو ئەکردەوە. بیری ئەوە بکەرەوە کە چۆن نەمهێشت بەنیئیسرائیلییەکان بتکوژن کە ئایەت و موعجیزەی ئاشکراو دیاری بۆ هێنان و باوەڕیان پێنەئەکرد و کافرەکانیان لەباتی باوەڕکردن ئەیانوت: ئەمانەی تۆ دەریان ئەخەیت تەنها جادووی ئاشکران و هیچی تر نین!

(١١١) ئەی عیسا! بیری ئەوە بکەرەوە چۆن خستمە دڵی ئەوانەوە کە بڕیارمان دابوو ببنە هاوڕێی تایبەتیت، یا بە وەحی لەسەر زوبانی خۆت داوام لێ کردن ئیمان بە من و بە پێغەمبەری من بێنن، ئەوانیش نووری ئیمان چووە دڵیانەوەو ڕوویان کردە خوداو وتیان: وا ئیمانمان هێنا بە خودای تەنیاو بێهاوڕێ، تۆیش خودایا بە لوطفی خۆت شایەت بە لەسەر ئەم ئیسلامەتییەمان.

(١١٢) کە حەوارییەکان وتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا خودای تۆ ئەتوانێ، یا بەگوێت ئەکا لە ئاسمانەوە خوانێکمان بۆ دابەزێنێ؟ عیسایش پێی وتن: ئەگەر بەڕاستی خاوەن ئیمانن لە خودا بترسن و دوودڵ و ڕاڕا مەبن. شایانی باسە ئەم داوای حەوارییانە یا وەك داواکەی حەزرەتی مووسایە کە لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر بوو عەرزی خودای کرد: ﴿ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ﴾ یا خۆ ئەو داوایە هی هەندێ لە حەوارییەکان بووە کە هێشتا دامەزراوو دڵنیا نەبوون.

(١١٣) وتیان: ئەمانەوێ لەو خوانە بخۆین و بەتایبەتی بەم موعجیزەیە شەرەفمەند ببین و بەتەواوی دڵنیا ببین و لە دڵەڕاوکێی شەیتان ڕزگار ببین و بەئاشکراو بە بینین بزانین کە لە ئیددیعای پێغەمبەری و ئەو موژدانەدا پێمانی ئەدەیت ڕاست ئەکەیت لەگەڵمانو ئێمەیش شایەتی هاتنەخوارەوەی ئەم خوانە بین.

قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ
تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ
خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ
مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾
وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي
وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ
أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي
نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا
قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ
عَلَيۡهِمۡ شَهِيدًا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ
عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ
وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ
يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ
خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١٩﴾
لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ ﴿١٢٠﴾



(١١٤) عیسـای کـوڕی مەریـەمیش ڕووی‌کردە بارەگای خوداییو دەستی کرد بـە پاڕانـەوەو وتـی: خودایـا! ئـەی پەروەردگارمان! خوانێکمان لـە ئاسمانـەوە بۆ بنێـرە خـوار کـە ببێتـە هـۆی جـەژن و شـادی بـۆ ئێمـەو بـەرودوامان، هـەروەها ببێتە نیشـانەیێکی ئاشـکرا کـە دەلالـەت بکات لە گەورەیی و توانـایی تـۆو، ببێتـە مـوعجیزە بـۆ ئیسـپاتی ڕاسـتی مـن لـە ئیددیعای پێغەمبەرایەتیمـدا. لـەو خوانـە ڕۆزیمان بـدەرێ، یـا بمانخـەرە سـەر ڕێگـای شوکرانەبژێریی نیعمەتەکانت. هـەر تـەنها تـۆ چـاکترین ڕۆزیـدەری، چـونکە خـۆت ڕۆزییەکـە دروسـت ئەکـەیت و خۆیشـت ئەیبەخشی.

(١١٥) خـودا تکاکـەی عیسـای قبـووڵ کردو وتـی: وا ئـەو خوانـەی داواتـان کـرد بۆتان ئەنێرمە خوار. ئیتر هەرکام لە ئێـوە پـاش ئـەوە کـافر بـوو و گـوێی نەدایـە ئامۆژگاریی پێغەمبـەر سزاییێکی گـران و توندوتیژی وەهای ئەدەم لە عالەمدا سزای کەس بەو جۆرە نـادەم. ئـەوەبوو ئەوانـەی کافر بوون خودا پێستی مەیموون و بەرازی بـە بـەردا کـردن کـە کـەس سـزای وەهـا نەدراوە.

(١١٦) ئەی موحەممەد! باسی ئەوەیان بـۆ بکە کە چۆن خودا لە ڕۆژی قیامەتدا بە ئاگاداریی خەڵك و لە بەردەمیاندا لە عیسای کوڕی مەریەم ئەپرسێو ئـەڵێ: ئەوە تۆ بەو خەڵکەت وتووە: لە خوا بەولاوە من و دایکیشم بپەرستن و بـە خودامـان حیسـاب بکـەن؟ عیسـایش لـە وەڵامدا ئەڵێت: پاکی و بێعەیبی هەر بۆ تۆیە، بۆ من ڕەوا نییەو حەقی ئەوەم نییە شتی پووچ و نارەوا بڵێم. ئەگەر وتبێتم ئەوا تۆ پێت زانیوە. ئەوەی لە دەروونی مندایە تۆ پێی ئەزانی بەڵام من نازانم چی لای تۆیە. هەر تـۆی زانـاو ئاگادار لە هەموو کارێکی پەنهان و شتێکی نادیار. (١١٧) هیچم پێ نەوتوون ئەوە نەبێ کە خۆت ئەمرت پێ‌کردووم پێیان بڵێم، پێم وتوون: تەنها خودا بپەرستن، ئەو خودایەی کە پەروەرگاری منـیش و ئێوەیشـە. تـا لـە ناویانـدا بـووم ئاگام لێیان بوو. کاتێ کە بردمتەوە بۆ خۆت و لە ناویاندا نەمام تۆ خۆت ئاگات لێیان بووەو بەسەریانەوە بووی. تـۆ لە هەموو شت و هەموو کارێ ئاگادارێو هیچت لێ ون نابێ.

(١١٨) ئەگەر عەزابیان ئەدەی ئەوا بەنـدەی خـۆتن و ئـەتوانی بـە ئـارەزووی خـۆت لەگـەڵیان بجووڵێیتـەوەو سـزایان بدەیت. مولکی خۆتن و کەس حەقی ڕەخنەی نییە. ئەگەر لە گوناهیشیان خۆش بیو چاوپۆشییان لێ بکـەیت کـەس ناتوانێ بڵێ: نەیتوانی سزایان بدات، بۆیە بەخشـینی! تـۆ زۆر بـەهێزی و دەسـتت بەسـەر هـەموو شـتێکدا ئـەڕوات. ئەتوانی ببەخشیو ئەتوانی سزا بدەیت. کارەکانیشت پڕ لە حیکمەتن.

(١١٩) جا خودا ئەفەرموێ: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستگۆیان ڕاستییەکەیان فریایان ئەکەوێت و، پاداشیان چەند باغو گوڵزارو بەهەشتێکی گەورەو بەرینە کە جۆگای ڕوون و سازگاریان بەناودا ئـەڕوات. خـودا ڕازییـە لێیـان و، ئـەوانیش شوکرانەبژێری کەرەمی خودان و پڕ بە دڵ ڕازیو کامەرانن بەو پاداشەی خودا پێی بەخشیون. ئا ئەمەیـە سـەرفرازیو بەختیاریی گەورە. (١٢٠) ئاسمانەکان و زەوی و هەرچییان تێدایە مولکی خودایـەو، خـودا دەسـتی بـە سـەر هـەموو شتێکدا ئەڕوات و توانایە.

## سُورَةُ الأَنْعَامِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ۖ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ۖ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ ۖ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ ﴿٣﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٦﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ ۖ وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا لَّقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴿٨﴾



## سوورەتی (الأنعام)

مەککەیی یەو، (١٦٥) ئایەتە*

(١) هەرچی سوپاسە شایانی ئەو خودا بەدەستەلاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوون و تاریکیو ڕووناکی داهێناوە. پاش ئەم هەموو نیشانە گەورانە کە دەلالەت لە گەورەیی خودا ئەکەن، کافرەکان لە ڕاستی لائەدەن و بە نیعمەتەکانی قایل نابن و بتە دەستکردەکانی خۆیان ئەکەنە هاوشانی خوداو ئەیانپەرستن.

(٢) خودا ئەو خودایە ئێوەی لە قوڕ دروست کردووە، ئەنجا بۆ هەرکەس ماوەیێکی دیاری داناوە کە تیایدا بژی، کاتێکی دیاریشی لای خۆی داناوە بۆ زیندوو کردنەوەو بۆ بەرپاکردنی ڕۆژی قیامەت. کەچی ئێوە پاش ئەم هەمووە دروستکردن و داهێنانە گومان ئەکەن لە ڕاستیی دەستەلاتی خودا لە زیندووکردنەوەی مردووان لە ڕۆژی قیامەتدا. ئەوەی بتوانێ لە نەبوونەوە شت دروست بکات پاش فەوتانی شتەکەیش ئەتوانێ دروستی بکاتەوەو سەرلەنوێ گیانی بکاتەوە بەبەردا.

(٣) لە ئاسمانەکان و لە زەویداو لە هەموو شوێنێکدا هەر ئەو خوایەو شایانی عیبادەت بۆکردنە. ئەزانێ بەوەی لە دڵتاندایە یا بە پەنهانی ئەیکەن، ئەیشزانێ بەوەی ئەیشارنەوەو دەریناخەن، چ چاك و چ خراپ. ئەزانێ چی ئەکەن لە چاکە کە پاداشتان ئەدرێتەوە لەسەری،و، لە خراپە کە موحاسەبە ئەکرێن لەسەری.

(٤) هیچ ئایەتێکیان بۆ نایێت لە ئایەتەکانی خودا سەرپێچی لێ ئەکەن و موخالەفەی ئەکەن!

(٥) ئەمانە باوەڕیان نەکرد بە قورئان کە بۆیان هات، وەك چۆن باوەڕیان بە هیچ موعجیزەیێکی تر نەکرد. دوارۆژ واتە لە ڕۆژی قیامەتدا یا هەر لە دنیادا کە وەختی تۆڵەلێسەندنەوەیان دێت و ئایینی ئیسلام سەرئەکەوێ، خەبەری ئەوەیان پێ ئەگات کە گاڵتەیان پێ ئەکردو خۆیان ئەبیننەوە.

(٦) ئەمانە بۆ ناڕوانن و بیر ناکەنەوە لەوە کە ئێمە چەندەها تیرەو تایەفەمان پێش ئەمان لە ناوبردو شوێنەوارمان نەهێشتن، کە جێو ڕێو هێزو دەستەلاتی وەهامان دابوونێ بە ئێوەمان نەداوەو، حاڵیان زۆر لە ئێستای ئێوە باشتر بوو، لە ئێوە گەلێ تواناتر بوون. ئاسمان و هەورو بارانمان بۆ خستبوونەکارو خێرو بێرمان بەسەردا ڕژاندبوون، جۆگا لەبەر پێیاندا ڕەوان بوو، لە نازو نیعمەت و خۆشیدا ئەژیان. ئاخری ئەو دەستەڵات و خۆشگوزەرانییە هەمووی فریایان نەکەوت و بە هۆی گوناهکارییانەوە لەناومان بردن و، دوای ئەوان خەڵکی ترمان هێنایە ڕووی کار. (٧) ئەگەر ئێمە کتێبێکت بۆ بنێرین کە لە کاغەزێکدا نووسرابێ،و، کافرەکان بە دەستی خۆیان دەستی لێبدەن، هێشتا باوەڕ ناکەن و ئەڵێن: ئەمە جادوویێکی ئاشکرا نەبێ هیچی تر نی‌یە. (٨) کافرەکان ئەڵێن: ئەوە بۆچی مەلائیکەیێکی لەگەڵدا نەنێررایە خوار بۆ لامان پێمان بڵێ: ئەمە پێغەمبەری خودایە؟! بێگومان ئەگەر کار بگاتە ئەو ڕادە مەلائیکە بێتە خوارو ئەوان بیبینن یەکسەر کار ئەبڕێتەوەو لەناو ئەبرێن و بە قەدەر چاوبەیەکدانانێك مۆڵەت نادرێن، چونکە خودا نیسبەت بە نەتەوەکانی تر وەهای کردووە بە عادەت و بەسەر ئەمانیشدا تەطبیق ئەکرێ.

---

★ تەفسیری بەیضاوی ئەڵێت: ئایەتی (٢٠) و(٢٣) و(٩١) و(٩٣) و(١١٤) و (١٤١) و(١٥١) و(١٥٢) و(١٥٣)ی ئەم سوورەتە مەدینەیین.

وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ قُل لِّمَن مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُل لِّلَّهِ ۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ ۞ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِى ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ ۗ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلْ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾



(٩) ئەگەر مەلائیکەیێکیشمان بناردایە لەگەڵتدا کە بیانبینیایە، یا هەر مەلائیکەکەمان بکردایە بە پێغەمبەر ئەمانخستە شێوەی بنیادەمەوە، وەك چۆن جارجار جیبرەئیل لە شێوەی دوحیەدا ئەهاتە لای پێغەمبەرو وەحیی بۆ ئەهێنا، چونکە بنیادەم هێزی ئەوەی نیە مەلائیکە لە شێوەی خۆیدا ببینێ، جا ئەو وەختەیش هەر سەریان لە خۆیان تێکئەداو ئەیانوت: ئەمە کەی پێغەمبەرە؟ ئەمە بنیادەمێکە وەکو ئێوەو هیچ جیاوازییەکی نیە.

(١٠) گاڵتە زۆر کرا بە پێغەمبەرانی پێش تۆیش. لە ئەنجامدا ئەو کافرانەی گاڵتەیان ئەکرد تووشی بەڵا هاتن و نەگبەتی ئەو گاڵتەکردن و بێباوەڕییە خراپ گرتنی.

(١١) بڵێ بەو کافرانە: با بڕۆن بگەڕێن بە دنیاداو بیربکەنەوە لەوانەی باوەڕیان بە پێغەمبەران نەئەکردو ئەیانخستنەوە بەدرۆوە، چییان بەسەر هات و بۆ کوێ چوون؟ دیارە هەموو فەوتان و لە ناوچوون و خودا تۆڵەی لێ سەندنەوە. دەی ئەنجامی ئێوەیش لەوان چاکتر نابێ.

(١٢) تۆ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەوەی لە ئاسمانەکان و لە زەویدایە هی کێیە؟ هەر خۆیشت وەڵام بدەرەوەو بڵێ: هەمووی هی خودایەو کەس حەقی ئەوەی نیە خاوەن بێ خودا نەبێ. خودا بە لوطف و کەرەمی خۆی نەوەك بە ناچاری و بێدەستەڵاتی بڕیاری داوە لەسەر خۆی بەزەیی بە خەڵکدا بێتەوە لە دنیاو لە قیامەتدا. قەسەم بەخودا! هەمووتان لە ڕۆژی قیامەتدا کۆئەکاتەوەو موحاسەبەتان ئەکات و هیچی لێ ون نابێو، ئەم کۆکردنەوەیە ڕاستەو گومانی تێدا نیە. ئەوانەی خۆیان دۆڕاندوەو عەقڵێو حەواسیان بەکارنەهێناوەو بیریان لەم جیهانەو لە خودای ئەم جیهانە نەکردوەتەوە، ئیمانیان نەهێناو کافر بوون، واتە کوفرەکەیان ئەنجامی عەقڵ نەخستنەکار بوو.

(١٣) هەرچی لە شەوو ڕۆژدایە هەمووی مولکی خودایەو لە ژێر دەستی ئەودایە. خودا هەمووشت ئەبیسێو زاناو ئاگادارەو هیچی لێ ون نابێ. (١٤) تۆ ئەی پێغەمبەر! بڵێ بەو خەڵکە: چۆن ڕەوایەو، چۆن ئەچێتە عەقڵەوە من غەیری خودای دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی بپەرستم؟! ئەو خودا توانایە کە ڕزق و ڕۆزی بە خەڵك و بە گیانەوەران ئەدات و خواردنیان دەرخوارد ئەدات، کەچی خۆی پێویستی بە ڕزق و ڕۆزی و خواردن نیەو چاوەڕوانی دەستی کەس نیە. بڵێ: من وام فەرمان پێدراوە یەکەم موسوڵمان بم و لە پێش هەموو ئوممەتەکەمەوە ئیسلام ببم و ئیمان بهێنم. پێم وتراوەو ئەمرم پێ کراوە: لەوانە مەبە کە هاوبەش بۆ خودا بڕیار ئەدەن.

(١٥) ئەی پێغەمبەری خودا پێیان بڵێ: ئەگەر سەرپێچی لە فەرمانی خودا بکەم لە سزای ڕۆژێکی گەورەو ترسناك ئەترسم کە کەس فریام ناکەوێ تیا ئەو نەبێ. (١٦) هەر کەس لەو ڕۆژە سامناکەدا لەو سزایە لادرێو بپارێزرێ ئەوە خودای میهرەبان ڕەحمی پێکردووە. ڕزگاربوون لەو سزایە سەرکەوتن و سەربەرزییەکی ئاشکرایە.

(١٧) ئەگەر خودای توانا تووشی بەڵاییێکی کردی وەك: نەخۆشی، هەژاری، جەرگ سوتان، زیانی ماڵ، کەس نیە بتوانێ دەرووت لێ بکاتەوەو ئەو بەڵایەت لە کۆڵ بکاتەوە خۆی نەبێ. ئەگەر خێریش بێنێتە ڕێگات و بتحەسێنێتەوە ئەوا دەستی بە سەر هەموو شتێکدا ئەڕوات وکەس ناتوانێ دەست بێنێتە بەر دەستی و مەنعی بکات.

(١٨) هەر خودا خۆی دەستی بەسەر بەندەکانیدا ئەڕوات و ئەتوانێ بە ئارەزووی خۆی لەگەڵیان بجوولێتەوە. خاوەن حیکمەتەو شارەزاو ئاگادارەو هیچی لێ ون نابێ.

قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ۚ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ ۚ قُل لَّآ أَشْهَدُ ۚ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُ ۘ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢١﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَيْنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ۚ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ ۖ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُ ۖ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾



(١٩) ئەی پێغەمبەر بەو کافرانە بڵێ کە باوەڕت پێناکەن: چ شایەتییەك گەورەترو زیاتر جێگەی بڕوایە بۆ ئیسپات کردنی ڕاستیی قسەکەم؟ هەر خۆیشت وەڵام بدەرەوەو بڵێ: گەورەترین شاهید لە بەینی من و ئێوەدا خودایە کە ئاگای لە هەموو شتە. ئەم قورئانە بە وەحی نێرراوە بۆ من تا ئێوەو هەرکەسێ خەبەری پێبگا پێ بترسێنم لە سزای ڕۆژی قیامەت. ئایا ئێوە ئەوەندە نەفامن شایەتی ئەدەن و ئەڵێن لەگەڵ خودادا چەند خودایەکی تر هەیە؟! بڵێ: من شایەتیی وەها نادەم، پێیان بڵێ: خودا هەر یەك خودایەو، من بەریم و دوورم و قایل نیم بەو شتانەی کە ئێوە ئەیانکەنە هاوبەشی خودا.

(٢٠) ئەوانەی کتێبمان پێداون پێغەمبەر ئەناسن بەو صیفاتانەی کە لە تەورات و ئینجیلدا نووسراون، وەك چۆن ئەولادی خۆیان ئەناسن و لێیان ون نابن. ئەوانە کە دوای ڕاستی ناکەون و ئەیشارنەوە خۆیان دۆڕاندووەو زیانیان لە خۆیان داوە، بۆیە ئیمان ناهێنن و ڕێگای کوفر بەرنادەن.

(٢١) کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بە دەم خوداوە هەڵبەستێ‌و بوختانی بۆ بکات، بۆ نموونە: بڵێ مەلائیکە کچی خودان، یا ئەوانە لای خودا تکامان بۆ ئەکەن؟ کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە باوەڕ بە قورئان و بە موعجیزەی نەکات و درۆ بداتە پاڵ پێغەمبەر؟ بێ‌گومان ستەمکاران سەرناکەون و لە غەزەبی خودا دەرباز نابن.

(٢٢) یادی ئەو ڕۆژە بکەرەوە کە هەموویان کۆئەکەینەوەو، لە پاشاندا بەوانە ئەڵێین کە هاوبەشیان بۆ خودا دانابوو: کوا ئەوانەی ئێوە بە عەقڵی ناتەواوتان بە هاوبەشی خوداتان حسێب ئەکردن و ئەتانپەرستن؟ کوان؟ بۆ فریاتان ناکەون؟

(٢٣) ئەنجامی کوفرەکەیان هیچ نەبوو ئەوە نەبێ کە پەنایان بردە بەر درۆو ئەیانوت بە خودا قەسەم ئێمە هاوڕێمان بۆ خودا دانەناوە.

(٢٤) سەیر بکە چۆن درۆ ئەکەن لەگەڵ خۆیان و ئەڵێن: لە دنیادا موشریك نەبووین؟ سەیر بکە چۆن ئەوانەیان ون کردوون کە لە دنیادا ئەیانکردنە هاوبەشی خودا؟ سەیر بکە چۆن سەریان لێ تێکچووە؟

(٢٥) ئەم ناموسوڵمانانە هی وایان هەیە دێنە لات و گوێ لە قورئانەکە ئەگرن، بەڵام دڵیان پەردەیێکی ئەستووری لەسەرەو تێی ناگەن، گوێیان قورسەو نایبیسن. ئەمانە ئەگەر هەرچی ئایەت و موعجیزە هەیە بیبینن ئیمانی پێناهێنن. بێ‌باوەڕییان گەیشتووەتە ڕادەیێك ئەگەر بێنە لات و موجادەلەت لەگەڵ بکەن و تۆ ڕاستییان بۆ باس بکەی، ئەو کافرانە ئەڵێن: ئەمەی تۆ ئەیخوێنیتەوە ئەفسانەو قسەی پڕوپووچی پێشینانەو جێگای بڕواو متمانە نی‌یە!

(٢٦) ئەم کافرانە ناهێڵن خەڵك دوای پێغەمبەر بکەون، هەروەها خۆیشیان لێی دوور ئەکەونەوەو پەیڕەویی ناکەن. ئەمانە کەس نافەوتێنن خۆیان نەبێ‌و، بە خۆیان نازانن کە چ ڕێگایێکی هەڵدێرو مل شکێنیان گرتووەتە بەر؟!

(٢٧) ئەگەر چاوت لێیان بوایە کاتێ لەسەر ئاگری دۆزەخ ڕائەگیرێن، چۆن پەنجەی پەشیمانی ئەگەزن و ئەدەن بە ئەژنۆی خۆیانداو ئەڵێن: ئاخ خۆزگا ئەگەڕاینەوە بۆ ژیانی دنیاو ئیتر ئینکاری ئایەتەکانی خودامان نەئەکردو ڕێگای ئیسلامەتیمان ئەگرتەبەر، بەڵام پاش چی؟!

بل بدا لهم ما كانوا يخفون من قبل ولو ردوا لعادوا لما نهوا عنه وإنهم لكاذبون ﴿٢٨﴾ وقالوا إن هي إلا حياتنا الدنيا وما نحن بمبعوثين ﴿٢٩﴾ ولو ترى إذ وقفوا على ربهم قال أليس هذا بالحق قالوا بلى وربنا قال فذوقوا العذاب بما كنتم تكفرون ﴿٣٠﴾ قد خسر الذين كذبوا بلقاء الله حتى إذا جاءتهم الساعة بغتة قالوا يا حسرتنا على ما فرطنا فيها وهم يحملون أوزارهم على ظهورهم ألا ساء ما يزرون ﴿٣١﴾ وما الحياة الدنيا إلا لعب ولهو وللدار الآخرة خير للذين يتقون أفلا تعقلون ﴿٣٢﴾ قد نعلم إنه ليحزنك الذي يقولون فإنهم لا يكذبونك ولكن الظالمين بآيات الله يجحدون ﴿٣٣﴾ ولقد كذبت رسل من قبلك فصبروا على ما كذبوا وأوذوا حتى أتاهم نصرنا ولا مبدل لكلمات الله ولقد جاءك من نبإ المرسلين ﴿٣٤﴾ وإن كان كبر عليك إعراضهم فإن استطعت أن تبتغي نفقا في الأرض أو سلما في السماء فتأتيهم بآية ولو شاء الله لجمعهم على الهدى فلا تكونن من الجاهلين ﴿٣٥﴾



(٢٨) نەخەیر! ڕاست ناکەن، ئەوە بۆیە وا ئەڵێن چونکە ئەنجامی بەدو تۆڵەی ئەو کوفرەیان بۆ دەرکەوتووە کە لە دنیادا ئەیانشاردەوە، ئێستە لە بێزاری و خەفەتباریدا وا دەڵێن. ئەگەر بیشگێڕرێنەوە بۆ دنیا جارێکی تر دەست ئەدەنەوە ئەو کارو کردەوە ناشیرینانە کە نەهییان لێ کرابوو، بەڕاستی ئەوانە درۆزنن.

(٢٩) ئەڵێن تەنها ژیانێکەو ئەویش ژیانی دنیایە، ئیتر ژیانی ئەو دنیا نی‌یەو، ئێمە هەرگیز زیندوو ناکرێینەوە!

(٣٠) ئەگەر چاوت لێبوایە کاتێ لە حوزووری خوادا ڕائەگیرێن و، خودا ئەفەرموێ: ها! ئا ئەم ڕۆژی زینووبوونەوەیە ڕاست نی‌یە؟ ئەمە چی‌یە کە ئێوە ئێستا کۆکراونەتەوەو ڕاگیراون؟ ئەوانیش ئەڵێن: قەسەم بە خودای پەروەردگارمان ڕاستەو گومانی تێدا نی‌یە. خودا ئەفەرموێ: دە کە واتە لە تۆڵەی کوفرەکەتاندا سزا بچێژن، خۆتان بە خۆتانتان کرد!

(٣١) ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەتو بەخوداگەیشتن نی‌یە زیانبارو ماڵ وێرانن. کە ڕۆژی قیامەت لەپڕ سەرودڵیان ئەگرێ ئەو کاتە پەشیمان ئەبنەوەو ئەڵێن: ئاخ چیمان بە خۆمان کرد؟ بۆ ئینکاری زیندووبوونەوەمان کرد؟ ئەمە ئەڵێن و باری گرانی کوفریان بە کوڵ هەڵگرتووە! ئای کە ناشیرین و بەدئەنجامە ئەوەی هەڵیانگرتووەو بەکۆڵیانەوەیە! (٣٢) ژیانی دنیا لە ئارەزووبازیو یاری‌کردن و شتی بێهوودە بەولاوە نی‌یە. ڕۆژی دوایی، واتە پاداش و خۆشیی ڕۆژی قیامەت، زۆر چاکترە بۆ ئەوانەی لە خودا ئەترسن و خۆیان لە گوناه و کاری نالەبار ئەپارێزن، ئەوە بۆچی فام و هۆشتان ناخەنە کارو بیرناکەنەوە؟

(٣٣) زۆر چاك ئەزانین ئەو قسانەی کافرەکان لە ڕووی تۆدا ئەیانکەن دڵت عاجز ئەکەن و خەفەتیان پێ‌ئەخۆی، کە بڕواناکەن بە وتارەکانت و ئیمانیان پێ‌ناهێنن. لە ڕاستیدا ئەوانە تۆ ناخەنەوە بە درۆوە، بەڵکو ئەو ستەمکارانە قسەی خودا بەدرۆ دەخەنەوەو ئینکاری ئایەت و دەستەڵاتی خودا ئەکەن.

(٣٤) بەڕاستی گەلێ لە پێغەمبەرانی پێش تۆ بەدرۆخرانەوەو عەنادیان لەگەڵ کرا، ئەوانیش خۆگر بوون و، ئەو هەمووە ئازارو سەرپێچییەی کافرانیان تەحەممول کرد، تا لەلایەن ئێمەوە یارمەتییان پێ‌گەیشت. ئەوەی خودا بڕیاری داوە کەس ناتوانێ بیگۆڕێ، خودا بەڵێنی داوە بە سەرخستن و یارمەتیدانی پێغەمبەرەکانی. خۆ تۆ دەنگوباس و سەرگوزەشتەی پێغەمبەرانت پێ‌گەیشتووەو ناشارەزا نیت.

(٣٥) ئەگەر لەسەر دڵت زۆر گرانە ئەوانە ڕووت لێ وەرئەگێڕن و باوەڕ بە قسەکانت ناکەن، دە بڕۆ. ئەگەر ئەتوانی ڕێگایەك، کونێك لە زەویدا بدۆزەرەوەو بڕۆرە ناخیەوەو ئایەتێکیان بۆ سەربخە، یا پەیژەیەك پەیدا بکەو پیایدا سەرکەوە بۆ ئاسمان و لەوێوە ئایەتێ بێنە خوار بۆیان تا ئیمان بهێنن! خۆت بۆ ئەمانە نارەحەت مەکە، خودا ئەگەر بیویستایە هەموویانی لەسەر ڕێگای ڕاست و ڕەوان کۆئەکردەوە. کەواتە لەوانە مەبە کە لەباتی خۆگری خەفەت ئەخۆن و، سوور ئەبن لەسەر شتێ کە نابێ، ئەمە کاری نەزانانە، تۆ لە نەزانان مەبە.

إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَٰبِ مِن شَىْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ ۗ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾



(٣٦) ئەوانــــە وەڵامــــت ئەدەنــــەوەو بەدەنگتەوە دێـن کـە بەڕاسـتی ئەبیسـن و بیرئەکەنــەوە. ئەمانــە وەك مــردوو وان نابیســـن. مردووەکـان خـودا زینـدوویان ئەکاتــەوەو، لــەو کاتــەدا تێئەگـەن کـە مەســەلە چی‌یە؟ بــەڵام تێگەیشـتن لـەو ڕۆژەدا سـوودی نی‌یـەو فریایـان ناکـەوێ‌و، تۆڵەیان لێ ئەکرێتەوە.

(٣٧) کافرەکـان، چـونکە سـوورن لەسـەر کـوفرو سەرپێچـی، ئـەڵێن: ئـەوە بۆچـی بێجگە لەم ئایەتانە ئایەتی تـری بـۆ نایـێ لە لای خوداوە؟ بڵێ: خودا ئەتوانێ ئایەتی تر نازڵ بکات، بەڵام زۆرتری ئـەم کافرانـە ئـەوە نـازانن کـە خـودا توانایـەو ئەگـەر ئایەتی تر نازڵ بکات ئەبێتـە هـۆی بـەڵاو ماڵوێرانی بۆ ئەوان.

(٣٨) هەرچـــی گیانلەبـــەری زەوییـــەو، هەرچی باڵندەیێ هەیە کە بـە بـاڵ بفـڕێ، هەموو چـەند کۆمـەڵێکن دروسـت کـراوی خـودان، وەك ئێـوە ئـەخۆن و ئەخۆنـەوەو ئەژین و ئەمرن و، هەموو شتێکتان کـاتی تایبەتی و دیاری کراوی خۆی هەیە. خـودا ئاگای لە هەموویانەو توانی فراوانە. ئێمە هیچ شتێکمان لـە (لـوح المحفـوظ)دا تـەرك نـەکردووەو، هــەموو شــتمان تێــدا هـەڵگرتووە. هـەموو ئەمانـە لـە دواڕۆژدا لای خودا کۆئەکرێنـەوەو، هەرچی حـەقی حەقداره لە ستەمکارو زۆردار دەسەنرێتەوە، تەنانەت تۆڵەی حەیوانی بێ‌شاخ لە شاخدار ئەکرێتەوە.

(٣٩) ئەو کەسانەی ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ ئەزانن و باوەڕیان پێ‌ناکەن ئەوانە کەڕو لاڵن نە قسەی حـەق ئەبیسـن و نە قسەیێکی ڕاست بە دەمیاندا دێت، نوقمی تاریکیی بێ‌بنن. ئەمەیش شتێکی سـەیر نی‌یـە. ئـەوەی خـودا بیـەوێ سـەری لێ بشێوێنێ گومڕای ئەکات‌و ڕێی پێ‌هەڵە ئەکات. ئەوەیش بیـەوێ بەختـەوەری بکـات ئەیخاتـە سـەر ڕێگـای ڕاست و ڕەوان. (٤٠) تۆ ئەی پێغەمبەر! بە کافرەکان بڵێ: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن و ئـەو بتانـە خوداو فریاڕەسن، وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەنەوە: ئەگەر سزاو ئازار لە لایەن خوداوە هات بۆتان، یا ئەگەر ڕۆژی سامناکی قیامەت هات بەسەرتانداو دامان، هاوار لە غەیری خودا ئەکەن؟ پەنا بۆ یەکێکی تر ئەبەن؟ نەخێر، لـەو کاتانـەدا هـەر لـە خودای توانا ئەپاڕێنەوە، واتە زۆر باش ئەزانن کە خودای تر نی‌یە بەڵام سەرپێچی ئەکەن!

(٤١) نەخێر، هەر لە خودا هاوار ئەکەن، پەنا هەر بۆ خودا ئەبەن. جا ئەگەر بیەوێ ئەو عەزابەتان لێ ئەڕەوێنێتەوە. لەو کاتی داماوی‌و گیرخواردنەدا ئەوانەتان لە بیر ئەچنەوە کە کردبووتاننە هاوبەشی خودا!

(٤٢) بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بۆ ئوممەتانی پێش تـۆو ئیمانیـان نـەهێناو بـە کـافری مانـەوە، لەبـەر ئـەوە غەزەبمان لێ‌گرتن و تووشی ناخۆشی و هەژاری و ئاژاوەمان کردن بەڵکو بگەڕێنەوە سەر ڕێی ڕاست و ڕوویکەنە خوداو لێی بپاڕێنەوە.

(٤٣) ئەوە بۆچی کە لەلایەن ئێمەوە تووشی نارەحەتی و مەینەت بوون نەپاڕانەوەو نەگەڕانەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست، بەڵکو دڵیان ڕەقترو ڕەشتر بوو و شەیتان کردەوە ناشیرینەکانیانی لە بەرچاو جوان کردن و لەخشتەی بردن؟!

(٤٤) جا کە ئەو نارەحەتی و ناخۆشیەیان لەبیرچووەوە، هەر بۆ تاقی‌کردنەوە دەرگای هەموو خێـرو خۆشـییەکمان لێ کردنەوەو کەوتنە ئیسراحەت و، گەیشتنە ڕادەیەك کە زۆر دڵخۆش و شادمان بوون بەو نازو نیعمەتـە، کەچـی غـروور گرتنی‌و ڕوویان نەکردە خودا، ئیتر لەپڕ گرتمـانن و تووشـی بـەڵامان کـردن، ئەوسـا پەنجـەی پەشـیمانییان ئەگەست و خەفەتیان ئەخوارد.

فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾
قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم
مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ
ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ
بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا
نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ
فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا
يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ
عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ۖ
إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ
أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓا۟
إِلَىٰ رَبِّهِمْ ۙ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ
﴿٥١﴾ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ
وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ
عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾



(٤٥) لە ئەنجامی ستەم و کوفردا ئەو ستەمکارانە لەناوبران و کەسیان نەمان. ستایش بۆ پەروەردگاری هەموو عالەم.
(٤٦) تۆ ئەی پێغەمبەر! بەو کافرانە بڵێ: ئەگەر خودا کەڕو کوێری کردن و نەتانتوانی ببیسن و، دەرگای دڵی داخستن و، هێزی هەست و هۆشی لێ سەندنەوە، کێیە بێجگە خودا بتوانێ ئەو هێزەو ئەو توانەتان بداتێ؟ سەیرکە چۆن ئێمە بە هەموو جۆر ئایەتەکانیان بە بەڵگەی عەقڵی بۆ ڕوون ئەکەینەوە، بەوەی خۆیان بە چاو ئەیبینن و، بەوەی لە خەڵکەوەو دەربارەی خەڵك بیسراوە، کەچی ئەوان هەر سەرپێچی ئەکەن و سوورن لەسەر بێباوەڕی خۆیان؟!
(٤٧) بڵێ پێیان: ئەگەر لە پڕو بێ ئەوەی پێ‌بزانن غەزەبی خودا ڕووی تێ‌کردن، یا نیشانەکانی ئەو غەزەبە دیار بوون و ئەتانزانی کە بەو زووانە ئەو غەزەبەتان بەسەردا ئەبارێ، کێ ئەفەوتێ بەجۆرێ لە ڕەحمەتی خودا بێبەش ببێ، بێجگە لە ستەمکاران؟!
(٤٨) ئێمە پێغەمبەران تەنها بۆ ئەوە ڕەوانە ئەکەین کە موژدە بەوانە بدەن ڕوو لە خودا ئەکەن و، ئەوانە بترسێنن کە سەرپێچی ئەکەن و ڕێگای چەوت ئەگرن، بۆ ئەوەمان نەناردوون بە خەڵقەوە خەریك بن. جا هەر کەس ئیمانی هێناو چاکەکەر بوو، ئەوانە ترسی هیچیان نی‌یەو لە ڕۆژی قیامەتدا غەمی هیچیان نابێ.
(٤٩) ئەو کەسانەیش ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ ئەخەنەوە، باوەڕیان پێ‌ناکەن، بەهۆی ئەو کوفرو بێباوەڕییەوە سزای ئێمەیان پێ ئەگات و تۆڵەیان لێ ئەکرێتەوە.
(٥٠) ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: من پێتان ناڵێم خەزێنەکانی خودا لەبەردەستمدان، من پێتان ناڵێم کارە غەیبییەکان ئەزانم، کە خودا نەبێ کەس نایانزانێ! من پێتان ناڵێم فریشتەم و لەو خەڵکە جیاوازم و نادەمزاد نیم! نەخێر، ئیددیعای ئەمانە هیچیان ناکەم. من تەنها پەیڕەویی ئەوە ئەکەم کە بە وەحی بۆم ئەنێررێ. پێیان بڵێ: بۆ بیر ناکەنەوەو نەختێ مێشکتان ناخەنە کار؟ هەرگیز ئەچێتە عەقڵەوە کوێرو بینا، ڕێگایڕاستگرو لەڕێیڕاست لادەر وەك یەك بن؟! (٥١) بەم وەحیە کە بۆت ئەنێرێت ئەوانە بترسێنە کە تاوانیان کردووەو لەوە ئەترسن لە بەردەم خودادا حەشر بکرێن و سزابدرێن، کە لەو ڕۆژەدا نە دۆستێکیان هەیەو نە تکاکارێ. بیانترسێنە بەڵکو لە خودا بترسن و خۆیان لە گوناه بپارێزن؟!
(٥٢) ئەی پێغەمبەری خودا ! لەبەر خاتری دڵی کافرەکان ئەو موسوڵمانە هەژارانە دەرمەکە کە بەیانیو ئێوارە لە خودای خۆیان ئەپاڕێنەوەو مەبەستیان ڕەزامەندیی خودایە. حیسابی ئەوانە لەسەر تۆ نی‌یەو، حەقت نی‌یە بەسەر دڵو دەروون و باری ژیان و کۆمەڵایەتییانەوە، هەروەك حیسابی تۆیش لەسەر ئەوان نی‌یەو حەقیان بەسەرتەوە نی‌یە. نەکەی ئەو موسوڵمانانە دەرکەیت و بەوە بچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە.

وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٥٥﴾ قُلْ إِنِّى نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلْ إِنِّى عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَكَذَّبْتُم بِهِۦ ۚ مَا عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٨﴾ ۞ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾



(٥٣) هەروەها بەهۆی هەندێکیانەوە هەندێکیان تاقی ئەکەینەوەو تووشی بەڵاو غەزەبی خودا ئەبن. ئێمە ئیمان ئەدەین بە هەژاران و بێدەستەڵاتان، کەچی کافرە دەوڵەمەندەکان ئەڵێن : ئا ئەم هەژارە بێجێگاو ڕێگایانەن خودا لە ناو ئێمەدا هەڵیبژاردوون و نیعمەتی ئیسلامی پێداون؟! ئەو کافرانە ئەزان و ئەفامن. خودا لە هەموو کەس چاکتر بەندەی شوکرانەبژێری خۆی ئەناسێ‌و، چاکتر ئەزانێ کێ شایانی پلەو پایەیەو، کێ بێئایین و ناشوکورەو شایانی سەرشۆڕییە.

(٥٤) ئا ئەو جۆرە کەسانە کە ئیمانیان هێناوەو، بەیانی‌و ئێوارە ڕوو لە خودان و لێی ئەپاڕێنەوە ئەگەر هاتنە لات گوێیان لێ بگرەو موژدەی خۆشیان بدەرێ‌و پێیان بلێ : سلاوی خوداتان لەسەر بێ، خودا بڕیاری داوە بەزەیی‌و میهرەبانیتان لەگەڵدا بەکاربێنێ، خودا بڕیاری داوە هەرکام لە ئێوە بە نەزانی کارێکی خراپی کردو لەپاشاندا پەشیمان بوویەوەو عەزمی جەزم کرد لەسەر ئەوە کە نەگەڕێتەوە بۆ ئەو کارە، لە گوناهی خۆش ببێ‌و بیخاتە ژێر باڵی ڕەحمەتی خۆیەوە.

(٥٥) ئا بەم شێوە ئاشکرایە ئایەت و حوکمەکانت بۆ ڕوون ئەکەینەوە، تا چاك و خراپت لە یەك بۆ جیا بکەینەوەو، بۆت دەرکەوێ کافرەکان چەند هەڵئەگرن و چەندیان لەباردایەو، چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەیت؟

(٥٦) پێیان بلێ : من بەهۆی ئەو هەمووە دەلیلە ئاشکرایانەوە کە ئەیانبینم نەهی ئەوەم لێ کراوە ئەوانە بپەرستم کە ئێوە لە باتی خودا ئەیانپەرستن یا کردووتانن‌ە هاوبەشی خودا. بلێ : من دوای ئارەزووی ئێوە ناکەوم. ئەگەر شتی وەها بکەم منیش وەك ئێوە گومڕا ئەبم و، لە زومرەی ئەوانە نابم کە خودا هیدایەتی داون و ڕێگەی ڕاستیان گرتووەتەبەر.

(٥٧) من بەهۆی ئەو دەلیلە ئاشکرایانەوە دڵنیام و باوەڕی تەواوم هەیە کە خودا تاك و تەنیایەو هاوبەشی نی‌یە. بەڵام ئێوە ئیمانتان پێی نی‌یەو هاوبەشی بۆ دائەنێن. ئەو سزایەی ئێوە بە پەلە داوای ئەکەن بە دەستی من نی‌یە، من ناتوانم بەردبارانتان بکەم یا زیانتان لێ بدەم، ئەمە بە دەستی خودایەو حوکم حوکمی ئەوە، ئەگەر ئیستە سزاتان بدات یا دوای بخات. خودا حەقتان بۆ ئەگێڕێتەوە. خودا چاکترین خاوەن حوکمەو لە هەموو کەس چاکتر شت ئەبڕێتەوە.

(٥٨) ئەگەر ئەو سزایەی بە پەلەن بۆی بە دەستی من بوایەو لە توانی مندا بوایە گورج لە پێناوی ڕەزای خودادا ئەمفەوتاندن و کار ئەبڕایەوە لە بەینی من و ئێوەدا، بەڵام خودا خۆی چاکتر ئەزانێ کێ ستەمکارەو کەی تۆڵەی لێ ئەسەنرێتەوە.

(٥٩) کلیلی شتە نهێنی‌یەکان لای خودایە، ئەو نەبێ کەس نایانزانێ. خودا هەرچی لە وشکانی‌و لە دەریادایە پێی ئەزانێ. گەڵایەك ناکەوێتە خوار ئەو پێی نەزانێ. هەرچی دانەوێڵە لە ناخی تاریکی توێی زەویدایە، هەرچی تەڕەو هەرچی وشکە هەمووی لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوەو دیاری کراوە.

وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ
يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ
ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ
وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ
رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ
أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن
ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ
لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ
ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا
مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم
بَأْسَ بَعْضٍ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾
وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ
نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِىٓ
ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ
ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾



پەنهانیو بەئاشکرا ئەپاڕێنەوەو ئەڵێن: ئەگەر خودا لەم گێژداوە
و بێ‌گوێیی ناکەین!
ناخۆشییەو لە هەموو جۆرە ناخۆشییەکی‌تر، بەڵام پاش ئەوە ئێوە
ردا دائەنێن و شوکرانەبژێر نابن!
نەوە سزاتان بنێرێتە سەر وەك سزاکانی قەومی نووح و لووط، یا لە
ەون و کۆمەڵەکەیو، وەك ڕۆچوونی زەویو تەقینەوەی کانەکانی.
مەڵ کۆمەڵو بچن بەگژیەکدا خۆتان ببڕنەوە. بڕوانە چۆن بە هەموو
ەینەوە بەلکو تێ‌بگەن و چاو بکەنەوەو ڕێگای ڕاست بگرنەبەر.
نکاری قورئان ئەکەن، کە ڕاستەو لە لای خوداوەیە، تۆ پێیان بڵێ:
تەنها ئەوەندەم لەسەرە ئاگادارتان بکەم و ڕێگای ڕاست و لارتان بۆ

کی دیاری‌کراوی هەیەو، دوایی کە هات ڕاستیتان بۆ دەرئەکەوێ.
نکار کردنی قورئاندا ڕوویان لێ وەرچەرخێنەو مەچۆرە ناویان تا
ئەگەر جارێ شەیتان ئەم ئامۆژگارییەی لەبیربردیتەوەو چوویتە ناویان
ەڵی ستەمکاران دامەنیشە

وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟ ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾ قُلْ أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ ۚ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٧٣﴾



(٦٩) بەڵام ئەو موسوڵمانانەی ئەترسن لەوەی تووشی گوناھ ببن لە تێکەڵی‌کردن لەگەڵ ئەو کافرانەدا، ھیچ گوناھێکیان ناگات لە تێکەڵیبیان، ئەگەر لە قسەکانیان ڕازی نەبن. تەنھا ئەوەندەیە ھەموو جار بیخەنەوە بیریان کە ئەو ئینکارکردن و قسەوتنەیان خراپە، بەڵکو بچێ بەگوێیانداو بگەڕێنەوەو خۆیان لەو گوناھە گەورەیە بپارێزن.

(٧٠) گوێ مەدەرە ئەوانەی دینەکەیان کردووەتە گاڵتەو ئارەزووبازیو، بە پێی حەزو ئارەزووی نەفسیان حەڵاڵو حەرام دائەنێن و بت ئەپەرستن. ئەوانەی ژیانی دنیاو ڕابواردنی مەغرووری کردوون و قیامەتی لەبیر بردوونەتەوە، بەم قورئانە ئاگاداریان بکەرەوە نەبادا بەھۆی کوفرو کردەوەی خراپیانەوە بەھیلاك بچن و، لە ڕۆژێکدا گیربخۆن کە بێجگە خودا کەس نی‌یە یارمەتییان بدات و تکایان بۆ بکات. لەو ڕۆژەدا ئەگەر ھەرچی فیدیەو سامانی دنیا ھەیە بیدەن لەپێناوی ڕزگار بوونیاندا لێیان وەرناگیرێو فریایان ناکەوێ. ئەوانە بەھۆی کردەوەی ناڕەوای خۆیانەوە ئەفەوتێن و تووشی سزا ئەبن. ئاوی کوڵ بەکوڵی دۆزەخ ئەنۆشن و بە ئاگرە تیژە ئازاردەرەکەی سزای توند ئەدرێن، چونکە لە دنیادا کافر بوون.

(٧١) تۆ ئەی پێغەمبەر! بڵێ: ئایا ڕەوایە بێجگە خودا بانگ لە شتێ بکەین و لێی بپاڕێینەوەو عیبادەتی بۆ بکەین کە نە توانێ ئەوەی ھەبێ سوودمان پێ بگەیێنێ و نە توانێ ئەوەی ھەبێ زیانمان لێ بدات؟ ئایا ڕەوایە پاشەوپاش بگەڕێینەوە بۆ کوفرو بێ‌دینی، پاش ئەوەی کە خودا لوتفی لەگەڵ کردین و شارەزای ڕێی ڕاستی ئیسلامی کردین؟! ئایا ڕەوایە وەکو ئەوانەمان لێ بێ کە شەیتان لە خشتەی بردوون و بە سەر زەویدا سەرگەردان و بێ ئامانج ئەسووڕێنەوە، کە چەند برادەرێکی باشیشیان ھەبێ بانگیان بکەن بۆ لای خۆیان، بۆ سەر ڕێگای ڕاست و ڕەوان ؟! ئەی پێغەمبەر ! تۆ بڵێ : شارەزایی ئەوەیە لە لایەن خوداوە بێو، ئێمە فەرمانمان پێ دراوە ڕووبکەینە پەروەردگاری ھەموو عالەم و ملکەچی بین.

(٧٢) فەرمانمان پێ دراوە : نوێژ بکەن و بە دڵ ڕوو لە خودا بکەن. لە خودای پەروەردگار بترسن و لە گوناھ دوور بکەونەوە ھەر بۆ لای خودا ئەگەڕێنەوەو لای ئەو کۆئەکرێنەوەو موحاسەبە ئەکرێن.

(٧٣) ھەر ئەو خودایە کە بە ڕاستی و حیکمەت ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە. ڕۆژێ کە بڵێ بە شتێ ببە ئەبێو دواناکەوێو قسەی ئەو ڕاستەو دێتە جێ. لەو ڕۆژەیشدا کە فوو دەکرێ بە شاخداو قیامەت بەرپا دەبێ، دەسەڵات و داراییو ھەرچی ھەیە ھی ئەوەو کەس خاوەنی ھیچ نی‌یە. ھەرچی نهێنی و ئاشکرایە ھەمووی ئەزانێو ھیچی لێ ون نابێ، ھەر ئەو کارەکانی پڕ حیکمەتن، ھەر ئەو لە ھەموو شت ئاگادارە.

۞ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَـٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْـَٔافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَـٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَـٰذَا رَبِّى هَـٰذَآ أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَـٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ ۚ قَالَ أَتُحَـٰٓجُّوٓنِّى فِى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ ۚ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّى شَيْـًٔا ۗ وَسِعَ رَبِّى كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا ۚ فَأَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾



(٧٤) ئەوەیان بۆ باس بکە کە چۆن وەختی خۆی ئیبراهیم بە ئازەری باوکی وت: ئەوە بۆچی ئەو بتانە ئەپەرستیو بە خودایان حیساب ئەکەی؟! کاری وەها کەی ڕەوایە؟ بە ڕاستی من وا ئەزانم و دڵنیام کە تۆیش و قەومەکەیشت ڕێگاتان لێ تێکچووەو لە گومڕاهییەکی ئاشکرادان.

(٧٥) ئا وەها دەلیلی خودایەتیی خوداو پەروەردگاریی ئەو بە ئیبراهیم پیشان ئەدەین، کە خودا خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، تا بەتەواوی یەقین پەیدا بکات بەوەی باوەڕی پێیەتیو خەڵکی بۆ بانگ ئەکات، چونکە ئینسان تا باوەڕو یەقینی بە شتێ نەبێ ناتوانێ خەڵکی بۆ بانگ بکات.

(٧٦) کە باوکی بەجێهێشت و ئەفرەتی لە بتەکانی ئەکردو بەدوای ڕاستیدا ئەگەڕاو شەوی بەسەردا هات، ئەستێرەیێکی گەشی جوانی دی، وتی: ئەمەیە پەروەردگاری من، بەرزەو دەس پێنەگەییوەو، ڕووناك و ورشەدارە! کە ئەستێرەکە ئاوا بوو و شوێنەواری نەما وتی: من شتی ئاوابووم خۆش ناوێ، شتێکم خۆش ئەوێ هەمیشەیی بێ.

(٧٧) جا کە مانگی دی هەڵهات و ڕووناکی پەخش کردەوە وتی: ئەمەیە خودای من و پەروەردگاری من. کە ئەمیش ئاوا بوو وتی: ئەمە چییە؟ بەڕاستی ئەگەر خودا ئەمخاتە سەر ڕێگای ڕاست و بەرچاوم ڕوون نەکاتەوە ئەچمە ڕیزی گومڕاهانەوە.

(٧٨) ئەمجارە کە خۆری پڕتەوداری دی هەڵهات و جیهانی پڕکرد لە تین و ڕووناکی، وتی: ئا ئەمەیە خودای من ئەمە لەوانی تر گەورەترە. کە ئەمیشی دی ئاوا بوو و، لەبەرچاو ون بوو، وتی: ئەی خێڵەکەم! من دوورم لەو شتانەی کە ئێوە کردووتانن بە هاوبەشی خودا.

(٧٩) بێگومان وا من ڕووم کردە ئەو پەروەردگارە بێ وێنەیە کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووەو، لە نەبوونەوە هێناونیەتە بوون. من لەوانە نیم هاوبەش بۆ خودا دائەنێن، خودا تاك و تەنیایە.

(٨٠) قەومەکەی دەستیان کرد بە موجادەلەو ئینکاری یەگانەیی خودایان ئەکرد. ئەویش وتی: بۆ موجادەلەم لەگەڵ ئەکەن دەربارەی وەحدانییەتی خودا، کە خودا ڕێگای ڕاستی پیشان داوم؟! من تەنها ئەو ئەپەرستم و هاوبەشی بۆ دانانێم. من لەوانە ناترسم کە ئێوە کردووتانن بە هاوبەشی خودا، مەگەر خودا خۆی بیەوێ تووشی زیانێکم بکات، ئەوان ناتوانن قازانج بە خۆیان بگەیێنن یا زیان لە خۆیان لادەن. خودا ئاگای لە هەموو شتەو بە هەموو شت ئەزانێ. ئێوە بۆ بیر ناکەنەوەو هۆش و فام ناخەنە کار؟!

(٨١) من چۆن لەو شتانە ئەترسم کە ئێوە کردووتاننە هاوبەشی خودا، کەچی ئێوە لەوە ناترسن کە شتی واتان کردووەتە هاوبەشی خودا کە هیچ بەڵگەو دەلیلێکی بۆ نەناردوون لەسەر ڕاستی کردەوەکەتان و، خۆتان لەخۆتانەوە ئەم هاوبەشانەتان داناوە، ئەگەر ئێوە ژیرو زانان بیربکەنەوە کام لەم دوو تاقمە شایانی ئەوەیە نەترسێ، ئەوە کە تەنها خودای تاك و تەنیای بێ وێنە ئەپەرستێ، یا ئەوە کە دارو بەردی خۆدروستکردوو ئەپەرستێ

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿٨٣﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ كُلًّا هَدَيۡنَاۚ وَنُوحًا هَدَيۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحۡيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلۡيَاسَۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطٗاۚ وَكُلّٗا فَضَّلۡنَا عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ وَإِخۡوَٰنِهِمۡۖ وَٱجۡتَبَيۡنَٰهُمۡ وَهَدَيۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ وَلَوۡ أَشۡرَكُواْ لَحَبِطَ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾



(٨٢) ئەوانەی باوەڕیان بە خودایەتی خودا هەیەو، باوەڕیان نەکردووە بە هاوبەش دانان بۆ خودا، ئەوانە بێ‌ترس ئەبن لە سزای ڕۆژی قیامەت و، ئەوانەن خودا هیدایەتی داون و ڕێگای ڕاستیان گرتووەتەبەر.

(٨٣) ئەم موجادەلەکردنی ئیبراهیمە لەگەڵ باوکی‌و لەگەڵ کافران و بت پەرستان‌و بیرکردنەوەی لە ئاسمان‌و زەوی‌و ئەستێرەو مانگ‌و خۆرو خودای پەروەردگاریان، دەلیل‌و بەڵگە بوون دامانن بە ئیبراهیم بۆ تێگەیاندنی قەومەکەی‌و بەزاندنیان. ئێمە بۆ هەر کەسێ بمانەوێ بە چەندین پایەو پلە بەرزی ئەکەینەوەو ئەیکەینە ڕابەر. خودای پەروەردگارت کارەکانی پڕ لە حیکمەتن و، زانایەو ئاگاداری هەموو شتە.

(٨٤) ئیسحاقمان بەخشی بە ئیبراهیم و، یەعقووبیش بە ئیسحاق و، هەردوکیانمان هیدایەت دان و کردمانن بە پێغەمبەر. لەپێش ئیبراهیم و نەوەکانیشیەوە نووحمان خستە سەر ڕێگای ڕاست و کردمان بە پێغەمبەر. لە نەوەی ئیبراهیمیش داوودو سولەیمان و ئەیووب و یووسف و مووساو هاروونمان هیدایەت دان و، کردمانن بە پێغەمبەر. ئاوەها پاداشی چاکەکەران ئەدەینەوەو، بەرەکەت ئەخەینە خۆیان و نەوەیان و سەربەرزی دین و دنیایان ئەکەین.

(٨٥) هەروەها زەکەریاو یەحیاو عیساو ئیلیاسیشمان ناردن و هەڵمانبژاردن و بوون بە پێغەمبەر. ئەمانە پیاو چاك و کرداریاش بوون و بە هەموو جۆر لەخودا ترس بوون.

(٨٦) هەروەها ئیسماعیل و ئەلیەسەع و یوونس و لووطیشمان هیدایەت دان و کردمانن بە ڕابەرو، هەموو دەرەجەی زیادەمان پێ‌دان، لە خەڵق زیاتر، چونکە پایەی پێغەمبەریمان پێ‌دان.

(٨٧) هەندێ لە باوك و باپیری ئەمانەو لە نەوەو بەرەیان و لە براکانیانمان هیدایەت داو هەڵمانبژاردن و ڕێگای ڕاست و ڕەوامان پیشان دان. (٨٨) ئەمە هیدایەتی خودابییە بۆ هەرکام لە بەندەکانی کە ئیرادەی بوو بەوە هیدایەتی ئەداو لوتفی لەگەڵ ئەکات. ئەم پێغەمبەرو پیاوچاکانە لەگەڵ ئەو پایەو پلەیشدا کە هەیانبوو ئەگەر هاوبەشیان بۆ خودا بڕیار بدایە هەرچی کردەوەیێکی چاکە کە کردبوویان هەمووی بەفیڕۆ ئەچوو و، ئەوانیش وەك کافرەکان ماڵوێران ئەبوون. (٨٩) ئەوانەی باسمان کردن ئەوانەن کە کتێب و حیکمەت و پایەی پێغەمبەریمان پێ‌بەخشین. جا ئەگەر ئەم کافرانە باوەڕ بەم سێ شتە نەکەن ئەوا ئێمە خەڵکی ترمان بۆ ڕەخساندووە کە باوەڕیان پێیان هەیەو دیفاعیان لێ ئەکەن وەك پێغەمبەرەکان خۆیان و وەك پێڕەوەکانیان و فریشتەکان. ئیتر کافرەکان کە نایێنە سەر ڕێگەی ڕاست خۆیان زەرەر ئەکەن. (٩٠) ئەوانەن کە خودا هیدایەتی داون، دوای ئەوانە بکەوەو پەیڕەوی ئەوانە بکە، واتە: لە بناخەی ئاییندا، وەك خودابەیەك زانین و باوەڕکردن بە پێغەمبەران و، بە زیندووبوونەوە بە ڕۆژی قیامەت و باوەڕکردن بە قەزاو قەدەرو بە مەلائیکە. تۆ ئەی پێغەمبەر! بەو خەڵکە بڵێ: بەرامبەر بەم ئامۆژگاری‌و ڕێ‌پیشاندانە داوای هیچتان لێ ناکەم، بە خۆڕایی ڕێ‌بەدێیتان ئەکەم. ئەم قورئانەو ئەم ئامۆژگارییانە تەنها بیرخستنەوەییێکن بۆ خەڵك نەبادا لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن کەس پێی نەوتین.

وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًاۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْۖ قُلِ ٱللَّهُۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَاۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْأٓخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُاْۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾



(٩١) ئەو جوولەکانە کە ئەڵێن خودا هیچ کتێبێکی بۆ بنیادەم نەناردووە خودایان نەناسیوەو، نازانن خودا چەند میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانی خۆیو، هەرکەسی بوێ بەرزی ئەکاتەوەو، هەر کەسی بوێ ئەیکاتە پێغەمبەرو کتێبی بۆ ئەنێرێ. ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەی کێ ئەو تەوراتەی نارد کە مووسا هێنایو بە خەڵکی ڕاگەیاند، کە ڕووناکیو هیدایەت بوو بۆ بنیادەم، کە ئێوە، ئەی عالمە بێ عەمەلەکان! بە ئارەزووی خۆتان پارچە پارچەی ئەکەن و ئەوی بەدڵتان بێ دەریئەخەن و زۆریشی ئەشارنەوە کە قازانجی خۆتانی تێدا نییە؟! وا ئێستەیش بەهۆی قورئانی پیرۆزەوە، بێجگە ئەوەی لە تەوراتدا هەیە شتی وا فێرکران نە خۆتان و نە باوباپیرتان نەتانزانیبوو. ئەی پێغەمبەر! بۆیان دووپات بکەرەوە بڵێ: خودا ناردوویەتیو بێجگە ئەو کەس کتێب نانێرێ بۆ پێغەمبەران. ئەمەیان پێ بڵێ و ئیتر وازیان لێ بێنە با لە گومڕاهی خۆیاندا بگەوزێن و بە ئارەزووی نەفسی بەدخوایان بجوولێنەوە، تۆ تەنیا ڕاگەیاندنت لەسەرە، ئەوی تری حەواڵەی خودایە.

(٩٢) ئەم قورئانەیش کە ناردوومەتە خوار بۆت کتێبێکی پیرۆزەو باوەڕی بەو کتێبانە هەیە کە لە پێش خۆیەوە هاتوونەتە خوار بۆ پێغەمبەران، بۆیە ناردوومانە تا ئەهلی مەککەی پێ بترسێنی لە عەزابی خودا. ئەو مەککەی کە دایکانەی دێهاتەکانەو هەموو دێن بۆ زیارەتی ماڵی خودا لەوێ. هەروەها ئەوانەیش بترسێنی کە لە دەوراندەوری مەککە دانەنیشن. ئەوانەی کە ئیمانیان هەیە بە ڕۆژی دوایی باوەڕیان هەیە بەو قورئانەو هەمیشە ئاگاداری نوێژەکانیانن و نایانفەوتێنن.

(٩٣) کێ ستەمکارترە لەو کەسەی درۆ بەدەم خوداوە هەڵبەستێو بڵێ: من پێغەمبەرم، وەك موسەیلەمەی کەززاب، یا حوکمێ بە دەم خوداوە هەڵبەستێ، یا بڵێ: لەلایەن خوداوە وەحیم بۆ نێرراوەو، هیچ وەحییشی بۆ نەنێررابێ! یا بڵێ: منیش ئەتوانم ئایەتو قسەی وەك ئایەتو قسەی خودا بڵێم؟! خۆزگا ئەو ستەمکارانەت ئەدی لەکاتی غەرغەرەی سەرەمەرگدا، کە قورسایی مەرگ سەرو دڵیان ئەگرێتو، مەلائیکە گیانکێشەکانیش دەستیان ڕائەکێشنو بە زۆرو ئازار گیانیان دەرئەکێشنو پێیان ئەڵێن: دە گیانەکەتان دەرکەن و بماندەنێ! ئەمڕۆ تۆڵەتان لێ ئەسەنرێتەوەو سزاو سووکیو بێنرخیتان ئەکرێ بە قورگا، چونکە لە کاتی زیندوویییدا قسەی نارەواتان بەدەم خوداوە هەڵئەبەستو، لووتتان لە ئایەتەکانی هەڵئەکردو باوەڕتان پێ نەئەکردن!

(٩٤) وا ئەمڕۆ، کە قیامەتە، هاتنە بەر دەستمان بۆ حیسابو کیتاب بە تاکە تاکە، نە ماڵەو نە حاڵ، نە کەسەو نە کار! وەك چۆن لە سەرەتادا بە تاکە تاکە دروستمان کردن. هەرچیمان پێدابوون لە دنیادا لە نازو نیعمەتو سامانو کەسوکار هەمووتان لەپاش خۆتان بەجێهێشتو هیچتان لەگەڵ خۆتان نەهێنا. ئەوانە نابینین لەگەڵتان کە بە تکاکاری لای خوداتان دائەنانو لاتان وابوو هاوبەشی خودانو پێکەوە ئێوەیان دروست کردووەو ئەبێ وەك خودا بپەرسترێن! پێوەندیی نێوان ئێوەو ئەوان بچڕاو ئێستە نە ئەیانناسنو نە ئەتانناسن. ئەوانەی واتان ئەزانی بۆ ئەمڕۆتان بەکەڵك دێن لەکیستان چوونو ون بوون!

۞ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ۖ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٩٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٩٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾



(٩٥) بەڕاستی هەر خودایە درز ئەکاتە ناوکەی بەری دارو درەخت و تۆوی سەوزەو لەو درزەوە چەکەرە دەرئەچێ و ئەبێتە دارو گیا کە ئادەمزادو گیانلەبەری پێ ئەژی. هەر خودایە زیندوو لە مردوو دەرئەکات، دارو گیای سەوزو نەشونوماکەر لە ناوك و تۆوی ڕەق و وشك، ئینسانی زیندوو لە دڵۆپێ ئاوی بێ نەشونوما دروست ئەکات. هەروەها هەر خودایە دەرهاوەری ئاوە لە بنیادەم و گیانەوەرو، دەرهاوەری دارو تۆوی گیایە لە داروگیای سەوزو، بەم جۆرە ڕێچکەی ژیان بە ئیزنی خودا پەیدا ئەبێت. ئا ئەمەیە خودای دەستەڵاتدار، کەواتە ئێوە بۆچی ڕوو لە ئەمری خودا وەردەچەرخێننو، لە ڕێی ڕاست لائەدەن؟!

(٩٦) هەر خودایە تاریکیی شەو لەت ئەکات و ڕووناکیی بەرەبەیانی لێ جیا ئەکاتەوە. هەر ئەوە شەوی کردووتە کاتی حەسانەوەی ماندووان. هەر ئەوە جموجووڵو هەڵاتن و ئاوابوونی مانگ و خۆری بە حیساب و ئەندازە داناوەو، شەوو ڕۆژو وەرزەکانی لێ پەیدا کردووە. ئەمانە هەموو ئەنجامی ئەندازەدانانی خودای بەدەستەڵاتو زانان.

(٩٧) هەر خودای دەستەڵاتدارە ئەستێرەکانی بۆ کردوونەتە نیشانەو ڕێپیشاندەر، تا لە تاریکیو نووتەکییەکانی وشکانیو شەپۆلی دەریای پان و بەریندا شارەزای ڕێگاو بان بن و، بەهۆی ئەو ئەستێرانەوە بگەنە ئامانج و سەرتان لێ تێکنەچێو ڕێ ون نەکەن. بەڕاستی ئێمە ئایەتەکان بەش بەش ڕوون ئەکەینەوە بۆ ئەوانەی زانان و سوودیان لێ وەرئەگرن. (٩٨) هەر خودایە لە تاکە نەفسێ دروستی کردوون کە ئادەمە (س.خ)و، ماوەیێك لە سەر زەویو ماوەیێکیش لە ناو زەوی، لە قەبردا ئەمێننەوە، یا ماوەیێك لە پشتی باوکداو ماوەیەك لە سکی دایکدا ئەمێننەوە. بەڕاستی ئێمە ئایەتەکان بەش بەش بەیان ئەکەین بۆ ئەوانەی بە وردی شت ئەزانن و تێئەفکرن و سوودیان لێ وەرئەگرن. (٩٩) هەر خودایە لای ئاسمانەوە لە هەور ئاو ئەنێرێتە خوار. بەو ئاوە گیای هەموو جۆرە تۆوێك لە زەوی دەرئەکەینو، لەو گیایانە سەوزە دەرئەکەین و، لە دارخورما تۆزی (تلقیح) دەرئەکەین، کە بۆڵ بۆڵو هێشوو هێشوونو لە یەك نزیکن و لە ئێوەیشەوە نزیکن. هەروەها باغی ترێو زەیتوون و هەنارمان بۆ سەوز کردوون، هەندێ لەم میوەو دارو گوڵو گیایانە لە یەك ئەچن و، هەندێکیشیان لە یەك ناچن. بە وردی سەیری بەری ئەو دارانە بکەن کە چۆن لە سەرەتای دەرچوونیدا کرچوکاڵەو ناخورێ، دوای ئەوە کە پێئەگات لێی وردبنەوە چەند بەتام و خۆش و بەسوودە. ئەم دروستکردنە جۆراوجۆرانە، ئەم دارو درەختو گیاو گوڵە هەمە جۆرانە نیشانەی بوونی خوداو دەستەڵاتی بێ پایانینیو ئەوانە تێیئەگەن کە خاوەن باوەڕن و، سەرپێچی ناکەن.

(١٠٠) کافرەکان جنۆکەو شەیتانیان کردووە بە هاوبەشی خوداو، وەك ئەو ئەوانیش ئەپەرستن و بەگوێیان ئەکەن، کەچی ئەوانەیش خودا دروستی کردوون، دیارە خودای خالق شایانی پەرستنە نەك ئەوان. کافرەکان بە درۆو بوختان کوڕو کچیان بۆ خودا داتاشیوە، جوولەکە وتیان : عوزەیر کوڕی خودایە، گاور وتیان: عیسا کوڕی خودایە، کافرەکانیتر وتیان: مەلائیکە کچی خودان! نەخێر ئەمانە هیچیان ڕاست نین، خودا پاك و بێخەوشەو بەرزترە لە پڕوپووچی ئەو کافرانە، خودا پەروەردگاری ئەمانە هەموویانە.

(١٠١) خودا شاکارسازو ئافەریدگاری ئاسمانەکان و زەوییە، ئەو چۆن ئەوەی ئەبێ کە هەرگیز هاوسەری نەبووەو، خۆی هەموو شتی دروست کردووەو ئاگای لە هەموو شتەو هیچی لێ ون نابێ؟!

ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَٱعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ عَمِىَ فَعَلَيْهَا وَمَآ أَنَا عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٥﴾ ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾



(١٠٢) ئەوە خودای خالقی عالەمەو ناوی (الله)یە. ئەوە پەروەردگاری ئێوەیەو کەسێکی‌تر نی‌یە عیبادەتی بەڕاستی بۆ بکرێ ئەو نەبێ، هەر ئەو بپەرستن و ڕوو لە کەسی‌تر مەکەن و هەموو کاروباری جیهانی بەدەستەو توانایە.

(١٠٣) چاوی مەخلوقات هێزی ئەوەیان نی‌یە خودا ببینن و کونهی خودایان پێ بزانرێ. خودا کونهی چاوەکان و خاوەن چاوەکانیش ئەزانێ‌و بە وردی ئەیانبینێ‌و ذەڕڕەیێکی لێ ون نابێ. خودا لەطیفی ڕاستەقینەیەو هیچ شتێ مەنعی ناکات لە بینینی هیچ شتێك، خودا شارەزایەو لە هەموو شت ئاگادارە .

(١٠٤) ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ : بە ڕاستی لەلایەن خوداوە چەند ئایەتتان بۆ هاتووە بەرچاوی ڕۆشن کردوونەتەوە. جا ئیتر هەرکەس بەرپێی خۆی ببینێ‌و ڕێگای ڕاست بگرێ ئەوە قازانجی خۆیەتی‌و، ئەوەیش خۆی کوێر بکاو لە ڕێی ڕاست لابدات ئەوا خۆی زەرەر ئەکات. خودا کردەوەتان هەڵئەگرێ‌و ڕۆژی دوایی جەزاتان ئەداتەوە، ئیتر من هیچم بە دەست نی‌یە، من تەنها پێ‌وتن و ڕاگەیاندنم لەسەرە.

(١٠٥) ئا بەم جۆرە ئایەتەکان لە بەڵێنەوە ئەگۆڕین بۆ هەڕەشەو، لە ئامۆژگارییەوە بۆ داوای بیرکردنەوە لە دەستەڵاتی خودا، تا کافرە حەسوودەکان پێت بڵێن ئەم کتێبە لای خوداوە نەهاتووەو بە دەرس لای جنۆکەو ئەم و ئەو خوێندووتە! هەروەها تا ڕاستی ڕوون بکەینەوە بۆ ئەوانەی چاکەکرو زانان.

(١٠٦) دوای ئەوە بکەوەو ئیمان بەوە بێنە کە لە لای خوداوە وەحیت بۆ کراوە، چونکە هیچ خودایەك نی‌یە بەڕاستی بپەرسترێ ئەو نەبێ. ئیتر ڕوو لە کافرەکان وەرچەرخێنەو گوێ بە قسەیان مەدە.

(١٠٧) خودا بەدەستەڵاتەو، ئەگەر بیویستایە ئەمانە کافر نەئەبوون و هاوبەشیان بۆ دانەئەنا. ئێمە تۆمان نەکردووەتە ڕەقیبی ئەمانەو، تۆ کار هەڵسووڕێنی ئەم کافرانە نیت، تۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرە.

(١٠٨) جنێو مەدەن بەوانەی کافرەکان ئەیانپەرستن و، بە خراپە ناویان مەبەن و قسەی ناشیرینیان پێ مەڵێن، ئەگەرچی پەرستنی ئەوانە کارێکی زۆر ناشیرینە، نەبادا ئەوانیش بە نەزانی‌و نەفامی جنێو بە خودای گەورە بدەن. بەڵێ ئاوەها کردەوەی هەر ئوممەتێ لە بەرچاویان جوان ئەکەین و لایان پەسەندە، بەڵام لەپاشاندا بۆ لای خودای خۆیان ئەگەڕێنەوەو، هەرچییان لە دنیادا کردووە پێیان ئەڵێت‌و ئاگاداریان ئەکات‌و، پاداشی خۆیان وەرئەگرن.

(١٠٩) کافرەکان سوێند ئەخۆن بە خودا سوێندێکی گەورە: ئەگەر عەلامەت و موعجیزەیێك، لەوانەی خۆیان ئەڵێن، بێت بۆسەریان کە ڕاستیی قسەی موحەممەد ئیسپات بکات، بێ‌گومان باوەڕی پێ ئەکەن و ئیمانی پێ ئەهێنن ! تۆیش پێیان بڵێ : عەلامەت و موعجیزە لای خوداوەیەو من هیچم بە دەست نی‌یە. ئایا ئێوە نازانن ئەمانە ئەگەر ئەو موعجیزەیش بێت چوون بە چەقی لەعنەتداو ئیمان ناهێنن؟

(١١٠) ئایا نازانن کە ئەگەر موعجیزەکەیش بێت، لەبەر ئەوەی لەپێشدا ئیمانیان بە ئایەتەکان نەهێنا، دڵو چاویان وەرئەچەرخێنین لە تێگەیشتنی ڕاستی‌و بینینی ڕێگای ڕاست و، وازیان لێ ئەهێنین لە گومڕاهی خۆیاندا بن تا ڕۆژی دوایی کە موحاسەبە ئەکرێن؟

وَلَوۡ أَنَّنَا نَزَّلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَحَشَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ كُلَّ شَيۡءٖ قُبُلٗا مَّا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ يَجۡهَلُونَ ﴿١١١﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصۡغَىٰٓ إِلَيۡهِ أَفۡـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ وَلِيَرۡضَوۡهُ وَلِيَقۡتَرِفُواْ مَا هُم مُّقۡتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡتَغِي حَكَمٗا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مُفَصَّلٗاۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴿١١٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١١٧﴾ فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤۡمِنِينَ ﴿١١٨﴾





(١١١) بێ‌گومان ئەگەر ئێمە مەلائیکەیشیان بۆ بهێنینە خوارو، مردوویشیان بۆ زیندوو بکەینەوەو قسەیان لەگەڵ بکەن، ئەگەر هەمووشتێ لەوەی ئەیانەوێ بەکۆمەڵ بۆیان ئامادە بکەین، هێشتا باوەڕ ناکەن بە ئاینی ئیسلام مەگەر خودا ویستی لەسەر بێ، بەڵام بە بێ‌گومان زۆرتری ئەمانە بەوە نازانن کە ئەگەر ئەم ئایەت و شتانەیشیان بۆ بێ ئیمان ناهێنن، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا سوێند ئەخۆن کە ئیمان ئەهێنن!

(١١٢) تەنها تۆ دوژمندار نەبوویت، هەموو پێغەمبەرەکانی تریش دوژمندار بوون لە گومڕاکانی بنیادەم و جنۆکە، ئەو دوژمنانە لەناو خۆیاندا قسەی ڕووکەش و درۆودەلەسەیان بە یەکتر ئەگەیاندو ئەیانچپاند بە گوێی یەکترداو بە هەموویانەوە خەریکی بەدکاریو دوژمنایەتیی پێغەمبەران بوون و سەرکەش و لەخودانەترس بوون. بێ‌گومان ئەگەر خودا ویستی لەسەر بوایە نەیانئەتوانی ئەو دوژمنایەتییەو ئەو درۆو دەلەسانە بکەن، دەی کەواتە لێیان گەڕێ خۆیان و بوختانیان تا ڕۆژی خۆی.

(١١٣) با ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نی‌یە حەز لەو قسە پڕوپوچووچ و بوختانانە بکەن و دڵیان بدەنێ و بە باشیان بزانن، با چ گوناه و تاوان و بوختان ئەکەن بیکەن، دوایی لە ڕۆژی پاداشدا خۆیان ئەبیننەوە.

(١١٤) ئایا ڕەوایە بێجگە خودا یەکێکی تر بکەمە حەکەم لە بەینی خۆم و ئێوەدا بۆ جیاکردنەوەی حەق و ناحەق، کە خودا ئەو خودایە کە قورئانی ناردووەتە خوار بۆ ڕێ‌پیشاندانی ئێوەو حەق و ناحەقی ڕوون کردووەتەوە؟ ئەوانەی کتێبمان بۆ ناردوون چاك ئەزانن بە ڕاستی لای خوداوە هاتووە چونکە قورئان باوەڕی بە کتێبەکانی ئەوان هەیە کەواتە هەرگیز لەوانە مەبە کە دوودڵ و بەگومانن.

(١١٥) ئەم دەنگوباس و حوکم و بەڵێنانە کە خودا دایناون گەیشتوونەتە ئەوپەڕەکەی. دەنگوباس و بەڵێنەکانی خودا ڕاستن و حوکمەکانی دادپەروەرانەن، تازە کەس ناتوانێ بیانگۆڕێو لەمانە ڕاستترو دادپەروەرانە تر بهێنێ. خودا ئاگای لە قسەی کافرانەو ئەزانێت چی لەدڵیاندایە.

(١١٦) تۆ ئەگەر بە گوێی قسەی بەشی زۆری خەڵکی سەرزەوی بکەی لەوانەی کافرو گومڕان تۆیش گومڕا ئەکەن و سەرت لێ ئەشێوێنن. ئەمانە ڕاستیان لا نی‌یەو تەنها دوای گومان کەوتوون لە بیروڕای بەدیانداو لەوەدا کە ئەڵێن باوك و باپیریان لەسەر حەق بوون. ئەمانە قسەیێکی ڕاستیان نی‌یەو کارو کاسبییان نی‌یە درۆهەڵبەستن نەبێ بۆ خودا کە ئەڵێن خودا ئەولادی هەیەو هاوبەشی هەیە.

(١١٧) بێ‌گومان خودا لە هەموو کەس باشتر ئەزانێ کێ گومڕایەو لە ڕێگای ڕاست لایداوە. هەر ئەویشە لە هەموو کەس باشتر ئەزانێ کێ ڕێگای ڕاستی گرتووەتە بەرو شارەزایە.

(١١٨) ئەگەر باوەڕتان بە ئایەتەکانی خودا هەیە لە گۆشتی ئەو حەیوانانە بخۆن کە لەکاتی سەربڕیندا بەپێی ئایینی ئیسلام ناوی خودایان لێ هێنراوەو، لەوانە مەخۆن کە ناوی خودایان لێ نەهێنراوە.

وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ وَذَرُوا۟ ظَٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْسِبُونَ ٱلْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا۟ يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِى كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا۟ فِيهَا ۖ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ قَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ رُسُلُ ٱللَّهِ ۘ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ۗ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَمْكُرُونَ ﴿١٢٤﴾



(١١٩) بە چ دەلیلێ لە گۆشتی ئەو حەیوانانە ناخۆن کە لە کاتی سەربڕینیاندا ناوی خودایان لێ هێنراوە؟ چیتان دەست ئەکەوێ لە نەخواردنیان!؟ خودا خۆی حەرامی لە حەڵاڵ جیاکردووەتەوە بۆتان، لە کاتی ناچاریدا نەبێ کە بە ئەندازەی پێویست خواردنی حەرامیشتان بۆ ڕەوایە. بەڕاستی زۆر کەسی بێئایین لەخۆیانەوە خەڵکی گومڕا ئەکەن و بە ئارەزووی خۆیان بێ دەلیل لە خشتەیان ئەبەن، حەڵاڵیان لێ حەرام ئەکەن و حەرامیان بۆ حەڵاڵ ئەکەن! خودا لە هەموو کەس زاناترە کێ لەڕێلادەرەو کاری ناڕەوا ئەکات!

(١٢٠) واز لە گوناهی ئاشکراو نهێنی بێنن، یا نە بە ئەندام گوناه بکەن و نە بە دڵ. ئەوانەی خۆیان گوناهبار ئەکەن تۆڵەی ئەو گوناهەیان لێ ئەکرێتەوە بەخۆڕایی بەسەریاندا تێناپەڕێ.

(١٢١) لە گۆشتی ئەو حەیوانانە مەخۆن کە لە کاتی سەربڕینیاندا ناوی خودایان لێ نەهێنرابێ. خواردنی ئەو جۆرە گۆشتە یا ناوبردنی بتەکان لەکاتی سەربڕینیاندا دەرچوونە لە ئایینی ئیسلام. شەیتانەکان بەگوێی بنیادەمە دۆستە گومڕاکانیاندا ئەچپێنن و وەسوەسە ئەخەنە دڵیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بکەن. بێگومان ئەگەر بەگوێیان بکەن لەحەڵاڵ کردنی شتێکدا کە خودا حەرامی کردووە ئەوا ئێوە لە ڕیزی موشریکەکاندا ئەبن کە بەگوێی قسەی غەیری خودا ئەکەن.

(١٢٢) ئایا کەسێ مردوو بووبێ و زیندوومان کردبێتەوە واتە لەپێشدا گومڕاه بووبێ و لەپاشاندا ڕێگای ڕاستمان پیشان دابێت دەلیلو ئایەتو هۆشو بیری تێفکرینمان پێ دابێو بە سەلامەتی لە ناو خەڵکدا بڕوات بەڕێوە، وەك ئەو کەسەیە کە لە ناو تاریکیو بەسەر تاریکیدا بڕواتو هەرگیز لێی دەرنەچێت، واتە: ڕێگای کوفری گرتبێو بەری نەدات!؟ بەڵێ هەروەك ئیماندارەکان ڕێگای خوایان لا باشەو ئیمانەکەیان لا جوانەو ئەیپارێزن، کافرەکانیش کردەوە ناڕەواکانی خۆیانیان لە بەرچاو جوان کراوەو لێی جیانابنەوە!

(١٢٣) هەروەك لە مەککەدا تاوانبارەکان لە گەورەکانیانن، لە هەموو دێ و ئاوەدانییەکیش وامان ڕێکخستووە کە تاوانبارەکانیان لە گەورەکانیانن تا فێڵ لە خەڵك بکەن و گوناهی خۆیشیان و ئەوانیشیان بچێتە ئەستۆ، لەڕاستیدا ئەوان فێڵ لە کەس ناکەن لە خۆیان نەبێ و، هەر خۆیان زەرەر ئەکەن، بەڵام هۆشو فامیان نییە.

(١٢٤) کە ئایەتێکیان بۆ دێ ئەڵێن: تاوەك پێغەمبەرانی خودا وەحیمان بۆ نەیێ ئیمان ناهێنین! پێغەمبەرایەتی بە سامان و نەسەب نییە، خودا هەر خۆی ئەزانێ پێغەمبەرایەتی بە کێ ئەدات؟ تاوانبارەکان بەهۆی ئەو هەموو مەکرەوە کە ئەیکەن، سەرەنجام لە لایەن خوداوە زەلیلی و نوشوستییان تووش ئەبێو سزایێکی توند ئەدرێن.

فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَـٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾ وَهَـٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ ۞ لَهُمْ دَارُ ٱلسَّلَـٰمِ عِندَ رَبِّهِمْ ۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٧﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ۖ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٢٨﴾ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّى بَعْضَ ٱلظَّـٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِى وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَـٰذَا ۚ قَالُوا۟ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَـٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾ ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَـٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾



(١٢٥) هەرکەسێ خودا بیەوێ حەقی پێشان بداو بیخاتە سەر ڕێی ڕاست دڵی فراوان ئەکات و نووری تێ ئەچێ‌و ئایینی ئیسلام بەئاسانی وەرئەگرێ. ئەوەیش خودا بیەوێ گومڕای بکات دەروونی تەنگ ئەکات و ئەیهێنێتە یەك. کە ناوی ئیسلامی لە لا ببرێ، وەك ئەوەی بە زۆر بیەوێ بە ئاسماندا سەرکەوێ، هەناسەی سوار ئەبێ. بێگومان ئەوانەی ئیمان ناهێنن، وەك چۆن دڵیان دێتەیەك و ئیسلام وەرناگرن، خودایش سەرشۆڕی و سزاو ئازاریان ئەدا بە سەردا.

(١٢٦) بە ڕاستی ئەم ئایینی ئیسلامە ئەم ڕێگا ڕاستەیە کە خودا پیشانی داون تا پیایدا بڕۆن و لیێ لا نەدەن. ئێمە ئایەتەکانی قورئانمان بەیان کرد بۆ ئەوانەی بیر ئەخەنەکارو باوەڕیان بە دەستەڵات و قەدەری خودا هەیە.

(١٢٧) ئەو موسوڵمانانە شوێنی ئاسایش‌و بەهەشتی ئارامیان هەیە، کە لای خودایەو ئەو بۆی هەڵگرتوون. خودا دۆست‌و سەرداریانەو، ئەنجامی کرداری چاکیان یارمەتییان ئەدات.

(١٢٨) یادی ئەو ڕۆژە بکەرەوە کە خودای گەورە (انس وجن) هەموویان کۆئەکاتەوەو بە کۆمەڵی شەیتان ئەفەرموێ: ئێوە لە دنیادا بنیادەمی زۆرتان گومڕاه کرد، ئەو بنیادەمانەیش کە دۆستی شەیتانەکان بوون دەڵێن: خودایا ئێمەو ئەوان سوودمان لە یەکتر وەرئەگرت، بنیادەمەکان لە شەیتانەکانەوە فێری دواکەوتنی نەفس و ئارەزووبازی بوون و، شەیتانەکانیش بە گومڕاهیی بنیادەمەکان ئاواتیان هاتەدی و دڵخۆش بوون، وا ئیستەیش هەموومان گەیشتووینەتە ئەو سات و کاتەی بۆت دیاری کردبووین‌و لە بەردەستتداین. خودایش پێیان ئەفەرموێ: دە بڕۆن ئەوە دەردتان بێ مادام لە دنیادا دوای ئارەزووی نەفستان کەوتبوون، ئیستە ئاگری دۆزەخ جێگاو ئەنجامی ئەبەدیتانەو هەتا هەتایە تیایدا دەمێننەوە، مەگەر خودا بیەوێ لە دۆزەخەوە بۆ زەمهەریرو لەوێوە دووبارە بۆ دۆزەخ جێگاگۆڕکێتان پێ‌بکات، خودای تۆ کارەکانی پڕحیکمەتن و زانایەو ئاگای لە هەموو شتە.

(١٢٩) ئاوەها هەندێ لە ستەمکارەکان ئەکەینە دۆست‌و هاوقسەی هەندێکیان و یەکتر گومڕاه ئەکەن و لە ڕۆژی سزایشدا بەهۆی کرداری بەدی دنیایانەوە دەبنە هاوڕێی سزاو ئازار.

(١٣٠) ئەی کۆمەڵەی جینئی و بنیادەم! ئایا لە دنیادا پێغەمبەرانی بنیادەمتان بۆ نەهاتن کە ئایەتەکانی منیان بۆ ئەخوێندنەوەو لە سزای ئەم ڕۆژە سامناکەیان ئەترساندن کە لەگەڵ خودای گەورەو کارو کردەوەی خۆتاندا ڕووبەڕوو بوونەتەوە؟ وتیان: شایەتیی لە خۆمان ئەدەین، بەڵێ هاتن و پێیان وتین و ترساندینیان، بەڵام ئێمە باوەڕمان پێ نەکردن، ژیانی دنیاو ڕابواردنی زووڕەس و کەم عومری سەرکەشی کردن و لە خۆیان بایی بوون و، دوای ئارەزووی نەفس کەوتن. وا ئیستە ناچارن شایەتی لە خۆیان ئەدەن کە لە دنیادا سەرکەش‌و کافر بوون.

(١٣١) ئەم پێغەمبەرناردنەو ئەم ترساندنە لەبەر ئەوەیە خودا هەرگیز ئاوەدانییەکان لەناونابات بە ستەم کە ئەهلەکانیان ئاگادار نەکرابنەوەو پێغەمبەرانیان بۆ نەنێررابن.

وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُواْۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٢﴾ وَرَبُّكَ ٱلۡغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۚ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَأٓتٖۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَامِلٞۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۗ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبٗا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمۡ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمۡۗ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ قَتۡلَ أَوۡلَٰدِهِمۡ شُرَكَآؤُهُمۡ لِيُرۡدُوهُمۡ وَلِيَلۡبِسُواْ عَلَيۡهِمۡ دِينَهُمۡۖ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ﴿١٣٧﴾



(١٣٢) بۆ هەر موكەللەفێ پایەو پلەی تایبەتی هەیە بەرامبەر بە کردەوەکانی، چاك بێ یا خراپ. خودا هەرگیز لە کردەوەی بەندەکانی بێئاگا نییەو زەڕڕەیێك پاداش یا تۆڵەی لێ ون نابێت.

(١٣٣) خودا دەوڵەمەندەو بێنیازە لە بەندەو خوداپەرستنی بەندە. خاوەن میهرەبانییە کە داوای خوداپەرستیتان لێ ئەکات تا پاداشتان بداتەوە. هەروەها کە گوناه بکەن مۆڵەتتان ئەدات. ئەگەر بیەوێ ئێوەی تاوانبار لەناو ئەبات و خەڵکێکی تر دێنێتە ڕووی کار کە جێگاتان بگرنەوە، هەروەك ئێوەی لە نەوەی کۆمەڵی تر دروست کردووەو، کۆمەڵ پاش کۆمەڵ دێن و دەچن.

(١٣٤) بێگومان ئەوەی خودا بەڵێنی پێداون وەك زیندووکردنەوەو حیسابو کیتاب لە ڕۆژی خۆیدا دێتەدیو، ئێوە هەرگیز ناتوانن ڕێگا لە خودا بگرنو دەست بێننە بەر کاری.

(١٣٥) ئەی پیغەمبەر بە بێئایینەکان بڵێ: ئەی قەومەکەم چیتان لەدەست دێ بیکەن، منەتتان نەبێ. منیش ئەوەی پێم بکرێ ئەیکەم. پەیامەکەم ئەگەیێنم و سەبر ئەکەم، دوایی بۆتان دەرئەکەوێو ئەنجامی چاکی ئەم دنیایەو، ئەنجامی کردەوەی چاك لەم دنیایەدا بۆ کێ ئەبێ. بۆ ئێمە یا بۆ ئێوە؟ ستەمکاران هەرگیز سەرناکەون.

(١٣٦) ئەم کافرانە لەو شتانەی کە خودا دروستی کردوون، لە بەروبوومی کشتوکاڵو حەیوان، بەشێکیان داناوە بۆ خوداو ئەیدەن بە هەژارو میوان لە ڕێگای خودادا. بەشێکیشیان داناوە بۆ ئەو بتانەی بە هاوبەشی خودایان داناون، ئەیدەن بە دەرگاوان و کارگوزاران و زیارەتکەرانیان لەپێناوی ڕەزامەندیی ئەو هاوبەشە بێ ئەساسانەدا. ئەگەر لە پاش بەشکردنەکە بۆیان دەرکەوت بەشەکەی خودا چاکترەو هی بتەکان لە هینەکەی ئەو خراپترە ئاڵوگۆڕیان پێ ئەکەن، چونکە بتەکانیان خۆش ئەوێن! ئای کە کارێکی بەدو ناشیرین ئەکەن، شت خودا دروستی کردووەو ئەوان بە ئارەزوو دەستی تێ ئەخەن. بت خودا دروستی کردووەو ئەوان کردوویانن بە هاوبەشی خودا !! ئای کە حوکمێکی ناڕەوا ئەدەن!!

(١٣٧) هەروەها هاوڕێیانی هاوبەشبۆخودا دانەرەکان بردبوویانە دڵیانەوە کە منداڵەکانیان زیندەبەچاڵ بکەن و ئەم کارەیان لا جوان کردبوون، تا بیانفەوتێنن و ئایینیان لێ بگۆڕن و سەریان لێ تێکبدەن. ئەگەر خودا بیویستایە ئەم کارەیان نەئەکرد. دە لێیان گەڕێ، خۆیان و درۆو دەلەسەیان.

وَقَالُواْ هَٰذِهِۦٓ أَنۡعَٰمٞ وَحَرۡثٌ حِجۡرٞ لَّا يَطۡعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعۡمِهِمۡ وَأَنۡعَٰمٌ حُرِّمَتۡ ظُهُورُهَا وَأَنۡعَٰمٞ لَّا يَذۡكُرُونَ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا ٱفۡتِرَآءً عَلَيۡهِۚ سَيَجۡزِيهِم بِمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُواْ مَا فِي بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ خَالِصَةٞ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَاۖ وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ فَهُمۡ فِيهِ شُرَكَآءُۚ سَيَجۡزِيهِمۡ وَصۡفَهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿١٣٩﴾ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوۡلَٰدَهُمۡ سَفَهَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفۡتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِۚ قَدۡ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ۞ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٖ مَّعۡرُوشَٰتٖ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖۚ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ حَمُولَةٗ وَفَرۡشٗاۚ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿١٤٢﴾



(١٣٨) کافرەکـان هەنـدێ حـەیوانو کشتوکاڵیان جیاکردووەتەوەو ئەڵێن: ئەمە کەس لێی نەخوات ئەوانە نەبێ کە خۆمان ئەمانـەوێ. مەبەسـتیان دەرگـاوان و کـارگوزارانو دەسـتو پێوەنـدی بتەکانـە. هەروەها هەندێ وشتریان جیاکردوونەتـەوە کە بە حەرامیان داناوە کەس سواریان ببێ! هـەروەها هەنـدێ حـەیوان بـۆ بتـەکانیان سەرئەبڕن و ناوی خودایان لێ ناهێنن! ئـەم حەڵاڵو حەرام کردنە هەموو بـە ئـارەزووی خۆیانـەو بـەدەم خـوداوەی هەڵئەبەسـتنو هیچـی لای خـوداوە نییـەو لـە ڕۆژی قیامەتـدا تۆڵـەی ئـەو بوختانانـەیان لێ ئەکرێتەوە.

(١٣٩) کافرەکـان ئـەیانوت: ئـەوەی لـە سـکی ئـەم حەیوانانەدایـە ئەگـەر بـە زیندوویی بوون ئەوە تەنها بۆ نێرینەکانمانن و حـەرامن لـە ژنـەکانمان، ئەگـەر بـە مردوویش بوون ئـەوا نێـرو مـێ هاوبەشـن تیایاناو وەك یەك سـوودی لێ وەرئـەگرن. خودا تۆڵـەی ئـەم بەناحـەق حـەرامکـردن و حەڵاڵکردنەیان لێ ئەستێنێ. خودا کارەکانی پڕحیکمەتنو لە هەموو شت ئاگادارە.

(١٤٠) ئەوانەی بە بێعەقڵیو نەزانی لە ترسی هەژاری و لە شەڕا بە دیل گیران کچەکانیان ئەکوژن، بـەخۆڕایی زیـان لە خۆیان ئەدەن، خودا ڕۆزیبەخشە نەك ئەوان، هـەروەها ئـەوانیش زیـان لـە خۆیـان ئـەدەن کـە درۆ بـە دەم خـوداوە ئەکەنو گۆشتی هەندێ حەیوان لە خۆیان حەرام ئەکەن، خودا پێیداونو بۆی حەڵاڵ کردوون. ئەمانـە گـومڕاه بـوون و هەرگیز بە ڕێگای ڕاستدا نەڕۆیشتوون.

(١٤١) هەر خودایـە چـەند بـاغ و گـوڵزاری دروست کـردووە کـە دارەکانیـان هەنـدێکیان بەسـەر زەویـدا ئەکشێن و بڵاوئەبنەوە. هەر خودا دارخورماو کشتوکاڵی سەوز کردووە کە بەرەکانیان لە تامو شـێوەو ڕەنـگ و بـۆدا جیاجیـان. هەر ئەوە زەیتوونو هەناری دروست کردووە کە بەری هەندێکیان لە تامو ڕەنگو بۆدا لە یەك ئەچنو، هەندێکیشـیان جیاوازنو لە یەك ناچن. لە بەری ئەم دارو کشتوکاڵەتان بخۆن بۆتـان حەڵاڵـە. لـە ڕۆژی پێگەیشـتن و دروێنـەدا حـەقی خەڵکی لێ دەرکەن و خێرو صەدەقەی لێ بکەن. لەم خێرکردن و بەخشینەیشدا زیادەڕەوی مەکەن، مامناوەنـدی بـن. خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە زیادەڕەوی ئەکەن و لە سنوور دەرئەچن.

(١٤٢) خودا حەیوانی وەهای بۆ دروست کردوون کە بارتان بۆ هەڵدەگرێ و، هی وایشی بـۆ دروسـت کـردوون کـە لـە خوری و مووەکەی ڕایەخ دروسـت دەکـەن، بخۆن لـەو ڕۆزییـەی خـودا پێـی داون و سـوودی لێ وەرگرن. دوای قسـەو وەسوەسەی شەیتان مەکەون و، بە ئارەزووی خۆتان حەرام و حەڵاڵ دیاری مەکەن، شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە.

ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍۖ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِۖ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِۖ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَاۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍۖ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍۚ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾



(١٤٣) لەو حەیوانانە كە باس‌كران هەشت نێرو مێ بگرە، لە مەڕ نێرینەیەك و مێیینەیەك و لە بزن نێرینەیەك و مێیینەیەك. خودا كامی حەرام كردوون؟ دوو نێرینەكە، یا دوو مێیینەكە، یا ئەوانەی لە منداڵدانی مێیینەكاندان، نێرینە بن یا مێیینە؟ خەبەرم بدەنێ لە زانستەوە ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن و ئەزانن خوا هیچیانی حەرام كردووە، مەبەست ئەوەیە نە نێرینەكان حەرامن و نە مێیینەكان و نە ئەوانەی لە منداڵدانی مێیینەكاندان، كافرەكان بە ئارەزووبازی حەرام و حەڵاڵ دیاری ئەكەن و درۆ بە دەم خوداوە ئەكەن!

(١٤٤) هەروەها لە وشتر دوان یەكێكی نێرو یەكێكی مێو، لە ڕەشەوڵاخیش دوان یەكێكی نێرو یەكێكی مێ. خوا نێرینەكانی حەرام كردووە یا مێیینەكان؟ یا ئەوانەی لە منداڵدانی مێیینەكاندان، نێر بن یا مێ؟ واتە: هیچ كامیانی حەرام نەكردووەو، كافرەكان بە ئارەزووی خۆیان حەرام و حەڵاڵ دیاری ئەكەن و درۆ بەدەم خوداوە هەڵئەبەستن. یا خۆ ئێوە حازر بوون و ئاگادار بوون كە خودا ئەم حەرام و حەڵاڵەی بۆ دیاری كردن؟ كێ لەوە تاوانبارترو ستەمكارترە درۆ بەدەم خوداوە هەڵبەستێ تا بە نەزانی بێ‌دەلیل خەڵكی گومڕابكات؟ خودا هەرگیز ڕێگای ڕاست و چاكە پیشانی ستەمكاران نادات.

(١٤٥) تۆ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: من لەم ئایەتانەدا كە بە وەحی بۆم هاتوون هیچ نابینم كە خواردنی حەرام كرابێ، بێجگە گۆشتی حەیوانی مردارەوەبوو، خوێنی ڕژاو كە لە ڕەگ و لە لەش دەرچێ و، گۆشتی بەراز كە پیسە، یا گۆشتی حەیوانێ كە لە كاتی سەربڕینیدا ناوی غەیری خودای لێ هێنرابێ. جا ئەگەر كەسێ لەبەر برسێتی ناچار بوو لەوانە بخوات ئەوا بە بێ‌ئەوەی ستەم لە كەس بكات و بەشی كەس بخوات و بە بێ ئەوەی زیادەڕەوی بكات و لە سنوور لابدات بۆی دروستە بەقەدەر پێویست لێیان بخوات. خودا گوناهپۆش و میهرەبانە.

(١٤٦) گۆشتی هەر حەیوانێ كە نینۆك و پەنجەو چنگی هەبێ لە جوولەكەكانمان حەرام كرد وەك وشترو حەیوانی دڕندەو بازو شاهێن و هەڵۆ، هەروەها بەزو پیوی ڕەشەوڵاخ و ئاژەڵیشیمان لێ حەرام كردن، ئەو بەزە كە بەسەر پشتیانەوەیە یا بە ڕیخۆڵكانیانەوەیە یا ئەوەی كە لەگەڵ ئێسقاندا تێكەڵ بووە وەك دووگ كە بە كلێنچكەوە لكاوە. ئەو حەرام كردنەش تۆڵە بوو لێمان كردنەوە چونكە ستەمكارو بێ‌باوەڕ بوون. بێ‌گومان ئێمە لە بەڵێن و هەڕەشەو دەنگوباسدا هەرچی بڵێین ڕاست ئەكەین و درۆی تێدا نییە.

فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ
بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟
لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ ۚ
كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا ۗ
قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا
ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ ۖ
فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ
يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ
مَعَهُمْ ۚ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ ۞ قُلْ
تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ
شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ
إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ
مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى
حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾



(١٤٧) جا ئەگەر باوەڕیان پێ نەکردی بڵێ: خودای پەروەردگارتان خاوەنی میهرەبانییەکی فراوانەو مۆڵەتتان ئەدات. بەو مۆڵەتدانە مەغروور مەبن، چونکە هەرگیز وازتان لێ ناهێنێ و غەزەبی ناگەڕێتەوە لە تاوانباران. یا خودا ڕەحمەتی فراوانە بۆ خوداپەرستان و تۆڵەیشی توندە بۆ تاوانباران.

(١٤٨) ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خودا داناوە ئەڵێن ئێمەو باو باپیرانمان لەسەر حەقین، چونکە ئەگەر خودا بیویستایە کافر نەبین نە ئێمەو نە باوباپیرانمان کافر نەدەبووین و هیچمان لە خۆمان حەرام نەئەکرد. کە خودا ئەم ویستەی بەکار نەهێنا ئەوە واتە ئێمە لەسەر حەقین و خودا لێمان ڕازییە! کافرەکانی پێش ئەوانیش هەر بەم جۆرە پێغەمبەرەکانیان بەدرۆئەخستەوەو بە سەرکەشی باوەڕیان پێ نەئەکردن تا ئازاری ئێمەیان چەشتو بە سزای خۆیان گەیشتن. تۆ ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: هیچ دەلیلێکتان هەیە لەسەر ڕاستی ئەم قسانەتان بۆمانی دەربخەنو تێمان بگەیێنن! هیچی تر نی‌یە ئەوە نەبێ کە دوای گومان کەوتوون و بوختان بۆ خودا هەڵئەبەستن!!!

(١٤٩) تۆ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: دەلیلی بەهێزو جێگیر هی خودایە، خودا ئەگەر بیویستایە هەمووتانی هیدایەت ئەدا، بەڵام بڕیاری داوە هەندێکتان هیدایەت دراوو هەندێکتان گومڕا بن.

(١٥٠) ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەو شاهیدانەتان حازر کەن کە شایەتی ئەدەن و ئەڵێن خودا ئەمەی حەرام کردووە کە ئێوە ئەڵێن. جا ئەگەر شایەتییان دا تۆ باوەڕیان پێ مەکەو شایەتییان لەگەڵ مەدە، بەڵکو ڕێگای ڕاستیان بۆ ڕوون بکەرەوە. دوای ئارەزووبازی ئەوانە مەکەوە کە ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ دائەنێن و ئیمانیان پێ ناهێنن، ئەوانەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نی‌یەو، هاوبەش بۆ خودا بڕیار ئەدەن.

(١٥١) ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: وەرن پێتان بڵێم و بۆتان بخوێنمەوە خودا چی لێ حەرام کردوون: نابێ هاوبەش بۆ خودا بڕیار بدەن. ئەبێ لەگەڵ باوك و دایکتاندا گوفتارو کردارو دڵ و دەروونتان باش بێ‌و، هەرگیز خراپ نەبن لەگەڵیانداو دڵیان ئازار نەدەن. ئەولادەکانتان لە ترسی برسێتی و هەژاری مەکوژن، ئێمە ئەتانژیێنین ئێوەیش و ئەوانیش. ڕزق و ڕۆزیی هەموو لایەکتان لەسەر خودایە، خۆتان لە گوناهی گەورە دوور بخەنەوە چ ئاشکرای و چ پەنهانی. بە حەق نەبێ کەس مەکوژن کە خودا کوشتنی حەرام کردووە. ئەمەیە ئامۆژگاریی خودا بۆ ئێوە بەڵکو عەقڵ و فام بخەنەکارو ڕێی ڕاست بگرن و لە خودا بترسن.

وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰۖ وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ وَتَفۡصِيلًا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلۡكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيۡنِ مِن قَبۡلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمۡ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوۡ تَقُولُواْ لَوۡ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمۡۚ فَقَدۡ جَآءَكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞۚ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنۡهَاۗ سَنَجۡزِي ٱلَّذِينَ يَصۡدِفُونَ عَنۡ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يَصۡدِفُونَ ﴿١٥٧﴾



(١٥٢) نزیکی ماڵی هەتیو مەبنەوە بە چاکترین شێوە نەبێ واتە: بە هەڵگرتنی بۆیان، یا خستنەکارو قازانج کردن. بۆیان هەڵگرن تا بالغ ئەبن و ئەفامن. لە مامەڵەدا پێوانەو کێشانە بە ڕێکیو بێ زیادو کەم جێبەجێ بکەن. ئێمە ئەوەندەتان لێ داوا ئەکەین کە لە وزەتاندا بێت و بتوانن بیکەن. ئەگەر لە مەحکەمەدا شایەتیتان داو قسەیەکتان کرد ڕاستگۆ بن، درۆ مەکەن با ئەو کەسەیش کە شایەتی بۆ ئەدەن یا شایەتی لەسەر ئەدەن خزم و خوێشتان بن. پەیمانی خوداو فەرمانەکانی بەجێبێنن، خودا بۆیە بەم جۆرە ئامۆژگاریتان ئەکات تا بیربکەنەوەو هۆش بخەنەکارو لە ڕێگای ڕاست لانەدەن.

(١٥٣) ئەوەی کە لەم سوورەتەدا بۆم خوێندنەوە لەباسی یەکیەتیی خوداو ڕاستی پێغەمبەران و ڕوونکردنەوەی حوکمی شەریعەتی ئیسلام، ڕێگای ڕاستی بێپێچو پەنای منە، من بەم ڕێگەدا ئەڕۆم، ئێوەیش بیگرنە بەرو لێی لامەدەن، مەکەونە دوای ئارەزووی نەفس و ڕێگای هەمەجۆرە کە تەفرو تووناتان بکات و سەرتان لێ تێکبدات و لە ڕێی ڕاست لاتاندات. خودا بەوە ئامۆژگاریتان ئەکات کە ڕێگای ئیسلام بگرن، بەڵکو خۆتان لە گوناه و لە سزای ڕۆژی دوایی بپارێزن.

(١٥٤) پاشان تەوراتمان دا بە مووساو، بەو تەوراتە نیعمەتی خۆمان تەواو کرد بۆ ئەوانەی کە بە باشی پەیڕەویی تەوراتیان کردو حورمەتمان گرتن. لەو تەوراتەدا هەموو ئەو حوکمانەمان ڕوون کردەوە کە پێویستیان پێ هەبوو کردمانە هۆی شارەزاییو هیدایەت بەڵکو خەڵکەکە باوەڕ بەوە بکەن کە ڕۆژی پاداش بە خودای خۆیان ئەگەن و حیسابو کیتابیان لەگەڵ ئەکرێ.

(١٥٥) ئەم قورئانەیش کتێبێکی بەقازانجە ناردوومانە بۆتان پەیڕەویی بکەن و بەگوێرەی ئامۆژگارییەکانی بجووڵێنەوەو، خۆتان لە گوناه بپارێزن بەڵکو خودای گەورە ڕەحمتان پێبکات.

(١٥٦) ئێمە بۆیە ئەم قورئانەمان نارد نەوەك ئێوە ئەی کافرەکان بڵێن: پێش ئێمە کتێب تەنها بۆ دوو تایەفە نێرراوە جوولەکەو گاور، ئیتر ئێمە هیچ ئاگامان لەو کتێبانەی ئەوان نەبووەو نەمانزانیوە چین و لێی تێنەگەیشتووین.

(١٥٧) یا بڵێن ئەگەر ئێمە کتێبمان بۆ بنێررایە لەوان شارەزاتر ئەبووین، چونکە ئێمە لەوان زیرەکترو وردبینترین. ئەوا دەلیلێکی ئاشکراتان بۆ هات و قورئانێکتان بۆ نێررا کە مایەی شارەزاییەو ئەبێتە هۆی میهرەبانیی خودا بۆ کەسێ پەیڕەویی بکات. کێ لەوە ستەمکارترە کە ئایەتەکانی خودا بەدرۆبخاتەوەو باوەڕیان پێ نەکات و لادا لێیان؟ ئێمە بەهۆی ئەو باوەڕنەکردن و لێ لادانەوە توندترین سزای ئەوانە ئەدەین کە سەرپێچی ئەکەن و لە ڕێگای ڕاست و لە ئایەتەکان لانەدەن.

هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِيَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ قُلْ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ۚ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٥﴾



(١٥٨) چاوەڕوانی هیچ نین هی ئەوە نەبێ کە مەلائیکەی گیانکێشان یا مەلائیکەی سزادانیان بۆ بێت، یا سزای خوداو نیشانەکانی قیامەت بێن، یا هەندێ لە نیشانەکانی قیامەتو ڕۆژی دوایی بێن. کە هەندێ لە ئایەتەکانی خودا هاتن ئیتر ئیمان هێنان لەوکاتەدا سوودی نی‌یە بۆ کەسێ کە لەوە پێش ئیمانی نەهێنابێ یا ئیمانی هێنابێو چاکەیێکی پێ نەکردبێ. ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: دەسا ئێوە چاوەڕوانی یەکێ لەوانە بن، ئێمەیش چاوەڕوانین بزانین سەرئەنجام کێ قازانج ئەکات و کێ بەسەروماڵەوە تیا ئەچێ!؟

(١٥٩) هەرگیز تۆ لەوانە نیت کە دینیان پارچە پارچە کردووەو باوەڕیان بە هەندێکی هەیەو هەندێکی تری باوەڕیان پێی نی‌یەو بوونەتە تیپ تیپ و گرۆهـ گرۆهـ. تۆ پێوەندیت بەوانەوە نی‌یە. خودا خۆی حیساب و کیتاب لەگەڵ ئەوانە ئەکات و تۆڵەیان لێ ئەسێنێتەوەو، لە ڕۆژی خۆیدا ئاگاداریان ئەکات کە لە دنیادا چییان کردووە؟ ئەوانە لە دەستی خودا دەرناچن.

(١٦٠) هەرکەس چاکەیێ بکات دە قاتی ئەو چاکەیە پاداشی ئەدرێتەوە، هەرکەسیش خراپەیێ بکات تەنها بە قەدەر خراپەکەی تۆڵەی لێ ئەسەنرێ و، هەرگیز ستەمیان لێ ناکرێ بە کەمکردنەوەی پاداشی کردەوەی چاك، یا بە زیادکردنی تۆڵەی کردەوەی خراپ.

(١٦١) ئەی پێغەمبەر تۆ پێیان بڵێ: خودای گەورە ڕێگای ڕاستی پیشان داوم کە ئایینێکی خاوێن و پایەدارە، ئایینی خودابەیەکناسین، کە ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم بووە (د.خ). بێ‌گومان ئیبراهیم خودای بە یەك ناسیوەو هەرگیز لە زومرەی ئەوانە نەبووە کە هاوبەشیان بۆ خودا داناوە.

(١٦٢) ئەی موحەممەد! تۆ بڵێ: بەڕاستی نوێژو هەموو جۆرە عیبادەتێکم یا حەج و قوربانیم و هەر عیبادەتێ لە کاتی زیندوویەتیدا ئەیکەم و لەسەری ئەمرم هەمووی بۆ خودایە کە خوای هەموو جۆرە مەخلووقێکە.

(١٦٣) هاوبەشی نی‌یە و من بەم جۆرە ڕاستی و دڵسۆزی و خاوێنییە لە لایەن خوداوە فەرمانم پێ دراوەو من لەپێش هەموو ئوممەتی خۆمەوە موسوڵمان بووم و ڕێگای ڕاستی ئیسلامەتیم گرتووەتەبەر.

(١٦٤) ئەی موحەممەد! تۆ بڵێ: لە خودای تاك و تەنیا بەولاوە بگەڕێم بەدوای خودایەکی تردا بیپەرستم و بیکەمە هاوبەشی خودا، کە خودای تاك و تەنها پەروەردگاری هەمووشتەو، هیچی تر غەیری خۆی شایانی پەرستن نی‌یە؟ دیارە نە. بێ گومان نەفسی ئینسان هەر خراپەیەك بکات زیانەکەی هەر بۆ خۆی ئەگەڕێتەوەو قازانجی پێ ناگەیێنێ. ئێوەیش ناتوانن گوناهی من بگرنە ئەستۆ چونکە هیچ تاوانبارێ تاوانی یەکێکی‌تر هەڵناگرێ و، هەرکەس تاوانی خۆی بە کۆڵی خۆیەوەیە، جا لە ڕۆژی قیامەتدا هەمووتان ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوداو، خودا ئەو شتانەتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە خیلافتان تیایا هەبوو. لەو ڕۆژەدا ڕاستی لە ناڕاستی و چاکەکەر لە خراپەکەر جیا دەکرێتەوە.

(١٦٥) خودا ئەو خودایە کە ئێوەی کردووە بە جێنشینی خۆی لە زەویدا، یا هەندێکی کردووەتە جێنشینی هەندێکی ترو یەك لەدوای یەك دێن، هەر خودایە کە هەندێکی بەسەر هەندێکی ترتاندا بەرز کردوەتەوە لە جێگاو سامان و دەوڵەمەندیدا تا تاقییان بکاتەوە، لەو گەورەیی و دەوڵەمەندییەدا کە پێی بەخشیون. خودا گورج تۆڵە ئەسێنێتەوە، چونکە ڕۆژی قیامەت نزیکە، هەروەها خودا گوناهبەخش و میهرەبانە.

## سُورَةُ الأَعرَافِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓصٓ ﴿١﴾ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ﴿٤﴾ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٥﴾ فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٦﴾ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴿٧﴾ وَٱلۡوَزۡنُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّۚ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿١٠﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَٰكُمۡ ثُمَّ صَوَّرۡنَٰكُمۡ ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿١١﴾



## سوورەتی (الأعراف)

مەککەیی‌یە بێجگە لە ئایەتی(١٦٣)وە تا دوایی. ئایەتی (١٧٠)، کە مەدینەیین.
(٢٠٦)ئایەتە.

(١) لای هەندێ لە ئەهلی تەفسیر واتە: (المصورّ). لای هەندێکی تر واتە: (أنا الله أعلم وأفضّل). لای هەندێکیش ئەم جۆرە ئایەتانە ناوی سوورەتەکانیانن. لای هەندێکی تریان ناوی حەرفەکانن: ئەلیف، لام، میم، صاد،. خودای گەورەیش لە هەموو کەس زاناترەو، خۆی ئەزانێ واتای چی‌یە!.

(٢) ئەم قورئانە کتێبێکە نێرراوەتە خوار بۆ لات. با دڵت تەنگ نەبێ و لات گران نەبێ کە بە خەڵکی ڕابگەیێنی. بۆیە بۆمان ناردوویت کافرانی پێ بترسێنی لە ئەنجامی بێ‌ئیمانی‌و، موسڵمانانی پێ ئاگادار بکەیتەوەو، هەموو جار ئەنجامی خوداپەرستی یا ملپێچییان بخەیتەوە یاد.

(٣) دوای ئەو قورئانە بکەون کە خودا نازڵی کردوەتە سەرتان، مەکەونە دوای کەسانی تر یا ئایینی تر، کە ڕێگاتان لێ ون بکەن و تووشی سزای ڕۆژی قیامەت بن. ئێوە کەم بیرئەکەنەوە بۆیە دوای ئایینی خودا ناکەون و پەیڕەویی خەڵکی تر ئەکەن.

(٤) چەندین ئاوەدانیمان وێران کردو ئەهلەکەمان لەناوبردن و، لە شەودا سزای ئێمەیان بۆ هات یا لە کاتی نیوەڕۆدا کە نوستبوون یا خۆ لە حەسانەوەو ئیستیراحەتدا بوون. (٥) کە سزاو ئازاری ئێمەیان بۆ هات هیچیان بۆ نەمایەوە بیڵێن ئەوە نەبێ کە دان بە تاوانی خۆیاندا بنێن و بڵێن: بەڕاستی ئێمە ستەمکار بووین.

(٦) جا لە پاشەڕۆژدا پرسیار لەو خەڵکە ئەکەین کە پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانە کرابوون کە وەڵامی پێغەمبەرەکانیان چۆن داوەتەوە؟ هەروەها پرسیار لە پێغەمبەرەکانیش ئەکەین کە ئەمان چییان پێ وتوون و، ئەوان چۆن جوابیان داونەتەوە؟

(٧) جا ئەو کاتە هەموو شتێکیان بۆ ئەگێڕینەوە لە زانینەوەو لە ئاگادارییەوە. ئێمە هیچ کاتێ بێ ئاگا نەبووین لێیان و، بە هەموو شتمان زانیوە.

(٨) لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی قیامەتە کێشانەی کردەوە ڕاستەو تۆزقاڵێ زیادو کەمی تێدا نی‌یە، جا هەرکەسێ کێشی کردەوەی چاکی قورس بێ ئەوە ئەوانەن کە ڕزگار بوون.

(٩) ئەوانەیش کە کێشی کردەوەی چاکەیان سووکە ئەوە خۆیانیان دۆڕاندووە، چونکە ستەمیان لە ئایەتەکانی ئێمە کردووەو باوەڕیان پێ نەکردوون.

(١٠) بەڕاستی دەستمان گیرکردن لەسەر زەوی و تیایا دانیشتن و، هۆیەکانی ژیانمان بۆ دروست کردن تیایا، وەك کشتوکاڵ و هۆیەکانی تر، بەڵام ئێوە کەم شوکری خودا ئەکەن!

(١١) بەڕاستی ئێمە باپیرە گەورەی ئێوەمان دروست کردو، شێوەی بنیادەممان پێ دا. پاشان وتمان بە فریشتەکان: سوجدەی ئیحتیرام بەرن بۆ ئادەم، ئەوانیش هەموویان سوجدەیان بۆ برد، ئیبلیس نەبێ کە سەرپێچی کردو سوجدەی نەبرد.

قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ إِذۡ أَمَرۡتُكَۖ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡۖ وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ ٱخۡرُجۡ مِنۡهَا مَذۡءُومٗا مَّدۡحُورٗاۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿١٨﴾ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ فَكُلَا مِنۡ حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾



(١٢) خودا فەرمووی بە شەیتان: بۆ کە پێم‌وتی سوجدەت نەبرد بۆ ئادەم؟ ئەویش وتی: من باشترم لەو، منت لە ئاگر دروست کردووە کە نوورانی‌و ڕووناکەو، ئادەمت لە قوڕ دروست کردوە کە بێ نوورو تاریکە!.

(١٣) خوای گەورە پێی فەرموو: دەی دابەزە بەرەو خوارو دەرچۆ لە بەهەشت، تۆ حەقی ئەوەت نی‌یە تەکەببوری تێدا بکەیت و لە خۆت بایی ببی‌و تیایا بژیت، بێ‌گومان تۆ لە بێ قەدرەکانی.

(١٤) ئەنجا شەیتان وتی: مادەم لە بەهەشت دەرم‌ئەکەیت‌و دوورم ئەخەیتەوە، تا ڕۆژی قیامەت ماوەم بدە، تا ئەوەندەی دەستم ئەڕوا لە ئەولادی ئادەم گومڕا بکەم‌و تۆڵەی خۆمیان لێ بکەمەوە!.

(١٥) خودا فەرمووی: دە بڕۆ تا ئەو وەختە مۆڵەتت بێ.

(١٦) ئەنجا شەیتان وتی: مادام منت وەها گومڕا کرد چەقی ڕێگا ڕاستەکەتیان لێ ئەگرم‌و بۆیان دائەنیشم‌و، لەو ڕێگایە لایان ئەدەم و گومڕایان ئەکەم.

(١٧) پاش ئەوە لە هەموو لایێکەوە بۆیان دێم، لە بەردەمەوە، لە پشتەوە، لای ڕاستەوە، لای چەپەوە ، بەهەموو جۆرێ هەوڵ‌ئەدەم لەخشتەیان‌بەرم. ئەوا ئەبینی کە زۆرتریان شوکرانە بژێر نابن و بە فەرمانی تۆ ناجوولێنەوە.

(١٨) جا خودا فەرمووی: دەی دەرچۆ لە بەهەشت بەزەم‌کراوی‌و دەرکراوی‌و دوورخراوەیی لە ڕەحمەتی ئێمە. قەسەم بەگەورەییم هەر بنیادەمێ بکەوێتە شوێنت‌و بەگوێت بکات دۆزەختان لێ پڕ ئەکەم هەمووتان.

(١٩) هەروەها فەرمووی بە ئادەم (س.خ): ئەی ئادەم! تۆو ژنەکەیشت لە بەهەشت دانیشن‌و میوەو خواردەمەنی بەهەشت بخۆن، لەهەر لایێکەوە ئارەزووتان لێیە، بەڵام نزیکی ئەم دارە مەکەونەوە، واتە: داری گەنم، ئەگەرنا لە زومرەی ستەمکاران ئەبن.

(٢٠) جا شەیتان وەسوەسەی خستە دڵیانەوە تا عەورەتی داپۆشراویان دەرکەوێ بۆیان و ڕووت ببێ، کە دەرکەوتنی شتێکی ناشیرینە. چووە بن کلێشەیان وتی: خودا بۆیە خواردنی بەری ئەو دارەی لێ مەنع کردوون تا نەبنە مەلائیکە، یا تا لە بەهەشتدا بە ئەبەدی نەمێننەوە، واتە: ئەگەر بێت و لێی بخۆن یا ئەبنە مەلائیکەت یا هەتا هەتایە لە بەهەشتدا ئەمێننەوە.

(٢١) سوێندیشی بۆ خواردن کە من بەڕاستی ئامۆژگاریتان ئەکەم!.

(٢٢) جا شەیتان بە سوێند خواردن ئادەم و حەووای هەڵخەڵەتاندو لە بەرزییەوە هێنانیە پەستی، ئادەم وای ئەزانی کەس بە درۆ سوێند بە خودا ناخوات، ئیتر لە داری گەنمیان خواردو ئەو بەرگە نورانییەیان لەسەر لاچوو و، عەورەتیان دەرکەوت و، خەریك بوون گەڵای داری بەهەشتیان بەخۆیانەوە دەپێچا تا عەورەتیان دەرنەکەوێ. ئینجا خودا بانگی لێ‌کردن و فەرمووی: ئایا من مەنعم نەکردن لە خواردنی بەری ئەو دارە؟ ئایا پێم نەوتن کە بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی دیاری و ئاشکراتانە؟.

قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلْ أَمَرَ رَبِّى بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ۗ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾



(٢٣) وتیان: ئەی خودای پەروەردگار! ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، تۆ ئەگەر لە گوناهمان خۆش نەبی و ڕەحممان پێ نەکەی لە زومرەی زیانباران ئەبین.

(٢٤) ئەنجا خودا فەرمووی: لە بەهەشت داپەڕنە خوار بۆ سەر زەوی. هەندێکتان ئەبنە دوژمنی هەندێکتان. ئێوە لەسەر زەوی دائەمەزرێن و ڕائەبوێرن تا موددەتان تەواو ئەبێ و ڕۆژتان دێت.

(٢٥) خودای گەورە فەرمووی: لە زەویدا ئەژین و لەوێیش ئەمرن و، هەر لەوێیش دەرئەکرێن بۆ حەشر لە ڕۆژی قیامەتدا.

(٢٦) خودای گەورە لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە بە بنیادەمی فەرموو: ئەی ئادەمزاد! ئێمە شتی وەهامان بۆ دروست کردوون عەورەتتان داپۆشێو، شتی وەهایشمان بۆ دروست کردوون کە بۆ جوانی لەبەری کەن. بەڵام پۆشاکی لەخوداترسان و خۆ دوورخستنەوە لە گوناه باشترین بەرگ و پۆشاکە. ئەمەیش نیشانەی گەورەیی و میهرەبانیی خودایە، بەڵکو بیربکەنەوەو شوکری نیعمەتەکانی خودا بکەن.

(٢٧) ئەی ئادەمزاد! ئاگاتان لە خۆتان بێ شەیتان نەتانخەڵەتێنێو نەتانخاتە ناو میحنەتی کوفرو گومڕاهییەوە، وەك باوكو دایکتانی لە بەهەشت بە دەرکردن داو بەرگی بەهەشتی لێ دارنین و عەورەتی خۆیانی پیشان دان. بێگومان شەیتان و دەستەو بەستەکەی لە دنیادا ئێوە ئەبینن، بەڵام ئێوە ئەوان نابینن، شەیتانەکان دۆستی ئێوە نین، ئێمە ئەو شەیتانانەمان کردوونەتە دۆستی ئەو کەسانەی باوەڕیان بە خودا نی‌یە.

(٢٨) کاتێ کارێکی خراپ و ناشایستە بکەن و پێیان بوترێ بۆچی ئەو کارە نابارە ئەکەن؟ لە وەڵامدا ئەڵێن: ئێمە باوك و باپیری خۆمانمان دیون ئەم کارەیان کردووەو ئێمەیش ئەیکەین، خودایش ئەمری پێ کردووین بیکەین. جا تۆ پێیان بڵێ: حاشا وە کەللا خودا ئەمر ناکات بە کاری ناشایستەو خراپ، ئێوە قسەی ناڕەوا بەدەم خوداوە هەڵئەبەستن!.

(٢٩) تۆ پێیان بڵێ: خودا ئەمری کردووە بە میانەڕەوی‌و عەدالەت. هەروەها ئەمری کردووە بەوەی کە ڕووبکەنە خوداپەرستی لە هەموو کاتێکی سوجدەبردندا، یا لەهەر شوێنە نوێژێکدا بۆتان هەڵکەوێ. بە دڵسۆزی عیبادەت بۆ خودا بکەن، دوایی هەر بۆ لای خودا ئەگەڕێنەوەو، وەك لە سەرەتاوە دروستی‌کردن وەهایش لە حەشردا زیندووتان ئەکاتەوەو حیساب و کیتابیان لەگەڵ ئەکات.

(٣٠) جا هیدایەتی تاقمێکی داو تاقمێکیش گومڕاهییان لەسەر بوو بەماڵ، چونکە گومڕاکان شەیتانەکانیان کردنە دۆستی خۆیان نەك خودای پەروەردگاری جیهان، وایش ئەزانن خۆیان شارەزاو هیدایەتدراون.

۞ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٣٢﴾ قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٞۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٣٤﴾ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٦﴾ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾



(٣١) ئـەی ئادەمزادینـە! جلوبـەرگتان لەبەرکـەن و عـەورەتتان داپۆشـن لـە هەموو مزگەوتێکدا، لە کاتی تەواف یا لـە کـاتی نوێژکردنـداو، بـە ڕووتـی نوێژمەکـەن و بـە ڕووتـی بـە دەوری کەعبـەدا مەسـووڕێنەوە. چـی خـودا حـەرامی کـردووە حـەڵاڵی مەکـەن لـە خۆتـان. زیـادەڕەوی مەکـەن چ لـە خواردەمـەنیو چ لـە پۆشـاکدا، خـودای گـەورە ئەوانـەی خـۆش نـاوێ کـە زیادەڕەوی ئەکەن.

(٣٢) تـۆ بڵـێ: کـێ ئـەو جلوبەرگـە جوانانـەی حـەرام کـردووە کـە خـودای گەورە دەریهێناون بۆ بەنـدەکانی خـۆی، لـە گیـا وەك لۆکـەو کـەتان، یـا لـە گیانلەبـەر وەك ئاوریشـم و خـوری، یـا لەکانەکان وەك زریێو پۆشاکی جـەنگی؟ کێ ئـەو ڕزق و ڕۆزییـە پـاك و پوختـەی حەرام کردووە کە خودا دروستی کـردووە بۆ بەندەکانی خۆی؟ تۆ بڵێ: ئەم هەموو نیعمەتە لـە دنیـادا هـی موسـوڵمانانەو کافرەکانیش بە هۆی ئەوانـەوە دەستیان ئەکەوێ، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا تـەنها بـۆ خواپەرسـتانەو کـەس هاوبەشـیان نابێ.

(٣٣) تـۆ بڵـێ: خـودای گـەورە هیچـی حەرام نەکردووە ئـەو کارانـە نـەبێ کـە فاحیشـەو ناشـیرینن وەك کـوفرو فاسـقی و فجـوورو ئـازاردانی خـەڵكو دزیو جەردەیی، ئەوەی کە دیار بێ و ئەوەیش کە بەپەنهانی بکرێ. هەروەها ئەو تاوانانەی کـە حـەددی شـەرعییان لەسـەر نییەو، ستەمکردن لە خەڵك بە ناحەق. هەروەها ئەوەی لێ حەرام کردوون کە هاوبەش بۆ خـودا دابنـێن کـە بـە هـیچ جۆرێ خودا دەلیلێکی نەناردووە لەسەر ڕاستیی ئەو هاوبەشە ناحەقانە. ئەوەتان لێ حەرام کراوە کە بە بێ زانیاری و، تەنها بە دواکەوتنی قسەی باوباپیرانتان، درۆو دەلەسە بەدەم خوداوە هەڵبەستن.

(٣٤) بۆ هەموو ئوممەتێ ماوەیێکی تایبەتی دانراوە، کە ماوەکەیان تەواو بوو و ڕۆژیان هات نە سەعاتێ دوانەخرێنو نە سەعاتێ پێش ئەخرێن.

(٣٥) ئەی ئادەمیزادەکان! کە پێغەمبەرانێ لەخۆتان هاتن بۆ لاتـان ئایەتـەکانی ئێمـەیان بـۆ خوێندنـەوە، هەرکـەس حاڵی خۆی ڕێكبخا لەگەڵ خوداداو لە سزای خودا بترسێ ئەوە لە دوارۆژدا نە ترسیان ئەبێ و نە پەژارە.

(٣٦) ئەو کەسانەیش کە ئینکاری ئایەتەکانی ئێمە بکەن و خۆیان بە گەورە بزانن و سەرپێچـی بکـەن لێیـان ئەوانـە هاوڕێی ئاگری دۆزەخن و هەتاهەتایە تیایا ئەمێننەوە.

(٣٧) کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خـوداوە هەڵبەسـتێ یـا ئینکـاری ئایەتـەکانی بکـات؟ ئەوانـە چییان بـۆ نووسراوە لە ڕزق و ئەجەل پێیان ئەگات. جا کاتێ کە مەلائیکەی گیانکێشان دێن بۆ لایان گیانیان ئەکێشن و پێیـان ئەڵێن: کوان ئەو بتانەو ئەو شتانەی بێجگە خودا ئەتانپەرستن؟ ئەوانیش لە وەڵامدا ئەڵێن: ئەوانـە لێمـان ون بـوون و دیار نین، بەم جۆرە ئیعتراف ئەکەن لەسەر خۆیان کە گومڕاو کافر بوون.

قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٞ وَمِن فَوۡقِهِمۡ غَوَاشٖۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾



(٣٨) جا خودا پێی فەرموون: دە بچنە ناو کۆمەڵانی نەتەوە کافرەکانی پێش خۆتان لە بنیادەم و لە جیننی. جا هەر تاقمێ ئەڕۆیشتە ناو ئاگر لەعنەتی لە ئوممەتەکەی پێش خۆی ئەکرد کە دوایان کەوتبوون. کە هەموو لەوێ کۆبوونەوەو ڕووبەڕووی یەك وەستان پەیڕەوەکان دەربارەی ئەوانەی دوایان کەوتبوون ئەیانوت: خودایا! ئا ئەمانە بوون ئێمەیان گومڕا کرد. دە دوو قات بە ئاگر سزایان بدە، حەقی ئەوەی خۆیان گومڕابوون و هی ئەوەیش ئێمەیان گومڕاکرد. خودا ئەفەرموێ: ئێوەش و ئەوانیش هەموو تۆڵەتان لێ‌ئەسەنرێ، ئەوان هی ئەوەی خۆیان گومڕا بوون و هی ئەوەیش ئێوەیشیان گومڕا کرد. ئێوەش هی ئەوەی گومڕا بوون و هی ئەوەش عەقڵتان نەخستەکارو دوای ئەوان کەوتن. بەڵام نە ئێوەو نە ئەوان کەستان بە حاڵ و سزای کەسی ترتان نازانن.

(٣٩) ئەنجا کۆمەڵە پێشووە گومڕاکەرەکان وتیان بە کۆمەڵی دوای خۆیان کە پەیڕەوییان کردبوون: ئەوا ئێمەو ئێوە وەك یەك سزا ئەدرێین‌و، ئێوە هیچ لە ئێمە چاکتر نین. دە بچێژن سزا بەهۆی کردەوەی بەدتانەوە.

(٤٠) بێ‌گومان ئەوانەی باوەڕ بە ئایەتەکانی ئێمە ناکەن و خۆیان بە گەورەتر ئەزانن لەوەی ئیمانیان پێ بهێنن، ئەوانە هەرگیز دەرگای ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوەو، ڕەحمەتی خودا ڕوویان تێ ناکات و، تا وشتر نەچێت بە کونی دەرزیدا ئەوانیش ناچنە بەهەشت، کە مەحاڵە وشتر بچێ بە کونی دەرزیدا. ئا بەم جۆرە عادڵانە پاداشی تاوانباران ئەدەینەوەو تۆڵەی لێ ئەسێنین.

(٤١) ئەم کافرانە ڕایەخیان دۆزەخەو نوێنیان دۆزەخەو سەرو خواریان بە ئاگر گیراوە. ئا بەم جۆرە پڕ سزایە پاداشی ستەمکاران ئەدەینەوە.

(٤٢) ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بە خوداو پێغەمبەرو کردەوەی باشیان کردوە، ئێمە تەنها بەقەدەر توان تەکلیفی چاکە لە خەڵك ئەکەین، ئەوانە هاوڕێی بەهەشتن و هەتا هەتایە تیایا ئەمێننەوە.

(٤٣) هەرچی لەدڵیاندا بێ لە ئەسبابی ڕق وکینە و یەکترنەویستن دەریئەهێنین و ئەبنە برای یەکتر. لە بەردەمیاندا جۆگاو ڕووبارو گوڵ و گوڵزارە. ئەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی شارەزای ڕێگایەکی کردین گەیاندینیە ئەم نازو نیعمەتە نەبڕاوەیە. ئێمە ئەگەر هیدایەتی خودا نەبوایە هەرگیز نەئەکەوتینە سەر ئەم ڕێگایە. پێغەمبەرانی خودا بەڕاستی هاتن و باوەڕمان پێ کردن و کەوتینە دوای ئامۆژگارییەکانیان. کە چوونە ئەو بەهەشتە بانگیان لێ ئەکرێت: ئەمە ئەو بەهەشتەیە بەهۆی کرداری چاکتانەوە دەستتان کەوت.

وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا
فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن
لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا
عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ
رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ
لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ۞ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ
أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ
وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ
ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ
﴿٤٩﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا
مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى
ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا
وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ
لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٥١﴾



(٤٤) بەهەشتییەکان بانگ ئەکەنە دۆزەخییەکان و پێیان ئەڵێن: ئێمە بەڕاستی ئەوەی خودا وەعدی پێ دابووین دەستمان کەوت، ئاخۆ ئێوەیش ئەوەی خودا وەعدی پێ دابوون دەستتان کەوت؟ وتیان: بەڵێ، جا لەوێدا لەبەینی ئەو دوو کۆمەڵەدا جارچی جاڕی کێشاو وتی: لەعنەت و نەفرینی خودا لە ستەمکاران بێ.

(٤٥) ئەو ستەمکارانەی مەنعی ئادەمزاد ئەکەن لە پەیڕەوی‌کردنی ڕێگای ئایینی خوداو، ڕێگای چەوت و گومڕاهییان ئەوێ‌و باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نی‌یە.

(٤٦) لە بەینی ئەهلی بەهەشت و ئەهلی دۆزەخدا شوورایەك هەیە هەردوولا لە یەك جوێ ئەکاتەوە. لە سەرووی ئەو شوورایەوە کۆمەڵێك هەن لەوانەی لە دنیادا هاوبەشیان بۆ خودا دانەناوەو تەنها خودایان پەرستووە، بەڵام لەکردەوەی چاکدا کەموکوڕییان هەبووە. ئەم کۆمەڵە ئەهلی بەهەشت و جەهەننەم ئەناسن و بە نیشانەی تایبەتیدا لە یەکیان جیا ئەکەنەوە.. هەر لەوێوە بانگ ئەکەنە ئەهلی بەهەشت و ئەڵێن: سلاوتان لێ بێ. ئەمانە هێشتا نەچوونەتە بەهەشت و بە هیوان بچن.

(٤٧) ئەمانە کە ڕوویان بەرەو لای ئەهلی دۆزەخ وەرئەچەرخێ ئەڵێن: پەنا بە خودا، ئەی پەروەردگار! مەمانکە بە هاوڕێی ستەمکاران.

(٤٨) کۆمەڵی ئەعراف بانگ لە هەندێ پیاو ئەکەن لە سەرگەورانی کافرەکان کە بە ناوچاوانیانا ئەیانناسن، پێیان ئەڵێن: هەرچی ماڵ و سامانتان کۆکردەوە یا خۆ کۆمەڵی زۆرتان، هیچی فریاتان نەکەوت و بە کەڵکتان نەهات، هەروەها خۆبەزلزانینتان بۆ ئەم ڕۆژە سەختە سوودێکی نەبوو!.

(٤٩) کۆمەڵی ئەعراف بەو دۆزەخییانە ئەڵێن: ئا ئەم بەهەشتییانە بوون وەختی خۆی سوێندتان ئەخوارد ئەتانوت خودا هەرگیز ئەمانە ناخاتە بەهەشت و میهرەبانییان لەگەڵ ناکات؟! هەروەها ڕوویش ئەکەنە بەهەشتییەکان و پێیان ئەڵێن: بچنە بەهەشت، پیرۆزتان بێ، نە ترستان لەسەرەو نە غەم ئەخۆن.

(٥٠) دۆزەخییەکان هاوارئەکەنە بەهەشتییەکان: لەو ئاوو ڕزقەی خودا پێی داون، بڕژێنن بەسەرماندا و بەشمان بدەن. بەهەشتییەکان لە وەڵامدا ئەڵێن: بەڕاستی خودا ئەمانەی لە کافران مەنع کردووەو نایاندرێتێ.

(٥١) ئەوانەی لە دنیادا ئایینی خۆیانیان کردبووە ئارەزووبازیو گاڵتەو، ژیانی خۆشو وەختیی دنیا مەغرووری کردبوون، ئەمڕۆ کە قیامەتە ئێمە ئەوان فەرامۆش ئەکەین و گوێیان نادەینێ، وەك چۆن ئەوان ئەم ڕۆژەیان لەبیر کردبوو و ئینکاری ئایەتەکانی ئێمەیان ئەکرد.

وَلَقَدْ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ ۚ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَاءَ فَيَشْفَعُوا لَنَا أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ ۚ قَدْ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ۗ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٥٤﴾ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ الْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾



(٥٢) ئێمە کیتابێکمان بۆ هێنان کە بیرو باوەڕو حوکمەکانمان تێدا تەفصیل داو بۆمان ڕوون کردنەوەو، خۆمان ئەزانین چۆنو بۆچی تەفصیلمان داون و، هەموو پڕن لە حیکمەت و، هۆی شارەزایی و ڕەحمەتن بۆ ئەوانەی ئیمان ئەهێنن و سەرپێچی ناکەن.

(٥٣) کافرەکان چاوەڕوانی ئەوەن ئەنجامی فەرموودەکانی قورئان، لە وەعدو وەعیدو سزاو پاداش بێنەدیو ڕۆژی قیامەت بێت. کە ئەوانە هاتنە دی و ڕۆژی قیامەت هات ئەوانەی لە دنیادا قورئانیان لەبیرکردبوو سەرپێچییان ئەکرد، ڕاستییان بۆ دەرئەکەوێت و ئەڵێن: پێغەمبەرەکان لە دنیادا ڕاستیان کردو ڕاستیان هێناو، ئێمە باوەڕمان پێ نەکردن. ئاخۆ لەم ڕۆژەدا تکاکار هەن تکامان بۆ بکەن و لە سزا ڕزگارمان بکەن؟ ئاخۆ ئەمانگەڕێننەوە بۆ دنیا تا کردەوەی تر بکەین غەیری ئەوەی ئەوسا ئەمانکرد؟ خودای گەورەیش ئەفەرموێ: نەخێر ئێستە ماوەی هیچ نەماوە، ئەمانە لە دنیادا خۆیان دۆڕاندو ئێستە ماڵوێرانن و، ئەو بوختان و درۆیانەی لە دنیادا کردنیان فریایان ناکەون.

(٥٤) خودای ئێوە خودایێکە ئاسمانەکان و ئەرزی دروست کردووە لە شەش ڕۆژداو، بوو بە فەرمانڕەوا بەسەر عەرشداو، بە هێزی خۆی شەو ئەکاتە پەردەو ڕۆژی پێ دائەپۆشێ و بە پەلە دێ بەدوایا وەك بیەوێ بیگرێ، هەروەها خۆرو مانگ و ئەستێرەکانی دروست کردوون کە هەموویان ڕامن لەبەردەستیداو بە ئارەزوو و خواستی ئەو ئەسووڕێنەوە. هەر خودایە ئەتوانێ هەموو شت دروست بکات و، هەر ئەوە فەرمانڕەوا، خودا پاك و بێگەردەو لە هەموو ئەندێشەو خەیاڵێ بەرزترەو پەروەردگاری هەموو عالەمە.

(٥٥) بە ترس و گریان و خوشووعەوە لە خودای خۆتان بپاڕێنەوە بە پەنامەکی، خودا ئەو کەسانەی خۆش ناوێ لە دوعاو پاڕانەوەدا لە ڕێگای شەرع لا ئەدەن و داوای شتی ناڕەوا ئەکەن یا بە بێ مەعنا لە دوعاکردندا دەنگ بەرزئەکەنەوە.

(٥٦) پاش ئەوەی خودا پێغەمبەری بۆ ناردن و ئایینی بۆ دیاری کردن و، زەوی ئاوەدان کردەوە، دەست مەدەنە خراپەکاریو گوناهو تاوانو لە خودای خۆتان بپاڕێنەوە لەگەڵ ترس و هیوادا، ترس لە قبووڵ نەبوونی پاڕانەوەکەتان و، هیوای قبووڵ بوون و ئومێدی لوتفی خودای میهرەبان، بێگومان لوتف و میهرەبانی خودا لە چاکەکارانەوە نزیکە.

(٥٧) خودا ئەو خودایە باکان ئەنێرێ، موژدەی بارانی ڕەحمەتیان پێیە، کە هەوری قورس و زۆریان هەڵگرت بەرەو وڵاتێك ئەیاندەینەبەر کە مردووەو سەوزاییو ژیانی تێدا نییە، لەوێ بارانی پێ ئەبارێنین و، لەو زەوییە مردووەدا هەموو جۆرە بەرو گیایەك ئەڕوێنین. بەڵێ چۆن دەستمان ئەڕوات ئەمە بکەین وەهایش مردوو زیندوو ئەکەینەوە. بەڵکو ئێوە بیربکەنەوەو بڵێن: مادام خوا ئەتوانێ ئەم زەوییە مردووە زیندوو بکاتەوە بەو جۆرەیش ئێمە زیندوو ئەکاتەوە، جا ڕوو بکەنە خوداو ڕێگای ڕاست بگرنەبەر.

وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ﴿٥٨﴾ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥٩﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى ضَلَٰلَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنصَحُ لَكُمْ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٦٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ۞ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾



(٥٨) جا وڵاتێ کە ئەرزەکەی باش و بەبەرەکەت بێ گیای زۆرو بەسوود ئەڕوێنێ. ئەو شوێنەیش کە شۆرەکات و بێخێر بێ شتێکی کەم و بێکەڵك ئەڕوێنێ. ئێمە ئابەم جۆرە ئایەتەکان دووبارە ئەکەینەوە بۆ کۆمەڵێ کە شوکرانەبژێری نیعمەتەکانی خودان و بیرئەکەنەوە لەو هەموو خێرو بەرەکەتەی خودا بۆ ئادەمیزادی ئامادەکردوەو ڕژاندوویەتی بەسەریاندا.

(٥٩) بەڕاستی نووحمان ڕەوانە کرد بە پێغەمبەری بۆ سەر قەومەکەی خۆی و، وتی: قەومینە! خودا بپەرستن، بێجگە لەو خودایەکی ترتان نی‌یە. بەڕاستی من ئەترسم لێتان ئەگەر ئیمان بە خودا نەهێنن‌و نەیپەرستن تووشی سزاو ئازاری ڕۆژێکی گەورە ببن، کە ڕۆژی سامناکی قیامەتە.

(٦٠) جا کۆمەڵی دەست ڕۆیشتووی قەومەکەی پێیان وت: بێگومان ئێمە لامان وایە تۆ لە گومڕاهییەکی ئاشکرادای.

(٦١) ئەویش پێی وتن: ئەی قەومەکەم! من هیچ جۆرە گومڕاهییەکم نی‌یە، من پێغەمبەرو فروستادەی پەروەردگاری هەردوو جیهانم.

(٦٢) پەیامی خوداتان پێ ئەگەیێنم و دەرزو ئامۆژگاریتان پێ ئەدەم. من شتی وەها لای خوداوە ئەزانم کە ئێوە نایزانن.

(٦٣) بۆ لاتان سەیرەو سەرتان سووڕ ئەمێنێ لەوەی کە ئامۆژگارییەکتان لای خوداوە بۆ بێت لەسەر دەستی یەکێ لە خۆتان کە ئادەمیزاد بێ وەك خۆتان، بۆ ئەوەی لە سزای ڕۆژی قیامەت بتانترسێنێ، تا خۆتان لە گوناه دوور بخەنەوەو لە خودا بترسن بە هیوای ئەوەی بەر ڕەحمەتی خودا بکەون؟! کافرەکان بەلایانەوە سەیر بوو بنیادەمێ بێت ئامۆژگارییان بکات، بە تەمای ئەوە بوون مەلائیکەیان بۆ بێت.

(٦٤) جا قەومەکەی باوەڕیان پێ‌نەکردو دوای ئامۆژگارییەکانی نەکەوتن، لەبەرئەوە خۆی و خاوەن ئیمانەکانمان ڕزگار کرد کە لە کەشتییەکەیدا لەگەڵی بوون، ئەوانەش باوەڕیان بە ئایەتەکانمان نەکرد غەرقمان کردن و تۆڵەی خۆیان وەرگرت، دڵ و چاویان کوێر بوو لە ئاستی ڕاستی و باوەڕیان بە هیچ نەئەکرد.

(٦٥) هەروەها هوودمان نارد بۆ سەر قەومی عاد کە یەکێك بوو لە خۆیان، وتی: قەومینە! خودا بپەرستن، خودایەکی ترتان نی‌یە لایقی پەرستن بێ ئەو نەبێ، بۆچی لە خوداناترسن و لە گومڕاهی دوور ناکەونەوە؟.

(٦٦) کافرە دەستەڵاتدارەکانی قەومەکە پێیان وت: بەڕاستی ئێمە تۆ بە نەفام دائەنێین و، وائەزانین لە زومرەی درۆزنانی!.

(٦٧) وتی: قەومینە! من نەفام و بێعەقڵ نیم من پێغەمبەرێکم لەلایەن پەروەردگاری هەموو عالەمەوە نێرراوم.

أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبۡتُمۡ
أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡۚ
وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ قَوۡمِ نُوحٖ وَزَادَكُمۡ
فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ
﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ
يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَاۖ فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ
﴿٧٠﴾ قَالَ قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ رِجۡسٞ وَغَضَبٌۖ
أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم
مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ
ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا
وَقَطَعۡنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ وَمَا كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ
﴿٧٢﴾ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن
رَّبِّكُمۡۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗۖ فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ
فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٧٣﴾



(٦٨) ئەوەی خودا ناردوویەتی و پەیامی خوداو فەرمانەکانیەتی پێتان ڕائەگەیێنم. من لە ئامۆژگاری‌کردنی ئێوەدا خیانەت ناکەم و دڵسۆزتانم.

(٦٩) بۆچی لاتان سەیرە لەلایەن خوداوە ئامۆژگارییەکتان بۆ بێ لەسەر دەستی پیاوێکدا لە خۆتان، تا لە سزای خودا بتانترسێنێ؟ بیری ئەوە بکەنەوە کە خودا ئێوەی کردە جێگەداری قەومی نووح و موڵك و داراییتان دەست کەوت و، لەوان زیاتر باڵای بەرز کردن و هێزی دانێ. بیری نیعمەتەکانی خودا بکەنەوەو شوکرانەبژێر بن بەلکو ڕزگارو سەرفراز بن.

(٧٠) قەومەکەی پێیان وت: تۆ بۆ ئەوە هاتوویتە لامان تەنها خودا بپەرستین و، واز لەو بتانە بهێنین کە باوباپیرانمان ئەیانپەرستن؟ ئەگەر ڕاست ئەکەی ئەو هەڕەشەو بەڵێنانە کە ئەمانەدەیتێ بیانهێنە بۆمان و بیانهێنەدی.

(٧١) ئەویش فەرمووی: بەڕاستی لەلایەنی خوداوە سزاو غەزەب نازڵ بووەتە سەرتان و موستەحەققینی؟، ئایا ئێوە موجادەلەم لەگەڵ ئەکەن لەسەر چەند شتێ کە ئێوەو باو باپیرتان ناوتاننناون خوداو، خودا هیچ دەلیلێکی نەناردووە لەسەر پەرستنی ئەوانە، دەی ئێوە چاوەڕوانی ئەو سزایە بن و منیش لەگەڵتان چاوەڕوانی ئەکەم.

(٧٢) ئەنجا هوودو ئەوانەی ئیمانیان هێنا لەگەڵیا بە لوتف و میهرەبانیی خۆمان ڕزگارمان کردن لە سزاو، ئەوانەشمان بنبڕ کردن کە باوەڕیان بە ئایەتەکانمان نەبوو و کافربوون و، شوێنەوارمان نەهێشتن.

(٧٣) هەروەها ڕەوانەشمان کرد بۆ سەر قەومی ثەموود صالحی برایان کە یەکێك بوو لە قەومەکەی خۆی. پێی وتن: قەومینە! تەنها خودا بپەرستن، خودایەکی ترتان نی‌یە شایانی پەرستن بێ ئەو نەبێ. بەڕاستی ئایەت و موعجیزەیێکتان لەلایەن خوداوە بۆ هاتووە، ئەمە وشترێکە خودا لە غەیری ڕێگەی عادەتییەوە، دروستی کردووە بۆتان، وازی لێ بێنن با لە زەوی خودادا بلەوەڕێ و، خراپ دەستی لێ مەدەن کە ببێتە هۆی ئەوەی سزایێکی توند و تیژ بدرێن.

وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ وَبَوَّأَكُمۡ
فِي ٱلۡأَرۡضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورٗا وَتَنۡحِتُونَ
ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗاۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ
مُفۡسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن
قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ
أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ
مُؤۡمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ
ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ
أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ
ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ
جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ
رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ
﴿٧٩﴾ وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم
بِهَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ
شَهۡوَةٗ مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿٨١﴾



(٧٤) بیری ئەو نیعمەتەی خودا بکەنەوە کە کردنی بە جێگەنشین پاش قەومی عادو لەسەر زەوی دایمەزراندن کە لە دەشتە ئاسانەکەیدا کۆشك و تەلار دروست بکەن، هەروەها لەکێوەکانیش لەو بەردە ڕەقانە هۆدەی جوان و ڕێك بتاشن و تیایانا بحەسێنەوە. لەبەر ئەوە یادو باسی نیعمەتەکانی خودا بکەن لەسەر خۆتان و شوکرانەبژێر بن و بەدکاری و پیاوخراپی مەکەن لە زەویدا.

(٧٥) جا ئەو کۆمەڵە کە وا خۆیان بە گەورە دائەنا لە قەومی صالح بە موسوڵمانەکانیان وت کە بێهێز بوون: ئایا ئێوە ئیمان و باوەڕتان هەیە بەوە کە صالح لای خوداوە نێرراوەو پێغەمبەرو ڕەهبەرە؟ وتیان: بەڵێ ئێمە باوەڕمان هەیە بەو ئایینەی لەگەڵ ئەو ڕەوانە کراوە.

(٧٦) بەڵام ئەوانەی خۆیان بە گەورە ئەزانی لە قەومی صالح وتیان ئێمە باوەڕمان نی‌یە بەوەی ئێوە ئیمانتان پێ‌هێناوەو ئینکاری ئەکەین.

(٧٧) جا چوارپەلی وشترەکەیان پەی کردو، لە فەرمانی خودا دەرچوون و وتیان: ئەی صالح! ئەگەر ڕاست ئەکەی تۆ لە پێغەمبەرانی، دەی ئەو سزاو عەزابەی وەعدت پێ‌دابووین بۆمان بێنە.

(٧٨) ئەوەندەی پێ‌نەچوو بومەلەرزە گرتنی و هەر لە خانوو بەرەکەی خۆیاندا سارد بوونەوەو مردن.

(٧٩)جا صالح پێغەمبەر پشتی لێ‌هەڵکردن و وتی: ئەی قەومی من! من بەڕاستی پەیامی خودام پێ گەیاندن و ئامۆژگاریم کردن و دڵسۆز بووم بۆتان، بەڵام ئێوە ئامۆژگاریکەرو دڵسۆزتان خۆش ناوێ!.

(٨٠) باسی حەزرەتی لووط بکە کاتێ وتی بە قەومەکەی ئایا ئێوە کارێکی فاحیشەی وەها ئەکەن کەس لە دنیادا ئەو کردەوە ناشیرینەدا پێشتان نەکەوتووە؟!

(٨١) ئێوە ئارەزووی خۆتان لە پیاواندا جێبەجێ ئەکەن نەك لە ژناندا. بەڕاستی ئێوە قەومێکی لە سنوور دەرچوون.

وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن
قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ
إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم
مَّطَرًاۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾
وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًاۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن
رَّبِّكُمْۖ فَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُواْ
ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ
إِصْلَٰحِهَاۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ
﴿٨٥﴾ وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ
عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًاۚ
وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْۖ وَٱنظُرُواْ
كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ
مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ
فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَاۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾



(٨٢) قەومەکەی هیچ وەڵامێکیان نەبوو ئەوە نەبێ کە وتیان: لووط و جەماعەتەکەی لەم دێیەتان دەرکەن، ئەمانە خەڵکێکن خۆیان لە کردەوەی ئێمە پاك ڕائەگرن و حەز لە کاری ئێمە ناکەن!.

(٨٣) ئەنجا لووط و خێزانەکەیمان ڕزگار کردن، ئەوانەی کە ئیمانیان هەبوو، ژنەکەی نەبێ کە لە زومرەی لەناوبراوەکان بوو.

(٨٤) هەروەها بارانێکی سەیرمان بەسەردا باراندن، جا تەماشاکە ئەنجام و پاشەڕۆژی تاوانکاران چۆن بوو؟.

(٨٥) بۆ سەر ئەوەو بەرەی مەدیەن، شوعەیبمان نارد، کە یەکێ بوو لە خۆیان و خزم و کەسیان بوو، پێی وتن: ئەی خزمینە! تەنها خودا بپەرستن، ئێوە هیچ خودایەکی شایانی پەرستنتان نی‌یە ئەو نەبێ. ئێوە لای خوداوە موعجیزەتان بۆ هاتووە. دەی لە پێوانەو کێشانەدا دەستتان ڕاست بێ‌و حەقی خەڵك کەم مەکەنەوە، پاش ئەوە کە خودای پەروەردگار پێغەمبەرانی ناردو شەریعەتیان بۆ ڕوون کردنەوەو کاروباری سەر زەوی باش بوو، ئێوە دەست مەدەنە خراپەکاری. پەیڕەوی کردنی ئەم ئامۆژگارییانە بۆ ئێوە باشتر و بەسوودترە ئەگەر خاوەن ئیمانن.

(٨٦) دامەنیشن لەسەر هەموو ڕێگایێك ڕێگا لە خەڵك بگرن و هەڕەشەیان لێ بکەن و، ڕێگای ئەوەیان لێ بگرن کە بچن بۆ لای شوعەیب و دوای بکەون، بتانەوێ گومان بخەنە دڵیانەوەو ڕێگای چەوت بگرن. بیری ئەوە بکەنەوە کە ئێوە کەم بوون چ لە لایەنی ژمارەوەو چ لە لایەنی شتومەکەوەو، خودا زۆری کردن و یارمەتی دان. هەروەها سەیرکەن ئەنجامی بەدکاران چی بوو، ئێوە لە بەسەرهاتی ئەوان پەند وەربگرن و بەدکار مەبن.

(٨٧) جا ئەگەر تاقمێك لە ئێوە ئیمانی هێنا بەوەی خودا ڕەوانەی کردوە لەگەڵ من و تاقمێکتان ئیمانی نەهێنا ئەوا چاوەڕوان بن تا خودا حوکمان لەبەیندا ئەکات و یارمەتی حەق ئەدات بەسەر ناحەقدا. بێ‌گومان خودا چاکترین داوەرەو ڕەواترین حوکم ئەدات.

۞ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴿٨٩﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٩٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩١﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟ هُمُ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ ۖ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٩٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّبِىٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَوا۟ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩٥﴾



(٨٨) جا ئەو کۆمەڵەی خۆیان بە گەورە دائەنا لە قەومەکەی شوعەیب وتیان: ئەی شوعەیب یا خۆت و ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لەگەڵتا لە دێکەمان دەرتان ئەکەین، یا ئەبێ بگەڕێنەوە سەر ئایینەکەی ئێمە! شوعەیب وتی: ئێمە ڕقمان لە ئایینەکەتانە، ئیتر چۆن ئەگەڕێینەوە سەری؟!.

(٨٩) ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە سەر ئایینە ناحەقەکەی ئێوە، کە خودا ڕزگاری کردووین لێیو هیدایەتی داوین، ئەوە ئێمە درۆو بوختان بۆ خودا هەڵئەبەستین بەوە کە هاوبەشی بۆ دابنێین، ئێمە هەرگیز ناگەڕێینەوە بۆ ئەو ئایینە ناحەقەی ئێوە، مەگەر خودای پەروەردگارمان بیەوێ سەرمان لێ تێك بداو عاقیبەت شەڕمان بکات. عیلمی خودا بەربڵاوەو هەر خۆی ئەزانێ بەوەی بووە و بەوەی لە لایەن ئێمەو ئێوەوە ئەبێ. ئێمە پشت بە خودا ئەبەستین کە لەسەر ئەم ئایینە ڕاستەی خۆمان دامانبمەزرێنێو لە بەدکاران ڕزگارمان بکات. خودایا! بەڕاستی حوکم بکە لە بەینی ئێمەو قەومەکەمانداو حەق و ناحەق لە یەك جیابکەرەوە، بێ‌گومان هەر تۆ چاکترین داوەریو حەق و ناحەق ڕوون ئەکەیتەوە.

(٩٠) ئەو کۆمەڵەی کە کافر بوون لە قەومی شوعەیب وتیان بە خەڵك: ئەگەر دوای شوعەیب بکەون و باوەڕی پێ بکەن و واز لە ئایینی خۆتان بێنن زەرەر ئەکەن و زیانمەند ئەبن!.

(٩١) جا بە ڕق و قینی خودا بە کوتوپڕی بوومەلەرزە گرتنیو هەر لە خانووبەرەکەی خۆیاندا کەوتن و مردن.

(٩٢) ئەوانەی شوعەیبیان بەدرۆئەخستەوەو باوەڕیان پێ نەئەکرد، وەها بنبڕ کران و شوێنەواریان نەما، ئەتوت لەو شوێنەشدا نەژیاون. ئەوانەی شوعەیبیان بەدرۆئەخستەوە، هەر خۆیان ماڵوێران و زەرەرمەند بوون.

(٩٣) ئەنجا شوعەیب پشتی لێ هەڵکردنو وتی: ئەی خزمینە! من بەڕاستی نامەکانی خودام پێ گەیاندن و دڵسۆزتان بووم، ئیتر چۆن خەم بخۆم بۆ ئەنجامی ناخۆشی کۆمەڵێکی کافر، کە باوەڕیان بە تەنیایی خودا نەبوو؟.

(٩٤) کە پێغەمبەرمان ناردبێ بۆ هەر دێو ئاوەدانییەك و بەگوێیان نەکردبێ ئەهلەکەیمان تووشی سزاو ناخۆشیو تەنگایەتی کردووە، بەڵکو بکەونە سەر ڕێی ڕاست و لە خودا بپاڕێنەوە ئەو نارەحەتییەیان لێ دووربخاتەوە.

(٩٥) دوایی لە باتی نارەحەتیو تەنگانەیی خۆشیو هەرزانیو فراوانیمان پێ دان، تا بیربکەنەوەو باوەڕ بە دەستەڵاتی خودا بکەن، کەچی هەر ئەوەندە کە ڕزگار بوون و حاڵ و ماڵیان زۆر بوو، لە باتی شوکرانەبژێریو سوپاسگوزاری وتیان: ئەم ڕووداوانە شتێکی عادەتین و ئەمە یاسای جیهانەو، باوك و باپیرانیشمان تووشی خۆشی و ناخۆشی بوون و بارودۆخی جیاجیایان دیوە. ئەنجا کوتوپڕو بە بێ‌ئەوەی بە خۆیان بزانن سزامان بۆ ناردن و تۆڵەمان لێ کردنەوە.

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ
مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا
يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَاتًا
وَهُمْ نَائِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا
ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُوا مَكْرَ اللَّهِ فَلَا يَأْمَنُ
مَكْرَ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ
يَرِثُونَ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ أَهْلِهَا أَن لَّوْ نَشَاءُ أَصَبْنَاهُم
بِذُنُوبِهِمْ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾
تِلْكَ الْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَائِهَا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم
بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا مِن قَبْلُ
كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الْكَافِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا
لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ وَإِن وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ
﴿١٠٢﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِآيَاتِنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ
فَظَلَمُوا بِهَا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾
وَقَالَ مُوسَىٰ يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٠٤﴾



(٩٦) ئەگەر ئەهلی ئەو دێیانە لەباتی کافریو بێگوێیی ئیمانیان بهێنایەو بەگوێی پێغەمبەرانیان بکردایەو لە خودا بترسانایە ئێمە لە هەموو لایێکەوە دەرگای ڕزق و ڕۆزی و بەرەکەت و خۆشیمان بۆ ئەکردنەوە، بەڵام ئەوان پێغەمبەرانیان بەدرۆئەخستەوەو کافر بوون، بۆیە ئێمەیش بەهۆی ئەو کردارە خراپانەیانەوە تۆڵەمان لێ سەندن و سزامان دان.

(٩٧) ئایا پاش ئەمە ئەهلی ئەو دێیانە ئەمینن و دڵنیان لەوەی کە لە شەوداو لەکاتێکدا کە ئەوان نووستوون و ئاگایان لە خۆیان نیيە سزاو عەزابی ئێمەیان بۆ نایێو تۆڵەیان لێ ناسەنرێتەوە؟!.

(٩٨) یا دڵنیان لەوەی کە لەکاتی چێشتەنگاودا، کە خەریکی یاریو ڕابواردنن، سزای ئێمەیان بۆ نایێت؟!

(٩٩) یا خۆ ئەو خەڵکانە ئەمینن لە قەهرو غەزەبی خودا؟ کەس لە قەهرو غەزەبی خودا ئەمین نابێ ئەوانە نەبێ کە زەرەرمەندن و کافرن و بیر لە گەورەیی خودا ناکەنەوە.

(١٠٠) ئایا ئەوانەی لەجێی خەڵقە پێشووەکان دانیشتوون و، سەرزەوییان بە میرات بۆ ماوەتەوە، خودا بۆی ڕوون نەکردوونەتەوە کە ئەگەر ئێمە بمانەوێ بەهۆی تاوانەکانیانەوە تۆڵەیان لێ ئەستێنین، وەك لە پێشووەکانمان سەند، هەروەها دڵیان مۆر ئەکەین و حەق نابیسن بە جۆرێکی وەها کە پەندو عیبرەت وەربگرن.

(١٠١) ئەمانە ئەو دێو ئاوەدانییانە بوون کە بەسەرهاتیانت بۆ ئەگێڕینەوە. بێگومان پێغەمبەرانیان بۆ هاتبوون بە موعجیزەو دەلیلەوە، بەڵام ئەو خەڵکانە هەرگیز ئیمانیان نەهێنا بەو شتانەی لەپێشدا باوەڕیان پێ نەکردبوو، چونکە بەردەوام بێباوەڕو سەرکەش بوون. ئاوەها خودا دڵی کافران مۆر ئەکات کە ئامادە نین ڕاستی ببیسن و باوەڕی پێ بکەن.

(١٠٢) بەشی زۆر ئەوانە عەهدو پەیمانمان لێ نەبینین، بەڕاستی زۆرتریان فاسق و لەڕێلادەر بوون.

(١٠٣) لەپاش ئەوان مووسای کوڕی عیمرانمان لەگەڵ موعجیزەدا نارد بۆ لای فیرعەونی قیبتیی پاشای میسرو کۆمەڵە هاوبیرەکەی. ئەوان ستەمیان لە ئایەتەکان کردو ئینکاری موعجیزەکانیان کرد، جا سەیر کە ئەنجامو پاشەڕۆژی ستەمکاران چۆن بوو؟.

(١٠٤) مووسا وتی: ئەی فیرعەون! من لە لای خودای پەروەردگاری هەموو جیهانەوە بۆ لای ئێوە نێرراوم و پێغەمبەری خودام.

حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ قَالُوٓا۟ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلْقُوا۟ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ سَحَرُوٓا۟ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا۟ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾



(١٠٥) شایانی پێغەمبەرایەتیی من ئەوەیە کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵنەبەستم، واجبە لە سەرم ڕاستی نەبێ هیچ نەڵێم. من موعجیزەی ئاشکرام هێناوە بۆتان بۆ ئیسباتی ڕاستیی قسەکانم و پێغەمبەرایەتیم، کەواتە بەنی ئیسرائیلم لەگەڵدا بنێرەوەو ماوەیان بدە با لەگەڵمدا بگەڕێنەوە بۆ نیشتمانی خۆیان کە جێگای باوباپیرانیان بووە.

(١٠٦) فیرعەون وتی بە مووسا: ئەگەر لای خوداوە ئایەتێکت هێناوە بێنیە پیشانی بدە ئەگەر ڕاست ئەکەی !.

(١٠٧) مووسایش عاساکەی فڕێ‌داو کوتوپڕ عاساکە بوو بە مارێکی گەورەی ئاشکرا.

(١٠٨) هەروەها دەستی لە بنباڵی دەرهێناو کوتوپڕ بوو بە ماددەیێکی نوورانیی زیاد لەئەندازە سپیو ڕووناك بۆ ئەوانەی لەوێ سەیریان ئەکرد.

(١٠٩) کۆمەڵێ لە قەومی فیرعەون وتیان: ئەم کابرایە بەڕاستی جادووگەرێکی زانایە.

(١١٠) ئەیەوێ زاڵ ببێت بەسەرتانداو لە جێو ڕێو نیشتمانی خۆتان دەرتان بکات! چی ئەڵێن بیکەین، چار چی‌یە؟

(١١١) وتیان بە فیرعەون: خۆیو براکەی لێرە ڕاگرەو لە کاریاندا پەلە مەکەو، مەئموور بنێرە بە وڵاتدا بۆ کۆکردنەوەی جادووگەران.

(١١٢) با هەرچی جادووگەری زانا هەیە بۆت بێنن.

(١١٣) جا مەئموورەکان ڕۆیشتن و جادووگەرێکی زۆریان کۆکردەوەو هەموو هاتنە لای فیرعەون و، وتیان: ئایا ئێمە پاداشێکی چاکمان ئەبێ ئەگەر هات و سەرکەوتین؟.

(١١٤) فیرعەون وتی: بەڵێ پاداشیان ئەبێ و، سەرەڕای ئەوەش لە منەوە نزیك ئەبن و حورمەتیان لێ ئەگیرێ.

(١١٥) جادووگەرەکان وتیان: ئەی مووسا! یا تۆ لەپێشان ئەسبابی جادووی خۆت دەربکەو فڕێی‌بدە یا ئێمە یەکەم جار فڕێی ئەدەین.

(١١٦) مووسا وتی: نەخەیر، ئێوە جادووی خۆتان دەربخەن و ئەسبابی خۆتان فڕێ بدەن. جا کە ئەوان جادووی خۆیان فڕێ‌دا خەڵکیان چاوبەست کردو شتی ناڕاست و درۆیان بە ڕاست پیشان دان و ترساندنیان و، جادوویێکی زلیان خستەکار.

(١١٧) جا وەحیمان کرد بۆ مووسا: کە عاساکەی خۆت فڕێ‌دە، کە فڕێی دا هەموو کەرەستەی جادووگەریی جادووەکانی فیرعەونی قووت دا.

(١١٨) جا بەم ڕووداوە ڕاستی قسەی مووسا دەرکەوت و، ئەوەی ئەوان کردیان و چاوبەستی خەڵکیان پێ کرد هەمووی پووچ و بێ‌کەڵك دەرچوو.

(١١٩) کە مووسا موعجیزەکەی نواندو جادووەکەی ئەوانی بەتاڵ کردەوە، جادووگەرەکان بەزین و ملکەچ بوون و بەزەلیلی و بەزێنراوی سەرشۆڕو ماڵوێران و ڕەنجەڕۆ بوون.

(١٢٠) ئەو موعجیزە گەورەیە جادووگەرەکانی وەها سەرسام کرد ماتو مەبهووتو بێ ئیرادە کەوتن بەڕووداو سوجدەیان برد بۆ خودای مووساو هەموو عالەم.

قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِى ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُواْ مِنْهَآ أَهْلَهَا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا ۚ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ ۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَآءَهُمْ وَنَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓاْ ۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا ۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾



(١٢١) وتيان: ئیمانمان بە پەروەردگاری هەموو عالەمەکان هێنا.

(١٢٢) ئەو پەروەردگارە کە مووساو هاروون ئەیپەرستن.

(١٢٣) جا فیرعەون بە جادووگەرەکانی وت: ئایا پێش ئەوەی من ڕێگاتان بدەم ئیمانتان پێ هێنا؟! بێگومان ئەم کارە فێڵو پیلانێکە لەم شارەدا بەرپاتان کردووە بە هاوکاری لەگەڵ مووسادا تا قیبتییەکانی لێ دەرکەن و بۆ خۆتان و بەنی ئیسرائیل بمێنێتەوە. لەمەوپاش بۆتان دەرئەکەوێ چیتان بەسەردێنم!!.

(١٢٤) بەڕاستی دەست و پێتان، ڕاست و چەپ، لە هەر ئەندامی لایەك ئەبڕمەوەو، هەمووتان ئەدەم لە دارو هەڵتانئەواسم.

واتە: دەستی ڕاست و پێی چەپ، دەستی چەپو پێی ڕاستتان ئەبڕمەوەو هیچ لایێکتان بە ساغی ناهێڵمەوەو ئەنجا بۆ پەندو عیبرەتی خەڵکیش هەڵتانئەواسم.

(١٢٥) وتیان چی ئەکەی بیکە. ئێمە ئەگەڕێینەوە بۆ لای خودای خۆمان و چاوەڕوانی لوتف و میهرەبانیی ئەوین. لامان موهیم نییە تۆ چی ئەکەی؟

(١٢٦) تۆ ئەوەت لا خراپە کە ئێمە ئیمانمان هێنا بە موعجیزەکانی پەروەردگارمان کە هاتن بۆمان. ئەوەش ئەوپەڕی چاکییەو هی ئەوە نییە ئینسان پێی ناخۆش بێ. خودایا تۆیش سەبرو خۆگری بەسەر دڵماندا بڕێژەو بە موسوڵمانی بمانمرێنە.

(١٢٧) دەسەڵاتدارەکانی قەومی فیرعەون و دەستەو بەستەکەی پێیان وت: ئایا واز لە مووساو قەومەکەی ئەهێنی بەدکاری بکەن لە سەرزەویو تۆو خوداکەت بەجێبێڵن و ئیمانتان پێ نەهێنن؟!. فیرعەون وتی: ئەمە چاری ئاسانە، هەرچی نێرینەیانە ئەیانکوژین و بنبڕیان ئەکەین و تۆویان ناهێڵین، ئەوەیش مێینەیانە بە زیندوویەتی ئەیانهێڵینەوەو زەلیلیان ئەکەین. ئێمە بەسەریاندا زاڵین.

(١٢٨) کە مووساو بەنیئیسرائیل ئەم هەڕەشەو پیلانەی فیرعەونیان بیست کە مووسا بە قەومەکەی وت: داوای یارمەتیو پشتیوانی لە خودا بکەن خۆگر بن. زەوی هەموو مولکی خودایەو کەس خاوەنی ڕاستەقینەی نییە، خودا زەویو دەستەڵاتی سەرزەوی ئەدا بە هەرکەس کە مەیلی لێ بێ و، ئەنجامی پیرۆزو پڕ بەختەوەری هی ئەوانەیە خۆیان لە گوناه ئەپارێزن و بەڕاستی لە خودا ئەترسن.

(١٢٩) بەنی ئیسرائیلیەکان وتیان: ئەی مووسا! ئێمە پێش ئەوەی تۆ بێی بۆ لامان ئازاردراوین و کە تۆیش هاتی ئازاردراین و زۆر دڵ پەرێشانین. مووسا پێی وتن: بەڵکو خودا دوژمنەکانتان لەناوبەریو ئێوە بکاتە جێنشین لەسەر عەرزو سەیرتان بکات چۆن ئەجووڵێنەوە: خوداپەرستی ئەکەن تا پاداشتان بداتەوە، یا ستەمکارو بێئایین ئەبن تا سزاتان بدات؟

(١٣٠) پاش ئەوە دەستەو بەستەی فیرعەونمان تووشی قاتیو قڕیو گرانی کردو، بەروبومی کشتوکاڵو دارو درەختمان کەم کردنەوەو ئازارمان دان بەڵکو بێنەوە سەر هۆشی خۆیان و بیربکەنەوە لە دەستەڵات و گەورەیی خوداو ڕوو بکەنە خوداپەرستی و دووربکەونەوە لە بێئایینی.

فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ
يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ
أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣١﴾ وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ
لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ
ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ
فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ
ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ لَئِن
كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ
إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ
هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ
فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾
وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ
ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ
ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ
يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ ﴿١٣٧﴾



(١٣١) ئەمانە ئەگەر خێرو خۆشی ڕوویان تێ بکات وەك باران و ڕزق و ڕۆزیی فراوان ئەڵێن: حەقی خۆمانەو خۆمان لایقی ئەم خێـرو خۆشـییەین. کـە ناخۆشـییەکیش ڕوویـان تێنـەکا ئـەڵێن: ئەمـە نەگبـەتیی مووسـاو دەسـتەو بەستەکەیەتی! نەخـەیر ئەو نەگبەتییەی ئەوان لای خوداوە ئـەدرێ بەسـەریاناو مووسـا هـیچ دەسـتێکی لـەو کـارەدا نیـیـە. بـەڵام بەشـی زۆری ئەوانـە نەزان و نەفامن و بیرناکەنەوە.

(١٣٢) کافرەکـان بـە مووسـایان وت: هەرچی موعجیزەو ئایەتێکمان بۆ بێنی تا دڵمان داگیر بکەی، ئێمە هـەرگیز بـاوەڕت پێ ناکەین و ئیمانت پێ ناهێنین.

(١٣٣) ئەنجا لافاوو بارانی توندمان نـاردە سـەریان تـا کشـتوکاڵیان لەناوبـەرێو، کوللەمان ناردە سەریان تا سـەوزیو بـەری دەغلـودان و دارەکانیـان هـەموو بخـۆن و، سـپێمان نـارد بـۆ ئـازاری لەشـیان و خورانـدنی. هـەروەها بۆقمـان نـاردە نـاو ماڵیان و هەموو شـوێنێکی داگیرکـردن و، خوێنمـان بارانـد بەسـەر خۆیـان و مـاڵو خواردەمەنییانداو بەتەواوی ئیسـتیراحەتمان لێ سـەندن. ئەمانـە هـەموو چـەند نیشانەییێکی ڕوون و ئاشـکرا بـوون لەسـەر دەستەڵات و گەورەیی خودا، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو نیشانانەدا ئەوان هەر خۆیان بـە گـەورە زانـیو لـەخۆبایی‌بوون و کۆمەڵێکی ستەمکارو لەخودانەترس بوون .

(١٣٤) کە ئەو سزاو ئازارانە بارین بەسەریانداو تووش بوون پەنایان بردە بەر مووسـاو پێیـان وت: لـە خـودای خـۆت بپاڕێرەوە ئەم نەگبەتیو نەهاتییەمان لە کۆڵ بکاتەوە، بـەو پەیمانـەی لـە بەینتانـدا هەیـەو پێـی وتـووی: ئەگـەر لـێم بپاڕێیتەوە نزات قبووڵ ئەکەم. جا قەسەم بەو پەیمانە ئەگەر ئـەم جارە ئـەم ئـازارەت لێ ڕەواندینـەوەو ڕزگـار بـووین ئیمانت پێ ئەهێنین و بەنی ئیسرائیلت لەگەڵ ئەنێرین.

(١٣٥) کە سزاکەمان لە کۆڵ کردنەوە تا ئەو ماوەی دیارییان کردبوو بۆ ئیمان هێنان، کوتوپڕ پەیمانەکەیان جێبـەجێ نەکردو لە ڕێگای لار لایان نەداو بە کافری مانەوە.

(١٣٦) ئێمەش تۆڵەمان لێسەندن و لە قووڵایی دەریای بێبندا نوقممان کـردن، چـونکە ئایەتـەکانی ئێمـەیان بـەدرۆ ئەخسـتەوەو باوەڕیـان پـێ نەئـەکردن و ئەوەنـدە لارێگـرو سـەرپێچ بـوون ئـەتوت ئاگایـان لـە هـیچ نیـیـەو هیچیـان بەسەرنەهاتووەو کەس ئامۆژگاری نەکردوون.

(١٣٧) پـاش ئـەوە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای سـەرزەوی، واتـە: شـام و دەوروبـەری کـە پیرۆزمـان کردبـوو و بەرەکـەتمان تێخستبوو، دامان بەوانەی زەبوون و ژێردەستە بوون و کوڕیان سەرئەبڕاو ئافرەتیان ئەکرانە کەنیزەك و ئازار ئـەدران، ئەو بەڵێنە زۆر جوانەش کە خودا بە بەنی ئیسـرائیلی دابـوو هاتـەدی، چـونکە خۆیـان گـرت و بوردەبارییـان کێشـا، هەروەها ئەوەی فیرعەون و قـەوم و دام و دەزگاکـەی دروسـتیان کردبـوو ئـەو باڵەخانـەو کۆشـك و بـاغ و گوڵزارانـەی بەرپایان کردبوون هەموومان تێکومەکان داو وێرانمان کردن.

وَجَٰوَزْنَا بِبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتَوْا۟ عَلَىٰ قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصْنَامٍ لَّهُمْ ۚ قَالُوا۟ يَٰمُوسَى ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۖ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿١٤١﴾ ۞ وَوَٰعَدْنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَٰهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخْلُفْنِي فِي قَوْمِي وَأَصْلِحْ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِي ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤٣﴾



(١٣٨) بە سەلامەتی بەنیئیسرائیلمان لە دەریا پەڕاندنەوە. دایان بە لای قەومێکدا کە بەدیاری چەند بتێکەوە دانیشتبوون و ئەیانپەرستن!. بەنیئیسرائیلیەکان بە مووسایان وت: تۆیش خودایێك بۆ ئێمە دروست بکە، وەك چۆن ئەمانە چەند خودایێکیان هەیە! مووسایش پێی وتن: بەڕاستی ئێوە قەومێکی نەزان و نەفامن، پاش ئەم هەمووە موعجیزانە تازە بەدوای بت پەرستیدا ئەگەڕێن؟!

(١٣٩) بەڕاستی ئەوەی ئەمانە خەریکینی خودا لە ئەنجامدا ئەیشکێنێ‌و لەناوی‌ئەباو شوێنەواری ناهێڵێ، ئەوەی ئەمانە ئەیکەن شتێکی پووچ و بێهوودەیە؛ ئەم بتانە نە خودان و نە ئەتوانن خەڵك لە خوداوە نزیك بکەنەوە.

(١٤٠) چۆن بەدوای پەرستراوێکی‌تردا ئەگەڕێم بۆتان لە (الله) بەولاوە کە نیعمەتێکی گەورەی بە ئێوە داوەو فەزڵی داون بەسەر هەموو خەڵکیدا؟!

(١٤١) بیری ئەوە بکەنەوە کە خودا چ لوتفێکی لەگەڵ کردن؟ چۆن لە زۆرو ستەمی فیرعەون و دارودەستەکەی ڕزگاری کردن، کە خراپترین سزایان دەرخوارد ئەدان، کوڕیان ئەکوشتن و ئافرەتەکانتانیان بەزیندوویی ئەهێشتنەوەو ئەیانکردنە جاریەو کەنیزەك، کە ئەمەش بەڵایێکی ئێجگار گەورە بوو.

(١٤٢) سی شەومان دیاری کرد بۆ مووسا بۆ عیبادەت‌کردن و دە ڕۆژی ترمان خستە سەری‌و، میقاتەکەی بوو بە چل شەوی تەواو. جا کە مووسا خۆی بۆ موناجات‌کردن لەگەڵ خودا ئامادە کرد، ڕووی‌کردە هاروونی برای‌و پێی وت: جێ‌نشینم بە لەناو قەومەکەمداو، ئاگاداریان بە لە شەریعەت لانەدەن و نەگۆڕێن. چاکەکەر بەو دوای ڕێگای بەدکاران مەکەوە، کە ئەوانەن لە خۆیان غافڵن و دوورن لە خوداپەرستی.

(١٤٣) جا کە مووسا لە کاتی دیاریکراودا هات و، خودای گەورە بە بێ هۆی کەسێکی‌تر ڕاستەوخۆو یەکسەر قسەی لەگەڵ کرد، وتی: خودایا خۆتم پیشان بدە تا بتبینم و و زیاتر دڵم بە نوورت ڕووناك بێتەوە. خودای گەورە لە وەڵامدا فەرمووی: تۆ ئیستە توانی ئەوەت نی‌یە من ببینی، بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیا ببی کە توانت نی‌یە ببینی سەیرێکی ئەو کێوە بکە، ئەگەر لە شوێنی خۆیدا مایەوە ئەوا تۆیش لەمەوپاش ئەتوانی ببینی. کە خودای گەورە جیلوەو نووری خۆی گرتە کێوەکە گورج ئەو کێوە وردو خاش و هەپروون بوو. کە مووسا ئەمەی دی خۆی بۆ ڕانەگیراو یەکسەر کەوت و بێهۆش بوو. کە هۆشی هاتەوە بەبەرداو چاوی کردەوە وتی: خودایا! پاکی و بێ‌خەوشی هەر بۆ تۆیە، پەشیمانم لەو قسەی بە نەزانی کردم و، من لەچاو ئوممەتەکەی خۆمدا یەکەم کەسم ئیمانم هێناو باوەڕم بە گەورەیی‌و دەسەڵاتت کرد.

قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٤٧﴾ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ وَلَا يَهۡدِيهِمۡ سَبِيلًاۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾ وَلَمَّا سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾



(١٤٤) ئەنجا خودا بە مووسای فەرموو: ئەی مووسا! من لەناو خەڵکی زەمانی خۆتا هەڵمبژاردی کە ببیتە پێغەمبەرم و سیفرەکانی تەوراتت بدەمێو، بەتایبەتیو بێواسیطە قسەت لەگەڵ بکەم، تۆیش ئەو بەهرەی پێمداوی وەریبگرەو بیپارێزەو شوکری خودا بکە کە نیعمەتی وەهای پێ بەخشیوی.

(١٤٥) هەموو شتمان لە لەوحەکاندا بۆ نووسین لە حەڵاڵو حەرامو مامەڵەو کاروباری خۆیی نیکاح و تەڵاق و هەموو شتێکی بایەخداریتر. ئەوەی نووسیبوومان ئامۆژگاری بوون و تەفصیلاتی هەموو حوکمەکان بوون. هەروەها بە مووسامان وت: ئەمانە بە هێزو حەزمەوە وەربگرەو رایان بگرەو، ئەمر بە قەومەکەت بکە لەو حوکمانە ئەوەی جوانترە وەریبگرن و پەیڕەوی بکەن، وەك خۆگری لە چاو سەرکەوتن، یا لێبووردن لەچاو تۆڵە کردنەوە . . تاد . . جا ئەگەر ئێوە ئەم ڕێگایە بگرن لە پاشەڕۆژدا ئەنجامتان بەهەشت و نازو نیعمەت ئەبێ، ئەنجامی بێدینەکانیشتان پیشان ئەدەین کە دۆزەخو سزاو ئازارە، یاخۆ شوێنەواری ستەمکارانو لەدینلادەرانتان پیشان ئەدەین، واتە فیرعەونو دەستەوبەستەکەی، کە چۆن ماڵوێران بوون و داریان بەسەر یەردەوە نەما، هەتا ئێوەش پەند وەربگرن و کارەساتی ئەوان ببێتە عیبرەت بۆتان .

(١٤٦) ئەوانەی بە ناحەق خۆیان بە گەورە ئەزانن لە ڕووی زەویداو، ئایینە هیچوپووچەکەی خۆیان بە ڕاست دائەنێنو، لە عاستی ڕاستی سەرپێچی ئەکەن، دڵیان مۆر ئەکەین، ئیتر لەو ئایەتانە وردنابنەوە کە خودا ناردوونیو بیر لە خۆیان ناکەنەوە کە چۆن دروست کراون و کێ دروستی کردوون؟. ئەوانە ئەگەر هەرچی ئایەتە ببینن باوەڕی پێناکەن. ئەگەر ڕێگەی ڕاست ببینن پەیڕەوی ناکەن، بەڵام ئەگەر ڕێگەی چەوت ببینن پەیڕەوی ئەکەن. ئێمە بۆیە دڵی ئەمانەمان مۆر کردووە چونکە خۆیان ستەمکارن و پێغەمبەران بەدرۆئەخەنەوەو باوەڕ بە ئایەتەکانی خودا ناکەن و تێیاننافکرن و بێئاگان لێیان.

(١٤٧) بێگومان ئەوانەی باوەڕ بە ئایەتەکانی ئێمە ناکەن و، باوەڕیان بە کۆبوونەوەی ڕۆژی دواییو لێپرسینەوە نییە، هەرچی ئەکەن پووچەو هیچ سوودێکی لێ وەرناگرن. ئەمانە غەیری پاداشی کردەوەی خۆیان پاداشیان نادرێتەوە.

(١٤٨) کە مووسا ڕۆیشت بۆ میقات قەومەکەی لەو خشڵانەی لە قیبتییەکانیان وەرگرتبوو، هەیکەلی گوێرەکەیێکیان دروست کرد کە لەشی هەبوو و وەك گا ئەیقۆڕاند. سامیری حیلەباز وای دروست کردبوو کە هەوای تێئەچوو دەنگی لێوە ئەهات. خەڵکە نەزانەکە وایان ئەزانی گیانلەبەرە. سەیری نەئەکرد ئەو پەیکەرە نە قسەیان لەگەڵ ئەکات و نە هیدایەتیان ئەدات!. کردیان بە خوداو پەرستیان و ستەمیان لە خۆیان کردو لە ئایینی ڕاستەقینە لایان دا.

(١٤٩) کە شکایە دەستیان و تێکەوتن و بەتەوای بۆیان دەرکەوت کارێکی خراپیان کردووەو گومراه بوون، پەشیمان بوونەوەو وتیان: ئەگەر خودا میهرەبانیمان لەگەڵ نەکاو نەمانبەخشێت ماڵوێران و ڕەنج بەخەسار ئەبین.

وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي
مِنۢ بَعۡدِيٓۖ أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡۖ وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأۡسِ
أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِۚ قَالَ ٱبۡنَ أُمَّ إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي وَكَادُواْ
يَقۡتُلُونَنِي فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي
رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ
ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ
وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ
تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ
﴿١٥٣﴾ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي
نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ وَٱخۡتَارَ
مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ
قَالَ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَۖ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ
ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي
مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾



(١٥٠) که مووسا لـه میقـات گەڕایـەوەو دی چـیـیان کـردووە تـووڕە بـوو و زۆر خەفەتی خواردو وتی: پـاش مـن کـارێکی زۆر ناشیرینتان کـرد کـه دەسـتتان دایـە گوێرەکە پەرستی. ئەی خـودا پێـی نـەوتن چـاوەڕێی گەڕانـەوەم بکـەن؟ بـۆ پەلـەتان کرد؟ لـه تووڕەییـدا لەوحـەکانی کوتـا بـه ئـەرزاو سـەری هـاروونی بـرای گـرت و ڕایکێشا. هاروونیش وتـی: کـوڕی دایکـم! مـن تـاوانم نییـە، لـێم نەترسـان و بـه بێدەسـتەڵاتیان زانـیم و، خـەریك بـوو بمکـوژن! لـه بەرچـاوی دوژمنانـدا سـووکم مەکەو دڵی دوژمـنم پـێخۆش مەکـەو لـه ستەمکارانم حسێب مەکە.

(١٥١) جـا مووسـا وتـی: خودایـا! لـه گونـاهی مـن و هـاروونی بـرام ببـوورەو چاوپۆشیمان لێبکەو، بمانخەرە ناو ڕەحمەت و بـەزەیی خۆتـەوە، تـۆ لـه هـەموو میهرەبانێ میهرەبانتری.

(١٥٢) بێگومـان ئەوانـەی گوێرەکـەیان کردە خودای خۆیان و پەرستیان، لەلای خوداوە غەزەبیان تـووش ئـەبێو لـه دنیـادا تووشـی زەلیلـی و دەس بەسـەری ئەبن. ئا بەم جۆرە پاداشی ئەوانە ئەدەینەوە کە درۆ هەڵئەبەستن و ڕێگای بێدینی ئەگرن.

(١٥٣) ئەوانەیش کە کردەوەی خراپیان کردووەو، لە پاشاندا تەوبەیان کردوەو پەشیمان بوونەتەوەو بەتەواوی ئیمانیان هێناوەو گەڕاونەتەوە بۆ لای خودا، خودا بۆ ئەوانە گوناهبەخش و میهرەبانە.

(١٥٤) جا کاتێ کە مووسا قارو قینی دامردەوە ئەو تەختانەی لە میقاتەوە هێنابوونی هەڵیگرتن کـه لـه نووسـراوی سەر ئەو تەختانەدا هیدایەت و شارەزایی هەبوو بۆ ئەو کەسانەی لە خودای خۆیان ئەترسن.

(١٥٥) مووسا لەسەر فەرمانی خودا حەفتا پیاوی لە بەنیئیسرائیل هەڵبژارد کە بێن بۆ میقاتی ئێمە، ئەو شـوێنەی لەگەڵ مووسادا قسەی تێدا ئەکەم. کاتێ گەیشتنە ئەوێ هەورەتریشقە لێیدان و هـەموو مـردن. ئـەنجا مووسـا ڕووی کردە بارەگای خوداو وتی: ئەگەر خواستت لێ بوایە لەپێش ئەم ڕۆژەدا منیش و ئەوانیشت ئەمراند، ئیستە مـن چـی بکەم لە تانەو تەشەری بەنیئیسرائیل؟ ئایا بەهۆی تاوانی نەفامەکانمانەوە ئێمە لەناو ئەبەی؟ بێگومـان ئـەم ڕووداوە تاقیکردنەوەیێکـە هـەر کەسـت بـوێ گـومڕاهی ئەکـەیت پێـیو، هـەر کەسیشـت بـوێ هیدایـەتی ئـەدەی پێـی. تـۆ گەورەمانی، تاوانمان ببەخشەو میهرەبانیمان لەگەڵ بکە، تۆ چاکترین تاوانبەخشی.

وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ ۚ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ ۖ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ ۙ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ ۖ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ وَمِنْ قَوْمِ مُوسَىٰ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٩﴾



(١٥٦) خودایا لەم دنیادا بڕیاری نیعمەت و ئەنجامی چاکمان بۆ بدەو، لەو دنیایشدا پاداش و بەهرەی باش. بێگومان ئێمە مەیلمان کردوە بۆ لای تۆ. ئەنجا خودا فەرمووی: بۆ هەرکەس خواستم لەسەر بێ سزای ئەدەم و، ڕەحمەت و میهرەبانیشم زۆر فراوانەو هەموو شت ئەگرێتەوە. ئەو ڕەحمەتەم بۆ ئەوانە ئەنووسم کە خۆیان لە گوناه ئەپارێزن و لە خودا ئەترسن و زەکات ئەدەن بە موستەحەققان و، باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیە.

(١٥٧) ئەو کەسانەی ئەکەونە دوای ئەو فروستادەیە کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارە ئەوەی ئەیبینن لای خۆیان لە تەورات و ئینجیلدا نووسراوەو ئەمریان پێ ئەکات بە چاکەو ئەهییان لێ ئەکات بە خراپەو، خواردەمەنی پاکو پوختیان بۆ حەلاڵ ئەکاتو، خواردەمەنی پیسیان لێ حەرام ئەکات و، ئەو بارە قورسانەی ئەوسا بەکۆڵیانەوە بوو لایان ئەدات و باری سەرشانیان سووک ئەکات. بێگومان ئەوانەی ئیمانی پێ بهێنن و حورمەتی بگرن و یارمەتی بدەن و، دوای ئەو نوورو هیدایەتە بکەون کە لای خوداوە بۆی هاتووە، ئا ئەوانەن لە دنیاو قیامەتدا ڕزگارو سەربەرزن.

(١٥٨) ئەی پێغەمبەر! تۆ بە بەرەی ئادەمزاد بڵێ: من پێغەمبەرو فروستادەی خودام بۆ سەر ئێوە هەمووتان، ئەو خودایەی هەرچی ئاسمان و ئەرزەو هەرچییان تێدایە هەمووی مولکی ئەوەو، کەس بەڕاستی عیبادەتی بۆ ناکرێ ئەو نەبێ. مردوو زیندوو ئەکاتەوەو زیندوو ئەمرێنێ. کە واتە ئیمان بێنن بە خوداو بەو فروستادەی کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری وایە باوەڕی بە خوداو کەلیماتی خودا هەیە، کە کتێبە ئاسمانیەکانن. دوای بکەون و پەیڕەوی ئامۆژگارییەکانی بکەن ؛ بەڵکو شارەزابن و بکەونە سەر ڕێگەی ڕاست.

(١٥٩) لە قەومی مووسا تاقمی وا هەن ڕێنومایی خەڵك ئەکەن بۆ لای خوداو حەق و عەدالەت لەناو خەڵکدا بڵاو ئەکەنەوە.

وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَيْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ
إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ
فَٱنۢبَجَسَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ
مَّشْرَبَهُمْ ۚ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْغَمَٰمَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْمَنَّ
وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۚ وَمَا
ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١٦٠﴾ وَإِذْ
قِيلَ لَهُمُ ٱسْكُنُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ وَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ
شِئْتُمْ وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا نَّغْفِرْ
لَكُمْ خَطِيٓـَٰٔتِكُمْ ۚ سَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٦١﴾
فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ
فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟
يَظْلِمُونَ ﴿١٦٢﴾ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ
حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ
حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ۙ
لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾



(١٦٠) بەنی‌ئیسرائیلمان کرد بە دوانزە بەش، دوانزە کۆمەڵ. جا کە قەومەکەی مووسا لە دەشتی تەیهدا تینوێتی تەنگی پێ‌هەڵچنین و داوای ئاویان لە مووسا کرد، وەحیمان بۆ مووسا کردو پێمان وت: بە عاساکەت لەو بەردە بدە، کە لێی‌دا دوانزە سەرچاوە ئاوی لێ هەڵقوڵی کە هەر کۆمەڵێ سەرچاوەی خۆی ئەزانی‌و نیشانەی تایبەتی لەسەر بوو. هەروەها هەورمان بۆ کردن بە سێبەر کە لە گەرمای هەتاو بیانپارێزێ‌و، گەزۆو شەلاقەشمان بەسەردا باراندن‌و، پێمانوتن: لەم ڕزقە پاك‌و پوختە بخۆن کە پێمان داون. جا کە ئەوان لە ڕێ لایانداو شوکرانەبژێری نیعمەتی خودا نەبوون زیانیان لە ئێمە نەدا، ستەمیان لە خۆیان کردو خۆیان ماڵوێرانی دنیاو قیامەت بوون.

(١٦١) بیری ئەوە بکەرەوە کە بە بەنی‌ئیسرائیل وترا: لەم دێیەدا، کە قودسی شەریفە، نیشتەجێ‌بن و، لە هەرلاییێکەوە ئارەزووتان هەیە بخۆن و بڵێن: خودایا مەبەستمان لابردنی باری تاوانە لەسەر شانمان و، بە حاڵی سوجدەبردنەوە بڕۆنە ژووری مزگەوت، ئەگەر وا بکەن لە گوناهتان ئەبوورین و، ئەوانەی چاکەکەرن پاداشی زیاتریان ئەدەینەوە.

(١٦٢) جا ئەوانەیان کە ستەمکار بوون ئەوەی ئەمریان پێ‌کرابوو بیڵێن گۆڕییان و شتێکی تریان وت کە پێیان نەوترابوو، بێ‌گوێیی پێغەمبەرەکەیان کرد. ئێمەیش لە ئەنجامی ئەو بێ گوێییەدا لە ئاسمانەوە تاعوونمان بۆ ناردن و تووشی نەگبەتی هاتن چونکە ئەوان ستەمیان لە خۆیان و لە خەڵکیش کرد.

(١٦٣) ئەی پێغەمبەری خودا لە جوولەکەکان بپرسە دەربارەی دەنگوباس و بەسەرهاتی ئەهلی ئەو دێیەی نزیکە دەریا بوو، چۆن لە سنووری فەرمانی خودا دەرئەچوون و، لە ڕۆژانی شەمموودا ئەچوون بۆ ڕاوەماسی کە خودا لەو ڕۆژەدا ڕاوی حەرام کردبوو، لەو شەممووانەدا ماسییەکان دەرئەکەوتن و ئەکەوتنە سەر ئاو بەڵام لە ڕۆژانی تردا دەرنەئەکەوتن و دیارنەئەبوون. ئەم جوولەکانە چونکە سەرومڕ لە فەرمانی خودا لایان ئەدا خودایش ئاوەها تووشی ئەکردن و تاقی ئەکردنەوە.

وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ
عَذَابًا شَدِيدًا ۖ قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾
فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ
وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ
﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ
﴿١٦٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَن
يَسُومُهُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُۥ
لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾ وَقَطَّعْنَـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِّنْهُمُ
ٱلصَّـٰلِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَـٰهُم بِٱلْحَسَنَـٰتِ
وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ
وَرِثُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَـٰذَا ٱلْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا
وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُۥ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَـٰقُ ٱلْكِتَـٰبِ
أَن لَّا يَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ وَدَرَسُوا۟ مَا فِيهِ ۗ وَٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ
خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ
بِٱلْكِتَـٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾



(١٦٤) بیری ئەوە بکەرەوە کە چۆن کۆمەڵێ لە بەنی ئیسرائیل بەو کۆمەڵەیان ئەوت کە ئامۆژگاری خەڵکی‌تریان ئەکرد، پێیان ئەوتن: ئەوە ئێوە بۆچی خۆتان ماندوو ئەکەن؟ بۆ ئامۆژگاریی کەسانێ ئەکەن کە خودا بێ‌گومان لەناویان ئەبات یا سزایەکی توندیان ئەدات؟ ڕابەرەکانیش لە وەڵامدا ئەیانوت: بۆیە ئامۆژگارییان ئەکەین تا لە ڕۆژی دواییدا لای خودا عوزرێکمان هەبێ‌و، کە فەرمووی بۆچی ئامۆژگاری خەڵکتان نەکرد؟ بتوانین وەڵام بدەینەوە، هەروەها بە هیوای ئەوەیش کە خەڵکەکە بەهۆی ئامۆژگارییەکەوە لە خودا بترسن و خۆیان لە گوناه بپارێزن.

(١٦٥) جا کاتێ ئەو نامەردانە ئەو ئامۆژگارییانەیان لەبیر خۆیان بردەوە کە پێیان وترابوو، ئەو موسوڵمانانەمان لە سزای سەخت ڕزگار کرد کە مەنعیان ئەکردن لە خراپەکاری‌و، ئەوانەش کە ستەمکار بوون، چونکە لە ڕێگای ڕاست لایاندابوو، تووشمان کردن و سزاییێکی زۆر خراپمان دان.

(١٦٦) جا کە زۆر زۆر لە حەق لایان داو زۆر نافەرمانییان کرد پێمان وتن دە بڕۆن بیخۆن، ببنە مەیموونگەلێکی ناچیزو سووك.

(١٦٧) یادی ئەوە بکەرەوە کە وەختێ خۆی خودای گەورە ڕایگەیاندو بڕیاری‌دا سەبارەت بەو جوولەکانەی ئیمانیان نەهێناو بە گوێی پێغەمبەرانیان نەکردو لەسەر بێ‌دینی مانەوە، کە تا ڕۆژی قیامەت ستەمکاری وەهایان ئەنێرێتە سەر ناخۆشترین سزایان بکا بە قوڕگدا. خودا زۆر گورج تۆڵە لە بەدکاران ئەسێنێتەوە. هەروەها خودا گوناهپۆش و میهرەبانە.

(١٦٨) بەنی ئیسرائیلەکانمان کردن بە چەند بەش و چەند تاقم، هی وایان هەبوو پیاوچاك و لەخوداترس بوون، هی‌وایشیان هەبوو لەخوار ئەوانەوە بوون، سا یا بەتەواوی کافر بوون، یا خۆ موسوڵمان بوون بەڵام کردەوەی خراپیشیان هەبوو. ئێمە بە چاکەو بە خراپەو بەخۆشی‌و ناخۆشی بە هەرزانی‌و بە گرانی تاقیمان کردنەوە تا بگەڕێنەوە سەر ڕێی ڕاست و بیر لە خۆیان و لە خودای خۆیان بکەنەوەو، بکەونە سەر ڕێگای خوداپەرستی.

(١٦٩) دوای ئەوان کۆمەڵێ جێگای گرتنەوە کە تەوراتیان لە باوك و باپیریانەوە بە میرات بۆ هاتبوەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دوای سامانی دنیای بێ‌بەقا ئەکەوتن و وازیان لە ئایین ئەهێنا. ئەگەر پێیان بوترایە کاری خراپ مەکەن و، دوای سامانی دنیا مەکەون ئەنجامی خراپ ئەبێ، ئەیانوت: ئێمە لەبەر ئەوەی ئەولادی پێغەمبەرانین خودا لێمان ناگرێ‌و عەفومان ئەکات. هەروەها ئەگەر لە کاتی پەندو ئامۆژگاریداماڵێکی دنیایان بۆ بلوایە ئەیانقۆستەوە! ئەی بۆچی وەختی خۆی لە تەوراتەکەیاندا پەیمانیان لێ نەسەنرا کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵنەبەستن؟ ئەی پێمان نەوتن: هەرکەس بەگوێرەی کردەوەی خۆی پاداشی ئەدرێتەوەو، سەیری پایەی باو باپیر ناکرێ؟! ئەی خۆیان لە تەوراتدا نەیانخوێندوەتەوە کە ئەڵێ: بەندە ئەبێ ڕێگای ڕاست بگرێ‌و دوای ئامۆژگاری پێغەمبەران بکەوێ؟. ئایا نەیانئەزانی کە بۆ ئەوانەی لە خودا ئەترسن پاداشی چاکی نەبڕاوەی ڕۆژی قیامەت لە سامانی دنیای بڕاوە چاکترو بەسوودترە؟ ئەوە بۆچی نافامن و خۆتان گێل ئەکەن؟!

(١٧٠) ئەوانەیش دەستیان بە تەوراتەوە گرتووەو پەیڕەوی دین ئەکەن و ئیمان بە موحەممەدو ئایینەکەی ئەهێنن و نوێژ ئەکەن، ئێمە هەرگیز پاداشی ئەوانە نافەوتێنین کە چاکەکەرن و ڕێگەی ڕاست ئەگرن.

۞ وَإِذۡ نَتَقۡنَا ٱلۡجَبَلَ فَوۡقَهُمۡ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٞ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعُۢ بِهِمۡ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوۡ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ أَفَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿١٧٤﴾ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِيۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٧٨﴾



(١٧١) یادی ئەوە بكەرەوە كە چۆن كێوی طوورمان هەڵكەندو بەڕاسەریانەوە ڕامانگرت وەك چەترو، وایان ئەزانی ئەكەوێ بەسەریاندا. پێمان وتن: ئەوەی پێمانداون لە تەوراتدا بەهێزو عەزم وەریبگرن و پەیڕەوی بكەن و، ئەوەی تیایەتی تێیفكرن بەڵكو لە كاری خراپ و ئەنجامی ناهەموار بپارێزرێن.

(١٧٢) ئەی پێغەمبەر! بیری ئەوە بكەرەوە كە خودای گەورە لەپێش لەدایكبوونی هەر ئینسانێ لەو كاتەدا كە تۆو بووە لە پشتی باوكیدا ئەو تۆوەی هۆشیار كردووەتەوەو قسەی لەگەڵ كردووە:

ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش وتوویانە: بەڵێ پەروەردگاری ئێمەیو، كردوونی بە شاهید لەسەر خۆیان بۆ ئەم پەیمانە نەبادا لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن ئێمە ئاگامان لەم پەیمانە نەبووە. یا لە عالەمی ئەرواحدا قسەی لەگەڵ كردوون و پەیمانی ئیعتیراف بە خودایەتی خۆی لێ وەرگرتوونو كردوونی بە شاهید لەسەر خۆیان.

(١٧٣) یا بڵێن: باوباپیرانمان هاوبەشیان بۆ خودا داناوەو كافر بوون و، ئێمەیش لەبەرئەوە كە مناڵ و ورد بووین و دوای ئەوان هاتبووین، چاومان لەوان كردو ئێمە تاوانبار نین. ئایا بەهۆی كاری بەدكارانەوە ئێمە لەناو ئەبەیت و تووشی سزامان ئەكەیت؟. (١٧٤) ئا بەم جۆرە ئایەتەكان تەفصیل ئەدەین و باسی ئەم هەموو شتانەیان بۆ ئەكەین بەڵكو بگەڕێنەوە سەر ڕێگای ڕاست و واز لە سەرپێچی بهێنن.

(١٧٥) ئەی پێغەمبەر! دەنگوباس و بەسەرهاتی ئەو زانا جوولەكەیە بۆ ئەم جوولەكانە بگێڕەوە كە چۆن تەوراتمان فێركردو سوور ئەیزانی تۆ ڕەوانە ئەكرێیت، چونكە لە تەوراتەكەدا هەبوو. لە پاشاندا بێئیمان بوو بە تەورات و كافر بوو و، شەیتان خستیە دوای خۆیو لەئەنجامدا چووە ناو زومرەی گومڕاهانەوەو ماڵوێران بوو.

(١٧٦) ئەگەر بمانویستایە بەهۆی ئەو ئایەتانەو بەهۆی پەیڕەویكردنیانەوە بەرزمان ئەكردەوەو پایەی گەورەمان پێ ئەدا، بەڵام ئەو خۆی مەیلی لە ماڵو سامانی دنیا بوو و پشتی لە دین هەڵكرد. حاڵی ئەم زەلامە وەك حاڵی سەگە هەڵمەتی بۆ بەری زمان دەرئەكێشێو هەناسەبڕكێی پێ ئەكەوێ، وازیشی لێ بێنی هەر هەمان جۆرە. ئەمە حاڵی ئەوانەیە كە باوەڕ بە ئایەتەكانی ئێمە ناكەن. تۆ ئەی پێغەمبەری خوا بەسەرهاتی خەڵكیان بۆ بگێڕەوە بەڵكو بیر بكەنەوەو، بگەڕێنەوە سەر ڕێگای ڕاست. ئەڵێن مەبەست لەم شەخصە بەلعەمی كوڕی باعوورایە.

(١٧٧) زۆر ناشیرینە نموونەی ئەوانەی ئایەتەكانی ئێمە بە درۆدەخەنەوەو ستەم لە خۆیان ئەكەن بە تاوان و گوناهباری.

(١٧٨) هەركەس خودا هیدایەتی بدا ئەوە شارەزایە. هەركەسیش خودا گومڕای بكات ئەوانە زەرەرمەندو ڕەنج بەخەسارن.

وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٨١﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ ۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾



(١٧٩) بەڕاستی ئێمە لە ئادەمزادو لە پەری گەلێ کەسی وامان دروست کردووە، لەوانەی ڕێگای گومڕاهی ئەگرن، دڵیان هەیە بەڵام هیچی پێ حاڵی‌نابن، چاویان هەیە بەڵام شتی پێ نابینن، گوێیان هەیە بەڵام پێی نابیسن، ئەوانە وەکو حەیوانی چوارپێ وەهان بەڵکو گومڕاترن. ئەم جۆرە کەسانە لە ئاین و ڕەوشتی پێغەمبەران بێ‌ئاگان.

(١٨٠) جوانترین ناوەکان هی خودان، ئەو ناوانە لە خودا بنێن و بەو ناوانە لێی بپاڕێنەوە، واز لەو ناوانە بێنن کە گومڕاکان بە بێ‌دەلیل لە خودایان ئەنێن؛ ئەوانە لە دوارۆژدا تۆڵەی کردەوەی خۆیانیان لێ ئەکرێتەوە.

هەندێ لە ئەعرابەکان لە کاتی پاڕانەوەدا لەخودا ئەیانوت: (یا ابا المکارم) و (یا ابیض الوجه). گاورەکانیش ئەیانوت: (یا ابا المسیح). بێ‌گومان ئەم ناوانە ناشەرعی‌و نارەوان و نابێ لە خودا بنرێن.

(١٨١) لەوانەی دروستمان کردوون ئومەتی وا هەن خەڵکی بە شێوەی ڕاستی شارەزا ئەکەن‌و حەقیان نیشان ئەدەن‌و، بەڕاستی عەدالەت جێبەجێ ئەکەن لە حوکمەکانیاندا.

(١٨٢) ئەوانەیش کە بێ باوەڕن بە ئایەتەکانی ئێمەو ئەیانخەنەوە بە درۆوە پلەپلە بەرزیان ئەکەینەوەو ئەدەین بە دەمیانەوەو بەجۆرێ کە بە خۆیان نەزانن لەناویان ئەبەین و تۆڵەیان لێ ئەکەینەوە.

(١٨٣) مۆڵەتیان ئەدەین و، خەڵك وا ئەزانن لە هەموو ئازارێ ڕزگار ئەبن، کەچی بەرەو لەناوچوون ئەڕۆن. وردەکاری ئێمە بۆ فەوتاندنی کافرەکان و ستەمکارەکان گەلێ بەحیکمەت و دامەزراوە.

(١٨٤) ئەوە بۆچی بیر ناکەنەوە لە وەزعی خۆیان و دنیاو ئەو پێغەمبەرەی ڕەوانەمان کردووە بۆ ئامۆژگاری‌کردنی ئادەمزادو گەیاندنی کەلامی خوا؟ بۆ تەماشا ناکەن کە بە هیچ جۆرێ نیشانەی شێتی و بێ‌هۆشی لەو زاتەدا نی‌یە، تەنها ئەوەیە کە ئینسانێکی ڕاستەو خەڵکی لە قەهرو غەزەبی خودا ئەترسێنێ؟.

(١٨٥) ئەوە بۆچی سەیری نیشانەکانی قودرەتی خودا ناکەن؟ بۆ ورد نابنەوە لە موڵکی گەورەی ئاسمانەکان و ئەرزو لەو شتانەی‌تر کە خودا دروستی کردوون؟ بۆ ئەوەندە بێ‌ئاگان؟ لەوانەیە ئەجەل و ئاکامیان نزیك بووبێتەوە. ئیتر پاش قورئان ئیمان بە چی دێنن؟.

(١٨٦) هەرکەس خودا گومڕای بکات کەس ناتوانێ بیخاتە سەر ڕێ‌و خودا لە گومڕاهیدا ئەیانهێڵێتەوەو بە سەرگەردانی ئەسووڕێنەوە.

(١٨٧) دەربارەی ڕۆژی قیامەت پرسیارت لێ ئەکەن و ئەپرسن کەی دێت و جێگیر ئەبێ؟ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ زانینی کات و ساتی ڕۆژی قیامەت لای خودای پەروەردگارمە. کەس لە سات و کاتی خۆیدا دەریناخات و بەرپای ناکات ئەو نەبێ. سامی ڕۆژی قیامەت زۆر گرانە لەسەر ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی، بۆیە شارراوەتەوە. ڕۆژی قیامەت لەپڕوکتوپڕ نەبێ نایێ. لێت ئەپرسن دەربارەی کاتی ڕۆژی قیامەت وەك تۆ زۆر چاکی بزانی و ئاگات لێ بێ کەی دێ! تۆ پێیان بڵێ: نەخەیر، خودا نەبێ کەس نایزانێ تەنانەت مەلائیکەکان و پێغەمبەران و ئەوانەی خۆشەویستی خوداو لێیەوە نزیکن نازانن کەی دێ؟ بەڵام بەشی زۆری خەڵق نازانن، مەسەلەی هاتنی قیامەت کەس نایزانێ خودا نەبێ.

قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٨٨﴾ ۞ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَاۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفٗا فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحٗا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمۡۚ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡ أَدَعَوۡتُمُوهُمۡ أَمۡ أَنتُمۡ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۗ قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾



(١٨٨) ئەی پێغەمبەر! تۆ پێیان بڵێ: من خاوەنی هیچ سوودو زیانێ نیم بۆ خۆم: نە ئەتوانم قازانج بە خۆم بگەیێنم و نە ئەتوانم زیان لە خۆم دوور بخەمەوە، واتە نهێنییەکان نازانم. ئەگەر غەیبم بزانیایە خێرو قازانجی زۆرم بۆ خۆم کۆئەکردەوەو هەرگیز تووشی زیان نەئەبووم، من هیچ نیم ئەوە نەبێ کە موسوڵمانان لە گوناە و سزای گوناە ئەترسێنم و موژدەیان ئەدەمێ بە پاداشی خواپەرستیو کردەوەی چاك، واتە تەنها خاوەن ئیمان گوێ بۆ ئەم موژدەو هەڕەشەیە ئەگرن و، ئەوان سوودی لێ وەرئەگرن.

(١٨٩) خودا ئەو زاتە بەدەستەڵاتەیە کە ئێوەی بەرەی ئادەمزادی لە یەك نەفس دروست کرد کە ئادەمە. هەر لە ئادەمیش حەووای هاوسەری دروست کردووە تا لەگەڵیا بژیو پێکەوە ئولفەت بگرن. کە چووەڵای سکی پڕ بوو بە شێوەیێکی سووك و، لەگەڵ ئەوەشدا کە سکی هەبوو هەڵسوکەوتی عادەتی ئەکردو ئیشوکاری بەجێئەهێنا. کە سکەکەی قورس بوو و، وەختی لەدایکبوونی هات هەردوکیان لە خودای خۆیان پاڕانەوەو عەرزیان کرد: ئەگەر کوڕێکی باشمان پێ ببەخشی سوپاست ئەکەین و زۆر شوکرانەبژێر ئەبین.

(١٩٠) کە خودا کوڕێکی چاکی پێدان و لەو کوڕە نەوەو بەرە کەوتەوەو زۆر بوون، ئەولادەکانیان هاوبەشیان دائەنا بۆ خودای گەورە لەو ئەولادانەدا کە پێیان ئەدرا. خودا پاك و بێگەردەو لەوانە بەرزترە کە ئەوان دەیانکەنە هاوبەشی خودا.

(١٩١) ئایا دەچێتە عەقڵەوە شتێ بکەنە هاوبەشی خودا کە ناتوانێ هیچ دروست بکات، بەڵکو ئەو شتانە خۆیان دەستکردن و خەڵکی دروستیان کردوون؟

(١٩٢) ئەو بت و شتانە کە کراونەتە هاوبەشی خودا نە ئەتوانن یارمەتی موشریکەکان بدەن و نە ئەتوانن تەنانەت یارمەتی خۆیان بدەن. ئیتر چۆن خودایێکن؟!.

(١٩٣) ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی پەیڕەوەکانی پێغەمبەر! وازبێنن لەو کافرە موشریکانە، ئێوە ئەگەر بانگیان بکەن بۆ سەر ڕێی ڕاست بەگوێتان ناکەن و نایەن! وەك یەکە چ بانگیان بکەن و هەوڵیان لەگەڵ بدەن و چ بێدەنگ بن، نایەنە سەر ڕێ.

(١٩٤) ئەوانەی غەیری خودا کە ئێوە ئەیانپەرستن و بە خودایان ئەزانن، هەموو دروستکراوێکن وەك ئێوەو خودا دروستی کردوون. ئەگەر ڕاست ئەکەن ئەمانە شایانی پەرستنن و سوودو زیانیان هەیە، دە بانگیان لێ بکەن با جوابتان بدەنەوەو بێن بە دەمتانەوە، بزانم جوابتان ئەدەنەوە؟!.

(١٩٥) ئایا ئەوانەی ئێوە ئەیانپەرستن و کردووتانن بە هاوبەشی خودا، پێیان هەیە پێی بڕۆن بە ڕێدا؟ دەستیان هەیە هەڵمەتی پێبەرن؟ چاویان هەیە پێی ببینن؟ گوێیان هەیە پێی ببیسن؟!

ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: بانگ لەوانە بکەن کە کردووتانن بە هاوبەشی خوداو داوای یارمەتییان لێبکەن و، چەندێ ئەتوانن هەوڵ بدەن و فێڵ بکەن بۆ ئازاردانم و مۆڵەتم مەدەن بزانم چی ئەتوانن بکەن؟!.

إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْۖ وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخۡوَٰنُهُمۡ يَمُدُّونَهُمۡ فِي ٱلۡغَيِّ ثُمَّ لَا يُقۡصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ وَإِذَا لَمۡ تَأۡتِهِم بِـَٔايَةٖ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَاۚ قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّيۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾ وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾

سجدة



(١٩٦) بێگومان یارو یاوەرو سەرپەرشتیکاری من ئەو خودایەیە قورئانی ناردووە. ئەو سەرپەرشتی بنیادەمی چاکەکەرو لەخواترس ئەکات.

(١٩٧) ئەو کەسانەو ئەو بتانە کە ئێوە ئەیانپەرستن، غەیری خودای پەروەردگار، هەرگیز ناتوانن یارمەتیتان بدەن، تەنانەت ناتوانن یارمەتیی خۆیشیان بدەن.

(١٩٨) ئەگەر ئەو کافرانە بانگ بکەن بۆ سەر ڕێی ڕاست نابیسن و بەگوێتان ناکەن. ئەیانبینی بە دیمەن بۆت ئەڕوانن، بەڵام لەڕاستیدا گومڕاهی کوێری کردوون و ناتبینن و ڕێگا ڕاستەکەشت نابینن!.

(١٩٩) کاری ئاسان لە خەڵك داوابکەو ئەمر بە چاکە بکەو لەوانە لادە کە نەفامنو بەگوێت ناکەنو تۆیش گوێیان مەدەرێ.

(٢٠٠) ئەگەر لەلایەن شەیتانەوە خەیاڵێکی خراپ و نابار هات بە دڵتا پەنا بە خودا بگرە لە بەدی ئەو خەیاڵەو بڵێ (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) خودا دوعات ئەبیسێو زانایە بە ئەحواڵت.

(٢٠١) بێگومان ئەوانەی لە خودا ئەترسنو خۆیان لە گوناە دوور ئەخەنەوە ئەگەر سووسەیێ لە شەیتانەوە لێیان بداو غافڵیان بکا گورج بیر ئەکەنەوە لە گەورەییو زانایی خوداو ئەبینی گورج چاویان بینایەو دڵیان زانایەو ڕۆحیان ئاشنایە.

(٢٠٢) بەڵام کافرە لەخودانەترسەکان براکانیان یارمەتییان ئەدەن بۆ گوناە و گومڕاهیو، ئەو گومڕاهییە لە بەرچاویاندا جوان ئەکەن و ئەیڕازێننەوەو، لەپاشاندایش کۆتایی ناکەن لە گومڕاکردنیان.

(٢٠٣) ئەگەر جارێ ئایەتێك یا شتێ کە ئەوان پێشنیادیان کردووە بۆیان نەهێنی ئەڵێن: ئەوە بۆچی خۆت وەکو ئایەتەکانیتر هەڵتنەبەست، یا بۆ پێشنیادت نەکرد لە خودا کە بتداتێ؟! تۆ ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: من نە ئایەت هەڵئەبەستم و نە پێشنیادی ئەکەم لە خودای گەورە، ئەوانە کاری من نین. من تەنها پەیڕەوی ئەوە ئەکەم کە لای خودای گەورەوە بە وەحی بۆم دێت. ئەم قورئانە هەڵبەستراو نییە، بەڵکو هۆی ڕووناکی دڵەو ڕاستی لە ناڕاست پێ جیا ئەکرێتەوە. هۆی شارەزاییەو ڕەحمەت و میهرەبانییە لەلایەن خودای گەورەوە بۆ ئەوانەی باوەڕ بە خودا ئەکەن و لێی ئەترسن و سەرپێچی ناکەن.

(٢٠٤) کە قورئان خوێنرا گوێی لێ ڕابگرن و بێدەنگ بن بەڵکو خودا ڕەحمتان پێ بکات. ئەمە لای ئیمامی شافیعی (ر. خ) بۆ نوێژە جەهرییەکانە وەکو نوێژەکانی بەیانیو مەغریب و عیشا کە ئیمام قورئان ئەخوێنێو مەئموم گوێی لێ ئەگرێو بێدەنگ ئەبێ. لە غەیری نوێژیشدا هەمدیسان سوننەتە ئینسان گوێ ڕابگرێ مادام خەریکی کارێکی مەشرووع نەبێ.

(٢٠٥) ذیکری خودای خۆت بکە لە نەفسی خۆتدا بە زاریو کزیو داماویو ترسەوە. ئەگەریش بە زوبان ذیکرت کرد با دەنگت لە ئاشکرایی کەمتر بێ، لە بەیانیو ئێوارەداو لە هەموو کاتدا ناوی خودا بهێنەو، لەوانە مەبە کە لە یادو ناوی خودا بێئاگان.

(٢٠٦) بێگومان ئەوانەی نزیکی بارەگای خودان خۆیان بە گەورە ناگرن بەرامبەر بە خوداپەرستیو عیبادەت کردنو، تەسبیحی خودا ئەکەن و سوجدەی بۆ ئەبەن.

سورة الأنفال — ترتيبها ٨ — آياتها ٧٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَنفَالِۖ قُلِ ٱلۡأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١﴾ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَمَغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٤﴾ كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴿٥﴾ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَمَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلۡحَقَّ وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٨﴾



## سوورەتی (الأنفال)

**مەدینەیی‌یەو (٧٥) ئایەتە**

(١) پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی تالآنی کە کێ بەشی ئەکات و، چۆن بەش ئەکرێت؟. تۆ پێیان بڵێ: حوکمی تالآنی عائیدە بە خوداو پێغەمبەری خودا. پێغەمبەری خودا بە ئەمری خودا بەشی ئەکا لەبەینتاندا. لە خودابترسن و لەناو خۆتانا ناکۆك مەبن و ناوبەین و پێوەندیتان باش بکەن و بە گوێی خوداو پێغەمبەری خودا بکەن ئەگەر خاوەن ئیمانن.

(٢) خاوەن ئیمانی ڕاستەقینە ئەوانەن کە ناوی خودا ببرێ دڵیان ئەترسێ‌و، ئەگەر ئایەتیان بەسەردا بخوێنرێتەوە باوەڕیان بە خوداو پێغەمبەر زیاتر ئەبێ‌و لە هەموو کاروبارێکدا تەنها پشت بە خودای خۆیان ئەبەستن و داوای یارمەتی لەو ئەکەن.

(٣) ئەو کەسانەن کە نوێژەکانیان بەجێ‌ئەهێنن و، لەو ڕزق و ڕۆزییەی پێمان داون لە ڕێی خودادا خەرج ئەکەن.

(٤) ئا ئەوانەن موسوڵمانی ڕاستەقینەو، لای خودا پایەو پلەی باشیان هەیەو، لە تاوانیان ئەبوورێ‌و سەربەرزییان پێ ئەبەخشێ.

(٥) ئەم حاڵەی ئەوان کە هەندێ لە موسوڵمانەکان بەش کردنی تالآنەکەیان بە دڵ نی‌یە وەکو ئەوەیە کە چۆن خودا ئەمری پێ‌کردیت و لە ماڵو حاڵی خۆت دەرچوویت بۆ غەزای بەدر، کەچی هەندێ لە موسوڵمانەکان ئەم دەرچوونەیان بە دڵ نەبوو! خودا خۆی ئەزانێ چی ئەکات؟.

(٦) لە شتێکی ڕاست و بێ‌گوماندا موجادەلەت لەگەڵ ئەکەن کە دەرچوونە بۆ جیهادو غەزا، پاش ئەوەی لە قسەی تۆوە بۆیان دەرکەوت کە سەرئەکەون. جەنگیان پێ ناخۆش بوو وەك بدرێنەبەر بۆ مەرگ و بە چاوی خۆیان ئەسبابی مەرگەکە ببینن.

(٧) باسی منەت و نیعمەتی خودا بکەن لەسەرتان کە چۆن بەڵێنی پێدان یەکێ لە دوو کۆمەڵەکەتان بکاتە نصیب، یا قافڵەی بارو ڕزق و ڕۆزی و شتومەکی بازرگانی موشریکەکانی مەککە، کە لە شامەوە گەڕایەوە، یا کۆمەڵی کافرانی قورەیش کە دێن بۆ جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان بە نیازی لەناوبردنی ئایینی ئیسلام. ئێوە حەزتان ئەکرد ئاسانەکەتان ببوایە بە نصیب. خودایش ئەیویست ئایینی خۆی بەرز بکاتەوەو قسەی خۆی جێگیر بکات بە وەحی‌و بە یارمەتیدانی مەلائیکەو، کافرە بەدنیازەکان بنبڕ بکات‌و هێزو توانیان نەهێڵێ.

(٨) خودا بۆیە ئیختیاری گرانەکەی کرد کە غەزای بەدر بوو تا ڕاستی جێگیر بکات کە ئایینی ئیسلامی پیرۆزەو، ناڕاستی کاول بکات، کە کوفرو بتپەرستی‌یە، ئەگەرچی کافرەکان لە ناخەوە پێیان ناخۆشە حەق سەرکەوێ‌و ناحەق لەناوبچێت.

إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ
مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ
وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ
عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ
عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ
الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴿١١﴾
إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا ۚ
سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ
الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ
شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ وَمَن يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ اللَّهَ
شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَافِرِينَ
عَذَابَ النَّارِ ﴿١٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ
كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ
دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ
بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦﴾



(٩) یادی ئەوە بکەن کە هاوارتان لە خودا ئەکردو داوای یارمەتیتان لیّ ئەکرد ئەویش پاڕانەوەکەی قبووڵ کردن و هات بە دەنگتانەوەو وتی: هەزار مەلائیکە ئەنێرم بۆ یارمەتیدان کە دوای موسوڵمانەکان بگرن و پێکەوە دژی کافران بجەنگن.

(١٠) خودای گەورە ئەو فریشتانەی بۆ ئەوە نارده خوار کە ببن بە مژده بۆ ئێوەو، تا دڵتان پێی دابمەزرێ‌و لە جەنگدا خۆگر بن. یارمەتی هەر لای خوداوەیە. بێ‌گومان خودا بەدەستەڵاتەو کارەکانی پڕ حیکمەتن.

(١١) بیری ئەوە بکەنەوە کە چۆن خودا وەنەوزی پێ‌دان و ئەمینی دا بە دڵتان، هەروەها لە ئاسمانەوە بارانی بۆ باراندن تا لە بێ‌دەستنوێژی‌و لەشپیسی پاکتان بکاتەوە کە بە وەسوەسەی شەیتان بەسەرتاندا هات و دڵیشتان بە ئومێد بە کەرەمی خودا دامەزرێنێ. هەروەها بە هۆی ئەو بارانەوە زەوییە لمینەکە پتەو بوویەوەو هاتوچۆتان باش بۆ ئەکراو پێتان قایم ئەبوو. یا مەبەست خۆگری‌و لە ڕووی دوژمندا وەستانە بە بێ‌ترس.

(١٢) بیری ئەوە بکەنەوە کە خودا وەحیی کرد بۆ فریشتەکان و پێی وتن من لەگەڵتانم و یارمەتیتان ئەدەم، ئێوە دڵی موسوڵمانەکان دامەزرێنن. بە ڕاستی من ترس ئەخەمە دڵی کافرەکانەوە. دە لێیان دەن لە پشتی ملەوەو لە هەموو وردە جمگەکانی دەست و پێیان .

(١٣) ئەمە لەبەر ئەوەیە ئەو کافرانە دوژمنایەتی لەگەڵ خوداو پێغەمبەردا ئەکەن و، هەرکەس دوژمنایەتی لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خودادا بکات خودا تۆڵەی سەختی لیّ ئەکاتەوە.

(١٤) نا ئەوەتە دە بیچێژن! بێ‌گومان کافرەکان بە ئاگر سزا ئەدرێن.

(١٥) ئەی خاوەن ئیمانەکان! ئەگەر لەگەڵ کافراندا بەرەنگاری یەك بوون و، ئەوان ئەوەندە زۆر بوون دەتوت دنیایان پڕکردووەو دەخشێن بە ڕووی زەویداو هێرش دێنن، لێیان مەترسن و پشتیان تێ‌مەکەن و ڕووبەڕوویان بێ‌ترس بجەنگن.

(١٦) بێ‌گومان هەرکەس لەو ڕۆژەدا پشتیان لیّ هەڵکات و ڕابکات، بێجگە بۆ فێڵی جەنگ یا بۆ یارمەتیدانی کۆمەڵێکی‌تر لە موسوڵمانان، ئەوە تووشی ڕق‌و غەزەبی خودا ئەبێ‌و جێگای دوارۆژی دۆزەخ ئەبێ. بێ‌گومان دۆزەخ ناخۆشترین ئەنجامە.

فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ۖ وَإِن تَنتَهُوا۟ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَعُودُوا۟ نَعُدْ وَلَن تُغْنِيَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾



(١٧) ئێوه هێزی ئەوەتان نەبوو بیانکوژن و بەسەریاندا زاڵ بن، ئێوه کەم و کەم چەك و ئەوان زۆرو پڕچەك بوون، بەڵام خودا یارمەتی دان و دڵی بەهێز کردن و بە فریشتە یارمەتی دان، خودا کافرەکانی بەزاندو کوشتنیو ئێوەی سەرخست. لە ڕاستیدا ئەو وردە بەردانە کە تۆ فڕێت دان بەرەو دەموچاوی کافرەکان تۆ فڕێت نەدان، خودا بە دەستەڵاتی بێپایانی خۆی ئەو وردە بەردانەی کرد بە دەمو چاویانداو خەریکی کردن بە ئازاری چاویانەوەو، ئێوه دەستتان کرد بە کوشتن و دیل کردنیان. ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە پاداشێکی باش بە موسوڵمانەکان بدات و سەریان بخات. بێگومان خودا شنەوایەو، نزاو پاڕانەوەی موسوڵمانەکان ئەبیسێو، زانایە بە دڵو دەروونیان و ئاگاداری حاڵیانە.

(١٨) خودا خواستی ئەوە بوو کە کافرەکان بشکێنێو موسوڵمانەکان سەربخات. بە ڕاستی خودا حیلەو فێڵی کافران پووچ و بەتاڵ ئەکاتەوە.

(١٩) کافرەکانی مەککە کە هاتن بۆ جەنگ دژی حەزرەت (د. خ) داوای فەتح و سەرکەوتنیان لە خودا ئەکرد. جا خودای گەورە بە گاڵتەو توانجەوە پێیان ئەفەرموێ: ئەگەر داوای فەتح و سەرکەوتنتان کرد ئەوا بۆتان هات بەڵام بۆ ئێوه نەبوو، بۆ دەستەی پێغەمبەر بوو. جا ئەگەر دەستبەردار بن و واز لە دوژمنایەتیو جەنگ بهێنن ئەوە بۆ خۆتان چاکترە. خۆ ئەگەر ئەگەڕێنەوە بۆ جەنگ ئەوا ئێمەیش ئەگەڕێینەوە. کۆمەڵەکەتان فریاتان ناکەوێو کەم و زۆر سوودی نییە بۆتان ئەگەرچی زۆریش بن. بێگومان خودا لەگەڵ دەستەی ئیماندارانە و یارمەتی ئەوان ئەدات.

(٢٠) ئەی خاوەن ئیمانەکان بە گوێی خودا بکەن و بەگوێی پێغەمبەری خودا بکەن. پشتی لێ هەڵمەکەن و بێگوێیی مەکەن کە ئێوه قورئان و ئامۆژگاری ئەبیسن و ئەزانن ڕاستە.

(٢١) ئێوه وەك ئەوانە مەبن کە ئەڵێن: گوێمان لێ بوو و بیستمان. وای دەرئەبڕن کە تاعەت گوزارن، کەچی درۆ ئەکەن حەق نابیسن و گوێڕایەڵ نین و موناففن. (٢٢) بێگومان بەدترین و بێکەڵکترین گیانلەبەر لای خودا ئەوانەن کە کەڕو لاڵن و هیچ نافامن. مەبەست کافرو منافقەکانە.

(٢٣) ئەگەر خودا بیزانیایە خێرو چاکەیان لەبارەدایە قورئانی ئەبردە گوێچکەیانەوە بەجۆرێ کە سوودی لێ وەربگرن. ئەگەریش بەم حاڵی سەرکەشییەوە قسەیان لەگەڵ بکات و هێزی بیستنیان بداتێ و ڕێی هیدایەتیان پیشان بدات هەر پشت هەڵئەکەن و ڕوو وەرئەرچەرخێنن و، لەحەق لائەدەن.

(٢٤) ئەی خاوەن ئیمانەکان! بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا بکەن کە بانگتان ئەکات بۆ کارێ کە هۆی بەختیاری ئەبەدییە، وەکو باوەڕ بە خوداو بە پێغەمبەران و بە ڕۆژی پاداش، هەروەها لە خوداترسان و لە گوناه دوورکەوتنەوە. خودا ئەوەندە لە بەندەیەوە نزیکە ئاگای لە هەموو نهێنییەکی دڵی هەیەو، ئەوەندە بە دەستەڵاتە ئەکەوێتە بەینی دڵ و ئارەزوویەوە، کە بەندەی بیەوێ شتێ بکا پەشیمانی ئەکاتەوەو ئارەزووەکەی ئەگۆڕێو ناهێڵێ بیکات. بێگومان ئێوه حەشرتان لای خودا ئەبێو پاداشی هەموو چاکەیێکتان ئەداتەوەو تۆڵەی کردەوەی خراپتان لێ ئەکاتەوە.

(٢٥) خۆتان لەو سزاو بەدبەختییە بپارێزن کە تەنها ستەمکارەکانتان ناگرێتەوەو ئاسارەکەی خەڵکیتریش ئەگرێتەوە ئیتر لە دوارۆژدا هەرکەس لەسەر نییەتی خۆی لێی دەپرسرێتەوە. بۆ نموونە خودا کە غەزەب لە ستەمکاران بگرێ قاتیو قڕی

وَاذْكُرُوا إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٢٦﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَا إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾



بلاّوئەکاتەوە کە خەلکیتریش ئەگرێتـەوە، یا بییەوێ دێیـەکی کـافران نـوغرۆ بکـات هەمووی کاول ئەبێو خـەلکی بێتـاوانیش تووش ئەبن، یا خۆ بییەوێ تۆلە لە باوك و دایکی خراپ بکاتەوەو تووشی مەینـەتیان بکات هەتیوەکانیشیان تووشی زیان ئەبن. زۆر چاك بزانن کە خودا سەختگیرە.

(٢٦) باسی ئەوە بکەن کە ئێوە کەم بوونـو بێهێز بوون لە زەویـداو، ئەترسـان دوژمـن بتانفڕێنێو لەناوتان بەرێ، لەگـەل ئـەوەش خودا جێگەو ڕێگەی پێدان و بە یارمـەتی خۆی هێزی پێدان و لە شتی پاك و پوختـە ڕزق و ڕۆزی پـێدان بـە هیـوای ئـەوەی سوپاسی بکەن.

(٢٧) ئەی خـاوەن باوەڕەکـان خیانـەت لـە پێغەمبەر مەکەن، خیانـەت لـەو شـتانەدا مەکـەن کـە وان بەلاتانـەوەو، ئـەزانن کـە خیانـــەت و دەستپیســـی شـــتێکی زۆر ناشیرینە.

(٢٨) زۆر چـاك بـزانن مـالّو دارایـیو ئـەولادو ئـەوەتان هـۆی ئـاژاوەو ئەگبـەتین ...وتان و، خوای گەورە ئەیەوێ تاقیتان بکاتەوە. بەڕاستی پاداشی گەورەو گران لای خودای گەورەیە.

(٢٩) ئەی خاوەن ئیمانەکان! ئەگەر لە خودا بترسن خودا نوورو هیدایەت ئەخاتە دلّتانەوە کە چاك و خراپی پـێ جیـا ئەکەنەوە. هەروەها تاوانەکانتان دائەپۆشێو لێتان خۆش ئەبێ. بەڕاستی خودا خاوەنی فەزلّو ڕەحمی گەورەیە.

(٣٠) یادی ئەوە بکەرەوە کە چۆن کافرەکانی قورەیش دەستیان دایـە فـێلّو حیلـە بـۆ ئـەوەی برینـدارت بکـەن و لـە ...کەلکی جموجوولّت بخەن یا حەپست بکەن، هەروەها بۆ ئەوە بتکوژن یا لـە مەککـە بـە زەلیلـی دەرت بکـەن، ئەوانـە حیلەیان کرد بەلاّم خودای بەدەسـتەلاّت کـاری وەهـای کـرد لـە حیلەکـەی ئـەوان بـەهێزتر بـوو. خـودا چـاکترین کـار ڕاپەڕێنەو لەوان دوژمن کوژترە.

(٣١) کاتێ ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا ئەخوێنرێتەوە ئەلّێن: ئەمـەمان بیسـتووە، ئەگـەر مـەیلمان لێ بـێ وێنـەی ئەمە ئەلّێین. ئەم ئایەتانە حیکایەتی پێشوانن و شتێکی تازە نین!

(٣٢) یادی ئەوە بکە کە کافرەکـان وتیـان: خودایـا! ئەگـەر ئـەم قورئانـە حەقـە کەچـی ئێمـە بـاوەڕی پـێ ناکـەین. بەردەبارانمان بکە بە بەردی ئاسمان، یاخۆ سزایەکی سەختی ترمان بۆ بێنە کە نابار بێت.

(٣٣) تا تۆ لە ناویاندا بی خوا سزایان ناداو، تا هەندێکیان داوای عـەفوو لـە گوناەخۆشـبوون لـە خـودا بکـەن خـودا سزایان نادا.

وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ ۚ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ إِلَّا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ۚ فَسَيُنْفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ اللَّهُ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٣٧﴾ قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ وَإِنْ يَعُودُوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ الْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ انْتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَوْلَاكُمْ ۚ نِعْمَ الْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ النَّصِيرُ ﴿٤٠﴾



(٣٤) بۆچی خودا سزایان نەدا کە مەنعی خەڵك ئەکەن لە زیارەتی (مسجد الحرام) و تەواف کردن بە دەوریا؟ ئەوانە بۆ ئەوە ناشێن سەرپەرشتی کەعبە بکەن، سەرپەرشتیکەری کەعبەی پیرۆز ئەبێ لەوانە بێ لە خودا ئەترسن، بەڵام زۆرتری خەڵك ئەمە نازانن.

(٣٥) ئەو نوێژەی ئەوان لای کەعبەی پیرۆز ئەیانکرد تەنها بریتی بوو لە فیکەکێشان و چەپڵەلێدان و گاڵتەوگەپ. مادام ئەمە عادەتتان بوو دە بچێژن سزای ئەسیری و کوشتن لەسەر دەستی موسوڵمانان لە جەزای کوفرتاندا.

(٣٦) بێگومان کافرەکان ماڵی خوایان لە پێناوی ئەوەدا خەرج دەکرد کە مەنعی خەڵك بکەن لە ئایینی ئیسلام و ڕێگای ڕاست، لەمەوپاشیش هەر بۆ هەمان مەبەست خەرجی ئەکەن. پاشان ئەو ماڵخەرجکردنە ئەبێتە خەم و خەفەت بۆیان، چونکە هیچ ئەنجامێکی نەبوو. لەپاش ئەوەش کە موسوڵمانەکان فەتحی مەککەی پیرۆز ئەکەن ئەوان ئەبەزرێن. ئەم ئایەتە ئیخبار بە غەیبەو لە موعجیزەکانی قورئانە. هەروەها ئەو کەسانە کە کوفریان پەسەند کردو کافر بوون بەرەو دۆزەخ ئەدرێنە بەر.

(٣٧) ئەوانە حەشر ئەکرێن تا خودا پیس لە پاك، واتە کافر لە موسوڵمان، جیا بکاتەوەو پیسەکان بخاتە پاڵ یەك و لەسەر یەك کەڵەکەیان بکات و هەموویان بخاتە دۆزەخەوە، ئەوانە هەموو خەسارەتمەندو ماڵوێران بوون.

(٣٨) بڵێ بە کافرەکان: ئەگەر واز لە کوفر بهێنن و موسوڵمان بن و پەیڕەویی پێغەمبەر بکەن ئەوا خودا لە هەموو گوناهی لەوەپێشیان ئەبوورێ. خۆ ئەگەر بگەڕێنەوە سەر باری دوژمنایەتی کردنی پێغەمبەرو شەڕ لەگەڵ کردنی ئەوا بەسەرهاتی نەتەوە پێشووەکان جێگیر بووە کە ئازاری پێغەمبەرانیان ئەداو، خودا بە ڕەگ و ڕیشەیاندا چووەخوار، ئێوەش هەمان دەردتان بەسەردێ.

(٣٩) جەنگیان لەگەڵ بکەن تا ئاشووبی کوفرو شیرك نەمێنێ‌و دین هەمووی دینی خودا بەیەكزانین بێ. جا ئەگەر دەسبەردار بوون ئەوە خودا بینایەو ئەزانێ چی ئەکەن.

(٤٠) خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکردو هەر لەسەر باری کوفر مانەوە ئەوا زۆر چاك بزانن کە خودا، گەورەتانەو سەرپەرشتیتان دەکات. خودا باشترین گەورەو باشترین یارمەتیدەرە.

وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا غَنِمۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ (٤١) إِذۡ أَنتُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُم بِٱلۡعُدۡوَةِ ٱلۡقُصۡوَىٰ وَٱلرَّكۡبُ أَسۡفَلَ مِنكُمۡۚ وَلَوۡ تَوَاعَدتُّمۡ لَٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡمِيعَٰدِ وَلَٰكِن لِّيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗا لِّيَهۡلِكَ مَنۡ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٖ وَيَحۡيَىٰ مَنۡ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٖۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ (٤٢) إِذۡ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلٗاۖ وَلَوۡ أَرَىٰكَهُمۡ كَثِيرٗا لَّفَشِلۡتُمۡ وَلَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ (٤٣) وَإِذۡ يُرِيكُمُوهُمۡ إِذِ ٱلۡتَقَيۡتُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِكُمۡ قَلِيلٗا وَيُقَلِّلُكُمۡ فِيٓ أَعۡيُنِهِمۡ لِيَقۡضِيَ ٱللَّهُ أَمۡرٗا كَانَ مَفۡعُولٗاۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ (٤٤) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ (٤٥)



(٤١) بزانن هەرچیتان بە تالآن دەس کەوت لە جەنگی کافراندا ئەوە ئەکرێت بە پێنج بەشەوە، پێنج یەکێکی بۆ خوداو پێغەمبەرو خزمانیو هەتیوانو گەدایانو رێبوارانی بێ خەرجییە، ئەگەر ئیمانتان هەیە بە خوداو بەو ئایەت و فریشتانە کە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ سەر بەندەی خۆمان کە موحەممەدە لە رۆژی جیابوونەوەی حەقدا لە بەتاڵ لەو رۆژەدا کە هەردوو کۆمەڵ سوپای موسوڵمان و سوپای کافران بەیەك گەیشتن لە حەڤدەی مانگی رەمەزانی پیرۆزدا لە خاکی بەدردا، خودا بەسەر هەموو شتێکدا توانایە.

(٤٢) کە ئێوەو کافرەکانی قورەیش لە گوێ چەمی شیوەکەدا بوون، ئێوە لە مەدینەوە نزیکتر بوون و ئەوان دوورتر، هەروەها قافڵەی قورەیش لە خوارتانەوە بوو. ئەگەر ئێوەو کافرەکان لە پێشدا بە وەعدو رێککەوتن کاتی جەنگتان دیاری بکردایە، ئێوە بەهۆی زۆریی ئەوان و پرچەکییانەوە، لەناو خۆتاندا ئەبوو بە خیلافتان. بەڵام خودا وای کرد کە بەرەنگاربوونەوەکەتان لەسەر وەعدو رێککەوتن نەبوو بەڵکو کوتوپڕ بوو، بۆیەش وەها کوتوپڕ بوو تا ئەوەی خودا ویستی لەسەر بوو بیکات، کە سەرکەوتنی ئێوەو یارمەتیدانتان و شکستی کافرەکان بوو. تا ئەوەی ئەمرێ دەلیلەکە ببینێو هیچ ماوەی بەهانە نەمێنێ. دیارە مەعرەکەی بەدرو سەرکەوتنی بەرەی ئیسلام دەلیلێکی ئاشکراو نومایان بوو. بێگومان خودا شنەواو زانایە.

(٤٣) بیری ئەوە بکەرەوە کە خودای گەورە دوژمنەکانی لە خەودا بە کەم نیشان دای. ئەگەر بە زۆری نیشان بدایتایە سست ئەبوون و دڵتان تێك ئەچوو و، لە کاری جەنگدا بشێوی ئەکەوتە ناوتانەوە، بەڵام خودا پاراستنی لەو پەرێشانییە. بێگومان خودا ئاگای لە دڵو دەروونی خەڵکە.

(٤٤) بیری ئەو پیرۆزییە بکەنەوە کە لە کاتێکدا سوپای هەردوولا بەرامبەری یەك راوەستان و ئامادەی جەنگ بوون خودای گەورە بە هێزو توانی خۆی سوپای کافرەکانی لە بەرچاوی ئێوەدا بە کەم پیشانداو، سوپای ئێوەیشی لە بەرچاوی ئەواندا بە کەم پێشان دا، تا هیچ لایێ لەو لاکەیتر نەترسێو هێرش ببەن بۆ جەنگ، تا خوا خواستی خۆی جێبەجێ بکات کە سەرکەوتن و یارمەتی موسوڵمانان و کوشتن و دیل کردنی کافرەکانە. هەموو کارێ هەر بۆ لای خودا ئەگەرێتەوەو کار هەر لای ئەوە.

(٤٥) ئەی خاوەن باوەڕەکان کە گەیشتن بە کۆمەڵێك لە کافران لە کاتی جەنگدا خۆتان بگرن و دامەزراو بن و، بە زوبان ناوی خودا بهێنن و بە دڵ یادی بکەن بە هیوای ئەوەی لە جەنگدا بە سەربەرزیو سەرکەوتوویی رزگار بن.

وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ
وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ
خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ
عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٤٧﴾ وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ مِنَ
ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٞ لَّكُمۡۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلۡفِئَتَانِ نَكَصَ
عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ
إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذۡ يَقُولُ
ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمۡۗ
وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٤٩﴾
وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ
وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ
بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٥١﴾
كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ
فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٥٢﴾



(٤٦) بەگوێی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بکەن و لەناو خۆتاندا ئاشووب و ئاژاوە مەگێڕن و مەچن بەگژ یەکدا کە ئەو ناکۆکییە ببێتە هۆی سەرنەکەوتنتان و هێزتان نەمێنێ. خۆتان بگرن. خودای گەورە لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان ئەگرن.

(٤٧) ئێوە ئەی موسوڵمانەکان لەخوداترس‌و ڕاست‌و خۆگر بن، وەکو ئەو کافرانە مەبن بە لەخۆباییبوونەوە لە مەککە دەرچوون بۆ پاراستنی کاروانەکەی قورەیش کە لە شامەوە ئەگەڕایەوە، ئەوانە بە ڕیاو خۆنواندن ئەڕۆیشتن تا پێیان بڵێن ئازان و مەردی مەیدانن، هەروەها ڕێگەیان لە ئیسلام بوونی خەڵك ئەگرت. جا ئەوە بوو گەڕانەوەو لە پاشاندا خۆیان ئامادەی جەنگی بەدر کرد، کە سەرئەنجام کوژران و بریندار کران و بەدیل گیران و جەنگەکەیان دۆڕاند. خودا ئاگای لە بەرو دوای کردەوەیان هەیەو جەزای هەموو کردەوەیێکیان ئەداتەوە.

(٤٨) یادی ئەوە بکەنەوە کە شەیتان لە کاتی بەرامبەربوونی موسوڵمانان و کافراندا کردەوەی کافرەکانی لەبەرچاویاندا جوان کردو پێی وتن هیچ بنیادەمێ بەسەر ئێوەدا زاڵ نابێ لەم ڕۆژەداو، من پەنام بۆ ئێوە، واتە: بتەکانیان. جا کاتێ هەردوو گورۆهەکە یەکتریان بینی‌و ڕاستەوخۆ کەوتنە جەنگەوە شەیتان لێیان پاشگەز بوویەوەو پێی وتن: بێ‌گومان ئەوەی من ئەیبینم ئێوە نایبینن بێ‌گومان من لە خودا ئەترسم! بەڕاستی خودا زۆر سەختگیرە.

(٤٩) یادی ئەوە بکەنەوە کە منافقەکان ئەیانوت: ئەم موسوڵمانانە دینەکەیان بایی کردوون. ئەو منافقانە لە دڵیاندا نەخۆشی‌و ڕق و کینە هەیە بۆیە قسەی وا بێ‌جێ ئەکەن . موسوڵمانەکان پشتیان بە خودا بەستووەو کەسێکیش پشت بە خودا ببەستێ ڕزگارو بەختیارە، چونکە خودای گەورە خاوەن عیززەت و خاوەن حیکمەتەو ئەتوانێ یارمەتی بەندەکانی خۆی بدات.

(٥٠) خۆزگە چاوتان لێ ئەبوو چۆن مەلائیکەکان کە گیانی کافرەکان ئەکێشن، لە دەموچاوو لە پشتیان ئەدەن و پێیان ئەڵێن: ئەوە دەردتان بێ، دە سزای ئاگر بچێژن!

(٥١) ئەمەش ئەنجام و جەزای ئەو کردەوە ناشیرینانەیە کە کاتی خۆی کردتانن. خودا هەرگیز ستەم لە بەندەکانی خۆی ناکات.

(٥٢) ڕەوشتی ئەمانە وەك ڕەوشتی دەستەو بەستەی فیرعەون و ئەوانەی پێش ئەوان بوو کە ئایەتەکانی خودایان بەدرۆ ئەخستەوەو باوەڕیان پێ نەئەکردن، کە خودا غەزەبی لە هەموویان گرت بەهۆی گوناهەکانیانەوە. بەڕاستی خودا بەتوان و بەهێزەو زۆر سەختگیرە.

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٥٣﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَۚ وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةٗ فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْۚ إِنَّهُمۡ لَا يُعۡجِزُونَ ﴿٥٩﴾ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦١﴾



(٥٣) ئەم سزادان و لەناوبردنانەیان لەبەر ئەوەیە کە یاسای خودا وەهایە هەر نازو نیعمەتێ کە بیدا بە گرۆهێ لێیان تێك ناداو نایبڕێت تا ئەوان وایان لێ دێ حاڵی خۆیان لە ئیمانەوە ئەگۆڕن بۆ کوفرو لە شوکرانەبژێرییەوە بۆ کوفرانی نیعمەت و، لە تێکۆشانەوە بۆ تەمەڵیو تەوەزەلی. دیارە خودا قسەی ئەم کافرانە ئەبیسێو زانایە بە ئەحواڵیان.

(٥٤) ڕەوشتی ئەمانە وەك ڕەوشتی دەستەوبەستەی فیرعەون و ئەوانەی پێش ئەوان بوو. کە ئایەتەکانی خودایان بەدرۆدەخستەوە، لەئەنجامدا بە هۆی گوناەو تاوانەکانیانەوە لەناومانبردن، هەروەها دەستەی فیرعەونیشمان لە نیلدا خنکاند. ئەمانە هەموویان ستەمکارو بەدکردار بوون.

(٥٥) بێگومان بەدترین گیانلەبەرێ بڕوا بەسەر زەویدا لای خودای گەورە ئەوانەن کە کافرن و باوەڕ بە ئایەتەکانی خودا ناکەن. ئەوانە ئیتر ئیمان ناهێنن.

(٥٦) ئەوانەی پەیمانت لەگەڵ بەستن کە دوژمنایەتیتان لەگەڵ نەکەن و خەڵکتان لێ ئاڵۆز نەکەن، کەچی لەپاشاندا هەمووجار پەیمانەکەیان هەڵئەوەشێننەوەو، لە خودا ناترسن و غەدرت لێ ئەکەن.

(٥٧) کە لە جەنگدا بەرەنگاریان بوویت و بەسەریاندا زاڵ بووی هیچ ماوەیان مەدەو پەرت و بڵاویان بکە، لەو کافرانە بدە کە دوایان کەووتون با تەفروتوونا بن بەڵکو بیر بکەنەوەو بکەونە سەر ڕێگای پاکی ئیسلام.

(٥٨) ئەگەر ترست بوو لە کۆمەڵێ کە پەیمانت لەگەڵ بەستوون، خیانەت بکەن و پەیمانەکە هەڵوەشێننەوە، ئەوا لەم حاڵەدا بە ڕێگەیەکی ڕاست و میانە پەیمانەکەیان بدەرەوە بەسەرداو بڵێ: وا من لەو پەیمانە دەرچووم.

(٥٩) با ئەوانەی کافرن گومان وا نەبەن پێش کەوتوون و لە دەستی خودا ڕزگار بوون! بێگومان ئەوان ناتوانن خودا عاجز بکەن و، خودا هەمیشە ئەتوانێ ئازاریان بدات و تۆڵەیان لێ بسێنێتەوە.

(٦٠) ئەوی لە توانتاندا هەیە لە ئەسبابی هێزو سەرکەوتن ئامادەی بکەن بۆ جەنگی کافران، وەك شیرو تیرو زرێو تاس کڵاوو چەکی هەر ڕۆژێ بەپێی ئەو ڕۆژە، هەروەها ئەسپی بەستراوەی ئامادە بۆ سواری، تا دوژمنەکانی خوارو خۆتانی پێ بترسێنن، دوژمنی تریش وەکو منافقان و دوژمنی دوور، کە ئێوە نایانناسن و خودا ئەیانناسێ. بێگومان هەرچی لە ڕێگای خوداو ئایینی ئیسلامدا صەرفی بکەن خودا لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشیتان ئەداتەوەو، ئێوە هەرگیز ستەمتان لێ ناکرێت.

(٦١) ئەگەر دوژمنەکان مەیلی ڕێکەوتن و ئاشتییان کرد تۆیش مەیلی بکەو بچۆ بەدەمیانەوەو، پشت بە گەورەییو دەسەڵاتی خودا ببەستەو لە فرۆفێڵی دوژمن مەترسە، خودا شنەواو زانایە.

وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ٱلۡـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٦٧﴾ لَّوۡلَا كِتَٰبٞ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٦٨﴾ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٩﴾



(٦٢) ئەگەر بیانەوێ بەم ڕێکەوتنانە بتخەڵەتێنن و فێڵت لێ بکەن تۆ مەترسە، خوات بەسە بۆ یارمەتیدان و پاراستنت، هەر ئەو بوو بەهێزی کردی بە یارمەتیدانی خۆیو بە یەکیەتیو دڵسۆزیی موسوڵمانان.

(٦٣) خودا ئولفەت و دۆستایەتیو یەکیەتی خستە دڵیانەوە لەگەڵ ئەو هەموو عەصەبییەتە کە لەناویاندا هەبوو. تۆ ئەگەر هەرچی لە زەویدایە لە ماڵ و سامان لە ڕێگای ئولفەتی ئەواندا صەرفت بکردایە نەتئەتوانیو پێت نەئەکرا، بەڵام خودا دڵی خستنە یەك و دۆستایەتی لەناویاندا جێگیر کرد. خودا خاوەن دەستەڵاتەو کارەکانی پڕحیکمەتن.

(٦٤) ئەی پێغەمبەری خودا بەسە بۆ تۆ یارمەتیی پەنهانی خوداو یارمەتیی ئەوانە کە پەیڕەوتن لە موسوڵمانەکان کە بە ئاشکرا هاتوچۆ ئەکەن و یارمەتیت ئەدەن.

(٦٥) ئەی پێغەمبەری خودا هانی خاوەن ئیمانەکان بدە لەسەر جەنگکردن لەگەڵ کافرەکاندا. ئەگەر لە ئێوە بیست کەسی خۆگر بن زاڵ ئەبن بەسەر دووصەد کەسدا، وە ئەگەر صەد کەسی خۆگر بن زاڵ ئەبن بەسەر هەزار لە کافرەکاندا، چونکە ئەوانە کۆمەڵێکن نازانن لەسەر ڕێگای ڕاست و ئیمان دامەزراو بن و بەتەمای پاداشی خودای گەورە بن.

(٦٦) ئێستە کە بارتان گرانە خودا باری سووك کرد لەسەرتان. خودا ئەزانێ کە بێهێزیتان تێدایەو دەرەقەت نایێن، جا ئەگەر ئێوە صەدکەسی خۆگرتان ببێ بەسەر دووصەد کەسدا زاڵئەبن و، ئەگەر هەزار کەستان ببێ بەسەر دوو هەزار کەسدا زاڵ ئەبن بە ئیزنی خودا. بێگومان خودا لەگەڵ خۆگراندایە.

(٦٧) لەمەوپێش بۆ هیچ پێغەمبەرێ نەشیاوە دیلی هەبێو بەرامبەر بە ماڵ بەرەڵایان بکات تا زۆر نەکوژێ لە کافران، جا کە هێزیگرت ئەوسا دروستە بۆی فیدیە وەربگرێ. ئێوە ماڵو دارایی دنیاتان دەوێ بۆیە فیدیە وەرئەگرن، خودای گەورەیش پاداشی قیامەتی ئەوێ بۆ ئێوە. خودا غاڵبە بەسەر کاری خۆیداو خاوەن حیکمەتە.

(٦٨) ئەگەر نووسراوێکی (لوح المحفوظ) نەبوایە، یا لە عیلمی خودادا بڕیار نەدرابوایە چاوپۆشی لەم فیدیە وەرگرتنەتان بکرێت، بەهۆی ئەم فیدیەوە کە وەرتان گرت لەلایەن خوداوە سزایێکی گەورەتان تووش ئەبوو.

(٦٩) دەی لەو ماڵە بخۆن بە تالآن دەستتان کەوتووە، کە حەڵاڵەو پاکەو، لە خودا بترسن. بە ڕاستی خودا تاوان بەخش و میهرەبانە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٧٠﴾ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٧٤﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴿٧٥﴾



(٧٠) ئەی پێغەمبەری خوا بەو دیلانە بڵێن کە لە بەردەستتاندان ئەگەر خودا بە ئیمان و ئیخلاص بزانێ لە دڵتانا ئەوە چاکتر لەوەتان ئەداتێ کە لێتان سەنراوەو گوناهتان ئەبەخشێ. خودا گوناهپۆش و میهرەبانە.

(٧١) ئەگەر بیانەوێ خیانەتت لێ بکەن و پەیمان هەڵبوەشێننەوە بەلاتەوە سەیر نەبێ. ئەوان خیانەتیان لە خودا کرد، عەقڵی پێ‌دان و بە عەقڵ نەچوون بە ڕێگادا، جا خودا زاڵ بوو بەسەریاندا. خودا زاناو خاوەن حیکمەتە.

(٧٢) بێ‌گومان ئەوانەی کۆچیان کرد لە ڕێگەی خوداداو بە ماڵو دارایی‌و گیان جیهادیان کرد لە پێناوی بەرزکردنەوەی ناوی خوداو ڕەواجی ئاییننداو، ئەوانەیش کە جێگای کۆچکردووەکانیان کردەوەو یارمەتییان دان کە کۆمەڵی ئەنصار بوون، لەناو خۆیاندا دۆستی یەکترین و میرات لە یەکتر ئەبەن. ئەوانەش ئیمانیان هێنا، بەڵام کۆچیان نەکرد، ئێوەو ئەوان میرات لە یەکتر نابەن تا کۆچ نەکەن، کە کۆچیان کرد ئەوا میرات لە یەکتر ئەبەن. بەڵام ئەگەر موحتاجی یارمەتی بوون و داوای یارمەتییان لێ کردن ئەوە واجبە لەسەرتان یارمەتییان بدەن دژی دوژمنەکانیان. خۆ ئەگەر ناکۆکییان لەگەڵ قەومێك بوو پەیمان لە بەینی ئێوەو ئەوانەدا بوو ئەوە حەقتان نی‌یە دژی ئەوانە یارمەتییان بدەن. بێ‌گومان خودا بینایەو ئاگای لە کردەوەتانە.

(٧٣) ئەوانەش کە کافرن هەندێکیان دۆست و یارمەتیدەری هەندێکی تریانن، یا میرات لە یەکتر ئەبەن. ئەگەر ئەم دەستوورەی کە بۆم دیاری کردوون پەیڕەوی لێ نەکەن و لەگەڵ موسوڵمانەکاندا دۆستی نەکەن و لەگەڵ کافراندا پێوەندیتان هەبێ ئەوا فیتنەو ئاژاوەو خراپەکاری‌و پەرێشانی لەسەر زەوی پەیدا ئەبێ خراپەکاری‌یەکی گەورە.

(٧٤) بێ‌گومان ئەو کەسانەی ئیمانیان هێناو کۆچیان کردو لەپێناوی ئایینی ئیسلامدا جیهادیان کردو، ئەوانەش کە جێگەی کۆچکردووەکانیان کردەوەو یارمەتییان دان، ئەوانەن موسوڵمان و خاوەن ئیمانی ڕاستەقینەو، ئەوانەن کە خودا لێیان خۆش ئەبێ‌و ڕۆزیی باشیان پێ ئەدرێ.

(٧٥) ئەو کەسانەش کە دوایی ئیمانیان هێنا کۆچیان کردو لەگەڵتاندا جیهادیان کرد ئەوانەش لە ئێوەن. خزمەکان لەناو یەکا موستەحەقترن بۆ میرات وەرگرتن لە یەکتر. ئەمە حوکمێکە لە قورئاندا جێگیر کراوە. خودا ئاگای لە هەموو شتەو هیچی لێ ون نابێ.

## سُورَةُ التَّوبَةِ

مدنية — ٩ — آياتها ١٢٩

بَرَاءَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا فِي الْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ وَأَنَّ اللَّهَ مُخْزِي الْكَافِرِينَ ﴿٢﴾ وَأَذَانٌ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى النَّاسِ يَوْمَ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ أَنَّ اللَّهَ بَرِيءٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللَّهِ وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُوا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣﴾ إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾



## سوورەتی (التوبة)

مەدینەیی‌یە بێجگە دوو ئایەتی دواینی کە مەککەیین سوورەتەکە (١٢٩) ئایەتە.

ئەم سوورەتە ناوی مەشهوورە بە (بەرائەت). سیڕی نەنووسینی (بسم الله الرحمن الرحیم) لە سەرەتایەوە ئەوەیە ئەم سوورەتە بۆ بەیانی ڕق و قینی خودایە لە کافران و موناسبی ڕەحمەت نی‌یە. لە حەزرەتی عوثمانەوە ئەگێڕنەوە (ڕ.خ) فەرموویەتی: نووسەری دوایی سوورەتی ئەنفال و سەرەتای سوورەتی بەرائەت بووم، حەزرەت (د.خ) نەیفەرموو پێم کە (بسم الله الرحمن الرحیم) لە سەرەتایەوە بنووسم.

(١) ئەمە بەرائەتە لەلایەن خوداو پێغەمبەریەوە لە عەهدو پەیمانی ئەو کافرانە کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون و پەیمان هەڵئەوەشێننەوە، واتە : ئیتر لەمەوپاش خوداو پێغەمبەری خودا گوێ نادەنە ئەو پەیمانە چونکە ئەوان پەیمانیان نەبردەسەرو هەڵیانوەشاندەوە.

(٢) ئیتر ئێوە ئەی موشریکەکان بەرەڵا بن بە زەویداو بۆ کوێ ئەڕۆن بڕۆن، ئەم بەرەڵابوونەش بۆ ماوەی چوارمانگە، کە هەندێ لە ئەهلی تەفسیر وتوویانە شەووال و ذی‌القعدەو ذی‌الحجەو موحەڕڕەمە. هەندێکیش وتوویانە لە بیستەمی ذی‌الحجەوە تا دە ڕۆژی ربیع الثاني یە. زۆر باش بزانن ئێوە دەرەقەتی خودا نایەن و ناتوانن خودا بێ‌دەستەڵات بکەن. بێ‌گومان خودای بەدەستەڵات کافرەکان ڕیسوا ئەکات. (٣) ئەمە بانگ و ڕاگەیاندنە لە لایەنی خوداو پێغەمبەرەوە بۆ لای ئادەمزاد لە ڕۆژی حەجی گەورەدا کە جەژنی قوربانە کە گەلێ ئاداب و یاسای گەورەی تێدایە لە ئادابی حەج، بانگدان و ڕاگەیاندنە لەسەر ئەوەی کە خوداو پێغەمبەری خودا دوورو بەریو پاکن لە پەیمانی ئەو کافرە موشریکانە. جا ئەگەر تەوبەتان کرد لە کوفرو موسوڵمان بوون ئەوە زۆر چاکترە بۆتان، خۆ ئەگەر پشتتان هەڵکرد ئەوا بزانن ئێوە خودا بێ‌دەسەڵات ناکەن و، بزانن خودا توانایە. موژدە بدە بە کافرەکان بە سزایێکی زۆر سەخت و گران.

(٤) مەگەر ئەو کافرە موشریکانە کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون و لە ماوەی ئەو پەیمانەدا هیچ کەموکووڕییەکیان نەبووبێ‌و پەیمانیان هەڵنەوەشاندبێتەوەو، کەسیان لێ نەکوشتبێ و یارمەتی کەسیان نەدابێ لەسەر ئازاردانتان، ئەوانە پەیمانیان لەگەڵ بەرنەسەر تا ماوەکەی تەواو ئەبێ. خودا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە لە خودا ئەترسن و بەپێی فەرمانەکانی ئەڕۆن بەڕێوە.

(٥) جا کاتێ ئەو چوار مانگە تەواو بوو کە ڕێگا درابوو بە پەیمان‌شکێنەکان بە ئازادی تیایا بگەڕێن، ئەو موشریکە پەیمانشکێنانە بکوژن لە هەر شوێنێکدا زەفەرتان پێ بردن لە خاکی حەرەم یا لە شوێنێ‌تر بیانگرن و تەنگیان پێ هەڵچنن و گەمارۆیان بدەن و لە هەموو ڕێگەیێکدا بۆیان دانیشن و مەهێڵن تەوافی کەعبە بکەن. جا ئەگەر تەوبەیان کردو گەڕانەوە بۆ لای خوداو موسوڵمان بوون و نوێژیان کردو زەکاتی ماڵی خۆیانیان دا بەوانە کە موستەحەققی زەکاتن، ئەوا ڕێگەیان بەرەڵا بکەن با بە ئازادی وەکو خۆتان بژین بێ‌گومان خودا تاوانبەخش و میهرەبانە. (٦) ئەگەر یەکێ لە موشریکەکان داوای پەنای لێ کردی پەنای بدە تا فەرموودەی خودا ببیسێ. پاش ماوەی مانەوەی بیگەیێنە جێگای ئەمن و ئاسایشی خۆی. ئەم میهرەبانییە لەبەرئەوەیە کە ئەمانە کۆمەڵێکن نەزانو نەفامن.

كَيۡفَ يَكُونُ لِلۡمُشۡرِكِينَ عَهۡدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ فَمَا ٱسۡتَقَٰمُواْ لَكُمۡ فَٱسۡتَقِيمُواْ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٧﴾ كَيۡفَ وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ وَأَكۡثَرُهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٨﴾ ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرۡقُبُونَ فِي مُؤۡمِنٍ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُعۡتَدُونَ ﴿١٠﴾ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ وَنُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿١١﴾ وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣﴾



(٧) موشریکەکان عەهدو پەیمانیان نابێ لەگەڵ خوداو لەگەڵ پێغەمبەری خوداداو ئاییەنەسەر، ئەوانە نەبێ کە لای مەسجیدولحەرام پەیمانتان لەگەڵیاندا بەست. جا ئەمانەش چەندێ پەیمانەکەیان ڕاگرت ئێوەش ڕایگرن. بەڕاستی خودا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە لە خودا ئەترسن‌و خۆیان لە گوناەو بێئەمریی خودا دوورئەخەنەوە.

(٨) ئەمانە چۆن بە خاوەن پەیمان بزانین؟ ئەمانە چۆن پەیمان ئەبەنە سەر؟ والحال ئەگەر بەسەرتاندا زاڵ ببن نە ڕیعایەتی خزمایەتی ئەکەن و نە ڕازیتان ئەکەن. بەدەم ڕازیتان ئەکەن، بەڵام بە دڵ ئێوەیان خۆش ناوێ. زۆرتریان لە ڕێلادەرو پەیمان شکێنن.

(٩) ئەو کافرانە ئیحترامی ئایەتەکانی خودایان بە نرخێکی کەم و بە سامانی بێبەقای دنیا گۆڕییەوەو، پشتیان لە حەق کردو ڕێگای ئیسلامبوونیان لە خەڵك گرت. ئەو کردەوەی ئەوان ئەیکەن

کرداریکی ئێجگار بەدە.

(١٠) ئەوانە دەربارەی موسوڵمانەکان نە حەقی خزمایەتی ڕائەگرن و نە عەهدو پەیمان. ئەوانە لە حەق لایانداوەو فەرمانی خودایان جێبەجێ نەکردووە.

(١١) بەڵام ئەگەر تەوبەیان کردو نوێژیان جێبەجێ کردو زەکاتیان دا بە موستەحەققان، ئەوا براتانن لە ئاییندا. ئا بەم جۆرە ئایەتەکان تەفصیل ئەدەین بۆ قەمێ کە زانا بن و تێبگەن.

(١٢) جا ئەگەر پەیمانی خۆیانیان شکاند پاش بەستنی و بەئاشکرا ئایینەکەی ئێوەیان بەدرۆ ئەخستەوەو تەعنەیان لێ ئەداو قسەیان پێئەوت، ئیتر جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوانەدا کە سەرکردەی کوفرو گومڕاهین. ئەوانە ئیمانیان نییەو پەیمان ڕاناگرن. شەڕیان لەگەڵ بکەن و تەنگیان پێ هەڵچنن بەڵکو دەسبەرداری ئەم کردەوە نالەبارانە بن و بێنە سەر ڕێی ڕاست.

(١٣) چۆن جەنگ ناکەن لەگەڵ کۆمەڵێك کە پەیمانیان شکاندو عەزمیان جەزم بوو لەسەر دەرکردنی پێغەمبەر لە شاری مەککە، کە ئەوان لەپێشدا پەیمانیان تێك دا؟ ئایا ئێوە لێیان ئەترسن؟ خودا شایانی ئەوەیە لێی بترسن ئەگەر موسوڵمانن، چونکە موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەوەیە هەر لەخودا بترسێ.

قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٥﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾ ۞ أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾



(١٤) جەنگیان لەگەڵدا بکەن. خودا بە دەستی ئێوە سزایان ئەداو ڕیسوایان ئەکاتو، یارمەتیتان ئەدا بەسەریانداو موسوڵمانەکان شادکامو دڵ خۆش ئەکات بە شکست و سزای ئەوان و سەرکەوتنی ئێوە.

(١٥) داخی دڵیان لەو کردەوە ناشیرینانە ئەڕێژێ کە کافرەکان ئەیانکردن، تەوبەیش قبووڵ ئەکات لە هەرکەس مەیلی لەسەر بێ. خودا زانایەو کارەکانی پڕ لە حیکمەتن.

(١٦) ئەم ئایەتە خیطابە لەگەڵ موسوڵمانەکان لە کاتێکدا هەندێکیان جەنگ کردنیان پێ ناخۆش بوو. واتە: ئایا لاتان وایە وازتان لێ بهێنرێ کە هێشتا ئەوانەتان کە تێکۆشەرو موجاهیدی ڕاستەقینەن لە جیهانی ماددەدا دەرنەکەوتوون؟ هەروەها هێشتا دەرنەکەوتووە ئێوە بێجگە خوداو پێغەمبەری خوداو موسوڵمانان، کەسێکیترو دۆستێکی نهێنیتان نییە قسەو نهێنییەکانی لا بدرکێنن؟ خودا لە هەموو کردەوەتان ئاگادارەو هیچی لێ ون نابێت.

(١٧) ڕەوا نییە هاوبەشبۆخوادانەران بێن مزگەوتەکان ئاوەدان بکەنەوە بە دروست کردن یا چوونەناو بۆ عیبادەت. ئەوان و مزگەوت چ پێوەندییەکیان بە یەکەوە نییە، ئەوان خۆیان شایەتی لە نەفسی خۆیان ئەدەن کە کافرن . ئەوانە کردەوەی بەدیمەن چاکیان لای خودا بێئیعتیبارەو نرخی نییە. ئەوانە هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا ئەمێننەوە.

(١٨) مزگەوتەکانی خودا ئەوانە ئاوەدانیان ئەکەنەوە کە باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیەو، نوێژ ئەکەن و ماڵیان بە موستەحەققان ئەدەن و، لە خودا نەبێ لە کەس ناترسن. ئەمانە هیوا وایە کە شارەزای ڕێگای ڕاست و لە ئەهلی هیدایەت بن.

(١٩) ئایا ئێوە وا ئەزانن پایەی ئاو بەحاجیدان و ئاوەدان کردنەوەی (مسجدالحرام) وەکو پایەی ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیەو لەپێناوی ڕەزامەندی خوداو پاراستنی ئایینی ئیسلامدا جیهادیان کردووە؟ ئەم دوو جۆرە کەسانە هەرگیز لای خودای گەورە وەك یەك نین. خودا هەرگیز قەومی ستەمکاری کافر هیدایەت نادات.

(٢٠) ئەوانەی ئیمانیان هێناو کۆچیان کردو لەپێناوی ڕەزامەندی خودادا بە ماڵو بە گیان جیهادیان کرد ئەوانە پایەیان لای خودا گەورەترەو ئەوانەن سەرکەوتوون و بە میهرەبانی خودا گەیشتوون.

يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا
نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ
عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ
وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِ ۚ
وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ إِن
كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ
وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ
تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ
فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى
ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ
كَثِيرَةٍ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ
تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ
بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا
وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾



(٢١) خودای گەورە موژدەیان پێ ئەدا بە میهرەبانیو ڕەزامەندی خۆی هەروەها موژدەی چەند بەهەشتێکیشیان پێ ئەدا کە نیعمەت و خۆشی هەمیشەییان تێدایە بۆیان.

(٢٢) هەتا هەتایە لەو بەهەشتانەدا ئەمێننەوە. بێ‌گومان خودا پاداشی گەورەی لایە.

(٢٣) ئەی موسوڵمانینە! باوك و باپیرو براکانتان بە دۆست و کەسی خۆتان ڕامەگرن ئەگەر ئەوان کوفریان پەسەند کرد بەسەر ئیماندا، هەرکەس لە ئێوە ئەوانە بە دۆست و کەسی خۆی بزانێ ئەوانە ستەمکارن و وەك ئەوانن.

(٢٤) تۆ بڵێ بەوانە: ئەگەر باوكو باپیرتانو کوڕەکانتانو براکانتانو ژنەکانتانو عەشرەتەکەتانو، دارایی‌یەك کە دەستتان کەوتووەو، بازرگانیی‌یەك کە ترستان هەیە زەرەر بکاتو، خانوو بەرەیەك کە پێی ڕازین باشترو خۆشەویستتر بن لاتان لە خوداو پێغەمبەری خوداو جیهاد لەپێناوی ڕەزامەندی خودادا، ئەوا ڕاوەستن و چاوەڕوان بن تا خودای گەورە سزای خۆی ئەنێرێ بۆ سەرتان. بێ‌گومان خودا هەرگیز هیدایەتی قەومی فاسق نادات.

(٢٥) بەڕاستی خودا لە گەلێ شوێندا یارمەتی ئێوەی داو، لەڕۆژی غەزای حونەیندا کە ژمارەتان زۆر بوو بەو زۆرییە لە خۆتان بایی بوون و دڵنیا بوون کە بەهۆی زۆریتانەوە سەرئەکەون و کەس دەرەقەتتان نایێو زەفەرتان پێ نایات، زۆرییەکەتان هیچ فائیدەیێکی نەبوو بۆتان و فریاتان نەکەوت و ئەو دنیا پان و پۆڕو بەربڵاوەتان لێ تەنگ بوو و پاشان پشتتان هەڵکردو هەڵاتن.

(٢٦) جا خودای گەورە ئارامی نارد بۆ سەر دڵی پێغەمبەرو موسوڵمانان و سوپایێکی نارد بۆ یارمەتیتان کە ئێوە نەتانئەبینین، هەروەها سزای کافرەکانی داو شکاندنی. ئەمەیە پاداشی شایانی کافرەکان.

ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا الَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا۟ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ۚ وَإِنْ خِفْتُمْ عَيْلَةً فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِۦٓ إِن شَآءَ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٨﴾ قَٰتِلُوا۟ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْءَاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا۟ الْكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ وَقَالَتِ النَّصَٰرَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَٰتَلَهُمُ اللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ اتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾



(٢٧) جا پاش ئەوە بۆ هەرکەس کە خودا مەیلی لێ بێ تەوبەی لێ قبووڵ ئەکات، خودا تاوانبەخش و میهرەبانە.

(٢٨) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا! بەڕاستی موشریکەکان پیسن، لەم ساڵیان بەدواوە ئیتر نابێ توخنی (مسجد الحرام) بکەون و زیارەتی بکەن. خۆ ئەگەر ئێوە ترسی ئەوەتان هەبوو کە ئەگەر ئەوانە نەیێن بۆ زیارەت هیچتان دەست نەکەوێت و فەقیر بکەون و خەرجیتان نەبێ، ئەوا بێگومان خودا لەمەوپاش بە فەزڵی خۆی دەوڵەمەندتان ئەکات و بێنیاز ئەبن لە خەڵك، ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ. خودا زانایەو کارەکانی پڕحیکمەتن.

(٢٩) جەنگ بکەن لەگەڵ ئەو کیتابییانەدا کە بە شێوەیێکی ڕاست و تەواو ئیمانیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی نییەو پەیڕەوی ئایینی ئیسلام ناکەن، جەنگیان لەگەڵ بکەن تا ناچار ئەبن جزیە (سەرانە) بدەن بە شێوەیێکی ملکەچانەو، سەر شۆڕ کەن بۆ دەستەڵاتی ئیسلام.

(٣٠) جوولەکەکان وتیان عوزەیر کوڕی خودایە، گاورەکانیش وتیان عیسای مەسیح کوڕی خودایە . قسەیێکە بە دە[م] ئەیکەن و مەعناکەی تێناگەن و نازانن خودا مەحاڵە کوڕی ببێ و لە کەس بووبێ . ئەم قسەیان وەك قسە[ی] کافرەکانی لەمەوپێشە کە ئەیانوت مەلائیکەکان کچی خودان. خودا لەسەر بوختانە درۆیە بچێ بەگژیانداو لەناویا[ن] بەرێت . ئەمانە چۆن لە حەق و ڕاستی هەڵئەگەڕێنەوەو پەیڕەوی ڕێگای ناڕاست ئەکەن ؟.

(٣١) ئەوانە زانا ئایینیی‌یەکانیان و ڕەبەنەکانیان ئەپەرستن و لە حەرام و حەلاڵدا بەگوێی ئەوان ئەکەن و سوجدەیان بۆ ئەبەن و لە زاتی خودا لایانداوە ، هەروەها عیسای مەسیحی کوڕی مەریەم ئەپەرستن، کەچی لەلایەن خوداوە ئەمریا[ن] پێ نەکراوە بەوە نەبێ کە یەك خودا بپەرستن کە تاق و تەنیایەو کەس خودا نی‌یە ئەو نەبێ، خودا پاکەو دوورە لە[و] شتانەو لەو کەسانە کە ئەوان کردوویانن بە هاوبەشی.

يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَٰتِلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾

الحزب ٢٠



(٣٢) ئەوانە ئەیانەوێ نووری خودا کە دینی ئیسلام و ڕیسالەتی پێغەمبەرە (د.خ) بە قسەی پڕوپووچی خۆیان بکوژێننەوە. خودا نووری ئایینی خۆی تەواو ئەکات و ئەیپارێزێ هەرچەند کافرەکان حەز نەکەن و پێیان ناخۆش بێ.

(٣٣) خودا ئەو خودایە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە لەگەڵ چرای هیدایەت و ئایینی ئیسلامدا بۆ ئەوەی بەرزی بکاتەوە بەسەر هەموو دینێکدا ئەگەرچی موشریکەکان حەز نەکەن و پێیان ناخۆش بێ.

(٣٤) ئەی موسوڵمانینە ! بەڕاستی گەلێ لە زانایانی ئایینی و ڕەبەنانی ئەهلی کیتاب بە ناحەق ماڵی خەڵك ئەخۆن و ڕێگا لە خەڵك ئەگرن کە ئیسلام بن و بکەونە سەر ڕێی ڕاست . ئەوانە ئاڵتوون و زیو کۆئەکەنەوەو لە ڕێگای خودادا صەرفی ناکەن. واتە زەکاتی شەرعی لێ دەرناکەن، ئەوانە موژدەیان بدەرێ بە سزای سەختی ڕۆژی دوایی.

(٣٥) ئەو سزا سەختە لە ڕۆژێکدا ئەبێ کە ئەو ئاڵتوون و زیوە لە ئاگری دۆزەخدا سوور ئەکرێنەوەو، تەوێڵ و پشت و تەنشتی خاوەنەکانیان پێ داخ ئەکرێو، پێیان ئەوترێ ئەمە ئەو ئاڵتوون و زیوەیە لە دنیادا کۆتان ئەکردەوە بۆ خۆتان و حەقی شەرعیتان لێ دەرنەئەکردو زەکاتتان لێ نەئەدا، ئەوە دەردتان بێو سزای ئەوە بچێژن کە کۆتان ئەکردەوە.

(٣٦) ژمارەی مانگەکانی ساڵ لای خودا دوانزە مانگە لەو ڕۆژەوە کە خودا زەویو ئاسمانەکانی دروست کردووە، ئەمە لە لەوحی مەحفوظ و لە عیلمی خودادا بڕیار دراوە. چوار مانگیان جەنگ کردن تیایاندا حەرامە کە بریتین لە ذی‌القعدە و ذی‌الحجە و موحەڕڕەم بە یەکەوەو ڕەجەب بە تەنیا. ئەمە دین و ئایینی ڕاستە. لەو چوار مانگەدا بەتایبەتی ستەم لە خۆتان مەکەن و ئازاری یەکتر مەدەن. لەگەڵ موشریکەکان بەعموومی بجەنگن وەك ئەوان چۆن جەنگ لەگەڵ هەمووتان ئەکەن و بزانن کە بەڕاستی خودا لەگەڵ ئەوانەیە لێی ئەترسن و خۆیان لە گوناه ئەپارێزن.

إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّمۡ تَرَوۡهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾



(٣٧) بێگومـان دواخستنی حـەرامی مانگێك لـەو چوار مانگـە بـۆ جێگـەی مانگێکی‌تر زیادە کوفرە، چونکە ئەبێتە هۆی حەڵاڵکردنی ئـەوەی خـودا حـەرامی کـردووەو حـەرامکردنی ئـەوەی خـودا حەڵاڵی کردووە.

هەندێ لە کافرەکان ئەگەر لـە یـەکێ لـەو چوار مانگـە حەرامـەدا بکەوتنایەتـە جەنگـەوە بـەردەوام ئـەبوون لەسـەر جەنگەکـەو، لـەباتی ئـەو مانگـە دوایـی مانگێکی‌تریان حەرام ئەکرد.

بـە ئـارەزووی خۆیـان سـاڵی مانگـێ حەرامیان حەڵاڵ ئەکردو ساڵێ بەحەرامی ئەیانهێشتەوە، تـەنها حیسـابی ژمـارەی چوار مانگیـان ئـەکرد بـە بـێ گوێدانـە مانگە حەرامە تایبەتییـەکان. بـەم جۆرە ئـەو مانگـەی خـودا حـەرامی کردبـوو حەڵاڵیان ئەکرد. ئەم کردەوە ناشیرینانەی خۆیان لـە بەرچاویان جـوان بووبـوون، بـە باشیان ئەزانین. خودا هەرگیز هیدایەتی قەومی کافر نادات.

(٣٨) ئەی موسوڵمانینە! ئەوە چیتانەو، چیتان لێ قەوماوە کە پێتان بوترێ دەرچن بۆ غەزا خۆتان ئەدەن بە زەویدا، تەمەڵی ئەکەن و لەشی خۆتان قورس ئەکەن تا نـەڕۆن بـۆ غەزاکـە؟ ئایـا ڕازی ئـەبن بـە ژیـانی دنیـا لـەباتی ژیانی نەبڕاوەی قیامەت، کە لەزەت و خۆشی ژیانی دنیا بەنیسبەت خۆشی ژیانی قیامەت هیچ نی‌یەو زۆر کەمە؟.

(٣٩) ئەگەر ڕانەپەڕن و نەچن بۆ جەنگ خودا سزایێکی زۆر سەختتان ئـەدات و لـە بـاتی ئێـوە قـەومێکی‌تر دێنێتە ڕووی کار. ئێوە ناتوانن هیچ جۆرە زیانێك لە خودا بدەن، خودا توانایەو دەستی بەسەر هەموو شتێکدا ئەڕوات.

(٤٠) ئەگەر ئێوە یارمەتی پێغەمبەر نەدەن مەبەست نی‌یە، چونکە بەڕاستی خـودا فریای‌کـەوت و یارمـەتی دا لـەو کاتە نالەبارەدا کە کافرەکان لە مەککـە دەریـان کـرد، کـە تـەنها خـۆیو هاوڕێکـەی بـوون لـە ئەشـکەوتەکەداو، بە هاوڕێکەی ئەوت خەم مەخۆ خودا لەگەڵماندایە. جا خودا ئـارامـیو بێترسـی نـازڵ کـردە سـەر دڵـیو، بـە سوپایەك یارمەتی‌دا کە ئێوە نەتانبینی. دەنگی کافرەکانی نزم کردەوەو دای بە لووتیاندا، بێگومان قسەی خودا کـە تەوحیدە بەرزترو بەرێزترەو ئەو ئەبێ سەرکەوێ. خوا خاوەن دەستەڵاتەو کارەکانی پڕحیکمەتن.

ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ وَسَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٤٢﴾ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾ لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأٓخِرِ وَٱرْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ۞ وَلَوْ أَرَادُواْ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُواْ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾



(٤١) دەرچن بۆ غەزا بە سووك و قورستانەوەو بە سوارەو پیادەتانەوەو، بە ماڵو دارایی‌و گیانتان تێكۆشن لەپێناوی ڕەزامەندی خودادا. بێ‌گومان ئەگەر زانا بن‌و بفامن ئەم غەزاو تێكۆشانە بۆ ئێوە چاكترەو پاداشی گەورەترە.

(٤٢) ئەگەر ئەوەی تۆ ئەوانی بۆ بانگ ئەكەی دەستكەوتێكی نزیك بوایە یا سەفەرێكی مام ناوەندی بوایە دوات ئەكەوتن، بەڵام مەسافەكە دوورەو ئەوان ماندو ئەبن. سوێند بە خودا ئەخۆن و ئەڵێن ئەگەر بمانتوانییایە لەگەڵتان دەرئەچووین. ئەوانە بەم حاڵە خۆیان ئەفەوتێنن، خودا ئەزانێ ئەوان درۆزنن.

(٤٣) خودا عەفوت كا! بۆچی ئیزنت دان لە شوێنی خۆیاندا بمێننەوە؟ با بۆت دەركەوتایە كێ لەوانە ڕاستگۆیەو بەدڵیەتی‌و كێ درۆزنە.

(٤٤) ئەوانەی باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە داوای ئیزنت لێ ناكەن بۆ ئەوەی بە ماڵو بە گیان لە پێناوی ڕەزامەندی خودادا جیهاد بكەن. ئەوانە ئامادەو لەسەرپێن و خۆیان دەستپێشخەری ئەكەن. خودا ئاگای لەوانەیە كە لێی ئەترسن.

(٤٥) تەنها ئەوانە داوای ئیزنت لێ ئەكەن كە باوەڕیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی نی‌یەو دوودڵن، ئەوانە لەناو دوودڵیی خۆیاندا ئەتلێنەوەو ئەم سەرەوسەر ئەكەن و لەسەر بارێك دانامەزرێن.

(٤٦) ئەگەر ئەو ئیزن خوازانە بیانویستایە دەرچن بۆ جیهاد ئەسبابی دەرچوونیان ئامادە ئەكردو خۆیان كۆئەكردەوە، بەڵام خودا نەیویست هەستن و نیشاط بنوێنن ئەنجامی بێ‌ئیرادەیی‌و تەمەڵی خۆیان ، بۆیە وەستاندنی‌و ڕاست نەبوونەوە بۆ جیهادو، لەلایەن شەیتانەوە وەسوەسە خرایە دڵیان و، پێیان وترا: ئێوەش لەگەڵ دانیشتووە تەمەڵەكاندا دانیشن.

(٤٧) ئەگەر لەگەڵتان دەرچوونایە هیچیان زیاد نەئەكرد بۆتان سستی نەبێ‌و، بەپەلە دەستیان ئەكردە دووزوبانی‌و ئاژاوەنانەوەو ترساندنتان. ئێوەش هی واتان هەیە ئیرادەیان بێ‌هێزەو قسەیان ئەبیستن و مەسئەلەكە بە زیان بەسەرتاندا ئەشكایەوە. خودا ئاگای لە ستەمكاران هەیە.

لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ۖ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا۟ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا۟ وَّهُمْ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ قُلْ أَنفِقُوا۟ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمْ ۖ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾



(٤٨) بەڕاستی ئەو منافقانە لەمەوپێش، لە غەزای ئوحوددا، حەزیان لە فیتنەو ئاژاوەو پەرێشانی ئەکرد لەناو یارانی تۆداو، چەند قسەیان هەڵگێڕایەوەو چەند پیلانیان نایەوە بۆ ئەوەی عەزمتان بشکێنن، تا یارمەتی خودا هات و دینی ئیسلام بەرز بوویەوە ئەگەرچی ئەوانیش لە کانگای دڵیانەوە پێیان ناخۆش بوو.

(٤٩) هەندێ لەوانە ئەڵێن: ئیزنم بدە دانیشم لە ماڵداو تووشی فیتنەو موخالەفەم مەکە، واتە ئیزنم نەدەیت و بەگوێت نەکەم. بێ‌گومان فیتنە ئەوەیە کە ئەوانی تێکەوتوون، کە دوا ئەکەون لە جیهادو دووڕوویی ئەکەن. بەڕاستی دۆزەخ گەمارووی کافرەکان ئەدات و هەموویان کۆئەکاتەوە.

(٥٠) ئەگەر چاکەیێك، سەرکەوتنێ، تالانییەکت دەس کەوێ لە کانگای دڵیانەوە پێیان ناخۆشەو بەخیلیت پێ‌ئەبەن. ئەگەر لە هەندێ غەزایشدا تووشی زیان و شکست بێی ئەوان ئەڵێن: ئێمە دەستی خۆمان وەشاند . باش بوو دواکەوتین و نەچووین بۆ جەنگ. بە شادەکامیو خۆشی‌یەوە پشتتان لێ هەڵئەکەن.

(٥١) تۆ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئێمە هیچمان تووش نابێ، لە سەرکەوتن یا شەهید بوون، ئەوە نەبێ خودا بۆی نووسیوین لە (لوح المحفوظ)دا، ئیتر پێ خۆش بوون و پێ‌ناخۆش بوونی ئێوە کارەکە ناگۆڕن. هەر خودا پشتیوان و سەردارمانەو پشتمان بەو بەستوە، بەڕاستی لەسەر خاوەن ئیمانەکان پێویستە تەنها پشت بە خودای دەستەلاتدار ببەستن.

(٥٢) تۆ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە چاوەڕوانی ئەوەن کە ئێمە بێجگە دوو ئەنجامی زۆر چاك تووشی هیچ ببین: یا سەرکەوتن بە سەر دوژمندا، یا مردن لە ڕێگای خوداداو شەهید بوون؟ ئێمەش چاوەڕوانین کە خودای گەورە تووشی یەکێ لە دوو ئەنجامی زۆر خراپتان بکات: یا خۆی سزاتان بدات، یا ئێمە بە دەستی خۆمان زەفەرتان پێ بەرین و بەسەرتاندا زاڵ ببین. دە چاوەڕوان بن. ئێمەش لەگەڵتان چاوەڕوانین: تا بزانین ئەنجام چی ئەبێ؟.

(٥٣) پێیان بڵێ: ماڵ صەرف کەن چ بە ئارەزووی خۆتان و چ بە زۆر، بە هەر جۆرێ صەرفی بکەن لێتان قبوول ناکرێ، چونکە ئێوە قەومێکی فاسق بوون.

(٥٤) هیچ شتێ ڕێگای ئەوەی لێ نەگرتن کە نەفەقەیان لێ قبوول بکرێ ئەوە نەبێ کە ئەوانە باوەڕیان بە خوداو بە پێغەمبەری خودا نی‌یەو بە تەمەڵیو تەوەزەلیو لەشقورسی نەبێ ناچن بۆ نوێژو، هەرچیش صەرف ئەکەن پێیان ناخۆشەو بەدڵ حەز لەو صەرفە ناکەن.

فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم
بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾
وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ
قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ
أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴿٥٧﴾ وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ
فِى ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنْ أُعْطُوا۟ مِنْهَا رَضُوا۟ وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا۟ مِنْهَآ إِذَا
هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ
وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ
وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ
لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ
وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ
فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾ وَمِنْهُمُ
ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ
لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾



(٥٥) ئیتر هەرگیز ماڵو دارایی‌و ئەولادی ئەوانە نەتخەنە تەعەججوب و بە باشیان نەزانی، خودا ئەیەوێ لە دنیادا بەو شتانە بیانخاتە سزاو ماندووبوونەوە بە هۆی کۆکردنەوەی‌و پاراستنی‌و بەرچاوبرسییەتی‌و ترس لە فەوتانی‌و، بە هۆی ڕابواردن و لەزەت وەرگرتنەوە لەو ماڵو سامانە خودایان لە بیربچێتەوەو بە کافری بمرن.

(٥٦) سوێندتان بۆ ئەخۆن بەخودا کە ئەوان لە ئێوەن و موسوڵمانن. هەرگیز ئەوان لە ئێوە نین و حەزتان لێ ناکەن بەڵام ئەمانە کۆمەڵێکی ترسنۆکن و لێتان ئەترسن بۆیە ئەم قسانەتان بۆ ئەکەن.

(٥٧) ئەگەر پەنایێ یا چەند ئەشکەوتێ یا شوێنێکی وەك سەرداب و شوێنی خۆشاردنەوەیان دەسبکەوتایە هەموو ڕوویان تێ ئەکردو خۆیان ئەشاردەوەو سەرکەشییان ئەکرد. بەڵام چ بکەن چاریان نەماوەو بەدیمەن بەگوێتان ئەکەن.

(٥٨) لە منافقەکان هی وا هەیە ڕەخنەت لێ ئەگرێ دەربارەی دابەش کردنی صەدەقە، جا ئەگەر بەشیان درا ڕازی ئەبن و، ئەگەر بەشیان نەدرا عاجز ئەبن و پێیان ناخۆشە.

(٥٩) ئەگەر ئەوان ڕازی بوونایە بەو بەشەی خوداو پێغەمبەر پێی داون و، بیانوتایە: ئێمە میهرەبانی خودامان بەسەو ئەو لە فەزڵی خۆیمان ئەداتی‌و پێغەمبەریش بەشمان ئەداو ئێمە حەز لە ڕەزامەندیی خودا ئەکەین، ئەوە بەش و پارەیێکی باشیان لەلایەن خوداوە دەس ئەکەوت.

(٦٠) زەکات تەنها بۆ ئەم هەشت صینفەیە. یەکەم : هەژار کە هیچی نەبێ پێی بژی. دووەم: مسکین ئەوەی کەمێکی هەیەو بەشی ناکا. سێیەم: ئەو کەسانەی زەکاتەکە کۆئەکەنەوە. چوارەم : ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بەڵام نییەتەکەیان بێ هێزەو بە ماڵی دنیا دڵیان ڕائەگیرێ. پێنجەم: بەندەیێ کە موحتاجی ماڵ بێ بۆ ئازادبوونی لە بەندەیی. شەشەم: ئەوکەسەی کە لە ڕێگای ڕێکخستنی موسوڵمانان و کاری خەیردا قەرزار بووەو نەتوانێ بیداتەوە. حەوتەم: ئەوانەی بە خۆڕایی و بەبێ مەعاش لە ڕێگای خودادا غەزا ئەکەن. هەشتەم: ئەو موسافیرانەی مەسرەفیان پێ نەمابێ‌و دەستیان لە ماڵی خۆیان بڕابێ. ئەمە لەلایەن خوداوە واجب کراوە. خودا زانایەو کارەکانی پڕ لە حیکمەتن.

(٦١) لە منافقەکان هی وا هەن ئازاری دڵی پێغەمبەر ئەدەن و ئەڵێن: ئەم ئینسانە هەر گوێچکەیە، واتە : هەمووشت ئەبیستێ‌و هەرچی پێ بوترێ باوەڕی پێ ئەکا.. تۆ بڵێ: ڕاستە، بەڵام قسەی خێر ئەبیستێ‌و قبوڵی ئەکا کە قازانجە بۆ ئێوە. ئیمانی بەخودا هەیە. هەروەها باوەڕ بە موسوڵمانان ئەکات چونکە ئەزانێ دڵسۆزن. پێغەمبەر ڕەحمەتە بۆ موسوڵمانەکانتان، بێ‌گومان ئەوانەی ئازاری دڵی پێغەمبەر ئەدەن سزایێکی پڕ ئێش و ئازار ئەدرێن.

يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ لِيُرۡضُوكُمۡ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ
أَن يُرۡضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّهُۥ
مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدٗا فِيهَاۚ
ذَٰلِكَ ٱلۡخِزۡيُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ
أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ
إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ
لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ
وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم
بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ
بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ
بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ
عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ
إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ
ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ
فِيهَاۚ هِيَ حَسۡبُهُمۡۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ﴿٦٨﴾



(٦٢) سوێندتان به خودا بۆ ئەخۆن تا ڕازیتان بکەن و قەناعەت بکەن بە ڕاستی قسەیان. بێگومان خوداو پێغەمبەری خودا شایانترن بۆ ئەوەی ڕازییان بکەن، ئەگەر بەڕاستیو بە دەم و بە دڵ خاوەن ئیمانن.

(٦٣) ئایا نەیانزانیوە ئەوەی موعارەضەی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا ئەکات ئاگری دۆزەخ بەشییەتیو هەتا هەتایە تیایا ئەمێنێتەوە؟ ئا ئەمەیە سەرشۆڕیو ڕیسوایی گەورە.

(٦٤) منافقەکان ئەترسن لەوەی سوورەتێ بێتە خوارەوە چی لە دڵیاندایە پێیان بڵێو دەریبڕێ، جا تۆ پێیان بڵێ: ئێوە ئیستیهزای خۆتان بکەن خودا ئەوەی لێی ئەترسن دەری ئەخا بۆ خۆتانو بۆ خەڵك.

(٦٥) ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی: ئەوە چیتان ئەوت؟ بۆ گاڵتەتان ئەکرد بە فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا؟ ئەڵێن: ئێمە گاڵتەمان نەئەکرد بە فەرمانی خودا، لەناو خۆماندا گاڵتەوگەپی خۆمان ئەکرد. جا تۆ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بەو هەمووە ناتەواوییەی خۆتانەوە گاڵتە بەخوداو ئایەتەکانی خوداو پێغەمبەری خودا ئەکەن؟ ئایا کاری وەها ڕەوایە؟

(٦٦) عوزر مەهێننەوە، ئێوە پاش ئیمان هێنانتان کافر بوون. ئەگەر تاقمێ لە ئێوە عەفو بکەین کە تەوبەیان کردووەو ئیتر گاڵتە بە فەرمانی خوداو پێغەمبەر ناکەن، تاقمێکیترتان سزا ئەدەین کە سوورن لەسەر منافقیو ئازاردانی موسوڵمانان، چونکە ئەوانە تاوانبارن.

(٦٧) پیاوانی منافق و ژنانی منافق لەناو خۆیاندا وەك یەکن لە منافقیو دووری لە ئیمانەوەدا، واتە هامڕازن و قسەیان یەکە، ئەمر بە خراپە ئەکەن و نەهی لە چاکە ئەکەن و دەستی خۆیان ئەنووقێنن و خێرات ناکەن و فەرمانی خودایان فەرامۆش کردوە. خوداش موبالاتی بەوان نەکردو گوێی نەدانێ. بەڕاستی منافقەکان فاسق و لەدین دەرچوون.

(٦٨) خودا بۆ پیاوان و ژنانی منافق و بۆ کافرەکانیتر ئاگری دۆزەخی بڕیارداوە کە تیایا ئەمێننەوە هەتا هەتایە. ئەو دۆزەخە بەسە بۆیان و کاڵا لەقەد باڵایە ، خودا نەفرینی لێ کردوون و، لە پاشەڕۆژدا سزایێکی هەمیشەیی سەختیان هەیە.

كَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنكُمۡ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرَ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا فَٱسۡتَمۡتَعُواْ بِخَلَٰقِهِمۡ فَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِخَلَٰقِكُمۡ كَمَا ٱسۡتَمۡتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُم بِخَلَٰقِهِمۡ وَخُضۡتُمۡ كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ (٦٩) أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ أَتَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ (٧٠) وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ (٧١) وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ (٧٢)



(٦٩) ئێوەش وەك ئەو كافرانەن كە لەپێش ئێوەدا بوون، ئەوان لە ئێوە بەهێزتر بوونو ماڵو سامانو كوڕوكاڵیان زۆرتر بوو، ئەوان بە بەشە لەزەتی دنیای خۆیان ڕایانبوارد، ئێوەش بە بەشە لەزەتی دنیای خۆتان ڕاتانبوارد وەك چۆن ئەوان بە بەشی خۆیان لەزەتیان وەرگرت، ئێوەش ڕۆچوون بە ئارەزووبازی دنیادا وەك چۆن ئەوان ڕۆچووبوون. ئەوانە كردەیان بێسوود بوو نە بۆ دنیا بەكەڵكیان هات و نە بۆ قیامەت. ئەوانەن زەرەرمەندو ڕەنج بەخەسار.

(٧٠) ئایا دەنگوباسی ئەو ئوممەتانەیان پێ نەگەیشتووە كە لەپێش ئەماندا بوون وەك قەومی نووح كە بە تۆفان لەناوچوونو، عاد كە بە باو، ثەموود كە بە بوومەلەرزە فەوتان، هەروەها قەومی ئیبراهیم كە نەمرددوودی گەورەیان بە
...یشوولەو، هاوڕێكانی بە دەردیتر لەناوبران، قەومی مەدیەن، جەماعەتی شوعەیب كە بە ئاگر سووتان و، قەومی ...وط كە شوێنەكانیان سەروژێر بوو بەردباران كران، ئەمانە هەموو پێغەمبەرانیان بە موعجیزەوە بۆ نێرران و، ...یكاریان ئەكردن و باوەڕیان پێ نەئەكردن. بێگومان خودای گەورە ستەمی لەمانە نەكرد، ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان كرد.

(٧١) خاوەن ئیمانەكان ژن و پیاویان هەندێكیان دۆستی هەندێكیانن و یەكتریان خۆش ئەوێ. ئەمر ئەكەن بە چاكەو ...ەهی ئەكەن لە خراپەو، نوێژ ئەكەن و زەكات ئەدەن و بەگوێی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا ئەكەن. ئەمانە خودای گەورە ڕەحمیان پێئەكات. خوا غاڵبە بەسەر كاری خۆیداو كارەكانی پڕحیكمەتن.

(٧٢) خودا بەڵێنی داوە بە خاوەن ئیمانەكان لە پیاوو لە ژن بە چەند بەهەشتێ كە جۆگا بەناویاندا ئەڕواو، هەتا ...ەتایە تیایاندا ئەمێننەوە، هەروەها بە چەند ڕێگاو جێگاو خانووی جوان و پاك لە جەنناتی عەدندا، لەگەڵ ڕەزامەندی خودای گەورە، كە گەورەترە لە هەموو پایەیێك، ئەوە سەركەوتن و سەرفرازی گەورەیە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ۚ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ۚ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْا۟ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ ۙ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾



(٧٣) ئـەی پێغەمبـەری خـودا دژی کـافرانو منافقـان بجەنگەو تێبکۆشەو، تونـدو تیـژ بـە لەڕوویانـدا، ئەوانـە سـەرەنجامیان دۆزەخـە، ئـای کـە سەرەنجامێکی بەدو ناشیرینە.

(٧٤) سوێند ئـەخۆن بـە خـودا کـە ئـەو قسـە نارەوایانـەیان نـەوتوە. بەڕاسـتی کەلیمەی کوفریان بەدەما هات و، پاش ئـەوەی بـە زاهـیری ئیسـلام بـوون کافربوونەوە. نیازیان بوو شتێ بکەن کە بۆیان نەکرا وەك کوشتنی پێغەمبـەر یا دەرکردنی لە مەدینە. ئەوان ڕقیان لـەوە هەسـتاوە کـە خـوداو پێغەمبـەر موسـوڵمانەکانی مەدینـەیان دەوڵەمـەنـد کردو، هـاتنی پێغەمبـەر بـوو بـە هـۆی پـیرۆزیو بەرەکـەت بۆیـان. جـا ئـەو منافقانە ئەگەر تەوبەی ڕاستەقینە بکەن و لـە بـەدکاری وازبهێـنن ئـەوە چـاکترە بۆیان. خۆ ئەگەر پشت هەڵکەن و لەسەر وەزعی بەدیان بـەردەوام بـن ئـەوا خـودا سـزایێکی تونـدو پڕئازاریـان ئـەدات لـە دنیـاو لـە قیامەتـداو، ئـیتر لـە دنیـادا یەکێك نابێ دۆستیان بێو، پشتگیرییان لێ بکات و یارمەتییان بدات.

(٧٥) هی وایان هەیە پەیمانی بە خودا داوە کە ئەگەر خـودا لـە فـەزڵی خۆی بەشـیان بـدات خێـری لێ ئەکـەن و لـە پیاوچاکان ئەبن.

(٧٦) کەچی کاتێ کە خودا لە فەزڵی خۆی بەشی دان ڕژدییان کردو هیچ صەدەقەیان نەکردو پشتیان هەڵکردو لە ڕێ لایان دا.

(٧٧) جا ئەو ڕژدیو زەکات نەدانە بوو بەهۆی دامەزرانی منافقی لە دڵیاندا تا ڕۆژی قیامەت و پاداشی نیفاقەکەیان ئەدرێتەوە، چونکە لەگەڵ خودا خیلاف وەعدەیان کردو درۆیان کرد.

(٧٨) ئایا نەیانزانیوە خودا ئاگادارە لە کارە نهێنییەکانیان و لەو چپەی لەناو خۆیاندا ئەیکەن؟ ئایا نەیانزانیوە خودا بە هەموو غەیبەکان ئەزانێو هیچی لێ ون نابێ؟

(٧٩) ئەو کافرو منافقانە کە پلار ئەگرنە ئەو موسوڵمانانەی زیادە صەدەقە ئەکەن لە ڕێی خوداداو، ئـەڵێن بـە ڕیـاو بەرچاوێنی ئەیکەن، هەروەها عەیب ئەگرن لەو موسوڵمانە هەژارانە کـە بێجگـە ڕەنجی شـان و عـارەقی ناوچـاوانیان هیچیان دەست ناکەوێو توانجیان تێئـەگرن کـە لات و بێسـامانن ، ئەمانـە خـودای گـەورە گاڵتـەیان پـێ ئـەکات و سزایێکی زۆر سەختیان ئەدات.

ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ
فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ
وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ فَرِحَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ
بِمَقۡعَدِهِمۡ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ
وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِي ٱلۡحَرِّۗ قُلۡ نَارُ جَهَنَّمَ
أَشَدُّ حَرّٗاۚ لَّوۡ كَانُواْ يَفۡقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلۡيَضۡحَكُواْ قَلِيلٗا وَلۡيَبۡكُواْ كَثِيرٗا
جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٖ
مِّنۡهُمۡ فَٱسۡتَـٔۡذَنُوكَ لِلۡخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخۡرُجُواْ مَعِيَ أَبَدٗا وَلَن
تُقَٰتِلُواْ مَعِيَ عَدُوًّاۖ إِنَّكُمۡ رَضِيتُم بِٱلۡقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٖ فَٱقۡعُدُواْ
مَعَ ٱلۡخَٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا وَلَا تَقُمۡ
عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓۖ إِنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُواْ وَهُمۡ فَٰسِقُونَ
﴿٨٤﴾ وَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَأَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم
بِهَا فِي ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَآ
أُنزِلَتۡ سُورَةٌ أَنۡ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ ٱسۡتَـٔۡذَنَكَ
أُوْلُواْ ٱلطَّوۡلِ مِنۡهُمۡ وَقَالُواْ ذَرۡنَا نَكُن مَّعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾



(٨٠) تۆ داوای عەفویان بۆ بکەی یا نەیکەی سوودی نی‌یە، ئەگەر حەفتا جاریش داوای عەفویان بۆ بکەی خودا عەفویان ناکات؛ چونکە ئەوانە کافر بوون و باوەڕیان بە خوداو بە پێغەمبەری خودا نەکرد، خودا هیدایەتی کۆمەڵی فاسقان نادات.

(٨١) ئەوانەی لە سەفەری جیهاد دواکەوتن دڵخۆش بوون بەوەی کە دانیشتن و لە حەزرەت دواکەوتن و، حەزیان نەئەکرد بە ماڵ‌و سامان و گیان لەپێناوی ڕەزامەندی خودای گەورەو سەرخستنی ئیسلامدا جیهاد بکەن و، ئەیانوت بە موسوڵمانەکان : بەم گەرمایە مەچن بۆ جیهاد پێتان تەحەممول ناکرێ. تۆ بڵێ: ئەگەر بفامن‌و هۆش بەکار بێنن ئاگری دۆزەخ گەرمترو بەتاوترە، کەسێ بەرگەی گەرمای دنیا نەگرێ چۆن بەرگەی گەرمای ڕۆژی جەزا ئەگرێ؟

(٨٢) با لە دنیای بێ‌بەقادا کەمێ پێبکەنن و لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر بگرین لە پاداشی ئەو کردەوە خراپانەدا کە لە دنیادا ئەیانکردن.

(٨٣) ئەگەر خودا گەڕاندیتیەوە بۆ مەدینەو کۆمەڵێ لە منافقە دواکەوتووەکانی لێ بوو و، داوای ئیزنیان لێ کردی کە لە غەزایەکی تردا لەگەڵت دەرچن ، پێیان بڵێ: نەخەیر هەرگیز لەگەڵ من دەرناچن و لەگەڵ من دژی هیچ دوژمنێ ناجەنگن؛ ئێوە یەکەم جار ڕازی بوون بەوەی دانیشن و نەیێن بۆ جەنگ و غەزا ، دەی لەگەڵ دواکەوتووە بێ‌دەستەلاتەکان هەر لە ماڵەوە دانیشن.

(٨٤) کە یەکێ لەو منافقانە مرد هەرگیز نوێژ لەسەر جەنازەکەی نەکەی‌و لەسەر قەبری ڕانەوەستی بۆ دەفن و زیارەتی، ئەوانە بەڕاستی کافر بوون و ئیمانیان بە خوداو بە پێغەمبەری خودا نەبوو و بە حاڵی فاسقی‌و لەدین دەرچوویی مردن.

(٨٥) ماڵ‌و سامان و ئەولادی ئەو منافقانەت لا سەیر نەبێ‌و تەعەجوبی لێ مەکە ؛ ماڵ‌و دارایی‌و ئەولادیان ڕەحمەت نین ، خودا مەبەستی ئەوەیە لە دنیادا بە پەروەردەکردن و بەخێوکردنیان ماندوویان بکات و سزایان بدات و بە حاڵی کافرییەوە بمرن.

(٨٦) کە سوورەتێ نازڵ بکرێ پێیان بڵێ ئیمان بە خودا بهێنن و لەگەڵ پێغەمبەردا جیهاد بکەن، دەست ڕۆیشتووەکانیان داوای ئیزنت لێ ئەکەن و ئەڵێن لێمان گەڕێ با لەگەڵ دانیشتوان بین.

رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ جَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾ وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ۚ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾



(٨٧) ڕازین بەوە کە لەگەڵ بێدەستەڵاتو جێماوەکان بمێننەوە، دڵیان مۆر کراوەو تێناگەن کە جیهاد لەگەڵ پێغەمبەر چەند خێرو چەند بەختیاری تێدایەو دواکەوتن چەند خراپە.

(٨٨) بەڵام پێغەمبەرو ئەوانەی موسوڵمانن لەگەڵیا بە سەرو ماڵ لەپێناوی خودادا جیهادیان کردو، بۆ ئەوانە خێراتی دنیاو قیامەت و ئەوانەن ڕزگار بوون لە سزای دۆزەخ.

(٨٩) خودای گەورە چەند بەهەشتێکی بۆ ئەوانە ئامادە کردووە کە جۆگەیان بەناودا ئەڕوات و هەتا هەتایە تیایاندا ئەمێننەوە. ئا ئەمەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورە.

(٩٠) لە کاتی غەزای تەبووکدا عوزرهاوەرەکانی ئەعراب هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر کە ئیزنیان بدا لە شوێنی خۆیاندا دانیشن و هاوبەشی نەکەن لە جیهاددا بە بەهانەی زۆری خێزان و گرانی ژیان و ترس لە دوژمنان. ئەوانەیش کە درۆیان لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خودا کرد، دانیشتن و نەچوون بۆ جیهاد. ئەوانەی کافرن لەناو ئەمانەدا، لەمەوپاش سزایەکی پڕ ئێش و ئازاریان تووش ئەبێت.

(٩١) ئەو کەسانەی بێهێزو ناتوانان، ئەوانەی نەخۆش و پەك کەوتەن، ئەوانەی خەرجییان نییەو بێدەستن، تاوان و گلەییان لەسەر نییە کە دوابکەون، ئەگەر ڕاست و دڵسۆز بن بۆ خوداو بۆ پێغەمبەری خودا. مرۆی چاکەکەرو خاوێن گلەیی لێ ناکرێو خودا گوناه پۆش و میهرەبانە.

(٩٢) هەروەها ئەوانەیش گوناهبار نابن و هیچیان لەسەر نییە کە دێنە لات بۆ ئەوەی وڵاغی سوارییان بۆ پەیدا بکەیت و بێن بۆ جیهاد و تۆیش ئەڵێیت: وڵاغم نییە بتاندەمێو سوارتان کەم، ئەوانیش ئەگەڕێنەوەو لە غەم و خەفەتدا چاویان پڕ ئەبێ لە فرمێسك، چونکە ئازووخەو تفاقی جیهادیان دەست نەکەوت.

## جوزئی یازدەهەم

(٩٣) تاوان و عیتاب لەسەر ئەوانەیە کە داوای ئیزنت لێ ئەکەن و کەچی دەسترۆیشتوو و دەوڵەمەندن، ڕازین بەوەی لەگەڵ دواکەوتوان و پەککەوتوان بن و، خودا دڵی مۆر کردوون و نازانن پیرۆزیو بەختیاریی دنیاو قیامەت لە چیدایە؟

يَعۡتَذِرُونَ إِلَيۡكُمۡ إِذَا رَجَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡۚ قُل لَّا تَعۡتَذِرُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكُمۡ قَدۡ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنۡ أَخۡبَارِكُمۡۚ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ إِذَا ٱنقَلَبۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ لِتُعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٩٦﴾ ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغۡرَمٗا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٩٩﴾



(٩٤) ئـەو دواكەوتووانـە كـە ئێـوە گەڕانەوە بۆ لايان عوزرتان بۆ ئەهێننەوە عوزری بێ ئەساس. بڵێ پێیان: عوزرمان بۆ مەهێننەوە باوەڕتان پێ ناكەین، خودا ئاگاداری كردووین كە چی لـە دڵتاندایـە. لەمـەوپاش خـوداو پێغەمبـەری خـودا كردەوەتان ئـەبینن، ئـاخۆ لەسـەر كـوفرو گـومڕاهی ئەمێننـەوە یـان پەشـیمان ئەبنـەوە؟ ئـەنجا دوای ئـەم ژیـانی دنیایـە ئەبرێنەوە بۆ لای ئەو خودایەی ئاگای لـە نهێنـیو ئاشـكرا هەیـە، ئـەو وەختـە ئاگادارتان ئەكات كـە لـە دنیـادا چیتان كردووە؟

(٩٥) كـە ئێـوە گەڕانـەوە بـۆ لایـان سوێندتان بۆ ئەخۆن تا وازیان لێ بێنن و گلـەییان لێ نەكـەن. وازیـان لێ بێنن، ئەوانە بیروباوەڕیان پیسەو فەرقی ڕاست و درۆیـان لا نییـە. جێگـای پاشـەڕۆژیان دۆزەخـە لـە پاداشـی ئـەو كـردەوە ناشیرینانەدا كە ئەیانكردن.

(٩٦) سـوێندتان بـۆ ئـەخۆن بـۆ ئـەوەی لێیان ڕازی بن. ئەگەر ئێوە لێیان ڕازی بن بێگومان خودا هەرگیز لە كۆمەڵی لەدینلادەر ڕازی نابێ.

(٩٧) بادیە نشینەكان لـە نیشـتەجێكانی شـارو لادێ دڵـڕەقترن لـە بابـەتی كـوفرو مونافقییـەوە، چـونكە دوورن لـە ئاوەدانی و، تێكەڵی زانایان ناكەن و كیتاب و سوونەت نابیسن، هەروەها لە خەڵكی تر نابەدڵترن سەبارەت بە یاسـاو سـنووری ئەو فەرمانانە كە خودا ناردوونی بۆ پێغەمبەری خودا. خودا ئاگای لـە حـاڵی هـەموو كـەس هەیـەو خـاوەن حیكمەتە.

(٩٨) لە بادیەنشینەكان هی وا هەیە ئەوەی كە خەرجی ئەكا لە ڕێگای ئیسلامدا بە غەرامەتی ئـەزانێو بـە خـەرجی ناڕەوای دائەنێو، چاوەڕێی ئەوە ئەكا بەڵاو مەینەت بێتە سەرتان. یا خودا مەینەتی خراپ بەسەر ئەواندا بێ. خـودا شنەواو زانایەو لە هەموو شت ئاگادارە.

(٩٩) عەرەبە بادیەنشینەكان هی وایشیان هەیە ئیمانی بە خوداو بـە ڕۆژی دوایـی هەیـەو ئـەوەی خـەرجی ئـەكا بـە خەیرو هۆی لەخودانزیكبوونەوەی ئەزانێو بە هۆی ئـەوەی دائـەنێ كـە پێغەمبـەر دوعـای خێـری بـۆ ئـەكا. ئـا ئـەو خەرجانەی ئەوان ئەیكەن هۆی نزیكبوونەوەن لە خودا. خـودای گـەورە ئەوانـە ئەخاتـە نـاو ڕەحمـەتی خۆیـەوە. خـودا تاوانبەخش و میهرەبانە.

وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ مُنَٰفِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ مَرَدُوا۟ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ ﴿١٠١﴾ وَءَاخَرُونَ ٱعْتَرَفُوا۟ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا۟ عَمَلًا صَٰلِحًا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ ٱعْمَلُوا۟ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠٦﴾



(١٠٠) ئەوانـەی کـە پـێش کـەوتوون لـە ئیسـلامبوون و خزمـەتکردنی ئیسـلامدا لەوانـەی لـە مەککـەوە کۆچیان کـرد بـۆ مەدینـەو، لـە یارمەتیـدەرانی ئـەهلی مەدینـەو، ئەوانـەیش بـە شوێنی ئەوانـدا هـاتن بـە کـرداری چـاك، خـودا لەوانـە ڕازی‌یـەو کردەوەیـان قبـوولّ ئـەکات، ئەوانەیش ڕازین لـە خوداو شوکرانەبژێرن بەرامبەر بە نیعمەتی دین و دنیا کە پێی داون و، خـودا چـەند بەهەشـتێکی بـۆ ئامـادە کـردوون کـە جۆباریـان بـەناودا ئەڕوات و، هەتا هەتایە تیایا ئەمێننـەوە. ئا ئەوەیە سەرکەوتن و بەختیاریی گەورە.

(١٠١) لەوانـەی دەورو پشـتتان لـە بادیەنشینەکان هی وا هەن منافیقن و، لە ئەهلی مەدینـەش هـی وا هـەن ڕاهـاتوون لەسـەر منـافقی، تـۆ پێیـان نـازانی ئێمـە پێیـان ئـەزانین‌و ئاگامـان لـە پەنامەکی‌یـەکانیان هەیـە. ئێمـە هـەر لـە دنیادا دوو جاریان سزا ئەدەین، ئابڕوویـان ئەبەین‌و ئەشیانکوژین، یا ئازاری لەشـیان ئەدەین و زەکاتیان لێ ئەسـێنین، دوایـیش ئەگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوداو لـە قیامەتـدا سزایێکی گەورە ئەدرێن.

(١٠٢) کۆمەڵێکی‌تر هەن لـە دواکـەوتووەکان کـە دانیـان نـا بـە تـاوانی خۆیانـداو وەك منافقـەکان عـوزری درۆیـان نەهێنایەوە، ئەمانە کردەوێکی باشیان کرد کە دانیان بـە گونـاهی خۆیانـدا نـاو کردەوەیێکـی خراپیشیان کـرد کـە دواکەوتن. ئەمانە نزیکە خودا تەوبەیان لێ قبوولّ بکات، خودا تاوانبەخش و میهرەبانە.

(١٠٣) زەکـات وەربگـرە لـە مـاڵی ئەمانـە تـا پاکیـان بکاتـەوە لـە گونـاهی زەکـات نـەدان و پاکیـان بکاتـەوە لـە خۆشویستنی دنیاو، دوعـای خێرو عـەفویان بۆ بکە، کە مردن نوێژیان لەسەر بکە، دوعاکردنی تـۆ مایـەی ڕەحـەتی و دڵنیایی‌یە بۆ ئەوان. خودا شنەواو زانایە.

(١٠٤) ئایا نەیانزانیوە خودا تەوبە لە بەندەکانی خۆی قبوولّ ئـەکات و زەکاتیـان لێ وەرئـەگرێ بـۆ دامـاوان، خـودا تەوبە وەرگرەو میهرەبانە.

(١٠٥) پێیان بڵـێ: چـی ئەکـەن بیکـەن، خـودا ئاگـای لـە کردەوەتانـەو هیچـی لێ ون نابـێ، هـەروەها پێغەمبـەرو موسوڵمانانیش بە کارتان ئەزانن چونکە خودا پێیان ئەڵێت و لێیان ناشارێتەوە، دوای ئەوەش ئەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو خودایە کە زانای نهێنی‌و ئاشکرایەو ئاگای لە هـەموو شـتە، ئاگادارتـان ئـەکات و پێتـان ئـەڵێت لـە دنیـادا چیتان کردووە.

(١٠٦) کۆمەڵێ تر هەن لە دواکەوتووان ئەنجامی کردەوەیـان دواخـراوە بـۆ فـەرمانی خـودا، یـا سـزایان ئـەدا ئەگـەر بەردەوام بوون لەسەر منـافقی، یـا ئەیانبەخشـێ ئەگـەر وازیـان هێنـاو پەشـیمان بوونـەوە، خـودا زانایـەو کارەکـانی پڕحیکمەتن.

وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنْيَٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْاْ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ۚ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ ۖ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ ۚ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۚ فَٱسْتَبْشِرُواْ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١١١﴾



(١٠٧) هەندێ لە پیاوخراپەکان مزگەوتێکیان دروست کرد بۆ زیانلدان لە موسوڵمانان و بەهێزکردنی کوفرو، بۆ جیاکردنەوەو کۆمەڵ کۆمەڵکردنی موسوڵمانان، هەروەها بۆ ئەوە ئەبووعامیری ڕاهیب لە شامەوە بێت و بێتە ناوی، کە هەر لە پێشەوە خەریکی دوژمانیەتی‌یەو جەنگی دژی خوداو پێغەمبەر کردوە. ئەم گرۆهە سوێند ئەخۆن بۆتان کە لە دروستکردنی ئەو مزگەوتەدا چاکە نەبێ هیچی‌تریان مەبەست نەبووە، خودایش شاهیدی ئەدا کە ئەوانە درۆزنن و مەبەستیان لە دروستکردنی مزگەوتەکە ئازاردانی ئیسلامە.

(١٠٨) هەرگیز لەو مزگەوتەدا ڕامەوەستە بۆ نوێژکردن. بەڕاستی مزگەوتێ لە یەکەم ڕۆژیەوە لەسەر لەخوداترسان دروست کرابێ‌و بناخەی دانرابێ وەك مزگەوتی قوبا یا مزگەوتەکەی خۆت، ئەوە لایقترە بۆئەوەی تیا بوەستی‌و نوێژی تیا بکەی، چونکە چەند پیاوێکی تێدایە حەز ئەکەن خۆیان لە خووڕەوشتی خراپ پاك بکەنەوەو خوداپەرستی بکەن. بێ‌گومان خودا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە خۆیان لە خوو کرداری خراپ پاك ئەکەنەوە.

(١٠٩) ئایا کەسێ بینای مزگەوتی لەسەر بناخەی بتەوی لەخوداترسان و ڕەزامەندی خودا دامەزراندبێ چاکترە، یا کەسێ بینای مزگەوتی لەسەر قەراخی کەندێکی بێ‌هێزی ڕووخاو دامەزراندبێ کە لەگەڵ خۆیدا بڕووخێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە؟ چونکە لەسەر بناخەی دوژمانیەتی‌کردنی ئایینی ئیسلام دامەزراوە. خودا هەرگیز هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

(١١٠) ئەو بینایەی دروستیان کردوە بەردەوام هۆی دوودڵی‌و گومان و زیادبوونی منافقییانە مەگەر کاتێ کە دڵیان لەتوپەت بکرێ و هێزی هەستی تێدا نەمێنێ. خودا زانایەو کاری پڕحیکمەتە لە ڕووخاندنی ئەو بینایەدا.

(١١١) خودا سەروماڵی لە موسوڵمانان کڕیوە بەرامبەر ئەوەی بەهەشتیان پێ بدات، ئەوانە لە ڕێگای ڕەزامەندی خودادا ئەجەنگن، کافران ئەکوژن و خۆیان شەهید ئەبن. پەیمانێکە خودا بەستوویەتی لەگەڵیان، لە تەورات و ئینجیل‌و قورئاندا باس کراوە. کێ لە خوا بەوەفاترە بە وەعدەو گفتی خۆی؟ کە واتە ئێوە خۆشحاڵ‌و شادمان بن بەو موعامەلەی لەگەڵ خودادا کردووتانە. سەرکەوتنی گەورە ئەوەیە.

ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٢﴾ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ﴿١١٤﴾ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۚ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿١١٦﴾ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٧﴾



(١١٢) ئـەو موسـولْمانانە کـە ئـەو پەیمانەیان لەگەڵ خودادا بەستووە ئەوانـەن کـە هەمیشـە تەوبـە ئەکـەن و خـەریکی خوداپەرستین و شوکرانەبژێری نیعمەتـەکانی خـودان و، بـەڕۆژوو ئـەبن و نوێژئەکـەن و هەمیشـە لـە ڕکـووع و سـجووددان و، ئـەمر بـە چـاکە ئەکـەن و نـەهی لـە خراپـە ئەکـەن و، سـنووری فەرمانـەکانی خـوداو ئـەحکامی دیـن ڕائـەگرنو لێـی لا نـادەن. مـوژدە بـدە بـە خاوەن ئیمانەکان کە پاداشیان گەورە ئەبێ بەهۆی ئەو کردەوە بەرزانەوە.

(١١٣) ڕەوا نەبووەو نابێ بـۆ پێغەمبـەرو بـۆ ئەوانـەی خـاوەن ئیمـانن داوای عـەفو بکـەن لـە خـودا بـۆ موشـریکەکان، بـا خزمیشـیان بـن، پـاش ئـەوەی بۆیـان دەرکەوت کە ئەوانە ئەهلی دۆزەخن و بـە کافری مردوون.

(١١٤) داوای عەفوکردنی ئیبراهیمیش لە خودا بۆ باوکی لەبەر ئەوە بوو کە بـەڵێنی دابوویە داوای عەفوی بۆ بکات (لأستغفرن لك)، جا کاتێ بۆی دەرکەوت کە باوکی دوژمنی خودایە، ئیتر بە وەحی زانیبێتی یا بـاوکی بـە کـافری مردبێ لـ بەرچاویا، خۆی لێ بەری کردو حەقی نەبوو بە سەریەوەو داوای عەفوی بـۆ نـەکرد. بەڕاسـتی ئیـبراهیم زۆر دڵنـەرم و خاوەن حیلم بوو.

(١١٥) خودا هیچ قەومێك بە گومڕاه دانانێو وەك گومراه موعامەلەیان لەگەڵ ناکات پاش ئەوەی کە هیدایەتی دا تا ئەو کارانـەیان بـۆ ڕوون نەکاتـەوە کـە پێویسـتە خۆیـانی لێ بپـارێزن و ڕێگـەی عیبادەتیـان پیشـان نـەدات و لـ دواڕۆژیان نەترسێنێ. جا ئەگەر ئەو قەومـە پـاش ئەوانـە هـەر لەسـەر ئینکـار مانـەوە ئـەوە غـەزەبیان لێ ئـەگرێو گومڕایان ئەکات.

(١١٦) بێگومان خودا خاوەنی ئاسمانەکان و ئەرزەو مردوو زیندوو ئەکاتەوەو، زیندوو ئەمرێنێو، بێجگە خودا کـە دۆست و یارمەتیدەر نییە بۆ ئێوە.

(١١٧) خودا تەوبەی قبووڵ کرد لە پێغەمبەرو لە هاوڕێ کۆچکردووەکانیو لە هاوڕێ یارمەتیدەرەکانیو پایەی بـەر کردنەوەو ڕەحمەتی بەسـەردا ڕژانـدن، ئەوانـەی کـە پـەیڕەویی پێغەمبـەریان کـردو لـە سـەعات و کـاتی تەنگانـەیی ناخۆشیدا دوای کەوتن و پشتیان چۆڵ نەکرد، دوای ئەوەی کە کۆمەڵێکیان خەریك بوو دڵیان تێـك‌بچێو لـە ڕێگـەی ڕاست لابدەن، تەوبەی لێ قبووڵ کردن و دڵی بەهێز کردن. خودا خاوەن ڕەحمەت و میهرەبانە لەگەڵیاندا.

وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ مَا كَانَ لِأَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ وَمَنۡ حَوۡلَهُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرۡغَبُواْ بِأَنفُسِهِمۡ عَن نَّفۡسِهِۦۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ لَا يُصِيبُهُمۡ ظَمَأٞ وَلَا نَصَبٞ وَلَا مَخۡمَصَةٞ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوۡطِئٗا يَغِيظُ ٱلۡكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنۡ عَدُوّٖ نَّيۡلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٞ صَٰلِحٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةٗ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةٗ وَلَا يَقۡطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمۡ لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢١﴾ ۞ وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗۚ فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ ﴿١٢٢﴾



(١١٨) هەروەها تەوبەی قبووڵ کرد لەو سێ کەسەی دواکەوتبوون لە غەزاو هێشتا حوکمیان نەبڕابوویەوە، کە دنیایان بەو هەمووە بەربڵاوییەوە لە بەرچاو تەنگ بوو، لە غەم و پەژارەو خەفەتی ئەنجامی خۆیاندا دڵیان تەنگ بوو و زانییان پەنایان لەدەستی خودا نی‌یە خودای گەورە خۆی نەبێ، ئەنجا خودا تەوفیقی دان کە تەوبە بکەن و تەوبەیان کرد. خودا زۆر تەوبە قبووڵ ئەکات و زۆر میهرەبانە.

(١١٩) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە لە خودا بترسن و نزیکی کارێ مەکەونەوە کە خودا پێی ڕازی نەبێ‌و، لەگەڵ ڕاستگۆیان هەڵسن و دانیشن.

(١٢٠) ڕەوا نی‌یە بۆ ئەهلی مەدینەو عەرەبەکانی دەورو پشتیان لە پێغەمبەری خودا دوا بکەون و، خۆیان لە شتێ بپارێزن کە پێغەمبەر خۆی لێ نەپارێزێ، چونکە بەرامبەر بە هەر تینوویەتی‌و ماندوویەتی‌و برسییەتییەك کە لە ڕێگای خودادا تووشیان ئەبێ‌و، هەر هەنگاوێ کە ئەینێن و ئەبێتە هۆی ڕق هەستانی کافران و، هەر زەفەرێ بە دوژمنی بەرن وەك لێ‌کوشتن و بەدیل گرتن و تاڵان‌کردن، هەموو ئەمانەیان، بە کردەوەی چاك بۆ ئەنووسرێ‌و پاداشی باشیان ئەدرێتەوە. بێ‌گومان خودا هەرگیز پاداشی چاکەکاران نافەوتێنێ.

(١٢١) ئەوانە هەر خەرجییەك کە ئەیکەن لە ڕێگەی خودادا، بچووك بێ یا گەورەو، هەر شیوێ کە بۆ جیهاد ئەیبڕن، هەموویان بۆ ئەنووسرێ‌و هیچی ناخرێتە پشت گوێ، تا خودا باشترین پاداشیان بۆ بنووسێ.

(١٢٢) نابێ موسوڵمانان هەموویان دەرچن بۆ غەزا یا بۆ تەڵەبی عیلم. هەروەها نابێ هەموویان دانیشن و هیچ نەکەن، بەمە هیچ کارێ سەقامگیر نابێ. کەواتە بۆچی لە هەموو کۆمەڵێکی گەورە، وەك هۆزێ یا تیرەیێ، جەماعەتێکیان ناچن بۆ فێربوونی زانیاری تا لە ڕێگای زانینی حوکمی ئایینەدا ماندوو ببن و کە گەڕانەوە بۆ لای قەومەکانیان بییانترسێنن لە کردەوەی خراپ و بێ‌دینی، بەڵکو خۆیان بپارێزن و تووشی سزای دواڕۆژ نەبن؟

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ أَوَلَا يَرَوۡنَ أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٖ مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ هَلۡ يَرَىٰكُم مِّنۡ أَحَدٖ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾

سُورَةُ يُونُسَ — مرتبتها ١٠ — آياتها ١٠٩



(١٢٣) ئەی خاوەن ئیمانەکان! لەدژی ئەو کافرانە بجەنگن کە لێتانەوە نزیکن. با توندو تیژیو خۆگریتان تیا ببینن. زۆر باش بزانن خوا لەگەڵ ئەوانەدایە لێی ئەترسن و خۆیان لە گوناە ئەپارێزن. خودا یارمەتییان ئەدات و ئەیانپارێزێ.

(١٢٤) کاتێ کە سوورەتێ لە قورئان دێتە خوارەوە هەندێ لەو کافرانە بەگاڵتەو لاقرتیکردن بە یەکتر ئەڵێن: کام لە ئێوە ئەم سوورەتە ئیمانی زیادکرد؟ جا ئەوانەی کە خاوەن ئیمانن ئەو سوورەتە ئیمانیان زیاد ئەکات، چونکە لە ئەساسدا ئیمانیان هەیەو دیارە ئیمان ئیمان ڕادەکێشێ، هەروەها خاوەن ئیمانەکان دڵخۆش و شادمان ئەبن بە هاتنی ئەو سوورەتانەو لەناو یەکدا موژدە بە یەکتر ئەدەن.

(١٢٥) بەڵام ئەوانەی دڵیان نەخۆش و کرمێیە سوورەتەکە زیاتر نەخۆش و دڵکرمێیان ئەکات و پیسیی کوفر دەکاتە سەرباری ئەو کوفرەی لە دڵیاندایە، چونکە کوفر کوفر ڕادەکێشێو، بە کافری ئەمرن.

(١٢٦) ئەوە بۆ بیر ناکەنەوە لەوە کە ساڵی جارێ یا دووجار تووشی بەڵا ئەبن، کەچی تەوبە ناکەن و بیرناکەنەوە لە ئەنجام و پاشەڕۆژی خۆیان ؟!.

(١٢٧) کە سوورەتێ نازڵ ئەکرێ بۆ پێغەمبەر بە غەمزو لەمزو ئینکارو گاڵتەکردنەوە سەیری یەکتر دەکەن و، لەناو خۆیاندا ئەڵێن: ئەگەر هەڵسین و مەجلیسەکە بەجێبێڵین کەس ئەمانبینێ؟ جا ئەگەر کەس نەبوو هەڵئەستن و ئەڕۆن، ئەگەر کەس هەبوو ناڕۆن، دوایی ئەڕۆن. خودا دڵیان لە ئیمان وەرچەرخێنێ چونکە ئەمانە قەومێکن نافامن و بیرناکەنەوە.

(١٢٨) بەڕاستی لە لایەن خوداوە پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە کە لە خۆتانەو هاونیشتمان و هاوزمانتانەو، زۆری پێ ناخۆشە تووشی نارەحەتی بن، زۆر حەز ئەکات لە خێرو خۆشیتان و لەگەڵ موسوڵمانان بەبەزەییو میهرەبانە.

(١٢٩) جا خودا ئەفەرموێ بە پێغەمبەر (د.خ): ئەگەر ئەو خەڵکە پشتیان لێ هەڵکردیو نەکەوتنە شوێن یاسای ئیسلام، تۆ بڵێ: یارمەتیو پشتیوانیی خودا بەسە بۆ من و هیچ خودایە نییە بەڕاستی عیبادەتی بۆ بکرێ ئەو نەبێ، من تەنها پشت بەو ئەبەستم، خوا پەروەردگاری عەرشی مەزنە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ إِنَّهُۥ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ إِنَّ فِى ٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾



## سوورەتی ( یُونُسَ )

مەککەییەو (١٠٩) ئایەتە.

(١) مەعنای ( الر ) هەر خودا ئەیزانێ چییە.
ئەم ئایەتانە کە لەم سورەتەدا هەن ئایەتی کتێبێکی پڕحیکمەتن، کە قورئانی پیرۆزە.

(٢) ئایا لای خەڵکی شتێکی سەیرو عەجایەبە ئێمە وەحی بکەین بۆ پیاوێ لە خۆیان و پێی بڵێین ئادەمزاد بترسێنە لە سزای خودا و موژدە بە خاوەن ئیمانەکان بدە کە لای خودای خۆیان پایەیان بەرزە؟ کافرەکان وتیان: ئەمە جادووگەرێکی ئاشکرایە.

(٣) بێگومان پەروەردگاری ئێوە خودایێکی وەهایە ئاسمانەکان و ئەرزی لە شەش ڕۆژدا دروست کرد، پاش ئەوە فەرماندار بوو بەسەر عەرشدا، هەرچی کاروباری کائینات هەیە هەمووی لەژێر توانایی خۆیدا ڕێك ئەخات. هەروەها کەسێ نییە بتوانێ تکای عەفوی تاوانی کەسێ بکا، مەگەر پاش ئیزن و ئیجازەی ئەو. ئەو زاتە پەروەردگاری ئێوەیە بیپەرستن. ئایا هێشتا بیرناکەنەوە لەوەی کە تەنها خودا شایانی پەرستنە ؟

(٤) کە ئەمرن و حەشر ئەکرێن هەمووتان بۆ لای ئەو ئەبرێن و ئەنجامتان لای ئەوە. بەڵێنێکی ڕاستەو خودا داویەتیو درۆی تێدا نییە. هەر ئەوە لە نەبوونەوە کائیناتی دروست کردووە. هەر ئەویشە پاش لەناوبردنیان دروستیان ئەکاتەوە تا بە دادپەروەریی خۆی پاداشی ئەوانە بداتەوە کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باشیان کردووە. ئەوانەیش کە کافر و بێئیمانن ئاوێکی زۆر گەرمی ئازاردەریان دەرخوارد ئەدرێ و سزایێکی سەخت ئەدرێن بەرامبەر بە کافرییەکەیان.

(٥) خودا خاوەن دەسەڵاتێکی وەهایە خۆری کردووە بە خاوەن ڕووناکی و مانگی کردوو بە خاوەن نوورو بۆ هەریەك لەم دوانە چەند پایەو پلەیێکی داناوە تا ئێوە ژمارەی ڕۆژو حەفتەو مانگو ساڵو تێکڕای وەختی خۆتان بزانن. خودا ئەمانەی بەڕاستیو ڕەسایی دروست کردووە. خودا ئایەتەکانی خۆی تەفصیل ئەدا بۆ کۆمەڵێك کە ورد ببنەوەو تێفکرن لە ئەوزاعی جیهان و ڕاستی بزانن.

(٦) بێگومان لە یەك بەدوای یەکا هاتنی شەوو ڕۆژو، لەو کائیناتەی کە خودا لە ئاسمانەکانو زەویدا دروستی کردوون نیشانەو بەڵگەی دەسەڵاتی خودا هەیە بۆ کەسانێ کە لە خودا بترسن و خۆیان لە خراپە بپارێزن.

إِنَّ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا وَرَضُوا بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاطْمَأَنُّوا بِهَا وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ آيَاتِنَا غَافِلُونَ (٧) أُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمُ النَّارُ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (٨) إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ ۖ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ (٩) دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَامٌ ۚ وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٠) ۞ وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُمْ بِالْخَيْرِ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ ۖ فَنَذَرُ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ (١١) وَإِذَا مَسَّ الْإِنْسَانَ الضُّرُّ دَعَانَا لِجَنْبِهِ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَائِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُ مَرَّ كَأَنْ لَمْ يَدْعُنَا إِلَىٰ ضُرٍّ مَسَّهُ ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (١٢) وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا ۙ وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ وَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ (١٣) ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلَائِفَ فِي الْأَرْضِ مِنْ بَعْدِهِمْ لِنَنْظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ (١٤)



(٧) بەڕاستی ئەوانەی بەتەما نین بە ئێمە بگەنو باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نییەو، بە ژیانی براوەی دنیا ڕازینو دڵنیان پێی، ئەوانەی لە ئایەتەکانی ئێمە بێئاگانو تێنافکرن، (مەعنای ئایەتەکە لە ئایەتی پاشەوەدا ئەبڕێتەوە).

(٨) ئەوانە شوێنیان ئاگری دۆزەخە بەهۆی ئەو کارە ناڕەوایانەوە کە ئەیانکردن.

(٩) بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باشیان کردووە خودا ڕێگای ڕاستو ئەسبابی پیرۆزیو بەختەوەریی هەردو دنیایان پیشان ئەدات بەهۆی نووری ئەو ئیمانەی لە دڵیاندایەو، لە قیامەتیشدا لە بەهەشتە پڕلە نازو نیعمەتەکاندا ڕائەبوێرنو جۆباری جوان لە بەرپێیانا دەڕواتو بە خۆشی ئەژین.

(١٠) دوعاو نزایان لە بەهەشتدا ئەوەیە ئەڵێن: پاکی و بێ خەوشی بۆ تۆیە ئەی خودای پەروەردگار، هەروەها لەناو یەکا سەلام لە یەکتر ئەکەن، یا مەلائیکەکان سەلامیان لێئەکەنو، دوا دوعایان ئەوەیە کە ئەڵێن: ستایش و سوپاس بۆ ئەو خودایە کە پەروەردگاری هەموو عالەمە.

(١١) ئەگەر خودا گورج خەڵکی تووشی مەینەتی و ئەگبەتی بکردایە، وەك چۆن گورج تووشی خێر و خۆشییان ئەکات، زوو کار ئەبڕایەوەو ناکامیان ئەهاتو لەناوئەبران، ئەوانەی بە تەمای زیندووبوونەوەو بەئێمەگەیشتن نین لێیان ئەگەڕێین لە گومڕاهیی خۆیاندا سەرگەردان بن، واتە: دوایی حیسابیان لەگەڵ ئەکەین.

(١٢) بنیادەمی ستەمکار کە تووشی زیانێك ئەبێ، وەك ئەخۆشیو فەقیریو بێحاڵی، بە پاڵکەوتنو دانیشتنو بەپێوەو لە هەموو کات و ساتێکدا لێمان ئەپاڕێتەوە ئەو ناخۆشییەی لەکۆڵ بکەینەوە، جا کە چووین بەدەنگیەوە و مەینەتەکەمان لەکۆڵ کردەوە، دیسان ڕێگای گومڕاهی ئەگرێتەوەبەرو لە خۆی بایی ئەبێ، ئەڵێی هەرگیز لێمان نەپاڕاوەتەوە بۆلابردنی ناخۆشی! ستەمکارە لەسنووردەرچووەکان، ئابەم جۆرە، کردەوەی بەدی خۆیان و لەخۆباییبوونیان لە بەرچاو جوان کراوە !.

(١٣) بەڕاستی ئێمە خەڵکی سەردەمەکانی پێش ئێوەمان لەناوبردن، کە ستەمیان کردو بەگوێرەی فەرمانی خودا نەجووڵانەوەو، پێغەمبەرانیان بە ئایەت و موعجیزەوە بۆ ئەهات، کەچی ئیمانیان پێ نەئەهێنان. ئێمە ئا بەو جۆرە پاداشتی تاوانباران ئەدەینەوە.

(١٤) پاش ئەوان ئێوەمان کرد بە جێنشینی ئەوان لە سەرزەوی تا تەماشا بکەین چۆن ڕەفتارئەکەن ؟.

وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآيِٕ نَفْسِيٓ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرٗا مِّن قَبْلِهِۦٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَٱخْتَلَفُواْ وَلَوْلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٩﴾ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾



(١٥) کاتێ کە ئایەتە مەعنا ئاشکراکانی ئێمەیان بەسەردا ئەخوێنرێنەوە ئەوانەی باوەڕیان بە زیندووبوونەوەو گەیشتن بە ئێمە نی‌یە ئەڵێن: قورئانێکی تری غەیری ئەم قورئانەمان بۆ بێنە، کە بە دڵی ئێمە بێ، یا ئایەتەکانی بگۆڕە بە ئایەتی‌تر. تۆ ئەی پێغەمبەری خودا بڵێ: بۆ من ڕەوا نی‌یە لەخۆمەوە بیگۆڕم ؛ من دوای ئەوە ئەکەوم کە بە وەحی بۆم دێت. بەڕاستی ئەگەر من بێ گوێیی خودای خۆم بکەم و بیگۆڕم لە سزای ڕۆژێکی سامناکی گەورە ئەترسم.

(١٦) بڵێ: ئەگەر خودا غەیری ئەمەی بویستایە من بۆم نەئەخوێندنەوەو، لەسەر زوبانی من ئاگاداری نەئەکردن پێی. من تەمەنێکی زۆرم لەناوتێوەدا بردوەتە سەر، چل ساڵ لەناوتاندا ژیاوم پێش هاتنی قورئانو خوێندنەوەی بەسەرتاندا ؛ کە واتە ئەم قورئانە خودا ناردوویەو قسەی من نی‌یە تا بیگۆڕم، ئەوە بۆچی بیرناکەنەوەو عەقڵتان ناخەنەکار کە ئەم قورئانە لە خوداوەیەو هی بەندە نی‌یە ؟

(١٧) کێ ستەمکارترە لەوەی درۆ بە دەم خواوە هەڵبەستێ یا ئایەتەکانی بەدرۆبخاتەوەو باوەڕیان پێ‌نەکات؟ بێ‌گومان تاوانباران هەرگیز ڕزگارنابن.

(١٨) ئەو کافرانە، غەیری خودا، شتی وا ئەپەرستن کە ناتوانێ زیانیان لێ بدات یا قازانجیان پێ بگەیەنێت. هەروەها ئەڵێن: ئەو بتانە لای خودا تکامان بۆ ئەکەن. تۆ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە خەبەری شتێ بە خودا ئەدەن کە نەیزانێ لە ئاسمانەکان و لە زەویدا ؟ واتە: ئەگەر ئەم شەریکایەتی و تکاکاریی‌یە شتێکی ڕاست بوونایە خودا پێی ئەزانین. خودا پاکەو بەرزەو بەرییە لەو شتانەی ئەوان کردوونیان بە هاوبەشی.

(١٩) بنیادەم هەموو یەك ئوممەت بوون، جا کە پێغەمبەران نێرران جیاجیا بوونەوە و، هەندێکیان ئیمانیان نەهێناو دوای ئارەزووی نەفسیان کەوتن. ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە خودا هەر لە ئەزەل بڕیاری داوە موحاکەمەی خەڵك بخاتە ڕۆژی قیامەت، زوو حوکمی ئەدا لە بەینی کۆمەڵانی جیاجیاداو، ئەوی لەسەر حەقە ئەیهێشتەوەو ئەوی لەسەر ناحەقە ئەیفەوتاند.

(٢٠) ئەو کافرانە ئەڵێن: ئەوە بۆچی موعجیزەیێ لە ئاسمانەوە ڕەوانە نەکرایە خوارەوە بۆ سەر موحەممەد؟ بڵێ: هەرخودا خۆی غەیبزانە. من چوزانم بۆ ناینێرێ؟ دەی چاوەڕوان بن منیش لەگەڵ ئێوەدا چاوەڕوانم.

وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٣﴾ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٢٥﴾



(٢١) لەپاش مەینەتو ناخۆشی وەك دەردوگرانی كە تووشیان ئەبێ ئەگەر لایان لێبكەینەوەو خۆشیو لەش ساغییان بدەینێو ڕەحمیان پێ بكەین لەباتیی سوپاس و شوكرانەبژێری دەست ئەدەنە فێلكردنو سەرپێچی لە پێغەمبەر، پێیان بڵێ: خودا لە ئێوە زووتر كاری خۆی بڕیوەتەوەو بڕیاری داوە كە لە ڕۆژی خۆیدا تۆڵەتان لێ بكاتەوە. فریشتەكانمان هەموو كردەوەكانتان ئەنووسنو هیچیان لێ ون نابێ.

(٢٢) خودا ئەو دەستەڵاتدارەیە كە ئەتانگێڕێ بە وشكانی و بە دەریادا. كە لە كەشتیدا بن و باییێكی خۆشو ئارام كەشتییەكەیان بخاتەگەڕو بیانباو دڵیان پێی خۆش ببێو، لەوكاتەدا باییێكی توند لێیان هەڵكات و شەپۆل لە هەموو لاییێكەوە بۆیان بێت وا بزانن گەمارۆ دراون و ئیتر ڕزگاربوونیان بۆ نییە، لەو كاتەدا بە ئیخلاصو باوەڕێكی بێگەردەوە لە خودا ئەپاڕێنەوە كە ڕزگاریان بكات و ئەڵێن: ئەگەر لەم تەنگانەیە ڕزگارت كردین سوپاسگوزار و شوكرانەبژێر ئەبین.

(٢٣) كە لەو مەینەتە ڕزگاری كردن كوتوپڕ بە ناحەق ئەكەنە خراپە كردن لە زەویدا. ئەی خەڵكینە! هەر خراپەیێ كە ئەیكەن زیان لە خۆتان ئەدەن، ئەمە ڕابواردنێكی كورت و بڕاوەی دنیاییەو، دوایی بۆ لای ئێمە ئەگەڕێنەوە و، چیتان لە دنیادا كردووە پێتان ئەڵێین و، بە پێی ئەو كردەوانە تۆڵەتان لێ ئەسێنینەوە.

(٢٤) وێنەی ژیانی دنیا، كە سەرەتای جوانەو دوایی لەناو ئەچێت، وەك ئەوەیە كە باران ببارێنین و، بەو بارانە گژوگیای زەوی سەوزبێت و شاخ بكات و تێكەڵ بە یەك ببێت، لەوەی كە بنیادەم و گیانلەبەر ئەیخۆن، جا كە زەوی بە سەوزی و بەروبوومەوە خۆی بگرێت و ببووژێتەوەو، وەك بووك بڕازێتەوەو هەموو جۆرە دانەوێڵەو بەرهەمێكی پێ بگاتو خەڵك وابزانن ئیتر دەستیان لێی گیرئەبێتو سوودی لێ وەرئەگرن، لەپڕ فەرمانی ئێمە ڕووی تێ بكات، بە سەرما، یا بە تەرزە، یا بە گڕی تیژ، یا هەر دەردێكی ترو، بە جۆرێ بنبڕی بكەین كە بڵێی دوێنێ هەر كشتوكاڵیش نەبووە. ئابەم جۆرە ئایەت تەفصیل ئەدەینو ڕوونی ئەكەینەوە، بۆ قەومێ كە تێفكرن و عەقڵ و هۆش بخەنە كار.

(٢٥) خودا بانگی خەڵك ئەكا بۆ بەهەشت كە جێی ئەمن و ئاسایشەو دوورە لە ناخۆشی. خودا بۆ هەركەس كە خواستی لێ بێ شارەزای ئەكات بۆڕێگای ڕاست و ئەیخاتە سەر ئایینی ئیسلام و لە خودا ترسان كە دەیگەیەنێتە بەهەشت.

لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٦﴾ وَالَّذِينَ كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ مَّا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۖ كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا ۚ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَاؤُكُمْ ۚ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ ۖ وَقَالَ شُرَكَاؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ ﴿٢٩﴾ هُنَالِكَ تَبْلُو كُلُّ نَفْسٍ مَّا أَسْلَفَتْ ۚ وَرُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ فَسَقُوا أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾



(٢٦) بۆ ئەو کەسانەی چاکە ئەکەن و لە خودا ئەترسن پاداشی زۆر چاك هەیە لەگەڵ زیادەدا، کە گەیشتنە بە لیقای خودای گەورەو، لە ڕۆژی قیامەتدا تۆزوگەردی غەمو پەژارە ڕوخساریان داگیرناکاتو سووکیو بێ حورمەتییان بەسەردا نایێ. ئا ئەوانە خاوەنی بەهەشتنو هەتا هەتایە تیایدا ئەمێننەوە.

(٢٧) ئەو کەسانەیش کردەوەی خراپ ئەکەن پاداشێکی خراپی بەقەد خراپەکەیان هەیەو، سووکیو بێحورمەتی داگیریان ئەکاتو کەس نایانپارێزێ لە سزای خودا، دەموچاویان ئەوەندە ڕەشە ئەڵێی بە شەوی تاریك داپۆشراوە. ئا ئەوانە ئەهلی ئاگری دۆزەخن و هەتاهەتایە تێیدا ئەمێننەوە.

(٢٨) یادی ئەو ڕۆژە بکە کە هەموو خەڵك کۆ ئەکەینەوە، دوای ئەوە بەوانە ئەڵێین کە هاوبەشیان بۆ خودا داناوە: ئێوەو هاوبەشەکانتان لە شوێنی خۆتاندا ڕاوەستن، ئەنجا جیایی ئەخەینە نێوانیان و پێوەندی لەنێوانیاندا ناهێڵین، هاوبەشەکان لە کافرەکان تەبەڕڕا ئەبن و پێیان ئەڵێن: ئێوە لە دنیادا ئێمەتان نەپەرستووەو ئێمە هەقمان نی‌یە بەسەرتانەوە !

(٢٩) خودا بەسە بۆ شاهیدی لە بەینی ئێمەوئێوەدا، بەڕاستی ئێمە ئاگامان لە عیبادەتی ئێوە نەبوە .

(٣٠) ئا لەوکات و ساتەدا هەموو نەفسێ کردارەکانی دنیای تاقی ئەکاتەوەو ئەبینێ کامی قازانجی هەیە بۆی و کامی زیانی لێ ئەداو هەموو ئەگەڕێنەوە بۆ لای خودا کە سەرداری ڕاستەقینەیانەو پاداشی هەموو کردەوەکانیان ئەداتەوە. ئیتر ئەو هاوبەشە ساختانەیان لێ ون ئەبن کە لە دنیادا بە درۆ هەڵیانبەستبوون و بە هیچ جۆرێ فریایان ناکەون.

(٣١) تۆ پێیان بڵێ: کێ لە ئاسمان و لە زەوییەوە ڕۆزی و ژیوارتان ئەداتێ؟ یا خۆ کێیە بتوانێ هێزی بیستن و بینین دروست بکات؟ کێیە ئەژیێنێ و ئەمرێنێ، یا کێیە گیانلەبەر لە نوتفە دروست ئەکات و نوتفە لە گیانلەبەر؟ کێیە کاروباری ئەم کائیناتە هەڵئەسووڕێنێ؟ بێگومان ناتوانن ئینکار بکەن و ئەڵێن: خودایە. جا تۆ پێیان بڵێ: کەواتە بۆ لە خودا ناترسن و بۆ هاوبەشی بۆ دائەنێن؟.

(٣٢) ئا ئەو خودایە کە تەدبیری هەموو کاروبارێ ئەکات ئەوەیە خوداو پەروەردگاری ڕاستەقینەی ئێوە. ئیتر پاش حەق و ڕاستی چی هەیە بێجگە ناڕاستیو گومڕاهی؟ دە بۆچی لە ڕێی ڕاست لائەدەن و ڕێی گومڕاهی ئەگرن، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئیددیعای خاوەنفامی ئەکەن و خۆتان بە ژیر ئەزانن ؟

(٣٣) وەك چۆن خودایەتی خودا ڕاستە وەها فەرموودەی هاتەدی و جێگیر بوو لەسەر ئەوانەی سوورن لەسەرکافری کە هەرگیز ئیمان ناهێنن و شایانی سزای ئەبەدیی دواڕۆژن.

قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾ وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّى عَمَلِى وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ ۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾



(٣٤) پێیان بڵێ: ئەوانەی کە ئێوە بە هاوبەشی خودایان دائەنێن یەکێکیان هەیە بتوانێ یەکەم جار کائینات دروست بکاتو پاش لەناوبردن جارێکی تر دروستیان بکاتەوە؟ ئەوان ناتوانن ئینکاری ڕاستی بکەن. تۆ پێیان بڵێ خودای بێشەریك لە سەرەتاوەو لە نەبوونەوە خەڵك دروست ئەکات و پاش لەناوچوونیان سەرلەنوێ دروستیان ئەکاتەوە، کە واتە ئێوە چۆن لە ڕێی ڕاست لائەدەنو ڕێگای چەوت ئەگرنەبەر؟

(٣٥) پێیان بڵێ: ئایا لەناو هاوبەشەکانی ئێوەدا یەکێکی وایان هەیە خەڵك شارەزا بکات بۆ لای حەق و حەقیقەت؟ بێگومان ئەوان وەڵامیان نی‌یە بیدەنەوە، جا تۆ بڵێ: هەر خودا هیدایەتی ئادەمزاد ئەدات بۆ لای حەق، هەروەها پێیان بڵێ: ئایا کەسێ هیدایەتی خەڵك بدات بۆ ڕێگای ڕاست شایانی ئەوەیە کە پەیڕەوەی بکرێ و بەگوێی فەرمانی بکرێ یا کەسێکی وێڵی وەها کە شارەزا نەبێ مەگەر یەکێ شارەزای بکات؟ ئەوە چیتان لێ‌قەوماوەو چۆن بێ بیرکردنەوە حوکمی نارەوا ئەدەن ؟

(٣٦) بەشی زۆری ئەو کافرانە دوای گومان کەوتوون و هیچ بەڵگەیێکیان نی‌یە، گومان هیچ سوودێکی نی‌یە لەباتی حەق و خودا ئاگادارە لە کردەوەیان. (٣٧) ئەم قورئانە خاوەن فەصاحەت و بەلاغەت و ئەخباری غەیبە لەوانە نی‌یە لە خۆوە لەلایەن بنیادەمەوە هەڵبەسترێ، بەڵکو فەرموودەی خودایەو موعجیزەیەو هۆی باوەڕکردنە بەوکتێبانەی لەپێش ئەودا نازل بوون، وەك تەورات و ئینجیل، هەروەها هۆی بەیان و تەفصیلی ئەو حوکمانەیە کە لەسەرتان نووسراون و گومان و شوبهەی تێدا نی‌یەو لای خودای پەروەردگاری هەموو جیهانەوە هاتووە.

(٣٨) یاخۆ هەر سوورن لەسەر کوفر و ئەڵێن: ئەم قورئانە موحەممەد خۆی هەڵی بەستووەو هیی خودا نی‌یە؟ بڵێ: ئەگەر ڕاست ئەکەن قورئان وتاری ئادەمزادە دە ئێوە سوورەتێ وەك سوورەتەکانی بێنن و، بۆ ئەم مەبەستە لە هەرکەس ئەتوانن داوای یارمەتی بکەن، بێجگە لە خودا، ئەگەر ڕاست ئەکەن. دیارە هەرچی بکەن ناتوانن ئەوە جێبەجێ بکەن و وێنەی سوورەتێکی قورئان بێنن. (٣٩) نەخێر ئەم کافرانە زۆر نەزانن و ئینکاری قورئانێ ئەکەن کە ناتوانن لێی حاڵی بن و، هێشتا مەعنا و نهێنییەکانی ڕوون نەبووەتەوە بۆیان. کافرەکانی پێش ئەمانیش هەر بەو جۆرە پێغەمبەرانیان بە درۆئەخستەوە. دە سەیرکە ئەنجام و دوارۆژی ستەمکاران چۆن بوو ؟

(٤٠) ئەوانەی ئینکاری قورئان ئەکەن هی وایان هەیە لە دڵی خۆیاندا ئیمانیان پێی هەیەو ئەزانن ڕاستە، بەڵام لە ڕق‌وقیندا سەرپێچی ئەکەن و ئینکاری ئەکەن. هی وایشیان هەیە بەتەواوی بە دڵ و بە زمان ئیمانیان پێی نی‌یە، خوا لە هەموو کەس چاکتر ئاگای لە خراپەکاران هەیە.

(٤١) ئەگەر ئەو کافرانە هەروا سووربوون لەسەر باوەڕپێ‌نەکردنت ئەوا پێیان بڵێ: من کردەوەی خۆم بۆ خۆم و ئێوەش کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان. من دوورم لە پاداشی کردەوەی ئێوەدو، ئێوەیش دوورن لە پاداشی کردەوەی من.

(٤٢) لەو کافرانە هی وا هەن لە کاتێکدا کە تۆ قورئان ئەخوێنی گوێ ڕائەگرن، بەڵام وەری‌ناگرنو باوەڕی پێ‌ناکەن، وەك کەڕ بن و هیچ نەبیسن، ئایا تۆ ئەتوانی بنیادەمی کەڕی‌بێ‌هۆش‌و فام شنەوا بکەی ؟

وَمِنۡهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيۡكَۚ أَفَأَنتَ تَهۡدِي ٱلۡعُمۡيَ وَلَوۡ كَانُواْ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ ٱلنَّاسَ شَيۡـٔٗا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٤٤﴾ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ كَأَن لَّمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيۡنَهُمۡۚ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿٤٥﴾ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ ﴿٤٦﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولٞۖ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمۡ قُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي ضَرّٗا وَلَا نَفۡعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌۚ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَلَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٤٩﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوۡ نَهَارٗا مَّاذَا يَسۡتَعۡجِلُ مِنۡهُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓۚ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَيَسۡتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَۖ قُلۡ إِي وَرَبِّيٓ إِنَّهُۥ لَحَقّٞۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٥٣﴾



(٤٣) لەو کافرانە هی وایش هەن سەیرت ئەکەن و نیشانەو بەڵگەی پێغەمبەریت تێدا ئەبینن، بەڵام لەبەر سەرکەشی باوەڕت پێ ناکەن و ئیمانت پێ ناهێنن. ئەوانە لە ئاستی ڕاستیدا کوێرن، ئایا تۆ ئەتوانی کوێر هیدایەت بدەی کە سەرەڕای کوێرییەکەی دڵیشی ڕووناك نەبێ؟

(٤٤) بێگومان خودا بە هیچ ئەندازەیێ ستەم لە خەڵك ناکات، خەڵکی خۆیان ستەم لە خۆیان ئەکەن کە تێنافکرن و خۆیان لە ئاستی ڕاستی کوێر ئەکەن و ڕێگای چەوت ئەگرن.

(٤٥) لەو ڕۆژەدا کە لەپاش مردن خودا زیندوویان ئەکاتەوەو کۆیان ئەکاتەوە بۆ حیساب‌وکیتاب، لە ترس‌وسامی ئەو ڕۆژەدا وا ئەزانن تەنها سەعاتێك نەبێ لە دنیادا نەماونەتەوە، یەکتر ئەناسن، وەك پێش ماوەیێکی کەم یەکتریان دیبێ. ئا لەو کاتەدا تێ‌ئەگەن کە بەڕاستی ئەوانەی لە دنیادا باوەڕیان بە زیندووبوونەوەو بەخوداگەیشتن نەبووە زەرەرمەندو ڕەنج بەخەسارن و شارەزای ڕێی ڕاست نەبوون.

(٤٦) ئەگەر هەندێ لەو سزایانەت پیشاندەین کە بەڵێنمان داوە کافرەکانی پێ سزا بدەین، وەك شکستیان لە غەزای بەدردا، یا بتمرێنین و لەدنیادا نەیبینی، ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا بە چاوی خۆت ئەیبینی، چونکە هەموویان سەرەنجامیان لای ئێمەیەو، خودا لە کردەوەیان ئاگادارەو تۆڵەیان لێ ئەسێنێتەوە.

(٤٧) هەر ئومەتێ لە ئومەتانی پێش ئێوە پێغەمبەرێکیان بووە تا بانگیان بکات بۆ خوداپەرستی، جا کە پێغەمبەرەکەیان هات و ئاگاداری کردن و نامەکەی پێ‌گەیاندن ئیتر گلەیی خۆیان لەسەر خۆیانو، لە ڕۆژی قیامەتدا بە داد حوکم ئەکرێ لەنێوانیاندا، ئەوانەیان باوەڕیان بە پێغەمبەرەکەیان کردووە پاداشی کرداری چاکی خۆیان وەرئەگرن، ئەوانەیشیان باوەڕیان پێ نەکردوون تۆڵەی تاوانیان لێ ئەکرێتەوە. لە ڕۆژی قیامەتدا هەر داد هەیەو کەس ستەمی لێ ناکرێ.

(٤٨) بە سەرکەشی و گاڵتەکردنەوە ئەڵێن: ئەگەر ڕاست ئەکەن ئەم بەڵێنی ڕۆژی حیساب‌وکیتاب و پاداشەکەی دێتەدی؟. (٤٩) تۆ پێیان بڵێ من نە ئەتوانم زیانێ لە خۆم لادەم و نە ئەتوانم قازانجێ بە خۆم بگەیێنم، خودا مەیلی لەسەر شتێ نەبێ هیچم پێ ناکرێ. هەر ئومەتێ ئاکامێکی تایبەتیی هەیە، کە ئاکامیان هات نە سەعاتێ دوا ئەخرێن و نە سەعاتێ پێش ئەخرێن.

(٥٠) بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر سزای خودا بە شەوا بێت بۆتان یا بە ڕۆژا، تاوانباران پەلەی چییانە؟ سزا هەر سزایە زووبێ یا درەنگ، شەو بێ یا ڕۆژ ؟!. (٥١) ئایا پاش ئەوە کە سزاکە هات ئیمانی پێ ئەهێنن؟ ئا ئیستە ئیمانی پێ ئەهێنن کە وەختی خۆی بەگاڵتەوە پەلەتان ئەکردو ئەتانوت: کوا کەی دێ؟

(٥٢) لە پاشاندا وترا بەوانە کە تاوانیان کردبوو: دە بچێژن سزای نەبڕاوەی ئەبەدی. ئایا بێجگە کردەوەی بەدی خۆتان هیچ پاداشێکتان ئەدرێتەوە ؟

(٥٣) لێت ئەپرسن ئەڵێن ئایا ئەم ئیددیعای پێغەمبەرییەت ڕاستە، یا ئەم قورئانە ڕاستە، یا ئەم هەڕەشەیە ڕاستە؟ بڵێ: بەڵێ قەسەم بە خودا ڕاستە و، ئێوە هەرگیز ناتوانن لە دەست سزای خودا ڕزگاربن.

وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي الْأَرْضِ لَافْتَدَتْ بِهِ ۗ وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ ۖ وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ (٥٤) أَلَا إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۗ أَلَا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (٥٥) هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٥٦) يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ (٥٧) قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ (٥٨) قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ رِزْقٍ فَجَعَلْتُمْ مِنْهُ حَرَامًا وَحَلَالًا قُلْ آللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ (٥٩) وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ (٦٠) وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُو مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ (٦١)



(٥٤) هەموو ئەوانەی لە دنیادا ستەمیان کردووە، کە لە ڕۆژی قیامەتا لە لایەن خواو بە شێوەیەکی دادپەروەرانە حوکم ئەکرێ لەنێوانیانا و کەس ستەمی لێ ناکرێ و، سزای خوا بە چاوی خۆیان ئەبینن و ئەیچێژن و پەشیمانی و ئاخوداخ ئەپەسێننە دڵیان، ئەگەر هەرچی دارایی و سامانی دنیا هەیە مولکی ئەوان بێ، لەپێناوی ڕزگاربوونی خۆیانا لەو سزایە هەمووی ئەبەخشن.

(٥٥) بێگومان هەرچی لە ئاسمانەکان و لەزەویدا هەیە هەمووی مولکی خودایە، ئاگاداربن بەڵێن و قسەی خودا ڕاستە، بەڵام زۆرتری خەڵك نازانن و فکرو هۆشیان کەموکورتە.

(٥٦) هەر خودای دەستەڵاتدارە مردوو زیندوو ئەکاتەوەو زیندوو ئەمرێنێ و، هەمووتان بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە.

(٥٧) ئەی خەڵکینە ! بە ڕاستی قورئانێکتان بۆ هاتووە پڕیەتی لە ئامۆژگاری و، ڕێگای ڕاستتان پیشان ئەدات بۆ قازانجی دین و دنیاتان، ئەمرتان پێ ئەکا بە چاکەو نەهیتان ئەکا لە خراپە، کە ئەمانە هەموو شیفای دڵ و دەرونن و، لە گومان و بیروباوەڕی خراپ پاکتان ئەکەنەوە. ئەو قورئانە هۆی شارەزایی و ڕەحمەتە بۆ خاوەن باوەڕە دیندارەکان.

(٥٨) با بە نەوازش و میهرەبانیی خودا دڵخۆش بن، با بەوە دڵخۆش بن. ڕەحمەتی خودا زۆرچاکترە لەو سامان و داراییە کە کۆی‌ئەکەنەوە. ڕەحمەتی خودا بەردەوام و نەبڕاوەیەو سامانی دنیا بێ‌بەقایە.

(٥٩) پێم بڵێن: ئەو ڕزق و ڕۆزییەی خودا بۆی ناردوون و هەندێکیتان حەڵاڵ کردووەو هەندێکیتان حەرام کردووە، ئایا خودا ڕێگای داون هەندێکی حەڵاڵ و هەندێکی حەرام بکەن، یا خۆتان لە خۆتانەوە بە دەم خوداوە هەڵتانبەستووە کە خودا شتی وەهای نەفەرمووە.

(٦٠) ئەوانەی تاوانی گەورەی وەها ئەکەن و درۆ بەدەم خواوە هەڵ ئەبەستن، دەربارەی دۆزەخ گومانیان چی یە؟ ئایا وا ئەزانن نایگەنێ و نایبینن؟ خودا چاکەی زۆرە بەسەر خەڵکەوە، هۆش و فامی پێ داون و پێغەمبەری بۆ ناردوون ڕێگای چاکەو خراپەی بۆ ڕوون کردوونەتەوە، بەڵام زۆرتری خەڵك شوکرانەبژێری نیعمەتەکانی خودا نین.

(٦١) خەریکی هەرشتێ ببیو لە هەر حاڵێکدا بی و هەر ئایەتێ لە قورئان بخوێنیتەوە و، هەر کردەوەیێ بکەن، ئێمە ئاگادارین کە خەریکی ئەبن و سەرگەرمی ئەبن، هەرگیز بەقەدەر تۆزقاڵێ لە زەوی و لە ئاسماندا لە خودای تۆ ون نابێ، هەرچی هەبێ لە تۆزقاڵ گەورەتر یا بچووکتر هەمووی لە (لوح المحفوظ) دایە.

أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾ وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٥﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ۖ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بِهَٰذَآ ۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾



(٦٢) بەڕاستی ئەوانەی دۆستی خودان و بێ‌گوێیی خودا ناکەن و ئەویش پایەی بەرزکردوونەتەوە، هەرگیز لەوە ناترسن زیانیان تووش ببێ و غەم و پەژارەی ئەوە ناخۆن کە داخوازییەکیان لەکیس چووە.

(٦٣) دۆستەکانی خودا ئەوانەن کە بەڕاستی‌و لە ناخی دڵەوە باوەڕیان بەخوداو پێغەمبەر هەیەو خۆیان لە هەموو کارێکی ناڕەواو ناشەرعی ئەپارێزن‌و لە سزای خودا ئەترسن.

(٦٤) ئەمانە لە دنیادا قورئان‌و پێغەمبەر موژدەی سەرفرازییان ئەدەنێ و لە قیامەتیشدا فریشتەکان بە موژدەوە بەپیریانەوە دێن، ئەمە فەرموودەو بڕیاری خودایەو، فەرموودەی خودایش هەرگیز ناگۆڕرێ. ئا ئەوەیە سەرکەوتن‌و سەرفرازیی مەزن .

(٦٥) با تانەو تەشەری کافرەکان دڵت عاجزنەکات، بەڕاستی گەورەیی‌و دەستەڵات هەمووی هیی خودایە و، خودا شنەواو زانایەو ئاگای لە کردەوەیانەو تۆڵەیان لێ‌ئەسێنێتەوە.

(٦٦) بێ‌گومان ئەوانەی لە ئاسمانەکان و لە زەویدان چ بنیادەم و چ فریشتە هەموو مولك و بەندەی خودان و شایانی ئەوە نین ببنە هاوبەشی خودا. ئەوانە کە غەیری خودا ئەپەرستن دوای هاوبەشی ڕاستەقینە نەکەوتوون، چونکە هاوبەشی ڕاستەقینە بۆ خودا نی‌یە، ئەو کافرانە تەنها دوای گومان کەوتوون و درۆزنن کە ئەڵێن خودا هاوبەشی هەیە.

(٦٧) خودا ئەو خودایەیە کە شەوی بۆ دروست کردوون تیایا ئارام بگرن و بحەسێنەوەو، ڕۆژیشی بۆ دروست کردوون کە هۆی بینین و بەرچاو ڕوونیتانە. بێ‌گومان لە دروست کردنی ئەم شەو و ڕۆژەدا چەندین بەڵگەو نیشانەیێ هەیە دەلالەت لە گەورەیی‌و دەستەڵاتی خودا ئەکەن لای ئەو کەسانە کە حەق ئەبیسن و خۆیان کەڕناکەن.

(٦٨) موشریکەکان ئەڵێن خودا کوڕی بۆخۆی بڕیارداوەو، فریشتەی کردووە بە ئەولادی خۆی ! خودا پاك و بێ خەوشەو دوورە لەم جۆرە کارانە، خودا بێ‌نیازە بە خەڵك و موحتاجی کەس نی‌یە، خودا دەوڵەمەندەو هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە مولکی خودایە. ئێوە دەلیلێکتان لەسەر ئەم قسە بێ‌جێیە نی‌یە. ئایا ڕەوایە شتێ دەربارەی خودا بڵێن کە خۆتان هیچی لێ نازانن ؟

(٦٩) تۆ بڵێ: ئەو کەسانەی درۆ بۆخودا هەڵئەبەستن و ئەڵێن خودا ئەولادی بۆ خۆی بڕیارداوە، هەرگیز سەرفراز و سەرکەوتوو نابن.

(٧٠) ژیانیان لە دنیادا ڕابواردنێکی کەم و ناپایەدارە، پاشان بۆ لای ئێمە دێنەوەو، سەرەنجامیان لای ئێمەیەو، بەرامبەر بەو کوفرو درۆ هەڵبەستن و کردارە بەدانە کە کردوویانن سزایێکی سەختیان ئەدەین و تۆڵەی بەرودوایان لێ ئەسێنینەوە.

۞ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ﴿٧١﴾ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٧٢﴾ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۚ كَذَٰلِكَ نَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٧٤﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧٦﴾ قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمۡۖ أَسِحۡرٌ هَٰذَا وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَلۡفِتَنَا عَمَّا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٨﴾



(٧١) دەنگوباسـی نووحیـان بەسـەرا بخوێنـەوە کـە وتـی بـە قەومەکـەی: ئـەی قەومینـە ! ئەگـەر زەحمـەت‌وگرانـە لەسـەرتان مـن لـە ناوتانـدا بم و بـە ئایەتـەکانی خـودا ئامۆژگاریتـان بکـەم، ئەوا من پشت بە خودای خۆم ئەبەستم، ئێوەیش هەموو مەکرو هیممەتی خۆتـان ئامادە بکەن خۆتانو ئەوانەی بە شەریکی خوداتان داناون، هەروەها هەرچیتان ئەویٚ کە دژی من بیکەن با ئاشکرابیٚ و شاراوە نەبیٚ، ئەنجا دەست بدەنـە کارەکـەو هیـچ مۆڵەتی من مەدەن.

(٧٢) جا ئەگەر پشتتان لە ئایین هەڵکردو سەرپیٚچیتان کرد، ئـەوە کـەیفی خۆتانـە، خـۆ مـن داوای هیـچ پاداشـێکم لـە ئێـوە نەکردووە، پاداشـی مـن لەسـەر خودایـە. من ئەمرم پیٚ کراوە ئیتاعەی خودابکەم و لە کۆمەڵی موسوڵمانان بم.

(٧٣) جا ئەوانیش نووحیان بە درۆزن دانا و باوەڕیان پیٚ نەکرد، ئـەوە بـوو ئێمـەیش نووحمـان ڕزگـارکرد لـە کەشـتیدا لەگـەڵ ئەوانـەی لەگـەڵیابوونو باوەڕیـان پـیٚ کردبوو، ئەوانەمان کردن بە خاوەن جێگاو جێنشـین لـە زەویـداو، ئەوانـەیش کـە نووحیان بـە درۆزن دائـەنا و باوەڕیـان بـە ئایەتـەکانمان نەئـەکرد هـەموویانمان خنکاندن، دە سەیربکە ئەنجامی ئەوانە کە لە سزای خودا ترسێنران و سەرپێچییان کرد چی بوو و چۆن لە ناوبران ؟

(٧٤) لەپاش نووح چەند پێغەمبەرێکمان نارد بۆ سەر قەومەکانیان، هوود بـۆ سـەر عـاد، صـالح بـۆ سـەر ثـەموود. ئیبراهیم بۆ سەر نەمروودو، هەموو ئەو پێغەمبەرانە موعجیزەیان هێنابوو بۆیـان، بـەڵام قەومـەکانیان ئیمانیـان پـیٚ نەهێنان چونکە لەوە پێشتر خوویان بە کوفر و بیٚ باوەڕییەوە گرتبـوو. ئاوەهـا دڵـی دەسـتدرێژیکەران مـۆر نەکـەین. چونکە خۆیان بیٚباوەڕو سەرکەشن.

(٧٥) پاش ئـەوانیش مووسـاو هاروونمـان نـارد بـۆ لای فیرعـەون و کۆمـەڵەکـەی لەگـەڵ ئایـەت و موعجیزەکانماندا. ئەوانیش، واتە فیرعەون و کۆمەڵەکەی، خۆیان بە گـەورە دانـاو باوەڕیـان بـە مووسـاو هـاروون نـەکردو، کۆمـەڵێکی تاوانباربوون.

(٧٦) کە لەلایەن ئێمەوە حەقیان بۆ هاتو، بە موعجیزە بۆیان دەرکەوت کە ڕاستە، سەرپێچییان کردو ئیمانیان پیٚ نەهێناو نەیانوت: ئەمە هیچ نییە جادوویێکی ئاشکرا نەبیٚ !

(٧٧) جا مووسا وتی: ئایا ئێوە کە موعجیزەی خودایی هاتـە لاتـان پێـی ئـەڵێن: ئایـا ئەمـە سـیحر و جـادووە کـە جادووگەرانیش هەرگیز سەرناکەون؟!

(٧٨) فیرعەون و دەستەو دائیرەکەی بە مووسایان وت: ئایا تۆ بۆ ئەوە هاتووی بـۆ لامـان لـەو ڕێـو شـوێن و یاسـای عیبادەتە هەڵمانگەڕێنیتەوە کە باوك‌وباپیری خۆمانمان لەسەر دیوە، تا ئێمە بیٚ دەستەڵات و بیٚ هێز ببین و گەورەیی و دەسەڵات لە سەر زەویدا بۆ ئێوە بێت؟ هەرگیز شتی وەها نابێت و ئێمە ئیمانتان پیٚناهێنین.

وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٨٢﴾ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٞ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ خَوۡفٖ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحۡمَتِكَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيۡتَ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةٗ وَأَمۡوَٰلٗا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَۖ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٨٨﴾



(٧٩) جا فیرعەون بە مەئموورەکانی وت: هەرچی جادووگەری زاناو وریا هەیە بۆم حازرکەن.

(٨٠) کە جادووگەرەکانی فیرعەون هاتن مووسا پێی وتن: کاری خۆتان لەپێشدا بنوێنن‌و چیتان پێ یە پیشانی خەڵکی بدەن.

(٨١) کاتێ کە جادووگەرەکان شتی خۆیان فڕێدا مووسا پێی‌وتن: ئەوەی ئێوە هێناوتانە جادوویەو بێ‌گومان خودا بەتاڵی ئەکاتەوە، خودا کاری بەدکاران ڕێك ناخات.

(٨٢) خودا بەئەمر و فەرمانی خۆی حەق‌و ڕاستی جێگیر ئەکات، ئەگەرچی تاوانباران پێیان ناخۆش بێ‌و بە دڵیان نەبێ.

(٨٣) پاش دەرکەوتنی موعجیزە کەس ئیمانی بە مووسا نەهێنا، چەند نەوەیێکی قەومەکەی خۆی نەبێ، کە ئیمانیان پێ هێناو، ئەیشترسان لە فیرعەون‌و دەستەو بەستەکەی کە سزایان بدەن، فیرعەون دەستەلاتدار بوو لەسەر زەوی و، زیاد لە ئەندازە خۆی بە گەورە ئەزانی، تەنانەت ئیددیعای خودایەتیی ئەکرد.

(٨٤) مووسا وتی بەقەومەکەی: ئەی قەومینە ! ئێوە ئەگەر باوەڕتان بە خودا هەیەو، ڕازین بە فەرمانی‌و ملکەچن بۆ حوکمی، پشت بەخودا ببەستن و بڕواتان تەنها بەو بێ.

(٨٥) ئەوانیش وتیان: پشتمان بە خودا بەست‌و تەنها ئەو بە پشت‌و پەنا دائەنێین. خودایا مەمانخەرە ژێر دەستی خودانەناسان‌و تاوانباران کە تووشی سزاو ئاژاوەمان بکەن.

(٨٦) بە لوتف‌و میهرەبانیی خۆت لە زۆر و ستەمی کافران ڕزگارمان بکە.

(٨٧) وەحیمان بۆ مووساو هاروونی برای کرد کە خۆتان‌و کۆمەڵەکەتان لە شاری میصر نیشتەجێ ببن و، خانووەکانتان بکەنە جێگای نوێژو خوداپەرستی، نوێژیان تێدابکەن‌و ڕووبکەنە قیبلە، واتە کەعبە. موژدەیش بە خاوەن باوەڕەکان بدە کە لە دنیادا سەرئەکەون و لە قیامەتیشدا جێگایان بەهەشتی بەرینە.

(٨٨) مووسا لە خودا پاڕایەوە وتی: خودایا تۆ جوانی و نومایش و ئەسبابی سەربەرزیی دنیات داوە بە فیرعەون و دەستەو بەستەکەی، ئەوانیش خەڵك گومڕاه ئەکەن و لە ڕێگای تۆیان لائەدەن، خودایا سامان و داراییيان لەناوبەرە و دڵیان مۆربکە، بۆ ئەوەی ئیمان نەهێنن تا سزای سەخت ئەبینن.

قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّىٰ إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ آلْآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ فَمَا اخْتَلَفُوا حَتَّىٰ جَاءَهُمُ الْعِلْمُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَاءَكَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾



(٨٩) خودا فەرمووی: بەڕاستی دوعاکەتان قبوولّ کرا. ئێوە لەسەر بەگوێکردنی فەرمانی خودا بەردەوام بن و مەکەونە شوێن ڕێگای ئەوانەی نەزانن.

(٩٠) ئەنجا بەنی ئیسرائیلمان لە دەریا پەڕاندەوەو بە سەلامەت گەیشتنە قەراخ دەریاو، فیرعەونو لەشکرەکەی ستەمکارانە بە ڕاکردن دوایان کەوتن تا گەیشتنە ڕادەیێك خەریك بوو فیرعەون لە نیلدا ئەخنکا، ئەنجا وتی: باوەڕم هێنا کە هیچ خودایێ نی‌یە بەڕاستی عیبادەتی بۆ بکرێ ئەو خودایە نەبێ کە بەنی ئیسرائیل باوەڕیان پێ هێناوە و، منیش لە موسوڵمانانم.

(٩١) جا خودا فەرمووی: ئا ئێستە باوەڕ ئەکەیتو ئیمان ئەهێنی کە تۆ لەمەوپێش سەرپێچیت ئەکردو لە زومرەی بەدکرداران بووی؟

(٩٢) ئەمڕۆ لاشەکەت بە بێ‌گیان لە نقوم بوون ڕزگار ئەکەین و ئەیخەینە سەر ئاوو وەك کۆمەڵەکەت لە بنی دەریادا ناتهێڵینەوە، تا خەڵك بە خنکاوی بتبینن‌و، ببیتە پەندو عیبرەت بۆ ئەوانەی لەپاش تۆ دێن و، بزانن ئەنجامی ستەمکار نەمان و لەناوچوونە. بێ‌گومان زۆر کەس لە ئایەتەکانی ئێمە بێ ئاگان و تێیان نافکرن.

(٩٣) لە پاش خنکانی فیرعەون بەنی ئیسرائیلمان لە نیشتمانێکی باش و پەسەندا دامەزراندو، ڕزق و ڕۆزیی پاك و پوختمان پێ دان، لە کاروباری ئایینیاندا جیاوازی نەکەوتە ناویان ئیللا پاش خوێندنەوەی تەورات‌و زانینی حوکمەکانی. بێ‌گومان خودا لە ڕۆژی قیامەتدا دەربارەی ئەو شتانەی ئیختیلافیان تێدا هەبوو حوکم لە بەینیاندا ئەکات و ڕاست و چەوتیان لێك جوێ‌ئەکاتەوە و هەرکەس حەقی خۆی ئەداتێ.

(٩٤) تۆ ئەگەر لە ڕاستیی ئەو قورئانەی بۆمان ناردوویت گومانێکت هەیە بڕۆ لەوانە بپرسە کە پێش تۆ تەوراتیان خوێندووەتەوە، لە تەوراتەکەی ئەواندا باسی ڕاستی ئەم قورئانە هەیە. بێ‌گومان تۆ حەقت لەلایەن خودای خۆتەوە بۆ هاتووە و جێی گومان نی‌یە، کە واتە ڕاڕاو دوودڵ مەبە.

(٩٥) هەرگیز لەوانە مەبە کە ئایەتەکانی خودا بە درۆ ئەخەنەوە تا بچیتە زومرەی زەرەرمەندانەوە.

(٩٦) ئەوانەی بە هۆی کوفرو کردەوەی بەدیانەوە لە عیلمی خودادا بڕاوەتەوە بە کافری ئەمرن، هەرگیز ئیمان ناهێنن.

(٩٧) ئەوانە ئیمان ناهێنن ئەگەرچی هەرچی ئایەت و موعجیزەی خودایە بەچاو ببینن. ئیمان ناهێنن تا بەچاوی خۆیان سزای سەخت ئەبینن، دیارە لەو وەختەیشدا ئیمان بەکەڵك نایەت.

فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ
ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ
إِلَىٰ حِينٖ ﴿٩٨﴾ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ
جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَمَا
كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تُؤۡمِنَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَجۡعَلُ ٱلرِّجۡسَ
عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَا تُغۡنِي ٱلۡأٓيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٠١﴾
فَهَلۡ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثۡلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ
قُلۡ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّي
رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيۡنَا نُنجِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
﴿١٠٣﴾ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي شَكّٖ مِّن دِينِي فَلَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِينَ
تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنۡ أَعۡبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُمۡۖ وَأُمِرۡتُ
أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنۡ أَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗا
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدۡعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ
مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَۖ فَإِن فَعَلۡتَ فَإِنَّكَ إِذٗا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾



(٩٨) بۆ خەڵکی گوندێ لەو گوندانەی بە هۆی بێ‌ئیمانییانەوە نوغرۆمان کردن، بەر لەوەی سزاو غەزەبی خودا بەچاوی خۆیان ببینن، ئیمانیان نەهێنا، تا ئیمانهێنانەکەیان بەکەڵکیان بێ؟ بەڵام قەومی یوونس(س.خ) کە نیشانەی سزایان دی پێش هاتنەکەی ئیمانیان هێنا. جا کە ئیمانیان هێنا سزامان لێ لادان، ئەو سزایەی بۆیان ئەبوو بە مایەی سەرشۆڕی لە دنیادا. دوایش تا ڕۆژی ئاکامیان ڕزقو ڕۆزیو نازو نیعمەتمان پێ دان.

(٩٩) ئەگەر خودا بیویستایە هەموو ئەهلی سەر زەوی ئیمانیان ئەهێناو تاقیان لێ دەرنەئەچوو کە بێ ئیمان بێ، بەڵام خودا خواستی ئەوەی نەبوو کە واتە نابێ. ئایا تۆ بەزۆر ئەتەوێ هەموو خەڵك موسوڵمان بکەی ؟

(١٠٠) بۆ هیچ نەفسێ نی‌یە ئیمان بێنێ بە خواستی خوداو تەوفیقی ئەو نەبێ، ئێمە سزاو سەرشۆڕی بەسەر ئەوانەدا ئەدەین کە نافامنو هۆشیان ناخەنە کارو، بیر لە گەورەییو دەسەڵاتی خودا ناکەنەوە.

(١٠١) تۆ بڵێ بەو کافرانە: سەیرکەن چی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە لەو شتانەی کە دەلیل و بەڵگەن لەسەر بوونی خودا و دەستەڵاتی؟ بەڵام موعجیزەو ترساندن سوودی نی‌یە بۆ قەومی بێ‌ئیمان.

(١٠٢) ئەوانە چاوەڕوانی چی ئەکەن بێجگە لە بەسەرهاتو ئەنجامی کافرانی پێش خۆیان کە خودا غەزەبی لێ‌گرتن. دە ئێوە چاوەڕوان بنو منیش لەگەڵتان چاوەڕوانم.

(١٠٣) جا پاش ئەوەی کافرەکانمان فەوتاند پێغەمبەرەکانمان و ئەوانەی ئیمانیان هێناوە ڕزگاریان ئەکەین. ئاوەها ئێمە بڕیارمان داوە خاوەن ئیمانەکان ڕزگار بکەین.

(١٠٤) بڵێ: ئەی خەڵکینە ! ئەگەر ئێوە گومانتان لە دینەکەی مندا هەیە و بەڕاستی نازانن، ئەوا دڵنیابن من هەرگیز عیبادەت ناکەم بۆ ئەوانەی ئێوە عیبادەتیان بۆ ئەکەن غەیری خودا، بەڵام عیبادەتی ئەو خودایە ئەکەم کە ئێوە ئەمرێنێ و، ئەمرم پێ کراوە لە خاوەن باوەڕان بم.

(١٠٥) ئەمرم پێ کراوە ڕووبکەمە ئایینی خوابەیەك‌ناسین بە پاکیو خاوێنیو لەوانە نەبم کە هاوبەش بۆ خوای تاكو تەنیا دائەنێن.

(١٠٦) بێجگە خودا بانگ لەو شتانە مەکە کە نە ئەتوانن قازانجت پێ بگەیێنن و نە ئەتوانن زیانت لێ بدەن. ئەگەر تۆ شتی وەها بکەی لە زومرەی ستەمکاران ئەبیت.

وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾

## سُورَةُ هُودٍ

ترتيبها ١١ — آياتها ١٢٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۚ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴿٢﴾ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ۖ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴿٣﴾ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُ ۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٥﴾



(١٠٧) ئەگەر خودا تووشی زیانێکت بکات کەس نی‌یە بتوانێ ئەو زیانەت لێ لابدات خۆی نەبێ، هەروەها ئەگەر بیەوێ خێرو خۆشییەکت بداتێ کەس نی‌یە بتوانێ ئەو نەوازشەت لێ بگێڕێتەوە. خودا خێرو خۆشی ئەگەیەنێ بە هەرکەس خواستی لەسەر بێ لە بەندەکانی. هەر خودایە گوناهپۆش و میهرەبان.

(١٠٨) تۆ بڵێ: ئەی خەڵکینە ! حەقتان لەلایەن خوداوە بۆ هاتووە، کە قورئانە یا پێغەمبەرە، جا هەرکەس ڕێی ڕاست ئەگرێ ئەوە بۆ خێرو قازانجی خۆی ئەو ڕێگا ڕاستە ئەگرێتە بەر. ئەوەیش گومڕاە ئەبێ‌و سەرپێچی ئەکات ئەوا زیانی گومڕاهییەکە خۆی ئەگرێتەوە. ئیتر من وەکیلی ئێوە نیمو، چاك و خراپی ئێوە بەدەست من نی‌یە.

(١٠٩) پەیڕەویی ئەو قورئانە بکە کە بە وەحی بۆت نێرراوەو، خۆگربە لە گەیاندن و ڕەفتارپی‌کردنیدا، تا خودا فەرمانی خۆی جێبەجێ ئەکات. خودا باشترین فەرمانڕەوایە.

## سووڕەتی (هُودٍ)

مەککەیی‌یەو (١٢٣) ئایەتە.

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لە وشەی (الـر) چی یە. ئەم قورئانە کتێبێکە ئایەتەکانی بە پتەوی‌و ساغی لە (لوح المحفوظ) دا نووسراون و هەرگیز تێك ناچن‌و بەتەواوی نێرراون بۆ پێغەمبەرو لە پاشاندا تەفصیل دراون بۆ بیرو باوەڕو کردەوەو دەنگوباس لەلایەن خودایەکی گەورەی خاوەن حیکمەت و شارەزاوە.

(٢) ئەو ئایەتانە ئەڵێن کەس مەپەرستن خودا نەبێ، من لەلایەن خوداوە نێرراوم و مژدەدەر و ترسێنەرم بۆتان.

(٣) داوای تاوان پۆشین لە پەروەردگارتان بکەن و، لە گوناهەکانتان پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خودا. ئەگەر وەها بکەن خودا تا ئاکامێکی دیاری خۆشیتان ئەداتێ‌و، هەرکەس زیادەچاکەیێکی هەبێ پاداشی خۆی وەرئەگرێ. خۆ ئەگەر سەرپێچیتان کرد ئەوا من ئەترسم کەوا لە ڕۆژێکی پڕ سامدا سزایەکی سەخت بدرێن.

(٤) گەڕانەوەتان و سەرئەنجامتان بۆ لای خودایەو، خودا بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارو توانایە.

(٥) بەڕاستی کافرەکان سینەیان لە ئاستی حەق وەرئەچەرخێنن تا خۆیان لە خودا بشارنەوەو، پێغەمبەرو موسوڵمانان پێیان نەزانن. بێ‌گومان تەنانەت لەو کاتەدا ئەوان ئەچنە ناو نوێن‌و خۆیان دائەپۆشن خودا ئاگای لەوەیە لە دڵیاندایەو لەوەی بە زمانیاندا دێ. خودا ئاگای لە هەموو نهێنییەکە، ئیتر چۆن خۆیان ئەشارنەوە ؟!

۞ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴿٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ وَلَئِن قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧﴾ وَلَئِنۡ أَخَّرۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٖ مَّعۡدُودَةٖ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحۡبِسُهُۥٓۗ أَلَا يَوۡمَ يَأۡتِيهِمۡ لَيۡسَ مَصۡرُوفًا عَنۡهُمۡ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٨﴾ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ ثُمَّ نَزَعۡنَٰهَا مِنۡهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٞ كَفُورٞ ﴿٩﴾ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ نَعۡمَآءَ بَعۡدَ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٞ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿١١﴾ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٞۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ ﴿١٢﴾



(٦) هەر گیانلەبەرێ بە سەر زەویدا بڕوات ڕۆزیو ژیواری لەسەر خودایە. خودا بە شوێنی ژیان و مردنیان ئەزانێ. ئەمانە هەموو لە(لوح المحفوظ)دا نووسراون.

(٧) خودا ئەو خودایە لە ماوەی شەش ڕۆژدا ئاسمانەکان و زەویی دروست کرد، عەرشی خودایش پێش دروستکردنی ئاسمان و زەوی لەسەر ئاو بوو. دروستی کردن تا تاقیتان بکاتەوە کامتان کردەوەتان جوانترە. ئەگەر پێیان بڵێیت ئێوە لەپاش مردن زیندوو ئەکرێنەوە کافرەکان ئەڵێن: ئەم قسە جادوویەکی ئاشکراو دیارە.

(٨) ئەگەر سزاکەیان بۆ ماوەیێکی دیاری کراو دوا بخەین ئەڵێن ئەگەر ڕاستە بۆ دواکەوت؟ بۆ نەهات؟ بێگومان ئەو سزایە دێت و لەو ڕۆژەیشدا کە بۆیان دێت لێیان لا نادرێت و ئەبێ تووشیان بێت. ئەو سزایەی گاڵتەیان پێ ئەکرد بێگومان گەمارۆیان ئەداتو سەرو دڵیان ئەگرێت.

(٩) بەڕاستی ئەگەر ئێمە نیعمەتو خۆشییەك لەلایەنی خۆمانەوە بدەین بە ئینسان و لە پاشاندا لێی وەرگرینەوە، زۆر نائومێد ئەبێو کوفرانی ئەو نیعمەتە ئەکا کە پێمان داوە.

(١٠) ئەگەریش پاش مەینەت خۆشیو نیعمەتمان دایە ئەڵێت: ناخۆشییەکەم ڕۆییو، لەم ڕووەوە دڵشاد ئەبێ و لە خۆی ئەگۆڕێو لەناو خەڵکدا شانازی ئەکات.

(١١) ئەوانە نەبێ کە خۆگرن و کردەوەی باش ئەکەن. ئەوانە خودا ئەیانبەخشێ و پاداشی گەورەیان هەیە.

(١٢) بۆ تۆ ناشێ تەرکی گەیاندنی هەندێ لەو ئایەتانە بکەیت کە وەحی کراون بۆتو بە دڵی کافرەکان نین. بۆ تۆ ناشێ دڵت تەنگ بێ لەوە کە کافرەکان ئەڵێن: بۆچی خەزنەیێك نانێرێ بۆ موحەممەد تا وەك پادشاهان ڕابوێرێ، یا لەوە کە ئەڵێن: بۆچی فریشتەیێکی لەگەڵ نەنێرراوە تەصدیقی بکاتو یارمەتیی بدات؟ نەکەی، کاری وا بۆ تۆ ناشێ، تۆ کارت ترساندنی کافرانە لە سزا؛ ئیتر هەموو شت بە دەستی خودایە، پشت بەو ببەستە.

أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَـٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَـٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَـٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَـٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَـٰدُ هَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿١٩﴾



(١٣) یا خۆ ئەڵێن: ئەم قورئانەی بە دەم خوداوە هەڵبەستووەو هی خودا نی‌یە! بڵێ: دە ئەگەر ئازانو ئەتوانن دە سوورەتی هەڵبەستراوی وەك سوورەتەکانی ئەو بێننو، بۆ ئەم مەبەستەیش بێجگە خودا کێتان ئەوێ بانگی بکەن و داوای یارمەتی لێ بکەن ئەگەر ڕاست ئەکەن هەڵبەستراوە.

(١٤) جا ئەگەر پێیان نەکرا ئەوا زۆر چاك بزانن ئەو قورئانە پیرۆزە، بەجۆرێ نازڵ کراوە هەر خودا خۆی ئەیزانێو، زۆر چاك بزانن هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نی‌یە خودای تاك و تەنیا نەبێ. ئایا ئێوە کە بۆتان دەرکەوت قورئان موعجیزەیە، لەسەر ئایینی ئیسلام بەردەوام ئەبن؟.

(١٥) ئەوانەی بەرامبەر بە کردەوەی بەدیمەن چاکی دنیایان تەنها ژیان و خۆشیی دنیایان بوێ و پاداشی قیامەتیان مەبەست نەبێ، ئەوانە پاداشی کردەوەی دنیایان ئەدەینەوەو هیچی لێ کەم ناکرێتەوە.

(١٦) ئا ئەوانە لە دوارۆژدا هیچ بەش‌و بارەیێکیان نی‌یە، ئاگری دۆزەخ نەبێ. هەروەها هەرچییان کردووە لە دنیادا بۆ دوارۆژ پووچ و بێ‌سوودەو ئەوەی کردوویان بەتاڵە.

(١٧) ئایا کەسێ دەلیلی لای خوداوە هەبێ، وەك عەقڵ و تێفکرین، بیخاتە سەر ڕێگای ڕاست و، شاهیدێکی وەك قورئانی هەبێ یارمەتیی بداتو، لەپێش ئەو شاهیدەیشەوە تەوراتی مووسا کە پێشەوای خەڵکی سەردەمی خۆی بووە، یارمەتی قسەو کردەوەی دابێ، ئایا ئەم جۆرە کەسە وەك ئەو کەسەیە کە تەنها ژیانو خۆشیی دنیای مەبەست بێو ڕۆژی دوایی بەخەیاڵدا نەیێ؟ ئەوانە، واتە پێغەمبەرو پەیڕەوەکانی، باوەڕیان بە قورئان هەیە. ئەوەیش باوەڕی پێ نەکات، وەك موشریکەکانی مەککەو دەستەو بەستەکانیان، ئاخری دۆزەخ جێگایانەو لەوێ سزا ئەدرێن. هەرگیز گومانو دوو دڵیت نەبێ لە قورئاندا؛ قورئان حەقەو لای خودای خۆتەوە هاتووە، بەڵام زۆرتری خەڵك باوەڕیان نی‌یە؛ چونکە بیرناکەنەوەو عەقڵیان ناخەنەکار.

(١٨) کێیە لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵبەستێ؟ ئەوان ئەبرێنە بەردەم خوداو، شاهیدەکان ئەڵێن: ئا ئەمانە بوون درۆیان بەدەم خودای خۆیانەوە کرد؟ لەعنەت و نەفرین لە خوداوە لەسەر ستەمکاران بێ.

(١٩) ئەو ستەمکارانە ڕێگا لە دینی ئیسلام ئەگرن و ئەیانەوێ موسوڵمانەکان لێی هەڵگەڕێنەوەو، باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نی‌یە.

أُولَٰئِكَ لَمْ يَكُونُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَمَا كَانَ لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ۘ يُضَاعَفُ لَهُمُ الْعَذَابُ ۚ مَا كَانُوا يَسْتَطِيعُونَ السَّمْعَ وَمَا كَانُوا يُبْصِرُونَ ﴿٢٠﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُمْ مَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢١﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِي الْآخِرَةِ هُمُ الْأَخْسَرُونَ ﴿٢٢﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَأَخْبَتُوا إِلَىٰ رَبِّهِمْ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ مَثَلُ الْفَرِيقَيْنِ كَالْأَعْمَىٰ وَالْأَصَمِّ وَالْبَصِيرِ وَالسَّمِيعِ ۚ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَنْ لَا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ ۖ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾ فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلَّا بَشَرًا مِثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمْ عَلَيْنَا مِنْ فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنْتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَآتَانِي رَحْمَةً مِنْ عِنْدِهِ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنْتُمْ لَهَا كَارِهُونَ ﴿٢٨﴾



(٢٠) ئەوانە لە دنیادا ناتوانن دەست بێننە ڕێگای خوداو مەنعی سزا لە خۆیان بکەن، لە ڕۆژی دواییشدا هیچ دۆستێکیان نی‌یە بە دەنگیانەوە بێ‌و لە تۆڵە ڕزگاریان بکات. سزایان لە ڕۆژی قیامەتدا دووقات ئەبێ؛ چونکە لە دنیادا تاقەتیان نەبوو گوێ لە حەق بگرن‌و خۆیان لە ئاستی ئایەتەکانی خودادا کوێر ئەکرد.

(٢١) ئەوانە کەسانێکن خۆیان دۆڕاندو، ئەو درۆو دەلەسەیەی کردیان هەمووی بە هیچ دەرچوو و سوودێکی پێ نەگەیاندن.

(٢٢) بێ‌گومان ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا لە هەموو کەس زیاتر زەرەرمەند و دۆڕاون.

(٢٣) بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان بە خوداو پێغەمبەر هەیەو کردەوەی چاکەیان کردووەو بە دڵ موتیعی خودای خۆیانن ئەهلی بەهەشتن و هەتا هەتایە لە بەهەشتدا ئەمێننەوە.

(٢٤) ئەم دوو تاقمی موسوڵمان و کافرە وەکو دوو کەسن یەکێکیان کوێرو کەڕ بێ‌و ئەوی تریان بیناو شنەوا بێ. ئایا ئەم دوانە وەك یەکن؟ حاشا وە کەللا، ئەی بۆ بیر ناکەنەوە؟.

(٢٥) بەڕاستی نووحمان بە پێغەمبەری نارد بۆ قەومەکەی و پێی وتن: من ترسێنەرێکی ئاشکرای ئێوەم و لە سزای ...ڕۆژ ئەتانترسێنم.

(٢٦) من پێتان ئەڵێم: عیبادەت بۆ کەس مەکەن خودا نەبێ. من ئەترسم تووشی سزای ڕۆژێکی پڕ ئازار ببن.

(٢٧) جا کافرەکانی قەومەکەی وتیان: تۆ هیچ نیت بنیادەمێکی عادەتیی وەك ئێمە نەبێ، زیادە گەورەییەکت نی‌یە تا شایانی پێغەمبەرایەتی بیت. هەروەها نابینین کەست دواکەوتبێ ئەوانە نەبێ لای ئێمە بێ نرخترینمانن‌و، بە‌کەسەر بێ‌وردبوونەوە بیروبۆچوونی خۆیان دەرئەبڕن. ئێوە زیادەیێکتان نی‌یە بەسەر ئێمەدا تا دواتان بکەوین و پەیڕەویتان بکەین، بەڵکو بە درۆزنتان ئەزانین.

(٢٨) نووح بە قەومەکەیی وت ئەی ئەگەر خودا دەلیلی پێ دابم لەسەر ڕاستیی قسەکەم و، ڕەحمەتی خۆی پێ بەخشیبم، کە پێغەمبەرییە، کەچی ئەو بەهرەیە لە ئێوە شارراوە بێ‌و خودا هیدایەتتان نەدات، ئایا من ئەتوانم بەزۆر هیدایەتتان بدەم کە خۆتان پێتان ناخۆش بێ و بیرنەکەنەوە؟

وَيَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مَالًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَلَٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوْمِ مَن يَنصُرُنِى مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمْ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّى مَلَكٌ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِىٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًا ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ إِنِّىٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَىَّ إِجْرَامِى وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴿٣٥﴾ وَأُوحِىَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٣٧﴾



(٢٩) ئەی قەومەکەم! من بەرامبەر بە ئامۆژگاری کردنتان هیچتان لێ داواناکەم، پاداشی من لەسەر خودایە. من هەرگیز ئەوانە لە خۆم دوور ناخەمەوە کە ئیمانیان هەیە، ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا بە خودای خۆیان ئەگەن و هەرکەس لەم دنیا دەریان بکات لەو دنیا یەخەی ئەگرنو شکاتی لیٚئەکەن، بەڵام من وائەزانم ئێوە قەومێکی نەفامن.

(٣٠) ئەی قەومینە! ئەگەر من ئەوانە دەربکەم کێ لە غەزەبی خودا ڕزگارم ئەکات و یارمەتیم ئەدات؟ ئێوە بۆ هیچ تێنافکرن؟.

(٣١) من ناڵێم خەزێنەکانی خودا لای منن، ناڵێم غەیب ئەزانم، ناڵێم فریشتەم. بەو کەسانەیش ناڵێم کە ئێوە بە چاوی سووك تەماشایان ئەکەن: خودا خێریان پێ نادات. هەر خودا ئەزانێ چی لە دڵیاندایە. من ئەگەر یەکێ لەمانە بڵێم لە زومرەی ستەمکاران ئەبم.

(٣٢) جا قەومەکەی نووح بە نووحیان وت: بەڕاستی تۆ موجادەلەت لەگەڵ ئێمە کردو زۆریشت موجادەلە لەگەڵ کردین. دە فەرموو ئەو سزایەی وەعدە[illegible] پێ داین بیهێنە بۆ سەرمان ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی.

(٣٣) ئەویش وتی: خودا ئەو سزایەتان دەنێرێتە سەر ئەگەر خواستی لەسەر بێ. ئێوە ناتوانن ڕێگا لە خودا بگ[illegible] مەنعی ئەو سزایە لە خۆتان بکەن.

(٣٤) ئەگەر بمەوێ ئامۆژگاریتان بکەم، مادام خودا مەیلی لەسەر ئەوە بێ گومڕاتان بکات، ئامۆژگاریی م[illegible] سوودتان پێ ناگەیێنێ. هەر خودا پەروەردگارتانە و بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە.

(٣٥) یا خۆ ئەڵێن نووح درۆئەکا بە دەم خوداوەو پێغەمبەر نییە؟ پێیان بڵێ: ئەگەر درۆم هەڵبەستبێ ئەوا خ[illegible] سزای تاوانی خۆم هەڵئەگرم. من بەریم لەو تاوانەی ئێوە کە من بە درۆزن ئەزانن.

(٣٦) جا لەپاش ئەم کێشەو جیداڵە وەحی بۆ نووح کرا: ئیتر بێجگە ئەوانەی پێشتر ئیمانیان هێناوە لە قەومەکە[illegible] کەس ئیمان ناهێنێو، لە کردەوەی نالەباری قەومەکەت زویر مەبە.

(٣٧) دەست بکە بە دروستکردنی کەشتییەکە لەژێر چاودێریی ئێمەداو بەجۆرێ کە وەحیت بۆ ئەکەین، ئیتر لەبار[illegible] عەفوو بەخشینی ئەو تاوانبارانەوە هیچ قسەم لەگەڵ مەکە، ئەوانە غەرق کراون، واتە لە عیلمی خودادا ڕابووردو[illegible] کە غەرق ئەبن.

وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ سَخِرُواْ مِنۡهُۚ قَالَ إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا تَسۡخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ وَمَنۡ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ﴿٤٠﴾ ۞وَقَالَ ٱرۡكَبُواْ فِيهَا بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٤١﴾ وَهِيَ تَجۡرِي بِهِمۡ فِي مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبۡنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعۡزِلٖ يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ يَعۡصِمُنِي مِنَ ٱلۡمَآءِۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلۡيَوۡمَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَۚ وَحَالَ بَيۡنَهُمَا ٱلۡمَوۡجُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡمُغۡرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَنَادَىٰ نُوحٞ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي وَإِنَّ وَعۡدَكَ ٱلۡحَقُّ وَأَنتَ أَحۡكَمُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾



(٣٨) نووح دەستی کرد بە دروستکردنی کەشتییەکەو، هەرجارێ کە کۆمەڵێ لە قەومەکەی بەلایدا تێپەڕیان ئەکرد گاڵتەیان پێ ئەکرد. نووحیش پێی ئەوتن: ئەگەر ئێوە گاڵتە بە ئێمە ئەکەن، ئێمەیش گاڵتە بە ئێوە ئەکەین وەك گاڵتەکردنەکەی ئێوە.

(٣٩) دوایی ئەزانن کێ سزایێکی بۆ دێ کە سەرشۆڕو ڕیسوای بکاو کێ سزای بەردەوامی تووش ئەبێ؟.

(٤٠) نووح هەر خەریکی کەشتییەکە بوو تا فەرمانمان هات بۆ هەستانی تۆفان و، تەنانەت تەنووری نان کردن کە شوێنی ئاگرە هاتەکوڵو، وەك مەنجەڵی سەرئاگر سەرڕێژی کرد، وەحیمان بۆ نووح کرد کە لە هەموو نێرو مێیەك دوو جووت هەڵبگرە، لەگەڵ خێزانەکەتدا، ئەو کەسە نەبێ کە پێشتر لە عیلمی خودادا بڕیاردراوە بفەوتێ. هەروەها پێمانوت خاوەن ئیمانەکان لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ، کە ژمارەیێکی کەمیش نەبێ کەس ئیمانی نەهێنابوو.

(٤١) نووح وتی: دە سواری کەشتییەکە بن و، چ لە ڕۆیشتنیدا و چ لە ڕاوەستانیدا ناوی خودای لێ بێنن. بێگومان خودای من گوناهبەخش و میهرەبانە.

(٤٢) کەشتییەکە بە ناو چەند شەپۆلێکدا ئەیبردن کە وەك کێو گەورە بوون. نووح بانگی لە کوڕەکەی کرد، کە لێی دوور بوو، وتی: ڕۆڵە کوڕم وەرە سوار بە لەگەڵمانو، لەگەڵ کافران مەبە.

(٤٣) کوڕەکەی وتی: من سەرئەکەومە سەر کێوێك بمپارێزێ لە ئاوو تۆفان. نووح وتی: ئەمڕۆ کەس لە قەهری خودا ڕزگار نابێ کەسێ نەبێ خودا ڕەحمی پێ بکا، ئیتر شەپۆل کەوتە بەینیانەوەو لە زومرەی خنکاواندا خنکا.

(٤٤) جا پاش خنکانی کافرەکان و تەواوبوونی قەزای خودا، فەرمان لەلایەن خوداوە دەرچوو بۆ زەوی و پێی وترا: ئەی زەوی! ئاوی خۆت قووت بدەرەوە. بە ئاسمانیش وترا: ئەی ئاسمان وازبێنە و دەس بەردار ببە لە ڕژاندنی ئاو بەسەر زەویدا، هەروەها کەشتییەکەیش لەسەر کێوی (جوودی) گیرسایەوەو، ئەنجا جاڕ درا کە دووری لە ڕەحمەتی خودا بۆ قەومی ستەمکارە.

(٤٥) نووح بانگی لە خودای خۆی کردو وتی: خودایا کوڕەکەم یەکێکە لە خێزانەکەم و وەعدەی تۆیش بە ڕزگارکردنی ئەهلی من وەعدەیێکی ڕاستە و، تۆ لە هەموو فەرمانڕەوایێ دادپەروەرتری.

قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ
مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾
قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا
تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ قِيلَ يَٰنُوحُ
ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ
وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٤٨﴾ تِلۡكَ
مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ
مِن قَبۡلِ هَٰذَاۖ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِلَىٰ عَادٍ
أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ
غَيۡرُهُۥٓۖ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُفۡتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ
أَجۡرًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي فَطَرَنِيٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٥١﴾
وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ
عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ
مُجۡرِمِينَ ﴿٥٢﴾ قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ
بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٣﴾



(٤٦) خودا وتی: ئەی نووح! ئەوکوڕە لە ئەهلی تۆ نی‌یە؛ ئەو کردەوەی خراپو ناڕەوایە. داوای شتێکم لێ مەکە کە نازانی چی‌یە. من ئامۆژگاریت ئەکەم، نەکەی لە نەزانەکان بی.

(٤٧) نووح وتی: خودایا پەنا ئەگرم بە تۆ لەوەی داوای شتی وەهات لێ بکەم کە نایزانم و لە سیڕڕەکەی تێ نەگەیشتووم، ئەگەر تۆ گوناهم نەپۆشی‌و ڕەحمم پێ نەکەی لە زومرەی دۆڕاوان ئەبم.

(٤٨) وەحی بۆ نووح کرا: لە کەشتییەکە دابەزە، لەلایەن ئێمەوە ئارامو بێ بەلا ئەبن‌و، زیادە خۆشی‌و بەرەکەت ئەڕێژین بەسەر خۆت‌و بەسەر ئەو خاوەن ئیمانانەدا کە لەگەڵتن. پاش ئێوەیش چەند ئوممەتێکی تر دێن کە تا ماوەیێك لەزەت و خۆشییان ئەدەینێ‌و پاشان سزایێکی پڕ ئازاریان لەلایەن ئێمەوە تووش ئەبێ.

(٤٩) بەسەرهاتی نووح و قەومەکەی لە دەنگ و باسی غەیبەو کەس نەیزانیوەو ئێمە وەحیی ئەکەین بۆت. پێش ئەم وەحیە نە تۆ بەم بەسەرهاتەت ئەزانی‌و نە قەومەکەت. کەواتە لەژێر ئەرکی پێغەمبەرایەتی‌و ئامۆژگاری‌کردندا وەك نووح خۆگر بە، ئەنجامی سەرکەوتنی دنیاو سەرفرازیی قیامەت بۆ ئەوانەیە شەریك بۆ خودا بڕیارنادەن‌و، خۆیان لە گوناه ئەپارێزن.

(٥٠) بۆ قەومی عادیش هوودمان ڕەوانەکرد بە پێغەمبەری کە برایان بوو، لە خۆیان بوو. پێی وتن ئەی قەومینە! تەنها خودای تاك بپەرستن، خودایێکی ترتان نی‌یە بەڕاستی عیبادەتی بۆ بکرێ ئەو نەبێ. ئێوە کە بتەکان ئەپەرستن درۆنەکەن بەدەم خواوە و ئەو بتانە بۆ خودایی ناشێن.

(٥١) ئەی قەومینە! من بەرامبەر بەم ئامۆژگارییانە پاداشێ لە ئێوە داوا ناکەم، پاداشم لەسەر پەروەردگارێکە دروستی کردووم. ئایا ئێوە تێنافکرن و بیرتان ناخەنە کار؟.

(٥٢) ئەی قەومینە! داوای تاوان پۆشی لە خودای خۆتان بکەن‌و بە دڵ بگەڕێنەوە بۆ لای‌و واز لە گوناه بێنن. ئەگەر وابن خودا ئاسمان ئەخاتە کار بۆتان کە خێری زۆر بڕژێنێ بەسەرتاندا و زیاد لەم هێزەی هەتانە هێزی ترتان ئەداتێ. پشت لە خودا هەڵمەکەن بە تاوانباری.

(٥٣) ئەوانیش وتیان: ئەی هوود! تۆ هیچ دەلیل و بەڵگەیێکت بۆ ئێمە نەهێناوە لەسەر ڕاستیی ئەم داوایەت. ئێمە لەبەر قسەی تۆ واز لە خوداکانی خۆمان ناهێنین. ئێمە باوەڕ بە تۆ ناکەین و ئیمانت پێ ناهێنین.

إِن نَّقُولُ إِلَّا اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ ۗ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِ ۖ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا ۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَيْكُمْ ۚ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّي قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُ شَيْئًا ۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٥٧﴾ وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَاهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا رُسُلَهُ وَاتَّبَعُوا أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ وَأُتْبِعُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ ۗ أَلَا إِنَّ عَادًا كَفَرُوا رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ قَالُوا يَا صَالِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَا ۖ أَتَنْهَانَا أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾



(٥٤) ئێمە هەر ئەوەندە ئەڵێین کە هەندێ لە خوداکانمان لێت عاجز بوون و دەستیان لێ وەشاندوویت و شێت بوویی. ئەویش وتی: بەڕاستی من خودا ئەگرم بە شاهیدو ئێوەیش شاهید بن کە من بەریو بێبەشم لەو شەریکانەی ئێوە بۆ خوداتان داناون.

(٥٥) لەو شەریکانە کە غەیری خودان، دەسا چەند ئەتوانن هەوڵ بدەن و فێڵ بکەن بۆ فەوتاندنم و هیچ مۆڵەتم مەدەن.

(٥٦) بەڕاستی من پشتم بە میهرەبانیی خودا بەستووە کە خودای منو خودای ئێوەیە، ئیتر ئێوە بێ خواستی خودا ناتوانن زیانم لێ بدەن. هەرچی گیانلەبەرەو بەسەر زەویدا ئەڕوا خودا زاڵە بەسەریانداو بە ئارەزووی خۆی تەصەڕروفیان تیا ئەکات. خودای من لەسەر ڕێگاییێکی ڕاستەو دادپەروەرە.

(٥٧) جا ئەگەر ئێوە پشت هەڵکەن و بە گوێم نەکەن ئەوا من ئەو ڕاسپێرییەی پێم وتراوە پێتانی بگەیێنم پێم گەیاندن، ئیتر گوناه لە منەوە نییە. خودا توانایە و ئێوە لەناوئەباتو قەومێکی تر لە شوێنتان دائەنێو ئێوە بەم پشتهەڵکردنە ناتوانن هیچ زیانێ لە خودا بدەن. خودای من هیچی لێ ون نابێو ئاگاداریی ئەکات.

(٥٨) کە فەرمانمان هات بۆ سزادانیان هوودو ئەوانەی ئیمانیان هێنابوو لەگەڵیا بە میهرەبانیی خۆمان نەجاتمان دانو لە سزای سەخت ڕزگارمان کردن.

(٥٩) ئەوە قەومی عاد بوون ئینکاری ئایەتەکانی خودای خۆیان کردو، بەگوێی پێغەمبەرانی خودایان نەکرد و، دوای ئەموو ستەمکارێکی خاوەن عەناد کەوتن.

(٦٠) لەم دنیایەداو لە ڕۆژی قیامەتدا لەعنەت بە دوایانەوەیەو بەدەما ئەیانخاتە ناو سزاوە. بە ڕاستی قەومی عاد ئینکاری نیعمەتەکانی خودای خۆیان کردو ئیمانیان پێ نەهێنا. دووری لە ڕەحمەتی خوداو لەناوچوون بۆ عادی قەومی هوود بێ.

(٦١) هەروەها صالحمان بە پێغەمبەری نارد بۆ قەومی ثەموود، کە برایان بوو و لە خۆیان بوو. پێی وتن: ئەی قەومینە! خودا بپەرستن، خودای ڕاستەقینەتان نییە ئەو نەبێ، ئەو لە خاك دروستی کردوون و عومرو زیندەگانیی پێداون تیایا. تکای گوناهبەخشین هەر لەو بکەن و بۆ لای ئەو بگەڕێنەوە و، لە گوناهەکانتان پەشیمان بنەوە، بەڕاستی خودای پەروەردگاری من لە بەندەکانی خۆیەوە نزیکەو نزایان قبووڵ ئەکات.

(٦٢) وتیان: ئەی صالح! تۆ پێش ئەم قسانە جێگای هیوامان بوویو، بەتەمای ئەوە بووین ئەندامێکی چاك و بەکەڵك بی بۆمان! ئایا تۆ مەنعی ئەوەمان لێ ئەکەیت کە خودای باوك و باپیرانمان بپەرستین؟ ئێمە بە گومان و دوودڵییەوە سەیری قسەکانت ئەکەین کە بانگمان ئەکەیت بۆ پەرستنی تەنها خودایەك و وازهێنان لە پەرستنی بتەکان.

قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي مِنۡهُ رَحۡمَةٗ فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنۡ عَصَيۡتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيۡرَ تَخۡسِيرٖ ﴿٦٣﴾ وَيَٰقَوۡمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗۖ فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ﴿٧٠﴾ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾



(٦٣) صالح وتی: قەومینە! من کە خودا بەرچاوی ڕوون کردوومەتەوەو ڕەحمەتێکی وەکو پێغەمبەرایەتیی پێ داوم، ئەگەر بێتو بێگوێیی بکەم کێ یارمەتیم ئەداو لە سزای خودا دوورم ئەخاتەوە؟ ئێوە بێجگە لە زیان و ماڵوێرانی هیچیترم بۆ ناکەن و قازانجێکم پێ ناگەیێنن.

(٦٤) ئەی قەومینە! ئەمە کە خودا دروستی کردووە وشترێکە خودا کردوویە بە موعجیزەو نیشانەی ڕاستیی قسەم کە ئەڵێم من پێغەمبەری خودام. دە وازی لێ بێنن با لە ئەرزی خودادا بلەوەڕێو بژی. بە ئازارو کوشتن نزیکی مەکەونەوە، نەبادا سزایێکی بێمۆڵەت و نزیک بتانگرێ.

(٦٥) کەچی قەومەکەی بەگوێیان نەکردو وشترەکەیان پەی کرد، واتە بە زیندووی هەر چوارپەلیان بڕییەوە. ئەنجا صالح پێی وتن: لەناو خانوو و بەرەی خۆتاندا سێ ڕۆژ ڕابوێرن، دوای ئەو ماوەیە سزاتان بۆ دێت، ئەمە قسەو بەڵێنێکە درۆی تێدا نی‌یە.

(٦٦) کە سزاکەمان هات بە میهرەبانیی خۆمان صالحو ئەوانەی ئیمانیان هێنابوو لەگەڵیا ڕزگارمان کردن، هەروەها ڕزگارمان کردن لە سەرشۆڕیی ڕۆژی سزاکە، یا لە سەرشۆڕی ڕۆژی قیامەت. بێگومان هەر خودای پەروەردگارت بە هێزو خاوەن دەسەڵاتە.

(٦٧) ئەوانەیش کە ستەمکاربوون و باوەڕیان بە صالح نەکرد، بوومەلەرزەو بورکان گرتنیو هەر لە شوێنی خۆیاندا کپ بوونەوەو مردن.

(٦٨) ئەو کافرانە بەجۆرێ لەناوبران و شوێنەواریان نەما، ئەڵێی ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر لەوێشدا نەژیاون! بەڕاستی قەومی ثەموود ئیمانیان بە خودای خۆیان نەهێنا. دووری لە ڕەحمەتی خودا و لەناوچوون بۆ قەومی ثەموود بێ.

(٦٩) بەڕاستی فریشتە فروستادەکانی ئێمە بە موژدەوە سەریان لە ئیبراهیم داو سڵاویان لێ کردو ئەویش بە گەرمی وەڵامی دانەوەو، ئەوەندەی پێ نەچوو گوێرەکەیەکی برژاوی لە بەردەمیاندا دانا بیخۆن.

(٧٠) کە تەماشای کرد دەس بۆ خواردنەکە نابەن لێیان تەوسایەوەو ترسی لێ نیشت کە تووشی زیانێکی بکەن، ئەوانیش کە هەستیان بە ترسەکەی ئیبراهیم کرد پێیان وت: مەترسە ئێمە فریشتەین و بۆ سزادانی قەومی لووط نێرراوین. کە دەست بۆ خواردنەکە نابەین لەبەر هیچ نی‌یە ئەوە نەبێ کە فریشتەین و فریشتە خواردەمەنی ناخوات.

(٧١) ژنەکەی ئیبراهیم لەوەێ ڕاوەستابوو، کە ترسی نەماو زانیی فریشتەکان بۆ لەناوبردنی قەومی بەدکردار هاتوون لە خۆشییاندا پێکەنی، ئێمەیش مژدەمان پێ دا کە کوڕێکی ئەبێ ناوی ئیسحاق ئەبێ و، ئیسحاقیش کوڕێکی ئەبێ ناوی یەعقووب ئەبێ.

قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِى ضَيْفِىٓ ۖ أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ ﴿٧٨﴾ قَالُوا۟ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِى بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ قَالَ لَوْ أَنَّ لِى بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾ قَالُوا۟ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓا۟ إِلَيْكَ ۖ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ ۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمْ ۚ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ ۚ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴿٨١﴾



(٧٢) وتی: هاوار به ماڵم! من چۆن منداڵم ئەبێ کە پیرەژنێکم و ئەمەیش مێردەکەمە پیرە پیاوێکە؟ ئەمە شتێکی سەیرە!

(٧٣) وتیان ئایا سەرت لە کاری خودای دەسەڵاتدار سوورئەمێنێ؟ میهرەبانیی خوداو بەرەکەتی لەسەر ئێوە بێ ئەی خێزانی پێغەمبەرایەتی و شوێنی وەحیی خودایی! خودا هەموو کردەوەکانی جوانو تەعریف کراون و، خاوەنی چاکە و کەرەمە.

(٧٤) جا کە ترس و بیم لە دڵی ئیبراهیم دەرچوو و ئەو مژدە خۆشەی بیست و لە حاڵی فریشتەکان حاڵی بوو دەستی کرد بە قسە کردن لەگەڵمان بۆ ڕزگارکردنی قەومی لووط.

(٧٥) ئیبراهیم ئینسانێکی دڵنەرم و ساغ و بۆ لای خودا گەڕاوەیە.

(٧٦) جا وەحیمان کرد بۆ ئیبراهیم و پێمان وت: ئەی ئیبراهیم وازبێنە لە تکاکردن بۆ قەومی لووط، چونکە فەرمانی خودا هاتووە بۆ سزادانیان و ئەوانە سزاییێکی وەهایان دێتە سەر کە هەرگیز ناگەڕێتەوە.

(٧٧) کە فروستادەکانمان هاتن بۆ لای لووط بە هاتنەکەیان دلگران بوو و سینگی تەنگ و دنیای لێ‌هاتە یەك چونکە [فر]وستادەکان لە شێوەی چەند غوڵامێکدا هاتن، ئەویش لەوە ئەترسا قەومەکەی بێن و نیازی خراپیان ببێ دەربارەی [م]یوانەکانی و ئابڕووی بەرنو، وتی: بەڕاستی ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی سەختە بۆ من.

(٧٨) کە قەومەکەی لووط بە هاتنی میوانەکانیان زانی بە ڕاکردن چوون بۆ ماڵی لووط بە نیازی خراپەکردن، کە [ئە]وان پێش ئەو کاتەیش فێری ئەو خووە خراپە بووبوون و لەگەڵی ڕاهاتبوون. لووط پێی وتن: ئەوە کچەکانم [ل]ەخۆتانیان مارەبکەن، ئەوان چاکتر و پاکترن بۆتان. لە خودا بترسن و شەرمەزاری میوانەکانم مەکەن. ئەوە ئێوە [پی]اوێکی بەغیرەتتان تێدا نی‌یە.

(٧٩) ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان: تۆ ئەزانی ئێمە پێویستمان بە کچەکانی تۆ نی‌یە، بەڕاستی تۆ زۆرباش ئەزانی ئێمە [چ]یمان ئەوێ ؟!

(٨٠) جا حەزرەتی لووط بە ئەسەفەوە فەرمووی: ئاخ هێزم ئەبوو بەسەرتاندا یاخۆ پەنایێکی بە قووەتم ئەبوو پەنام [ب]ردایەتەبەرو یارمەتی بدامایە.

(٨١) جا فریشتەکان هاتنە جواب و وتیان: ئەی لووط! ئێمە فروستادەی خودای تۆین، هەرگیز ئەم کافرانە ناگەنە [ت]ۆو دەستیان بەسەر میوانی تۆدا ناڕوات. دە تۆ بە شەو ئەهل و خێزانەکەت هەڵگرە و بیانبەرە دەرەوە و، با کەس [ئ]ەلاتەکاتەوە بۆ دواوە نەبادا تووش ببێ، ئیللا ژنەکەت نەبێ، ئەو لەگەڵ خۆتان مەبە، بەڕاستی ئەو سزایەی تووشی قەومەکە ئەبێ تووشی ئەویش ئەبێ. بەڕاستی وادەی هاتنی سزاکە سبەینێ یە، ئایا سبەینێ نزیك نی‌یە ؟

فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾ ۞ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ۚ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِيٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُا۟ ۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾



(٨٢) كه فەرمانمان هات بۆ سزادانیان شوێنەكەمان سەرەوژێر كرد و كاولمان كرد بەیەكاو بەردەبارانمان كردن بە بەردێ لە جۆری قوڕی بەبەردبوو كە بەتایبەتی یەك لە دوای یەك ڕیزكرابوون بۆ سزادانیان.

(٨٣) بەردەكە لەلایەن خوداوە نیشانەكراوو دیاری بوو. بێگومان سزا و كاول كردن و بەردەبارانی وەها لە ستەمكارانەوە دوور نییە. ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان كرد و كافرو بەدكرداربوون و شایانی ئەو سزایە بوون.

(٨٤) شوعەیبمان نارد بۆ سەر ئەهلی مەدیەن بە پێغەمبەری، كە برایان بوو و لە خۆیان بوو، پێی وتن: ئەی قەومینە! تەنها خودای پەروەردگار بپەرستن، ئێوە بێجگە ئەو خودایێكی ڕاستەقینەتان نییە. لە كاتی مامەڵەدا لە پێوانەو كێشانەدا حەقی خەڵكی كەم مەكەنەوەو عادلانە پێوانەو كێشانە بكەن. من ئێوە ئەبینم خاوەن دارایین و لە خۆشیدا ئەژین و لە نازو نیعمەتی خودادان و پێویستیتان بەوە نییە غەش لە خەڵك بكەن. ئەترسم تووشی سزایێكی گەورە بن كەستانی لێ دەرنەچێ.

(٨٥) ئەی قەومینە پێوانە و كێشانە بەتەواوی بكەن، بە عەدالەت جێ بەجێی بكەن، ماڵی خەڵكی كەم مەكەن و
لە ڕووی زەویدا دەست مەكەن بە بەدكاری.

(٨٦) ئەوەی خودا بۆتانی بهێڵێتەوە لە دارایی دنیا، یا ئەوەی بۆ دوارۆژتان بمێنێتەوە لە كردەوەی باش، بۆ ئێوە زۆر
باشترە لە ماڵ و سامانی حەرام ئەگەر خاوەن ئیمان بن و منیش نیگابان و پارێزگاری ئێوە نیم.

(٨٧) ئەوانیش وتیان: ئەی شوعەیب! ئەوە نوێژەكەت ئەمرت پێ ئەكات بە ئێمە بڵێیت واز لەو بتانە بهێنین كە باو
و باپیرمان پەرستوویانن و، بە نارەزووی خۆمان تەصەڕروف لە ماڵ و موڵكی خۆماندا نەكەین؟ خۆ تۆ وا مەشهوور
پیاوێكی وشیار و كردەوە باشی!

(٨٨) شوعەیب وتی: ئەی قەومەكەم! ئەگەر من لای خوداوە زانیاریو پێغەمبەرایەتیم پێ درابێو ڕزقو ڕۆزیی جوان
حەڵاڵی پێ بەخشیبم، هێشتا هەر بێ گوێیی بكەم؟ ئەوەی پێتان ئەڵێم مەیكەن خۆیشم نایكەم، من بەم ئەمر بە
چاكەو نەهی لە خراپەیە هیچم مەبەست نییە ئەوە نەبێ بە قەدەر توانم چاكە لەگەڵ ئێوە بكەم و بتانخەمە سەر ڕێی
ڕاست و لە سزا دوورتان بخەمەوە. من كەس تەوفیقم نادا خودا نەبێ، تەنها پشت بەو ئەبەستم و بۆ لای ئەو
ئەگەڕێمەوە.

وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ﴿٨٩﴾ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ لَرَجَمۡنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَهۡطِيٓ أَعَزُّ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٩٢﴾ وَيَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَٰمِلٞۖ سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞۖ وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ فِرۡعَوۡنَۖ وَمَآ أَمۡرُ فِرۡعَوۡنَ بِرَشِيدٖ ﴿٩٧﴾



(٨٩) ئەی قەومەکەم! با دوژمنایەتیتان لەگەڵ من واتان لێ نەکات تووشی بەڵای وەك بەڵاکانی قەومی نووح و هوود و صالح بن، واتە: غەرق بوون و زریان و بوومەلەرزە. خۆ ئەگەر لە دوورەکان پەند وەرناگرن ئەوا بەسەرهاتی قەومی لووط نە شوێن و نە کاتی لە ئێوە دوور نییە، دە پەندی لێ وەربگرن.

(٩٠) داوای عەفوی گوناه لە خودا بکەن و، بەدڵ بگەڕێنەوە بۆ لای خودا، خودای من میهرەبان و بەبەزەییە.

(٩١) جا قەومەکەی شوعەیب وتیان: ئەی شوعەیب! ئێمە لەگەڵێ لە قسەکانی تۆ حاڵی نابین و، ئێمە تۆ بە لاوازو بێهێز ئەزانین لەناو خۆماندا. ئەگەر لەبەر کۆمەڵەکەت نەبوایە ئێمە بەردەبارانمان ئەکردی، تۆ لە لای ئێمە ئەوەندە بە دەستەڵات نیت نەتوانین زەفەرت پێ بەرین.

(٩٢) شوعەیب وتی: ئەی قەومەکەم! ئایا کۆمەڵەکەی من لای ئێوە لە خودا عەزیزترن، وا ئێوە گوێ بە فەرمانی خودا نادەن، بەڵام لەبەرخاتری کۆمەڵەکەم دەستدرێژی ناکەنە سەرم ؟! خوداتان فەرامۆش کردووە و موبالاتی پێ ناکەن! خودا ئاگای لەهەموو کردەوەکانتانەو بەپێی کردەوە پاداشتان ئەداتەوە.

(٩٣) ئەی قەومەکەم! ئێوە چی ئەکەن بیکەن بە پێی تاقەت و توانای خۆتان و منیش کاری خۆم ئەکەم ؛ لەمەوپاش حاڵی ئەبن و بۆتان دەرئەکەوێ کێ سزایێکی وەهای بۆ دێت سەرشۆڕی بکات و کێ درۆزنە؟ چاوەڕوان بن منیش لەگەڵ ئێوە چاوەڕوانم.

(٩٤) کە فەرمانی عەزابمان هات شوعەیب و ئەوانەمان ڕزگارکردن کە ئیمانیان هێنابوو لەگەڵیا. ئەوانەیش کە ستەمکارو کافربوون جیبرەئیلی ئەمین هاواری کرد بەسەریانداو بە ئێجگاری لەناوی بردن و، لە شوێنی خۆیاندا مردن.

(٩٥) بەجۆرێ لەناوچوون و شوێنەواریان نەما ئەڵێی ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر لەوێیشدا نەژیاون و ڕایاننەبواردووە. دووریی لە ڕەحمەتی خودا بۆ ئەهلی مەدیەن، هەروەك قەومی ثەموود لە ڕەحمەتی خودا دوور کەوتنەوە. جێگای هەردووکیان ناخی دۆزەخ بێ.

(٩٦) بەڕاستی ئێمە مووسای کوڕی عیمرانمان بە ئایەت و موعجیزەی ئاشکراوە بە پێغەمبەری نارد.

(٩٧) بۆ سەر فیرعەون و دەستە و بەستەکەی، ئەوانە دوای قسەی مووسا نەکەوتن و ئیمانیان پێ نەهێنا، بەڵکو دوای فەرمانی فیرعەونی گومڕا کەوتن. بێگومان ڕێگای فیرعەون ڕاست و ڕەوان نەبوو بەڵکو ڕێگایەکی چەوت و چەوێڵ بوو.

يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَـٰذِهِۦ لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ بِئْسَ ٱلرِّفْدُ ٱلْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَـٰهُمْ وَلَـٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَـٰلِمَةٌ ۚ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَـٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۖ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾



(٩٨) له ڕۆژی قیامەتدا ئەکەوێتە پێش قەومەکەی و ئەیانبات بۆ ئاگری دۆزەخ کە پیسترین شوێنە خەڵکی بېرێتە سەر.

(٩٩) لەم دنیایەدا لەعنەتیان بەدوادا نێرراو لە ڕۆژی قیامەتیشدا. خراپ بەش و بەهرەییێکە پێیان دراوە.

(١٠٠) ئەمە لە بەسەرهات و دەنگوباسی دێهاتەکان بوو بۆمان گێڕایتەوە. لەو دێهاتانە هی وایان هەیە ماوەو بەپێوەیەو هی وایشیان هەیە وەك دەغڵودانی دروێنەکراو هەر شوێنەواری ماوە!

(١٠١) ئێمە ستەممان لەوان نەکرد، ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد. لە کاتێکدا کە فەرمانی سزادانیان هات ئەو خودایانەی بانگیان ئەکردن، بێجگە خودا، سوودی هیچیان نەبوو بۆیان و فریایان نەکەوتن و هیچیان بۆ زیاد نەکردن لەناوچوون و ماڵوێرانی نەبێ.

(١٠٢) خودا کە غەزەب لە دێهاتە ستەمکارەکان ئەگرێ ئاوەها غەزەبیان لێ ئەگرێ و لەناویان ئەبات. بەڕاستی غەزەبی خودا ئازاردارو سەختەو ڕزگاربوون لێی مەحاڵە.

(١٠٣) بێگومان لە فەوتانو سزادانی ئەتەوە پێشووەکاندا پەندو عیبرەت هەیە بۆ کەسێ لە سزای ڕۆژی دوایی بترسێ. ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکی سامناکە هەموو بنیادەمێکی تێدا کۆئەکرێتەوە و، ڕۆژێکە هەموو ئەهلی ئاسمان و زەویی تێدا ئەبینرێن.

(١٠٤) ئێمە ئەو ڕۆژە دواناخەین بۆ ماوەییێکی دیاری نەبێ، جا کە وادەکە تەواو بوو ئەو ڕۆژە دێتە دی.

(١٠٥) کە ئاکامەکە تەواو بوو و ڕۆژی قیامەت هات کەس ناتوانێ قسە بکات بە ئیزنی خودا نەبێ، جا لەو سات سامناکەدا هەندێ کەس ئەهلی شەقاوەتن و، هەندێکیش ئەهلی سەعادەت.

(١٠٦) جا ئەوانەی بەدبەختن وان لە ناو ئاگری دۆزەخدا و لەوێدا هەناسە وەردەگرن و هەناسە دەرئەکەن.

(١٠٧) لەو ئاگرەدا بەردەوام ئەمێننەوە تا ئاسمان و ئەرز مابێ، ئیللا کاتێ کە خودا مەیلی لە دەرکردنیان هەبێ خودای بەدەستەڵات چی بوێ ئەیکات.

(١٠٨) ئەوانەیش کە بەختەوەرن بەردەوام لە بەهەشتدان و هەتا هەتایە تیایا ئەمێننەوە و تا ئاسمان و ئەرز مابێ مەگەر کاتێ کە خودا بییەوێ دەربچن و شوێنی تر ببینن. ئەمە بەهرە و بەخششێکە لە خوداوە هەرگیز نابڕێ.

فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُ ۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا۟ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُو۟لُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَآ أُتْرِفُوا۟ فِيهِ وَكَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾



(١٠٩) کە مادام ئەم هەمووە دەنگوباس و بەسەرهاتی خەڵکی لەوەپێشەت زانی ئیتر گومانت نەبێ لە بەدیو هیچ و پووچیی ئەو شتانەی کافرەکان ئەیانپەرستن. عیبادەتی ئەم کافرانە تەنها وەکو عیبادەتی باو باپیرانیانە لەمەوپێش. عیبادەتی ئەوان نارەوابوو بە پاداشی خۆیان گەیشتن، هیی ئەمانیش هەروەهایە. ئێمە بەبێ کەموکووڕی پاداشی کردەوەی ئەم کافرانە ئەدەینەوە.

(١١٠) لەمەوپێش کیتابمان دا بە مووسا، واتە: تەورات. جا قەومەکەی دەربارەی ئەو کیتابە ئیختیلاف کەوتە بەینیان، هەندێکیان ئەیانوت لە لای خوداوە هاتووەو ئیمانیان پێ هێنا، هەندێکیشیان ئەیانوت: قسەی مووسا خۆیەتیو هی خودا نی‌یەو باوەڕیان پێ نەکرد، کە واتە تۆ گوێ مەدەرە ئیختیلافی قەومەکەت دەربارەی قورئان. ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە خودا زوو بڕیاری داوە تۆڵەو پاداش دوابخرێ بۆ ڕۆژی خۆی گورج حوکم ئەکرا لە بەینیانداو پاك‌و پیس جیا ئەکرایەوەو، هەرکەس بە ئەنجامی کاری خۆی ئەگەیشت. بەڕاستی قەومەکەت دەربارەی قورئان دوودڵ‌و بێ‌باوەڕن.

(١١١) بەڕاستی هەموو لایێک چ [...]سوڵمان چ کافر جەزایان ئەدرێتەوە و پاداشی کردەوەیان پێ ئەدرێ. خودا لە هەموو کردەوەی ئەوان ئاگادارەو [...]یچی لێ ون نابێ.

(١١٢) تۆ بەردەوام بە لەسەر ئەو یاساو ڕێو شوێنەی فەرمانت پێ دراوە لەگەڵ ئەوانەی گەڕاونەتەوە بۆ لای خودا [...]. توغیان مەکەن و لە سنووری دەستووری خودا لامەدەن. بەڕاستی ئێوە هەرچی ئەکەن خودا ئەیبینێ و لێی [...]ڕێتەوە. (١١٣) هیچ جۆرە مەیلێ مەکەن لەگەڵ ئەو کافرانە کە ستەم لە خۆیشیان و لە خەڵکیش ئەکەن و لە [...]رمانی خودا لائەدەن، ئەگینا ئاگری دۆزەخ لێتان ئەکەوێو ئێوەیش ئەگرێتەوەو، لەو کاتەیشدا بێجگە خودا [...]ستان نابێ لە سزا ڕزگارتان بکات و پاشانیش یارمەتی نادرێن.

(١١٤) نوێژەکانت ڕاگرە و جێ بەجێیان بکە لە دوو لای ڕۆژدا، واتە کاتی بەیان کە نوێژی سبەینانە و پاش زەوال کە [...] نیوەڕۆ و عەصرە، هەروەها لە چەند کاتێکدا کە نزیکی ڕۆژن وەك نوێژی مەغریب و عیشا. بە ڕاستی کردەوە [...]کەکان چ نوێژ و چ غەیری نوێژ گوناهە بچووکەکان لائەبەن. ئەم وتارە یادئاوەریی عیبادەتە بۆ ئەوانەی یادی خودا [...]ئەکەن. (١١٥) خۆت بگرە لەسەر زەحمەتی عیبادەت، خۆت بگرە لەسەر تەرکی گوناه. بەڕاستی خودا پاداشی [...]چاکەکاران بەفیڕۆ نادات.

(١١٦) ئەوە بۆ لە ئەهلی چەرخە پێشووەکان کۆمەڵێ نەبوو خاوەن کردەوە و بیروباوەڕی باش بن تا مەنعی خەڵك [...] لە خراپەکردن لە زەویدا، مەگەر کەمێ نەبێ لەوانەی ڕزگارمان کردن لە خۆشەویستیی دنیا؟ ستەمکارەکان [...] شوێنی ئەو ڕابواردنانە کە لەزەتیان لێ وەرگرتن و تاوانباربوون.

(١١٧) خودای تۆ هەرگیز لەوانە نەبوە بە ستەم و ناڕەوایی ئاوەدانییەکان کاول بکات کە ئەهلەکانیان خاوەنی [...]داری باش بووبن.

وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَانتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾

## سُورَةُ يُوسُفَ

ترتيبها ١٢ — آياتها ١١١

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَٰذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ ﴿٣﴾ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ ﴿٤﴾



(١١٨) ئەگەر خودای تۆ مەیلی ببوایە بەرەی بنیادەمی هەموو ئەکردە یەك ئوممەت و هەموو موسولمان ئەبوون. ئەم بەرەی بنیادەمە بەردەوام ناجۆرو لەیەك جیان، هەندێکیان ئیماندارو هەندێکیان بێئیمانن.

(١١٩) ئەوانە نەبێ کە خودا هیدایەتی داون و ئیمانیان هێناوە لەناو خۆیاندا یەکن‌و جیاوازییان نی‌یە. ئەنجامی دروست کردنەکەیان ئەوەبوو هەندێ خاوەن ئیمان‌و هەندێ بێ ئیمان بن. قسەی خودات بڕاوەتەوەو لە عیلمیدا تێپەڕیوە: نەبێ دۆزەخ لە بنیادەمیش و لە جینئییش پڕ بکەم.

(١٢٠) هەموو جۆرە دەنگوباسێکی پێغەمبەرانت بۆ ئەگێڕینەوە کە ببێتە هۆی دامەزرانی دڵت و بەردەوامیت لەسەر گەیاندنی پەیامەکەت و بەرگەگرتنی ئازاری کافران. لەم سوورەتەداو لەم دەنگوباسانەدا شتی ڕاست و بێ گەردت بۆ هاتووە و ئامۆژگاری و یادئاوەرییە بۆ ئەوانەی خاوەن ئیمانن.

(١٢١) تۆ بڵێ بەوانەی ئیمان ناهێنن: ئێوە لەسەر حاڵی خۆتان کاربکەن، ئێمەیش لەسەر حاڵی خۆمان کارئەکەین.

(١٢٢) ئێوە چاوەڕوانی بکەن، ئێمەیش چاوەڕوانین تا بزانین ئەنجامی کاری هەردوولامان چۆنەو چۆن ئەبێ.

(١٢٣) هەر خودایە پەنامەکییەکانی ئاسمان و زەوی ئەزانێ و هەموو شتێ بۆ لای ئەو ئەگەڕێتەوە و، سەرەنجامی لای ئەوە. هەر ئەو بپەرستە، پشت هەر بەو ببەستە. خودا بێ ئاگاو بێ خەبەر نی‌یە لە هەرکارێ کە ئەیکەن و، پاداشی هەمووتان لەکاتی خۆیدا پێ‌ئەگات.

## سوورەتی (یُوسُف)

**مەککەیی‌یە ئایەتەکانی ١ و ٢ و ٣ و ٧ی نەبێ و (١١١)ئایەتە.**

(١) (الـر): خودا خۆی ئەزانێ مەبەستی پێی چییە. ئایەتەکانی ئەم سوورەتە چەند ئایەتێکن مەعناکەی دیارییەو، ئاشکرایە کە موعجیزەن.

(٢) بەڕاستی ئێمە ئەو کتێبەمان نازڵ کردووە کە قورئانێکە بە زوبانی عەرەبی تا ئێوە لێی تێ بگەن و بیزانن.

(٣) ئێمە بە وەحی‌کردنی ئەم سوورەتە لە قورئان جوانترین و شیرینترین چیرۆکت بۆ ئەگێڕینەوە، ئەگەرچی تۆ لەپێش ئەم وەحیەدا ئاگات لەم چیرۆکە نەبوەو بە خەیاڵتدا نەهاتووە.

(٤) باسی ئەوە بکە کە یووسف بە یەعقووبی باوکی وت: بابە من یازدە ئەستێرەم لە خەودا چاوپێ کەوت لەگەڵ خۆرو مانگدا، چاوم پێ کەوتن سوجدەیان بۆ ئەبردم.

قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٦﴾ ۞ لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخۡوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٞ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿٧﴾ إِذۡ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ لَئِنۡ أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾



(٥) یەعقووبیش لە وەڵامدا وتی: کوڕە بچکۆلانەکەم! ئەم خەوەت بۆ براکانت مەگێڕەوە، نەبادا مەعنای خەوەکت بزانن و بەخیلیت پێ ببەن و، فێڵێکت لەگەڵ بکەن کە زیانت پێ بگەیێنن. بێگومان شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئینسان و لەوانەیە وەسوەسە بخاتە دڵی براکانتەوە و دەستت لێ بوەشێنن.

(٦) ئا وەها خودا هەڵتئەبژێرێت و مەعنای قسە گرانەکانی کتێبەکانی خۆیو قسەی حەکیمان و خەوبینین و شتی ترت فێرئەکات و نیعمەتی خۆیت بۆ تەواو ئەکات، هەم پێغەمبەریو هەم موڵكو داراییو دەستەڵات بۆ تۆو بۆ ئالی یەعقووب، هەروەك نیعمەتی گەورەی پێغەمبەرایەتیو جێگەو ڕێگەی پێش تۆ بۆ ئیبراهیمو ئیسحاقی باپیرت، تەواوکرد. بەڕاستی خودای پەروەردگاری تۆ زانایە و کارەکانی پڕ حیکمەتن.

(٧) بەڕاستی لە بەسەرهاتی یووسف و براکانیدا چەند ئایەت و بەڵگەیێك هەیە دەلالەت لە دەستەڵات و حیکمەتی کارەکانی خودا ئەکەن بۆ ئەوانەی لەم بەسەرهاتە ئەپرسن.

(٨) کە براکانی یووسف لەناو خۆیاندا وتیان: یووسف و بە بنیامینی برای لە ئێمە خۆشەویستترن لای باوکمان، کەچی ئێمە کۆمەڵێکین هەموو کارێکمان بۆ ئەکرێ، بەڵام ئەوان منداڵ و بێهێزن. بەڕاستی باوکمان لەم بابەتەوە لە گومڕاهییەکی ئاشکرادایە.

(٩) دە یووسف بکوژن یا فڕێی دەنە شوێنێکی دوور لە ئاوەدانییەوە، ئەو وەختە بەرچاوی باوکتان بۆ ئێوە خاڵی ئەبێت و هەر ئێوەی خۆش ئەوێ. ئیتر پاش ئەوەی لە کاری یووسف بوونەوە، ببنە کۆمەڵێکی کردار چاك و لەگەڵ باوکتان باش و بە خزمەت بن.

(١٠) یەکێکیان وتی: ئەگەر بەگوێم ئەکەن و، ئەتانەوێ لە بەرچاوی باوکی دوور بخەنەوە، لە دەستتان دێ، مەیکوژن، کوشتن گوناهێکی گەورەیە، فڕێی دەنە قووڵاییی بیرێکەوە بەڵکو ڕێبوارگەلێ بیدۆزنەوەو هەڵیگرن و بیبەن بۆ خۆیان.

(١١) جا لەسەر ئەم مەبەستە بڕیاریان داو ڕۆیشتن بۆ لای یەعقووبی باوکیان و پێیان وت: بابە! ئەوە بۆچی سەبارەت بە یووسف لە ئێمە ئەمین نیت و نایدەیتە دەستمان لەگەڵ خۆماندا بیبەینە دەشتودەر، کە ئێمە برای دڵسۆزی ئەوین؟!.

(١٢) سبەینێ بینێرە لەگەڵماندا ڕابوێرێ و میوە بخوات و یاری بکات، ئێمە بە هەموومان پارێزگاری لێ ئەکەین.

(١٣) یەعقووب وتی: پێم ناخۆشە بیبەن و خەفەتی پێ ئەخۆم ؛ ئەترسم گورگ بیخوات و ئێوە ئاگاتان لێی نەبێت.

(١٤) وتیان: قەسەم بە خودا ئەگەر بێتو گورگ بیخوات، کە ئێمە کۆمەڵێکین، ئەوە مەعنای وایە ئێمە ماڵوێران و زۆر بەخەسارین.

فَلَمَّا ذَهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓا۟ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ ۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا۟ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ ۖ قَالَ يَٰبُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٌ ۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾



(١٥) جا کە ئیزنیان لە باوکیان وەرگرت یووسفیان لەگەڵ خۆیان بردو، هەموو بڕیاریان دا بیخەنە قووڵاییی بیرەکەوە و، خستیشیانە ناوی، لەو کاتەدا ئیلهاممان کرد بۆ یووسف و خستمانە دڵیەوە کە خەم مەخۆ تۆ ڕزگار ئەبیت و ڕۆژێ دێت تۆ بەم برایانە ئەڵێیت کەچییان بە تۆ کردو، لەوکاتەدا لەبەر پایەبەرزی تۆو لەبەر دووریی ماوەی تاوانەکەیان نازانن تۆ یووسفی.

(١٦) ئێوارە بە گریانەوە هاتنەوە بۆ لای باوکیان.

(١٧) کە باوکیان لێی پرسین: بۆ ئەگرین؟ کوا یووسف؟ وتیان: بابە: ئێمە ڕۆیشتین پێشبڕکێمان ئەکردو، یووسفمان بە لای جل و شتومەکەکانمانەوە دانا، تا هاتینەوە گورگ خواردبووی، بەڵام تۆ باوەڕ بە ئێمە ناکەی با ئێمە ڕاستگۆیش بین.

(١٨) کراسەکەیشیان هێنا بۆ باوکیان کە بەخوێنێکی درۆینە خوێناوییان کردبوو. کە یەعقووب تەماشای کرد وتی: ئەم خوێنە خوێنی ئینسانێکی گورگ خواردوو نی‌یە، نیشانەی ددانی گورگی پێوە نی‌یەو، نەفسی ئێوە کارێکی خراپی لا جوان کردوون، من چارەم نی‌یە خۆگرییەکی چاك نەبێ کە شکات لای خودا نەبێ لای کەس نەکە
هەر خودا داوای یارمەتیی لێ ئەکرێ بۆ خۆڕاگرتن بەرامبەر بەم کارەساتە کە ئێوە باسی ئەکەن.

(١٩) ئەوەندەی پێ نەچوو کاروانێ کە لە مەدیەنەوە بەرەو میسر ئەچوو لەو نزیکانە لایداو ئاوکێشیان نارد ئاوی
لە بیرەکە بۆ هەڵگۆزێ، ئەویش کە دۆڵچەکەی داهێشت و دۆڵچە گەیشتە بنی بیرەکە یووسف خۆی بە پەت
دۆڵچەکەوە شۆڕکردەوەو سەرکەوت، کە ئاوکێشەکە دیی وتی: مژدە بێ ئەمە غولامێکی جوان و شیرینە، ئیتر لە
خۆیاندا کارەکەیان شاردەوە و نەیانوت لەبیر دەرمان هێناوە و، کردیانەماڵی بازرگانی بۆ فرۆشتن. خودایش ئەزانی
چییان کرد.

(٢٠) هەروەها بە نرخێکی کەم فرۆشتیان، بە چەند درهەمێ، جا چونکە دۆزیبوویانەوە مەبەستیان نەبوو بە هەرچە
بیفرۆشن.

(٢١) ئەو پیاوە میسرییە کە یووسفی کڕی کە عەزیزی میسربوو، بە ژنەکەیی وت: خزمەتی ئەم کوڕە بکە و قەدر
بگرە؛ هیوام وایە لە بارەگادا بەکەڵکمان بێت و سوودمان پێ بگەیەنێ، یا هەر بیکەین بە کوڕی خۆمان. ئا بە
جۆرە جێگە و ڕێگەمان لە ئەرزدا بۆ یووسف خۆش کردو، ماوەیێکی باشمان بۆ ڕەخساند تا فێری مەعنای قس
وردو خەولێکدانەوەی بکەین. بەڕاستی خودا بەسەر کاری خۆیدا زاڵەو مەبەستی خۆی جێبەجێ ئەکات، بەڵام بەش
زۆری خەڵك ئەم ڕاستییە نازانن.

(٢٢) جا کە یووسف گەورە بوو پێگەیشت، هێزی بەجێهێنانی حوکم و دادپەروەریمان پێ دا لەگەڵ زانست
زیرەکیدا. ئێمە ئاوەها پاداشی چاکەکاران ئەدەینەوە.

وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾ وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٣٠﴾



(٢٣) ئەو ژنە کە یووسف لەماڵیا بوو، دڵداریی بە یووسف ئەفرۆشت و ئەیویست ڕامی بکات بۆ مەبەستی خۆی و کاری ناشەرعیی لەگەڵ بکات و بۆ ئەم مەبەستە دەرگاکانی لێ داخست و پێی وت: وەرە دەستوبرد کە! یووسفیش وتی: پەنا بە خوا لەم کارە ناهەموارە! بەڕاستی من ئاغام داڵدەی داوم و حورمەتی گرتووم، نابێ خیانەتی لێ بکەم. بێگومان ستەمکاران هەرگیز سەرناکەون و ڕزگار نابن .

(٢٤) بەڕاستی ژنەکە ویستی ئارەزووی خۆی لەگەڵ یووسف جێبەجێ بکات و، یووسفیش ویستی، ئەگەر دەلیلی لای خودای خۆیەوە نەدیبایە کە زینا کارێکی نارەواو گوناهێکی گەورەیە.

(هەندێك لە ئەهلی تەفسیر ئەڵێن: لەو کاتەدا جیبریلی لێ پەیدابووە. هەندێکیش ئەڵێن جیبریل چووەتە شێوەی یەعقووبەوە و ڕووبەڕووی وەستاوەو پەنجەی لێ گەزتووە، واتە: نەکەی! هەندێکیش ئەڵێن لەو کاتەدا بانگی لێ کراوە کە: تۆ ئەی یووسف لە زومرەی پێغەمبەراندا نووسراوی، کەچی ئەتەوێ کاری ناشایستە بکەیت ؟!. هەرچۆن بێ خودا لەو تەنگو چەڵەمەیە ...ی کردو تووشی گوناہ نەبوو ). ئاوەها لەسەر چاکە دامانمەزراند تا خراپەو زینای لێ لادەین. بەڕاستی یووسف ...ێکە لە بەندە خالیصەکانی ئێمە کە بۆ عیبادەت و خوداپەرستی هەڵبژێرراون.

(٢٥) پێشبڕکێیان کرد بەرەو دەرگاو ژنەکە کراسەکەی یووسفی لەپشتەوە دادڕی و، لەو کاتەدا لای دەرگاکەدا ...دوفی عەزیزیان کرد، ژنەکە بە عەزیزی وت: کەسێ نیازی خراپەی لەگەڵ خێزانی تۆ ببێ پاداشی چییە لە حەپس ... یا سزایێکی پڕ ئازار، بەولاوە ؟

(٢٦) یووسف بۆ دیفاع لە خۆی وتی: ئەو ویستی دڵداریم لەگەڵ بکا و ڕامکێشێ بۆ ئارەزووی خۆی. لەوێدا شاهیدێ ... خزمانی ژنەکە کە منالێکی بەربێشکە بوو شایەتییداو وتی: ئەگەر کراسەکەی یووسف لە پێشەوە دڕابوو ئەوا ...ژنەکە ڕاست ئەکات و ئەو درۆزنە.

(٢٧) خۆ ئەگەر کراسەکەی یووسف لە دواوە دڕابوو ئەوا ژنەکە درۆئەکات و یووسف ڕاستگۆیە.

(٢٨) جا کە عەزیز کراسەکەی یووسفی دی لەدواوە دڕابوو تێگەیشت و بە ژنەکەی وت: ئەمە لە فڕوفێڵی ئێوەیە، ...بەڕاستی فڕوفێڵی ئێوە گەورەیە.

(٢٩) عەزیز بە یووسفی وت: ئەی یووسف تۆ لەم قسەیە گەڕێ و لای کەس باسی مەکە، هەروەها بە ژنەکەیشی ...وت: داوای بەخشینی تاوانەکەت لە خودا بکە، بەڕاستی دەرکەوت تۆ خەتاباری.

(٣٠) کۆمەڵێ ژن لە میسر کە باسی ئەم ڕووداوەیان بیست سەرزەنشتی ژنەکەی عەزیزیان ئەکرد و ئەیانوت: سەیرە ...ی عەزیز دڵی لە خزمەتکارەکەی خۆی چووە! ئەیەوێ لەگەڵی جووت ببێ! لە ناخی دڵەوە خۆشی ئەوێ! ئێمە وا ...ئەزانین ئەم ژنە گومڕابووە و لە ڕێگای ڕاست لای داوە.

فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْءَايَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٣٥﴾ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَعْصِرُ خَمْرًا وَقَالَ ٱلْءَاخَرُ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِى خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾



(٣١) کە ژنی عەزیز بە مەکری ژنەکانی زانی ناردی بە دوایانداو جێگای دانیشتن و پاڵپشتی بۆ ئامادەکردن و هەر یەکی چەقۆیەکی دایە دەستیان. ئەنجا بە یووسفی وت: دەرچۆ بۆ لایان. کە ژنەکان دییان زۆر لە بەرچاویان گەورەو نایاب بوو، لە جوانیو شۆخیی ئەو سەرسام بوونو، ئاگایان لە خۆیان نەماو هەموو دەستی خۆیان برینداركردو، وتیان: حاشا وەکەللا ئەمە بنیادەم نییە ئەمە فریشتەییێکی پایەبڵند نەبێ هیچی تر نییە.

(٣٢) جا ژنەکەی عەزیز پێی وتن: ئەمە ئەو غولامە کەنعانییەیە ئێوە سەرزەنشتی منتان کرد لەسەر خۆشویستن و دڵداری پێ فرۆشتنی، بە ڕاستی من تێکۆشیم بۆ ڕامکردنی، بەڵام ئەو خۆی پاراست و خۆی نەدا بەدەستەوە. ئەگەر ئەوەی ئەمری پێ ئەکەم نەیکات و داخوازیم جێبەجێ نەکات بێگومان بەند ئەکرێو لە زەلیلانی دەربار ئەبێ.

(٣٣) جا یووسف لە خودا پاڕایەوە وتی: خودایا حەپس کردن و بەندیخانەم پێخۆشترە لەوەی گوناهبارببم و پیس ببم بەو کارە سووکەی منی بۆ بانگ ئەکە... ئەگەر تۆ دەفعی مەکری ئەمانەم لێ نەکەیت مەیل ئەکەم بەلایانداو تووشی گوناە ئەبم و لە زومرەی ئەوانە ئەبم کـ... نازانن چاك چییەو خراپ چییە.

(٣٤) جا خودا بە میهرەبانیی خۆی دوعاو نزاکەی لێ قوبووڵ کرد و ئاواتی بەجێهێناو پاراستی لە گوناە و مەکری ژنەکەی لێ لادا. بێگومان خودا شنەواو زانایە ئاگای لە هەموو شت هەیە.

(٣٥) پاش ئەوەی عەزیز و پیاوانی دەربار نیشانەکانی پاکیی یووسفیان بۆ دەرکەوت، وەك شایەتیی ساواکە و دڕانی کراسەکەی لە دواوەو برینداربوونی دەستی ژنەکان و خۆپاراستنی یووسف لە مەکریان، لە ئەنجامی تەئسیری قسەی ژنەکەی عەزیزدا بڕیاریان دا تا ماوەیەك توندی بەندیخانەی بکەن، تا خەڵك وا بزانن تاوانبارە.

(٣٦) کە یووسف حەپس کراو دوو گەنجیش لەگەڵی خرانە بەندیخانە کە بەتاوانی تر حوکم درابوون. یەکێکیان وتی: لە خەودا دیم ترێم بۆ پاشا ئەگوشی، ئەویتریشیان وتی: لە خەودا دیم نانم بەسەر سەرمەوە هەڵگرتبوو باڵندە لێیان ئەخوارد. واتای ئەم دوو خەوەمان بۆ لێك بدەرەوە، بەڕاستی ئێمە تۆ بەپیاوێکی چاك ئەزانین.

(٣٧) یووسف پێی وتن: هیچ خواردەمەنییەك نایێتە لای ئێوە بۆ خواردنی ئیللا من پێش ئەوەی بگات بە ئێوە پێتان ئەڵێم ئەو خواردەمەنییە چییەو لە چی دروست کراوە. ئەمە شتێکە خودا بە وەحیو ئیلهام فێری کردووم. من ئاینی قەومێکم وازلێهێناوە کە ئیمانیان بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت نییە.

وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾



(٣٨) من دوای ئایینی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووبی باوباپیرم کەوتووم. بۆ ئێمە ڕەوا نەبووە و نییە هاوبەش بۆ خودا دابنێین، ئەمە ڕەحم و میهرەبانیی خودایە بەسەر ئێمە و بەسەر باقیی موسوڵمانانەوە، بەڵام بەشی زۆری خەڵك سوپاسی نیعمەتی خودا ناکەن.

(٣٩) ئەی هاوڕێیانی بەندیخانەم! ئایا چەند خودایێکی جیاوازی پەرێشان چاکن یا خودای تاق و تەنیا کە بەسەر جیهاندا زاڵ و فەرمانڕەوایە ؟

(٤٠) ئەوانەی غەیری خودا کە ئێوە ئەیانپەرستن هیچ نین تەنها چەند ناوێکن ئێوەو باوك و باپیرانتان داتانناون، خودا دەلیلێکی لەسەر ڕاستیی ئەوانە نەناردووە تا بنیادەمی ژێر باوەڕیان پێ بکات. پەرستن بۆ خودا نەبێ بۆ هیچ شتێ ڕەوا نییە. خودا خۆی فەرمانی [...]وە کەس نەپەرستن ئەو نەبێ. ئەوەیە ئایینی ڕاستی بەڵام بەشی زۆری خەڵك نافامن.

(٤١) ئەی هاوڕێیانی بەندیخانە! ئەوەتان کە خەوی دیوە ترێ بۆ گەورەکەی ئەگوشێ ئەوە لە بەندیخانە ڕزگار ئەبێت و [...]ەڕواتەوە بۆ شوێنی خۆی و شەراب ئەدات بە دەمی گەورەکەیەوە. ئەوی تریشیان ئەکرێ بەداراو باڵندە لێی ئەخۆن. [...]ەو کارەی ئێوە لەبارەیەوە پرسیار ئەکەن لای خوداوە بڕیار دراوە و بڕاوەتەوە.

(٤٢) جا یووسف وتی بەویانە کە لای وابوو ڕزگار ئەبێ: کە دەرچوویت لای گەورەکەت باسی حاڵم بکە بەڵکو ڕزگارم [...]کات، بەڵام پیاوەکە شەیتان لە بیری بردەوە کە لای گەورەکەی باسی بکات و، یووسف چەند ساڵێ لە بەندیخانەدا [...]مایەوە.

(٤٣) پادشای میسر وتی: حەوت مانگای قەڵەوم لە خەودا دی حەوت مانگای لەڕ ئەیانخواردن، هەروەها حەوت [...]گوڵە گەنمی سەوزم دی لەگەڵ حەوت گوڵی وشك. ئەی کۆمەڵی مەجلیسی خۆم! واتای ئەم خەوەم بۆ لێك بدەنەوە [...]ئەگەر ئەزانن مەعنای خەو لێك بدەنەوە.

قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ فَأَرۡسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾



(٤٤) ئەوانیش وتیان: ئەم خەوەی تۆ خەوی پڕوپووچ و بێ ئەساسەو ئێمە مەعنای خەوی پڕوپووچ و بێ‌ئەساس نازانین.

(٤٥) ئەو بەندییەی ڕزگاری بووبوو لە زیندان و گەڕابوەوە بەردەستی پادشاو، پاش ماوەییێکی زۆر یووسفی بیرکەوتەوە، وتی: من لە واتای ئەم خەوە ئاگادارتان ئەکەم. دە بمنێرن بۆ بەندیخانە بۆ لای یووسف.

(٤٦) ئەوانیش ڕێگای پیاوەکەیان دا چوو بۆ بەندیخانە بۆ لای یووسف و، پێی وت: ئەی یووسف! ئەی پیاوی فرە ڕاستگۆ! واتای ئەم خەوەمان بۆ لێکبدەرەوە، حەوت مانگای قەڵەو حەوت مانگای لەڕ ئەیانخۆن، هەروەها حەوت گوڵەگەنمی سەوزو حەوتی وشك؟ بەڵکو بڕۆمەوە بۆ لای خەڵکەکە، بەڵکو لە مەعنای خەوەکە تێ بگەن، یا لە زانایی‌و ڕاستگۆیی تۆ خەبەردار بن.

(٤٧) وتی: مەعنای خەوەکە ئەوەیە حەوت ساڵ لەم تەنریخە بەدواوە کشتوکاڵێکی تەواو ئەکەن بە پێی عادەتو نەریتی خۆتان. هەرچیتان دروووەوە، کەمێکی نەبێ کە ئەیخۆن، لەناو گوڵەکەیا لێی گەڕێن.

(٤٨) جا پاش ئەو حەوت ساڵە حەوت ساڵی سەختی وشکەساڵی نەبار دێتە پێشەوە، هەرچیتان لە حەوت ساڵی پێشوودا هەڵگرتبوو هەمووی ئەخۆن کەمێکی نەبێ کە بۆ تۆو هەڵیئەگرن.

(٤٩) پاش ئەو حەوت ساڵە سەختە بەختە ساڵێکی باش دێتە پێشەوە خودا بە هاواری خەڵکەوە دێت و فریایان ئەکەوێ و خێر و بەرەکەت زۆر ئەبێ‌و خەڵکی دەست ئەکەن بە گوشین و ئاوگرتنی میوە.

(٥٠) پادشا وتی: ئەو کوڕە حەبس‌کراوەم بۆ بێنن تا چاوم پێی بکەوێ. کە غوڵامی پادشا ڕۆیشت بۆ بەندیخانە بۆ لای یووسف (س.خ)، یووسف پەلەی دەرچوونی نەکردو، بە غوڵامەکەی وت بڕۆرەوە بۆ لای پادشاو لێی بپرسە: ئەو ژنانە کە دەستی خۆیانیان بڕی حاڵی یووسفیان چۆن بۆ دەرکەوت و ئەوان لە چ حاڵەتێکدا بوون دەربارەی یووسف کە ئەیانویست ڕامی بکەن؟ بەڕاستی خودا بە حاڵی ئەو ژنانە ئەزانێ و ئاگای لە مەکریانە.

(٥١) کە ژنەکان هاتن پادشا پێی وتن: ئەوە چیتان بوو کە دڵداریتان بە یووسف ئەفرۆشت و ئەتانویست ڕامی بکەن؟ تاوانی ئەو بوو یا هیی ئێوە؟ ئەوانیش وتیان: حاشا لیللا ئێمە هیچ کارێکی خراپمان لەوەوە نەدیوە. ئەنجا ژنەکەی عەزیز وتی: ئیستە حەق دەرکەوت و ڕاستی ئەبێ بوترێ، من گیرۆدەی خۆشەویستی ئەو بووبووم و ئەمویست ڕامی بکەم بۆ خۆم. یووسف هیچ تاوانێکی نەبوو، بەڕاستی یووسف لە ڕاستگۆیانە.

(٥٢) ئەم تەحقیق و لێپرسینەوە بۆ ئەوەبوو گەورەکەم دڵنیابێ لەوەی کە من لە پاشملەو بەپەنهانی خیانەتم لەگەڵ نەکردووە، هەروەها تا بزانێ خودا هەرگیز مەکرو فێڵی خیانەتکاران سەرناخات.

۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾ وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ أَلَا تَرَوۡنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴿٦١﴾ وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٦٢﴾ فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾



(٥٣) لە هەمان کاتدا من نەفسی خۆم بە بێعەیب و بێتاوان نازانم و دیفاعی لێ ناکەم؛ چونکە بێگومان نەفسی ئادەمزاد زۆر فەرمان ئەدا بە خراپەکردن و مەیلی لە کاری ناشیرینە، مەگەر میهرەبانیی خودا ئینسان ڕزگار بکات، خودای من تاوانبەخش و میهرەبانە .

(٥٤) پادشا وتی: ئەو جوانە ژیرەم بۆ بێنن بەتایبەتی ڕای ئەگرم بۆ ڕاوێژو کاروباری خۆم لە دەرباردا. کە هێنایان و لەگەڵ پادشا کەوتە وتووێژ پادشا پێی وت: تۆ لەمڕۆ بەدواوە لای ئێمە خاوەن پایەیت و لە هەموو شتێکدا باوەڕ پێکراوو دەمڕاست ئەبی .

(٥٥) یووسف داوای لە پادشا کرد، وتی: بمکە بە ئەمینداری گەنجینەکانی ئەرز. من ئەیانپارێزم لە فەوتان و بەخۆڕاییلەناوچوونو، ئەزانم چۆن ئەیانبەم بەڕێوەو تەسەڕوفیان تێدائەکەم .

(٥٦) پادشا داخوازییەکەی یووسفی جێ بەجێ کرد و، کردیە ئەمینداری دارایی و واریداتی وڵات. ئا بەو جۆرە لە وڵاتی میسردا شوێنمان بۆ یووسف خۆش کرد و، لە هەرکوێ مەیلی ببوایە لێی دائەنیشت. ئێمە میهرەبانیی خۆمان لە دنیاو قیامەتدا ئەڕژێنین بەسەر هەر کەسێکدا خواستمان لە سەری بێ. ئێمە هەرگیز پاداشی چاکەکەران نافەوتێنین .

(٥٧) بێگومان بۆ ئەوانەی باوەڕیان بە خودا هەیەو خۆیان لە هاوبەش بۆخودادانان و لە داوێن پیسی ئەپارێزن. پاداشی ڕۆژی دوایی لە هەموو پاداشێ چاکترە .

(٥٨) لەو ساڵانەدا گرانی داکەوت، براکانی یووسف لە کەنعانەوە بە کاروانی چوونە میسرو، ڕۆیشتنە بارەگای پادشا بۆ ئیجازەی کڕینی زەخیرە. چوونە ژوورەوە بۆ لای یووسف، لەو کاتەدا یووسف ئەوانی ناسی بەڵام ئەوان ئەمیان نەئەناسی! .

(٥٩) کە خستنیە ڕێ و ئەوەی پێویستیان بوو پێی دان پێی وتن: برایەکی باوکیتان هەیە ئەمجارە کە هاتنەوە لەگەڵ خۆتان بیهێنن بۆم، نابینن من باش و بەتەواوی ئازووخەتان بۆ ئەپێوم و باشترین خانەخوێو میواندارم ؟

(٦٠) ئەگەر بۆمی نەهێنن ئیتر ئێوە بەشتان لای من نابێ و نزیکم مەکەونەوە .

(٦١) وتیان: کە ڕۆیشتینەوە هەوڵ ئەدەین موافەقەی باوکی وەرگرین لەسەر ناردنی و، ئێمە ئەمە ئەکەین .

(٦٢) جا یووسف بە مەئموورەکانی وت: ئەو شتانە بخەنەوە بارگەکانیان کە هێناویانن بۆ کڕینی خواردەمەنی، بەڵکو کە گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان و زانییان خواردەمەنییەکەیان کەوتووەتە خۆڕایی و شتومەکەکانیان بۆ گێڕراوەتەوە، ببێتە هۆی ئەوەی جارێکی تر بێنەوەو برا باوکییەکەیانم بۆ بهێنن .

(٦٣) کە گەڕانەوە بۆ لای باوکیان وتیان: بابە! مەنعی کڕینی زەخیرەمان لێکراوە ئەگەر براکەمان لەگەڵ خۆمان نەبەین. بینێرە لەگەڵمان تا ئازووخە وەربگرین، بەڕاستی ئێمە ئەیپارێزین و ناهێڵین تووشی هیچ جۆرە زیانێ ببێت .

قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَـٰفِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُوا۟ مَتَـٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَـٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِى هَـٰذِهِۦ بِضَـٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَـٰبَنِىَّ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِى عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَـٰهُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾



(٦٤) باوکیان وتی: ئایا ئەمین ئەبم لێتان بۆ پاراستنی براکەتان ئیللا وەکوو ئەوەی لەمەوپێش ئەمین بووم لێتان بۆ پاراستنی یووسفی برای؟ بێگومان خودا باشترین پارێزگارەو لە هەموو میهرەبانێ میهرەبانترە.

(٦٥) کە شتومەکیان کردەوە تەماشایان کرد هەرشتێکیان بردبوو لەگەڵ خۆیان بۆ کڕینی ئازووخە هەمووی گێڕراوەتەوە بۆیان؛ جا وتیان : بابە! ئیتر چیمان ئەوێ ؟! ئەوەتا چیمان بردبوو بۆمان گێڕراوەتەوە و، خواردەمەنی و پێویستیی ژیان دێنین بۆ خێزانەکەمان و، براکەیشمان ئەپارێزین و باری وشترێ زیاتریش لەجاری پێشوو ئازووخە ئەهێنین. ئەمەی ئەمجارە هێناومانە کەمەو بەشمان ناکات .

(٦٦) وتی: هەرگیز نایینێرم لەگەڵتان تا سوێندم بە خودا بۆ نەخۆن کە ئەیهێننەوە بۆم، مەگەر لەهەموو لایێکەوە گەمارۆ بدرێن و چارتان نەمێنێ. جا کە سوێندیان بۆ خوارد وتی: خودا لەسەر ئەم پەیمانەی ئێمە وەکیل و ئاگادارە.

(٦٧) هەروەها لەبەرئەوەی کوڕەکانی کۆمەڵێکی جوان و ڕێکو پێك بوون لە ترسی چاوی حەسوود پێی وتن: کە ئەچنە میسر لە یەك دەرگاوە مەچنە ناوشار، بەڵکو لەچەند دەرگاییێکی جیا جیاوە بچنە ژوورەوە. خۆ من ناتوانم ئەوەی کە خودا بڕیاری داوە لە ئێوەی دووربخەمەوەو نەهێڵم تووش بن. حوکم و بڕیار هەر بۆ خودایە و، پشتم بە لوتف و میهرەبانیی ئەو بەستووە و، ئەوانەیش ئەیانەوێ پشت بەکەسێ ببەستن با هەر پشت بەو ببەستن .

(٦٨) جا کاتێ کە داخلی شار بوون، وەك باوکیان ئەمری پێ کردبوون، وە ئەبێ ئەو بەگوێ کردنە شتێکی لێ دوور خستبنەوە کە لای خوداوە بڕیار درابێ، بەڵام ئەو نەسیحەتە پێویستییەك بوو لە دڵی یەعقووبداو دەریبڕی. بەڕاستی یەعقووب لەوانە گەیشتووە کە بە وەحی پێمان ڕاگەیاندووە، بەڵام بەشی زۆری خەڵك نهێنییەکانی قەزاو قەدەر نازانن.

(٦٩) کە چوونە بارەگای یووسف بەنیامینی برای بردە لای خۆیەوە پێی وت: من یووسفی براتم. ئیتر دڵت عاجز نەبێ دەربارەی ئەوەی ئەوان دەرحەق بە ئێمە کردیان .

فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِى رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾ ۞ قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِى نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٧٨﴾



(٧٠) جا کە باریان بۆ بارکردن و ئەوی ویستیان پێیان دان، ئەو کاسە زیوینەی کە ئەوسا پادشا ئاوی پێ ئەخواردەوەو دوایی لەبەر پیرۆزی کرابوو بە مەن و ئازووخەی پێ ئەپێورا خستیانە بارەکەی بەنیامینی برای یووسفەوەو دەرگای خەرارەکەیان دووری. پاش ئەوە جارچی جاڕی دا وتی: ئەی کاروانەکە بە ڕاستی ئێوە دزن .

(٧١) براکانی یووسفیش کە ڕوویان کردە جارچییەکە وتیان: چیتان دیار نی‌یە؟ .

(٧٢) وتیان: ئەو مەنەی لە عەماردا بە ئەمری پادشا پێوانەی پێ ئەکرێ، ئەوەمان دیار نییە و، هەرکەس بیهێنێتەوە باری وشترێ مژدانەیەتی و من کەفیلیمی و ئەیدەمێ .

(٧٣) وتیان: قەسەم بە خودا ئێوە ئەزانن ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین بەدکاری بکەین لە زەویدا و لەمەوبەریش دز نەبووین .

(٧٤) ئەوانیش وتیان: کەواتە ئەی جەزای چی بێ ئەگەر درۆزن دەرچوون ؟

(٧٥) وتیان: جەزاکەی ئەوەیە هەرکەس مەنەکە لە بارەکەیدا دۆزرایەوە ئەوە جەزای بێ و بکرێتە بەندە، ئێمە وەها جەزای دز ئەدەینەوەو تۆڵەی لێ ئەستێنین.

(٧٦) کابرای جاڕدەر دەستی کرد بە پشکنینی بارەکانی برا باوکییەکانی یووسف پێش باری بەنیامینی برای باوکیو دایکیی یووسف و، مەنەکەی لە باری براکەی یووسفا دەرهێنا. بەم جۆرە وەحیمان کرد بۆ یووسف و تێمانگەیاند. یووسف نەیئەویست براکەی بە پێی یاسای پادشا بگرێ و موحاکەمەی بکات مەگەر خودا بیویستایە. هەرکەس کە بمانەوێ، چەند پلەو پایە بەرزی ئەکەینەوەو، لە ژوور هەموو زانایێکیشەوە زانایێکی تر هەیە .

(٧٧) جا براکانی وتیان: ئەگەر ئەمە دزیی کردبێ برایێکی هەبوو پێش ئەم ئەویش هەر دزیی کرد! یووسف قسەکەیانی پێ ناخۆش بوو بەڵام جوابی نەدانەوەو لە دڵی خۆیدا وتی: ئێوە لەو خراپترن، واتە: ئێوە براکەی ئەوتان دزی. خودایش زاناترە بەوەی باسی ئەکەن، واتە: خودا ئەزانێ براکەی دزیی نەکردووە .

(٧٨) جا کە بەنیامین گیرا براکانی پاڕانەوە لە عەزیز و وتیان: ئەی عەزیز! ئەم کوڕە باوکێکی پیری بەساڵداچووی گەورەی هەیە، تکا ئەکەین لەباتیی ئەو یەکێك لە ئێمە گل بدەرەوەو ئەو بەرەڵڵا بکە. بەڕاستی ئێمە تۆ بە خاوەن چاکە ئەزانین .

قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ مِنْهُ خَلَصُوا۟ نَجِيًّا ۖ قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ ۖ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ ﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُوا۟ بَثِّى وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾



(٧٩) وتی: پەنا ئەگرین بە خودا لەوەی لەو کەسە بەولاوە کە مەنەکەی خۆمان لا دۆزیوەتەوە، یەکێکی تر بگرین. ئێمە ئەگەر شتی وەها بکەین لە ستەمکاران ئەبین .

(٨٠) کە لە یووسف نائومێد بوون و، بۆیان دەرکەوت پاڕانەوە سوودی نی‌یە، کەناریان گرت و لەناو خۆیاندا دەستیان کرد بە ڕاوێژکردن. برا گەورەکەیان وتی: ئایا نازانن ئێوە پەیمانتان بە باوکتان داوەو سوێندتان بەخودا خواردووە دەربارەی بەنیامین هیچ درێغی ناکەین ؟! ئەی نازانن لەمەوپێش چ خراپەیەکتان دەربارەی یووسف کرد؟! قەسەم بەخودا لەم شوێنە ناجوولێم تا باوکم ئیزنم ئەدا یا خودا کارێك ئەکات بەنیامین ڕزگار ببێت .

(٨١) بگەڕێنەوە بۆ لای باوکتان و بڵێن بەنیامینی کوڕت دزیی کردو، ئێمەیش هیچ شاهیدییەکمان نەدا بەوە نەبێ کە زانیمان: کە دیمان مەنەکەیان لەبارەکەیدا دۆزییەوە. ئێمە ئاگامان لە غەیب نی‌یەو نازانین خۆی دزیویەتی یا سەپاندوویانە بەسەریدا.

(٨٢) سەبارەت بەم ڕووداوە لە ئەهلی ئەو دێیە بپرسە کە لەوێ بووین و، لە خەڵکی ئەو کاروانە بپرسە کە لەگەڵیان بووین. بێ‌گومان ئێمە ڕاستگۆین .

(٨٣) باوکیان وتی: نەخەیر ئەمەیش فێڵ و پیلانێکە ئێوە لەناو خۆتاندا دروستتان کردووە، ئەگەر وەها نی‌یە پادشای میسر لە کوێ زانیی بە یاسای ئێمە دز لە پاداشی دزیدا ئەگیرێ و ئەکرێتە بەندە ؟! من هیچم بۆ نەماوەتەوە سەبر و خۆڕاگرتنێکی زۆر باش نەبێ، بەڵکو خودا هەموویانم بۆ بهێنێتەوە؛ خودا زانایەو کارەکانی پڕحیکمەتن .

(٨٤) جا پشتی لێ‌هەڵکردن و لەبەر برینداریی دڵی خۆی وتی: ئای داخی گرانم بۆ یووسفی کوڕم. ئەوەندە خەفەتی خوارد و گریا چاوەکانی سپی بوونەوەو دڵی پڕ بوو لە ڕق لە کوڕەکانی، بەڵام پیشی ئەخواردەوەو دەری‌نەئەبڕی .

(٨٥) کوڕەکانی پێیان وت: قەسەم بە خودا، بابە، تۆ وازناهێنی‌و هەر بیر لە یووسف ئەکەیتەوەو هەر باسی ئەکەیت تا نەخۆشییەکی سەخت ئەگری یا هەر بە تەواوی لەناو ئەچیت .

(٨٦) ئەویش وتی: وازم لێ بێنن. من سکاڵای غەم و دڵگرانیی خۆم لای خودای خۆم ئەکەم و، شتی وا لە ڕەحمەت و میهرەبانیی خودا ئەزانم ئێوە نایزانن .

يَـٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٩٥﴾



(٨٧) کوڕەکانم! بڕۆن هەواڵی یووسف و براکەی بپرسن و هەرگیز لە میهرەبانیی خودا نائومێد مەبن. بەڕاستی کافران نەبێ کەس لە میهرەبانی و لوتفی خودا نائومێد نابێ.

(٨٨) جا کە جارێکی تر ڕۆیشتنەوە بۆ میسر و چوونە لای یووسف، وتیان: ئەی پیاوی بەشکۆ! ئێمەو خێزانمان برسین و کەلوپەلێکی کەم نرخمان هێناوە، ئەمر بفەرموو بارمان بۆ تەواوبکەن و، بە بەردانی بەنیامینیش پیاوەتیمان لەگەڵ بکە، بەڕاستی خودا پاداشی چاکەکەران ئەداتەوە.

(٨٩) جا یووسف وتی: ئەزانن ئێوە چیتان بە یووسف و براکەی کرد لە کاتێکدا کە ئێوە نەزان بوون؟ یووسفتان خستە بیرو براکەیتان زەلیل کرد.

(٩٠) براکانی وتیان: بەڕاستی تۆ یووسفی؟ وتی: بەڵێ من یووسفم و ئەمەیش بەنیامینی برامە، خودا لوتفی لەگەڵ کردین و منەتی نایە سەرمان. بێ‌گومان ئەوەی لە خودا بترسێ‌و سەبر بکا خودا هەرگیز کاری چاکەکەران نافەوتێنێ‌و پاداشیان بەتەواوەتی ئەداتەوە.

(٩١) ئەوانیش وتیان: بە خودا قەسەم خودا تۆی بەسەر ئێمەدا هەڵاوێرد و پایەی دایتێ. بێ‌گومان ئێمە لەو کردارەدا کە لەگەڵ تۆمان کرد، کەوتینە هەڵەوەو تاوانبار بووین.

(٩٢) یووسف وتی: ئەمڕۆ سەرزەنش‌و لۆمەتان لەسەر نی‌یە. خودا لێتان خۆش ئەبێ، خودا لە هەموو میهرەبانێ میهرەبانترە.

(٩٣) ئەم کراسەم بەرن و بیدەن بەسەر ڕوخساری باوکمدا چاوی چاك ئەبێتەوە. ئێوەو باوکم هەموو خێزانەکانتان بێنن بۆ ئێرە بۆ لای من.

(٩٤) کە کاروانی کەنعان لە میسر بەرەو ماڵ دەرچوو یەعقووب وتی: بەڕاستی ئەگەر بە کەم عەقڵم نازانن من بۆنی یووسف ئەکەم.

(٩٥) وتیان: بە خودا قەسەم تۆ ئەوەندە یووسفت خۆش ئەوێ و بیری لێ ئەکەیتەوە، هەر لەسەر بارە کۆنەکەی خۆت ماوی و لە ڕێگای ڕاست لاتداوە.

فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا ٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ۞ رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۖ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٣﴾



(٩٦) جا کە موژدەدەر گەیشتە لای یەعقووب کراسەکەی یووسفی خستەسەر چاوی یەعقووب و، یەعقووب دەستبەجێ بینایی هاتەوە بۆ چاوی و، وتی: پێم نەوتن: من لای خوداوە شتی وەها ئەزانم کە ئێوە نایزانن؟

(٩٧) ئیتر کە مەسەلەکە ڕوون بوویەوە، کوڕەکانی یەعقووب هاتنە لای بۆ عوزرخواهی و وتیان: بابە! لە خودا داوابکە لە گوناهمان خۆش ببێ. بەڕاستی ئێمە گوناهبارین و خەتامان کرد.

(٩٨) وتی: لەمەوپاش لە خودای خۆم ئەپاڕێمەوە لە گوناهتان ببووڕێ. بەڕاستی خودا گوناهپۆش و میهرەبانە.

(٩٩) کە یەعقووب و خێزانی خۆی و کوڕەکانی چوونە میسر و، ڕۆیشتنە لای یووسف لە بارەگا، یووسف باوك و دایکی بردە لای خۆی و، پێی وتن: بچنە میسر إن شاء الله بە ئەمینی لە قاتوقڕیو نەبوونی.

(١٠٠) یووسف باوك و دایکی لەسەر عەرشەکەی خۆی دانا و ئەوانیش بەپێی داب و نەریتی ئەوێ هەموو کڕنووشی خورمەتیان بۆ یووسف برد. لەوکاتەدا یووسف وتی: بابە! ئەمە تەئویلی خەوەکەمە کە زوو دیم، وا خودا بەڕاستی گێڕاو هێنایەدی. هەروەها خودا چاکەی لەگەڵ کردم کە لە بەندیخانە دەریهێنام و ئێوەی لە دەشتەوە هێنا بۆ لام، پاش ئەوەی کە شەیتان نێوانی من و براکانی تێکدا. بێگومان خودای من جوان هەرشتێ ڕێك ئەخات کە مەیلی لێ بێ. بەڕاستی خودا زانایەو کارەکانی پڕحیکمەتن.

(١٠١) ئەی خودای پەروەردگار! بەڕاستی تۆ موڵك و دەستەڵاتت پێ بەخشیوم و فێری مەعنای کتێب و لێکدانەوەی خەوبینینت کردووم. ئەی دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی تۆ گەورەو سەرپەرشتیکەری منی لە دنیاو لە قیامەتدا. بە موسوڵمانی گیانم بکێشەو لە زومرەی چاکانم حسێب بکە.

(١٠٢) ئەمانە هەموو دەنگوباسی غەیبین کە وەحیمان کردوون بۆت، تۆ لای براکانی یووسف حازر نەبووی کە قسەیان کرد بە یەك و تەدبیری ئەوەیان کرد یووسف بخەنە بیرەوەو ئازاری بدەن.

(١٠٣) بەشی زۆری ئەو خەڵکە ئیمان ناهێنن هەرچەند تۆ مەیلت لەسەر ئیمانهێنانیان بێ.

وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓا۟ أَن تَأْتِيَهُمْ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ ۗ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۗ وَلَدَارُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا۟ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّىَ مَن نَّشَآءُ ۖ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾



(١٠٤) تۆ بەرانبەر بەم ئامۆژگارییانە داوای کرێ و حەقدەستیان لێ ناکەی، ئەم قورئانە کە تۆ پێیان ڕائەگەیێنی بیرخستنەوەو ئامۆژگارییە بۆ هەموو جیهان.

(١٠٥) گەلێ نیشانەی گەورە لەسەر دەستەڵاتی خودا لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەن ئەو کافرانە بەلایاندا تێئەپەڕن و چاویان پێیان ئەکەوێ، کەچی ڕوویان لێ وەرئەچەرخێنن و تێیاننافکرن و عیبرەتیان لێ وەرناگرن.

(١٠٦) بەشی زۆری ئەوانە ئیمانیان بە خالیقیەتی خودا نییە ئیللا لەگەڵ حاڵەتی هاوبەشبۆدانانیدا نەبێ، وەك ئەوەی ئەحبارەکان بەخودا دائەنێن، یا ئەولاد بۆ خودا بڕیار ئەدەن.

(١٠٧) ئایا ئەو کافرانە ئەمینن لەوەی سزاییێکیان لەلایەن خوداوە بۆ بێت داگیریان بکات، یا ئەمینن لەوەی کە لەپڕ دنیا تەواوببێ و قیامەت لەپڕ ڕوویان تێ بکاتو ئەوان ئاگایان لە هاتنەکەی نەبێ ؟

(١٠٨) تۆ ئەی پێغەمبەر! بەو کافرانە بڵێ: ئەمە ڕێگەو یاسای منە، خەڵك بانگ ئەکەم بۆ لای خودا بە بەرچاو ڕووناکیی خۆم و پەیڕەوانم. خودا پاك و بێعەیبەو دوورە لە هاوبەش. من لەو کەسانە نیم هاوڕێ بۆ خودا بڕیار ئەدەن.

(١٠٩) لە پێشی تۆیشدا کەسمان ڕەوانە نەکردووە بۆ ئامۆژگاری ئیللا چەند پیاوێکی ئەهلی دێهاتەکان کە وەحیمان بۆ کردوون واتە: پێغەمبەران لە بەرەی ئادەمزادن و فریشتە نین. ئەوە بۆ ناچن بگەڕێن بە زەویدا تا بزانن ئەنجامی خەڵکەکانی پێش ئەوان چۆن بوو کە ئەوانەی باوەڕیان بە خوداو بە پێغەمبەران نەبوو، و بە دڵ و گیان باوەشیان کردبوو بە دنیادا، تا عیبرەت بگرن و تەمێ خواربن؟ بێگومان ماڵی ڕۆژی دوایی زۆر چاکترە بۆ ئەوانەی خۆیان لە هاوبەش بۆخوادانان و گوناهی تر ئەپارێزن. ئایا ئەمانە تێنافکرن؟

(١١٠) ئیتر پێغەمبەران بەردەوام بوون لەسەر کاری خۆیان و، کافرەکانیش بەردەوام بوون لەسەر ملپێچی و گومڕاهی، تا ڕادەیێك کە پێغەمبەرەکانمان گومانیان ئەبرد کەوا ئەو بەڵێنەی پێیان دراوە نایێتەدی و هەرگیز بەسەر دوژمندا سەرناکەون. ئا لەم کاتی نائومێدییەدا سەرکەوتن لای ئێمەوە هات و ئەوەی ویستمان ڕزگارمان کرد، واتە پێغەمبەرەکان و پەیڕەوەکانیان، بێگومان سزاو عەزابی ئێمە دوور ناخرێتەوە لە تاوانباران و ئەبێ تووش بێن.

(١١١) بە ڕاستی لە سەرگوزەشتەی یووسف و براکانیدا دەرز و پەند هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن هۆش و فامن، لەوڕووەوە کە تێئەگەن لە جیهاندا حەسوودی هەیەو، مەکرو فێڵ ماوەی کورتەو، خۆگرتن لەبەر قەزا ئەنجامی خێرەو، حقوق ڕاگرتن و شەرم لە خودا کردن بناغەی پیرۆزییەو، حەق و ڕاستی هەر جێگەی خۆی ئەگرێ و، خودا هەموو کارێکی پێ ئەکرێ. ئەم قورئانە قسەی دەسهەڵبەست نییە، بەڵکو شتێکی حەق و کتێبێکی ڕاستەو باوەڕی بەو کتێبانە هەیە کە پێش ئەو لای خوداوە نێرراون بۆ پێغەمبەران و، تەفصیلی هەموو شتێکی پێویستی تێدایە و، ڕێنیشاندەرو ڕەحمەتە بۆ کۆمەڵی خاوەن ئیمان.

# سورة الرعد

ترتيبها ١٣ — آياتها ٤٣

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓر ۚ تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ ۗ وَالَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ الْحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُم بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا ۖ وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ ۖ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ ۞ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَإِذَا كُنَّا تُرَابًا أَإِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٥﴾



## سوورەتی (الرعد)

مەدینەیی‌یەو (٤٣) ئایەتە.

(١) (المر) هەر خودا ئەزانێ مەعنای چی‌یە. ئەوانە ئایەتی قورئانن و هەموو ئەو قورئانەی لای خوداوە بۆت نازڵ کراوە ڕاستەو بێ‌گەردە، بەڵام بەشی زۆری خەڵك بێ‌ئیمانن چونکە بیرناکەنەوەو عەقڵیان ناخەنەکار.

(٢) خودا ئەو خودایە ئاسمانەکانی بەرزکردوونەتەوە بە بێ کۆڵەکەگەلێ ئێوە بیانبینن، غاڵب و خاوەن فەرمانە بەسەر عەرشداو، خۆرو مانگی ڕام کردووە بۆ هاتوچۆو، هەرکام لەوانە تا ماوەییێکی دیاریکراو ئەگەڕێن. هەموو کارێ تەدبیر ئەکات. ئایەتەکان تەفصیل ئەدات، بەڵکو بیربکەنەوە لە توانی خودا و ئیمان بێنن کە زیندوو ئەکرێنەوەو بە خودای خۆتان ئەگەن.

(٣) خودا خوداییێکی وەهایە زەویی ڕاکێشاوەو چەند کێوی دامەزراوو چەند ڕووباری تێدا دروست کردووەو، لە هەموو بەرو میوەیێ جووتێکی دروست کردووە وەك ترش‌و شیرین، زەردو سوور، گەورەو بچووك.. تاد، بە شەو ڕۆژ دائەپۆشێ‌و دنیا تاریك ئەکات. لەم کارانەدا چەند ئایەت‌و بەڵگە هەن دەلالەت لە گەورەیی و دەستەڵاتی خودا ئەکەن بۆ ئەو کۆمەڵەی بیرو هۆشیان ئەخەنە کار.

(٤) لە زەویدا چەند پارچەییێك هەن دراوسێی یەکن، کەچی یەکێکیان بەپیتەو یەکێکیان بێ‌پیت. هی وا هەیە خوێی هەیەو هی وا هەیە بێ‌خوێیە.. تاد. هەروەها باغی ترێ و کشتوکاڵ و دارخورما هەیە، هەندێ لەو دارخورمایانە یەك بنجیان هەیەو هەندێکیان دوو بنجیان هەیە، هەموویشیان بە یەك ئاو ئاوئەدرێن کەچی وەها جیاجیان. هەندێ لەم میوانە پەسەند ئەکەین بەسەر هەندێکی تریاندا و بە تام و لەزەتترن لە خواردندا. لە هەموو ئەمانەدا نیشانەو دەلیل هەیە لەسەر گەورەیی خودا بۆ کۆمەڵێ کە خاوەن هۆش بن.

(٥) ئەگەر تۆ سەرت سووڕئەمێنێ لە قسەی ئەوان، حەقتە سەرت سووڕبمێنێ، چونکە قسەی ئەوان زۆر جێگەی سەرسووڕمانە کە ئەڵێن: ئایا ئەگەر ئێمە بمرین و بڕزێین و ببین بە خۆڵ سەرلەنوێ دروست ئەکرێینەوە ؟! ئەوانە ئیمانیان بە خودای خۆیان نی‌یە، بۆیە باوەڕ بە زیندووبوونەوە ناکەن. ئەوانە بەهۆی ئەوەوە کە هەمیشە گومڕاهن، ڕۆژی قیامەت زنجیر ئەخرێتە ملیان. ئەوانە هاوڕێی ئاگرن و، هەتا هەتایە لەو ئاگرەدا ئەمێننەوە.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِمُ ٱلْمَثُلَٰتُ ۗ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۗ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ ۖ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ ۖ وَكُلُّ شَىْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴿١٣﴾



(٦) ئەوانە پەلەت لیّ ئەکەن بۆ هیّنانی سزای خودا بەسەریاندا پیّش خۆشیو سەلامەتی، لەگەڵ ئەوەدا کە پیّش ئەوان تۆڵە لە تاوانباران سەنراوە، بەڵام ئەوان پەندیان لیّ وەرناگرن. بەڕاستی خودا لە گوناهی خەڵك ئەبووریّ ئەگەرچی ئەوان ستەم لە خۆیان ئەکەن. بەڕاستی خودای تۆ سەختگیرە.

(٧) کافرەکان ئەڵیّن: ئەوە بۆچی ئایەتیّکی وەك ئایەتەکانی مووسا و عیسای لە لای خوداوە بۆ نانیّرریّ؟ تۆ وەك پیّغەمبەرانی تر تەنها بۆ ئەوە نیّرراوی خەڵك لە سزا بترسیّنی و، ئایەت ناردن بە دەستی خودایە. بیّگومان بۆ هەموو قەومیّ پیّغەمبەریّك ئەنیّرریّ کە ڕیّگای ڕاستیان پیشان بدا.

(٨) هەر خودا ئەزانیّ چی لە سکی ئافرەتدایە. هەر ئەو ئەزانیّ منداڵدانی ئافرەت چەندیّك کەم ئەکات و چەندیّك زیاد ئەکات. هەموو شتیّ لای خودا ئەندازەییّکی دیاری هەیە نە لیّی زیاد ئەکات و نە لیّی کەم ئەکات.

(٩) هەرخودایە ئاگای لە پەنهان و لە ئاشکرا هەیەو هیچی لیّ ون نابیّ، هەر ئەوە گەورەو دوور لە خەوش و کەموکووڕی.

(١٠) یەکسانە لای خودا ئەوەتان بە پەنامەکی قسە لەگەڵ نەفسی خۆی بکات و ئەوەتان بە ئاشکرا قسە لەگەڵ خەڵك بکات و، ئەوەتان شەو خۆی بشاریّتەوە و، ئەوەتان بە ڕۆژدا دەرکەویّ. خودا ئاگای لە هەموو هەیە.

(١١) هەیە بۆ ئەو ئینسانەی لە ئایەتی پیّشوودا باسی کرا چەندین فریشتە لەبەرو لەدواوە، واتە لە هەموو لایەکەوە قسەو کرداری لای خۆیان تۆمارئەکەن و، هەرکاتیّ کە گوناهیّکی کرد لە سزای خودای ئەپاریّزن بەوە کە لەخودا ئەپاڕیّنەوە لیّی خۆش ببیّ یا سزادانی دوابخا بۆ ڕۆژی قیامەت. بیّگومان خودا حاڵی خۆشی و نیعمەتی هیچ قەومیّ ناگۆڕیّ تا ئەوان حاڵی خۆیان نەگۆڕن. ئەگەر خودا ویستیشی قەومیّ تووشی سزاییّ بکات کەس ناتوانیّ ئەو سزایەیان لیّ بگیّڕیّتەوەو لە خودا بەولاوە کەس نی‌یە سەرپەرشتییان بکات.

(١٢) خودا ئەو خودایە برووسکەتان پیشان ئەدات، لە سەریّکەوە لە ئازاری ئەترسن و لەسەریّکی ترەوە بەتەمای بارانن لیّیەوە. هەروەها خودایە هەوری گەورەو گران دروست ئەکات و ئەینیّ بەیەکەوە.

(١٣) ڕەعد، واتە هەورەگرمە، سوبحانەڵلا ئەکات لەگەڵ حەمدو سەنای خودا. فریشتەیش هەروا لە ترسی خودا سوبحانەڵلا ئەکات. خودا تریشقەیش ئەنیّریّ و، بەو تریشقەیە ئەدا لە هەرکەس کە خواستی لەسەر بیّ، کەچیی کافرەکان دەمەدەم ئەکەن لە بارەی توانایی و یەکیّتیو بیّ هاوڕیّیی خوداوەو پیّغەمبەر بەدرۆ ئەخەنەوە. خودایش بەتوندی کافران گرفتار ئەکات.

لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۚ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ﴿١٤﴾ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ۩ ﴿١٥﴾ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ قُلِ ٱللَّهُۚ قُلۡ أَفَٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ لَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ نَفۡعٗا وَلَا ضَرّٗاۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ أَمۡ هَلۡ تَسۡتَوِي ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُۗ أَمۡ جَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُواْ كَخَلۡقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلۡخَلۡقُ عَلَيۡهِمۡۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدٗا رَّابِيٗاۖ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٖ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴿١٧﴾ لِلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُۥ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٨﴾



(١٤) هەر بۆ لای خودایە هاوارکردن و دوعاکردنی ڕاست. ئەو کەسانەی بانگ لە غەیری خودا ئەکەن بانگ لێکراوەکان نایەن بە دەنگیانەوەو مەبەستەکانیان بۆ جێبەجێ ناکەن، مەگەر وەکو ئینسانێکی تینوو کە هەردوو لەپی دەستی پان بکاتەوە بۆ لای ئاوو داوای لێ بکات بگاتە دەمی و، ئەویش بەگوێی ناکات‌و ناگاتە دەمی چونکە شتێکی جەمادەو نابیسێ. بێ‌گومان دوعای کافران لە گومڕاهی‌و زەرەرمەندی بەولاوە نی‌یە.

(١٥) هەر بۆ خودا سوجدە ئەبا ئەوەی لە ئاسمانەکان و لە ئەرزایە حەز بکا و حەز نەکا. هەروەها سێبەریشیان لە سبەینان و لە ئێواراندا هەر بۆ ئەو سوجدە ئەبەن، حەز بکەن و حەز نەکەن.

(١٦) تۆ بڵێ: کێیە خودای ئاسمانەکان و ئەرزە؟ هەر خۆت لە وەڵامدا بڵێ: (الله) یە. دە بڵێ: ئایا ئێوە غەیری ئەو خودا چەند گەورەیێکتان بۆخۆتان داناوە ئەوەندە بێ‌بایەخن ناتوانن قازانجێ بە خۆیان بگەیێنن یا زیانێ لە خۆیان بدەن ؟! تۆ بڵێ ئایا کوێرو چاوساغ وەك یەکن؟ یا خۆ تاریکی‌و ڕووناکی وەك یەکن؟ یا خەیر چەند هاوبەشێکتان بۆ خودا بڕیارداوە کە گوایە وەك خودا شت دروست ئەکەن و پاشان مەخلووقەکانی خوداو ئەوانتان لێ گۆڕاوە؟ کە ئەوانە هەرگیز ناتوانن هیچ دروست بکەن؟ تۆ بڵێ: هەر خودایە دروستکەری هەموو شتێکەو هەر ئەو تاك‌و تەنیاو بەدەستەڵات و توانایە.

(١٧) خودا ئاو لە ئاسمانەوە نازڵ ئەکات و باران ئەبارێنێ، جا شیوەکان لافاویان لێ هەڵئەستێ، هەر شیوێ بەئەندازەی خۆی و، ئەو لافاوە کەفێکی بەرز هەڵئەگرێ، هەروەها کەفێکیش هەڵئەگرێ لە ماددەی مەعدەنێ کە ئاگری بۆ هەڵئەگیرسێنن و خشڵ و قاپ و قاچاخی لێ دروست ئەکەن. خودا ئاوەها وێنەی حەق و بەتاڵتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە. جا ئەوەی کە کەفی ڕووتە بە بێ سوود ئەڕوات و، ئەوەیش قازانجی ببێ بۆ ئادەمزاد وەکو ئاوی پاك و ساف بۆ زەویوزار یا ماددەی مەعدەنی، ئەوە لە ئەرزدا ئەمێنێتەوە. خودا ئاوەها نموونەکانتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە.

(١٨) بۆ ئەوانەی بەگوێی خودای خۆیانیان کردووە پایەی باش هەیە. ئەوانەیش کە بەگوێیان نەکردووە، حاڵیان ئەوەندە خراپ ئەبێ ئەگەر هەرچی لە زەویدا هەیە مولکی ئەوان بێ و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێ ئەیدەن لە فیدیەی خۆیاندا بۆ ڕزگار بوونیان لە سزا. ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا حیسابێکی خراپیان هەیەو جێگایان دۆزەخە کە خراپترین جێگای ئارام گرتنە.

الحزب ٢٦

۞ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ ﴿٢٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾



(١٩) جا ئايا كەسێ بزانێ ئەوەی بۆ تۆ نێرراوەتە خوارەوە لەلایەن پەروەردگارتەوە حەقەو ڕاستەو، پەیڕەویی بكات، وەكو كەسێكە كوێر بێ‌و حەق لە بەتاڵ جیانەكاتەوە؟ حاشا وەكو یەك نین. بەڕاستی تەنها خاوەن عەقڵەكان بیرئەكەنەوە.

(٢٠) ئەوانەی عەهدی خودا جێبەجێ ئەكەن و پەیمان تێك نادەن.

(٢١) ئەوانەیش كە هەرچی خودا ئەمری بە ڕاگرتنی كردووە، ڕای ئەگرن، وەك صیلەی ڕەحم و دۆستایەتیی موسوڵمانان‌و ئیمان بە پێغەمبەران و ڕاگرتنی مافی خەڵك و، لە خودای خۆیان ئەترسن و ترسیان لە حیسابی سەختی ڕۆژی قیامەت هەیە.

(٢٢) ئەوانەیش كە سەبرئەكەن لەسەر زەحمەتی دەست‌لێ‌هەڵگرتنی حەرام و بەجێهێنانی واجبات لەپێناوی ڕەزامەندیی خودای خۆیانداو، نوێژ ئەكەن‌و، لەو ڕۆزییەی پێماندراون بە پەنهانی‌و بە ئاشكرا لە ڕێی خودادا سەرف ئەكەن و، بە كردەوەی چاك خراپە لە خۆیان دوورئەخەنەوە، ئەوانەن ئەنجامی پیرۆزو ئارامگای باشیان هەیە.

(٢٣) ئارامگایان بەهەشتی هەمیشەییە كە ئەچنە ناوی، خۆیان و هەركەسێ چاك بێ لە باوك و باپیران و هاوسەرو نەوەیان و، فریشتەكان ئەڕۆنەلایان، هەموو دەرگاكانیان لە ڕوودا كراونەتەوە.

(٢٤) پێیان ئەڵێن: سەلامتان لێ بێ بەهۆی ئەوەوە كە لەدنیادا خۆتان ڕاگرتبوو. ئارامگای دوایی‌تان ئارامگایەكی زۆر باشە.

(٢٥) ئەوانەیش كە پەیمانی خودا هەڵئەوەشێننەوە پاش بەستنی و، ئەوەی كە خودا ئەمری بە ڕاگرتنی كردووە ڕایناگرن و ئەیبڕن و خراپە ئەكەن لە زەویدا، بۆ ئەوانە نەفرین هەیە لەلایەن خوداوەو، لە دوارۆژیشدا ماڵێكی خراپ مەنزڵگایانە.

(٢٦) خودا ڕۆزی گوشاد ئەكات بۆ هەركەس كە خواستی لەسەر بێ‌و، هەر ئەویش تەنگی ئەكات. كافرەكان ژیانی دنیایان خۆش ئەوێ، كەچی ئەم ژیانی دنیایە لەچاو ژیانی قیامەتدا ڕابواردنێكی كەم و ناچیزو بێ‌بایەخە.

(٢٧) كافرەكان ئەڵێن: ئەوە بۆچی موحەممەد لەلایەن خواكەیەوە ئایەت و نیشانەیێكی گەورەی بۆ نایێ؟ بڵێ خودا هەركەس گومڕا بكات ئەیكات و، هەركەس هیدایەت بدات ئەیدات. خودا ئەوانە هیدایەت ئەدات كە دڵیان لەسەر گەڕانەوەیە بۆ لای خودا.

(٢٨) خودا ئەوانە هیدایەت ئەدات كە ئیمانیان هێناوەو دڵیان بە یادی خودا دامەزراوەو پشت بەو ئەبەستن و هیوایان بەو هەیە. بێ‌گومان دڵ هەر بە یادی خودا دائەمەزرێ‌و لە دڵەڕاوكێ ئەكەوێ.

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَـَٔابٍ ﴿٢٩﴾ كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَٰكَ فِىٓ أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٌ لِّتَتْلُوَاْ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ ۚ قُلْ هُوَ رَبِّى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾ وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ وَعْدُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٣٢﴾ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ۗ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلْ سَمُّوهُمْ ۚ أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ أَم بِظَٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ ۗ بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكْرُهُمْ وَصُدُّواْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ لَّهُمْ عَذَابٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَقُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٣٤﴾



(٢٩) ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە، خۆشا بە حاڵی ئەوانە. جوانترین جێگاو باشترین دوارِۆژیان هەیە.

(٣٠) هەروەك ئەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ ڕەوانەمان کردوون، تۆیشمان لەناو ئوممەتێکدا ڕەوانە کرد کە پێش ئەوانیش چەند ئوممەتی تر ڕابووردوون. بۆ ئەوەیشمان ناردوویت ئەو قورئانەیان بەسەردا بخوێنیتەوە کە وەحیمان کردووە بۆت، ئەو ئوممەتە ئینکاری خودای میهرەبان و تەنیایی ئەو خودایە ئەکەن. جا تۆ پێیان بڵێ: هەر ئەو خودایە خودای منە، هیچ خودایەك نی‌یە بەڕاستی عیبادەتی بۆ بکرێ ئەو نەبێ. پشت هەر بەو ئەبەستم و گەڕانەوەی منیش و ئێوەیش بۆ لای ئەوە.

(٣١) ئەگەر قورئان کێوەکانی پێ بجووڵێنەوەو بکەونە هاتوچۆ، یا زەویی پێ لەت لەت بکرێ لە ترسی خودا، یا قسەی پێ بکرێ لەگەڵ مردووان و ئەوانیش بیبیسن و بیخوێننەوە، ئەوکافرانە هەر ئیمان ناهێنن. دە واز لەوانە بێنە. خودا توانی بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو دەستەڵات هەر هیی ئەوە. ئایا موسوڵمانەکان دڵنیا نەبوون و نازانن کافرەکان ئیمان ناهێنن؟ نازانن ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ هیدایەتی هەموو ئادەمزاد ئەدات، بەڵام ئەوە عادەتی ئەو نەبووەو نابێ. ئەو کافرانە بەهۆی کوفرەکەیانەوە هەمیشە سزایێکیان تووش ئەبێ کە ئەدات بە تەپڵی سەریاندا، یاخود بەڵایێك لە نزیکی ماڵەکانیانەوە نازڵ ئەبێت، تا بەڵێنی خودا دێتەدی بە مەرگیان یا بە هاتنی ڕۆژی قیامەت. خودا هەرگیز خیلاف وەعدە ناکات.

(٣٢) بەڕاستی گاڵتە بە گەلێ لە پێغەمبەرانی پێش تۆ کراو، منیش مۆڵەتی ئەو کافرانەم داو پاشان غەزەبم لێگرتن. جا سزای من بۆ ئەوان چۆن بوو ؟

(٣٣) ئایا کەسێك ئاگای لە هەموو نەفسێك بێ کە چی ئەکات و، هیچی لێ ون نەبێ وەکو یەکێکە وەها نەبێ؟ حاشا. ئەو کافرانە چەند هاوبەشێکیان بۆ خودا داناوە! دە تۆ پێیان بڵێ: ئا دەی ناوی ئەو هاوبەشانە بێنن بزانین چ کارەن؟ یا هەر باسی شتێك ئەکەن بۆ خودا کە گوایا ئەو نایزانێ و ئاگای لێی نی‌یە کە ئەوەش مەحاڵە، یا هەر بە قسەی ڕووتی بێ‌مەعنا ناوتان ناون هاوبەش ؟! نەخەیر ئەو کافرانە قسەی بێ‌مەعناو فڕوفێڵیان لا جوان کراوەو، ڕێگای ڕاستی خودایان لێ گیراوە. بێ‌گومان کەسێ خودا گومڕای بکات کەس نی‌یە ڕێگای ڕاستی پیشان بدات.

(٣٤) ئەوانە سزاو ئازاریان بۆ هەیە لە ژیانی دنیادا و، بەڕاستی سزای پاشەڕۆژیان ناهەموارترە و، هیچ کەسیان نی‌یە لە سزای خودایان بپارێزێ.

مَّثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوا وَّعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ (٣٥) وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَفْرَحُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ الْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُ قُلْ إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا أُشْرِكَ بِهِ إِلَيْهِ أَدْعُو وَإِلَيْهِ مَآبِ (٣٦) وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَمَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا وَاقٍ (٣٧) وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ (٣٨) يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ (٣٩) وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ (٤٠) أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَاللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ (٤١) وَقَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلِلَّهِ الْمَكْرُ جَمِيعًا يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ وَسَيَعْلَمُ الْكُفَّارُ لِمَنْ عُقْبَى الدَّارِ (٤٢)



(٣٥) نموونەی ئەو بەهەشتەی بەڵێنی پێ دراوە بە لەخواترسەکان، بەهەشتێکی ئەوتۆیە چەندین جۆبار بەناویا ئەڕواو خۆراکی بەردەوامەو سێبەریشی هەروەها. ئەم بەهەشتە پاداش و دوارۆژی ئەو کەسانەیە لە خودا ئەترسن. دوارۆژو سەرئەنجامی کافرانیش ئاگرە.

(٣٦) ئەوانەی لەمەوپێش کیتابمان بۆ ناردوون و موسوڵمان بوون، شادمان ئەبن بەو قورئانەی نازڵ کراوە بۆ سەر تۆ. لە کافرەکانیشدا هیی وایان هەیە ئینکاری هەندێك لە قورئان ئەکەن، تۆ پێیان بڵێ: من تەنها ئەمری ئەوەم پێ کراوە خودا بپەرستم و هاوبەشی بۆ دانەنێم و خەڵك هەر بۆ لای ئەو بانگ ئەکەم و، گەڕانەوەی منیش هەر بۆ لای ئەوە.

(٣٧) هەر بەو جۆرە کە کتێبەکانی پێغەمبەرانی پێشوومان نازڵ کرد، هەروایش حوکم و فەرمانی ئایینی ئیسلامان نازڵ کرد بە زوبانی عەرەبی. جا ئەگەر پاش ئەم زانیارییەی بۆت هاتووە، دوای ئارەزووی بەتاڵی کافرەکانی دەوروبەرت بکەوی، ئیتر لەلایەن خوداوە هیچ دۆست و یارمەتیدەرێکت نابێ و هیچ کەس ناتپارێزێ لە سزا و ئازار.

(٣٨) بە ڕاستی پێش تۆ چەندین پێغەمبەرمان ڕەوانە کردو، ژن و منداڵیشمان دابوونێ، واتە: ئەوانیش ئادەمزاد بوون وەك بنیادەمەکانی تر. هیچ پێغەمبەرێك بۆی ڕەوا نەبوەو ناتوانێ ئایەتێك یا موعجیزەیێك بێنێ کە خەڵکەکەی دەوروبەری داوایان لێ کردبێ، بە ئیزنی خودا نەبێ. هەروەها بۆ هەر ماوەیێکیش کتێب و حوکمێك هەیە لەلایەن خوداوە بۆ بەرەی ئادەمزاد.

(٣٩) ئەو حوکمەی خودا بیەوێ لای ئەبا و، ئەوەیشی بیەوێ بیهێڵێتەوە ئەیهێڵێتەوە. ئەسڵی هەموو کتێبەکانی پێغەمبەران کە (لوح المحفوظ)ە لای خودایە.

(٤٠) ئەگەر هەندێ لەو سزایانەت پیشان دەین کە وەعدەمان داوە بە کافرانی بگەیێنین یا بتمرێنین پێش ئەوەی بیبینی و چاوت پێ نەکەوێ، لە هیچکام لەم دوو حاڵەدا شتەکە ناگۆڕێ. تۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرەو ئێمەیش حیساب و تۆڵەسەندنەوە. کە واتە گوێمەدە بەوانەی ئیمان ناهێنن و پەلەت نەبێ بۆ سزادانیان.

(٤١) ئایا ئەو کافرانە تەماشا ناکەن و نابینن ئێمە لە هەموو لایێکەوە پێوانەی وڵاتی کافران کەم ئەکەینەوەو ئەیخەینە سەر وڵاتی موسوڵمانان، واتە: نابینن ئایینی ئیسلام پەرە ئەستێنێ؟ بێگومان خودا فەرمان ئەدا بە سەرکەوتنی ئیسلام و کەس ناتوانێ فەرمانی ئەو ڕەدبکاتەوەو تێکی بدات، خودا بە گورجی حیساب لەگەڵ کافران ئەکات.

(٤٢) بەڕاستی کافرەکانی پێش ئەوان فڕوفێڵی زۆریان لە پێغەمبەران و لە پەیڕەوەکانیان کرد. هەرچی مەکرە هی خودایە، چونکە مەبەست لە مەکرکردنی کەسێ لە کەسێکی تر ئازاردانیەتی و ئازاردانی ڕاستەقینەش بەدەستی خوایەو کەس ناتوانێ مەکرو فڕوفێڵ لە خوا بکا. هەر نەفسێ هەر کارێ بکات خودا پێی ئەزانێ و پاداش یا سزای بۆ ئامادە ئەکات. لەمەوپاش کافرەکان بۆیان دەرئەکەوێ ئەنجامی باش و پڕ لە خۆشی بۆ کێیە؟ بۆ ئەوانی بەدکردارە، یا بۆ موسوڵمانی چاککردار؟.

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسْتَ مُرْسَلًاۚ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾

## سُورَةُ إِبْرَاهِيمَ

ترتيبها ١٤ — آياتها ٥٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾



(٤٣) کافرەکان ئەڵێن: تۆ ڕەوانە نەکراویو فروستادەی خودا نیت. تۆ بڵێ: خودا بەسە بۆ شاهیدی لەنێوان منو نێوەداو ئەو کەسەیش کە بە ئیعجازو گەورەییو پایەبەرزیی قورئان ئەزانێ.

## سووڕەتی (إبراهيم)

مەککەیی‌یە ئایەتی ٢٨ و ٢٩ ی نەبێ‌و

(٥٢) ئایەتە

(١) ئەم قورئانە کتێبێکە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ لای تۆ تا ئادەمزاد لە تاریکیی گومڕاهییەوە دەربکەیت و بیبانخەیتە ناو ڕووناکیی شارەزایی بە ئیزنی خودای خۆیان، بۆ ڕێگای خودای خاوەن عیززەت و ستایش‌کراو.

(٢) ئەو خودا بە دەستەڵاتەی هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هەمووی هیی ئەوە. هاوار و ناخۆشی بۆ کافرەکان لە هاتنی سزایەکی سەختی نالەبار.

(٣) ئەوانەی ژیانی دنیا پەسەند ئەکەن بەسەر ژیانی پاشە ڕۆژدا و ڕێگا لە خەڵك ئەگرن کە ئیمان بە خودا بێنن و ئەیانەوێ ڕێگای ئایینی ئیسلام لار بێ تا بتوانن ڕەخنەی لێ بگرن، ئەوانە لە گومڕاهییەکی زۆر دوور لە حەقدان.

(٤) هیچ فروستادەیێکمان نەناردووە بۆ ڕەهبەری بە زوبانی قەومەکەی خۆی نەبێ بۆ ئەوەی ئەحکامی خودایان بۆ بەیان بکات و تێی بگەن. جا پاش ئەو بەیانە خودا ئەوەی بییەوێ گومڕاهی ئەکات و، ئەوەیشی بییەوێ ئەیخاتە سەر ڕێگای ڕاست. خودا خاوەن دەستەڵاتەو کارەکانی پڕحیکمەتن.

(٥) بەڕاستی ئێمە مووسامان نارد لەگەڵ موعجیزەی گەورەدا و پێمان وت قەومەکەت شارەزا بکەو لە تاریکییەوە بیانبەرە ڕووناکی و، ڕووداوەکان و سزای قەومەکانی تریان بخەرەوە یاد کە سزامان دان. بەڕاستی لەم شتانەدا چەند نیشانە هەیە بۆ هەموو کەسێکی خۆگر و سوپاسگوزار.

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ إِن تَكْفُرُوا أَنتُمْ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ ۛ وَالَّذِينَ مِن بَعْدِهِمْ ۛ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ ۚ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ قَالُوا إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾



(٦) یادی ئەوە بکە کە مووسا بە قەومەکەی خۆی وت: یادی نیعمەتی خودا بکەن لەسەرتان کە لەفیرعەون و دەستەو بەستەی ئەوی ڕزگار کردن کە خراپترین ئازاری ئەدان و کوڕەکانی سەرئەبڕین و ژنەکانی بە زیندوویەتی ئەهێشتنەوە. ئەم کارەساتەیش بەلاییکی گەورە بوو خودا تووشی ئێوەی کردبوو.

(٧) یادی ئەوە بکەن کە لە ڕێگای وەحیەوە خودا ئاگاداری کردن کە بەڕاستی ئەگەر سوپاسم بکەن نیعمەتتان بۆ زیاد ئەکەم و، ئەگەر سوپاسم نەکەن سزام زۆر سەختە.

(٨) مووسا وتی بە قەومەکەی: ئەگەر ئێوەو هەرچی ئەهلی سەر زەوییە کافر بن و سەرپێچی بکەن خودا نیازێکی بە ئێوە نی‌یەو لە زاتی خۆیا شایانی حەمدو سەنایە.

(٩) ئایا دەنگوباسی ئەوانەتان پێ‌نەگەیشتووە کە پێش ئێوە بوون لە قەومی نووح و عاد و سەموود و ئەوانەیش لە پاش ئەوان بوون کە خودا نەبێ کەس پێیان نازانێ. پێغەمبەرەکانیان بە موعجیزەوە هاتن بۆ لایان و ئەوان دەستیان ئەبرد بۆ دەمیان و لە داخی قسەی پێغەمبەرەکان پەنجەی خۆیان ئەگەست و بە پێغەمبەرەکانیان ئەوت ئێمە باوەڕمان نی‌یە بەوەی لەگەڵتان نێرراوە. ئێمە گومانێکی وامان هەیە ئەمانخاتە دوودڵییەوە لەو شتەی بانگمان ئەکەن بۆی کە ئیمان هێنانە.

(١٠) جا پێغەمبەرەکانیان وتیان: ئایا گومان هەیە لە بوونی خوداییکدا کە ئافەریدگاری ئاسمانەکان و زەوییەو، بانگتان ئەکات بۆ ئەوەی لە تاوانەکانتان خۆش ببێ و، مۆڵەتیشتان بدات بۆ ئەوەی تا ماوەییکی دیاری کراو بژین. کافرەکان بە پێغەمبەرەکانیان وت: ئێوە لە بنیادەمێکی وەك ئێمە بەولاوە نین، ئەتانەوێ ڕێمان لە پەرستنی ئەو شتانە لێ بگرن کە باوباپیرانمان پەرستوویانن. کەواتە دەلیلێکی ئاشکرامان بۆ بێنن ئیسپاتی قسەکەتان بکات کە ڕاستگۆن.

قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ وَمَا كَانَ لَنَا أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَانٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَا أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى اللَّهِ وَقَدْ هَدَانَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَا آذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَا أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ الظَّالِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ الْأَرْضَ مِن بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَاسْتَفْتَحُوا وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَائِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّاءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَائِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ مَّثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ ﴿١٨﴾



(١١) پێغەمبەرەکانیان وتیان: ئێمە لەڕاستیدا هەر ئادەمزادێکی وەکو ئێوەین، بەڵام خودای گەورە چاکە لەگەڵ کەسێ ئەکا کە خواستی لێ بێ لە بەندەکانی خۆیو پایەی پێغەمبەرایەتیی ئەداتێ. بۆ ئێمە ڕەوا نییەو ناتوانین بە ئیزنی خودا نەبێ موعجیزەیەك یا ئایەتێکی دیاری بهێنین بۆ ئێوە. کەواتە ئەوانەی خاوەن ئیمانن با هەر پشت بە خودا ببەستن.

(١٢) ئێمە چیمان دەست ئەکەوێ ئەگەر پشت بەخودا نەبەستین کە هیدایەتی داوین بۆ ڕێگای ڕاستی خۆمان کە ڕێگای فەرمانبەرداریی خودایە؟ بێگومان ئێمە خۆمان لە بەر ئازاری ئێوەدا ئەگرین، دەی با ئەوانەی پشت بە خودا ئەبەستن لەسەر ئەو پشتبەخودابەستنەیان بەردەوام بن.

(١٣) هەروەها کافرەکان بە پێغەمبەرەکانیان وت: یا دەرتان ئەکەین لەم خاك و وڵاتەی خۆمان، یا ئەبێ بگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینی ئێمە! جا خودا وەحیی بۆ پێغەمبەرەکان کرد: مەترسن، ئێمە بەڕاستی ئەو ستەمکارانە ئەفەوتێنین.

(١٤) پاش ئەوانیش ئێوە لە جێگای ئەواندا لە ئەرزا نیشتەجێ ئەکەین. ئەم پایەیە بۆ ئەو کەسانەیە لە هەیبەتی من بترسن و لە هەڕەشەی من بسڵەمێنەوە.

(١٥) پێغەمبەرەکان داوای فەتح و یارمەتییان لە خودا کردو، هەرچی زۆردارو ستەمکارە هەمووی فەوتانو نائومێد بوون.

(١٦) ستەمکار ئەنجامیشی لەوەپاش دۆزەخەو لە ئاوی کێم و زووخاوی دەرخوارد ئەدرێ.

(١٧) ئەیەوێ بیخواتەوە، ئەگیرێتە قوڕگیو بە زەحمەت بۆی قووت ئەچێو، لە هەموو لایێکەوە مەرگی بۆ دێت کەچی نایشمرێ تا بحەسێتەوەو، هەموو کاتێکیش سزایێکی سەختی لە بەردەمدایە.

(١٨) ئەوانەی ئیمانیان بە پەروەردگاری خۆیان نییە کردەوەیان وەك خۆڵەمێشێکە با گورج هەمووی بەرێ و تەفرو تووناى بکات لە ڕۆژێکدا کە بایێکی تیژی بەهێزی تێدا هەڵکردبێ. ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا هەرگیز هیچیان لەوەی لە دنیادا کردوویانە دەستگیر نابێ. ئا ئەمەیە گومڕاهیی قووڵی لە حەق دوور.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ قَالُوا۟ لَوْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيْنَٰكُمْ ۖ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَجَزِعْنَآ أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ ﴿٢١﴾ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾



(١٩) ئایا نابینی خودا ئاسمانەکان و زەویی بە ڕاستی و حیکمەت دروست کردوون؟ ئەگەر مەیلی ببێ هەمووتان لەناوئەبات و خەلکێکی تازە ئەهێنێتە ڕووی کار.

(٢٠) ئەو کارەیش لای خودا شتێکی گران نی‌یە.

(٢١) لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو لە قەبر دەرئەچن و لای خودا حازر ئەبن بۆ حیساب، جا داماوەکان بە خاوەن ترو فیزەکان ئەڵێن: ئێمە کە لە دنیادا باوەڕمان بە پێغەمبەران نەئەکرد، دوای ئێوە کەوتبوین، ئایا ئێوە ئێستە بەشێ لەو سزای خودایەمان لێ لائەدەن؟ ئەوانیش ئەڵێن: ئەگەر خوا هیدایەتی ئێمەی بدایە ئێمەش هیدایەتی ئێوەمان ئەدا. ئێستە یەکسانە بۆ ئێمە دلگران بین یاخۆمان بگرین‌و سەبر بکەین، هەرگیز دەرفەتی ڕزگاربوونمان نی‌یە.

(٢٢) جا کاتێ کە حوکم بڕایەوەو بەهەشتییان چوونە بەهەشت و دۆزەخییان چوونە دۆزەخ، شەیتان بە دۆزەخییەکانی وت: خودا بەڵێنی پێ دان و ڕاستی لەگەڵ کردن و هێنایەدی، منیش بەڵێنم پێ‌دان کە حیساب نی‌یەو درۆم لەگەڵ کردن. من هیچ زۆرێکم نەبوو بەسەرتانەوە، تەنها ئەوەندە بوو بانگم کردن بۆ ڕێگای چەوت و بەگوێتان کردم. ئیستە سەرزەنشتی من مەکەن. سەرزەنشتی خۆتان بکەن کە بەگوێتان کردم. نە من ئەتوانم ئێوە لە سزا ڕزگار بکەم و نە ئێوەیش ئەتوانن من ڕزگار بکەن. من ئیمانم بەوە نی‌یە کە لەمەوپێش ئێوە منتان کردە هاوبەشی خودا. بەڕاستی ستەمکاران سزای سەختیان هەیە.

(٢٣) ئەوانەیش کە ئیمانیان هێنا و کردەوەی باشیان بوو، خرانە ناو چەند بەهەشتێکەوە کە جۆگەو جۆبار لەژێریانەوە ڕەوان ئەبێ، بە ئیزنی خودا هەتا هەتایە لەو بەهەشتانەدا ئەمێننەوەو مەلائیکەکان قەدریان ئەگرن و سلاویان لێ ئەکەن.

(٢٤) ئایا نابینی خودا چۆن نموونەیەکی جوان باس دەکات کە ئەڵێت: قسەیێکی جوان وەکو دارێکی جوانە بنجەکەی بەزەویدا ڕۆچووبێ‌و لقەکانیشی لە ئاسمان بن؟

تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦ ۗ قُلْ تَمَتَّعُوا۟ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾



(٢٥) هەموو کاتێ بە ئیزنی ئەو خودایەی درووستی کردووە بەر بدا بە خەڵك. خودا میسال و نموونە دەهێنیتەوە بۆ خەڵك بەڵکو بیر لە گەورەیی و دەستەڵاتی خودا بکەنەوە.

(٢٦) نموونەی قسەیەکی خراپیش وەك دارێکی پیسی بێکەڵکە ڕەگو ڕیشەی لە زەوی دەرکێشرابێ و لە جێگەی خۆیدا دانەچەقێ و جێگیر نەبێ.

(٢٧) خوا لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانە دامەزراو ئەکا کە باوەڕیان بە وتەی چەسپاوی خوابەیەکزانین (لا الە الا الله) هەیە. لە دنیادا ناهێڵێ پێیان هەڵخلیسکێ و لە باوەڕی خۆیان پەشیمان ببنەوە و، لە ڕۆژی قیامەتیشا ناهێڵێ لە کاتی وەڵامدانەوەدا زمانیان تەتەڵە بکاو وەڵامیان پێ نەدرێتەوە. ستەمکارانیش کە ستەمیان لە خۆیان کردووە، خوا گومڕایان ئەکات چونکە بیریان نەئەکردەوە تا ڕێی ڕاست بدۆزنەوەو هەر لەسەر چاولێکەریی باوو باپیرانیان ئەڕۆیشتن. خودا هەرچی مەیل لێ بێ ئەیکات.

(٢٨) ئایا ئەوانە نابینی کە نیعمەتی خودایان پشتگوێ خست و سوپاسی ئەو نیعمەتەیان نەکرد و سوپاسەکەیان گۆڕی بە کوفرو خۆیان ماڵوێران کردو قەومەکانیشیان خستە خانەی فەناوە چونکە هانیان دان بۆ کافربوون؟

(٢٩) ئەو خانەی فەنایەیش دۆزەخە ئەڕۆنە ناوی‌و بە گەرماییەکەی ئەبرژێن و دۆزەخ پیسترین شوێن و ماوایە.

(٣٠) ئەو کافرانە چەند هاوبەشێکیان بۆ خودا داناوە کە ئادەمزادیان پێ گومڕا بکەن. تۆ پێیان بڵێ: ئەمڕۆ لەم دنیایەدا ڕابوێرن و لەزەت وەربگرن، بەڕاستی پاش ئەم دنیایە دوارۆژ و ماواتان ئاگری دۆزەخە.

(٣١) بڵێ بەو بەندانەم کە ئیمانیان هێناوە: با نوێژ بکەن و لەو ڕزقو ڕۆزییەی پێمانداون بەئاشکراو بەنهێنی لە ڕێگای خودادا صەرف بکەن پێش ئەوەی ڕۆژێکی وا بێتە پێشەوە نە خرید و فرۆشتنی تێدا هەیەو نە برادەریو دۆستی‌و یارمەتی.

(٣٢) خودا ئەو خوایە ئاسمانەکان و ئەرزی دروست کردووەو لە ئاسمانەوە ئاوی ناردووەتە خوارەوەو، بەو ئاوە گەلێ بەرو میوەی دەرکردووەو کردوونی بە ڕزق و ڕۆزی بۆ ئێوە. هەروەها کەشتیی بۆ ملکەچ و دەسەمۆ کردوون، بۆ ئەوەی هات وچۆ بکات لە دەریادا بە فەرمانی خودا. ڕووبارەکانیشی بۆ ڕام کردوون تا سوودیان لێ وەربگرن.

(٣٣) خۆر و مانگیشی بۆتان ڕامکردووە بەردەوام و، شەوو ڕۆژی بۆ ڕام کردوون بۆ ژیوار پەیداکردن و بۆ حەسانەوەتان.

وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُۚ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٞ كَفَّارٞ ﴿٣٤﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنٗا وَٱجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣٦﴾ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِيٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِي وَمَا نُعْلِنُۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيْءٖ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ رَبِّ ٱجْعَلْنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٖ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾



(٣٤) لە هەموو جۆرە شتێ داواتان کردووە لێی، پێی داون. ئەگەریش ئێوە نیعمەتەکانی خودا بژمێرن ناتوانن باسی هەموویان بکەن. بەڕاستی ئادەمزاد ستەم لە خۆیو غەیری خۆی ئەکا و ئینکاری نیعمەتەکانی خودا ئەکات.

(٣٥) یادی ئەوە بکە کە ئیبراهیمی خەلیل وتی: خودایا! ئەم شاری مەککەیە ئەمین بکە لە ستەمکارو، خۆم و نەوەکانم بپارێزەو دوورمان بخەرەوە لە بتپەرستن.

(٣٦) خودایە! بتەکان خەڵکێکی زۆریان گومڕا کردووە. جا هەرکەس دوای من بکەوێ و پەیڕەویی ئایینی من بکا ئەوە لە منەو هەرکەسیش بەگوێم نەکا ئەوا تۆ گوناهپۆش و میهرەبانی و هەموو کارێ بە دەستی خۆتە.

(٣٧) خودایا! من هەندێ لە نەوەکانم لە شیوێکی بێکشتوکاڵدا نیشتەجێ کردووە لە نزیکی ماڵە پیرۆزەکەی تۆوە کە حەرامە دەستی بۆ ببرێ یا بە سووکی تەماشای بکرێ، یا دوژمن دەستدرێژی لێ بکات. خودایا بۆیە لێرە دامناون نوێژت بۆ بکەن. دەی سا دڵی هەندێ ـیادەم وەها لێ بکە مەیل بکەن بۆ لایانو، لەبەر و میوەی جیهان ڕزقیان بدەرێ، هیوام وایە ئەوانیش سوپاسی ـیعمەتی تۆ بکەن.

(٣٨) خودایا تۆ بەوە ئەزانی کە ئەیشارینەوەو بەوەیش کە دەری ئەبڕین. نە لە ئاسمان و نە لە زەویدا هیچ شتێ لە ـودا ون نابێ.

(٣٩) ستایش بۆ ئەو خودایە کە لەسەر پیری ئیسماعیل و ئیسحاقی پێ بەخشیم. بەڕاستی خودا شنەوای دوعایە.

(٤٠) خودایا بمکە بە ئینسانێ بەردەوام بم لەسەر نوێژو عیبادەت. هەروەها لە نەوەیشم. خودایا دوعایشم قبووڵ ـکە.

(٤١) خودایا! لەو ڕۆژەدا کە حیساب بەرپا ئەبێ، تاوانی خۆم و باوك و دایکم بپۆشە، هی ئەوانەیش لەسەر دەستی ـنا ئیمانیان پێت هێناوە.

(٤٢) ئەی پێغەمبەر! تۆ هەرگیز وا مەزانە خودا بێ ئاگایە لە کردەوەی ستەمکاران. خودا بۆ ڕۆژێکی هەڵگرتوون چاو تیایا ئەبڵەق ئەبێ، کە ڕۆژی قیامەتە.

مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ
هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ
ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ
ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم
مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَـٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟
أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا
لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ
مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ
﴿٤٦﴾ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ
ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ ۖ
وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ
مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ
وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَـٰذَا بَلَـٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟
بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٥٢﴾



(٤٣) بەپەلە ئەڕۆن بەدوای ئەو فریشتەدا کە مەئموورە لەسەریان و سەریان بەرزکردووەتەوەو چاویان وەرناگەڕێ بۆ لایان و ئەبلەق بووەو دڵیشیان هۆش و فامی تێدا نی‌یە.

(٤٤) خەڵك بترسێنە لەو ڕۆژەی کە سزای خودا دێت. ئەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردووە، لەو ڕۆژەدا ئەڵێن: خودایا! بۆ ماوەیەکی کەم دوامان بخە بەڵکو تەوبە بکەین و بکەوینە دوای بانگەوازەکەت و پەیڕەویی پێغەمبەران بکەین! ئەی ئەوە نەبوو ئێوە پێش ئیستە، واتە لە دنیادا، سوێندتان ئەخوارد کە هەرگیز لەناوچوونتان بۆ نی‌یە ؟

(٤٥) هەروەها لە دنیادا لەماڵەکانی ئەواندا دانیشتن کە ستەمیان لە خۆیان کردبوو و بۆتان دەرکەوت چیمان لێ کردن! چەند نموونەیشمان بۆ هێنانەوە بەڵکو پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرن.

(٤٦) بەڕاستی کافرەکان مەکری زۆریان کرد و، ئەو مەکرانەیان لای خودا ئاشکرا بوون و خوا ڕۆژی خۆی تۆڵەیان لێ ئەستێنێ، ئەگەرچی مەکرەکەیان ئەوەندە بەهێز بوو لەوانەبوو شاخ لە شوێنی خۆیدا تەخت بکا.

(٤٧) لات وا نەبێ خودا لەگەڵ پێغەمبەرانی خۆیدا خیلاف وەعدە ئەکات! بەڕاستی خودا بەدەستەڵات و تۆڵەسێنە.

(٤٨) ئەو تۆڵە سەندنەوەیشە لە ڕۆژێکدا ئەبێ کە ئەم زەوییە ئەگۆڕێ بە زەوییەکی تر و ئاسمانەکان بە ئاسمانی تر و هەرچی ئادەمزادە لە گۆڕ دەرئەچن و لە بەردەم دادگای خودای تاكو تەنیاو بەدەستەڵاتدا ڕائەوەستن.

(٤٩) لەو ڕۆژەدا تاوانباران ئەبینی لە کۆت و زنجیردا ڕیزکراون.

(٥٠) کراسەکانی بەریان بریتییە لە قەترانی ڕەش و، ئاگر هەموو دەموچاویان دائەپۆشێ.

(٥١) ئەمانە دێنە دیار بۆئەوەی خودا بەهەر نەفسێ پاداشی خۆی بداتەوە. بەڕاستی خودا زۆر بەگورجی حیساب لەگەڵ خەڵکدا ئەکات.

(٥٢) ئەمەی لەم سورەتەدا نازڵ بوو ئاگادارییەك بوو بۆ خەڵك و، بۆ ئەوە هاتووە حاڵی بن و پێی بترسێنرێن و بزانن خودای جیهان یەك خودای تاك و تەنیایە. هەروەها بۆ ئەوەیە خاوەن هۆشان بیربکەنەوە.

# سُورَةُ الحِجۡرِ

آياتها ٩٩ · ترتيبها ١٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ﴿١﴾ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ كَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴿٢﴾ ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ﴿٤﴾ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ﴿٥﴾ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ﴿٦﴾ لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَمَا كَانُوٓاْ إِذٗا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٢﴾ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ ﴿١٥﴾





## سووره‌تی (الحِجۡرِ)

مه‌ککه‌یی‌یه ئایه‌تی ٨٧ ی نه‌بیّ، (٩٩) ئایه‌ته

(١) خوا خۆی ئه‌زانیّ مه‌به‌ستی له (الـر) چی‌یه. ئه‌وه‌ی له‌م سووره‌ته‌دایه ئایه‌تی کیتاب و قورئانێکی ئاشکراو دیارییه.

(٢) له ڕۆژی قیامه‌تدا کافره‌کان ئاوات ئه‌خوازن ئه‌ڵێن: کاشکی موسوڵمان بوایه‌ین!

(٣) لێیان گه‌ڕیّ با بخۆنو ڕابوێرن و، هیوای پڕوپووچی خۆشیو پیرۆزیی دوارۆژ بیّ ئاگایان بکات. له‌مه‌ولا له ڕۆژی قیامه‌تدا ئه‌زانن ئه‌نجامیان چۆن ئه‌بیّ؟

(٤) ئێمه هیچ ئاوه‌دانییێکمان وێران نه‌کردووه ئیللا واده‌یه‌کی دیاریکراو هه‌یه بۆ وێرانکردنیو کاتو چۆنیه‌تیی ئه‌و وێرانکردنه له (لوح المحفوظ) دا نووسراوه.

(٥) هیچ نه‌ته‌وه‌یێك له ئاکامی خۆی پێش ناکه‌ویو لێیشی دواناکه‌ویّ.

(٦) کافره‌کان به گاڵته‌پیّ‌کردنه‌وه به پێغه‌مبه‌ریان وت: ئه‌ی ئه‌و که‌سه‌ی قورئانی نازڵ کراوه‌ته سه‌ر به ڕاستی تۆ شێتی!

(٧) ئه‌وه تۆ بۆچی فریشته‌مان ناهێنیته سه‌ر ئه‌گه‌ر له‌م هه‌ڕه‌شه‌و گوڕه‌شه‌تدا ڕاستگۆی؟

(٨) ئێمه فریشته نازڵ ناکه‌ین ئیللا به‌جۆریّ که حیکمه‌تمان بیه‌ویّ نه‌ك به ئاره‌زووی ئه‌وان. ئه‌و کاته‌یش که نازڵی بکه‌ین کافره‌کان هیچ مۆڵه‌ت نادرێن.

(٩) ئێمه خۆمان قورئانمان نازڵ کردووه‌و هه‌ر ئێمه‌یش ئه‌یپارێزین له‌وه‌ی بفه‌وتیّ یا ده‌سکاری بکریو زیادو که‌می تیدا بکریّ.

(١٠) به‌ڕاستی ئێمه، پێش تۆیش پێغه‌مبه‌رانمان ناردووه بۆ سه‌ر تاقمه پێشووه‌کان.

(١١) کافره‌کان، هه‌ر پێغه‌مبه‌ریّ هاتبیّ بۆ سه‌ریان گاڵته‌یان پیّ کردووه.

(١٢) ئێمه ئاوا گومڕاهیو کوفر ئه‌خه‌ینه دڵی تاوانبارانه‌وه.

(١٣) خستوومانه‌ته دڵیانه‌وه که ئیمان نه‌هێنن. به‌ڕاستییش کرداری خودا له ناو کافره پێشووه‌کاندا تێپه‌ڕی کردووه که بیخاته دڵیانه‌وه ئیمان نه‌هێنن.

(١٤) ئه‌گه‌ر ده‌رگایه‌کمان له ئاسمان بۆ بکردنایه‌ته‌وه‌و به‌رده‌وام لێیه‌وه سه‌رکه‌وتنایه،

(١٥) ئه‌یانوت: چاوبه‌ستمان لیّ کراوه. نه‌خه‌یر، ئێمه جادوومان لیّ کراوه.

وَلَقَدۡ جَعَلۡنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظۡنَٰهَا مِن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسۡتَرَقَ ٱلسَّمۡعَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ مُّبِينٞ ﴿١٨﴾ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡزُونٖ ﴿١٩﴾ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسۡتُمۡ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٢١﴾ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَسۡقَيۡنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمۡ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحۡشُرُهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٦﴾ وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾



(١٦) بەڕاستی ئێمە لە ئاسماندا چەند بورجێكو چەند مەقامێكمان داناوە بۆ خۆرو مانگ بە درێژایی وەخت. هەروەها ئاسمانەكانو بورجەكانمان ڕازاندوونەتەوە بۆ ئەوانەی سەیریان ئەكەن.

(١٧) ئاسمان و بورجەكانمان لە هەموو شەیتانێكی دوور لە ڕەحمەتی خودایش پاراستووە.

(١٨) شەیتانێ نەبێ كە گوێ ڕابگرێ بییەوێ قسەیێ بدزێ، ئەویش نەیزەكێكی سۆزندەی ئاشكرای شوێن ئەكەوێو ڕاوی ئەنێت و ئەیسووتێنێ.

(١٩) ئێمە هەروەها زەویمان درێژكردوەتەوەو چەند كێوێكی گەردنكەشو دامەزراومان تیا داكوتاوەو، هەرچی شتێ كە موناسبی حیكمەت بێ تیامانا ڕواندوە.

(٢٠) لەو زەوییەدا هەرچی هۆی ژیانە بۆمان دروست كردوون، هەروەها بۆ ئەوانەیش كە ئێوە ڕۆزیدەریان نین و خودا ڕۆزییان ئەداتێ.

(٢١) هەرچی لە دنیادا هەیە خەزێنەكانی لای ئێمەیەو بە ئەندازەیێكی دیاریكراو نەبێ دایناببەزێنین.

(٢٢) باكانمان بە سكپڕی، یا بۆ پێوەندو تەلقیحكردنی دارو درەخت ناردو، لە ئاسمانەوە ئاومان بۆ ناردنو دامانە دەرخواردتان، یا كردمانن بە ئاودێری دارودرەخت و، كشتوكاڵتان بەو ئاوە ئاو دا كە ئێوە خۆتان ئەو ئاوەتان هەڵ نەگرتووەو نەتانكردووەتە چاڵاوەوە.

(٢٣) بەڕاستی ئێمە مردوو زیندوو ئەكەینەوەو، زیندوو ئەمرێنینو هەر ئێمە لەپاش ئێوە ئەمێنینەوە.

(٢٤) بەڕاستی ئێمە بەوانەتان ئەزانین كە لە پێشدا لە دایك ئەبن و لە پێشدا ئەمرن و، بەوانەیشتان كە دواتر لە دایك ئەبنو دواتر ئەمرن. یا ئێمە بە ئەحواڵی ئەوانەی لە پێش ئێوە بوونو ئەوانەی لە پاش ئێوە دێن، ئەزانین.

(٢٥) بەڕاستی خودای تۆ هەموویان لە ڕۆژی قیامەتدا كۆئەكاتەوە. خودا كارەكانی پڕ لە حیكمەتن و بە هەموو شت ئەزانێ.

(٢٦) بەڕاستی ئادەمزادمان لە قوڕێكی وشك دروست كردووە كە دەستی لێ بدەی دەنگی لێوە دێ، ئەو قوڕەیش لە قوڕێكی ڕەشی ڕەنگ گۆڕاوی لەقاڵب دراوە.

(٢٧) جینێیشمان، پێش ئینسان، لە ئاگرێكی زۆر گەرم دروست كرد.

(٢٨) یادی ئەوە بكەرەوە كە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەكانی وت: من ئینسانێك لە خاكێكی ئاوازەداری سیاڕەنگو ترشاو دروست ئەكەم.

(٢٩) جا كە ڕێكم خست و لەلایەن مەئمووری خۆمەوە فووم پیا كردو گیانی چوو بەبەرا، ئێوە لەبەردەمیا بكەون و كوڕنووشی قەدرو حورمەتی بۆ بەرن.

(٣٠) جا فریشتەكان هەموو سەرپاك كوڕنووشیان برد بۆ ئادەم.

(٣١) ئیبلیس نەبێ كە نەیویست لەگەڵ كوڕنووشبەرەكان بێ و سوجدە بۆ ئادەم بەرێ.

قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمۡ أَكُن
لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٣٣﴾ قَالَ
فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ
ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ
مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ
أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾
إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ
مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ
ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٣﴾
لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾ إِنَّ
ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾
وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ
﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾
۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي
هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾



(٣٢) خودا فەرمووی: ئیبلیس ! ئەوە چیتە؟ بۆ لەگەڵ سوجدەبەرەکان نەبوویت؟

(٣٣) وتی: ڕەوا نی‌یە من کڕنووش بۆ بەشەرێ بەرم لە خاکێکی ئاوازەداری سیاڕەنگ دروست کرابێ.

(٣٤) خودا فەرمووی: دە دەرچۆ لە بەهەشت چونکە تۆ دەرکراوی‌و لە ڕەحمەتی من بێ بەشی.

(٣٥) تا ڕۆژی سزایش، لەلای منەوە نەفرینت لێ کراوە.

(٣٦) ئەنجا شەیتان وتی: کەواتە خودایا! تا ئەو ڕۆژەی ئینسان و جیننی زیندوو ئەکرێنەوە بمهێڵەرەوەو مەمکوژە.

(٣٧) خوا فەرمووی: باشە لە ئێستەوە تۆ لەوانەی ئەهێڵرێنەوەو نامرێنرێن.

(٣٨) تا ڕۆژێ کاتی دیاری کراو بۆ مراندنت دێ.

(٣٩) شەیتان وتی: خودایا مادام تۆ منت گومڕا کرد، منیش هەرچی تاوانە لای ئەوانی جوان ئەکەم لەسەر زەویداو هەموویان گومڕا ئەکەم.

(٤٠) مەگەر ئەو بەندانەت کە پاکیزەو هەڵبژاردەن.

(٤١) خوا فەرمووی: ڕزگارکردنی پاکیزەکان ڕێگای ڕاستی منە.

(٤٢) بەڕاستی تۆ هەرگیز دەستت بەسەر بەندەکانی مندا ناڕوا مەگەر ئەوانەی بکەونە شوێنت لە گومڕاهەکان.

(٤٣) بێ‌گومان دۆزەخ مەڵبەندی ئەوانە هەموویانە.

(٤٤) دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە هەر دەرگاییێکیان بەشێکی تایبەتیی هەیە. دەرگایەك هیی کافرانە، دەرگایەك هیی موسوڵمانانی گوناهبارەو... تاد.

(٤٥) بەڕاستی ئەوانەی لە خودا ئەترسن‌و خۆیان لە گوناە ئەپارێزن، لەناو بەهەشتداو لەسەر سەرچاوەی کانی‌و ئاون.

(٤٦) فەرموون بڕۆنە ناویانەوەو بە ئەمینی لە هەموو شتێکی ناخۆش بمێننەوە تیایاندا.

(٤٧) هەرچی کینەو ناحەزی هەبوو لە سینەیانمان دەرهێنا و، بەرامبەر یەك، لەسەر کورسی دائەنیشن.

(٤٨) هیچ ئەلەم‌و ئازارێ ناگا بە لەش‌و دڵیان‌و لەو بەهەشتانەیش دەرناکرێن.

(٤٩) خەبەر بە بەندەکانم بدە کەوا من گوناهپۆش‌و میهرەبانم.

(٥٠) هەروەها کە سزایشم سزایێکی پڕئازارە.

(٥١) دەنگوباسی میوانەکانی ئیبراهیمیشیان بۆ بگێڕەوە.

إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَـٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِى عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِىَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا۟ بَشَّرْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَـٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَـٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَـٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَـٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾



(٥٢) کە چوونە ماڵەوە بۆ لایو وتیان: سەلامتان لێ بێت. ئەویش پاش جوابدانەوەی سەلامەکەیان وتی: بەڕاستی ئێمە لێتان ئەترسین.

(٥٣) وتیان: مەترسە، ئێمە مژدەی کوڕێکی زانات ئەدەینێ.

(٥٤) وتی: ئایا بەم حاڵی پیرییەمەوە مژدەم ئەدەنێ؟ مژدەی چیم ئەدەنێ؟

(٥٥) وتیان: مژدەی ڕاستییت ئەدەینێ، دە تۆیش لە نائومێدان مەبە.

(٥٦) وتی: جا لە گومڕاهان بەو لاوە کێ لە ڕەحمەتی خودای خۆی نائومێد ئەبێ؟

(٥٧) وتی: کە واتە ئیشتان چییە ئەی فروستادەکان؟

(٥٨) وتیان: ڕاستیەکەی ئێمە نێرراوین بۆ سەر قەومێکی تاوانبار.

(٥٩) تەنها ماڵو منداڵی لووط خۆی نەبێ کە هەموویان ڕزگار ئەکەین.

(٦٠) ژنەکەی نەبێ کە بڕیارمان داوە لەگەڵ کافرەکان بمێنێتەوە تا هەموو پێکەوە سزا ئەدرێن.

(٦١) کە فروستادەکان هاتن بۆ لای ئالی لووط،

(٦٢) لووط پێی وتن: ئێوە قەومێکی نەناسراون.

(٦٣) ئەوانیش وتیان: ئێمە قەومێکی نەناسراو نین بەو مەعنا کە تۆ ئەیڵێیت، بەڵکو هەواڵی ئەو سزایەمان هێنا... بۆت کە قەومەکەت گومانیان تێیدا هەبوو.

(٦٤) ئێمە هەواڵێکی ڕاستمان بۆ هێناوی کە سزادانی ئەو تاوانبارانەیەو ڕاست ئەکەین لەمەدا کە پێتی ڕائەگەیەنین.

(٦٥) بە شەو ماڵو منداڵی خۆت بڕەوێنە، با شەوی بمێنێ بڕۆن و، خۆیشت بکەوەرە دوایانو بیانجووڵێنە با دەستو... بکەن بڕۆنو دوانەکەون. با کەستان لا نەکاتەوە بۆ دواوە نەوەك سزاکە ئەویش بگرێتەوە. بڕۆن بۆ ئەو شوێنەی ئەمرتان پێ ئەکرێ بۆی بڕۆن.

(٦٦) وەحیمان بۆ کرد کە ئەو قەومە تاوانبارە لە بەرەبەیاندا بنەبڕ ئەکرێنو کەسیان لێ نامێنێ.

(٦٧) ئەهلی شارەکەی قەومی لووط کە لە هاتنی میوانەکانی لووط ئاگادار بوون، هاتن بە یەکداو لە خۆشی هاتنی ئەو مەئموورانە مژدەیان بەیەك ئەدا. تەماعیان تێ کردبوونو ئەیانویست ئەو کارە بەدەی کردبوویان بـ... عادەت لەگەڵ میوانی نێرینەیان ئەکرد لەگەڵ ئەوانیشی بکەن.

(٦٨) لووط پێی وتن: ئەمانە میوانمن، ئابڕووم مەبەن.

(٦٩) لەخوا بترسنو شەرمەزارم مەکەن.

(٧٠) بە لووطیان وت: ئێمە پێمان نەوتی حەقت بەسەر خەڵکەوە نەبێ؟

قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٧﴾ وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ ﴿٧٩﴾ وَلَقَدۡ كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡحِجۡرِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُمۡ ءَايَٰتِنَا فَكَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ ﴿٨١﴾ وَكَانُواْ يَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُصۡبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَقُلۡ إِنِّيٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾



(٧١) لووط وتی: ئەوەتان کچەکانم، ئەگەر حەز ئەکەن مارەیان بکەن لە خۆتان.
(٧٢) بەگیانت قەسەم ئەو کافرانە لە سەرخۆشیی خۆیاندا سەرگەردانن، ئیتر چۆن ئامۆژگارییان ئەچێتە گوێ؟
(٧٣) جا لە بەرەبەیاندا کە خۆر خەریکە کەناری ئاسمان ڕوونکاتەوە، دەنگی فریشتەی سزا گرتنی.
(٧٤) شوێنەکەیانمان سەرەوژێر کردو بە گڵمتکی وەك بەرد ڕەق بەردەبارانمان کردن.
(٧٥) بەڕاستی لەم بەسەرهاتەدا نیشانەی گەورەیی‌و دەستەڵاتی خودا هەیە بۆ ئەوانەی زیرەکن و شت بە نیشانەدا ئەناسنەوە.
(٧٦) ئەو دێو شوێنە لەسەر ڕێگاییێکی ڕاست‌و دامەزراوە، کە خەڵك پیایا ئەڕۆن و ئەو پاشماوانە ئەبینن.
(٧٧) بەڕاستی لەو ڕووداوەدا نیشانەی دەستەڵاتی خودا هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن باوەڕن.
(٧٨) بەڕاستی بێشەنشینەکانی قەومی شوعەیب ستەمکار بوون.
(٧٩) جا تۆڵەمان لێ سەندن. ئەم دوانە، واتە سەدیم و ئەیکە، لەسەر ڕێگاییێکی دیاری‌و ئاشکران کەس لێی تێکناچن.
(٨٠) بەڕاستی خاوەنەکانی حیجریش کە قەومی سەموود بوون، پێغەمبەرانیان بەدرۆ ئەخستەوە.
(٨١) ئایەت و موعجیزەی خۆمانمان پیشان دان بەڵام ئەوان باوەڕیان پێ نەئەکردو ڕوویان لێ وەرئەچەرخاند.
(٨٢) ئەوانە خانوویان لە شاخەکان دائەتاشی‌و بە ئەمینی تیا دائەنیشتن.
(٨٣) جا نرکەی فریشتەی سزا لە بەرەبەیاندا گرتنی‌و لەناوی بردن.
(٨٤) ئەوەی پەیدایان ئەکرد لە ئەسبابی دنیاو هێزی عادەتیی خۆیان، هیچی فریایان نەکەوت‌و سوودی نەبوو بۆیان.
(٨٥) ئاسمانەکان‌و زەوی‌و ناوبەینیانمان، بە حەق نەبێ دروست نەکردووە. بەڕاستی ڕۆژی قیامەت دێت. جا کەواتە تۆیش چاوپۆشی بکە بە چاوپۆشییەکی جوان کە بریتییە لە بانگکردنیان بە زمانی شیرین و بە نەرمی‌و خۆشی بۆ ئیسلام بوون.
(٨٦) بەڕاستی خودای تۆ ئافەریدگارو زانایە.
(٨٧) بەڕاستی ئێمە حەوت ئایەتی سوورەتی فاتیحەمان پێ داوی کە هەموو ڕۆژێ لە نوێژەکاندا دووبارە ئەبنەوە. هەروەها قورئانی پایەبڵندمان پێ داوی.
(٨٨) چاوەکانت مەبڕەرە ئەوەی بە هەندێ لە کافرەکانمان داوە لە خۆشی‌و لەزەتی دنیا و، هەرگیز خەفەت بۆ ئەو نازو نیعمەتەی ئەوان مەخۆو باڵت ڕاخە بۆ موسوڵمانان.
(٨٩) بیشڵێ من ترسێنەرێکی ئاشکرام لە سزای ڕۆژی قیامەت.
(٩٠) هەروەکو سزامان ناردە سەر ئەوانەی ڕێگاکانی مەککەیان لە ڕۆژانی حەجدا ئەگرت و نەیانئەهێشت خەڵك بێن موسوڵمان بن.

الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ ﴿٩٥﴾ الَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ ﴿٩٩﴾

## سُورَةُ النَّحْلِ

مكية ١٦ — آياتها ١٢٨

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

أَتَىٰ أَمْرُ اللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ ۚ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١﴾ يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ ﴿٢﴾ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ ۚ تَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾



(٩١) ئەوانەی ئیمانیان بە هەندێ لە قورئان هەیە ئەوەی موافیقی تەورات بیٚ‌و، ئیمانیان بە هەندێکی نی‌یە کە موخالیفیەتی.
(٩٢) قەسەم بە خودای خۆت لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیار لە هەموویان ئەکەین.
(٩٣) لەو کردەوانەی لە دنیادا ئەیانکردن.
(٩٤) دەی ئەوەی ئەمرت پیٚ ئەکریٚ بەئاشکرا بیلیٚ با هەموو خەڵك پێی بزانن‌و، گویٚ مەدەرە کافرەکان‌و قسەی هیچوپووچیان.
(٩٥) تۆ ئێمەت بەسە بۆ لەناوبردنی ئەوانەی گاڵتەت پیٚ ئەکەن.
(٩٦) ئەوانەی لەگەڵ خودای بەحەق پەرستراودا خودایەکی تر بڕیار ئەدەن، ئەوانە لەمەوپاش ئەزانن چییان بەسەر دیٚ؟!.
(٩٧) ئێمە چاك ئەزانین تۆ دڵت بە قسەی نارەوای ئەوان تەنگ ئەبیٚ.
(٩٨) تۆ تەسبیح و تەعزیمی خودای خۆت بکە لەگەڵ سەناو ستایشیدا و، لەوانە بە هەمیشە سوجدە بۆ پەروەردگار ئەبەن.
(٩٩) تا مردنیشت بۆ دیٚ، خوای پەروەردگاری خۆت بپەرستە.

## سوورەتی (النحل)

مەککەیی‌یە تەنها سیٚ ئایەتی دواییی نەبیٚ‌و (١٢٨) ئایەتە

(١) فەرمانی خودا هاتووە بە سزادانی کافرەکان، پەلەی لیٚ مەکەن. پاکی‌و بیٚ‌عەیبی هەر بۆ خودایە. خودا لەوانە بەرزترە کە ئەوان ئەیانکەنە هاوبەشی لە خوایەتیدا.
(٢) خودا فریشتە ئەنێریٚ بە وەحیەوە بە فەرمانی خۆی بۆ سەر هەرکەسیٚ کە خواستی لەسەر بیٚ کەوا: خەڵکی بترسێنەو پێیان بڵیٚ: هیچ خودایێ نی‌یە ئیللا من، کەواتە لێم بترسن.
(٣) خودا ئاسمانەکان و ئەرزی دروست کردوە بە حیکمەت و، بەرزە لە پەستیی ئەوانەی کردوویانن بە هاوبەشی.
(٤) خودا ئادەمزادی لەتۆوی ئادەمی دروست کردووە کە چەند ناچیزە، کەچی لەپڕ ئەو دروستکراوە ئەبێتە دوژمنێکی ئاشکرای خودا.
(٥) خودا ئاژەڵ‌و ڕەشەوڵاخ و وشتریشی بۆ دروست کردوون کە بەرگ‌و پۆشاك بۆ گەرمبوونەوەتان‌و چەند قازانجی جۆراوجۆری تریان تێدایە وەك زاوزێ‌و سواربوون‌و بارپیٚ بردن، هەروەها لە شیر‌و ماست‌و ڕۆن‌و لە گۆشتەکەیشیان ئەخۆن.
(٦) زینەت‌و جوانییشیان تێدایە بۆتان کە لە لەوەڕگاوە ئەیانهێننەوە بۆ ماڵ‌و لە ماڵەوە دەریان ئەکەن بۆ لەوەڕگا.

وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِۚ إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٧﴾ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨﴾ وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنۡهَا جَآئِرٞۚ وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١١﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿١٢﴾ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٤﴾



(٧) بارتان بۆ هەڵئەگرن بۆ شارێ کە بە زەحمەتێکی زۆر نەبوایە نەیئەگەیشتنێ. بەڕاستی خودای ئێوە میهرەبان و بەڕەحمە.

(٨) ئەسپ و هێسترو کەریشی بۆ دروستکردوون تا سواریان بن، هەروەها بۆ زینەت و جوانی لە سواربوونا یا لە بەجێهێنانی پێویستییەکانی ژیانداو پاش ئەم چەرخەیش شتی وەها دروست ئەکات ئێوە هەر نایانزانن.

(٩) لەسەر خودایە بە خواستی خۆی ڕوون کردنەوەی ڕێگای ڕاست کە ئینسان ئەگەیەنێتە بەختیاری، ڕێگای وایش هەیە ناڕاستەو نالەبار. ئەگەر خودا مەیلیشی لێ بوایە هەمووتانی هیدایەت ئەدا.

(١٠) خودا ئەو خودایە ئاوی بارانی لە ئاسمانەوە بۆ نازڵ کردوون کە لێی ئەخۆنەوەو، دارو درەخت و گژوگیای پێ سەوز ئەبێو حەیواناتی پێ ئەلەوەڕێنن.

(١١) خودا بەو ئاوە کشتوکاڵو زەیتوونو خورماو ترێو هەموو بەرێکتان بۆ سەوز ئەکات. بەڕاستی ئایەتو نیشانەی دەستەڵاتی خودا لەم سەوزکردنەدا هەیە بۆ قەومێ کە بیربکەنەوەو عەقڵیان بخەنەکار.

(١٢) خودا شەوو ڕۆژو مانگو خۆری لەپێناوی قازانجی ئێوەدا بۆ ڕام کردوون. هەروەها ئەستێرەکانیش بە ئەمری خودا ڕام بوون. لە هەموو ئەمانەدا چەندین ئایەت و نیشانە هەیە لەسەر تاك و تەنیاییو دەستەڵاتی خودا بۆ قەومێ کە عەقڵیان بخەنەکار.

(١٣) ئەوەیشی بۆ ڕام کردوون کە لە زەویدا دروستی کردووە لە هەموو ئەو شتانەی سوودیان لێ وەرئەگیرێ لە گژوگیاو کان و گیانلەبەری جۆراوجۆر. بەڕاستی لەم کارانەدا گەلێ نیشانەی گەورەییو توانایی خودا هەیە بۆ قەومێ کە بیربکەنەوە.

(١٤) خودا ئەو خودایە دەریای بۆ ڕام کردوون گۆشتی تازەی ماسیی لێ بخۆن و، دوڕو گەوهەری لێ دەربێنن کە ئەیکەن بە خشڵو ئەیدەن لە خۆتان. هەروەها چەند کەشتی ئەبینی لە دەریادا هاتوچۆ ئەکەن بۆ بازرگانیو بۆئەوە کە ئێوە بە دوای نیعمەتی خودادا بگەڕێنو سوپاسی میهرەبانیی خودا بکەن.

وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَأَنۡهَٰرٗا وَسُبُلٗا
لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَٰمَٰتٖۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ
﴿١٦﴾ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن
تَعُدُّواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٨﴾
وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ
أَحۡيَآءٖۖ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ
فَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٞ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ
﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ إِنَّهُۥ
لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡتَكۡبِرِينَ ﴿٢٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمۡ
قَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحۡمِلُوٓاْ أَوۡزَارَهُمۡ كَامِلَةٗ
يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ أَلَا
سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ
فَأَتَى ٱللَّهُ بُنۡيَٰنَهُم مِّنَ ٱلۡقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّقۡفُ
مِن فَوۡقِهِمۡ وَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٢٦﴾



(١٥) هەروەها چەند كێویێكی بەرزو بڵندی لە زەویدا داكوتاوە نەبادا زەوی بجووڵێتەوەو ئێوەیش تووشی زیان ببن، جۆگاو ڕووبارو ڕێگای بۆ دروست كردوون بەڵكو ڕێگای ڕاستی خوداناسی بگرنەبەر.

(١٦) چەند نیشانەیشی بۆ دروست كردوون تا ڕێگا ون نەكەن. ئەوان بەهۆی ئەستێرەیشەوە ئەتوانن ڕێگا بدۆزنەوە.

(١٧) دەی ئاخۆ كەسێ ئەم هەمووە كائیناتە دروست بكات وەكوو یەكێكە نەتوانێ هیچ دروست بكات؟! ئێوە بۆچی بیر ناكەنەوەو هۆش و فامتان ناخەنەكار؟

(١٨) ئەگەر بتانەوێ نیعمەتەكانی خوا بژمێرن، ئەوەندە زۆرن ناتوانن بەتەواوی بیانژمێرن. خودا بەڕاستی گوناهپۆش و میهرەبانە.

(١٩) خودا ئاگای لەوەیە كە لەناو دڵتاندا ئەیشارنەوەو، ئەوەیش كە ئاشكرای ئەكەنو دەریئەبڕن.

(٢٠) ئەو بتانە كە ئەوان هاواریان لێ ئەكەن و هاوار ناكەنە خوا، ناتوانن هیچ دروست بكەن، بەڵكو ئەوان خۆیان دروست ئەكرێن و دەستكردن.

(٢١) ئەوانە مردوون، زیندوو نین و نازانن كەی زیندوو ئەكرێنەوە.

(٢٢) خودای ئێوە خوداییێكی تاق و تەنیایە. ئەوانەی ئیمانیان بە ڕۆژی قیامەت نییە، دڵیان ئینكاری خودا ئەكات خۆیان بە گەورە ئەزانن و قسەی حەق وەرناگرن.

(٢٣) بێگومان خودا ئەزانێ بەوەی ئەیشارنەوە و بەوەی ئاشكرای ئەكەن. خودا ئەوانەی خۆش ناوێ كە خۆیان بە گەورە ئەزانن.

(٢٤) كە بەو كافرانە بوترێ: خودای ئێوە چیی نازڵ كردووە؟ لە وەڵامدا ئەڵێن: حیكایەت و نووسراوی قەدیمییەكانە جێی باوەڕ نییەو لای خوداوە نەهاتووە.

(٢٥) با ئەو كافرانە تاوانەكانی خۆیان بەتەواوەتی لە ڕۆژی قیامەتدا هەڵگرن لەگەڵ هەندێ لە تاوانی ئەوانەیش كە گومڕایان كردن بێ ئەوەی ئەمانە بزانن كەوا ئەوانە خۆیان گومڕان. خەڵكینە! بارێكی خراپە ئەو بارەی ئەوان هەڵی ئەگرن.

(٢٦) ئەو كافرانەی پێش ئەمان بوون ئازاری پێغەمبەرانیان داو، خودایش لە سزای ئەوەدا خانووەكانیانی بنكەی كردو بان لەسەرەوە ڕووخا بەسەریانداو سزای خودایان لە لاییێكەوە بۆ هات كە هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەئەهات نەیانزانی چۆن لەناوچوون.

ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تُشَاقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ إِنَّ الْخِزْيَ الْيَوْمَ وَالسُّوءَ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٢٧﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا السَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوءٍ ۚ بَلَىٰ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِي اللَّهُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن تَأْتِيَهُمُ الْمَلَائِكَةُ أَوْ يَأْتِيَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ اللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٣٣﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٣٤﴾



(٢٧) پاش سزای دنیا لە ڕۆژی قیامەتیشدا خودا ڕیسوایان ئەکات و سزایان ئەدات و پێیان ئەڵێ: ئەوە کوان هاوبەشەکانم، ئەوانەی دەمەدەمەتان لەسەر ئەکردن لەگەڵ پێغەمبەران کەوا گوایە هاوبەشی خودان؟ لەو کاتەدا خاوەن زانیارییەکان لە پێغەمبەران و زانایانی دیندار ئەڵێن: بەڕاستی ئەمڕۆ سەرشۆڕی و بەدحاڵی بۆ کافرەکانە.

(٢٨) ئەو کافرانە فریشتە گیانیان ئەکێشن لەحاڵێکدا کە ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردووە. جا کە بەهانەیان نەماو ڕاستییان بە چاوی خۆیان دی و ناچار تەسلیم بوون و ملکەچی بەر قاپیی خودا بوون، وتیان: ئێمە هیچ خراپەیێکمان لە دنیادا نەکردووەو ئەوەی کردوومانە بە چاکمان زانیوە... نەخەیر وا نییە، خودا ئەزانێ چیتان ئەکرد.

(٢٩) دەی سا بڕۆنە ناو دەرگاکانی دۆزەخو هەتاهەتایە تیادا بمێننەوە. بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بە گەورە ئەزانی و سەرپێچییان ئەکرد، جێگایێکی زۆر خراپیان هەیە.

(٣٠) هەروەها بەوانەیش وترا کە لەخوداترس بوون: خودا چیی ناردووەتە خوارەوە؟ لە وەڵامدا وتیان: خەیری ناردووەتە خوارەوە. بۆ ئەو کەسانە کە چاکەیان کردوە لەم دنیایەدا پاداشی چاکیان ئەدرێتەوەو، خانووی ڕۆژی قیامەت چاکترە. جێگای ئەوانە زۆر باشە کە لەخواترسن.

(٣١) ئەو خانووانە چەندین بەهەشتن، جێگای دانیشتنی هەمیشەیین، لەخواترسەکان ئەچنە ناویان. ئەو بەهەشتانە ڕووباری زۆر بەبەریاندا ئەڕوات. لەوێدا چی حەز لێ بکەن لە بەردەستیاندایە. خودا ئاوەها پاداشی ئەوانە ئەداتەوە کە لە خوا ئەترسن.

(٣٢) ئەوانەی فریشتە کە گیانیان ئەکێشن حاڵیان باشەو لەخوداترسن، فریشتەکان پێیان ئەڵێن: سەلامتان لێ بێ، ئیتر لەمەوپاش تووشی هیچ نارەحەتییەك نایەن. بەهۆی ئەو کردەوە باشانەوە کە لەدنیادا کردووتانن بچنە بەهەشت.

(٣٣) ئەو کافرانەی باس کران، ئایا چاوەڕوانیی لەوە بەولاوە ئەکەن کە مەلائیکە بێنە سەریان، یا فەرمانی خودا نازل ببێ بە سزادانیان؟ کافرەکانی تری پێش ئەوانیش هەر وایان ئەکرد و موجادەلەیان لەگەڵ پێغەمبەران ئەکرد. ئەوانە خودا ستەمی لێ نەکردن بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد.

(٣٤) ئەوەبوو پاداشی کردەوە خراپەکانی خۆیانیان تووش هات و، جەزای ئەو گاڵتە و بێ شەرمییەی بەرامبەر بە پێغەمبەرانیان کرد گەمارۆی دان و تەنگی پێ هەڵچنین.

وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ۚ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۙ لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ ۚ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾



(٣٥) کافره موشریکەکان وتیان: ئەگەر خودا بیویستایە ئێمە غەیری ئەومان نەئەپەرست، نە ئێمە و نە باوك و باپیرانمانو، بەبێ فەرمانی ئەو هیچ شتێکمان حەرام نەئەکرد. ئەمانەی ئێمە کردوومانن هەمووی لەسەر خواستی خودا بووە. کافرەکانی پێش ئەمانیش هەروایان ئەوت و وایان ئەکرد. ئایا پێغەمبەران لە ڕاگەیاندنی فەرمانەکانی خودا بەولاوە هیچیان لەسەرە؟

(٣٦) بە ڕاستی ئێمە بۆ هەر ئومەتێ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووەو پێمان وتوون: عیبادەتی خودا بکەن و، خۆتان لەوانە بپارێزن کە بانگتان ئەکەن بۆ گومراهی، جا هەندێ لەوانە خودا هیدایەتی دان و، هەندێکیشیان گومراه بوون. دە بەسەر زەویدا بگەڕێن و وردببەنەوە تا بزانن ئەنجامی ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆ ئەخستەوە چی بوو و، چییان بە سەردا هات؟

(٣٧) ئەگەر تۆ زۆر حەز بکەی لە هیدایەتی ئەو کافرانە ئەوە سوودی نییە، چونکە خودا هیدایەتی ئەوانە نادات کە گومڕای کردوون و ئەوانە هیچ یارمەتیدەرێکیان نییە.

(٣٨) موشریکەکان پڕبەدڵ سوێندیان بەخودا ئەخوارد: کە ئەوەی ئەمرێ خودا زیندووی ناکاتەوە. نەخەیر ئەمە بەڵێنێکە و خودا داویەتی بە زیندووکردنەوەی هەموو مردوویەك بۆ لێپرسینەوەو سەنگوتڕازوو کردنی چاکەو خراپەی. بەڵام بەشی زۆری ئادەمزاد ئەمە نازانن.

(٣٩) بۆ ئەوەیشیان زیندوو ئەکاتەوە تا ئەو ڕاستییەیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە ئیختیلافیان تێدا هەبوو کە ئەوەیە خودا یەکەو زیندووکردنەوەی مردوو ڕاستە. هەروەها بۆ ئەوەی کافرەکان چاك بزانن خۆیان درۆزن بوون.

(٤٠) ئێمە کە بمانەوێ شتێ لە نەبوونەوە دروست بکەین تەنها ئەوەندەیە پێی ئەڵێین: ببەو ئیتر ئەبێ، واتە ئەشیری ئێمە بۆ دروستکردنی نەبوو ماددەو زەمانی ناوێ. ئەوەی کە ئیستە ئەیبینن بە مۆڵەت شتەکان پێ ئەگەیێنین، هەر لەبەر چاودێریی عادەتە.

(٤١) ئەو کەسانەی لە پێناوی ڕەزامەندیی خوداو ئایینی ئیسلامدا کۆچیان کردو جێ‌و شوێنی خۆیانیان بەجێ هێشت پاش ئەوەی ستەمیان لێ کرا، ئەوانە لەم دنیایەدا لە شوێنی جواندا جێگیریان ئەکەین. پاداشی پاشەڕۆژیش گەورەترە ئەگەر کافرەکان بیانزانیایە.

(٤٢) ئەم ئەجرو پاداشە بۆ ئەو موسوڵمانانەیە کە خۆگرن‌و پشت بە خودای خۆیان ئەبەستن.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدٗا لِّلَّهِ وَهُمۡ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن دَآبَّةٖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ۩ ﴿٥٠﴾ ۞وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾

الحزب ٢٨ سجدة



(٤٣) ئەوانەیش کە پێشی تۆ ناردوومانن بە پێغەمبەری تەنها چەند پیاوێکی ناسراو بوون وەحیمان بۆ ئەکردن، واتە: پێغەمبەران هەموویان بنیادەمنو فریشتە نین. دە ئەگەر خۆتان ئەمە نازانن لە ئەهلی قورئان بپرسن تا حاڵیتان بکەنو تێتان بگەیێنن.

(٤٤) ئەگەر ئاگاتان لە ئایەتە ئاشکراکانی ئێمە نییەو لەو کتێبانە بێخەبەرن کە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو نێرراون. ئێمە بۆیە قورئانمان بۆ نازڵ کردووی تا ئەوەیان بۆ ڕوون بکەیتەوە کە بۆ تەمێ کردنی ئەوان نێرراوە بەڵکو بیربکەنەوە و بگەنە ڕاستی.

(٤٥) ئایا ئەوانەی فێڵی خراپیان کردو ویستیان پێغەمبەر لەناوبەرن، ناترسن لەوەی خودا بیانباتە خوارەوە بە ئەرزا. وەك قاروونی بردە خوارەوە بە ئەرزا، یا لە لایێکەوە سزایان بۆ بێ کە هەستی پێ نەکەن و ترسیان لێی نەبووبێ؟

(٤٦) یا لە کاتی هەڵسووڕانیاندا بۆ کاروباری ڕێگەویان و بازرگانییان بیانگرێو بیانفەوتێنێ. ئەو کافرانە هەرگیز ناتوانن ڕێگا لە خودا بگرن.

(٤٧) یا لەکاتێکدا بیانگرێ کە بترسن تووشی سزا بن وەك کافرەکانی پێش خۆیان؟ بەڕاستی خودا بە ڕەحم و میهرەبانە.

(٤٨) ئایا نابینن و ناڕوانن بۆ ئەو شتانەی خودا دروستی کردوون، لەهەر جۆرێ بن، کە سێبەرەکانیان لە لای ڕاستەوە و لە لای چەپەوە ئەگەڕێنەوە. ئەو سێبەرانە فەرمانبەرداری خودان چونکە سێبەر هیی خاوەن سێبەرەو، خاوەن سێبەر لەبەر خۆردایەو، خۆریش ڕامە بۆ خودای خۆیو، هەموو ئەمانە لەبەر فەرمانی خودادا ملکەچن.

(٤٩) هەرچی لە ئاسمانەکانو لە زەویدا هەیە لەوانەی جموجووڵ ئەکەن لە ئینسانو غەیری ئینسانو لە فریشتە هەموو سوجدە بۆ خودا ئەبەنو خۆیان بەرامبەر دەستەڵاتی خودا بە گەورە نازانن‌و هەموو ملکەچی ئەمرو ئیرادەی ئەون.

(٥٠) لە خودای خۆیان ئەترسن کە زاڵە بە سەریاندا و، ئەوەی ئەمریان پێ ئەکرێ جێ بەجێی ئەکەن.

(٥١) خودای گەورە فەرمووی: دوو خودا بۆ خۆتان بڕیار مەدەن، هەر تەنها یەك خودا هەیە، دەی تەنها لە من بترسن.

(٥٢) هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هەمووی هی خودایە و طاعەتکردن هەر بۆ ئەوە بە واجبی و بە هەمیشەیی. ئایا ئێوە لە غەیری خودا ئەترسن؟!

(٥٣) هەر نیعمەتێکتان ببێو پێتانەوە بێ هەمووی لە خوداوەیە، ئەو پێی‌داون. ئەگەر پاشانیش تووشی ناڕەحەتی بوون، هاوارو هانا هەر بۆ لای ئەو ئەبەن و لەو ئەپاڕێنەوە.

(٥٤) کەچی لەپاش ئەو هەمووە نیشانەی دەستەڵاتی خودایە کە بۆ خاوەن عەقڵ دەرئەکەوێ، ئەگەر لە ناخۆشییەکە ڕزگاری کردن و لێی لادان تاقمێکتان هاوبەشی بۆ بڕیار ئەدەن!

لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ تَاللَّهِ لَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنْتُمْ تَفْتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ وَلَهُمْ مَا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالْأُنْثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِمْ مَا تَرَكَ عَلَيْهَا مِنْ دَابَّةٍ وَلَٰكِنْ يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ الْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ الْحُسْنَىٰ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ النَّارَ وَأَنَّهُمْ مُفْرَطُونَ ﴿٦٢﴾ تَاللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَىٰ أُمَمٍ مِنْ قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ الْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٦٤﴾



(٥٥) بۆ ئەوەی کوفرانی ئەو نیعمەتە بکەن کە پێمان داون و لە نارەحەتی ڕزگارمان کردوون. دەی لەم دنیادا بە ئارەزووی خۆتان ڕابوێرن، جا لە پاشاندا تێ ئەگەن ئەنجامی کارتان چی‌یەو چۆن ئەبێ.

(٥٦) ئەو کافرانە بەشێ لەو حەیواناتەی کردوومانن بە ڕۆزی بۆیان، بڕیار ئەدەن بۆ ئەو بتانە کە نازانن چین و چ کارەن. واتە خوا ڕۆزییان پێ ئەدا، کەچی ئەوان بەشێ لەو ڕۆزییە ئەکەنە قوربانی بۆ بتەکان. قەسەم بەخودا! بەرامبەر بەو درۆیانەی لە دنیادا ئەتانکردن لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیارتان لێ ئەکرێ.

(٥٧) کچ بۆ خودا بڕیار ئەدەن و ئەڵێن: فریشتەکان کچی خودان. خودا پاکە لەو درۆیەی بۆی هەڵئەبەستن. بەڵام بۆ خۆیان بە ئارەزووی خۆیان چییان حەز لێ بێ -کە مەبەست کوڕە- ئەوە بڕیار ئەدەن.

(٥٨) ئەگەر یەکێ لەو کافرانە مژدەی کچی بدرێتێ کە بوویەتی، لە نارەحەتیدا دەموچاوی ڕەش دائەگیرسێ و دڵی پڕ ئەبێ لە ڕقو قینو ناسوپاسی.

(٥٩) لە خراپیی ئەوەی مژدەی بوونی پێ دراوە خۆی لە قەومەکەی ئەشارێتەوە، نازانێ چی بکا، بە سەرشۆڕییەوە بیهێڵێتەوە یا خۆ زیندەبەچاڵی بکاتو لەژێر خاکا بیشارێتەوە؟ ئەمە حوکمێکی ناڕەوایە ئەمانە ئەیدەن، بۆ خۆیان بە کچ ڕازی نابنو ئەگەر کچیان ببێ زیندە بەچاڵی ئەکەن، کەچی ئەڵێن خودا کچی هەیە.

(٦٠) ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نی‌یە صیفەتی ناشیرینیان هەیە کە ئەوەیە پێویستیان بە ئەولاد هەیە و کوڕیان ئەهێڵنەوە و کچیان زیندەبەچاڵ ئەکەن. خودایش بەرزترین صیفەتی هەیە کە (واجب الوجود) ەو مەحتاجی هیچ شتێ نی‌یە. خودا خاوەن دەستەڵاتە و کارەکانی پڕحیکمەتن.

(٦١) ئەگەر خودا بەرەی ئادەمزادی بەهۆی ستەمیانەوە بگرتایە جوولەکەری بەسەر ڕووی زەوییەوە نەئەهێشت، بەڵام بۆ کاتێکی دیارییان دوا ئەخات. کە ئاکامیان هات ئیتر نە سەعاتێ پێش ئەکەون و نە سەعاتێ دوائەکەون.

(٦٢) ئەوی بۆ خۆیان پێی ڕازی نابن بڕیاری ئەدەن بۆ خودا و بە زوبان درۆ ئەکەن کە ئەڵێن خودا فریشتەی کردووە بە کچی خۆیو، هەروەها کە ئەڵێن پاداشی باشیان لای خودا هەیە. بێگومان ئەنجامی ئەوان ئاگری دۆزەخەو بەزۆر ئاگر بە قوڕگیاندا ئەکرێ.

(٦٣) قەسەم بەخودا ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانمان ناردووە بۆ لای چەندین ئوممەت. جا شەیتان کردەوە ناشیرینەکانی ئەو ئوممەتانەی لەبەرچاویان جوان کرد و ئەوانیش دەستیان کرد بە موجادەلە لەگەڵ پێغەمبەران و دەستیان دایە کردەوەی بەدو نالەبار، کە واتە ئەوانە ئەمڕۆ شەیتان دۆستیانەو عەزابێکی سەخت ئەدرێن.

(٦٤) ئێمە قورئانمان نازڵ نەکردووە بۆ لای تۆ بۆ ئەوە نەبێ تۆ ئەو شتانە بەیان بکەی بۆ کافرەکان کە ئیختیلافیان تێدا هەیە، واتە: بۆ ئەوەی بیانهێنیتە سەر ڕێگای ڕاست و، کردوومانە بە هیدایەتو هۆی میهرەبانی بۆ قەومێ کە باوەڕی پێ بکەنو ئیمانی پێ بهێنن.

وَاللَّهُ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٥﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ ۚ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ ۚ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ۚ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ اللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾



(٦٥) خـودا لـه ئاسمانـەوە ئـاوی نـازڵ کـردووەو ئـەرزی پـێ زینـدوو کردووەتـەوە پاش ئەوەی کە مردوو بووە، واتـە وشـكو بـێ تـین بـووەو گیـای لـێ نـەڕواوە. لـەم کردەوانـەدا نیشـانەی دەسـتەڵاتو تـوانی خودا هەیە بۆ قەومێ کە ببیسـن و گـوێی خۆیـان لـە بیسـتنی قسـەی ڕاسـت کـەڕ نەکەن.

(٦٦) بەڕاسـتی لـە حەیواناتـدا پەنـد و چاوڕووناکی هەیە بـۆ ئێـوە. ئـەوەتا ئێمـە لەوەی کە لە سکی ئەو جینسـە دەرئەچـێ لەمابەینی پیسی و خوێندا شیرێکی سـافی گەواراتان دەرخـوارد ئـەدەین بـۆ ئەوانـەی شیر ئەخۆنەوە.

(٦٧) لـە بەرهـەمی دارخورمـا و تـرێیش شەرابی وەها دروست ئەکـەن کـە ئینسـان مەست ئەکات لەگـەڵ ڕۆزیـی جوان وەکـو مێوژو باسووقو هەموو جۆرێکی خورمـاو دۆشاوو غەیری ئەمانە. بەڕاستی لەمانەدا نیشانەی توانایی‌و دەستەڵاتی خـودا هەیـە بۆ ئەوانەی کە عەقڵیان هەیە.

(٦٨) خـودا خسـتیە دڵـی هەنگـەوە کـە ماڵی خۆتان دروست بکەن لە شاخەکانداو لە قوڕۆڵی دارداو لە هەرشوێنێ کە خـەڵك بەرزی ئەکەنەوە وەك دارمێوو بنمیچ.

(٦٩) جا لە شیرەی هەموو بەرێ بخۆن و ئەو ڕێگایە بگرنەبەر کە خودا بۆی ئاسان کردوون. لـە سـکی ئـەو هەنگانـە شەرابێکی ڕەنگاوڕەنگ، زەردو سپی‌و ڕەش، دەرئەچێ لە خواردنەوەیدا شیفا هەیە بۆ خـەڵك. بێ‌گومـان لـە هـەنگو جۆری ژیانی‌و دروست کردنی هەنگوین‌و ئێرومێیاندا نیشـانەی دەسـتەڵاتو تـوانی خـودا هەیـە بـۆ قـەومێ کـە بـیر بکەنەوە وعەقڵیان بخەنەکار.

(٧٠) خودا ئێوەی دروست کردووە و پاشان ئەتانمرێنێ. هیی وایشتان هەیـە ئەگەڕێتـەوە بـۆ بێ‌کـارەترین تەمـەن کـە پیری‌و لێکەوتنی تەواوە تا وای لێ دێت لەپاش زانایی هیچ نازانێ و وەك منداڵی ساوا شتی لەبیر ئەچێتەوەو لـە هـیچ تێ ناگات. بەڕاستی خودا زانا و توانایە.

(٧١) خودا هەندێکتانی هـەڵاوێردووە بەسـەر هەندێکتانـدا. هیـی واتـان هەیـە دەوڵەمەنـدە و هیـی وایشـتان هەیـە هەژارە. هیی واتان هەیە خاوەن بەندەیە و هیی وا هەیە بۆخۆی بەندە و زەڕخریدەیە، ئەوانـەتان کـە زیادەیـان بەسـەر ئەوانی ترتاندا هەیە لەو زیادەیە نادەن بە بەندەکانیان تا وەك یەك بن. جـا کـە ئێـوە خۆتـان‌و بەنـدەکانتان وەك یـەك نازانن، ئەی چۆن خوداو بتەکان وەك یەك ئەزانن؟ ئەوە بۆچی ئینکاری نیعمەتی خودا ئەکەن‌و ئەڵێن لە خوداوە نی‌یەو لە بتەکانەوەیە؟

(٧٢) خوای گەورە هەر لە نەوعی خۆتان هاوجووت و هاوسەری پێ داون و، لەو هاوسەرانە کوڕ و کوڕەزای پێ داون. هەروەها خواردەمەنیی پاك و پوختەی کردووە بە ڕۆزیتان. ئایا ئێوە بە شتی بـەتاڵ بـاوەڕ ئەکـەن کـە گوایـا بتـەکان قازانجتان پێ ئەگەیێنن، کەچی ئینکاری نیعمەتی خودا ئەکەن‌و ئەڵێن ئەو پێی نەداوین‌و بتەکان پێیان داوین؟

وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَمَن رَّزَقْنَٰهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُۥنَ ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ ۖ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ ۙ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾



(٧٣) کافرەکان شتی وا ئەپەرستن غەیری خودا کە نە لە ئاسمان و نە لە زەویدا خاوەنی هیچ جۆرە ڕزقێك نی‌یە بۆ ئەوان و توانی هیچی نی‌یە بۆیان !

(٧٤) هاو وێنە و هاوبەش بۆ خودا دامەنێن، خودا بە خراپیی کردەوەتان ئەزانێ و ئێوە پێی نازانن، ئەگەر بتانزانیایە نەتان ئەکرد.

(٧٥) خودا نموونەیێکی هێناوەتەوە: بەندەیێکی موڵك کە توانی هیچی نەبێ و، یەکێکیش کە ڕزقێکی باشمان پێ دابێ و، بەئاشکراو بەنهێنی لە ڕێگای خودادا لەو ڕزقە سەرف بکات. ئایا ئەم دوو کەسە وەکو یەکن؟ حاشا وەکەللا. سوپاس و ستایش هەر بۆ خودایە. بەڵام زۆرتری کافرەکان نەزانن و نیعمەتی خودا بە هیی غەیری خودا ئەزانن کە بتەکانن و بەرامبەر بەو نیعمەتە کە هیی ئەوان نەبوە، ئەیانپەرستن.

(٧٦) هەروەها خودای گەورە نموونەی هێناوەتەوە بە دوو پیاو یەکێکیان لاڵ و بێ زوبانەو توانی هیچی نی‌یەو ناتوانێ هیچ بلێ‌و بکات‌و بارە بەسەر شانی ئاغاکەیەوەو بۆ هەر شوێنێکی ئەنێرێ چاکەیەکی بۆ ناهێنێتەوە. ئایا ئەم پیاوە یەکسانە لەگەڵ کەسێك کە هۆشیار و زانا و توانا بێ‌و ئەمر بکات بە چاکەو لەسەر ڕێگای ڕاستی بێ؟

(٧٧) هەرچی پەنامەکییەکانی ئاسمانەکان و زەوی هەیە لای خودایەو پێی ئەزانێ‌و ڕوودانی ڕۆژی قیامەت لای خودا وەك چاو بەیەکادانێکە یا لەوەیش کەمترە. بەڕاستی خودا توانایە و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(٧٨) خودای گەورە ئێوەی لەسکی دایکتان دەرکردوە لە حاڵێکدا کە هیچتان نەئەزانی. هەروەها هێزی بیستن و بینین و دڵی بۆ دروست کردون بەڵکو شوکرانەبژێریی خودا بکەن.

(٧٩) ئایا سەیری پەلەوەر ناکەن لە بۆشایی ئاسماندا ڕام کراون و کەس بە ئاسمانەوە ڕاگیریان ناکات خودا نەبێ. لەم کارو دەستەڵاتەدا زۆر نیشانەی گەورەیی و تواناییی خودا هەیە بۆ قەومێ کە باوەڕیان بە خودا هەبێ.

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ﴿٨٠﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ﴿٨١﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٢﴾ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٣﴾ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ ﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ قَالُواْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَۖ فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَۖ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٨٧﴾



(٨٠) خـوداى گـەورە لـە خـانووە عادەتییەكانى خۆتاندا جێگەى ئارامى پێداون و لـە پێست و خـورى و مـووى ڕەشـەوڵاخ و ئاژەڵیش وەكـوو گـاو وشـترو مەڕو بزن، نشیمەنى وەهـاى پـێ داون كـە وەك دەوار ( ڕەشماڵ ) لە ڕۆژى كۆچكردن و لە ڕۆژى نیشتەجێبوونتانا سووكو ئاسان هەڵیان ئەگرن. هەروەها لە خوریى مەڕو كـوركى وشـترو مـووى بـزنیش ڕایـەخ و ئەسبابى ئارامىو ڕابواردنى تا ماوەیەكى دیاریى پێ داون.

(٨١) خوداى گەورە لەو شتانەى دروستى كردوون وەك كێوو دارو درەخت و خانوو، سێبەرى بـۆ كـردوون، لـە شـاخەكانیش جێگـاى حەسـانەوەى بـۆ دروست كردوون وەك ئەشكەوت و خانووى لە بەرد تاشراو. هـەروەها جلوبـەرگى وەهـاى بـۆ دروست كردوون كە بتانپارێزێ لە گەرماو، بەرگى زرێیینى بۆ دروست كردوون كە بتانپارێزێ لە شیروتیرى بنیادەمى وەك خۆتان. ئا بەم جۆرە خودا نیعمەتى خۆى بـۆ ئێـوە تـەواو ئەكا. بەڵكو فەرمانبەردارى ئەو بن.

(٨٢) جا ئەگەر ئەو كافرانە پشتیان لە باوەڕكردن هەڵكرد و بە گوێیان نـەكردى، ئـەوا تـۆ هـەر گەیانـدنى فـەرمانى خودات لەسەرە كە بەشێوەیێكى ئاشكراو ڕووناك، بیگەیەنى بە خەڵكەكە.

(٨٣) هەموویان بە نیعمەتەكانى خودا ئەزانن و لەگەڵ ئەوەیش ئینكاریـان ئەكـەن و، بەشـى زۆرى ئەوانـە، كـە فـام كردووەكانیانن، كافرن.

(٨٤) یادى ئەو ڕۆژە بكە كە لە هەموو ئوممەتێكدا شاهیدێ لەسەر كردەوەیان حازر ئەكـەین كـە پێغەمبـەرەكانیانن. پاشان، ئیتر ئیزنى عوزر هێنانەوە نادرێ بەو كافرانەو ڕەزامەندى خودایان دەست ناكەوێ، یا ماوەى ئەوەیان نادرێتێ كە داواى ڕەزامەندى لە خودا بكەن.

(٨٥) كە ستەمكارەكان سزاى ڕۆژى قیامەت ئەبینن، بە هیچ جۆرێ سزایان سووك ناكرێو مۆڵەت نادرێن.

(٨٦) لە ڕۆژى قیامەتدا كە موشریكەكان ئەو بتانە ئەبینن كە كردبوونیان بە هاوبەشى خودا، ئەڵێن: خودایا ئەوانەن هاوبەشەكانمان كە داواى خێر و خۆشیمان لێ ئەكردن. خودایش بتەكان ئەهێنێتە قسەو بە كافرەكان ئـەڵێن: ئێـوە لـە خۆتانەوە ئێمەتان كردبوو بە هاوبەشى خوداو ئێمە پێمان نەوتبوون. ئێوە بەڕاستى درۆزنن.

(٨٧) لەو ڕۆژەدا كافرەكان ملكەچ ئەكەن بۆ خوداو ئەو هـەموو درۆو بوختانانـەى لـە دنیـادا كردبوویـانن مایـەپووچ دەرئەچن و بەكەڵكیان نایەن چونكە بتێ نىیە بتوانێ لەو ڕۆژەدا تكاى بەخشینیان لاى خوا بۆ بكا.

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ
ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفْسِدُونَ ﴿٨٨﴾ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِى كُلِّ
أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ
هَٰٓؤُلَآءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى
وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ
وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ
وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ
﴿٩٠﴾ وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلْأَيْمَٰنَ
بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا إِنَّ
ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ
غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا
بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ
ٱللَّهُ بِهِۦ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾
وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن
يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾



(٨٨) ئەوانــە کــە خۆیــان کــافر بــوون و مــەنعی خەڵکیشــیان ئــەکرد لــە ئیمــان هێنان، زیاد لە سزای کوفرەکـەی خۆیـان، بەرامبــەر مەنعەکــەیش ســزایان ئــەدەین چونکە کرداریـان بـەد بـوو نەیانئەهێشت خەڵك ڕێگای ڕاست بگرنەبەر.

(٨٩) یـادی ئـەو ڕۆژە بکـە کـە لـە هـەر ئوممەتێك شاهیدێ ڕەوانـە ئەکـەین لەسـەر کردەوەیان، کە پێغەمبەرەکەیانە، هەروەها تـۆیش ئەکەینـە شـاهید لەسـەر کـردەوەی ئـەمان کـە ئوممەتەکـەتن. قورئانمـان نـازڵ کردووەتە سـەرت بـۆ بـەیانکردنی هـەموو کاروبارێکی ئایینیتان و، پیشاندەرو هـۆی ڕەحمەتــە بــۆ هــەموان و مــژدەدەرە بــە موسوڵمانەکان بەتایبەتی.

(٩٠) بەڕاستی خودا ئەمرتان پـێ ئـەکات بـە میانـەڕەوی وەك خـودا بەیـەك زانـین و بەخشندەییو دادپەروەریو خوداپەرستیو، ئەمرتان پێ ئەکات بە چاکەکردن بە جۆرێ کــە وابــزانن خــودا لــە بەرچــاوتانەو ئــەتانبینێو، ئــەمرتان پــێ ئــەکات بــە جێبەجێکردنی ئیحتیاجی خزمو خوێش. هەروەها نەهیتان لێ ئەکات لە کردەوەی خراپی وەکـو داوێـن پیسـیو، لـەو کارانەی کە ناڕەواو ناشیرینن و، لە دەست درێژی کردنە سەر خـەڵك و زۆرداری. خـودا ئامۆژگاریتـان ئـەکات بـەڵکو بیربکەنەوەو پەند وەربگرن.

(٩١) کە بەیعەتتان کرد بـە پێغەمبـەر وەفـای پـێ بکـەن و ئـەو بەیعەتـە هەڵمەوەشـێننەوە پـاش ئـەوەی کـە توند بەستبووتان و خوداتان کردبووە کەفیل لەسەر ڕاگرتنی ئەو پەیمانە. خودا بە کردەوەتان ئەزانێ.

(٩٢) خۆتان مەکەن بەو ژنە کە لە بەیانییەوە تا ئێوارە ڕێسمانی ئەڕست و بای ئەدا و پاش ئەوە کە هێزی ئەگرت و بای ئەخوارد ئەچوو تاڵ تاڵ خاوی ئەکردەوە. ئەو سوێندو پەیمانانە مەکەنە هـۆی خیانـەت لـەناو خۆتانـدا بـۆ ئـەوەی کۆمەڵێ لە کۆمەڵێکی تر زیاتر و بەهێزتربێ و بەسەریا سەرکەوێ. خودا بەو پەیمانانە تاقیتان ئەکاتەوە تا بۆ خەڵك دەربکەوێ کێ ڕای ئەگرێ و کێ ڕای ناگرێ. بێگومان خودا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو شتانەتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە لە دنیادا تیا ناکۆك بوون و یەکتان نەئەگرتەوە.

(٩٣) ئەگەر خودا مەیلی ببوایە ئەیکردن بە یەك ئوممەت و هەموو موسوڵمان ئەبوون، بەڵام خـودا هەرکەسـی مـەیل لێ بێ گومڕای ئەکات و هەرکەسی مـەیل لـێ بـێ هیدایـەتی ئـەدا. بێگومـان ئێـوەش پرسـیارتان لـێ ئـەکرێ لـەو کردەوانەی کردووتانن.

وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖۗ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٧﴾ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٠٢﴾



(٩٤) پەیمانەکانتان مەکەنە هۆی خیانەت کردن لەناو خۆتاندا تا پێتان هەڵخلیسکێ پاش دامەزران و جێگرتنی و، بەهۆی ئەوەوە کە خەڵك مەنع بکەن لە ڕێگەی خودا پاداشی خراپ بچێژن و سزایێکی گەورە بدرێن.

(٩٥) ئەو پەیمانەی لەگەڵ خودا ئەیکەن و ئەو بەیعەتەی کە بە پێغەمبەری خودای ئەکەن، مەیگۆڕنەوە بە نرخێکی سووکی چرووك. بێگومان ئەو پاداشەی لای خودایە بۆ ئێوە چاکترە ئەگەر پێی بزانن.

(٩٦) ئەوەی لای ئێوەیە تەواو ئەبێ و ئەبڕێتەوەو ئەوەی لای خودایە ئەمێنێتەوە. ئەو کەسانەی خۆگرن بە باشترین کردەوەیان پاداشیان ئەدەینەوە.

(٩٧) هەرکەسێ کردەوەییێکی چاك بکا لە پیاوو لە ژنو لەگەڵ ئەو کردەوەدا ئیمانیشی هەبێ، ئەوە بە ژیانێکی پیرۆزو باش ئەیژیێنینو پاداشیان ئەدەینەوە بە ئەجرێ بۆ ئەوان بشێ بەرانبەر چاکترین کردەوەییێك کە کردوویانە، یا بە باشتر لە کردەوەکەیان پاداشیان ئەدەینەوە.

(٩٨) کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بە خودا لە شەیتانی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوداو بڵێ: (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم)

(٩٩) بێگومان شەیتان دەستی بەسەر ئەو کەسانەدا ناڕوات کە ئیمانی تەواویان هەیەو پشت بە خودا ئەبەستن.

(١٠٠) شەیتان تەنها دەستی بەسەر ئەوانەدا ئەڕوات کە ئەویان خۆش ئەوێو بەگوێی ئەکەن و بەهۆی ئەوەوە هاوبەش بۆ خودا بڕیار ئەدەن.

(١٠١) کاتێ کە ئایەتێکمان لە جێگەی ئایەتێکی تر هێنا، واتە کە ئایەتێکمان نەسخ کردو ئایەتێکی ترمان لە جێگەیا دانا، کە خودا خۆی لە هەموو کەس زاناترە بەوەی کە نازڵی ئەکا، کافرەکان ئەڵێن: ئەی موحەممەد تۆ ئیفتیرا ئەکەیتو بە درۆ ئەو ئایەتە لە شوێنی ئایەتەکەی تردا دائەنێیت. تۆ واز لەو نەفامانە بێنە، بەشی زۆری ئەوانە عەقڵیان نی‌یە و نازانن حیکمەت لە چییدایە؟

(١٠٢) جا تۆ بڵێ: ئەو ئایەتە جیبرەئیل بە حەق و حیکمەتەوە لای خوداوە هێناویەتی بۆ ئەوەی دڵی خاوەن ئیمانەکانی پێ دامەزراوو پتە و بکات و بۆ ئەوەی ببێتە هیدایەت و مژدە بۆ ئەوانەی ملکەچی حوکم و فەرمانی خودان.

وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا فُتِنُوا۟ ثُمَّ جَٰهَدُوا۟ وَصَبَرُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٠﴾



(١٠٣) بەڕاستی ئێمە ئەزانین ئەو کافرانە ئەڵێن: بنیادەمێکی تایبەتی ئەم ئایەتانەی فێر ئەکات، بەڵام ئەوانە نەفامن بۆیە ئەم قسە بەتاڵە ئەکەن، چونکە زمانی ئەو کەسەی ئەڵێن گوایە فێری ئەکات زمانی عەجەمی‌و غەیرە عەرەبییەو ئەم قورئانە زمانێکی عەرەبی و ڕەوان و دیارییە.

(١٠٤) بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان بە ئایەتەکانی خودا نی‌یە خودا هەرگیز هیدایەتیان نادات و سزایێکی سەختیان هەیە.

(١٠٥) تەنها ئەوانە ئیفتیرا ئەکەن لەسەر خوداو درۆی بەدەمەوە هەڵئەبەستن کە باوەڕیان بە ئایەتەکانی خودا نی‌یە. ئەوانە خۆیان درۆزنن.

(١٠٦) هەرکەسێ لەپاش ئیمان هێنان ئینکاری خودا بکا ئەوە غەزەبی خودای لەسەرە، مەگەر یەکێ زۆری لێ بکرێ لەسەر کەلیمەی کوفر و دڵی لەسەر ئیمان دامەزرابێ، ئەوە هیچی لەسە نی‌یە. بەڵام کەسێ سینەی بە کوفرو لەدین‌وەرگەڕانەوە شاد بێ و پێی خۆش بێ، ئەوانە غەزەبی خودایان لەسەرە سزای گەورەیان هەیە.

(١٠٧) ئەوانە بۆیە پاش ئیمان هێنان لە دین وەرگەڕانەوە چونکە ژیان و ڕابواردنی دنیایان هەڵاوێرد بەسەر پاداشی نەبڕاوەی قیامەتداو، بێ‌گومان خودا هیدایەتی قەومی کافر نادات.

(١٠٨) ئەوانە کەسانێکن خودا دڵ و گوێ و چاوی مۆرکردوون، نە بە دڵ تێ‌ئەفکرن و، نە بە گوێ حەق ئەبیستن و نە بە چاو تەماشای نیشانەی قودرەتی خودا ئەکەن. ئەوانە لە حەق غافڵن و حەقیان فەرامۆش کردووە.

(١٠٩) بێ‌گومان ئەوانە لە پاشەڕۆژدا زیانبار و خەسارەت کردوون.

(١١٠) پاش ئەمە بزانن بێ‌گومان خودا بۆ ئەو کەسانەی پاش ئەوەی سزاو ئازار دران و دواییش لە ڕێگەی خودادا غەزایان کردو خۆیان لەبەر زەحمەت‌و ئازاردا ڕاگرت‌و لە مەککەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، خودا خۆشی ئەوێن و تاوانبەخش و میهرەبانە لەگەڵیان.

يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَٰدِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾ فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَٱشْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾



(١١١) لـەو ڕۆژەدا کـە هـەموو نەفسـێ دێـتو موجادەلـە ئـەکات بـۆ ڕزگـارکردنی نەفسی خۆی و، هەر نەفسێ پاداشی ئەوەی کردوویەتی ئەدرێتە دەستی و ستەمیان لێ ناکرێ.

(١١٢) خودا نموونـەیێکی هێناوەتـەوە کـە بـریتی یـە لـە دێیـەکی پـڕ لـە ئـەمن و ئاسایشی دڵنیا و ڕەحـەت کـە لـە هـەموو شـوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزیـی فراوانـی بـۆ ئەهات، ئەنجا ئەهلی ئەو دێیە کوفریان بـە نیعمەتـەکانی خـودا کـردو شـوکرانەبژێر نەبوون. خوایش لە ئـەنجامی ئـەو کوفرەدا پۆشاکی برسییەتیو ترسی کردە بـەریان و، بە هۆی ئەو کردەوانەوە کە کردیانن ژیـانی تاڵی پێ چەشتن.

(١١٣) بێ‌گومان ئەوانە پێغەمبەرێك هـەر لەخۆیان هاتە لایـان و ئـەوان باوەڕیـان پـێ نـەکردو بـە درۆزنیـان دانـا، بۆیـە سـزای خوداگرتنی لـەکاتێکا کـە سـتەمکاربوونو ئیمانیان نەهێنا.

(١١٤) جا کە مادام پاداشی کـوفری نیعمـەت وەهـا خراپـە، ئێـوە کـوفری نیعمـەت مەکـەن، لـەوە بخۆن کـە خـودا کردوویەتی بە ڕۆزی بۆتان و حەڵاڵ و پاکو پوختەیەو، سوپاسی نیعمەتی خودا بکەن ئەگەر خودا پەرستن.

(١١٥) بەڕاستی ئەوەی خودا حەرامی کردووە لێتان خواردنی گۆشتی مردارەوە بووە و خوێنی ڕەوانو گۆشتی بـەرازو گۆشتی هەر حەیوانێ کە لەکاتی سەربڕینیدا ناوی غەیری خودای لێ هێنرابێ. کەسـێ ناچـار بـوو لـەو حەرامـە بخـوا بەشەرتێ دەسدرێژی نەکاتە سەر ناچارێکی تر و زیاد لە ئەندازەی پێویست بۆ ژیان نەخوات، ئەوە خودا گوناهبەخشو میهرەبانە.

(١١٦) بە تەنها قسەیێك کە بە درۆو بێ دەلیل بە زمانتاندا دێت مەڵێن ئەم حەیوانە حەڵاڵەو ئەم حەیوانە حەرامـە، ئەمە دەبێتە درۆ هەڵبەستن بە دەم خوداوە کە گوایا ئەمەی حەڵاڵ کردووە و ئەوەی حەرام کردووە. بێگومان ئەوانـەی درۆ بە دەم خوداوە هەڵئەبەستن هەرگیز لە ڕۆژی قیامەتدا سەرناکەون.

(١١٧) لە دنیادا ڕابواردنێکی کەمیان هەیە و لە قیامەتدا سزاییێکی سەخت.

(١١٨) ئەوانەی جوولەکە بوون، ئەوەی لەمەوپێش بۆمان باس کردی لـە سـورەتی (الانعـام) دا لێمـان حـەرام کـردن، چونکە بێ‌گوێیی فەرمانی خودایان کرد. ئێمە ستەممان لێ نەکردن، ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد.

ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ
بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾
إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ
﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ
﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ
﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ
مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ
ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا
كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ
وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ
هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾
وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ
لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ
وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ
﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾



(١١٩) پـاش ئەمانـە سـەبارەت بـەو کەسانەی بـە نـەفامیو نـەزانی خراپـەیان کـردووە و پـاش ئـەوە تەوبـەیان کـردووەو پەشیمان بوونەتەوەو بەرامبەر خودا حـاڵی خۆیـان چـاك کـردووە، پـەروەردگاری تـۆ تاوانبەخشو میهرەبانە.

(١٢٠) بێگومان ئیبراهیم خۆی بـە تـەنیا ئومـمـەتێ بـوو، واتـە ئەوەنـدەی ئومـمـەتێ خاوەنی ڕەوشتی چاكو كردەوەی پاك بـوو. ملكەچی فەرمانی خودا بـوو. لـە هەرچی بیروبـاوەڕو کـردەوەی بەتاڵـە لای دابـوو. ڕووی كردبووە بیروباوەڕی پاكو بێ گـەردو لە موشریكەكان نەبوو.

(١٢١) شوكرانەبژێری نیعمەتـەكانی خـودا بـوو و سوپاسـی ئـەوی ئـەكرد. خـودا هەڵیبـژارد و شـارەزای کـرد بـۆ ڕێگـای ڕاستو كردی بە پێغەمبەر.

(١٢٢) لە دنیادا پایـەو حورمـەتمان پـێدا لەناو خەڵكداو ناووبانگی دەركرد و بوو بە خاوەن كەرامەتو ئیستیقامەت و ئەولادی بـاشو ڕزقـی فراوانمـان پـێ داو، لـە پاشەڕۆژیشدا لە ئەهلی بەهەشتە.

(١٢٣) پاشـان وەحیمـان بـۆ کـردی کـە پەیڕەوی ئـایینی خوابەیەكناسـی ئیـبراهیم بكە كە لە بیروبـاوەڕی بـەتاڵ لای دابـوو و لە موشریكەكان نەبوو.

(١٢٤) خودا ئیحتیرامی ڕۆژی شـەممەی لەسـەر ئـەو جوولەکانـە فـەرزکرد کـە لەگـەڵ مووسـا موجادەلـەیان ئـەکردو بەگوێیان نەئەكرد، كە مووسا ئەمری پێ كردن ڕۆژی جومعە دانێن بۆ عیبادەت و ئیشی تری تێدا نەكـەن، ئـەوانیش وتیان ڕۆژی شەممەمان ئەوێ، ئەوەبوو شەممەیان بۆ دیاری كرا، كەچی تەنانەت ئیحتیرامی شەممەكەیشیان نەئـەگرت و ڕاویان تێدا ئەكرد. بەڕاستی خودا لە ڕۆژی قیامەتدا حوكم ئەكات لە نێوانیاندا لەو شتانەدا كە ناكۆكییان لەناوا بوو تیایاندا.

(١٢٥) خەڵك بانگ بكە بۆ ڕێگای خوداو بۆ ئیسلام بوون بە شێوەیێ كە موافیقی عەقڵ و هۆشی ساغ بێ، واتە بـۆ زانا بە دەلیلێ كە قەناعەتی پێ بكاو بۆ نەزان بەشێوەیێ كە لێی حاڵی ببیـێو بچێتە دڵیـەوە. هـەروەها بـە پەنـدو ئامۆژگارییەك كە جوان بێو دڵیان نەرم بكاتو ڕایان بكێشـێ بـۆ ئیسـلام نـەك دڵیـان بریندـاربكاتو لـە حـەق دوور بكەونەوە. ئەگەر شوێنەكەیش شوێنی موجادەلە بوو كە بەرانبەر ئەیەوێ قسەی خۆی بباتە سەر، ئـەوە پێویسـتە بـە شێوەیێكی باش قسەی لەگەڵ بكەی. ڕاییكێشی بۆ چاكەو دووری بخەیتەوە لە خراپە. بێگومان خودای تۆ زاناترە كـە كێ لە ڕێی ڕاست لائەداو كێ ڕێگای ڕاست ئەگرێتەبەر.

(١٢٦) ئەگەر پاداشی كردەوەی خراپی خەڵكتان دایەوە چاودێریی عـەدالەت بكەن با پاداشەكەتان ئەوەندەی پێویسـت بێ، واتە: ئازاری ئەوان بۆ ئێوە چەند بوو با ئازاری ئێوەیش بۆ ئـەوان هـەر ئەوەنـدە بـێ. خـۆ ئەگـەر خۆتـان بگـرنو چاوپۆشی بكەن لە تۆڵەسەندنەوە، ئەوە قازانجی بۆ ئێوە زۆرەو لە تۆڵە سەندنەوە باشترە.

(١٢٧) لە بەرانبەر باری گرانو گەیاندنی ڕیسالەتدا سەبر بكە: بێگومان، بە تەوفیقی خـودا نـەبێ ئـەو سـەبرەت بـۆ ناكرێ. لەبەر بێگوێییو سەرپێچی كردنی كافرەكان غەم مەخۆو لە مەكریان دڵ تەنگ مەبە.

(١٢٨) بەڕاستی خودا لەگەڵ ئەوانەیە لێی ئەترسنو ئەوانەی چاكە ئەكەن.

## سُورَةُ الإِسْرَاءِ

ترتيبها ١٧ — آياتها ١١١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سُبْحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِي بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُواْ مِن دُونِي وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِي ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُـٔۥُواْ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُواْ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوْاْ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾





## سوورەتی (الإسراء)

**مەککەیی‌یە تەنها ئایەتی ٢٦ و ٣٢ و ٣٣ و ٥٧ و لە ئایەتی ٧٣ وە نەبێ تا دوایی ئایەتی ٨٠ و، (١١١) ئایەتە.**

(١) پاکی‌و بێ عەیبی بۆ ئەو خودایە کە شەورەویی بە بەندەی خۆی کرد کە موحەممەدە (د.خ) لە شەوێکدا لە (مسجد الحرام) ەوە لە مەککە بۆ (مسجد الاقصا) لە قودسی شەریف، ئەو مزگەوتی ئەقصایەی کە خۆی و دەوروبەریمان موبارەك کردووە. بۆ ئەوەیش شەورەویمان پێ کرد تا هەندێ نیشانەی قودرەتی خۆمانی پیشان بدەین و دڵی پێ دابمەزرێ. بەڕاستی خودا شنەواو بینایەو ئاگای لە هەموو شتە.

(٢) بەڕاستی تەوراتمان دا بە مووساو کردمانە هۆی شارەزایی بۆ بەنی ئیسرائیلو، پێمان وتن: لە من بەولاوە پشت بە هیچ کەس مەبەستن.

(٣) کە نەوەو زادەی ئەوانەن لەگەڵ نووح لە کەشتییەکەدا هەڵمانگرتن. بەڕاستی نووح بەندەیێکی سوپاسگوزار بوو.

(٤) وەحیمان کرد بۆ بەنی ئیسرائیل لە تەوراتداو پێمان وتن: ئێوە دووجار بەدکاری‌و ستەم ئەکەن لە زەویداو لەم ستەم و بەدکارییەدا بەرز ئەبنەوە بەرزبوونەوەیێکی گەورە.

(٥) کاتێ کە وەعدەی پاداشی خراپەکاریی یەکەم جارتان هات چەند بەندەیێکی بەهێز و ئازا لە بەندەکانی خۆمان ڕەوانە ئەکەین بۆ سەرتان بە دواتاندا ئەگەڕێن و لەناومالآندا ئەتانگرن و سزاتان ئەدەن. ئەمە بەڵێنێکی بڕیار دراوەو ئەبێ بێتەجێ.

(٦) لە پاشا جارێکی تر سەرتان ئەخەینەوە بەسەر دوژمنەکانتانداو بە ماڵ و کوڕگەلێکی زۆر یارمەتیدان ئەدەین، پاش ئەوە کە ماڵتان لە شەڕی پێشوودا بە تالآن براو کوڕەکانتان کوژران. هەروەها خەڵکی شەڕکەرتان بۆ زۆر ئەکەین کە هۆی سەرکەوتنە.

(٧) ئێوە ئەگەر چاکە بکەن بۆ خۆتانی ئەکەن و، ئەگەر خراپە بکەن زیانی خراپەکە هەر بۆ خۆتان ئەگەڕێتەوە. جا کە وەعدەی پاداشی زۆر و ستەمی جارەکەی ترتان هات خەڵکی ترتان بۆ ئەنێرین تا بەسەرتاندا سەرکەونەوەو نیشانەی سەرکەوتنیان بە ناوچاوانتانەوە دیار بێ و، وەك جاری پێشوو چوونە (بیت المقدس) ئەم جارەیش بچنەوە ناوی و هەرچی دەستیان ئەڕوات بەسەریا وێرانی بکەن.

عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ۘ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ وَأَنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾ وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ ۖ وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾ وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿١٧﴾



(٨) ئەمجا خودای گەورە بەئارامی قسەیان لەگەڵ ئەکات و ئەفەرموێ: هیوا هەیە کە خودا ڕەحمتان پێ بکات. بەڵام ئەگەر جارێکی تر دەستتان کردەوە بە خراپەکاری ئێمەیش ئەگەڕێینەوە بۆ تۆڵە لێ سەندنتان و، دۆزەخیشمان کردووە بە جێی کافران کە هەرگیز لێی دەرناچن.

(٩) بەڕاستی ئەم قورئانە شارەزایی خەڵك ئەکات بۆ ڕاسترین ڕێگا کە ئایینی ئیسلامە. هەروەها مژدە ئەدات بەو خاوەن ئیمانانەی کردەوەی چاك ئەکەن بەوەی کە پاداشێکی گەورەیان هەیە.

(١٠) ئەوانەیش کە ئیمان و باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نییە، سزایێکی پڕ ئازارمان بۆ ئامادە کردوون.

(١١) بنیادەم لەکاتی ڕق‌هەڵساندا دوعای شەڕ لە خۆیو لە ماڵو منالّی ئەکات وەك چۆن دوعای خێریان بۆ ئەکات. بنیادەم پەلەیەو چی بەدڵیا هات ئەیکات بێ ئەوەی بیر لە ئەنجام بکاتەوە.

(١٢) ئێمە شەو و ڕۆژمان کردووە بە دوو نیشانەی دەستەڵات و پڕحیکمەتیی کاری خۆمان، کە چۆن بە ڕێکوپێکی و بێ زیاد و کەم بە دوای یەکدا دێن. هەروەها شەومان تاریك و ڕۆژمان ڕووناك کرد تا لە ڕووناکیی ڕۆژدا کەسابەت بکەن و بەدوای نیعمەتی خودادا بگەڕێن و بەرچاوتان ڕوون بێ و، بە هۆی گۆڕانی شەو و ڕۆژەوە ژمارەی ساڵەکان و حیسابی کاروباری کەسابەتتان بزانن. بەڕاستی هەموو ئەو شتانەمان بۆ ڕوون کردوونەتەوە کە بۆ کاری دین و دنیاتان پێویستن.

(١٣) هەموو بنیادەمێ کردەوەی خۆیمان کردووەتە گەردنی، واتە: کردەوەی خۆی لەسەر خۆیەتی و، لە ڕۆژی قیامەتدا پەڕەی کردەوەکانی بۆ دەرئەکەین و بە کراوەیی و ئاشکرایی پێی‌ئەگات و سەیری ئەکات و خۆی ئەزانێ لە ژیانی خۆیدا چیی کردووە؟

(١٤) لە لایەن فریشتەی مەئمورەوە پێی ئەوترێ: کتێبی کردەوەکانی خۆت بخوێنەرەوەو بزانە چیت کردووە؟ ئەمڕۆ خۆت بەسیت بۆ لێپرسینەوەی خۆت، واتە پێویست ناکات کەس شایەتیت لێ بدات.

(١٥) هەرکەسێ هیدایەتی خودا قبووڵ بکات قازانجی هیدایەتەکەی هەر بۆ خۆیەتی و، هەرکەسێکیش گومڕا بێ ئەنجامی گومڕاهییەکەی لەسەر خۆیەتیو خۆی زیان ئەکات. هەروەها هیچ گوناهبارێ گوناهی یەکێکی تر هەڵناگرێو تەنها گوناهی خۆی هەڵئەگرێ. ئێمەیش سزای کەس نادەین تا پێغەمبەرێ ئەنێرین، کە ناردمانو بەگوێیان نەکرد ئەوکاتە سزامان ئەکەوێتە کار.

(١٦) کاتێ بمانەوێت ئاوەدانییەك بفەوتێنین فەرمان بە خاوەن نیعمەتەکان و دەستەڵاتدارەکانی ئەدەین پەیڕەویی پێغەمبەرەکەیان بکەن و، لە ڕێی ڕاست لانەدەن. ئەوانیش بێ‌گوێیی فەرمانەکە ئەکەن و لە ڕێی ڕاست لائەدەن، ئەمجا سزایان لەسەر پێویست ئەبێ و بە تەواوی وێرانی ئەکەین.

(١٧) زۆرمان لە خەڵکی چەرخەکانی پاش چەرخی نووح فەوتاند. خودای تۆ بەسە بۆ پێ زانین و بینینی گوناهی بەندەکانی خۆی و هیچی لێ ون نابێ.

مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَـٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَـٰٓؤُلَآءِ وَهَـٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْـَٔاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَـٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾ لَّا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ فَتَقْعُدَ مَذْمُومًا مَّخْذُولًا ﴿٢٢﴾ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُواْ صَـٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾



(١٨) ئـەو كەسـەی تـەنها ڕابـواردن و خۆشـیی دنیـای بـویێ هەرچـیمان بـویێ ئەیدەینێ بەو کەسەی بمانەوێ بیدەینێ و، لە پاشەڕۆژیشدا دۆزەخ ئەکەینە جێگای و بە زەمکراویو دوورخراوەیی لە ڕەحمەتی خوداوە بەو دۆزەخە ئەسووتێ.

(١٩) ئەو کەسەیش کە پاداشی پاشەڕۆژی بوێ و هەوڵی باشی بۆ بدا و، ئەو چاکانە بکات کە لەلایەن خوداوە ئەمریان پێ کراوەو ئەو کارانە نەکا کە خودا نەهیی لێ کردوون و، باوەڕی ڕاستەقینەی بە خودا ببێ، ئەوانە هەوڵەکەیان لەلایەن خوداوە قبووڵ کراوە.

(٢٠) هەر دوو تاقمەکە چ ئەهلی دین و چ ئەهلی دنیا لە نیعمەتی خودای تۆ بەشیان ئەدەین. بێگومان بەخششی خودای تۆ لە هیچ کەس ناگێڕرێتەوەو بەپێی خواستی خودا هەرکەس بەشی خۆی وەرئەگرێ.

(٢١) سەیرکە چۆن ڕۆزی و پایەی هەندێکمان لە دنیادا بەسەر هیی هەندێکدا زیاد کردووە. بێگومان ڕۆژی قیامەت پایەو پلەی گەورەترە، چونکە پایە وپلەی ئەوێ بەهەشت و پایەکانی، یا دۆزەخ و قووڵاییەکانیەتی.

(٢٢) لەگەڵ خودای پەروەردگار و تاك و تەنیا خودایەکی تر بڕیارمەدەو هاوبەش بۆ خودا دامەنێ، تا بەخراپی باس نەکرێیت و، لە میهرەبانیی خودا نائومێد نەبی.

(٢٣) خودای پەروەردگارت فەرمانی داوە هەر ئەو بپەرستن و، عیبادەت بۆ کەس مەکەن بۆ ئەو نەبێ. هەروەها فەرمانی داوە لەگەڵ باوك و دایکدا ڕەفتارتان چاك بێ، ئەگەر یەکێکیان لای تۆ بوو و لە سایەی تۆدا پیربوو، یا هەردووکیان لای تۆ بوون و لای تۆ پیر بوون، هەرگیز ئۆف مەکە لە دەستیان تا دڵیان نەیێشێ و هەرگیز لێیان تووڕەمەبەو بەڕوویاندا هەڵمەشاخێ و قسەی نەرم و نیان و باشیان لەگەڵ بکە.

(٢٤) باڵی زەلیلییان بۆ دانەوێنە و، خۆت بە ملکەچ پیشان بدە بۆیان و خاکینە بە لەگەڵیان و لە خودای خۆت بپاڕێرەوە بڵێ: خودایا وەك ئەوان منیان بە ساوایی و منداڵی پەروەردە کرد تۆیش لەگەڵ ئەوان میهرەبان و بە ڕەحم بە.

(٢٥) خودای ئێوە زاناترە بەوەی لە دڵتاندایە، ئەگەر ئێوە کردارتان چاك بێ ئەوا خودا گوناهپۆشی ئەوانەیە کە ئەگەڕێنەوە بۆ لای و تەوبە ئەکەن.

(٢٦) حەقی خزم و خوێش بدە، سیلەی ڕەحم بەجێ بێنە و، قسەت خۆش بێ لەگەڵیان و، چاکەیان لەگەڵ بکە. هەروەها حەقی هەژار و ڕێبوار بدە ، بەڵام ماڵت لە شتی وەهادا سەرف مەکە کە پێویست نەبێو زیادەڕەوی مەکە لە خەرج کردندا.

(٢٧) بەڕاستی ئەوانەی ماڵی خۆیان لە شتی ناپێویستدا خەرج ئەکەن برای شەیتانەکانن و شەیتانیش زۆر کافرو نافەرمانبەرداری خودای خۆیەتی.

وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾



(٢٨) ئەگەر ڕووت لە خزم و هەژارو ڕێبوار وەرچەرخاند چونکە نەتبوو بیاندەیتێو شەرمیشت ئەکرد دەست بە ڕوویانەوە بنێیو چاوەڕوانی ڕزقێکت ئەکرد لەلایەن خوداوە بۆت بێ تا بەشی ئەوانیشی لێ بدەی، لە حاڵی وەهادا قسەیێکی مەردانەو بەجێیان لەگەڵ بکە کە دڵیان بداتەوەو شادمانیان بکا.

(٢٩) ئەوەندە ڕژدو دەست نووقاو مەبە هیچت لەدەست نەبێتەوە بۆ کەس. ئەوەندەیش بەدەهەنەو دەست بڵاو مەبە هیچت بە دەستەوە نەمێنێ و بە سەرزەنشتکراویو غەمباریو پەشیمانی بۆی دانیشی.

(٣٠) بەڕاستی خودای پەروەردگارت دەرگای ڕزق و ڕۆزی ئەخاتە سەرپشت بۆ هەرکەس خواستی لەسەربێ و بۆ هەرکەسیش خواستی لەسەر بێ لێی ئەگرێتەوەو ڕۆزی تەنگ ئەکات. خودا ئاگای لە ئاشکراو نهێنیی بەندەکانی خۆی هەیەو ئەیانبینێ و ئەزانێ قازانجیان لەچیدایە.

(٣١) کوڕەکانتان لە ترسی فەقیریو نەبوونی مەکوژنو کچەکانتان زیندەبەچاڵ مەکەن، ئێمە ڕزق و ڕۆزیی ئەوانیش و ئێوەیش ئەدەین. بەڕاستی کوشتنیان گوناهێکی گەورەیە.

(٣٢) نزیکی زینا مەکەونەوە، چونکە زینا کارێکی خراپەو ڕێگاییێکی زۆر بەدەو دەبێتە هۆی تێکدانی نەسەب.

(٣٣) ئەو نەفسە مەکوژن کە خوا کوشتنی بەهۆی حەقێکی شەرعییەوە نەبێ حەرام کردووە. هەر کەسیش بە ستەم لێکراویو بە ناحەق بکوژرێ هێزی شەرعمان داوە بە حەقدارەکەی بۆ کوشتنەوەی بکوژەکە. دەی با ئەو حەقدارە زیادەڕەوی نەکا لە کوشتنەوەی بکوژەکەدا، چونکە ئەو لەلایەن خواوە یارمەتی دراوە بە حەقی تۆڵەسەندنەوە لە دنیا تۆڵەسەندنەوە لە دنیاداو بە پاداشی باش لە ڕۆژی قیامەتدا.

(٣٤) هەرگیز نزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە بە باشترین ڕێگا نەبێ کە قازانجی هەتیوەکەی تێدا بێ، تا ئەو هەتیوە ئەگاتە ڕادەی ئاوزان و فام کردنەوە کە بزانێ تەبەڕڕوف لە ماڵ و حاڵی خۆیدا بکات. هەروەها ئەگەر پەیمانێکتان بەست، بیبەنەسەرو هەڵیمەوەشێننەوە. بەڕاستی پەیمان لێی ئەپرسرێتەوە.

(٣٥) ئەگەر پێوانەتان کرد باش بپێون و، ئەگەر کێشانەتان کرد بە ترازوویەکی ڕێك بکێشن، ئەم شێوە مامەڵەیە بۆ ئێوە چاکترەو ئەنجامی جوانترە.

(٣٦) هەرگیز شوێنی شتێ مەکەوە عیلمت پێی نەبێ و بەڕاستی نەیزانی. بێگومان گوێ و چاو و دڵ، هەموو ئەمانە پرسیاریان لێ ئەکرێ کە خاوەنەکەیان چیی پێکردوون. شتێ نەتبیستبێ یا نەتبینیبێ یا بەڕاستی نەیزانی هەرگیز مەڵێ بیستوومە یا دیتوومە یا ئەیزانم.

(٣٧) بە دەعیەو فیزو خۆ بە زل زانینەوە مەڕۆ بە ڕێگادا، تۆ نە زەوی بە هەنگاوەکانت هەڵئەدڕی و نە بە درێژی ئەگەیتە بەرزیی کێوەکان. واتە دەعیەو خۆبەزلزانین شتێکی زۆر بێجێیە.

(٣٨) ئەم بیستو پێنج ڕەوشتە کە لە ((ولا تجعل مع الله الها اخر))ەوە تا ئێرە باس کران و نەهیان لێ کراوە لای خودا ناپەسەندن و پاداشی خراپیان لەسەرە.

ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدۡحُورًا ﴿٣٩﴾ أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم بِٱلۡبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًاۚ إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لِيَذَّكَّرُواْ وَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾ قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا ﴿٤٢﴾ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٤٣﴾ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ جَعَلۡنَا بَيۡنَكَ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ حِجَابٗا مَّسۡتُورٗا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۚ وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِ وَحۡدَهُۥ وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورٗا ﴿٤٦﴾ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴿٤٨﴾ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ﴿٤٩﴾



(٣٩) ئەم ئەمر و نەهیانە لەو حیكمەت و خوداناسی و كاری چاكانەن خودا وەحیی كردوون بۆ تۆ. خودای تر بڕیار مەدە لەگەڵ خودای تاك و تەنیا بە هاوبەش، نەبادا بە سەرزەنشت كراوی و دوورخراوەیی لە ڕەحمەتی خودا فڕێ بدرێیتە ناو دۆزەخ.

(٤٠) ئایا خودا ئێوەی هەڵبژاردووە كە كوڕتان بداتێ و، بۆ خۆی مەلائیكەی ئیختیار كردووە بە كچی خۆی؟ ئێوە قسەیێكی گەورەو بوختانێكی ناڕەوا بەدەم خواوە ئەكەن بەم قسەیە.

(٤١) بەڕاستی ئێمە لە قورئاندا بە چەند جۆر عیبارەتمان گۆڕیوەو پەندو ئامۆژگاریمان هێناوەتەوە بۆ ئەو كافرانە تا بیر بكەنەوەو ڕێگەی عەقڵ و تێفكرین بگرن، بەڵام ئەوان هەر دووریو بێباوەڕییان زیاد ئەبێو ئامۆژگاری كاریان تێ ناكات.

(٤٢) بڵێ بە موشریكەكان: ئەگەر لەگەڵ خودادا چەند خوایێكی تر هەبوونایە، وەكو ئەوان ئەڵێن، ئەوا ئەڕۆیشتن بۆ لای خودای خاوەن عەرش وەك عادەتی پادشاهان وایە كە سەر لەیەك ئەدەن، یا لێی نزیك ئەبوونەوە بە عیبادەت بۆ كردن كە بۆیان دەرئەكەوت ئەوانی تر بێدەستەڵاتن و هەر خوا دەستەڵاتدارە.

(٤٣) خوا پاك و بێعەیبەو زۆر لەو بوختانانە بەرزترە كە ئەوان بۆی هەڵئەبەستن.

(٤٤) هەر حەوت ئاسمانەكان و زەوی و هەركەسیان تێدایەو هەرچی شت هەیە هەموو تەسبیحاتی خودا ئەكەن، بەڵام ئێوە ئەی موشریكەكان، لە تەسبیحاتی ئەوان ناگەن. یا مەبەست ئەوەیە هەر حەوت ئاسمانەكان و زەوی و هەركەسیان تێدایەو هەرچی شت هەیە هەموو دەلالەت لەوە ئەكەن كە خودا(واجب الوجود)ەو لە مومكینات نی‌یەو تاك و تەنیایەو هاوبەشی نی‌یە، بەڵام ئێوە چونكە عەقڵتان ناخەنەكار و عەناد ئەكەن لەم گەیاندنە ناگەن. خودا زۆر بە حیلمەو زوو تۆڵە ناسەنێتەوە و، زۆر گوناه پۆشە بۆ ئەو كەسەی تەوبە ئەكات.

(٤٥) كاتێ كە تۆ قورئان ئەخوێنی لەبەینی تۆو ئەوانەدا كە باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نی‌یە پەردەیێكی داپۆشراو دروست ئەكەین، واتە صیفەتێكی وەها لە دڵی كافرەكاندا دروست ئەكەین مەنعیان بكات لە تێگەیشتنی قورئانەكە.

(٤٦) چەند پەردەیێكمان دروست كردووە مەنعیان ئەكەن لە تێگەیشتنی مەعنای قورئان و، گوێیان سەنگین ئەكەین لە بیستنی قورئانەكە. هەروەها كاتێ كە تۆ لە قورئاندا ناوی خوای خۆت بە تەنها ئەبەی، پشت هەڵئەكەن و ڕائەكەن و نایانەوێ وشەی خوابەیەكزانینەكە ببیسن.

(٤٧) ئێمە لە ئێوە زاناترین كەوا لەكاتێكدا ئەو كافرانە گوێت لێ ئەگرن بۆچی گوێت لێ ئەگرن، كە لەناو خۆیاندا بە چپە قسەئەكەن و گاڵتە بە تۆ و بە قورئان ئەكەن و ئەڵێن ئێوە دوای پیاوێكی سەرلێ شێواوی جادوولێكراو كەوتوون؟ (٤٨) جا تەماشا بكە چەند وێنەو نموونەت بۆ ئەهێننەوەو بەچەند جۆر باست ئەكەن: یەكێ ئەڵێ شێتە. یەكێ ئەڵێ جادووگەرە. یەكێ ئەڵێ كاهینە. یەكێ ئەڵێ لای عەجەمێ ئەخوێنێ. یەكێ ئەڵێ شاعیرە. ئەمانە گومڕا بوون و ناتوانن ڕێیەك بدۆزنەوە بۆ تانەلێدانت، جا ئەكەونە قسەی پڕوپووچ كردن.

(٤٩) كافرەكان ئەڵێن: ئایا كە ئێمە بووین بە ئێسقان و ڕزین و هەپروون هەپروون بووین جارێكی تر سەر لەنوێ بە دروست كردنەوەیەكی تازە زیندوو ئەكرێینەوە ؟!

۞ قُلْ كُونُوا۟ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِى صُدُورِكُمْ ۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا ۖ قُلِ ٱلَّذِى فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ ۖ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٥٢﴾ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ كَانَ لِلْإِنسَـٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ۖ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ۚ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ۖ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾



(٥٠) تۆ پێیان بڵێ: ببنە بەرد یا ببن بە ئاسن،

(٥١) یا ببنە شتێکی تر لە مەخلووقاتی خوا کە بەهێزترو گەورەتر بێ، بە هەرچی ببن خودا دەستەڵاتی هەیە زیندووتان بکاتەوە. دوایی ئەڵێن: کێ دروستمان ئەکاتەوە؟ بڵێ: ئەو کەسە کە یەکەم جار دروستی کردن. جا بە گاڵتەکردنەوە سەر با ئەدەن و ئەڵێن: کەی دروستمان ئەکاتەوە؟ بڵێ لەوانەیە نزیك بێ، بێگومان هەر دێتەجێ‌و، دوور لای خودا نزیکە.

(٥٢) لە ڕۆژێکدا کە بانگتان دەکات بۆ حەشرو حیساب و، ئێوە بەگوێی ئەکەن و بەدەنگیەوە دێن و، حەمدو سەناو ستایشی دەکەن لەسەر توان و دەستەڵاتی. لەو ڕۆژەدا گومان وا دەبەن کە ماوەیێکی کەم نەبێ لە ژیانی دنیادا نەماونەتەوە.

(٥٣) بە بەندە موسوڵمانەکانم بڵێ: لە کاتی موجادەلە لەگەڵ کافرەکاندا جوانترین قسەبکەن و بە زبری لەگەڵیان مەدوێن تا نەبێتە مایەی ئاشووب. ئەوان شەیتان هانیان ئەدا بۆ ئاژاوەو لەوانەیە قسەی زبر ئەنجامی باش نەبێ و زیاتر بەرەو عەنادو سەرکێشییان بەرێ، بەراستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئادەمیزادە.

(٥٤) پێیان بڵێن: خوا زاناترە بە حاڵی ئێوەو بەوەی لە دڵتاندایە، ئەگەر بیەوێ ڕەحمتان پێ ئەکات و ئەگەر بیشیەوێ سزاتان ئەدات. ئێمە تۆمان نەناردووە کە وەکیلی ئەوان بی و بەزۆر ئیمانیان پێ بهێنی، تۆ تەنها مژدەدەر و ترسێنەری.

(٥٥) خودای تۆ زاناترە بەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەن و، چاکتر ئەزانێ کێ بۆ پێغەمبەری ئەشێ. هەروەها هەندێ لە پێغەمبەرانمان فەزڵ داوە بەسەر هەندێکی تریانداو داوودمان بەوە گەورە کرد کە زەبوورمان بۆ ناردو لەو زەبوورەی ئەویشدا باسی پیرۆزیی ئایینی ئیسلام و گەورەیی حەزرەتی (محمد) کراوە ﴿ولقد كتبنا في الزبور من بعد الذكر أن الأرض يرثها عبادي الصالحون﴾. مەبەست لەو بەندە چاکانەیش پێغەمبەر و ئوممەتی ئیسلامە.

(٥٦) پێیان بڵێ: ئادەی بانگ لەوانە بکەن کە غەیری خودای پەروەردگار بە خودای خۆتانیان دەزانن، وەك فریشتەو عیساو عوزەیر، بزانن هیچتان بۆ ئەکەن؟ ئەوانە ناتوانن بەڵاو ناخۆشیتان لێ لادەن، یان بیدەن بەسەر کۆمەڵێکی تردا. ئەمە تەنها خودای تاك و تەنها ئەتوانێ بیکا.

(٥٧) ئەوانەی ئەو کافرانە بانگیان لێ ئەکەن تا بەهاواریانەوە بێن و فریایان بکەون، کامیان بە خوداپەرستی و لە خودا ترسان لێیەوە نزیکترن، بۆخۆیان لە هۆیەك دەگەڕێن پێی نزیك بینەوە لێی و، بۆخۆیان لە هۆیەك دەگەڕێن پێی نزیك بینەوە لێی و، بە تەمای میهرەبانینی‌و لە سزای ئەترسن. ئیتر چۆن ئێوە هاوار ئەکەنە ئەوانە؟! بەڕاستی سزای خودا شتێکی سەختەو شایانی ئەوەیە هەموو کەس لێی بترسێ.

(٥٨) هەرچی ئاوەدانییەك هەیە ئێمە پێش ڕۆژی قیامەت وێرانی ئەکەین یا سزایێکی سەختی بەسەردا ئەدەین، ئەمە لە (لوح المحفوظ) دا نووسراوە.

وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَٰنًا كَبِيرًا ﴿٦٠﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزْجِى لَكُمُ ٱلْفُلْكَ فِى ٱلْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾



(٥٩) ئێمە بۆیە ئەو موعجیزانە نانێرین کە قورەیش داوایان دەکەن چونکە ناردنمان بۆ قەومەکانی پێش ئەوان و باوەڕیان پێ نەکرد و ئەنجام ئەوەبوو لەناومان بردن. ئەگەر بۆ ئەمانیشی بنێرین و باوەڕی پێ نەکەن، ئەبێ بیانفەوتێنین و بنەبڕیان بکەین، ئێمەیش نامانەوێ بیانفەوتێنین. یەکێ لەو قەومانە کە موعجیزەمان بۆ ناردن قەومی سەموود بوو کە وشترێکمان لەسەر داوا کردنی خۆیان بۆ ناردن ببێ بە هۆی تێگەیشتنی خاوەن عەقڵان، کەچی ستەمیان لێ کردو بە زیندوویی چوار پەلیان بڕییەوە، ئێمە بۆیە ئەو موعجیزانە ئەنێرین بۆ ئەوەی لە ناردنی عەزاب بترسن و باوەڕی پێ بکەن و عادەتمان واکردووە ئەگەر باوەڕی پێ نەکەن لەناویان ببەین و کەسیان نەهێڵین، لەبەر ئەوە بۆیان نانێرین، لەناویان نەبەین.

(٦٠) یادی ئەوە بکە کە وەحیمان بۆ کردی، بەڕاستی خودای تۆ دەوری کافرەکانی داوەو لە دەستی دەرناچن، ئەو خەوەیش پێشانمان دای، کە ئەوە بوو ئەچیتە ناو مەککەوە، بۆ بەراوردکردنی موسولّمان و ناموسولّمان بوو. دیارە خەوی پێغەمبەران ڕاستەو زوو بێ یا درەنگ هەر دێتەدی. هەروەها بای دارە لەعنەتییەکە کە ناوی (زەققوومە)، بوو بەهۆی تاقیکردنەوەیان، دیارە ئینسانی موسولّمان باوەڕی بەوە هەیە کە بۆ توانی خودا فەرقی ئاوو خاك و ئاگر نی‌یە و، لە هەر شوێنێ مەیلی لێ بێ ئەیروێنێ، بەڵام کافرەکان باوەڕی پێ ناکەن. ئێمە بە هەموو جۆرێ ئەو کافرانە ئەترسێنین، بەڵام ئەو ترساندنە هەر سەرکەشی و لەخۆ بایی‌بوونیان زیاد دەکات.

(٦١) یادی ئەوە بکە کە بە مەلائیکەکانمان وت: سوجدە بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوجدەیان بۆ برد ئیبلیس (شەیتان) نەبێ کە وتی: من سوجدە بەرم بۆ یەکێ کە لە قوڕت دروست کردووە؟!

(٦٢) هەروەها وتی: ئاگادارم کە دەربارەی ئەو کەسەی گەورەت کردووە بەسەر منداو فەرمانم پێ ئەدەی سوجدەی بۆ بەرم. بۆچی گەورەت کردووە بەسەر مندا؟! ئەگەر دوام بخەیت و مۆڵەتم بدەیت تا ڕۆژی قیامەت، هەرچی نەتەوەی ئەو کەسە هەیە، کەمێکیان نەبێ، بە گومڕاکردن، لە ڕەگ‌وڕیشەیان دەرئەهێنم.

(٦٣) خودایش فەرمووی: دە بڕۆ، مۆڵەتت بێ، هەرکەس لەوان دوای تۆ بکەوێ ئەوا دۆزەخ پاداشتانە پاداشێکی وا حەققی خۆیان بۆ تەواو بکا.

(٦٤) هەرکەست پێ بکرێ لەوان، بە بانگ‌کردنی بۆ کردەوەی خراپ سووکی بکە. بە سوارەو پیادەتەوە پەلاماریان بدە. هەموو هێزێك بۆ هەڵخەڵەتاندنیان بخەرەکار. لە ماڵی حەرام و ئەولادی حەرامدا هاوبەشیان بە. بە درۆو دەلەسە بەڵێنیان بدەرێ. بەڵێنی شەیتان تەنها بەوەیە کە کاری خراپ و ڕەوشتی ناشرینیان لە بەرچاو جوان بکات.

(٦٥) ئەوانەی بەندەی منن و من ئەپەرستن تۆ دەستت بە سەریاندا ناڕوات. ئەوان خودایان بەسە کە پشتی پێ ببەستن و پەنای پێ بگرن لە تۆ.

(٦٦) خودای ئێوە ئەوخودایە کەشتیتان لە دەریادا بۆ بەڕێوە ئەبات، تا بگەڕێن و لە لوتفی خودا شتومەکتان دەست بکەوێ و قازانج بکەن، بەڕاستی خودا میهرەبانە لەگەڵتان .

وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ ۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَـٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَـٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَفَضَّلْنَـٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَـٰمِهِمْ فَمَنْ أُوتِىَ كِتَـٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَـٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِى هَـٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَـٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَـٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾



(٦٧) کاتێ لە ناو دەریادا تووشی نارەحەتی دەبن، ئەوانەی هاواریان لێ ئەکەن هەموو ون ئەبن و لەیادتان ئەچن چونکە ئەزانن هیچیان لەبارەدا نیەو هیچیان پێ ناکرێ خودا خۆی نەبێ. جا کە خودا رزگاری کردن و گەیاندنیە وشکانی، پشتی لێ هەڵئەکەن و موبالاتی پێ ناکەن و لێی ناپارێنەوەو ئەکەونەوە پارانەوە لە بتە هیچوپووچەکانتان. بەڕاستی ئینسان ناشوکرە بە نیعمەتی خوای گەورەو باوەڕی پێی نی‌یە.

(٦٨) بۆ وائەکەن بۆ وائەزانن خوا هەر لە دەریادا ئەتوانێ غەزەبتان لێ بگرێ؟ ئایا ئێوە لەوە ناترسن لە وشکانیشدا بتانبات بەناخی زەویداو بیتەپێنێ بەسەرتاندا؟ یا لەوە ناترسن بایەك بنێرێتە سەرتان بەردەبارانتان بکات و، کەستان دەست نەکەوێ بتانپارێزێ و رزگارتان بکات لێی؟

(٦٩) یا ناترسن لەوەی جارێکی‌تر خوا بە هۆی پێویستییەکەوە یا بۆ کارێکی تر، بتانگێڕێتەوە بۆ ناو دەریاو سواری کەشتی ببنەوەو، بە هۆی کوفرتان یا ناشوکریتانەوە بایەکی توندی تێکشکێنتان بنێرێتە سەرو نوقمتان بکات و، ئیتر کەستان دەست نەکەوێت دوای ئێمە بکەوێ و داوای رزگارکردنتان بکات لێمان؟

(٧٠) بەڕاستی ئێمە قەدری ئادەمزادمان گرتووە بە دیمەنی جوان و سروشتی چاك و بالآی رێكوپێك و هێزی تێگەیاندن بە قسەو نووسین و ئیشارەکردن و بە هۆش و فام و شارەزا کردنی رێگەی ژیان و دەست بەسەر زەویدا گرتن و پیشاندانی رێگەی چاکەو خراپەو، بە گەلێ نیعمەتی تر کە لە ژماردن نایەن، لە وشکانیدا بەسەر ولآخەوەو، لە دەریادا لەناو کەشتی‌دا هەڵمانگرتوون، رۆزیی پاك و پوختەمان پێ داون، چ ئەوەی خۆیان ئامادەی دەکەن و چ ئەوەی بۆیان ئامادەکراوە. هەروەها گەورەمان کردوون بە گەورەکردن بەسەر زۆر شتدا لەوانەی دروستمان کردوون.

(٧١) یادی رۆژێ بکە کە لەو رۆژەدا هەر تاقمێ بەناوی پێشەوای خۆیانەوە بانگ دەکەین، جا لەو رۆژەدا هەرکەسێ نامەی خۆیان بەشادمانییەوە ئەخوێننەوەو ئەوەندەی تۆزقاڵێ ستەمیان لێ ناکرێ.

(٧٢) هەرکەسێکیش لەم دنیادا کوێر بێ و چاوی رێگەی راست نەبینێ، ئەوە لە پاشەڕۆژیشدا هەرکوێرەو گومڕاترەو رێگە بە بەهەشت نابات.

(٧٣) بەڕاستی نزیك بوو، خودا نەخواستە، ئەو کافرانە لات بدەن لە کەوتنە شوێنی ئەوی وەحیمان کردوە بۆت تا غەیری ئەوەمان لێ نیسبەت بدەی، جا ئەوکاتە ئەیانکردی بە دۆستی خۆیان.

(٧٤) ئەگەر بە میهرەبانی خۆمان دڵمان لەسەر حەق قایم نەکردیتایە لەوانە بوو کەمێك مەیل بکەی بەلای ئەواندا.

(٧٥) جا ئەگەر وا بوایە نزیکیان ببوویتایەتەوە، سزای ژیان و سزای مردن، سزای دنیاو سزای قیامەتمان، دوو قاتی خەڵکی تر، دەرخوارد ئەدایت، چونکە تۆ گەورەیت و گوناهی گەورەیش لە گوناهی خەڵکی تر گەورەترە، ئەو کاتە کەست دەست نەئەکەوت یارمەتیت بدات و سزات لێ لادات.

وَإِن كَادُواْ لَيَسۡتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ لِيُخۡرِجُوكَ مِنۡهَاۖ وَإِذٗا لَّا يَلۡبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدۡ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِن رُّسُلِنَاۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحۡوِيلًا ﴿٧٧﴾ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ﴿٨٠﴾ وَقُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ﴿٨١﴾ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا ﴿٨٢﴾ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسٗا ﴿٨٣﴾ قُلۡ كُلّٞ يَعۡمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَنۡ هُوَ أَهۡدَىٰ سَبِيلٗا ﴿٨٤﴾ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ وَلَئِن شِئۡنَا لَنَذۡهَبَنَّ بِٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيۡنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾



(٧٦) بەڕاستی نزیك بوو ئەهلی مەككە نارەحەتت كەن تا لە خاكی مەككە دەرت كەن، جا ئەگەر دەرچوویتایە، ئەوان پاش تۆ ماوەییێكی كەم نەبێ نەئەمانەوە. ئەوەبوو كە پێغەمبەر(د.خ) لە مەككە دەرچوو ئەوەندەی نەبرد غەزای بەدر ڕوویداو كافرەكانی مەككە زۆریان لێ كوژراو سوپاكەیان شكا.

(٧٧) ئەمە یاسایەكە ئێمە دامانناوە دەربارەی ئەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ ناردوومانن كە هەر قەومێ پێغەمبەرەكەیان دەركردبێ لەناومان بردوون. بێگومان یاسای خودا گۆڕانی بۆ نی‌یە.

(٧٨) نوێژەكانت ڕاگرەو بیانكە هەر لە لادانی خۆرەوە لە ناوەڕاستی ئاسمان تا تاریكایی شەو دادێ، واتە نوێژەكانی نیوەڕۆو عەسرو مەغریبو عیشا. هەروەها نوێژی بەیانی بكە، بەڕاستی فریشتەكانی شەوو ڕۆژ ئاگایان لە نوێژی بەیانیانە.

(٧٩) لە هەندێ شەودا واز لە خەو بێنەو شەونوێژ بكە. ئەم شەونوێژە بەتایبەتی لەسەر تۆ فەرزكراوەو زیادە پاداشی تێدایە بۆت. ڕجا وایە بە هۆی ئەم خوداپەرستییانەوە خودا بەرزت بكاتەوە بۆ پایەییێكی باشی ستایش كراو.

(٨٠) تۆ بڵێ: ئەی خوای پەروەردگار! بەجۆرێكی باش بمخەرە ناو قەبرو، بەجۆرێكی باشیش لە قەبرم دەركە بۆ حەشرو، یارمەتیدەرێكی بەهێزم لای خۆتەوە بۆ بنێرە.

(٨١) هەروەها بڵێ: حەق كە ئایینی ئیسلامە هاتو بەتاڵ كە كوفرە لەناوچوو، بێگومان شتی پووچ و بێ مایە خۆی ناگرێ و لە ناوئەچێ.

(٨٢) ئێمە لە ئایەتی قورئان ئایەتی وا نازڵ دەكەین كە شیفایەو ڕزگارییە لە نەخۆشیی مادیەیو مەعنەوی بۆ ئەوانەی باوەڕیان بە خودا هەیە، بەڵام قورئان هیچ بۆ ستەمكاران زیاد ناكات زیان نەبێت.

(٨٣) كە نیعمەت ئەدەین بە ئینسان و، لەش‌ساغ و دەوڵەمەندی ئەكەین، ڕوو لە ناوی خوا وەرئەچەرخێنێ و خۆی بە زل ئەزانێ و لە خودا دوورئەكەوێتەوە. كە تووشی نارەحەتییەكیش ئەبێ، ئەخۆش ئەكەوێ یا هەژار ئەبێ، نائومێدی لە ڕەحمەتی فراوانی خودا دای ئەگرێ و هیوای‌ئەبڕێ.

(٨٤) تۆ بڵێ: هەركەس لەسەر ڕەوشت و مەزاج و عادەتی خۆی ئیش ئەكات و ئەجووڵێتەوە، جا خودای ئێوە باشتر ئەزانێ كێ ڕێگای ڕاستی باشتر گرتووە.

(٨٥) لە بارەی ڕۆحەوە لێت ئەپرسن كە چی‌یە؟ بڵێ: ڕۆح لەو مەخلووقانەیە كە بە ئەمرو فەرمانی خودای من پەیدابوون و، هەر خودا خۆی ئەزانێ چی‌یە، ئێوە ئەندازەییێكی كەم نەبێ زانیاریتان پێ‌نەدراوە، دیارە عەقڵی ماددیی كەموكوڕی ئێوە پەی بە شتی نامەحدوود ناباو نایزانێ.

(٨٦) ئەگەر بمانویستایە ئەو قورئانەمان كە وەحیمان كردووە بۆ تۆ لە سینەو لە سەر لاپەڕەكان مەحو دەكردەوە، ئەو كاتە كەسێكت دەست نەئەكەوت لە جیاتیی ئێمە بۆت بگەڕێنێتەوە.

إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾



(٨٧) بەلاّم خودا بەمیهرەبانیی خۆی لای نەبرد، بەڕاستی فەضل و چاکەی خودا بەسەر تۆوە گەورەیە.

(٨٨) تۆ بلێ: ئەگەر هەموو ئینسان و جین کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ناتوانن وێنەی بێنن هەرچەند لە ناو خۆیشیاندا پشتی یەکتر بگرن.

(٨٩) بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا هەموو جۆرە نموونەو ڕوداوێکی سەیرو عەجایەبمان بۆ خەڵك هێناوەتەوە تا بیربکەنەوەو ئیمان بهێنن، کەچی بەشی زۆری ئادەمزاد لە کافری بەولاوە ڕێگایەکی تریان ئیختیار نەکرد.

(٩٠) وتیان: تا کانییەکمان لە زەوی بۆ هەڵنەقوڵێنی، باوەڕت پێ ناکەین و ئیمانت پێ ناهێنین.

(٩١) یا ئەبێ باغێکی دارخورماو دارمێوت هەبێ چەند جۆگای بەناودا بتەقێنی بە تەقاندن.

(٩٢) یا وەك خۆت ئەڵێیت پارچە پارچە ئاسمان بدەیت بەسەرماندا، یا خوداو فریشتەکان بێنیتە سەرمان کە شاهید بن لەسەر ڕاستیی قسەکانت.

(٩٣) یا خانوویێکی ئاڵتوونت هەبێ، یا بەرز بیتەوە بۆ ئاسمان و، لەگەڵ ئەوەیشدا تا کتێبێکمان بۆ نەهێنی بیخوێنینەوە تیا نووسرابێ کە بەرز بویتەوە، باوەڕ بە بەرزبونەوەکەت ناکەین. تۆیش بلێ: پاکی و بێ‌خەوشی بۆ خودای منە. ئێوە چۆن داوای شتی وەها لە من ئەکەن؟ بۆ من لە بنیادەمێکی فورستادەی خودا بەولاوە هیچ هەم واتە: من مرۆیەکم توانم کەموکورت و سنووردارە، چۆن ئەتوانم ئەم شتانە بکەم؟

(٩٤) هیچ شتێ مانیعی ئەو خەڵکە نەبوو پاش هاتنی قورئان و دەرکەوتنی حەق ئیمان بهێنن ئەوەنەبێ کە ئەیانوت: ئایا خودا ئادەمزادێکی بە فورستادەیی ناردووە ؟

(٩٥) تۆ بلێ: بەو کافرانە ئەگەر لە ئەرزا مەلائیکە ببوونایە بە نیشتەجێی بڕۆیشتنایە بەسەر زەویداو وەکو ئادەمیزاد لەوێ بژیانایە.. لە ئاسمانەوە مەلائیکەمان ڕەوانە ئەکرد بۆ سەریان بە پێغەمبەری، چونکە پێغەمبەر ئەبێ لە نەوعی ئەوانە بێ کە ڕەوانە ئەکرێ بۆ سەریان. دەی مادام ئێوە ئادەمیزادن پێویستە ئادەمیزادیش بێت بۆ لاتان ئیتر بۆچی داوای هاتنی مەلائیکە ئەکەن کە لە غەیری جینسی خۆتانە؟

(٩٦) بلێ: خودا بەسە بۆ شاهیدی لە نێوان من و ئێوەدا، خودا ئاگادارو بینایە بە حاڵی بەندەکانی خۆی.

وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾



(٩٧) هەرکەس خودا هیدایەتی بدات ئەو کەسە شارەزای ڕێگای ڕزگاری بووەو، هەرکەسیش خودا گومڕای بکات ئەو جۆرە کەسانە دۆستی وەهایان نابێ سوودیان بۆیان هەبێ و، لە ڕۆژی قیامەتا لەپەوڕوو حەشریان ئەکەین و بە کوێریو کەڕولاڵی بەکێشیان ئەکەین و جێگایان دۆزەخە، هەرچەند بڵێسەی دامرکێتەوە ئێمە گڕەکەی زیاد دەکەین.

(٩٨) ئەمە سزای ئەوانە چونکە بڕوایان بە ئایەتەکانمان نەکردو ئەیانوت: ئایا ئەگەر ئێمە مردین و بووین بە ئێسقان و ڕزین، ئایا تازە ئێمە بەدروستکردنێکی نوێ زیندوو ئەکرێینەوە ؟

(٩٩) ئایا نازانن ئەو خودا توانایە کە ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە ئەتوانێ وێنەی ئەوانیش دروست بکاتەوەو ماوەیێکی بۆ مانەوەیان لە دنیاداو بۆ مردنیان و زیندوو کردنەوەیان داناوە هیچ گومانی تێدا نییە؟ بەڵام ستەمکارەکان لەگەڵ ئاشکرایی ئەم ڕاستییەیشدا لە کافری بەولاوە هیچ ناکەن و هیچیان ناوێ.

(١٠٠) تۆ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە خاوەنی گەنجینەکانی ڕەحمەتی خودای من بونایە، لە ترسی تەواوبوونی هیچتان بە کەس نەئەدا. ئادەمزاد هەر لە سەرەتەوە ڕژدو دەست نووقاوە.

(١٠١) بەڕاستی ئێمە نۆ موعجیزەی ئاشکرامان دا بە مووسا کە هەمووی بەڵگەبوون لەسەر دەستەڵاتی خودا. ئەو نۆ موعجیزەیەش بریتی بوون لە (عەسا، دەستی وەك چرا هەڵگیرساوو، بەرزکردنەوەی کێوی طوورو، لەتبوونی دەریا، چەند ساڵی قاتیو قڕیو بێ ڕزقیو، هێرشی ئەسپێ بۆ سەر عەماری ڕزق و بۆ سەر لەشیان و، هێرشی بۆق بۆ سەر خۆراکیان و، خوێن لەسەر نان و خوانیان و دەرهاتنی ئاو لەبەردەوە). دەی هەواڵی ئەوە لە بەنیئیسرائیلییەکان بپرسە کە مووسا هات بۆلایان و، فیرعەون وتی: ئەی مووسا تۆ پیاوێکی جادوولێکراوی.

(١٠٢) مووسایش ووتی: تۆ خۆت ئەزانی کەس ئەو موعجیزانەی نەناردووە خودا نەبێ کە ئەو موعجیزانەیش دەلیلن لەسەر ڕاستیی قسەی من. من بەڕاستی لام وایە تۆ لە ڕێی ڕاست لادراویو تەبیعەتت لەسەر شەڕ خوڵقاوە.

(١٠٣) جا فیرعەون ویستی بەنیئیسرائیلییەکان سووك و بێ نرخ بکات و لە میسریان دەربکات. ئێمەیش فیرعەون و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون هەموومان نوقم کردن و لەناومان بردن.

(١٠٤) پاش نوقمکردنی فیرعەون و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، بە بەنی ئیسرائیلییەکانمان وت: لەو ئەرزەدا دانیشن کە فیرعەون ویستی دەرتان بکات لێی، کە وادەی ڕۆژی قیامەتیش هات، هەمووتان حازر ئەکەین، ئێوەیش و ئەوانیشو، موحاکەمەتان ئەکەین و بەختیار و بەدبەخت لە یەك جیا دەکەینەوە.

وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَۗ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿١٠٥﴾ وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا ﴿١٠٦﴾ قُلۡ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوۡ لَا تُؤۡمِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهِۦٓ إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَۤ لِلۡأَذۡقَانِۤ سُجَّدٗا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعٗا۩ ﴿١٠٩﴾ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ﴿١١٠﴾ وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي لَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٞ فِي ٱلۡمُلۡكِ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلِيّٞ مِّنَ ٱلذُّلِّۖ وَكَبِّرۡهُ تَكۡبِيرَۢا ﴿١١١﴾

## سُورَةُ الكَهۡفِ

ترتيبها ١٨ — آياتها ١١٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ﴿١﴾ قَيِّمٗا لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا ﴿٢﴾ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدٗا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا ﴿٤﴾



(١٠٥) ئێمە ئەم قورئانەمان بە حەق نازڵ کردووە کە هەر ئەبوو وا نازڵمان بکردایەو، بە حەق نازڵ بووەو پێویست بوو وا نازڵ ببیٚ، تۆیشمان نەناردووە بۆ ئەوە نەبیٚ مژدە بە گوێگر بدەیت و ئەوانە بترسێنی کە گویٚناگرن.

(١٠٦) ئێمە ئەم قورئانەمان بەش بەش ناردووەتە خوارەوە تا بە شێنەیی و لەسەرخۆ بۆ خەڵکی بخوێنیتەوەو ئەوانیش بەئاسانی تێی بگەن، ئێمە قورئانمان بە پێی ڕووداوەکان پارچە پارچە ناردووەتە خوارەوە.

(١٠٧) پێیان بڵێ: ئیمان بێنن بە قورئان یا ئیمانی پیٚ نەهێنن، نە بە ئیمانەکەتان قورئان زیاد دەکات و نە بە ئیمان نەهێنانتان کەم دەکات، خەڵکی لە ئێوە چاکتر ئیمانیان پیٚ هێناوە لەوانەی کە کتێبە پێشووەکانیان خوێندووەتەوەو ڕاستیی (وەحی) دەزانن و فەرق لەبەینی حەق و ناحەقدا دەکەن، کاتێ کە قورئانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە بەڕوودا ئەکەون و سوجدە بۆ خوا دەبەن.

(١٠٨) ئەڵێن: پاکی و بیٚ عەیبی بۆ خودایە، بەڕاستی وەعدەی خودای ئێمە دەبیٚ بێتەجیٚ.

(١٠٩) بە ڕوودا ئەکەون و ئەگرین و بیستنی قورئان ترسیان لە خودا زیاد دەکات.

(١١٠) تۆ بڵێ: بە (یاالله) بانگ بکەنە خوا یا بە (یا رحمان) دروستەو هیچ مانیعێکی تێدا نی‌یە، هەردووکیان جوانن و خودا ناوی جوان جوانی هەیە کە بـ (الأسماء الحسنى) ناسراون و لە هەموو ناویٚ جوانترن. نوێژ بە دەنگی بەرز مەکە کە کافرەکان گوێیان لیٚ بیٚو دەست بکەن بە جنێودان، بە دەنگی نزمی وەهایش مەیکە کە تەنانەت خۆیشت نەیبیسی. لە نێوان ئەم دوو جۆرە ڕێگایەکی مامناوەندی نە بەرزو نە نزم بگرە.

(١١١) تۆ بڵێ: سەناو ستایش بۆ ئەو خودایە ئەوەی بۆ خۆی قەرار نەداوەو هاوبەش و هاوکاریشی نی‌یە لە تەسەڕڕوفدا، هەروەها یارمەتیدەریشی ناویٚ لەبەر کزبوون و داماوی، چونکە هەرگیز کز نابیٚ تا پێویستی بە یارمەتیدەر بیٚ. بە گەورەی جیهانی دابنیٚ و بڵێ: خوا لە هەموو گەورەییٚ گەورەترە.

## سوورەتی (الكهف)

**مەککەیی‌یە تەنها ئایەتی ٣٨ و لە ئایەتی ٨٣ ەوەنەبیٚ تا ئاخری ئایەتی ١٠١ و، (١١٠) ئایەتە.**

(١) سەناو ستایش بۆ خودای (واجب الوجود)ە کە قورئانی پیرۆزی نازڵ کردووەتە سەر بەندەی خۆی کە پێغەمبەرە، لەو قورئانەدا کە ناردوویەتی هیچ جۆرە لاری و نالەبارییەك نی‌یە چ لەلایەن وشەوەو چ لەلایەن واتاوەو لە هیچ شتێکدا لە حەق و ڕاستی لای‌نەداوە.

(٢) قورئانێکە ڕاستو ڕەوانو میانەڕەوەو بەرژەوەندیی بەندەکانی خودا ئەپارێزیٚ. بۆ ئەوە نێرراوەتە خوار کافران و بیٚئیمانان لە سزای سەخت بترسێنیٚ و، مژدەی دوارۆژی باش و پاداشی چاك بەوانە بدات کە باوەڕیان بە خودا هەیە و کردەوەی چاك ئەکەن. (٣) کە هەتا هەتایە لەو خۆشییەدا ئەمێننەوە.

(٤) هەروەها بۆ ئەوە نێرراوەتە خوارەوە ئەوانە بترسێنیٚ لە سزای سەخت کە ئەڵێن خودا کوڕی هەیە.

مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِآبَآئِهِمْ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾



(٥) نە خۆیان ئاگایان لەمە هەیەو نە باووباپیریان ئاگایان لێ بووە!. بوختانێکی زۆر گەورەیە لە دەمیان دەرئەچێ و قسەکەیان درۆ و دەلەسە نەبێ هیچی تر نی‌یە.

(٦) تۆ لەوانەیە خۆت بە خەم و خەفەت بفەوتێنی لە داخی ئەو کافرانە کە باوەڕ بەم قورئانە ناکەن.

(٧) بێ‌گومان هەرچی لەسەر ڕووی زەوییە لە گیاو گوڵ و گوڵزار و دار و درەخت و جۆراوجۆری میوەو هەموو جۆرە سەوزاییەك، ئێمە کردوومانن بە هۆی جوانی و ئارایشتی زەوی، تا خەڵکی سەرزەوییان پێ تاقی بکەینەوەو بەراوردیان بکەین ئاخۆ کامیان کاری جوانترەو هەڵسوکەوتی ڕاسترە و، باشتر سوودی دین و دنیا لەو بەرهەمانە وەرئەگرێ ؟

(٨) هەروەها پاش ئەو ئارایشت و جوانییە دەیکەینەوە بە زەوییەکی بێ گیان و بێ‌گیاو ڕووتوقووت.

(٩) ئایا تۆ گومان وا ئەبەی ڕاگرتن و هێشتنەوەی گیانی کۆمەڵی ئەصحابولکەهف شتێکی سەیرە و، لە چاو موعجیزەو نیشانە زۆرەکانی خودادا مایەی سەرسووڕمانە ؟

(١٠) لەو کاتەدا کە کۆمەڵی گەنجی خاوەن ئیمان لە دەست جەورو ستەمی کافری زۆردار هەڵاتن و پەنایان بردە بەر ئەشکەوت و خۆیان شاردەوە و، لە خودای خۆیان پاڕانەوە وتیان: خودایا! لەلایەن خۆتەوە ڕەحمەتمان بدەرێ و لە گوناهمان ببوورێ و ڕۆزیمان بدەرێ و لە قێڵ و زۆری دوژمن ڕزگارمان بکە و، لەم کارەدا کە لەسەرینی ڕێگای ڕاستمان پیشان بدە.

(١١) ئەوە بوو بۆ ماوەی چەند ساڵ لەو ئەشکەوتەدا خەواندمان بە جۆرێ هیچ دەنگ و هەرایەك خەبەریان نەکاتەوە.

(١٢) پاشان بێدارمان کردنەوە تا بزانین لەو دوو تاقمە کە ئیختیلافیان لە ماوەی مانەوەیاندا هەبوو، کامیان ماوەی مانەوەیانی باشتر زانیوەو چاکتر بۆی چووە ؟

(١٣) ئێمە بە شێوەیێکی ڕاست باسی بەسەرهاتی ئەوانت بۆ ئەگێڕینەوە: ئەوانە کۆمەڵە لاوێك بوون ئیمانیان بە خودای خۆیان هێنابوو، ئێمەیش زیاتر باوەڕمان بەهێزکردبوون و زیاتر بەرچاومان ڕوون کردبوونەوە.

(١٤) دڵمان لەسەر خۆگرىو تەحەموول کردنی دووریی لە وڵات و ماڵ و منداڵ و لەسەر دەربڕینی حەق لە ڕووی زۆرداری کافردا بەهێزکردبوون، ئەوەبوو لەبەر دەمیدا هەستانە سەرپێ و بەئاشکرا وتیان: خودای پەروەردگاری ئێمە خودای پەروەدگاری ئاسمانەکان و زەوییەو، بێجگە لەو بانگ لە هیچ کەس ناکەین و کەس ناپەرستین ئەو نەبێ. ئەگەر بانگ لە غەیری ئەو بکەین و بێجگە لەو شتی تر بپەرستین، ئەوا قسەیێکی هەڵەو هیچوپووچ و دوور لە ڕاستیمان کردووە.

(١٥) ئا ئەوانە خێڵەکەی ئێمەن لە خودای (واجب الوجود) بەولاوە، چەند خوداییێکی درۆیینە ئەپەرستن! ئەوە بۆ بەلگەیێکی دیار و ئاشکرا لەسەر ڕاستی و بەکەلکیی ئەوانە ناهێننەوە؟ چۆن شت بێ‌دەلیل دەکرێت بە خودا ؟! کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بۆ خودا هەڵبەستێ و هاوبەشی بۆ دابنێ؟

وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ
يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا
﴿١٦﴾ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ
ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ
مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن
يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ﴿١٧﴾ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا
وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم
بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ
فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا ﴿١٨﴾ وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ
لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا
يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ
أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ
طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ
بِكُمۡ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ
أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ﴿٢٠﴾



(١٦) جا كۆمەڵە لاوەكە لە ترساندا لە كافرەكان جیابووبوونەوە، لە ناو خۆیاندا وتبوویان: مادام ئێوە لەو قەومە خراپەو لەو بتانە جیابوونەوە كە ئەوان ئەیانپەرستن‌و خوا ناپەرستن، بڕۆنە ئەو ئەشكەوتە. خودای گەورەیش لە میهرەبانیی خۆی بەشتان ئەدات و كارتان بۆ ئاسان ئەكات و هۆی حەسانەوەو ژیانتان بۆ ئامادە ئەكات.

(١٧) وەزعی ئەشكەوتەكەیان وا كەوتبوو كە خۆر هەڵئەهات بەلای ڕاستیا لای‌ئەداو كە ئاوا ئەبوو بەلای چەپیا لای ئەدا. هەتاو سوودی پێ ئەگەیاندن، بەڵام تیشك‌و گەرمای هەتاوەكە لێی نەئەدان ، ئەوانیش لە ناوەڕاستی ئەشكەوتەكەدا بوون بە جۆرێ كە هەوای پاكیان پێ ئەگەیشت و شێ و تاریكیی ئەشكەوتەكە ئازاری نەئەدان. ئەمە كاری خودایە كە بەو جۆرە لەو ئەشكەوتەدا ئەحەسانەوەو، نیشانەیێكە لە نیشانەكانی میهرەبانیی ئەو. بێ‌گومان هەركەس خودا هیدایەتی بدات ئەوە بە ڕاستی شارەزای ڕێگای ڕاست ئەبێ و، هەركەسیش خودا گومڕای بكات نابینی دۆستێكی یاریدەدەر و ڕێ پیشاندەری هەبێ.

(١٨) ئەگەر تەماشات بكردنایە وات ئەزانی بەخەبەرن، یا لەبەر ئەوەی چاویان كراوە بوو یا لەبەر ئەوەی جموجوولیان ئەكرد، كەچی لەڕاستیدا نووستبوون. بەلای ڕاست و چەپدا هەڵمان ئەسووڕاندن تا لەشیان نەڕزێ. .. هەروەها سەگەكەیشیان لەبەردەرگای ئەشكەوتەكەدا هەردوو دەستی ڕاخستبوو. ئەگەر بڕۆیشتیتایەتە ڕاسەریان و سەیرت بكردنایە ڕات ئەكرد لێیان و گیانت پڕ ئەبوو لە ترس لە وەزعیان.

(١٩) جا هەروەك خەواندمان خەبەریشمان كردنەوە. بێ‌گومان ئەم خەواندن و خەبەركردنەوەیە نیشانەی دەسەڵات و توانی خودایە. بۆیە خەبەرمان كردنەوە تا لەناو خۆیانا پرسیار لە یەكتر بكەن و ڕاستییان بۆ دەربكەوێ و باوەڕیان بە توانی خودا زیاتر ببێ. جا یەكێكیان وتی: ئاخۆ چەندێكە لەم ئەشكەوتەدا خەوتووین؟ هەندێكیان لە وەڵاما وتیان: ڕۆژێك یا هەندێ لە ڕۆژ. دوایی كە لە خۆیان ووردبوونەوە تەماشایان كرد نینۆك و موویان زۆر درێژ بووە و، خەوەكە هیی ڕۆژ و دوو ڕۆژ نی‌یە، وتیان: هەر خودا ئەزانێ چەند خەوتوون؟ ئادەی یەكێكتان بنێرن بۆ شار و با ئەم دراوە زیوەیشتان لەگەڵ خۆی بەرێ و بزانێ كام دووكاندار خواردەمەنیی پاك و پوختەتری هەیە ڕزق و ڕۆزیی لێ بكڕێ بۆتان. با زۆر بەنەرمییش قسە لەگەڵ ئەهلی بازاڕ بكات و كارێكی وا نەكات كەس پێتان بزانێ.

(٢٠) چونكە بەڕاستی ئەگەر بێتو ئەهلی شارەكە پێتان بزانن ئەوا یا بەردەبارانتان ئەكەن و ئەتانكوژن یاخۆ زۆرتان لێ ئەكەن و ئاتانگێڕنەوە بۆ سەر ئایینی خۆیان و ئیتر ئەگەر گەڕانەوە بۆ ئایینی ئەوان هەرگیز لە سزای خودا ڕزگار نابن.

وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَا۟ىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ ۖ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ ۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ وَٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ ۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٧﴾



(٢١) هەروەك خەواندنمان و زیندوومان کردنەوە، وەهایش خەڵکمان لە وەزعیان ئاگادار کرد، تا ئەو خەڵکە بزانن بەڵێنی خودا ڕاستەو هاتنی ڕۆژی قیامەت شتێکی ڕاست و بێ‌گومانە. چونکە ئەوی بتوانێ ئەو ماوە زۆرە بنیادەم بخەوێنێ و دواییش زیندووی بکاتەوە، دەستەڵاتی ئەوەی هەیە ڕۆژی قیامەتیش هەموو مردووان زیندوو بکاتەوە. لەو وەختەدا خەڵکەکە ئەوانەیان دی دەمەقاڵەیان بوو لە مەسئەلەی زیندوو بوونەوەدا. جا کە پاشان ئەو کۆمەڵە لاوە بەتەواوی مردن، خەڵکەکان وتیان: خانوویەکیان بەسەرەوە بکەنەوە یا شوێنەکە ببێتە ئاوەدانی. خودا زاناترە حاڵی ئەمانە چۆن بووە؟ هەندێکی دەستەڵاتداریش وتیان: مزگەوتێکیان بەسەرەوە دروست ئەکەین.

(٢٢) هەندێك لە ئەهلی کیتاب ئەڵێن: کۆمەڵی ئەشکەوتەکە سێ کەس بوون و چوارەمیان سەگەکەیان بووە. هەندێکیش لە گاورەکان ئەڵێن: پێنج بوون و سەگەکەیان شەشەمیان بووە. ئەمانە لە خۆیانەوە غەیب لێ ئەدەن و باسی شتێ ئەکەن ئاگایان لێ نی‌یە. موسوڵمانەکانیش ئەڵێن: حەوت کەس بوون و سەگەکەیان هەشتەمیان بووە. تۆ ئەی پێغەمبەری خودا بڵێ: خودا لە هەموو کەس چاکتر ئەزانێ چەند بوون. خەڵکێکی کەم نەبێ، لەوانەی کە خودا ئاگاداری کردوون، کەس نازانێ چەند بوون. هەروەها تۆ ئەی پێغەمبەری خودا دەربارەی (اصحاب الکهف) بەشێوەیێکی سادە نەبێ موجادەلەیان لەگەڵ مەکەو دەربارەی بەسەرهاتیان لە کەس مەپرسە، چونکە ئەوانە نایزانن و بۆ ئەوەیش ناشێن پرسیاریان لێ بکرێ.

(٢٣) هەرگیز مەڵێ سبەی فلان کار ئەکەم.

(٢٤) بێ ئەوەی بڵێی ئەگەر خودا خواستی لەسەر بێ، واتە: بڵێ: ئەگەر خودا خواستی لەسەر بێ فلانە کار ئەکەم. جا ئەگەر لەبیرت چوو و کەوتەوە بیرت بڵێ: (ان شاء الله). هەروەها بڵێ تکام وایە خودا شارەزام بکات بۆ زانینی شتێ کە لە زانینی بەسەرهاتی (اصحاب الکهف) زیاتر لە پێغەمبەرایەتیم بگەیێنێ.

(٢٥) ئەو کۆمەڵە سێسەدونۆ ساڵ بە خەوتوویی لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە.

(٢٦) بڵێ: خودا زاناترە کە چەند ماونەتەوە تیادا. هەر ئەوە هەموو نهێنییەکانی زەوی و ئاسمانەکان ئەزانێ. ئای کە بینایە، ئای کە شنەوایەو هیچی لێ ون نابێ. هەرچی ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی هەیە، خودا نەبێ، کەس نی‌یە سەرپەرشتییان بکات و کاریان ڕاپەڕێنێ. خودا لە حوکم و دەستەڵاتی خۆیا کەسی نەکردوە بە هاوبەشی خۆی.

(٢٧) ئەو قورئانە بخوێنەرەوە کە لەلایەن خودای پەروەردگارتەوە وەحی کراوە بۆت و گوێ مەدەرە قسەی کافران. کەس ناتوانێ فەرموودەی خوا بگۆڕێ خۆی نەبێ و، بێجگە ئەو پەناو پشتێکت دەست ناکەوێ پشتی پێ ببەستی.

وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۚ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٣١﴾ ۞ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَٰبٍ وَحَفَفْنَٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴿٣٢﴾ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا ۚ وَفَجَّرْنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرًا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾



(٢٨) نەفسی خۆت لەگەڵ ئەوانەدا ڕابگرە بەیانیان و ئێواران لە خودای خۆیان ئەپاڕێنەوەو ناوی ئەبەن و ڕەزامەندیی ئەویان مەبەستە. چاوت لە موسوڵمانان وەرمەچەرخێنەو لامەدە بڕوانیتە کافرەکانو مەبەستت جوانیی ژیانی دنیاو سامانی دنیا بێ. بەگوێی ئەو کەسە مەکە کە دڵیمان لەیادی خۆمان بێئاگا کردووەو دوای ئارەزوو نەفسی خۆی کەوتووەو لە حەق پێش ئەکەوێت و پشتی تێ ئەکاو بەگوێی ناکات.

(٢٩) تۆ ئەی پێغەمبەری خودا بڵێ: شتی حەق و ڕاست ئەوەیە کە لای خوداوە بەهۆی پێغەمبەرەوە بۆتان بێت، ئیتر ئەوەی ئەیەوێ ئیمان بهێنێ با ئیمان بهێنێ و ڕێگەی ڕاست بگرێ و، ئەوەی ئەیەوێ کافر بێ با کافربێ و ڕێگای چەوت بگرێ. ئێمە ئاگرێکمان ئامادە کردووە بۆ ستەمکاران دەوریان ئەگرێ و گەمارۆیان ئەدات. ئەگەر هاوار و فیغانیش بکەن و لە تینواندا داوای ئاو بکەن، ئاوێکیان پێ ئەدرێ وەك لەشی تواوە گەرمەو دەموچاو ئەبرژێنێ. ئای کە ئاوێکی خراپە! ئای کە ئاگر جێگای حەساوەنەیێکی بەدو ناخۆشە!

(٣٠) ئەو کەسانەی ئیختیاری ئیمانیان کردووەو ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باشیان کردووە، ئێمە پاداشی ئەوانە نافەوتێنین کە کردەوەی باشیان کردووە.

(٣١) جێگاو پاداشی ئەو موسوڵمانە کردەوەباشانە بەهەشتی هەمیشەییە کە ڕووباریان لە بنەوە ئەڕوات. هەروەها بازنی زێڕ لە دەست ئەکەن و جلوبەرگی سەوزی سوندوس و ئاوریشمینی ئەستوور لەبەر ئەکەن و لەسەر کورسی جوان و ڕازاوە پاڵ ئەدەنەوە. ئەمە باشترین پاداش و جوانترین شوێنی حەسانەوەیە.

(٣٢) تۆ ئەی پێغەمبەر! نموونەی حاڵ و ئەنجامی کافر و موسوڵمان بۆ ئەوانە بهێنەرەوە بە دوو پیاو لە بەنی ئیسرایل یەکێکیان کافر و ئەوی تریان خاوەن ئیمان بوو. دوو باغی ڕازاوەمان دابوو بە یەکێ لەو دوانە کە باغی ترێ بوون و دەوران دەوریانمان بە دار خورما گرتبوو. نێوانی ئەو دوو باغەیشمان کردبوو بە کشتوکاڵ.

(٣٣) هەر دوو باغەکە هاتنە بەرو هیچ کات بەروبوومیان کەمی نەئەکرد. لە نێوان ئەو دوو باغەیشدا جۆگایەکمان تەقاندبوو تا هەمیشە تێراو بن و جوان و بەڕەونەق بن.

(٣٤) خاوەنی دوو باغەکە بێجگە لەو دوو باغە ماڵ و سامانیشی هەبوو. جا ئەم پیاوە ڕۆژێ لە کاتی قسە لەگەڵکردندا بە هاوڕێکەی وت: من دارایی و ماڵ و سامانم لە تۆ زۆرترەو لە تۆ زیاتر پایەو قەدرم هەیە.

وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلٗا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴿٣٨﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴿٤٢﴾ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلۡحَقِّۚ هُوَ خَيۡرٞ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا ﴿٤٤﴾ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾



(٣٥) ڕۆیشتنە ناو باغەکەی، لە کاتێکدا کە ستەمی لە خۆی کردو بە گومڕاهی مایەوە. وتی: باوەڕ ناکەم ئەم باغ و سامانە هەرگیز بفەوتێ.

(٣٦) هەروەها وتی: هەرگیز باوەڕ ناکەم ڕۆژی قیامەت بەرپا ببێ. خۆ ئەگەر زیندوویش بکرێمەوەو بگەڕێمەوە بۆلای خودای خۆم، ئەوا لەم باغ و سامانەیش چاکترم دەست ئەکەوێت و ئەنجامم باشتر ئەبێ.

(٣٧) هاوڕێ موسوڵمانەکەی کە قسەو گفتوگۆی لەگەڵ ئەکرد پێیوت: ئەوە کوفرت کرد و باوەڕت بەو خودایە نییە سەرەتا لە خۆڵ و دوایی لە نوتفە دروستی کردیت و، پاشان کردیتی بە ئینسانێکی نێرو گەیانیتیە پایەی پیاوان؟

(٣٨) بەڵام من خودا پەروەردگارمەو هەرگیز کەس ناکەم بە هاوبەشی پەروەردگاری خۆم.

(٣٩) ئەوە بۆ کە چوویتە باغەکەت و سەیری ئەو هەموو جوانییەت کرد، نەت وت: (ما شاء الله)، خودای گەورە بە دەسەڵاتەو هەرچی مەیلی لێ بێ دروستی ئەکات و، هەرچی نازو نیعمەتە هەمووی هیی ئەوەو ،هەر چی هێزو توانە هەمووی هەر لە خوداوەیە. ئەگەر ئەمبینی من ماڵ و منداڵ و سامانم لە تۆ کەمترە، لات عەجایەب نەبێ ،

(٤٠) لەوانەیە خودای گەورە لە دنیادا بێ یا لە قیامەتدا، لە باغەکەی تۆ جوانترم بداتێ. هەروەها لە خۆت بایی بەمە، لەوانەیە خودا لە ئاسمانەوە هەورە تریشقەیێك بنێرێتە سەر باغەکەت و هەمووی بفەوتێنێ و بیکاتە زەوییەکی ڕووسی خزیلگە،

(٤١) یاخود ئاوەکەی بچێ بە ناخی زەویداو ون ببێ و، هەرگیز نەتوانی بگەڕێی بەدوایدا بیگێڕیتەوە.

(٤٢) ئەوە بوو وەك هاوڕێکەی وتی، دەردو بەڵا گەمارۆی باغەکانی داو بەروبوومی لەناوبردو هیچی بۆ نەمایەوە. جا لەو کاتەدا دەستی ئەماڵی بەدەستیداو خەفەتی ئەخوارد و ئاخی هەڵئەکێشا بۆ ئەو هەموو ئەرکەی لەو باغانەدا کێشابووی و ئەیوت: خۆزگا هەرگیز هاوڕێ و هاوبەشم بۆ خودا بڕیار نەئەدا.

(٤٣) لەو کاتە تەنگییەدا، بێجگە خودا، نە کەسێکی هەبوو، نە کۆمەڵێك یارمەتی بدەن و بێن بە هاوارییەوەو، ئەو هێزو دەستەڵاتەی ئەوسا هەیبوو هیچی نەما، چونکە خودا تۆڵەی لێ کردەوە.

(٤٤) لەو کاتەداو لەو بارودۆخەدا یارمەتیدانی ڕاستەقینە هەر بۆ خودایەو، بێجگە ئەو کەس ناتوانێ یارمەتی بدات. خودا چاکتر پاداشی دۆستانی خۆی ئەداتەوەو چاکتر ئەنجامیان بۆ دائەنێ.

(٤٥) ئەی پێغەمبەر! بۆ جوانی و ڕەونەقی ژیانی دنیاو زوولاچوونی، نموونە بهێنەرەوە بۆ خەڵك بەو ئاوەی لە ئاسمانەوە ئەینێرین و، بەهۆی ئەو ئاوەوە دنیا پڕ ئەبێ لە گیاو سەوزیی جۆراوجۆرو ئەچن بەیەکدا، کەچی زۆری پێناچێ وشك ئەبێتەوەو ئەبێتە پووش و پەڵاشی وردو خاش و با ئەیباو شوێنەواری نامێنێ. خودای گەورە توانایەو دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا ئەڕوات.

ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ
خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى
ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُوا۟
عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ بَلْ زَعَمْتُمْ
أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ
مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ
لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟
حَاضِرًا وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟
لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ
أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ
بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ۞ مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا
﴿٥١﴾ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ
فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ
ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴿٥٣﴾



(٤٦) مـالّ و سـامان و ئـەولاد جـوانیی ژیـانی دنیـان و زوو لەناونەچـن. بـەڵام کـردەوە چـاکەکان، کـە بەرهـەمیان هـەتا هەتایـە ئـەمێنێ، لای خـودا چـاکترن بـۆ بنیادەم لـە لایـەنی پاداشـەوەو، چـاکترین شتێکن هیوایان پێ ببەسترێ.

(٤٧) باسی ئـەو ڕۆژە بکـە کـە کێوەکـان ئەخەینە جموجووڵ و لە بن هەڵیانئەکـەنین و ئەیانڕەوێنین و، لەو کاتەدا تەختی زەوی بەئاشکرا ئەبینی، چونکە هیچی لەسـەر نابـێ‌و، خـەڵك هـەموو کۆئەکەینـەوەو کەسیان بەجێ ناهێڵین.

(٤٨) هەموو ئەمانە لـە بـەردەم خـودادا ئـەنوێنرێن تـا فـەرمانی خـۆی بـدات دەربارەیـان. جـا خـودا ئەفـەرموێ: ئـەوا ئێوە بەڕاستی هـاتن بـۆ لامـان وەك چـۆن یەکەم جار بـە ڕووتوقـووتی و بـێ مـاڵ و منالّ دروستمان کردن. ئێوە وەختی خـۆی لـە دنیـادا ئـەتانوت: گوایـە ئێمـە کـاتی زیندووکردنەوەمان بۆ دیاری نەکردوون و، لاتـان وابـوو پێغەمبـەران درۆیـان لەگـەڵ ئەکردن.

(٤٩) لەو ڕۆژەدا نامەی کردەوە دائەنرێ، جـا ئـەبینی تاوانبارەکـان، زۆر لـەوە ئەترسن کە لە ناو ئەو نامانەدا نووسراوەو ئەڵێن: ئەی هاوار مـاڵوێران خۆمـان! ئـەم نامەیە نە کاری گەورەو نە کاری بچووك هیچی بەجێ نەهێشتووەو هەمووی نووسیوەو دیاریی کردووە؟ چییان کردوو
لە دنیادا لەو کاتەدا هەمووی ئەبینن و بە تەواوی بۆیان دەرئەکەوێ کە پەروەردگاری تۆ ستەم لە کەس ناکـات و بـ
خۆڕایی سزای کەس نادات.

(٥٠) باسی ئەوە بکە کە لەکاتی خۆیدا بە فریشتەکانمان وت: سوجدەبەرن بـۆ ئـادەم و، لەوێـدا هـەموویان بـەگوێـ
کردین و سوجدەیان بۆ برد، شەیتان نەبێ کە لە بەرەی جین بوو لە فەرمانی خودا دەرچوو و سوجدەی نەبرد. جـا ئایـ
لەگەڵ ئەم حاڵەدا ئێوە شەیتان و نەوەکانی ئەکەنە دۆستی خۆتان لەجیاتیی من کە ئەوانـە دوژمـنی ڕاسـتەقینەتان
بێگومان شەیتان بریتییەکی زۆر خراپە بۆ ستەمکاران. مرۆی ژیر چۆن دوژمن ئەکاتە دۆستی خۆی؟

(٥١) من شەیتان و نەوەکانیم ئاگادار نەکردووە لە دروستکردنی ئاسمانـەکان و زەوی. هـەروەها هەنـدێکیانم ئاگـادا
نەکردووە لە دروستکردنی هەندێکیان، بەڵکو تەنها بە زۆر و توانی خۆم دروستم کردوون. من هەرگیز ئەوانە ناکەمـ
یاریدەدەر کە خەڵك گومڕا ئەکەن و، پشتیان پێ نابەستم.

(٥٢) باسی ئەو ڕۆژە بکە کە خودا بە کافرەکـان ئـەڵێت: ئـادەی بـانگ لـە هاوبەشـەکانم بکـەن، ئەوانـەی ئێـوە بـە
هاوبەشی منتان ئەزانین و ئەتانوت: ئەوانە تکاتان بۆ ئەکەن لای من. جا کافرەکانیش بانگیان لێ ئەکەن، بەڵام ئەوان
هیچ وەڵامیان نادەنەوەو فریایان ناکەون هەروەها ئاگری دۆزەخمـان لـە نێـوان هـەردوو لایانـدا دانـاوە کـە هەرکەسـ
تێکەوێ بە هیلاك ئەچێ.

(٥٣) لەو ڕۆژەدا تاوانبارەکان ئاگری دۆزەخ ئەبینن و بەڕاستی ئـەزانن کـە ئەکەونـە نـاو ئـەو ئـاگرەو، هـیچ مـاوەی
خۆلێلادانیان نییە.

وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُوا رَبَّهُمْ إِلَّا أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ الْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ الْعَذَابُ قُبُلًا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۚ وَيُجَادِلُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالْبَاطِلِ لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ ۖ وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَمَا أُنذِرُوا هُزُوًا ﴿٥٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوا إِذًا أَبَدًا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ الْغَفُورُ ذُو الرَّحْمَةِ ۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا لَعَجَّلَ لَهُمُ الْعَذَابَ ۚ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا مِن دُونِهِ مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ الْقُرَىٰ أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَاهُ لَا أَبْرَحُ حَتَّىٰ أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾



(٥٤) ئێمە بەڕاستی هەموو نموونەیێکی ڕوون و هەموو شتێکی باش و بەسوودمان لەم قورئانەدا بۆ بنیادەمەوشیارەکان باس کردووە، بەلاّم ئینسان لە هەموو شت زیاتر موجادەلەو چەنەبازی ئەکات و لەسەر ناحەق ئەڕوات.

(٥٥) ئەو خەلکە کە پێغەمبەریان بۆ نێرراو قورئانیان بۆ نازلّ کرا، بۆیە ئیمان ناهێنن و داوا لە خودا ناکەن کە لە گوناهیان خۆش بێ چونکە سەرسەختن و بەتەمای ئەوەن کارەساتی نەتەوە پێشووە کافرەکانیان بەسەردا بێت و بە تەواوی لەناوبرێن یا سزای ڕۆژی قیامەتیان بەئاشکرا بۆ بێت.

(٥٦) ئێمە پێغەمبەران ڕەوانە ناکەین بۆ ئەوە نەبێ مژدەی پاداشی چاك بە موسولّمانان و چاکەکەران بدەن و، کافران و بەدکاران لە سزای دواڕۆژ بترسێنن. دروستکردنی ئایەت و موعجیزەو بەجێهێنانی خواستی کافران بەدەستی ئەوان نی‌یە. کافرەکان بەرامبەر بە حەق‌و ڕاستی‌و دژی پێغەمبەر موجادەلەو چەنەبازیی هیچوپووچ ئەکەن و ئەیانەوێ حەق ببەزێنن و لەناوی بەرن، هەروەها گالّتە بە قورئان‌و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر ئەکەن.

(٥٧) کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە بە قورئان ئامۆژگاری بکرێ کەچی ڕوو لەو ئامۆژگارییە وەرچەرخێنێ و گوێی نەداتێ، هەروەها کردەوە بەدە ناپارەکانی خۆی لەبیربچێتەوە؟ ئەمانە ستەمکارن، ئێمە دلّمان مۆر کردوون و لەو ئامۆژگارییە ناگەن و، گوێیان لە ئاستی حەقدا گرانەو بانگیشیان بکەی بۆ شارەزابوون هەرگیز شارەزا نابن و ڕێگای ڕاست ناگرن.

(٥٨) خودای تۆ زۆر تاوانپۆش و میهرەبانە. ئەو ئەگەر ئەو ستەمکارانەی بە هۆی کردەوەی بەدیانەوە بگرتایە، بە پەلەو زۆر زوو سزای ئەدان و تۆلّەی لێ ئەکردنەوە. بەلاّم ئەمانە کاتی تایبەتییان بۆ دیاری کراوە کە لەو کاتەدا بێجگە خودای گەورە پەنایێکیان دەست ناکەوێ و کەس بەهاواریانەوە نایەت.

(٥٩) ئەو دێهات‌و ئاوەدانییانە کە نشینگەو شوێنی عادو سەموودو هاوچەشنەکانیان بوون کە خەلّکەکەیان دەستیان دایە ستەمکاری‌و بەدرۆزن دانانی پێغەمبەران و باوەڕپێ‌نەکردنیان، لەناومان بردن و بە ڕەچەلّەکیاندا چووینە خوارو کاتێکی تایبەتیمان بۆ لەناوبردنیان دیاری کرد.

(٦٠) باسی ئەوە بکە کە ڕۆژێ مووسای کوڕی عیمران، پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل، بە یووشەعی خزمەتکار و خوشکەزای خۆی وت: هەر ئەڕۆم و ناوەستم تا ئەگەمە ئەو شوێنەی دوو دەریاکە ئەگەنە یەك، یا ماوەیێکی زۆر ئەڕۆم.

(٦١) کە گەیشتنە شوێنی بەیەك‌گەیشتنی دوو دەریاکە، ماسییەکەیان کە لە تۆشەبەرەیەکا بوو و ئامادە کرابوو بۆ خواردن لەبیر چوو. ماسییەکەیش بە فەرمانی خودای گەورە زیندوو بوویەوەو ڕێگەی خۆی لە دەریادا گرتەبەرو ڕۆیی.

فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا
هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ
ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ
فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا
قَصَصًا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ
عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ
عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ
مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ
سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ
فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا
﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِى ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا ۖ قَالَ أَخَرَقْتَهَا
لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ
لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِى بِمَا نَسِيتُ وَلَا
تُرْهِقْنِى مِنْ أَمْرِى عُسْرًا ﴿٧٣﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ
قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾



(٦٢) کە ئەو شوێنەیان بەجێ هیشت مووسا بە یووشەعی وت: ئا خواردەمەنیەکەی نیوەڕۆمان بۆ بێنە، بەڕاستی لەم سەفەرەماندا زۆر ماندوو بووین.
(٦٣) یووشەع وتی: ئاگات لێ نەبوو کە چووینە پاڵ تاشە بەردەکە بۆ حەسانەوەو تۆ خەوت لێ کەوت؟ لەوکاتەدا من ماسییەکەم لەبیرچوو و شەیتان نەبێ کەس لەبیری نەبردمەوەو، ماسییەکە بە شێوەیەکی سەیر ڕێگای خۆی لە دەریادا گرتەبەر و ڕۆیی.
(٦٤) مووسا وتی: دەرچوونی ئەو ماسییە لەناو تۆشەبەرەکە بۆ ناو دەریا ئەوەبوو کە ئێمە ئەمانویست، چونکە ئەوە نیشانەی جێگای گەیشتنە بەو بەندەیە کە خوا بە منی فەرمووە. جا هەردوکیان دوابەدوا گەڕانەوەو شوێن پێی خۆیانیان هەڵئەگرتەوە.
(٦٥) جا کە گەڕانەوە بۆ شوێنی دەرچوونی ماسییەکە گەیشتن بە بەندەیێ لە بەندەکانی ئێمە کە ڕەحمەتی پێغەمبەرایەتیمان پێ دابوو و شتی وەهامان فێرکردبوو لە ڕێگای وەحی بۆ کردنی ئێمەوە نەبێ نازانرێ.
(٦٦) مووسا پێی وت: ئایا ڕێگام ئەدەی دوات کەوم و لەگەڵتا بم بەمەرجێ لەوەی فێر کراوی لە هۆیەکانی ڕوشـ مەعریفەت فێرم بکەی؟ (٦٧) ئەویش وەڵامی مووسای دایەوەو وتی: تۆ ناتوانی لەگەڵ من بساچێنی و خۆت لەگـ من پێ ناگیرێ. (٦٨) تۆ چۆن خۆت ئەگری لەسەر کارێ کە هەر دیوی دەری ئەبینی و نازانی دیوی ناوەوەی چی یە
(٦٩) مووسا وتی: ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ ئەمبینی خۆگر ئەبم و لە هیچ شتێکدا بێ گوێیت ناکەم.
(٧٠) وتی: باشە، ئەگەر دوام کەوتی و لەگەڵم هاتی هەرچی ئەکەم لێم مەپرسە تا خۆم پێت ئەڵێم.
(٧١) جا پێکەوە ڕۆیشتن تا گەیشتنە کەشتییەك و سواری بوون. هەر کە سوار بوون کابرا تەشوێیەکی هەڵگرت و کەشتییەکەی کون کرد. مووسا پێی وت ئەوە کەشتییەکەت شکاند تا خەڵکەکەی ناوی نوقوم بکەیت؟ بە ڕاستی کارێکی خراپی گەورەت کرد!
(٧٢) پیاوەکە بە مووسای وت: پێم نەوتی تۆ لەگەڵم هەڵناکەی و خۆت پێ ڕاناگیرێ ؟
(٧٣) مووسا وتی: لێم مەگرە کە ئامۆژگارییەکەتم لەبیرچوو و بارم بە توانج و تووڕە بوون گران مەکە.
(٧٤) دوای ئەوەی لە کەشتییەکە دەرچوون کەوتنەوە ڕێ تا گەیشتن بە منداڵێکی نابالغ و هاوڕێکەی مووسا کوشتی. مووسا وتی: ئەوە ئەفسێکی بێ گوناهت کوشت بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ ؟! بەڕاستی کارێکی زۆر ناشیرین و ناڕەوات کرد!.

قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا ﴿٧٦﴾ فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَا أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٨٢﴾ وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾



(٧٥) هاوڕێکەی مووسا وتی: ئاخر پێم نەوتی تۆ ناتوانی لەگەڵ من خۆت ڕاگری؟

(٧٦) مووسا وتی: ئەگەر پاش ئەم ڕووداوە دەربارەی هەرشتێ پرسیارم لێ کردی هاوڕێیەتیم مەکە. ئەم چەند جارە پرسیارم لێ ئەکردی عوزرم هەبوو.

(٧٧) جا کەوتنەوەڕێ تا گەیشتە دێیەك. لەوکاتەدا برسییان بوو، داوای خواردەمەنییان لە خەڵکی دێیەکە کرد، ئەوانیش میوانداریيان نەکردن. لەو دێیەدا دیواری خانووێکیان دی خەریك بوو بڕووخێ. هاوڕێیەکەی مووسا ڕاستی کردەوە. مووسا پێی وت: ئەگەر بتویستایە کرێیەکت لەسەر چاککردنەوەی ئەم دیوارە وەرئەگرت و دەفعی ئەم برسییەتییەی خۆمانمان پێ ئەکرد !

(٧٨) هاوڕێکەی مووسا ناوی (خضر) بوو، بە مووسای وت: ئێستا ئیتر کاتی لێکجیابوونەوەی من و تۆیەو، لەمەولا تۆ لەگەڵ من هەڵناکەیت. وا ڕاستی حەقیقەتی هۆی ئەو کارانەت پێ ئەڵێم کە خۆتت پێ ڕانەئەگیراو ڕەخنەت لێ ئەگرتم لەسەریان.

(٧٩) هەرچی کەشتییەکەیە کە کونم کرد، ئەوە مولکی چەند کەسێکی هەژار بوو لە دەریادا کاریان ئەکرد و بە دەرامەتی ئەو کەشتییە ئەژیان. پادشایێك لەدوایانەوە بوو هەر کەشتییەکی ساغ و سەلیمی بدیایە داگیری ئەکرد، منیش عەیبدارم کرد تا ئەو پادشایە داگیری نەکات.

(٨٠) هەرچی کوڕەکەیش بوو کە کوشتم، باوك و دایکی موسوڵمان بوون. ترساین کە گەورە بوو، بە لەخوایاخیبوون و کافریی خۆی نارەحەت و ماندوویان بکا.

(٨١) ویستمان خودا کوڕێکی لەو باشتریان بداتێ نەفسی پاکتر بێ و میهرەبانتر بێ لەگەڵیان و قازانجی ببێ بۆیان.

(٨٢) دیوارەکەیش کە ڕاستم کردەوە هیی دوو منداڵی هەتیو بوو لە شارەکەدا و، لەژێر ئەو دیوارەدا غەزنەیێکی زێڕو زیویان هەبوو و باوکیشیان پیاوێکی چاك بوو. خودای تۆ ویستی ئەو منالآنە گەورە بن و فام پەیدابکەن و ئەو غەزنەیان دەربێنن و سوودی لێ وەرگرن. جا ئەگەر دیوارەکە بڕووخایە خەڵکی بە غەزنەکەیان ئەزانی و ئەیانبرد بۆ خۆیان. ئەمەیش میهرەبانییەك بوو لە خوداوە دەربارەی ئەو منالآنە. ئیتر من لە خۆمەوە ئەو کارانەم نەکردوە و بە فەرمانی خودا کردوومن. ئەمە ڕاستیی ئەو کارانە بوو تۆ خۆتت پێ ڕانەگیرا و، ڕەخنەت لەسەر کردنیان لێ گرتم.

(٨٣) جوولەکەکان یا موشریکەکانی مەککە لەبارەی ئەسکەندەری زولقەرنەینەوە پرسیارت لێ ئەکەن کە ئەسکەندەری ڕۆمیی شای ڕۆم و فارسە، پێیان بڵێ: لەمەودوا لەبارەی ئەوەوە قورئانتان بۆ ئەخوێنمەوە.

إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَغۡرُبُ فِي عَيۡنٍ حَمِئَةٖ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوۡمٗاۖ قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمۡ حُسۡنٗا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوۡفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا نُّكۡرٗا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطۡلِعَ ٱلشَّمۡسِ وَجَدَهَا تَطۡلُعُ عَلَىٰ قَوۡمٖ لَّمۡ نَجۡعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتۡرٗا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَۖ وَقَدۡ أَحَطۡنَا بِمَا لَدَيۡهِ خُبۡرٗا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمٗا لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلٗا ﴿٩٣﴾ قَالُواْ يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِنَّ يَأۡجُوجَ وَمَأۡجُوجَ مُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَهَلۡ نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا عَلَىٰٓ أَن تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدّٗا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارٗا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرٗا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسۡطَٰعُوٓاْ أَن يَظۡهَرُوهُ وَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقۡبٗا ﴿٩٧﴾



(٨٤) بەڕاستی ئێمە دەستەڵات و هێزمان پێ دابوو لە زەوییدا و، هەرچی بویستایە بۆمان ئەسازاند. ئەوەبوو ویستی بگاتە ڕۆژاوا، ئێمەیش هۆمان بۆ ئامادە کردو.
(٨٥) ئەویش دوای هۆیەکە کەوت و بەرەو ڕۆژاوا ڕۆیشت. (٨٦) تا کە گەیشتە شوێنێ خۆر بەناو سەرچاوەییێکی قوڕاودا ئاوا ئەبوو، واتە بەناو ئاوێکدا ئاوا ئەبوو کە لە دوورەوە وەکو قوڕاو ڕەشی ئەکردەوە، لەویا قەومێکی دی بەدکردار و بێنایین بوون و، لەبەر بێگوێیی و سەرپێچییان شایانی سزا بوون. ئێمەیش خستمانە دڵی زولقەرنەینەوەو تێمان گەیاند کە تۆ ئارەزووی خۆتە: یا بێ پشوودان سزایان ئەدەیت، یا ڕووت لەگەڵیان خۆش بێو داوای تەوبەیان لێ بکەیت.
(٨٧) ئەویش بە قەومەکەی وت: هەرکەس بەگوێم نەکات و لەسەر کافریو ستەمکاری بمێنێتەوە، سزای ئەدەین و دوایی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەگەڕێتەوە بۆ لای خودای خۆی سزایێکی سەخت و ناهەمواری ئەداتێ. (٨٨) هەر کەسێکیش ئیمان بە خودا بێنێ و کرداری چاك بکات، لە هەردوو دنیادا باشترین پاداشی هەیە و، ئێمەیش کاری سووك و ئاسانی بەسەردا ئەدەین.
(٨٩) پاش ئەوە کەوتە سەر ڕێگای ڕۆژهەڵات. (٩٠) تا کە گەیشتە ئەو شوێنەی هەتاوی لێ هەڵدێ، سەیری کرد هەتاو لە قەومێ ئەکەوێ لە خ… بەولاوە شتێ نەبوو دایانپۆشێ، نە جلوبەگ و نە خانوو. (٩١) کاری زولقەرنەین بەو جۆرە بوو کە باسمان کرد ل… دەستەڵات و پایەبەرزییدا و، ئێمە ئاگادار بووین لەوەی کە هەیبوو لە زیرەکی و تەجرەبە لە کاروباری سوپا… ئەسبابی جەنگیدا. واتە: هەر ئێمە ئەمانزانی چەند دەستەڵاتی هەبوو.
(٩٢) هەروەها کەوتە شوێن ئەسبابی داگیرکردنی دنیا و ڕێگایەکی تری گرتەبەر لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بەرەو… باکوور. (٩٣) تا کە گەیشتە شوێنێ لە نێوان دوو کێودا بوو، لە نێوانی ئەو دوو کێوەدا بەستێ کرابوو. لەوێ… قەومێکی دی لەوانە بوو لە قسە حاڵی نەبن.
(٩٤) کۆمەڵێ لە ژیرەکانی ئەو قەومە هاتنە لای زولقەرنەین و پێیان وت: ئەی زولقەرنەین! نەتەوەی یەئجووج… مەئجووج لەم ناوانەدا نەتەوەییێکی بەدکارن لەسەر ئەم زەوییە و، پیاو ئەکوژن ماڵ تاڵان ئەکەن! ئایا ڕازی ئەبی ل… موڵك و ماڵی خۆمان خەراجێکی تایبەتیت بۆ دیاری بکەین بە مەرجێ بەستێك لەنێوان ئێمە و ئەواندا دروست… بکەی ڕێگایان لێ بگرێت نەتوانن هێرش بێننە سەرمان؟
(٩٥) ئەویش وتی: ئەوەی خودا بە منی داوە لە دارایی و زانیاریی لەو خەراجەی ئێوە چاکترە. ئێوە تەنها بە هێزی… کارگەران یارمەتیم بدەن. تا لە نێوان ئێوە و ئەواندا بەستێکی بەرز و ئەستوور دروست بکەم.
(٩٦) ئێوە ئاسنی پارچە پارچەم بۆ بێنن و بیانخەنە سەر یەك. ئەوانیش بۆیان هێنا تا بەینی هەردوو کێوەکەی… پڕکردەوە. جا بە وەستا و پیشەوەرەکانی وت: دەمە لەسەر ئەو دیوارە ئاسنینە بدەمێنن و فووی پێدا بکەن، ئەوانیش… دەمەیان دەماند و فوویان پێدا کرد تا هەموو ئاسنەکانی ئەو دیوارە سوورەوە بوون، ئەنجا پێی وتن: مسی تواوەم بۆ… بێنن تا بیڕێژم بەسەریا.
(٩٧) ئیتر پاش ئەوە قەومی یەئجووج و مەئجووج نەیانتوانی بەسەر بەستەکەدا سەرکەون و نەیشیانتوانی کونی بکەن.

قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ۖ فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴿٩٨﴾ ۞ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ ۖ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَافِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾ الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَاءٍ عَن ذِكْرِي وَكَانُوا لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴿١٠١﴾ أَفَحَسِبَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن يَتَّخِذُوا عِبَادِي مِن دُونِي أَوْلِيَاءَ ۚ إِنَّا أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ﴿١٠٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَالِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴿١١٠﴾



(٩٨) زولقەرنەین وتی: ئەم بەستە قایم و سەختە میهرەبانییەکە لەلایەن خودای پەروەردگارمەوە. بەڵام کاتێ کە وەعدەی خودا هاتەدی بۆ دەرچوونی یەئجووج و مەئجووج یا بۆ بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت، بەستەکە ئەڕووخێنێ و لەگەڵ زەوی تەختی ئەکات. بێ‌گومان وەعدەی پەروەردگاری من ڕاستەو دێتەدی.

(٩٩) لەو ڕۆژەدا کە یەئجووج و مەئجووج لە پشتی بەستەکەوە دەرئەچن لێیان ئەگەڕێین دێن بەیەکاو بە وڵاتاندا شەپۆل ئەدەن. یا لە ڕۆی قیامەتدا خەڵکی بە سەرلێشێواوی و سەرسامی دێن بەیەکاو تێکەڵ ئەبن. هەروەها فوو ئەکرێ بە صوردا بۆ بەرپا بوونی قیامەت و هەموو خەڵکی کۆئەکەینەوە بۆ لێپرسینەوە.

(١٠٠) لەو ڕۆژەدا دۆزەخ بۆ کافران دەرئەخەین و پیشانیان ئەدەین.

(١٠١) ئەو کافرانەی لە دنیادا چاویان پەردەی بە سەردا کێشرابوو و نیشانەکانی دەستەڵاتی منیان نەئەبینی و، گوێیان لە ناستی قسەی من کەڕ بوو و شتی ڕاستیان بە گوێدا نەئەچوو. (١٠٢) ئایا کافرەکان وا ئەزانن پەرستنی بەندەکانی من و لادان لە پەرستنی من بەکەڵکیان دێ و سوودی هەیە بۆیان؟ ! نەخەیر وا نی‌یە، بەڕاستی ئێمە دۆزەخمان بۆ شوێنی کافرەکان ئامادە کردووە و بۆ سزای ئەوانمان داناوە. (١٠٣) پێیان بڵێ: ئایا ئاگادارتان بکەین لەوانەی لە کردەوەدا لە هەموو کەس زیانبارترن؟ (١٠٤) ئەوانەی بە هۆی کوفریانەوە لە ژیانی دنیادا ڕەنجیان بە زایە بووە، کەچی ئەوەندە لەخۆباین وا ئەزانن کاری چاك ئەکەن و لەسەر حەقن.

(١٠٥) ئەوانە ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بە قورئان و بەو نیشانانە نی‌یە کە دەلالەت لە یەکێتی و دەستەڵاتی خودا ئەکەن و باوەڕیان بە زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە نی‌یە. ئیتر هەموو کردەوەییێکی دنیایان بەخەسار چووە، ئێمەیش لە قیامەتدا هیچ جۆرە نرخێکیان بۆ دانانێین و بە چاوی سووك سەیریان ئەکەین. (١٠٦) ئەنجامی کار ئاوەها بوو، پاداشیان دۆزەخ بوو چونکە کافر بوون و گاڵتەیان بە ئایەتەکانی من و بە پێغەمبەرانی من ئەکرد.

(١٠٧) بەڕاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە (جنـات الفـردوس) یان بۆ ئامادە کراوە کە بەرزترین و چاکترین جێگای بەهەشتە. (١٠٨) هەتاهەتایە تیایدا ئەمێننەوە و داوای ئەوە ناکەن لەوێ بگوێزرێنەوە.

(١٠٩) تۆ ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئەگەر دەریا مەرەکەب بێ بۆ نووسینی کەلیمەکانی زانیاری و دەستەڵات و توانی خودا، دەریا تەواو ئەبێ پێش ئەوەی کەلیمەکانی خودا تەواو بن، هەرچەند ئەوەندەی ئەو دەریایە دەریای تریش بێنین بۆ یارمەتی دانی، چونکە کەلیمەی خودا سنووری نی‌یە و تەواو نابێ و وەك زاتی خۆی قەدیمە لە ئەزەلەوە بووە و تا ئەبەد ئەمێنێ، بەڵام دەریا سنوورداره و شتی سنوورداریش ئەبڕێتەوە.

(١١٠) تۆ ئەی پێغەمبەر بڵێ من تەنیا بنیادەمێکم وەك ئێوە و گەزافی ئەوە لێ نادەم کە هەموو کەلیمەکانی خودا ئەزانم. تەنیا بەوە لە ئێوە جیا ئەبمەوە کە وەحیم بۆ ئەکرێ و ئەوترێ: کە بەڕاستی خودای ئێوە خوداییێکی تاق و تەنیا و بێ هاوبەشە، دەی هەرکەس بە هیوای ئەوەیە بە سەربەرزی و شادمانی بگاتە حوزووری خودا، با کردەوەی چاك و بەسوود بکات بۆ خۆی و بۆ خەڵك و، هیچ یەکێ نەکاتە هاوبەشی خودای خۆی.

## سُورَةُ مَرۡيَمَ

مَرۡيَمَ ١٩ — آيَاتُهَا ٩٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾
إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ
مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ
شَقِيّٗا ﴿٤﴾ وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ
ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ﴿٥﴾ يَرِثُنِي وَيَرِثُ
مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ﴿٦﴾ يَٰزَكَرِيَّآ
إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا
﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي
عَاقِرٗا وَقَدۡ بَلَغۡتُ مِنَ ٱلۡكِبَرِ عِتِيّٗا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ
قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞ وَقَدۡ خَلَقۡتُكَ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ تَكُ
شَيۡـٔٗا ﴿٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۚ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا
تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ
مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿١١﴾



## سوورەتی (مریم)

مەککەیی‌یە تەنها ئایەتی ٥٨و ٧١ی‌نەبێ‌و (٩٨) ئایەتە.

(١) خودای گەورە خۆی ئەزانێ مەعنای چی‌یە.

(٢) ئەمە باسی میهرەبانیی خودای تۆیە لەگەڵ زەکەریای بەندەی خۆی.

(٣) کاتێ کە زەکەریا بە پەنهانی لە خودای خۆی پاڕایەوە.

(٤) وتی: خودایا من ئێسقانم بێ هێز بووەو بە هۆی پیرییەوە سەرم سپی بووەو، لەمەوپێش نزا و پاڕانەوەم ڕەد نەکراوەتەوە و، هەر تکایێکم لێ کردبی جێبەجێت کردووە بۆم.

(٥) بەڕاستی من لە خزمەکانم ئەترسم کە پاش خۆم بە چاکی شوێنم نەگرنەوە و لە دین لابدەن. ژنەکەیشم نەزۆکە و منالّی نابێ، بۆیە لە میهرەبانیی تۆ ئەپاڕێمەوە کوڕێکم پێ ببەخشی سەرداریی ئەم خانەدانو جێگاو ڕێگایە بکات.

(٦) ئەو کوڕە کوڕێکی وەها بێ میراتی پێغەمبەرایەتی لە من و لە ئالی یەعقووب وەربگرێ و جێگامان بگرێتەوە. خودایا بیشیکە بە کوڕێکی کردەوە پەسەند کە خۆت لێی ڕازی بیت.

(٧) لە لایەن خوداوە وەڵامی درایەوە: ئەی زەکەریا! ئێمە مژدەت ئەدەینێ بە کوڕێك کە ناوی یەحیایەو لەوەوپێش هاوناومان بۆ دانەناوە.

(٨) زەکەریا کە ئەم مژدەیەی لە خواوە بیست لەخۆشییاندا وتی: خوایە! من چۆن کوڕم ئەبێ کە ژنەکەم نەزۆکەو خۆم بەتەواوی پیر بووم و هێزم لێ بڕاوە؟

(٩) خودا فەرمووی: کار وەها ئەبێت، خودا ئەفەرموێت ئەو کارە بۆ من ئاسانە و کاتی خۆی تۆم دروست کرد کە هیچیش نەبوویت.

(١٠) زەکەریا عەرزی خودای کرد وتی: خودایا! نیشانەیێکم بۆ دیاری بکە لەسەر بەجێ‌هێنانی ئەم داخوازییە. خودا وەڵامی دایەوە فەرمووی: نیشانەت ئەوەیە سێ شەو و سێ ڕۆژ، بێ ئەوەیش کەڕو لاڵ بی، بە ئیشارە نەبێ ناتوانی قسە لەگەڵ خەڵك بکەیت و، تەنها خەریکی یادی خودا ئەبی.

(١١) جا کە ئەو حاڵەی بەسەردا هات لە میحرابەکەی هاتە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی و ئیشارەی بۆ کردن کە بەیانیان و ئێواران تەسبیحاتی خودای گەورە بکەن.

يَا يَحْيَىٰ خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ ۖ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾ وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَاةً ۖ وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾ وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا ﴿١٤﴾ وَسَلَامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴿١٥﴾ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ﴿١٦﴾ فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ ۖ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا ۚ وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴿٢١﴾ ۞ فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾ فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾



(١٢) جا کە یەحیا گەورە بوو پێگەیشت پێمان وت: ئەی یەحیا! بەهێز و ئیرادەو توانەوە تەورات هەڵبگرەو کاری پێ بکەو بە خەڵکی ڕابگەیێنە، وەك پێغەمبەرە پێشووەکان. یەحیا هەر لە منالییەوە عەقڵی تەواو و تێگەیشتنمان پێ‌داو فێری تەورات و حوکمەکانی بوو.

(١٣) هەروەها بەزەیی و میهرەبانیمان خستە دڵیەوە بەرامبەر بە خەڵك و، بەتایبەتی هەژاران و بێ‌هێزان، لەگەڵ خاوێنیی دڵدا. بەڕاستی یەحیا لەخوداترس بوو خۆی لە گوناه ئەپاراست.

(١٤) لە گەڵ باوك و دایکی چاك ڕەفتارو شیرین گوفتار بوو خۆی بە گەورە نەئەزانی‌و سەرپێچ نەبوو.

(١٥) سەلام لە لایەن ئێمەوە لەسەر ئەو بێ لەو ڕۆژەدا لە دایك بووەو، لەو ڕۆژەدا ئەمرێت و، لەو ڕۆژەدا کە بۆ حەشر زیندوو ئەکرێتەوە.

(١٦) لە قورئاندا باسی بەسەرهاتی مەریەم بکە کە چۆن لە ماڵی خۆیان جیا بووەوەو لە جێگایەکدا دانیشت لە ڕۆژهەڵاتی (بيت المقدس) ەوە.

(١٧) لەوێ پەردەییێکی لێ‌دا بۆ خۆشۆردن کە بیشارێتەوە. لەو کاتەدا ئێمە فروستادەی خۆمان، کە جیبرەئیلە، ناردە لای و، لە شێوەی بنیادەمێکی ڕێك و پێك و تەواودا خۆی پیشان دا.

(١٨) مەریەم وتی: من پەنا ئەگرم بە خودا لە تۆ ئەگەر تۆ لەخواترس بی. واتە، دەس بەردارم بە.

(١٩) جیبرەئیل کە زانیی مەریەم لە وەزعەکە ترسا، دڵنیای کردەوە و وتی: مەترسە، من فروستادەی ئەو خودایەم کە تۆ پەنای پێ ئەگریت و، من بۆ ئەوە هاتووم خودا بە هۆی منەوە کوڕێکی پاك و بێ گوناهت پێ ببەخشێ.

(٢٠) مەریەم وتی: من چۆن کوڕم ئەبێ کە کەسم بە حەڵاڵی لێ نەکەوتووە و هەرگیزیش داوێن پیس نەبووم؟ !

(٢١) ئەویش وتی: فەرمان وەهایە. خودا ئەفەرموێت: ئەوە بۆ من شتێکی ئاسانە و، ئەیکەم بە نیشانە بۆ ئادەمزاد لەسەر توانی خۆم، ئەیکەمە هۆی ڕەحمەت بۆ ئادەمزاد و، فەرمانەکە بڕاوەتەوە.

(٢٢) فووی پیا کردو سکی پڕ بوو و هەڵی‌گرت و، بە خۆی و سکەکەیەوە گۆشەگیر بوو و لە جێگاییێکی دوور لە کەسوکاری دانیشت.

(٢٣) جا ژانی منالبوون گرتی و ڕاپێچی کردو هێنای بۆ لای دارخورماییێك کە لەوێدا بوو، تا دەستی پێوە بگرێ. ئیتر لەوێدا منالەکەی بوو. لەو کاتەدا دڵی زۆر نارەحەت بوو وتی: خۆزگا پێش ئەمە بمردمایە و بە تەواوی لە بیر بچوومایەتەوە.

(٢٤) ئەنجا عیسای بوو. عیسا لە ژێر داوێنیەوە بانگی لێ کردو پێی وت: خەم مەخۆ، خودا یەکێکی پڕقەدری لەژێر داوێنتدا دروست کردووە کە لای خودا و لای بەندە پایە و حورمەتی هەیە.

(٢٥) ئەو دارخورمایە بەرەو لای خۆت ڕاوەشێنە خورماییێکی تەڕ و تازە و پاکت بۆ ئەوەرێنێ.

فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ
إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴿٢٦﴾
فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا
فَرِيّٗا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ
أُمُّكِ بَغِيّٗا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي
ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي
نَبِيّٗا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ
وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا ﴿٣١﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي
جَبَّارٗا شَقِيّٗا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوۡمَ وُلِدتُّ وَيَوۡمَ أَمُوتُ
وَيَوۡمَ أُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ قَوۡلَ ٱلۡحَقِّ
ٱلَّذِي فِيهِ يَمۡتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٖۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓۚ
إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ
فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٣٦﴾ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ
بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشۡهَدِ يَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسۡمِعۡ بِهِمۡ
وَأَبۡصِرۡ يَوۡمَ يَأۡتُونَنَا لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلۡيَوۡمَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٣٨﴾



(٢٦) جا خورما بخۆ و ئاو بخۆرەوە و، دڵ خۆش و چاو ڕوون بە. ئەگەر بنیادەمێکت دی بڵێ: من لەسەر خۆمم نەزر کردووە بۆ خودا کە قسە لەگەڵ هیچ ئادەمزادێك نەکەم، بۆیە ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ کەسێ ناکەم.

(٢٧) جا کوڕەکەی هەڵگرت و هاتەوە بۆ ناو قەومەکەی. کە چاویان پێ کەوت بە منداڵەکەوە هەڵیگرتبوو، وتیان: ئەی مەریەم شتێکی درۆو بێ ئەسڵت هێناوە، واتە منداڵێکی بێ باوکت هێناوە.

(٢٨) ئەی هاوچەشنی هاروونی برای مووسا لە عیبادەت کردنا، تۆ باوکت پیاوێکی خراپ نەبوو و دایکیشت داوێن پیس نەبوو، ئەم منداڵە چی یە هەڵتگرتووە؟

(٢٩) ئەویش ئیشارەتی کرد بۆ منداڵەکەی، واتە: قسە لەگەڵ ئەو منداڵە بکەن. ئەوانیش وتیان: چۆن قسە لەگەڵ منداڵێك بکەین ساوای ناو بێشکە بێ؟

(٣٠) منداڵەکە هاتە جواب، فەرمووی: من بەندەی خودام، خودا کتێبی داومێ و کردوومی بە پێغەمبەر.

(٣١) پیرۆزیشی کردووم لە هەر کوێیەك بم، ئامۆژگاریی کردووم تا بە سەر زیندوو بم و لە دنیادا بژیم نوێژ بکەم و زەکاتی ماڵ دەرکەم.

(٣٢) کردوویشمی بە ئینسانێکی چاکەکەر لەگەڵ دایکم و نەیکردووم بە ستەمکارێکی خراپەکەر.

(٣٣) سەلامی خوایشم لێ بێ لەو ڕۆژەدا لەدایك بووم و لەو ڕۆژەدا ئەمرم و لەو ڕۆژەیشا کە زیندوو ئەکرێمەوە.

(٣٤) ئەو منداڵەی بەو جۆرە لە مەریەمی عەزرا لەدایك بوو، ئەوە عیسای کوڕی مەریەم بوو. قسەی ڕاست وەربگرە، ئەو قسەیەی ئەوان، واتە کافرەکان، گومانیان خراپە تیادا و هەر لایێ بەجۆرێ قسەی لێ ئەکەن.

(٣٥) ئەڵێن: کوڕی خودایە، واتە عیسا. حاشا لیللا. قەت ڕەوا نی‌یە بۆ خودا منداڵ دروست بکا بۆ خۆی. خودا پاکو دوورە لەو جۆرە شتانە. هەرکاتێ فەرمان بە بوونی شتێ بداو خواستی لەسەر بوونی بێ، ئەفەرموێت: ببە، ئەویش دەستبەجێ ئەبێ.

(٣٦) بەڕاستییش خودای تەعالا پەروەردگاری منیش و ئێوەیشە، کە واتە ئێوەیش بیپەرستن و عیبادەتی بۆ بکەن، ئەم خواپەرستییە ڕێگایێکی ڕاست و دروستە.

(٣٧) جا کۆمەڵەکانی سەردەمی مەریەم لە بارەی مەریەمەوە ناکۆکییان کەوتە نێوانەوە. دەی هاوار بۆ ئەوانەی کافر بوون لە هاتنەڕووی کاری کۆمەڵی ڕۆژێکی زۆر مەزن کە ڕۆژی حەشرە.

(٣٨) پەنا بەخودا، ئەو ڕۆژەی ئەو کافرانە دێنە بەردەستمان، زۆر شت ئەبیسن و زۆر شت ئەبینن. بەڵام ئەوانە ئەمڕۆ لە گومڕاهییەکی زەق و زۆپدان.

وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِيٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُوا۟ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥١﴾



(٣٩) ئەو کافرانە بترسێنە لە ڕۆژی داخ و خەفەت خواردن کە پاش حیساب لەگەڵکردن و لێپرسینەوەیە و ئیتر هەموو شتێ ئەبڕێتەوە و بەهەشتی و دۆزەخی لێك جوێ ئەکرێنەوە و ئەوانیش ئەمڕۆ لە غەفڵەت و فەرامۆشیدان و ئیمان ناهێنن.

(٤٠) بەڕاستی ئێمەین زەوی و هەرکەس و هەرچی لەسەر زەوییە بەڕاستی هەمووی ئەگەڕێتەوە بۆمان و کەس خاوەنی هیچ نابێ.

(٤١) تۆ باسی ئیبراهیم لە قورئانا بکە بۆ خەڵك. بەڕاستی ئیبراهیم پیاوێکی ڕاستگۆو پێغەمبەری خوا بوو. مەبەست لەو باسەی حەزرەتی ئیبراهیمە کە بە باوکی ئەڵێ: تۆ بۆ شتی وا ئەپەرستی کە نە هیچ ئەبیسێ و نە هیچ دادێکی کەس ئەدا؟

(٤٢) کە ئەوەبوو بە باوکی وت: بابە تۆ بۆچی شتێ ئەپەرستی هیچ نابیسێ و هیچ نابینێ و هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێ؟

(٤٣) ئەی باوکی من! بەڕاستی من زانیاریی وام بۆ هاتووە بۆ تۆ نەهاتووە، دە کەواتە شوێنم کەوە تا ڕێگایەکی ڕاستت پیشان بدەم.

(٤٤) ئەی باوکی من! شەیتان مەپەرستە و عیبادەتی مەکە. شەیتان، بەڕاستی، یاخی و سەرکێشە لە خوای میهرەبان.

(٤٥) ئەی باوکی من، بەڕاستی من ئەترسم سزایێ لەلایەنی خواوە بتگرێتەوەو بە هۆی ئەوەوە ببی بە دۆستی شەیتان.

(٤٦) باوکی ئیبراهیمیش بە ئیبراهیمی وت: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ ڕووت لە خواکانی من وەرگێڕاوە، واتە دەسبەرداری ئەو بتانە بووی کە من ئەیانپەرستم؟ ئەگەر واز لەم بیروباوەڕەت نەهێنی بەردەبارانت ئەکەم. دە بڕۆ تا ئەتوانی لێم دوور بکەوەرەوە.

(٤٧) ئیبراهیمیش بەئیحتیرامەوە بە باوکی وت: بابە سەلامەت لێ بێ، من پاشان داوا لە خوای خۆم ئەکەم بۆت لێت خۆش بێ. خوا بەڕاستی لەگەڵ من میهرەبانە.

(٤٨) جیایش ئەبمەوە لێتان و کەنارتان لێ ئەگرم لە خۆتان و لەو بتانەیش لێیان ئەپاڕێنەوە و هاواریان لێ ئەکەن بێ لە خواو و، هاوار ناکەنە خوا و، هاوار لە پەروەردگاری خۆم ئەکەم، هیوام وایە لە هاوارلێکردنی خودای خۆما نائومێد نەبم.

(٤٩) جا کاتێ جیابووەوە لەوان و لە بتەکان کە ئەیانپەرستن لە خوا لایان ئەدا، ئیسحاقیش و یەعقووبیشمان پێ بەخشی و هەردوکیشیانمان کرد بە پێغەمبەر.

(٥٠) بەهرەیەکی زۆریشمان لە میهرەبانیی خۆمانەوە پێ بەخشین و پایە و قەدر و حورمەتێکی بەرزمان بۆ دانان تا خەڵك بەڕاستی بە باش ناویان بهێنن.

(٥١) تۆ لە قورئانا ناوی مووسای کوڕی عیمرانیش بهێنە. ئەو بەڕاستی دڵی خاوێن و بێگەرد کرابوو بۆ خواپەرستی و بەندەیی خوا و، پێغەمبەری خوا بوو بۆ سەر ئادەمزاد و پایەی بەلای خواوە بەرز بوو.

وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴿٥٣﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا۩ ﴿٥٨﴾ ۞فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴿٦١﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿٦٢﴾ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴿٦٣﴾ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمۡرِ رَبِّكَۖ لَهُۥ مَا بَيۡنَ أَيۡدِينَا وَمَا خَلۡفَنَا وَمَا بَيۡنَ ذَٰلِكَۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ﴿٦٤﴾



(٥٢) لە لای ڕاستی کێوی توورەوە بانگمان لێ کرد و نزیکمان خستەوە لە خۆمان و کردمان بە خاوەن ڕاز لەگەڵ خۆمان.

(٥٣) لە میهرەبانیی خۆیشمان هاروونی برایمان پێ بەخشی بە پێغەمبەری، واتە کردمان بە پێغەمبەر بۆ خاتری ئەو تا لە گەیاندنی فەرمانی خوادا یارمەتیی بدا.

(٥٤) ناوی ئیسماعیلیش لە قورئانا بهێنە. بەڕاستی ئەو پیاوێکی خاوەن گفت و وەعدەبەجێ بوو و پێغەمبەری خودا بوو بۆسەر خەڵك و خاوەنی پایەی نوبووەت بوو.

(٥٥) فەرمانیشی ئەدا بە ژن و منداڵ و خزم و کەسوکار و شوێنکەوتووانی کە نوێژەکانیان بکەن و زەکاتی ماڵیان بدەنو، ئینسانێکی وا بوو خوا لێی ڕازی بوو.

(٥٦) هەروا لە قورئانا ناوی ئیدریسیش بهێنە. ئەو بەڕاستی ئینسانێکی ڕاستگۆی پێغەمبەر بوو.

(٥٧) بڵندیشمان کردەوە بۆ شوێنێکی بەرز، واتە بۆ ئاسمان، یا بۆ پایەیەکی بڵند کە پایەی پێغەمبەرییە.

(٥٨) ئەمانە کە خودا نیعمەتی خۆی ڕشتووە بەسەریانا لە پێغەمبەران لە نەوەی ئادەم و لە نەوەی ئەوانەی لەگەڵ نووح لە کەشتییەکەیدا هەڵمانگرتن و لە نەوەی ئیبراهیم و ئیسرائیل کە حەزرەتی یەعقووبە و، لەوانەی هیدایەتمان داون و هەڵمانبژاردوون، کاتێ فەرموودەی خوایان بەسەرا بخوێنرایەتەوە، بە ڕوودا ئەکەوتن و سوجدەیان ئەبرد بۆ خوا و لە ترسی خودا دەستیان ئەکرد بە گریان.

(٥٩) کەچی پاشماوە گەلێکیان لێکەوتەوە نوێژیان نەئەکردو کەوتبوونە شوێن ئارەزووبازی. ئەمانە سەرئەنجام بە جەزای گومڕایی خۆیان ئەگەن.

(٦٠) مەگەر کەسێ بگەڕێتەوە بۆ لای خواو ئیمان بهێنێ و کردەوەی باش بکا، ئەوانە ئەڕۆنە بەهەشت و کەم و زۆر ناهەقییان لەگەڵ ناکرێ.

(٦١) ئەو بەهەشتە (جنات العدن)ە کە خودای میهرەبان وەعدەی پێ داوە بە بەندەکانی خۆی لە کاتێکا کە هێشتا دیار نەبوە و بەرچاو نەبوە. وەعدەی خوا بەڕاستی دێتەدی.

(٦٢) قسەی هیچوپووچ لەو بەهەشتەدا نابیستن، بەڵکو هەر سەلام لەیەك‌کردن ئەبیسن و، بەیانیو ئێوارە ڕزقو ڕۆزیی خۆیانیان لەو بەهەشتەدا هەیە.

(٦٣) ئەو بەهەشتە بەهەشتێکی وایە بە میرات ئەیدەین بە هەرکەسێ لە بەندەکانی خۆمان کە لەخواترس بێ.

(٦٤) ئەو فریشتانەی لە ئاسمانەوە دێنە خوار بە پێغەمبەرەکان ئەڵێن: ئێمە بە فەرمانی خوای تۆ نەبێ لە ئاسمانەوە نایەینە خوارەوە، هەرچی لەپێشمانەوەیە و هەرچی لە پاشمانەوەیە هەمووی هی ئەو خوایە. خوای تۆ هیچ لە یاد ناکاو هیچی لە بیر ناچێتەوە.

رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ﴿٦٥﴾ وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا ﴿٦٧﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَحۡشُرَنَّهُمۡ وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ لَنُحۡضِرَنَّهُمۡ حَوۡلَ جَهَنَّمَ جِثِيّٗا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمۡ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ عِتِيّٗا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحۡنُ أَعۡلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمۡ أَوۡلَىٰ بِهَا صِلِيّٗا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيّٗا ﴿٧٢﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ خَيۡرٞ مَّقَامٗا وَأَحۡسَنُ نَدِيّٗا ﴿٧٣﴾ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَحۡسَنُ أَثَٰثٗا وَرِءۡيٗا ﴿٧٤﴾ قُلۡ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَدًّاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلۡعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضۡعَفُ جُندٗا ﴿٧٥﴾ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗىۗ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٞ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾



(٦٥) خـوای ئاسمـان و زەوی و نێوانیانـە. بیپەرستە و خۆڕاگرە لـە پەرستنیا ئایا هاوناوێکی ئەو ئەزانی؟ دیارە نە، چونکە کەس هاوناوی نی‌یە، لەبەر ئەوە کـە لـەو بەولاوە کەس بەڕاستی خوا نی‌یە.

(٦٦) ئینسان - مەبەستی لـە ئینسانی کافرە — ئەڵێ: ئایا کە مردم، لـەوە پـاش بـە زینـدوویی لـە گـۆڕ دەرئەهێنرێمـە دەرەوە؟

(٦٧) ئایا ئەم ئینسـانە کـەوا ئـەڵێ، بیر لـەوە ناکاتـەوە کـەوا ئێمـە لەمەوبـەر ئەومان دروست کرد و ئەو ئەوکاتـە هـیچ نەبوو؟

(٦٨) قەسەم بە خوای تۆ هـەموو ئەوانـە لەگـەڵ شـەیتانەکانیانا کۆئەکەینـەوەو پاشـان هـەموویان بـەدەوری دۆزەخـا خڕ ئەکەینەوە لەسەر ئەژنۆو وا ئەمێننەوە تا ئەخرێنە ناودۆزەخ.

(٦٩) پاشان لە هـەر تایەفەیـەك کامیـان لـە خـوا یـاخیترو فیـززلترو گوناهبـارتر بـووبێ، ئەوانـەیان لـە جێـی خۆیـان هەڵئەکەنین و فڕێیان ئەدەینـە نـاو ئـاگری دۆزەخەوە.

(٧٠) پـاش ئەمـەیش، ئێمـە لـە هـەموو کـەس باشـتر ئـەزانین ئەوانـە کامیـان شایانتری ئەوەن بچنە ناو دۆزەخ.

(٧١) کەس لە ئێوە نی‌یە نەچێتە ناو دۆزەخ. ئەمە کارێکە بڕیار دراوە و لەسەر خوا پێویستە جێبـەجێی بکـا، واتـە خوا خۆی بڕیاری داوەو پێویستی کردووە لەسەر خۆی هەموو کەسێ بەرێتە دۆزەخو سەری لەوێ پێ بدا.

(٧٢) جا پاش ئەوەی هەموومان بردنە دۆزەخەوە، ئەوانەیان کـە باوەڕیـان بـە خـوا بـووە و لـەخوا ترسـاون ڕزگاریـان ئەکەین و ئەیاهێنینەوە دەرەوەو، ستەمکارەکان لەسەر ئەژنۆ لەوێ ئەهێڵینەوە.

(٧٣) کاتێ ئایەتەکانی ئێمە بخوێنرێنەوە بەسەریانا، کافرەکان بە موسوڵمانەکان ئەڵێن: کام تاقم لە ئێمـەو لـە ئێـوە پایە و مەقامی باشترەو کۆڕو مەجلیسی خۆشترە؟

(٧٤) پێش ئەمانەیش زۆرمان لەئەهلی چەرخ و زەمانەی تر لەناوبردووە کە کەلوپەل و دارایـی و شـتی لـە بەرچـاوی جوانتر لە هیی ئەمانەی ئێستایان بووە. واتە ماڵی دنیا شتێ نی‌یە پیاو شانازیی پێوە بکا و بە بەڵگـەی پایەبڵنـدیی لای خوای بزانێ.

(٧٥) تۆ بڵێ ئەی پێغەمبەر!: ئەو کەسەی لە گومڕاهیدایە با خودا هەر درێژە بە ئەحواڵی بدا و جڵەوی بۆ شۆڕ بکا. جا، کاتێ چاویان بەو شتە ئەکەوێ کە خوا گفتی پێ داون کە یا هاتنی سزای دنیایە یا هـاتنی ڕۆژی قیامەتـە، ئـەو کاتە ئەزانن و تێ ئەگەن کێ لەبارەی پایەو پلەوە شوێنی خـراپترەو لـە بـارەی لەشـکرو یارمەتیـدەرەوە لاوازتـرو بـێ دەستەڵاترە.

(٧٦) خوا هیدایەت و ڕێدەرکـردن زیـاد ئـەکا بـۆ ئەوانـەی هیدایـەت دراون و ڕێنمـوونی کـراون و، ئـەو کردەوانـەی ئەمێننەوە بـۆ ڕۆژی قیامـەت باشـترن بـۆ ئـادەمزاد بـەلای خـواوەو لـە ڕووی پاداشیشـەوە چـاکترن و لـەبارەی هیـوا پێدارییەوە باشترن، واتە بۆ ئەوە ئەشێن ئینسان چاوەڕوانیان بێو بەتەمایان بێ.

أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴿٨٤﴾ يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَـٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَـٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَـٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَـٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَـٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾



(٧٧) ئاگات لە حاڵی ئەو کابرا هەیە کە ئینکاری نیشانەکانی ئێمە ئەکاو ئەڵێ من لەو دنیایش ئەگەر زیندوو کرامەوە ماڵ و ئەولادم هەر ئەدرێتێ؟

(٧٨) ئاخۆ ئەم کابرا ئاگای لە عیلمی غەیب هەیە کەوا ماڵ و ئەولادی ئەدرێتێ؟ یان عەهد و پەیمانی لە خودای میهرەبانەوە وەرگرتووە کە وای مامەڵە لەگەڵ ئەکا؟

(٧٩) حاشا، هیچ کام لەم دوانە لەئارادا نی‌یەو، ئەو قسەیەی ئەم ئینسانە کافرە ئەیکا ئێمە لای خۆمان ئەینووسین لەسەری‌و سزایشی بۆ درێژ ئەکەینەوە تا پڕبەپێستی تاوانەکانی بێ.

(٨٠) کە مردیش هەرچی کە ئەیلێ و هەیەتی لە ماڵ و ئەولاد هەمووی لێ وەرئەگرینەوە و نابێ بە خاوەنی هیچی‌و خۆی بە تاقی تەنیا دێتە بەردەستمان.

(٨١) ئەو کافرە هاوبەش‌بۆخوادانەرانە چەند خوایەکیان لە خوای عالەم بەولاوە بۆخۆیان داناوە بۆ ئەوەی لە دنیا و لە قیامەتا بۆیان ببن بە پشت و پەناو مایەی شان و شکۆ.

(٨٢) حاشا، ئەمانە هیچ نافامن و ئەم بتانەی کردوویانن بە هاوبەشی خودا لە ڕۆژی قیامەتا ئینکاری ئەوە ئەکەن کە ئەو بتپەرستانە پەرستبنیان، چونکە خۆیان بە شایانی پەرستن نازانن و دژیان ئەوەستن.

(٨٣) ئایا تۆ نابینی ئێمە شەیتانەکان ئەنێرینە سەر کافرەکان و ئەوانیش بە خەیاڵاتی هیچوپووچ ئەیانجولێننەوە و ئەیانبزوێنن؟

(٨٤) تۆ لە بارەی ئەو کافرانەوە پەلەت نەبێ. ئێمە ڕۆژیان بە ژماردن لەسەر ئەژمێرین، واتە: زۆریان نەماوە.

(٨٥) ئەو ڕۆژەی ئێمە لەخواترسەکان کۆئەکەینەوە و بە کۆمەڵ کۆمەڵی پڕقەدرو حورمەت ئەیانبەین بۆ لای خوا.

(٨٦) تاوانبارەکانیش ئەدەینەبەر بۆ دۆزەخ و لێیان ئەخوڕین وەك گەلەیێ ئاژەڵی تینوو کە ببرێ بۆسەر ئاو.

(٨٧) لەو ڕۆژەدا ئەوانە کەسیان خاوەن تکا نین لای خوا کەسێ نەبێ خوا خۆی بەهۆی خواپەرستنیەوە ڕێی تکاکردنی دابێ و گفتی درابێتێ کە تکای لێ قبووڵ ئەکرێ.

(٨٨) کافرەکان وتیان: خودای میهرەبان ئەولادی بۆخۆی ڕاگرتووە.

(٨٩) ئەی کافرینە! بەڕاستی، ئێوە بەم قسەیەتان کارێکی نارەواتان کردووە.

(٩٠) لەوانەیە ئاسمانەکان لەم قسە ناشیرینە لەت لەت بن و زەوی شەق ببێ و کێوەکان بکەون و بڕووخێن.

(٩١) لەبەر ئەوە کە نیسبەتی ئەولادیان داوەتە پاڵ خوا.

(٩٢) بۆ خودای میهرەبان ناشێ ئەولادی ببێ.

(٩٣) کەس لە ئاسمان و ئەرزا نی‌یە بە بەندەیی نەیەتە بەردەستی خودای میهرەبان.

(٩٤) خوا ئاگای لە هەموو ئەو بەندانەی هەیە و دەستی بەسەرا گرتوون و بە ژمارە سەرژمێری خۆیان و کرداری کردوون.

(٩٥) هەموویشیان ڕۆژی قیامەت یەکەیەکە دێنە حوزووری خودا.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴿٩٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًۢا ﴿٩٨﴾

## سُورَةُ طه

ترتيبها ٢٠ — آياتها ١٣٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى ﴿٤﴾ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾ وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذْ رَءَا نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدًى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّىٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ ۖ إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٢﴾



(٩٦) بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان بە خوا بووە و کاری چاکیان کردووە، خودای میهرەبان لەمەوپاش هەر لە دنیایا لە قیامەتدا خۆشەویستییان ئەخاتە دڵی یەکتریانەوە یا ئەیخاتە دڵی مەلائیکەتەوە.

(٩٧) جا بۆیە ئەم قورئانەمان بە زمانەکەی تۆ کە زمانی عەرەبییە ناردووە بۆ خەڵك، یا بۆیە لەسەر زمانی تۆ، واتە لە ڕێگای تۆوە، ناردوومانە بۆ خەڵك بۆ ئەوەی مژدەی پێ بدەی بە لەخواترسان و ئەو کەسانەی پێ بترسێنی کە کەللەڕەق و سەختگیرن لە دوژمنایەتیدا.

(٩٨) ئەی پێغەمبەر! گوێ مەدە بەو کافرانە و ترست لێیان نەبێ. ئێمە بەر لەوان خەڵکی چەندین چەرخ و زەمانمان تەفروتوونا کرد. تۆ ئێستا هەست بە کەسیان ئەکەی یا نووزەیەك چی‌یە لێیانی ئەبیسی؟

## سوورەتی (طه)

**مەککەیی‌یە تەنها دوو ئایەتی ١٣ و ١٣١ ی نەبێ و، (١٣٥) ئایەتە.**

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی بەم وشەیە چی‌یە. هەندێکیش ئەڵێن ناوی سوورەتەکەیە.

(٢) ئێمە قورئانمان بۆ ئەوە نازڵ نەکردووەتە سەر تۆ ماندوو ببی و نارەحەت ببی کەوا کافرەکانی قورەیش باوەڕیان پێ نەکردوویت و موسوڵمان نەبوون.

(٣) بەڵکو بۆ ئەوەمان بۆ ناردووی بیکەی بە هۆی یادکردنەوەی خوا، بۆ ئەو کەسانەی لە خوا ئەترسن.

(٤) بە پلەپلە نێرراوەتە خوارەوە لەلایەن خوایەکەوە کە زەویی نزم و ئاسمانە بەرزەکانی دروست کردووە.

(٥) خودای میهرەبان عەرشی داگیرکردووە.

(٦) هەر بۆ ئەوە بە تایبەتی هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەوی و لە ژێر زەویدا هەیە.

(٧) تۆ ئەگەر بە ئاشکرا ناوی خوا بێنی خوا پێویستی بەوە نی‌یە، چونکە بە هەموو شتێکی نهێنی و لەو نهێنییەیش نهێنیتر ئەزانێ.

(٨) ئەو زاتە ناوی (الله)یە، کەس نی‌یە بەڕاستی بەندەیی بۆ بکرێ ئەو نەبێ. ئەوە ناوە جوانەکانی هەیە کە نەوەدونۆ ناون. (٩) ئایا باسی مووسات پێ گەیشتووە.

(١٠) کاتێ کە ئاگرێکی بینی، بە کەسوکار و خێزانەکەی خۆی فەرموو: من ئاگرێکم بەدیکردووە بەڵکو بچم دەسەچیلەیەکتان لەو ئاگرە بۆ بێنم یا شارەزاییەکم لە دانیشتووانی سەر ئەو ئاگرەوە دەست کەوێ. ئەمە کاتێ بووە دایك و کەسوکارەکەی لەگەڵ خۆی بردووە بۆ شوێنێ بچن، لە یەکێ لە شیوەکانی کێوی توور شەویان بەسەردا دێ و شەوەکەی سارد ئەبێ، ئیتر لەوێدا ئاگرەکە بەدی‌ئەکا و ئەم فەرمایشە ئەفەرموێ.

(١١) کە هاتە سەر ئاگرەکە بانگی لێ کرا: ئەی مووسا.

(١٢) بەڕاستی من خودا و پەروەردگاری تۆم، تۆیش پێڵاوەکانت داکەنە لە پێت. بەڕاستی تۆ لە شیوێکی پیرۆزدای کە ناوی توا (طوی) یە.

وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ فَٱسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ ﴿١٦﴾ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِىَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُا۟ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِى ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّى وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِى ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِى ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِى ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِىٓ أَمْرِى ﴿٣٢﴾ كَىْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾



(١٣) مـــن لـــه نـــاو بـــه‌نی ئیســـرائیلا هه‌ڵمبژاردووی بـۆ پێغه‌مبه‌رایـه‌تی، ده‌ســا گوێ شـل کـه بـۆ ئـه‌وه‌ی وه‌حـی ئـه‌کرێت بۆت.

(١٤) به‌ڕاســتی مــن خـودا (الله)م، هـیچ خودایـه‌کی ڕاسـتی نی‌یـه عیبـاده‌تی بـۆ بکـرێ مـن نـه‌بێ، کـه واتـه عیبـاده‌ت و به‌نده‌ییم بکه و نوێـژه‌کانت به‌جێبێنـه بـۆ ئه‌وه‌ی ناوم بهێنی و یادم بکه‌یته‌وه.

(١٥) به‌ڕاســـتی ڕۆژی قیامـــه‌ت دێـــت، ئه‌مه‌وێ بیشارمه‌وه کـه‌ی دێت، بۆیـه‌یش دێـت بـۆ ئـه‌وه‌ی هه‌رکه‌ســێ بـه‌گوێره‌ی کرداری خۆی له دنیادا پاداشتی بدرێته‌وه.

(١٦) ده‌ی ئاگادار به، با ڕێت لـێ نـه‌گرێ له باوه‌ڕ به ڕۆژی قیامه‌ت که‌سێ که خۆی بـاوه‌ڕی بـه ڕۆژی قیامـه‌ت نی‌یـه‌و شـوێن ئاره‌زووبازیی خۆی که‌وتووه‌و، تـۆیش بـه‌و ڕێ‌لێ‌گیرانه‌ت به هیلاك بچی.

(١٧) مووسا ئـه‌وه چـی یـه بـه ده‌سـتی ڕاستته‌وه؟ خوا پرسیاری لێ ئه‌کا. ئه‌ویش وه‌ڵامی ئه‌داته‌وه.

(١٨) مووسا وه‌ڵامی دایه‌وه و وتی: ئـه‌وه عه‌ســاکه‌ی ده‌ســتمه خــۆمی ئــه‌ده‌م به‌ســه‌رداو گـه‌ڵاداری پـێ دائـه‌وه‌رێنم بـۆ مــه‌ڕه‌کانم و چـه‌ند ئیشـێکی بایه‌خـداری تریشم پێی هه‌یه.

(١٩) خــوا فــه‌رمووی: ئــه‌ی مووســا عاساکه‌ت هه‌ڵده. (٢٠) ئه‌ویش عاساکه‌ی هه‌ڵدا ده‌سبه‌جێ بوو به مارێك ئه‌کشا به‌م لاو به‌ولادا.

(٢١) خودا فه‌رمووی: ماره‌که بگره و مه‌ترسه. ئێمه پاشان ئه‌یبه‌ینه‌وه سه‌ر شێوه پێشووه‌که‌ی خۆی کـه عاسایه‌ك بوو به‌ده‌سته‌وه ئه‌گیرا. (٢٢) ده‌ستیشت بکه به بن باخه‌ڵتا، دێتـه ده‌ره‌وه بـه سـپێتی وه‌ك بلێـی بدره‌وشـێته‌وه، بـێ ئه‌وه‌ی ده‌ردێکی وه‌ك به‌ڵه‌کی و شتی وای پێوه‌بێ. ئه‌مه‌یش موعجیزه‌و په‌رجوویه‌کی تره جگه له‌وه که عاسات بـووه به مار. (٢٣) ئه‌مانه‌مان دایتێ بۆئه‌وه‌ی هه‌ندێ له موعجیزه گه‌وره‌کانی خۆمانت پیشان بده‌ین.

(٢٤) بڕۆ بۆ سه‌ر فیرعه‌ون، ئه‌و به‌ڕاستی توغیانی کردووه و به‌ڵه‌سه بـووه. (٢٥) مووسـایش بـه خـوای وت: خوایـه سینه‌م به نووری خۆت نوورانی بکه. (٢٦) کاری گه‌یاندنی په‌یامی خۆتیشم به فیرعه‌ون بۆ ئاسان بکه.

(٢٧) گرێی سه‌ر زمانیشم بۆ بکه‌ره‌وه تا قسه‌م ڕه‌وان بێ.

(٢٨) بۆ ئه‌وه‌ی له قسه‌م حاڵی ببنو تێی‌بگه‌ن. (٢٩) وه‌زیرێکیشـم لـه که‌سـوکاری خـۆم بـۆ دانـێ یارمـه‌تیم بـدا لـه جێبه‌جێ‌کردنی ئه‌رکه‌کانی سه‌رشانما. (٣٠) هاروونی برام بێ. (٣١) پشتمی پێ‌بگره‌و پێی به‌هێز بکه.

(٣٢) بیشیکه به هاوبه‌شم له‌م کاری پێغه‌مبه‌رێتییه‌ما بۆ سه‌ر فیرعه‌ون.

(٣٣) تا (سبحان الله. ..سبحان الله)ت زۆر بۆ بکه‌ین و زۆر بڵێین خوا پاك و بێگه‌رده.

(٣٤) زۆریشت ناو بهێنین به زمان و به دڵ. (٣٥) خوایه به‌ڕاستی تۆ چاوت لێمان بووه.

(٣٦) خوا فه‌رمووی: ئه‌ی مووسا وا به‌ڕاستی ئه‌وه‌ت درایه که داوات کرد هه‌ر لـه داوای نـوورانی کردنـی سـینه‌ته‌وه بیگره تا ئه‌گاته کردنی هاروونی برات به پێغه‌مبه‌ر له‌گه‌ڵتدا.

(٣٧) به‌ڕاستی ئێمه جارێکی تریش نیعمه‌تی خۆمان به‌سه‌ردا ڕشتی.

إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ ۖ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾



(٣٨) کاتێ کە ئەو شتەی بە وەحی بە پێغەمبەران ئەوترێ بە ئیلهام خستمانە دڵی دایکت.
(٣٩) تێمانگەیاند مووسا بخەرە ناو سندووقێکەوە و بیدە بەدەم ئاوی نیلەوە، با ئاوەکەیش فڕێی بداتە کەنارەوە، دوژمنێکی منیش و ئەو خۆیشی بیگرێتەوە و خۆشەویستییەکەتم لەخۆمەوە خستەدڵان، هەرکەس بتبینێ خۆشی بوێیت. ئەمەم بۆ کردی، ئەی مووسا، تا لە بەرچاوی خۆمدا دروست بکرێیت و پەروەردە بکرێیت. ئەمەیش کینایەیە لە چاودێری و ئاگاداریکردن.
(٤٠) جا لەو کاتەدا دامابوون بۆ دایەنێك بەخێوت بکا، خوشکەکەت ڕۆیشت بۆ حەرەمسەرای فیرعەون و پێی وتن: ئەتانەوێ کەسێکتان پیشان بدەم ئەو مناڵە بگرێتە ئەستۆی خۆی و سەرپەرشتیی بکا؟ ئەوانیش ڕازی بوون بەوەو گێڕامانیتەوە بۆ دایکت، بۆ ئەوەی چاوی ڕوون ببێتەوە پێتو لە دووریت خەفەتبار نەبێ. تۆیش پاش گەورەبوونت لە بارەگای فیرعەوندا کابرایەکی قیبتیت کوشت و خەفەتبار بوویت و ئەترسایت بتگرن و ئێمە لەو ترسە ڕزگارمان کردیت و بە ئازاری دوورکەوتنەوە لە کەسوکارو چوون بۆ خاکی مەدیەن گرفتارمان کردیو چەند ساڵ لەوێ مایتەوە و، پاشان لەسەر تەقدیرێکی تایبەتی هاتیتەوە بۆ میسر.
(٤١) من دروستم کردی بۆ خۆم و سازم کردی بۆ خزمەتی ئەو پەیامەی ویستم لە ڕێگای تۆوە بیگەیەنم.
(٤٢) تۆو هاروونی برات بەم موعجیزانەی منەوە بڕۆن و سستی مەکەن لە یادکردنەوە و ناوهێنانی مندا.
(٤٣) بڕۆن بۆ لای فیرعەون، ئەو بەڕاستی توغیانی کردووە و لەڕادە دەرچووە.
(٤٤) کە چوونە لای قسەی نەرمی لەگەڵ بکەن بەڵکو بیرێ بکاتەوە و پاشگەز ببێتەوە لە خراپە یا بەهۆی قسەکانی ئێوەوە بترسێ. (٤٥) ئەوانیش وتیان: پەروەردگارا! ئێمە ئەترسین دەستوبرد بکا بۆ سزادانمان یا لە جاران بەلەسەتر بێ و بێ ئەدەبیی زیاتر بکا لەئاستی تۆدا.
(٤٦) خوایش فەرمووی: مەترسن، بەڕاستی من لەگەڵتانم گوێم لێ یە چی ئەڵێ و چاوم لێ یە چی ئەکا لەگەڵتان، هەرچی پێویست بێ بۆ لادانی شەڕی لێتان ئەیکەم و ڕێی لێ ئەگرم.
(٤٧) بێنە لای و پێی بڵێن: ئێمە دوو کەسی فروستادەی خوای پەروەردگارتین، دەسا تۆیش بەنی ئیسرائیل ئازادکە و بیاندەرە دەستمان و لەگەڵمانیان بنێرە و ئازار و سزایان مەدە. ئێمە بەڕاستی موعجیزەمان لای خواوە هێناوەتە لات، سەلامی خوایش لەو کەسەی شوێنی ڕێگەی ڕاست ئەکەوێ.
(٤٨) ئێمە بەڕاستی وەحیمان بۆ کراوە لای خواوە کەوا عەزابی خوا بۆ ئەو کەسانەیە پێغەمبەرانی خوا بە درۆ ئەخەنەوە و پشتیان لێ هەڵئەکەن. (٤٩) فیرعەون وتی: ئەی مووسا بۆچی خوای ئێوە کێیە؟
(٥٠) وتی: خوای پەروەردگاری ئێمە ئەو کەسەیە کە هەموو بوونەوەرێکی دروست کردووە و سیفەتی بوونی داوەتێ و ڕێگای پیشان داوە چۆن بۆخۆی بجووڵێتەوە.
(٥١) ئەنجا فیرعەون وتی: باشە، ئەی ئەم گشتە ڕشتەی ئادەمزادە کە لە سەدەکانی پێشوودا بوون حاڵیان چۆنەو ئەنجامیان چییە؟

قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّى ﴿٥٣﴾ كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُولِي النُّهَى ﴿٥٤﴾ ۞ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى ﴿٥٥﴾ وَلَقَدْ أَرَيْنَاهُ آيَاتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَى ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَا مُوسَى ﴿٥٧﴾ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِ فَاجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُ نَحْنُ وَلَا أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّى فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُ ثُمَّ أَتَى ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَى وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ وَقَدْ خَابَ مَنِ افْتَرَى ﴿٦١﴾ فَتَنَازَعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى ﴿٦٢﴾ قَالُوا إِنْ هَذَانِ لَسَاحِرَانِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ الْمُثْلَى ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُوا كَيْدَكُمْ ثُمَّ ائْتُوا صَفًّا وَقَدْ أَفْلَحَ الْيَوْمَ مَنِ اسْتَعْلَى ﴿٦٤﴾



(٥٢) مووسا وتی: زانینی ئەحواڵی ئەو میللەتە دێرینانە لای خوای پەروەردگارمەو لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوە. خودا نە هیچی لێ ون ئەبێ نە هیچی لەیادئەچێ.

(٥٣) ئەو خودایەی زەویی کردووە بە بێشکە بۆ ئێوەی ئادەمزاد ئارام ئەگرن و پێ ئەگەن تیایاو ڕێگای بۆ تێدا دروست کردوون هاتوچۆیان پیا بکەن و ئاوی بارانی لە ئاسمانەوە بۆ باراندوون، جا بەو بارانە چەند جۆرمان گژوگیا و دارودرەخت لە زەویدا بۆ ڕواندوون.

(٥٤) پێیشم وتوون: بۆخۆتان لەو گژوگیایانە و لەو بەری دارودرەختانە بخۆنو چوارپێکانیشتان بلەوەڕێنن. ئەمەی ئێمە بۆمان کردوون نیشانەی زۆری تیایە بۆ کەسانێ وێڵ و کەماڵیان ببێ و فامێکی وایان ببێ لە کاری بەد بییانگێڕێتەوە.

(٥٥) لەو ئەرزە ئێوەمان دروست کردووەو پاش مردنیش ئەتانگێڕینەوە بۆ ناو ئەو ئەرزەو جارێکی تریش کە لە ڕۆژی قیامەتدا مردوو زیندوو ئەکرێتەوە لەو ئەرزەتان ئەهێنینە دەرەوە.

(٥٦) بەڕاستی ئێمە هەموو نیشانەو موعجیزەکانی خۆمانمان پیشانی فیرعەون دا، بەڵام ئەو هەر مووسای بە درۆزن دانا و قایل نەبوو ئیمانی پێ بهێنێ و باوەڕی پێ بکا.

(٥٧) بە مووسای وت: ئەی مووسا! تۆ بۆ ئەوە هاتووی بە سیحرو جادووی خۆت ئێمە لەم خاکی خۆمانە دەرپەڕێنی؟

(٥٨) بەڕاستی ئێمەیش جادوویەکی وەك جادووەکەی تۆ دێنین، دەی سا کاتێ لەنێوان ئێمە و ئێوەدا بڕیار بدە بۆ جادووبازی هیچ لایەکمان پشتگوێی نەخەین و لە شوێنێکا بێ بۆ هەموو کەسێ چوون یەك بێ.

(٥٩) مووسایش وتی: کاتەکەی نێوانمان ڕۆژی جوانی بێ کە هەموو کەسێ ئەزانێ چ ڕۆژێکە و، خەڵکەکەیش لە چێشتانگاودا کۆبکرێنەوە.

(٦٠) جا فیرعەون پشتی پێهەڵکرد و ڕۆیی و پاشان هۆیەکانی سیحر و جادووی خۆی کۆکردەوە و پاش ئەوەیش لە ڕۆژ و کاتی دیاری کراوا هات و ئامادە بوو.

(٦١) مووسا بە سیحربازەکانی فیرعەونی وت: هاوار بۆ حاڵی ئێوە! بوختانی درۆ بەدەم خوداوە مەکەن بڵێن موعجیزەکانی کە من پیشانیان ئەدەم سیحرو جادوون و خوایش لە سزای ئەوەدا بە عەزابی سەختی خۆی تەفروتووناتان بکا. ئەوەی درۆ بەدەم خواوە بکا و موعجیزەکانی بە سیحرو جادوو دابنێ سەرەنجام نائومێد ئەبێ.

(٦٢) سیحربازەکانی فیرعەون لەنێوان خۆیانا کەوتنە دەمەقاڵەو قسە ڕەدوبەدەڵکردن بەرانبەر بە یەك و هەندێکیان وتیان ئەم قسانەی مووسا لە قسەی جادووگەر ناچن و بە پەنامەکی هەندێ چپەچپیان کرد.

(٦٣) لە ئەنجاما وتیان: ئەم دوانە، واتە مووسا و هاروون، دوو جادووگەرن ئەیانەوێ لە خاکی خۆتانتان وەدەرنێن و داگیری کەن بۆخۆیان و ئایین و ڕاوڕەسمە باشەکەتان لەناوا نەهێڵن.

(٦٤) کە واتە هەرچی سیحر و جادوو ئەزانن هەمووی کۆکەنەوەو بەڕیز بێن بۆ مەیدانی سحرپیشاندان. بەڕاستی ئەوەی ئەمڕۆ زاڵ ببێ بە سەر دوژمنا، ئەوە سەربەرز ئەبێ.

قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ
بَلۡ أَلۡقُواْۖ فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ
﴿٦٦﴾ فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ
أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ
كَيۡدُ سَٰحِرٖۖ وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيۡثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدٗا
قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمۡ لَهُۥ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ
لَكُمۡۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحۡرَۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ
وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ وَلَتَعۡلَمُنَّ
أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ ﴿٧١﴾ قَالُواْ لَن نُّؤۡثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ
ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِي فَطَرَنَاۖ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ
ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغۡفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكۡرَهۡتَنَا
عَلَيۡهِ مِنَ ٱلسِّحۡرِۗ وَٱللَّهُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا
فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ
عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ
تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾



(٦٥) جادووگەرەکانی فیرعەون وتیان: ئەی مووسا یا تۆ عەساکەی خۆت هەڵدە یا ئێمە یەکەم کەس ئەبین مارەکانمان هەڵئەدەین.

(٦٦) مووسا وتی: نەخەیر ئێوە لەپێشا ئەسبابی جادووی خۆتان هەڵدەن. زۆری نەبرد گوریسەکانیان و عاساکانیان بەهۆی ئەو جادووەوە تیایانا کرابوو کە جیوەیان لێ دابوون، وا ئەهاتنە بەر چاوی مووسا بجولێن و بکشێن.

(٦٧) مووسا لەدڵی خۆیا ترسی لەم وەزعە لێ‌نیشت.

(٦٨) بە مووسامان وت: ئەی مووسا! لە جادووەکەیان مەترسێ، بەڕاستی هەر تۆ بڵندو باڵای.

(٦٩) ئەوەی بە دەستتەوەیە کە عاساکەتە هەڵیدە، ئەوەی ئەوان کردوویانە هەمووی قووت ئەدا و هەڵیئەلووشێ. ئەوەی ئەوان کردوویانە فڕوفێڵی سیحربازێکەو سیحربازیش هەرچی بکاو لە هەر ڕێگایەکەوە بێتە مەیدانەوە سەرناکەوێ‌و نایباتەوە.

(٧٠) جا پاش ئەوەی مووسا عاساکەی خۆی فڕێدا و، عاساکەی جادووی جادووگەرەکانی هەڵلووشی، هێزی موعجیزەکەی مووسا جادووگەرەکانی فیرعەونی لەپەوڕوو خست و خستنیە حاڵی سوجدە بردنەوە و وتیان: وا ئیمانیان بە خوای هاروون و مووسا هێنا و باوەڕمان پێ کرد.

(٧١) کە فیرعەون بەمەی زانی لێیان تووڕە بوو و پێی وتن: ئەوە ئێوە بەر لەوەی من ڕێگەتان بدەم لە خۆتانەوە ئیمانتان پێ هێنا و باوەڕتان پێ کرد؟ دیارە ئەو گەورەکەتانە کە فێری سیحری کردوون. بەڕاستی دەست و قاچتان ڕاست و چەپ، واتە دەستی ڕاست و قاچی چەپتان ئەبڕمەوە و بە لقی دارخورماتاندا هەڵئەواسم. جا ئەو کاتە بەڕاستی ئەزانن کام لامان سزای سەختتر و پایەدارترە؟

(٧٢) ئەوانیش وتیان: ئێمە هەرگیز تۆمان لا چاکتر نی‌یە لەو بەڵگەو موعجیزانەی لە خوداوەندەوە هاتوون بۆمان کە دروستی کردووین، دەسا تۆیش چیت پێ ئەکرێ بیکە، تۆ هەر لەم ژیانە دوونەی دنیادا حوکم و دەستەڵاتت هەیە.

(٧٣) ئێمە ئیمانمان هێناوە بە خودای خۆمان بۆ ئەوەی لە تاوانمان خۆش ببێ و ئەو جادووگەرییەمان ببەخشێ کە تۆ بەزۆر پێت کردین و، خوا خۆی لە هەموو کەسێ باشترو پایەدارترە.

(٧٤) بەڕاستی هەرکەسێ بە کافری و تاوانباری بێتە حوزووری خوداوەند، ئەوە دۆزەخ بەشیەتی و بۆ ئەوەو نە ئەمرێ تیایا تا بحەسێتەوە و نە بە ژینێکی خۆشیش تیا ئەژی.

(٧٥) هەرکەسیش بە خاوەن باوەڕی بێتە حوزووری خواوەند و کرداری چاکی کردبێ، ئەو جۆرە کەسانە پایەی بەرزیان هەیە لە بەهەشتا.

(٧٦) ئەو پایەبەرزانە بەهەشتی عەدنن کە جۆگای ئاو بەناویانا ڕەوانن و هەمیشە لەو بەهەشتی عەدنەدا ئەمێننەوەو، ئەمەیش پاداشی ئەو کەسانەیە کە خۆیان لە کافری و لە تاوان خاوێن کردووەتەوە.

وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا وَلَا تَخۡشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ﴿٨٠﴾ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ۞ وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ﴿٨٦﴾ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾



(٧٧) بەڕاستی وەحیمان کرد بۆ مووسا کە شەورەوی بە بەندە بەنی ئیسرائیلییەکانم بکە و ڕێیەکی وشکانیان لە ئاوی نیلدا بۆ ئامادە بکە و لەوە مەترسە کە سوپای فیرعەون پێتان بگاتەوە و لە خنکانیش مەترسە لە ئاوی نیلدا.

(٧٨) کە ئەوان بەڕێکەوتن فیرعەونیش بە سەربازەکانیەوە کەوتە شوێنیان و ئەوەی لە دەریا داپۆشین و نوقمی کردن، داپۆشین.

(٧٩) فیرعەون قەومەکەی خۆی گومڕا کردو ڕێگای ڕاستی پیشان نەدان.

(٨٠) بە بەنیئیسرائیلییەکانمان وت: ئەی بەنی ئیسرائیل! بەڕاستی ئێمە ئێوەمان لە دەستی دوژمنەکەتان ڕزگار کرد کە فیرعەون بوو، وەعدەیشمان داونەتێ پیرۆزبایتان پێبدەین لە تەنیشتی ڕاستی لای توورەوە، لە سەحرایشدا گەزۆو پەلەوەری شەلاقەمان بۆ داباراندن. ئەم قسەلەگەڵبەنیئیسرائیل کردنەیش لە ڕێگای وەحیکردنەوە بووە بۆ مووسا.

(٨١) لەو خواردنە پاك و خۆشە بخۆن بە ڕۆزی پێمان داون و توغیان مەکەن و لە خۆتان بایی مەبن و حەرام مەخۆن تا غەزەبی منتان بەسەردا نەیەت. هەرکەس غەزەبی منی بەسەردا بێت نەکەوێت. (٨٢) من بەڕاستییش تاوانبەخشی ئەو کەسانەم کە تۆبە ئەکەن و کردەوەی باش ئەکەن و پاش ئەوەیش بۆ دواڕۆژیان شارەزای ڕێگای چاکە ئەبن.

(٨٣) خوا فەرمووی بە مووسا: ئەی مووسا! چی تۆی بەپەلە هێنا بۆ کێوی توور بەر لە قەومەکەت؟.

(٨٤) مووسایش وتی: خودایە! ئەوانیش وان لە دوامەوە بەشوێنما دێن، بەڵام من پەلەم کرد بۆ هاتن بۆ لای تۆ بەڵکو تۆ ڕازی بی لێم.

(٨٥) خودایش فەرمووی: بەڕاستی ئێمە پاش دەرچوونت لە ناو قەومەکەت، تاقیمان کردنەوە و گرفتارمان کردن و سامیرییش گومڕای کردن و سەری لێ شێواندن و وای لێ کردن دەست بدەنە گوێرەکەپەرستن.

(٨٦) جا مووسا بە توورەیی و خەم و پەژارەوە گەڕایەوە بۆ ناو قەومەکەی و پێی وتن: ئەی قەومەکەی من! ئایا خودا وەعدەی ئەنجامی جوان و باشی نەدابوونێ کە تەوراتتان بۆ بنێرێ؟ ئایا ماوەی وەعدەکەی دوور و درێژ بوو پێتان تەحەمول نەکرا؟ یا ویستتان غەزەبی خوای خۆتانتان بەسەردا بێ وا بەپێچەوانەی ئەو گفتە جووڵانەوە کە بە منتان دابوو کەوا لەسەر خواپەرستیی خۆتان بەردەوام بن، کەچی گوێرەکەتان پەرست؟

(٨٧)ئەوانیش وتیان: ئێمە بە دەستەڵات و ئارەزووی خۆمان خیلاف وەعدەمان لەگەڵ نەکردی و بە پێچەوانەی ئەو گفتە نەجووڵاینەوە کە پێمان دابووی، بەڵام بارێکی قورسی خشڵی گرۆی قیبتییەکانمان درابوو بە کۆڵدا، بە فەرمانی هاروون فڕێمان دایە ناو ئاگرەوەو، سامیرییش ئەوەی لای بوو فڕێیدایە ناو بۆتەکەیەوەو ڕشتیە ناویەوە

فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ
وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا وَلَا
يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ مِن قَبۡلُ
يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ
أَمۡرِي ﴿٩٠﴾ قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ
﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ
أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ
إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ
قَوۡلِي ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطۡبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرۡتُ
بِمَا لَمۡ يَبۡصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ
فَنَبَذۡتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتۡ لِي نَفۡسِي ﴿٩٦﴾ قَالَ
فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ
مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ
عَاكِفٗاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ
إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا ﴿٩٨﴾



(٨٨) جا سامیری لەو خشڵە تواوەی ڕشتیە ناو بۆتەکەیەوە، پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ دروست کردن قۆڕەی لێوە ئەهات وەك گوێرەکەی ترو بە بەنی ئیسرائیلییەکانی وت: ئەمە خودای ئێوەو مووسایەو، ئەوەی لەبیرچوو کە ئەوە خودای مووسا نیيەو خودای دەسکردی خۆیەتی.

(٨٩) ئایا ئەو گرۆیە نابینن و نازانن کەوا ئەو گوێرەکە وەڵامی قسەیان ناداتەوە و هیچ زیان و قازانجێکی بۆیان نیيە؟

(٩٠) بەڕاستی هاروونیش پێشتر پێی‌وتبوون: ئەی قەومەکەی من! ئێوە بە هۆی ئەو گوێرەکەوە گرفتار بوون، ئەمە خودای ئێوە نیيە، خودای ئێوە خودای میهرەبانە، دە شوێنی کەون و بەگوێی فەرمانی من بکەن.

(٩١) ئەوانیش وتیان: دەستبەرداری ئەم گوێرەکە نابین و هەر بەردەوام ئەبین لەسەر پەرستنی تا مووسا ئەگەڕێتەوە بۆ ناومان.

(٩٢) مووسایش کە گەڕایەوە بە هاروونی وت: هاروون کە دیتنت گومڕا بوون، چی ڕێی لێ گرتی ،

(٩٣) کەوا شوێنی من و ڕێگای من بکەوی و بچی بەگژیانا یا بەجێیان بهێڵی و بێی بۆ لام؟ ئەوە بێ‌فەرمانیی منت کرد کە پێم‌وتبووی لە کاروباری ئایینیدا توندو سەختگیر بیت؟

(٩٤) هاروون لە وەڵامی مووسای برایدا وتی: ئەی کوڕی دایکم! مووی ڕیش و سەرم ڕامەکێشە. من بۆیە نەچووم بە گژیانا یا لێیان جیا نەبوومەوە، لەوە ترسام تۆ بڵێی دووبەرەکیت خستە نێوان بەنی‌ئیسرائیل و قسەی منت ڕانەگرت.

(٩٥) جا مووسا ڕووی دەمی کردە سامیری و پێی وت: ئەی سامیری! تۆ بۆ وات کرد و چیت ئەویست وا ئەم کارەت کرد؟

(٩٦) سامیری لە وەڵامی مووسادا وتی: من ئەوەم دیبوو کە بەنی‌ئیسرائیلییەکان نەیاندیبوو، چاوم بەو فریشتەیە کەوتبوو کە لە شێوەی سوارێکدا هاتبوو و لەگەڵماندا بوو، هەر شوێنێ وڵاخەکەی پێی نایە سەر گورج گیای لێ ئەڕوا، منیش مشتێ خاکم لە شوێن پێیەکەی وڵاخەکەی هەڵگرت و پرژاندم بەو خشڵەدا کە لە بۆتەکەمدا تواندبوومەوە، کە کردمە ناو قاڵبەوە ئەو گوێرەکەیەی لێ پەیدا بوو و نەفسم ئەو کارەی لا جوان کردم.

(٩٧) مووسا بە سامیریی وت: بڕۆ لاچۆ لاما، تۆ لەم ژیانەتا دەردێکت تووش ئەبێ بڵێیت کەس توخنم نەکەوێ و لە قیامەتیشدا وەعدەیەکت هەیە بۆ سزادان خوا پشتگوێی ناخات و بۆت دێنێتەدی. سەیری گوێرەکەکەیشت بکە کە کردبووت بە خوای خۆت و ئەتپەرست و لەسەری بەردەوام بووی لێت لانەئەدا، باش باش ئەیسووتێنین و ورد وردی ئەکەین و فڕێی ئەدەینە ناو دەریا و لەوێ پرژوبڵاو ئەبێتەوە.

(٩٨) بەڕاستی خودای ئێوە زاتێکی پاکی وایە پەرستراوێکی بەڕاست لەم دنیادا نیيە لەو بەولاوەو هەرچی بۆ ئەوە بشێ پێی بزانرێ ئەو پێی ئەزانێ.

كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾



(٩٩) ئاوەها دەنگوباسی ڕووداوی ڕابووردووت بۆ ئەگێڕینەوە و بەڕاستی کتێبێکمان لەلای خۆمانەوە داویتێ باسی ئەم ڕووداوو دەنگوباسانەی هەموو تیایە.

(١٠٠) هەرکەسێ پشت لەو کتێبە بکاو گوێی نەداتێ ئەوە لە ڕۆژی قیامەتا بارێکی قورسی گوناه هەڵئەگرێ.

(١٠١) ئەو کەسانە بەردەوام لەو حاڵەیانا ئەمێننەوە. ئەو حاڵە بارێکی زۆر گران و خراپە بە کۆڵیانەوە لە ڕۆژی قیامەتا.

(١٠٢) لە ڕۆژێکا کە فوو ئەکرێ بە سووردا و تاوانباران خڕئەکرێنەوە لەو ڕۆژەدا چاویان شین بووە.

(١٠٣) لەناو خۆیانا ئەکەونە چپە چپ و ئەڵێن: لە دە ڕۆژ زیاتر لە دنیادا نەژیاون. مەبەست لەوەیە وەزعیان ئەوەندە ناخۆش ئەبێ هەموو خۆشییەکی لەوەپێشیان لەبیرئەچێتەوە.

(١٠٤) ئێمە چاکتر ئەوە ئەزانین کە ئەوان ئەیڵێن لەو کاتەدا کە هەرە زیرەکیان ئەڵێ لە ڕۆژێ زیاتر لە دنیادا نەماونەتەوە.

(١٠٥) پرسیارت لێ ئەکەن لەبارەی کێوەکانی ڕووی زەوییەوە کە سەرەنجام چییان بەسەر دێت؟ تۆیش لە وەڵامی پرسیارەکەیانا بڵێ: خوا بە داڕووخاندن دایان ئەڕووخێنێ و ئەیانکا بە خۆڵ و ،

(١٠٦) شوێنەکانیان ئەهێڵێتەوە بە دەشتێکی سافی وا ،

(١٠٧) لاری و لەواری و بەرزیو نزمیی تیا بەدی ناکەی.

(١٠٨) لەو ڕۆژەدا ئەم خەڵکە گشت ئەکەونە دوای ئەو بانگەوازکەرەی بە فەرمانی خوا بانگیان ئەکا بۆ مەیدانی حەشرکردنیان و هەموو خاوەن دەنگێ مل کەچ ئەکا لە ترسی خواداو لە دەنگی ژێرلێو بەولاوەت بەرگوێ ناکەوێ.

(١٠٩) لەو ڕۆژەدا تکاکردنی هیچ کەسێ سوود نابەخشێ تەنها تکاکردنی ئەوانە نەبێ کە خوای میهرەبان خۆی ڕێگای دابن و ڕازی بێ لە قسەکردنیان لە حوزووریا لەبەر پایە و پلەیان لای خوا.

(١١٠) خوا ئەوزاع و ئەحواڵی بەرودواو و داهاتووی ئەو خەڵکە ئەزانێ، بەڵام ئەوان ئەوە نازانن کە خوا ئەیزانێ.

(١١١) هەموو چیهرە و ڕوخسارێ دائەنەوێتەوەو سەر شۆڕو مل کەچ ئەکا بۆ خواوەندی هەمیشە زیندووی جیهان ڕاگر و هەرکەسێ باری تاوانی هەڵگرتبێ نائومێد ئەبێ.

(١١٢) هەرکەسێکیش هەندێ چاکەی کردبێ و باوەڕی بە خوا هەبێ، ئەو کەسە ترسی ئەوەی نابێ ستەمی لێ بکرێو حەقی بفەوتێنرێ.

(١١٣) ئاوەها قورئانێکی عەرەبیمان نارده خوارەوە و جۆرەها هەڕەشەمان تیا گۆڕی بەڵکو ئەو قورئانە پەندێ بخاتە دڵیانەوە.

فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۗ وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴿١٢٥﴾



(١١٤) زۆر بەرزو بالآیە لە زات و سیفاتدا ئەو خوایەی کە پادشاهی ڕاستەقینەی ئەم گێتییەیە، دەستی دەستدارو هۆشی هۆشیاری پێ ناگا. پەلەپەل مەکە بۆ خوێندنەوەی قورئان بەرلەوەی وەحیەکەت بە هۆی جوبرەئیلەوە پێ ڕاگەیەنرێ و بگاتە لات و، بڵێ: خوایە زانستم زیاد بکە.

(١١٥) بەڕاستی لەمەوپێش ئامۆژگاری ئادەممان کرد تۆخنی درەختی گەنم نەکەوێ، کەچی ئامۆژگارییەکەمانی لەبیرچوو و بە خاوەن عەزم و توانمان نەدی ئەو ئامۆژگارییەمانی پێ ڕابگیرێ.

(١١٦) یادی ئەوە بکەرەوە کە بە فریشتەکانمان وت: سوجدەی حورمەت لێگرتن بۆ ئادەم بەرن، ئەوانیش هەموو سوجدەیان بۆ برد تەنها شەیتان نەبێ گوێی بە فەرمانەکەمان نەداو سوجدەی نەبرد.

(١١٧) جا بە ئادەممان وت: بەڕاستی ئەم شەیتانە دوژمنە بۆت و بۆ ژنەکەت، دەسا ئاگاداربە دەرتان نەپەڕێنێ لە بەهەشت و گیرۆدەی نارەحەتی ببی.

(١١٨) بێگومان ئەمە بۆ تۆ لە بەهەشتا هەیە کەوا نە برسیت ببێ تێیداو نە بێ بەرگ و پۆشاك بی.

(١١٩) تینوویشت نەبێ تیایاو گەرمات نەبی.

(١٢٠) پاشان شەیتان وەسوەسەو خەیاڵاتی پڕوپووچی خستە ناو دڵیەوە، پێی وت ئەی ئادەم ئایا شارەزاییت بکەم بۆ دارێ کە لێخواردنی ئەبێ بە هۆی ئەوە هەتا هەتایە بژیت و، موڵك و ماڵێکت پیشان بدەم کە هەرگیز نافەوتێ و نابڕێتەوە.

(١٢١) ئادەم بەو وەسوەسەی شەیتانە هەڵخەڵەتا، خۆی و ژنەکەی لە بەری ئەو دارەیان خوارد، لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو توێکڵە سەدەفەی بەسەر لەشیانەوەبوو لاچوو و عەورەتیان دەرکەوت، ئەوانیش دەستیان کرد بە شاردنەوەی عەورەتیان بە گەڵاداری بەهەشت. ئادەم لە فەرمانی خوای خۆی دەرچوو گومڕا بوو.

(١٢٢) پاش ئەوە خوا بە ڕەحمەتی خۆی هەڵیبژارد بۆ پێغەمبەرایەتی و لێی بووردو ڕێگای پیشان دا بۆ لانەدان لەو تەوبەیەی کردی.

(١٢٣) خوا بە ئادەم و ژنەکەیو بە شەیتانی وت: لە بەهەشت دابەزن بۆ سەر زەوی، هەندێ لە ئێوە (لە ئادەمزادو لە جنۆکە) دوژمنی هەندێکتانن (ئەوەتا ئادەمزاد و جنۆکەی خواپەرست و ئادەمزادو جنۆکەی کافر دوژمنی یەکترن). جا کاتێ کە لە منەوە ڕێپیشاندانێکتان بۆ دێ هەرکەسێ شوێنی ئەو ڕێپیشاندانەی من بکەوێ ڕێ گوم ناکا و نارەحەت و کلۆڵ نابێ.

(١٢٤) هەرکەسێکیش پشت لە یادکردنەوەی من هەڵکا ژیانێکی تەنگ و ناخۆش ئەژی لە دنیادا چونکە هەموو قورسایی کارو بیری خۆی خستووەتە سەر کۆکردنەوەی ماڵی دنیاو هیچ ڕەحەتییەکی دڵی نابێ و، لە ڕۆژی قیامەتیشا بە کوێری حەشری ئەکەین.

(١٢٥) ئەویش ئەڵێ: خوایە بۆ بەکوێری حەشرت کردم لە کاتێکا من لە دنیادا چاوساغ و بینا بووم؟ .

قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا وَمِنْ ءَانَآيِٕ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ وَقَالُواْ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾ وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴿١٣٤﴾ قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُواْ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾



(١٢٦) خوا فەرمووی: وامان پێ کردی چونکە لە دنیادا ئایەتی ئێمەت بۆ هات کەچی فەرامۆشت کردو گوێت نەدایێ، تۆیش هەروا ئەمڕۆ لە بەرچاو ئەکەویو فەرامۆش ئەکرێی. (١٢٧) هەر بەم جۆرەیش پاداشی ئەو کەسانە ئەدەینەوە کە زیادەڕەوی بکەن لە بێدینیو ئارەزووپەرستیداو باوەڕ بەو بەڵگەو نیشانانە نەکەن کە خوا نیشانیان ئەداو، سزای ئەو دنیایش زۆر لە سزای ئەم دنیایە سەختترو بەردەوامترو درێژخایەن ترە. (١٢٨) ئایا ئەو کارەساتانەی هێناومانن بەسەر کافرە پێشووەکانا ئەم کافرانەی مەککەی شارەزا نەکرد بۆ ڕێگەی ڕاست، کە ئەوەبوو خەڵکی سەدە پێشووەکانمان بەربادکرد کە ئێستا ئەمانە کە ئەڕۆن بۆ کاروان بە شوێنەوارەکانی ئەوانا تێئەپەڕن. بەڕاستی ئەمە گەلێ ئایەتو بەڵگەی تیایە بۆ ئەوانەی عەقڵێکی ساغیان هەیە.

(١٢٩) ئەگەر فەرمانێ لە پێشتر لە خوای تۆوە دەرنەچووایە بە دواخستنی سزادانی ئەم ئوممەتە بۆ ڕۆژی قیامەتو ئەگەر وادەیێ دانەنرابوایە بۆ سزادانیان کە لە ڕۆژی قیامەتا ئەبێ، بەربادکردنی ئەم کافرانەیش وەك کافرە پێشینەکان کارێکی پێویست بوو، بەڵام خواوەند هەر لەپێشەوە سزای ئەمانەی دواخستووە بۆ ڕۆژی قیامەتو ئەو ڕۆژەی بۆ دەستنیشانو دیاری کردوون و، بڕیاری ئەویش هەڵوەشاندنەوەی بۆ نی‌یە.

(١٣٠) دەسا خۆت ڕاگرەو سەبر بکە بەرانبەر ئەو قسە ناڕەوایانەی کافرەکان ئەیانکەنو سوبحانەڵلا بکەو سوپاسی خودای خۆت بکە بەر لە خۆرهەڵاتن و بەر لە ئاوابوونی (مەبەست لە نوێژی بەیانیو نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەیە)و لە هەندێ کاتی شەودا (مەبەست لە شەو نوێژە)و لە هەندێ کاتی هەردوو چمکەکەی ڕۆژدا (دیسانەوە مەبەست لە نوێژی بەیانیو ئێوارەیە). ئومێد وایە پاداشێکی وات بەرانبەر بەم تەسبیح و سوپاسی خودایە لە خوای گەورەوە دەسگیر ببێ پێی ڕازی ببی.

(١٣١) چاو مەبڕەرە ئەوەی ژیانی چەند تاقمێکمان لەو کافرانە پێ خۆش کردووە لە دارایی دنیاو ژنو منداڵو دەستەو بەستەیان کە مایەی خۆشی ژیانی دنیان، ئەوانەمان بۆ ئەوە داونێ تاقییان بکەینەوە پێیان یا لە قیامەتا سزایان بدەین بەهۆی ئەو خۆشییانەوە. ئەو ڕزق و ڕۆزییەی پێمان داوی کە بریتییە لە نیعمەتی پێغەمبەرایەتی لە هەموو شتێ باشترو بەسوودترو پایەدارترە.

(١٣٢) فەرمانیش بدە بە ژن و منداڵ و کەسوکارو دەستەو بەستەت کە نوێژ بکەن و بۆ خۆیشت بەردەوام بە لەسەر ئەم نوێژکردنە لە خۆشیو ناخۆشیدا. ئێمە داوای ڕزق و ڕۆزی لە تۆ ناکەین بۆ کەس. ئێمە ڕزق و ڕۆزی بە تۆ ئەدەین و ئەنجامی باشیش بۆ ئەوانەیە لە خوا ئەترسن و خۆیان لە کاری خراپ ئەپارێزن.

(١٣٣) کافرەکان وتیان: بۆچی موحەممەد بەڵگەیەك لەلایەن خوای خۆیەوە ناهێنێ بۆمان کە نیشانەی ئەوە بێ پێغەمبەری خوایە؟ ئەی بەڵگەی ئەوەیان بۆ نەهاتووە کە لە کتێبە پێشووەکانی خوادایە بۆ پێغەمبەران کە تەورات و ئینجیل و کتێبەکانی ترن؟ (ج)

(١٣٤) ئەگەر ئێمە ئەو کافرانەمان بەر لە ناردنی موحەممەدو نازڵ کردنی قورئان بۆسەر خەڵك بەرباد بکردایە بە سزایێ لە تاو ئەو سزایە ئەیان وت: خوایە ئەوە بۆ پێغەمبەرێکت نەنارده سەرمان تا ئێمەیش شوێنی ئایەتەکانی تۆ بکەوتینایە بەر لەوەی زەلیلی دنیاو ڕسوای قیامەت ببین.

(١٣٥) تۆ لە وەڵامی ئەو قسەیەی کافرەکانا پێیان بڵێ: ئێمەو ئەوان هەردوولا چاوەڕوانی ئەنجامی ئەولاکەمانین کە چیی بەسەردێ. دەی‌سا چاوەڕێ بن، لەمەولا ئەزانن کێ خاوەنی ڕێی ڕاستەو کێ شارەزای ڕێگای خوا بووەو بە باشی ئەیزانێ و ئەیگرێتەبەر.

## سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

ترتيبها ٢١ — آياتها ١١٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴿١﴾ مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا ٱسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ ۗ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ هَلْ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ۖ أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّى يَعْلَمُ ٱلْقَوْلَ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٤﴾ بَلْ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ مَآ ءَامَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ ۖ أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِمْ ۖ فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾ وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُوا۟ خَٰلِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقْنَٰهُمُ ٱلْوَعْدَ فَأَنجَيْنَٰهُمْ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهْلَكْنَا ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٩﴾ لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠﴾



## سووڕەتی (الأَنبِيَاءِ)

**مەککەیی یەو(١١٢) ئایەتە**

(١) نزیکبووەتەوە بۆ خەڵك لێپرسینەوەی بیروباوەڕو گوفتارو کرداریان کە لە ڕۆژی قیامەتا ئەبێ، کەچی ئەوان لە بێئاگاییدان و خۆیان لە لێپرسینەوەی ئەو ڕۆژە لائەدەن.

(٢) هیچ وەبیرهێنانەوەیەکی نوێیان لە خواوە بۆ نایەت ئیللا کاتێ ئەیبیسن گاڵتەی پێئەکەن.

(٣) حاڵیان وایە دڵیان بێئاگایە لە کاتی بیستنی ئەو وەبیرهێنانەوەی خوادا، ئەو ستەمکارانە ئەکەونە چپەچپ، پێیان وایە پێغەمبەری خوا نابێ ئادەمزاد بێ، ئەڵێن: ئایا ئەم ئیددیعای پێغەمبەرایەتی کردووە لە بنیادەمێکی وەك ئێوە بەولاوە هەیە جادووتان لێ ئەکا؟ ئێوە ئایا دێن بۆ لای جادوو کە بە چاوی خۆتان ئەبینن ئەوە جادووە ؟

(٤) پێغەمبەریش بەو نەفامانەی وت: خوای من بە هەموو قسەیەك ئەزانێ کە بەئاشکرا یا بە چپە لە ئەرز یا لە ئاسمانا بکرێ، ئەو گوێی لە هەموو قسەیەکەو بە هەمووشتێ ئەزانێ.

(٥) تۆ لادە لەوە کە ئەمانە ئەڵێن: قسەکانی پێغەمبەر سیحرن، ئەیشڵێن: خەوی پڕوپووچن، ئەیشڵێن: درۆ و ساختەو دەستهەڵبەستی خۆیتی، ئەیشڵێن: شاعیرەو شیعر دائەنێ، ئەگەر ڕاست ئەکا با موعجیزەیەکمان پێشان بدا وەك چۆن پێغەمبەرانی پێشوو ڕەوانە کرابوون و هەریەکە موعجیزەیەکیان هەبوو.

(٦) خەڵکی ئەو ئاوەدانییانەی پێش ئەمان کە بەربادمان کردن و فەوتاندمانن کە داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەرەکانیان ئەکردو ئەوانیش پیشانیان ئەدان و، بەو موعجیزانەیش ئیمانیان نەئەهێنا، ئێستە ئەمانە ئیمان دێنن ئەگەر موعجیزەیان پیشان بدەین ؟

(٧) پێش تۆ لە چەند پیاوێ بەولاوەمان نەناردووە کە وەحیمان بۆ ئەکردن، واتە پێش تۆیش هەر ئادەمزادمان بە پێغەمبەری ئەناردو هەرگیز فریشتەمان بە پێغەمبەری نەناردووە. دەی ئەگەر خۆتان نازانن لەوانە بپرسن کە ئاگایان لەو کتێبانە هەیە کە لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە بۆ خەڵکمان ناردوون.

(٨) ئەو پێغەمبەرانەی ناردبوومانن وامان دروستنەکردبوون کە تەنها لاشەیەك بن خۆراك نەخۆن و، لە دنیایشدا بۆ هەمیشە نەبوون و سەرەنجام مردوون.

(٩) پاش ئەوەیش هەر گفتێکمان دابوونێ ڕاستمان لەگەڵ کردوون و بۆمان هێناونەدیو ئەوان و هەرکەسی تر کە خواستمان لەسەر بووبێ ڕزگارمانکردوون و ئەوانەمان بەرباد کردووە کە لە کافریو گوناهباریدا لە سنوور دەرچووبوون.

(١٠) بەڕاستی ئێمە کتێبێکمان بۆ ناردوون کە قورئانە پەندو ئامۆژگاریتانی تیایە، دەی بۆ عەقڵتان پێ ناشکێ تا ئیمانی پێ بهێنن و پەیڕەویی لێ بکەن ؟

وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُواْ وَٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَىٰهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِىَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِى بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْحَقَّ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾



(١١) ئێمە زۆر ئاوەدانیمان تێکشکاندووە کە خەڵکەکانیان ستەمکار و لەخوانەترس بوون و خەڵکێکی ترمان لەو شوێنانەدا دروستکردووەو دامەزراندووە.

(١٢) کاتێ کە ئەوانە هەستیان بە هێزو بە سەختیی سزای ئێمە کردووە بە پەلە لەو شوێنانە هەڵاتوون و رایانکردووە.

(١٣) خوایش پێی فەرموون: هەڵمەیەن و بگەڕێنەوە بۆ ئەو شتانەی زیادەڕەویتان تیا کردن وەکو ڕابواردن و خۆشیو لەزەتی دنیا بیۆ، بگەڕێنەوە بۆ ماڵ و مەنزڵی خۆتان بەڵکو لێتان بپرسرێتەوە لەو خراپانەی کردووتانن.

(١٤) وتیان: هاوار بۆ ئێمە! ئێمە بەڕاستی کەسانێکی ستەمکار بووین.

(١٥) جا بەردەوام هەر ئەوەیان ئەوت تا کردمانن بە پووشی دوراوەی بێگیان و وشکهەڵاتوو.

(١٦) ئێمە ئاسمان و ئەرزو نێوانیانمان بە گاڵتە دروست نەکردووە.

(١٧) ئەگەر بمانویستایە ئەسبابی بێئاگایی ڕابواردن دروست بکەین هەر لای خۆمان دروستمان ئەکرد ئەگەر مەبەستمان کردنی شتیوا بوایە.

(١٨) ئێمە ئەسبابی بێئاگاییو ڕابواردن دروستکەر نین، بەڵکە حەق ئەدەین بەسەر ناحەقا جا حەقەکە سەری ناحەقەکە پان ئەکاتەوەو ناحەقەکە ئەفەوتیو قوڕبەسەر ئێوەیش و هاوار بۆتان لەو هاوبەشبۆ خوادانانەتان.

(١٩) بۆ خوا خۆیەتی هەرکەس و هەرچی لە ئاسمانەکان و لە ئەرزدا هەن و ئەو فریشتانەیش کە لای خۆین، ئەمانە خۆ بە زل نازانن لەوە کە خوا بپەرستن و بەندەیی بۆ بکەن و، لە گوێڕایەڵیکردنیا ماندوو نابن.

(٢٠) بە شەو و بە ڕۆژ سوبحانەڵلا ئەکەن و لە بەگوێکردنیا هیچ درێغی ناکەن.

(٢١) هەی هەی! ئەمانە بە خەیاڵی بەتاڵی خۆیان هەندێ شتی سەرزەویيان بۆ خۆیان کردووە بە خواو ئەیانپەرستن گوایە ئەمانەن مردوو زیندوو ئەکەنەوە.

(٢٢) ئەگەر خودای ڕاستەقینە لە زاتی خودا بەولاوە لە ئاسمانەکان و لە ئەرزدا ببوایە، ئاسمان و ئەرز تێکئەچوون کەواتە خوای پەروەردگاری عەرش پاك و خاوێنە لەوەی کافرەکان باسی ئەکەن کە ئەوەتە خوا هاوبەشی ببێ.

(٢٣) خوا پرسیاری لێ ناکرێ لە هەر کارێ کە ئەیکا، بەڵام خەڵك پرسیاریان لێ ئەکرێو حیساب و کیتابیان بۆ دائەنرێ، جا یا پاداشی چاکەیان وەرئەگرن یا تۆڵەی خراپەیان لێ ئەستێنرێ.

(٢٤) یاخەیر چەند خوایەکیان لە زاتی (واجب الوجود) بەولاوە بۆخۆیان ڕاگرتووە، دەی پێیان بڵێ: بەڵگەو دەلیلی خۆتان بێنن لەسەر ڕاستی ئەوەی کردووتانە. ئەم کتێبەی بۆ من هاتووە پەندو ئامۆژگاریی من و ئەو پێغەمبەرانەی ترە کە پێش من هاتوون کە هەموویان خوایان هەر بە یەکێ داناوە، بەڵکو زۆرتری ئەمانە کە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن نەزانن ڕاستییەکە کامەیەو لێی لائەدەن و پشتی تێ ئەکەن.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ
إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ
بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم
بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ
وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ
﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ
جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا
مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ
رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمۡ وَجَعَلۡنَا فِيهَا فِجَاجٗا سُبُلٗا لَّعَلَّهُمۡ
يَهۡتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ
ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ
وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ
ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ
ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٣٥﴾



(٢٥) پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە ئیللا وەحیمان بۆ کردووە کەوا کەسێ نی‌یە بپەرسترێ من نەبێ، دەسا بێن بمپەرستن و عیبادەتم بۆ بکەن.

(٢٦) کافرەکان ئەڵێن: خوا منالّی بۆ خۆی قەرارداوە. خوا پاکە لەوە کە منالّی ببێ، بەڵکو فریشتەی هەن کە بەندەی بەقەدر و حورمەتی خوان.

(٢٧) پێش خوا ناکەون لە قسەدا واتە بێ‌گوێیی ناکەن و، ئەوانە بە فەرمانی خوا کارئەکەن و ئەجووڵێنەوە.

(٢٨) خوا زانایە بە هەرچی لە بەردەمیانایەو بە هەرچی لەدوایانەوەیە، واتە هەرچییان لەمەوپێش کردووەو هەرچی لەمەوپاش ئەیکەن هەمووی ئەزانیو ئاگای لێیەو، تکایش ناکەن بۆ کەسێ نەبێ خوا ڕازیی لێ بێو لە قاری خوا ئەترسن.

(٢٩) هەرکامێکیش لەو فریشتانە بڵێ من خودام و خودا نەپەرستێ، پاداشی بە دۆزەخ ئەدەینەوەو هەروەهایش پاداشی ستەمکاران ئەدەینەوە.

(٣٠) ئایا کافرەکان نازانن کەوا ئاسمانەکان و زەوی پارچەیەکی پێکەوە لکاو بوون و لێکمان کردنەوەو، هەمووشتێکی زیندوومان لە ئاو دروست کردووە؟ دەی ئایا هێشتا هەر ئیمان ناهێنن ؟

(٣١) چەند کێوێکی دامەزراوو چەسپاویشمان لە زەویدا دروستکردوون نەکا ئەرز لە هەڵسووڕانا لاربێتەوە بەوانەی لەسەریەوەن و، کەلەبەری بڵاویشمان لەو کێوانەدا کردووە بە ڕێگا بەهیوای ئەوەی ڕێگای دابینکردنی ڕزق و ڕۆزی بۆ ژیانی خۆیان لەو شیو و دۆڵانەدا بدۆزنەوە.

(٣٢) ئاسمانیشمان کردووە بە سەربانێکی پارێزراو لە کەوتن، کەچی کافرەکان لووتەلان و پشتیان لەو نیشانانەی یەکێتیو توانایی خوا هەڵکردووە کە لەو ئاسمانانەدا هەن.

(٣٣) خوا ئەو خوایە شەوو ڕۆژو خۆرو مانگی دروستکردووە، هەریەك لەوانە لەناو بازنەیەکا وەك مەلەوان دێن و ئەچن.

(٣٤) ئێمە نەمریمان بەر لە تۆ بۆ هیچ ئادەمزادێك بڕیار نەداوەو کەسمان نەمر نەکردووە. ئاخۆ ئەگەر تۆ بمری ئەوان بە نەمری ئەمێننەوە؟ نەخەیر، ئەوانیش وەك تۆ ئەمرن و دنیا تا سەر بۆ کەس نابێ.

(٣٥) هەموو گیانلەبەرێ مەرگ ئەچێژێو ئێمە بە خراپەو بە چاکە تاقیتان ئەکەینەوە بۆ دەرکەوتنی هەڵوێستتان لە خۆشیو لە ناخۆشیداو سەرەنجامیش ئەگەڕێنرێنەوە بۆ لای خۆمان و هەرکەس پاداشی شایانی خۆی وەرئەگرێ.

وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖۚ سَأُوْرِيكُمۡ ءَايَٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحۡمَٰنِۗ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾



(٣٦) کاتێ کە کافرەکان ئەتبینن بە هیچت ناکەن بە گاڵتەجاڕی خۆیان نەبیو بە گاڵتە پێکردنەوە ئەڵێن: ئا ئەمەیە ناوی خواکانی ئێوە بە سووکی ئەبا؟ کەچی خۆیان ناوی خودای میهرەبان ناهێنن، بۆیە ئەوان، نەك تۆ، شایانی ئەوەن گاڵتەیان پێ بکرێ.

(٣٧) ئادەمزاد ئەوەندە بە پەلەو هەڵپەیە وەك بڵێی بۆخۆی لە پەلەپەل دروست کراوە. با پەلە نەکەن بۆ چاوکەوتنیان بە نیشانەو قەهرو غەزەبی من، پاش وەخت لە کاتی خۆیا پیشانیان ئەدەم.

(٣٨) ئەڵێن: ئەم وادەی هاتنی سزایە کەیە ئەگەر ڕاستنەکەن دێت؟

(٣٩) ئەگەر ئەو کافرانە بزانن کاتێ کە ئەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوەو ناتوانن ئاگر نە لە چرچاویان و نە لە پشتیان بگێڕنەوەو کەس نایێ بەهاواریانەوە یارمەتییەکیان بدات، بزانن حاڵیان چۆن ئەبێ، پەلە ناکەن بۆ زانینی وادەی هاتنی ئەو سزایەی خوا.

(٤٠) بەڵکو ڕۆژی قیامەت یا سزای خوایی لە دنیادا یا ئاگری دۆزەخیان لەپڕ بۆ دێت و سەگەردانیان ئەکا، ئیتر ناتوانن بیگێڕنە دواوەو مۆڵەتیشیان نادرێو بۆیان دواناخرێ.

(٤١) بەڕاستی گاڵتە بە گەلێ پێغەمبەری پێش تۆیش کراوەو لەئەنجامی ئەوەدا سزای ئەو گاڵتەکردنە گەمارۆی گاڵتەکەرەکانی داو تەفر و تووناى کردن.

(٤٢) تۆ بەو کافرانە بڵێ: ئەوە کێیە بە شەو و بە ڕۆژ لە عەزابی خواتان ئەپارێزێ، بەڵام تۆ لێیان گەڕێو وازیان لێ بێنە، ئەوانە پشتیان لە ناوی خوداو لە یادی خوا هەڵکردووەو گوێی نادەنێ.

(٤٣) یان ئەوانە بە خەیاڵی خۆیان خواگەلێکیان هەن ڕێی سزای ئێمەیان لێ ئەگرن و ناهێڵن تووشیان ببێ. نەخێر ئەو خوا خەیاڵییانەی ئەوان توانای یارمەتیدانی ئەوانی نییەو لای ئێمەیشەوە نیگابان و پارێزگاریان بۆ ڕەوانە ناکرێ لەگەڵیان بن و سزای ئێمەیان لێ لادەن.

(٤٤) بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە ئێمە گوزەرانی خۆشمان داوە بەو کافرانەو بە باوك و باپیرانیان تا ماوەی ژیانیان بەوجۆرە درێژەی کێشاو لە خۆیان بایی بوون و وایانزانی ئەو خۆشیو ڕابواردنەیان تا سەرەو هەرگیز نابڕێتەوە. ئایا ئەمانە سەیرناکەن ئێمە پەیدەرپەی لە خاکی کافران کەم ئەکەینەوەو ئەیخەینە ژێر دەستەڵاتی موسوڵمانان؟ ئایا لەگەڵ ئەمەیشا خۆیان بە زاڵتر ئەزانن بەسەر موسوڵماناناو وا ئەزانن ئەو خۆشیو ڕابواردنەیان دوایی نایەت؟

قُلۡ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلۡوَحۡيِۚ وَلَا يَسۡمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتۡهُمۡ نَفۡحَةٞ مِّنۡ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلۡفُرۡقَانَ وَضِيَآءٗ وَذِكۡرٗا لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشۡفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَٰذَا ذِكۡرٞ مُّبَارَكٌ أَنزَلۡنَٰهُۚ أَفَأَنتُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾ ۞ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ إِبۡرَٰهِيمَ رُشۡدَهُۥ مِن قَبۡلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُواْ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدۡ كُنتُمۡ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا بِٱلۡحَقِّ أَمۡ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمۡ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصۡنَٰمَكُم بَعۡدَ أَن تُوَلُّواْ مُدۡبِرِينَ ﴿٥٧﴾



(٤٥) تۆ بەو کافرانە بڵێ من ئێوە ئەترسێنم بەو ئایەتانەی لای خواوە بۆم دێن، بەڵام مرۆی کەڕ گوێی لە هاوار لێکردنی کەس نی‌یە لەوکاتا کە ئەترسێنرێ.

(٤٦) ئەم کافرانە ئەگەر کەمترین سزای خوای تۆیان پێ بگا ئەکەونە هاوار هاوار و ئەڵێن: ئەی قوڕبەسەر خۆمان! بەڕاستی ئێمە کەسانێکی ستەمکار بووین.

(٤٧) ئێمە ترازووی سەرنەکردوو دائەنێین لە ڕۆژی قیامەتا بۆ کێشانەی چاکەو خراپەی خەڵك، ئیتر هیچ‌کەسێ ستەمی لێ ناکرێو هەقی خۆی ئەدرێتێ، ئەگەر کەسێکیش دانە خەردارەیێ چاکە یا خراپەی هەبێ ئەیهێنینە مەیدانی حیسابەوەو بۆیی حیساب ئەکەین و ئێمە بەسین بۆ حیساب‌کردنی چاکەو خراپەی بەندە.

(٤٨) ئێمە بەڕاستی کتێبێکمان دا بە مووساو بەهاروون کە حەق و ناحەقی لێك جویێ ئەکردەوەو ڕووناکی بوو بۆ دڵی ئەوەی بییەوێو مایەی یادی خوا بوو بۆ ئەوانەی لە خوا ئەترسن. هەندێکیش وتوویانە: مەبەست لە (فورقان) عاساکەی مووسایە کە نیلی پێ کەرت کرد تا بەنی ئیسرائیل لێی بپەڕنەوەو، مەبەست لە (ضیاء) ڕووناکییەکەی دەستیەتی و، مەبەست لە تەنها (ذکر)ەکە تەوراتە.

(٤٩) ئەو لەخواترسانەی دڵیان ئەکەوێتە لەرزە لەوەی کە خوایان لە خۆیان ناڕازی کردبیو لە ڕۆژی قیامەت ئەترسن. ئەم ئایەتە باسی ئەو لەخواترسانەیە لە ئایەتی پێشوودا ناویان هات.

(٥٠) ئەم قورئانەیش قورئانێکی پیرۆزە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر، جا ئێوە ئەی کافرەکان ئینکاری ئەکەن ؟

(٥١) بەڕاستی ئێمە بەر لە مووساو هاروونیش توانی دۆزینەوەی ڕێی چاکەمان دا بە ئیبراهیم و حاڵیمان ئەزانیو ئەمانزانی کەوا بەکەڵکی خەڵاتی پێغەمبەرایەتی دێ.

(٥٢) کە بە باوکیو بە خێڵەکەیی وت: ئەم پەیکەرانە چین وا ئێوە بە دەوروخولیانا دانیشتوون؟

(٥٣) وتیان: باوك و باپیرانی خۆمانمان وا دیوە ئەم پەیکەرانەیان ئەپەرست.

(٥٤) ئیبراهیمیش وتی: ئێوەیش و باپیرانیشتان لە گومڕاهییەکی ئاشکرادا بوون.

(٥٥) ئەوانیش پێیان وت: ئایا ڕاستیت بۆ هێناوین لەم قسانەتدا کە ئەیانکەیت یاخود لەوکەسانەی کە گاڵتە ئەکەن و بە ڕاستت نی‌یە؟

(٥٦) ئیبراهیمیش وتی: بەڵێ من بەڕاستمەو گاڵتە ناکەم خوایەی ئێوە ئەو خوای ئاسمان و زەوییە کە دروستی کردوون و من شایەتی ئەم ڕاستییەم.

(٥٧) سوێندیش ئەخۆم بەخوا پاش ئەوەی ئێوە پشت پێ هەڵکەن و بڕۆن و ئەم شوێنە بەجێ‌بێڵن کەتنێك بە بتەکانتان ئەکەم.

فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا۟ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾



(٥٨) گشت بتەکانیانی پارچە پارچە کردو شکاندنی بەسەر یەکدا تەنها بتە گەورەکەیان نەبێت بەهیوای ئەوەی خێڵە بتپەرستەکەی بگەڕێنەوە سەر ئەو بتە گەورەیەو لێی‌بپرسن کێ وای لەو بتانە کردووەو شکاندوونی بەسەر یەکاو وردو خاشی کردوون؟

(٥٩) کە بتپەرستەکان هاتنەوە بۆ بتخانەکەو دییان بتەکان پارچە پارچە کراون وتیان: کێ وای بەم بتانە کردووە. بەڕاستی ئەو کەسە لەستەمکارانە.

(٦٠) وتیان: گوێمان لە لاوێ بوو بەخراپ باسی بتەکانی ئەکرد ناوی ئیبراهیم بوو ڕەنگ بێ ئەو وای لێ کردبن و بەو دەردەی بردبن.

(٦١) وتیان: ئەو کوڕە بێنن بۆ بەرچاوی ئەم خەڵکە بەڵکو بیناسنەوەو شایەتیی لەسەر بدەن کە ئەو ئەم کەتنەی کردووە.

(٦٢) کە هێنایان و خەڵکەکە شایەتییان لەسەردا کە ئەو بوو باسی بتەکانی بە خراپ ئەکرد، پێیان وت: ئیبراهیم تۆ وات بە خواکانمان کردووە؟

(٦٣) ئیبراهیمیش وتی: من نەبووم، ئەم بتەگەورەیەیان بوو وای لێ کردن، ئەیوت: چۆن تا من ببم ئەبێ ئەمانە بپەرسترێن؟ دەی ئەگەر ئەمانە ئەتوانن بێنەدەنگ و قسەبکەن، لێیشیان بپرسن بزانن کێ وای لێ کردوون؟

(٦٤) ئەوانیش گەڕانەوە بۆسەر خۆیان و لەناو خۆیانا کەوتنە ڕاوێژ، بە خۆیانیان وت: ئێوە خۆتان خەتابار و ستەمکارن کەوا ئەم بتە داتاشراوانە ئەپەرستن.

(٦٥) پاشان، دیسانەوە پاش ئەوەی کەمێك عەقڵیان هاتەوە سەریان، سەری سەر شۆڕییان دانەواندو بە ئیبراهیمیان وت: تۆ خۆت ئەزانی ئەو بتانە قسە ناکەن، تۆ خۆت بڵێ کێ وای لێ کردن ؟

(٦٦) ئیبراهیمیش پێی‌وتن: کەواتە ئاخۆ ئێوە غەیری خوا شتێ ئەپەرستن نە هیچ قازانجێکتان پێ‌ئەگەیەنیو نە زیانێ؟

(٦٧) هاوار بۆ ئێوەو بۆ ئەو شتانەی غەیری خوا کە ئێوە ئەیانپەرستن، ئەوە ئێوە هیچ نافامن ؟

(٦٨) خێڵەکەی ئیبراهیم کە ڕقیان هەستابوو، لەبەر کەللەڕەقیی خۆیان وتیان: باش باش بیسووتێنن و لەسەر خواکانی خۆتان بکەنەوە ئەگەر کارێکتان لە دەست دێ.

(٦٩) کە ئیبراهیمیان گرت و فڕێیاندایە ناو ئاگرەوە، بە ئاگرەکەمان وت: ئاگرەکە! سارد بەرەوەو ببە بە مایەی سەلامەتیو زیان نەگەیشتن بە ئیبراهیم.

(٧٠) ئەوان خواستیان وابوو زیانی پێ‌بگەیەنن، ئێمەیش ئەوانمان کرد بە هەرەخەسارەتبارو دۆڕاو.

(٧١) خۆیو لووطی برازایشیمان ڕزگارکردو بردمانن بۆ ئەو خاکەی بەرەکەتمان تێ‌خستووە بۆ هەرکەس لە خەڵکی ئەم جیهانە کە لەوێ بێ، کە وڵاتی شامە.

(٧٢) ئیسحاقیشمان پێ‌بەخشیو یەعقووبیش بە زیادە بە کوڕەزاییو هەموویانمان کرد بە پیاوی چاك و بۆ خوا سوڵحاو.

وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِى رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٧٧﴾ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾



**(٧٣)** کردمانیشن بە پێشەوا بۆ ئادەمزادی دەوروبەریان، بە فەرمانی ئێمە ڕێی ڕاست بە خەڵکی پێشان بدەن و بە وەحی حاڵیمان کردن چاکە بکەن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن و ئەوانیش ئێمەیان ئەپەرست.

**(٧٤)** پێغەمبەرایەتیو زانستمان بە لووطیش بەخشیو ڕزگارمان کرد لەو گوندەی خەڵکەکەی کاری پیس و چەپەڵیان ئەکرد. ئەوانە گرۆهی کردەوەی خراپ بوون و فاسق بوون.

**(٧٥)** خستیشمانە ناو ڕەحمەت و میهرەبانیی خۆمانەوەو ئەو، واتە: لووط بەڕاستی لە پیاوچاکان بوو.

**(٧٦)** باسی نووحیش بکە کە بەر لەم پێغەمبەرانە هاواری کردە ئێمەو ئێمەیش خۆیو ماڵو منداڵیمان لەو بەڵا ناهەمواروو گەورەیە ڕزگارکرد، کە هاتبوە ڕێیان، کە یا تۆفانەکەیە یا خراپیو بەدکرداریی خێڵەکەیەتی.

**(٧٧)** یارمەتیشمان داو ڕزگارمان کرد لەو خێڵەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانابوو. ئەوانە خێڵێکی خراپ بوون، ئێمەیش هەموویانمان لە ئاوی تۆفانا خنکاندو نوقممان کردن.

**(٧٨)** باسی ئەوەی داوودو سولەیمانیش بکە کە خەریك بوون لەبارەی باخ و کشتوکاڵی موسڵمانێکەوە بڕیاریان ئەدا، مەڕوماڵاتی خێڵێکی تێچووبوو و خواردبووی و، ئێمەیش ئاگامان لە بڕیارەکەیان بوو کە خەریك بوو ئەیاندا لەو مەسەلەدا.

**(٧٩)** جا مەسەلەکەمان پیشانی سولەیماندا و تێمانگەیاندو زانینی چۆنیەتیی بڕیاردانی نێوان خەڵك و زانستیشمان تێکڕا بە هەردوکیان بەخشی و، کێوەکانمان ڕام کرد بۆ داوود تەسبیحاتیان لەگەڵی ئەکرد بۆ خواو، پەلەوەرەکانیشمان هەروا بۆ ڕامکرد ئەوانیش تەسبیحاتیان لەگەڵی ئەکردو ئێمە ئەم کارانەمان بۆ کرد.

**(٨٠)** فێریشمان کرد زرێو تاسکڵاوی جەنگیتان بۆ دروست بکا بۆ ئەوەی لە جەنگا بتانپارێزێ، جا ئایا ئێوە سوپاسی خوا ئەکەن بەرانبەر بەم نیعمەتە گەورەیە؟

**(٨١)** باسی سەختی بە گوژمیشمان ڕامکرد بۆ سولەیمان بە فەرمانی ئەو ئەچوو بۆ ئەو خاکەی بەرەکەتمان تێخستبوو چیی بویستایە بۆی ئەهێناو ئەبردو ئێمە ئاگامان لە هەموو شتێ هەبوو ئەمانزانی چیی ئەوێ.

وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَۖ وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾



(٨٢) لە دێویش ئەوانەیانمان بۆ ڕامکردبوو کە ئەچوونە بنی دەریاو دوڕو مەرجانیان بۆ دەرئەهێناو کاری تریشیان لەوە بەولاوە بۆ ئەکردو ئێمە ئاگاداریمان ئەکردن لە فەرمانی دەرنەچن.

(٨٣) یادی ئەییووبیش بکەرەوە لەو کاتەیا کە بانگی کردە خوا خۆیو هاواری لێ کرد وتی: خوایە من تووشی دەردو بەلا هاتووم‌و تۆیش لە هەموو میهرەبانێ میهرەبانتری.

(٨٤) ئێمەیش بەدەنگیەوە هاتین و چی ئێش و ئازاری پێوەبوو هەموومان لاداو بە ژمارەی منالە مردووەکانی منالمان دایەو ئەوەندەی تریش بە میهرەبانیی خۆمان بۆ ئەوەی ببێ بە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی خوای خۆیان ئەپەرستن.

(٨٥) یادی ئیسماعیل و ئیدریس و ذولکیفلیش بکەرەوە، ئەمانە هەموو لەوانە بوون سەبریان ئەکرد لەسەر دەردو مەینەت و خۆیان ڕائەگرت.

(٨٦) ئەمانەمان خستە ناو لێشاوی ڕەحمەتی خۆمانەوە، ئەمانە لە پیاوچاکان بوون.

(٨٧) باسی ذوننون واتە: یوونسیش بکە کاتێ کە بە تووڕەییەوە خێڵەکەی خۆی بەجێهێشت و سووسەیێ گومان کەوتبوە دڵیەوە گوایە هیچمان پێ ناکرێ دەرهەق خێڵەکەی. تا سەرەنجام لە تاریکەشەوێکایا لەناو دەریادا یا لەناو سکی ماسیدا گیری خواردبوو هاواری کرد، خوایە لە تۆ بەولاوە خوایەکی تر نی‌یە بەحەق بپەرسترێ، تۆ لە هەموو کەموکورتیو ناتەواوییەك پاکیو، منیش یەکێ بووم لەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردووە، دەی سا فریام کەوە.

(٨٨) ئێمەیش بەفریایەوە هاتین و لە خەم‌وخەفەت ڕزگارمان کردو هەر بەوجۆرەش خاوەن باوەڕەکان ڕزگار ئەکەین.

(٨٩) یادی زەکەریایش بکەرەوە ئەوکاتەی کە هاواری کردە خوای خۆی وتی: خودایە! بەتەنیام مەهێڵەوە بێ‌کەس و بێ‌دەر و، تۆ چاکترین کەسێکی بۆ ئینسان بمێنێتەوە.

(٩٠) ئێمەیش بەدەنگیەوە هاتین و دوعاکەمان لێ قبووڵ کردو یەحیامان پێ بەخشیو ژنەکەیمان بۆ چاککردو وامان لێ کرد سکوزا بکاو منالی ببێ، چونکە ئەم پێغەمبەرانەی ناومان هێنان مرۆڤی چاك بوون و دەستوبردیان ئەکرد بۆ کردنی چاکەو بەهیوای چاکەو لەترسی سزای دوارۆژ لێمان ئەپاڕانەوەو ملکەچی فەرمانمان بوون.

وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا
وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩١﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ
أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾
وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ﴿٩٣﴾
فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ
لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴿٩٤﴾ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ
أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٩٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ
يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾
وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا
ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوۡ كَانَ
هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةٗ مَّا وَرَدُوهَاۖ وَكُلّٞ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾
لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾



(٩١) یادی ئەو ئافرەتەیش بکە کە داوێنی خۆی پاراست لەوەی کەس دەستی بۆ بەرێ و، جا ئێمەیش لە ڕێگای فریشتەی خۆمانەوە کە(جوبریلە) فوومان پیدا کردو خۆیو کوڕەکەی کە عیسایە کردمانن بە نیشانەی گەورەییو دەسەڵاتی خۆمان بۆ هەموو جیهان.

(٩٢) بە پێغەمبەرەکانیشمان وت: ئەم ئایینانەی بە ئێوەدا ناردوومانن بۆ ئادەمزاد، هەموو یەك ئایینن کە ئایینی خوابەیەكزانینەو منیش خوای ئێوە هەمووتانم، کە واتە عیبادەتم بکەن و بمپەرستن.

(٩٣) کەچی ئەو خەڵکانەی پێغەمبەرەکانمان ناردبوونە سەریان ئایینەکەیان لە نێوان خۆیانا پارچە پارچە کردو هەریەکە بەلایەکا ڕۆیشتن و لەخوابەیەكزانین لایان دا، بەڵام سەرەنجام هەموو دێنەوە بەردەستمان و هەریەکە سزای بەحەقی خۆی وەردەگرێ.

(٩٤) جا هەرکەس کاری چاکی کردبیو باوەڕیشی بە خوای تاك و تەنیا بووبێ، کردەوەی چاکی پشتگوێ ناخریو ئێمە بۆی ئەنووسین و پاداشی چاکی لەسەر ئەو کردەوە چاکانەی ئەدەینەوە.

(٩٥) حەرامە لەسەر خەڵکی ئاوایییەك ئێمە ڕۆژێ لەبەر کافریو گوناهبارییان وێرانمان کردبێ، تازە پاشگەز ببنەوەو تۆبە بکەن یا بگەڕێنەوە بۆ دنیاو بژیێنەوە.

(٩٦) تا کاتێ کە ڕێگای یاجووج وماجووج ئەکرێتەوە، واتا تا ڕۆژی قیامەت دێو یاجووج و ماجووج لە هەموو ملەو بەرزایییەکەوە بەپەلە ئەکەونەڕێ، ئەو کاتە خەڵکی ئەو ئاوایییە وێرانکراوانەیش زیندوو ئەکرێنەوە.

(٩٧) زیندوو نابنەوە تا کاتێ کە گفتی ڕاست نزیك ئەبێتەوە کە هاتنی ڕۆژی قیامەتەو چاوی کافرەکان ئەبڵەق ئەبیو ئەڵێن: ئەی هاوار! ئێمە ئاگامان لەم ڕۆژە ئەبوو، ئێمە کەسانێکی ستەمکاربووین ستەممان لە خۆمان کرد.

(٩٨) ئەی کافرینە! ئێوە خۆتان و ئەو شەیتانانەی ئەیانپەرستن لەجیاتیی ئەوەی خوا بپەرستن هەمووتان چڵوچێوی سووتەمەنیی دۆزەخن و هەموو ئەڕۆنە ناو دۆزەخ.

(٩٩) ئەگەر ئەو بتانە خوا بوونایە نەئەچوونە دۆزەخەوە، کەچی هەموو بتەکان و بتپەرستەکانیش هەتاهەتایە هەر لە دۆزەخا ئەبن. (١٠٠) هاوار و نرکەو ناڵەیانە لە دۆزەخاو شتێکی تیا نابیسن دڵیان خۆش بکا.

(١٠١) ئەوانەیش کە لەلایەن ئێمەوە چاکەیان بۆ بڕیاردراوە کە بریتییە لە خواپەرستیو دەرنەچوون لە فەرمانی، ئەوانە لەو ئاگری دۆزەخە دوور خراونەتەوە.

لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَاغًا لِّقَوْمٍ عَابِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ آذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ وَإِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٩﴾ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ ﴿١١٠﴾ وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١١١﴾ قَالَ رَبِّ احْكُم بِالْحَقِّ وَرَبُّنَا الرَّحْمَٰنُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١٢﴾

(١٠٢) هەرگیز دەنگی نالەباری دۆزەخ نابیسن و هەتاتایە لە دڵخوازی خۆیانان.

(١٠٣) ترسی لە هەموو ترسیێ بەدتر کە ترسی مانەوەی هەمیشەیی بیێباوەڕانە لە دۆزەخدا زویرو دڵتەنگیان ناکاو فریشتە دێن بەدەمیانەوە پێشوازییان لیێئەکەن و پێیان ئەڵێن: ئەمە ئەو ڕۆژەی خۆتانە کە گفتتان ئەدرایێ پێی.

(١٠٤) ئەمەیش لەو ڕۆژەدا ئەبیێ کە ئاسمان ئەپێچینەوە وەك چۆن تۆماری نووسراو ئەپێچرێتەوە. ئێمە وەك چۆن دنیامان یەکەمجار دروستکرد هەروەها تازەیشی ئەکەینەوە. ئەمە وەعدەیەکە لەسەر شانمانو ئێمە هەرچیمان بویێ جیێ بەجێی ئەکەین.

(١٠٥) ئێمە بەڕاستی پاش تەورات، لە(زەبوردا)دا، نووسیومانە: بەهەشت یا ڕووی زەوی بۆ بەندە لەگەڵ خوای خۆ ڕاستو باشەکانم ئەمێنێتەوە، وەك چۆن میرات بۆ میراتگر ئەمێنێتەوە.

(١٠٦) بەڕاستی لەم ئایەتانەدا! ڕاگەیاندنیێ هەیە بۆ کەسانیێ کە خواپەرستن.

(١٠٧) ئەی محمد(د.خ)! تۆیشمان بە هیچ حاڵیێ نەناردووە بە ڕەحمەت و خێرو بەرەکەت نەبیێ بۆ هەموو ئەهلی جیهان بۆ فێرکردنی خواپەرستیو خوابەیەکزانین و فێری زانست و ڕەوشتێ چاك بوون.

(١٠٨) تۆ ئەی موحەممەد(د.خ)! بەو خەڵکە بڵیێ: من لە بابەتی یەکێتیی خواو هاوبەش بۆ دانەنانیەوە هەر ئەوەم یە وەحی بۆ دیێ کە خوای ئێوە تاقە یەك خوایەو هاوبەشی نی‌یە، دەی ئێوە مل بۆ ئەم ڕاستییە کەچ ئەکەن؟

(١٠٩) جا ئەگەر خەڵکەکە پشتیان لە ڕاستی هەڵکرد، تۆش پێیان بڵیێ: من ئێوەم وەك یەك ئاگادار کردەوە نایشزانم ئەوەی وەعدەتان پیێ دراوە ئەبیو دێتەدی کە ڕۆژی قیامەتە، نزیکە یا دوورە.

(١١٠) بەڕاستی خوا ئاگادارە لە هەرچی بە ئاشکرا ئەوتریو ئاگاداریشە لەوەی بەدزییەوە ئەیڵێن و ئەیشارنەوە.

(١١١) من نازانم، لەوانەیشە ئەوەی من پێتان ڕائەگەیەنم کە دواخستنی سزادانتانە تا ڕۆژی قیامەت بۆ تاقیکردنەوەتان بیو بۆ ئەوە بیێ تا ماوەیەك بۆ خۆتان ڕابوێرن.

(١١٢) موحەممەد(د.خ) وتی: خودایە! بڕیاری ڕاست بدە لە نێوان من و ئەم لەخوانەترسانەدا. هەرخوای میهرەبانی هەموولایەکمان پەنای ئەبرێتەبەرو داوای یارمەتیی لیێ ئەکریێ لە بارەی ئەو شتانەوە ئێوە باسیان ئەکەن.

سُورَةُ الحَجّ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَىٰ وَمَا هُم بِسُكَارَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَانٍ مَّرِيدٍ ﴿٣﴾ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُ يُضِلُّهُ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٤﴾ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِن بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا ۚ وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ ﴿٥﴾



## سووره‌تی (الحج)

**مه‌دینه‌یی‌یه ئایه‌ته‌كانی (٥٢-٥٥) ی نه‌بیّ و، (٧٨) ئایه‌ته**

(١) خه‌ڵكینه! له خوا بترسن، به‌ڕاستی بوومه‌له‌رزه‌ی زه‌وی كه له‌پێش قیامه‌تدا ڕووئه‌دا شتێكی گه‌وره‌و سامناكه.

(٢) ئه‌و ڕۆژه‌ی ئه‌و بوومه‌له‌رزه‌یه ئه‌بینن، هه‌رچی ئافره‌تی مناڵبه‌به‌ره كه شیر به منداڵه‌كه‌ی ئه‌دا، ئاگای له منداڵه شیره خۆره‌كه‌ی نامێنیّ و، هه‌رچی ئافره‌تی دووگیانه به‌راویته ئه‌بیّو، ئه‌بینی خه‌ڵك سه‌رخۆشن و له ڕاستییشدا سه‌رخۆش نین، به‌ڵام سزاكه‌ی خوا زۆر سه‌خته‌و له‌تاواندا خه‌ڵكه‌كه وایان لیّ به‌سه‌رهاتووه.

(٣) له‌ناو ئه‌م خه‌ڵكه‌دا كه‌سانێكی وا هه‌ن ئه‌كه‌ونه ده‌مه‌ده‌م له‌باره‌ی بوونی خواوه بیّ‌ئه‌وه‌ی هیچی لیّ بزانن و، شوێنی هه‌ر شه‌یتانێكی له‌خواعاسی ئه‌كه‌ون.

(٤) شه‌یتانێكی ئه‌وتۆ وای بۆ بڕیارداوه هه‌ركه‌س شوێنی بكه‌ویّ گومڕای ئه‌كاو ڕیّبه‌دێیی ئه‌كا بۆ ناو سزای دۆزه‌خ.

(٥) خه‌ڵكینه! ئه‌گه‌ر ئێوه گومانتان له زیندووبونه‌وه‌ی خۆتان له ڕۆژی قیامه‌تدا هه‌یه، چاری ئه‌و گومان و دوودڵییه‌تان به‌وه بكه‌ن وردببنه‌وه، من ئێوه‌م له گڵ دروست كردووه چونكه باوكه گه‌وره‌ی ئاده‌مزاد كه ئاده‌مه له گڵ دروست كراوه، له‌وه‌پاش له تۆوی باوك و دایكم دروست كردوون، ئه‌مجا له پارچه خوێنێكم دروست كردوون، ئه‌مجا له پارچه گۆشتێكم دروست كردوون، هه‌یه‌تی خراوه‌ته شێوه‌ی ئاده‌مزاده‌وه‌و هه‌یه‌تی نه‌خراوه‌ته شێوه‌ی ئاده‌مزاده‌وه، ئه‌مه‌تان بۆیه بۆ باس ئه‌كه‌م تا بزانن چۆنم دروست كردوون. ئێمه چیمان بویّ له كوڕو له كچ له منداڵدانی ئافره‌تدا دائه‌نێین تا واده‌ی دیاری كراوی خۆی، ئه‌مجا به منداڵیی له سكی دایكتان ئه‌هێنینه ده‌ره‌وه، ئه‌مجا په‌روه‌رده‌تان ئه‌كه‌ین بۆ ئه‌وه‌ی بگه‌نه هه‌ڕه‌تی هێزی له‌شتان. هێی وایشتان تیایه پێش ئه‌وه گیانی وه‌رئه‌گیرێته‌وه‌و ئه‌مریّ. هێی وایشتان تیایه ئه‌هێڵرێته‌وه تا ئه‌گه‌یه‌نرێته ته‌مه‌نیّ له هه‌موو ته‌مه‌نێكی له‌وه‌پێشتری لاوازترو بیّده‌سه‌ڵاتتر ئه‌بیّ، تا وای لیّدیّ پاش ئه‌و گشته شته‌ی زووتر زانیویه هیچ شتیّ نه‌زانیّ. ئه‌مه وه‌ك ئه‌وه وایه تۆ زه‌وی ئه‌بینی كشومات و وشك و بیّڕه‌ونه‌قه، جا كه بارانمان به‌سه‌ردا باراند ئه‌كه‌وێته جووڵه‌و هه‌ڵاوساو له هه‌موو جۆره گیاو گوڵێكی جوان له ناو خۆیدا ئه‌ڕوێنیّ.

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴿٨﴾ ثَانِىَ عِطْفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَنُذِيقُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٩﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٠﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةَ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدْعُوا۟ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦ لَبِئْسَ ٱلْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ ٱلْعَشِيرُ ﴿١٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾



(٦) ئەمە گشتی لەوەوەیەو لەبەر ئەوەیە خوا حەقەو ڕاستەو هەموو شتێکی لە دەستەڵاتدا هەیەو هەموو مردوویێ زیندووکاتەوەو توانی بەسەر هەموو شتێکدا ئەشکێ.

(٧) لەبەر ئەوەیشە کە ڕۆژی قیامەت بەڕاستی‌دیێو، خوا بەڕاستی هەموو ئەو مردووانەی لە گۆڕدان زیندوویان ئەکاتەوە.

(٨) کەسانی وا هەن ئەکەونە دەمەدەم لەبارەی بوونی خواوە بێ ئەوەی هیچ بزانن و کەسێ شارەزای کردبن و کتێبێکیان بەدەستەوە بێ بەرچاوو دڵیان ڕوون بکاتەوە.

(٩) سەرپێچی ئەکاو مل لائەدا لە وەرگرتنی ئامۆژگاریی پێغەمبەران، بۆ ئەوەی خەڵك لە ڕێی خوا لابداو گومڕایان بکا، ئەم جۆرە کەسانە لە دنیادا ڕیسوایی‌و سەرشۆڕییان بۆ هەیەو لە قیامەتیشا سزای ئاگری سۆزندەیان پێ ئەچێژین.

(١٠) پێیشی ئەوترێ ئەم سزایەت لەسەر ئەو کردەوانەت ئەدرێ کە کردووتن و، وەك دیاریی دەست لەپێش مردنتا حەواڵەی ئەو دنیات کردوون و خوایش هەرگیز ستەم لە بەندەکانی خۆی ناکات.

(١١) لەناو ئەم خەڵکەدا کەسانێکی وا هەن لەسەر لایێ واتە: بەمەرج خوا ئەپەرستن، ئەگەر خێریان هاتەڕێ پێیان خۆش ئەبی‌و دڵیان دائەمەزرێ. ئەگەر زیانیشیان پێ‌گەیشت بەسەر ڕوودا ئەکەون واتە: ئەکەونە شین و شەپۆڕو سوپاسی خوا ناکەن. ئەم جۆرە کەسانە دنیاو قیامەتیان لەکیس چووەو زیانی گەورەو ئاشکرایش ئەوەیە بنیادەم دنیاو قیامەتیشی بەجارێ لەدەست بچێ. مەبەست لەوەیە موسوڵمان لە خۆشییشی‌و لە ناخۆشیشیا هەر ڕازی بێ بە بەشی خواو شوکرانەبژێر بێ.

(١٢) بنیادەمی وا لەجیاتیی ئەوەی هەر لە خوا بپاڕێتەوەو ڕووی دەستی دوعای لەو بکا، لە شتێ ئەپاڕێتەوە نە زیانی پێ‌ئەگەیەنی‌و نە قازانج، واتە دەستەڵاتی هیچی نی‌یە وەك بت. گومڕاهیی دوور ڕۆیشتوو پاڕانەوەیە لەم جۆرە شتانە لەجیاتیی پاڕانەوە لە خوا.

(١٣) بەڵکو لەکەسێ ئەپاڕێتەوەو هاواری لێ ئەکا زیانی لە قازانجی نزیکترە. هاوارلێکراوی وا خراپ یارمەتیدەرێکەو خراپ هاوڕێیەکە.

(١٤) ئەوکەسانەی ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەرانی خوا هێناوە، خوا ئەیانخاتە ناو بەهەشتی وا جۆگەو ئاو بەژێریانا ئەڕوا، بەڕاستی خوا ئارەزووی لە هەرچی ببێ ئەیکا.

(١٥) ئەو کەسەی گومانی وایە کە خوا لە دنیاو لە قیامەتا یارمەتیی پێغەمبەری خۆی نادا، با لەداخانا پەتێ لە ئاسمانی، واتە: لە بنەبانی، ماڵەکەی خۆیەوە، هەڵخاو شۆڕی‌کاتەوە بۆخوارەوەو لە گەردنی خۆیی بئاڵێنێ‌و پاشان پەتەکە بەخۆیەوە بەرداتەوە تا بخنکێ، ئاخۆ ئەو کارەی کردی لەوانەیە ڕق و کینەو توڕەییەکەی دامرکێنێ‌و دوایی پێ بێنێ؟.

وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ ۞ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾



(١٦) ئێمە هەر بەم جۆرە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە کە حاڵی وایە کۆمەڵێ ئایەتی ڕۆشنەو، خوای تەعالا هەرکەسی ئارەزوو لێ بێ هیدایەتی ئەداو ئەیخاتە سەر ڕێی ڕاست.

(١٧) ئەوانەی ئیمانیان بە خواو پێغەمبەرانی خوا هێناوەو ئەوانەی ئایینی جوولەکەیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووەو سابیئییەکان و گاورە (مەسیحی )ەکان و مەجووسە (زەردەشتی) یەکان و ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دائەنێن، خوا خۆی لە ڕۆژی قیامەتا چاك و خراپیان لە یەك جوێ ئەکاتەوەو، خوا خۆی ئاگای لە هەموو شتێ هەیە.

(١٨) ئایا تۆ نابینی یاخود نازانی کەوا خوای تەعالا هەرچی لە ئاسمانەکان و لەزەویدا هەیە سوجدەی بۆ ئەبەن و بە گەورەی ئەزانن و، هەروەها خۆر و مانگ و ئەستێرەو کێوەکان و درەخت و ئەو گیاندارانەی بەسەر زەویدا ئەڕۆن و زۆر لە ئادەمزادیش سوجدەی بۆ ئەبەن و، زۆریتریش لە ئادەمزاد کەناپەرستن و سوجدەی بۆ نابەن لەبەر ئەو بێدینییەیان سزادانیان پێویست بووەو، ئەوەیش خوا سووکی بکا کەس ناتوانێ بیکا بە خاوەن قەدر. خوا هەرچی مەیلی لێ بێ ئەیکا.

(١٩) ئەم دوو دەستەو تاقمە کە کافرو موسوڵمانن لەبارەی خواوە دوژمنی یەکن و هەرایانە: کافرەکان هاوبەشی بۆ دائەنێن و بتەکانیان ئەکەن بە هاوبەشیو موسڵمانەکانیش ئەڵێن: کەسی هاوبەش نییە. ئەوانەی کە کافرن جلی لەئاگر دروست کراویان بە باڵا بڕاوە لە دۆزەخدا ئەکرێتە بەریانو ئاوی کوڵ بەکوڵ یان بەسەردا ئەکرێ.

(٢٠) هەرچی لە ناو سکیانایەو پێستەکەی بەریشیان بەو ئاوە کوڵ بەکوڵە ئەتوێنرێتەوە.

(٢١) گورزی ئاسنیشیان بۆهەیە بۆ سزادانیان، بەدەست مەئموورى سزادانیانەوەن.

(٢٢) هەرچەند بییانەوێ لەبەر ناڕەحەتیو داخ و خەفەتی دڵیان لەو ئاگرە دەرچن، ئەگەڕێنرێنەوە بۆ ناویو پێیان ئەوترێ: دە بخۆن ئاگری لەشسوتێن بچێژن.

(٢٣) بەڕاستی خوا ئەوانەی کە ئیمانیان پێ هێناوەو کرداری چاکەیان کردووە ئەیانخاتە ناو بەهەشتگەلی واوە جۆگەئاو بەژێریانا ئەڕواو، لەو بەهەشتگەلەدا بە بازنی زێڕین و بە مرواری جوان ئەکرێن و ئەڕازێنرێنەوەو بەرگیان لە بەهەشتدا ئاوریشمە.

وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ٱلَّذِي جَعَلۡنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِۚ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٢٥﴾ وَإِذۡ بَوَّأۡنَا لِإِبۡرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلۡبَيۡتِ أَن لَّا تُشۡرِكۡ بِي شَيۡـٔٗا وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلۡقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴿٢٧﴾ لِّيَشۡهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمۡ وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لۡيَقۡضُواْ تَفَثَهُمۡ وَلۡيُوفُواْ نُذُورَهُمۡ وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦۗ وَأُحِلَّتۡ لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾



(٢٤) ئەمانە کە لە دنیادا بوون خراونەتە سەر ڕێی قسەی پاك و چاك کە خوابەیەکزانین و سوپاسکردنیەتیو خراونەتە سەر ڕێگایەك کە ئەنجامەکەی باشە کە چوونە بەهەشتەو، ئەو ڕێگایەیش ڕێگای باوەڕکردنە بە خوا.

(٢٥) بەڕاستی ئەوکەسانەی کە کافرن و ڕێگا لەخەڵك ئەگرن لەوەی ڕێگای خوا بگرنە بەر کە ئایینی ئیسلامەو ناهێڵن بڕۆن لە مزگەوتی حەرامی مەککەدا خواپەرستی بکەن کە چون یەکە چ بۆ ئەوانەی تێیدا نیشتەجێن و چ بۆ ئەوانەی تێیدا بەڕێگوزەر ڕێیان تێی ئەکەوێ، ئەوانە سزای سەخت ئەچێژن. هەرکەسیش ئارەزووی لەوە بێ بەهۆی ستەمکاریی خۆیەوە لە ڕێگای ئاین لابدا سزایەکی سەختی پڕئازاری پێ ئەچێژین.

(٢٦) یادی ئەوە بکەرەوە کە جێگای مزگەوتی حەرامی مەککەمان بۆ ئیبراهیم دەستنیشان کردو پێمان وت: ئەکەی هاوبەش بۆ خوا دابنێیو ماڵەکەم پاك بکەرەوە بۆ ئەوانەی دێن زیارەتی ئەکەن و بە دەوریا ئەسووڕێنەوەو بۆ ئەوانەی لەوێ دانیشتوون و خوای تێدا ئەپەرستن و بۆ ئەوانەی نوێژی تێدا ئەکەن و ڕکووع و سوجدەی تێدا ئەبەن.

(٢٧) جاڕبدە بە ناو خەڵکدا بێن بۆ حەج ئەوانیش دێن بۆ لات بەپیادەو بەسەر پشتی هەموو وشترێکی لاوازەوە. و لە هەموو ڕێگایەکی دوورەوە.

(٢٨) بۆ ئەوەی حازری هەندێ سوودو قازانجی خۆیان بن و لە چەند ڕۆژێکدا کە ڕۆژانی حەجن ناوی خودا ببەن و زیکری بکەن بەرانبەر بەو ڕزق و ڕۆزییو مەڕو ماڵاتو وشترو گاو مانگایەی پێی داون، دە خۆیشتان لێیان بخۆن و خۆراکی کەسانی نەداری هەژاریشی لێ بدەن.

(٢٩) پاشان با بە بەرسمێڵکردن و نینۆككردن و تووکی بن باڵهەڵکێشان و شتی وا کە لە قۆناغی یەکەمدا حەرامن و پاشان حەڵاڵ ئەبنەوە، چڵك و چەپەڵیی خۆیان لابەرن و چییان لەسەر خۆیان نەزرکردووە بەجێی بێنن و بە دەورو خولی کۆنە ماڵی خوادا بگەڕێن.

(٣٠) ئەمە وەربگرن فەرمانی خوایەو هەرکەس ئەو شتانەی خوا حورمەتی لێ گرتوون وەك (حەڵاڵو حەرام)، بە گەورەیان بگرێ، ئەوە باشترین شتە بۆی لای خوای خۆی. بزن و مەڕ و وشتر و ڕەشەوڵاخیشتان بۆ حەڵاڵ کراوە ئەوانەیان نەبێ باسی حەرامییانتان بەسەردا خوێنراوەتەوە وەك مردارەوەبوویان ئەوانەیان لە کاتی سەربڕینیاندا ناوی غەیری خوایان بۆ هێنرابێ. کەواتە خۆتان لە پیسیی بت و لە قسەی درۆ بپارێزن.

حُنَفَاءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ۖ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ ۖ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾



(٣١) حاڵتان وابێ لە بێباوەڕییەوە لابدەن بۆ باوەڕداری، بۆ ڕەزامەندیی خوا. هاوبەشیش قەرار مەدەن بۆ خوا. هەرکەس هاوبەش قەرار بدا بۆ خوا وەك ئەوە وایە لە ئاسمانەوە بەربیێتەخوارەوەو پەلەوەر بێنە سەر کەلاکەکەیو گۆشتەکەی بفڕێنن و بیخۆن، یاخود وەك کەسێك وایە بایەکی توند هەڵکاو بیبا فڕێی بداتە شوێنێکی دووری وا کەس پێی نەزانێ. مەبەست لەوەیە ئەو کەسە کابرایەکی بێ سەرو شوێنە.

(٣٢) مەسەلە ئەوەیە کە وتمان و، هەرکەسیش ئادابی خواپەرستی بە گەورە بگرێو لێی لانەدا ئەوە ئەو ڕەوشتەی ڕەوشتی ئەوانەیە بە دڵ لە گوناهو خراپە پارێزکەن.

(٣٣) ئەو چوارپێیانەی باسمان کردن هەندێ قازانجیان تا ماوەیەکی دیاریکراو بۆ ئێوە تیایە وەکو شیرو کوڵك و موو و خوریو سواربوونیان و بەچکەکانیان تا کاتی سەربڕینیان دێو پاشان سەرەنجام ئەهێنرێنە ماڵی کۆنی خوا کە مزگەوتی حەرامی مەککەیە لەوێ سەرئەبڕێن و گۆشتەکەیان ئەبەخشرێتەوە.

(٣٤) بۆ هەر میللەتێ سەر بە هەر ئایینێ بێ جۆرە قوربانیدانێکمان بڕیار داوە تا ناوی خوا لەسەر ئەو قوربانییەیان بێنن بەرانبەر بەوەی ئەو حوشتر و ڕەشەوڵاخ و ئاژەڵەمان پێ بەخشیون. دەی خوای ئێوە تاقە یەك خوایە، فەرمانبەرداری بکەن و ملی بۆ کەچ بکەن و مژدە بەو کەسانەیش بدە کە خۆیان بە کەم ئەزانن و فیزو دەعیە ناکەن.

(٣٥) ئەوانەی کە ناوی خوا ببرێ لایاندا دڵیان دێتە لەرزە لە ترسانا، هەر موسیبەتێکیان تووش ببێ خۆیان لەبەرامبەردا ڕائەگرن و، نوێژەکانیان ئەکەن و ئەو داراییەی پێمان بەخشیون لە ڕێی خوادا لێی خەرج ئەکەن.

(٣٦) ئەو وشترانەی ئەیانبەن بۆ مەککە تا لە حەجدا سەریان ببڕن، بۆمان کردوون بە بەشێ لە نیشانەکانی خواپەرستی. خێرو بەرەکەت بۆ ئێوە هەیە لەو وشترانەدا وەك شیرو بەروبومەکانیو سواربوونیان و گۆشت و موو. کەواتە لە کاتی سەربڕینیاندا کە قنج لەسەر چوارپەلیان ڕاوەستاون ناوی خوا بهێنن. جا کاتێ کە تەنیشتیان کەوتە سەر زەوی واتە سەربڕان و مردن، لە گۆشتەکەیان بخۆن و بەشی هەژاری قنیاتکار و داواکەریشی لێ بدەن. ئێمە ئاوا ئەو حەیوانی قوربانییانەمان بۆ وا لێکردوون مل بدەن بۆتان سەریان ببڕن، بەڵکو ئەمە خوایە سوپاسی ئەم نیعمەتانەی ئێمە بکەن.

(٣٧) گۆشت و خوێنی ئەو قوربانییانە ناگا بە خواو خوا ئەوەی لە ئێوە ناوێ، بەڵام ئەگەر فەرمانبەرداریی خوا بکەن و خۆتان لە بێفەرمانیی ئەو بپارێزن ئەوە لای ئەو پەسەندو قوبووڵە. خوا ئەو حەیوانی قوربانییانەی بۆ ئێوە ئاوا لێ‌کردوون ملتان بۆبدەن بۆ سەربڕینیان، بۆئەوەی لە کاتی سەربڕینیاندا (الله أكبر) بکەن کەوا ڕێگای موسڵمانەتیی پیشان داون و، مژدە بدەن بە پیاوچاکان و چاکەکاران. ئەڵێن: بتپەرستانی مەککە کە قوربانییان ئەکرد خوێنەکەیان ئەدا لە دیواری کەعبە گوایە ئەوە بۆ خوایە. ئایەتەکە بەرپەرچی ئەو کردارەی بتپەرستەکان ئەداتەوە.

(٣٨) بەڕاستی خوا داکۆکی ئەکا لەو کەسانەی باوەڕیان پێ کردووە. خوا کەسانی خائین و کافری خۆش ناوێ کە لەگەڵ خوا ئەمین نەبن و بت بپەرستن.

أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْاْ عَنِ ٱلْمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَٰبُ مَدْيَنَۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾



(٣٩) خـــوا ڕوخســـەتی داوە بـــەو موســـوڵمانانەی کـە کافرەکـان جـەنگیان لەگـەڵ ئەکـەن، ڕوخسـەتی وەڵامدانـەوەو شەڕکردنی لەگەڵیان داوە چونکە ستەمیان لێ کـراوەو، خـوا تـوانی ئـەوەی هەیـە یارمەتییان بـداو سەریان بخا بەسـەر ئـەو کافرانەدا.

(٤٠) ئەوانەی بەناحەق لەسەر ماڵو حاڵی خۆیان دەرکراون تەنها لەبەر ئەوەی ئـەڵێن پـەروەردگاری تـاك و تـەنیای ئێمـە زاتـی خوایـە. ئەگـەر خـوا هەنـدێ کەسـی بـە هەندێ کەسی تر لـەناو نەبردایـە، چـەندین پەرسـتگای ڕەبەنـەکان و چـەند کڵێسـەی گاوران و چەند کەنشـتی جوولەکـەو چـەند مزگـەوتی موسـوڵمانان کـاول ئـەبوون کـە هـەموو نـاوی خوایـان تێـدا ئـەهێنرێ. بەڕاستی خوا یارمەتی هەرکەسێ ئەدا کـە ئەویش یارمەتیی ئاینیی خوا بـدات. خـوا بەهێزە، ئـەتوانێ یارمـەتیی ئـەو کەسـانە بدات و هیچ شتێ ڕێی لێ ناگرێ.

(٤١) ئەو لە ماڵی خۆدەرکراوانەی ئەگـەر ئێمە جێگیریان بکـەین و دایانمـەزرێنین لـە ئـەرزدا نوێـژ ئەکـەن و زەکـات ئـەدەن و فەرمان بە چـاکە ئـەدەن و نـەهی لەخراپـە ئەکەن و، ئەنجامی هەر کارێکیش هەر بۆ خوا ئەگەڕێتەوە.

(٤٢) ئەگەر ئەم کافرانە باوەڕ بە تۆ نەکەن و بە درۆزنت دانێن، تـۆ تاقـە پێغەمبـەر نیت خێڵەکـەی بـە درۆزنیان دانابێ. بەر لە تۆیش خێڵەکەی نووح پێغەمبەر و خێڵەکەی عادو سەموودیش، پێغەمبەری خۆیانیان بە درۆزن ئەدایە قەڵەم.

(٤٣) هەروا خێڵەکەی ئیبراهیم پێغەمبەر و خێڵی لووط پێغەمبەریش، پێغەمبەری خۆیانیان بە درۆزن ئەدایە قەڵەم.

(٤٤) ئەهلی مەدیەنیش کە شوعەیب پێغەمبەریان هاتەسەر، شوعەیبی پێغەمبەری خۆیانیان بە درۆزن دانا، مووسا پێغەمبەریش هەر لەلایەن فیرعەون و قیبتییەکانەوە بە درۆزن دانرا. منـیش جڵـەوم بـۆ کافرەکـان شـۆڕ کـرد لەسـەر کافریی خۆیان بەردەوام بن تا وادەی خۆیان هات، جا چۆن بوو لێتێکدانم بۆیان و بە چ دەردێکم بردن؟

(٤٥) گەلێ ئاوەدانیمان وێران و کاول کرد لەحاڵێکا کە دانیشـتووانیان سـتەمکار بـوون و، ئێستا ئـەو ئاوەدانییانە بەسەر بنچینەکانیانا کەوتوون و داتەپیون و، زۆر بـیری ئـاو هـەن ئێسـتا پـەکیان کـەوتووەو کـوێر بوونەتـەوە و زۆر کۆشکی دروست کراو هەن ئێستا تاقە کەسێکیشمان تێیاندا نەهێشتووە.

(٤٦) ئایا ئەمانە بەسەر ئەرزا نەڕۆیشتوون تا دڵێکی وایان ببێ بە هۆی ئەو دڵەوە عەقڵیان ببێو بزانن ئـەبێ چی بکەن کە خوا بەتاك و تەنیا زانینە، گوێیەکی وایان ببێ شتی پێ ببیسن و بزانن ئەبێ ئادەمزاد گـوێ بـۆ چـی شل بکات؟ چونکە تەنها دیتن بە چاو بەس نییە، وا ئەبێ چاو کـوێر نـەبینێ بـەڵام سوودیشـی نی‌یـە چـونکە دڵ کـە لـە سنگدایە ئەو کوێر ئەبێ.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ ۚ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٨﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِىٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾



(٤٧) ئەو کافرانە پەلەپەلت لێ ئەکەن بۆ ئەوەی عەزابی خوایان بەسەردا بێ و، خوایش هەرگیز پێچەوانەی وەعدەی خۆی ناجوولێنێتەوەو عەزابییان هەر ئەداو شتەکە پەلەپەلی ناوێ و، یەك ڕۆژی خوایی وەك هەزار ساڵ وایە لەو ساڵانەی ئێوە ئەیانژمێرن.

(٤٨) گەلێ ئاوەدانی هەبوون خەڵکەکانیان ستەمکار بوون، مۆڵەتم دان تا کاتی خۆیان هات، پاشان سزام دان و سەرەنجامی هەر شتێ هەر بۆ لای خۆمە.

(٤٩) تۆ ئەی محمد(د.خ) بەم خەڵکە بڵێ: خەڵکینە! من هەر پێغەمبەرێکم بەئاشکرا ئەتانترسێنم لە سزای خوا بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بکەن و ڕێگەی چاکە بگرنەبەر.

(٥٠) پاش ئەوەی من ترسی سزای خوام نانەبەر، ئەوانەی باوەڕ بە خوای خۆیان ئەکەن و باش ئەجوولێنەوەو چاکە ئەکەن، خوا لە گوناهیان خۆش ئەبێو ڕۆزییەکی دەست بڵاوانەیان ئەداتێ کە بەهەشت و نازو نیعمەتی بەهەشتە.

(٥١) ئەوانەیش کە هەوڵ ئەدەن بۆ بەرپەرچدانەوەی ئایەتەکانی ئێمەو ئەکەونە پێشبڕکێ بۆ نارەحەتکردنمان، ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن.

(٥٢) ئێمە، بەر لە تۆ، هیچ پێغەمبەرێکی خاوەن کتێب و بێ کتێبمان نەناردووە بۆسەر خەڵك ئیللا وا بووە کەهەرچەند ئارەزووی شتێکی کردبێ کە بە دڵیا هاتبێ شەیتان بە وەسوەسە هەندێ شتی ناموناسبی خستووەتە دڵیەوە، جا خوا ئەو شتانەی لە دڵی داشۆردووە کە شەیتان بە وەسوەسە خستبوونیە دڵیەوە، پاش ئەوە خوا ئایەتەکانی خۆی لە دڵی ئەو پێغەمبەرەدا ئەچەسپێنێ کە داوای لێ ئەکەن هەر بیر لە خواو لە ڕۆژی قیامەت بکاتەوەو، خوا زاناو خاوەن حیکمەتە.

(٥٣) خوا بۆیە دەرفەتی شەیتان ئەدا ئەو وەسوەسەیە بخاتە دڵی ئەو پێغەمبەرانەوە تا ئەو شتەی خراوەتە دڵیانەوە بکا بە مایەی تاقیکردنەوە بۆ منافقە دوودڵەکان و بتپەرستە دڵڕەقەکان. بەڕاستی ئەم دوو تاقمە ستەمکارە لە خراپەیەکی دوور لەڕاستییەوە دان.

(٥٤) هەروا تا ئەو کەسانەیش کە زانیارییان دراوەتێ بزانن ئەم قورئانە ڕاستەو لە خوای تۆوە هاتووەو ئیمانی پێ بهێنن و لە ئەنجامی ئەو ئیمانەیاندا دڵیان لێی بترسێ. بەڕاستی خوا ڕێ بەدێیی ئەو کەسانە ئەکا کە باوەڕیان پێی هێناوەو ئەیانخاتە سەر ڕێیەکی ڕاست کە وردبوونەوەیەکی ئەوتۆیە بیانگەیەنێتە ئامانجێکی ڕاست و دروست.

(٥٥) ئەو کەسانەیش کە کافرن، هەمیشە گومان و دوودڵییان لە ڕاستیی قورئانا هەیە تا قیامەتیان لەپڕ دێ بەسەردا یاخود سزای ڕۆژێکی بێ خێر و بەرەکەت دێ بۆیان.

ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴿٥٩﴾ ۞ ذَٰلِكَۖ وَمَنۡ عَاقَبَ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ﴿٦٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصۡبِحُ ٱلۡأَرۡضُ مُخۡضَرَّةًۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٦٤﴾



(٥٦) فەرمان و فەرمانڕەوایی لەو ڕۆژەدا بۆ زاتی خوایەو ئەو بڕیار ئەدا لەناو ئەو خەڵكەدا. جا ئەو كەسانەی باوەڕیان بە خوا هێناوەو كردەوەی چاكیان كردووە لە بەهەشتی پڕ نازو نیعمەتدان.

(٥٧) ئەو كەسانەیش كە كافرن و نایەتەكانی ئێمە بە درۆ ئەزانن، ئەوانە سزایەكیان بۆ هەیە سووك و ڕەزیل و سەفیلیان ئەكا.

(٥٨) ئەو كەسانەیش كە لە ڕێگەی خوادا كۆچیان لە وڵاتی خۆیان كردو پاشان كوژران یا بە مردن مردن، ئەوانە بەڕاستی خوا لە قیامەتدا ڕۆزییەكی جوانیان ئەداتێ لە بەهەشتا. خوا چاكترینی هەموو ڕۆزیدەرانە.

(٥٩) ئەیانخاتە شوێنێكەوە پێی ڕازی بن، خودا بەڕاستی زاناو بەحیلم و حەوسەڵەیە.

(٦٠) ئەمە شتێكی ڕاستەو هەركەسێ سزای یەكێ بدا بەوجۆرەی كە ئەو سزای ئەمی داوە پاشان دەستدرێژی بكرێتە سەر، خوا یارمەتیی ئەدا. خوا بەڕاستی تاوانپۆش و لێبووردووە.

(٦١) ئەمە لە بەر ئەوەیە كە بەڕاستی خوا توانایەو هەموو شتێكی پێ ئەكرێو شەو ئەبا بەناو ڕۆژداو ڕۆژ ئەبا بەناو شەودا، واتە ئەیانگەیەنێ بە یەك و لە یەكێكیان زیاد ئەكاو لە یەكێكیان كەم ئەكا و، خوا بەڕاستی شنەواو بینندەیە هەموو شتێ ئەبیستێو هەموو شتێ ئەبینێ.

(٦٢) ئەمە لەبەر ئەوەیە كە بەڕاستی خوا هەر خۆی ڕاستەو، ئەو شتانەی ئەوان هاواریان ئەكەنێ هەر ئەوان هیچوپووچن و، بەڕاستی هەر خوا بەرزو بڵندەو گەورەیە.

(٦٣) ئایا تۆ نابینی خوا ئاو لە ئاسمانەوە دائەكاو پاش ئەوە زەوی سەوز هەڵئەگەڕێ. خوا ناسكە، زانستی بە هەموو شتێكا ئەگاو لە هەموو شتێكی نهێنیو ئاشكرا شارەزایە.

(٦٤) هەرچی لە زەوییو لە ئاسمانەكانایە هەمووی هیی ئەوەو، بەڕاستی خوا هەر خۆی دەوڵەمەندو ئیحتیاجی بە هیچو بە كەس نییەو هەر خۆی ستایش كراوە.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِى ٱلْأَمْرِ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾



(٦٥) ئایا تۆ نابینی خوا هەرچی لە زەویدا هەیەو پاپۆڕەکانیشی بۆ ئێوە ڕام کردووە کە بە فەرمانی ئەو بەناو دەریادا ئەڕۆن و، ئاسمانەکانی ڕاگرتووەو ناهێڵێ بکەونە خوارەوە بەسەر زەویدا مەگەر بە ڕەزامەندیو ڕێگادانی ئەو. بەڕاستی خوای گەورە بەزەیی بە خەڵکدا دێتەوەو ڕەحمیان پێ ئەکا.

(٦٦) خوا ئەو خوایە ئێوەی دروست کردووەو زیندووی کردوون و لەپاشا ئەتانمرێنیو پاشتر زیندووتان ئەکاتەوە. بەڕاستی ئادەمزاد بەرانبەر بە نیعمەتی خوا سپڵەو ناسوپاسە.

(٦٧) بۆ شوێنکەوتووانی هەر ئایینێ بەر لە ئێوە پەرستگایەکمان دانابوو خوایان تیا ئەپەرست، بۆ شوێنکەوتووانی هەر ئایینێ جۆرە پەرستنێکمان دانابوو خوایان بەوجۆرە ئەپەرست، کەواتە ئیتر با شوێنکەوتووانی ئایینەکانی تر لەگەڵ تۆ نەکەونە هەرا لەکاروباری ئایینا چونکە مەسەلەی ئایینی تۆ لەوە دیاریترە هەرا هەڵبگرێ و، تۆخەڵك بانگ بکە بۆ لای خوا، تۆ بەڕاستی لەسەر ڕێگای ڕاستی هیدایەت و خواناسییت.

(٦٨) جا ئەگەر کەوتنە موجادەلە لەگەڵتا پێیان بڵێ: خوا لە هەموو کەس چاکتر ئەزانێ ئێوە چی ئەکەن.

(٦٩) خودا حوکم ئەدا لە نێوانتانا لە ڕۆژی قیامەتا لەو شتانەدا کە قسەتان یەك ناکەوێ تیایانداو هەرلایێ بەجۆرێ بۆی ئەچن.

(٧٠) ئایا تۆ نەتزانیوە کەوا بەڕاستی خوا ئەزانێ چی لە ئاسمانو لە ئەرزدا هەیە، هەموو ئەو شتانە لە (لوح المحفوظ)دا نووسراون ئەمە بەڕاستی بۆ خوا ئاسانە.

(٧١) ئەم کافرانە لە جیاتیی ئەوەی خوا بپەرستن شتگەلێ ئەپەرستن خوا بەڵگەیەکی نەناردووە کە ڕاستن و شایانی پەرستنن و، شتی وا ئەپەرستن خۆیان نازانن چین. ئەمانە ستەم لە خۆیان ئەکەن و ستەمکاریش هیچ یارمەتیدەرێکی نی‌یە.

(٧٢) کە ئایەتە ڕوون و ئاشکراکانی ئێمەیان بەسەرا ئەخوێنرێنەوە لە ناوچاوانی کافرەکانا ئینکار و مل نەدان بەدی ئەکرێ چونکە ڕقێکی زۆریان لە ڕاستی لە دڵایە، لەوانەیە پەلاماری ئەو موسوڵمانانە بدەن کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەرا ئەخوێننەوە. تۆ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: هەواڵی شتێکی لەو ڕق و توڕەیی خۆتانە خراپترتان بدەمێ؟ ئەو شتە ئاگری دۆزەخە کە خوا وەعدەی پێ داوە بە کافران و ئاگری دۆزەخ ئەنجامێکی بەدە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ
تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ
وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ
ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ
ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ
رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ
مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱرْكَعُوا۟ وَٱسْجُدُوا۟ وَٱعْبُدُوا۟
رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُوا۟ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾
وَجَٰهِدُوا۟ فِى ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ
عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ
ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ
وَتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ۚ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ
وَٱعْتَصِمُوا۟ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾

## سُورَةُ المُؤْمِنُونَ

مكية — ٢٣ — آياتها ١١٨



(٧٣) خەڵكینە! پەنێك هێنراوەتەوە گوێی بۆ شل كەن. بەڕاستی ئەو بتانەی ئێوە هاواریان لیٚ‌ئەكەن و هاوار لە خوا ناكەن ئەگەر هەموویشیان خڕببنەوە مێشێ دروست بكەن ئەو مێشەیان پیٚ دروست ناكریٚ. تەنانەت ئەگەر مێش شتێكیان لیٚ زەوت بكا هەرگیز ناتوانن لێی بسێننەوە. زۆر لاوازو بیٚ كارەیە ئەو كەسەی داوای هاتنەدیی مرازی خۆی لە بت ئەكا و، زۆریش لاوازو بیٚ كارەیە ئەو بتەی داوای هێنانەدی مرازی لیٚ ئەكریٚ !.

(٧٤) ئەم كافرە هاوبەش بۆخوادانەرانە خوایان وا نەناسیوە كە پێویستە بیناسن. خوا زۆر بەهێزەو بەسەر هەموو شتێكا زاڵە.

(٧٥) خوا لەناو فریشتەكانا چەند فروستادەییٚ بۆ لای پێغەمبەران هەڵئەبژێریٚ. لەناو خەڵكیشا چەند فروستادەییٚ بۆ لای خەڵك هەڵئەبژێریٚ كە پێغەمبەرانن ئەیاننێرێتە سەر ئادەمزاد. خوا بەڕاستی گوێی لە هەموو شتێكەو هەموو شتیٚ بەدی ئەكا.

(٧٦) هەموو ئەو شتانە ئەزانیٚ كە ئەو خەڵكە لەمەوپێش كردوویانن و لەمەوپاش ئەیانكەن. هەرچی كارێكیش هەیە هەمووی بۆ لای خوا خۆی ئەگەڕێتەوەو هەمووی بەدەستی ئەوە.

(٧٧) ئەی ئەو كەسانەی ئیمانتان بە خواو بە پێغەمبەر هێناوە ڕوكوع و سوجدە بەرن بۆ خواو خوای خۆتان بپەرستن چاكە بكەن بەڵكو ڕزگاربن لە سزای دۆزەخ.

(٧٨) غەزا بكەن و تێبكۆشن لە ڕێگەی خوادا بەرانبەر بە دوژمنانی دینی خوا بە غەزاو تێكۆشانێكی ڕاستەقینە ئەو خۆی ئێوەی هەڵبژاردووە بۆ ئەم ئەركەو، كارێكی لە ئایینا پێویست نەكردووە لەسەرتان كە ناڕەحەتتان بكاو نەتوانن بیكەن. ئەم ئایینی خوابەیەكزانینە ئایینی ئیبراهیمی باوكتانە ( كە باوكە گەورەی پێغەمبەری خۆتانەو وەك باوكە گەورەی خۆتان وایە ). ئیبراهیم ناوی ئێوەی ناوە موسوڵمان بەر لەوەی قورئان ئەم ناوەتان لیٚ بنیٚ و لەم قورئانەیشدا كە خوا ناردوویە بۆ سەر پێغەمبەری خۆی هەر بە موسوڵمان ناوبراون. بۆ ئەوەیش ناونراون موسوڵمان تا پێغەمبەر ببیٚ بە شایەت بۆتان كە ئایینی خوای پیٚ گەیاندوون و، ئێوەیش، ئەی موسوڵمانان شایەت بن بەسەر خەڵكی ترەوە كەئێوەش ئەو ئایینەتان گەیاندووە بە خەڵكی تر، كەواتە نوێژ بكەن و زەكات بدەن و لە هەموو كاروبارێكتاندا خوا بكەن بە پشت و پەنای خۆتان، ئەو گەورەو یارمەتیدەرتانە لە هەموو كاروبارێكدا. ئەو باشترین گەورەو باشترین یارمەتیدەری ئادەمزادە.

## سوورەتی (المؤمنون)

**مەککەیی‌یەو (١١٨) ئایەتە**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ﴿٤﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١١﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافِلِينَ ﴿١٧﴾



(١) بەڕاستی خاوەن باوەڕەکان ڕزگاریان بووە.

(٢) ئەو خاوەن باوەڕانەی کە لە نوێژەکانیانا لەخواترس و ئارامن.

(٣) کە لە گوتارو کرداری بێ‌سوودیش خۆیان لائەدەن.

(٤) کە زەکاتی ماڵی خۆیشیان دەرئەکەن.

(٥) کە عەورەتی بەرودوای خۆیشیان ئەپارێزن.

(٦) تەنها بۆ هاوسەری شەرعیی خۆیان یان کەنیزەکیان نەبێ کە بەگوێرەی شەرع بووبن بە هیی ئەوان، بەڕاستی ئەوانە لۆمەیان ناکرێ ئەگەر بچنە لای ئەو جۆرەکەسانە.

(٧) دەی کەسانێ بەدوای لەو دوو ڕێگا شەرعییەی پێوەندی نێوان پیاوو ئافرەت بەولاوە بکەون، ئەوانە یەجگار زۆر دەسدرێژییان کردووە.

(٨) هەروەها ئەو موسوڵمانانە ڕزگار بوون کە ئەگەر ئەمانەتێکیان لا دانرابێ‌و گفت و پەیمانێکیان دابێ ئاگاداریی بکەن و دەسپیسی لە ئەمانەتەکەدا نەکەن و گفت و پەیمانەکە نەشکێنن.

(٩) ئەوانەیش کە پارێزگاریی نوێژەکانیان ئەکەن و ناهێڵن نوێژیان بچێ.

(١٠) ئەوانەن ئەو کەسانەی بەهەشت بە میرات ئەبەن بۆ خۆیان.

(١١) ئەوانەی بەهەشت بە میرات وەرئەگرن هەمیشە تیایا ئەمێننەوەو نامرن.

(١٢) بەڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان لە پوختەیەك لە قوڕ دروست کردووە.

(١٣) پاش ئەوە نەوەی ئەو پوختەی گڵەمان کرد بە تۆمێ کە لە جێگایەکی پارێزراوا ڕامانگرتووە کە منداڵدانی دایکە.

(١٤) پاش ئەوە ئەو تۆمەمان کرد بە پارچەیێ خوێن، پاشان ئەو پارچە خوێنەمان کرد بە پارچە گۆشتێ، پاش ئەوە ئەو پارچە گۆشتەمان کرد بە ئێسقان، ئەوجا گۆشتمان کردە بەری پارچە ئێسقانەکە، ئەوجا کردمان بە دروستکراوێکی تر کە ئەو منداڵەیە لە منداڵدانی دایکی دێتە دەرەوەو لەدایك ئەبێ، ماشەڵڵا چەند گەورەو پیرۆزە خوا کە جوانترین دروستکەرێکە بە خەیاڵی ئادەمیزادا بێت.

(١٥) پاش ئەمانەیش ئێوە بەڕاستی ئەمرن.

(١٦) پاش مردنیش لە ڕۆژی قیامەتا زیندووئەکرێنەوە بۆ حیساب و کیتاب لەگەڵ کردن و لێپرسینەوەی چاکەو خراپەتان.

(١٧) بەڕاستی ئێمە حەوت ئاسمانمان بە ژوور سەری ئێوەوە دروست کردووە کە ڕێگای هاتوچۆکردنی فریشتەکانن و، ئێمە هەرگیز بێئاگا نەبوین و نین لەو شتانەی دروستمان کردوون.

وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِ جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَوْمِهِ مَا هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ بِهِ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا بِهِ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ أَنِ اصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ ۙ فَاسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ مِنْهُمْ ۖ وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا ۖ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾



(١٨) ئێمە، بەئەندازەیێ کە بۆ ڕواندنی گژوگیاو دارودرەخت و ژیاندنی هەموو گیانداران پێویست بێ ئاوی باران و بەفرمان لە ئاسمانەوە ڕشتووەتە سەر زەویو لەویێ جێگیرمان کردووە لە شێوەی دەریاو ڕووبارو چەم و جۆگاو کانیاوداو ئەیشتوانین ئەو ئاوانە لابەرین.

(١٩) جا پاش ئەوەی ئەو ئاوەمان لە ئاسمانەوە ڕژاندە سەر زەوی، گەلێ باخ و باخاتی خورماو مێومان بەو ئاوە بۆ دروست کردن کە میوەی زۆریان تیایە بۆتان و لێیشی ئەخۆن.

(٢٠) درەختێکیشمان بۆ داهێناون لە تووری سەینا ئەڕویێ، بە ڕۆنەوە سەوز ئەبێ، واتە ڕۆنی پێوەیە. ڕۆنەکەی ئەگیرێ بۆ گەلێ شتو پێخۆریشی لێ دروست ئەکرێ بۆ بخۆران.

(٢١) بەڕاستی هەیە بۆ ئێوە ئەی ئەوەی ئادەمیزاد پەندو ئامۆژگاری لە ئاژەلاو وشترو ڕەشەولآخدا کە باوەڕ بە خواو بە نیعمەتی خوا بکەن، ئەوەتا شیری ناوسکیانتان دەخوارد ئەدەین بیخۆنەوەو سوودی زۆریان تیایە بۆتان وەك جووت پێکردن و بار پێبردنی هەندێکیان و پێست و خوریی هەندێکی تریان و، لێیشیان ئەخۆن کە ئەوەتا سەریان ئەبڕن و گۆشتەکەیان ئەخۆن. (٢٢) بەکۆڵیانەوەو بە کۆڵی کەشتییش هەڵئەگیرێن و ڕێگای وشکانیان پێ ئەبڕن و لە چەم و ڕووبارو لە دەریا ئەپەڕێنرێنەوە.

(٢٣) بەڕاستی ئێمە نووحمان بە پێغەمبەری نارد بۆ لای قەومەکەی، جا فەرمووی: ئەی قەومەکەم! خوا بپەرستن ئێوە لە خوا بەولاوە کەسێکتان نییە خوا بێو شایانی پەرستن بێ، ئەوە ئێوە هێشتا لە خوا ناترسن؟

(٢٤) جا کۆمەڵەی پیاوە گەورەکانی قەومەکەی کە کافر بوون وتیان: ئەم نووحە لە بنیادەمێکی وەك ئێوە بەولاوە نییە ئەیەوێ خۆی بەم ئیددیعای پێغەمەرێتییەی بەسەر ئێوەوە گەورە بکا. ئەگەر خوا بیویستایە پێغەمبەرێ بنێرێتە سەرتان فریشتەیەکی بە پێغەمبەری ئەناردە سەرتان نەك بنیادەمێکی وەکو نووح. ئێمە شتی وامان لە باوکو باپیرانی پێشووی خۆمانەوە نەبیستووە کە نووح ناوێ خوا بە پێغەمبەری ئەینێرێتە سەرمان.

(٢٥) ئەم نووحە لە پیاوێ بەو لاوە نییە کە شێتییەکی لەگەڵە، ئەگینا ئیددیعای وای نەئەکرد. ماوەیێ لێی گەڕێنو تەحەممولی بکەن و چاوەڕوان بن بەلکو بێتەوە سەرخۆیو دەسبەرداری ئەم جۆرە قسەو ئیددیعایانە ببێ.

(٢٦) نووحیش کە ئەم قسانەی لە کافرەکانی قەومەکەی بیست لە خوا پاڕایەوە وتی: خوایە کۆمەکم بکەو یارمەتیم بدە بەرانبەر بەم قەومەم کە بە درۆزنیان دانام.

(٢٧) ئێمەیش وەحیمان کرد بۆ نووح کە لەژێر چاودێریی ئێمەداو بە فەرمانی ئێمە کەشتی دروست بکات (واتە ئاگامان لێ ئەبێ ناهێڵین لە دروست کردنەکەیا هەڵە بکەی)، جا کاتێ کە فەرمانی ئێمە هات کە سواری کەشتییەکە ببیو تۆفانەکە گەیشتە ڕادەیەك تەنووری نان کردن ئاوی لێ هەڵقوڵێ، لە هەر نێرو مێیەك لە گیانداران دوانی تێخەو ماڵ و منداڵی خۆیشتی تێخە ئەوانەیان نەبێ کە پێشتر فەرمانی خنکانیان دەرچووەو، لە بارەی ستەمکارانی گوێ بۆ فەرمانی خوا شل نەکردووە وە هیچمان لەگەڵ مەلێو تکا بۆ کەسیان مەکە، ئەوانە بێگومان لە ئاودا نوقم ئەکرێن.

فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا
مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ
ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا
مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟
ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا
تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ
﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ
﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا
ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ
ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ
ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾
فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾



(٢٨) جا کاتێ کە تۆ و ئەوانەی لەگەڵتان لەسەر پشتی کەشتییەکە جێگیر بوون و دامەزران، بڵێ: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە لە خێڵی ستەمکارانی ڕزگار کردین.

(٢٩) بیشڵێ: خوایە لە جێدابەزینێکی پیرۆز و بە فەڕو بەرەکەتدا لەنگەرم پێ بگرەو تۆ باشترین کەسێکی بەندەی خۆی لە شوێنی باشا دابەزێنێ.

(٣٠) بەڕاستی لەم ڕووداوەدا چەند نیشانەو بەڵگەیێ هەیە لەسەر توانایی خواو، بەڕاستی ئێمە ئەوانەمان بەراورد کردو تاقیمان کردنەوەو مەینەتمان هێنایە ڕێیان.

(٣١) ئینجا پاش ئەوان وەچەیەکی تری ئادەمیزادمان دروست کرد.

(٣٢) جا پێغەمبەرێکمان لە خۆیان ناردە سەریان پێیان بڵێ: خوا بپەرستن. ئێوە لەو بەولاوە خوایەکی ترتان نی‌یە بیپەرستن. ئەوە بۆ لە خوا ناترسن؟

(٣٣) جا کۆمەڵەی گەورە گەورانی قەومەکەی لەوانەی کە کافر بوون و دیداری ڕۆژی قیامەتیان بەلاوە درۆ بوو و لە ژیانی دنیادا نازو نیعمەتی زۆرمان دابوونێ، وتیان: ئەم کابرا کە ئیددیعای پێغەمبەرایەتی ئەکا لە مرۆیەکی وەك ئێوە خۆتان بەولاوە نی‌یە، ئێوە چی ئەخۆن ئەویش لەوە ئەخواو چی ئەخۆنەوە ئەویش هەر ئەوە ئەخواتەوە، گوایە پێغەمبەر ئەبێ مرۆیەکی تایبەتی بیو لە چەشنی ئەم خەڵکی خوایە نەبێ !

(٣٤) ئەگەریش ئێوە گوێ بۆ قسەی کابرایەکی وەك خۆتان شل بکەن، ئەوا ئێوە بەڕاستی زەرەرتان توش بووە.

(٣٥) ئایا ئەو گفتی ئەوەتان ئەداتێ کە مردن و ڕزین و بوون بە خۆڵ و ئێسك، بەڕاستی زیندوو ئەکرێنەوەو لە گۆڕ دەرئەهێنرێنە دەرەوە؟.

(٣٦) دووره زۆر دووره ئەوەی ئەو پیاوە گفتتان ئەداتێ بێتەدی.

(٣٧) ژیان نی‌یە لەم ژیانە بەولاوە کە نزیکە لێمانەوەو ئێستایەو، ئەمرین و هیی ترمان دێتە دنیاو ئێمە هەرگیز زیندوو ناکرێینەوە.

(٣٨) ئەم شەخسەیش کە ئیددیعای پێغەمبەرایەتی ئەکا لە کابرایێ بەولاوە نی‌یە کە درۆ بەدەم خواوە ئەکاو ئێمە باوەڕی پێ ناکەین.

(٣٩) پێغەمبەرەکەیش فەرمووی: خوایە یارمەتیم بدە لەبەر ئەوە کە ئەم خەڵکە بە درۆزنیان دانام.

(٤٠) خوایش فەرمووی: ئەمانە لە ماوەیەکی کەما لە کردەوەی خۆیان پەشیمان ئەبنەوە.

(٤١) جا دەنگێ لە ئاسمانەوە وەك هەورە برووسکە هات و بەڕاستی گرتنیەوەو لێی دان و کردنی بە پووشی ئاوماڵك کە لافاو ڕاینەماڵێ. دەسا دووری لە ڕەحمەتی خوا بۆ قەومی ستەمکارو گوێ لەخوا ڕانەگر.

(٤٢) جا پاش بەربادکردنی ئەوان چەند وەچەیەکی تری ئادەمیزادی غەیری ئەوانمان دروست کرد.

مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ (٤٣) ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ (٤٤) ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ (٤٥) إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ (٤٦) فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ (٤٧) فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ (٤٨) وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ (٤٩) وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ (٥٠) يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ (٥١) وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ (٥٢) فَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ (٥٣) فَذَرْهُمْ فِى غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ (٥٤) أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ (٥٥) نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ (٥٦) إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ (٥٧) وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ (٥٨) وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ (٥٩)



(٤٣) هیچ ئوممەتێ پێشی ئاکامی دیاریکراو بۆ برانەوەی خۆی ناکەوێو لێیشی دواناکەوێ، واتە: هەرکەسێ بەو ئاکامەی خۆی ئەمرێ کە بۆی دەسنیشان کراوە.

(٤٤) پاش ئەمەیش پێغەمبەرانی خۆمانمان نارد یەك بەدوای یەکا ئەهاتن. هەرکاتێ پێغەمبەرێ ئەهات بۆسەر ئوممەتێ ئەو ئوممەتە بە درۆزنیان دائەنا، ئێمەیش چینێ لەو ئوممەتانەمان ئەفەوتاندو چینێکی ترمان بەدوایا ئەهێناو ئەمانکردن بە مایەی قسەی سەرزاری خەڵکی تر کە لێیان ئەدوان و سەرگوزەشتەیانیان ئەگێڕایەوە چۆن پێغەمبەریان ئەهاتە سەرو چۆن بە درۆزنیان دائەناو چۆن بەربادمان ئەکردن. سا خوا کەسانی بێباوەڕ هەر دوورتر بخاتەوە لە ڕەحمەتی خۆی.

(٤٥) پاشان مووساو هاروونی برایمان بە ئایەتەکانی خۆمانەوەو بە موعجیزەیەکی ئاشکراوە نارد.

(٤٦) بۆ لای فیرعەون و کۆمەڵە پیاو ماقووڵەکانی، ئەوانیش خۆیان بەزل زانیو گوێیان بۆ شل نەکردن و تاقمێکی لووتبەرز بوون.

(٤٧) وتیان: ئێمە ئیمان بێنین بە دوو بنیادەمی وەك خۆمان لە حاڵێکا کە قەومەکەیان هەردەم خزمەتکاری ئەکەن بۆ ئێمە وەك بەندەی زەڕخرید ؟

(٤٨) مووساو هاروونیان بە درۆزن دانا، جا ئەنجامیان وابوو لەوانە بوون کە فەوتێنراون.

(٤٩) ئێمە بەڕاستی کتێبی تەوراتمان دا بە مووسا بەڵکو ئەمە خوایە قەومەکەی بێنە سەر ڕێی خواناسی.

(٥٠) عیسای کوڕی مەریەم و دایکیمان کرد بە نیشانەی گەورەییو خوایەتیی خۆمان و نیشتەجێمان کردن لە بەرزاییەکی وادا بۆ نیشتمان بشێو سەرچاوەی ئاوی سافی هەبێ.

(٥١) ئێمە بە هەموو پێغەمبەرانمان وت: هەرکام لە سەردەمی خۆیا، ئێوە ڕزق و ڕۆزیی پاك و خاوێن بخۆن و کردەوەی چاك بکەن، ئێوە هەرچی بکەن من پێتان ئەزانم.

(٥٢) ئەم ئوممەتانەیش کە ئێوە هاتوونەتە سەریان و ئەوانەیش باوەڕیان بە ئێوە کردووە، هەموو یەك ئوممەتن و ئایین و باوەڕیان یەك ئایین و باوەڕە کە خوا بە تاك و تەنیا دانانەو منیش خوای ئێوەم، کە واتە خۆتانم لێ بپارێزن و سەرپێچی لە فەرمانەکانم مەکەن. (٥٣) کەچی ئەو ئوممەتانە ئایینی خۆیانیان تێکداو کاری خۆیانیان پارچە پارچە کرد بە چەند بەشێك کە هەر تاقمێکیان دڵیان بە بیروباوەڕی خۆیان خۆشە.

(٥٤) دە لێیان گەڕێ با هەر لە گێژاوی خۆیانا بن تا کاتی خۆیان دێ. (٥٥) ئایا گومان وا ئەبەن ئەوەی ئێمە بۆیان زیاد ئەکەین لە ماڵ و لە کوڕگەل.. (قسەکە لە ئایەتەکەی پاشەوەدا ئەبڕێتەوە).

(٥٦) خێروبێریان بەوە بۆ زۆر ئەکەین؟ حاشا، ئەوان شوعووریان نییەو هەست ناکەن کەوا زۆر کردنی ماڵ و کوڕە بەدەمەوە دان و جڵەو بۆ شۆڕکردنەو خێرو بێرزیادکردنی ڕاستی نییە.

(٥٧) بەڕاستی ئەوانەی لە سزای خوای خۆیان ئەترسن، (٥٨) ئەوانەیش کە باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوای خۆیان هەیە، (٥٩) هەروا ئەوانەیش کە هاوبەش بۆ خوای خۆیان دانانێن،

وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَوا۟ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَهُمْ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَلَدَيْنَا كِتَٰبٌ يَنطِقُ بِٱلْحَقِّ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ بَلْ قُلُوبُهُمْ فِى غَمْرَةٍ مِّنْ هَٰذَا وَلَهُمْ أَعْمَٰلٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِٱلْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجْـَٔرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدْ كَانَتْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا۟ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۚ بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ خَرْجًا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾



(٦٠) ئەوانەیش کە هەرچی لە ڕێی خوادا ئەبەخشن لە حاڵێکدا ئەیبەخشن لەوە ئەترسن کە خوا لێیان قبووڵ نەکات، چونکە ئەوان سەرەنجام ئەگەڕێنەوە بۆ لای خواو پێویستیان بەوە هەیە پێش مردنیان خێراتیان کردبێ‌و لای خوا بۆیان نووسرابێ،

(٦١) ئەوانەن دەستوبرد ئەکەن بۆ دەست خستنی چاکەو پێش خەڵکی تر ئەکەون لە دەست پێشخەری‌کردنا بۆی.

(٦٢) ئێمە ئەرك ناخەینە ئەستۆی هیچ کەسێ ئەوەندە نەبێ کە لە وزەیا بێ جێبەجێی بکاو، کتێبێکمان لایە ڕاست ئەڵێ‌و باسی کردەوەی خەڵك بێ زیادو کەم ئەکاو ئەو خەڵکە کەسیان ناحەقی لەگەڵ ناکرێ.

(٦٣) بەڵکو دڵی ئەو کافرانە بێ‌ئاگایە لەم کتێبەی باسمان کرد کە کارو کردەوەی چاك و خراپی هەموو کەسێکی گرتووەتە خۆی‌و ئەم کافرانە کرداری خراپتری تریشیان هەیە کە کردوویانن و ئەیانکەن.

(٦٤) تا کاتێ کە گەورە نازو نیعمەتدارەکانیانمان بە قارو غەزەبی خۆمان گرت تەماشا ئەکەی دەسبەجێ کەوتنە هاوارو دادو بێداد.

(٦٥) ئەمڕۆ هاوارو دادو بێداد مەکەن. ئێوە بەرانبەر بە ئێمە یارمەتی نادرێن و کەس لە دەستی ئێمەتان ڕزگار ناکا.

(٦٦) بەڕاستی ئایەتەکانی منتان بەسەرا ئەخوێنرایەوەو ئێوەیش لەسەر پاژنە پاشەوپاش ئەگەڕانەوە.

(٦٧) فیزتان بە ماڵی مەککەوە ئەکرد کە گوایە هیی ئێوەیەو شەونوخونیتان ئەکرد بۆ تانەو تەشەردان لە قورئان و خۆتان لە گوێ بۆ شل کردنی دوورئەخستەوە.

(٦٨) ئایا ئەوە بیریان نەکردەوە لە واتای قورئان و قسەکانی پێغەمبەر، یا شتی وایان بۆ هاتووە کە بۆ باوك و باپیرە پێشووەکانیان نەهاتووە بۆیە نەترسان، وەك باوك و باپیرە پێشووەکانیان ئەترسان کە پێغەمبەریان لە خواوە هاتبووەسەر؟

(٦٩) یا پێغەمبەرەکەی خۆیان ناناسن و بەو دەست پاکی‌و ڕاستگۆیی‌و ڕەوشت بەرزی‌و زاناییەدا کە هەیەتی لەگەڵ ئەوەیش کە خوێندەوار نی‌یەو، لەبەر ئەوە ئینکاری ئیددیعای پێغەمبەرایەتییەکەی ئەکەن و باوەڕی پێ ناکەن؟

(٧٠) یا ئەڵێن ڕەگێکی شێتی پێوەیە بۆیە گوێ لە قسەی ناگرن؟ نەخێر هیچ کام لەوانە نی‌یەو، ئەو شتی ڕاست و دروستی لای خواوە بۆ هێناون، بەڵام ئەوان بەشی زۆریان خۆشیان لە ڕاستی نایە بۆیە بەگوێی ناکەن.

(٧١) ئەگەر حەق و ڕاستی شوێن ئارەزووی ئەوان بکەوتایەو هەرچی ئەوان ئارەزوویان لێ بوایە حەق و ڕاستی بوایە، ئاسمانەکان و زەوی‌و چییان تیایە هەموو تێك ئەچوون. بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە ئێمە ئەو پەندو ئامۆژگارییەمان هێنانە سەر کە بێداریان ئەکاتەوەو ئەوانیش لە پەندو ئامۆژگاریی خۆیان لووتەلان.

(٧٢) یان تۆ داوای کرێیان لێ ئەکەی بەرانبەر بەوە کە نامەی خوات پێ گەیاندوون و ئەوانیش ناتوانن بتدەنێ. ئەو ڕزق و ڕۆزییەی خوا بتداتێ لە هەمووی چاکترەو خوا خۆی باشترین ڕۆزیدەرێکە.

(٧٣) تۆ بەڕاستی ئەوانە بانگ ئەکەی بێنە سەر ڕێیەکی ڕاست کە ڕێگای باوەڕ بە خواو هاوبەش‌بۆدانەنانیەتی.

(٧٤) بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نی‌یە شانیان لە ڕێگای ڕاست هەڵتەکاندووە.

۞ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ
يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُواْ لِرَبِّهِمْ
وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ
إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ
وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ
وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ
ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ بَلْ قَالُواْ مِثْلَ مَا قَالَ
ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓاْ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا
لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ
إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن
كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ
﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ
﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ
مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن
كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾



(٧٥) ئەگەر ئێمە ڕەحم و میهرەبانییشمان لەگەڵیان کردبایەو ئەو مەینەتی قاتیو گرانییەی تووشیان هاتووە لێمان لادابان، ئەوان هەر دەسیان لە عەنادو کەللەڕەقیی خۆیان هەڵنەئەگرت و بە سەرگەردانی ئەمانەوە.

(٧٦) ئێمە بەڕاستی گرفتاری ئازارو سزامان کردن (مەبەستی لە شکست خواردنی کافرەکانە لە ڕۆژی غەزای بەدرا) کەچی هێشتا بچووکیو ملکەچیی خۆیان بۆ خوای خۆیان پیشان نەداوەو نایشپاڕێنەوە لە خوا کە لەو تاوانی ملکەچ نەکردنەیان خۆش ببێ.

(٧٧) تا کاتێ کە دەرگای سزایەکی سەختمان لێ کردنەوە کە سزای قاتی وقڕی بوو، دەسبەجێ نائومێدیو سەرسامیو سەرگەردانی لەو حاڵەدا دایگرتن و نەیانئەزانی چۆن چاری دەردی خۆیان بکەن.

(٧٨) خوا ئەو خوایە گوێی داونەتێ پێی ببیستن و چاوی داونەتێ پێی ببینن و دڵی داونەتێ بیری پێبکەنەوە، کەچی ئێوە لەگەڵ ئەم گشتە نیعمەتەیشا زۆر کەم وائەبێ سوپاسی خوای خۆتان بکەن !

(٧٩) خوا هەر ئەو خوایشەیە بە ڕووی زەوییا بڵاوی کردوونەتەوەو سەرەنجام بۆ لای خۆی ڕاپێچ ئەکرێنەوە.

(٨٠) دیسان خوا ئەو خوایە گیانتان ئەکا بەبەراو ئەتانمرێنیو بەدووی‌یەکاهاتنی شەو و ڕۆژ بە دەستی خۆیەتی، دەسا بۆ بیرناکەنەوەو ئەقڵ ناگرن و نافامن تا بزانن خوای شایانی پەرستن هەر ئەوەو هاوبەشی نی‌یە.

(٨١) بەڵکو ئەمانیش هەر هەمان جۆرە شتیان وت کە باوك و باپیرە پێشینەکانیان ئەیانوت.

(٨٢) وتیان: ئایا ئێمە ئەگەر مردین و بووین بە خۆڵ و ئێسك، زیندوو ئەکرێینەوە ؟

(٨٣) بەڕاستی ئێمەو باو باپیرانمان لەمەوپێش ئەم گفتەمان درابوویێ. ئەم باسە لە ئەفسانەی پێشینان بەولاوە نی‌یە.

(٨٤) تۆ پێیان بڵێ: سەرزەویو هەرکەسی تیایە هیی کێن ئەگەر ئێوە ئەزانن ؟

(٨٥) ئەڵێن: هیی خوان. دەی بڵێ: ئەوە ئێوە بیرناکەنەوە تا بزانن ئەو خوایەی کەوا سەرزەویو هەرچی تیایەتی دروست کردووە؟ ئەتوانێ مردووی ڕزیویش دروست و زیندوو بکاتەوە.

(٨٦) تۆ بڵێ: کێ خوای حەوت ئاسمانەکان و خوای عەرشی مەزنە ؟

(٨٧) ئەڵێن: هیی خوایە. بڵێ کەواتە لەو خوایە ناترسن کە خاوەنی هەموو ئەوانەیە ؟

(٨٨) بڵێ: کێیە تەسەڕڕوف کردن لە هەموو شتێکا بەدەست ئەوەو، ئەتوانێ پەنای داماوان بدا و، کەس نی‌یە بتوانێ پەنای یەکێ بدا لە دەس ئەو ئەگەر بەڕاستی شت ئەزانن ؟

(٨٩) لە وەڵاما ئەڵێن: هیی خوایە. بڵێ کەواتە چۆن وا جادووتان لێ ئەکریو عەقڵتان لێ ئەسەنرێ ؟

بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٩٠﴾ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّى مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِى فِى ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَٰدِرُونَ ﴿٩٥﴾ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾



(٩٠) بەلکو ئێمە بە ئایینی ڕاستەوە هاتووینەتە لای ئەوان و ئەوان بەڕاستی درۆزنن. (٩١) خوا منالّی بۆ خۆی ڕانەگرتووە چونکە کەسی لە وێنە نییەو هیچ خوایەکی لە خۆی بەولاوەیشی لەگەلّ نەبوەو نییە. ئەگەر خوایەکی کەی لەگەلّ بوایەو هاوبەشی هەبوایە، هەر خوایەك لە خوایەکان بەشە دروستکراوی خۆی ئەبرد بۆ خۆی ئەبوو بە شەڕیان و ئەچوون بەگژی یەکداو هەندێکیان زالّ ئەبوون بەسەر هەندێکیانا. خودا پاك و دوورە لەو قسە پڕوپووچانەی ئەو هاوبەشبۆخوادانەرانە ئەیانلێن و دێن بە دەمیانا.

(٩٢) ئەو خوایەی هەموو شتێکی پەنهان و ئاشکرا ئەزانیو کەواتە پاك و دوورە لەو قسە پڕوپووچانەی هاوبەش بۆخوادانەرەکان ئەیانکەن کە ئەلێن خوا هاوبەشی هەیە.

(٩٣) تۆ بلّێ: خوایە ئەگەر پێویستە ئەو سزایەم پیشان بدەی کە هەڕەشەی لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پێ کراوە (وەلاّمەکەی لە ئایەتی پاشەوەدایە).

(٩٤) خوایە مەمخەرە ناو تاقمی ستەمکارەکان و مەمکە بە هاوبەشی سزاکەیان.

(٩٥) ئێمە توانی ئەوەمان هەیە ئەوەت پیشان بدەین کە هەڕەشەمان لە هاوبەشبۆخوادانەرەکان پێ کردووە.

(٩٦) تۆ خراپەی ئەو کافرانە بە کردارو گوفتاری چاك لابدەو بەر لێ بگرە. ئێمە لە تۆ چاکتر ئەزانین ئەوان چی ئەلێن و خۆمان ئەزانین، ئەگەر بمانەوێ، چۆنیان سزائەدەین.

(٩٧) بیشلێ: خودایە من پەنا ئەگرم بە تۆ لە وەسوەسەی شەیتانەکان کە ئەیخەنە دلّی ئادەمیزادەوە.

(٩٨) پەنایش ئەگرم بە تۆ خوایە لەوە کە ئەم شەیتانانە بێنە بن دەستم.

(٩٩) هەرکام لەم کافرانە هەر لەسەر ئەم پێودانە ئەڕوا تا کاتێ کە مەرگ لەپڕ دێتە سەر یەکێکیان پەشیمان ئەبێتەوە لە کردارو گوفتاری بەدی خۆیو ئەلێ: خوایە بمگێڕەوە بۆ ژیان...

(١٠٠) بە هیوای ئەوەی کردەوەیەکی چاك بکەم لەگەلّ ئەو باوەڕەدا کە کاتی خۆی تەرکم کردبوو، واتە باوەڕ بە خوای تەنیاو بێ هاوبەش بکەم و کردەوەی چاکیش لەگەلّ باوەڕەکەم بکەم. نەخێر ئەمە نابێو ئەم قسەیەی ئێستە ئەیکا قسەیەکی ڕووتە ئەیلێو بە دەمیا دێو بەڕاستی نییەو ئەگەر بگێڕرێتەوە بۆ ژیان هەر لەسەر پێودانەکەی جارانی ئەڕوا و، ئەمانە عالەمێکی بەرزەخی نێوان مەرگ و زیندووکردنەوەیان لە پێشە تا ئەو ڕۆژەی لە قیامەتا زیندوو ئەکرێنەوە درێژە ئەکێشێ.

(١٠١) جا کاتێ کە فوو کرا بە صوورداو قیامەت هات هەرکەسێ ئەکەوێ بە کۆستی خۆیاو بنەچەو نەوە نامێنێ لە نێوانیاناو کەس سوودی بۆ کەس نابێو کەس لە کەس ناپرسێتەوە.

(١٠٢) جا ئەو ڕۆژە هەرکەس ترازووی قورس بێو کردەوەی چاکی زۆری لە تای ترازوودا هەبێ، ئەوانە لە سزای دۆزەخ ڕزگار بوون.

(١٠٣) هەر کەسیش ترازووی سووك بێو چاکەی کەم لە تای ترازوویا هەبێ، ئەوە ئەو کەسانە خۆیان فەوتاندووەو خۆیان لەکیس داوەو نەیانهێشتووە بە ڕێگای ڕاست و دروستی خواناسیدا پێبگەن و هەتا هەتایە لە ناو دۆزەخدا ئەمێننەوە.

(١٠٤) ئاگری دۆزەخ ڕوخساریان ئەسووتێنێو هالاّوی گەرمی خۆییان پیا ئەکاو لە ناو ئاگرا گرژئەبنەوەو هەلّئەقرچێن.

أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّى جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾ قَٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾

## سُورَةُ النُّور

مرتيبها ٢٤ — آياتها ٦٤



(١٠٥) خوای تەعالایش لە وەڵاما پێیان ئەفەرموێ: ئەوە نەبوو ئایەتەکانی منتان بەسەرا ئەخوێنرایەوەو بە درۆتان ئەزانین و ئەتانوت: درۆن ؟

(١٠٦) ئەوانیش ئەڵێن: خوایە بەدبەختییەکەمان زاڵ بوو بەسەرماناو ئێمە کۆمەڵێکی گومڕا بووین ڕێگای ڕاستمان بەدی‌نەکرد!

(١٠٧) خوایە لەم ئاگری دۆزەخەمان دەرکە، ئەگەر گەڕاینەوە بۆ کافرىو فەرمانبەرداری نەکردنت، ئەوە بەڕاستی ئێمە ستەمکارین و خۆمان وامان لە خۆمان کردووەو شایانی ئاگری دۆزەخین.

(١٠٨) خوایش ئەفەرموێ: بە سەرشۆڕیی خۆتانەوە بێ‌دەنگ بن بۆخۆتان لەناو ئاگری دۆزەخداو لەم بارەوە قسەم لەگەڵ مەکەن چونکە ئەو جێگەیە هەڵبژاردەی خۆتانە.

(١٠٩) مەسەلەکە بەڕاستی ئەوەیە وەختی خۆی تاقمێ بەندەی من هەبوون ڕوویان تێ ئەکردم و ئەیانوت: خوایە! ئێمە باوەڕمان بە تۆ کردووە، سا تۆیش لە گوناهمان خۆش ببەو ڕەحمان پێ بکەو تۆ چاکترین ڕەحمکەرێکی.

(١١٠) ئێوەیش ئەو بەندە چاکانەی منتان کردبوو بە گاڵتەجاڕی خۆتان و گاڵتەتان پێ ئەکردن بەجۆرێ کە گاڵتە پێ‌کردنتان ناوی منی لەیاد بردبوونەوەو ئێوە پێیان پێئەکەنین.

(١١١) ئەمڕۆ وا من جەزای ئەوانم دایەوە بەرانبەر بە خۆڕاگرتن و بوردەبارییان کە ئەو گشتە سووکی‌پێ‌کردنەی ئێوەیان تەحەمول کردو جەزاکەیشیان ئەوەیە کە بە خێرو خۆشیی هەمیشە گەیشتوون لە بەهەشتاو ئەوان بردوویانەتەوە.

(١١٢) خوا لەو کافرانەی پرسی کە لە دۆزەخدان: بە ژمارەی ساڵ چەند ساڵ لەسەر زەوی مانەوەو چەند ساڵ ژیان؟

(١١٣) وتیان: ساڵ نا، ڕۆژێ یا بەشێ لە ڕۆژێ لەسەر زەوی ماینەوە. لەوانە بپرسە کە شت ئەژمێرن ئەوان چاکی لێ ئەزانن.

(١١٤) خوا فەرمووی: ماوەیەکی کەم نەبێ لەسەر زەوی نەماونەتەوە ئەگەر بزانن.

(١١٥) ئاخۆ ئێوە واتان گومان ئەبرد ئێمە ئێوەمان بێ‌سوودو بێ مەبەست دروست کردووەو ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمەو هیچ پرسیارو وەڵامێ لە ئارادا نی‌یە ؟

(١١٦) بەرزو باڵایە خوای پادشای ڕاستەقینە، هیچ خوایێ لەو بەولاوە نی‌یە، خوای عەرشی پڕقەدرو حورمەتە.

(١١٧) هەرکەسێ لەگەڵ بانگ‌وهاوارکردنەخوادا بانگ و هاوار بکاتە خوایەکی تر کە هیچ بەڵگەیەکیشی بەدەستەوە نی‌یە کەوا ئەو خوایە بەڕاستی خوایە، جەزای ئەو کەسە لای پەروەردگاری خۆیەتی و، بەڕاستی کافران ڕزگار نابن.

(١١٨) جا بڵێ: خوایە لێم خۆش ببەو ڕەحم پێ بکە، تۆ چاکترینی هەموو خاوەن ڕەحمەکانی.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سُورَةٌ أَنزَلْنَٰهَا وَفَرَضْنَٰهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَآ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١﴾ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلْخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَؤُا۟ عَنْهَا ٱلْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَٰدَٰتٍۭ بِٱللَّهِ ۙ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾



## سوورەتی (النور)

**مەدینەیی یەو (٦٤) ئایەتە**

(١) ئەمە سوورەتێکە لە عالەمی غەیبەوە ناردوومانەتە خوارو چەند حوکمێکی شەرعیمان تێدا فەرزکردووە لەسەر موسوڵمانان و چەند ئایەتێکی ڕۆشن و مەعنا ئاشکرامان تیا ناردووەتە خوار بە هیوای ئەوەی بیرێ بکەنەوە لە فەرمانەکانی خواو لە سەرەنجامی خۆتان لە ڕۆژی دواییدا.

(٢) ئەو ژنەی زینای کردبێ‌و ئەو پیاوەی زینای کردبێ یەکی سەد داریان لێ بدەن و بەزەییتان پیایانا نەیەتەوە لە بڕیارێکی ئایینیدا کە خوا بڕیاری دابێ بە جۆرێ کە دارلێدانەکەیان لەسەر هەڵگرن، ئەگەر باوەڕتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیەو، با کۆمەڵێ لە موسوڵمانانیش لە سزادانەکەیانا حازر بن.

(٣) پیاوێ زینای کردبێ ژنی زیناکردوو یا ژنی هاوبەش‌بۆخوادانەر نەبێ مارە ناکا و، ژنێ زینای کردبێ شووناکا بە پیاوێ نەبێ کە زینای کردبێ یا هاوبەش بۆ خوا دانێ و، مارەکردنی ژنی زیناکردوو و شووکردن بە پیاوی زیناکردوو حەرامە لەسەر موسوڵمانانی خاوەن بڕوا. ئەم ئایەتە بە ئایەتی (وأنكحوا الأيامى منكم. ..) هەڵوەشێنراوەتەوە یا تەنیا تایبەتە بەو حاڵەوە کە تیایا هاتووەتە خوارەوە.

(٤) ئەو کەسانەی نیسبەتی زینا ئەدەن لە ژنانی داوێن پاك و پاشان چوار شایەت ناهێنن بۆ ئیسپاتکردنی ئەو قسەی داویانەتە پاڵ ئەو ژنانە، یەکی هەشتا داریان لێ بدەن لە سزای ئەو بوختانەدا کە بەدەم ئەو ژنانەیانەوە کردووەو تا ماون شایەتییان لێ قوبووڵ مەکەن و ئەوانە فاسقن و لە سنووری شەرع دەرچوون.

(٥) ئەوانەیان نەبێ کە پاش بوختانەکەی کردیان تۆبەیان کردووەو پاشگەزبوونەتەوەو خۆیان ڕاست کردووەتەوەو کرداری چاکیان کردووە، ئەوانە شایەتییان لێ قوبووڵ ئەکرێ چونکە پاشگەز بوونەتەوەو خوایش بەخشندەو میهرەبانە.

(٦) ئەو پیاوانەیش کە نیسبەتی زینا ئەدەن لە ژنی خۆیان و لە خۆیان بەولاوە شایەتیان نی‌یە بۆ ئیسپاتکردنی قسەکەیان، ئەوە ئەبێ هەرکام لەو جۆرە کەسانە چوار جار بڵێ: من خوا بەشایەت ئەگرم کەوا لەم نیسبەتدانی زینایەدا بۆ ژنەکەم، ڕاست ئەکەم.

(٧) شایەتیدانی پێنجەمیشی ئەوەیە کەوا بڵێ: لەعنەتی خوام لێ بێ ئەگەر درۆ بکەم.

(٨) سزا لە کۆڵی ژنەکەیش ئەکاتەوە ئەوە کە چوار جار شایەتی بداو بڵێ: من خوا بە شایەت ئەگرم کەوا ئەم پیاوە درۆئەکا کە نیسبەتی زیناکردن ئەدا لە من.

(٩) شایەتیی پێنجەمیشی ئەوەیە کە بڵێ: من غەزەبی خوام لێ بێ ئەگەر ئەو پیاوە ڕاست بکاو من زینام کردبێ.

(١٠) ئەگەر فەزڵ و گەورەیی‌و ڕەحمی خوا نەبوایە لەگەڵتان و لە بەر ئەوە نەبوایە کە خوا تۆبەی بەندەی خۆی قوبووڵ ئەکاو خاوەن حیکمەتە قارو غەزەبی لێ ئەگرتن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾



(١١) بەڕاستی ئەوانەی ئەو درۆ نابارەو ئەو بوختانە ناهەموارەیان هێنا کە ئەوەبوو بوختانیان بەدەم خاتوو عائیشەوە کردو بەناو خەلکیانا بلاوکردەوە تاقمێکن لە خۆتان، وا مەزانن شتێکی خراپە بۆتان، چاکە بۆتان، چونکە ئەبێ بەهۆی داشۆردنی وردە گوناهتان و بۆ لەمەولای ژیانتان هۆشیارتان ئەکاتەوەو خوا خۆی شایەتی ئەدا بۆ پاکیو بێ گوناهیی ئەو کەسەی بوختانەکەی بەدەمەوە کراوە. ئەوانەیش کە بوختانەکەیان کردووەو بەناو خەلکیانا بلاوکردووەتەوە، هەریەکە بەشە گوناهی خۆی ئەکەوێتە ئەستۆی. ئەو کەسەیش کە بەشی زۆری بلاوکردنەوەی بوختانەکەی لە ئەستۆی خۆی گرت لە ناویانا، سزایەکی گەورەی هەیە. ئەو کابراش عەبدوللای کوڕی ئوبەی بوو کە سەرکردەی منافقەکانی ناو شاری مەدینە بوو.

(١٢) ئەوە بۆچی کاتێ ئەو قسەیەتان بیست، پیاوو ژنە موسولمانەکان گومانی چاکەیان به خۆیان نەبردو ئەو قسەیان بە درۆ نەزانیو بلێن ئەم قسە بوختانێکی ئاشکراو دیارە ؟

(١٣) ئەوە بۆ چوار شایەتیان نەهێنا شایەتی بدەن بۆ ڕاستیی ئەو قسەیەی کردیان؟ مادەم چوار شایەتەکەیان نەهێنا ئەوانە هەر خۆیان لای خوا بە درۆزن دائەنرێن.

(١٤) ئەگەر فەزلّ و گەورەییو ڕەحمەتی خوا نەبوایە بەسەرتانەوە لە دنیاو لە قیامەتدا، لەم باسەدا کە کەوتە ناوتان و هەرکەسێ قسەیێکی تیا ئەکرد، عەزابێکی گەورە ئەیگرتنەوەو لێی ئەدان.

(١٥) کاتێ ئەو عەزابە گەورەیەی خوا لێی‌ئەدان کە ئەو قسەیە بە زمان ئەقۆزنەوەو بە دەم و زمانی خۆتان قسەی وا ئەکەن کە ئاگاتان لێ نی‌یە ڕاستە یان درۆیەو، لاتان وایەو وا گومان ئەبەن ئەو قسەیەی ئەیکەن شتێکی ئاسانە بەلام لای خوا گەورەیە.

(١٦) ئەوە بۆ کاتێ کە ئەو قسەیەتان بیست نەتانوت ئێمە بۆمان نی‌یە قسەی وا بەدەمانا بێت؟ خوایە پاك و بێگەردی بۆتۆیە، ئەم قسەیەی ئەم خەلکە ئەیکەن بوختانێکی گەورەیە.

(١٧) خودا ئامۆژگاریتان ئەکاو پەندتان دائەدا نەکەن هەرگیز جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ وێنەی ئەم جۆرە قسەیە ئەگەر موسولمانن و باوەڕتان بە خوا هەیە.

(١٨) خوا ئایەتی واتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە تێتان بگەیەنێ چی بکەن و چۆن بجوولێنەوە، خوا هەموو شتێ ئەزانێو بە حیکمەتەو کاری ڕێکوپێك ئەکا.

(١٩) بەڕاستی ئەو کەسانەی پێیان خۆشە قسەی ناشیرین و بوختانی ناڕەوا لە ناو ئەهلی ئیمان و باوەڕا بلاو ببێتەوە، لە دنیاو لە قیامەتا سزای سەختیان بۆ هەیە، خوا خۆی ئەزانێ چییان لەناو دلا هەیەو ئێوە نازانن.

(٢٠) ئەگەر فەزلّ و گەورەییو ڕەحمەتی خوا نەبوایە لەگەلّتان و ئەوە نەبوایە کە خوا میهرەبان و بەڕەحمە، بە هۆی ئەم کارەساتی بوختان کردن و بەدناوکردنەوە غەزەبی خوا ئەیگرتنەوە، بەلام خوا بەڕەحم و میهرەبانەو لەگوناه ئەبووری.

۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَـٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾



(٢١) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە شوێن هەنگاوی شەیتان مەکەون، هەرکەسێ شوێن هەنگاوی شەیتان بکەوێ گیرۆدە ئەبێ چونکە شەیتان فەرمان بە کاری بێحورمەتانەو ناپەسەند ئەدا، ئەگەر فەزڵ و گەورەییو ڕەحمەتی خوا نەبوایە کەستان بە خاوێنی نەئەمانەوەو هەموو ئەکەوتنە داوی فەرمانبەرداریی شەیتانەوە، بەڵام خوا کێی ئارەزوو لێ بێ کە بە پاکی بمێنێتەوە بە پاکی ئەیهێڵێتەوە، خوا گوێی لە هەموو قسەیەکی ئاشکراو نهێنییەو بە هەموو شتێ ئەزانێ، گوێی لێیە خوانەناسەکان چی ئەڵێن و ئەزانێ چی ئەکەن.

(٢٢) با خاوەن دارایییو گوشاد ڕۆزییەکانتان سوێند نەخۆن کەوا هیچ نادەن بەخزمەکانیان و هەژاران و گەدایان و بەوانەی لەپێناوی خوادا ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشتووەو کۆچیان کردووەو، با لێیان خۆش بن و لێیان ببوورن ئەگەر هەڵەیان کردبێ. ئایا ئێوە حەزناکەن خوایش لە ئێوە خۆش ببێ و، خوا گوناهبەخش و بەڕەحمە. ئەگەر پێتان خۆشە خوا لێتان خۆش ببێ، ئێوەش لە خەتای خەتاکاران خۆش بن.

(٢٣) بەڕاستی ئەوکەسانەی بوختان بۆ ئافرەتانی داوێن پاکی لە تاوان بێئاگای خاوەن باوەڕ ئەکەن، لە دنیاو لە قیامەتا لەعنەتیان لێکراوەو سزایەکی قورسیان بۆ هەیە.

(٢٤) سزاکەیان لەو ڕۆژەدا ئەبێ کە زمانیان و دەست و پێیان شایەتی ئەو تاوانانەیان لێ ئەدەن کە لە دنیادا بەهۆی ئەوانەوە کردوویانن.

(٢٥) لەو ڕۆژەدا خوا ئەو پاداشەیان ئەداتەوە کە ڕاستەو موستەحەق و شایانینیو ئەزانن کە خوا خوایەکی ڕاست و ئاشکرایە لە خوایەتیی خۆیا.

(٢٦) ژنەپیسەکان بۆ پیاوەپیسەکان و پیاوەپیسەکان بۆ ژنەپیسەکان و ژنەپاکەکان بۆ پیاوەپاکەکان و پیاوەپاکەکان بۆ ژنەپاکەکان، ئەوانەی بوختانەکەیان بۆ کراوە بەرین لەو بوختانەی بوختانکەرەکان کردوویانە چونکە خوا شایەتیی خاوێنیی بۆ داون. ئەوانە خوا لێیان خۆش بووەو لە بەهەشتیشا نیعمەت و ڕۆزییەکی باشی بۆ داناون.

(٢٧) ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەر ! مەڕۆنە ناو خانووی غەیری خانووی نشیمەنی خۆتان تا پرس بەوانە ئەکەن لەو خانوەدا ئەژین و ڕێگاتان ئەدەن ئێوەیش سەلام لە دانیشتووانی ناو ماڵەکە ئەکەن. ئاوا بۆ ئێوە چاکترە. ئەم پەندەتان دائەدەین بەڵکو ئێوەیش بیر بکەنەوەو ئەوەتان بیربکەوێتەوە کە ئەبێ چۆن بکەن.

فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾



(٢٨) جا ئەگەر کەستان وەگیر نەکەوت لە ماڵەکەدا، لەخۆتانەوە مەڕۆنە ناوی تا ڕێگاتان ئەدرێ و، ئەگەر ڕێگایان نەدان و وتیان بگەڕێنەوە بگەڕێنە دواوە، ئەو گەڕانەوەیە پاکترە بۆتان و بێگەردترە لەوەی لە خۆتانەوە بێ‌پرس بچنە ژوورەوەو هەرچیش بکەن خوا پێتان ئەزانێ‌و لێی ون نابێ.

(٢٩) گوناهبار نابن ئەگەر بڕۆنە ناو چەند هۆدەیەکەوە کە کەسیان تیا نیشتەجێ نەبێ‌و کەلوپەلی خۆتانیان تیابێ. خوا بە هەرچی ئەزانێ کە ئێوە ئاشکرای بکەن یان بیشارنەوە، چی دەربخەن چی بشارنەوە خوا بە هەمووی ئەزانێ.

(٣٠) بە پیاوە خاوەن باوەڕەکان بڵێ: چاو بنێن بەیەکداو نەڕوانن بۆ ژنی بێگانەو، عەورەتی خۆیان بپارێزن لە تێکەڵبوون لەگەڵ غەیری ژنی خۆیان، ئەوە پاکترو بێگەردترە بۆیان و، هەرچیش بکەن خوا ئاگای لێیە.

(٣١) بە ژنە خاوەن ئیمانەکان بڵێ: با چاو بەیەکا بنێن و نەڕوانن بۆ پیاوی بێگانەو، عەورەتی خۆیان بپارێزن لەکاری ناشەرعی و، جوانیی لەشی خۆیان دەرنەخەن ئەوەی نەبێ کە بۆخۆی بەدەرەوەیە، وەك دەموچاوو دەستیان تا ئەگاتە مووچیان، ئەوی تری داپۆشن و با سەرپۆش بدەن بەسەر گەردنو مل و سنگ و بەرۆکیانداو جوانی‌و خشڵ و متوموورووی خۆیان دەرنەخەن لای مێردەکانیان، یا باوکیان، یا باوکی مێردەکانیان، یا کوڕی خۆیان، یا کوڕی مێردەکانیان، یا برای خۆیان، یان کوڕی برا، یا کوڕی خوشکیان نەبێ، یا بۆ ژنانی لە خۆیان واتە: ژنانی موسوڵمان، یا بۆ موڵکی خۆیان واتە: بەندەو کەنیزەکیان، یا بۆ ئەو پیاوانەی بۆ سواڵ یا بۆ خزمەتکاری‌و شتی وا دوای ژنان ئەکەون و هیچ ئیحتیاجییەکی نێرانەیان بە مێینە نەماوە ئەوەندە پیرو پەککەوتە بوون، یان بۆ ئەو منداڵانەی هێشتا وایان لێ نەهاتووە ئاگادارییەکیان لە عەورەتی ژنان هەبێ. هەروا پێیان بڵێ: با پێی خۆیان توند نەکوتن بەزەویدا بۆئەوەی خەڵك بەو خشڵانەیان بزانن کە شاردوویاننەتەوەو دیارنین لەبەرچاودا و، ئەی خاوەن باوەڕەکان هەمووتان بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو تۆبە بکەن و پەشیمان ببنەوە لەو گوناهانەی کردووتانن بەڵکو ئەمە خوایە ڕزگارتان ببێ لە سزای ڕۆژی دوایی.

وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَـٰتٍ مُّبَيِّنَـٰتٍ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾ ۞ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَـٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَـٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ ﴿٣٦﴾



(٣٢) ژنانی بێشووی خۆتان بدەن بە شوو، و ژن بۆ پیاوچاکانی بەندەکانی خۆتان بێنن و، کەنیزەکە چاکەکانتان بدەن بە شوو. ئەگەر ئەمانە گەدایش بن و نەتوانن ئەرکی ژن و ماڵداری بەڕێوەبەرن خوا لە گەورەیی‌و ڕەحمەتی خۆی دەوڵەمەندیان دەکا، خوا بەری ناز و نیعمەتی بڵاوەو لە بڕانەوە نایەت و ئاگای لە هەموو شت هەیەو پێی ئەزانێ.

(٣٣) با ئەوانەی داراییان نییە تا بتوانن ژن بهێنن، خۆیان بە خاوێنی ڕاگرن و داوێنیان پیس نەکەن تا ئەو ڕۆژەی خوا لە فەزڵی خۆی دەوڵەمەندیان ئەکا. ئەو بەندانەیشتان کە داواتان لێ ئەکەن موکاتەبەیان لەگەڵ بکەن ( کە ئەوەتە خاوەن بەندە بە بەندەکەی بڵێ: هەرکاتێ ئەوەندەت پارە بۆ هێنام ئازاد بی)، ئەگەر چاکەتان تیا بەدی کردن، واتە لاتان وابوو ئەمینن و پارەکە دێنن، لەو داراییەی خوا کە هەندێکی لێ پێداون بەشیان بدەن. زۆریش لە کەنیزەکەکانتان مەکەن بڕۆن بازرگانی بە لەشیانەوە بکەن مادەم ئەوان خۆیان بیانەوێ خۆیان بە خاوێنی ڕاگرن، هەر بۆ ئەوەی هەندێ پارەتان بە خۆفرۆشتنی ئەو کەنیزەکانەتان دەست کەوێ. هەرکەس زۆریان لێ بکا خۆیان بفرۆشن ئەوە خوا لەو ئافرەتانە خۆش ئەبێ پاش زۆر لێکردنەکەیان، چونکە ئەو کارەیان بە ئارەزووی خۆیان نەکردووە.

(٣٤) بەڕاستی نازڵمان کردووە بۆ لای ئێوە چەند ئایەتێکی وا کە حوکمەکانی خواتان بۆ ڕوون ئەکەنەوە، هەروەها چەند نموونەیەکی سەیرو سەمەرەمان بۆ نازڵ کردوون لەوانەی لەمەوپێش بوون و بەسەرچوون، چەند پەندو ئامۆژگارییەکیشمان نازڵ کردووە بۆ ئەوانەی خۆیان لە گوناە ئەپارێزن.

(٣٥) خوا ڕووناکیی ئاسمان و زەوییە. نموونەی ڕوناکیی ئەو وەك ڕووناکیی تاقێکی بێ‌کەلێنە چرایەکی داگیرساوی تیا بێ‌و چراکە لە بلوورێکا بێ‌و بلوورەکە وەك ئەستێرەیەکی درەخشان وابێ، چراکە لە ڕۆنی دارێکی پیرۆز داگیرسابێ کە دارزەیتوونێ بێ نە ڕۆژهەڵاتی بێ‌و نە ڕۆژئاوایی کە هەرگیز خۆر لێی نەدا، بەڵکو بەدرێژایی ڕۆژ خۆر لێی بدا، لەوانە بێ ڕۆنەکە هەڵبگیرسێ با ئاگریشی لێ نەکەوێ، پڕتەوی چراکە لەسەر پڕتەوی بلوورەکە بێ. خوایش ئارەزووی لە ڕێپیشاندانی هەرکەسێ بێ ڕێی پیشان ئەدا بۆ لای ڕووناکی خۆی. خوا نموونە ئەهێنێتەوە بۆ خەڵك تا لە شت حاڵی بن و، زانایە بە هەموو شتێ.

(٣٦) واتای ئەم ئایەتە پێوەندی بە واتای ئایەتی پێشووەوە هەیە، واتە: لە کۆمەڵە خانوویەکا ڕێی پیشان ئەدا بۆ لای ڕووناکیی خۆی کە ڕێگای داوە بینایان بەرز بکرێتەوەو ناوی خوایان تیا بهێنرێ‌و بە بەیانی‌و ئێوارەدا سوبحانەڵڵایان تیا بکەن و باسی پاکی‌و بێگەردیی خوایان تیا بکەن، پیاوانێ.. (ڕستەکە لە ئایەتی پاشەوەدا دوایی دێ).

رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ
ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾
لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ
مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ
بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا
وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾
أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن
فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ
يَكَدْ يَرَىٰهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ
ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ كُلٌّ قَدْ
عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِى
سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ
خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ
وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾



(٣٧) پیاوانێ سوبحانەڵلاو باسی پاکیو بێگەردیی خوایان تیا ئەکەن بازرگانیو کڕین و فرۆشتن لەیادی خواو ناوهێنانی خواو نوێژکردن و زەکاتیمالّدانیان بێئاگا ناکاو هەمیشە خواپەرستیی ئەکەن و لە ڕۆژێکی وا ئەترسن کە چاو و دڵی لە ترسی خوا تیا هەڵئەگەڕێتەوە کە ڕۆژی قیامەتە.

(٣٨) بۆیە وا خواپەرستی ئەکەن تا خوا پاداشی باشترین کرداریان بداتەوەو لە فەزڵی خۆیشی لەو ئەندازەیان بۆ زیاد بکا کە موستەحەقینی و، خوایش بێ حیساب و پرسینەوە چیی ئارەزوو لێ بێ ڕزق و ڕۆزیی هەرکەسێ ئەدا کە خۆی بیەوێ.

(٣٩) ئەوانەیش کە کافرن کردەوەکانیان بێسوودو نابوودە وەك تراویلکەی بەردەخوێ لە دەشتێکی پانا کە تینسانی تینوو لە دوورەوە وا گومان ئەبا ئاوەو کاتێ ئەگاتە لای ئەبینێ هیچ نییەو هیچی لا دەسگیر نابیو تەنها خودا ئەبینێ لەویاداو ئەویش حسابی خۆی بۆ جێبەجێ بکاو تۆڵەی چەند گوناهی لەسەر بێ لێی بسەنێتەوەو خوایش حسابی خۆی زوو جێبەجێ ئەکا.

(٤٠) یاخود کردەوەکانیان وەك چەند پەردەی یەك لەسەریەکی تاریکی وایە لە دەریایەکی قووڵی بێبنا، ئەو دەریایە شەپۆلی بەسەردا بێت و بەسەر شەپۆلەکەیشا شەپۆلی تر بێت و بەسەر هەموو شەپۆلەکانیشەوە هەورێکی ڕەش بێ، تاریکستانێك بێ هەندێ بەسەر هەندێکی تریەوە. تەنانەت کە کابرا دەستی دەرکا لەوانەبێ لەبەر تاریکی نەیبینێ، ڕاستەکەیشی ئەوەیە کەسێ خوا ڕووناکیی پێ نەبەخشیبێ هیچ ڕووناکییەکی نابێ.

(٤١) ئایا نازانی کەوا خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیەو پەلەوەرە ڕیزبەستووەکانیش بەهەواوە هەریەکە بە زمانی حاڵی خۆی باسی پاکیو بێگەردیی ئەو ئەکاو ئەویش بەم باسی پاکیو بێگەردی کردنەی ئەمان ئەزانێ و، خوا ئاگادارەو ئەزانێ چی ئەکەن؟

(٤٢) هەر بۆ خوایە مولکی ئاسمانەکان و زەوی و، گەڕانەوەی هەمووشتێ هەر بۆ لای خوایە.

(٤٣) ئایا تۆ نابینی خوا پەڵە هەور پاڵ پێوە ئەنیو ئەیانخاتە گەڕو پاشان ئەیانداتە دەم یەك و ڕێکیان ئەخاو پاشان ئەیاننیشێنێتە سەریەك و کەڵەکەیان پێ ئەکا؟ جا ئەبینی بارانی لێوە دائەبارێ و، لە ئاسمانەوە لە کێوانی تەرزەوە کە لە هەوادان تەرزە دائەوەرێنیو باخ و باخات و دەغڵودان و ئاوەدانیی هەرکەسێ ئارەزووی لێ بێ لەو تەرزانە ئەگرێتەوەو هەرکەسیشی نارەزوو لێ بێ لێی لائەداو بروسکەیش لەو هەورە دەرئەچێ کە لەوانەیە تیشکەکە چاوی ئادەمزاد کوێر بکاو ڕووناکییەکەی بەرێ.

يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖۖ فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖۚ يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٤٥﴾ لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖۚ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤٦﴾ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلۡحَقُّ يَأۡتُوٓاْ إِلَيۡهِ مُذۡعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ أَمۡ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥۚ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخۡشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقۡهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَئِنۡ أَمَرۡتَهُمۡ لَيَخۡرُجُنَّۖ قُل لَّا تُقۡسِمُواْۖ طَاعَةٞ مَّعۡرُوفَةٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٥٣﴾



(٤٤) خوا شەو و ڕۆژ سووڕنەدا بەدوای یەکا یا کەم و زیادیان پێ ئەکا یا گەرماو سەرمایان ئەگۆڕێ. لەم کارەی خوادا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی بینابییان هەیەو شت ئەبینن.

(٤٥) خوا هەموو گیانلەبەرێکی بەسەر ئەرزا ڕۆیشتووی لە ئاو دروست کردووە کە ئاوی تۆمەو یا ئاوێکی تری تایبەتییە کە ئەو گیانلەبەرەی لێ دروست ئەبێ، جا هیی وایان هەیە لەسەر سك ئەخشێن و، هیی وایان هەیە لەسەر دوو پێ ئەڕۆن و، هیی وایان هەیە لەسەر چوار پێ ئەڕۆن. خوا هەرچی خواستی لەسەر بێ دروستی ئەکا. خوا دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا ئەشکێ.

(٤٦) بەڕاستی ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ چەند ئایەتێ کە هەموو جۆرە ڕاستییەکی ئایینیو دنیایی ڕوون ئەکەنەوەو، خوا هەرکەسی ئارەزوو لێ بێ هیدایەتی ئەدا بۆ ڕێگای ڕاست.

(٤٧) ئەو منافقانە ئەڵێن: باوەڕمان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەری خواو فەرمانبەرداریمان کردوون، کەچی پاش ئەم قسەیەیان تاقمێکیان پشت لە ڕاستی هەڵئەکەن. ئەمانە بەڕاستی باوەڕیان بە خواو پێغەمبەر نیەو درۆ ئەکەن کە ئەڵێن هەمانە.

(٤٨) کاتێ ئەمانە بانگ ئەکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا تا ئەوان بڕیاردەر بن لە هەر ناکۆکییەکدا لەگەڵ کەسێکی تریان هەبێ، کوتوپڕ تاقمێکیان پشت هەڵئەکەن و نایەن چونکە ئەزانن لەسەر حەق نین و ئەو بڕیارەی ئەیدەی لە قازانجی ئەوان نی‌یە.

(٤٩) ئەگەریش حەق بۆ ئەوان بێ بە مل بۆ کەچکردوویی دێن بۆ لای چونکە قازانجی خۆیانی تیایەو ئەوانیش هەر شتێ بە ترازووی قازانج و زیانی خۆیان ئەکێشن.

(٥٠) ئایا ئەمانە نەخۆشی لە دڵیانایە یا گومانیان لە ڕاستیی تۆدا هەیەو باوەڕت پێ ناکەن یا ئەترسن خواو پێغەمبەری خوا ناهەقییان لەگەڵ بکەن؟ نەخەیر هیچ کام لەم دوانەی دوایی نی‌یەو ئەمانە خۆیان لە حەق لادەرو ستەمکارن.

(٥١) قسەی ئەوانەی خاوەن باوەڕن هەر ئەوەیە کاتێ بانگ ئەکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەی حوکم بدا لەنێوانیانا، بڵێن: گوێمان لە فەرمانەکە بوو و گوێڕایەڵین بۆیو ئەوانەی وا ئەڵێن ئەوانەن ڕزگار ئەبن و بەر ڕەحمەتی خوا ئەکەون.

(٥٢) ئەوانەی فەرمانبەرداریی خواو پێغەمبەری خوا ئەکەن و لە خوا ئەترسن لەبەر ئەو گوناهانەی کردوویانەو لە پاشماوەی ژیانیانا خۆیان لە نافەرمانیی خوا ئەپارێزن، ئەوانەن بە پیرۆزیی دنیاو قیامەت ئەگەن.

(٥٣) سوێند ئەخۆن بە خوا بە سوێندێکی جەختلەسەرکراو کەوا ئەگەر تۆ فەرمانیان پێ بدەی دەس لە ماڵ و دارایی خۆیان هەڵبگرن بۆ خودا، دەستی لێ هەڵئەگرن و بەجێی ئەهێڵن. تۆیش بڵێ پێیان: بەدرۆ سوێند مەخۆن، ئەوەی داوای ئەکرێ لێتان فەرمانبەردارییەکی خوایە کە هەموو کەسێ ئەیزانێ چییەو چۆنەو سوێندی درۆ نی‌یەو خوا خۆی ئاگای لێیە ئێوە چی ئەکەن.

قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٥٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا۟ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾



(٥٤) پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەری خوا بکەن، جا ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئەوە لەسەر پێغەمبەرە ئەوەی دراوە بەسەر شانیا کە ئامۆژگاریکردن و ڕێپیشاندانی خەڵکە بۆ ئیسلامەتیو، لەسەر ئێوەیشە ئەوەی دراوە بەسەر شانتانا کە گوێبۆشلکردنیەتی. ئەگەر فەرمانبەرداریيشی بکەن هیدایەت ئەدرێنو ئەکەونە سەر ڕێی ڕاست و، پێغەمبەریش لەوە زیاتری لەسەر نی‌یە کە فەرمانی خوا بەڕاست و ڕەوانی بە خەڵك ڕابگەیەنێ.

(٥٥) خوا گفتی داوە بەوانەتان کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باشیان کردووە، ئەیانکا بە جێنشینی ئەوانەی پێش ئەوان دەستەڵاتدار بوون بەسەر زەویدا وەك ئەوانی پێشوویشی کرد بە جێنشینی دەسەڵاتدار لە جێی پێشینانی خۆیان و، ئەو ئایینەیان بۆ دائەمەزرێنێ کە بۆی پەسەند کردوون و، لە جیاتیی ئەو ترسەی بەسەریانەوەیە لە زۆرداران ئەمن و ئاسایشیان بۆ دێنێ بەمەرجێ ئەوانیش بەندەیيو فەرمانبەرداریی من بکەن و کەس نەکەن بە هاوبەشم لە خوایەتیدا، هەرکەسیش لەپاش ئەم پایەو مایەیە کە خوا ئەیداتێ کافر ببێو لە فەرمانی خوا دەربچێ ئەوانە فاسقن و لە فەرمانی خوا دەرچوون و لایان داوە.

(٥٦) نوێژ بکەن و زەکاتی ماڵ بدەن و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێ لە لایەن خواوە.

(٥٧) گومان مەبەن کەوا ئەوانەی کافرن کارێ لە خوا ئەکەن نەتوانێ لەم زەوییەدا لەناویان بەرێ. ئەتوانێ هەرچی ئارەزووی لێ بێ لێیان بکاو لەو دنیایش جێگایان لە دۆزەخایەو، دۆزەخیش خراپترین سەرەنجامە بۆ هەرکەس تووشی ببێ.

(٥٨) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە با ئەو کەسانەی مولکی ئێوەن واتە بەندەی ئێوەن و ئەوانەی نەگەیشتوونەتە قۆناغی شەیتانیبوون و باڵغ نەبوون ئەگەر ویستیان بێنە ژوورەوە بۆ ناو ماڵ بۆ لاتان لە سێ کاتا تەقە بدەن لە دەرگاو پرستان پێ بکەن و لەو سێ کاتەدا بێپرس‌پێ‌کردن و ڕێگادانیان نەیەنە ژوورەوە نەوەك ئێوە ڕووت بن و لەگەڵ خێزانی خۆتانا ڕاکشابن: بەر لە نوێژی بەیانی و، نیوەڕۆژان کە جلتان دائەکەنن و لە ماڵا ئیسراحەت ئەکەن و، دوای نوێژی عیشا کاتێ کە خۆتان ئامادە ئەکەن بۆ نووستن. ئەم سێ کاتە کاتی ڕووتین بۆ ئێوە. پاش ئەم کاتانە ئەگەر هەندێکتان هاتوچۆی لای هەندێکتان بکەن نە بۆ ئێوە گوناهەو نە بۆ ئەوان، لەو کاتانەی هەندێکتان دێن بۆ لای هەندێکتان. خوا بەم جۆرە ئایەتی خۆیتان بۆ ڕوون ئەکاتەوەو خوا زاناو خاوەن حیکمەتە.

وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾



(٥٩) کاتێکیش کە مناڵەکانتان گەیشتنە قۆناغی خەوبینین و باڵغ بوون، با ئەوانیش ئەگەر ویستیان هاتوچۆی ماڵی خەڵك بکەن پرس بکەن و ئیزن بخوازن وەك ئەوانەی تر کە ئیزن ئەخوازن. خوا ئایەتی خۆیتان بەم جۆرە بۆ ڕوون ئەکاتەوەو خوا زاناو خاوەن حیکمەتە.

(٦٠) ئەو پیرەژنانەی لە ماڵا دانیشتوونو هیوای شووکردنیان نەماوە، گوناهیان ناگا ئەگەر پۆشاکی عادەتیی خۆیان لابەرن و تەنیا لەشپۆشیان پێوە بمێنێ بە مەرجێ جوانیو شوێنی جوانی وەك سینەو بەرۆك و قۆڵ و ڕان و پووزیان دەرنەخەن. خۆ ئەگەر خۆیان بە عیففەت و حەیاوە ڕاگرن و پۆشاکی عادەتییان لەبەرا بێ باشترە بۆیان و خوا گوێی لە هەموو شتێکەو بە هەموو شتێ ئەزانێ.

(٦١) تاوان لەسەر کوێرو شەل و نەخۆش نییە بێنە ماڵتان و خواردەمەنی بخۆن، واتە ئەو لێکەوتووانەی خۆیان ماڵ و حاڵیان نییەو کەس شك نابەن نانیان بداتیو خزمەتیان بکا دروستە بێن لە ماڵی خەڵکی تر نان بخۆن، چونکە ژیاندنی کەسانی پەککەوتەی بێکەس و بێدەستەلات لەسەر دەوڵەمەندانی موسوڵمانە. هەروا تاوان نییە بۆ خۆیشتان لە ماڵی خۆتانا خواردەمەنی بخۆن بە هەر شێوەییو پێویست ناکا هەموو ئەهلی ماڵەکە کۆببنەوەو ئەوجا پێکەوە نان بخۆن. هەروا تاوانتان لەسەر نییە لە ماڵی باوك و دایك و براو خوشك و مام و پوور (خوشکی باوك ) و خاڵ و پوور (خوشکی دایك ) و لەو ماڵانەدا بخۆن کە کلیلیان دراوەتە دەستان و، لە ماڵی دۆست و برادەرتان بخۆن بە کۆمەڵ یا یەکەیەکە. جا کە چوونە ماڵێ لەم ماڵانە سەلامێکی پیرۆزی خاوێنی خوا قووبووڵ کردوو لە خۆتان بکەن. خوا بەم جۆرە ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە بەڵکو عەقڵ بگرن.

إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ
عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ
أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ
لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ
ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ
بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ
أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ
مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ
يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾

## سُورَةُ الفُرْقَانِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا
﴿١﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ
يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾



(٦٢) بەڕاستی خاوەن ئیمانەکان ئەوانەن ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا هێناوەو، کاتێ لەسەر کارێکی وا پێویستی بە کۆمەڵی خەڵك بێ لەگەڵ پێغەمبەر بن، تا ئیزنی لێ نەخوازن و ئیزنیان نەدا نەڕۆنو کارەکە بەجێنەهێڵن. جا بێگومان ئەوانەی کە داوای ئیزنت لێ ئەکەن ئەوانەن بەساغی ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا هێناوە. بۆیە ئەگەر ئیزنت لێ بخوازن بۆ هەندێ کاروباری خۆیان کێیانت ئارەزوو لێ بوو ئیزنی بدەو داوا لەخوا بکە لێیان خۆش ببێ خوا گوناهبەخشو بەڕەحمە.

(٦٣) بانگ کردنی پێغەمبەر بۆ یەکێ لە ئێوە وا لێ مەکەن وەك یەکێکتان بانگی یەکێکتان بکا کە لەوانەیە گوێی نەداتێو وەڵامی نەداتەوە. کە پێغەمبەر بانگی لە یەکێکتان کرد گورج بەڵێی بۆ بکەن و بەدەنگیەوە بچن. خوا بەوانەتان ئەزانێ کە خۆیان ئەدزنەوەو لە کۆمەڵ دەرئەچن و خۆیان لە شوێنێکدا حەشار ئەدەن و یەك پەنای یەك ئەدەن. کەواتە با ئەوانەی لە فەرمانی پێغەمبەر دەرئەچن بترسن و ئاگادار بن نەوەك تووشی فیتنەو هەرایەك بن یا سزایەکی سەختی خوا بیانگرێتەوە.

(٦٤) بێدار بن ! هەرچی لە ئاسمانەکان و لە ئەرزدایە هیی خوایە. بێگومان خوا بە هەموو ئەو ئەخلاق و ڕەوشتانە ئەزانێ کە ئێوە لەسەرینی. ڕۆژێکیش کە ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوا کە ڕۆژی قیامەتە خەبەریان ئەداتێ کە لە دنیادا چ گوناهێکیان کردووە. خواوەند ئاگاداری هەموو شتێکەو پێی ئەزانێ.

## سووڕەتی (الفُرْقَانِ)

**مەککەییە ئایەتەکانی ٦٨ - ٧٠ ی نەبێو (٧٧) ئایەتە.**

(١) گەلێ گەورەو پایەدارە ئەو خوایەی قورئانێکی پیرۆزی وای ناردووەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر کە ڕاست و درۆو حەقو ناحەق لێك جوێ ئەکاتەوە، بۆ ئەوەی ئەهلی جیهانەکانی پێ بترسێنێ لەو ڕۆژەی خوا سزای خراپەی لە خراپەکاران تیا ئەسێنێتەوە.

(٢) ئەو خوایەی کە مولکی ئاسمان و زەوی هیی ئەوەو، ئەوەی بۆ خۆی ڕانەگرتووەو ئەویستووەو هاوبەش و هاوڕێی لە گەورەییو پادشایی خۆیا نەبوەو نییەو، هەموو شتێکی دروست کردووەو لە پێش دروستکردنیا لە عیلمو زانیاریی خۆیا ئەندازەی بۆ داناوەو بەو پێیە دروستی کردووە.

وَاتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَاةً وَلَا نُشُورًا ﴿٣﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ فَقَدْ جَاءُوا ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾ قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ وَقَالُوا مَالِ هَٰذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا وَقَالَ الظَّالِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾ انظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الْأَمْثَالَ فَضَلُّوا فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ الَّذِي إِن شَاءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًا ﴿١٠﴾ بَلْ كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِالسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾



(٣) ئەو کافرە بت پەرستانە چەند بەناوخوایەکی هیچوپووچی وایان بۆ خۆیان بڕیارداوەو کردونیانن بە خوای خۆیان و ئەیانپەرستن کە هیچیان پێ دروست ناکرێو بۆ خۆیان بنیادەم دروستیان ئەکا یا هەر خوا خۆی دروستی کردوون، وەك دارو بەردو تەنانەت بۆ خودی خۆیشیان هیچ زیان و سوودێکیان نی‌یەو نە مەرگیان بەدەستەو نە ژیان و نە زیندووکردنەوە لەو دنیادا.

(٤) کافرەکان لەبارەی قورئانەوە وتیان: ئەم قورئانەی کە موحەممەد هێناویەتیو ئەڵێ خوا بۆی نازڵ کردووە لە درۆیەکی دەستهەڵبەستی خۆی بەولاوە نی‌یەو هەندێ کەسی تریش یارمەتییان داوە بۆ هەڵبەستن و دروستکردنی. بەڕاستی ئەمانە کە وا ئەڵێن زوڵم و ناحەقیان کردووە کە قورئانی کەلامی خوا بە دەستهەڵبەست دائەنێن و ساختەچییەتییان کردووە کە قورئانی کەلامی خوا ئەدەنە پاڵ پێغەمبەر خۆی و، ئەڵێن بۆ خۆیو بەیارمەتیی چەند کەسێك دروستی کردووە.

(٥) هەروا ئەم کافرانە وتیان: ئەم قورئانە ئەفسانەی پێشینانە لەڕووی کتێبە ئەفسانەکانی کۆن بۆی نووسراوەتەوەو لەبەر ئەوەی بۆ خۆی نەخوێندەوارە بەیانیو ئێوارە بەسەریا ئەخوێنرێتەوە تا لەبەری بکا.

(٦) تۆ بەو کافرانە بڵێ: نەخەیر وا نی‌یە کە ئێوە ئەڵێن، ئەم قورئانە ئەو خوایە ناردوویەتە خوار کە هەرچی ڕازو نهێنی لە ئەرز و ئاسمانا هەیە هەمووی پێ ئەزانیو خوایەکی تاوانبەخش و میهرەبانە وا ئێستا سزاتان نادا لەسەر ئەم درۆ و دەلەسانەی لەبارەی قورئانەوە ئەیانکەن و لێتان ئەگەڕێ تا ڕۆژی قیامەت، ئەگینا ئەبوو هەر ئێستا لەم دنیای ڕۆشنەدا تووغرۆی بکردنایە.

(٧) کافرەکان بە خەیاڵی خۆیان بۆ بەڵگەهێنانەوە کە گوایە پێغەمبەر پێغەمبەری خوا نی‌یەو لەخۆیەوە ئیددیعای پێغەمبەرایەتی ئەکا، ئەڵێن: ئەم پێغەمبەرە چی‌یەتیو چۆن پێغەمبەرێکە خواردن ئەخواو بە ناو بازاڕا دێو دەچێ وەك خەڵکی عادەتی؟ ئەگەر ڕاست ئەکا پێغەمبەرە بۆچی فریشتەیەکی لە ئاسمانەوە بۆ نەنێرراوەتە خوارێ لەگەڵیا بێو پێکەوە بێن خەڵك لە بێ فەرمانیی خوا بترسێنن تا ئێمەیش باوەڕی پێ بکەین؟

(٨) یا بۆ گەنجینەیەکی لە ئاسمانەوە بۆ فڕێنادرێ تا زێڕو زیوی زۆری لە بەردەستا بێ بە ئارەزووی خۆی لێی خەرج بکا یا بۆ باخ و باخاتێکی نی‌یە لە میوەکانی بخوا؟ ئەم سەتەمکارە ناحەق وێژانە بە موسوڵمانەکان ئەڵێن: ئێوە شوێن پیاوێکی جادوولێکراو ئەکەون.

(٩) سەیرکە ئەم کافرانە چۆن ئەم باسە سەیرو عەجاییە دوور لە عەقڵو عادەتانەیان هێنایە ئاراوە بۆ تۆو گومڕابوونو وایان لێ هات ڕێگایەکی ڕاستیان پێ نادۆزرێتەوە بۆ خۆیان تا بزانن چی بکەنو چۆن بجووڵێنەوە.

(١٠) گەلێ گەورەیە ئەو خوایەی ئەگەر بیەوێ چاتر لەو شتانەت ئەداتێ لە دنیادا کە ئەو کافرانە ئەڵێن بۆ نی‌یەتی. ئەو بەهەشتگەلی وات ئەداتێ جۆگەو جۆباری ئاوی سافیان بەژێرا ئەڕواو چەندین کۆشكو تەلارت بۆ دروست ئەکا.

(١١) بەڵام ئەو کافرانە باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نی‌یە کە چاك پاداشی چاکەی خۆیو خراپ سزای خراپەی خۆی تیا وەرئەگرێ. ئەوەیش کە باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت نەبێ ئێمە دۆزەخی پڕ لە ئاگرمان بۆ سازداوە.

إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ لَّا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾ قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَاءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ خَالِدِينَ ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْئُولًا ﴿١٦﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ فَيَقُولُ أَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي هَٰؤُلَاءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا السَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا سُبْحَانَكَ مَا كَانَ يَنبَغِي لَنَا أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَآبَاءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا الذِّكْرَ وَكَانُوا قَوْمًا بُورًا ﴿١٨﴾ فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا ۚ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾ وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾



(١٢) کاتێ کە ئەو دۆزەخە کافرەکان لە دوورەوە بەدی ئەکا، ئەمانیش هەر لەدوورەوە گوێیان لە دەنگی پڕ قارو قینی ئەبێ‌و لرفەی گڕو بڵێسەی هەر لە دوورەوە ئەبیسن.

(١٣) کاتێکیش ئەو کافرانە فڕێ ئەدرێنە شوێنێکی تەنگەڵانی دۆزەخەوەو لەوێدا جووت جووت و کۆمەڵ کۆمەڵ کۆت و زنجیریان لە دەست و پێ کراوە ئەکەونە هاوار هاوارو بانگەبانگ و واوەیلاکردن و خۆزگەی مەرگی خۆ خواستن.

(١٤) فریشتەی بەرپرسی سزادانیش لە وەڵامی هاوارو بانگەبانگ و واوەیلا کردنەکەیانا پێیان ئەڵێن: هەر تەنیا جارێ ئاواتی مەرگ مەخوازن، زۆر جار ئاواتی مەرگی خۆتان بخوازن چونکە مەرگ تاقە جارێکەو ئەبڕێتەوە، بەڵام دۆزەختان هەمیشەیی‌و هەتاهەتاییە.

(١٥) تۆ ئەی موحەممەد بەو کافرانە بڵێ: جا توخوا ئەم حاڵەی ئێستاتان لەم دۆزەخەدا باشە یا بەهەشتی بەردەوام و پایەدار کە گفتی پێ دراوە بەو کەسانەی لە خوای خۆیان ئەترسن و ئەبێ بە سەرەنجامی کاریان ؟

(١٦) هەیە بۆ ئەهلی بەهەشت لەو بەهەشتەدا کە گفتیان دراوەتێ پێی، هەرچی شتێ خۆیان ئارەزووی بکەن. هەمیشەیش لەو بەهەشتەدا ئەمێننەوەو قەت لێی ناچنە دەرەوەو ئەمە گفتێکە خوا داویە بەو لەخواترسانەو شەوانیش داوای ئەکەن و خوا گفتەکەی خۆییان بۆ دێنێتەدی.

(١٧) بیر لەو ڕۆژە بکەرەوە کە خوا بتپەرستەکان زیندوو ئەکاتەوەو کۆیان ئەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ بتەکانیان کە ئەیانپەرستن و خوایان نەئەپەرست و پێیان ئەڵێ: ئەی بتەکان ! ئێوە بوون بەندەکانی منتان گومڕا کردو واتان لێ کردن لە خوا پەرستنەوە بێنە سەر پەرستنی ئێوە، یان ئەوان خۆیان بوون ڕێیان گوم کرد؟

(١٨) بتەکان دێنە دەنگ و ئەڵێن: خوایە پاکی‌و بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە. ئێمە هەرگیز بۆمان نەبووە لە تۆ بەولاوە کەس بگرین بە پشت و پەناو بە خەڵك بڵێین پشتمان پێ ببەستن، بەڵام تۆ خۆت گوزەرانی خۆشت بە خۆیان و باووباپیرانیان داو ئەوانیش لە خۆبایی‌و بەلەسە بوون‌و ناوهێنانی تۆیان لە یادچوو و گوێیان بە تۆو بە ئایینی تۆ نەئەداو تاقمێکی لە ڕووی ئایینەوە ماڵوێران و بەربادیان لێ دەرچوو.

(١٩) جا خودا بە بتپەرستەکان ئەڵێ: ئەوەتا ئەو بتانەی ئێوە ئەتانپەرستن قسەکانتانیان بەدرۆخستەوە کە ئەتانوت: ئەوان ئێمەیان گومڕا کردو لە ڕێی موسوڵمانەتی لایان داین و، ئێوە ئێستا نە ئەتوانن سزای خوا لە خۆتان لابدەن و نە کەسێکتان دەسگیر ئەبێ یارمەتییەکتان بداو، هەرکەسیش ستەمکاریی بکا سزایەکی گەورەی پێ ئەچێژین.

(٢٠) ئێمە بەر لە تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە وەك خەڵکی تر خواردنی نەخواردبێ‌و بەناو بازاڕدا نەڕۆیشتبێ و، ئێمە هەندێ لە ئێوەمان کردووە بە مایەی تاقیکردنەوەی هەندێکی ترتان تا بزانین کێ سەبرو تەحەمولی هەیەو کێ نی‌یەتی، وەك ئەوە کە هەژار بە دەوڵەمەند تاقی بکەینەوە بزانین سەبر ئەکا لەسەر هەژاریی خۆی و، پێغەمبەران بەو خەڵکانە تاقی بکەینەوە کە ناردوومانن‌تە سەریان بزانین تەحەمولی ئازارو قسەی تاڵ و سوێری باوەڕنەهاوردووەکان ئەکەن یا نەء، خوایش خۆی چاوی لێیە هەریەکە چۆن ئەجوولێتەوەو چۆن مامەڵە ئەکا.

۞ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَاۗ لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٢١﴾ يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشۡرَىٰ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُجۡرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴿٢٢﴾ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا ﴿٢٤﴾ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ﴿٢٦﴾ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ﴿٢٨﴾ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴿٣٠﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا ﴿٣١﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ﴿٣٢﴾





(٢١) ئـەو كافرانـەی هیـوای گەیشـتن بـە ئێمـەیان نیـیە چـونكە باوەڕیـان بـە ڕۆژی قیامەت و حیساب و كیتابی پێش بەهەشتو دۆزەخ نیـیـە، وتیـان: ئـەوە بۆچـی فریشـتەیەكمان لـە لای خـواوە نـازڵ نەكرایـە سـەر ئاییـنمـان پـێ ڕابگەیـەنێ لـە جیـاتی پێغەمبەرێكی ئادەمزادی وەك خۆمان؟ یا بـۆ بە چاوی خۆمان خوای خۆمان نابینین؟ ئەمانە خۆیانیان زۆر بە زل زانیوە داوای شتی وایـان كردووەو تا ڕادەیەكی زۆر گـەورە لـە سنوری خۆیان دەرچوون.

(٢٢) لەو ڕۆژەدا كە ئەوانە فریشتەی سزادان بـە چـاوی خۆیـان ئـەبینن هـیچ مژدەیـەك و هەواڵێكی خۆش بۆ تاوانبـاران نـابێ و پێیـان ئەڵێن: دیداری خودا یا ڕزگـاربوون لـە سزای دۆزەخ یـان چوونەبەهەشـت بـۆ ئێـوە نیـیەو لێتان قەدەغەكراوە.

(٢٣) ئێمە ئەچین بەلای ئەو كارانەیانـەوە لـە دنیادا كردوویانن، ئەیكەین بە تۆز و گـەردی بابردوو، چونكە بـاوەڕ بـە خـواو مەرجـەكانی تری ئیمـانی لەگـەڵ نـەبوەو لەبـەر ئـەوە ئـەو كارەچاكانەیان هیچ دادێكیان نادا.

(٢٤) ئەوانەی كە بەهەشتین و جێگـەیان لـەو ڕۆژەدا لـە بەهەشـتدایە ئەوانـە جێگـەیان لـە هەمووان باشترەو شوێنی حەسانەوەیان لە هی هـەموو كـەس خۆشـترە. ئـەم (باشـتری )و (خۆشتری) یە یا بە بەراورد لەگـەڵ (باشـی)و (خۆشـی)ی كافرانـە لـە دنیـادا یـا هـەر بەمەعنای (باشی) و (خۆشی) یـە نـەك ئـەوە كە لە هی كافرەكان (باشتر) و (خۆشتر) بێ لەو دنیا چونكە جێی ئەوان دۆزەخە كەوا سزایان ئەدرێ تیایـداو هـیچ خۆشـییێكی تیا نییە. (٢٥) لەو ڕۆژەدا كە ئاسمان لەت لەت ئەبێ بە هۆی لێدەرچوونی تۆزی وەك هەورەوەو فریشتە ئەنێررێنە خوارەوە بـۆ سەر زەوی كردارنامەی بەندەكانی خوا لەگەڵ خۆیان دێنن.

(٢٦) ئەو ڕۆژە مالیكیەت و خاوەنایەتی ڕاستەقینە هەر بۆ خوایەو، كەسی تر، با بە شێوەی مەجازیش بێ، بۆ ئەوە ناشێ بـە خاوەنی هیچ دابنرێ و، ئەو ڕۆژە ڕۆژێكی زۆر قورس و گران ئەبێ بۆ كافران چونكە كاتی لێپرسینەوەیان هاتووە.

(٢٧) بیر لەو ڕۆژە بكەرەوە كە ستەمكار لەداخانـاو لەبەر پەشیمانی خۆی لەوە كە لە دنیادا ستەمكاریی كردووە دەستی خـۆی ئەگەزێ و ئەڵێ بریا لەگەڵ پێغەمبەری ڕێگاپیشاندەردا ڕێگای ڕاستی ئیسلامەتیم بگرتایەتەبەرو بەگوێم بكردایە.

(٢٨) هەی هاوار! خۆزگە فلانەكەسی گومڕاو لەخوایاخیم نەكردایە بە دۆستی خۆم كە بە قسەی ئەوم ئەكرد و گـومڕای كـردم.

(٢٩) بەڕاستی ئەو كابرا گومڕای كردم و دووری خستمەوە لە یادی خوا پاش ئەوەی كـە هـاتبوە بەردەستم و ئـەمتوانی یـادی خوا بكەمەوەو ڕێی ڕاست بگرمەبـەر. بەڕاسـتی شـەیتان كـە ئـادەمزاد لـە ڕێگـای خـوا دوورئەخاتـەوەو ئەیخاتـە سـەر خـەتی گومڕاهان، نائومێدو دەسخەڕۆی ئەكا.

(٣٠) پێغەمبەر بە خوای خۆی وت: خوایە! ئەم خێڵەی من كە منت ناردووەتە سەریان ڕێگای ئیسلامەتییان پیشان بدەم، ئـەم قورئانەیان وەلاخستووە كە بە منا بۆت ناردوون بە فەرمانی بكەن و بەگوێرەی ئەو بجووڵێنەوە.

(٣١) هەر بەم جۆرە كە دوژمنی كافرمان بۆ گیانی تۆ دروست كردووە، بۆ هەموو پێغەمبەرێكیش بەر لە تۆ دوژمنێكمـان لـە تاوانباران دروسـت كردبـوو بـەڵام تـۆ گـوێی مـەدەرێ، تـۆ خـوات بـە تـەنیا خـۆی بەسـە بـۆ ڕێگـا پیشـاندان و یارمەتیـدانت لەتەنگانەدا.

(٣٢) كافرەكان وتیشیان: ئەوە بۆ قورئانی بەجارێ بۆ نەهاتووەتە خوار؟ وەڵامی ئەم قسـەیەی كـافران ئەوەیـە بۆیـە بـە پارچـە پارچە ناردوومانەتە خوارەوە تا دڵتی پێ بەهێز بكەین و بتوانی لەبەری بكەیو لەسەرخۆو بەئارام بۆمان خوێندیـەوە تـا بـاش بۆت ڕەوان بكرێ.

وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَا مَعَهُ أَخَاهُ هَارُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا اذْهَبَا إِلَى الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَدَمَّرْنَاهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ لَمَّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ أَغْرَقْنَاهُمْ وَجَعَلْنَاهُمْ لِلنَّاسِ آيَةً وَأَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَ وَأَصْحَابَ الرَّسِّ وَقُرُونًا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ الْأَمْثَالَ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى الْقَرْيَةِ الَّتِي أُمْطِرَتْ مَطَرَ السَّوْءِ أَفَلَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَهَا بَلْ كَانُوا لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ آلِهَتِنَا لَوْلَا أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ الْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾



(٣٣) ئەو کافرانە هیچ پرسیارێکی سەیرو سەمەرەت لێ ناپرسن، بێ ئەوەی ئێمەیش وەڵامێکی ڕاست و دروستیت بۆ بهێنین و پیشانت بدەین کە واتاو لێکدانەوەی لە هی ئەوان جوانتر و بەرێوجێتر بێ.

(٣٤) ئەو کافرانە کە خڕئەکرێنەوەو لەپەورووی پاڵیان پێوە ئەنرێ بۆ دۆزەخ، ئەوانە شوێنیان لە هەموو کەس گومڕاترو ڕێی ڕاستونکردووترن.

(٣٥) ئێمە بەڕاستی کتێبی تەوراتمان دا بە مووساو هاروونی برایمان بۆ کرد بە پشتیوان تا پەیامی خوا لەگەڵیا بگەیەنێ بە خەڵك.

(٣٦) جا پێمان وتن: بڕۆن بۆ لای ئەو کۆمەڵە خەڵکە کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ داناوە، ئەوانیش ڕۆیشتن بۆ لایان، بەڵام ئەمان باوەڕیان پێ نەکردن، ئێمەیش بە وێرانکردنێکی خراپ وێرانمان کردن.

(٣٧) قەومی نووحیش کە نووحمان ناردبوە سەریان و باوەڕیان پێ نەکردو پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا، بە ئاوی تۆفان خنکاندمانن و کردمانن بە پەندو عیبرەت بۆ خەڵك و، سزایەکی سەختیشمان بۆ ئەو دنیا ئامادە کردووە بۆ ستەمکاران.

(٣٨) قەومی عاد و قەومی سەموود و خێڵی بیرەکەیش کە شوعەیب پێغەمبەرمان ناردبوو بۆلایان و، چەند نەوەی زۆری تریش لەو نێوانانەدا هەموو لە فەرمانی خوا یاخی بوون و هەموومان لەناوبردن.

(٣٩) پەندو ئامۆژگاریمان بۆ هەموو ئەمانە هێنایەوەو هیچیان گوێڕایەڵی فەرمانی خوا نەبوون و ئێمەیش هەموویانمان تەفر و توونا کرد.

(٤٠) قورەیشییە کافرەکان چەند جار لە سەفەری شامیانا بەسەر ئەو ئاوەدانییەدا گوزەریان کردووە کە بارانی خراپی بەسەرا بارێنراوەو بەردە باران کراوە، ئاخۆ ئەمانە ئەو دێیەیان بە چاوی خۆیان نەئەدی چیی بەسەر هێنراوە؟ بەڵێ ئەیاندی، بەڵام بە هیوای زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت نەبوون، بۆیە پەندیان پێ وەرنەئەگرت.

(٤١) هەرکاتێ بتبینن بە گاڵتەجاڕی خۆیان نەبێ بە هیچی ترت ناکەن، واتە: هەرچەند بتبینن گاڵتەت پێ ئەکەن، ئەڵێن: ئەم کابرایە گوایە خوا بە پێغەمبەرێتی ناردوویە؟ قەت ئەم پیاوە بۆ ئەم کارە دەس نادا.

(٤٢) ئەڵێن: ئەوەندەی نەمابوو ئەم کابرا ڕێمان بۆ لای خوای خۆمان پێ ون کاو لە ئایینی خۆمان هەڵمانگێڕێتەوە، ئەگەر دامان بە بتەکانی خۆمانا نەگرتایەو لەسەر ئایینی خۆمان سوور نەبووینایە. با هەروا بڵێن. سبەینێ کە سزای دۆزەخ بە چاوی خۆیان ئەبینن ئەزانن کێ لە هەرکەس گومڕاترە؟ دیارە ئەوان گومڕان کە لەسەر بتپەرستی مابوونەوەو موسوڵمان نەبوون.

(٤٣) پێم بڵێ: کەسێ کە ئارەزووبازیی خۆی بۆخۆی کردبێ بە خواو بەگوێرەی ئەوە هەڵسوکەوت بکا، تۆ خۆت ئەکەی بە جێگری ئەوو ئەتوانی دەستی لە خراپەکردن و ئارەزووپەرستی پێ بگێڕیتەوە؟ بێگومان کاری وا بە تۆ ناکرێ.

أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ۚ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ۞ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ۗ وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾



(٤٤) یان لات وایە بەشی زۆری ئەو جۆرە كەسانە لەوانەن قسەی ڕاستیان بەگوێدا بچێ، یا بفامن و ڕاست و درۆ و چاك و خراپ لێك جیا بكەنەوە؟ ئەوانە وەك چوارپێ نەبێ وەك هیچی تر وانین و بەڵكو لە بارەی لێكجوێكردنەوەی ڕێی ڕاست و چەوتەوە لە چوارپێش گومڕاترن.

(٤٥) ئەوە تۆ ناڕوانی بۆ كاری خوای خۆت چۆن سێبەری بەسەر پانتایی زەویدا كێشاوە وەك لەپاش ڕۆژاواوە تا خۆركەوتنی ڕۆژی دوایی و، ئەگەر ئارەزووی لێ بوایە ئەو سێبەرەی تا دنیا دنیایە ئەهێشتەوە. پاشان ڕۆژی لە كەناری ئاسمانەوە دەركردو كە ڕۆژ دەركەوت، ئەو ڕۆژدەركەوتنەی كرد بە دەلیلی ئەوە كە سێبەر شتێكی جێگرتوو بوو لەبەر ئەوە كە لە هەندێ شوێنا مایەوە لە هەندێ شوێنا نەما وەك فەرمویەتی (ثم جعلنا الشمس علیه دلیلا) واتە: ڕۆژمان كرد بە دەلیل و بەڵگە لەسەر بوونی سێبەر.

(٤٦) پاشان وردە وردە ئەو سێبەرەمان وەرگرتەوە بۆ لای خۆمان، واتە هەرچەند تیشكی ڕۆژ زەوی زۆرتر دائەگرێ سێبەر كەمتر ئەبێتەوە. (٤٧) خوا ئەو خوایە شەوی بۆ كردوون بە سیپاڵ وەك چۆن سیپاڵ لەش داپۆشێ شەویش هەروا خەڵك دائەپۆشێ و ئەیانشارێتەوە و، خەوی بۆ كردوون بە مایەی حەسانەوەی لەش و مێشك و، ڕۆژی بۆ كردوون بە مایەی بڵاوەلێكردن بە زەویدا بۆ كاسبی و ڕۆزی پەیدا كردن.

(٤٨) خوا ئەو خوایەیە با ئەنێرێ بەمژدەدەری پێش هاتنی ڕەحمەتی خۆی كە بارانەو، ئاوی پاكی پاكەوەكەریشمان كە بارانە لە ئاسمانەوە ناردووەتە خوار.

(٤٩) بۆئەوەی وڵاتێكی لەبەر بێبارانی لە تینوێتیدا مردووی پێ زیندوو بكەینەوە و، سەوزایی تیا بڕوێنینەوە و، لە ناو ئەو گیانلەبەرانەدا كە دروستمان كردوون ئەو ئاوە دەرخواردی چوار پێ و ئادەمزاد بدەین.

(٥٠) بەڕاستی ئەم باسانەمان بە جۆرەهای جیاجیا لە ناو خەڵكا گۆڕیوەو بۆمان گێڕاونەتەوە بۆ ئەوەی بیربكەنەوەو بزان خوا چ تواناو بەدەسەڵاتێكە، بەڵام بەشی زۆری خەڵك لە ئینكاری خواو بێ فەرمانیكردنی بەولاوەیان نەویستووە.

(٥١) ئەگەر بمانویستایە لەهەر دێیەكا پێغەمبەرێكمان ئەنارده سەر خەڵك بیانترسێنێ لە ڕۆژی دوایی.

(٥٢) دەی تۆ بەگوێی كافرەكان مەكەو بە چەكی قورئان غەزایەكی گەورەیان لە دژ بكە. (٥٣) خوا ئەو خوایە كە دوو دەریا ئەكا بە دراوسێ و هاوشانی یەك، یەكیان شیرینەو تینوێتی لائەباو یەكیان سوێرەو لەڕادەبەدەر شۆرەو، ڕێ لەیەك گرێكیشی لە نێوان هەردووكیانا داناوەو ناكۆكییەكی زۆریشی خستووەتە نێوان سروشتی هەردوكیانەوە، كە هەریەكێ تامێكی هەیە و، كە كەمەكەیان ئەڕژێتە ناو زۆرەكەیان تا ماوەیەك هەر یەكێكیان ڕێوجێیەكی تایبەتی خۆی هەیەو تێكەڵی یەك نابن و، هەركام تامی خۆی ئەپارێزێ وەك ئاوی شەتتولعەرەب كە ئەڕژێتە دەریای هیندەوە ئەمیان شیرینەو ئەویان سوێرەو ماوەیەكیش ئاوە شیرینەكەی شەتتولعەرەب لە دەریا سوێرەكەی هیندا هەر بە شیرینی ئەمێنێ‌و تێكەڵی ئەو نابێ و كار لەیەك ناكەن.

(٥٤) خوا ئەو خوایە لە ئاوی تۆم ئادەمزادی دروست كردووەو پاش ئەوە ئەو كۆمەڵە ئادەمزادانەی كردووە بە دوو بەش بەشێكیان نێرینەكانیانن و كە ئەمیان كوڕی ئەوو ئەو كوڕی ئەوی ترەو، بەشێكیان مێینەكانیانن كە لە ڕێگای شووكردن و ژن و ژنخوازەوە خزمایەتییان لەگەڵ نێرەكانیان پێ ئەكرێ‌و، خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا ئەشكێ.

(٥٥) ئەو كافرە بتپەرستانە لە جیاتیی ئەوەی خوا بپەرستن شتی وا ئەپەرستن نە قازانجیان پێ ئەگەیەنێ و نە زیان واتە: خۆی بۆخۆی دەسەڵاتی نە چاكەو نە خراپەی نیـیە. بەڕاستی كافر لەدژی خوا پشتە، پشتی شەیتان ئەگرێ لە دوژمنایەتی كردنی خوادا.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٥٦﴾ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْۤ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا۩ ﴿٦٠﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجٗا وَقَمَرٗا مُّنِيرٗا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ لِّمَنۡ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا ﴿٦٢﴾ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ﴿٦٧﴾



(٥٦) ئێمە تۆمان نەناردووە بۆ سەر ئادەمزاد ئیللا بە مژدەدەر بۆ چاکەکانیانو بە ترسێن بۆ خراپەکانیان.

(٥٧) تۆ ئەی محمد بەو کافرانە بڵێ: من داوای هیچ حەقدەست و کرێیەك لە ئێوە ناکەم کردەوەی چاکی کەسێ نەبێ بیەوێ ڕێگەیەك بگرێتەبەر بۆ لای خوای خۆی.

(٥٨) پشت بەو خودا ببەستە کە زیندووەو نامرێ و، خاوێنی ڕاگرە لە هەرچی سیفەێکی ناتەواوی و کەموکورتییەو، هەرچی سیفەتی چاکەو تەواوەتی هەیە بیدەرە پاڵی و، خوا بۆخۆی بەسە بۆ ئاگاداری لە گوناهی بەندەکانی خۆی.

(٥٩) ئەو خودایەی ئاسمانەکان و زەوی و چی لە نێوانیانا هەیە هەمووی لە شەش ڕۆژا دروست کرد و پاشان عەرشیشی داگرت. ئەو خوایە ناوی( ڕەحمان)ەو بەڕەحمو میهرەبانە، لە بارەی ئەوەوە لە شارەزایێ بپرسە، ئەو بۆت باس بکا چۆن خوایەکە.

(٦٠) کە بەو کافرانە بووترێ سوجدە بەرن بۆ خوای میهرەبان و بەڕەحم، ئەڵێن: خوای میهرەبان چی‌یە؟ ئێمە چۆن سوجدە ئەبەین بۆ ئەوەی تۆ فەرمانمان ئەدەیتێ سوجدەی بۆ بەرین و، ئەم فەرمانەی تۆ دوورەپەرێزتریان ئەکا.

(٦١) گەورەیی بۆ خوایەکە چەند بورجی لە ئاسمانا درووست کردووە کە مەنزڵی ئەستێرە گەڕۆکەکانن و چرای ڕۆژ و مانگی ڕوناککەرەوەی تیا داناوە.

(٦٢) خوا ئەو خوایە شەوو ڕۆژی کردووە بە پاشکۆی یەکترو هەرکامیان بەدوای ئەویانا دێ و ئەمەی بۆ پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن کردووە بۆ هەر کەس بیەوێ پەند و ئامۆژگاری وەرگرێ یا بیەوێ سوپاسی لوتفی خوا بکات.

(٦٣) بەندەی بەڕاستی بەندەیی‌کەری خوا ئەوانەن بەئارامی بەسەر زەویدا ئەڕۆن و بە ئەدەبەوە هەڵسوکەوت ئەکەن و ئەگەر مرۆی نەفام قسەی ناپەسەندو ناخۆشیان لەگەڵ بکەن ئەمان قسەی ئاشتیخوازانەیان لەگەڵ ئەکەن و شەڕانی نابن لەگەڵیان و پێیان ئەڵێن: (سلام علیکم).

(٦٤) هەروا ئەوانەن شەو بە سوجدە بردن بۆ خواو بە نوێژکردن و لەنوێژاڕاوەستان بۆ خوا بەسەر ئەبەن.

(٦٥) ئەوانەیشن ئەڵێن: خوایە سزای دۆزەخمان لێ لادە، سزای دۆزەخ بارێکە تۆ لە کۆڵی مرۆی نەکەیتەوە لە کۆڵی نابێتەوە.

(٦٦) بەڕاستی دۆزەخ خراپ قەرارگاو نشینگایەکە بۆ هەرکەسێ تووشی ببێ.

(٦٧) هەروا بەندەی ڕاستەقینەی خوا ئەوانەن کە ماڵ خەرج ئەکەن زیادەڕەوی ناکەن لە خۆڕایی پارە خەرج بکەن و ڕژدییش ناکەن واتە دڵیان نەیەت مەسرەف بکەن و، مەسرەفیان لەو نێوانەدا مامناوەندی ئەبێ.

وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾ قُلْ مَا يَعْبَؤُا۟ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ۖ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾

## سُورَةُ الشُّعَرَاءِ

ترتيبها ٢٦ — آياتها ٢٢٧



(٦٨) هەروا ئەوانەن لەگەلّ خوادا هاوار ناکەنە خوایەکی ترو خوای تر ناپەرستن و گیانی ئادەمزاد ناکێشن کە خوا حەرامی کردووە گیانی بکێشرێ و بکوژرێ مەگەر بە حەق وەك ئەوە کە یەکێکی کوشتبێ و، داوێن پیسی ناکەن و، هەرکەس ئەوانە بکا تووشی گوناەو تاوان ئەبێ.

(٦٩) سزای لە ڕۆژی قیامەتا بۆ دووقات ئەکرێ و هەمیشە بە سووکی لە دۆزەخا ئەمێنێتەوە.

(٧٠) مەگەر یەکێ کە تۆبەی کردبێ لە کافری و باوەڕی بە خوا هەبێ و ئیشی چاکەی کردبێ. ئەو جۆرە کەسانە هەرچی کاری خراپیان لەوەپێش کردووە خوا بۆیان ئەگۆڕێ بە چاکە و، خوا گوناە بەخش و بەڕەحم و میهرەبانە.

(٧١) هەرکەسێکیش تۆبە بکا لە کوفرو لە گوناەو نەگەڕێتەوە سەریان، ئەوە بەڕاستی ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا.

(٧٢) هەروەها ئەو کەسانەیشن کە شایەتیی درۆ نادەن و، ئەگەر بە لای شتێکی هیچوپووچ و ناڕەوادا تێپەڕین سەردانەو بەشەرەفەوە بەلایا تێئەپەڕن و چاوپۆشیی لێ ئەکەن.

(٧٣) ئەوانەیشن کە ئەگەر ئایەتی خوا بهێنرێتەوە یادیان یا ئایەتی قورئانیان بەسەرا بخوێنرێتەوە، بە کەڕ و کوێری ناکەون بەسەریا وەك هیچ نەبینن و گوێیان لە هیچ نەبێ.

(٧٤) ئەوانەیشن کە لە خوا ئەپاڕێنەوەو ئەڵێن خوایە کەسی وامان لە ژن و منالّەکانمان پێ ببەخشە مایەی ڕووناکیی چاوو شادمانیو سەربەرزی بێ بۆمان و بمانکە بە پێشەوای ئەو جۆرە کەسانەی لە خوای خۆیان ئەترسن و خۆیان لە گوناە ئەپارێزن.

(٧٥) ئەوانە بەرانبەر بە خۆڕاگرتنیان لەسەر ئەرك و نارەحەتیی خواپەرستی و گوناهنەکردن بەرزترین شوێنی بەهەشتیان لە پاداشا ئەدرێتێ و لەو شوێنانەدا فریشتە سلاّویان لێ ئەکەن و دوعای خێرو خۆشییان بۆ ئەکەن.

(٧٦) هەتا هەتایە لەو شوێنە بەرزانەی بەهەشتا ئەمێننەوەو، شوێنەکەیان شوێنی زۆر چاك و خۆشە بۆ ئۆقرە تیا گرتن و تیا دانیشتن و جێگیر بوون.

(٧٧) تۆ ئەی مەحەممەد! بەو کافرانە بڵێ: خوای من هیچ بایەخێکتان ناداتێ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ کە بانگتان بکا بۆ باوەڕ بە خواو بە پێغەمبەری خوا تا لەوەپاش بڕوبیانووتان نەمێنێ و نەڵێن کەس بانگی نەکردین بۆ موسوڵمان بوون، چونکە ئێوە خواو پێغەمبەرتان بە درۆ لەقەڵەم داوەو لەبەر ئەوە سزای ئەو تاوانەتان پێوە ئەنووسێ و ناچاری ئەبێ و ئەو سزایەتان هەر ئەدرێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ ﴿٤﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ ﴿٥﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩﴾ وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئْتِ ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدْرِى وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِى فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَىَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ كَلَّا ۖ فَٱذْهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآ ۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ ٱلَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾



## سوورەتی (الشُّعَرَاءِ)

مەککەیی‌یەو (٢٢٧) ئایەتە
ئایەتی ١٩٧ و لە ئایەتی ٢٢٤ ەوە نەبێ تا ئاخری سوورەتەکە، ئەوانەی مەدینەیین

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چی‌یە.

(٢) ئەم سوورەتە چەند ئایەتێکی قورئانی ڕاست و ڕۆشنە.

(٣) لەوانەیە لەبەر ئەوەی ئەم کافرانە موسوڵمان نابن تۆ ئەوەندە خۆت نارەحەت بکەی خۆت بدەی بەکوشت. واتە: بەزەییت بە خۆتا بێتەوەو وا لە خۆت مەکە.

(٤) ئەگەر ئێمە ئارەزوومان لێ بێ نیشانەیەك لە ئاسمانەوە ئەنێرینە خوارەوە بۆ سەر ئەم کافرانە ناچاریان بکا موسوڵمان بن، نیشانەیەکی وا تا ماون ملکەچ بن بۆی.

(٥) هیچ پەندو ئامۆژگارییەکی نوێ لای خواوە نایەتەخوار بۆسەر ئەو کافرانە، ئیللا پشتی لێ هەڵئەکەن و گوێی نادەنێ.

(٦) ئەوەتا ئەوانە ئایەتەکانی خوایان بە درۆ دانا، جا لەمەوپاش هەواڵی پاداشی ئەو ئایەتانەیان بۆ دێ کە گاڵتەیان پێ ئەکردن و لێی حاڵی ئەبن.

(٧) ئایا ئەوانە ناڕوانن بۆ زەوی کە چەند جۆرە درەخت و شینایی و سەوزەو داری بەردارمان تیا ڕواندووە لە هەر جۆرێکی پڕقازانج و بەسوود؟

(٨) بەڕاستی ئەم کارەی ئێمە نیشانەی ئەوەی تیایە کە وا ئەو خوایەی ئەو دارو درەخت و سەوزایی و شینایییانەی ڕواندووە خوایەکی حەق و ڕاستە، بەڵام بەشی زۆری ئەوانە موسوڵمان نین و ئیمان ناهێنن چونکە هەر لە سەرەتاوە وا لە عیلمی خوادا ڕابوردووەو قەت پێچەوانەی ئەوەیش کە لە عیلمی خوادا ڕابوودرووە، ڕوونادا.

(٩) بەڕاستییش خوای تۆ هەر خۆی زاڵە بەسەر کافرانداو ئەتوانێ هەمیشە تۆڵەیان لێ بسێنێ، بەڵام بەرەحمیشە دوایان ئەخا بۆ ڕۆژی قیامەت. (١٠) یادی ئەوە بکەرەوە کە خوا بانگی کردە مووساو پێی وت: بێ بڕۆرە سەر خێڵی ستەمکاران. (١١) خێڵی فیرعەون، ئەوە هێشتا لە خوا ناترسن؟ واتە: دە با ئیتر لە خوا بترسن.

(١٢) مووسایش وتی: خوایە بەڕاستی من ئەترسم بە درۆزنم دانێن.

(١٣) سینەیشم تەنگ ئەبێ و زمانم ئەگیرێ و بەرنابێ، دەی فریشتەی وەحی بنێرە لای هاروونی برام، واتە ئەویش لەگەڵما بکە بە فروستادەی خۆت بۆسەر فیرعەون.

(١٤) سزای گوناهێکیشیانم لەسەرە پیاوێکم لێ کوشتوون، بۆیە ئەترسم بمکوژن.

(١٥) خوا فەرمووی: نەخێر مەترسە. بە نیشانەکانی ئێمەوە بڕۆنە سەریان، ئێمە لەگەڵتانین. گوێمان لێیە چییان پێ ئەڵێن و چیتان وەڵام ئەدەنەوە. (١٦) بێنە لای فیرعەون و پێی بڵێن: ئێمە فروستادەی خوای هەموو جهانەکانین.

(١٧) بۆ ئەوە هاتووین بەنی‌ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێری.

(١٨) فیرعەون بە مووسای وت: ئایا ئێمە تۆمان لەناو خۆمان و لە ماڵی خۆمانا بەمناڵی پەروەردەو بەخێو نەکردووە چەند ساڵێکی تەمەنت بەمناڵی لەناو ئێمەدا نەمایتەوە؟ (١٩) کارە ناپەسەندەکەیشت کرد کە کردت، کە ئەوەبوو قیبتییەکەت کوشت و لەوانە بووی کە ئینکاری نیعمەتی من بەسەریانەوە ئەکەن؟

قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾



(٢٠) مووسایش وتی: بەڵێ من کاتی خۆی ئەو کارە ناپەسەندەم کرد و من ئەوکاتە نەزان و گومڕا بووم ئەگینا شتی وام نەئەکرد.

(٢١) جا کە ترسام لێتان لەدەستان هەڵاتم و، خوای خۆیشم پاش ئەوە فەرمانی پێ بەخشیم و کردمی بە یەکێ لە پێغەمبەران.

(٢٢) ئەو نیعمەتەیش کە تۆ منەتی ئەخەیتە سەرم لەئەنجامی ئەوەوە بووکە تۆ بەنیئیسرائیلت کردوە بە بەندەو کۆیلەی خۆت؟ و منیش لەترسی تۆ کەوتمە دەستی ئێوەو بەخێوتان کردم.

(٢٣) فیرعەون وتی: ئەی خوای هەموو جیهانەکان چی‌یە کە ئەلێی من فروستادەی ئەوم؟

(٢٤) مووسایش وتی: خوای ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی شتێ کە لە نێوانیانایە ئەگەر ئێوە شت ئەزانن و دڵنیان لە زانایی خۆتان.

(٢٥) فیرعەون وتی بەوانەی بەدەوروبەریدان: ئەوە ئێوە گوێ‌ناگرن لەو وەڵامەی مووسا وەڵامی پرسیارەکەی منی پێ ئەداتەوە؟ من پرسیار لە زاتی خواکەی ئەکەم و ئەو وەڵام بە کردەوەکانی ئەداتەوە!

(٢٦) مووسا وتی: ئەو خودا خودای ئێوەو باوك و باپیرە پێشینەکانیشتانە.

(٢٧) فیرعەون وتی: ئەم فروستادەیەی نێرراوەتە سەر ئێوە، بەڕاستی شێتە.

(٢٨) مووسا وتی: خوای خۆرهەڵات و خۆرنشین و هەرچی شتێکیشە لەنێوانیانایە ئەگەر ئێوە عەقڵتان هەیەو ئەفامن چونکە زاتی خوا بۆ کەس بەیان ناکرێ و ئەوەی بەیان ئەکرێ تەنها سیفەتەکانی و کردەوەکانیەتی.

(٢٩) فیرعەون کە نەیتوانی بە بەڵگە مووسا ببەزێنێ کەوتە هەڕەشە لێ‌کردنیو وتی: ئەگەر لە من بەولاوە خوایەکی تر بۆ خۆت ڕاگری و کەسێکی تر بپەرستی ئەتکەم بە یەکێ لەوانەی خراونەتە زیندانەوەو بەندکراون.

(٣٠) مووسا وتی: ئەی ئەگەر موعجیزەیەکی دیار و ئاشکرایشت بۆ بێنم هەر ئەمخەیتە زیندانەوە؟

(٣١) فیرعەون وتی: ئەگەر ڕاستئەکەی موعجیزەکەت بێنەو پیشانی‌بدە.

(٣٢) مووسا عاساکەی دەستی هەڵدایە سەر زەوی، کوتوپڕ ئەبینن مارێکی ئاشکرایەو دیارە کە مارە.

(٣٣) دەستیشی لە بن‌باخەڵی خۆی دەرهێنا کوتوپڕ ئەبینن چرایەکی سپی و بەگڕە بۆ هەرکەس تەماشای بکاو بۆی بڕوانێ.

(٣٤) فیرعەون کە ئەم موعجیزانەی مووسای بینی بە کۆمەڵە خەڵکەکەی دەوروبەری خۆیی وت: بەڕاستی ئەم مووسایە جادووگەرێکی زۆرزانە.

(٣٥) ئەیەوێ بە سیحر و جادووی خۆی لەم خاکی خۆتانەتان دەرکاتە دەرەوە، جا ئێوە فەرمانتان بە چی‌یە؟

(٣٦) خەڵکەکەی دەوروبەریشی وتیان: مووساو براکەی لێرە ماتڵ‌کەو ڕایانگرەو چەند کەسێکی خەڵك کۆکەرەوەو بڵاوکەرەوە بە شارانا ،(٣٧) هەرچی جادووگەری زۆرزان هەیە هەموویان بهێننەلات.

(٣٨) جا هەموو جادووگەرەکان لە ڕۆژێکی دیاری‌کراوا کۆکرانەوە.

(٣٩) جاڕیش بەناو خەڵکا درا: ئاخۆ ئێوە کۆئەبنەوە بۆ سەیرکردنی جادووگەران،

لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُواْ لَا ضَيْرَ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾



(٤٠) تا شوێنی جادووگەرەکانی خۆمان بکەوین ئەگەر ئەمان زاڵ بوون بەسەر مووساو براکەیا.
(٤١) سیحربازەکان کە هاتن بە فیرعەونیان وت: ئایا ئەگەر ئێمە سەرکەوتین بەسەر مووساو براکەیا، کرێیەکمان ئەبێ، واتە: خەڵاتمان ئەکەی؟
(٤٢) فیرعەون وتی: بەڵێ ئەتانبێ و ئێوە ئەو کاتە بەڕاستی لە نزیکانی بارەگای ئێمە ئەبن!
(٤٣) مووسا بە سیحربازەکانی وت: ئەوەی هەڵیئەدەن، هەڵیدەن. مەبەستی لەو شتانەیە کە جادووەکەی خۆیانیانی پێ ئەکەن.
(٤٤) ئەوانیش هەرچی گوریس و عاسایان هەبوو هەموویان هەڵداو وتیان: قەسەم بە گەورەیی فیرعەون بەڕاستی هەر ئێمە زاڵین.
(٤٥) پاشان مووسایش عاسای خۆی هەڵداو کوتوپڕ بوو بە مارێکی وا هەرچی جادووگەرەکان هەڵیاندابوو و بە ساختە کردبوویانن بە مار هەمووی هەڵلووشین و قووتیدان.
(٤٦) جا جادووگەرەکان لەپەوڕوو کەوتن و سوجدەیان بۆ خوا برد بۆ نیشانەی بێدەستەڵاتییان لە بەردەمی موعجیزەی موسادا.
(٤٧) وتیان: ئیمانمان بە خوای هەموو جیهانەکان هێنا. (٤٨) کە خوای مووساو هاروونە.
(٤٩) فیرعەون تووڕە بوو و وتی: بەرلەوەی من ڕێتان بدەم ئیمانتان بە مووسا هێنا؟ دیارە مووسا ئەو سەرگەورەیەتانە کە جادووی فێرکردوون. لەمەوپاش ئەزانن چیتان پێئەکەم و بە چ دەردێکتان ئەبەم! بەڕاستی دەست و قاچی هەمووتان، ڕاست و چەپ، ڕاستی ئەمیان و چەپی ئەویان، ئەبڕمەوەو گشتتان هەڵئەواسم.
(٥٠) جادووگەرەکان وتیان: هەرچیمان لێ بکەی زیانی نییەو قەیدناکا، ئێمە ئەگەڕێینەوە بۆ لای خوای خۆمان کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.
(٥١) ئێمە بەتەمای ئەوەین خوای خۆمان لە گوناهو خەتامان خۆش ببێ لەبەر ئەوە کە بەر لە هەرکەس ئیمانمان بە مووسا هێناوە. (٥٢) ئێمەیش وەحیمان کرد بۆ مووسا کە بەشەو بەنیئیسرائیلییە بەندەکانم هەڵگرەو بیبیانبەو زوو دەرچن، بەدووتانەوەن، سوپای فرعەون لەدووتان دێ بتانگرێتەوە.
(٥٣) مووساو ئەو بەنی ئیسرائیلییانەی لەگەڵی ڕۆیشتن بە شەو بۆی دەرچوون. فیرعەونیش مەئمووری سوپا کۆکردنەوەی دەرکرد بۆ شاران بێن بچن بەدوایانا بیانگرنەوە.
(٥٤) بە خەڵکی شارەکانیان وت: ئەم تاقمی مووساو بەنیئیسرائیلییانە کۆمەڵێکی کەمن.
(٥٥) ئەمانە کاری وا ئەکەن ئێمە زویرو تووڕە ئەکەن پێی.
(٥٦) ئێمەیش کۆمەڵێکین عادەتمانە وریاو ئاگادار بین و لە کاروباردا توندی بەکاربێنین.
(٥٧) جا فیرعەون و تاقمەکەیانمان لەو باخ و باخات و کانیاوانە دەرکرد کە بەدەستیانەوە بوون.
(٥٨) لەو گەنجینەو سامان و شوێنە بەرزانەیش کە هەیانبوون.
(٥٩) مەسەلەکە ئاوابوو، ئەوەی لە فیرعەون و تاقمەکانیانمان سەندەوە بەمیرات دامان بە بەنیئیسرائیل.
(٦٠) جا فیرعەون و تاقمەکەی ڕووەو ڕۆژهەڵات، کەوتنە دوای بەنیئیسرائیل.

فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ نَعۡبُدُ أَصۡنَامٗا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلۡ يَسۡمَعُونَكُمۡ إِذۡ تَدۡعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوۡ يَنفَعُونَكُمۡ أَوۡ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُواْ بَلۡ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيۡتُم مَّا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلۡأَقۡدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمۡ عَدُوّٞ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهۡدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِي هُوَ يُطۡعِمُنِي وَيَسۡقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضۡتُ فَهُوَ يَشۡفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبۡ لِي حُكۡمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾



(٦١) کە فیرعەون و تاقمەکەی نزیككەوتنەوە لە بەنی‌ئیسرائیلییەکان و هەردوولا دەرکەوتن بۆ یەکتر، ئەوانەی لەگەڵ مووسا بوون وتیان: بەڕاستی پێمان گەیشتوونەتەوە، واتە دوژمن پێمان گەیشتووەتەوە.
(٦٢) مووسایش وتی: نەخەیر مەترسن. بەڕاستی من خوای خۆمم لەگەڵە ڕێگەی ڕزگاریم پیشان ئەدا چۆن لەدەست فیرعەون و تاقمەکەی ڕزگار بیین.
(٦٣) جا وەحیمان کرد بۆ مووسا کەوا بە عاساکەت بدە لە دەریای نیل، ئەویش لێی‌داو نیل بوو بە دوو کەرتەوە هەر کەرتێکیان وەك کێوێکی گەورە بەرز بووەوە.
(٦٤) جا ئەوانیشمان، کە فیرعەون و تاقمەکەینی، لەویادا نزیك کردەوە لەو شوێنەی ئاوەکە بۆ مووسا بووبوو بە دوو کەرتەوە بە لێدانی عاساکەی.
(٦٥) جا مووساو ئەوانەی لەگەڵ مووسا بوون هەموومان ڕزگار کردن.
(٦٦) پاشانیش ئەوانی ترمان، واتە فیرعەون و لەشکرەکەی لەگەڵی بوو هەموومان خنکاندن.
(٦٧) بێ‌گومان لەم ڕووداوەدا دەلیلێکی گەورە لەسەر توانایی ئێمە هەیە، بەڵام بەشی زۆری ئەو خەڵکە ئیمانیان نەبوو ئەگینا پەند و عیبرەتیان لەو دەلیلانەی گەورەیی ئێوە وەرئەگرت.
(٦٨) بەڕاستی هەر خوای تۆ خاوەن عیززەتەو بەرەحمیشە.
(٦٩) باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم پێغەمبەریشیان بەسەرا بخوێنەرەوە.
(٧٠) کاتێ کە بە باوکی و بە خێڵەکەیی وت: ئێوە چی ئەپەرستن؟
(٧١) ئەوانیش وتیان: هەندێ بت ئەپەرستین و بەدیاریانەوە ئەمێنینەوە.
(٧٢) ئیبراهیمیش وتی: ئەو بتانەی ئەیانپەرستن، گوێیان لێتانە کاتێ کە هاواریان لێ ئەکەن و بانگیان ئەکەن؟
(٧٣) یا سوودتان پێ‌ئەگەیەنن یا زیانتان تووش ئەکەن؟
(٧٤) بت پەرستەکانیش وتیان: مەسەلە قازانج و زیانگەیاندن نی‌یە، مەسەلە ئەوەیە ئێمە باوك و باپیری خۆمانمان دیوە ئەوانیش هەر وایان ئەکرد و ئەم بتانەیان ئەپەرست.
(٧٥) ئیبراهیم وتی: دەربارەی حاڵی ئەو شتانەی ئەتانپەرستن خەبەرم بدەنێ.
(٧٦) ئێوەو باوك و باپیرە پێشینەکانتان، واتە: ئەو بتانەی ئێوە ئەتانپەرستن و باوك و باپیرانیشتان ئەیانپەرستن.
(٧٧) ئایا هیچ چاکەیەکیان پێوە هەیە؟ مادەم چاکەیان پێوە نی‌یەو سوودیان نی‌یە، ئەوانە هەموو دوژمنی منن. هەر خوای هەموو جیهانەکان خۆشەویستی منە.
(٧٨) ئەو خودایەی کە دروستی کردووم و کەواتە هەر ئەویشە ڕێگای ڕاستم لە ژیانا پیشانئەدا.
(٧٩) هەر ئەویشە هەرچییەك بخورێ و بخورێتەوەم ئەداتێ.
(٨٠) کە نەخۆشیش کەوتم ئەوە چاکم ئەکاتەوە. (٨١) هەر ئەویشە ئەممرێنێ و پاشان زیندووم ئەکاتەوە.
(٨٢) ئەو خودایەیشە کە هیواموایە لە ڕۆژی قیامەتا تاوانم ببەخشێ و لێم خۆش ببێ.
(٨٣) خوایە حوکم و هێزم پێ ببەخشە بۆ خزمەتکردنی خەڵك و بمخەرە ڕیزی پیاوچاکانەوە.

وَٱجْعَل لِّى لِسَانَ صِدْقٍ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجْعَلْنِى مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغْفِرْ لِأَبِىٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخْزِنِى يَوْمَ يُبْعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾ ۞ قَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ ﴿١١١﴾



(٨٤) بە چاکە ناوهێنانێکی بەڕاستیشم بۆ بڕەخسێنە لەناو ئەوانەدا پاش من دێن، واتە وەچەی پاش ئێمە لەسەر بنەمایەکی ڕاست بە چاکە ناوم بهێنن. ئەمەیش بەوە ئەبێ کە تەوفیقم بدەی خۆم تا لە ژیانام گوفتار و ڕەفتاری چاکم هەبێ.
(٨٥) بیشمکە بە یەکێ لەوانەی بەهەشتیان لە پاداشی کردەوەی چاکیانا وەك میرات بۆ ئەمێنێتەوە.
(٨٦) لە باوکیشم خۆشببەو گوناهی ببەخشە. ئەو یەکێ بوو لە گومڕاهان و ڕێی ڕاستی ون کردبوو.
(٨٧) ڕسوایشم مەکە لەو ڕۆژەدا کە مردووان هەموو زیندوو ئەکرێنەوە کە ڕۆژی قیامەتە لەسەر ئەوە کە لە ژیانما کەموکورتییەکم لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی تۆدا بووبێ، یا بە سزادانی باوکم چونکە لە ڕیزی گومڕاهانا بوو.
(٨٨) ئەو ڕۆژەی کە نە دارایی و نە کوڕ سوودی نی‌یەو دادی کەس نادا چونکە کەس بە پارەو بە کوڕ و کەسوکار خۆی لە سزای ڕۆژی قیامەت پێ ڕزگار ناکرێ.
(٨٩) بەڵام ئەگەر کەسێ بە دڵێکی ساف و ساغ وپاك لە گوناهەوە هاتبێتە حوزووری خوا، ئەوە سوود لەو حاڵەی خۆی ئەبینێ. (٩٠) لەو ڕۆژەدا بەهەشت نزیکئەخرێتەوە بۆ ئەو کەسانەی لە خوای خۆیان ترساون و خۆیان لە کوفر و لە گوناه دوور ڕاگرتووە. (٩١) دۆزەخیش زەق دەرئەخرێت بۆ ئەوانەی کە گومڕا بوون.
(٩٢) ئەیشوترێ بەو گومڕاهانە: لەکوێن ئەوانەی ئەتانپەرستن و، (٩٣) لاتان ئەدا لە خوا؟ ئایا ئەوانە یارمەتیتان ئەدەن یا بۆخۆیان یارمەتی لە کەسەوە وەرئەگرن؟ (٩٤) جا ئەوانە جار لەدوای جار لەگەڵ گومڕاهانی ترا ئەخرێنە ناو دۆزەخەوە. (٩٥) سەربازەکانی شەیتانیش هەموو ئەخرێنە ناو دۆزەخ. (٩٦) جا ئەوانە لە دۆزەخا، لەحاڵێکا کە ئەبێ بە هەرایان و ئەچن بەگژی یەکا، لەناو خۆیانا بە بتەکانیان ئەڵێن: (٩٧) قەسەم بەخوا ئێمە بەڕاستی لە گومڕاهییەکی ئاشکرادا بووین. (٩٨) کە ئێوەمان لەگەڵ خوای هەردوو جیهانا لە یەك ئاستا دائەناو وەك یەك ئەمانپەرستن و وەك ئەو بە شایانی پەرستنمان دائەنان. (٩٩) کەسیش ئێمەی گومڕا نەکردو لە ڕێی لانەداین تاوانبارەکان نەبێ. (١٠٠) جا ئێستا هیچ تکاکارێکمان نی‌یە تکامان بۆ بکا لەم حاڵە ڕزگارمان ببێ.
(١٠١) هیچ دۆستێکی گەرم و ڕاستەقینەیشمان نی‌یە. (١٠٢) خۆزگە گەڕانەوەیەکمان بوایە بۆ دنیا تا ئیمانمان بهێنایەو لە موسوڵمانان بووینایە. (١٠٣) بەڕاستی ئەم باسە دەلیلی تیایە لەسەر گەورەیی خواو، بەشی زۆری ئەو خەڵکە ئیمانیان نەبوو. (١٠٤) هەر خوای تۆیش بەڕاستی زاڵە بەسەر هەرچیدا بییەوێ بیکاو لەگەڵ خەڵکیش بەڕەحم و میهرەبانە. (١٠٥) قەومی نووح باوەڕیان بە نووح نەکرد و هەموو پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا.
(١٠٦) ئەوەبوو نووحی برایان پێی وتن: ئەوە ئێوە لە خوا ناترسن؟ (١٠٧) من بەڕاستی فروستادەیەکی ئەمین و ساغ و پاکم لە خواوە بۆ لای ئێوە. (١٠٨) کەواتە لە خوا بترسن و، چیم پێ وتن بە قسەم بکەن.
(١٠٩) من داوای هیچ کرێ دەستێك لە ئێوە ناکەم، کرێدەستی من لەسەر کەس نی‌یە لەسەر خوای هەموو جیهانەکان نەبێ. (١١٠) کەواتە لە خوا بترسن و چیم پێ وتن بەقسەم بکەن.
(١١١) قەومەکەی نووحیش بە نووحیان وت: ئێمە چۆن باوەڕت پێ بکەین و بە پێغەمبەرت بزانین لە کاتێکا کە تۆ لاتولووترین و هەرچی و پەرچیترین کەست شوێن کەوتوون؟

قَالَ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ
لَوۡ تَشۡعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ
﴿١١٥﴾ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ
رَبِّ إِنَّ قَوۡمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفۡتَحۡ بَيۡنِي وَبَيۡنَهُمۡ فَتۡحٗا وَنَجِّنِي وَمَن
مَّعِيَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ
﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا بَعۡدُ ٱلۡبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ
أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾ كَذَّبَتۡ
عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمۡ
رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ
مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبۡنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ
ءَايَةٗ تَعۡبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمۡ تَخۡلُدُونَ ﴿١٢٩﴾
وَإِذَا بَطَشۡتُم بَطَشۡتُمۡ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾
وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِيٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنۡعَٰمٖ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾
وَجَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ
﴿١٣٥﴾ قَالُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَوَعَظۡتَ أَمۡ لَمۡ تَكُن مِّنَ ٱلۡوَٰعِظِينَ ﴿١٣٦﴾



(١١٢) نووحیش وتی: جا من چووزانم ئەوانە كاتی خۆی بەرلەوەی باوەڕ بە من بكەن چییان ئەكرد؟

(١١٣) لێپرسینەوەی ئەوان لەسەر كەس نی‌یە لەسەر خوای خۆم نەبێ. ئەگەر ئێوە هەست و شوعوورتان هەبوایە ئەمەتان ئەزانی.

(١١٤) من خاوەن بڕواكان لە دەوروبەری خۆم دەرناكەم.

(١١٥) من لە ئینسانێ بەولاوە نیم كە خەڵك لە عەزابی خوا ئەترسێنم.

(١١٦) كافرەكانی قەومی نووح بە نوحیان وت: ئەگەر بێتو واز لەم قسانە نەهێنی و بێ‌دەنگ نەبی ئەبی بە یەكێ لەو كەسانەی سەنگەسار و بەردباران كراون.

(١١٧) نووحیش بە خوای وت: خوایە! بەڕاستی قەومەكەم بە درۆزنیان دانام و باوەڕیان پێ نەكردم.

(١١٨) خوایە كەواتە بڕیاری خۆت لە نێوان من و ئەم كافرانەدا بدەو خۆم و كێم لەگەڵە لە موسوڵمانان، ڕزگارمان بكە.

(١١٩) جا نووح و ئەو موسوڵمانانەی لەگەڵی بوون لەناو كەشتی‌یە پڕەكەدا هەموومان ڕزگار كردن.

(١٢٠) پاشانیش ئەوانی ترمان هەموو لە ئاوا نوقم كرد.

(١٢١) بەڕاستی لەم ڕووداوانەدا نیشانەی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا هەیەو بەشی زۆری ئەو خەڵكە باوەڕیان نەبوو و موسوڵمان نەبوون. (١٢٢) بەڕاستییش خوای تۆ هەر خۆی زاڵە بەسەر دوژمنانداو بەڕەحم و میهرەبانیشە، سزا دوا ئەخا بۆ ڕۆژی قیامەت. (١٢٣) قەومی عاد ئەو پێغەمبەرانەیان بەدرۆزن دانا كە نێررابوونە سەریان.

(١٢٤) ئەوە بوو هوودی برایان كە پێغەمبەر بوو نێرابووە سەریان پێی وتن: ئەوە بۆ لەخوا ناترسن.

(١٢٥) بەڕاستی من فروستادەیەكی ئەمینم لەلایەن خواوە بۆسەر ئێوە.

(١٢٦) كەواتە لە خوا بترسن و فەرمانبەردارم بن. (١٢٧) داوای هیچ كرێ و پاداشێكیشتان لێ‌ناكەم، كرێ و پاداشی من لەسەر كەس نی‌یە لەسەر خوای هەموو جیهانەكان نەبێ. (١٢٨) ئایا ئێوە لەسەر هەموو بەرزاییەك كۆشك و تەلارێ دروست ئەكەن و بەزم و ڕابواردنیان تیا ئەكەن و هیچ سوودێكی ڕاستەقینەیان لێ وەرناگرن؟

(١٢٩) كارگە دروست ئەكەنو ئاو ڕائەكێشنو قەڵا دروست ئەكەن بە هیوای ئەوەی هەرگیز نەمرنو هەمیشە بمێننەوە؟ (١٣٠) كە هەڵمەتیشتان بردە سەر هەر تایەفەیەك زۆردارانەو ستەمكارانە هەڵمەت ئەبەن و لە هیچ كۆناكەنەوەو چیتان ئارەزوو لێ بێ ئەیكەن و ئازاری خەڵك ئەدەن؟

(١٣١) دەی لە خوا بترسن و فەرمانبەرداری بكەن.

(١٣٢) لەوخوایە بترسن كە ئەم گشتە یارمەتییەی داون كە خۆتان ئەزانن چەند زۆرە.

(١٣٣) یارمەتی داون بە ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ و وڵاخی بەرزەو كوڕی زۆری داونێو،

(١٣٤) باخ و باخات و كانیو سەرچاوەی پێ‌بەخشیون.

(١٣٥) بەڕاستی من ترسی سزای ڕۆژێكی زۆر گەورەم لێتان هەیە كە ڕۆژی قیامەتە.

(١٣٦) وتیان: لای ئێمە چوونیەكە ئامۆژگاریمان بكەی یان نەیكەیو لە ڕیزی ئامۆژگاریكەران نەبی.

إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾



(١٣٧) ئەم درۆیەی تۆ بۆت هێناوین لە درۆی پێشینەکان زیاتر نی‌یە کە ئەوانیش ئەهاتن و خۆیان بە پێغەمبەر ئەدایە قەڵەم.
(١٣٨) ئێمەیش هەرگیز لەسەر ئەم باوەڕنەکردنەمان بە تۆ سزا نادرێین.
(١٣٩) قەومی عاد هوودیان بە درۆزن داناو ئێمەیش لە سزای ئەو باوەڕنەکردنەیانا لەناومان بردن و، لەم لەناو بردنەیانا نیشانەیەکی گەورەیی خوا هەیەو زۆرتری ئەم قەومی هوودە موسوڵمان نەبوون.
(١٤٠) بەڕاستیش خوای تۆ هەر خۆی زاڵە بەسەر دوژمنانیاو بەڕەحم و میهرەبانیشە.
(١٤١) قەومی سەموودیش پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا.
(١٤٢) ئەوەبوو سالّح پێغەمبەری برای خۆیان پێی وتن: ئەوە بۆ لە خوای خۆتان ناترسن.
(١٤٣) بەڕاستی من فروستادەیەکی ئەمینم لە لایەن خواوە بۆسەر ئێوە.
(١٤٤) کەواتە لە خوا بترسن و گوێڕایەڵم بن.
(١٤٥) داوای هیچ کرێو پاداشێکیشتان لێ ناکەم، کرێو پاداشی من لەسەر کەس نی‌یە لەسەر خوای هەموو جیهانەکان نەبێ.
(١٤٦) ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداری خوا نەبن خوا چۆنتان لێ ئەگەڕێ بە ئەمینیو بێ‌ترسو لەرز لەم شوێنە خۆشەدا بمێننەوە؟ (١٤٧) لەناو باخ و باخات و سەرچاوەو کانی ئاوو، (١٤٨) لەناو کشتوکاڵ و دارخورمای گوڵۆك نەرم و ناسکا.
(١٤٩) زیرەکانەو بە چالاکی خانوو لە شاخەکان دائەتاشن. (١٥٠) کەواتە لە خوا بترسن و چیتان پێئەڵێم بەگوێم بکەن و، (١٥١) گوێڕایەڵی فەرمانی ئەوانە مەبن کە زیادەڕەوی ئەکەن.
(١٥٢) ئەوانەی خراپە ئەکەن لە سەرزەویداو چاکە ناکەن. (١٥٣) قەومەکەی سالّحیش لە وەڵامی ئەم ئامۆژگارییانەدا بە سالّحیان وت: بەڕاستی تۆ لەوانەی جادوویان لێ کراوەو عەقڵیان لێ سەنراوە.
(١٥٤) تۆ لە بنیادەمێکی وەك ئێمە بەولاوە نیت، دەی ئەگەر ڕاست ئەکەی پێغەمبەری موعجیزەیەکمان پیشانبدە.
(١٥٥) سالّحیش لە وەڵاما وتی: ئەمەی لە بەرچاوتانایە حوشترە مێینەیەکە ئەو نۆرە ئاوێکی هەیەو، ئێوەیش نۆرەی ئاوێکی ترتان بۆ حوشترەکانتان هەیە. نۆرە ئاوی ئەو لێگەڕێن بۆخۆی و لە ڕۆژی نۆرە ئاوی خۆتانا حوشترەکانتان ئاوبدەن. (١٥٦) دەستی بە خراپە بۆ درێژ مەکەن نەکا سزای ڕۆژێکی سەخت بتانگرێ کە ئەو ڕۆژەیە خوا لە تۆڵەی بەخراپە دەستبردن بۆ ئەو حوشترەدا غەزەبتان لێ ئەگرێ.
(١٥٧) قەومەکەی صالّح لە جیاتیی ئەوەی ئامۆژگارییەکانی لەگوێبگرن حوشترەکەیان پەی‌کرد، واتە: چوار پەلیان بڕیەوەو سەرەنجام لە کردەوەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە.
(١٥٨) جا سزای خودایی هات بەسەریاناو گرتنی. بەڕاستی لەو کارەساتەدا نیشانەیەکی گەورەی توانایی خوا هەیەو زۆرتری ئەو قەومەی سالّح موسوڵمان نەبوون و باوەڕیان بە فەرموودەی خواو پێغەمبەری خوا نەبوو.
(١٥٩) بەڕاستییش هەر خوای تۆ زاڵە بەسەر کافراناو، هەر ئەویش میهرەبان و بەڕەحمە.

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾



(١٦٠) قەومی لووط پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا.
(١٦١) ئەوەبوو لووطی برایان پێی‌وتن: ئەوە بۆ لە خوا ناترسن؟
(١٦٢) بەڕاستی من فروستادەیەکی ئەمینم لە لایەن خواوە بۆ سەر ئێوە.
(١٦٣) کەواتە لە خوا بترسن و گوێڕایەڵم بن.
(١٦٤) من داوای هیچ کرێ و حەق دەستێکیشتان لێ ناکەم بەرامبەر بەوە کە ڕێی ڕاستتان پیشان ئەدەم. کرێو حەق دەستی من لەسەر خوای هەموو جیهانەکان نەبێ لەسەر کەس نی‌یە.
(١٦٥) بۆ لەناو ئەم هەموو خەڵکەدا کە خودا دروستی‌کردوون تەنها ئێوە ئەچنە لای نێرینەو لەگەڵ نێرینەدا جووت دەبن؟
(١٦٦) ژنەکانیشتان لێ ئەگەڕێن کە خوای خۆتان بۆی دروست کردوون تا بچنە لایان. دیارە ئێوە تاقمێکن لە سنوری ئارەزووبازیی عادەتی لاتان‌داوە کە وا ئەکەن و، ڕەفتاری ڕاستتان لەمبارەوە واز لێ‌هێناوە.
(١٦٧) وتیان: ئەی لووط ئەگەر واز لەم قسانەت نەهێنی بەڕاستی ئەبی بە یەکێ لەوانەی لەم وڵاتە دەرکراون.
(١٦٨) لووط بە قەومەکەی خۆی وت: بەڕاستی من لەوانەم لە کردەوەی ئێوە نارازیی و نارەحەتن. (١٦٩) خوایە خۆم و ژن و منالّم ڕزگارکە لەم کارەی ئەمانە ئەیکەن.
(١٧٠) جا ئێمەیش خۆی و ژنی و منالّیمان هەموو ڕزگار کرد.
(١٧١) تەنها پیرەژنێ نەبێ کەوا لەوانە بوو کاریان بەسەر چووبوو و بڕابوونەوە، واتە: بڕیار درابوو بەر غەزەبی خوا کەوێ چونکە لە ڕەفتار و کرداری قەومی لووط ڕازی بوو. (١٧٢) پاشان ئەوانی ترمان بەرباد و ماڵوێران کرد.
(١٧٣) بارانێکمان بەسەرا باراندن. بارانێکی خراپ بوو ئەو بارانەی بەسەر ئەو کافرانەدا بارێنرا کە پێشتر هەڕەشەی غەزەبی خوایان لێ کرابوو.
(١٧٤) بەڕاستی لەم ڕووداوەدا نیشانەی توانایی خوا هەیەو بەشی زۆری ئەو قەومەی لووط موسوڵمان نەبوون و باوەڕیان نەبوو. (١٧٥) بەڕاستییش هەر خوای تۆ زاڵە بەسەر کافراناو هەر ئەو میهرەبان و بەڕەحمە.
(١٧٦) خاوەنانی بێشە، واتە: ئەوانەی لە بێشەکەی نزیکی شاری مەدیەن دائەنیشتن، پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا.
(١٧٧) ئەوەبوو شوعەیب پێی وتن: ئەوە بۆ لە خوا ناترسن؟
(١٧٨) من بەڕاستی فروستادەیەکی ئەمینم لە لایەن خواوە بۆ سەر ئێوە.
(١٧٩) کەواتە لە خوا بترسن و فەرمانبەرداریم بکەن.
(١٨٠) من داوای هیچ کرێ و حەقدەستێکتان لێ ناکەم، حەق دەستی من لەسەر خوای هەموو جیهانەکان نەبێ لەسەر کەس نی‌یە.
(١٨١) پێوانە بە پڕی بدەن بە خاوەن حەق و لەوانە مەبن کە زیان بە خەڵك ئەگەیەنن.
(١٨٢) کێشانەیش بە ترازووی ڕاست بکێشن و کە سەرنەکا بەملاو بەولادا .
(١٨٣) ماڵ و دارایی خەڵك بە ناتەواوی مەدەنەوە پێیان و زیانیان پێ مەگەیەننو خراپە مەکەن لە سەرزەویدا بە کوشتنو تاڵانکردنی خەڵكو چەتەییو ڕێگری.

وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ
مِنَ الْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ
الْكَاذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ السَّمَاءِ إِن كُنتَ
مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ
فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ
الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ
الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ
مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ آيَةً أَن يَعْلَمَهُ
عُلَمَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَاهُ عَلَىٰ بَعْضِ الْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾
فَقَرَأَهُ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا بِهِ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَاهُ
فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِ حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ
الْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُوا
هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَأَيْتَ
إِن مَّتَّعْنَاهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَاءَهُم مَّا كَانُوا يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾



(١٨٤) لەو خوایەیش بترسن کە ئێوەیش و ئەوە پێشووەکانیشی دروست کردووە.

(١٨٥) بێشەنشینەکانی قەومی شوعەیبیش بە شوعەیبیان وت: ئەی شوعەیب، بەڕاستی تۆ لەوانەی کە سیحرو جادوویان لێ کراوە.

(١٨٦) تۆ لە بنیادەمێکی وەك ئێمە بەولاوەیش نیت و ئێمە گومانی ئەوەت پێ ئەبەین یەکێ بی لە درۆزنەکان.

(١٨٧) دەی ئەگەر لە ڕاستگۆیانی پارچەیێ لە ئاسمانمان بەسەرا بخەرە خوارەوە.

(١٨٨) شوعەیبیش وتی: خوای من باشتر ئەزانێ ئێوە چی ئەکەن.

(١٨٩) جا قەومەکەی بە درۆزنیان داناو پاش ئەوە سزای ڕۆژی سێبەری هەوری ئاگرباران گرتنی. بەڕاستی سزای ئەو ڕۆژە سزای ڕۆژێکی دیاری و گەورە بوو.

(١٩٠) بەڕاستی لەو ڕووداوەدا نیشانەیەکی گەورەی توان و دەسەڵاتی خوا هەیە و، ئەو قەومی شوعەیبە بەشی زۆریان باوەڕیان نەبوو.

(١٩١) بەڕاستییش خوای تۆ بەسەر کافرەکانا زاڵەو هەر خۆی میهرەبان و بەڕەحمە.

(١٩٢) بەڕاستیش ئەو قورئانە لە خوای هەموو جیهانەکانەوە هاتووەتە خوار بۆ پێغەمبەر کە بیگەیەنێ بە ئادەمزاد. (١٩٣) فریشتەیەکی پیرۆزی ئەمین هێناویەتە خوار.

(١٩٤) بۆسەر دڵی تۆ، وشە وشەو ڕستە ڕستەو ئایەت ئایەت دایناوە لە دڵتاو تۆ فێری بوویت بۆ ئەوەی لەوکەسانە بی خەڵك ئەترسێنن لە سزای خوا.

(١٩٥) بەزمانێکی عەرەبیی واتا دیارو ئاشکرا هێناویەتە خوار.

(١٩٦) بەڕاستیش ئەم قورئانەی بۆ تۆ هاتووە لەو کتێبانەدا باسی هەیە کە بۆ پێغەمبەرە پێشینەکان هاتوون.

(١٩٧) ئایا ئەمە کە زانایانی بەنیئیسرائیل بەوە ئەزانن کە قورئان لە کتێبەکانی پێغەمبەرانی زوودا وەك تەورات و ئینجیل باسی کراوە، نابێ بەبەڵگەو دەلیل بۆ ئەمانە کە ئێستا هەن؟ .

(١٩٨) ئەگەر ئەو قورئانەمان بۆ کەسێکی ناعەرەب بناردایەتە خوار،

(١٩٩) ئەویش بیخوێندایەتەوە بەسەر ئەم کافرانەدا هەر باوەڕیان پێ نەئەکرد و ئەیانوت چۆن ئەبێ کابرایەکی ناعەرەب قورئانی عەرەبی بخوێنێتەوە بەسەر ئێمەی عەرەبدا؟ چونکە فیزیان نەئەهات شوێنی کەسێکی ناعەرەب بکەون.

(٢٠٠) ئاوا لەئەنجامی گومڕاهیی و کەللەڕەقییانەوە ئەم قسە کوفرانە ئەخەینە ناو دڵی تاوانباران.

(٢٠١) هەرگیز ئیمان بەقورئان ناهێنن تا سزای پڕئازار بە چاوی خۆیان نەبینن.

(٢٠٢) جا ئەو سزایەیان لەپڕ بۆ دێ و ئەوان پێی نازانن.

(٢٠٣) ئەڵێن: ئاخۆ دەرفەتمان ئەدرێتێ تا بیر بکەینەوە؟

(٢٠٤) ئایا ئەمانە پەلەیانە بۆ هاتنی سزای ئێمە؟

(٢٠٥) پێم بڵێن: ئەگەر ئێمە ساڵەهایێ دەرفەتی ڕابواردنیان بۆ بەرەڵڵا بکەین،

(٢٠٦) ئەوسا سزا هەڕەشەپێکراوەکەیان بێتەسەر،

مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا
لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكْرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٠٩﴾ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ
ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ
عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ
مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخْفِضْ
جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّى
بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِى
يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ
كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾
وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ
يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ
بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾

## سُورَةُ النَّمْلِ

آياتها ٩٣ — ترتيبها ٢٧



(٢٠٧) ئاخۆ ئەو ماوەی ڕابواردنەی بۆیان ڕەخسێنرابوو هیچ سوودێکیان پێ ئەگەیەنێ؟

(٢٠٨) ئێمە هیچ ئاوەدانییەکمان نەفەوتاندووە بێ ئەوەی لەوەپێش چەند پێغەمبەری ترسێنمان ناردبێتە سەر و لە سزای خوای ترساندبێ.

(٢٠٩) بۆ ئەوەی دانیشتوانی ئەو ئاوەدانییە بیربکەنەوەو ڕێگای ڕزگاری بدۆزنەوە، بەڵام بیریان نەئەکردەوەو ئێمەیش ستەمان لێ نەکردوون.

(٢١٠) ئەم قورئانەیش شەیتانەکان لە ئاسمانەوەیان نەهێناوەتە خوار.

(٢١١) ئەوەیش ڕەوا نی‌یە بۆ ئەوان و نایشتوانن شتی وا بکەن.

(٢١٢) بەڕاستی ئەو شەیتانانە ڕێیان لە بیستنی قورئان یا قسەی فریشتەکان لێ گیراوە لەبەر ئەوە قابیل نی‌یە ئەوان قورئان ببیستن و لە ئاسمانەوە بیهێننە خوار.

(٢١٣) دەی تۆ لەگەڵ زاتی خوای (واجب الوجود) دا هاوار مەکەرە خوایەکی تر بۆ ئەوەی لە ئەنجامی ئەو بانگ و هاوارکردنە خوایەکی ترەدا نەبی بە یەکێ لەوانەی سزا ئەدرێن.

(٢١٤) خزمە نزیکەکانت بترسێنە لە سزای خوا. (٢١٥) باڵی میهرەبانییش شل کە بۆ ئەو خاوەن باوەڕانەی شوێنت کەوتوون. (٢١٦) جا ئەگەر هاتوو بێ‌فەرمانییان کردی پێیان بڵێ: من بەری و دوورم لەوەی ئێوە ئەیکەن.

(٢١٧) پشتیش بەو خوایە ببەستە کە بەهێزەو بەسەر دوژمنانیا زاڵەو میهرەبان و بە ڕەحمیشە.

(٢١٨) ئەو خوایەی کە تۆ شەوان هەڵئەستی بۆ شەونوێژ، ئەو چاوی لێتەو ئەتبینێ.

(٢١٩) ئەم دیوو ئەودیوکردن و جموجوڵیشت لە سوجدەبردنا بۆ خوا لە ڕیزی سوجدەبەرانا ئەبینێ.

(٢٢٠) هەر ئەو خوایە گوێ لە پاڕانەوەو ئاه و ناڵەتەو بە هەموو کارو کردارێکت ئەزانێ.

(٢٢١) ئاگادارتان بکەم شەیتانەکان بۆ سەر دڵی کێ دێنە خوار؟

(٢٢٢) بۆ سەر دڵی هەموو درۆزنێکی تاوانبار دێنە خوار.

(٢٢٣) ئەو درۆزنە تاوانبارانە گوێ ڕائەگرن بۆ ئایەتەکان و بە خەیاڵی خۆیان هەندێ گومان و خەیاڵاتیان لێ وەرئەگرن و زۆرتریشیان درۆ ئەکەن و هەر لە خۆیانەوە درۆو دەلەسە هەڵئەبەستن.

(٢٢٤) شاعیرەکان، ئەوانەیان دوائەکەون کە گومڕان.

(٢٢٥) تۆ نابینی ئەوانە بە سەرگەردانی بە هەموو شیو و دۆڵێکا هەڵئەگەڕێن؟ واتە قەومێکن لە چاك و لە خراپ ئەڵێن و ئەکەن. (٢٢٦) بەدەم قسەی چاکی وا ئەڵێن کە بە کردەوە نایکەن.

(٢٢٧) ئەوانەیان نەبێ کە ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوەو ناوی خوا زۆر دێنن و پاش ئەوەی کە ستەمیان لێ کرا تۆڵەی خۆیان سەندەوە و، بێ‌گومانیش ستەمکاران لە دوارۆژا ئەزانن چۆن هەڵگەڕانەوەیەك هەڵئەگەڕێنەوەو چۆن پشتیان ئەشکێ.

## سووره‌تی (النَّمل)

**مه‌ككه‌یی یه‌و (٩٣) ئایه‌ته**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طسٓ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ وَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٥﴾ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلْقُرْءَانَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾ إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًۢا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ فِى تِسْعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَٰتُنَا مُبْصِرَةً قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾



(١) خوا خۆی ئه‌زانێ مه‌به‌ستی له‌ وشه‌ی (طس) چی‌یه‌. ئه‌وه‌ی له‌م سووره‌ته‌دا دێته‌ خوار ئایه‌تی قورئان و نووسراوی كتێبێكی روونكه‌ره‌وه‌یه‌ كه‌ ناوی (لوح المحفوظ)ه‌..

(٢) رێگا پیشانده‌رو مژده‌ده‌ره‌ بۆ خاوه‌ن باوه‌ڕه‌كان.

(٣) ئه‌وانه‌ی نوێژ ئه‌كه‌ن و زه‌كات ئه‌ده‌ن و باوه‌ڕی بێ‌گه‌ردو پڕمتمانه‌یان به‌ ڕۆژی دوایی هه‌یه‌ كه‌ ڕۆژی قیامه‌ته‌.

(٤) ئه‌وانه‌یش باوه‌ڕیان به‌ ڕۆژی دوایی نی‌یه‌، كردووه‌ ناشیرینه‌كانیانمان له‌ به‌رچاو جوان كردوون و جا ئه‌وانیش بۆ خۆیان سه‌رگه‌ردان بوون.

(٥) ئه‌وانه‌ن كه‌ سزایه‌كی خراپیان بۆ هه‌یه‌و ئه‌وانه‌ن له‌ ڕۆژی قیامه‌تا له‌ هه‌موو كه‌سێ زه‌ره‌رمه‌ندترن.

(٦) به‌ڕاستی تۆ له‌ لایه‌ن خوایه‌كی خاوه‌ن حیكمه‌ت و زاناوه‌ قورئانت پێ وه‌رئه‌گیرێ.

(٧) بیر له‌وه‌ بكه‌ره‌وه‌ كه‌ مووسا به‌ ماڵ و منداڵ و كه‌سوكاره‌كه‌ی خۆی وت: من ئاگرێكم له‌دووره‌وه‌ به‌دی‌كردووه‌ ئه‌ڕۆم بۆ لای ئه‌و ئاگره‌ له‌وێوه‌ هه‌واڵێكتان بۆ دێنمه‌وه‌ یا ده‌سه‌چیله‌یه‌كتان له‌و ئاگره‌ بۆ دێنمه‌وه‌ به‌ڵكو خۆتانی پێ گه‌رم بكه‌نه‌وه‌.

(٨) كه‌ هاته‌ سه‌ر ئاگره‌كه‌ بانگی لێ كراو كه‌وا پیرۆزی و به‌ره‌كه‌ت درا به‌وانه‌ی له‌ شوێنی ئاگره‌كه‌و به‌ ده‌وروبه‌ریدان و، خاوێن و بێگه‌رده‌ خوای هه‌موو جیهانه‌كان.

(٩) ئه‌ی مووسا! بێگومان مه‌سه‌له‌كه‌ ئه‌وه‌یه‌ من (الله) خوام و به‌سه‌ر هه‌موو خواستێكما زاڵم و خاوه‌ن حیكمه‌تم له‌ هه‌موو كارێكما.

(١٠) عاساكه‌یشت هه‌ڵده‌، ئه‌ویش هه‌ڵیدا. كه‌ دیتی به‌جۆش ئه‌جووڵێته‌وه‌ وه‌ك ماری تیژ، پشتی پێ هه‌ڵكردو به‌ره‌ودوا گه‌ڕایه‌وه‌و نه‌هاته‌وه‌ بۆ شوێنه‌كه‌ی خۆی. ئێمه‌یش بانگمان لێ كرد: ئه‌ی مووسا مه‌ترسه‌و متمانه‌ت به‌ خوای خۆت ببێ. بێ گومان فروستاده‌كانی من ترسیان له‌ هیچ نی‌یه‌ چونكه‌ ئه‌زانن خراپه‌یه‌كیان نایه‌ته‌ڕێ ماده‌م پێغه‌مبه‌ری خودان، كه‌واته‌ هیچ هۆیه‌ك نی‌یه‌ بۆ ترسانیان.

(١١) به‌ڵام پێغه‌مبه‌رێ كه‌ كاتی خۆی سته‌مێكی له‌ كه‌سێ كردبێ و له‌پاش ئه‌و خراپه‌یه‌ كاری خۆی به‌ باری چاكه‌دا گۆڕیبێ، ئه‌وه‌ من به‌خشنده‌و به‌ڕه‌حمم له‌گه‌ڵی. ئه‌مه‌ ئیشاره‌ته‌ بۆ ڕووداوی كوشتنی كابرایه‌كی قیبتی له‌ لایه‌ن حه‌زره‌تی مووساوه‌.

(١٢) ده‌ستیشت بخه‌ره‌ ناو به‌رۆكی خۆت و ده‌ری‌بهێنه‌، كه‌ ده‌ری ئه‌هێنی به‌ سپیه‌تی و بێ هیچ عه‌یب و ناته‌واوییه‌ك دێته‌ ده‌ره‌وه‌، واته‌ سپیه‌تییه‌كه‌ی هیی نه‌خۆشی وه‌ك به‌ڵه‌كی و شتی وا نی‌یه‌. ئه‌م دوانه‌ دوو مه‌عجیزه‌ن له‌ نۆ موعجیزه‌ پێیانه‌وه‌ ئه‌ڕۆی بۆ لای فیرعه‌ون و قه‌ومه‌كه‌ی، ئه‌وانه‌ كۆمه‌ڵێكن فاسق و له‌حه‌ق لایان داوه‌.

(١٣) كاتێ كه‌ موعجیزه‌كانی ئێمه‌ به‌ ڕوونـاكی و ئاشكرایی گه‌یشتنه‌ لای فیرعه‌ون و تاقمه‌كه‌ی، وتیان: ئه‌مه‌ جادووگه‌رییه‌كی زه‌ق و ئاشكرایه‌.

وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ
وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾
وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ
وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ
لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾
حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟
مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ
﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ
نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا
تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩﴾
وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ
ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ
أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ
أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾



(١٤) فیرعەون و کۆمەڵەکەی ئینکاری پێغەمبەرایەتییەکەی مووسایان کرد هەرچەند بەدڵ ئەیانزانی ڕاستە پێغەمبەرە، بەڵام بەخۆبەزلزانین و ستەمکارییان سەرپێچییان لێ کرد، جا سەیرکە سەرەنجامی ئەو خراپەکارانە چۆن بوو چیمان بەسەرهێنان.

(١٥) زانابیشمان دا بە داوود و سولەیمانی کوڕیو ئەوانیش لە سوپاسی ئەو نیعمەتی زاناییەدا کە پێمان دابوون وتیان: ستایش بۆ خوایە کە بەم زانستە پێدانە لە زۆر لە بەندە خاوەن باوەڕەکانی خۆی گەورەتری کردووین.

(١٦) سولەیمان میراتی پێغەمبەرایەتی و زانست و سەرەکایەتیی لە داوودی باوکییەوە بۆ هاتەوەو ڕووی کردە خەڵکەکەی و وتی: خەڵکینە! ئێمە لە لایەن خواوە فێری زمانی پەلەوەر کراوین و کە هەر یەکێکیان ئاوازێکی لێوە دێ ئەزانین ئەڵێ چی و، لە هەر بابەتێ بەشێکمان دراوەتێو ئەمەیش بەڕاستی گەورەییەکی دیارییە خوا گەورەی کردووین پێی.

(١٧) سەربازەکانی سولەیمان لە پەرییان و لە ئادەمزاد و لە پەلەوەر کۆکرانەوەو ئەمانە ماتڵ ئەکران تا هەموو ئامادە ئەبوون.

(١٨) تا کاتێ گەیشتنە سەر شارە مێروولەیەك لە شام، مێروولەیەکیان کە ئەم لەشکرەی سولەیمانی دی بانگی کردە مێروولەکانی هاوڕێی و وتی: ئەی مێروولەیینە! بچنەوە ناوماڵەکانی خۆتان نەوەك سولەیمان و سەربازەکانی پێتان نەزانن و ئاگایان لێ نەبێ داتانشێلن !

(١٩) سولەیمان کە گوێی لە قسەی ئەم مێروولەیە بوو زەردەخەنەیێ گرتی و پێکەنی و سەری لە ژیری و بەئینسافیی ئەو مێروولەیە سووڕما کە وتی: ئەگەر سەربازەکانی سولەیمان دامانشێلن، بە دەست ئەنقەست نییەو پێیان نەزانیووین کەتووینەتە بەر پێیان و وتی: خوایە کارێ بکە هەرگیز لە سوپاسی ئەو نیعمەتەت دەسبەردار نەبم کە بە خۆم و باوکم و دایکمت داوە و، کارێ بکە کردەوەی وا بکەم کە تۆ پێی ڕازی بی و بە ڕەحمەتی خۆت بمخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانتەوە.

(٢٠) ڕۆژێ لە ڕۆژان پەلەوەرەکانی بەسەرکردەوە، پەپووەسلێمانە دیار نەبوو، وتی: ئەوە بۆ پەپووەسلێمانە نابینم؟ چاوم دەرکی ناکا یا بۆخۆی لە کۆڕی پەلەوەرەکانا نییە؟

(٢١) کە زانی لەوێ نییە تووڕە بوو و هەڕەشەی لێ کرد و وتی: بەڕاستی سزایەکی سەختی ئەدەم یا سەری ئەبڕم یا ئەبێ بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرام بۆ بهێنێتەوە کە بۆچی دیار نەبوە؟

(٢٢) پەپووەسلێمانە زۆری بە نادیاری پێ نەچوو هاتەوەو بە سولەیمانی وت: من لە شتێ ئاگادار بووم تۆ لێی ئاگادار نیت و، لە شاری (سەبەء) ی یەمەنەوە هەواڵێکی ڕاستم بۆ هێناوی.

إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ۩ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ثُمَّ تَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَٱنظُرۡ مَاذَا يَرۡجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾



(٢٣) من بەڕاستی دیم ئافرەتێ فەرمانڕەوایی خەڵکی ئەو شارە ئەکات و لە هەموو بابەتێکی هەیەو تەختێکی گەورەی شاهییشی هەیە.

(٢٤) دیمن خۆی و قەومەکەی سوجدەیان نەك بۆ خوا، بۆ ڕۆژ ئەبرد و، شەیتان ئەو کار و کردەوانەیانی لا جوان کردبوون و لە ڕێگای خواپەرستیی لادابوون و، بۆیە ئیتر ڕێی ڕاستی خواپەرستی ناگرنەبەر.

(٢٥) بۆیە شەیتان لە ڕێگای خواپەرستی لایدابوون تا سوجدە بۆ ئەو خوایە نەبەن شتی نادیار لە ئاسمانەکان و لە زەوییدا دەرئەخا وەك ڕوونکردنەوەی ئەستێرەو باراندنی باران و سەوزکردنی گژوگیاو میوەدەرکردنی دار و درەخت و گەلێ شتی تر. ئەو خوایەی ئاگای لە هەر شتێ هەیە کە ئێوە بیشارنەوە یا دەری بخەن.

(٢٦) ئەو خوایە (الله) یە کە لەو بەولاوە هیچ خوایەکی تر نی‌یە بەڕاستی بپەرسترێ و خوای عەرشی مەزنە.

(٢٧) سولەیمان لە وەڵامی قسەکەی پەپووەسلێمانەدا پێی وت: سەیر ئەکەین بزانین ڕاستت کرد لەم قسەیەتدا یا لە درۆزنان بووی.

(٢٨) بڕۆ ئەم نامەیەی من بەرەو بۆیان هەڵدەو ئەنجا پشتیان لێ هەڵکەو بزانە چی ئەڵێن و چۆن وەڵامی نامەکەم ئەدەنەوە.

(٢٩) پەپووەسلێمانەیش نامەکەی بردو هەڵیدا بۆیان و خۆی پشتی پێ هەڵکردو لە شوێنێکا خۆی پەنا گرت گوێی لێ بێ پاش خوێندنەوەی نامەکە ئەڵێن چی. گوێی لێ بوو شاژنی (سەبەء) بە دەستەو دائیرەکەی خۆی وت: ئەی کۆمەڵ! من نامەیەکی پڕ قەدر و حورمەتم بۆ هەڵدراوە.

(٣٠) ئەو نامەیە لەلایەن سولەیمانەوەیەو لە سەرەتایەوە نووسراوە: بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان.

(٣١) مەبەست لەم نامە ئەوەیە خۆتان بەرز مەگرن لەسەرم و بەگوێم بکەن و بە موسوڵمانی یا بە گوێڕایەڵی بێن بۆ لام.

(٣٢) شاژن بە دەستەو دائیرەکەی خۆی وت: ئەی کۆمەڵ! لەم پرسەما کە پێتان ئەکەم وەڵامم بدەنەوەو قسەی خێرم بۆ بکەن. من تا ئێستا هیچ مەسەلەیەکم نەبڕیوەتەوەو دوابڕیارم تیا نەداوە تا ئێوە ئامادە نەبووبن و بڕیارتان تیا نەدابێ.

(٣٣) کۆمەڵەی دەستەو دائیرەکەیشی لە وەڵاما وتیان: ئێمە بە ژمارەی سەر زۆر و بەهێزین و بە لەشیش زۆر ئازاو لێهاتووین و مەسەلەکەیش لە دەستی خۆتایە چونکە پادشای ئەم وڵاتەی، کەواتە وردبەرەوە چی بە باش ئەزانی و فەرمان بە چ ئەدەی فەرمان بدە ئێمەیش جێبەجێی بکەین.

(٣٤) شاژنیش وتی: پادشاهان ئەگەر پێیان نایە ئاوەدانییەك و داگیریان کرد کاولی ئەکەن و وەزعی تێك ئەدەن و خراپەی زۆری تیا ئەکەن و پیاوە گەورەکانی زەلیل و سووك و سەفیل ئەکەن. هەمیشە هەر وایان کردووەو ئێستەیش ئەگەر لەشکری سولەیمان بێ بەسەر ئەم وڵاتەی ئێمەدا هەروا ئەکا.

(٣٥) لەبەر ئەوە من ئاشتیم لەگەڵیا پێ باشە و، دیارییەکیان بۆ ئەنێرم با بزانم فروستادەکانم چۆن ئەگەڕێنەوەو چۆن دێنەوە بۆ لام؟

فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِى ٱلصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾



(٣٦) که فروستادەکەی شاژن هاتە لای سولەیمان و دیارییەکەی پێشکەش کرد، سولەیمان وتی: ئەوە ئێوە ماڵی دنیا بۆ من دێنن؟ من ئەوەی خوا داویمیّ لە هەموو ئەوە باشترە بە ئێوەی داوە، ئێوە خۆتان بەم دیارییەی بۆ منتان هێناوە دڵتان خۆش ئەبیّ، بیبەنەوە بۆ خۆتان، من پێویستم پێی نییە.

(٣٧) بگەڕێرەوە بۆ لایان، بڕیار بیّ بە لەشکرێکەوە بێینە سەریان توانی بەرەنگاری کردنییان نەبیّ و بە زەلیلی و ملکەچی لە شارەکەیانیان ئەکەینە دەرەوە.

(٣٨) که فروستادەکەی شاژن گەڕایەوە بۆ سەبەء و قسەکانی سولەیمانی بۆ گێڕایەوە، شاژن بڕیاریدا بڕوا بۆ دیدەنی سولەیمان و خۆی بۆ ئەوە ئامادەکرد و کەوتەڕیّ بۆ قودس. سولەیمانیش کە ئەم هەواڵەی پێگەیشت بە کۆڕەکەی دەوروبەری خۆیی وت: کامتان تەختەکەی شاژنم بۆ دێنێتە ئێرە بەرلەوەی خۆیان بە موسوڵمان بوویی یا بە ملکەچی بێنە بەردەستم؟

(٣٩) دێویّ لە جنۆکەکان وتی: من بەرلەوەی لەو شوێنەی خۆت ڕاست بیتەوە بۆت ئەهێنم و بەڕاستی من کابرایەکی بەهێزو ئەمینم و ئەو کارەم پیّ ئەکریّ و بەڕاستییش ئەیکەم.

(٤٠) یەکێکی تریش کە زانیاریی نهێنییەکانی (لوح المحفوظ)ی هەبوو وتی: من لە چاوترووکانێکدا ئەیهێنمە بەردەستت. کە سولەیمان چاوی هەڵخست سەیری کرد ئەوا تەختەکەی شاژن لەبەردەمیایە، وتی: ئەمە لە لوتفی خواوەیە لەگەڵ من، خوا تاقیم ئەکاتەوە بزانیّ سوپاسی ئەکەم یا نایکەم. هەرکەسیش سوپاسی بکا سوودی سوپاس کردنەکەی بۆ خۆیەتیو هەرکەسیش سپڵە بیّ و سوپاسی نەکا خوای من بیّئیحتیاجە بەم خەڵکەو خاوەن بەخشە.

(٤١) سولەیمان وتی: تەختەکەی لیّ بگۆڕن واتە هەندیّ دەسکاریی وای تیا بکەن هەندیّ شتی وەك جاران نەمێنیّ تا بزانین ئاخۆ ئەیناسێتەوە یا ئەبیّ بە یەکیّ لەوانە کە شتی خۆیان ناناسنەوەو سەرکوێرو کەودەنن؟

(٤٢) شاژن کە گەیشتە بەرەوە پێیوترا: تەختەکەی تۆ ئاوایە؟ ئەویش وتی: هەر ئەڵێی خۆیەتی و ئێمە لەپێش ئەم ڕووداوەوە زانیاریمان لەبارەی توانی خواو موعجیزەی پێغەمبەرانەوە دراوەتیّ و بەر لەوەی بگەینە ئێرەو ئەم موعجیزەیە ببینین موسوڵمان بووین و ملمان بۆ فەرمانی خوا کەچ کردووە.

(٤٣) پێشتر ئەوە ڕێی موسوڵمانیەتی و مل بۆ خوا کەچ کردنی لە شاژن گرتبوو کەوا غەیری خوای ئەپەرست چونکە لە قەومێکی کافرو خوانەناس بوو.

(٤٤) پێی وترا: وەرە ناو کۆشکی سولەیمانەوە. کەناو کۆشکەکەی دی شووشەبەند بوو و شەوقی ئەدایەوەو ، وای زانی ئاوەو کراسەکەی هەڵکردو پیّو پووزی دەرخست. سولەیمانیش پێی وت: پێویست ناکات کراسەکەت هەڵماڵی ئەوە ئاو نییە، ئەو تەختانی ناو تەلارە تەختانێکی ساف و لووسی و شووشەبەندە، شاژنیش وتی: خوایە من لەمەوبەر ستەمم لە خۆم کردووە کە ڕۆژم پەرستووەو وا ئێستا لەگەڵ سولەیمان مل کەچ ئەکەم بۆ خوای هەموو جیهانەکان.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا
هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ
بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ
تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ قَالَ طَٰٓئِرُكُمْ
عِندَ ٱللَّهِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِى ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ
رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا۟
تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا
مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا
وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ
﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓا۟ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ
أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ
ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾



(٤٥) ئێمە بەڕاستی ساڵحی برای خێڵی سەموودمان نارد بۆسەر خێڵەکەی پێیان بڵێ: خوا بپەرستن و دەست لە پەرستنی غەیری خوا هەڵبگرن، کەچی لەجیاتیی ئەوەی هەموو شوێن قسەی بکەون و گوێی بۆ شل بکەن بوون بەدوو بەشەوە، بەشێکیان باوەڕیان پێ کردو بەشێکیان لاسارییان کردو بەکافری مانەوەو ئەم دووتاقمە لەناو خۆیانا بوو بەهەرایان.

(٤٦) ساڵحیش بەکافرەکانیانی وت: ئەرێ خزمینە! ئەوە بۆ بەر لەوەی لە چاکە بگەڕێن دەست پێشخەری بۆ خراپە ئەکەن و باوەڕ بە پێغەمبەرایەتیی من ناکەن؟ ئەوە بۆ داوای بەخشین لە خوا ناکەن بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێ و خوا لێتان ببوورێ.

(٤٧) ئەوانیش وتیان: ئێمە بەهۆی تۆو ئەوانەوە لەگەڵتان شووم و نەگبەتیمان هاتووەتە ڕێ. ساڵحیش وتی: حاشا شوومی و نەگبەتی لە منەوە نی‌یەو شووم و نەگبەتیتان لە خواوە بۆ دێ و هەمووی بەدەست ئەوە، بەڵکو ئێوە خێلکێکن خوا تاقیتان ئەکاتەوەو خێرو شەڕیشتان دێتەڕێ.

(٤٨) لەو شارەی سەموودا کە ساڵحیان نێرابووە سەر نۆ کەس هەبوون هەموو بەجارێ خراپەیان ئەکرد و هیچی چاکیان نەئەکرد.

(٤٩) لەناو خۆیانا وتیان: سوێند بخۆین بەخوا شەو لەپڕ بدەین بەسەر خۆیی و ماڵ و منالّیا و بییانکوژین و پاشان کەس و میتراگرانی وتیان: بۆ واتان کرد، بڵێین ئێمە ئاگامان لە کوشتنی ماڵ و منالّی نی‌یەو ڕاستیش ئەکەین چونکە کوشتنەکەیان بە کەسانێکی تر کردووەو ئەو نۆ کەسە خۆیان لە کات و شوێنی کوشتنەکەیانا حازر نەبوون.

(٥٠) ئەوان بە فێلکردن فێڵیان کرد و ئێمەیش بە فێڵکردن فێڵەکەی خۆیانمان کرد بەهۆی فەوتانیان و ئەوان ئاگایان لەمە نەبوو و پێیان نەزانی.

(٥١) جا سەیرکە ئەنجامی فێڵەکەیان چۆنی لێ دەرچوو؟ ئەوەبوو ئێمە ئەو نۆکەسەو خێڵەکەیشیانمان هەموو فەوتاندو نابووتمان کردن.

(٥٢) ئەوەتا بە هۆی ئەو ستەمەوە کە کردیان خانووەکانیان چۆڵ و هۆڵن بەڕاستی لەمەدا کە ڕووی‌دا لە خێڵەکەی ساڵح، نیشانەی توان و دەسەڵاتی خوا دیارە بۆ کەسانێ شت ئەزانن و پەندی لێ وەرئەگرن.

(٥٣) ئەوانەیشمان ڕزگارکرد کە ئیمانیان هێنابوو و لە خوای خۆیان ئەترسان.

(٥٤) باسی لووطیش بکە کە بە خێڵەکەی خۆی وت: ئەوە ئێوە کاری ناشیرین و ناپەسەند ئەکەن و چاوتان لێیەو ئەیشزانن چەند کارێکی نارەواو ناپەسەندە؟ !

(٥٥) ئێوە بۆ ڕاپی کردنی ئارەزوو و حەزی خۆتان ئەچنە لای پیاوان و ناچنە لای ژنەکانتان کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوون؟ ئێوە کەسانێکن نازانن چاك کامەیەو خراپ کامەیە.

۞ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٖ مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرٗاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٖ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلْ هُمْ قَوْمٞ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارٗا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرٗا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًاۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرَۢا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِۦٓۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾



(٥٦) وەلامی خێڵی لووط لەسەر ئەم ئامۆژگارییە باشە لەوە زیاتر نەبوو کە وتیان: لووط و تاقمی لووط لە دێکەی خۆتان دەرکەن. ئەوانە خۆیان بە پاك و ئێمە بە پیس دائەنێن.

(٥٧) جا ئێمەیش لووط و ماڵ و منالەکەیمان ڕزگارکرد ژنەکەی نەبێ کە بڕیارماندابوو لەوانە بێ کە کاریان بەسەرچووەو ئەبێ بفەوتێن.

(٥٨) بارانێکی نەگبەتمان بەسەرا باراندن. بارانێکی خراپ بوو بارانی ئەوانەی پێشتر ترساندبوومانن لەوەی غەزەبی خوایان بەسەرا داباریٚ.

(٥٩) بڵێ: سوپاس بۆ خواو سەلامەتی لە دەردو مەینەت بۆ ئەو بەندانەی لەناو هەموو خەڵکا هەڵیبژاردوون. خوا باشە بۆ ئەوەی ئادەمزاد بیپەرستن و گوێڕایەڵی فەرمانی بن یا ئەو شتانەی ئەیانکەن بە هاوبەشی خوا؟

(٦٠) یاخود کێیە ئەوەی ئاسمانەکان و زەویی دروستکردووەو ئاوی لە ئاسمانەوە بۆ باراندوون و پاشان بەو ئاوە باخ و باخچەی جوان و ڕازاوەمان ڕواندووە کە بۆتان نەئەکرا درەختەکانیان بڕوێنن؟ ئایا خوایەك هەیە لەگەڵ زاتی خوادا؟ نەخێر نییە، بەڵام ئەمانەی هاوبەش بۆ خوا دائەنێن تاقمێکن لە ڕاستی لائەدەن.

(٦١) یاخود ئەوە کێیە زەوی کردووە بە جێگەی ئۆقرەتیاگرتنتان و ڕووباری ئاوی بەناویا ڕەوانکردووە و کێوی دامەزراوی بۆ دروست کردووەو لە نێوان دەریای ئاوی شیرین و سوێراوا کۆسپێکی دروست کردووە ناهێڵێ ئاوەکانیان تێکەڵی یەکتری بن؟ ئایا خوایەکی تر هەیە لەگەڵ خوادا لە کردنی ئەم کارانەدا هاوبەشی بێ؟ نەخەیر نییە، بەڵام بەشی زۆری ئەم خەڵکە نەفامن و نازانن ڕاستی کامەیە؟

(٦٢) یاخود کێیە ئەوەی دوعای داماوان قوبووڵ ئەکا کاتێ لێی بپاڕێنەوەو شتی خراپەو ناخۆش لە ئادەمزاد لائەداو ئەتانکا بە جێگرەوەو جێنشینی پێشینەکانتان لە زەویدا؟ ئایا خوایەکی تر هەیە لەگەڵ خوادا هاوبەشی بێ لە کردنی ئەم کارانەدا؟ نەخێر نییە بەڵام ئێوە زۆر کەم وا ئەبێ بیربکەنەوەو ئەم ڕاستییە بزانن.

(٦٣) یاخود ئەوە کێیە لە تاریکستانی وشکانیو دەریادا شارەزاتان ئەکاو ڕێگای هاتوچۆتان پیشان ئەداو، کێیە با ئەنێرێ بە مژدەدەری پێشوەختی بارانی ڕەحمەت؟ ئایا خوایەکیتر هەیە لەگەڵ خوادا هاوبەشی بێ لە کردنی ئەم کارانەدا؟ نەخەیر، خوا گەلێ بەرزو بڵندترە لەو شتانە کە ئەوانە بە هاوبەشی خوایان دائەنێن.

أَمَّن يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ
أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾
قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ
أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلْمُهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ بَلْ هُمْ
فِى شَكٍّ مِّنْهَا بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا
هَـٰذَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾
قُلْ سِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ
﴿٦٩﴾ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿٧٠﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلْ عَسَىٰٓ
أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ ٱلَّذِى تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ
لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ
رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ
فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّا فِى كِتَـٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ إِنَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ
يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾



(٦٤) یاخود کێیە ئەوەی ئەم گشتە مەخلووقاتەی لە نەبوون دروست کردووەو پاش مراندنیشیان سەرلەنوێ زیندوویان ئەکاتەوەو، کێیە ئەوەی لە ئاسمان و زەوییەوە ڕزق و ڕۆزیتان ئەداتێ؟ ئەگەر لاتان وایە لە خوا بەولاوە کەسێ هەیە ئەم کارە بکا بەڵگەو دەلیلی خۆتان بێنن و پیشانی بدەن ئەگەر ڕاست ئەکەن.

(٦٥) تۆ بڵێ: تێکڕای ئەوانەی لە ئاسمان و لە زەویدان هیچیان غەیب نازانن و ئاگایان لێ نییە، هەر خوا خۆی ئەیزانێ و، هەروەها نایشزانن کەی زیندوو ئەکرێنەوە.

(٦٦) بەڵکو زانیاریو مەعلووماتی ئەم خەڵکە لە بارەی ئەوزاعی قیامەتەوە زۆر کەم و کورت و ناتەواوە، بەڵکو گومانیشیان لەوەدا هەیە کە ڕۆژی قیامەت دێ و، بەڵکو هەر سەرکوێریشن تیایاو بەڵگەکانی نازانن.

(٦٧) کافرەکان وتیان: ئاخۆ ئێمە کە مردین و بووین بە خۆڵ و هەوا باو و باپیرە پێشینەکانیشمان لە گۆڕ دەرئەهێنرێین و سەرلەنوێ زیندوو ئەکرێینەوە؟

(٦٨) بەڕاستی پێش ئەوەیش موحەممەد ئەم گفتەمان بداتێ ئەم گفتەمان دراوەتیو بە باوك و باپیرانیشمان دراوە، بەڵام ئەم گفتی زیندوو کردنەوەی مردووانە لە ڕۆژی قیامەتا لە ئەفسانەی پێشینان بەولاوە نییە.

(٦٩) تۆیش پێیان بڵێ: بڕۆن بە زەویدا بسووڕێنەوەو سەیرکەن ئەنجامی تاوانکاران چۆن بووەو خوا چۆنی تۆڵە لێ سەندوونەتەوەو نوغرۆی کردوون.

(٧٠) خەفەتبار مەبە بۆ ئەوە کە باوەڕت پێ ناکەن و ئیمان ناهێنن و بە هۆی فڕوفێڵیشیانەوە دڵتەنگ مەبە.

(٧١) ئەو کافرانە ئەڵێن: ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن کاتی ئەو سزایە کەیە ئەڵێن سزای ئێمەی پێ ئەدرێ.

(٧٢) تۆیش بڵێ: بەڵکو ئەمە خوایە هەندێ لەو سزایەی پەلەتانە بۆتان بێ، پێتان بگا.

(٧٣) بەڕاستی خوای تۆ خاوەنی فەزڵ و کەرەمە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام بەشی زۆری ئەم خەڵکە سوپاسی خوا ناکەن.

(٧٤) بەڕاستییش خوای تۆ ئەزانێ ئەم کافرانە چییان لەناو دڵیانا هەڵگرتووەو چییشی لێ ئاشکرا ئەکەن و، خوا هیچی لێ ناشاررێتەوە.

(٧٥) هیچ شتێکی نادیار نییە لە ئاسمان و لە زەویدا کە لە عیلمی خوا یا لە (لوح المحفوظ)دا نەبێ.

(٧٦) بەڕاستی ئەم قورئانە بەشی زۆری ئەو بابەتانە ئەگێڕێتەوە بۆتان کە بەنیئیسرائیل ناکۆکییان لەناوا هەیە لەبارەیانەوە.

وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُم بِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ ﴿٧٩﴾ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِى ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨١﴾ ۞ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِيَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٨٦﴾ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾



(٧٧) بەڕاستی ئەم قورئانە مایەی ڕێپیشاندان و ڕەحمەتی خوایشە بۆ کەسانێ کە باوەڕیان هەبێ.

(٧٨) بەڕاستی خوای تۆ بڕیاری خۆی ئەدا لە نێوان بەنی ئیسرائیلا بەگوێرەی ئیرادەی خۆی و، خوا بەسەر هەموانا زاڵەو هەموو شتێ ئەزانێ.

(٧٩) کەواتە پشت بە خوا ببەستەو پاڵ بدەرە سەر ئەو بۆ پاراستنت، بێگومان تۆ لەسەر ئایینی ڕاستی ڕووناکی.

(٨٠) بەڕاستی تۆ ناتوانی کارێ بکەی مردوو قسەت ببیسن و، ناتوانی کارێ بکەی کەڕ گوێیان لە بانگەوازت بێ ئەگەر کەڕەکان خۆیان بیانەوێ پشت پێ هەڵبکەن و گوێ لە بانگەوازەکەت نەگرن، واتە ئەم کافرانە وەك مردوو و وەك کەڕ وان. ئەگەر خوا بە قودرەتی خۆی کارێ نەکا گوێت بۆ شل بکەن، تۆ ناتوانی گوێیان پێ شل بکەی. (٨١) هەروا بەڕاستی تۆ ناتوانی ڕێگا پیشانی کوێران بدەیو لە گومڕاهییان وەرگێڕی. تۆ ئەتوانی گوێ تەنها بەو کەسانە شل بکەی کە باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیە. ئەوانە ملکەچی فەرمانی خوان. (٨٢) کاتێ کە ئادەمزاد مووستەحەقی عەزابی خوا ئەبن و فەرمودەی هاتنی عەزاب دێتە سەریان واتە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوەی تاوانباران نزیك ئەبێتەوە، شتێکیان لە زەوی بۆ دەرئەکەین ئەڕوا بەڕێداو قسە لەگەڵ خەڵك ئەکا ئەڵێ: ئەم خەڵکە باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوا نەبوو. (٨٣) باسی ئەو ڕۆژە بکە کە لە هەموو ئوممەتێ کۆمەڵێ لەوانەیان کۆئەکەینەوە کە باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە نەبوو. جا ماتڵ ئەکرێن بۆ لێپرسینەوە.

(٨٤) کاتێ کە دێن بۆ مەیدانی لێپرسینەوە خوا پێیان ئەڵێ: بۆچی بەر لەوەی باش بیربکەنەوەو لە ئایەتەکانی ئێمە بگەن و بزانن ڕاستن و عەقڵ ئەیانگرێ یا نە، بە درۆتان دانان و باوەڕتان پێ نەکردن، یا چیتان ئەکرد لە کردەوەی ناڕەوا بێ ئەوەی سەیریکەن ئەنجامی کردەوەکانتان چۆن ئەبێ؟

(٨٥) فەرموودەی خوایان بۆ هاتنی عەزاب بۆیان بەسەردا کەوت بەهۆی ئەو ناحەقییانەوە کە کردبوونیان و ئەوانیش هیچ ناڵێن چونکە ناتوانن و مەجالی وتنی هیچیان نابێ.

(٨٦) ئایا نابینن یا نازانن ئێمە شەومان بۆ ئەوە داناوە خەڵك ئۆقرەی تیا بگرن و تیا بحەسێنەوەو ڕۆژیشمان ڕووناك کردووەتە خەڵك کارو کاسبیی تیا بکەن؟ بێگومان ئەمە گەلێ نیشانەی گەورەیی خوای تیایە بۆ کەسانێ کە باوەڕیان بە خوای خۆیان بێ.

(٨٧) باسی ئەو ڕۆژە بکە کە فووی پیا ئەکرێ بە (صور) دا، لەو کاتەدا هەرکەس لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە ترسی عەزابی خوای لێ‌ئەنیشێ مەگەر کەسێ خوا مەیلی وابێ نەترسیو هەموو ئادەمزاد بە داماوییەوە دێنە مەیدانی خوا بۆ لێپرسینەوە.

(٨٨) کێوەکانی سەر زەوی ئەبینی وا گومان ئەبەی کە وەستاو و ئارامن و لە ڕاستیدا وەك پەڵە هەور ئەبزوون چونکە شتی گەورە کە بەجارێ بجووڵێ ئادەمزاد هەست بە جووڵەی ناکا. ئەمەیش کاری ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی بە باشی دروست کردووە، بێگومان خوا ئاگادارە لە هەر کارێ کە ئێوە ئەیکەن.

مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِى حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنْ أَتْلُوَا۟ ٱلْقُرْءَانَ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾

## سُورَةُ القَصَصِ

مكية ٢٨ — آياتها ٨٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾



(٨٩) هەرکەسێ لە دنیادا کردەوەی باشی کردبێو لە ڕۆژی لێپرسینەوەی قیامەتا ئەو کردەوە چاکانەی خۆی بهێنێتە مەیدانی لێپرسینەوە، پاداشی چاکتری لە کردەوەکەی خۆی ئەدرێتەوەو، ئەو کەسانە لەو ڕۆژەدا لە ترسی سزا ئەمێنن.

(٩٠) کەسانێکیش لە دنیادا خراپەیان کردبێ لە ڕۆژی قیامەتیشا کردەوەی خراپی خۆیان دێتە بەردەمیان و بەدەما فڕێ ئەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخ و، لە لایەن کاربەدەستانی دۆزەخەوە پێیان ئەوترێ: ئایا ئێوە جەزاتان بە لەوە بەولاوە ئەدرێتەوە کە خۆتان لە دنیادا ئەتانکرد؟

(٩١) ئەی موحەممەد! تۆ بەم کافرانەی مەککە بڵێ: من تەنها فەرمانی ئەوەم دراوەتێ ئەو خوایە بپەرستم کە خوای ئەم شارەیەو کوشتارو بەدڕەفتاریی تیا حەرام کردووەو هەموو شتێ لە ئاسمان و زەویدا بەدەست خۆیەتیو من فەرمانم دراوەتێ کەوا لە موسوڵمانان بم.

(٩٢) فەرمانیشم دراوەتێ قورئان بخوێنم، جا هەرکەس ڕێی ڕاست ئەگرێتە بەر ئەوە بۆ خۆیی ئەگرێتەبەرو هەرکەسیش لە ڕێی ڕاست لائەدا تەوە تۆ پێیان بڵێ: من تەنها ئەوەندەم بەدەستە کە خەڵك لە سزای خوا بترسێنم.

(٩٣) بیشڵێ: سوپاس بۆ خوا لەمەولا خوا نیشانەکانی گەورەییو توانی خۆیتان پیشان ئەداو ئێوەیش ئەزانن ئەوانە نیشانەی گەورەییو توانی خوان و، خوای تۆیش بێ ئاگا نی‌یە لەو کارانەی ئێوە ئەیانکەن.

## سوورەتی (القَصَص)

**(٨٨) ئایەتەو مەککەیی‌یە لە ئایەتی (٥٢) وەوە نەبێ تا ئایەتی (٨٥) ئەوانەی مەدینەیین**

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چی‌یە.

(٢) ئەم ئایەتانەی لەم سوورەتەدان ئایەتی قورئانی ڕێگا ڕوونکەرەوەن.

(٣) هەندێ لە دەنگوباسی مووساو فیرعەونت بەڕاستی بەسەردا ئەخوێنینەوە بۆ قەومێ کە باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەری خوای هەیە.

(٤) بەڕاستی فیرعەون بەرز بووەوە لە زەویداو خەڵکی وڵاتەکەی تاقم تاقم کردبوو بۆ ئەوەی زاڵ ببێ بەسەریانا، تاقمێکیانی لاوازو سووك ئەکرد، هەر منداڵێکی نێرینەیان لێ بهاتایەتە دنیاوە سەری ئەبڕیو منداڵی مێیینەیانی بە زیندووی ئەهێشتەوە. بەڕاستی فیرعەون یەکێ بوو لەوانەی خراپە ئەکەن.

(٥) ئێمەیش ئەمانەوێ چاکەی خۆمان بکەین لەگەڵ ئەوانەی لاوازو سووك کرابوون و بیانکەین بە پێشەوای ئاین و بیانکەین بە میراتگری موڵك و ماڵی فیرعەون.

وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ أُمِّ مُوسَىٰ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي ۖ إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰ أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَارِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِ قُصِّيهِ ۖ فَبَصُرَتْ بِهِ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَاهُ إِلَىٰ أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾



(٦) هەروا ئەمانەوێ دامەزراویان کەین لە زەویداو ئەوەیش بەهۆی سەرکوتکراوەکانەوە پیشانی فیرعەون و هامان و لەشکرەکەیان بدەین کە لێی ئەترسان کە بەربادبوون و فەوتانە.

(٧) خستمانە دڵی دایکی مووساوە کەوا بەخێوی بکەو شیری بدەرێو هەرکاتێ ترست لێپەیداکرد کە بێن بیبەن فڕێی دەرە ناو ئاوی دەریاوەو مەترسە کە هیچی بەسەر بێو خەفەتی بۆ مەخۆ کەوا لێت دوورئەکەوێتەوە، ئێمە سەرەنجام ئەیهێنینەوە بۆ لای خۆت و ئەیکەین بە یەکێ لە پێغەمبەران.

(٨) پاش ئەوەی کە دایکی مووسا مووسای دا بەدەم ئاوەوەو ئاو بردی، دەستودائیرەی فیرعەون بەسەر ئاوەوە گرتیانەوە بۆ ئەوەی سەرەنجامی کار ببێ بە دوژمنیان و بە مایەی خەم و خەفەت بۆیان. بەڕاستی فیرعەون و هامان و لەشکرەکەیان لە هەموو ڕوویەکەوە بەهەڵە چووبوون، لەوەدا کە لە پێشا بەهیوای کوشتنی ئەو، واتە مووسا، منالّی نێرینەی ئیسرائیلیان هەموو ئەکوشت و، پاشانیش لەوەدا کە بەسەر ئاوەکەوە گرتیانەوەو، دواتریش لەوەدا کە بە پێغەمبەری هاتە سەریان باوەڕیان پێ نەکرد.

(٩) کە بەسەر ئاوەکەوە گرتیانەوەو بردیانە لای ژنەکەی فیرعەون ژنەکەی فیرعەون بە فیرعەونی وت: ئەم منالّە فێنکایی چاوانی من و تۆیەو چاومانی پێ ئەکرێتەوە کە منالێکی وا نازدار لە مالّەکەمانا ئەبینین، مەیکوژن، بەڵکو سوودێکی ببێ بۆمان یا بیکەین بە منالّی خۆمان. ئەوان ئەم قسانەیان ئەکردو هیچ ئەوەیان نەئەزانی کە ئەم منالّە مووسایەو ئاخری سەریان ئەخواو ئەبێ بە مایەی بەربادبوون و مالّ وێرانییان.

(١٠) کە دایکی مووسا زانیی مالّی فیرعەون منالّەکەییان بەسەر ئاوەوە گرتووەتەوەو بردوویانەتە لای خۆیان، لە ترسانا هیچ بیرو هۆش لە دلّیا نەماو لەوانەبوو لەبەر حیرسی لەسەر منالّەکەی بڕوا پێیان بلّێ: ئەو منالّە مووسای کوڕی منە، ئەگەر ئێمە دلّیمان بەهێز نەکردایە کە خۆی بگرێو قسە نەکاو یەکێ بێ لەوانە کە باوەڕیان بە خوا هەیە چونکە خوا خۆی پێشتر خستبوویە دلّیەوە ئێمە سەرەنجام ئەیهێنینەوە بۆ لای خۆت و ئەیشیکەین بە پێغەمبەر.

(١١) دایکی مووسا بە خوشکەکەی مووسای وت: بکەوەرە پەیجۆری براکەت بزانە کەوتووەتە کوێو چیی بەسەرهاتووە، ئەویش ڕۆیشت بۆ مالّی فیرعەون و لەوێ لە دوورەوە براکەی خۆیی دیو دەستەو دائیرەی فیرعەون پێیان زانی.

(١٢) بەرلەوەی خوشکەکەی مووسا بچێتە مالّی فیرعەون و لەوێ بیدۆزێتەوە، ئێمە مژینی مەمکی هەر ئافرەتێکمان لە مووسا حەرام کردبوو کە ئەیانبرد شیری بدەنێ، واتە بە فەرمانی خوا مەمکی هیچ ژنێکی نەئەگرت بە دەمیەوە. کاتێ کە خوشکەکەی چووە ئەوێو چاوی پێکەوت و دیتی چۆن بەدەستیەوە داماون و مەمکی هیچ ژنێ ناگرێ بە دەمەوە، پێی وتن: مالّێکتان پیشان بدەم لە ئەستۆی خۆیانی بگرن و شیری بدەنێو چاودێریی بکەن؟

(١٣) مالّی فیرعەونیش پێیان خۆش بوو ئافرەتێکی وایان دەسکەوێ مووسا شیریان بخواو چاودێری بکەن، بۆیە دایانە دەستی خوشکەکەی بیبا بۆ مالّەوەو بەوجۆرە مووسامان گێڕایەوە بۆ دایکی تا چاوی فێنک ببێتەوەو خەفەت نەخوا بۆ دووریی کوڕەکەیو بزانێ ئەو گفتەی خوا دابوویێ کەوا منالّەکەی بۆ ئەهێنێتەوە ڕاستە، بەلاّم بەشی زۆری ئەم خەلّکە ئەمە نازانن.

وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسۡتَوَىٰٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ ٱلۡمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفۡلَةٖ مِّنۡ أَهۡلِهَا
فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيۡنِ يَقۡتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنۡ عَدُوِّهِۦۖ
فَٱسۡتَغَٰثَهُ ٱلَّذِي مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِي مِنۡ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ
فَقَضَىٰ عَلَيۡهِۖ قَالَ هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّهُۥ عَدُوّٞ مُّضِلّٞ مُّبِينٞ
﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي فَٱغۡفِرۡ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓۚ إِنَّهُۥ هُوَ
ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ فَلَنۡ أَكُونَ
ظَهِيرٗا لِّلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٧﴾ فَأَصۡبَحَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا
ٱلَّذِي ٱسۡتَنصَرَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ يَسۡتَصۡرِخُهُۥۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِيّٞ
مُّبِينٞ ﴿١٨﴾ فَلَمَّآ أَنۡ أَرَادَ أَن يَبۡطِشَ بِٱلَّذِي هُوَ عَدُوّٞ لَّهُمَا قَالَ
يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقۡتُلَنِي كَمَا قَتَلۡتَ نَفۡسَۢا بِٱلۡأَمۡسِۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ
أَن تَكُونَ جَبَّارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴿١٩﴾
وَجَآءَ رَجُلٞ مِّنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلۡمَلَأَ
يَأۡتَمِرُونَ بِكَ لِيَقۡتُلُوكَ فَٱخۡرُجۡ إِنِّي لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾
فَخَرَجَ مِنۡهَا خَآئِفٗا يَتَرَقَّبُۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢١﴾



(١٤) کاتێ کە مووسا گەیشتە تەمەنی هێزو خۆڕاگرتنیو بوو بە پیاوێکی پیاوانە، توان و زانستی بەڕێوەبردنی کاروبارمان دایەو ئێمە پاداشی پیاوچاکان بەم جۆرە ئەدەینەوە. (١٥) جارێکیان کاتێ کە خەڵك ئاگایان لە خۆیان نەبوو و نووستبوون مووسا هاتە ناو شار، لەوکاتەدا دوو کەسی دی چووبوون بەگژی یەکا، یەکێکیان لە تاقمی خۆی بوو و ئەوی تریان لە بەرەی دوژمنەکەی بوو، ئەوەیان کە لە تاقمی خۆی بوو داوای یارمەتیی لێ کرد لەدژی ئەوەیان کە لە بەرەی دوژمنەکەی بوو، مووسایش مستەکۆڵەیەکی لێداو کوشتی، کە دیی وا کابرای کوشت وتی: ئەم کارەی کردم کاری شەیتان بوو، شەیتان دوژمنێکی گومڕاکەری ئاشکرایە.

(١٦) جا ڕووی کردە خواو وتی: خوایە بەڕاستی من ستەمم لە خۆم کرد، لێم خۆش ببە. خوایش لێی خۆش بوو. بەڕاستی خوا بەخشندەو بەڕەحمە.

(١٧) کە خوا لێی خۆش بوو، ئەمیش وتی: خوایە بەرانبەر بەم نیعمەتەی بە منت داو لێم خۆش بووی، لەمەوپاش هەرگیز پشتیوانی تاوانباران نابم.

(١٨) ئیتر لەبەر ئەوەی کە ئەو کابرایەی کوشتبوو وای لێهات لە ناو شارا لە خۆی ئەترسا، چاوەڕوانی ئەوەبوو دەستەو دائیرەی فیرعەون و کەسوکاری کوژراوەکە لە تۆڵەدا بیکوژنەوە. لە پڕ لووتی بوو بە لووتی کابراوە کە دوێنێ هاواری لێ کردبوو و داوای یارمەتیی لێ کردبوو ئەمڕۆش هاواری لێ ئەکرد جارێکی تریش یارمەتیی بدا. مووسا نەیویست بەدەنگیەوە بچیو پێی وت: کابرا تۆ گومڕایەکی ئاشکراو دیاریت.

(١٩) لەگەڵ ئەوەیشا مووسا کە دیی کابرای هاوارکەر بەدەست کابراکەی ترەوە زەلیلە، غیرەتی قووبووڵی نەکرد نەچێ بەهاواریەوەو ویستی هەڵمەت بەرێ بۆ ئەم کابرا کە دوژمنی خۆیشیو دوژمنی کابرای هاوارکەریش بوو چونکە هاوارکەرەکە لە بەنیئیسرائیل و ئەمی تر قیبتیو لە تاقمی فیرعەون بوو، کابرای قیبتی وتی: ئەی مووسا ئەوە ئەتەوێ منیش بکوژی وەك چۆن دوێنێ کابرایەکت کوشت. تۆ هیچت ناوێ ئەوە نەبێ ببی بە کابرایەکی زۆردار لەم سەرزەوییەداو ناتەوێ یەکێ بی لەوانەی کاری چاکە ئەکەن و ئەگەر دوو کەس لەناو خۆیانا شەڕیان بوو ئاشتیان کەیتەوە.

(٢٠) کابرایەك لەلای ئەو پەڕی شارەوە بە ڕاکردن هات بۆ لای مووساو پێی وت: ئەی مووسا کۆمەڵی بارەگای فیرعەون لەناو خۆیانا خەریکی ڕاوێژن بۆ کوشتنت، دەستوبردکە لە شار دەرچۆ، من یەکێکم لەوانەی ئامۆژگاریی دۆستانەت ئەکەن.

(٢١) جا مووسایش بە ترسەوە لە شار دەرچوو، چاوەڕوانی ئەوە بوو بێن بەدوایا بیگرن، وتی: خوایە ڕزگارم کە لەم خێڵە ستەمکارە.

وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهْدِيَنِي سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِي حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتْهُ إِحْدَىٰهُمَا تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيْهِ ٱلْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتْ إِحْدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسْتَـْٔجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِيُّ ٱلْأَمِينُ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ٱبْنَتَيَّ هَٰتَيْنِ عَلَىٰٓ أَن تَأْجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا ٱلْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَٰنَ عَلَيَّ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٢٨﴾



(٢٢) که ڕووی کرده شاری مەدیەن لە فەلەستین وتی: بەهیوام خوا شارەزام بکا بۆ سەر ڕێی ڕاست.

(٢٣) کاتێ کە گەیشتە سەر بیرەکەی مەدیەن دی خەڵکی مەدیەن ئاژەڵیان لێ ئاو ئەداو لە خوار ئەوانیشەوە دوو ژنی دی مەڕەکانی خۆیان لائەدا لەوەی تێکەڵی مەڕی خەڵکانی تر ببن. پێی وتن: بۆ مەڕەکانتان لائەدەن؟ ژنەکان وتیان: ئێمە ئاوی مەڕەکانمان نادەین تا شوانەکان لائەچن لەسەر بیرەکەو تەنها خۆمان ئەمێنینەوەو باوکیشمان پیرێکی بەساڵاچووە ناتوانێ بێ لەگەڵ خەڵکەکەدا ئاوی مەڕەکان بدا.

(٢٤) کە ژنەکان باسی خۆیانیان بۆ مووسا گێڕایەوە مووسایش مەڕەکانی بۆ ئاودان و ئەوسا چووە سێبەرێ لەو شوێنەدا دانیشت و ڕووی کردە خواو وتی: خوایە من موحتاجی چاکەیەکم تۆ لەگەڵم بکەی.

(٢٥) جا یەکێ لە ژنەکان هات بۆ لای مووساو بەشەرمەوە ئەڕۆیشت بەڕێداو پێی وت: باوکم بانگت ئەکا بۆ ئەوەی پاداشی ئەو پیاوەتییەت بداتەوە کە مەڕەکانت بۆ ئاو داین. کە مووسا هاتە لای باوکیان و سەرگوزەشتەکانی خۆی بۆ گێڕایەوە، باوکیان کە شوعەیب پێغەمبەر بوو پێیوت: مەترسە ڕزگارت بووە لەو تاقمە ستەمکارە کە تاقمی فیرعەونە.

(٢٦) یەکێ لە دوو کچەکەی شوعەیب وتی بە باوکی: بابە ئەم کوڕە بەکرێ بگرە بۆ بەخێوکردنی مەڕەکانمان. بێگومان باشترین کەسێ بەکرێی بگری کەسێکە هێزو توانی کارکردنی ببێو دەستپاکیش بێ، ئەم کوڕەیش بەهێزو دەست پاکە.

(٢٧) شوعەیبیش بە مووسای وت: من ئەمەوێ یەکێ لەم دوو کچەی خۆمت لێ مارە ببڕم بەمەرجێ تۆیش هەشت ساڵ کرێکاریم بۆ بکەی. خۆ ئەگەر دە ساڵت تەواوکرد ئەوە پیاوەتیی خۆتەو من نامەوێ ئەزیەتت بدەم، خوا یار بێ ئەبینی پیاوێکی باش و بەشەرت و وەفا ئەبم لەگەڵت.

(٢٨) مووسایش وتی: ئەوەی کە وتت ڕێکەوتنی نێوان من و تۆ بێ، هەرکام لەو دوو ماوەیەی هەشت ساڵ یا دە ساڵ کرێکارییەم بەجێهێنا بۆت داوای زیاترم لێ مەکە چونکە ئەرکی خۆمم جێ بەجێ کردووەو خوا ئاگادارە لەوەی ئەیلێین.

۞ فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارٗاۖ قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ وَأَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ ﴿٣١﴾ ٱسۡلُكۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖ وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلۡتُ مِنۡهُمۡ نَفۡسٗا فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَاۚ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾



(٢٩) کاتێ کە مووسا ماوەی کرێکارییەکەی خۆی تەواوکرد لەگەڵ ژنەکەی کە کچەکەی شوعەیب بوو گەڕایەوە بۆ میسر، لە ڕێگادا لە بەری کێوی توورەوە ئاگرێکی بەدیکرد، بە ژن و منداڵەکانی وت: من ئاگرێکم بەدی کردووە، ئێوە لێرە ڕاوەستن، من ئەڕۆم بۆ لای ئەو ئاگرە بەڵکو هەواڵێکم دەسگیر ببێ یا دەستەچیلەیەکتان بۆ بێنم لێی، بەڵکو خۆتانی پێ گەرم کەنەوە.

(٣٠) کاتێ کە مووسا گەیشتە لای ئاگرەکە، لە کەناری شیوەکەوە کە ئەکەوێتە لای ڕاستی مووساوە لەو پارچە زەوییە پیرۆزەدا لای درەختەکەوە کە لەوێدا ڕوابوو، بانگی لێ کرا: ئەی مووسا بێگومان من (الله)م خواو پەروەردگاری هەموو جیهانەکانم.

(٣١) فەرمانیشت ئەدەمێ کەوا عاساکەی دەستت هەڵدە. کە هەڵیداو بینیی ئەجووڵێتەوەو تەکان ئەداتە خۆی ئەڵێی تیرەمارە، مووسا بەرەوپشت وەرگەڕایەوەو نەگەڕایەوە بۆلای مارەکە. ئێمەیش بانگمان لێ کرد: مووسا! ڕوومان تێ بکەو مەترسە، تۆ لەو کەسانەی ئەمینن لە مەترسیو زیانیان نایەتەڕێ.

(٣٢) کە مووسا ترسەکەی ڕەوییەوە، جارێکی تر بانگمان لێ کردەوەو پێمان وت: دەستت بخەرە ناو باخەڵتەوە بە دەستێکی سپیو ڕووناك دێتە دەرەوە بێ ئەوەی ئەو سپییەتیو ڕووناکییە هیی عەیبێ بێ تووشی هاتبێ، قۆڵەکانیشت بکە بەیەکا لەسەر سنگت بۆ ئەوەی ئەگەر ترسایت خۆت بگریت و تێك نەچیت. ئەو مارە کە عاساکەی دەستت بوو بە مار و، دەستت کەوا سپیو ڕۆشن بووەوە، دوو بەڵگەن لە خواوە بۆت بۆ لای فیرعەون و دەستەو دائیرەکەی. فیرعەون و دەستەو دائیرەکەی تاقمێکی لەفەرمانیخوادەرچووبوون.

(٣٣) مووسا وتی: خوایە من یەکێکم لەم تاقمی فیرعەونە کوشتووە، ئەترسم لە تۆڵەی ئەو یەکەدا بمکوژنەوە.

(٣٤) هاروونی برایشم لەگەڵ بنێرە ئەو زمانی لە من فەسیح و کراوەترە، بیکە بە یارمەتیدەرم، بە بەڵگەی بەهێزو قسەی بەرێوجێی کارێك بکا دەستەو دائیرەی فیرعەون بزانن من ڕاستگۆم و پێغەمبەری خوام، ئەترسم بە درۆزنم دابنێن و باوەڕم پێ نەکەن.

(٣٥) خوایش بانگی لێ کردەوە پێی وت: لەمەوپاش قۆڵت بە هاروونی برات توند ئەکەین و دەسەڵاتێکتان ئەدەینێ هەرگیز بەو دەسەڵاتەوە دەستیان پێتان نەگاو بڕۆنە سەر فیرعەون، ئێوەو ئەوانەی لەگەڵتانن بەم موعجیزانەی ئێمەوە بەسەر ئەوانا زاڵن.

فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّفۡتَرٗى وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ﴿٤٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾



(٣٦) کاتێ کە مووسا بە موعجیزەکانی ئێمەوە کە هەموو ئاشکراو دیار بوون هات بۆ لای فیرعەون و دەستەو دائیرەکەی، وتیان: ئەم شتانەی ئێوە، واتە موعجیزەکانتان، لە جادووی دەست هەڵبەست بەولاوە نین و نەمانبیستووە شتی وا لەناو باوك وباپیرانمانا ڕووی دابێ.

(٣٧) مووسایش وتی: خوای من لە هەمووان زاناترە کەوا کێ ڕێ پیشاندان و ڕاستیی لەلای ئەوەوە هێناوەو، کێ سەرەنجامی خێری لە ماڵی بەهەشتا بۆ ئەبێ. بەڕاستی تاوانباران ڕزگاریان نابێ.

(٣٨) فیرعەون ڕوویکردە دەستەو دائیرەکەی خۆیو پێی وتن: ئەی کۆمەڵی باڵا! من نەمزانیوە ئێوە لە خۆم بەولاوە خوایەکی ترتان هەبێ. ئەنجا ڕووی کردە هامان و پێی وت: هامان! خشتی قوڕم بۆ سوور بکەرەوەو کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە سەرکەومە سەری بەڵکو لەوێوە لە خواکەی مووسا ئاگادار ببم بزانم ڕاست ئەکا ئەڵێ ئەو ناردوومی یا ڕاست ناکا؟ من گومانم وایە مووسا لەو کەسانە بێ کە درۆئەکەن.

(٣٩) فیرعەون و لەشکرەکەی، خۆیان لەسەر زەویدا بە ناحەق بە گەورە دانابوو و گومانیان وابوو هەرگیز ناگەڕێنەوە بۆ بەردەستی ئێمە.

(٤٠) ئێمەیش خۆیو لەشکرەکەیمان گرت و فڕێمان دانە ناو دەریای نیلەوە، جا سەیرکە سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بوو.

(٤١) کردبوویشمانن بە کۆمەڵە پێشەوایەك خەڵکیان بانگ ئەکرد بۆ کردەوەی وا سەرەنجام ڕایانکێشێتە ناو ئاگری دۆزەخ و، لە ڕۆژی قیامەتیشا کەس ناگاتە فریایان و یارمەتییان نادرێ بۆ ڕزگاربوون لە سزای ئێمە.

(٤٢) لەم جیهانەیشا لەعنەت و نەفرینمان شوێن خستن و لە ڕۆژی قیامەتیشا لە مرۆ ناشیرین و دزێوەکانن یا لەوانەن کە لە ڕەحمەتی خوا دوور خراونەتەوە.

(٤٣) ئێمە بەڕاستی کتێبی تەوراتمان دا بە مووسا پاش ئەوەی خەڵکی سەدە پێشینەکانمان بەرباد کرد. بۆیە تەوراتمان دایە تا ببێ بە مایەی بەرچاوڕوونی بۆ خەڵك و بە مایەی ڕێ دۆزینەوەو ڕەحمەت بۆیان بەڵکو ئەمە خوایە بیرێ بکەنەوە لە سەرەنجامی خۆیان و ڕوویێ بکەنە خوا.

وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ ۚ أَوَلَمْ يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۖ قَالُوا۟ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓا۟ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾



(٤٤) تۆ لە بەری خۆرئاوای تووری سیناوە نەبووی کە ئەرکی پێغەمبەرایەتیمان خستە ئەستۆی مووساو، لەو شوێنەدا ئامادە نەبووی تا ئاگات لەوە ببێ، ئێمە ئێستا بە وەحی ئەو مەعلووماتەت پێ ڕائەگەیەنین.

(٤٥) بەڵام ئێمە خەڵکی چەند سەدەمان لە نادەمزاد دروست کردو ئەوانیش تەمەنێکی درێژیان بەسەر بردو لە خۆیان بایی بوون. تۆیش دانیشتووی شاری مەدیەن نەبووی تا ئایەتی ئێمەیان بەسەرا بخوێنیتەوە، بەڵام ئێمە بووین تۆمان بە پێغەمبەرایەتی ناردو لەم باسانەمان ئاگادار کردی.

(٤٦) تۆ لە بەری کێوی تووری سیناوە نەبووی کە بانگمان کردە مووساو قسەمان لەگەڵ کرد تا ئاگات لەم باسانە بێ، بەڵام ڕەحمەتی خوای خۆتمان بۆ ناردی کە قورئانەو باسی مووساو پێغەمبەرانی تری تیایە بۆ ئەوەی ئەو قەومە بترسێنی لە سزای خوا کە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکیان نەهاتووەتەسەر بییان ترسێنێ، بەلکو بیری لە سەرەنجامی کاری خۆیان بکەنەوە.

(٤٧) ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە نەبادا بەهۆی ئەو کردەوە ناشیرینانەوە کە کردوویانن و پێش خۆیان خستوون بۆ قیامەتیان، مەینەتێکیان تووش ببێو ئەوانیش بڵێن خوایە بۆ پێغەمبەرێکت نەنارده سەرمان تا ئێمەیش شوێن ئایەتەکانی تۆ بکەوین و لە ڕیزی موسوڵمانان بین، ئێمە تۆمان بۆ ڕەوانە نەئەکردن، بەڵام وا بۆ بەهانە برینیان تۆمان بۆ ناردن و ڕێگامان دان و عوزرو بیانوومان بۆ نەهێشتن. جا ئەگەر هەر بەردەوام بن لەسەر کوفرو بێدینییان حەقی خۆیانە سزای دۆزەخ بچێژن.

(٤٨) کەچی کە پێغەمبەری ڕاستیان لای ئێمەوە بۆ هات لە جیاتیی ئەوەی باوەڕی پێبکەن کەوتنە بروبیانوو گرتن و وتیان: بۆ ئەم پێغەمبەرە موعجیزەی وای نەدراوەتێ کە بە مووسا درابوو تا ئیمانی پێ بهێنین؟ ئەی ئەوە نەبوو وەختی خۆی مووسایش نێررایە سەر فیرعەون و خێڵەکەی‌و ئەو موعجیزە گەورانەی درایێ کەچی ئینکاریان کردو باوەڕیان بە مووسایش نەکردو بەخۆی‌و هاروونی براییان وت ئەمانە دوو جادووگەرن کەوتوونەتە یەك و یارمەتی یەکتر ئەدەن لە دژی ئێمەو، ئێمە باوەڕمان بەمانە خۆیان و موعجیزەیان نییەو ئینکاری گشتیان ئەکەین.

(٤٩) تۆیش بڵێ: دە فەرموون کتێبێ بێنن باشتر لە تەوراتەکەی مووساو قورئانەکەی من ڕێ پیشانی خەڵك بدا بۆ لای خوا تا من پێڕەویی لێ بکەم و شوێنی بکەوم ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن ئێمە ڕاستگۆ نین.

(٥٠) جا ئەگەر ئەم داوایەی تۆیان بەجێ نەهێناو گوێیان بۆ شل نەکردی، ئەوا بزانە ئەمانە هەر شوێنی ئارەزووبازیی خۆیان ئەکەون و لەدووی ڕاستی ناگەڕێن. کێیش لەو کەسە گومڕاترە کە شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆی ئەکەوێ بێ ئەوەی ڕێپیشاندانێکی لای خواوە هەبێ. بێگومان هەرگیز خوا هیدایەتی کەسانێ نادا کە ستەمکارو لە حەق لادەر بن.

وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِۦ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا۟ وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ وَقَالُوٓا۟ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ۚ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍۭ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا ۖ فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ وَكُنَّا نَحْنُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾



(٥١) بەڕاستی ئێمە لە هەموو جۆرێ پەندو ئامۆژگاریمان بۆ ئەم کافرانە هێنایەوەو پێوەندمان کردن بەیەکەوە بەلکو ئەمە خوایە بیرێ بکەنەوە.

(٥٢) ئەو خاوەن باوەڕانەی کاتی خۆی تەورات و ئینجیلمان بۆ ناردوون بەرلەوەی قورئان بنێرینە خوارەوە، ئەوانە باوەڕیان بە قورئان هەیە.

(٥٣) کاتێ کە قورئانیان بەسەرا بخوێنرێتەوە ئەڵێن: باوەڕمان پێی هەیە کە لەلای خواوە هاتووەو ڕاستەو ئێمە هەر لەپێش ئەوەوە لە خواوە بێتە خوار بۆسەر پێغەمبەر باوەڕمان پێی هەبووەو ملکەچی بووین چونکە لە کتێبەکانی خۆمانا باسی کراوە.

(٥٤) ئەم کۆمەڵە ئەهلی کیتابە کە وا ئەڵێن دووجار پاداشی چاکەی خۆیان وەرئەگرن، جارێ لەسەر باوەڕکردنیان بە کتێبە پێشووەکان کە بۆ خۆیان هاتوونە خوارو جارێ لەسەر باوەڕکردنیان بە قورئان لەبەر ئەوەی کە سەبریان کردووەو خۆیان لەسەر لۆمەو سەرزەنشتی کافرەکانی ئەهلی کیتاب ڕاگرتووە. ئەمانە بە کرداری جوان وەلامی کرداری ناشیرینی کافرەکان ئەدەنەوەو لەگەڵیان ناکەونە شەڕو هەراو لەو ڕزق و ڕۆزییەی خوا پێی‌داون لە ڕێگای خوادا خەرج ئەکەن.

(٥٥) ئەگەر قسەی پووچ و بێ سوودیش لە خەڵکی تر ببیستن خۆیانی لێ لائەدەن و وەلامی نادەنەوەو بەو کەسانە ئەڵێن: کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان و کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان و خوا حافیزتان بێ ئێمە هاوڕێیەتیی پیاوی نەفامان ناوێ.

(٥٦) بێ‌گومان تۆ ناتوانی هیدایەتی هەرکەسێ بدەی کە حەزت لێ بێ هیدایەت وەرگرێ. ئەمە کاری خوای خۆیەتیو ئەو هیدایەتی هەرکەسێ ئەدا کە مەیلی لێ بێ هیدایەتی بداو، ئەو خۆی باشتر ئەزانێ کێ ئامادەیە بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرێ.

(٥٧) کافرەکانی مەککە بیانوو بۆ موسوڵمان‌نەبوونیان بەوە ئەهێننەوە ئەڵێن: ئەگەر شوێنی ئەو ڕێ‌پیشاندانە بکەوین کە تۆ ڕێمان پیشان ئەدەی لەم خاکی خۆمانەمان هەڵئەکەنن و دوورئەخرێینەوە. تۆیش لە وەلاما پێیان بڵێ: چۆن قسەی وا ئەکەن؟ ئەی ئێمە، واتە خوا خۆی، حەرەمێکی ئەمین و کەس‌دەس‌بۆنەبردووی وەك حەرەمی مەککەمان بۆ نەڕەخساندوون کە بێ ترس و لەرز تیا ئەژین و لە هەموو لایەکەوە خێرو بێری بەسەرا ئەڕژێو هەموو جۆرە ڕزق و ڕۆزییەکی بۆ ئەهێنرێو ئەوەیش لەلای ئێمەوە بڕیاردراوە بۆیان؟ بەلام بەشی زۆری ئەمانە حەقیقەت نازانن و نازانن خواوەند چیی داونەتێ.

(٥٨) ئێمە چەندین ئاوەدانیمان بەرباد کرد کە لە ژیانی خۆیانا بایی بووبوون و توغیانیان کردبوو. ئەوەتان خانووەکانیان پاش لەناوچوونی خۆیان کەسیان تێ نەچوون مەگەر کەمجار و، ئێمە خۆمان ماینەوە پاش لەناوچونی ئەوان و بووین بە میراتگریان.

(٥٩) خوا قەت عادەتی نەبوە دێهاتەکان کاول بکا بەرلەوەی پێغەمبەرێ لە گەورەدێی ئەو دێهاتانەدا بنێرێ ئایەتەکانی خوا بەسەر خەڵکەکەیانا بخوێنێتەوەو بانگیان کا بۆ باوەڕکردن بە خواو بە پێغەمبەرانی خوا. ئێمە هەرگیز دێهاتمان وێران نەکردووە مەگەر لەو کاتانەدا کە دانیشتووانی ئەو دێهاتانە گوناهبارو ستەمکار بووبن و بە فەرمانی خوایان نەکردبێ.

وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا ۖ تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كَانُوٓا۟ إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۚ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾ وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِي ٱلْأُولَىٰ وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾



(٦٠) هەرچی لە دنیادا بە ئێوە درابێ ئەوە کەلوپەلی ژیان و مایەی خۆڕازاندنەوەیە لە دنیاداو، ئەوەی بەلای خواوەیەو لە پاشەڕۆژا کە پاش زیندووبونەوەیە ئەدرێ بە کەسانی خاوەن باوەڕ، لە هەموو شتێ باشترو پایەدارترە. دە بۆ هۆش ناکەنەوەو عەقڵتان بەوە ناشکێ ؟

(٦١) ئایا کەسێ خاوەن باوەڕ بوویی‌و ئێمەیش گفتێکی جوانمان دابێتێ کە گفتی بەهەشت و خێر وخۆشیی هەمیشەیی بەهەشتەو ئەویش ئەو گفتەی بەڕاستی بۆ بێتەدی‌و پێی‌بگا، وەك کەسێ وایە کە تەنها خێروخۆشی دنیامان دابێتی‌و لە ڕۆژی قیامەتا ئامادە بکرێ بۆ لێپرسینەوەو سزادانی دۆزەخ چونکە لە دنیادا باوەڕی نەبوە ؟

(٦٢) باسی ڕۆژی قیامەت بکە کە خوا بانگی ئەو کەسانە ئەکا کە هاوبەشیان بۆی دائەناو، پێیان ئەڵێ: لە کوێن ئەو هاوبەشانەم کە ئێوە بە خەیاڵی خۆتان بۆ منتان دانابوون ؟

(٦٣) جا ئەو هاوبەشبۆخوادانەرانە کە فەرمانی سزادانیان بڕیاردراوە ئەڵێن: خوایە ئەمانەی ئێمە گومڕامان کردن، گومڕامان کردن وەك خۆمان گومڕا بووین. وا بەری‌بوونی خۆمان لای تۆ لێ ڕاگەیاندن، خۆ ئەوانە ئێمەیان نەپەرستووە، ئارەزووی نەفسی خۆیانیان پەرستووە.

(٦٤) بەو هاوبەش‌بۆخوادانەرانە ئەوترێ: بانگی ئەوانە بکەن کە کردبووتانن بە هاوبەشی خوا بەڵکو بگەنە فریاتان ئەوانیش بانگیان ئەکەن، بەڵام ئەمان وەڵامیان نادەنەوە چونکە توانی وەڵامدانەوەو بەفریاگەیشتنیان نی‌یەو سزای خۆیان بە چاوی خۆیان ئەبینن و ئەڵێن: بریا کاتی خۆی ڕێگای ڕاستی باوەڕبەخوایان دیبایەتەوە.

(٦٥) باسی ئەو ڕۆژە بکە کە خوا بانگ ئەکاتە هاوبەش‌بۆخوادانەرەکان و پێیان ئەڵێ: چۆنتان وەڵامی پێغەمبەران دایەوە؟ (٦٦) ئەوانیش سەریان لێ ئەشێوی‌و هەموو شتێکیان لێ ون ئەبی‌و تەنانەت لە یەکتریش ناپرسن وەڵامیان چی بی‌و بڵێن چی؟

(٦٧) جا ئەوانەی کە تۆبەیان کردووەو باوەڕیان کردووەو کاری باشیان کردووە، ئەوانە هیوا وایە لەوانە بن کە ڕزگار ئەبن.

(٦٨) خوای تۆ ئەوەی مەیلی لێ بێ دروستی ئەکاو ئەو کەسانە هەڵئەبژێرێ بۆ پێغەمبەرایەتی کە مەیلی لێ بێ هەڵیانبژێرێ. ئەو کافرانە هەرگیز بۆیان نەبوەو بۆیان نابێ ئەوان کەس هەڵبژێرن بۆ پێغەمبەرایەتی تا بڵێن بۆچی موحەممەد ببێ بە پێغەمبەر؟ خودا پاك و بێ عەیب و بەرزو دوورە لەوە کە هاوبەش بۆ دانەرەکانی هاوبەشی بۆ دائەنێن.

(٦٩) خوای تۆ ئەزانێ ئەو کافرانە چییان لە دڵایەو بەئاشکرایش چی ئەکەن و چی ئەڵێن.

(٧٠) ئەو زاتی خوایە ناوی (الله) یەو لەو بەولاوە خوایەکی تر نی‌یە بەڕاستی شایانی پەرستن بێ. سەناوستایش بەرودواو لە دنیاو لە قیامەتا هەر بۆ ئەوەو فەرمان و دەسەڵاتی ڕاستەقینە هەر هیی ئەوەو سەرەنجام هەمووتان بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە.

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾ ۞ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾



(٧١) ئەی موحەممەد! تۆ بەو کافرانە بڵێ کە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن: ئەگەر بهاتایە خوا شەوی تا ڕۆژی قیامەت بەسەرتانەوە ڕاگرتایەو ڕۆژی لێ نەکردنایەتەوە، چ خوایەکی ساختەی لە خوای ڕاستەقینە بەولاوە تۆسقاڵێ ڕۆشنایی بۆ ئەهێنان و ڕۆژی بۆ ئەکردنەوە؟ ئەوە بۆ دەرس و پەندو ئامۆژگاریی ڕاستی ناگرنە گوێ ؟

(٧٢) دیسان ئەی موحەممەد! تۆ بەو کافرانە بڵێ کە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن ئەگەر بهاتایە خوا ڕۆژی تا ڕۆژی قیامەت بەسەرتانەوە ڕاگرتایەو شەوی بۆ نەهێنانایە، چ خوایەکی ساختەی لە خوای ڕاستەقینە بەولاوە شەوێکی بۆ ئەهێنان تیا بحەوێنەوەو بخەون و ماندوێتیی ڕۆژتانی تیا دەرچێ؟ ئەوە بۆ ناڕوانن خوا چ لوتفێکی لەگەڵ کردوون تا باوەڕی پێ بکەن و سوپاسی ئەو بکەن؟

(٧٣) ئەمە بەشێکە لە ڕەحمەتی خوا لەگەڵ ئێوە کەوا شەو و ڕۆژی بۆ دروست کردوون تا لە شەوەکەدا بحەسێنەوەو لە ڕۆژەکەدا کاسبی بکەن و لە فەزڵی خواوە دارایی پەیدا بکەن و بەڵکو سوپاسی خوا بکەن بەرانبەر بەم گشتە خێرو بەرەکەتەی پێی داون.

(٧٤) یادی ئەو ڕۆژە بکەنەوە کە خوا بانگ ئەکاتە ئەوانەی هاوبەشیان بۆی دائەناو پێیان ئەڵێ: ئەو هاوبەشانەم لە کوێن کە بە خەیاڵی خۆتان بۆ منتان دانابوون؟

(٧٥) لەناو هەر میللەتێکا شایەتێك جوێ ئەکەینەوە کە ئەو پێغەمبەرەیە لە دنیادا ناردوومانەتە سەری بۆئەوەی بێ بە شایەت لەسەر ئەو میللەتە کە لە دنیادا هەڵوێستیان چۆن بوو. جا بە میللەتەکە ئەڵێین ئادەی بەڵگەی خۆتان بێنن کە بتتان ئەکرد بە هاوبەشی خواو، ڕوونی کەنەوە چۆن ئەو بتانەتان ئەکرد بە هاوبەشی ؟. ئەوانیش ئەویادا ئەزانن و بۆیان دەرئەکەوێ حەق حەقی خوایە لە خوایەتیی بێهاوبەشداو ئەو بوختان و ئێفتیرایانەی ئەیانکردن و هەڵیان ئەبەستن هەموویان لە دەس دەرئەچێ چونکە لەسەر هیچ بینا کرابوون.

(٧٦) بێگومان قاروون یەکێ بوو لە خێڵی مووساو پاشان ستەم و ناحەقیی لێ کردن و داوای لێ کردن بیکەن بە سەرگەورەی خۆیان. ئێمەیش ئەوەندە گەنجینەو داراییمان دابوویێ کۆمەڵێ پیاوی بەهێز کلیلی ئەو گەنجینەو داراییەیان بۆ هەڵئەنەئەگیرا ئەوەندە زۆرو قورس بوون. ئەم ستەم و ناحەقییەیشی لە کاتێکدا بوو خێڵەکەی پێیان وت: دڵ بەم گەنجینەو داراییەت خۆش مەکەو پێی بایی مەبە، خوا خۆشی لە کەسانێ نایەت دڵ بە ماڵی دنیا خۆش بکەن.

(٧٧) لەو ماڵی دنیایەدا کە خوا پێی بەخشیوی لەدووی ماڵی قیامەتیشت بگەڕێ واتە: خێرو چاکە بۆ ئەو دنیایشت پاشەکەوت بکەو بەشی ژیانی ئەو دنیایەیشت لەیادنەچێ کە بەخۆشی بژیت و، وەك چۆن خوا چاکەی لەگەڵ تۆ کردووە و خێرو بەرەکەتی بەسەرا ڕشتووی تۆیش چاکە لەگەڵ خەڵك بکەو خراپەکردنت نەوێ لە سەرزەویدا، خوا خۆشی لەوانە نایەت کە خراپە ئەکەن.

قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِيٓ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾

٣٩٥

(٧٨) قاروونیش لە وەڵامی ئەم پەندو ئامۆژگارییەی خێڵەکەیا وتی: ئەم سامانەی دەسگیرم بووە لە زانایی‌و لێهاتوویی خۆمەوە دەستگیرم بووەو منەتی کەسی تیا نی‌یەو حەقی کەسم بەسەرەوە نی‌یەو بەشی کەسی لێ نادەم. ئاخۆ قاروون نازانێ خوا لە سەدەکانی بەر لە سەردەمی ئەویشدا کەسانی وای تەفروتوونا کردووە کە لە قاروون بەهێزتر بوون و دەست و پێوەندیان زۆرتر بوون و، کە کاتی قارهەستانی خوا هات تاوانباران پرسیاریان لێ ناکرێ لەبارەی تاوانەکانیانەوە چونکە خوا خۆی پێی ئەزانی‌و لەپڕ ئەدا بەسەریانا.

(٧٩) جا قاروون ڕۆژێکیان خۆی ڕازاندەوەو بە کەشوفش و عەنعەنەو تەنتەنەوە لەماڵ دەرچوو هات بۆ ناو خێڵەکەی. ئەوانەی حەزیان لە ژیانی خۆشی ئەو دنیایە بوو وتیان: بریا ئێمەیش سامانێکی وەك ئەوەمان هەبوایە کە بە قاروون دراوە. بەڕاستی قاروون بەشێکی گەورەی هەیە.

(٨٠) ئەوانەیش کە ئەیانزانی خوا چیی لەو دنیا بۆ پیاوچاکان و خاوەن باوەڕان داناوە، وتیان: هەی بەدبەختینە! پاداشی چاکی خوا چاکترە بۆ کەسێ باوەڕی بە خوا هەبی‌و کرداری چاك بێ، کەس بەم خێرو خۆشییەی خوا ناگا ئەوانە نەبێ کە خۆیان ئەگرن لەسەر گوناه نەکردن و حەرامنەخواردن و چاکەکردن.

(٨١) جا قاروون خۆی‌و ماڵەکەیمان بەگەنجینەکانیەوە بە ناخی زەویدا بردە خوارەوەو هیچ کەسێك و کۆمەڵێکی نەبوو یارمەتیی بدەن بە بێ ڕەزای خوا تا لەو غەزەبەی خوا ڕزگاری ببێ و، بۆ خۆیشی لەوانە نەبوو بتوانێ ڕێ لەو غەزەبی خوایە بگرێ کە هات بەسەریا.

(٨٢) ئەو کەسانەی دوێنێ ئاواتی پایەو مایەکەی ئەویان ئەخواست وایان لێ هات ئەیانووت: هاوار! وادیارە خوا بۆ هەر بەندەیەکی خۆی کە مەیلی لێ بێ ڕۆزی فراوان ئەکاو لێیشی ئەگرێتەوە. ئەگەر خوا لوتفی لەگەڵ نەکردینایە ئێمەیشی بە ناخی زەویدا ئەبردە خوارەوە. ئەی هاوار! وادیارە کافران هەرگیز ڕزگاریان نابێ.

(٨٣) ماڵی قیامەت بۆ ئەو کەسانە تەرخان ئەکەین نایانەوێ لە زەویدا بەسەر خەڵکی ترا بەرز ببنەوەو خراپە لەناو خەڵکا بکەن و، سەرەنجامی باشیش بۆ ئەو کەسانەیە خۆیان لە گوناه ئەپارێزن.

(٨٤) هەرکەسێ بیرو باوەڕو گوفتارو ڕەفتارێکی باش دابهێنێ پاداشی لەوە باشتری ئەدرێتەوەو، هەرکەسێکیش بیرو باوەڕو گوفتارو ڕەفتارێکی خراپ دابهێنێ پاداشی لەوە خراپتری ئەدرێتەوە، چونکە پاداشی ئەوانە نادرێتەوە کە خراپەیان کردووە بە چەشنی کردەوەکەی خۆیان نەبێ.

إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ۚ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾ وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓا۟ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ۖ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾

## سُورَةُ العَنكَبُوتِ

مكية — آياتها ٦٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَـَٔاتٍ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَـٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَـٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦﴾



(٨٥) بێ‌گومان ئەو خوایەی قورئانی لەسەر تۆ فەرز کردووەو بۆی ناردوویەو پێویستی کردووە لە سەرت کە ڕەفتاری پێ بکەی‌و بیگەیەنی بە خەڵك و تێبکۆشی بۆ بلاوکردنەوەی، ئەتگێڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووی کە شاری مەککەیە ئەیگری‌و ئەچیتەوە ناوی. تۆیش بە خەڵکی دەورو پشتت بڵێ: خوای من لە هەرکەسی تر چاکتر ئەزانێ کێ ڕێنمایی بۆ خەڵك هێناوەو کێ لە گومڕاییەکی ئاشکرا دایە.

(٨٦) تۆ هیچ بەتەماو هیوای ئەوە نەبووی قورئانت بخرێتە ناو دڵەوەو بخوێنرێتەوە بەسەرتاو لە زوبانی تۆوە بگا بە خەڵك، لوتف و ڕەحمی خوا بوو بۆت هات، کەواتە نەکەی هەرگیز ببی بە پشتیوانی کافران.

(٨٧) با ئەو کافرانە ڕێت لێ نەگرن لە خزمەتکردن و بلاوکردنەوەی ئایەتەکانی خوا پاش ئەوەی کە نازڵ کرا بۆت و، خەڵك بانگ بکە بۆ باوەڕکردن بە خواو لەو کەسانە مەبە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن.

(٨٨) قەت لەگەڵ خوادا بانگ مەکەرە هیچ خوایەکی تر چونکە هەر خواکەی خۆت پەرستراوی بەڕاستەو لەو بەولاوە خوایەکی ڕاستەقینە نی‌یە. هەرچی هەیە لە جیهانا هەمووی ئەفەوتی‌و هەر ئەو ئەمێنێتەوەو هەموو ئەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو.

## سووڕەتی (العَنكَبُوتِ)

**مەککەیی‌یە ئایەتەکانی ١-١١ی نەبێ و، (٦٩) ئایەتە**

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی پێی چییە.

(٢) ئایا ئەوانەی موسوڵمان بوون و باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا هێناوە، وا گومان ئەبەن هەر بەوەی کە وتوویانە باوەڕمان هێناوە وازیان لێ‌بهێنری‌و هیچ جۆرە تاقیکردنەوەیەکی ناخۆش و تاڵ و سوێریان نەیەتەڕێ؟

(٣) موسوڵمانانی پێش ئەم موسوڵمانانەیش کە لەسەر دەستی تۆدا باوەڕیان بە خواو بە ئایینی خوا کردووە، وەك ئەمان تاقیمان کردوونەتەوەو تاڵی‌و سوێریی ژیانمان بەهۆی موسوڵمان بوونیانەوە هێناونەتەڕێ تا خوا بزانێ کام لەمانە بەڕاستی موسوڵمان بوون و لەگەڵ خوای خۆیان ڕاست ئەکەن و بەرانبەر بە دەردو ئازار خۆیان ئەگرن و، کامیان درۆ ئەکەن و بەڕاستیان نییەو موسوڵمانی ڕاستەقینە نین.

(٤) یاخود ئەوانەی کرداری خراپ ئەکەن وا گومان ئەبەن کە پێش قەزاو قەدەری ئێمە بکەون و خۆیان لە سزای ئێمە دەرباز بکەن؟ ئەگەر لایان وایە، ئەوا بڕیارێکی خراپیان بۆ خۆیان داوە چونکە هەرگیز شتی وا ڕووناداو نابێ.

(٥) هەرکەسێ هیوای گەیشتن بە خوای هەیە لە بەهەشتا یا هیوای گەیشتن بەو پاداشەی هەیە خوا بۆ خاوەن باوەڕانی داناوە، بێ‌گومان کاتی ئەوە داو، خوا گوێی لە هەموو قسەیەکە کە بەندەکانی ئەی‌کەن‌و ئاگای لە باوەڕو کرداریان هەیە.

(٦) هەرکەسیش سەعی ئەکاو ڕەنج ئەکێشێ بۆ فەرمانبەرداریی خواو دوورکەوتنەوە لە گوناەو لە ئارەزووبازی، ئەوە قازانجی کارەکەی بۆ خۆیەتی‌و قازانجی چاکی لە بەرانبەریا دەستگیر ئەبی‌و خوا بێ‌گومان پێویستی بە هیچ کەسێ نییە لە هەموو جیهانا.

وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ (٧) وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْنًا وَإِن جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (٨) وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي الصَّالِحِينَ (٩) وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ وَلَئِن جَاءَ نَصْرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ (١٠) وَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْمُنَافِقِينَ (١١) وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ ءَامَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ وَمَا هُم بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُم مِّن شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ (١٢) وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ (١٣) وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ (١٤)



(٧) ئەوانەیش کە باوەڕیان بە خوا بووەو کردەوەی چاکیان کردووە، هەرچی خراپەیان کردووە هەموویان لێ دادەشۆرین و بەپێی پاداشی باشترین کردەوەیان پاداشیان ئەدەینەوە.

(٨) ئادەمزادمان ڕاسپاردووە چاکە لەگەڵ باوك و دایكیا بكا، بەڵام ئەگەر هەوڵیان لەگەڵ دای کەسێ یا شتێ بکەی بە هاوبەشی من لە خوایەتییاکە تۆ هیچ شتێ لەبارەی خوایەتیی ئەو کەسە یا ئەو شتەوە نازانیو، ئادەمزادیش نابێ شوێنی شتێ بکەوێ کە نەزانێ چییەو چکارەیە، ئەوە لەو حاڵەدا گوێڕایەڵیان مەبە، ئێوە هەمووتان خۆیشتان و باوك و دایكیشتان سەرەنجام ئەگەڕێنەوە بۆ لای من و خەبەرتان ئەدەماو پێتان ئەڵێم لە دنیادا چیتان ئەکرد.

(٩) ئەوانەیش کە باوەڕیان بە خوا بووەو کردەوەی چاکیان کردووە، ئەیانخەینە ڕیزی پیاوچاکانەوە.

(١٠) کەسانی وا لەناو بەناو موسوڵمانانا هەن، ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان بە خوا هێناوە، جا ئەگەر لە ڕێگای ئەو ئیمان بەخوا هێنانەیانا تووشی دەردو ئازار بوون و کافرەکان ئازاریان پێ گەیاندن ئەڵێن: ئازاری خەڵکیش لە دنیادا هەروەك ئازاری خوا وایە لە قیامەتا، جا کە ئێمە هەر توشی ئازار ببین بۆ لە دنیادا تووشی ببین و با هەر ئازارەکەی قیامەت بێ لەلایەن خواوە، بەڵام ئەگەر سەرکەوتنێ بۆ موسوڵمانان لەلایەن خواوە هات، بێگومان بە موسوڵمانان ئەڵێن: ئێمەیش لەگەڵ ئێوە بووین. بۆ وائەڵێن و قسەی ناڕاست ئەکەن؟ بۆ خوا لە هەموو کەس باشتر نازانێ چی لە دڵی ئەم گشتە خەڵکەدا هەیەو، منافق و موسوڵمانی ڕاست لەیەك جیاناکاتەوە؟

(١١) بێگومان خوا ئەزانێ کێن ئەوانەی بەڕاستی ئیمانیان هێناوەو ئەزانێ منافقەکانیش کێن؟

(١٢) کافرەکان وتیان بەوانەی کە ئیمانیان هێناوە: واز لە موسوڵمانەتی بێنن و ڕێگاکەی ئێمە بگرنەبەر، ئەگەر قیامەت و زیندووبوونەوەو لێپرسینەوە هەبوو ئێمە ئۆباڵی ئێوەیش لە گەردن ئەگرین، بەڵام هیچ ئۆباڵێکیان لە گەردن ناگرن و بەڕاستی ئەوانە درۆئەکەن.

(١٣) بەڕاستی ئەو کافرانە باری گرانی تاوانەکانی خۆیان لە ئەستۆ ئەگرن و باری گرانی تاوانی ئەوانەیش لە ئەستۆ ئەگرن کە گومڕایان کردوون و لە ڕۆژی قیامەتا لەبارەی ئەو درۆو دەلەسەو ساختەچییەتییەی کە لە دنیادا ئەیانکرد، لێیان ئەپرسرێتەوە.

(١٤) ئێمە بەڕاستی نووحمان ڕەوانەکرد بۆسەر قەومەکەی، ئەویش هەزار ساڵ پەنجا ساڵ کەم واتە نۆسەدوپەنجا ساڵ لەناویانا مایەوە، واتە هەر بانگی ئەکردن بۆ خواپەرستیو ئەوانیش هەر بەگوێیان نەدەکرد، سەرەنجام تۆفان دایگرتن لەحاڵێکا کە ئەوان کافرو ستەمکار بوون.

فأنجيناه وأصحاب السفينة وجعلناها آية للعالمين (۱٥) وإبراهيم إذ قال لقومه اعبدوا الله واتقوه ذلكم خير لكم إن كنتم تعلمون (۱٦) إنما تعبدون من دون الله أوثانا وتخلقون إفكا إن الذين تعبدون من دون الله لا يملكون لكم رزقا فابتغوا عند الله الرزق واعبدوه واشكروا له إليه ترجعون (۱۷) وإن تكذبوا فقد كذب أمم من قبلكم وما على الرسول إلا البلاغ المبين (۱۸) أولم يروا كيف يبدئ الله الخلق ثم يعيده إن ذلك على الله يسير (۱۹) قل سيروا في الأرض فانظروا كيف بدأ الخلق ثم الله ينشئ النشأة الآخرة إن الله على كل شيء قدير (۲۰) يعذب من يشاء ويرحم من يشاء وإليه تقلبون (۲۱) وما أنتم بمعجزين في الأرض ولا في السماء وما لكم من دون الله من ولي ولا نصير (۲۲) والذين كفروا بآيات الله ولقائه أولئك يئسوا من رحمتي وأولئك لهم عذاب أليم (۲۳)



(۱٥) جا نووح خۆیو ئەوانەی لەناو کەشتییەکەدا بوون ڕزگارمان کردن و کەشتییەکەمان کرد بە نیشانە بۆ ئەهلی جیهان لەسەر توانایی خۆمان.

(۱٦) باسی ئیبراهیمیش بکە کاتیێ کە بە قەومەکەی خۆی وت: خوا بپەرستن و بەندەییی بۆ بکەن و لێی بترسن و خۆتان لە سزای بپارێزن، ئەگەر پێ بزانن ئەوە چاترە بۆتان.

(۱۷) ئێوە لە جیاتیی ئەوەی خوا بپەرستن کۆمەڵێ بت ئەپەرستن و ئێوە لەم کارەتانا درۆو بوختان ئەکەن کە ئەو بتانە بە خوا دائەنێن. ئەوانەی ئێوە لە جیاتیی خوا ئەیانپەرستن خاوەنی ڕزق و ڕۆزیی ئێوە نینو هیچیان بەدەست نییە بۆتان. لای خوا داوای ڕزق و ڕۆزیی خۆتان بکەن و بیپەرستن و سوپاسی بکەن، سەرەنجام بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە.

(۱۸) خۆ ئەگەر بە فروستادەی من بڵێن درۆئەکا ئەوە هیچ زیانێ بە پێغەمبەرایەتیی ئەو ناگا چونکە زۆر لە سیللەتانی پێش ئێوەش پێغەمبەری خۆیانیان بە درۆزن دانا. پێغەمبەری فروستادەیش هیچ ئەرکێکی لەسەر شان نییە لەوە بەولاوە کە فەرمانی خوا بە ڕۆشنیو ئاشکرایی بە خەڵکا ڕاگەیەنێ.

(۱۹) ئایا ئەو کافرانە بە چاوی بیرو هۆشی خۆیان نابینن چۆن خوا دەستئەکا بە دروستکردنی دروستکراوەکانی خۆیو چۆن لەو دنیایش دروستیان ئەکاتەوە ؟ بێگومان کاریوا بۆ خوا ئاسانە.

(۲۰) ئەی پێغەمبەر! تۆ بەو خەڵکە بڵێ: بڕۆن بە زەویدا بگەڕێن و سەیربکەن بزانن خوا چۆن دەستیکرد بە دروستکردنی خەڵك و دارو درەخت و گژوگیاو گیانلەبەران و شاخ و کێوو دەشت و ڕووبارو دەریاو، پاشانیش لەو دنیادا سەرلەنوێ بۆ دواجار دروستیان ئەکاتەوە. خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ.

(۲۱) ئازاری هەرکەسێ ئەدا ئارەزووی لێ باو ڕەحم بە هەرکەسێکیش ئەکا ئارەزووی لێ باو سەرەنجام بۆ لای ئەو ئەگێڕرێنەوە.

(۲۲) ئێوە ناتوانن کارێ بکەن کە خوا لە ئەرزا یا لە ئاسمانا دەستی نەڕوا بەسەرتاناو لە هەرلاییێ بن لەژێر دەسەڵاتی خوادان و کەسێ نییە دۆستتان بێو یارمەتیتان بدا لە بەرانبەری خوادا.

(۲۳) ئەو کەسانەیش کە ئینکاری ئایەتەکاتی خوا ئەکەن و ئینکاری گەیشتن بەحوزووری خوا ئەکەن، ئەوانە لە ڕەحمەتی من نائومێدن و ئەوانە سزایەکی پڕئازاریان بۆ هەیە.

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ
فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ
﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ
فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَاۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم
بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ
وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌۘ وَقَالَ
إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبْنَا
لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ
وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿٢٧﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ
مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾
أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ
فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ
أَن قَالُواْ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ
﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾



(٢٤) وەڵامـی خێڵەکـەی ئیـبراهیم لـەوە بەولاوە نـەبوو کـە وتیـان: یـا بیکـوژن یـا بیسـووتێنن. خـوایش لـەو ئـاگرەی ئـەوان بۆیان کردبوەوە ڕزگاری کرد. بەڕاستی ئەم ڕووداوە چەندین نیشانەی تیایە بۆ کەسانێ کە باوەڕیان بە خوا هەبێ.

(٢٥) ئیبراهیمیش بەوانی وت: ئێوە تەنها چەند بتێکتان لەم ژیانی دنیـادا ڕاگرتـووە ئەیانپەرسـتن بـۆ ئـەوەی بـەردەوام بـن لـە خۆشویستنی یەکتریتاناو خواتان پشـتگوێ خستوەو، پاشانیش لە ڕۆژی قیامەتا هـەر یەکێکتان بگری ئینکـاری ئـەوانی ترتـان ئەکاو ئەو لەعنـەت لـە یـەکتری ئەکـەن و جێگـای دواجاریشـتان ئـاگری دۆزەخـەو کەسێ نییە یارمەتیتان بدا.

(٢٦) جا لـووط بـاوەڕێ پـێ‌کردو ئیمـانی پێ‌هێنـا کـە پێغەمبـەری خوایـەو ئیبراهیمیش وتی: من کۆچ ئەکەم و ئەڕۆم بۆ ئەو شوێنەی خـوا فـەرمانی پـێ‌داوم و خوا خوایەکی بەدەسەڵات و خاوەن حیکمەتە ئەزانێ چی باشە ئەوە ئەکا.

(٢٧) جا پاش ئەوە ئێمەش ئیسحاق و یەعقوبی کوڕی ئیسحاقمان بـە ئیـبراهیم بەخشـی پێغەمبەرایـەتیو کتێبی ئاسمانیمان لە نەوەیا داناو پاداشتمان لە دنیادا دایەوەو لە قیامەتیشا لە ڕیزی پیاوچاکانایە.

(٢٨) باسی لووطیش بکە کاتێ کە بە خێلکەکەی خۆیی وت: ئێوە کارێکی بێ‌شەرمانەی خراپ‌وا ئەکەن بەر لە ئێوە کەس لە جیهانا نەیکردووە.

(٢٩) ئەوە ئێوە بەڕاستی ئەوەندە بێ‌حەیاو شـەرمن ئەچـینە لای نێرینـە (سـواریان ئـەبن) و ڕێ لـە ڕێبـوار ئـەبڕن و ڕووتیان ئەکەنەوەو لە کۆمەڵگای خۆتانا کاری ناشیرین و ناپەسەند ئەکەن؟ قەومەکەی هیچ وەڵامێکیان نـەبوو ئـەوە نەبێ کە وتیان: ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی ئێمە بە سزای خوا ئەترسێنی، ئەو سزایەی خوامان بهێنە سەر بزانین ئـەتوانێ چیمان لێ بکا؟

(٣٠) لووطیش وتی: خوایە! یارمەتیم بدەو زاڵم بکە بەسەر ئەم خێڵە بەدکارە خراپەکەرەدا.

وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُوٓاْ إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِۖ إِنَّ أَهۡلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱرۡجُواْ ٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمۡۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ ﴿٣٨﴾



(٣١) کاتێکیش مەلائیکەی فروستادەی ئێمە هاتنە لای ئیبراهیم، مژدەیان بۆ هێناو پێیان وت: ئێمە بێگومان خەڵکی ئەم دێیە لەناو ئەبەین، خەڵکی ئەم دێیە کۆمەڵێکی ستەمکارو خراپەکەر بوون.

(٣٢) ئیبراهیمیش وتی: ئاخر لووط لەوێیە، ئەویش لەگەڵیان ئەفەوتیو لەناوئەچێ. مەلائیکەتەکانیش وتیان: ئێمە خۆمان ئەزانین کێ لەو دێیەدایە. لووط خۆیو ماڵ و منالّی لەو سزای خواییە ئەپارێزین ژنەکەی نەبێ، ئەو لەو کەسانەیە بڕیاری بڕانەوەو بەسەرچوونیان دراوە.

(٣٣) کاتێکیش کە مەلائیکەتەکانی فروستادەمان هاتن بۆ لای لووط خۆیو خەبەری ئەوەیان دایە کە خوا بڕیاری فەوتاندنی خێڵەکەیی داوە، پێی نارەحەت بوو و دڵی خەمبار بوو بە هاتنیان، چونکە ئەترسا خەڵکی دێکە کە دییان غەزەبی خوایان هاتووەتەسەر بڕۆنە سەریو تۆڵەی خۆیانی لێبکەنەوە یا ئەو خۆیشی بەر ئەو غەزەبەی خوا بکەوێ. مەلائیکەتەکان پێیان وت: مەترسەو خەفەت مەخۆ، ئێمە تۆو ماڵ و منالّت ڕزگار ئەکەین تەنها ژنەکەت نەبێ کە یەکێکە لەوانەی بڕیاری لەناوچوونیان دراوە.

(٣٤) ئێمە سزایێ لە ئاسمانەوە دائەبەزێنین بەسەر خەڵکی ئەم دێیەدا بەهۆی ئەوەوە کە فیسق و فجووریان ئەکرد.

(٣٥) ئێمە بەڕاستی نیشانەیەکی دیارمان لەو دێیەدا بەجێهێشت بۆ هەر کۆمەڵە خەڵکێ کە عەقڵیان هەباو بیر لە چاکەو خراپە بکەنەوەو بفامن کەوا خوا دێرگیریش بێ سەختگیرە. زانایانی تەفسیر نوسیویانە: خوا ئاواییەکەی ژێراوژوور کردووەو بەردی بەسەرا باراندووەو ئێستایش نیشانەی ئەو غەزەبەی خوا لەو شوێنەدا دیارە.

(٣٦) بۆ لای خەڵکی مەدیەنیش شوعەیبی برای خەڵکی مەدیەن خۆیانمان نارد، پێیوتن: خەڵکینە! خوا بپەرستن و بەهیوای پاداشی چاکی بن لە ڕۆژی قیامەتاو کوفرو خراپە لە ڕووی زەویدا زۆر مەکەن.

(٣٧) ئەوانیش پێیان وت: تۆ درۆ ئەکەیو خوا نەیناردووی بۆسەر ئێمە، ئیتر بوومەلەرزەیەك هات بەسەریاناو لەناو خانووەکانیانا لەپەوڕوو کەوتن و مردن.

(٣٨) بیر لە تایەفەی عادو تایەفەی سەموودیش بکەرەوە کە خوا چۆنی غەزەب لێ گرتن و ئەو غەزەبی خوایە کە لێیان گیرا بە خانوەکانیانا دیارە بۆتان و بە چاوی خۆتان ئەیانبینن. شەیتان کاروکردەوە ناشیرینەکانیانی لا جوان کردن و لە ڕێگەی خوا پەرستی لایدان کە ئەیشیانتوانی بڕوانن و ڕاستی ببینن و شوێنی خراپە نەکەون بەڵام ڕێگای ڕاستیان نەگرتەبەر.

وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ
بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ
﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا
وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ
ٱلۡأَرۡضَ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ
وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٤٠﴾ مَثَلُ ٱلَّذِينَ
ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلۡعَنكَبُوتِ
ٱتَّخَذَتۡ بَيۡتٗاۖ وَإِنَّ أَوۡهَنَ ٱلۡبُيُوتِ لَبَيۡتُ ٱلۡعَنكَبُوتِۖ
لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يَدۡعُونَ مِن
دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلۡكَ
ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ
﴿٤٣﴾ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ
لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ
وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ
وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ﴿٤٥﴾



(٣٩) بیر لە قاروون و فیرعەون و هامانیش بکەرەوە، موسا نیشانەی پێغەمبەرایەتیی خۆی لای خواوە بۆ هێنان، کەچی ئەوان خۆیان بە زل زانی لەم سەرزەمینەدا، بەڵام نەیانتوانی پێش بکەون و خۆیان لە غەزەبی خوا دەرباز بکەن.

(٤٠) جا هەموو ئەمانەمان بەهۆی تاوانی خۆیانەوە گرتو گرفتارمان کردن. هیی‌وایان هەبوو بەردەبارانمان کردن و، هیی‌وایان هەبوو نرکەو ناڵەی بوومەلەرزە گرتنیەوەو لەناوی بردن و، هیی‌وایان هەبوو ڕۆچوونە خوارەوە بەزەویداو، هیی‌وایان هەبوو لە ئاوا نوقممان کردن. خوا لەوانە نەبوو بە ناحەق ئەمانە گیرۆدەبکاو توشیان بکا، ئەوان بۆخۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد.

(٤١) نموونەی ئەوانەی غەیری خوایان کردووە بە پشت و پەنای خۆیان و ئەیانپەرستن، وەك جاڵجاڵۆکە وایە کە ماڵ بۆ خۆی ئەتەنیو لای وایە ماڵەکەی قەت وێران نابێ کەچی بێهێزترین و خۆڕاگیرنەکردووترین ماڵیش ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر بە خۆیانیان بزانیایەو بییانزانیایە چی ئەکەی.

(٤٢) بێ‌گومان خوا ئەزانێ ئەوانە لە غەیری خوا بانگی کێ ئەکەن و هاوار ئەکەنە کاو کێ ئەپەرستن، ئیتر هەرچی بێ. خوا زاڵە بەسەر هەرچییەکا مەیلی لێ بی‌و خاوەن حیکمەتە ئەزانێ چی ئەکا.

(٤٣) ئێمە ئەم جۆرە نموونانە ئەهێنینەوە بۆ خەڵك لێیان ورد ببنەوەو، پیاوانی زانا نەبێ کەس فامیان ناکاو تێیان ناگاو لە ناوکرۆکەکەیان حاڵی نابێ.

(٤٤) خوا ئاسمانەکان و زەویی بۆ حیکمەتێ دروست کردووەو لە خۆڕاییی دروستی‌نەکردوون. دروست کردنی ئاسمان و زەوی نیشانەی تیایە بۆ کەسانێ باوەڕیان بەخوا هەبێ و، بە دروستکردنی ئاسمان و زەویدا بەڵگەیان لەسەر بوونی خواو گەورەیی‌و توانای خوا بۆ دەرئەکەوێ.

(٤٥) ئەو قورئانە بخوێنەرەوە کە بە وەحی هاتووەتە سەرت و نوێژ ڕابگرە، نوێژ ئادەمزاد لە کاری خراپ و ناپەسەند ئەگرێتەوە، ناوهێنانی خوا لە هەموو شتێ گەورەترەو خوا ئەزانێ ئێوە خەریکی چین و چی‌ئەکەن.

۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ (٤٦) وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ (٤٧) وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ (٤٨) بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ (٤٩) وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ (٥٠) أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ (٥١) قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗاۖ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ (٥٢)



(٤٦) دەمەقاڵە مەكەن لەگەڵ كەسانی سەر بەو ئایینانەی خوا كاتی خۆی كتێبی ناردوونەتەسەر بە باشترین شێوەی گفتوگۆ نەبێ، تەنها ئەوانەیان نەبێ كە ستەمكارنو دەمدرێژی ئەكەن و، بڵێن: ئێمە باوەڕمان بە قورئان هەیە كە لە خواوە هاتووەتە خوار بۆمان و بە تەوراتو ئینجیلو زەبوور و ئەو كتێبانەی تر كە لە خواوە هاتوونەتە خوار بۆ ئێوەو، خوای ئێمەو ئێوە هەر یەك خوایەو ئێمە گەردنكەچین بۆ ئەو خوایە.

(٤٧) هەروەك كتێبی خۆمانمان ناردووەتە خوار بۆ سەر پێغەمبەرانی بەر لە تۆ، قورئانیشمان ناردووەتە خوار بۆ سەر تۆ. جا ئەوانەی كتێبی خۆمانمان داونێ لەپێش هاتنی تۆدا، باوەڕیان بەم قورئانە هەیە چونكە لە كتێبەكانی خۆیانا گفتی پێدراوەو باسی هاتنی لە دوارۆژدا كراوە، ئەهلی ئەو كتێبانەیش كە ئێستا هەن، هەیانە باوەڕیان پێ هەیەو، كەسێ نییە ئینكاری قورئان و هاتنەخوارەوەی قورئان بۆسەر تۆ بكا ئەوانە نەبێ كە كافرن و لەڕاستیدا باوەڕیان بە كتێبە پێشووەكانیش نییە.

(٤٨) تۆ خۆت لەوانە نەبووی كتێب بخوێنیتەوەو بە دەستی ڕاستیشت كتێبت لەدەمی كەسەوە نەنووسیوەتەوە. ئەگەر خوێندەوارو بنووس بوویتایە بتتوانیایە بخوێنیتەوەو بنووسی، بەتاڵوێژەكان بەلگەیان دەسگیر ئەبوو بۆ گومانیان لەوەدا كە قورئان فەرموودەی خوایە.

(٤٩) نەخەیر وانییە كە بەتاڵوێژان ئەڵێن و، قورئان كۆمەڵە ئایەتێكی ئاشكراو مەعنادیارو ڕێكوپێكەو لە سنگی ئەوانەدایە كە خوا نیعمەتی عیلمی داونێو، كەسانی ستەمكارو ناهەق نەبێ كەس ئینكاری ئایەتی ئێمە ناكا.

(٥٠) كافرەكان وتیان: ئەوە بۆچی چەند موعجیزەیەكی دیار لە خوداوە نەهاتووەتە خوار بۆ سەر موحەممەد؟ تۆیش لە وەڵامیانا بڵێ: هاتنی موعجیزە بە مەیل و فەرمانی خوایە بە هەر پێغەمبەرێكی ببەخشێ و، منیش تەنها كەسێكم خوا ناردوومی خەڵك لە سزای خوا بترسێنم و ڕێی موسوڵمانەتییان بۆ ڕوون بكەمەوە.

(٥١) ئەوانە موعجیزەیان بۆ چییە؟ موعجیزە شتێكە بەرچاوی، بۆ عەوام باشە. بۆ مرۆڤی هۆشیار موعجیزەیێ باشە كە عەقڵ پەسەندی بكا. ئەوەیشیان بۆ هاتووە كە قورئانە. ئایا ئەوە بەس نییە بۆ ئەوان كە ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوار بۆ سەر تۆ، ئەخوێنرێتەوە بەسەریانا؟ بەڕاستی لە ناردنی قورئانا ڕەحمەت و بیرخستنەوە هەیە بۆ هەر كۆمەڵێ كە باوەڕیان بە خوا هەبێ، خواو ڕۆژی پاداش و سزایان دێنێتەوە یاد.

(٥٢) تۆ بەو كافرانە بڵێ: خوای بڵندو باڵا بەسە بۆ ئاگاداری لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی دا هەیە هەمووی ئاگا لێیە. ئەو كەسانەیش كە باوەڕیان بە شتی پڕوپووچ و نادروست هەیەو ئینكاری خوا ئەكەن، ئەوانە لە هەردوو جیهانا دۆڕاندوویانە.

وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَوْلَآ أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَآءَهُمُ ٱلْعَذَابُ
وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ
وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ
مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ
﴿٥٥﴾ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ أَرْضِى وَٰسِعَةٌ فَإِيَّٰىَ فَٱعْبُدُونِ
﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِى
مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ نِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ
صَبَرُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحْمِلُ
رِزْقَهَا ٱللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَئِن
سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ
عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم
مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَا
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾



(٥٣) پەلەپەلت لێ ئەکەن داوا ئەکەن سزای خوا بێتە سەریان و ئەڵێن: ئەگەر ڕاستە بابێت. ئەگەر هەر شتێ کات و وادەی خۆی بۆ دیاری نەکرابوایە کە هەر ئەبێ لەو کاتەی خۆیا بێ، لەسەر ئەو داوایەی خۆیان سزایان ئەهاتەسەرو، لەپڕیش دێتە سەریان و بەخۆیان نازانن کە ئەیانکوتێتەوە.

(٥٤) پەلەپەلت لێ ئەکەن بۆ هاتنی سزا بۆ سەریان. پەلەی چییانە؟ بۆ کوێ دەرباز ئەبن؟ سزا هەر ئەیانگاتێ. بەڕاستی دۆزەخ لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی کافرانی داوە.

(٥٥) لە ڕۆژێکدا، سزای خوا لە ژوور سەریانەوەو لە ژێر پێیانەوە دایان ئەپۆشێ‌و، خوا پێیان ئەفەرموێ: بەری ئەو کردەوانەتان بچێژن کە ئەتانکردن.

(٥٦) ئەی ئەو بەندانەم کە باوەڕتان هەیەو ئیمانتان هێناوە، بەڕاستی ئەرزی من گوشاد و بەربڵاوە، دەی هەر من بپەرستن و عیبادەتم بۆ بکەن لە هەر لایێ بێ چونیەکە.

(٥٧) هەموو گیانلەبەرێ تامی مردن ئەچێژێ و ئەمرێ و پاشان دێنەوە بۆ لای خۆمان.

(٥٨) ئەوکەسانەیش کە ئیمانیان هێناوە بەخواو کاری چاکیان کردووە لە دنیادا، لە باڵاخانەی بەهەشتا دایان ئەمەزرێنین و جێگیریان ئەکەین کە جۆگای ئاو لە ژێریانەوە ئەڕواو هەمیشەو هەتا هەتایە لەو باڵاخانانەدا ئەمێننەوە. پاداشی ئەوانەی کاری چاکیان کردووە لە دنیادا پاداشێکی زۆر چاکە.

(٥٩) ئەو کەسانەی کە خوویان بە بەجێهێنانی فەرمانی خواوە گرتووەو پشت بە خوای خۆیان ئەبەستن.

(٦٠) زۆر گیانلەبەری وا هەیە کەبەسەر ئەرزا ئەڕوا ئەوەندە بێدەسەڵاتە ڕوزیی خۆی پێ هەڵناگیرێ، خوا ڕۆزیی ئەداو ڕۆزیی ئێوەیش ئەدا. خوا گوێی لە هاواری هەموو گیانلەبەرێکەو بە حاڵی هەموویان ئەزانێ‌و ئەزانێ پێویستیان بە چییە.

(٦١) ئەگەر لە کافرەکانی مەککە بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووەو کێ ڕۆژ و مانگی ڕام کردووە؟ لە وەڵاما ئەڵێن: خوا. جا کە مادام وایە بۆچی و چۆن ڕوو لە پەرستنی خوا وەرئەچەرخێنن و بت ئەپەرستن و بە فەرمانی خوا ناجووڵێنەوە؟

(٦٢) هەر خوایە ڕزقو ڕۆزی گوشاد و فراوان ئەکا بۆ هەر بەندەیەکی مەیلی لێ بێ‌و لێی ئەگرێتەوەو کەم دەستی ئەکا. خوا ئاگای لە هەموو شتێ هەیەو هەموو شتێ ئەزانێ و چاکەو خراپەی خەڵك ئەزانێ.

(٦٣) ئەگەریش لەو کافرانەی مەککە بپرسی: کێیە ئاوی لە ئاسمانەوە داباراندووەو زەویی پاش وشك بوونەوەو مردنی بەو ئاوە ژیاندووەتەوە، لە وەڵاما ئەڵێن: خوا. دە تۆیش بڵێ: سوپاس بۆ خوا کەوا دان بەو ڕاستییەدا ئەنێن، بەڵام ئەوان بەشی زۆریان عەقڵیان نییەو نافامن. دان بەوەدا ئەنێن کە خوا خالقی هەموو شتێکە، کەچی هاوبەشیشی بۆ دائەنێن و ئەو هاوبەشە درۆینانە ئەپەرستن.

وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾

## سُورَةُ الرُّوم

آياتها ٦٠ — ترتيبها ٣٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِى بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾



(٦٤) ئەم ژیانی دنیایە لە بێئاگاییو گاڵتە بەولاوە نییەو بەڕاستی ماڵی قیامەت ماڵی ژیانی ڕاستەقینەیە و، ئەگەر ئەم کافرانە بیانزانیایە ژیانی دنیایان لەم ژیانە ڕاستەقینەیە پێ باشتر نەئەبوو.

(٦٥) جا کاتێ کە سواری کەشتی ئەبن و ترسی نقوم بوون لە دەریادا دایان ئەگرێ، ئەکەونە پاڕانەوە لە خواو ئایینیان خاوێن ئەکەنەوە لەوە کە کەس بکەن بە هاوبەشی خواو، بەتەنها لە خۆی ئەپاڕێنەوە. پاشان کەخوایش ڕزگاریکردن و گەیاندنیە وشکان کوتوپڕ دەست ئەکەنەوە بە هاوبەش دانان بۆ خوا.

(٦٦) بۆیە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن تا ئینکاری ئەو نیعمەتی ڕزگارکردنە بکەن کە پێمان بەخشین و لە دنیادا بۆ خۆیان ڕابوێرن، بەڵام لەمەوپاش ئەزانن بە چ دەردێکیان ئەبەین.

(٦٧) ئایا سەیرناکەن ئێمە حەرەمێکی بێترس و ئەمینمان دروست کردووە کەس دەستی درێژ ناکاتە سەر، کەچی بەدەوروبەریانا خەڵك ئەفڕێنن؟ جا ئاخۆ ئەمانە باوەڕیان بە ئایینی بەتاڵ و پڕوپووچ هەیەو ئینکاری نیعمەتی خوا ئەکەن؟

(٦٨) کێ لەو کەسانە ستەمکارترە کە درۆ بەدەم ئایینی خواوە هەڵ ئەبەستن یا پێغەمبەر و قورئانیان بە درۆ داناوە کە هاتوونە سەریان؟ ئاخۆ دۆزەخ جێگای ئۆقرە تیاگرتنی تێدانییە بۆ کافرەکان؟

(٦٩) ئەوانەیش کە لە ڕێگای ئێمەدا تێکۆشاون و خواپەرستیی ڕاستییان کردووە، ئێمە لە پاداشی چاکەیانا شارەزای ڕێگەکانی خۆمانیان ئەکەین و خوایش لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە چاکە ئەکەن.

## سوورەتی (الرُّوم)

**مەککەییە ئایەتی ١٧ی نەبێ و، (٦٠) ئایەتە**

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چییە.

(٢) ڕۆمییەکان شکان.

(٣) لە وڵاتی نزیك لە وڵاتی عەرەبەوەداو، ئەم ڕۆمییانە، پاش ئەم شکانەیان، زاڵ ئەبنەوە بەسەر ئەوانەدا کە شکاندبوونیان کە فارسەکانن.

(٤) لەماوەی چەند ساڵێکا. سەرەنجامی کار لەمەوپێشیش بۆ خوا بووەو لەمەوپاشیش هەر بۆ ئەوە، واتە فارس زاڵ بێ یا ڕۆم زاڵ بێ سەرەنجامی کار هەر بۆ خوا خۆیەتی. جا ئەو ڕۆژە کە ڕۆمییەکان زاڵ ئەبن بەسەر فارسەکانا، موسوڵمانان شاد ئەبن.

(٥) بەو سەرکەوتنەی خوا ڕۆمییەکانی سەرخست چونکە ئەوانیش ئەهلی کیتابن و لە پەیڕەوانی هەر ئایینێکی تر لە موسوڵمانانەوە نزیکترن. خوا مەیلی لە سەرکەوتنی هەرلایەك بێ ئەوە سەر ئەخا. خوا بەهێزو میهرەبانە.

وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ﴿٧﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَاقِبَةَ الَّذِينَ أَسَاءُوا السُّوأَىٰ أَن كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَكَانُوا بِهَا يَسْتَهْزِئُونَ ﴿١٠﴾ اللَّهُ يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُبْلِسُ الْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَائِهِمْ شُفَعَاءُ وَكَانُوا بِشُرَكَائِهِمْ كَافِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَهُمْ فِي رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾



(٦) ئەمــەگفتی خوایــە، خــوا هــەرگیز پێچەوانەی گفتی خۆی ناجوولێتەوە، بـەڵام بەشـی زۆری خـەڵك نـازانن خـوا گفتـی بـە چی‌داوەو پێچەوانەی گفتی ڕوونادا.

(٧) ئەم خەڵکە تەنها هەندێ دیمەنی دیاری ژیانی دنیا ئەزانن و لەبارەی ژیانەکەی تری ئەو دنیاوە بێ‌ئاگان.

(٨) ئایا ئەم خەڵکـە بیریـان نەکردووەتـەوە لە خودی خۆیان تا بزانن خوا ئاسمانـەکان و زەوی و ئـەوەی لـە نێوانیانـا هەیـە بـۆ حیکمەتێك و بۆ ماوەیەکی دیاری‌کراو نەبێ دروسـت نـەکردووە؟ بەڕاسـتی بەشـی زۆری خەڵك ئینکـاری ڕۆژی قیامـەت و گەیشـتن بـە حـوزووری خـوا ئەکـەن کـە لـەو ڕۆژەدا پاداشـی چـاکەو سـزای خراپـەی هـەموو کەسێك ئەداتەوە.

(٩) ئایا ئەمانە بەزەویدا نەگەڕاون تا سەیر بکەن سەرەنجامی ئەوانە چۆن بووە کە پێش ئەمان بوون؟ ئەوان لەمان بـەهێزتر بـوون و زەوییان هەڵگێڕایـەوە بـۆ تـۆو تیـاکردن و دارو درەخـت تیـا ناشـتن و ئاوەدانیـان کـردەوەو شـارو لادێیـان تیـا دروسـت کـرد زیاتر لەوەی ئەمانـەی ئێستا کردوویانـەو، پێغەمبەرانی ئێمە بە موعجیزەی ئاشـکراو دیارەوە هاتنە سەریان ، کەچی ئەوان ئینکاریان کردن و باوەڕیان پێ نەکردن و خوایش لە سزای ئـەوەدا غـەزەبی لێ گرتن. خوا لەوانە نەبوو ستەمیان لێ بکا کە وای لێ کردن، ئەوان خۆیان سـتەمیان لـە خۆیـان ئـەکردو بـە کردەوەی خراپیان خۆیان بەودەردە برد.

(١٠) پاشان سەرەنجامی ئەوانەی‌کردەوەی خراپیـان کـرد ئـەوەبوو ئینکـاری ئایەتـەکانی خوایـان کـردو گاڵتـەیان پـێ ئەهات.

(١١) خوا لە سەرەتادا هەموو مەخلووقات دروست ئەکاو پاشان کە مردن سەرلەنوێ زیندوویان ئەکاتەوەو پاشانیش هەمووتان ئەگێڕرێنەوە بۆ لای خوا خۆی.

(١٢) ڕۆژێکیش کە قیامەت بەرپا ئەبێ‌و دێتە پێشەوە، تاوانکاران کڕوکپ ئەبن نازانن چی بڵێن و چۆن داکـۆکی لـە خۆیان بکەن.

(١٣) لەناو ئەوانەیشا کە دایاننابوون بە هاوبەشی خوا هیچ کەسانێکیان نەبوو تکایان بۆ بکەن و ڕزگاریان کەن لـەو ڕۆژە ڕەشەی تێی کەوتبوون و، ئینکاری ئەوانەیان ئەکرد کـە بـە هاوبەشـی خوایـان دانـابوون و ئـەیانزانی دەسـەڵاتی هیچیان نییەو شتێکیان لەدەست نایەت.

(١٤) لەو ڕۆژەیشا کە قیامەت بەرپا ئەبێ، ئەو ڕۆژە ئەو خەڵکانەی زیندوو ئەکرێنەوە، بڵاوەی لێ ئەکەن.

(١٥) جا هەرچی ئەوانەن کە باوەڕیان بە خوابووەو کردەوەی چاکەیان کردووە، لە باخی بەهەشتا دڵخـۆش و شـادمان ئەکرێن.

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلْأَٓخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿١٦﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ وَيُحْيِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَاۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْيِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾



(١٦) هەرچی ئەوانەیشن کە کافربوون و ئایەتەکانی ئێمەو گەیشتن بە ڕۆژی قیامەتیان بە درۆ داناوە، ئەوانە ئامادە کراون بۆ ناو سزاو لێی دەرباز نابن.

(١٧) کەواتە پاکیو بێگەردی هەر بۆ خوایە کاتێ کە ئەکەونە ئێوارەو کاتێ کە ڕۆژ ئەکەنەوەو ئەکەونە سبەینێوە.

(١٨) سەناو ستایش بۆ خوایە لە ئاسمانەکان و لە زەویداو کاتێ کە ئەکەونە شێوان و کە ئەکەونە نیوەڕۆوە، واتە: لە هەموو کاتێکا.

(١٩) خوا ئەو خوایە زیندوو دەرئەکا لە مردوو و مردوو دەرئەکا لە زیندوو و زەوی ئەژێنێتەوە پاش مردنی و ئێوەیش هەر بەو جۆرە لە گۆڕ دەرئەکرێن و زیندوو ئەکرێنەوە.

(٢٠) یەکێ لە نیشانەکانی توانایی خوا ئەوەیە ئێوەی لە گڵ دروست کردووە چونکە ئادەمزاد هەموو نەوەی ئادەمن و لە گڵ دروست کراوە و، پاش ئەوە ئێوە بڵاوەی لێ‌ئەکەن بە هەموو لایەکی جیهانا.

(٢١) یەکێکی تر لە نیشانەکانی توانایی خوا ئەوەیە هاوجووتی بۆ دروست کردوون لە جۆری خۆتان، پیاو بۆ ئافرەت و ئافرەت بۆ پیاو، بۆ ئەوەی دڵتان لەگەڵیان ئارام بگرێ و حەزیان لێ بکەن و خۆشەویستی و ڕەحمی لە نێوانتانا دروست کردووە، نێرو مێ یەکتریان خۆش ئەوێ. ئەمەی کە خوا کردوویە چەندین نیشانەی گەورەیی و توانایی خوای تیایە بۆ هەر کۆمەڵە ئادەمزادێک کە بیر لە شت بکەنەوە.

(٢٢) یەکێکی تر لە نیشانەکانی توانایی خوا دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازیی زمانتانە کە هەر میللەتێ بە زمانێ ئەدویو جیاوازیی ڕەنگی پێستتانە. ئەمە چەندین نیشانەی لەسەر گەورەیی خوا تیایە بۆ هەموو جیهان.

(٢٣) یەکێکی تر لە نیشانەکانی گەورەیی خوا نووستنتانە لە شەوو لە ڕۆژاو داواکردن و پەیداکردنی نان و نیعمەتتانە لە گەورەیی و ڕەحمی خوا. بەڕاستی لەمەدا چەندین نیشانە هەیە بۆ کەسانێ کە گوێ لە دەرزی ڕاستی بگرن.

(٢٤) یەکێکی تر لە نیشانەکانی گەورەیی خوا ئەوەیە کە برووسکەی هەورتان پیشان ئەدا تا لەوە بترسن کە برووسکەکە لێتان بداو بتانکوژێ و ئاگر بە ماڵ و باخ و باخات و دەغڵودانتانەوە بنێ و، تەماعی ئەوەیشتان بخاتەبەر کە باران بباریو کشتوکاڵتان ئاو بخواتەوە لێی. خوا لە ئاسمانەوە ئاوی باران دائەبارێنێ زەویی پێ زیندوو ئەکاتەوە پاش وشك بوونەوەو مردنی. ئەمەیش چەندین نیشانەی تیایە بۆ کەسانێ کە عەقڵیان ببێ و بفامن.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾



(٢٥) یەکێکی تر لە نیشانەکانی توانایی خوا ئەوەیە ئاسمانەکان و زەوی بە فەرمانی ئەو لەسەر حاڵی خۆیان ڕاگیربوون و، کاتێ بانگێکی لێ‌کردن پاش مردنتان لەناو زەوییەوە ڕاپەڕن و بەدەنگیەوە بێن دەس بەجێ گشتتان لە گۆڕ دێنەدەر.

(٢٦) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە لە فریشتەو پەری و ئادەمزاد و هەر جۆرە مەخلووقێ هەمووی هیی خوایەو لەژێر فەرمانی ئەودان و هەموو ملکەچی ئەون.

(٢٧) خوا ئەو خوایە دەست ئەکا بە دروستکردنی مەخلووقات لە نەبوونەوە، جا لە پاش مردنیان زیندوویان ئەکاتەوەو ئەم دروستکردنەوەیە ئاسانترە بۆی بە ئیعتیباری عەقڵی چونکە ئەوەڵ جار هیچ لە کارا نەبووە کە دروستی کردوون، بەڵام دووەم جار خۆ هیچ نەبێ لاشە ڕزیوە بە خۆڵ بووەکەیان لە بەردەستایە. شان و شەوکەتی بەرز لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەر بۆ خوایەو خوا زاڵ و تواناو بەهێزەو خاوەن حیکمەتە لە هەر کارێکا کە ئەیکا.

(٢٨) خوا نموونەیەکتان هەر لە خودی خۆتانا بۆ دێنێتەوە: ئەو بەندەو کەنیزەکانەی هەتانن، کەسیان هاوبەشتانن لەو ڕزق و ڕۆزیو نان و نیعمەتەدا کە ئێمە پێمان داون، تا یەکسان و چوونیەك بن لەگەڵیان لەو ڕزق و ڕۆزییەداو لێیان بترسن کە تەسەڕروفی تیا بکەن وەك ئێوەی ئازاد لەناو خۆتانا لە یەکتری ئەترسن؟ مادەم ئێوەو کەنیزەکەکانتان نابن بە شەریکەبەش لەو ڕۆزییەدا کە خوا پێی بەخشیون، ئیتر چۆن ئەو بتانە کە دارو بەردێکی تاشراون ئێوە خۆتان دروستتان کردوون، ببن بەهاوبەشی خوایەتیی خوا؟ ئێمە ئا بەم جۆرە بەڵگەی خوایەتیو بێ‌شەریکی خوا ڕوون ئەکەینەوە بۆ ئەو کەسانەی ئەفامن و لە شت تێ ئەگەن.

(٢٩) بەڵکو ئەوانەی ستەمکارن و ناحەقی ئەکەن، بێ ئەوەی هیچ بزانن ، دوای هەواو هەوەسی ئارەزووبازیی خۆیان کەوتوون. جا کەسێ کە خوا خۆی گومڕای کردبێ کێ ئەتوانێ هیدایەتی بداو ڕێی ڕاستی پیشان بداو، ئەمانە هیچ یارمەتیدەرێکیان بۆ نییە.

(٣٠) دەی ڕووی خۆت ڕاست بکە بۆ ئایینی ئیسلام بە حاڵێ کە لابدەی لە هەموو کارێکی بەتاڵ، لەسەر ئەو فیترەتە پاکەی خوا مەخلووقی لەسەر دروست کردووە. کەس ناتوانێ ئەوەی خوا کردی بیگۆڕێ. ئەمەیە ئایینی ڕاست ، بەڵام بەشی زۆری خەڵك نازانن.

(٣١) ئەی موحەممەد! ڕووی خۆت ڕاست بگرە بەرەو ئایین لەگەڵ شوێنکەوتووەکانتا ، حاڵتان وابێ بگەڕێنەوە بۆلای خوداو لە خودا بترسن و نوێژەکانتان بکەن و، لە گرۆهی کافرە هاوبەش‌بۆخوادانەرەکان مەبن.

(٣٢) ئەو هاوبەش‌بۆخوادانەرانە کە ئایینەکانی خۆیانیان پارچە پارچە کردو هەر پارچەیەکیان ڕووی‌کردە لایەك و بوون بە چەند تاقم و هەر تاقمێ دڵی بەو بۆ چوونە خۆشە کە خۆی هەیەتی.

وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣٧﴾ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَا۟ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ۖ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٠﴾ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾



(٣٣) ئەم خەڵکە ئەگەر تووشی زیانێك بوون لە خوا ئەپاڕێنەوەو ئەگەڕێنەوە بۆ لای‌و کە پاشان ڕەحمەتێکیان لە خواوە بۆ هات و خوا ڕەحمێکی پێ چەشتن لەجیاتیی ئەوەی سوپاسی بکەن ئەبینین کۆمەڵێکیان هاوبەش بۆ خوای خۆیان دائەنێن.

(٣٤) تا بەو هاوبەش‌بۆخوادانانەیان ئینکاری ئەو نیعمەتە بکەن کە پێمان داون. دەسا ئەی کافرینە بۆ خۆتان ڕابوێرن و بگوزەرێنن، لەمەوپاش ئەزانن چیتان بەسەردێ.

(٣٥) یان لەبەر ئەوە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن گوایە ئێمە بەڵگەیەکمان داوەتە دەسیان و، ئەو بەڵگەیە باسی ئەو هاوبەش‌بۆخوادانانەیان ئەکا؟ شتی وا نییەو لەخۆیانەوە دوای شتی چەوت کەوتوون و سەریان لێ شێواوە.

(٣٦) کاتێ کە ڕەحمەت و نیعمەتێ بە خەڵك بچێژین شادمان ئەبن پێی و ئەگەر خراپەیەکیان بەهۆی کردەوەی بەدی خۆیانەوە بێتەڕێ نائومێد و مەئیووس ئەبن لە ڕەحمەتی خوا.

(٣٧) ئایا نازانن خوای گەورە ڕۆزی گوشاد ئەکات بۆ هەرکەسێ خۆی خواستی لێ بێ و تەنگی ئەکاتەوە لەسەر هەرکەسێ خۆی خواستی لەسەر بێ؟ بەڕاستی لەمەدا چەندین نیشانەی گەورەیی خوا هەیە بۆ کەسانێ باوەڕیان بە خوا هەبێ.

(٣٨) دەی بدە بە خزم و کەس حەقی خۆیان لە خەرجی ئەگەر داماوبوون و حەقی هەژارو ڕێبواری نەداریش بدە. ئەم جۆرە خێرکردنە چاکترە بۆ ئەو کەسانەی خاتری خوایان ئەوێ و، هەر ئەو جۆرە کەسانەیشن لە ڕۆژی قیامەتا ڕزگار ئەبن.

(٣٩) ئەو پارەو ماڵەی ئەیدەن بە خەڵك بە قەرز بۆ ئەوەی زیاد بکاو لە پارەی ئەوانی بێتەسەر، ئەوە لای خوا زیاد ناکا، واتە پارە بەقەرز بدەن بەخەڵك بۆ ئەوە نا خەڵکەکە پاشان بەزیادەوە بتاندەنەوە بەڵکو بۆ ئەوە خوا بۆتان زیاد بکاو بە دە قات چاکەتان بۆ بنووسێ. هەر زەکاتێکی ماڵیش لە ڕێگای خوادا بیدەن بە موستەحەققان، ئەو کەسانەی زەکاتی وا ئەدەن، ئەوانەن ماڵی خۆیان لە ڕێگاری شەرعییەوە چەندین ئەوەندە لێ ئەکەن.

(٤٠) خوا ئەو خوایە دروستی کردوون و ئەنجا ڕزق و ڕۆزیی داونێ و پاشان ئەتانمرێنێ و پاشتریش زیندووتان ئەکاتەوە. هیچکام لەو هاوبەشانەتان کە بۆ خواتان داناون کارێ لەم کارانە ئەکا؟ خوا پاك و بێگەردەو خاوێنە لەم هاوبەشانەی بۆ ئەویان داناون.

(٤١) خراپە لە زەوی و لە دەریادا دیاری داوە بە هۆی ئەو شتانەوە کە دەستی ئادەمزاد ئەیانکا، بۆ ئەوەی خوا سزای هەندێ لەم کردەوانەی ئەم خەڵکە کردوویانە بچێژێ پێیان، بەڵکو پەشیمان ببنەوەو لەو کارانە پاشگەز ببنەوە.

قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلُ ۚ كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُشْرِكِينَ ﴿٤٢﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ الْقَيِّمِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لَا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾ مَنْ كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِأَنْفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴿٤٤﴾ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْ فَضْلِهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ وَلِيُذِيقَكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَلِتَجْرِيَ الْفُلْكُ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَاءُوهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَانْتَقَمْنَا مِنَ الَّذِينَ أَجْرَمُوا ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفًا فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ ۖ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَانْظُرْ إِلَىٰ آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾



(٤٢) بەم هاوبەشبۆخوادانەرانە بڵێ: بگەڕێن بە زەویداو بزانن ئەنجامی ئەوانە چۆن بوو کە بەر لە ئێوە هەبوون و بەشی زۆریان هاوبەشیان بۆ خوا دائەنا؟ بزانن خوا لە تۆڵەی ئەو هاوبەشبۆدانانەیانا بە چ دەردێکی بردن؟

(٤٣) دەی سا ڕووی خۆت ڕاست ڕابگرە بۆ ئایینی ڕاست بەر لەوەی ڕۆژێکی وەها لە لای خواوە بێت کە گەڕانەوەی بۆ نییە. لەو ڕۆژەدا ئەو خەڵکە بڵاوەی لێ ئەکەن: موسوڵمانان بۆ بەهەشت و کافران بۆ دۆزەخ.

(٤٤) هەرکەسێ کوفری کردبێ سزای کوفرکردنەکەی لەسەر خۆیەتی و، کەسانێکیش کاری چاکیان کردبێ ئەوانە لە بەهەشتا جێگە بۆ خۆیان خۆش ئەکەن.

(٤٥) بۆ ئەوەی خوا بە گەورەیی خۆی پاداشی ئەوانە بداتەوە کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرانی خوا بووەو کاری چاکەیان کردووە. بەڕاستی خوا کافرانی خۆش ناوێ.

(٤٦) یەکێ لە نیشانەکانی توانایی خوا ئەوەیە بای وەشت ئەنێرێ مژدەی بارانی پێیەو بۆ ئەوەی ڕەحمەتی خۆیتان پێ بچێژێو بۆئەوەی کەشتی لە دەریادا بە فەرمانی خوا بە هێزی ئەو بایە ڕێ بکاو ئێوەیش کاسبی بکەن و خێرو بەرەکەتی خوا داوا بکەن بۆ خۆتان و بەڵکو سوپاسی بکەن.

(٤٧) بەڕاستی ئێمە پێش تۆیش پێغەمبەرانمان ناردووە بۆ لای قەومەکانی خۆیان و ئەو پێغەمبەرانە بەڵگەو موعجیزەیان هێنا بۆیان کەوا پێغەمبەری خوان، کەچی باوەڕیان پێ نەکردن. ئێمەیش تۆڵەمان سەندەوە لەوانەی تاوانیان کردبوو و بەڕاستی حەق بوو بەسەرمانەوە یارمەتیی ئەوانە بدەین کە ئیمانیان هەبوو.

(٤٨) خوا ئەو خوایە بای وەشت هەڵئەکاو ئەینێرێ، ئەویش هەور هەڵئەکاو بەڕووی ئاسمانا بڵاوی ئەکاتەوەو هەرچۆن خۆی مەیلی لێ بێ پەڵە پەڵەی ئەکا، جا ئەبینی باران لە نێوان هەورەکەوە دێتە دەرو دائەبارێتەخوار. جا کاتێ ئەو بارانە کەسانێ بگرێتەوە لە بەندەکانی خوا کە خۆی مەیلی لەسەر بێ، پێی شادمان و کەیفخۆش ئەبن.

(٤٩) هەرچەندە ئەو خەڵکە بەرلەوەی بارانەکەیان بەسەردا بباریێ، بەر لە پەیدابوونی هەورەکە نائومێد و مەئیووس بوون.

(٥٠) جا بڕوانە بۆ نیشانەو قازانجی ڕەحمەتی خوا چۆن زەوی بەو بارانە زیندوو ئەکاتەوەو پاشان وشك بوونەوەو مردنی. بەڕاستی ئەو خوایە کەوا زەوی بەوجۆرە زیندوو ئەکاتەوە، ئەو خوایە کە مردووان زیندوو ئەکاتەوەو، ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ.

وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ۖ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴿٦٠﴾



(٥١) بەڕاستی ئەگەر ئێمە بایەك هەڵکەین و بینێرین و لەپاش ئەو با هەڵکردن و ناردنی هەورە، هەورەکە بە زەردی ببینن، کە هەوری زەرد نیشانەی ئەوەیە کە بارانی پێوە نییە، دەس ئەکەن بە کوفر کردن و هەر کوفر ئەکەن، چونکە خۆیان بە نائومێد ئەبینن، لە جیاتیی ئەوەی سەبر بکەن و خۆ ڕابگرن و متمانەیان بە ڕەحمەتی خوا ببێ کە ئەگەر ئەمڕۆیش نەبارێ ڕۆژێکی تر ئەبارێ.

(٥٢) ئەم جۆرە کەسانە وەکو مردوو وان، چونکە دڵیان مردووەو تۆیش ناتوانی قسە بەگوێی مردوودا بکەیت و ناتوانی بانگەواز بەگوێی کەڕ ببیستێنی ئەگەر ئەوان پشتی لێ هەڵکەن و نەیانەوێ ببیسن.

(٥٣) تۆ ناتوانی ڕێگا بە کەسانی گومڕا پیشان بدەی کە وەك کوێر وان و حاڵییان بکەی گومڕاییەکەیان لەچیدایە. تەنها قسە بەگوێی ئەوانەدا ئەبەی کە باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیەو فەرمان بەرداری فەرمانی ئێمەن.

(٥٤) خوا ئەو خوایە لە پێشا بە لاوازیو هیچلەدەسنەهاتوویی دروستی کردوون و پاش ئەو لاوازی و بێ هێزییە هێزی دانێ و پاشان لەپاش بەهێزییەکەتان بێهێزی و پیری بۆ هێنان. ئەو مەیلی بەچی بێ ئەوە دروست ئەکا. ئەو بە هەموو شتێ ئەزانێ و ئەتوانێ هەموو شتێ بکا.

(٥٥) ڕۆژێ کە قیامەت بەرپا ئەبێ تاوانباران سوێند ئەخۆن سەعاتێ زیاتر لە دنیادا نەژیاون و نەماونەتەوە. ئا بەوجۆرە هەڵئەگێڕرێنەوە لە ئاگاو هۆش و هیچیان لەبیر نامێنێ.

(٥٦) ئەوانەیش کە زانست و باوەڕیان دراوەتێو موسوڵمان بوون و چاکەو خراپەیان زانیوە پێیان ئەڵێن: نەخەیر وا نییە. لە عیلمی خوادا هەیە کەوا تەواوی تەمەنتان لە دنیادا ژیاون و پاشان مردوون و وا ماونەتەوە تا ڕۆژی زیندووکردنەوەتان کە ئەمڕۆیەو وا ئێستا زیندوو کراونەتەوە بۆ لێپرسینەوە، بەڵام ئێوە لەبەر ئەوەی ئێستا لە بەردەم لێپرسینەوەدا وەستاون هیچ نازانن و هەمووتان لە بیر چووەتەوە.

(٥٧) لەو ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوەیەدا عوزر هێنانەوە دادی ستەمکاران و گوناهباران نادا و ئیتر داوای تۆبەیان لێ ناکرێ وەك لە دنیادا بۆ ئەوەی لۆمەو عیتابیان لێ نەکرێ.

(٥٨) بەڕاستی ئێمە لە هەموو جۆرە پەندو ئامۆژگارییەکمان لەم قورئانەدا هێناوەتەوە بۆ ئەوەی بیربکەنەوە، بەڵام سوودی نەبوو بۆیان. ئێستەیش ئەگەر تۆ ئایەتێ لە ئایەتەکانی قورئانیان بۆ بهێنیتەوە، بێگومان کافرەکان ئەڵێن: ئێوە لە بەتاڵگۆو هەرزەوێژ زیاترنین.

(٥٩) ئاوا خوا مۆر بەدڵی ئەو کەسانەوە ئەنێ کە نەزان و بێ ئاگان.

(٦٠) کەواتە سەبرت ببێ و دان بەخۆتا بگرە، ئەو گفتەی خوا داویە ڕاستەو دێتەدی و، با بێباوەڕان بە بێباوەڕیی خۆیان کارێکت لێ نەکەن خۆت قورس نەگری و بکەویتە دوودڵییەوە.

## سُورَةُ لُقْمَانَ

ترتيبها ٣١ — آياتها ٣٤

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١١﴾



## سووره‌تی (لُقْمَانَ)

مه‌ككه‌یی‌یه ئایه‌تی ٢٧و٢٨و٢٩ی نه‌بێ و (٣٤) ئایه‌ته

(١) خوا خۆی ئه‌زانێ مه‌به‌ستی له‌م وشه‌یه چییه.

(٢) ئـه‌م ئایه‌تانـه ئایـه‌تی كتـێبی پڕحیكمه‌ت و ڕاز و وردبێژین.

(٣) مایـه‌ی ڕێپیشـاندان بـۆ چـاكه‌و خێروبێرن بۆ كه‌سانێ كرداریان چاك بێ.

(٤) ئه‌و كه‌سانه‌ی نوێـژ ئه‌كـه‌ن و زه‌كـاتی ماڵ ئـه‌ده‌ن و بـاوه‌ڕو متمانـه‌یان بـه ڕۆژی قیامه‌ت هه‌یه.

(٥) ئه‌وانه دامه‌زراون له‌سه‌ر هیدایه‌ت لـه لایه‌ن خواوه‌و ئه‌وانـه‌ن لـه‌گومڕاهیی دنیـاو له سزای ڕۆژی قیامه‌ت ڕزگاریان بووه.

(٦) كه‌سانی‌وا هه‌ن قسه‌و باسـی پڕوپـووچ ئه‌كرن و خۆیانی پێـوه خـه‌ریك ئه‌كـه‌ن بـۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵكی ساده‌ی پێ‌گومڕا بكه‌ن و له ڕێگای خوایان لاده‌ن بێ ئه‌وه‌ی بـزانن ئـه‌و قسه‌وباسـه پڕوپووچـانه‌ی ئـه‌یانكرن چین و ڕێگای خوا ئه‌كه‌ن بـه گاڵتـه‌جاڕی خۆیـان. ئه‌و جۆره كه‌سانه له‌و دنیا سزایه‌كیان ئه‌درێ ڕه‌زیل و سه‌فیلیان بكات.

(٧) ئه‌وانه كه‌سانێكن كاتێ ئایه‌تی فه‌رمووده‌ی ئێمه‌یان به‌سه‌را بخوێنرێته‌وه پشت هه‌ڵئه‌كه‌ن و فیزیان ناهێنێ گوێی بۆ شل بكه‌ن وه‌ك بڵێی گوێیان لێ نه‌بووبێ وه‌ك بڵێی گوێیان گران بێ، مژده‌ی سزایه‌كی سه‌ختیا بده‌رێ.

(٨) به‌ڕاستی ئه‌وانه‌ی ئیمانیان هێناوه‌و كرده‌وه‌ی چاكیان كردووه، به‌هه‌شتی شوێنی نازو نیعمه‌ت بۆ ئه‌وانه.

(٩) هه‌تا هه‌تایه له‌و به‌هه‌شته‌دا ئه‌مێننه‌وه له‌سه‌ر گفتـی ڕاسـتی خـوا كـه پێـی داون و خـودا زاڵ و توانایـه به‌سـه‌ر هه‌موو شتێكاو خاوه‌ن حیكمه‌ته كارێ ناكا حیكمه‌تی تیا نه‌بێ.

(١٠) خوا ئاسمانه‌كان و زه‌وی دروست كردووه بێ كۆڵه‌كه‌گه‌لێكی وا ئێوه به چاو ببیـانبینن و چـه‌ندین كێـوی بـه‌رزی له‌سه‌ر ئه‌رز دامه‌زراندووه بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌رز لارنه‌بێته‌وه پێتانه‌وه‌و تووشی زیان بـبن و، لـه هـه‌موو جـۆره گیانله‌بـه‌رێكی تێدا بڵاوكردووه‌ته‌وه كه پێیدا بڕوا و، ئاومان له ئاسمانه‌وه داباراندووه‌و به‌و ئاوه له هـه‌موو جووتـه جـۆره گیایـه‌كمان تێیدا ڕواندووه كه به‌سوودو به‌خشنده‌ن بۆ ئێوه‌و ژیانی ئێوه.

(١١) ئه‌مه‌ی باسم‌كرد ئه‌وه‌یه كه خوا دروستی كردووه، ده‌سا ئێوه بێن بیخه‌نه به‌رچاوم ئه‌وانه‌ی ئێوه له خوا بـه‌ولاوه ئه‌یانپه‌رستن چییان دروست كردووه؟ دیاره هیچیان دروست نه‌كردووه‌و نایشتوانن هیچ دروست كه‌ن، به‌ڵام سته‌مكاران له گومڕاییه‌كی ئاشكراو دیاردان.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾



(١٢) باسی ئەوە بکە کە وێڵ و کەماڵ و حیکمەتو زانیاری باشمان بەخشیبوو بە لوقمان و تێمان گەیاندبوو کە سوپاسی خوا بکاو هەرکەسیش سوپاسی خوا بکا قازانجی سوپاسەکەی بۆخۆی ئەگەڕێتەوەو هەرکەسیش کافر بێو دان بە نیعمەتی خوادا نەنێ خودا پێویستی بە کەس نییەو شایانی حەمد و سەنا بۆ کردنە.

(١٣) باسی ئەوە بکە کە لوقمان ئامۆژگاریی کوڕەکەی ئەکرد، پێی وت: ڕۆڵە! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ. بەڕاستی هاوبەش‌بۆخوادانان ستەمێکی گەورەیە.

(١٤) ئادەمزادمان ڕاسپاردووە دەربارەی باوك و دایکی، دایکی لە کاتی سستی لەسەر سستیدا، کە کاتی دووگیانییەتی، لە سکی خۆیا هەڵیگرتووە. جیابوونەوەی لە سکی دایکی بە لەدایکبوونیو، لە کۆش و بەرمەمکانی بە بڕینەوەی لە شیر لە دووساڵایە. ڕامان سپاردووە کەوا بەرانبەر بەم ئازار و ئەزیەتەی دایکت لەگەڵتی کێشاوە سوپاسی منیش و باوك و دایکیشت بکەو سەرەنجامیش دێیتەوە بەردەستی خۆم پاداشی یا سزای کرداری دنیات ئەدەمەوە.

(١٥) ئەگەریش هەوڵیان لەگەڵ دای کەوا هاوبەشم بۆ دابنێیو شتێکیوا بکەی بە هاوبەشم کە هیچی لێ نازانی ئاخۆ بۆ ئەوە ئەشێ ببێ بە هاوبەشم، بەگوێیان مەکەو هاوڕێیەتییان بکە لە دنیادا بە هاوڕێیەتییەکی باشی وا شەرع پێی ڕازی بێ و، شوێنی ڕێی ئەو کەسانە بکەوە کە گەڕاونەتەوە بۆ لای من. پاشانیش گەڕانەوەتان بۆ لای منەو جا منیش خەبەردارتان ئەکەم لە دنیادا چیتان کردووەو پاداشی کردەوەکانتان چییە.

(١٦) ڕۆڵە! ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەگەر چاکە یا خراپەی ئادەمزاد بە قورسایی دەنکە تۆوە خەرتەلەیەك بێ، لەناو تاشەبەردێکا بێ یا لە ئاسمانەکانا بێ، خوا ئەیهێنێ بۆ مەیدانی لێ پرسینەوە. خوا ئاسکە، زانستی ئەگاتە هەموو شتێ و خوا لە هەموو شتێ ئاگادارە.

(١٧) ڕۆڵە! نوێژبکەو ئەمر بە چاکە بکەو نەهی لە خراپە بکەو چیت هاتەڕێ لە ناڕەحەتی و گیروگرفت خۆتی لە بەرابەردا ڕاگرە، ئەم خۆلەبەرناڕەحتیداڕاگرتنە یەکێکە لە کارە مەزنەکان هەرکەسێ پێی بکرێ.

(١٨) ڕووی خۆت وەرمەچەرخێنە لە خەڵك کە فیزت ئەهێنێ ڕوویان تێ بکەی و قسەیان لەگەڵ بکەی و، بەفیز و خۆپەسەندییەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ. بێ‌گومان خوا خۆشی نایەت لە هیچ کەسێکی خاوەن فیزو دەعیەو شانازی بەخۆوە کردوو.

(١٩) مامناوەندی بە لە ڕۆیشتنتا بەڕێدا، نە خاو و خلیچك ڕێ بکەو نە بە پەلەیش بڕۆو، دەنگت زۆر هەڵمەبڕەو مەقیڕێنە. بێ‌گومان ناخۆشترین دەنگ دەنگی گوێدرێژە کە زۆر بەرز ئەزەڕێنێ.

أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسۡلِمۡ وَجۡهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحۡزُنكَ كُفۡرُهُۥٓۚ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمۡ قَلِيلٗا ثُمَّ نَضۡطَرُّهُمۡ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٖ ﴿٢٤﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوۡ أَنَّمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن شَجَرَةٍ أَقۡلَٰمٞ وَٱلۡبَحۡرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦ سَبۡعَةُ أَبۡحُرٖ مَّا نَفِدَتۡ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلۡقُكُمۡ وَلَا بَعۡثُكُمۡ إِلَّا كَنَفۡسٖ وَٰحِدَةٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾



(٢٠) ئێوە نابینن خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و لەزەویدا هەیە هەمووی بۆ ڕام کردوون و، نیعمەتی خۆی بەسەرتاندا بەربلاوکردووە بەئاشکراو بەنهێنی؟ لە ناو ئەم خەلکەدا کەسانی وا هەن ئەکەونە دەمەدەم کردن لەبارەی خواوە بێ‌ئەوەی بۆ خۆیان هیچ بزانن یا لە پێغەمبەرێکەوە شتێ فێر بووبن یا کتێبێکیان لە خواوە بۆ هاتبێ بەرچاویان ڕوون بکاتەوە.

(٢١) کە پێیان بوترێ: شوێنی ئەو کتێبە بکەون کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەر، ئەڵێن: نەخەیر، شوێنی ئەو ڕێوڕەسمانە ئەکەوین کە باوك و باپیرانی خۆمانمان دیوە لەسەریان ئەڕۆیشتن. جا ئایا ئەگەر شەیتان تەنانەت بۆ ئازارو سزای ئاگری بلێسەداری دۆزەخیشتان بانگ بکا، هەر شوێنی ئەکەون؟

(٢٢) هەرکەسێ ڕووی خۆی وەرچەرخێنێ بۆ لای خواو کاری خۆی بداتە دەست ئەو و کاروکردەوەی چاك بکا، ئەوە دەستی بەدەستەگیرەیەکی توندو پتەوو نەلەقیوەوە گرتووە و، سەرەنجامی هەموو کارێکیش بۆ لای خوا ئەگەڕێتەوە.

(٢٣) هەرکەسیش کافربێ، با کافرییەکەی خەفەتبار و دلگرانت نەکا. ئاخری هەموو دێنەوە بەردەستی ئێمەو خوایش ئاگاداریان ئەکاتەوە لە دنیادا چییان کردووە. خوا ئەزانێ چی لە دڵی هەرکەسێکدا هەیە.

(٢٤) چەردەیێ، یا بۆ ماوەیەکی کەم، ماوەی ڕابواردنیان بۆ ئەڕەخسێنین. پاشان ناچارو گیرۆدەی سزایەکی سەخت و نالەباریان ئەکەین.

(٢٥) ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە؟ ئەڵێن: خوا. تۆیش بڵێ: حەمدو سەنا بۆ خوا کەوا قسەتان نەماو دانتان بەو ڕاستییەدا نا، بەڵام ئەمانە بەشی زۆریان نازانن کەوا قسەیان نەماو بەداوی قسەی خۆیانەوە بوون.

(٢٦) هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هەمووی هیی خوایە. بەڕاستی هەر خوایە بێ‌نیازە لە هەموو جیهان و ستایشی ئەکرێ.

(٢٧) ئەگەر هەرچی دار و درەخت لە زەویدا هەیە هەمووی قەڵەم بێ‌و دەریایش هەمووی مەرەکەب بێ و حەوت دەریا لە دوایەوە یارمەتی بداو بچێتەسەری، هێشتا وشەکانی خوا تەواو نابن بەو قەڵەم و مەرەکەبانە بنووسرێن. بەڕاستی خوا خاوەن عیززەت و خاوەن حیکمەتە.

(٢٨) نە دروستکردنی ئێوەو نە زیندووکردنەوەتان پاش مردن وەك دروست کردن و زیندوو کردنەوەی یەك کەس نەبێ نییە. واتە دروستکردن و زیندووکردنەوەی پاش مردنی هەموو ئادەمزاد لای خوا هەر ئەوەندەی دروست کردن و زیندووکردنەوەی یەك کەسی تێ‌ئەچێ. بەڕاستی خوا گوێی لە هەموو شتێکەو هەموو شتێ ئەبینێ.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْا۟ يَوْمًا لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾

## سُورَةُ السَّجْدَة

ترتيبها ٣٢ — آياتها ٣٠



(٢٩) تۆ نابینی خوا شەو ئەبا بە ناو ڕۆژاو ڕۆژ ئەبا بەناو شەواو ڕۆژو مانگی ڕام کردووەو هەرکامیان تا ماوەیەکی دیاریکراو هاتوچۆ ئەکاو، خوا بەڕاستی ئاگادارە لە هەموو کار و کردەوەیەکتان.

(٣٠) ئەمەی کە باسمان کرد لەبەر ئەوەیە کە خوا ڕاستەو توانایە و، ئەو بتانەی ئێوە، ئەی بتپەرستەکان، هاواریان ئەکەنێ پووچ و بەتاڵن و، هەر خوا بۆ خۆی بەڕاستی بەرز و باڵاو گەورەیە.

(٣١) ئایا نابینی کەشتی ڕەوان ئەبن بەناو دەریادا بە ئیحسان و نیعمەتی خوا بۆ ئەوەی خوا هەندێ لە نیشانەکانی گەورەیی خۆیتان پیشان بدا؟ بێگومان لەم ڕەوان بوونی کەشتییانەدا بەناو دەریادا چەندین نیشانەی گەورەیی خوا هەیە بۆ ئەوانەی خۆ لەسەر بیرکردنەوە لە گەورەیی خوا ڕائەگرن و بەردەوام ئەبن لەسەری و سوپاسی نیعمەتی خوا ئەکەن.

(٣٢) ئەو خەڵکەی بە کەشتی هاتوچۆ بەناو دەریادا ئەکەن، ئەگەر شەپۆلێکی ئاو لە دەریادا بێ بەسەریاناو دایان بگرێ و وەك هەور بەسەریانەوە بێ، لە خوا ئەپاڕێنەوەو عیبادەتیان بۆ خوا بێگەرد ئەبێ و کەس ناکەن بە هاوبەشی. کە ڕزگاریشیان ئەکاو ئەیانگەیەنێتە وشکان، هەندێکیان لەسەر ڕێگەی ڕاستی خوا بەیەك زانین ئەمێننەوەو ناگەڕێنەوە بۆ هاوارکردنە بت و بە هاوبەشی خوا دانانی. کەسیش ئینکاری نیشانەکانی خوایەتیی ئێمە ناکا ئەوانە نەبێ کە کافر و غەددارو سپڵەو ناسوپاسن.

(٣٣) خەڵکینە خۆتان لە نافەرمانیی خوای خۆتان بپارێزن و لەو ڕۆژە بترسن کە هیچ باوکێ لەو ڕۆژەدا دادی کوڕی خۆی ناداو هیچ ئەولادێ سوودی هیچی بۆ باوکی نابێ نە کەم و نە زۆر. بەڕاستی ئەو گفتەی خوا داویە ڕاستەو دێتەدی و، کە واتە با ژیانی دنیا بایی و غەڕڕاتان نەکاو شەیتانی ئینسانخەڵەتێن واتان لێ نەکا لە خوا بەلەسە بېن و دەست بدەنە بێ فەرمانی و گوناهکردن.

(٣٤) بێگومان هەر خوا خۆی ئەزانێ کەی ڕۆژی قیامەت دێ و، هەر ئەوە باران ئەبارێنێ و ئەزانێ چی لە منداڵدانی ئافرەتایە کوڕ یا کچ، کەس نازانێ سبەینێ چی ئەکاو کەس نازانێ لە کوێ ئەمرێ. بەڕاستی هەر خوایە هەموو شتێ ئەزانێ و ئاگای لە هەموو شتێکە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۚ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا شَفِيعٍ ۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾ وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا ضَلَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍۭ ۚ بَلْ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۞ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾



## سوورەتی (السَّجْدَة)

**مەککەیی‌یە ئایەتی ١٦-٢٠ی نەبێ و، (٣٠) ئایەتە**

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چییە.

(٢) ناردنە خوارەوەی قورئان گومانی تیا نییە لەلایەن خوای هەموو جیهانەکانەوەیە.

(٣) یا ئەڵێن: موحەممەد خۆی هەڵیبەستووە؟ حاشا وا نییە، بەڵکو ئەو قورئانە حەقەو ڕاستەو لەلایەن خوای تۆوەیە بۆ ئەوەی کۆمەڵە خەڵکێکی پێ بترسێنی بەر لە تۆ هیچ ترسێنەرێکیان نەهاتووەتە سەر بییانترسێنێ، بەڵکو بێنە سەر ڕێی ڕاست کە ئایینی ئیسلامە.

(٤) ئەوەی ئەم قورئانەی ناردووەتە خوارەوە ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی و چی لە نێوانیانا هەیە لە شەش ڕۆژا دروست کردووە و، لە پاشا عەرشی داگیرکردووە. لە ڕەزامەندیی ئەو لابدەن هیچ دۆست و سەردارو سەرپەرشتیکەرێکتان نابێ یارمەتیتان بداو کەستان نابێ تکاتان بۆ بکا لای، دەسا بۆ بیرێ لە حاڵی خۆتان ناکەنەوەو ئامۆژگارییەکانیتان بەگوێدا ناچێ؟

(٥) ئەو خودایە کاروباری جیهان لە ئاسمانەوە تا زەوی ڕێك ئەخا بەهۆی کاربەدەستانی خۆیەوە کە فریشتەکانن، پاشان فریشتەی کاربەدەست ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا واتە بۆ ئەو شوێنەی خوا فەرمانی داوەتێ لەویادا بێ، لە ڕۆژێکا کە ئەندازەکەی بەحیسابی ئێوە هەزار ساڵە، واتە لە ماوەیەکی دوورو درێژدا. مەبەستی لەوەیە لە بڕیاردانی هەرکارێکەوە تا جێ بەجێ کردنی ماوەیەکی زۆری پێ ئەچێ. (٦) ئەو خودایە ئەوەیە بە هەموو شتێکی پەنامەکی و ئاشکرا ئەزانێ‌و بەسەر نەیارانیا زاڵەو لەگەڵ خۆشەویستانی خۆی میهرەبانە.

(٧) ئەو خودایەیە هەرشتێکی دروست کردووە باشی دروست کردووەو بە پێی حیکمەتێ دروستی کردووەو سەرەتای دروستکردنی ئادەمزادی لە گڵەوە دەست پێ کردووە.

(٨) پاشان نەوەی ئادەمی لە پوختەو خۆلاسەیەك دروست کردووە لە ئاوێکی سووك و بێ بایەخ.

(٩) پاشان ڕێکی‌خستووەو ئەندامەکانی دروست کردووە بەو جۆرەی کە ئەیبینین و گیانی خۆی کردووە بەبەراو گوێ و چاو و دڵی بۆ دروست کردوون. ئێوە زۆر کەم سوپاسی خوای خۆتان ئەکەن.

(١٠) کافرەکان وتیان: ئاخۆ کاتێ ئێمە مردین و ون بووین لە زەویدا، واتە: بووین بەخۆڵ و وامان لێ‌هات لە ناو خۆڵی زەویدا ئاسەوارمان نەناسرێتەوە، سەرلەنوێ دروست ئەکرێینەوە؟ لێگەڕێ لەمانە. ئەمانە ئینکاری ئەوە ئەکەن بگەنە حوزووری خواو حیسابیان لەگەڵ بکاو لێیان بپرسێتەوە.

(١١) تۆ پێیان بڵێ: فریشتەی مەرگ کە کراوە بە بەرپرسی گیانکێشانتان، گیانتان ئەکێشێ‌و، پاش گیانکێشانتان ئەگێڕرێنەوە بۆ لای خوای خۆتان و لێتان ئەپرسێتەوە.

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾



(١٢) ئەگەر چاوت لێ بێ کاتێ کە تاوانباران سەریان لە حوزووری خوای خۆیانا داخستووەو ئەڵێن: خوایە ئەوەمان بەچاوی خۆمان دی گفتت بە هاتنەدیی دابوو گوێمان لێ بوو فەرمووت: پێغەمبەرەکانت کاتی خۆی چییان لەلایەن تۆوە وتووە ڕاستیان وتووە، دەسا بمانگێڕەرەوە بۆ دنیا تا ئەمجار کردەوەی چاك بکەین و بەپێی فەرموودەکانت بجوولێینەوە. ئێمە ئێستا باوەڕمان بەتۆو بە پێغەمبەرانی تۆو بە ڕاستیی فەرموودەکانتان هەیە. وەڵامی (ئەگەر)ەکەی سەرەتای ئایەتەکە لە ئایەتەکەدا نەوتراوە، واتە: ئەگەر ئەوەت بدیایە شتێکی سەیرت ئەدی کە چۆن ئەو کافرانە بە سەرشۆڕی لە حوزووری خوادا وەستاون.

(١٣) ئەگەر مەیلمان لێ بوایە هیدایەتی هەموو کەسێکمان ئەدا بێتە سەر ڕێی ڕاست و موسوڵمان ببێ و نەمانئەهێشت کەس بە کافری بمرێ. واتە: ئەگەر ئەو کافرانە بگێڕینەوە بۆ دنیا تا موسوڵمان ببن، خۆ هەر لە سەرەتاوە هەموو کەسێکمان هیدایەتی ئەداو ئەمانهێنایە سەر ڕێگای ئیسلامەتی، بەڵام ئێمە ڕێی چاکەو خراپەمان ڕوون کردووەتەوە بۆ خەڵك و ئیتر خەڵك خۆیان بڕیار ئەدەن کام ڕێگا ئەگرنەبەرو، من بڕیاری خۆم [داوه] دۆزەخ پڕئەکەم لە جنۆکەو ئادەمزادی بێباوەڕ بەگوێرەی ئەو ڕێگایەی ئەوان بۆ خۆیانیان هەڵبژاردووە.

(١٤) دەسا بەهۆی ئەوەوە کە گەیشتن بەم ڕۆژەتانتان فەرامۆش کرد، تاڵیی دۆزەخ بچێژن. ئێمەیش ئێوەمان لە [بی]رچوەتەوەو کەواتە سزای نەبڕاوەو پایەدار بچێژن بەرانبەر بەو کردەوانەی لە دنیادا ئەتانکردن.

(١٥) تەنها ئەو کەسانە باوەڕیان بە ئێمە هەیە کەوا ئەگەر ئەو ئایەتانەیان بخرێنەوە یاد و ئامۆژگارییان بکرێ [پ]ێیان، بەڕوودا ئەکەون و سوجدە ئەبەن و سەناو ستایشی خوای خۆیان ئەکەن و خۆیان بەگەورە نازانن تا لە فەرمانی [خ]وا بەلەسە بن و ئیمان نەهێنن و فەرمانبەرداریی ئەمری خوا نەکەن.

(١٦) لاتەنیشتیان لە شوێنی نووستنی شەویان بەرز ئەبێتەوە واتە بەشەو ڕاست ئەبنەوە بۆ خواپەرستی و لە ترسی [س]زای دۆزەخ و، بە هیواو تەماعی نیعمەتی بەهەشت لە خوای خۆیان ئەپاڕێنەوەو خوا چیی دابنێ لێی خەرج ئەکەن [ل]ەڕێی ئەودا. (١٧) هیچ یەکێ لەوانە نازانێ لەپاداشی ئەو کردارە چاکانەدا لەم دنیادا ئەیانکردن، چیی بەبێ [ئ]اگاداریی خۆی بۆ ئامادە کراوە لەو دنیادا لەو شتانەی چاویان لە خۆشییانا پێ فێنك ئەبێتەوە.

(١٨) کە سزای بێ باوەڕان ئەوە بێ کە وتمان و پاداشی ئیمانداران و چاکەکەران ئەوەبێ کە وتمان، ئەوەی باوەڕی بووە وەك ئەوە وایە کە گوناهبارو لەخوانەترس بووە؟ دیارە وەك یەك نین و لە یەك ئاستدا نین.

(١٩) هەرچی ئەوانەن کە باوەڕیان بووەو چاکەیان کردووە، ئەوانە بەهەشتی (جنة المأوى) یان بۆ هەیە کە بۆ هەمیشە [ت]یا ئەژین و ئەمێننەوە وەك شوێنی بۆ ئامادەکراویان لە پاداشی ئەو کارە باشانەدا ئەیانکردن.

(٢٠) هەرچی ئەوانەیشن کە فاسق و گوناهبار بوون و باوەڕیان بە خوا نەبووە، ئەو مەڵبەندەی تیا ئەگیرسێنەوە [ئ]اگری دۆزەخە، هەرچەند بییانەوێ لێی دەرچنە دەرەوە ئەهێنرێنەوە ناوی و پێیان ئەوترێ: ئەو ئازارو سزای ئاگری دۆزەخە بچێژن و نۆشی بکەن کە بە درۆتان دائەناو ئینکارتان ئەکرد و باوەڕتان پێی نەبوو!

وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآۚ إِنَّا مِنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآئِهِۦۖ وَجَعَلۡنَٰهُ هُدٗى لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾ أَوَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍۚ أَفَلَا يَسۡمَعُونَ ﴿٢٦﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا نَسُوقُ ٱلۡمَآءَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡجُرُزِ فَنُخۡرِجُ بِهِۦ زَرۡعٗا تَأۡكُلُ مِنۡهُ أَنۡعَٰمُهُمۡ وَأَنفُسُهُمۡۚ أَفَلَا يُبۡصِرُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡفَتۡحُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٢٨﴾ قُلۡ يَوۡمَ ٱلۡفَتۡحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِيمَٰنُهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَٱنتَظِرۡ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾

## سُورَةُ الأَحۡزَابِ

ترتيبها ٣٣ — آياتها ٧٣



(٢١) ئێمە بەڕاستی لە دنیادا هەندێ ئازاری سووك، ئازاری قورس نا، بەو بێ باوەڕانە ئەچێژین بەڵكو بیرێ لە حاڵی خۆیان بكەنەوەو لە بێباوەڕیی خۆیان بكشێنەوەو پەشیمان ببنەوە.

(٢٢) كێ لەو كەسە ستەمكارترە كە ئامۆژگاریی كرابێ بە ئایەتەكانی خواو پاشان پشتی لەو ئایەتانەی خوا هەڵكردبێ و گوێی نەدابنێ؟ ئێمە بەڕاستی تۆڵە لە تاوانباران ئەسێنینەوە.

(٢٣) ئێمە بەڕاستی كتێبمان داوە بە مووسا كە تەوراتە. تۆیش هیچ گومانت لەوەدا نەبێ كە گەیشتووی بە كتێبێكی وا كە قورئانە و، ئەو كتێبەی مووسامان كردبوو بە مایەی هیدایەت و ڕێدەركردنی بەنی ئیسرائیل.

(٢٤) چەندین پێشەوای ئایینمان لە بەنی ئیسرائیلییەكان دروست كرد كە پێغەمبەرەكانیانن و بە فەرمانی ئێمە ڕێیان پیشانی خەڵك ئەدا كاتێ كە خۆیان لە بەرانبەری دەرد و ئازاری دوژمنانی خوادا ڕاگرت و نامەی خوایان بە خەڵك ئەگەیاندو متمانەیان بە ئایەتەكانی ئێمە هەبوو.

(٢٥) خوای تۆ فەسڵ ئەكا لە نێوان ئەو پێغەمبەرانەی بەنی ئیسرائیل و ئەو خەڵكانەدا كە خوا ئەو پێغەمبەرانەی ناردبووە سەریان بۆ ڕێپیشاندانیان، لە بارەی ئەو مەسەلانەوە كە ئیختلافیان لەناوا هەبوو تیایاندا.

(٢٦) ئایا ئەو كافرانە شارەزا ناكا بۆ ناسینی خوا ئەوە كە ئێمە بەر لەوان خەڵكی چەندین چەرخمان فەوتاندو لەناوبرد كە ئێستا ئەمانە لە هاتوچووی بازرگانیی ڕێگای شامیاندا بەناو نشینگەكانی ئەوانا ئەڕۆن؟ ئەو ڕووداوە چەندین نیشانەی بۆ خوایەتیی خوا تیایە، دەی ئەوانە هێشتا هەر نابیسن؟

(٢٧) ئایا ئەو كافرانە نابینن ئێمە باران ئەنێرینە سەر عەردی گیالێبڕاوو بەو بارانە گژوگیا ئەڕوێنین و لە عەردی دەرئەكەین و ئاژەڵ و چوارپێ و ڕەشەوڵاخیان و خۆیشیان لەو گژوگیایە ئەخۆن؟ ئایا ئەمانە سەیرناكەن و نابینن؟

(٢٨) كافران ئەڵێن: ئەو ڕۆژە كەی ئەبێ كە خوا موسوڵمانان زاڵ ئەكا بەسەر كافرانا ئەگەر ئێوە ڕاست ئەكەن و زاڵ ئەبن بەسەرمانا؟

(٢٩) تۆیش، ئەی موحەممەد! لە وەڵاما پێیان بڵێ: لە ڕۆژی زاڵبوونی موسوڵمانان بەسەر كافرانا كە ڕۆژی قیامەتە بەتەواوی دەرئەكەوێ باوەڕ سەركەوتووەو بێباوەڕی دۆڕاندوویەتی. كافران ئەگەر لەو ڕۆژەدا ئیمانیش بێنن ئیمانەكەیان هیچ سوودێكی نابێ بۆیان و مۆڵەتی هیچیشیان نادرێ، هەر كە لێپرسینەوە تەواو بوو پاڵیان پێوە ئەنرێ بۆ ناو دۆزەخ.

(٣٠) كەواتە خۆتیان لێ لابدەو گوێیان مەدەرێ كە باوەڕ بە پێغەمبەرایەتیت ناكەن و، چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بە كە زاڵ ئەبی بەسەریانا. ئەوانیش بۆ خۆیان چاوەڕوانی ئەوەن زاڵ بن بەسەر تۆدا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٣﴾ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدْعُوهُمْ لِءَابَآئِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ۗ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾



## سوورەتی (الأحزاب)

**مەدینەیی‌یەو، (٧٣) ئایەتە**

(١) ئەی پێغەمبەری خوا! لە خوا بترسەو بە گوێی کافرەکانی مەککەو مونافقە دووڕووەکانی مەدینە مەکە، بێ‌گومان خوا بە هەموو شتێ ئەزانێ و خاوەن حیکمەتە.

(٢) شوێنی ئەو قورئانە بکەوە کە بە وەحی لە خواوە دێ بۆت، بەڕاستی خوا ئاگادارە لە هەر کارێ کە ئەیکەن.

(٣) پشت بە خوا ببەستەو بەو پشت ئەستوور بە. خوا بەسە بۆ پاڵ پێوەدان و پشت پێ بەستن.

(٤) خوا لە سنگی هیچ کەسێکا دوو دڵی دانەناوەو، ئەو ژنانەتان کە (ظیهار)یان لەگەڵ ئەکەن و لە جێگەی دایکی خۆتانیان دائەنێن و پێیان ئەڵێن: تۆ لەجێی دایکمی، خوا ئەو ژنانەتانی نەکردووە بە دایکتان. دایکتان ئەوانەن ئێوەیان لێ بوون، ئەو کەسانەیش کە ئێوە بەقسە کردووتانن بە کوڕی خۆتان، خوا نەیکردوون بە کوڕتان، چونکە کوڕی ئێوە ئەو نێرینانەن لە بەیەکگەیشتنی ئێوەو ژنتان پەیدا بوون. ئەم بەکوڕیخۆکردنی منداڵی خەڵکە تەنها قسەی دەمتانە. خوا قسەی ڕاست ئەکاو ڕێگەی ڕاستتان پیشان ئەدا.

(٥) ئەو کوڕانە بە ناوی باوکی خۆیانەوە بانگ بکەن، ئەوە ڕاستترو عەدالەتترە لای خوا. خۆ ئەگەر نازانن کوڕی کێن‌و باوکیان کێیە، ئەوا برای دینیتانن و دۆست و برادەرتانن و تاوانبار نابن لەسەر وشەیەکی لەم بابەتە بەهەڵە بەدەمتانا بێ، بەڵام لەسەر ئەوە تاوانبار ئەبن کە بە دەسەنقەست و بە ئارەزووی دڵ بیڵێن و، خوا بەخشندەو بەڕەحمە.

(٦) پێغەمبەر باشترو بەسوودترە بۆ موسوڵمانان لە خودی خۆیان چونکە هەرگیز فەرمانیان بەکاری خراپ پێ نادا، بەڵام خۆیان گەلێ جار ڕێگەی چەوت بۆ خۆیان هەڵئەبژێرن. ژنەکانیشی وەك دایکی موسوڵمانان وان و، ئەوانەی خزمایەتییان لە نێوانا هەیە هەندێکیان شایانترن لە هەندێکیان بە پێی کتێبی خوا بۆ میرات لەیەك وەرگرتن لە موسوڵمانانی تر و لەوانەی لە مەککەوە کۆچیان کردووە بۆ مەدینە، مەگەر ئێوە خۆتان لە ژیانتانا بتانەوێ چاکەیەك لەگەڵ دۆستانتان بکەن و وەسیەت بکەن کەوا پاش مردنتان ئەوەندە لە پاشماوەتان بدەن بە فلان کەس. ئەمە لە کتێبی خوادا نووسراوە کە قورئان یاخود لەوحولمەحفووزە.

وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ
وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾
لِّيَسْأَلَ الصَّادِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ۚ وَأَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا
﴿٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ
جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ اللَّهُ
بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَاءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ
مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ
وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا
زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم
مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّائِفَةٌ
مِّنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا ۚ وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ
مِّنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا
فِرَارًا ﴿١٣﴾ وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ
لَآتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَا إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا
اللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ الْأَدْبَارَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ اللَّهِ مَسْئُولًا ﴿١٥﴾



(٧) یادی ئەوە بکە کە عەهدو پەیمانمان لە پێغەمبەران وەرگرت کەوا ئەو پەیامەی خوا لە ئەستۆی هەموویانی داناوە بە خەڵکی بگەیەنن و، لە تۆیشمان وەرگرت و لە نووح و لە ئیبراهیم و لە مووساو لە عیسای کوڕی مەریەمیشمان وەرگرت و، پەیمانێکی توندو سەختمان لێ وەرگرتن.

(٨) بۆیە ئەم پەیمانەمان لە هەموان وەرگرت تا خوا لە ڕۆژی قیامەتا لە ڕاستگۆیان بپرسێ لە بارەی ڕاستییانەوە و، سزایەکی پڕ ئازاریشی بۆ کافران ئامادە کردووە.

(٩) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەری خوا! باسی نیعمەتی خوا بکەن بەسەرتانەوە کاتێ کە لەشکری دوژمن هاتە سەرتان و ئێمەیش ڕەشەبایەکمان هەڵکرد بۆ سەریان و سەربازگەلێکمان نارده سەریان کە ئێوە نەتاننەبینین و، هەرچییەکی ئێوە نەتانکرد خوا هەمووی ئەبینی.

(١٠) کاتێ کە ئەو لەشکرە لە لای سەرووتانەوەو لە پێیینتانەوە هاتنە سەرتان و چاوان ئەبڵەق بوون و دڵان لەترسا کەوتنە تەپە تەپ و بەرزبوونەوە بۆ پێیینی قوڕگ و جۆرەها گومانتان بە خوا ئەبرد کە پشتی لێ هەڵکردوون و نایەت بەفریاتانەوە. .

(١١) ئا لەویادا خاوەن ئیمانەکان کەوتنە بەر تاقیکردنەوە تا دەرکەوێ کامیان ئیمانی دامەزراوەو کامیان ئیمانی لەقەو کەوتنە تەکانێکی زۆر توندەوە لەبەر زۆریی ئەو ترسەی دڵی داگرتبوون؟

(١٢) ئا لەویادا مونافقە دووڕووەکان و دڵکرمێبووەکان کە دڵیان بە دەردی کەمباوەڕی گرفتار بوو ئەیانوت: خواو پێغەمبەر لە گفتی هیچو پووچ بەولاوەیان نەداوینێ.

(١٣) کاتێکیش کە تاقمێ لە منافقە دووڕووەکان ئەیانوت: ئەی خەڵکی شاری یەثریب (کە ناوی شاری مەدینە بووە)! مەیدانی خۆڕاگرتنتان نییە بەرانبەر بەم لەشکرە. کەواتە بگەڕێنەوەو شەڕ مەکەن و، هەندێکیان داوای ڕوخسەت لە پێغەمبەر ئەکەن و ئەڵێن:ماڵمان چۆڵ و لەبەرچاوەو لەڕاستیشا چۆڵ و لەبەر چاو نییە، بەڵام هەر ئەوەیان ئەوێ کە هەڵبێن.

(١٤) ئەگەر لە چوار دەوری شاری مەدینەوە لەشکر بهێنرایەتە سەریان بۆ ناوشارو داوایان لێ بکرایە کە پاشگەز ببنەوە لە موسوڵمانەتی و بگەڕێنەوە بۆ کافری وایان ئەکردو داواکەیان جێبەجێ ئەکرد و ماوەیەکی کەم نەبێ ماتڵ نەئەبوون و خۆیان ڕانەئەگرت.

(١٥) پێشتریش ئەو مونافقە ئیمان لەقانە پەیمانیان بە خوا دابوو کە هەرگیز پشت پێ هەڵنەکەن و، پەیمانێ بە خوا درابێ ئینسان لە ئاستیا لێی ئەپرسرێتەوە.

قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلۡفِرَارُ إِن فَرَرۡتُم مِّنَ ٱلۡمَوۡتِ أَوِ ٱلۡقَتۡلِ وَإِذٗا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٦﴾ قُلۡ مَن ذَا ٱلَّذِي يَعۡصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَ بِكُمۡ سُوٓءًا أَوۡ أَرَادَ بِكُمۡ رَحۡمَةٗۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٧﴾ ۞ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلۡمُعَوِّقِينَ مِنكُمۡ وَٱلۡقَآئِلِينَ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ هَلُمَّ إِلَيۡنَاۖ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلۡبَأۡسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيۡكُمۡۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلۡخَوۡفُ رَأَيۡتَهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ تَدُورُ أَعۡيُنُهُمۡ كَٱلَّذِي يُغۡشَىٰ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلۡخَوۡفُ سَلَقُوكُم بِأَلۡسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلۡخَيۡرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يُؤۡمِنُواْ فَأَحۡبَطَ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿١٩﴾ يَحۡسَبُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ لَمۡ يَذۡهَبُواْۖ وَإِن يَأۡتِ ٱلۡأَحۡزَابُ يَوَدُّواْ لَوۡ أَنَّهُم بَادُونَ فِي ٱلۡأَعۡرَابِ يَسۡـَٔلُونَ عَنۡ أَنۢبَآئِكُمۡۖ وَلَوۡ كَانُواْ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓاْ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٢٠﴾ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنٗا وَتَسۡلِيمٗا ﴿٢٢﴾



(١٦) ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە لە مردن یا لە کوژران هەڵبێن ئەو هەڵاتنەتان هیچ سوودێکی نابێ بۆتان، چونکە ئەگەر بیشڵێین بەو هەڵاتنەتان لە مردن یا لە کوژران لە مەیدانی جەنگا ڕزگارتان ببێ، بۆ ماوەیەکی کەم نەبێ خۆشی لەو مانەوەیەتان نابینن و سەرەنجام هەر ئەمرن.

(١٧) تۆ، ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: کێ لە دەستی خواتان دەرباز ئەکا ئەگەر نیازی ئازاردانتانی ببێ یا بییەوێ ڕەحمتان پێ بکا؟ ئەو بێباوەڕانەی لە مەیدانی جەنگ هەڵدێن دۆستێك و یارمەتیدەرێکیان دەستگیر نابێ ڕزگاریان بکا لە دەستی قودرەت و توانایی خوا.

(١٨) بەڕاستی خوا بەو کەسانە ئەزانێ کە ئەبن بە کۆسپی ڕێگای خەڵك بۆ چوونە غەزا و، بەو کەسانەیش ئەزانێ کە بە دۆست و برادەرەکانیان ئەڵێن: مەچن بۆ غەزاو وەرن بۆ لای ئێمەو بۆخۆیان کەمێ نەبێ ناچنە مەیدانی جەنگەوە.

(١٩) ئەوانە کە زۆر ڕژدن لە یارمەتیدانتانا، کە ترسێکیشیان دێتەبەر ئەیانبینی سەیرت ئەکەن و چاوەکانیان لە کاسە چاویانا ئەخولێتەوە وەك کەسێ لە حاڵی گیانەڵادا سامی مەرگ دایگرتبێ. کە ترسەکەیشیان نەماو ڕەوییەوە، زمانتان لێ ئەکێشن و ئەکەونە قسەی بێ شەرم و شکۆ بەرانبەرتان. ئەمانە لەئاستی هەر کارێکی چاکەدا ڕژدو چرووکن و هیچیان لێ ناوەشێتەوە. ئەمانە ئیمانیان نەهێناوەو خوا کرداری مایەپووچ کردوون و، ئەم مایەپووچکردنەی کرداریشیان کارێکی ئاسانە بۆ خوا.

(٢٠) ئەم منافقە ئیمان لەقانە وا ئەزانن ئەحزابەکان کە هاتبوونە سەر موسوڵمانان بۆ مەدینە هێشتا بە دەوروبەری شارا ماون و نەڕۆیشتوون، لەبەر ئەوە هەڵاتبوون بۆ ناو شار تا خۆیان لەبەرچاو ون بکەن و، ئەگەر ئەحزابەکان جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ سەر مەدینە، حەز ئەکەن دەرچن و لە دەرەوەی شار بن لەناو دەشتەکییەکانا، هەرکەسێ لە شارەوە هات هەواڵی ئێوەی لێ بپرسن ئاخۆ خۆتان پێ ڕاگیرکراوە یا شکاون. ئەگەر لەناویشتانا بوونایە کەمێ نەبێ، ئەویش لە شەرما، هیچ شەڕیان نەئەکرد.

(٢١) بەڕاستی لە بوونی پێغەمبەری خوادا چاولێکەری و شوێنکەوتنێکی جوان هەیە بۆ ئەو کەسانەی بەهیوای گەیشتن بە حوزووری خواو پاداشی ڕۆژی قیامەتن و زۆرجار ناوی خوا دێنن و یادی ئەکەنەوە. واتە: ئەوانەی شوێنی خوو و ڕەوشتی پێغەمبەر ئەکەون، پیرۆزیی دنیاو قیامەتیان دەسگیر ئەبێ.

(٢٢) بەڵام موسوڵمانە خاوەن باوەڕەکان کاتێ کە تاقمەکانی کافرەکانیان دی، وتیان: ئەم هێرشی کافرانە بۆ سەرمانو ئەم شەڕە کە دەرگای پێ گرتووین، ئەوەیە کەخواو پێغەمبەر گفتیان دابووینێ کە فەرموویان: ڕۆژی وەك ئەم ڕۆژەتان دێتە ڕێ و هەرکەسێ خۆی ڕابگرێ و ئیمانی نەلەقێ خوا سەری ئەخاو لە قیامەتیشا پاداشی چاکی ئەداتەوەو، خواو پێغەمبەری خوا ڕاستیان بە موسوڵمانان وتبوو و موسوڵمانانیش لە باوەڕ زیادبوون بە فەرموودەی خواو پێغەمبەر و لە ڕەزامەندی بە فەرموودەی ئەوان بەولاوە هیچیان لەو ڕۆژە پڕ تەنگوچەڵەمەدا زیاد نەکرد. واتە ئەو هاتنەدییەی فەرموودەی خواو پێغەمبەرو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هێرش و هاتنی کافرانە هیچ ورەی پێ بەرنەدانو، بە پێچەوانەوە باوەڕیانی بە هەرچی کە خواو پێغەمبەری خوا بیفەرموون، زیاتر کرد.

مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّـٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَـٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَـٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ يَـٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَـٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾



(٢٣) لەناو موسوڵمانانا پیاوانێ هەن ڕاستیان کردووە لەو گفتەدا کە بەخواو بە پێغەمبەری خوایان داوە. جا هیی وایان هەیە بەو عەهدو پەیمانەوە مردوون وەك ئەو هاوڕێیانەی پێغەمبەر کە لە غەزای ئوحودا شەهید کران و، هیی واشیان هەیە ماون و چاوەڕێی ئەو ڕۆژەن لە ڕێی خوادا شەهید ئەکرێن و عەهدو پەیمانی خۆیان نەگۆڕیوە بە گۆڕین.

(٢٤) بۆیە هەڵوێستی موسوڵمانانی ڕاست و هەڵوێستی مونافقەکان بەو جۆرە بوو کە باس کرا، تا خوا پاداشی ئەوانە بداتەوە کە بە ڕاستی خاوەن باوەڕبوون و، ئەگەر ئارەزووی لێ بوو سزای منافقەکانیش بدا یا لێیان خۆش ببێ. خوا بەخشندەو بەڕەحمە.

(٢٥) خوایش کافرەکانی بە داخ و دەردەدڵ و ڕق و کینەی خۆیانەوە گێڕایەوە بۆ شوێنی خۆیان و پاشەکشەی پێ کردن کە هاتبوون ئەو هەموو داخەی لە دڵیانا بوو بە موسوڵمانانی بڕێژن و تۆڵەی بەرودوایان لێ بکەنەوە. هیچ خێر و بێرێکیان لەو هێرشەیاندا دەسگیر نەبوو و خوا شەڕی لە موسوڵمانان لادا. خوا بەهێزو خاوەن عیززەتە هەموو شتێکی پێ ئەکرێ.

(٢٦) ئەو جوولەکانەیش کە پشتی کافرە هێرشهاوردووەکانیان گرتبوو کە جوولەکەی بەنی قورەیزە بوون خوا لەناو قەڵاکانی خۆیانی هێنانە خوارەوەو ترسی ئێوەی خستە دڵیانەوەو خۆیان دا بە دەستتانەوە: تاقمێکتان لێ ئەکوشتن و، تاقمێکتان لێ بەدیل ئەگرتن.

(٢٧) زەویوزارو باخوباخات و قەڵاو دارایی و حەیواناتی ئەوان و وڵاتێ کە هێشتا پێتان تێنەنابوو هەمووی دا بە ئێوە وەك میرات کە لە مردوو ئەمێنێتەوە بۆ میراتگرو، خوا توانایە بۆ کردنی هەموو شتێ.

(٢٨) ئەی پێغەمبەری خوا! بە ژنەکانت بڵێ: ئەگەر ئێوە ژیانی ئەم دنیایەو شتی جوانی ئەم دنیایەتان ئەوێ وەك جلوبەرگی جوان و زێڕ و زیو، بێن حەقی موتعەو لەگەڵ ڕابواردنی خۆتانتان بدەمێ کە لەسەرمەو بە جوانی بەرەڵاتان بکەم، واتە: ئەگەر لە دووی خۆشیی دنیا ئەگەڕێن و بە ژیان لەگەڵ من ڕازی نین، بێن با تەڵاقتان بدەم و مارەیی خۆتانتان بدەمێ.

(٢٩) ئەگەر خواو پێغەمبەر و ماڵی ڕۆژی دواییشتان ئەوێ کە ڕۆژی قیامەتە، ئەوا خوا پاداشێکی مەزنی بۆ چاکەکەرانی ئێوە ئامادە کردووە.

(٣٠) ئەی ژنەکانی پێغەمبەر! هەرکامێ لە ئێوە کردەوەیەکی خراپی شەرماوەر بکا کە خراپی و شەرماوەری لای خەڵك دیاربێ، ئەوە سزای بۆ دووقات ئەکرێتەوە و، ئەمە کارێکی ئاسانە بۆ خوا.

۞ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾



## جوزئی بیستودووهەم

(٣١) هەرکەسێکیش لە ئێوە بەردەوام خەریکی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەری خوابیو کاری چاك بکا پاداشی خۆی دوو جار ئەدەینێ، جارێکیان لەسەر ئەوە کە فەرمانبەرداری خوا ئەکات و جارێکیشیان لەسەر ئەوە کە هاورێیەتیی پێغەمبەری بۆ خۆی هەڵبژاردووە و، ڕۆزییەکی پڕقەدرو حورمەتیشمان لە بەهەشتا بۆ ئامادە کردووە.

(٣٢) ئەی ژنەکانی پێغەمبەر! ئێوە وەك هیچ ژنێکی تر نین، ئەگەر لەخوا ئەترسن دەنگتان ناسك مەکەنەوە تا ئەوکەسانەی دڵیان نەخۆشە تەماعی خەیاڵی نارەواتان تێ بکاو، قسەیێ بکەن جوان بیو گومانی خراپی لێ نەکرێ.

(٣٣) لە ماڵی خۆتانا بە حەیاو حورمەتی خۆتانەوە دانیشن و وەك ژنانی سەردەمی نەزانیی پێش هاتنی ئیسلام خۆتان دەرمەخەن و نوێژەکانتان بکەن و زەکاتی ماڵتان بدەن و فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەری خوا بکەن. خوا ئەوەی ئەوێ هەموو چڵك و چەپەڵییەکی گوناهتان لێ دوور بخاتەوەو لابدا، ئەی دانیشتووانی ماڵی پێغەمبەرو، لە هەر بیرو کردەوەیەکی ناپەسەند خاوێنتان بکاتەوە.

(٣٤) باسی ئەو شتانە بکەن کە لە ماڵەکانتانا ئەخوێنرێنەوە لە ئایەتی خواو حیکمەت و فەرموودەی پێغەمبەر، خوا بە لوتفەو ئاگادارە لێتان.

(٣٥) بێ گومان ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی فەرموودەی خوا جێ بەجێ ئەکەن و، ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەرو بەشەکانی تری باوەڕ هەیە و، ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی لەسەر فەرمانبەرداریی خوا بەردەوامن و، ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی لە گوفتارو لەکردارا ڕاستن و، ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی خۆیان ئەگرن لە فەرمانبەرداری خواو دوورکەوتنەوە لە گوناه و، ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی ملکەچی فەرمانبەرداری خوان و، ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی زەکات ئەدەن و خێرو حەسەنات ئەکەن و، ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی ڕۆژوو ئەگرن و، ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی عەورەتی خۆیان ئەپارێزن لە حەرام و، ئەو پیاوانەو ئەو ژنانەی ناوی خوا زۆر ئەبەن و یادی ئەکەن، ئەوانە خوا لە گوناهیان خۆش بووەو پاداشێکی گەورەی بۆ ئامادە کردوون.

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾



(٣٦) ڕەوا نییە بۆ هیچ پیاوێكی خاوەن باوەڕی ئیسلامەتیو بۆ هیچ ژنێكی خاوەن باوەڕی ئیسلامەتی كاتێ كە خواو پێغەمبەری خوا فەرمانیان دا بە كارێ، بەئارەزووی خۆیان بجوولێنەوە لەو كارەداو كاریان بە ئارەزووی خۆیان بێ. هەركەسیش سەرپێچی لە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بكا ئەوە بە گومڕاهییەكی زۆر ئاشكرا گومڕا بووە.
(٣٧) یادی ئەوە بكەرەوە كە ئەتوت بەو كەسەی خوا نیعمەتی ئیسلامەتیی پێ بەخشیبوو و تۆیش نیعمەتی ئازادیت دابوویەو لە بەندەییت ئازاد كردبوو و، پێش سەردەمی ئیسلامەتی كردبووت بە كوڕی خۆت، پێت ئەوت: ژنەكەت بهێڵەوە بۆ خۆت و تەڵاقی مەدەو لە خوا بترسەو خەیاڵێكیشت لەدڵی خۆتا ئەشاردەوە كەخوا دەریخست و، لە خەڵك ئەترسایو شەرمت ئەكرد خەیاڵەكەی دڵت دەرخەی، كە ئەوە بوو ئەگەر ئەو پیاوە ژنەكەی تەڵاق دا تۆ مارەی ئەكەیت بۆ خۆت و، خوا لە هەركەس شایانترە بەوە كە لێی بترسی. جا كاتێ كە ئەو كەسە، كە زەیدی كوڕی حاریثە بوو، پێویستیی خۆی لە ژنەكەی بەجێهێناو لێی بێزار بوو و كاری پێ نەماو تەڵاقیداو عیددەی بەسەرچوو، ئێمە مارەمان بڕی لێت بۆ ئەوەی هیچ تاوانێ ڕوو نەكاتە موسوڵمانان لە مارەكردنی ژنی كوڕی بەخۆیەكوڕكردوویانا بۆخۆیان پاش ئەوەی مێردەكانیان كاریان پێیان نەماو تەڵاقیان دان، كە واتە لە ڕاستیدا كوڕیانن نین و هەربەدەم كردوویان بە كوڕی خۆیان بەر لەوەی منالّی خەڵك بە منالّیخۆكردن لە ئایینی ئیسلاما حەرام بكرێ. فەرمانی خوا هەرچۆنێ بوو بیو هەرچۆن بێ، بێگومان جێ بەجێ كراوو هاتوەدییەو كەس ناتوانێ بەری لێ بگرێ. (٣٨) هیچ سووچ و تاوانێ لەسەر پێغەمبەر نەبووەو نییە لە بەجێهێنانی كارێكا كە خوا بڕیاری داوە بۆیو خودا خۆی كردوویەتی وەك مارەبڕینی زەینەب لە پێغەمبەرو وەرگرتنی لەلایەن پێغەمبەرەوە وەك ژنی خۆی. ئەمە قانوونی خوایە لەو پێغەمبەرانەیشا كە لەمەوپێش بوون و بەسەر چوون و، خوا فەرمانی هەر كارێكی بەوانیش دابێ جێبەجێیان كردووەو كاری خوا كردوو بڕیارێ بووە دراوەو جێبەجێ كراوە. (٣٩) ئەو پێغەمبەرانەی نامەی خوا ئەگەیەنن بە مرۆڤایەتیو لەخوائەترسن و لەخوا بەولاوە لە كەس ناترسن و خوا بەتەنها بەسە بۆ سەرپەرشتی كردنی كاروباری هەموان.
(٤٠) موحەممەد باوكی هیچ یەكێ لە پیاوانی ئێوە نەبووە نە زەیدو نە غەیری زەید، بەڵام پێغەمبەری خواو دوا پێغەمبەری خوایەو خوا بە هەموو شتێكی زانیوەو ئەزانێ. (٤١) ئەی ئەو كەسانەی كە ئیمانتان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەری خوا! ناوی خوا بە زۆری بهێنن و زۆر زۆر بڵێن (یاألله، یاألله ).
(٤٢) بە بەیانیو ئێوارەیش تەسبیحاتی بۆ بكەن و بڵێن: ( سبحان الله.. سبحان الله) واتە: خوا لە هەموو خەوش وناتەواییەك خاوێن و بێگەردە.
(٤٣) خوا ئەو خوایە كە خۆیو فریشتەكانی سەڵاواتتان لێئەدەن: خوا خۆی ڕەحمەت ئەڕێژێ بەسەرتاناو فریشتەكانی داوای لێبووردنتان بۆ ئەكەن لە خوا بۆ ئەوەی لە تاریكستانی نەزانیو نەفامیو كوفرو گوناە دەرتان كاو بتانخاتە ڕووناكاییی شوێنكەوتنی ئایینی ئیسلام و، خوا بەڕەحمە لەئاست موسوڵمانانی خاوەن باوەڕدا .

تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٠﴾



(٤٤) قەدرگرتن لە موسوڵمانان لەو ڕۆژەدا کە ئەگەنە حوزووری خوا بەوەیە کە سەلامیان لێ ئەکرێ وخوا پاداشێکی وای بۆ ئامادە کردوون کە نیشانەی بەدەست و دەهەندەیی خوایە کە ئەویش بەهەشتی بەرینە .

(٤٥) ئەی پێغەمبەر! بەڕاستی ئێمە تۆمان ناردووە بۆ سەر خەڵك بۆ ئەوەی شاهیدو ئاگادار بی لەسەر ئەوزاعیان: کێ فەرمانبەرداریی خوا ئەکاو کێ نایکا و، بۆ ئەوەی مژدە بدەی بە فەرمانبەجێهاوەران کەوا ئەچنە بەهەشت، سەرپێچی کەرانیش بترسێنی بەئاگری دۆزەخ.

(٤٦) کردوویشمانی بە بانگکەری خەڵك بۆ لای خوا بەناسانکردنی کارت لە لایەن خواوە خۆیەوەو کردوومانی بە چرایەکی ڕوونکەرەوەی ڕێگای خەڵك.

(٤٧) مژدەیش بدە بەوانەی باوەڕیان بە پێغەمبەر هەیە کە بەڕاستی گەورەییەکی مەزنیان لە لایەن خواوە بۆ هەیە بەرانبەر بەو کردەوە باشانەی ئەیانکەن.

(٤٨) بەگوێی کافرەکان و منافقەکانیش مەکەو گوێ مەدە بەوە کە ئازارت ئەدەن و پشت بەخوا ببەستە، خوا بەتەنها خۆی بەسە بۆ پشت پێ بەستن.

(٤٩) ئەی خاوەن باوەڕەکان! ئەگەر ژنی خاوەن باوەڕی وەك خۆتانتان مارەکردو پاشان بەرلەوەی توخنیان بکەون تەڵاقتان دان ئەوە مافی هیچ عیددە بەسەرچوونێکتان بەسەریانەوە نییە پێیان بەسەربەرن، واتە: ئەو ژنانە ئەتوانن هەر دوای تەڵاقدانەکەیان شووبکەن چونکە ئێوە نەچوونەتە لایان و لەوانە نییە دووگیان بووبن لێتان، کەواتە دڵیان خۆش بکەن بەوە کە نیوەی مارەییەکەیان بدەنێ‌و بە شێوەیەکی جوان و شیرین بەرەڵلایان بکەن بڕۆن بەرێی خۆیانەوە.

(٥٠) ئەی پێغەمبەر! ئێمە ئەو ژنانەتمان بۆ حەڵاڵ کردووی کە مارەیی خۆیانت داونێ‌و ئەو کەنیزەکانەی کە موڵکی خۆتن لەوانەی خوا بە قانوونی فەیْ داونی پێت کە ئەو ئافرەتە دیلانەی جەنگی کافرانن کە بەرت کەوتوون، هەروا کچانی مامت و پووری خوشکی باوکت و کچانی خاڵت و پووری خوشکی دایکت کە لە مەککەوە کۆچیان لەگەڵت کردووە بۆ مەدینە و، هەر ژنێکی موسوڵمانیش کە خۆی بەخشیبێ بە پێغەمبەر ئەگەر پێغەمبەر مەیلی لێ بێ بیکا بەهاوسەری خۆی و، ئەمەی دوایی تایبەتیی خۆتەو بۆ موسوڵمانانی تر نییە. ئێمە ئاگادارین لەو حوکمانەی فەرزمان کردوون لەسەر موسوڵمانان لە بارەی ژن هێنانیانەوەو چۆن ژن ئەهێنن و کێیان بۆ حەڵاڵەو کێیان لێ حەرامەو، هەروا لەبارەی ئەو کەنیزەکانەوە کە هەیانن. ئەم بەیاناتەیشمان بۆیە نازڵ کرد تا تەنگی‌و تێگیرانت لەبارەی کاروباری خێزانیی تایبەت بە خۆتەوە نەیەتە ڕێ .خوایش لێبووردووەو بەرەحمە .

۞ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ
مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ
وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ
مَا فِي قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ
ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ
حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ رَّقِيبًا
﴿٥٢﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن
يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ
فَٱدْخُلُوا۟ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ
ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا
يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن
وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ
لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ
مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن
تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾



(٥١) ئەم ژنانەی کردووتن بە هاوسەری خۆت هەرکامیانت ئارەزوو لێ بێ دووری ئەخەیت و لەگەڵی نانویت و، هەرکامیانت ئارەزوو لێ بێ ئەی هێنیتە لای خۆت و لەگەڵی ئەنویت و، هەر کامیشیانت ئارەزوو لێ بێ لەوانە وەلات خستوون هیچ تاوان و ناشەرعییەکی تیا نییە بۆت بیهێنیتەوە لای خۆت. ئەمەیش نزیکترە لەوەوە کە چاویان بە هاتنەوەلات فێنك ببێتەوەو دڵیان شادبیو خەفەت نەخۆن و ڕازی بن بەوەی تۆ بە هەموویانت داوە و، خوا ئەزانێ چی لەدڵتانایەو خوا زانایەو بە حیلم و حەوسەڵەیە.

(٥٢) لەمڕۆ بەدواوەو پاش ئەمانەی باسمان کردن هیچ ژنێکی ترت بۆ حەڵاڵ نییەو بۆیشت نییە بیانگۆڕیت بە ژنی تر، واتە یەکێك یا زیاتریان تەڵاق بدەیو لەباتیی ئەو ژنی تر بهێنی هەرچەند جوانییشیانت زۆر بەدڵ بێ، مەگەر ئەو کەنیزەکانەی ببن بە مولکی خۆت بە کڕین یا پێبەخشین یا بە دیلگرتن لە شەڕی کافرانا و، خوا ئاگای لە هەموو شتێکەو هیچی لێ ون نابێ. کەواتە لەو سنوورە لامەدە کە ئەو بۆی دیاری کردووی.

(٥٣) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هەیە! مەڕۆنە ناو ماڵەکانی پێغەمبەرەوە مەگەر ئیزنتان درابێ بۆ ئەوەی بڕۆن خۆراکێ بخۆن بەمەرجێ کە چوون خواردنەکە پێگەیشتبیو ئامادە بیو دانەنیشن چاوەڕوان بن پێ بگا، بەڵام کە بانگ کران و (فەرموون)تان لێکرا بڕۆنە ژوورەوە و، کە خواردنەکەیشتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن و مەمێننەوە شانی لێ دادەن بۆ قسەو گفتوگۆکردن. بێگومان ئەمە ئازاری دڵی پێغەمبەر ئەداو ئەویش شەرمتان لێ ئەکا پێتان بڵێ: فەرموون هەستن بڕۆن، بەڵام خوا شەرمی لێ نایەت قسەی ڕاست بکاو چی ڕاستە ئەوە بڵێ. ئەگەر داوای پێویستییەکیشتان لە ژنەکانی پێغەمبەر کرد، لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن نەك بەرەوڕوو، ئەوە پاکترو بێگەردترە بۆ دڵی ئێوەیش و دڵی ئەوانیش و، بۆ ئێوە ڕەوا نییە ئازاری دڵی پێغەمبەر بدەن یا پاش کۆچی دوایی کردنی یا پاش جوێ بوونەوەی لە یەکێ لە ژنەکانی، هەرگیز ژنی ئەو مارە بکەن بۆ خۆتان، کاری وا لای خوا تاوانێکی زۆر گەورەیە.

(٥٤) ئەگەر ئەوەی لە دڵتانایە دەری بخەن یا بیشارنەوە، لایخوا چونیەکە چونکە خوا بە هەموو شتێ ئەزانێ .

لَّا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي آبَائِهِنَّ وَلَا أَبْنَائِهِنَّ وَلَا إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ
إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ أَخَوَاتِهِنَّ وَلَا نِسَائِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ
أَيْمَانُهُنَّ ۗ وَاتَّقِينَ اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا
(٥٥) إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ ۚ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ
آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا (٥٦) إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ
اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا
مُّهِينًا (٥٧) وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ
بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا (٥٨)
يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ
عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ
اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا (٥٩) ۞ لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ
فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ
بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا (٦٠) مَّلْعُونِينَ ۖ
أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا (٦١) سُنَّةَ اللَّهِ فِي
الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا (٦٢)



(٥٥) هیچ تاوانێ نییە لەسەر ژنەکانی پێغەمبەر لە ڕووبەڕووبوونەوەی بێپەردەدا بۆ باوك و باپیرانیان، یا بۆ کوڕی خۆیان، یا بۆ برایان، یا بۆ برازای کوڕیان، یا بۆ خوشکەزای کوڕیان، یا بۆ ژنانی لە چەشنی خۆیان، واتە: ژنانی موسوڵمانان، یا بۆ ئەو بەندەو کەنیزەکانەی کە موڵکی خۆیانن. ئەی ژنانی پێغەمبەر! لە خوا بترسن لە بارەی ئەم شتانەوە کە فەرمانتان پێ دراوە. خوا لە هەموو شتێ ئاگادارەو هیچی لێ ناشاررێتەوە.

(٥٦) بێگومان خواو فریشتەکانی سەڵاوات ئەدەن لە پێغەمبەر، واتە خوا ڕەحمەت ئەرێژێ بەسەریاو فریشتەکانی داوای لێبووردنی بۆ لێ ئەکەن. دەسا ئەی خاوەن باوەڕەکان! ئێوەیش سەڵاواتی لێ بدەن و سەلامی لێ بکەن بە سەلامکردن بە دڵ و بە زمان.

(٥٧) بێگومان ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەری خوا ئەدەن واتە کردەوەی وا ئەکەن کە خواو پێغەمبەر پێیان ناخۆش بێ، خوا لە دنیاو لەقیامەتا لەعنەتی لێ کردوون و لە ڕەحمەتی خۆی دووری خستوونەتەوەو سزایەکی وای بۆ ئامادەکردوون کە سووك و سەفیلیان بکا.

(٥٨) ئەوانەیش کە ئازاری پیاوان و ژنانی خاوەن باوەڕی ئیسلامەتی ئەدەن بێ ئەوەی ئەو پیاو و ژنانە تاوانێکیان کردبێ شایانی ئەو سزاو ئازارەبن لەسەری، ئەوانە بوختانێك و گوناهێکی ئاشکرایان کردووە بە بار بە کۆڵی خۆیانەوە چونکە بە ناهەق و بە بوختان ئەو پیاو و ژنە موسوڵمانانەیان بەگوناهبارو شایانی سزا داناوەو لەسەر هیچ سزای ناهەقیان داون. (٥٩) ئەی پێغەمبەری خوا! بە ژنەکانت و بە کچەکانت و بە ژنانی خاوەن باوەڕان بڵێ: چارشێوەکانیان لەسەرو دەموچاوو گەردنیان نزیك بکەنەوە تا ئەو شوێنانەی لەشیان داپۆشێ، ئەمە نزیکترە لەوەوە کە بناسرێن ئافرەتی ڕووهەڵماڵراو نین و خەڵك بزانن ئافرەتی بنەماڵەی پێغەمبەرو کۆمەڵی موسوڵمانانن و ئازار نەدرێن و مرۆی بێشەرم و حەیا ڕێیان پێ نەگرن و، خوایش بەخشندەو بەڕەحمە.

(٦٠) جا ئەگەر منافقەکان و ئەو موسوڵمانانەی دڵیان نەخۆش وکرمێیەو ئیمانیان دانەمەزراوە و، هەرچیو پەرچییە هەرزە گۆکانی مەدینە دەسبەردار نەبن لە بڵاوکردنەوەی واتەواتی بەدو لە فیتنەو فەساد گێڕان لە ناو شارا، بەڕاستی هانت ئەدەین و ئەمرت پێ ئەکەین بەگژیانا بچیو لە مەدینەیان بکەیتە دەرەوە، ئیتر پاش ئەوە بۆ ماوەیەکی کەم نەبێ لە دراوسێی تۆدا نامێننەوەو ناچاری کۆچ کردن ئەبن.

(٦١) ئەوانە ئەو کاتە بەر لەعنەتی خوا کەوتوو ئەبن یا بە لە موسوڵمانان وەلاخراو دائەنرێن، لە هەر کوێیەکدا ببینرێن و بدۆزرێنەوەو بکەونە بەر دەست ئەگیرێن و ئەکوژرێن و قەلاچۆ ئەکرێن .

(٦٢) خوا ئەم قانوونەی داناوەو جێ بە جێی کردووە لەناو ئەو ئوممەتانەدا کە لەمەوپێش بوون و بەسەرچوون و هەرگیز نابینی قانوونی خوا بگۆڕرێ.

يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنِ السَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ الْكَافِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي النَّارِ يَقُولُونَ يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا ﴿٦٦﴾ وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴿٦٧﴾ رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهًا ﴿٦٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ وَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٣﴾



(٦٣) خەڵك لە بارەی ڕۆژی قیامەتەوە پرسیارت لێ ئەکەن: کەی ئەبێ ؟ تۆ بڵێ: خوا خۆی ئەزانێ ڕۆژی قیامەت کەی ئەبێ. تۆ چوزانی کەی ئەبێ ؟ لەوانەیە بەم نزیکانە بێ.

(٦٤) بێگومان خوا لەعنەت و نەفرینی کردووە لە کافران و لە ڕەحمەتی خۆیی دوور خستوونەتەوەو ئاگرێکی سەختی بەتینی بۆ ئامادەکردوون کە ئاگری دۆزەخە.

(٦٥) لەو ئاگرە سەختە بەتینەدا ئەمێننەوە هەتا هەتایە، نە دۆستێکیان دەسگیر ئەبێ ڕزگاریان کا لێی و، نە یارمەتیدەرێك باری سەر شانیان سووك بکا.

(٦٦) ئەو ڕۆژەیان ڕۆژێکە ڕوویان لەناو ئاگرا ئەم دیوو ئەودیوی پێ ئەکرێ تا هەموو دیوێکی باش بسووتێو ئەوانیش لە تاو سەختی ئازاریان هاوار ئەکەن و ئەڵێن: بریا بەگوێی خواو پێغەمبەری خوامان بکردایەو بە فەرمانی ئەوان بجووڵاینایەتەوە.

(٦٧) ئەیشڵێن: خوایە! ئێمە بەگوێی فەرمانداروو پیاوە گەورەکانی خۆمانمان کرد، کەچی ئەوان گومڕایان کردین و خستینیانە سەر ڕێی چەوتی کافری.

(٦٨) خوایە! دووقات سزایان بدە، قاتێکیان لەسەر ئەوەی کە خۆیان گومڕا بوون و قاتێکیشیان لەسەر ئەوە کە ئێمەیشیان گومڕا کرد و، دووریان بخەرەوە لە ڕەحمەتی خۆت بە دوورخستنەوەیەکی زۆر زیادو گەورە .

(٦٩) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! وەك ئەوانە مەبن کە ئازاری دڵی مووسایان داو بوختانێکیان بۆ هەڵبەستو خوا پاکانەی بۆ کرد لەو بوختانەی کەوا بۆیان هەڵبەستبوو. مووسا لای خوا بەندەیەکی بە حورمەت و پایەبەرز بوو.

(٧٠) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! لە خوا بترسن و قسەیێ بکەن کە ڕاست و دروست و دامەزراوبێ.

(٧١) ئەگەر وابن خوا کارو کردەوەکانتان بۆ باش ئەکاو تاوانەکانتان بۆ ئەپۆشێ و، هەرکەسیش بە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بجووڵێتەوە ئەوە سەرکەوتنێکی گەورەی دەست کەوتووەو گەیشتووە بە پایەیەکی بڵند کە ئەوەتە لە دنیادا کرداری چاك بووەو لە قیامەتیشا بەهەشتی بەرین جێیەتی.

(٧٢) ئێمە ئەمانەتی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خۆمانمان خستە بەردەمی ئاسمانەکان و زەویو چیاکان تا بزانین ئاخۆ ئامادەن لە ئەستۆی خۆیانی بگرن، نکوولییان لە لەئەستۆگرتنی کردو هەڵیان نەگرت و لەو بەرپرسییە ترسان کە دێتە بەریان. پاشان ئادەمیزاد هەڵیگرت و لە ئەستۆی خۆیی گرت. بەڕاستی ئادەمیزاد ستەمی لەخۆی کردو نەیزانی چ ئەرکێکی گەورەی لە ئەستۆی خۆی گرتووە.

(٧٣) ئەنجامی ئەو چوونە بەر تەکلیفەی ئادەمیزاد ئەوەبوو هەندێ لەو خەڵکە پیاوو ژنی منافقیان لێ دەربچێو هەندێکیتریان هاوبەش بۆخوا دابنێن و هەندێکیش باوەڕیان بەخوا هەبێ و، لە ئەنجامی ئەمەیشا خوا سزای پیاوو ژنە منافق و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بدا و، تۆبەو لەگوناەپاشگەزبوونەوەی پیاوو ژنە خاوەن باوەڕەکانیش قوبووڵ بکاو، خوا بەخشندەو بەڕەحمە.

## سُورَةُ سَبَإٍ

ترتيبها ٣٤ — آياتها ٥٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿٧﴾



## سووره‌تی ( سَبَإٍ )

**مه‌ککه‌یی‌یه ئایه‌تی٦ی نه‌بێ و، (٥٤) ئایه‌ته**

(١) هه‌موو سه‌ناو ستایشێ بۆ ئه‌و خوایه که هه‌رچی له ئاسمانه‌کان و له زه‌ویدا هه‌یه هه‌موو هیی ئه‌وه‌و، سه‌ناو ستایش له ڕۆژی قیامه‌تاو له‌و دنیا بۆ ئه‌وه و، هه‌ر ئه‌وه خاوه‌ن حیکمه‌ته‌و له هه‌موو کارێکی نهێنی ئاگاداره .

(٢) به هه‌رچی ئه‌زانێ که به ئه‌رزا ئه‌ڕواته خواره‌وه وه‌ك هه‌واو ڕیشه‌ی دارو دره‌خت و گژوگیاو هه‌رچییه‌کی ترو، هه‌رچی لێیه‌وه دێته ده‌ر وه‌ك ئاو و دارو دره‌خت و گژوگیاو هه‌رچییه‌کی ترو، هه‌رچی له ئاسمانه‌وه دێته‌خوار وه‌ك به‌فرو باران و ئه‌و ئه‌ستێرانه‌ی ئه‌کشێن و هه‌رچی سه‌رئه‌که‌وێ بۆ ئاسمان وه‌ك فریشته‌و کرداری ئاده‌میزاد له چاك و خراپ و، هه‌ر ئه‌و خوایه به‌ره‌حمه‌و گوناهبه‌خشه .

(٣) کافره‌کان وتیان: ڕۆژی قیامه‌تمان بۆ نایه‌ت و ئه‌م جیهانه هه‌روه‌ك خۆی ئه‌مێنێ. تۆیش بڵێ به‌وان: نه‌خه‌یر وانییه‌و قه‌سه‌م به خوا ڕۆژی قیامه‌تتان بۆ دێ. قه‌سه‌م به‌و خوایه‌ی به هه‌موو شتێکی نهێنی ئه‌زانێ‌و ته‌نانه‌ت هیچ شتێکی به قورسایی گه‌ردیله‌یه‌ك له ئاسمانه‌کان و له زه‌ویداو له گه‌ردیله‌یه‌ك بچووکترو له گه‌ردیله‌یه‌ك گه‌وره‌تری لێ ون نابێ و، هه‌مووی له کتێبێکایه هه‌موو شتێ ڕوون ئه‌کاته‌وه .

(٤) ئه‌و ڕۆژی قیامه‌ته‌یش بۆ ئه‌وه دێ خوا پاداشی ئه‌و که‌سانه‌ی تیا بداته‌وه که ئیمانیان هێناوه‌و کاروکرده‌وه‌ی چاکیان له دنیادا کردووه. ئه‌وانه به‌خشین و لێبووردنی خوایان بۆ هه‌یه‌و ڕزق و ڕۆزییه‌کی پڕ قه‌درو حورمه‌ت له به‌هه‌شتا .

(٥) ئه‌و که‌سانه‌یش که هه‌وڵیان داوه بۆ به‌ربه‌رچدانه‌وه‌ی ئایه‌ته‌کانی ئێمه‌و ویستوویانه لێمان پێشکه‌ون و نه‌هێڵن خه‌ڵك شوێنی ئایه‌ته‌کانی ئێمه بکه‌ون، ئه‌وانه ئازاری سزایه‌کی سه‌ختی پڕ ئێش و ده‌ردیان بۆ ئاماده‌یه‌و هه‌یه .

(٦) ئه‌وانه‌ی که‌وا زانستیان پێ دراوه، ئه‌زانن ئه‌وه‌ی له لای خواوه هاتووه‌ته خواره‌وه بۆ سه‌ر تۆ که قورئانه، هه‌ر ئه‌وه ڕاسته‌و ڕێگای خوای خاوه‌ن عیززه‌ت و ستایش‌کراو به خه‌ڵك پیشان ئه‌دا.

(٧) کافره‌کان وتیان: ئایا شاره‌زاتان بکه‌ین له کابرایه‌ك که ئه‌ڵێ: کاتێ که پارچه پارچه بوون له‌ناو گۆڕاو به‌ته‌واوی دارزان و دافره‌قان و ئێسکه‌کانی له‌شتان لێك جیابوونه‌وه ، سه‌رله‌نوێ دروست ئه‌کرێنه‌وه‌و زیندوو ئه‌کرێنه‌وه ؟

أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ
فِى ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلْبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَىٰ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ
وَمَا خَلْفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ
ٱلْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَـَٔايَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ
يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ
سَٰبِغَٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ
بَصِيرٌ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ
وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ
رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾
يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ
وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ
ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ
إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ
أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾



(٨) ئایا ئەم کابرا (مەبەستی کافرەکان لە حەزرەتی پێغەمبەرە) بوختان ئەکا بەدەم خواوەو ئەم قسە بە زوبانی ئەوەوە ئەکا، یان جۆرە شێتییەکی پێوەیە وا قسەی سەیرو سەمەرەی لەم جۆرە ئەکا؟ نەخەیر ئەو پیاوە نە بوختانی بەدەم خواوە هەڵبەستووەو نە هیچ جۆرە شێتییەکیشی پێوەیە، بەڵام ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە لەناو عەزاب و گومڕاهییەکی دوورو قووڵدان. (٩) ئەوانە ئایا سەیری ئەو ئاسمان و زەوییەی بەردەم و پشتی خۆیانیان نەکردووە کە خوا دروستی کردووە ؟ ئەگەر ئێمە مەیلمان لەسەر بێ زەوییان پێ ڕۆئەبەینە خوارەوە یا پارچەی قورس قورسیان لە ئاسمانەوە بەسەردا دائەخەینە خوار و، ئەگەر ئەم کارە بکەین نیشانەی گەورەیی دەسەڵاتی ئێمەی تیایە بۆ هەر بەندەیەکی وا بییەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای خوا. (١٠) بەڕاستی ئێمە لای خۆمان گەورەییو زیادە پایەیەکمان بەخشی بە داوود زیاتر لەوەی بەهەر پێغەمبەرێکمان دابوو، کە ئەوەبوو بە چیاکانمان وت: ئەی کۆسارەکان! کاتێ کە داوود ذیکرو تەسبیحات ئەکا دەنگی خۆتان بخەنە پاڵ دەنگیو لەگەڵی بڵێنەوەو بۆی بسێننەوە، پەلەوەرەکانیش هەر وامان پێ وتبوون کە ذیکرو تەسبیحات لەگەڵ داود بڵێنەوەو بۆی بسێننەوە و، ئاسنی ڕەقیشمان بۆ نەرم کردبوو، وەك مۆم بوو لەناو دەستیاو هەر جۆرە چەك و سیلاحێکی بویستایە لێی دروست ئەکرد. (١١) کە ئاسنمان لەناو دەستیا وەك مۆم نەرم کردبوو فەرمانمان پێدابوو کەوا کراسی زرێی ڕەساو گوشاد دروست بکا لێی بۆ خۆیو لەشکرەکەیو تێمانگەیاندبوو کە ئەندازە لە گوشادیی کراسە زرێکانا ڕاگرێو وایان دروست بکا بۆ بەریان بشێن و بە خۆیو دەوروبەرەکەیمان وتبوو کەوا کردەوەی چاك بکەن چونکە من چاوم لە هەرچی کردەوەیەکە ئێوە ئەیکەن. (١٢) بایشمان ڕام کردبوو بۆ سولەیمان تاقی بەیانیان مانگەڕێیەك و تاقی ئێواران مانگەڕێیەکی ئەبڕێ و، کانیی مسی تواوەمان بۆ ڕەوان کردبوو، هەروەها لە جنۆکەیش هەندێکیانمان خستبوە ژێر فەرمانی چیی بویستایە فەرمانی ئەدانێ بۆیان جێبەجێ ئەکردو لە بەردەستیا بوون بە فەرمانی خوا کاریان بۆ ئەکرد و، هەرکەسێکیشیان لە فەرمانی ئێمە لابداو سەرپێچی بکا لە سزای دۆزەخی پێ ئەچێژین. (١٣) چیی بویستایە لە قەڵای قایم و خانووی چاك و پەیکەری فریشتەو پێغەمبەران و قاپی وەك حەوزی گەورەو مەنجەڵی لەسەر سێ کوچکە دامەزراو، ئەم جنۆکانە بۆیان دروست ئەکرد. دەسا ئەی خێڵی داوود! کار بکەن و خوا بپەرستن بۆ شوکرانەبژێری بۆی و، لەناو بەندەکانما کەمیان هەن شوکرانەبژێری بۆ خوا بکەن. (١٤) کە مەرگمان کرد بە حوکمڕان بەسەر سولەیماناو مراندمان کەس جنۆکەکان یا کەسوکاری سولەیمانی لە مەرگی ئاگادار نەکرد مۆرانە نەبێ عاساکەیان کرمۆڵ کردو ئەویش کە بە پێوە سەری خستبووە سەر عاساکەی پاش کرمۆڵبوونی عاساکەیو کەوتنی، خۆیشی کەوت و پێیان زانی کە مردووە. جا کە کەوت جنۆکەکان بۆیان دەرکەوت کەوا ئەگەر عیلمی غەیبیان هەبوایەو شتی نهێنیان بزانییایە، ئەیانزانی هەرچەند بەپێوەیە، مردووە و، لەو ئازارە سەختەی بەردەوام ئیشکردن و ڕەنج کێشاندا نەئەمانەوە، کە ئەو بەپێوە بەسەر سەریانەوە وەستابوو تا بەردەوام بن لەکارداو خاو و خلیچکی نەکەن و کارەکە تەواوبکەن .

لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾



(١٥) بەڕاستی خێڵی سەبەء لە نشینگەکەیانا نیشانەیەکیان هەبوو بوون و توانایی خوای پیشان ئەدا. نیشانەکە ئەوە بوو دوو کۆمەڵە باخ و باخاتیان لای ڕاست و لای چەپی نشینگەکەیانەوە هەبوو. شایانی ئەوە بوون خۆزگە بەحاڵیان بخوازرێو پێیان بووترێ: لەم ڕزق و ڕۆزییە بخۆن کە خوا پێی داون، شارێکی خۆش و پاکتان هەیە بۆ دنیاتان و، خوایەکی لێبووردوو و بەخشندەیش بۆ قیامەتتان. (١٦) پاشان پشتیان لە سوپاس‌کردنی خوا هەڵکردو ئێمەیش لافاوێکی سەختمان کردە سەریان و دوو کۆمەڵە باخ و باخاتەکەمان بۆ گۆڕین بە دوو کۆمەڵە بەناو باخ و باخاتی وا بەرەکانیان تفت و تاڵ بوون و دارگەزو چەردەیەکی کەمیش مۆردیان تیا بوو.

(١٧) بەم جۆرە جەزایە جەزامان دانەوە چونکە کوفری نیعمەتی خوایان کرد. ئایا ئێمە جەزای خراپی کەسێك ئەدەینەوە هیی کەسێك نەبێ کوفری نیعمەتی خوا بکاو ناسوپاس بێ؟

(١٨) لە نێوان ئەوان، واتە خەڵکی سەبەءو، ئەو دێهاتانەدا کە بەرەکەتمان تێخستبوون کە دێهاتی وڵاتی شامە، دێهاتگەلێکی دیارمان دانابوو ڕێبوار پێیان ئەزانین و لێیان تێکنەئەچوون، ئەندازەی ڕێ ڕۆیشتنیشمان لە نێوانیانا دیاری کردبوو بە جۆرێ کە ڕێبوار سبەینێ لە یەکێکیانەوە ئەکەوتەڕێ ئێوارە ئەگەیشتە یەکێکی تریان و هەر بەم جۆرە تا نێوانی سەبەء و قودسی ئەبڕی و، پێمان وتبوون چەند شەوو ڕۆژێ بە ئەمینیو بێ ترس و لەرز بەم ڕێگایەداو بەنێوان ئەم دێهاتانەدا هاتوچۆ بکەن تا ئەگەنە ئەو شوێنەی مەبەستتانە.

(١٩) ئەوانەیش لەبەر ناسوپاسیو بێ ئیمانییان، وەك بڵێی ئەیانوت: خوایە! مەنزڵەکانی سەر ڕێگای هاتوچوومان لەیەك دووربخەرەوە، خراپەیان لەگەڵ خۆیان کرد چونکە مەبەستیان ئەوە بوو ڕێگای هاتوچۆیان چۆڵ بێ بۆ ئەوەی بتوانن دەسدرێژی بکەنە سەر ڕێبواران و ڕووتیان بکەنەوەو تاڵانیان بکەن. ئێمەیش لەسەر ئەمە وا جەزامان دانەوە کە ماڵوێرانمان کردن و وامان لێ کردن تەنها باسی کۆنیان بمێنێو هەر تیرەو بەرەیەکمان فڕێ دانە شوێنێ. ئەم سەرگوزەشتەی خەڵکی سەبەئە نیشانەهای تیایە بۆ هەرکەسێ خۆڕاگر بێ لەسەر دوورکەوتنەوە لە گوناەو سوپاسی خوای خۆی بکا. (٢٠) بەڕاستی شەیتان گومانی خۆی لەم خەڵکی سەبەئەدا کرد بەڕاست، واتە گومانی بردبوو کە ئەتوانێ گومڕایان بکاو بەڕاستییش توانییو گومڕای کردن، تەنها تاقمێکی کەمیان نەبێ کە خاوەن ئیمان بوون ئەوانە شوێنی نەکەوتن. (٢١) شەیتان هیچ بەڵگەو توانێکیشی نەبوو بەسەریانا کە بتوانێ گومڕایان بکا، بەڵام ئەوە ڕووی دا بۆ ئەوەی بۆ هەمووان دەرکەویو عیلمی ئێمەیش ڕووبکاتە جیاوازیی نێوان خاوەن ئیمان و بێ ئیمان و بزانین کێ باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت هەیەو کێ گومانی تیایا هەیەو لێی دوو دڵە و، خوای تۆیش ئاگای لە هەموو شتێکە.

(٢٢) بڵێ بەوانەی هاوبەش بۆ خوا دائەنێن: بانگ بکەنە ئەو بتانەی گومانتان وایە سوودبەخشن بۆتان لە غەیری خوا تا بزانن کە نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا خاوەنی سەنگی گەردیلەیەك نین و هیچ بەشێکیان تیایانا نییە. خوایش هیچ پشتیوانێکی لە ناو ئەو بتانەدا نییە، واتە خوا پێویستی بە هیچ پشتیوانێك نییەو ئەو بتانە هیچیان هیچ نین.

وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن
قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ
﴿٢٣﴾ ۞ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ
وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل
لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ
يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ
﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ
ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ
بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾
وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾
قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ
﴿٣٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا
بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ
رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ
ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾

الحزب ٤٤



(٢٣) تکاکردنیش سوود نابەخشێ لای خوا تەنها بۆ تکاکارێ نەبێ کە خوا خۆی ڕێگای دابێ تکا بۆ تاوانباران بکا تا کاتێ ترس و لەرز لە دڵی تکاکاران و تکا بۆکراوان هەڵگیراو ڕێی تکاکردن درا، خەڵکەکە هەندێکیان بە هەندێکی تریان ئەڵێن: ئەوە خوا چیی فەرموو ؟ فریشتەکانیش یا موسوڵمانان ئەڵێن: خوا قسەی ڕاستی فەرموو کە ئەوەتە تکا تایبەتییە بۆ موسوڵمانان و تکا بۆ کافر ناکرێ و، هەر تەنها خوایە پایە بڵندو گەورەیە.

(٢٤) بڵێ: کێیە ڕۆزیتان لە ئاسمان یا لە زەوییەوە ئەداتێ ؟ خۆت لە وەڵاما بڵێ: خوا. کەواتە ئیتر ئێمە یا ئێوە لەسەر ڕێی هیدایەتین یا لە گومڕاهییەکی تەواو ئاشکرادایین.

(٢٥) تۆ بەوانە بڵێ: ئێوە پرسیارتان لێ ناکرێ لەو تاوانانەی ئێمە کردوومانن و ئێمەیش پرسیارمان لێ ناکرێ لەو کردەوانەی ئێوە ئەیانکەن.

(٢٦) تۆ پێیان بڵێ: لە پاشەڕۆژا خوا ئێمەو ئێوە پێکەوە کۆئەکاتەوەو پاشان حوکم لە نێوانمانا ئەدا بەوەی کە ڕاستەو هەر خوا حوکمدەری زانا بە هەموو شتێکە.

(٢٧) تۆ پێیان بڵێ: ئەوانەم پیشان بدەن کە خستووتاننەتە پاڵ خوا وەك هاوبەشی. نەخەیر شتی وا نییەو کەس نابێ بە هاوبەشی خوا و، خوا خاوەن عیززەت و حیکمەتە.

(٢٨) ئێمە تۆمان نەناردووە بۆ ئادەمیزاد هەموویان نەبێ، واتە تەنها بۆ بەشێکیانمان نەناردووی، بۆ ئەوەمان ناردووی هەموویان بترسێنی لە سزای خوا ئەگەر فەرمانبەرداریی نەکەن و مژدەی بەهەشتیان بدەیتێ ئەگەر بە فەرمانی ئەو بجوولێنەوە، بەڵام بەشی زۆری خەڵك نازانن چی چاکە بیکەن و چی خراپە نەیکەن و لەبەر ئەوە گوێ ڕایەڵت نابن.

(٢٩) ئەیشڵێن: ئەم وەختی سزادانە کەیەو کەی سزا ئەدرێین ئەگەر ڕاست ئەکەن خوا لەسەر بێ فەرمانیمان سزامان ئەدا ؟

(٣٠) تۆیش پێیان بڵێ: وەعدەی ڕۆژێکی بۆ دەسنیشان کراوتان هەیە کە ئەو وەعدە هات نە سەعاتێ دوا ئەکەون لێیو نە سەعاتێ پێش ئەکەون و، لە کاتیبۆدەسنیشانکراوی خۆتاندا ئەو غەزەب و سزای خوایەتان بەسەردادێ.

(٣١) کافرەکان وتیان: ئێمە ئیمان ناهێنین نە بەم قورئانەو نە بەو کتێبانەی لە پێش ئەوەوە هاتوون بۆ پێغەمبەرانی تر. جا ئەگەر ئەو ڕۆژە بە چاوی خۆت ئەبینی کە ستەمکاران لای خوا ڕاوەستێنراون دەمەتەقێیانەو هەرکامیان قسە ئەدا بەسەر قسەی ئەویتریانداو ئەوانەیان لە دنیادا بێدەسەڵات و ژێر دەست بوون بە گەورەو دەسەڵات بەدەستەکانیان ئەڵێن: ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە هەموومان موسوڵمان ئەبووین، ئەگەر ئەوە ببینی شتی سەیرو سەمەرە ئەبینی.

قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ ۚ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾



(٣٢) ئەوانەیان کە گەورەو دەسەلاٌت بەدەست بوون بەوانەیان ئەلێن کە بێ دەسەلاٌت و ژێردەستە بوون: ئایا ئێمە ڕێمان لە ئێوە ئەگرت هیدایەت وەربگرن و موسوڵمان بن کاتێ کە هیدایەتی خواتان بۆ هات و ئایینی ئیسلام هات ؟ نەخەیر وانییە، ئێوە هەر خۆتان تاوانبار بوون.

(٣٣) ئەوانەیش کە بێ دەسەلاٌت و ژێر دەستەبوون، بە گەورەو دەسەلاٌت بەدەستەکانیان وت: تاوانباریی خۆمان نەبوو نەیهێشت هیدایەت وەربگرین و موسوڵمان ببین، بەڵکو فریودانی ئێوە بوو هەمیشە فەرمانتان ئەداینێ ئینکاری تاق و تەنهاییی خوای گەورە بکەین و هاوبەش و هاوچەشنی بۆ دابنێین و، کاتێ کە سزای خوایان بە چاوی خۆیان دیو کۆت و زنجیرمان لە ملی کافران کرد، هەردوولا پەشیمانیان لە دڵی خۆیانا هەڵگرت چونکە دییان دەرخستنەکەی بێسوودە. ئایا ئەمانە لەسەر کردەوەی خۆیان نەبێ کە لە دنیادا کردوویانە سزا ئەدرێن ؟

(٣٤) هیچ فروستادەیەکمان لە هیچ ئاوەدانییەکا نەناردووە دانیشتووانی لە سزای خوا بترسێنێ، ئیللا دەوڵەمەندو خاوەن نازو نیعمەتەکانی بەو فروستادانەیان وتووە: ئێمە ئینکاری ئەو پەیامە ئەکەین کە لەگەڵ ئێوەدا نێرراوە.

(٣٥) وتوویشیانە: ئێمە ماڵ و دارایی‌و کوڕمان لە ئێوە زیاترەو ئێمە هەرگیز سزا نادرێین یا لەبەر ئەوە کە سزادان نییە یا لەبەر ئەوە کە ئێمە دەسەلاٌتدارین و خوا سزامان نادا.

(٣٦) تۆیش بڵێ: بێگومان خوای من ڕزق و ڕۆزی فراوان ئەکا بۆ هەرکەسێ خۆی مەیلی لێ بی‌و لە هەر کەسێ ئەگرێتەوە کە خۆی مەیلی لێ بێ، بەلاٌم بەشی زۆری خەڵك ئەمە نازانن و لایان وایە دەوڵەمەندی‌و هەژاریی هەرکەس لە ئازایی یا لە بێکارەیی خۆیەوەیە.

(٣٧) دارایی‌و ئەولادی ئێوە شتێ نین لە ئێمەتان نزیك بخەنەوە، بەلاٌم کەسانێ کە باوەڕیان بە خوا هەبی‌و کردەوەی چاکیان کردبێ ئەوانە پاداشی چەند قاتیان ئەدرێتەوە لەسەر کردەوە باشەکانیان و لە هۆدەکانی بەهەشتا بێ ترس و لەرز لە هیچ ناخۆشی‌و خەتەرێك ئەژین .

(٣٨) ئەوانەیش کە هەوڵ ئەدەن بۆ بەرپەرچدانەوەی ئایەتەکانی ئێمەو ئەکەونە بەربەرەکانێ لەگەڵ پێغەمبەرەکانمان و ئەیانەوێ بیانبەزێنن و زاڵ بن بەسەریانا، ئەوانە ئامادەکراون بۆ سزای ڕۆژی قیامەت و ئەو دنیا.

(٣٩) تۆ، ئەی موحەممەد! بڵێ: خوای من ڕزق و ڕۆزی گوشادو فراوان ئەکا بۆ هەرکام لە بەندەکانی خۆی‌و لێی ئەگرێتەوە و، هەرچییش خەرج بکەن لەڕێی خوادا خوا بۆتان ئەبژێری‌و بریتیی ئەنێرێ بۆتان و، خوا لە هەموو ڕۆزی بەخشێ چاکترە.

وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ وَقَالُوا۟ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُوا۟ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَكَذَّبُوا۟ رُسُلِى ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ۞ قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا۟ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا۟ ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَىْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾ قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٤٧﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٤٨﴾



(٤٠) یادی ئەو ڕۆژە بکەن کە خوا هەموو کافرەکان کۆئەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە، بەدەسەڵاتدارو بێ دەسەڵاتیانەوە و، بەفریشتەکان ئەڵێ: ئاخۆ ئەم هاوبەش‌بۆخوادانەرانە ئێوەیان ئەپەرست ؟

(٤١) فریشتەکانیش ئەڵێن: هەموو بێ‌عەیبییەك بۆ تۆیە، خوایە! تۆ سەردارو گەورەی ئێمەی نەك ئەمانە، بەڵکو ئەم کافرانە جنۆکەیان ئەپەرست و بەشی زۆریان باوەڕیان بە جنۆکە هەیە کە خوایانن و ئێمەیان نەپەرستووە.

(٤٢) جا ئەمڕۆ کە ڕاست و درۆ دەرکەوتووە، ئەی کافرەکان! کەستان خاوەنی هیچ قازانجێ نییە بۆ کەستان و هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنێ پێی و، ئێمەیش ئەڵێین بەوانەی لە دنیادا ستەمکارو خوانەناس بوون: سزای ئەو ئاگرە بچێژن کە باوەڕتان پێ نەبوو و بەدرۆتان ئەدایە قەڵەم.

(٤٣) کاتێکیش کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەرا ئەخوێنرێتەوە کە ڕووناك و دیارن، ئەڵێن: ئەم ئینسانە کە ئەم کتێبەی هێناوە لە پیاوێ بەولاوە نییە ئەیەوێ لاتان بدا لەو بتانەی باوك و باپیرانتان ئەیانپەرستن و، ئەڵێن: ئەم قورئانەیش لەدرۆیەکی هەڵبەستراو بەولاوە نییە و، کافرەکان بەقورئان ئەڵێن کەهاتە سەریان: ئەمە لە جادوویەکی ئاشکرا بەولاوە نییە. (٤٤) ئەمانە کە ئاوا مامەڵە لەگەڵ قورئان ئەکەن و بەجادووی ئەزانن بەر لەم قورئانە کە تۆ هێناوتەتە سەریان کتێبگەلێکی ترمان نەداونێ بییانخوێننەوە و، بەر لە تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووەتە سەر بییانترسێنێ لە سزای دۆزەخ.

(٤٥) کافرەکانی لەمەوپێش پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆزن دانا لە ئیددیعای پێغەمبەرایەتییاناو، ئەم کافرانەی سەردەمی تۆ نەگەیشتوونەتە دەیەکی ئەوەی بە کافرانی لەمەوپێشمان دابوو لە دارایی‌و خاوەن کورو کەسوکاری، جا کاتێ ئەوانەی پێشوو پێغەمبەرانی ئێمەیان بە درۆزن دانا، نارەزایی من لەوان چۆن بوو و چۆنم سزادان ؟ ئیتر ئەمانەی سەردەمی تۆ بە تەمای چین لە سزای بەدرۆزن دانانی تۆدا ؟ دیارە تۆڵەیەکی سەختیان لێ ئەکەمەوە.

(٤٦) تۆ، ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: من تەنها بەتاقە پەندێ ئامۆژگاریی ئێوە ئەکەم ئەویش ئەوەیە لەبەر خوا یەکەیەکەو دوو دوو لەم مەجلیسەی من هەڵسن و بیرێ بکەنەوە کەوا ئەم هاوڕێیەتان ( واتە پێغەمبەر) هیچ شێتییەکی لەگەڵ نییەو لەوە بەولاوە نییە کە هاتووە لە سزایەکی سەختی خواتان ئەترسێنێ کە لەپێشتانەو بەرلەوەی بێ بەسەرتانا.

(٤٧) تۆ، ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: هەر پاداشێ من لە ئێوەی داوا بکەم بەرانبەر بەم ئامۆژگارییەو بە گەیاندنی نامەی خوا پێتان، هەمووی بۆخۆتان. پاداشی من لەسەر کەس نییە لەسەر خوا نەبێ‌و خوا خۆی ئاگای لە هەموو شتێکە. (٤٨) تۆ، ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: خوای من ئایینی حەق‌و ڕاست ئەدا بە ئایینی پڕوپووچ و بەتاڵا. خوا لە هەموو پەنامەکی‌و نهێنییەك ئاگادارە.

قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِى ۖ وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴿٥٠﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۖ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴿٥٤﴾

## سُورَةُ فَاطِرٍ

ترتيبها ٣٥ — آياتها ٤٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾



(٤٩) تۆ، ئەی موحەممەد! بلێ: ئایینی حەق و ڕاست کە ئایینی ئیسلامە هاتووەو هەموو ئایینێکی پووچ بەتاڵ بووەتەوەو شتی بەتاڵ نە هیچی پێ دروست ئەکرێو نەمردوو زیندوو ئەکاتەوە و، لەبەر ئەوە پەرستنی پووچ و بەتاڵ و بێسوودە. (٥٠) تۆ، ئەی موحەممەد! بەو کافرانە بلێ: من ئەگەر گومڕابم ئەوە گومڕاییەکەم لەسەر خۆمەو زیانی بۆ خۆم ئەگەڕێتەوەو ئەگەر هیدایەتیشم وەرگرتبێو لەسەر ڕێی ڕاست بم ئەوە بەپیرۆزیی ئەوەوەیە کە خوا وەحیی بۆ کردووم. بەڕاستی خوا هەموو شتێ ئەبیسێو لەهەموو کەسێکەوە نزیکە.

(٥١) ئەگەر چاوت لە کافرەکان بێ ئەی موحەممەد! کاتێ کە ترسی هاتنی قیامەت و سزای ئەو دنیا دایانئەگرێو ئیتر ڕزگاربوونیان بۆ نییەو لە شوێنێکی نزیکەوە ئەبرێن، لە ماڵی خۆیانەوە بۆ گۆڕ یا لە گۆڕەوە بۆ مەیدانی لێپرسینەوە یا لە مەیدانی لێپرسینەوەوە پەلکێش ئەکرێن بۆ دۆزەخ،

(٥٢) ئەوکاتە کە ئەوکافرانە سزای ئەو دنیا بەچاوی خۆیان ئەبینن، ئەڵێن: باوەڕمان بە خوای تاك و تەنیا هەیە. ئەوان چۆن لە قیامەتەوە کە شوێنێکی دوورە ئەگەڕێنەوە بۆ شوێنی عیبادەت کە دنیایەو، چۆن دەستیان بەو باوەڕو خوا پەرستییە ئەگا؟

(٥٣) کەچی لەوە پێش، واتە کە لە دنیادا بوون، ئینکارییان ئەکردو باوەڕیان پێ نەئەکردو لە شوێنێکی دوورەوە کە ئاگایان لێ نەبێ ڕاستیی مەسەلەکە چۆنە، لەخۆیانەوە ڕمڵیان لێ ئەداو، بەگۆترە لە بارەی خواو پێغەمبەرو ئایینی ئیسلامەوە کە خوا ناردبوویو پێغەمبەر هێنابووی، ئەدوێن و هەرزەوێژییان ئەکرد.

(٥٤) کۆسپ ئەخرێتە نێوان ئەو کافرانەو ئەو شتەوە کە ئارەزوویانە کە ئەوەتە بگەڕێنەوە بۆ دنیاو ئیمان بهێنن و لە سزای دۆزەخ دەرباز بن، وەك پێشتر لەگەڵ هاوڕێکانیان کرا کە کافرەکانی تربوون و ئەوانیش ئەیانویست بگەڕێنەوە بۆ دنیاو ئیمان بهێنن و ڕزگار بن لە سزای ئەو دنیا. ئەمانیش وەك ئەوان لە دوودڵیو بەدگومانییەکدا بوون مرۆ ئەخاتە پەرێشانییەوە.

## سووڕەتی (فَاطِر)

**مەککەیییەو، (٤٥) ئایەتە**

(١) هەموو سەناو ستایش بۆ زاتی خوایەکە ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووەو فریشتەی کردووە بە فروستادە لە نێوان خۆیو پێغەمبەرانیاو دوو باڵ و سێ باڵ و چوار باڵی بۆ کردوون و چەندیشی مەیل لێ بێ باڵی زیاتریان بۆ ئەکا خوا بێگومان توانی بەسەر هەموو شتێکدا ئەشکێ.

(٢) ئەو ئەسبابی خێرو نیعمەتەی خوا بۆ خەلکی بەرەڵا بکاو بیکاتەوە کەس پێی ناگیرێتەوەو ئەوەیش ئەو بیگرێتەوە کەس بۆی بەرەڵلا ناکرێ پاش گرتنەوەکەی لە لایەن ئەوەوە. خوا خوایەکی زاڵە بەسەر هەر کارێکا بییەوێ بیکاو خاوەن حیکمەتە لەهەر کارێکا کە بیکا.

(٣) خەڵکینە! باسی نیعمەتی خوا بکەن بەسەرتانەوە کە داوینێ. لە خوا بەولاوە کەسێ هەیە ئێوەی دروست کردبێ کە لە ئاسمانەوەو لە زەوییەوە ڕزق و ڕۆزیتان ئەداتێ؟ لەو بەولاوە خوایەك نییە شایانی پەرستن بێ. دەی کەواتە چۆن لە خوای تاك و تەنها پەرستنەوە وەرئەچەرخێنرێن بۆ بت پەرستی؟

وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ
﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا
وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ
عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم
مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا
فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ
عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ
ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ
مَوْتِهَا كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا
إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ وَٱلَّذِينَ
يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَكْرُ أُو۟لَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ
﴿١٠﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا
وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ
وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١١﴾



(٤) ئەگەر ئەو كافرانە تۆ بە درۆزن دابنێن لە ئیددیعای پێغەمبەرایەتیدا، ئەوە مەكە بە تەگەرە لە ڕێگای گەیاندنی پەیامی خۆتا، چونكە چەندین پێغەمبەری تری پێش تۆیش بە درۆزن دانراون لە لایەن ئەو خەڵكانەوە كە ئەوانیان نێرابوونەسەرو، سەرەنجامی هەموو كارێكیش هەر بۆ لای خوا ئەگەڕێتەوە. (٥) ئەی خەڵكینە! بێگومان ئەو گفتەی خوا داویە ڕاستەو دێتەدی، دەسا با ژیانی دنیا بابیتان نەكا لە خۆتان و، ئەو شەیتانەی خواتان لەیادئەباتەوە فووتان تێ نەكا خۆتان وا دابنێن پێویستتان بەوە نییە خوا لە گوناهتان خۆش ببێو هەر سووربن لەسەر گوناهكردن. (٦) بێگومان شەیتان دوژمنتانە، كەواتە ئێوەیش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن. ئەو كۆمەڵەكەی خۆی بانگ ئەكا بۆ ئەوەی كردەوەی خراپی خواپێڕازینەبوو بكەن تا لە ئەنجاما بن بە هاوڕێو هاودەمی ئاگری دۆزەخ و بچنە جەهەنەم. (٧) ئەوانەی لە دنیادا كافر بوون و باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرانی خوا نەبوە، سزایەكی سەختیان بۆ هەیە لەو دنیادا و، ئەوانەیش كە ئیمانیان هێناوەو كردەوەی چاكیان كردووە لێبووردنی خواو پاداشێكی گەورەیان بۆ هەیە. (٨) ئایا كەسێ كردەوەی خراپی خۆی لا جوان كرابێو بە باشی بزانێ ( وەك كەسێكە خراپ بزانێ ؟) خوایش مەیلی لە گومڕاكردنی هەركەسێ ببێ بۆ خۆی گومڕای ئەكاو ئارەزووی لە هیدایەتدانی هەركەسێ ببێ بۆ خۆی هیدایەتی ئەدا. دەی كەواتە خۆت مەفەوتێنە لە خەفەتی ئەوەدا كەوا گومڕاكراوەكان نەهاتوونەتە سەر ڕێی ڕاست. خوا خۆی ئەزانێ ئەوانە چ كارەن و چی ئەكەن. (٩) خوا ئەو خوایە با ئەنێرێو باكەیش هەور هەڵئەستێنێ و، ئێمەیش هەورەكە دەئاژووین بۆ وڵاتێكی لە بێ بارانیدا وشكهەڵگەڕاوو مردوو، جا بەو بارانەی لەو هەورەوە ئەبارێ زەوی پاش مردنی زیندوو ئەكەینەوە. هەستانەوەی ئێوەیش لە گۆڕاو زیندووبوونەوەتان لەو دنیاو چوونتان بۆ سەحرای مەحشەر، هەر بەم جۆرەیە.

(١٠) ئەو كەسەی شەرەف و پارێزی بۆ خۆی ئەوێ، هەرچی شەرەف و پارێز هەیە هەمووی هیی خوایە، دەبا لە خوای داوا بكا. قسەی باش كە خوا بە تاك و تەنیا زانینە، بۆ لای خوا خۆی بەرز ئەبێتەوەو، خوا كردەووەی چاكیش قوبووڵ ئەكاو هەڵیئەبڕێ بۆ لای خۆی. ئەوانەیش كە لەناو خۆیانا ئەیانەوێ بە فڕوفێڵ زیان بە پێغەمبەر بگەیەنن، سزایەكی سەختیان لە پاداشی ئەو فڕوفێڵ و نیازە خراپانەیانا بۆ ئەبێ و، هەرچی فڕوفێڵ و پیلانێكیان هەیە هەمووی بە فیڕۆ ئەڕواو هیچی ناگاتە ئەنجام.

(١١) خوا بنەچەی ئێوەی لە گڵ دروست كردوەو پاش ئەوە كە ئادەمی لەگڵ دروست كرد ئەولادو نەوەی ئەوی لە تۆمێك دروست كرد كە لە پشتی باوكەوە ئەچێتە منداڵدانی دایك، ئەوجا كردنی بە هاوجووت و نێرو مێ. هیچ ئافرەتێ ئاوس نابێو منداڵی نابێ بە پێزانینی خوا نەبێ. هیچ خاوەن تەمەنێكیش تەمەنی درێژ نابێ یا كورت نابێتەوە ئیللا لە كتێبێكا نووسراوە كە ناوی (لوح المحفوظ) ەو، ئەمە گشتی كارێكی ئاسانە بۆ خوا.

وَمَا يَسْتَوِى ٱلْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾



(١٢) هەرگیز دوو دەریا وەك یەك نین، ئەمەیان ئاوەكەی خۆش و شیرین و ڕەوانە بە ئاسانی لە خۆیەوە بەگەروودا ئەچێتە خوار و، ئەوەیان سوێرو تاڵەو زەوق وەری ناگرێ و، لەگەڵ ئەویش لە هەردوو جۆرە دەریاكە گۆشتی تەرو تازەو ناسك ئەخۆن و دوڕو مرواریی جوان دەردێنن خۆتانی پێ ئەڕازێننەوە. ئەیشبینی كەشتییەكان دەریا ئەبڕن و پیا ئەڕۆن و بە ئاویا هاتوچۆ ئەكەن بۆ ئەوەی ئێوە نیعمەت و ڕۆزیی خوا پەیدا بكەن بۆخۆتان و بەڵكو سوپاسی ئەم نان و نیعمەتەی خوا بكەن.

(١٣) خودا شەو ئەكا بەناو ڕۆژاو دنیا تاریك دادێ و، ڕۆژ ئەكا بەناو شەواو دنیا ڕووناك ئەبێتەوە و، مانگ و ڕۆژی بۆ ڕام و دەستەمۆ كردوون هەریەكەیان تا وادەیەكی دیاری كراو بە ڕێی خۆیا ئەڕوا تا بە ڕۆژ كارو كاسبیی خۆتان بكەن و بە شەو پاش ماندووبوونی ڕۆژ بحەسێنەوە. ئەوەی ئەمە جێ بەجێ ئەكا زاتی (الله)یە كە خوای ئێوەیەو پەروەردگارتانە، دەسەڵات و تەسەڕڕوف لەم دنیایەدا هەر بۆ ئەوەو، ئەو بتانەی ئێوە لەبریتیی هاواركردنە خوا هاواریان لێ ئەكەن خاوەنی توێكڵە ناسكەكەی ناوكە خورمایەك نین.

(١٤) ئەگەر بانگیان لێ بكەن گوێیان لە بانگ كردنەكەتان نییەو ئەگەر گوێشیان لێ بێ وەڵامتان نادەنەوەو نایەن بەدەنگتانەوە چونكە هیچیان پێ ناكرێ بۆتان و، لە ڕۆژی قیامەتیشدا ئینكاری ئەوە ئەكەن كە ئێوە ئەوانتان كردووە بە هاوبەشی خواو كەسیش ناتوانێ وەك یەكێكی ئاگادارو شارەزا كە خوایە لەم بابەتەت ئاگادار بكا.

(١٥) خەڵكینە! ئێوە نیازمەندو موحتاجی خوان خوا بێ نیازە لە هەموو عالەم و سەناو ستایشكراو هەر ئەوە.

(١٦) ئەگەر مەیلی لێ بێ ئێوە لەناوئەباو خەڵكێكی تازە لە شوێنی ئێوە دێنێ.

(١٧) ئەمەیش كارێكی قورس و گران نییە بۆ خوا.

(١٨) هیچ نەفسێكی تاوانبار تاوانی كەسێكی تر لە ئەستۆ ناگرێ و، ئەگەر نەفسێكی بەتاوان بارگران داوای هەڵگرتنی هەندێ لە بارەگرانەكەی سەر شانی بكا لەلایەن كەسێكی ترەوە كەس بەدەنگیەوە نایەت و هیچی لەجیاتی هەڵناگیرێ با بانگكراوەكەیش خزم و نزیكی خۆی بێ. تۆیش ئەو كەسانە ئەترسێنی لە سزای خوا كە لە پەنامەكییاو كاتێ كەس پێیان نازانێ ئەگەر تاوان بكەن لە خوا ئەترسن و لەترسی ئەو تاوانەكە ناكەن، واتە ترساندن تەنها لەگەڵ ئەو جۆرە كەسانە سوودی هەیەو نوێژەكانیشیان ئەكەن، هەركەسیش خۆی لەتاوان و كردەوەی خراپ خاوێن بكاتەوە، ئەوە بۆ خۆیی خاوێن ئەكاتەوەو خۆی سوود لەو خۆ خاوێنكردنەوەیە ئەبینێ و، سەرەنجامیش هەموو هەر دێنەوە بۆ لای خوا.

وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ ۖ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ وَبِالزُّبُرِ وَبِالْكِتَابِ الْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا ۚ وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ ۚ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾



(١٩) کوێرو چاوساغیش یەکسان نابن و وەك یەك نین.

(٢٠) تاریکستانیو ڕووناکییش هەر یەکسان نابن و وەك یەك نین.

(٢١) سێبەرو بەرهەتاویش هەروا یەکسان نین و وەك یەك نین.

(٢٢) زیندوو مردوویش دیسان یەکسان نین و وەك یەك نابن. بێگومان خوا قسە ئەبا بەگوێی هەرکەسێکا مەیلی لێ بێو تۆ ناتوانی مردووی ناو گۆڕ وا لێ بکەی گوێی لە قسە بێ.

(٢٣) تۆ لە کەسێ بەولاوە نیت کە خەڵك لە سزای خوا ئەترسێنی.

(٢٤) بێگومان ئێمە تۆمان ناردووە بە مژدەدەر بۆ خواپەرستان و بە ترسێنەر بۆ لەخوا یاخییان و، هیچ میللەتێکیش نەبووە ترسێنێکی تیا نەنێررابێ.

(٢٥) ئەگەر ئەم کافرانە تۆ بە درۆزن دابنێن گوێ مەدەرێ چونکە کافرەکانی پێش ئەمانیش پێغەمبەرانی نێرراوە سەر خۆیانیان بە درۆزن دانا کە بە بەڵگەو کتێبی ئاسمانیی ڕێگا ڕوونکەرەوەوە نێررابوونە سەریان.

(٢٦) منیش پاش ئەو بەدرۆزندانانەی پێغەمبەران لە لایەن میللەتە کافرەکانیانەوە، ئەو کافرەپێغەمبەران‌بەدرۆزن‌دانەرانەم بە قارو غەزەبی خۆم گرت. جا نارەزایی من لە کارو کردەوەی ئەو کافرانە چۆن بوو و چۆنم سزادان ؟

(٢٧) ئایا تۆ نەتدیوە خوا ئاوی لە ئاسمانەوە ناردووەتە خوارەوەو بەو ئاوە چەندین بەرو بەرهەمی ڕەنگ و جۆر جیاجیامان پێگەیاندووە ؟ لە کێوەکانیش چەندین ڕێگاو هێڵی سپیو سووری ڕەنگ جیاواز و ڕەشی فرە ڕەش، واتە ئەمانەیشمان دروست کردووە ؟

(٢٨) لە نەوعی ئادەمیزادو کرم و مارو مێروو و چوارپێو ئاژەڵیش هەروەها ڕەنگ و جۆری جیاجیامان دروست کردووە. لە ناو بەندەکانی خوادا هەر زانایان لە خوا ئەترسن چونکە ئەوان باش شارەزای کارو کردەوەی خوان و پەی بە گەورەیی خوا ئەبەن. بێگومان خوا بەسەر خواستی خۆیا زاڵەو لە بەندەکانی خۆی خۆش ئەبێ.

(٢٩) بەڕاستی ئەو کەسانەی کتێبی خوا ئەخوێننەوەو نوێژ ئەکەن و لەوەی خوا پێیداون بەئاشکراو بەنهێنی خەرج ئەکەن لە ڕێی خوادا، ئەوانە بە هیوای بازرگانییەکن هەرگیز زیانی نایەتەرێو نابڕێتەوە.

(٣٠) بۆ ئەوەی خوا پاداشیان بە خێر بداتەوەو لە گەورەیی خۆیشی بۆیان زیاد بکا. بەڕاستی خوا گوناهبەخش و سوپاسگوزاری ئەوانەیە فەرمانبەرداریی ئەو ئەکەن. سوپاسگوزارییەکەیشی بەوەیە جەزای بەخێریان ئەداتەوە بەرانبەر کردەوە باشەکانیان.

وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴿٣٣﴾ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ ﴿٣٦﴾ وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾



(٣١) ئەو قورئانەی ئێمە بەوەحی بۆمان ناردووی هەر ئەوە حەق و ڕاستە نەك ئەوەی کافرەکان ئیددیعای ئەکەن و، هەر ئەو قورئانەیە باوەڕ بەڕاستیی ئەو کتێبە خواییانەی تر ئەکا کە لەپێش خۆیا هاتوون بۆ پێغەمبەران. بەڕاستی خوا لە بەندەکانی خۆی شارەزایەو هەموو شتێ ئەبینێ .

(٣٢) پاش ناردنی کتێبە پێشووەکان بۆ پێغەمبەرە ڕابووردووەکان، ئەم قورئانەمان بە میرات دا بەو کەسانەی هەڵمانبژاردبوون بۆ ئەوەی بە میرات بییاندەینیو وەری بگرن کە مەبەست میللەتی موسوڵمانانە. جا هەندێ کەس لەم میللەتە ستەم لە خۆیان ئەکەن و بەگوێرەی قورئانەکە ناجووڵێنەوە و، هەندێ کەسیشیان مامناوەندیو میانەکارن و نە زۆر گوێڕایەڵ و نە زۆر بێ گوێن و، هەندێ کەسیشیان بە ئیزنی خوا لە پێشەوەن بۆ چاکەکردن و، ئەم بەهرەی لەپێشەوەبوونە بۆ چاکە کردن گەورەییەکی مەزنە خوا بە کەسێکی بدا.

(٣٣) بۆ ئەوانە هەیە بەهەشتی (عەدن) ئەچنە ناوی‌و بە خشڵی زێڕو دوڕو مرواری ئەڕازێنرێنەوەو جوان ئەکرێن و پۆشاك و جلوبەرگیان لە بەهەشتا لە ئاوریشمە.

(٣٤) لەو بەهەشتەیانا سەناو ستایشی خوا ئەکەن و ئەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی غەمو پەژارەی ژیانی دنیاو ترسی ناخرشەڕیی قیامەتی لێ لاداین. بەڕاستی خوای ئێمە خوایەکی تاوانبەخش و سوپاسگوزارەو جەزای بەخێری خەڵك ئەداتەوە بەرانبەر هەر چاکەیەك بیکەن. (٣٥) ئەو خودایەی ئێمەی بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی لەم نشینگە بەردەوام و پایەدارەدا جێگیرکرد، نە ماندوویەتیمان تووش دێ تیایاو نە لە هیچیش بێزار ئەبین .

(٣٦) ئەوانەیش کە کافر بوون ئاگری دۆزەخیان بۆ هەیە، نە بڕیاری مردنێکی نوێیان ئەدرێ تا بمرن و بحەسێنەوەو لە سزای دۆزەخ ڕزگار بن و، نە سزای دۆزەخیان تۆزێ بۆ سووك ئەکرێ و، هەر کافرێکی تریش هەروا پاداش ئەدەینەوە.

(٣٧) ئەوانیش لە دۆزەخا ئەکەونە هاوار هاوارو ئەڵێن: خوایە! لەم دۆزەخەمان دەرکە با کردەوەیەکی چاك بکەین غەیری ئەو کردەوە خراپانەی لە دنیادا ئەمانکردن. جا خوایش پێیان ئەفەرموێ: ئایا ئێمە ئەوەندەمان تەمەن نەدانێ بەشی ئەوە بکا هەرکەس بتوانێ بیری تیا بکاتەوەو بزانێ چی چاکە تا بیکاو چی خراپە تا نەیکاو، پێغەمبەری لە ڕۆژی قیامەت ترسێنیشتان هاتەلاو گوێتان نەدایی‌و بە قسەتان نەکرد ؟ دە کەواتە بیچێژن، مرۆی ستەمکار هیچ یارمەتیدەرێکی بۆ نییە. (٣٨) بەڕاستی خوا هەموو نهێنییەکانی ئاسمان و ئەرز ئەزانێ‌و بەو خەیاڵاتە ئەزانێ کە بە ناو دڵی خەڵکا گوزەر ئەکا.

هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾



(٣٩) خوا ئەو خوایە ئێوەی کردووە بە جێگەنشینی خۆی لە تەسەڕروفکردن لە زەویدا. جا هەرکەس کافر ئەبیو بە فەرمانی خوا ناجوولێتەوە ئەوە زیانی کافرییەکەی بۆ خۆیەتی. کافریی کافرانیش هیچیان لای خوا بۆ زیاد ناکا لە نائومێدی لە ڕەحمەتی خواو زەرەرو زیان لیٚکەوتن بەولاوە.

(٤٠) تۆ پێیان بڵێ: ئەو بتانەتاان دیوە کە کردووتانن بە هاوبەشی خواو هاواریان لێ ئەکەن بێن بە فریاتانەوەو هاوار لە خوا ناکەن ؟ ئا پیشانم بدەن ئەم بتانەتان چییان دروست کردووە لە زەویدا ؟ یاخود ئاخۆ هاوبەشییەکیان لەگەڵ خوا هەیە لە دروستکردنی ئاسمانەکانا تا بەوە بێن بە هاوبەشی خوایەتیی خوا ؟ یاخود ئاخۆ ئێمە کتێبێکی خۆمانمان داونێ ئەو کتێبە بەڵگەیەکیان بداتە دەست کە هاوبەشی خوان ؟ نەخێر ئەمانە هیچیان نین. مەسەلە هەر ئەوەیە ئەم کافرە ستەمکارانە هەندێکیان کە گەورەکانیانن گفتی وا بە هەندێکی تریان ئەدەن کە بچووك و شوێنکەوتووەکانیانن تا بەو گفتانە باییان بکەن و هەڵیانخەڵەتێنن، وەك ئەوە کە ئەو بتانە هاوبەشی خوان و شتیان پێ ئەکرێو بەفریایانا ئەگەن.

(٤١) خوا ئاسمانەکان و زەوی ڕاگرتووەو ناهێڵێ لە شوێنی خۆیان لابچن و، ئەگەر لە شوێنی خۆیان لابچن کەس پاش ئەو کە بەرەڵڵای کردوون و لە شوێنی خۆیان لاچوون، نایانگرێتەوە. بەڕاستی خوا بەسەبرو حەوسەڵەیەو تاوانی تاوانباران ئەپۆشێ. (٤٢) قورەیشییەکان سوێندیان ئەخوارد بە خوا بە هەموو توانێکی سوێند خواردنیان، ئەیانوت: ئەگەر پێغەمبەرێکمان لای خواوە بێتەسەر بمانترسێنێ لە بێباوەڕی بە خوا، باشتر ئابینی ئەو پێغەمبەرە وەرئەگرین لە یەکێ لە میللەتەکانی جوولەکەو گاور کە پێغەمبەریان هاتبوە سەرو گوێ ڕایەڵی نەبووبوون. کەچی کاتێ پێغەمبەریان هاتەسەر، کە حەزرەتی موحەممەدە، هاتنەکەی هیچی لە جاران لا زیاترنەکردن خۆدوورگرتن نەبێ لە بەگوێ نەکردنی ئەو پێغەمبەرە کە ئیمانیان پێ نەهێنا. (٤٣) ئەمەیشیان لەوەوە بوو کە خۆیان بە زل ئەزانی لەسەر زەوییو لەبەر ئەوە بوو کە مەکری ناشیرینیان ئەکردو، مەکری ناشیرینیش سەرەنجام دەوری کەس ناداو بەسەر کەسا ناتلێتەوە بەسەر ئەوانەدا نەبێ کە کردوویانە. ئەمانە بە هیوای چین و چاوەڕێن چییان بێتەڕێ لەو سەرەنجامە بەولاوە کە بەسەر بێ باوەڕە پێشینەکانا هاتووە کە لە خوا یاخی بوون و گوێیان بۆ فروستادەی ئەو شل نەکردووە و؟ هەرگیز نابینی ئەو قانوونەی خوا بەسەر میللەتانیا جێ بەجێ کردووە لابداو بگۆڕێو هەمیشە هەر ئەوەیە.

(٤٤) ئایا ئەمانە بەسەر زەویدا نەگەڕاون تا سەیر بکەن سەرەنجامی میللەتە لەخوایاخیو بێ باوەڕەکانی پێش خۆیان چۆن بووە کە لەمانیش بەهێزترو تواناتربوون چ لەبارەی داراییو چ لەبارەی چەك و سیلاح و چ لەبارەی زۆریی ژمارەوە. بەڵام قەت خوا لەوانە نەبوە شتێ هەبێ پێی نەکرێو دەسەڵاتی بەسەریا نەشکێ نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا. بەڕاستی خوا بەهەموو شتێ ئەزانێو هەموو کارێ ئەتوانێ.

وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾

## سُورَةُ يسٓ

ترتيبها ٣٦ — آياتها ٨٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٧﴾ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكْرَ وَخَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ﴿١١﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾



(٤٥) ئەگەر خوا مۆڵەتی تاوانبارانی نەدایەو هەرکەس هەر تاوانێکی بکردایە دەسبەجێ تۆڵەی لێ بسەنرایە، هیچ بەسەر زەویدا ڕۆیشتوویەکی لە ئادەمزادو گیانلەبەرانی تر بەسەر پشتی زەوییەوە نەئەهێشت، بەڵام مۆڵەتیان ئەداو دوایان ئەخا هەر یەکە بۆ وادەیەك کە خۆی بۆی دیاری کردوون. جا هەرکاتێ کە وادەی دیاریکراوی هەرکامیان هات، خوا خۆی چاوی لە بەندەکانی خۆیەتیو ئەیانبینیو تۆڵەی خۆیانیان ئەداتە دەست.

## سوورەتی (یسٓ)

مەککەییە ئایەتی ٤٥ی نەبێ و، (٨٣) ئایەتە

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چییە، یاخود واتە: ئەی کەسێ کە ناوت یاسینەو مەبەستی پێغەمبەرە، یاخود ئەی ئادەمیزاد، بە گوێرەی زمانی خێڵی تەی کە لە ڕیشەدا (یا أنیسین) بوویو تەنها نیوەی دووهەمی مابێتەوە، وەك هەندێ لە تەفسیرنووسەکانی قورئان نووسیویانە.

(٢) سوێند ئەخۆم بە قورئانێ کە خاوەن حیکمەتە .

(٣) بێگومان تۆ یەکێکی لەوانەی نێرراون بۆ ڕێپیشاندانی ئادەمیزاد. (٤) لەسەر ڕێگایەکی ڕاستیشی. (٥) ئەو ڕێگا ڕاستە ڕێگای ئەو قورئانەیە کە خوای خاوەن عیززەت و هێزو میهرەبان نازڵی کردووە، یاخود ئەو قورئانەی سوێندم پێ خوارد نازڵ کراوی خوای خاوەن عیززەت و هێز و میهرەبانە. (٦) تۆ بۆ ئەوە ڕەوانە کراوی کەسانێکی وا لە سزای خوا بترسێنی کە باوك و باپیرانیان نەترسێنراون و پێغەمبەریان نەهاتووەتەسەرو لەبەر ئەوە لە فەرمانی خوا بێ ئاگان و هیچی لێ نازانن.

(٧) بەڕاستی ئەمانە ئەو فەرموودەیەی من بەسەر بەشی زۆریانا چەسپاوە کە وتوومە: دۆزەخ لە ئادەمیزادو پەرییان پڕئەکەم، چونکە ئەوانە ئیمان ناهێنن. (٨) ئێمە زنجیری بێ باوەڕیمان خستووەتە گەردنی ئەمانەو ئەو زنجیرانە ئەگەنە لای چەناکەیان و لەبەر ئەوە ئەوان ناتوانن مل دانەوێنن و سەریان هەڵبڕیوە بۆ لای ئاسمان.

(٩) ئەو بێ باوەڕانە بەڕادەیەك نوقمی بێ باوەڕینو هیچ ڕاستییەك بەدی ناکەن، لەبەردەمیانا دیوارێك و لە پشتیانەوە دیوارێکمان دروست کردووە، لەنێوان ئەو دوو دیوارەدا گەمارۆ دراون و بەرچاومان تاریك کردوون و هیچ نابینن. (١٠) چونیەکە بۆ ئەوان بیبیانترسێنی لە سزای خوا یان نەیانترسێنی، ئەوان لە هیچ حاڵێکا باوەڕ ناکەن و ئیمان ناهێنن. (١١) تۆ ناترسێنی بە ترساندنێکی وا سوودی هەبێ کەسێ نەبێ شوێنی قورئان بکەوێو لە پەناوە کە کەس ئاگای لێ نەبێ چی ئەکاو چی ناکا، لە خوا بترسێ. مرۆی وا مژدەی خوا لێخۆشبوون و پاداشێکی دەس بڵاوانەی بدەرێ کە لە لای خواوە بۆی دێ.

(١٢) بەڕاستی ئێمە مردووان زیندوو ئەکەینەوەو هەرچی کردەوەی چاك و خراپیان کردووە هەمووی لای خۆمان ئەنووسین و هەرچی کارێکی چاکیان بۆ پاش خۆیان بەجێهێشتووە هەمووی تۆمار ئەکەین و، هەرچی شتێ هەیە هەموویمان لە (لوح المحفوظ) بۆ خاوەنەکەی ژماردووەو نووسیومانە.

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَالِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾



(١٣) بــه نموونــه باســی خــاوەن و دانیشــتووانی دێــی (ئینتاکییــه ) بــۆ ئــەهلی مەککــە بکــە کــاتێ کــە فروستادەکانی عیسا پێغەمبەر هاتنە لایان.

(١٤) کاتێ کە دووکەسمان لە هاوڕێکان (حواریــون )ی عیســا نــاردە لایــان و ئەوانیش بە درۆزنیان دانان و، ئێمەیش بــە نــاردنی کەســێکی ســێیەم بــۆ یارمەتیدانیان پشتمان قایم کردن و هەموو تێکڕا بە ئەهلی دێکەیان وت: ئێمە نێرراوین بۆ لای ئێوە.

(١٥) ئەهلی دێکەیش پێیان وتن: ئێوە هیچ فروستادە نین و لە مرۆیەکی سادەی وەك ئێمە بەولاوە نین و خوا هیچ کتێبێکی ئاسمانیی نەناردووەتە خوارو ئێوە لە درۆ بەولاوە هیچ نالێن.

(١٦) فروستادەکانیش بــە ئــەهلی دێکەیان وت: خوا خۆی ئەزانێ ئێمە بۆلای ئێوە نێرراوین.

(١٧) هیچ ئەرکێکیشمان لە ئەستۆدا نییە ئەوە نەبێ ئەو وەحییەی کەوا خوا ناردوویەتی پێتانی ڕابگەیەنین بەئاشکرایی‌و ڕۆشنی.

(١٨) ئەهلی دێکە پێیان وتن: ئێمە پێوقودوومی ئێوە بۆ خۆمان بە نەگبەت ئەزانین و تووشی بەدبەختی هاتووین بە هۆی ئێوەوەو ئەگەر دەسبەردار نەبن لەم جۆرە قسانەتان سەنگەسارتان ئەکەین و سزایەکی سەختتان لە ئێمەوە تووش ئەبێ.

(١٩) فروستادەکان پێیان وتن: نەگبەتی‌و شوومیی ئێوە بە ئێمەوە نییەو لەگەڵ خۆتانایەو لە نەفسی خۆتانایە. ئایا هەر لەبەر ئەوە کە لە لایەنی ئێمەوە خواو ڕۆژی قیامەت و حیساب و کیتابتان خراوەتەوە یاد، خراپ بووین لەپێش چاوتانا ؟ نەخەیر مەسەلە ئەمە نییە، ئێوە خۆتان خێڵێکی لە سنوور لادەرو زیادەڕەون.

(٢٠) لەو ماوەیەدا پیاوێك بە هەڵەداوان لەوپەڕی شارەوە هات بۆ لای خەڵکەکە، ئەم پیاوە ناوی حەبیبی دارتاش بوو، بە خەڵکەکەی وت: خزمینە! شوێنی قسەی ئەم پیاوانە بکەون کە نێرراون بۆ لای ئێوە.

(٢١) شوێنی قسەی کەسانێ بکەون کە بە خۆڕایی ئامۆژگاریتان ئەکەن و داوای کرێتان لێ ناکەن و خوا ڕێگەی ڕاستی پیشان داون.

(٢٢) منیش چیمە ئەو خوایە نەپەرستم کە دروستی کردووم و هەموویشتان سەرەنجام بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە ؟

(٢٣) ئایا من چەند پەرستراوێکی هیچوپووچ لە خوا بەولاوە بۆ خۆم ڕائەگرم کە ئەگەر خوا ویستی تووشی زیانێکم بکا، تکاکارییان بۆم هیچ قازانجێکم پێ نەگەیەنی‌و ڕزگارم نەکەن ؟

(٢٤) من ئەگەر ئەو پەرستراوە هیچوپووچانە بۆ خۆم ڕاگرم و بیپانپەرستم، بێ گومان لە گومڕاییەکی ئاشکراو دیاردام. (٢٥) ئەی فروستادەکان! وا من بەڕاستی ئیمانم بە خواکەی ئێوە هێنا، کەواتە باش گوێتان لێم بێ.

(٢٦) ئەهلی دێکە لەسەر ئەم قسانەی کوشتیان. لەوکاتەدا کە ئەیانکوشت، لە لایەن خواوە پێی ڕاگەیەنرا کەوا تۆ بەهەشتیت. ئەویش وتی: خۆزگە خەڵکی دێکەم ئەیانزانی ..

(٢٧) کەوا خوای خۆم بە چیی لێم خۆش بوو و قەدری گرتم و خستمیە بەهەشت! بەڵکو ئەوانیش دەسیان لە بێ باوەڕی هەڵگرتایەو فەرمانبەرداریی خوایان بکردایە.

۞ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمۡ يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ أَنَّهُمۡ إِلَيۡهِمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴿٣٢﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبًّا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعۡنَٰبٍ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرٍّ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسۡبَحُونَ ﴿٤٠﴾



(٢٨) ئێمه پاش كوژرانی ئهو هیچ لهشكرێكمان له ئاسمانهوه نهنارده سهر خێڵهكهی تا تۆڵهی ئهو بێباوهڕیی خۆیانیان لێبسێنینهوهو لهوانهیش نییه سوپایهكی وا بنێرین.

(٢٩) سزایان لهوه زیاتر نهبوو تاقه یهك نهعرهتهمان بهسهرداكردن و كوتوپڕ ههموو ساردبوونهوه و ههناسهیان لێ چنرا..

(٣٠) ئهی داخ بۆ ئهم بهنده بێئاگایانه ! هیچ پێغهمبهرێكیان نههاته سهر، ئیللا ئهكهوتنه گاڵته و لاقرتی پێ كردنی.

(٣١) ئهوه ئاخۆ نهیاندیوه چهندین وهچهمان بهر لهوان لهناوبردووه و هیچ كام لهو وهچه لهناوبراوانه ناگهڕێنهوه بۆ لای ئهوان؟

(٣٢) هیچ كامیش لهو وهچانه نییه، كۆن و نوێیان، ئیللا ههموویان لای ئێمه ئاماده ئهكرێن و ئههێنرێنه بهردهستمان.

(٣٣) نیشانهو بهڵگهی توانایی خوایه بۆیان زهویی مردووی وشكی بێ شینایی كه ئێمه زیندووی ئهكهینهوهو گژوگیای لێ ئهڕوێنین و دانهوێڵهی لێوه دهرئهكهین و ئهوانیش لهو دانهوێڵهیه ئهخۆن.

(٣٤) باخی جوان جوانی دارخورماو دارمێویشی تیا سهوز ئهكهین و كانیاوی تیا ههڵئهقوڵێنین.

(٣٥) تا لهبهری ئهو باخانهی باسمان كردن بخۆن و ههروهها بهرههمی كاری دهستی خۆیشیان بخۆن كه لهبهری ئهو باخانهی دروست ئهكهن وهك دۆشاو و باسووق و مێوژ. جا ئایا لهگهڵ ئهمهیش هێشتا سوپاسی خوای نیعمهت بهخش ناكهن؟

(٣٦) پاكی و بێگهردی بۆ ئهو خوایه جۆرهها داری بهردار و شینایی خواردهمهنیی دروست كردووه لهوهی كه زهوی ئهیڕوێنێ و لهو شتانهیش كه ئهوان خۆیان نازانن چییه و له كام شوێنهوه و له چی پهیدا بووه؟

(٣٧) شهویش نیشانهو بهڵگهی توانایی خوایه بۆ ئهو كافرانه، كه دێین پێستی ڕووناكی ڕۆژی لێ دائهڕنین، ئیتر ههموو ئهم جیهانه ئهكهونه تاریكییهوه.

(٣٨) ههروا ڕۆژیش نیشانهی گهورهیی خوایه كه له مهداری خۆیا دێ و ئهچێ تا كاتی ئارامگرتنی به فهرمانی خوا و، ئهمهیش به تهقدیر و ڕێكخستنی خوایه كه دهسهڵاتی بهسهر ههموو شتێكا ئهشكێ و به ههموو شتێ ئهزانێ.

(٣٩) مانگیشمان بڕیار داوه به خاوهنی چهند ماواو مهنزڵ تا له سهرهنجاما له ئاخری مانگا وهك داری وشك ههڵاتووی كۆنی لێدێتهوه.

(٤٠) نه ڕۆژ بۆی ههیه خهتی هاتوچۆی مانگ بگرێ و نه شهویش له ڕۆژ پێش ئهكهوێ. واته هیچ كام ناتوانێ له خهتی خۆی لابدا، یاخود نه ئهویش زاڵ ئهبێ بهسهر ڕۆژا و ههموو كاتهكانی داگیر ئهكاو، ههركام بۆخۆی له فهلهكی تایبهتی خۆیا و له دائیرهیهكی خوسووسیدا مهلهوانی ئهكا.

وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ (٤١) وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ (٤٢) وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ (٤٣) إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ (٤٤) وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (٤٥) وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ (٤٦) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ (٤٧) وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (٤٨) مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ (٤٩) فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ (٥٠) وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ (٥١) قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ (٥٢) إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ (٥٣) فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (٥٤)



(٤١) نیشانەیەکی گەورەیە بۆ ئەمانە بۆ گەورەیی و توانایی خوا ئەمە کەوا ئێمە نەوڵادی ئەمانەمان هەڵگرتووە لە کەشتی پڕ لە ڕێبوارانا و ئەیانبەین بۆ ئەم لا و ئەولا. مەبەست لەوەیە کە بازرگانانی مەککە کوڕی خۆیان ئەنێرن بۆ وڵاتی دوور بۆ بازرگانی، یا ئەوە کە خۆیان بە کەشتی ئەڕۆن بۆ وڵاتی دوور و ژن و منداڵیشیان لەگەڵ خۆیان ئەبەن و سواری کەشتییان ئەکەن.

(٤٢) دروستیشمان کردووە بۆیان لە چەشنی کەشتیی دەریا شتێ کە لە وشکانا سواری بن وەك حوشتر کە حوشتر پێی ئەڵێن ( کەشتیی بیابان ) یاخود ئەمیش لە دەشت و بیابانا ئەو ئەرکە ئەبینێ کە کەشتی لە دەریادا ئەیبینێ.

(٤٣) ئەگەر بیشمانەوێ نوقمی دەریایان ئەکەین و ئەیانخنکێنین، ئیتر نە فریادڕەسێ هەیە بێ بە هاواریانەوە و نە ڕزگاریش ئەکرێن بەو فریادڕەسە ئەگەر فەرزیش بکەین ببێ.

(٤٤) مەگەر میهرەبانییەك لە لایەن ئێمەوە ڕزگاریان بکا بۆ ئەوەی تا وەختێکی دیاریکراو بژین و ڕابوێرن.

(٤٥) کاتێ بەم خوانەناسانە بوترێ: لەخوا بترسن و خۆ لەو سزایەی خوا دوور بگرن کە لەبەر دەستانایە کە سزای دنیایە و لەو سزایەی کە لە پاشەوەیە کە سزای ڕۆژی قیامەتە بەڵکو خوا ڕەحمتان پێ بکا. . وەڵامی ئەم قسە لە ئایەتەکەدا نییە، بەڵام لە ئایەتی پاشەوە دەر ئەکەوێ، واتە: موبالات ناکەن و گوێ نادەنێ.

(٤٦) هیچ موعجیزەیەك و هیچ کارەساتێك نایەتە لایان و پیشانیان نادرێ، ئیللا گوێی نادەنێ و ڕووی لێوەرئەچەرخێنن. (٤٧) کاتێکیش پێیان بوترێ: لەو ماڵ و سەروەت و سامانەی خوا پێی‌داون خەرج بکەن بۆ فەقیر و هەژار لە ڕێی خوادا، لە وەڵامی ئەوانەدا ئەم قسەیەیان بۆ ئەکەن کە ئەڵێن: ئایا ئێمە خواردەمەنی بە کەسانێ بدەین ئەگەر خوا خۆی خواستی لەسەر بوایە خۆراکی ئەدانێ؟ ئێوە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا نەبێ نین. ئەم ڕستەی دواییە یا خوا بەو کافرانەی ئەفەرموێ و بەیانی گومڕاییان ئەکا، یا خوا بە زوبانی ئەوانەوەی فەرمووە کە داوایان لێ کراوە خێر و سەدەقە بۆ هەژار و فەقیر بکەن و ئەوانیش وەڵامی داواکەرەکانیان پێ داوەتەوە.

(٤٨) ئەم کافرانە ئەڵێن: ئەم سزا وەعدەپێدراوە کەی دێتەدی ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن؟

(٤٩) ئەوانە چاوەڕوانی هیچ ناکەن لە هاوارێ بەولاوە کە دایان ئەگرێ لەکاتێکا کە ئەوان لە کار و کاسبیی خۆیانا خەریکی دەنگە دەنگ و هەرا و مشتومڕن. (٥٠) ئیتر نە توانی وەسیەت کردنیان هەیە بۆ کەسوکاریان و نە ئەگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان، بەڵکو هەر لە شوێنی خۆیانا بە بیستنی ئەو هاوارە گیانیان دەرئەچێ.

(٥١) فوویش ئەکرێ بە (صوور) داو، ئیتر کوتووپڕ ئەوان لە گۆڕەکانیان دەرئەچن و بەهەڵەداوان ئەچن بۆ لای خوای خۆیان، بۆ مەیدانی لێپرسینەوە. (٥٢) ئەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئێمە ! ئەوە کێ لەم شوێنەدا بە خەبەری هێناین کە تیا نووستبووین ! ئەم بەخەبەرهێنانە ئەوەیە کە خوای میهرەبان لە دنیادا گفتی دابووینێ و پێغەمبەرەکانی خوایش کە ئەم خەبەرەیان ئەدایێنێ ڕاستیان فەرموو. (٥٣) ئەو بەخەبەرهێنانە تەنها بە تاقە هاوارێ بوو کە دەنگی فووکردن بوو بە صووردا و کوتوپڕ هەموو بەجارێ لای ئێمە حازر کران. (٥٤) جا ئەمڕۆ هیچ کەسێ هیچ ستەمی لێ ناکرێ لە کەم و لە زۆر و کەستان پاداشتان نادرێتەوە بە گوێرەی ئەو کارانە نەبێ لە دنیادا ئەتانکردن.

إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ
فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم
مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ
أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا
تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ
هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦١﴾ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ
أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ
﴿٦٣﴾ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ
عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ
يَكۡسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ فَٱسۡتَبَقُواْ
ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوۡ نَشَآءُ لَمَسَخۡنَٰهُمۡ
عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ
﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٦٨﴾
وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ
﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾



(٥٥) بەڕاستی ئەهلی بەهەشت ئەمڕۆ بە ناز و نیعمەت و خۆشی و ڕابواردنی خۆیانەوە خەریکن.

(٥٦) خۆیان و ژنەکانیان لە سێبەردا لەسەر چارپایەی جوان پاڵیان لێ داوەتەوە.

(٥٧) لە بەهەشتا میوەیان بۆ هەیە و هەرچی داوابکەن لە بەهەشتا بۆیان هەیە.

(٥٨) سەلامیان بە وتن لەلایەن خوای میهرەبانەوە بۆ دێ.

(٥٩) ئەی تاوانبارەکان ! ئێوەیش ئەمڕۆ جوێ ببنەوە لە پیاوە باشەکان. ئەم ڕستەیەیش بە تاوانبارانی ئەهلی دۆزەخ ئەوترێ.

(٦٠) ئەی بەرەی ئادەمزاد ! ئایا من کاتی خۆی ڕام نەسپاردن پێم نەوتن: کەوا بەندەگی بۆ شەیتان مەکەن و مەیپەرستن، شەیتان بێگومان دوژمنێکی ئاشکراتانە.

(٦١) بەندەگی بۆ من بکەن و من بپەرستن و ئەمەیە ڕێگای ڕاست؟

(٦٢) بەڕاستیش شەیتان خەڵکێکی زۆری لێ گومڕاکردن. ئایا ئێوە عەقڵ و فامتان نەبوو وا بە گوێی شەیتانتان کرد؟

(٦٣) ئەمەی کە ئێستا ئەیبینن ئەو دۆزەخەیە کە گفتتان پێ ئەدرا کەوا بەنسیبتان ئەبێ.

(٦٤) دە ئەمڕۆ بڕۆنە ناوی لە سزای ئەو کوفرەدا کە کاتی خۆی ئەتانکرد.

(٦٥) ئەمڕۆ دەمیان مۆر ئەکەین بۆ ئەوەی نەتوانن هیچ بڵێن و، دەستیان قسەمان بۆ ئەکاو پێیان شایەتیمان بۆ ئەدا لەسەر ئەو کردەوانەی کاتی خۆی کردوویانن، واتە یا نیشانەی گوناهەکانیان دەرئەکەوێ یا هەر دەسوپەلیان دێنینە گۆ.

(٦٦) ئەگەر بیشمانویستایە چاوەکانیانمان تەخت و بێ بینایی ئەکرد، جا ئەکەوتنە پەلە بۆ ئەوەی ڕێ بدۆزنەوە و بڕۆن، بەڵام چۆن ڕێیان دەرئەکرد تا بڕۆن؟

(٦٧) ئەگەر بیشمانویستایە هەر لە شوێنی خۆیانا ئەمانگۆڕین و پێستی گیانلەبەرێکی ترمان ئەکرد بەبەریاناو ئیتر نەیانئەتوانی بڕۆن بەم لاو بەولادا و نەیشئەگەڕانەوە بۆ حاڵی جارانیان.

(٦٨) ئەوەیش کە تەمەنی درێژکەین و زۆری بژیێنین ئەیشیچەمێنینەوە و باڵای کووڕ ئەکەین ڕۆژبەڕۆژ لەڕ و لاوازتری ئەکەین. دەسا هێشتا ئەمانە نافامن ئادەمزاد لە خودی خۆیا زەعیفە و خوا ئەتوانێ هەموو حاڵێکی بەسەردا بهێنێ؟ (٦٩) ئێمە موحەممەدی پێغەمبەری خۆمانمان فێری شیعردانان نەکردووەو شیعر وتنیش شایانی ئەو نییە و بۆی ڕەوا نییە چونکە شیعر زیادەڕۆیی زۆری تیایە و ئەویش ئەبێ هەر ڕاستی بڵێ. ئەمەی ئەو لە خواوە بە خەڵکی ئەگەیەنێ، وەبیرهێنانەوەی خوا و ڕۆژی قیامەت و قورئانێکی ڕێگا ڕوونکەرەوەیە بۆ بەرەی ئادەمزاد.

(٧٠) بۆ ئەوە نێرراوەتە خوارەوە هەموو ئەو کەسانە بترسێنێ کە دڵ و دەروونیان زیندووە و سزای ڕۆژی قیامەتیش واجب ببێ بۆ ئەوانەی کافرن و نایەنە سەر ڕێگەی ڕاست.

أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَٰمًا فَهُمْ لَهَا
مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾
وَلَهُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَٱتَّخَذُواْ
مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ
نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ
إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا
خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا
مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾
قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ
﴿٧٩﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم
مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ
بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾
إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾
فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾

## سُورَةُ الصَّافَّاتِ

ترتيبها ٣٧ — آياتها ١٨٢



(٧١) ئاخۆ ئەم کافرانە نابینن کەوا ئێمە ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ و حوشتر و وڵاخی بەرزەمان لەبەرهەمی دەستی قودرەت و توانایی خۆمان بۆ دروست کردوون و، ئێستا ئەوان خاوەنی ئەو دروستکراوانەی ئێمەن؟ .

(٧٢) ئەو ئاژەڵ و وڵاخ و وڵاخی بەرزانەیشمان بۆ ڕام و ملکەچیش کردوون. هەیانە سواریان ئەبن و بۆ سواری بەکاریان ئەهێنن و هەیشیانە شیر و ماست و کەرە و ڕۆن و گۆشتەکەیان ئەخۆن.

(٧٣) گەلێ سوود و قازانج بۆ ئەوان هەیە لەو گیانلەبەرانەدا و، نۆشەمەنیی وەك شیرو ماست و دۆو، لەگەڵ ئەوەیش سوپاسی خوای خۆیان ناکەن.

(٧٤) سەرەڕای ئەوەیش کە سوپاسی خوا ناکەن بتیان ڕاگرتووە بۆ پەرستن و خوا ناپەرستن و بەهیوای ئەوەن لەلایەن ئەو بتانەوە یازمەتییان بدرێت.

(٧٥) ئەو بتانە ناتوانن یارمەتی ئەو بت پەرستانە بدەن کەچی ئەو بتپەرستانە سەربازی ئامادەکراون بۆ خزمەتکردنی ئەوان.

(٧٦) دەسا با قسەی ئەوان دڵ گرانت نەکا کە ئەڵێن: بتەکانیان هاوبەشی خوان، یا تۆ لە ئیددیعای پێغەمبەرایەتیدا بە درۆزن دائەنێن. ئێمە ئاگامان لێیە بە پەنامەکی چییان لە دڵایە و بە ئاشکرا چی ئەڵێن. (٧٧) ئایا ئادەمزاد نازانێ ئێمە ئەومان لە تۆمێ دروست کردووە لە پیاوەوە ئەگاتە منداڵدانی ئافرەت، کەچی کە پێگەیشت ئەبێ بە دوژمنێکی دیار و ئاشکرا؟

(٧٨) کابرای خوانەناس ئێسقانێکی ڕزیوی بە نموونە بۆ هێناینەوە کە گوایە مردوو زیندوو ناکرێتەوە و دروستکردنی خۆیی لەیادچوو کە چۆن لە دڵۆپێ ئاو دروستمان کردووە. وتی: کێ ئێسقانی ڕزیو زیندوو ئەکاتەوە؟ مەبەستی ئەوەبوو کەس ناتوانێ زیندووی بکاتەوە.

(٧٩) تۆیش، ئەی موحەممەد، لە وەڵامیا بڵێ: ئەو کەسە زیندووی ئەکاتەوە  کە یەکەمجار دروستی کردووە کە خوایەو ئاگای لە هەموو شتێکیش هەیەو، ئەزانێ مرۆ کە مرد چیی لێ دێ‌و، کە ڕزیی خۆڵەکەی ئەبێ بەچی‌و ئەکەوێتە کوێ‌و چۆن کۆئەکرێتەوەو ئەخرێتەوە پاڵ یەك و، بنیادەمەکەی جارانی لێ دروست ئەکرێتەوە.

(٨٠) ئەو خوایەی لە داری سەوزی تەڕی ئاودار ئاگری بۆ دروست کردوون کە ئاگرو ئاو پێکەوە کۆنابنەوەو ئێوە بەگورجی ئاگر لەو دارە تەڕە ئاودارە هەڵئەگیرسێنن. ئەم دارە تەڕە ئاودارە کە ئاگری لێوە هەڵئەگیرسێ، دوو جۆرە دارن ئەهێنرێن بەیەکاو ئاگریان لێوە هەڵئەگیرسێ.

(٨١) ئایا ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە ناتوانێ مرۆی تری وەك ئەو مرۆیانە لە شێوەی ئەوانا دروست بکاتەوە؟ بەڵێ وەڵڵاو، ئەو خوایە خوایەکی دروستکەری هەموو شتێك‌و زانا بە هەموو شتێکە.

(٨٢) کاری خوا کاتێ کە بییەوێ شتێ ببێ هەر ئەوەندەیە بفەرموێ: ببەو ئەو شتەیش دەسبەجێ ئەبێ‌و دێتەدی.

(٨٣) دەی پاکی لە هەموو خەوش‌و ناتەواوییەك بۆ ئەو خوایە فەرمانڕەواییی هەموو شتێ لە دەستی ئەوایەو هەموویشتان هەر بۆ لای ئەو ئەگێڕرێنەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجْرًا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَٰحِدٌ ﴿٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ ﴿٥﴾ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ فَٱسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ۚ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍۭ ﴿١١﴾ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ۞ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾



## سوورەتی (الصَّافات)

مەککەیی‌یەو، (١٨٢) ئایەتە

(١) سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی ڕیزیان بەستووە بە ڕیزبەستن بۆ خواپەرستی.

(٢) ئەنجا سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی مەنعی شەیتانەکان ئەکەن لە گوێگرتن لە ئاسمانا، بە مەنع کردنی توند.

(٣) ئەنجا سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی باسی گەورەیی و توانایی خوا بەسەر پێغەمبەرانا ئەخوێننەوە.

(٤) سوێند ئەخۆم کەوا بێ‌گومان خودای ئێوە یەك تاقە خوایە.

(٥) خوای ئاسمانەکان و زەوی و چی لە نێوانیانایەو خوای خۆرەڵاتەکانە.

(٦) بێ گومان ئێمە ئاسمانی لە ئەرزەوە نزیکترمان بە جوانییەك کە جوانیی ئەستێرەکانە، ڕازاندووەتەوە.

(٧) پاراستوویشمانە بە پاراستن لە هەر شەیتانێکی بەلەسەو لەفەرماندەرچوو.

(٨) ئەو شەیتانانە گوێ ناگرن بۆ فریشتەکانی کۆڕی باڵا ئیللا لە هەموو لایەکەوە نێزەکی فەزاسمیان تێ ئەگیرێ بۆئەوەی نەهێڵرێ سەرکەون و گوێیان لە قسەو باسی ناو فریشتەکان بێ.

(٩) بۆ گێڕانەوەیان بە سووکی‌و، بۆیشیان هەیە سزایەکی سەخت و هەمیشەیی.

(١٠) مەگەر شەیتانێ لەپڕ قسەیێ لە دەمی فریشتەیەك بفڕێنێ، ئەویش دەسبەجێ نێزەکێکی ڕوونی فەزاسمی شوێن ئەکەوێ. (١١) جا تۆ لەو بتپەرستانەی مەککە بپرسە ئاخۆ ئەوان سەخت و زەحمەتترن لە ڕووی دروست کرانەوە یا ئەم ئاسمان و زەوی‌و ئەستێرەو فریشتانە؟ ئێمە ئەوانمان لە قوڕێکی لکاو دروست کردووە. (١٢) بەڵکو تۆ سەرت سووڕ ئەمێنێ لە نەفامیی ئەو بتپەرستانە کە شوێنی ڕاستی ناکەون و، ئەوانیش گاڵتەیان دێ بە سەرسووڕمانەکەی تۆ.

(١٣) کە ئامۆژگارییش بکرێن پەند وەرناگرن.

(١٤) کە موعجیزەیەکیش ببینن گاڵتەی پێ ئەکەن و،

(١٥) ئەیشڵێن: ئەم موعجیزەیە لە جادوویەکی ئاشکرا بەولاوە نییە.

(١٦) ئایا ئێمە کە مردین و ڕزین و بووین بە خۆڵ‌و ئێسقان، بەڕاستی زیندوو ئەکرێینەوە؟

(١٧) یان باوك و باپیرە پێشینەکانمان زیندوو ئەکرێنەوە؟

(١٨) تۆیش لە وەڵامیانا بڵێ: بەڵێ ئێوەیش و باپیرانیشتان زیندوو ئەکرێنەوەو لەبەر هێزو توانایی خوا زەلیل و داماو ئەکەون. (١٩) هاتنی ڕۆژی قیامەت و زیندوبوونەوەی ئێوە تەنها تێخوڕینێکی توندی ئەو فریشتەیەیە ئەم کارەی پێ سپێرراوە ئیتر ئەبینی وا ئەو خەڵکە هەموو زیندوو بوونەتەوەو ئەڕوانن و سەیری یەکتری ئەکەن.

(٢٠) لەو کاتەیشدا ئەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئێمە ! ئەمە ڕۆژی جەزایە.

(٢١) ئەمە ئەو ڕۆژی جوێکردنەوەی حەق و ناحەقەیە لەیەك کە ئێوە باوەڕتان پێ نەئەکردو بە درۆتان دائەنا.

(٢٢) خوا لەو ڕۆژەدا فەرمان بە فریشتەکانی ئەدا ئەفەرموێ: ئەو کافرە ستەمکارانەو ژنەکانیان و ئەو بتانەی ئەیانپەرستن هەموو کۆبکەنەوە. (٢٣) کە ئەوانیان ئەپەرست و خوایان نەئەپەرست و، ڕێگای دۆزەخیان پیشان بدەن.

(٢٤) ڕایشیان بگرن، ئەوان بەرپرسیارن و پرسیاریان لێ ئەکرێ.

مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوا إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُوا بَل لَّمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا إِنَّا لَذَائِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُو آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمْ لَذَائِقُو الْعَذَابِ الْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُولَٰئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَاكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿٤٥﴾ بَيْضَاءَ لَذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾



(٢٥) پێیان ئەوترێ: ئەوە چیتان لێ قەوماوە یارمەتیی یەکتر نادەن؟
(٢٦) نەخەیر، ئەوانە ئەمڕۆ زەلیل و ملکەچن و خۆیان بەدەستەوە داوە.
(٢٧) جا هەندێکیان ڕووئەکەنە هەندێکی تریان و لە یەکتر ئەپرسن و ئەکەونە ڕەدوبەدەڵ.
(٢٨) ڕووئەکەنە گەورەو سەرەکەکانیان و پێیان ئەڵێن: ئێوە لای ڕاستەوە یا لە لایەنی هێزو دەسەڵاتەوە ئەهاتنە سەرمان و ناچارتان ئەکردین لە حەق لابدەین.
(٢٩) ئەوانیش لە وەڵاما پێیان ئەڵێن: نەخەیر خەتای ئێمە نەبوو، ئێوە هەر خۆتان بێباوەڕ بوون.
(٣٠) ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان بە سەرتانا نەبوو، بەڵکو ئێوە هەر خۆتان خێڵێکی لەحەقلاداو بوون.
(٣١) بۆیە وا فەرموودەی خوای خۆمانمان بەسەردا هاتەدی کە ئەبێ سزای دۆزەخ بچێژین و ئەوەتا ئەیچێژین.
(٣٢) جا ئێمە ئێوەمان گومڕا کرد. بەڕاستی ئێمە خۆمان گومڕا بووین.
(٣٣) جا بە ڕاستی ئەوانە هەموویان ئەو ڕۆژە لە سزادا هاوبەشن.
(٣٤) بێگومان ئێمە تاوانباران بەو دەردە ئەبەین و وایان لێ ئەکەین.
(٣٥) ئەوانە، بەڕاستی، وا بوون: کاتێ پێیان بوترایە هیچ خوایەك نییە بەحەق عیبادەتی بۆ بکرێ لەو خوا بەولاوە کە ناوی (الله)یە، دەمار ئەیگرتن و خۆیان لە ئاستی وشەی خوابەیەکزانینا بە زل ئەزانی. (٣٦) ئەیشیانوت: ئایا ئێمە خواکانی خۆمان واز لێ دێنین و دەستیان لێ هەڵئەگرین بۆ شاعیرێکی شێت؟ کە مەبەستیان پێغەمبەرە گوایە شاعیریشەو شێتیشە.
(٣٧) نەخەیر، ئەو بتپەرستانە نەفامن، پێغەمبەر نە شاعیرەو نە شێتە، بەڵکو ئایینی ڕاستی لە لایەن خواوە هێناوەو باوەڕیشی بە هەموو ئەو پێغەمبەرانە هەیە کە خوا پێش ئەو ناردوونی.
(٣٨) بەڕاستی ئێوە سزای سەخت ئەچێژن. (٣٩) جەزایشتان نادرێتەوە بەوە نەبێ کە خۆتان ئەتانکرد.
(٤٠) بەڵام ئەو بەندانەی کە خاوێن و بێگەردن لە هاوبەش دانان بۆ خواو بێ فەرمانی کردنی، ئەوانە ئەمین و بێترس ئەبن لە سزا. (٤١) ئەوانە ڕۆزییەکی دیاری کراویان لە لایەن خواوە بۆ هەیە.
(٤٢) ڕۆزییەکەیان بریتییە لە میوەجات و قەدریان لێ ئەگیرێ.
(٤٣) لە بەهەشتی نازو نیعمەتا. (٤٤) لە سەر تەختێ بەرانبەر بەیەك.
(٤٥) پیاڵەی شەرابی سافیان بەسەرا ئەگێڕن.
(٤٦) شەرابەکەی بەسەریانا ئەگێڕن سپییەو مایەی لەزەت و خۆشییە بۆ ئەو کەسانەی ئەیخۆنەوە.
(٤٧) نە هیچ گێروگرفتێکی پێوەیە وەك شەرابی دنیاو، نە ئەو کەسەی پێ سەرخۆش ئەبێ کە ئەیخواتەوە.
(٤٨) حۆریگەلی وایشیان لایە کە چاویان تەنها بڕیوەتە مێردەکانیان و چاوڕەشن.
(٤٩) ئەڵێی هێلکەی داپۆشراون کە گەردی لێ نەنیشتبێ.
(٥٠) دوای خواردنەوەی شەرابەکەیان هەندێکیان ڕووئەکەنە لای هەندێکیان و لە یەکتری ئەپرسن.
(٥١) یەکێکیان لەناو قسەدا بە یەکێکیان ئەڵێ: من لە دنیادا هاوڕێیەکم هەبوو.

يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا
لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ
ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى
لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا
ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾
لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ
ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ
تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ
﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ
عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾
إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾
وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم
مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾
إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ
ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾



(٥٢) پێی ئەوتم: ئایا تۆ لەوانەی باوەڕ بە قسەی ئەو پێغەمبەرە ئەکەن لە بارەی زیندووبوونەوەوە لە پاش مردن؟
(٥٣) ئایا ئێمە کە مردین و بووین بە خۆڵو ئێسقان، ئایا ئێمە زیندووئەکرێینەوەو جەزامان ئەدرێتەوە؟
(٥٤) وتی: ئایا ئێوە تەماشای ئەهلی دۆزەخ ئەکەن و بۆیان ئەڕوانن تا بزانن ئەو شەخسەی لە دنیادا برادەرم بوو و وای پێ ئەوتم، ئێستا لە دۆزەخدا لە چ شوێنێکایە؟
(٥٥) جا سەیری کردن، واتە: سەیری دۆزەخییەکانی کردو، ناسراوەکەی خۆی دی لە ناوەڕاستی دۆزەخا.
(٥٦) جا ئەم شەخسە بەهەشتییە بە کۆنەبرادەرە ئێستا دۆزەخییەکەی خۆی وت: قەسەم بە خوا نزیك بوو بمفەوتێنی و ببی بە هۆی کافربوونم.
(٥٧) ئەگەر نیعمەتی خوای خۆم نەبوایە منیش یەکێك ئەبووم لەوانەی ئامادەی ناو دۆزەخ کراون.
(٥٨) جا توخوا بەڕاست ئێمە لەوانە بووین کە نەمرین.
(٥٩) تەنها مردنی یەکەمان نەبێ و، لە قیامەتا سزامان نەدرێ؟
(٦٠) بەڕاستی سەرکەوتنی گەورە ئەم باوەڕبەخواو بەڕۆژیدواییکردنو ڕزگاربوون لە ئاگری دۆزەخەیە.
(٦١) دەسا با ئەوانەی کار ئەکەن، کار بۆ ئامانج و مەبەستی وا بکەن.
(٦٢) ئایا بەهەشت و نازو نیعمەتی بەهەشت ماواو مەنزڵی چاکە، یا درەختی زەققووم کە لە بەرەکەی بخۆی؟
(٦٣) ئێمە ئەو درەختەمان کردووە بە مایەی سەرلێشێوانی کافرەکان کە خۆیان بەوە کافر ئەکرد ئەیانوت درەخت چۆن لەناو ئاگری دۆزەخا ئەڕوێ و سەر دەردێنێ؟
(٦٤) زەققوومیش درەختێکە لە بێخی دۆزەخەوە ئەڕوێ و سەر دەردێنێ.
(٦٥) هێشووی ئەو درەختی زەققوومە لە ناشیرینییا لە سەلکە شەیتان ئەچێ.
(٦٦) بەڕاستی ئەهلی دۆزەخ لە بەری ئەو درەختە ئەخۆن و ورگی خۆیانی لێ هەڵئاوسێنن و پڕی ئەکەن.
(٦٧) سەرەڕای ئەوەیش ئەو درەختی زەققوومە شلەیەکی ئاوێتەی کوڵ بە کوڵیشی بەسەرەوەیە.
(٦٨) پاش ئەمەیش بەڕاستی سەرەنجامیان بۆ دۆزەخەو بۆ ئەوێ ئەگێڕرێنەوە.
(٦٩) ئەمانە باوك و باپیرانی خۆیانیان بە گومڕایی دیوە.
(٧٠) جا بۆیە ئەوانیش بە هەڵەداوان شوێن پێی ئەوان هەڵئەگرن.
(٧١) بەڕاستی، پێش ئەوانیش بەشی زۆری خەلکە پێشینەکان گومڕا بوون.
(٧٢) ئێمەیش، بەڕاستی، چەند پێغەمبەری خەڵك لەسزای خواترسێنمان نارده سەر ئەوان.
(٧٣) جا سەیرکە سەرەنجامی ئەو ترسێنراوانە چۆن بوو کە گوێیان بۆ پەیامی خوا شل نەکرد کە بە پێغەمبەرانا بۆیان نێررابوو. (٧٤) تەنها بەندە دڵسۆزەکانی خوا نەبێ کە لە خواو سزای ڕۆژی قیامەت ترسان و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاریان بوو. (٧٥) بەڕاستی نووح بانگی لێ کردین و هاواری فریاکەوتنی کردو، ئێمەیش چاکترین کەسێکین بە دەم هاوارو بانگی هاوارکەرێکەوە بچێ. (٧٦) خۆی و ماڵ و منداڵەکەیمان لە بەڵای گەورەی تۆفانی ئاو ڕزگار کرد.

وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾ وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾



(٧٧) هەموو کافرەکانمان فەوتاندو تەنها نەوەی ئەومان هێشتەوە.
(٧٨) مەدح و ستایشی ئەومانیش لەناو نەوەکانی لەوەپاش و ئەوانەدا هێشتەوە کە لە تۆفان ڕزگاربوون و نەخنکان.
(٧٩) سەلام لەسەر نووح بێ لەناو هەموو جیهانی ئادەمزادو فریشتەو پەرییاندا.
(٨٠) ئێمە، بەڕاستی، ئاوا پاداشی ئەوانە ئەدەینەوە کە چاکە ئەکەن وەك پاداشی نووحمان دایەوە. (٨١) بەڕاستی، نووح لە بەندە خاوەن باوەڕەکانی ئێمەیە.
(٨٢) پاشان باقیماندەی خەڵکەکەمان لە ئاوا نوقم کرد کە ئەوانە بوون باوەڕیان بە فەرموودەی خوا نەکردو قسەی نووحیان نەگرتە گوێ. (٨٣) بەڕاستی، ئیبراهیمیش لە پەیڕەوان و شوێنکەوتووانی نووحە.
(٨٤) ئەوەبوو بە دڵێکی ساف و بێگەردەوە ڕووی کردە خوای خۆی. (٨٥) کاتێ کە بە باوکی و بە خێڵکەیی وت: ئەوە ئێوە چی ئەپەرستن؟ (٨٦) ئایا ئێوە لە جیاتیی ئەوەی خوای تاك و تەنیا بپەرستن خواگەلی درۆینەتان ئەوێ؟ (٨٧) ئەی گومانتان بەخوای هەموو جیهانەکان چییەو بە چیی ئەزانن؟ (٨٨) ئیبراهیم ویستی سووکییەك بە بتەکانی خێڵەکەی بکاو بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم نیازەی ئەو کاتەی هەڵبژارد کە ئەوان ئەچوونە دەرەوەی شار بۆئەوەی جەژنی ئایینیی خۆیان بکەن چونکە لەو کاتەدا بتخانەکە چۆڵ و هۆڵ ئەبوو. بەم نیازە هات و سەیرێکی ئەستێرەکان یا کتێبی ئەستێرەشناسیی کرد. (٨٩) کە ئەوان پێیان وت: لەگەڵیان بڕوا بۆ دەرەوەی شار، ئەم لە وەڵاما وتی: من نەخۆشم. (٩٠) ئیتر ئەوانیش پشتیان لێ هەڵکرد و بەجێیان هێشت و ڕۆیشتن.
(٩١) جا ئیبراهیم بە دزییەوە چوو بۆ لای بتەکانیان لە بتخانەکەیاناو پێی وتن: ناخۆن؟ واتە ئەمڕۆ جەژنە، بە بۆنەی ئەم خۆشییەوە شتێ ناخۆن؟ (٩٢) کە هیچ وەڵامیان نەدایەوە، پێی وتن: ئەوە بۆ قسەیەکتان لە دەم دەرنایێ و هیچ ناڵێن؟
(٩٣) جا بەنهێنی لایەکی کردەوە بە لایاناو بە دەستی ڕاستی تێیان بەربوو. (٩٤) جا پاسەوانەکانی بتخانەکە هەواڵی ئەو ڕووداوەیان گەیاند بە خەڵکی شار کە چووبوونە دەرەوە، ئەوانیش بە پەلەپەل گەڕانەوەو هاتنە سەر ئیبراهیم.
(٩٥) ئیبراهیمیش پێی وتن: ئایا ئێوە بتگەلێ ئەپەرستن کە خۆتان تاشیوتانن و دروستتان کردوون، (٩٦) لەکاتێکا کە خوا ئێوەیش و هەموو ئەو شتانەی دروست کردووە کە ئێوە ئەیانکەن؟ (٩٧) ئەوانیش وتیان: سەکۆیەکی بۆ بکەن و داری زۆری لەسەر کەڵەکە بکەن و، ئاگری تێ بەردەن و فڕێی بدەنە ناو ئەو ئاگرە سەختەوە. (٩٨) ویستیان سزای بە سووتاندن بدەن چونکە بە بەڵگە دۆڕاندیان، ئێمەش ئەوانمان دۆڕاوو ژێرکەوتووتر کرد. ئەوەبوو فڕێیان دایە ناو ئاگرەوە، بەڵام خوا نەیهێشت ئاگرەکە بیسووتێنێو بەساغی هاتەدەرەوە. (٩٩) جا ئیبراهیم وتی: من ئەڕۆم بۆ لای خوای خۆم، واتە بۆ ئەو وڵاتەی خوا فەرمانی پێداوم بڕۆم بۆ ئەوێ. خوا ڕێگام پیشان ئەدا چی بۆ دنیاو قیامەتم چاکە، بیکەم.
(١٠٠) لە خوا پاڕایەوە وتی: خوایە ! نەوەیەکی چاکم پێ ببەخشە.
(١٠١) ئێمەیش مژدەی کوڕێکی بەحیلم و حەوسەڵەمان دایە کە ئەویش ئیسماعیلە.
(١٠٢) کاتێ کوڕەکە پێگەیشت و وای لێ‌هات لەگەڵ باوکی کار بکات، باوکی پێی وت: ڕۆڵە ! من لە خەوما دیم خەریك بووم سەرم ئەبڕیت، جا تێفکرە چی بە باش ئەزانی بیکەم. ئەویش پێی‌وت: بابە! فەرمانی چییان پێ‌داوی بیکە، خوا یار بێ ئەمبینی یەکێك ئەبم لەوانەی سەبرو بوردەبارییان هەیەو تەحەمولی هەموو ناڕەحەتییەك ئەکەن.

فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ﴿١١٣﴾ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُمَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلۡمُسۡتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿١١٨﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾



(١٠٣) كاتێ هەردوكيان ئامادە بوون فەرمانى خوا جێبەجێ بكەن و ئيبراهيم ئيسماعيلى لەپەڕووخست بۆئەوەى سەرى ببڕێ و لايەكى تەويلى كەوتە سەر زەوى،

(١٠٤) ئێمەيش بانگمان لێ كرد كەوا: ئەى ئيبراهيم!

(١٠٥) تۆ خەوەكەت هێنايە دى و، ئێمەيش ئاوا پاداشتى چاكەكاران ئەدەينەوە. وەڵامى (كاتێ) كەى ئايەتى پێشوو نەوتراوەو، واى لێ دێتەوە: ئيبراهيم و ئيسماعيل زۆر بەو لوتفەى خوا لەگەڵيان شادمان بوون كە ئەوەبوو جێبەجێكردنى ئەو فەرمانەى لەسەر شان لابردن.

(١٠٦) بەڕاستى ئەم فەرمانى سەربڕينى ئيسماعيلە كە خوا دابووى بە ئيبراهيم، تاقيكردنەوەيەكى مەزن بوو بۆ دەركەوتنى فەرمانبەردارى كردنى لە فەرمانەكانى خوا.

(١٠٧) بەرانێكى گەورەيشمان كرد بە قوربانى بۆ ئيسماعيل كە باوكى لە جياتيى ئەو سەرىببڕێ.

(١٠٨) ستايشيشمان بۆ ئيبراهيم بەجێهێشت لەناو ئەوانەدا دواى ئەو دێن كە هەميشە بە چاكە ناوىبەرن.

(١٠٩) سەلامى خوا لەسەر ئيبراهيم بێ.

(١١٠) ئاوا پاداشتى چاكەكاران ئەدەينەوە.

(١١١) بەڕاستى ئيبراهيم يەكێكە لە بەندە خاوەن باوەڕەكانمان.

(١١٢) مژدەيشمان دايە بە ئيسحاق كە پێغەمبەرێكەو لە پياوچاكانە.

(١١٣) بەرەكەتيشمان ڕشت بەسەر ئيبراهيم و بەسەر ئيسحاقداو لەنەوەى هەردوكياندا ئينسانى باش و چاكەكەريش هەيەو هيى وايش هەيە بە ئاشكرا بۆ خۆى خراپە.

(١١٤) بەڕاستى منەتيشمان نايەسەر مووساو هاروون و چاكەمان لەگەڵ كردن،

(١١٥) خۆيان و خێڵەكەيانمان ڕزگاركرد لەو بەڵا گەورەيەى تووشيان بووبوو كە فيرعەونى ستەمكار بوو.

(١١٦) يارمەتييشمان دان بەسەر دوژمنەكانياناو سەرەنجام ئەوان زاڵ بوون بەسەر ئەو دوژمنانەدا.

(١١٧) كتێبى بەباشى بابەت ڕوونكەرەوەيشمان دانێ كە تەوراتە.

(١١٨) ڕێگاى ڕاستيشمان پيشان دان. (١١٩) ستايشكردنيشمان بۆ بەجێهێشتن لەناو نەوەكانى لەوەپاشدا.

(١٢٠) سەلام لەسەر مووساو هاروون بێ.

(١٢١) ئێمە ئاوا پاداشتى چاكەكەران ئەدەينەوە.

(١٢٢) بەڕاستى مووساو هاروون لە بەندە خاوەن باوەڕەكانمانن.

(١٢٣) بەڕاستى ئيلياسيش يەكێ لەو پێغەمبەرانەيە خوا ناردوونى بۆ سەر خەڵك.

(١٢٤) ئەوەبوو بە خێڵەكەى خۆى وت: ئەوە ئێوە لە سزاى خوا ناترسن؟

(١٢٥) ئەوە ئێوە بانگ و هاوار ئەكەنە بتەكەتان كە ناوى (بەعل)ەو دەستبەردارى خوايەك ئەبن كە باشترين دروستكەرو پەروەردگارە؟

(١٢٦) بانگوهاوار ناكەنە خوا كە پەروەردگارى خۆتان و باووباپيرانى پێشووتانە؟

فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾
وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ
نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ وَإِنَّ لُوطًا
لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا
فِي الْغَابِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم
مُصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ
الْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ
مِنَ الْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَا أَنَّهُ
كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾
۞ فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً
مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾
فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ
وَلَهُمُ الْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا الْمَلَائِكَةَ إِنَاثًا وَهُمْ
شَاهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَا إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ
اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾



(١٢٧) کەچی بەدرۆزنیان دانـاو باوەڕیـان پێ‌نەکرد. جا بەڕاستی ئـەوانیش ئامـادە ئـەکرێن بـۆ سـزادان و فڕێدانـە نـاو ئـاگری دۆزەخ. (١٢٨) تـەنها بەنـدە خواپەرسـتە دڵسۆزەکانمان نەبێ لە ناویانا.

(١٢٩) ناوو ناوبـانگی چاکیشـمان بـۆ ئـەو جێهێشت لەناو نەوەکانی پاشەوەدا.

(١٣٠) سـەلام لەسـەر ئیلیاسـین کـە نـاوی ئیلیاس پێغەمبەرە.

(١٣١) ئێمـە ئـاوا پاداشـی چـاکەکەران ئەدەینەوە. (١٣٢) بەڕاستی ئـەو یەکێکـە لە بەندە خاوەن باوەڕەکانمان.

(١٣٣) بەڕاسـتی لـووطـیش یەکێکـە لـە پێغەمبەرە نێرراوەکان.

(١٣٤) ئەوەبوو خۆی و خێزانیمـان هـەموو ڕزگار کرد. (١٣٥) پیرەژنـێ نـەبێ کـە لـە بەسەرچووە فەوتاوەکان بوو.

(١٣٦) پاشـان ئـەوانی‌ترمان هـەموو فەوتانـدو بـەربادمان کـردن. (١٣٧) بەڕاسـتی ئێـوە سـبەینان بەسـەر وڵاتـی ئەوانـدا تێئەپـەڕن. (١٣٨) هـەروا بـە شـەویش بەسـەر وڵاتـی ئەوانـدا تێئەپـەڕن. دەسـا ئێـوە بـیر لـە سـەرەنجامی ئـەوان ناکەنـەوە کـە چـۆنمان غـەزەب لێ‌گـرتن و چیمان پێ‌کردن؟

(١٣٩) بەڕاستی یوونسیش لـە پێغەمبـەرە نێرراوەکانە. (١٤٠) ئەوەبوو هەڵات بۆ ناو کەشتییە پـڕ لـە ئـادەمزادو کەلوپەلەکـە.

(١٤١) جـا بەشـداریی کـرد لـە قورعـە لەسەرکردنا کە وتیان: بەندەیەکی هەڵاتوو لەم کەشتییەدایە ئەبێ قورعە بکـەین بزانین کێ بـە هەڵاتووەکـە دەرئەچێ تـ[illegible] تورێ‌دەینە ناو ئاوەکە، کە قورعەکەیان کرد لەسەر ئەو دەرچوو، ئەویش پێی‌لێ‌نا کە هەڵاتووەو فڕێیـان دایـە نـاو ئاوەکـ[illegible]
(١٤٢) کە فڕێیان دا ماسی لەناو ئاوەکەدا قووتی‌داو گلەیی‌و سەرزەنشت لەسەر خۆی بوو. (١٤٣) ئەگـەر یـوونس لەوانـ[illegible] نەبوایە کە خوا ئەپەرستن و هەمیشە بە پاکی و خاوێنی ناوی ئەبەن و ئەیوتایـە: (لاإلـه إلا أنت سبحانك إني كنت مـ[illegible] الظـالمين)، (١٤٤) لـە سـکی ماسـییەکەدا ئـەمردو ئەفـەوتاو تـا ئـەوڕۆژەی مـردوو زینـدوو ئەکرێنـەوە، وەك لـە سـکی ماسییەکەدا بێ، بەشێ ئەبوو لـە ڕزیـوی ئـەو ماسـییە. (١٤٥) پـاش ئـەوە ماسـییەکە هەڵیهێنایـەوەو ئێقـی کـردەوە[illegible] ئێمـەیش توورمـان دایـە کـەنارێکی ڕووت و بـەربڵاوی ڕوویـاری دیجلـەو، لاشـەی نـەخۆش بـوو وەك لاشـەی منـاڵی تـاز[illegible] لەدایکبوو. (١٤٦) بۆ ئەوەیش کە لە سای سێبەرا بحەسـێتەوەو مـێش و مەگـەزی لێ نەنیشـێ کـە چڵك و چـەپەڵیی نـا[illegible] ئاوەکەو ناو سکی ماسییەکە بە لەشیەوە بوو، دارکوولەکەیەکمان بەسەر سەریەوە ڕواند سێبەری بۆ بکاو ئەویش خۆی بـ[illegible] گەڵاکانی داپۆشێ‌و لە بەرەکەیشی بخوا، چونکە مێش و مەگەز لە دارکوولەکە نزیك ناکەوێتەوە.

(١٤٧) بە پێغەمبەرییش ناردمانە سەر سەدهەزار کەس یا زیاتر لە خەڵکی نەینەوا کە شاری خۆی بوو.

(١٤٨) ئەوانیش باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتیی ئـەو کـردو ئێمـەیش تـا ئـەو ماوەیـەی بۆمـان دیـاری کردبـوون خسـتمانـ[illegible] نازونیعمەت و گوزەرانی خۆشەوە. (١٤٩) دەسا تۆ پرسیار لە کافرەکانی مەککە بکە چۆن خوایێ بەم توانایییە کچی هەیـ[illegible] کە ئەڵێن فریشتە کچی خوان و خۆیان کوڕیان هەیە، واتە بۆ خوا کچ و بۆ خۆیان کـوڕ دائـەنێن، لەگـەڵ ئـەوەیش کـە خـوا منداڵی نییە نە کچ و نە کوڕ. (١٥٠) یاخود ئێمە فریشتەمان بە مێینە دروسـت کـردووەو ئـەوان ئاگـادار بـوون کـە ئێمـ[illegible] کردومانن بە کچی خۆمان؟ پەنا بە خوا! (١٥١) ئاگاداربن! ئەم کافرانە لەسـەر بنـەمای بوختـان چییەتی خۆیـان ئـەڵێن[illegible]
(١٥٢) خوا منداڵی بووە. بەڕاستی ئەمانە درۆزنن. (١٥٣) ئایا خوا کچی هەڵاوێردووە بەسەر کوڕا؟

مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُوا۟ بِهِۦ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾

## سُورَةُ صٓ

ترتيبها ٣٨ — آياتها ٨٨



(١٥٤) ئەوە چیتان دەسگیر ئەبێ لەم قسە پووچانە؟ ئێوە چۆن حوکم و بڕیار ئەدەن؟
(١٥٥) ئەوە بیر ناکەنەوە کە خوا لەم جۆرە بابەتانەوە دوورە؟ (١٥٦) یاخود دەلیل و بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراتان بە دەستەوەیە؟ (١٥٧) دەی کتێبی بنەمای بەڵگەی خۆتان بهێنن ئەگەر ڕاست ئەکەن.
(١٥٨) بڕیاری پێوەندێکی زاوزێیان لە نێوان خواو جنۆکەدا داوەو جنۆکە خۆیان، بەڕاستی، ئەزانن کە لە ڕۆژی قیامەتا حازر ئەکرێن بۆ لێپرسینەوەو، کەسێ کە لە ڕۆژی قیامەتا پرسیاری چاکەو خراپەی کرداری خۆی لێ بکرێ دوورە لەوە کە پێوەندی نەسەب و زاوزێی لەگەڵ خوا ببێ‌و، خوا هیچ جۆرە پێوەندێکی وای نە لەگەڵ ئادەمزادو نە لەگەڵ جنۆکە نییە.
(١٥٩) خوا پاك و دوورە لەو جۆرانەی ئەو کافرانە وەسفی ئەوی پێ ئەکەن.
(١٦٠) تەنها بەندە ساف و خواپەرستە بێگەردەکان نەبێ کە ئەوان باسی خوا بەم جۆرە ناکەن.
(١٦١) بەڕاستی، ئێوەو ئەو بتانەی ئەیانپەرستن، (١٦٢) ناتوانن کەس لەئاستی خوادا تێکبدەن و گومڕای بکەن.
(١٦٣) تەنها کەسێ نەبێ خوا لە زانستی خۆیا زانیبێتی ئەمە دۆزەخییەو ئەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ. (١٦٤) ئەمە باسی ئەوەیە کە فریشتەکان پێ لە بەندەیی خۆیان ئەنێن‌و ئەڵێن: ئێمە کەسمان تیا نییە پایەو شوێنێکی دیاری نەبێ لە خواناسین و خواپەرستنا. (١٦٥) ئێمە بە ڕاستییش هەموو ڕیزمان بەستووە بۆ خواپەرستی‌و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی. (١٦٦) بەڕاستییش ئێمە هەموو تەسبیحاتی خوا ئەکەین و باسی پاکی و بێعەیبیی ئەو ئەکەین. (١٦٧) بەڕاستییش ئەو کافرانە ئەڵێن: (١٦٨) ئەگەر ئێمە کتێبێکی وامان بوایە لەوانەی هاتوونەتە خوارەوە بۆ سەر میللەتە پێشینەکان، (١٦٩) بەندەی ساغ و بێگەردی خوا ئەبووین.
(١٧٠) ئەوەتا ئێستا کتێبێکیان هاتەسەر کە قورئانەو کەچی باوەڕیان پێ‌نەکردو ئینکارییان کرد کە هیی خوا بێ، جا ئەمەولا حاڵی خۆیان ئەزانن بە چ دەردێکیان ئەبەین. (١٧١) بەڕاستی واتەی ئێمە ڕابووردووە بۆ بەندە بە پێغەمبەرایەتی نێرراوەکانمان:
(١٧٢) کەوا بەڕاستی ئەوان یارمەتی‌دراوو سەرخراون. (١٧٣) بەڕاستییش سوپای ئێمەن زاڵن بەسەر دوژمنا.
(١٧٤) مادەم وایە تۆ پشتیان لێ هەڵکە تا ماوەیێ کە کاتی ئەوەیە بڕیار بدەین بەسەریانا زاڵ ببی.
(١٧٥) جا ئەو کاتە سەیریان بکە چییان بەسەر دێنین و ئەوان خۆیشیان بە چاوی خۆیان ئەبینن چییان بەسەردێ.
(١٧٦) ئایا پەلەیانە بۆ ئەوەی سزای ئێمەیان بەسەردا بێ؟
(١٧٧) کاتێ کە سزای ئێمە ئەگاتە بەرماڵیان و دەرفەتیان هیچ بۆ نامێنێ بۆ خۆ لێ دەربازکردنی، خراپ سبەینێیەکە ئەو سبەینێیەی تۆقێنراوەکان کە چەند جار پێیان وترابوو خۆیانی لێ دوور بگرن و قسەی کەس نەچوو بە گوێیانا.
(١٧٨) تۆیش پشتیان لێ هەڵکە تا ماوەیێ کە کاتی ئەوەیە بڕیاربدەین بەسەریانا زاڵ ببی.
(١٧٩) ئەوکاتە سەیرکەو ئەوانیش بە چاوی خۆیان ئەبینن.
(١٨٠) پاکی‌و بێعەیبی بۆ خوای تۆیە کە خوای هێزو شانو شکۆیەو خاوێنە لەو وەسفانەی ئەوان وەسفی ئەوی پێ ئەکەن.
(١٨١) سەلامیش لەسەر پێغەمبەرەکان بێ. (١٨٢) سوپاس و ستایشیش بۆ خوا کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

صٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ذِي ٱلذِّكۡرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي عِزَّةٖ وَشِقَاقٖ ﴿٢﴾ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ ﴿٣﴾ وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ﴿٥﴾ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ ﴿٨﴾ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ ﴿٩﴾ أَمۡ لَهُم مُّلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ فَلۡيَرۡتَقُواْ فِي ٱلۡأَسۡبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٞ مَّا هُنَالِكَ مَهۡزُومٞ مِّنَ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴿١١﴾ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ ذُو ٱلۡأَوۡتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوۡمُ لُوطٖ وَأَصۡحَٰبُ لۡـَٔيۡكَةِۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَحۡزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ مَّا لَهَا مِن فَوَاقٖ ﴿١٥﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٦﴾



## سوورەتی (صٓ)

مەککەیی‌یەو، (٨٨) ئایەتە

(١) (ص) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم پیتە چییە. سوێند ئەخۆم بە قورئانێ کە مایەی یادکردنەوەی خوایە، ئەم قورئانە فەرموودەی خوایەو، موحەمەد کە هێناویە بۆ نادەمزاد ڕاستگۆیە.

(٢) بەڵام کافرەکان کە باوەڕی پێ‌ناکەن خۆیان بە شت ئەزانن و لە سەرکێشی‌و نافەرمانیی خوادان.

(٣) ئێمە ئەهلی چەند سەدەی پێش ئەم کافرانەمان بەرباد کرد کە پێشان هیچیان بە گوێدا نەئەچوو، جا کە عەزابی خوایان ئەهاتەسەر ئەکەوتنە بانگەبانگ و هاوارکردن، بەڵام ئیتر دەرفەتی ڕزگاربوون دوورکەوتبوەوەو هاوار سوودیی نەمابوو.

(٤) سەرسام بوون لەوە کە پێغەمبەرێ بێتە سەریان بیبیانترسێنێ لە سزای خواو، کافرەکان وتیان: ئەمە سیحربازێکی درۆزنە.

(٥) هەموو خواکانی کردووە بە یەك خوا؟ بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرە!

(٦) پیاوماقووڵانی قورەیش لە ماڵی ئەبووتالیب دەرچوون و بڵاوەیان لێ کردو لەناو خۆیانا بە یەکترییان وت: ڕێی خۆتان بگرنەبەرو سەبرو خۆڕاگرتنتان ببێ لەسەر خواکانی خۆتان و دەسبەرداریان مەبن. بێ‌گومان ئەم داوای خوا بەیەك زانینەی موحەممەد بەڵایەکە هاتووەتە ڕێمان.

(٧) شتی وامان لە ئایینی چەرخ و زەمانی پێش خۆمانا نەبیستووە. ئەمە لە ساختەو دەسهەڵبەست بەولاوە نییە.

(٨) ئایا لەناو هەموو ئێمەدا کتێبی خوا هەر بۆ سەر ئەو هاتووە؟ نەخەیر، مەسەلە ئەمە نییە. مەسەلە ئەوەیە ئەوان دوودڵن لەم قورئانەی من کە ڕاست بێ‌و بۆ سەر موحەممەدم نازڵ کردبێ، بەڵکو لەمەیش زیاتر مەسەلە ئەوەیە هێشتا سزای منیان نەچەشتووەو پێیان نەچزاوە بە ئاگرا.(٩) یان گەنجینەکانی ڕەحمەتی خوای تۆ کە خاوەن عیززەت و بەخشندەیە، هەموو لای ئەوانە؟(١٠) یان موڵکی ئاسمانەکان و زەوی‌و چی لە نێوانیانایە لای ئەوانە؟ ئەگەر وایە با بە پلەکانەکانی هۆی سەرکەوتنا سەرکەون بۆ ئاسمان و بزانن حاڵ و ئەحواڵی موڵکەکانیان چۆنەو بۆمان بگێڕنەوە؟

(١١) ئەم کافرانە چەند لەشکرێکی شکستەو بەزیون لەو تاقمانەی کە خۆیان لە دژی پێغەمبەران کۆکردووەتەوە، ئیتر چۆن ئەتوانن لە بەرانبەر کاری خوادا ڕاست بنەوە؟ (١٢) بەر لەمانیش خێڵەکەی کە نووح نێررابووە سەریان و خێڵی عادو خێڵی فیرعەونی دەسەڵات بە مێخ مەحکەم کراویش پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆزن دانا.

(١٣) خێڵی سەموودو خێڵەکەیش کە لووط نێررابووە سەریان و خێڵەکەی کە شوعەیب نێررابووە سەریان کە پێیان ئەڵێن (أصحاب الأيكة) کە دارستان و بێشەڵانیان هەبوە، ئەوانە بوون گەلەکۆمەکیان کردبوو لە پێغەمبەرەکانیان و خوا لەشکریانی شکاند. (١٤) ئەم گشت کۆمەڵانە پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆزن دانا، بۆیە سزای ئێمەیان بۆ پێویست بوو و موستەحەقی ئەو سزایە بوون. (١٥) ئەم خێڵەی تۆیش کە باوەڕ بە پێغەمبەرایەتیی تۆ ناکەن و بە درۆزنت دائەنێن، چاوەڕوانی هیچ نین ناڵەیێ نەبێ کە ئیسرافیل ئەیکا بە صووردا و هەموو زیندوویێکی پێ ئەمرێ‌و جارێکی‌تر گەڕانەوەی بۆ نییەو بۆ ئەو مەبەستە ناکرێتەوە بە صووردا.

(١٦) ئەم خێڵەی تۆ ئەڵێن: خوایە! زووبەزوو بەشە سزای خۆمانمان بدە بەر لەوەی ڕۆژی لێپرسینەوە بێتە پێشەوە.

ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ ۞ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾



(١٧) تۆ خۆت بگرەو سەبرت ببێ بەرانبەر بەم قسەی تاڵو سوێرو بەدرۆزن دانانەت لە لایەن ئەو کافرانەوەو، داوودی بەهێزو بەدەسەڵاتی بەندەمانت بێتەوە یاد کە بەڕاستی بەندەیێ بوو زوو ئەگەڕایەوە بۆ لای خواو مەیدانی نەفسی خۆی نەئەدا لە خوا غافڵ ببێ.

(١٨) ئێمە بەڕاستیی شاخەکانمان بۆ ڕام کردبوو ئێواران و بەیانیان سوبحانەللایان لەگەڵ ئەکرد.

(١٩) پەلەوەریشمان هەروا بۆ ڕام کردبوو لە هەموو لایەکەوە لێی کۆئەبوونەوەو، هەموو، لە پەلەوەرو لە شاخ و کێوان، ئەگەڕانەوە بۆ لای.

(٢٠) ئێمە دەسەڵات و فەرمانڕەواییی داوودمان بەهێز کردبوو و زانیاریی ڕاستەقینەمان دابوویە لەگەڵ توانی بڕینەوەی ناکۆکیی نێوان ناکۆکاندا بە قسەیەکی وا کە قسەی هەردوولا ببڕێتەوە.

(٢١) ئایا خەبەری ئەو دوو کەسە ناحەز بەیەکەت پێ گەشتووە کە بەسەر دیواری پەرستگاکەی داوودا سەرکەوتن و چوون بۆ لای؟

(٢٢) کە لەپڕ چوونە لای، ئەویش ترسا لێیان چونکە هاتنەکەیان هاتنێکی نائوسوولی بوو. ئەوانیش پێیان وت: مەترسە لێمان، ئێمە دووکەسین ناکۆکیمان لە نێوانایە، یەکێکمان دەسدرێژیی کردووەتە سەر ئەویترمان، تۆیش بڕیاری ڕاستمان لەبارەوە بدەو لەڕاستی لامەدەو ڕێگای ڕاستمان پیشان بدە.

(٢٣) ئەم هاوڕێمە برامە، نەوەدونۆ کاوڕە مێنگەی هەیەو منیش تاقە یەك کاوڕە مێنگەم هەیە. ئەڵێ: کاوڕەکەی خۆیشتم بدەرێو بە قسە زاڵ بووە بەسەرماو مەیدانی قسەم نادا منیش قسەی خۆمی بۆ بکەم و بیروڕای خۆمی بۆ دەربڕم.(٢٤) داوودیش وتی: بەڕاستی ئەو براتە ناحەقیی لەگەڵ کردووی کە داوات لێ ئەکا تاقە کاوڕەکەی خۆتی بدەیتێ بیخاتە سەر کاوڕەکانی خۆیو، زۆر لەوانەی هاوبەشی داراییێ هەندێکیان ناحەقی لە هەندێکی تریان ئەکەن ئەوانەیان نەبێ باوەڕیان بە خوا هەیەو کاری چاك ئەکەن و ئەمانەیش دانسقەن. جا داوود لەو ڕووداوەدا گومانی بۆ ئەوە چوو ئەم دوو کابرایەمان بۆ تاقیکردنەوەی ناردبێتە سەری ئەم پرسیارەی لێ بکەن، لەبەر ئەوە داوای لێخۆشبوونی لە خوای خۆی کردو لە حاڵی ڕوکووعەوە لەپەوڕوو لێی کەوت و گەڕایەوە بۆ لای خوای خۆی.

(٢٥) ئێمەیش لەوە لێی خۆش بووین کە ئەوگومانەی لە خۆیەوە بردووەو، بەڕاستی داوود پایەو پلەیەکی نزیکی لە ئێمەوە هەیەو سەرەنجامێکی جوانیشی لە بەهەشتا هەیە.

(٢٦) ئەی داوود! ئێمە وا تۆمان کرد بە جێنشینی پێغەمبەرانی پێشوو لە زەویدا، دەسا تۆیش لەناو ئادەمزادا بەگوێرەی حەق و ڕاستی حوکم بکەو شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆت مەکەوە نەوەك ئارەزووی نەفس ڕێی خوات لێ ون بکا. بێ گومان ئەوانەی ڕێی خوا ون ئەکەن و لێی لائەدەن سزایەکی سەختیان هەیە بە هۆی ئەوەوە کە ڕۆژی لێپرسینەوەیان فەرامۆش کردووە.

وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ
فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ
﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟
ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ
﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ
أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾
رُدُّوهَا عَلَىَّ ۖ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا
سُلَيْمَٰنَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ
لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾
فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ
كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا
عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ
مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلشَّيْطَٰنُ
بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرْكُضْ بِرِجْلِكَ ۖ هَٰذَا مُغْتَسَلٌۢ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ﴿٤٢﴾



(٢٧) ئێمە ئاسمان و زەویو نێوانیانمان بە بێسوودو لە خۆڕایی دروست نەکردووە. ئەمە گومانی ئەوانەیە کەوا کافرن و باوەڕیان بە خواو پێغەمبەر نییە. هاوار بۆ ئەوانە لە ئاگری دۆزەخ.
(٢٨) یاخود ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باشیان کردووە، وەك ئەوانەیان موعامەلە لەگەڵ ئەکەین کە خراپە ئەکەن لە زەویدا؟ یاخود لەخواترسان وەکو تاوانکارە لەحەق لادەرەکان لێ ئەکەین؟ واتە: دیارە، نە.
(٢٩) ئەم قورئانەی ناردوومانەتە خوارەوە بۆ تۆ کتێبێکی پیرۆزە بۆ ئەوەمان ناردووە خەڵك بیر لە مەعنای ئایەتەکانی بکەنەوەو خاوەن هۆشەکان بیر لە ئەنجامی کاری خۆیان بکەنەوە.
(٣٠) کوڕێکمان بەخشی بە داوود کە سولەیمانە. سولەیمان بەندەیەکی چاکی خوایە.ئەو هەمیشە بە تۆبەکردن لە گوناه ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوای خۆی.
(٣١) کاتێ کە ئێوارە ئەسپە چاکە پەل بڵاوەکانی پیشان درا،
(٣٢) سولەیمانیش تا درەنگانێ بەو ئەسپانەوە خەریك بوو، جا وتی: من ئەم ماڵی دنیایەم کە ئەم ئەسپانەن زۆر خۆش ویست و ئاگام لە یادکردنەوەی خوا نەما، تا ڕۆژ کەوتە ئەو دیوی پەردەوەو ئاوا بوو. (٣٣) وتی: مادام ئەم ئەسپانە بوون بە هۆی غافڵبوونم لە یادی خوا، بۆمیان بگێڕنەوە. کە گێڕانیانەوە بەربووە مل و چوارپەلیان بە شمشێرو هەمووی سەربڕین و پەیی‌کردن. (٣٤) بەڕاستی ئێمە سولەیمانمان تاقی کردەوەو تووشی مەینەتێکمان کرد. ئەوەبوو منداڵێکی بێدەست و پێمان فڕێدایە سەر تەختەکەی. ئەویش کە ئەو منداڵەی دی تۆبەی کردو گەڕایەوە بۆ لای خوا. ((ئەگێڕنەوە جارێکیان سولەیمان وتوویە: ئەمشەو ئەچمە لای حەفتا لە ژنەکانم هەر یەکێکیان شۆڕەسوارێکی ببێ لەڕێی خوادا غەزا بکا. کە چووە لایان لەیادی نەبوو (ان شاء الله)بکا. کەچی هیچیان سکی پڕ نەبوو تاقە یەکێکیان نەبێ، ئەویش نیوە مرۆیەکی بوو، هەر لەبەر ئەوە کە (ان شاء الله)ی نەکردبوو. کە سولەیمان ئەمەی دیو تێگەیشت بۆیە وابووە چونکە (ان شاء الله)ی نەکردووە، پەشیمان بووەوەو تۆبەی کردو داوای لە خوا کرد لێی ببوورێ.)).
(٣٥) وتی: خوایە! لێم ببوورەو فەرمانڕەواییەکی وام پێ ببەخشە پاش خۆم شایانی کەسی تر نەبێ، هەر تۆ بەخشندەی. (٣٦) جا ئێمەش بامان بۆ ڕام کرد بە فەرمانی ئەو بۆ هەرکوێی بویستایە بە نەرمی ئەڕۆیی.
(٣٧) جنۆکەیشمان بۆ ڕام کرد هەرچییان وەستا بەنا بوون و خانوویان دروست ئەکردو، هەرچییان نوقمی بنی دەریا ئەبوون. (٣٨) جنۆکەی تریش کە کۆمەڵ کۆمەڵ پێکەوە کەلەپچەکرابوون و بەسرابوونەوە.
(٣٩) ئەم دەسکەوتە بەخششی ئێمەیە پێمان دای، جا تۆیش بە کێ ئەبەخشی ببەخشەو، لەکێ ئەگریتەوە بگرەوە بە ئارەزووی خۆت، کەس لێت ناپرسێتەوە. (٤٠) بەڕاستی سولەیمان لای ئێمە پایەی نزیکیی هەیە لێمانەوەو سەرەنجامێکی جوانیشی لە بەهەشتا هەیە. (٤١) باسی ئەییووبی بەندەمانیش بکە کاتێ کە بانگی کردە خوای خۆی وتی: خوایە! بەڕاستی شەیتان تووشی ئازارو نارەحەتیی کردووم بەوە کە لەئەنجامی ئەم دەردو نەخۆشییانەوە کە تووشم بوون وەسوەسەو دوودڵیی خستووەتە دڵمەوە. (٤٢) ئێمەیش فەرمانمان دایە کەوا پێ‌بکوتە بە زەویدا ئاوی گەرمت بۆ هەڵئەقوڵێ بۆ خۆپێ‌شتن و ئاوی ساردیشت بۆ هەڵئەقوڵێ بۆ لێ‌خواردنەوە.

وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنَّا وَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ ۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾ وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٨﴾ هَٰذَا ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ ٱلْأَبْوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴿٥٨﴾ هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ صَالُوا۟ ٱلنَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْ ۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾



(٤٣) ژن و منـــــــالّ و كەســـــــوكارە تەفرەقەبووەكانیشـیمان بـۆ كـۆكردەوەو بەخشیمانەوە پێیو ئەوەندەی تریشمان لە ڕووی میهرەبـانیی خۆمانـەوە پێبەخشـی بۆئەوەی ببێ بە یادگارو مایەی بیركردنەوە بۆ هەموو ئەوانەی عەقڵو فامیان هەیە.
(٤٤) ئەگێڕنەوە ژنەكەی ئەییووب چووبوو بـۆ كارێـك و زۆری پێچـوو، ئـەییووبیش لەوە نارەحەت بوو، سوێندی لێ خوارد كە چاك بـووەوە سـەد داری لێ بـدا. جا بـۆ ئـەوەی سـوێندەكەی نەكـەوێو لێدانەكـەی كردبێ خوا وەحیی بۆ كردو پێـی فـەرموو: دەسـتەیێ لقـەدارخورما بگـرە بەدەسـتەوە كە چڵەكانی زۆر بن و سوێندەكەت مەخەو بەو دەستەی لقە دارخورمایە ئەوەندەی پیا بماڵە كە سوێندەكەت پڕ بكاتەوە. ئـەویش پاش ئەوەی بە ئاوە گەرمەكە خۆی شت و زامەكانی لەشـی چاك بوونـەوەو لـە ئـاوە ساردەكەی خواردەوە، بە لقە دارخورماكان لە ژنەكەی دا. جا خـوا ئەفـەرموێ: ئێمـە دیمان ئەییووب لـەو سـەردەمی نەخۆشـیو دەردو ئازارەیـا زۆر بـە سـەبرو تەحـەممول بوو. ئەییوب بەندەی چاكەو هەمیشـە بـە تۆبە لە گوناھ ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوا.
(٤٥) باسی بەندەكانم ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقووب بكە كە خاوەن دەست و چاو بوون، واتە لە دین ئاگاداربوون و بەهێزیش بوون، خوا چیی لەسەر دانانایـە زووبـەزوو بەباشی جێبەجێیان ئەكرد. (٤٦) ئێمە ئەوانمان ساف و بێگەردكردبوو بە سیفەتێ كە هیـی ئـەوان بـوو كـە ئـەوەبوو بیریان لە ماڵی قیامەت ئەكردەوە، واتە لەبەر ئەوەی بیریـان لـە مـاڵی قیامـەت ئـەكردەوە، لـە هـەموو كودوورەتـێ پاكمان كردبوونەوە. (٤٧) ئەوان، بەڕاستی، لە بەندە خۆلاسەو هەڵبژاردەكانن لای ئێمـە. (٤٨) باسـی ئیسـماعیل و ئیلیەسەع و زولكیفلیش بكەو هەموویان لە پیاوچاكانن.
(٤٩) ئەم باسی پێغەمبەرانی پێشووە ئەبێ بە یادگار بۆ تۆو، بێگومان بۆ ئەوانەی لـە خـوا ئەترسـن ئـەنجامی چـاك هەیە لە شوێنێكی زۆر باشدا. (٥٠) ئەو شوێنە باشە بەهەشتی(عەدن)ە كە قاپییەكانی خراونەتە سەر پشت بۆیان.
(٥١) پاڵ ئەدەنەوە بە پشتییەوە لەو بەهەشتەداو داوای میوەی زۆرو شەربەت ئەكەن و بۆیان ئەهێنن.
(٥٢) حۆریی وایشیان لا هەیە كە چاویان بڕیوەتە تەنها مێردەكانیان و بۆ كەسی تر ناڕوانن و لەگەڵیان هاوتەمەنن.
(٥٣) ئەم پاداشتە ئەوەیە گفتتان پێ دراوە بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە. (٥٤) بێگومان ئـەم نیعمەتـە باشـە ڕزق و ڕۆزیـی ئێمەیەو بڕانەوەی بۆ نییە. (٥٥) ئەمە ئاوایەو، بەڕاستی بۆ كافرە توغیـانكردووەكـانیش خراپترین سـەرەنجام هەیـە.
(٥٦) كە دۆزەخە تێی ئەچن و خراپ فەرش و ژێرەخەرێكـە. (٥٧) دەبـا بیچـێژن ئەمـە ئـاوی كـوڵ بـەكوڵو ئـەوەیش زەمهەریری ساردوسڕ. (٥٨) سزای تری لەو جۆرەیش هەیە جۆراوجۆر. (٥٩) بەو كافرە گەورەگەورانـە ئـەوترێ كاتـێ كە ئەچنە ناو دۆزەخ: ئەمەیش گرۆهێكی تر كە كەوتوونەتە ناو دۆزەخ لەگەڵ ئێوەدا. كافرە گەورەكانیش ئەڵێن: دەك مەرحەبایان لێ نەبێ. ئەوانیش وەك ئێمە بەهۆی كردەوەی خۆیانەوە كەوتوونەتە ناو ئـاگری دۆزەخ. (٦٠) جـا كـافرە شوێنكەوتووەكانی گەورەكان لە داخا بەوانە ئەڵێن كە لە دنیادا شوێنیان كەوتبوون: بەڵكو مەرحەبا لـە ئێـوە خۆتـان نەبێ، ئێوە بوون ئەم سزای دۆزەخەتان لە دنیادا پێش خست بـۆ ئێمـەو بۆتـان ئامـادەكردین و ئێمـەتان خسـتە سـەر ڕێگای. ماواو جێوڕێیەكی خراپتان بۆ فەراهەم كردین. (٦١) جا ئەم كافرە شوێنكەوتووانە ڕوونەكەنـە خـواو ئـەڵێن: خوایە! ئەوەی ئەم سزای دۆزەخەی لە دنیادا بۆ ئێمە پێش خست، سزای لە ئاگری دۆزەخا دووقات بۆ زیاد بكە

وَقَالُوا۟ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَٰهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌ ۖ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٦٦﴾ قُلْ هُوَ نَبَؤٌا۟ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِىَ مِنْ عِلْمٍۭ بِٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰٓ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾



(٦٢) جا هەر ئەم کافرە شوێن کەوتووانەی گەورەکانیان، لەناو خۆیانا ئەڵێن: ئەوە بۆ ئەو پیاوانە نابینین کە لە دنیادا بە پیاوخراپمان دائەنان؟ مەبەستیان لە هەژارانی موسوڵمانانە کە ئەوان لە دنیادا بە سووکیان سەیر ئەکردن.

(٦٣) ئایا ئێمە ئەوانمان بە سووك سەیر ئەکردو بە پیاوخراپمان دائەنان بەڵام ئەوان باش بوون و نەهێنراونەتە دۆزەخ، یان هێنراون بەڵام بەرچاوی ئێمە ناکەون و چاومان لای داوە لێیان و نایانبینێ؟

(٦٤) بێگومان ئەم باسە ڕاستەو ڕووئەدا کە ئەهلی دۆزەخ لەناو خۆیانا ئەچن بە گژی یەکاو ئەبێ بە دەمەقاڵەیان.

(٦٥) تۆ بەو کافرانە بڵێ: من لە پێغەمبەرێ زیاتر نیم کە خوا ناردوومی بۆ ترساندنی خەڵك لە ئاگری دۆزەخ و هەموو شتێ بە دەس خوایەو هیچ خوایەك نییە تەنیا زاتی خوای تاك و خاوەن دەسەلات نەبێ.

(٦٦) خوای ئاسمانەکان و زەوی‌و ناو بەینیانەو خاوەن عیززەت و تاوانپۆشە.

(٦٧) تۆ، ئەی موحەممەد! بەو کافرانە بڵێ: ئەمەی کە من پێم وتن کە من بۆ ترساندنی خەڵك لە سزای بێفەرمانیی خوا هاتووم، هەواڵێکی مەزنە.(٦٨) هەواڵێکە ئێوە لەبەر بێئاگاییی خۆتان گوێی نادەنێ‌و خۆتانی لێ لائەدەن. (٦٩) من کە باسی یەکێتیی خواتان بۆ ئەکەم و باسی قیامەتتان بۆ ئەگێڕمەوە، خوا خۆی پێی ڕاگەیاندووم ئەگینا خۆ من لە ئەوزاعی کۆمەڵەی فریشتانی نزیك لە بارەگای خوا ئاگادار نیم کە لەناو خۆیانا ئەبێ بەدەمەقاڵەیان. ئەگەر خوا ئەمەم بە وەحی پێ ڕانەگەیەنێ من چۆنی پێ ئەزانم؟ ئەمە ئیشارەتە بۆ مەسەلەی دروست کردنی ئادەم و دانانی لە زەویدا کە لەناو فریشتەکانا بوو بە مایەی ناکۆکی وەك باسی لێ کراوە.

(٧٠) وەحی ناکرێ بۆ من ئەوە نەبێ کە من ترسێنەری ئادەمزادانم لە سزای خواو چاك و خراپیان بۆ ڕوون ئەکەمەوە.

(٧١) ئەم ئایەتە ئەگەڕێتەوە بۆ ئایەتی ٦٩و باسی ئەو دەمەقاڵەیە ئەکا لەناو فریشتەکانا ڕوویدا. ئەفەرموێ: ئەوە بوو خوای تۆ بە فریشتەکانی وت: من ئینسانێ دروست ئەکەم لە گڵ. (٧٢) جا کاتێ دروستم کردو بە فووی ئەو فریشتەیەی ئەم کارەی پێسپێرراوە لە گیانی خۆمم کرد بە بەرا، ڕوو لەسەر زەوی بکەون و سوجدەی بۆ بەرن.

(٧٣) جا کە ئادەمم دروست کرد فریشتەکان هەموو سوجدەیان بۆ برد.(٧٤) تەنها ئیبلیس نەبێ خۆی بە زل زانی‌و لە کافران بوو. (٧٥) خوا بە ئیبلیسی فەرموو: ئەی ئیبلیس! چی ڕێی ئەوەی لێ گرتی سوجدە بۆ ئینسانێ بەری من بە دەستی قودرەتی خۆم دروستم کردووە؟ خۆت بەزل زانی، یان هەر لە زاتی خۆتدا بەرزو پایە بڵندی؟

(٧٦) ئیبلیس وتی: بۆیە سوجدەم بۆ نەبرد چونکە من لەو چاکترم. تۆ منت لە ئاگر دروست کردووەو ئەوت لە قوڕ دروست کردووە. (٧٧) خوایش بە ئیبلیسی فەرموو: کەواتە لە ڕیزی فریشتەکان دەرچۆ، تۆ دوورخراوەی لە ڕەحمەتی خوا. (٧٨) بەڕاستییش تۆ لەعنەتی منت لەسەرە تا ڕۆژی جەزا کە ڕۆژی قیامەتە. (٧٩) ئیبلیسیش وتی: دەی خوایە! مۆڵەتم بدەو بمهێڵەرەوە تا ئەو ڕۆژەی مردوو هەموو زیندوو ئەکرێنەوە کە ڕۆژی قیامەتە.

(٨٠) خوایش فەرمووی: تۆ لە مۆڵەتدراوانی. (٨١) تا ڕۆژی ئەوکاتەی دیاریم کردوە بۆ مۆڵەت دراویت.

(٨٢) جا ئیبلیس وتی: بە عیززەت و جەلالی تۆ قەسەم هەموویان سەرجەم گومڕا ئەکەم.

(٨٣) تەنها بەندە خاوێن و دڵسۆزەکانت نەبێ لە ناویانا.

قَالَ فَٱلۡحَقُّ وَٱلۡحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ﴿٨٨﴾

## سُورَةُ الزُّمَرِ

ترتيبها ٣٩ — آياتها ٧٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ﴿٣﴾ لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا لَّٱصۡطَفَىٰ مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٤﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمًّىۗ أَلَا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ﴿٥﴾



(٨٤) خوایش فەرمووی: منیش ڕاستم و هەر ڕاست ئەڵێم.
(٨٥) کە ئەوەیە بە ڕاستی دۆزەخ پڕ ئەکەم لە تۆو لە هەموو ئەوانەی شوێن تۆ ئەکەون لێیان.
(٨٦) تۆ ئەی موحەممەد! بەو کافرانە بڵێ: من داوای هیچ کرێیەك لە ئێوە ناکەم لەسەر ئەم ڕاگەیاندنی فەرمانی خوایە پێتان و، لەوانەیش نیم بەزۆر خۆیان دێننە ناوەوە.
(٨٧) ئەم قورئانەیش لەوە بەولاوە نییە کە بیرخەرەوەو ئامۆژگارییە بۆ هەموو ئەهلی جیهان.
(٨٨) لەمەولایش، پاش کاتێکی دیاری، هەواڵی سەرکەوتنی ئەم قورئانەو پەیامی ئەم قورئانە ئەزانن.

## سوورەتی (الزمر)

**مەککەیی‌یە ئایەتی ٥٢و٥٣و٥٤ی نەبێ‌و، (٧٥) ئایەتە**

(١) ئەم قورئانە کتێبێکە لەلایەن خوای خاوەن عیززەت و خاوەن حیکمەتەوە هاتووەتە خوارەوە بۆسەر پێغەمبەر.
(٢) بەڕاستی ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ تۆ کە حەق و ڕاستە، کەواتە تۆیش خواپەرستی بکەو ئایینی خۆت پاك و بێگەرد ڕاگرە لە هەموو جۆرە هاوبەش‌دانانێك بۆ خوا.(٣) بێدارەوە بن! پەرستن هەر بۆ خوا ئەشێ‌و ئایینی بێگەرد ئەبێ هەر بۆ ئەو بێ‌و، ئەوانەی لەخوا بەولاوە پشت و پەنایان بۆ خۆیان ڕاگرتووە ئەیانپەرستن وەك ئەوانەی فریشتە ئەپەرستن یا عیسا ئەپەرستن یا بت ئەپەرستن و ئەڵێن: بەهیوای ئەوە نەبێ کە چەند پلەیەك لە خوامانەوە نزیك بکەنەوە، نایانپەرستین، ئەوانە بێ‌گومان خوا خۆی بڕیار لە بارەیانەوە ئەدا لە خوسووسی ئەم قسەیانەوەو لە هەموو ئەو شتانەی تردا کە ئیختیلافیان لە نێواندا هەیە لە بارەیانەوە. بێ‌گومان خوا هیدایەتی کەسێ نادا درۆزن بێ‌و زۆر کافر بێ وەك ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دائەنێن کە درۆ ئەکەن و ئەڵێن: خوا هاوبەشی هەیەو، زۆر کافریشن کە یەکەمین بنەمای خواپەرستییان تێکداوە بەوە کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە.
(٤) ئەگەر خوا بیویستایە نەوە بۆ خۆی ڕابگرێ، لەوانەی خۆی دروستیان ئەکا خۆی نەوەی بۆ خۆی هەڵئەبژاردو نەیئەدایە دەستی ئێوە بە ئارەزووی خۆتان ئەم و ئەوی بۆبکەن بە نەوە. خوا پاك و دوورە لەم درۆو دەلەسانە کە گوایە نەوەی هەیەو شتی‌وا. ئەو خوایەکی تەنهاو تاك و خاوەن قەهرو بەدەسەڵاتە.
(٥) ئەو خوایە ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە بەحەق و بەڕاستی. شەو هەڵئەسووڕێنێ بەدەوری ڕۆژاو ڕۆژ هەڵئەسووڕێنێ بەدەوری شەواو ڕۆژو مانگی ڕام کردووەو، هەر کام لەمانە بەڕێی خۆیا ئەڕوا تا وادەیەکی دیاری‌کراو کە ئەو ڕۆژەیە لە جووڵە ئەکەون. بێدارەوە بن! خوا بە تەنها خۆی خاوەن عیززەت و دەسەڵات و تاوان پۆشە.

خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾ إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ ۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ قُلْ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾



(٦) ئێوەی لە تاقە نەفسێك دروست کردووەو پاشان لەویش ژنەکەیی دروست کردو، لە چوارپێکانیش هەشت جووتی نێرو مێی نازڵ کردووە بۆتان کە حوشترو ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزنن. لە سکی دایکەکانتانا دروستتان ئەکا بەجۆرە دروستکردنێ پاش جۆرە دروستکردنێکیتر کە ئەوەتە لە تۆوەوە ئەتانکا بە پارچە خوێن و ئەنجا بە پارچە گۆشت و ئەنجا ئێسقانیشتان بۆ دروست ئەکا، لە سێ تاریکیدا: تاریکایی ناوسکی دایك و تاریکایی کیسەی منداڵدان و تاریکایی ئەو پەردە ناسکەی منداڵی لە منداڵدانا پێوە پێچراوە. ئەوەی ئەم کارانە ئەکا خوای پەروەردگارتانە. گەورەیی‌و فەرمانڕەوایی هەر بۆ ئەوەو خوایێکی تر نییە شایانی پەرستن بێ. دەسا ئیتر ئێوە چۆن لە باوەڕەوە بە خوای تاك و تەنیا وەرئەچەرخێنرێن بۆ هاوبەش بۆ دانانی؟

(٧) ئێوە ئەگەر کوفر ئەکەن، بێگومان خوا دەوڵەمەندەو بێنیازە لێتان. ئەوەندە هەیە ڕازی نییە بەوە کە بەندەکانی کوفر بکەن و، ئەگەر سوپاسیشی بکەن لێتان ڕازی ئەبێ‌و بەو سوپاسە ڕازییەو، هیچ باریگوناهلەئەستۆگرێ باری گوناهی کەسێکیتر هەڵناگرێ‌و هەر لە خۆی بەرپرسیارەو، سەرەنجامیش هەمووتان ئەگەڕێنەوە بۆ لای ئەوو خەبەردارتان ئەکا لەوەی لە ماوەی ژیانتانا ئەتانکرد لە چاکەو لە خراپەو ئەو ئەزانێ تەنانەت چی لەناو دڵتانایە.

(٨) کاتێ خوا زیانێ تووشی ئادەمزادێ بکا ئەو ئادەمزادە هاوار ئەکاتە خواو ئەپاڕێتەوە لێی‌و ئەگەڕێتەوە بۆ لای، کەچی ئەگەر نیعمەتێکی لای خۆیەوە بداتێ ئەو دەردو ئازارەی زووی لەیاد ئەچێتەوە کە لەبارەیەوە ئەپاڕایەوە تا بۆی چاربکاو لە کۆڵی بکاتەوە، هاوبەش و هاوچەشن بۆ خوا دائەنێ بۆ ئەوەی خەڵك لە ڕێی خوا گومڕا بکا. تۆ بەو ئادەمزادە بڵێ: تۆزێ بەم کافریی خۆتەوە ڕابوێرە، تۆ سەرەنجام دۆزەخیت و هاوڕێی ئاگرو لە جەهەنەمدا بەسەرئەبەی.

(٩) ئایا کەسێ کە بە سەعاتەکانی شەوا خەریکی خواپەرستییە سوجدە ئەباو بەپێوە ئەوەستێ و نوێژ ئەکاو لە سزای ڕۆژی قیامەت ئەترسێ‌و بە هیوای ڕەحمەتی خوایە، وەك کەسێکی کافری بێباوەڕ وایە؟ دیارە نە. تۆ بڵێ: ئایا ئەوانەی زانان و ئەوانەی هیچ نازانن وەك یەك وان؟ دیسان دیارە نە. کەسانێ کە خوا بە یەك بزانن و کەسانێ کە بە یەکی نەزانن وەك یەك نین و تەنها کەسانێ بیرئەکەنەوە کە خاوەن عەقڵ و فام و هۆش بن.

(١٠) تۆ بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم کەوا ئیمانتان هێناوە ! لە خوای خۆتان بترسن. بۆ ئەوانەی کردەوەی چاکەیان کردووە لەم دنیایەدا پاداشی چاك هەیەو ئەرزی خوایش بەربڵاوە، ئەوەی نەتوانێ لە نیشتمانی خۆیا چاکە بکا با بار بکا بۆ نیشتمانێکی تر بتوانێ چاکەی تیا بکاو، کەسێکیش بەسەبر بێ‌و تەحەمولی مەینەتی فەرمانبەرداریی خوا بکاو لەپێناوی فەرمان بەرداریی خوای خۆیا نیشتمانی خۆی بەجێ بهێڵێ، پاداشێکی وای ئەدرێتەوە ژمارەی ژمێریار پیایا ناگاتەوە.

قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَـٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّـٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾ لَـٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَـٰبِيعَ فِي ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَـٰمًا ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِي ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٢١﴾



(١١) تـۆ، ئـەی موحەممـەد! بڵـێ: مـن بەڕاستی فەرمانم پێدراوە کەوا زاتی خوا بپەرستم و بەندەیی خۆم بـۆ خـوا پـاك و بێگەرد بکەم و بە خاوێنی بیپەرستم.

(١٢) فەرمانیشـم دراوەتـێ یەکـەمین موسوڵمان بم.

(١٣) تـۆ بڵـێ: مـن ئەترسـم ئەگـەر لـە فەرموودەو فەرمانی خـوای خـۆم دەرچم سزای ڕۆژێکی سەختم تووش ببێ.

(١٤) تۆ بڵێ: من بەندەگیو پەرستن هەر بۆ خوا ئەکەم و ئـایین و دیانـەتی خـۆمم بۆ ئەو خاوێن و بێگەرد کردووە.

(١٥) ئێوەیش هەرکەستان ئارەزوو لێیە لـە غـەیری خـوا بیپەرسـتن. تـۆ بڵـێ: خەسـارەتباران ئەوانـەن خۆیـان و کەسوکاریانیان لە ڕۆژی قیامەتا لەکیس چووە. بێدارەوە بـن! زیـان و خەسـارەتی دیاریش هەر ئەوەیـە. مەبەسـتی ئەوەیـە لـە دنیـادا خۆیـان گـومڕا بـوون و کەسوکاریشـیانیان گـومڕاکردووەو لەبەرئـەوە لـە ڕۆژی قیامـەتا هـەموویان دۆزەخ جێیان ئەبێ.

(١٦) بۆیـان هەیـە بـە ژوور سـەریانەوە چەند سایەو سایەوانی ئاگری، لە ژێریشیانەوە چەند سایەو سایەوانی ئاگر. خوا بەندەکانی خۆی بەو سزایە ئەترسێنێ. کەواتە، ئەی بەندەکانم، لێم بترسن و خۆتانم لێ بپارێزن.

(١٧) ئەو کەسانەی دوورکەوتوونەتەوە لە شەیتان لەوە کە بیپەرستن و گەڕاونەتەوە بۆ لای خـوا، ئەوانـە مـژدەیان بـۆ هەیە کە خوا پاداشی چاکەیان ئەداتەوە، کەواتە مژدە بدە بەو بەندانەم.

(١٨) کە گوێ لە وتە ئەگرن و شوێنی ئەوەی ئەکەون کە لە هەمووی باشترە. ئەوانە کەسانێکن خـوا هیدایـەتی داون و، ئەوانە خاوەنی عـەقڵ و فامی ساغ و ڕێکوپێکن.

(١٩) ئایا کەسێ فەرمانی سزادانی دەرچووبێو لەناو ئاگری دۆزەخا بێ، ئایا تۆ کەسێکت پێ ڕزگار ئەکرێ کە لەناو ئاگری دۆزەخا بێ؟

(٢٠) بەڵام ئەوانەی لە دنیادا لە خوای خۆیان ترساون بۆ ئەوان هەیە باڵاخانەی بەرزی ژوور تێـدا کـراوە کـە جۆگـای ئاوی ساف بە ژێریانا ئەڕوا. ئەمە گفتی خوایە بۆ ئەو کەسانەو خوا هەرگیز بەپێچەوانەی گفتی خۆی ناجووڵێتەوە.

(٢١) ئایا تۆ نازانی خوا ئاوی لە ئاسمانەوە داپەڕاندووەتە خوارو کردوویەتی بە چەند کانیـاو لـە زەویـداو پاشـان بـەو ئاوی کانیاوانە کشتوکاڵی هەمەجۆرەو هەمەڕەنگە لە زەوی دەرئەکاو پاشان کشتوکاڵەکە زەرد ئەبێو وشك ئەبێو لە قەپاغی خۆی دەرئەچێو ئەوجا وردی ئەکا؟ بەڕاستی ئەمە هـەمووی مایـەی بیرکردنـەوەی تیایـە بـۆ ئەوانـەی فـام و هۆشیان هەیە.

أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ أَفَمَن يَتَّقِى بِوَجْهِهِۦ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْىَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾



(٢٢) ئایا كەسێ خوا سنگی كردبێتەوە بۆ ئیسلام و ئیتر ئەو لەبەر ڕووناكیی خوای خۆیدا بێ، ئەو كەسە وەك كەسێكی دڵ تاریك وایە خوا هیدایەتی نەدابێ؟ دەی هاوار بۆ ئەو كەسانەی دڵیان ڕەق بووەو یادی خوا نایەت بە دڵیانا. ئەوانە لە گومڕاهییەكی ئاشكراو دیاردان.

(٢٣) خوا ناردوویەتیە خوار بۆ سەر پێغەمبەر جوانترین وتار كە بریتییە لە كتێبێ كە ئایەتەكانی لە موعجیزەییو هاوسەنگیی دارِشتن و ڕاستی مەعناو گەیاندنی سوودی ئادەمزادا لەیەك ئەچن و، لە خوێندنەوەدا دووبارە ئەكرێنەوە. ئەوەندە بەسامە پێستی ئەو كەسانەی لە خوای خۆیان ئەترسن موچوڕكەی پیا دێو گرژئەبێتەوە لە ترسی ئەو هەڕەشانەی تیاینیو، پاشان پێستیان نەرم ئەبێتەوەو دڵیان بەهۆی یادكردنەوەی خواوە ئارام ئەبێتەوە. ئەم حاڵەتە هیدایەتی خوایە هەركەسی مەیلی لێ بێ پێی هیدایەت ئەداو، هەركەسیش خوا گومڕای بكا كەس نابێ هیدایەتی بداو ڕێگای پیشان بدا.(٢٤) ئایا كەسێ لە دۆزەخا سزا بدرێو جەستەی لە ڕۆژی قیامەتا بە ڕووی خۆی لە سزای بەدو ناهەموارو گران بپارێزێ واتە دەموچاوی بكا بە قەڵغانی لەشی لە ئاگری دۆزەخ كە كارێكی چەند قورس و گرانە، وەك كەسێ وایە بۆ خۆی لە بەهەشتا دوور لە ئاگری دۆزەخ حەسابێتەوە؟ ئا لەو ڕۆژەدا بە ستەمكاران ئەوترێ: بیچێژن ئەوەی خۆتان بۆ خۆتانتان پەیدا ئەكرد. (٢٥) ئەو كافرانەی بەر لە كافرەكانی سەردەمی پێغەمبەر بوون پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆزن دانا، بۆیە سزایان لەلای خواوە لە ڕێگایەكەوە بۆ هات كە خۆیان هەستیان پێ نەئەكردو پێیان نەئەزانی. (٢٦) جا خوا تامی ڕسوایی لە ژیانی ئەم دنیایەدا پێچەشتن و، سزای ڕۆژی قیامەتیش گەورەترە ئەگەر بیانزانییایە. (٢٧) بەڕاستی ئێمە لە هەموو نموونەیەكمان لەم قورئانەدا بۆ خەڵك هێناوەتەوە، بەڵكو ئەمە خوایە بیرێ بكەنەوەو گوێ بۆ فەرمانی خوا شل بكەن.

(٢٨) حاڵی ئەم قورئانەیش وایە قورئانێكی عەرەبی زمانە بۆ ئەوەی ئەوانەی قورئان لەناویانا هاتووەتە خوار تێی بگەن و لێی حاڵی بن. قورئانێكە هیچ چەوتیو چەوێڵییەكی تیا نییەو بەهیوای ئەوە نازڵمان كردووە ئەم خەڵكە لە خوای خۆیان بترسن. (٢٩) خوا نموونەیەكی هێناوەتەوە بۆ كەسێ خوا بە یەك بزانێو كەسی چەندین بت بپەرستێو بیانكا بە هاوبەشی خوا: كابرایێ بەندەی چەند خاوەنێ بێو خاوەنەكانی لەناو خۆیانا ناكۆك بن و كابرایەكی تریش بەندەی یەك تاقە خاوەن بێو خاوەنەكەیشی كابرایەكی ئارامی بێ زەرەرو زیان بێ. ئایا ئەم دوو بەندەیە یەك جۆرە ژیان ئەژین؟ دیارە نە. ئەوەی خاوەن فرە هەر تاوێكی ژیانێكی مردنێكەو، ئەمیشیان بۆخۆی لە ژیانێكی ئارام و ئاسوودەدا ئەژی. سوپاس هەموو بۆ خوایەو، كەس هاوبەشی نییە تیایا چونكە خاوەن و بەخشندەی ڕاستەقینەی هەموو شتێ هەر خۆیەتی، بەڵام بەشی زۆری ئەم خەڵكە نازانن ڕاستی كامەیەو چۆنە.

(٣٠) بێگومان، ئەی موحەممەد! تۆ سەرەنجام ئەمریو ئەوانیش هەموو ئەمرن. (٣١) پاشان ئێوە گشتتان لە ڕۆژی قیامەتا لە حزووری خوای خۆتانا ئەبێ بە هەراتان و تۆ بەڵگەی خۆتیان لەسەر ئەهێنێتەوە كە ئەتویست بیانهێنیتە سەر ڕێی ڕاست و ئەوان لەسەر بت پەرستیی خۆیان سووربوون و بڕوبیانوویان ئەهێنایەوە.

۞ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَٰمِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾



(٣٢) جا کێیە ستەمکارتر لە کەسێ درۆ بداتە پاڵ خواو ڕاستی وەك قورئان بەدرۆ دابنێ کاتێ هاتە سەری، یا پێغەمبەر بە درۆزن دابنێو ئیددیعای پێغەمبەرییەکەی بە درۆ بزانێ؟ ئایا لە دۆزەخا جێیەك نییە ئەم کافرانەی تیا جێگیر بن؟

(٣٣) ئەو کەسەیش کە قسەی ڕاستی لە خواوە هێناوە بۆ خەڵك و ئەوەیش کە باوەڕ بە ڕاستی ئەکا کە موسوڵمانانن کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرو قورئان کردووە، ئەوانە ئەو کەسانەن لە خوا ئەترسن و خۆیان لە ئاگری دۆزەخ دوورئەخەنەوە.

(٣٤) چییان دڵ بگرێ لای خوای خۆیانەوە دەسگیریان ئەبێو ئەمەیش پاداشی کەسانی چاکەکەرە.

(٣٥) بۆیەیش وایە تا خوا کەفارەتی خراپترین کردەوەیان بداو پاداشی خۆیان بداتەوە بە باشترینی ئەو کارانەی ئەیانکردن، واتە هەرچی کاری چاکیان بووە بە کردەوە هەرە باشەکەیان بۆیان حیساب بکاو بەپێی ئەوە پاداشیان بداتەوە.

(٣٦) ئایا خودا بەس نییە بۆ بەندەی خۆی کە پێغەمبەرە، واتە ئایا خوا بەسی پێغەمبەر نییە لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ یارمەتیدانیو سەرخستنیو بەزاندنی دوژمنەکانیو سەرخستنی ئایینەکەیو بۆ پاداشدانەوەیشی لە ڕۆژی قیامەتدا؟ ئەی موحەممەد! کافرەکان تۆ ئەترسێنن بەو بتانەی لە بریتیی پەرستنی خوا ئەیانپەرستن چونکە خۆیان گومڕان و، هەرکەسیش خوا گومڕای بکا کەس نییە بیخاتە سەر ڕێی ڕاست.

(٣٧) کەسێکیش خوا هیدایەتی بدا کەس نییە بتوانێ گومڕای بکا. ئایا خوا خاوەن عیززەت و زاڵو تۆڵەسێنەوە نییە لە تاوانکاران؟

(٣٨) ئەگەر تۆ پرسیاریان لێ بکەی کێ ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە، بەجەختەوە ئەڵێن: خوا. دەی تۆ پێیان بڵێ : دیتان ئەوانەی ئێوە هاواریان لێ ئەکەن و لێیان ئەپاڕێنەوەو هاوار ناکەنە خواو لێی ناپاڕێنەوە، ئەگەر خوا بیەوێ زیانێ بە من بگەیەنێ ئەوان ئەو زیانەم لەسەر لائەبەن، یا ئەگەر بییەوێ ڕەحمەتێکم بەسەرا بڕێژێ ئەوان ئەتوانن ئەو ڕەحمەتەی خوام لێ بگرنەوە؟ تۆ بڵێ : من خوام بەتەنها خۆی بەسە، کەواتە با هەرکەسێ ئەیەوێ بە یەکێ پشت ئەستوور بێ، بەو خوایە پشت ئەستوور بێ.

(٣٩) ئەی موحەممەد! تۆ بڵێ پێیان: ئەی تاقمێ کە من هاتووم هیدایەتتان بدەم و هیدایەت وەرناگرن! بەگوێرەی توانو دەسەڵاتی خۆتان کاربکەن، منیش ئەوەی بتوانم ئەیکەم. جا لەمەوپاش ئەزانن و بۆتان دەرئەکەوێ کەوا..

(٤٠) کێ سزایەکی وای لە خواوە بۆ دێ ڕیسوای بکاو، کێ عەزابی هەرگیز لەسەرلانەچووی بەسەرا دێ؟

إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾



(٤١) ئەی موحەممەد! ئێمە قورئانمان نازڵ کردووەتە خوارەوە بۆسەر تۆ بۆ خەڵك بەڕاستی. جا هەرکەس هیدایەت وەربگرێ ئەوە بۆ خۆیی وەرگرتووەو هەر کەسیش گومڕا ببێ ئەوە بۆ زیانی خۆی گومڕا ئەبێ. تۆ بەرپرسی ئەوان نیت ناچاریان بکەیت هیدایەت وەربگرن.

(٤٢) خوا گیانی هەموو زیندوویێ وەرئەگرێتەوە لە کاتی مردنیا بە جۆرێ کە لەشی دەسەڵاتی کردنی هیچی نەمێنێ، گیانی ئەوانیش وەرئەگرێتەوە لە کاتی نووستنیانا کە هێشتا نەمردوون و کاتی مردنیان نەهاتووە بەڵام پێوەندی گیانەکەیان بە لەشیانەوە ئەمێنێ. پاشان ئەوەی کە وادەی مردنی هاتووە گیانەکەی ناکاتەوە بەبەریاو، ئەوەیش کە نووستبوو گیانەکەی بەرەڵڵا ئەکا بچێتەوە جێی خۆی کە لەشەکەیەتی تا ئەوکاتەی بۆی دیاری کراوە بێگومان لەم کردارانەی خوادا گەلێ دەلیلو بەڵگە لەسەر توانایی خوا هەیە بۆ کەسانێ کە وردببنەوەو بیربکەنەوە.

(٤٣) یاخود ئەو بتپەرستانە چەند بتێکیان بێجگە لە خوا ڕاگرتووە بە ناوی ئەوەوە کە تکاکارن بۆیان لای خوا؟ جا تۆ پێیان بڵێ : ئەی ئەگەر ئەو بتانە خاوەنی هیچ نەبن و دەسەڵاتیان بەسەر هیچا نەشکێو هۆشیاریش نەبن و عەقڵو فامێکیان نەبێ، هێشتا هەر بۆ تکاکاری دەس ئەدەن؟ دیارە نەخێر.

(٤٤) تۆ پێیان بڵێ : هەر بۆ خوا خۆیەتی هەرچی تکاکارییەك هەیەو، موڵکی ئاسمانەکان و زەوی بۆ ئەوەو پاشان بۆ لای ئەو ئەگێڕرێنەوە.

(٤٥) کاتێ ناوی خوا بەتەنیاو بە بێهاوبەش ئەهێنرێ دڵی ئەوانەی ئیمانیان بە ڕۆژی قیامەت نییە نارەحەت و پەرێشان ئەبێ. کاتێکیش کە ناوی بتەکانیان ئەهێنرێ کە لەخوار خوایانەوە داناون دەسبەجێ شادمان ئەبن و ئەگەشێنەوە.

(٤٦) جا تۆ بڵێ : خوایە! ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویو، زانا بە هەرچی نهێنیو ئاشکرا هەیە! تۆ خۆتی بڕیار ئەدەی لە نێوان بەندەکانتا لە هەرچی بابەتێکا هەیە کە ناکۆکییان لە نێوانا بووبێ تیایا.

(٤٧) ئەگەر ئەوانەی لە دنیادا ستەمکار بوون هەرچی دارایی‌و سامان لە زەویدا هەیە هیی ئەوان بوایەو ئەوەندەی تریشی لەگەڵا بوایە ئەیانکرد بە قوربانی خۆیان و ئەیاندا لەباتیی ئەوەدا لەو سزا سەختە ڕزگاربن کە لە ڕۆژی قیامەتا تووشیان ئەبێو، لەو ڕۆژەدا بۆیان دەرئەکەوێ لەلایەن خواوە لە ئازارو سزا، ئەوەی کە هەر بە خەیاڵیشیانا نەئەهات.

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ۚ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا ۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾



(٤٨) لەو رۆژەدا خراپەی ئەو کردارانەیان بۆ دەرئەکەوێ کە کردوویانن و، ئەوەی گاڵتەیان پێئەکردو بەدرۆیان دائەنا گەمارۆیان ئەداو سزای لە هەموو لایەکەوە روویان تێئەکا.

(٤٩) عادەتی ئادەمزاد وایە تێکرا کە زیانێکی پێئەگا هاوارمان لێئەکا بچین بەفریایەوە . کە چوویشین بەفریایەوەو نازو نیعمەتێکمان پێبەخشی ئەڵێ : ئەم نازو نیعمەتەم لە لێهاتوویی و زانایی خۆمەوە دەست کەوتووە، نەخەیر وا نییەو ئەمە بۆ تاقیکردنەوەیەتی ، بەڵام بەشی زۆری ئەم خەڵکە نازانن خوا ئەیەوێ تاقییان بکاتەوە ئاخۆ سوپاسی نیعمەتی خوا ئەکەن یا نە؟

(٥٠) کافرەکانی پێش ئەمانیش هەر ئەم قسەیان ئەکرد، بەڵام نە ئەم قسەیەی ئەیانکردو نە ئەو کردەوانەی ئەیانکردن هیچ دادیان نەدان و سوودێکیان نەبوو بۆیان.

(٥١) جا سزای کردەوەی خراپی خۆیان گرتنیەوەو، ئەوانەیش کە ستەمکارییان کردووە لەناو ئەمانەدا ئەوانیش سزای کردەوەی خۆیان ئەیانگرێتەوەو ئەمانە ناتوانن کارێ بکەن خوا نەتوانێ سزایان بداو تۆڵەی بەدکردارییانیان لێ بسێنێتەوە.

(٥٢) ئایا ئەم کافرانە نەیانزانیوە کەوا خوا رۆزی بەربڵاو ئەکا بۆ هەرکەس خۆی مەیلی لێ بێ و کەموکورتی ئەکا بۆ هەر کەسێکی تر کە مەیلی لێ بێ. بێگومان ئەم دەسەڵاتی خوایە لە بەربڵاوکردن یا کەموکورت کردنی رۆزیی هەرکەسێکا کە خۆی مەیلی لێ بێ، چەندین نیشانەو بەڵگەی تیایە بۆ توانایی خوا بۆ هەر کۆمەڵە خەڵکێ کە باوەڕیان بە خوا هەبێ.

(٥٣) تۆ، ئەی موحەممەد! بڵێ بەو بەندانەم کە زیادەڕۆییان کردووە لەسەر نەفسی خۆیان لە گوناهکردن و بێفەرمانیی خوادا: نائومێد مەبن لە رەحمەتی خوا، خوا لە هەموو گوناهێ خۆش ئەبێ بۆ هەرکەسێ کە باوەڕی هەبێ کەوا خوا گوناهبەخش و میهرەبانە.

(٥٤) پێشیان بڵێ : بگەڕێنەوە بۆ لای خوای خۆتان و ملی بۆ کەچ بکەن و فەرمانبەرداریی بکەن بەر لەوەی سزا لە خواوە بێتە سەرتان و ئەو کاتە یارمەتیتان نەدرێ و کەس نەیێ بە هاوارتانەوە.

(٥٥) شوێنی جوانترین شتێکیش بکەون کە لەلایەن خوای خۆتانەوە نازڵ کراوە بۆتان کە قورئانە بەر لەوەی سزای خواتان لەپڕ بێتەسەرو ئێوەیش بە خۆتان نەزانن.

(٥٦) بەر لەوەی نەفسێ لەبەر خۆیەوە بڵێ : ئەی داخی گرانم بۆ ئەو کەمترخەمییەی لە ئاست فەرمانی خوادا کردم، بەڕاستی من لەوانە بووم گاڵتەیان بەم پەیامە ئەکرد کە خوا بۆ ئادەمزادی ناردبوو.

أَوۡ تَقُولَ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾
أَوۡ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّ لِي كَرَّةٗ فَأَكُونَ
مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَتۡكَ ءَايَٰتِي فَكَذَّبۡتَ بِهَا
وَٱسۡتَكۡبَرۡتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ
تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسۡوَدَّةٌۚ أَلَيۡسَ فِي
جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ
بِمَفَازَتِهِمۡ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ
خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٦٣﴾ قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا
ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ
أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ
فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ
وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ
مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٧﴾



(٥٧) یاخود بڵێ: ئەگەر خوا هیدایەتی بدامایەو بیخستمایەتە سەر ڕێی ڕاست، لەو کەسانە ئەبووم لەخوا ئەترسن و خۆیان لە گوناھ دوورئەخەنەوە.

(٥٨) یاخود کاتێ کە عەزابی خوا ئەبینێ بڵێ : خۆزگە گەڕانەوەیەکم ببوایە بۆ دنیا تا یەکێ بم لەو کەسانەی چاکە ئەکەن.

(٥٩) نەخێر، بەڕاستی ئایەتەکانی من هاتنە لات و باوەڕت پێ نەکردن و بەدرۆت دانان و خۆت بە زل زانیو لە کافرەکان بووی.

(٦٠) لە ڕۆژی قیامەتا ئەوانە ئەبینی کە درۆیان دابووە پاڵ خواو ئیددیعای درۆیینەیان بۆ کردبوو، ڕوویان ڕەشە. جا ئایا دۆزەخ جێیەکی تیا دەسگیر نابێ بۆ ئەوانەی لە بەرانبەر فەرمانەکانی خوادا خۆیان بە زل زانیوە؟

(٦١) خوا ئەوانە ڕزگار ئەکا کە لە خوا ترساون بە هۆی ئەو کردەوە باشانەیانەوە کە بوون بە مایەی ڕزگاربوونیان و خراپە نایانگرێتەوەو خەمبار نابن.

(٦٢) خوا دروستکەری هەمو شتێکەو لەسەر هەمو شتێك چاودێرو ئاگادارە.

(٦٣) کلیلەکانی ئاسمان و زەوی هەموو هیی ئەون و ئەو کەسانەیش کە کافر بوون هەر ئەوانە زەرەرمەندو ماڵوێرانن.

(٦٤) تۆ پێیان بڵێ، ئەی موحەممەد: ئەوە ئێوە فەرمان بە من ئەدەن عیبادەت و بەندەگیی غەیری خوا بکەم ئەی نەزانەکان؟

(٦٥) بەڕاستی وەحی کراوە بۆ تۆیش و بۆ پێغەمبەرەکانی پێش تۆیش کەوا ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێیت هەموو کردەوەت بە زایە ئەچێو لە ڕیزی خەسارەتمەندان ئەبی.

(٦٦) بەڵکو عیبادەت هەر بۆ خوا بکەو لەوانە بە کە سوپاسی خوا ئەکەن.

(٦٧) ئەو کافرانە قەدری خۆیان نەگرتووە بەوجۆرەی کە شایانیەتیو، ئەو خوایە خوایەکە هەموو ئەرز، لە وشکان و لە دەریای، لە ڕۆژی قیامەتا وەك مشتێ گڵە لەناو دەستی توانی ئەواو، ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستی ئەو، واتە بەهێزی ئەو، پێچراونەتەوە. خوا بەرزو پاك و خاوێنە لەوە کە هاوبەش بۆ دانەرەکانی هاوبەشی بۆ دائەنێن.

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧١﴾ قِيلَ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾



(٦٨) کاتێ کە سەردەمی فەوتانی هەموو گیانلەبەران دێ، لەلایەن فریشتەی فەرمان پێدراوی تایبەتیی ئەم کارەوە فوو ئەکرێ بە صووردا، ئیتر بە دەنگی توندو تیژی ئەو فووە کە ئەکرێ بە صووردا هەرچی گیانلەبەرێ لە ئاسمان و لە زەویدا هەیە هەمووی لە هۆشی خۆی ئەچێ واتە ئەمرێ ئەوانە نەبێ کە خوا بییەوێ بە زیندوویی بمێننەوە. جا پاش ماوەیێ، کە وتراوە چل ساڵە، فوویەکی تر بە هەمان صووردا ئەکرێ، ئیتر دەسبەجێ هەموو زیندوو بوونەتەوەو ڕاست بوونەتەوەو سەیر ئەکەن.

(٦٩) جیهانیش بە پڕتەوی جیلوەی خوا ڕووناك ئەبێتەوەو کتێب و دەفتەری لێپرسینەوە دائەنرێو، پێغەمبەران و شەهیدان ئەهێنرێن و داوەری لەنێوان خەڵکا ئەکرێ بەگوێرەی حەق و ڕاستی و ستەمیان لێ ناکرێ.

(٧٠) هەموو نەفسێکیش حەقی کردەوەی خۆی ئەدرێتەوە، چاك بێ یا خراپ بێ. خوایش لە هەمووکەسێ باشتر ئەزانێ ئەم خەڵکە چییان کردووە.

(٧١) ئەوانەیش کە لە دنیادا کافر بوون کۆمەڵ کۆمەڵ پاڵیان پێوە ئەنرێ بۆ ناو دۆزەخ، تا کاتێ کە ئەگەنە بەرەوە دەرگاکانی دۆزەخیان بۆ ئەکرێنەوەو دەرگاوانەکانی پێیان ئەڵێن: ئایا پێغەمبەرانێ لە خۆتان نەهاتنە لاتان ئایاتەکانی خوای خۆتانیان بەسەرا ئەخوێندنەوەو لەوەیان ئەترساندن کە بەم ڕۆژەتان بگەن؟ ئەوانیش ئەڵێن: بەڵێ، بەڵێ، هاتن و ترساندینیان، بەڵام فەرموودەی خوا بە سزادانی کافران ڕاستەو ئەبێ بێتەدی.

(٧٢) بەو کافرانە ئەوترێ: بڕۆنە ناو دەرگاکانی دۆزەخەوەو هەمیشە تیایانا بمێننەوە. دەسا گەلێ گەلێ خراپ و نابارو نا هەموارە قەرارگای ئەوانەی خۆیان بە زل ئەزانیو ملیان بۆ فەرموودەی خوا کەچ نەئەکرد.

(٧٣) ئەوانەیش کە لە دنیادا لە خوا ترساون کۆمەڵ کۆمەڵ بەرێ ئەکرێن بۆ بەهەشت، تا کاتێ ئەگەنە بەهەشت و دەرگاکانییان بۆ ئەکرێنەوەو دەرگاوانەکانی بەهەشت پێیان ئەڵێن: سڵاوی خواتان لێ بێ، خۆتان لە چڵك و چەپەڵیی تاوان پاك ڕاگرت، دە بڕۆنە ناو بەهەشتەوەو هەمیشە لەوێ بن.

(٧٤) بەهەشتییەکانیش ئەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خودایەی گفتی خۆی کە دابووینێ، لەگەڵی هێناینەدیو خاکی بەهەشتی بۆ کردین بە میراتی بۆماوە، هەر شوێنێکمان ئەوێ ئەیکەین بە جێگەو ماوەی خۆمان. کەواتە پاداشی چاکە پاداشی ئەوانەیە کردەوەی چاکەیان کردووە.

وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾

## سُورَةُ غَافِر

ترتيبها ٤٠ — آياتها ٨٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ مَا يُجَٰدِلُ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۖ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ۖ وَجَٰدَلُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾

حزب ٤٧



(٧٥) لەویادا فریشتەکان ئەبینی بە دەوری عەرشی خوادا ڕیزیان بەستووە سوپاس و تەسبیحاتی خوا ئەکەن و، داوەری لەنێوان خەڵکا کراوە بەوەی کە حەق و ڕاستەو، بەهەشتی براوە بۆ بەهەشت و دۆزەخی براوە بۆ دۆزەخ و، هەموان ئەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە .

## سووڕەتی ( غَافِر )

**مەککەییە ئایەتی ٥٦و ٥٧ی نەبێو، (٨٥) ئایەتە**

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چییە.

(٢) هێنانەخوارەوەی ئەم قورئانە لەلایەن خوایەکەوەیە کە خاوەن عیززەتەو زانایە بە هەموو شتێ.

(٣) گوناهبەخش و تۆبەوەرگرو سزاسەخت و بەهێزە. هیچ پەرستراوێکی بەڕاست نییە ئەو نەبێو، سەرەنجام هەمووشتێو هەمووکەسێ بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە.

(٤) ناکەوێتە دەمەدەم و بەرپەرچدانەوە لە بارەی ئایەتەکانی خواوە کە ناردوونیەتە خوارەوە بۆسەر پێغەمبەرەکانی تەنها ئەوانە نەبێ کە کافرن، لەبەر ئەوە گەڕان و هاتوچۆیان بە وڵاتانی شام و یەمەندا لە خشتەت نەبا وا بزانی ئەمانە کۆمەڵێکی بەهێزن و هەرگیز لە بەزین نایەن.

(٥) بەر لەوانیش خێڵەکەی نووح و، دوای ئەوانیش ئەو کۆمەڵانەی گەلەکۆمەیان کرد لە دژی پێغەمبەران، هەموویان پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆزن داناو باوەڕیان پێنەکردن و هەر میللەتێ کە پێغەمبەریان چووە سەر بۆ ئەوەی بێنە سەر باوەڕ بە خواو ئایینی خوا، هەموو نیازی خراپیان بە پێغەمبەری خۆیان هەبوو بۆ ئەوەی بیگرن و بیکوژن و بە قسەی هیچوپووچ کەوتنە دەمەدەم بە مەبەستی ئەوەی پێغەمبەرەکەیانی پێدەمکوت بکەن، منیش بە قاروقینی خۆم گرتمن و بەربادم کردن، جا سەیرکە سزای من چۆن بوو!

(٦) هەر بەم جۆرە قسەی خوای تۆ لەسەر ئەوانەی کافر بوون جێگیر بوو، کە قسەکەیش ئەوەیە ئەمانە دۆزەخین و هەمیشە هەر لە دۆزەخا ئەبن و لەگەڵ دۆزەخ لێك نابنەوە.

(٧) ئەو فریشتانەی عەرشی خوایان هەڵگرتووەو ئەو فریشتانەی تریش کە بەدەورووبەریدان بۆ سوپاس و سەنای خوا تەسبیحاتی بۆ ئەکەن و باوەڕیان پێی هەیەو داوای لێبووردن لە خوا ئەکەن، بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو ئەڵێن: خوایە ! تۆ بە میهرەبانیو زانایی خۆت هەموو شتێکت گرتووەتەوە، دەسا لەوانە ببوورە کە تۆبەیان کردووەو ڕێی تۆیان گرتووەتەبەرو لە ئاگری دۆزەخیان بپارێزە.

رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِيِّ ٱلْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزْقًا ۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ رَفِيعُ ٱلدَّرَجَٰتِ ذُو ٱلْعَرْشِ يُلْقِي ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾



(٨) خوایە بیشیانخەرە ناو ئەو بەهەشتی عەدنـەوە کـە گفتـت پـێداون، لەگـەڵ هەرکەس کە پیاوی چاك بووبێ لە باوك و باپیران و ژن و نەوەیان. بێگومان هەر تۆ خاوەن عیززەت و حیکمەتیت.

(٩) بیشیانپارێزە لـە سزای خراپ لـە ڕۆژی قیامەتاو، هەرکەسێ تۆ لەو ڕۆژەدا لە سزای خراپی بپارێزێ ئەوە میهرەبانیت لەگەڵی کـردووەو، بـە ئـاوات گەیشتنی مەزنیش هەر ئەوەیە.

(١٠) بەڕاستی ئەوانەی کە کـافر بـوون و بـە کـافری مـردوون لـە ڕۆژی قیامـەتا بانگیـان لێ ئـەکرێو پێیـان ئـەوترێ: دوژمنایـەتیی خـوا بـۆ ئێـوە لـەم ڕۆژەدا گـەورەترو سـەختترە لـە دوژمنایـەتیی خۆتان بۆ خۆتان لـە دنیـادا کاتـێ بـانگ ئـەکران بـۆ بـاوەڕکردن بـە خـواو ئێـوە کوفرتان ئەکردو ئیمانتـان پـێ نەئـەهێنا، چونکە دوژمنایەتییەکەتان بۆ خۆتـان لـە دنیادا هەر لەو ماوەیـەدا بـوو کـە بـانگ ئـەکران بـۆ ئیمانهێنـان و ئیمانتـان نەئەهێناو تا مـردن بـەو جۆرە ژیـان کـە خۆتان ئەتانویـست نـەك بـەوجۆرەی خـوا لێـی ئەویـستن، بـەڵام دوژمنایەتییەکـەی خوا بۆتان لە ڕۆژی قیامەتا ئەنجامەکـەی لـە سـەرەتای قیامـەتەوەیـەو هـەرگیز نابڕێتـەوە، چـونکە ئەتانخاتـە نـاو ئـاگری دۆزەخەوە کە بڕانەوەی بۆ نییە.

(١١) جا کافرەکان ئەڵێن: خوایە تۆ دوو جار ئێمەت مرانـدووە و دوو جـارت زینـدوو کردووینەتـەوە، مردنـی یەکـەم ئەوەیە کە هێشتا نەهاتبووینە دنیاوەو مردنی دووهەم ئەوەیـە کـە یەکـەجار لـە دنیـادا مرانـدتمان. زیندووکردنـەوەی یەکەمیش ئەوەیە کە یەکەجار گیانت کرد بە بەرمانداو زیندووکردنەوەی دووهـەمیش ئەوەیـە لـە قیامـەتا زینـدووت کردینەوە بۆ لێپرسینەوەی کردەوەمان لە دنیادا. دە ئاخۆ ڕێگایەك هەیە بۆ جۆرە دەرچوونێ لـەناو ئـاگری دۆزەخ بـە هەر جۆرێ بێ؟(١٢) ئەمەی ئێـوەی تێدان بـەهۆی ئەوەوەیـە کاتـێ بـانگ بکرایەتـە خـوا بەتـەنها خۆیو بـێهیچ هاوبەشێك ئینکاری ئەم تەنهاو تاکییەی خواتان ئەکردو، ئەگەر هاوبەشێکی بۆ دابنرایە باوەڕتان بەوە ئەکرد کە خـوا هاوبەشێکی هەیە. بۆیە ئێستا بڕیار هیی خوای بەرزو باڵاو گەورەیە کە ئەتانخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

(١٣) خوا ئەو خوایە نیشانەکانی گەورەیی خۆیتان پیشان ئەداو ڕزق و ڕۆزیتان لە ئاسمانەوە بۆ دائەپەڕێنێتە خوار بە هۆی بارانباراندنەوە کە ئەبێ بە مایەی سەوزبوونی دەغڵودان و پێگەیشتنی بەرومیوەی دارودرەخت، بەڵام کەس بـیر لە گەورەیی خوا ناکاتەوە ئەو کەسانە نەبێ بە ساغیو بێگەردی ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوا.

(١٤) دەی بانگ بکەنە خواو هاواری لێبکەن و حاڵتان وابێ پەرستنتان خاوێن و بێگەرد هەر بۆ ئەو بێو هاوبەشی بۆ دامەنێن هەرچەند کافرەکانیش پێیان ناخۆش بـێ.(١٥) خـودا پایـەو پلـە بـەرزە ، خـاوەنی عـەرشـە ، لـە فـەرمانی خۆیەوە وەحی ئەنێرێتە سەر هەرکەس لە بەندەکانی کە خۆی مەیلی لێ بێو ئـەیکا بـە پێغەمبـەر بـۆ ئـەوەی خـەڵك بترسێنێ لەو ڕۆژەی کە سەرجەمی ئادەمزاد ئەگەنەوە بە خواو لە کرداری چاك و خراپی دنیایان ئەکۆڵێتەوە کـە ڕۆژی قیامەتە.(١٦) ئەو ڕۆژەی کە ئەو خەڵکە هەموو دیارو بەدەرەوەن لە مەیدانی مەحشەردا کەسیان لە خوا ون نابـێو هیچ کردەوەیەکیان لە خوا ون نابێ. فەرمانڕەواییو دەسەڵات و لـەدەسدەربازنـەبوون لـەو ڕۆژەدا بـۆ کێیـە؟ بـۆ ئـەو خوایەیە کە تاك و تەنیایەو هەمووکەسێ لەژێر دەسەڵاتی ئەوایە.

ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٧﴾ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقۡضُونَ بِشَيۡءٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ۞ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُواْ هُمۡ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُواْ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ فَقَالُواْ سَٰحِرٞ كَذَّابٞ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ مِنۡ عِندِنَا قَالُواْ ٱقۡتُلُوٓاْ أَبۡنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ وَٱسۡتَحۡيُواْ نِسَآءَهُمۡۚ وَمَا كَيۡدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ﴿٢٥﴾



(١٧) ئەمڕۆ هەركەسێ جەزای كردەوەی ئەدرێتەوە. ئەمڕۆ هیچ جەورو ستەمێ نییەو دادپەروەرانە مامەڵە لەگەڵ هەمووكەسێ ئەكرێ. خوا زوو لە هەمووكەسێ ئەپرسێتەوە.

(١٨) تۆ، ئەی موحەممەد! ئەو كافرانە بترسێنە لە ڕۆژی قیامەت كە هاتنی نزیكە، لەو كاتەدا كە دڵ ئەكەوێتە تەپەتەپ و بەرز ئەبێتەوە بۆ لای گەروو، خەڵكەكەیش لەتاو خەم و خەفەت كپ و مات و بێدەنگن و ستەمكاران نە خزم و كەسێكیان هەیە بەزەییان پیایانا بێتەوەو نە تكاكارێكیان هەیە تكایان بۆ بكاو بەگوێی ثكاكەی بكرێ.

(١٩) ئەو خوایە بەو وردە خەیانەتانە ئەزانێ كە لە لاكردنەوەو ڕوانینی چاوا دەرئەكەون، بە هەرچی سنگی ئادەمزاد لەناو دڵی خۆیا بە پەنامەكی ڕای گرتووە، واتە ئەو نیازانەی لە دڵی هەركەسدان. مەبەست لەوەیە خوا بە هەموو كردەوەو خەیاڵێكی ئادەمزاد ئەزانێ.

(٢٠) خوا فەرمان بە شتی ڕاست ئەداو، ئەو بتانەی كافرەكان بانگیان لێ ئەكەن و بانگ لە خوا ناكەن، بڕیاری هیچیان پێ نادرێ نە ڕاست و نە ناڕاست، چونكە دەسەڵاتیان بەسەر هیچا ناشكێ. خوا تەنها خۆی شنەواو بینایە.

(٢١) ئایا ئەم كافرانە نەگەڕاون بە زەویدا تا سەیركەن سەرەنجامی ئەوانە چی بوو كە بەر لەمان بوو؟ ئەوان لەمان بەهێزتر بوون و پاشماوەی لێبەجێماویان وەك قەڵاو شاری بە شوورە دەورگیراوو خانووبەرەوی بەرزو مەحكەم لە هی ئەمان زۆرتر بوو، بەڵام سەرەنجام خوا بە گوناهی خۆیان گرفتاری كردن و كەسیان نەبوو بیانپارێزێ لە دەستی قودرەتی خوا .

(٢٢) ئەویش لەبەر ئەوە بوو كە پێغەمبەرەكان ئەهاتن بۆ لایان بە موعجیزەوە، كەچی ئەوان هەر كوفریان كردو ئیمانیان نەهێنا. جا خودا غەزەبی لێگرتن و گرفتاری كردن. خوایش خوایەكی تواناو سزا سەختە.

(٢٣) بەڕاستی ئێمە مووسامان بە موعجیزەو دەسەڵاتی ئاشكراوە نارد.

(٢٤) بۆ سەر فیرعەون و هامان و قاروون، ئەوانیش هەموو لە جیاتیی ئەوەی ئیمان بهێنن وتیان: مووسا سیحربازێكی درۆزنە.

(٢٥) كە مووسا بە دەلیلی ڕاستەوە لەلایەن ئێمەوە هاتە لایان، وتیان: ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لەگەڵیا كوڕەكانیان بكوژن و ژنەكانیان بە زیندوویی بهێڵنەوە، بەڵام فرتوفێڵی كافران هەموو سەرلێشێوان و گومڕاهییەو بە هیچ ئەنجامێكیان ناگەیەنێ.

وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴿٢٨﴾ يَٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾



(٢٦) فیرعەونیش وتی: لێم گەڕێن با مووسا بکوژم، جا با بانگ بکاتە خواکەی خۆی. من ئەترسم مووسا ئایینەکەتان پێ بگۆڕێ یا وڵات تێك بداو وێرانیی تیا بڵاوبکاتەوە.

(٢٧) مووسایش وتی: من پەنام گرتووە بە خوای خۆم و خوای ئێوە لە هەموو خۆبەزلزانیوێ کە باوەڕی بە ڕۆژی لێپرسینەوە نەبێ.

(٢٨) پیاوێکی خاوەن ئیمانیش لە کەسوکاری فیرعەون کە ئیمانی خۆی لێ شاردبوونەوە، وتی: ئەوە ئێوە پیاوێ ئەکوژن چونکە ئەڵێ (اللە) خوای منە، لەگەڵ ئەوەیش کە بەچەند موعجیزەوە لە لای خواوە هاتووەتە لاتان. ئەگەر درۆ بکات ئۆباڵی درۆکەی لە ئەستۆی خۆیایەتی. خۆ ئەگەر ڕاستیش بکا ئەوا هەندێ لەو پاداشە باشانەتان پێ‌ئەگا کە وەعدەتان ئەداتێ. خوا هیدایەتی ئەو کەسانە نادا کە زیادەڕۆن و درۆ زۆر ئەکەن.

(٢٩) هەر ئەو پیاوە خاوەن ئیمانە وتیشی: ئەی خزمینە! موڵك و فەرمانڕەوایی هیی ئێوەیەو دەسەڵاتتان بەسەر وڵاتا هەیە. جا ئەگەر عەزابی خوا بێتە سەرمان کێ بەفریامان ئەگاو یارمەتیمان ئەدا. فیرعەونیش گوێی بە قسەکەی نەداو وتی : لەوە بەولاوە کە خۆم بە پەسەندی ئەزانم هیچی‌ترتان پیشان نادەم و لە ڕێی عەقڵ‌و فام بەولاوە ناتانخەمە سەر هیچ ڕێیەك.

(٣٠) دووبارە پیاوە ئیماندارەکە وتی : ئەی کەسوکارەکانم ! من بەڕاستی ترسی ئەوەم هەیە لێتان کارەساتێکی وەك ئەوەی ئەو ڕۆژانەتان بەسەرا بێت کە بەسەر ئوممەتەکانی پێغەمبەرە پێشینەکانا هات کە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بە درۆزن دانابوو.

(٣١) وەك ئەوەی بەسەر قەومی نووح و عادو سەموودو ئەوانی پاش ئەوانا هات و، خوایش نایەوێ بە ناحەق ئازاری بەندەی خۆی بداو ستەمیان لێ بکا.

(٣٢) ئەی خزم و کەسوکارەکانم ! من ترسی ڕۆژی قیامەتم هەیە لێتان کە خەڵك هەموو هاوار ئەکەنە یەکتر بە هیوای ئەوەی فریایان کەون.

(٣٣) ئەو ڕۆژەی لە مەیدانی مەحشەر پشت پێ هەڵئەکەن و بەرەو دۆزەخ ئەگەڕێنە دواوە ، کەس نییە بتانپارێزێ لە خواو، ئەوەی خوا گومڕای‌کا کەس نییە هیدایەتی بداو بیهێنێتەوە سەر ڕێ.

وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ
مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ
مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ
مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ
أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ
يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ
يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ
وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ
وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ
ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾
يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ
دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ
وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ
فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾



(٣٤) بەڕاستی یوسفیش پێشتر بە بەڵگەی ڕەت نەکراوەوە هاتە لاتان کەچی ئێوە هەر لە بەدگومانیی خۆتانا بوون لەو شتانەی ئەو هێنابوونی بۆتان، تا کە مرد وتتان : ئیتر خوا پاش ئەو پێغەمبەرێکی تر نانێرێ. خوا بەم جۆرە ئەوانە گومڕاو سەرلێشێواو ئەکا کە زیادەڕۆو دوودڵن.

(٣٥) ئەوانەی بێ‌بەڵگەو دەلیلێ بۆیان هاتبێ ، لە بارەی ئایەتەکانی خواوە دەمەدەم ئەکەن ، ئەوانە کارەکەیان لای خواو لای موسوڵمانان زۆر بێزراوەو، خوایش ئاوا مۆر ئەنێ بەسەر دڵی هەر خۆبەزلزانیوێکی ستەمکارا.

(٣٦) فیرعەون بە هامانی وەزیری خۆیی وت : ئەی هامان ! تەلارێکی بەرزم بۆ دروست بکە بەڵکو بتوانم بە هۆی ئەو تەلارەوە بگەمە چەند ڕێگایێ.

(٣٧) ڕێگاکانی ئاسمانەکان . جا بە هۆی ئەو ڕێگایانەی ئاسمانەکانەوە کە وەکو ڕوانگە لێیانەوە بڕوانم و لە بارەی خواکەی مووساوە ئاگاداری پەیدا بکەم. بەڕاستییش من وای بۆ ئەچم مووسا درۆ بکا کە ئەڵێ : خوا منی ناردووە بۆ لای ئێوە. ئا بەم جۆرە فیرعەون کرداری ناشیرینی خۆیی بۆ جوان کراو ڕێی لێ گیرا کە پەیڕەویی پێغەمبەران بکاو ڕێگای چاکە بگرێتەبەر ، بەڵام هەرچی فڕوفێڵی فیرعەون هەیە هەمووی لە مایەپووچیدایە.

(٣٨) ئەوکەسەی بەنهێنی ئیمانی بە مووسا هێنابوو ، بە خێڵەکەی خۆیی وت: ئەی خێڵەکەم ! شوێنی من کەون تا ڕێی گەیشتن بە مرازتان پیشان بدەم.

(٣٩) ئەی خێڵەکەی خۆم ! ئەم ژیانی دنیایە لە هۆیەکی ڕابواردن بەولاوە نییەو، خانەی بەردەوام و جێگای ئۆقرەگرتن ئەو دنیایە.

(٤٠) هەرکەسێ کردەوەیەکی خراپ بکا پاداشی نادرێتەوە بە وێنەی ئەو کردەوە خراپەی خۆی نەبێ‌و، هەرکەسێکیش کردەوەیەکی باش بکا، پیاو بێ یا ئافرەت و، باوەڕی بە خوا هەبێ، ئەوانە ئەچنە بەهەشت و ڕزق و ڕۆزییان ئەدرێتێ بێ‌ئەوەی خۆیان بزانن لە کوێوە بۆیان دێت.

۞ وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى
ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ
لِي بِهِۦ عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ
أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ
وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ
﴿٤٣﴾ فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى
ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ
مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ
يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ
ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٦﴾ وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي
ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا
لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ
﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ
قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ
جَهَنَّمَ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٩﴾



(٤١) هەروا ئەی خێڵەکەی خۆم ! ئەوە چی ڕووی داوە لێم وا من بانگتان ئەکەم بۆ ڕزگاربوون لە عەزابی خواو، ئێوەیش من بانگ ئەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ؟

(٤٢) بانگم ئەکەن بۆ ئەوە کە نینکاری خوا بکەم و شتێکی بکەم بە هاوبەش کە هیچ ئاگام لە خوایەتیی ئەو شتەو هاوبەشێتی خوای نییەو، منیش ئێوە بانگ ئەکەم بۆ لای خوای خاوەن عیززەت و تاوان پۆش؟

(٤٣) هیچ گومانی تیا نییە ئەوەی ئێوە من بانگ ئەکەن بۆ پەرستن و بانگ لێ کردنی ، هیچ شایانییەکی پەرستن و بانگ لێ کردنی نە لە دنیاو نە لە قیامەتا نییەو، سەرەنجامی گەڕانەوەی هەموویان بۆ لای خوایەو، ئەوانەی زیادەڕۆیی ئەکەن لە گومڕاییو لەخوا یاخیبوونا ئەوانەن هاوڕێی هەمیشەی ئاگری دۆزەخن و لێی دەرناچن.

(٤٤) مادەم وایە، لەو دنیا بیری ئەم قسانە ئەکەنەوە کە ئێستا من پێتان ئەڵێم و من کاری خۆم بە خوا ئەسپێرم تا لە هەموو نیازێکی خراپی هەر بەدنیازێکم بپارێزێ . خوا چاوی لە هەموو بەندەکانیەوەیە.

(٤٥) خوایش ئەوی لەو فڕوفێڵانە پاراست کە بۆیان سازکردبوون و ، سزای بەدو ناهەمواریش دەورو گەمارۆی دەستەو دائیرەی فیرعەونی دا.

(٤٦) سزا بەدو ناهەموارەکەیش ئاگری دۆزەخە کە بەیانی و ئێوارە ئەبرێنە سەیرو تەماشایو گوزەریان پێ ئەکرێ بەلایاو، کە ڕۆژی قیامەتیش دێ فەرمان لای خواوە دێ کەوا دەستەو دائیرەی فیرعەون بخەنە ناو سەختترین سزاوە.

(٤٧) بیر لەوە بکەرەوە کە دۆزەخییان لە ناو ئاگری دۆزەخا ئەبێ بە هەراو دەمەقاڵەیان، جا ئەوانەیان کە لە دنیادا بێدەسەڵات و ژێردەستە بوون بەوانەیان ئەڵێن کە خۆیان کردبوو بە گەورە بەسەریانەوە، پێیان ئەڵێن : ئێمە لە دنیادا پەیڕەویکەرو شوێنکەوتەی ئێوە بووین چیتان بوتایە وامان ئەکرد ، جا ئاخۆ ئێستا بەشێ لەم باری ئاگرەمان لەسەر شان لائەبەن؟

(٤٨) ئەوانەیش کە لە دنیادا خۆیان کردبوو بە گەورە بەسەر ئەوانی ترەوە بەوانە ئەڵێن : ئێمەو ئێوە ئێستا هەموو پێکڕا لەناو ئاگری دۆزەخاین، خوایش بڕیاری خۆی لەنێوان بەندەکانیا داوەو ، چ ئێمەی جاران گەورەو چ ئێوەی جاران شوێنی ئێمە کەوتووی هەموو بەجارێ خستووەتە ناو ئاگرەوە، ئیتر تازە ئێمە چیمان لە دەست دێ بۆتان؟

(٤٩) ئەوانەی کە لەناو ئاگران بە قاپییەوانەکانی دۆزەخ ئەڵێن داوا لە خوای خۆتان بکەن بەڵکو ئەمە خوایە بۆ تاقە ڕۆژێ ئەم سزای دۆزەخەمان لەسەر هەڵبگرێ.

قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ
بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ
﴿٥٠﴾ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا
وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ
وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى
ٱلۡهُدَىٰ وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدٗى
وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٥٤﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ
حَقّٞ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ
وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ
ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ
مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلۡبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ
خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾
وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُۚ قَلِيلٗا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾



(٥٠) دەرگاوانەکانی دۆزەخیش لە وەڵاما پێیان ئەڵێن : ئایا ئەو پێغەمبەرانەی خوا ناردبوونیە سەرتان، بە بەڵگەو دەلیلی پێغەمبەرییەوە نەئەهاتنە لاتان؟ ئەمانیش ئەڵێن: بەڵێ ئەهاتن. دەرگاوانەکانیش پێیان ئەڵێن: کەواتە خۆتان داوا بکەن، بەڵام داواو دوعاو پاڕانەوەی کافران لە سەرلێشێواوییەوە ئەبێ نییەو هیچ دادێکیان نادا چونکە کاتی خۆی فریای خۆیان نەکەوتن تا ئێستا وا تووش نەبن.

(٥١) بێگومان ئێمە یارمەتیی فروستادەکانی خۆمان و ئەوانە ئەدەین کە ئیمانیان هێناوە، لە ژیانی دنیادا بەوە کە دڵیان بەهێز ئەکەین خۆیان بگرن و، لە ڕۆژی قیامەتیشا بەوە کە شاهید ڕاست ئەبنەوە بۆ شایەتیدان لەسەر کردەوەی هەرکەس کەوا پێغەمبەران نامەی خوایان گەیاندو ئیمان هاوردووان ئیمانیان پێهێنان و ئیمان نەهاوردووانیش گوێیان بۆ شل نەکردن.

(٥٢) ئەو ڕۆژەی کە عوزرهێنانەوەی ستەمکاران هیچ دادیان نادا و لەعنەت و نەفرینیان بۆ ئەڕواو مەنزڵو ماوایەکی خراپیان هەیە کە دۆزەخە.

(٥٣) بەڕاستی ئێمە هۆی هیدایەتدانی ئوممەتمان دا بە مووسا کە پایەی پێغەمبەرایەتیو شەریعەتەو، تەوراتیشمان بۆ لەناوامانەوە دا بە بەنیئیسرائیل.

(٥٤) کە مایەی هیدایەت و بیرکردنەوەو هۆشیاربوونەوە بێ لە ناویانا.

(٥٥) کەواتە تۆیش، ئەی موحەممەد! خۆت ڕاگرە لە ئاست باری گرانی ئازارو ئەزیەتی ئەو کافرانەدا کە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن. بەڕاستی ئەو وەعدەی ئێمە داومانە بە تۆ دێتەدیو داوا لە خوا بکە لە گوناهت خۆش ببێو ئێواران و سبەینان زوو تەسبیحات و سوپاسی خوای خۆت بکە.

(٥٦) بەڕاستی ئەوانەی لەبارەی ئایەتەکانی خواوە دەمەدەم ئەکەن بێئەوەی هیچ دەلیل و بەڵگەیەکیان هاتبێتە لا، ئەوانە لە خۆبەزلزانین و سەرکێشی بەولاوە هیچیان لە دڵا نییە کە ئەوەتە ئەیانەوێ ئایینی ئیسلام لەناوبەرن، دەیسا تۆ پەنا بگرە بە خواو میهرەبانیی خوا: بەڕاستی خوا گوێی لە هەموو قسەیەکی ئەم خەڵکەیەو چاوی لە هەموو کردەوەیەکیانە.

(٥٧) بەڕاستی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترو بە ئەهمییەتترە لە دروستکردنی ئادەمزاد، بەڵام بەشی زۆری ئەم خەڵکە ئەم شتە ڕاستانە نازانن.

(٥٨) هەرگیز کوێرو چاوساغ وەك یەك نابن. ئەوانەیش کە ئیمانیان هێناوەو چاکەیان کردووە لەگەڵ خراپەکاران و بەدڕەفتاران وەك یەك نابن. ئێوە، ئەی خەڵکینە، کەمتر بیرئەکەنەوە.

إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٌ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤۡفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾ ۞ قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾



(٥٩) بەڕاستی قیامەت دێ‌و گومانی هیچ تیا نییە، بەڵام بەشی زۆری خەڵك باوەڕیان بە هاتنی نییە.

(٦٠) خودای ئێوە وتی: بانگ بکەنە من بەدەنگتانەوە دێم . بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەزل ئەزانن بەرانبەر بە پەرستنی من و بە تەنیا خۆم ناپەرستن، لەمەوپاش بە داماوی‌و پەرێشانی ئەڕۆنە ناو دۆزەخەوە.

(٦١) خوا ئەو خوایە کە شەوی دروست کردووە بۆتان تا تیا بحەسێنەوەو ئارامی تیابگرن و، ڕۆژیشی بیناکردووە واتە کردوویە بە کاتێ خەڵك شتی تیا ئەبینن. بەڕاستی خوا خاوەن فەزڵە بەسەر خەڵکا ، بەڵام بەشی زۆری خەڵك سوپاسی خوا ناکەن.

(٦٢) ئەوی ئەوەی کردووە خوای پەروەردگارتانە کە دروستکەری هەموو شتێکە هیچ خوایەك نییە بەڕاستی بپەرسترێ ئەو نەبێ، دەی چۆن ئێوە لە پەرستنی خوا وەرئەچەرخێنرێن؟

(٦٣) ئەوانەیش کە ئینکاری ئایەتەکانی خوایان ئەکرد هەر بەوجۆرە کە ئێوە لە پەرستنی خوا وەرچەرخێنراون، ئەوانیش هەروا لە پەرستنی وەرئەچەرخێنرێن.

(٦٤) خوا ئەو خوایە زەویی کردووە بە ئارامگا بۆ ئێوەو ئاسمانیشی کردووە بە بانی خانوو بەسەرتانەوەو، دیمەنی بۆ کردوون و جوانی بۆ دروست کردوون و شتی پاك و خاوێنی بۆ کردوون بە ڕۆزی. ئەوەی ئەمانەی کردووە خوایەکە پەروەردگاری ئێوەیە. زۆر گەورەو پڕبەرەکەتە خوای پەروەردگاری هەموو جیهانەکان.

(٦٥) ئەو خوایە زیندووەو هەرگیز نامرێ. هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە ئەو نەبێ. کەواتە هاوارو بانگی لێبکەن‌و، بە بێ‌ئەوەی هاوڕێ‌و هاوبەشی بۆ دابنێن، بیپەرستن. سوپاس و ستایش بۆ خوا کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

(٦٦) تۆ بڵێ ، ئەی موحەممەد : من لەوکاتەوە کە موعجیزەو بەڵگەی ئاشکرام لە خوای خۆمەوە بۆ هاتووەو فەرمانم دراوەتێ مل بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانەکان کەچ بکەم، هەر لەو کاتەوە مەنع کراوم لەوە کە عیبادەتی ئەو بتانە بکەم ئێوە بانگ و هاواریان لێ ئەکەن و بانگ و هاوار لە خوا ناکەن.

هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٍ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلًا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡ ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخًاۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبۡلُۖ وَلِتَبۡلُغُوٓاْ أَجَلًا مُّسَمًّى وَلَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصۡرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِٱلۡكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرۡسَلۡنَا بِهِۦ رُسُلَنَاۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسۡحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي ٱلۡحَمِيمِ ثُمَّ فِي ٱلنَّارِ يُسۡجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمۡ نَكُن نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَمۡرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ ﴿٧٧﴾



(٦٧) خـوا ئـەو خوایـە ئێـوەی دروسـت کردووە لە گڵ‌و پاشان لە تۆوی ئادەمزادو پاشـتر لـە پارچـەیێ خـوێن و ئـەوجا لـە شێوەی منالاّ لـە سـکی دایکتـان دەرتـان ئەکاتە دەرەوەو، جا ئەتانژیێنێ تا بگەنـە پایـەی بـەهێزتری خۆتـان و ئـەوجا پـیرو لێکـەوتوو بـبن و هیـی وایشـتان تیایـە بەرلەوەی بگاتە ئەم پایانە ئەمرێ‌و گیانی ئەکێشـرێ — تـا ئەگەنـە ئـەو وادەیـەی دیـاریکراوە بـۆ ژیانتـان، بـەڵکو ئەمـە خوایـە عـاقڵ بـن و فـام بکـەن و بیربکەنەوە.

(٦٨) خـوا ئـەو خوایـە مـردوو زینـدوو ئەکاتەوەو زیندوو ئەمرێنێ. کاتێ بڕیاری شتێکی دا هـەر ئەوەنـدەی پێ‌ئـەوێ بڵـێ ببەو ئیتر ئەویش ئەبێ.

(٦٩) ئایـا تـۆ سـەیری ئەوانـە ناکـەی ئەکەونـە چەنەچـەن لـەبارەی ئایەتـەکانی خـواوە؟ ئەوانـە چـۆن لـە بـاوەڕکردن بـەو ئایەتانەی خوا وەرئەچەرخێنرێن؟

(٧٠) ئەوانـەی کتێبـەکانی خـوا بـەدرۆ ئەخەنەوەو بەڕاستیان نازانن و بـاوەڕ بـەو پەیامە ناکەن کـە پێغەمبەرەکـەمان پـێ ناردوون بۆسەر خەڵك، لەمەولا حاڵی خۆیان ئەزانن.

(٧١) کاتێ کە کۆت و زنجیر لە ملیانایەو بەکێش ئەکرێن.

(٧٢) بەناو ئاوی کوڵ بەکوڵداو پاشان لە ئاگرا ئەسووتێنرێن.

(٧٣) پاشان پێیان ئەوترێ : ئەوانە لەکوێن کە کردبووتانن بە هاوبەشی خوایەتیی خواو،

(٧٤) خواتان نەئەپەرست ؟ ئەوانیش ئەڵێن : لێمان ون بوون ، بەڵکو نـە ، ئێمـە لەمـەوپێش هاوارمـان نەکردووەتـە هیچ شتێك. خوا کافران ئاوا گومڕا ئەکاو سەریان لێ ئەشێوێنێ.

(٧٥) ئەمەیش بە هۆی ئەوەوەیە ئێوە لە دنیادا بێ‌سـنوور بـە ناحـەق شـادمان ئـەبوون و لـە شـادمانیدا لـە سـنوور دەرئەچوون.

(٧٦) دەی سا بڕۆنە دەرگاکانی دۆزەخەوەو پیایانا بچنە ژوورەوەو هەمیشـە تیایـا بمێننـەوە. زۆر خـراپ و بـەدە ئـەو شوێنەی ئەوانەی خۆیان لە بەرانبەری خوادا بەزل زانیوەو بێ‌فەرمانیی ئەویان کردووە ، تێیدا قەرار ئەگرن.

(٧٧) کەواتە تۆ خۆت ڕابگرەو سەبر بکـە بەرانبـەر بـە قـەزای خـوا. بێ‌گومـان ئـەو گفتـەی خـوا پێـی‌داوی ڕاسـتەو دێتەدی، جا یا هەندێ لەو شتانەت نیشـان ئـەدەین کـە گفتمـان پێیـان داوە بـەوان یـا ئـەتمرێنین و بـە چـاوی خـۆت نایانبینی بێنەدی ، جا دوای ئەوە هەمووتان ئەگەڕێنەوە بۆ لای ئێمەو هەرکەس جەزای خۆی وەرئەگرێ.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ
وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ
بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ قُضِيَ بِٱلْحَقِّ وَخَسِرَ
هُنَالِكَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمَ
لِتَرْكَبُوا۟ مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا
مَنَٰفِعُ وَلِتَبْلُغُوا۟ عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى
ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَأَيَّ ءَايَٰتِ
ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ
قُوَّةً وَءَاثَارًا فِي ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ
﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرِحُوا۟ بِمَا عِندَهُم
مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا
رَأَوْا۟ بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ
مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ
ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾



(٧٨) بەڕاستی ئێمە بەر لە تۆ چەند پێغەمبەرێکمان ناردووە بۆسەر خەڵکی جیهان، هیی‌وایان تیایە باسیانمان گێڕاوەتەوە بۆت و هیی‌واشیان تیایە باسیانمان نەگێڕاوەتەوە بۆت. هیچ پێغەمبەرێکیش نەبووە حەقی ئەوەی هەبێ موعجیزەیەك پیشان بدا بەڕەزامەندیی خوا نەبێ. جا کاتێ فەرمانی خوا هات بڕیاری حەق و ڕاست ئەدرێو ئەو کاتە ئەوانەی بەتاڵکارو هیچ و پووچن ئەیدۆڕێنن و کاریان بە زیان ئەبڕێتەوە.

(٧٩) خوا ئەو خوایە چوارپێی بۆ ئێوە دروست کردووە ، سواری هەندێکیان ئەبن بۆ هاتوچۆ وەك ئەسپ و ماین و حوشترو، گۆشت و شیرو بەروبوومی شیری هەندێکیشیان ئەخۆن وەك حوشترو مانگاو بزن و مەڕ.

(٨٠) گەلێ سوودو قازانجیشتان بۆ هەیە لەو چوارپێیانەدا وەك پێست و خوریو مەرەزو موو، بۆ ئەوەی بە سواریی ئەوانەیان کە بنیادەم ئەتوانێ سواریان ببێ، نیازێ کە لە دڵتانایە بڕۆن بیگەیەنن و جێبەجێی بکەن و، ئێوە بە کۆڵی ئەم جۆرە چوار پێیانەو بەکۆڵی کەشتییش هەڵئەگیرێن.

(٨١) خوا بەڵگەو نیشانەکانی توانایی خۆیتان پیشان ئەدا، دەسا ئێوە ئینکاری کام لەم بەڵگەو نیشانانەی توانایی خوا ئەکەن؟

(٨٢) ئایا ئەمانە بە زەویدا نەڕۆیشتوون تا بڕوانن و ببینن ئەنجامی ئەوانە چۆن بوو کە لەپێش ئەمانەبوون؟ لەم کافرانە زۆرترو بەهێزتر بوونو نیشانەو پاشماوەیان لە زەویدا زیاتر بوو، کەچی هەرچییان پەیدا کردبوو دادی نەدان و بەفریایان نەگەیشت.

(٨٣) کەچی کاتێ کە پێغەمبەرانی ئێمە بە بەڵگەو دەلیلی ڕوونەوە هاتنە سەریان دڵیان بەو زانیارییە خۆش بوو لای خۆیان هەبوو، سزای ئەوەیش کە گاڵتەیان بە پێغەمبەرە هاتووەسەرەکانیان ئەکرد گەمارۆی دان و تەفرو توونای کردن.

(٨٤) جا کاتێ کە هێزو توندیی سزای ئێمەیان بە چاوی خۆیان دی وتیان : وا باوەڕمان بە خوای تاك و تەنیا هێناو ناقایلین بەوەی کە هاوبەشمان بۆ خوا دائەنا.

(٨٥) بەڵام باوەڕکردنەکەیان لەو کاتەدا کە هێزی ئێمەیان دی هیچ دادی نەئەدان. ئەمەیش ڕاهوڕەسمی خوایە لە هەموو ئەو بەندانەیدا بەسەرچوون و، لەو کاتەدا کە ئەو کافرانە هێزو توانایی خوا ئەبینن مایەبەخەسار ئەبن.

## سُورَةُ فُصِّلَتْ

ترتيبها ٤١ — آياتها ٥٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾ ۞ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾



## سوورەتی ( فُصِّلَتْ )

مەککەیی‌یەو (٥٤) ئایەتە

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چییە.

(٢) ئەم قورئانە نێرراوەخوارێکە لە خوای بەخشندەو میهرەبان.

(٣) کتێبێکە ئایەتەکانی تەفصیل دراون بە ئەمرو نەهی‌و ئامۆژگاری‌و ڕێ پیشاندان و یادی خواو حوکمی شەرعی بابەتی ترو حاڵی وایە بە زمانی عەرەبی ئەخوێنرێتەوەو بۆ کەسانێ‌کە خاوەن فام و هۆش بن.

(٤) حاڵی وایە مژدەدەرە بەوانەی گوێی بۆ شل ئەکەن و تۆقێنە بۆ ئەوانەی گوێی نادەنێ، بەڵام بەشی زۆری ئەو خەڵکەی بەسەریانا ئەخوێنرێتەوە لایان داوە لە گوێ بۆ شل کردن و وەرگرتنی‌و، ئەوانە نابیستن.

(٥) کافرەکان وتیان: دڵمان لەناو پەردەدایەو داپۆشراوەو پەردەکە ڕێی لە بیستنی ئەوە گرتووە کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ ئەکەی‌و، لە گوێچکەکانمانا گرانییەك هەیە ناهێڵێ هیچ ببیسین و، لەنێوان ئێمەو ئێوەدا پەردەیەك هەیە ڕێگا نادا بەیەك بگەین، کەواتە تۆ ڕەفتار بە ئایینی خۆت بکەو ئێمەیش ڕەفتار بە ئایینی خۆمان ئەکەین.

(٦) تۆیش پێیان بڵێ: من هەر ئادەمزادێکی وەك ئێوەم وەحیم بۆ ئەکرێ کەوا خوای بەڕاستی پەرستراوی ئێوە لە تاقە خوایەکی تاك و تەنیا بەولاوە نییە، کەواتە بەڕاستی ڕووی تێ‌بکەن و داوای لێبووردنی گوناهەکانتانی لێ‌بکەن و، هاواریش بۆ حاڵی ئەوکەسانەی هاوبەش بۆ خوا دائەنێن.

(٧) ئەوانەی زەکات نادەن و ئینکاری ڕۆژی دوایی ئەکەن کە ڕۆژی قیامەتە .

(٨) ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هێناوەو کرداری چاکەیان کردووە پاداشێکیان بۆ هەیە هەرگیز نابڕێتەوە.

(٩) تۆ، ئەی موحەممەد، بەو کافرانە بڵێ : ئایا ئێوە ئینکاری ئەو خوایە ئەکەن کە زەویی لە دوو ڕۆژا دروست کردووەو، هاوچەشنی بۆ دائەنێن کە ئەو زاتەیش پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە؟

(١٠) چەند چیایەکی بەرزیشی لە زەویدا بەسەریەوە دروست کردووە کە بە زەویدا چەقیون و خێروبێری تێخستووەو ڕزق و ڕۆزیی خەڵکەکەی تێدا ڕێکخستووە کە هەر کۆمەڵێ بە چی ئەژین و چۆن ئەژین و ئەمەی لە چوار ڕۆژا ڕێکخستووە بە چونیەکی بۆ هەموو ئەوانەی داوای ئەم ڕزق و ڕۆزییە ئەکەن.

(١١) پاشان خوا ڕووی کردە ئاسمان، کە ئاسمان لەو کاتەدا گازێ بوو وەك دووکەڵ و، بە ئاسمان و زەویی وت : بێن بۆ مەجالی بوون و ڕێکوپێکی بە جۆرێ کە سوودتان لێ وەربگیرێ، بە خۆشی‌و ڕەزامەندیی خۆتان یا نارەزاییتان و، ئەوانیش وتیان: وا بە ڕەزامەندیی خۆمان هاتین.

فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿١٢﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ قَالُوا۟ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَخْزَىٰ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾



(١٢) جا خوایش بڕیاری ئاسمانەکانی دا بە حەوت ئاسمان لە ماوەی دوو ڕۆژاو لە هەر ئاسمانێکا کاروباری دایە دەست فریشتەی کارپێسپێراوی خۆیو، ئاسمانی خوارووی لە ئەرزەوە نزیکمان ڕازاندەوە بە چرای ئەستێرەکان بۆ جوانیو بۆ پاراستنی لەو شەیتانانەی بۆ گوێ ڕاهێڵ کردن لە دەنگوباسی ئەو ئاسمانە نزیك ئەکەونەوە. ئەمەیە بڕیاری خوای خاوەن عیززەتی زانا بە هەمووشتێ.

(١٣) جا ئەگەر ئەو کافرانە سەرپێچییان کرد لە فەرمانبەرداریی خواو ئیمانیان نەهێنا، تۆ پێیان بڵێ : وا من ئەتانترسێنم بە دەنگێکی بە هەیبەتی ئاسمانیی وەك ئەو دەنگەی بەسەر خێڵی عادو سەموودیا نەڕاند.

(١٤) کاتێ کە پێغەمبەرەکانیان لە هەموو لایەکەوە هاتنە لایان و هەوڵیان لەگەڵ دان و پێیان وتن : لە خوا بەولاوە عیبادەت بۆ کەس مەکەن، ئەوانیش لە وەڵاما وتیان: ئەگەر خوا بیویستایە ئەو بپەرستین و عیبادەت بۆ کەسی تر نەکەین فریشتەی ئەنارد ئەو خواستەی خۆیمان پێ ڕابگەیەنێو، ئێمە ئینکاری ئەو پەیامە ئەکەین ئێوەیان پێوە نێرراونەتە سەرمان.

(١٥) هەرچی هۆزی عاد بوو خۆیان بە ناحەق بە زل دانا لە زەویداو وتیان: کێ لە ئێمە بەهێزترە؟! ئەوانە ئاخۆ نەیانئەزانی ئەو خوایەی دروستی کردوون لەوان بەهێزترەو ئینکاری ئایەتەکانی ئێمەیان ئەکرد کە ئەیشیانزانی ڕاستن!.

(١٦) ئەوە بوو ئێمەیش بایەکی ساردمان لە چەند ڕۆژێکی شووما نارده سەریان بۆ ئەوەی سزای ڕسوایی و بەدناوییان لەم دنیایەدا پێبچێژین و سزای ئەو دنیایش بەڕاستی پڕڕسواییو سووکیترەو ئەوان هەرگیز یارمەتی نادرێن تا سزای ڕۆژی قیامەتیان لێ لابدرێ.

(١٧) هەرچی هۆزی سەموودیشە ڕێگای باوەڕهێنانمان بە خواو بە پێغەمبەرانی خوا پیشان دان، بەڵام ئەوان سەرکوێریو ڕێدەرنەکردنیان لا خۆشتر بوو لە ڕێگا دەرکردن و هاتنە سەر ڕێی موسوڵمانەتی، جا نرکەو ناڵەی سزای سەخت و ناهەموار گرتنی کە بوو بەهۆی ڕسواییو سووکییان لە سزای ئەو کردارە بەدانەدا کە ئەیانکردن.

(١٨) ئەوانەیش کە باوەڕیان بە خوا کردبوو و خۆیان لە گوناهو بێباوەڕیو کردەوەی خراپ ئەپاراست، ڕزگارمان کردن.

(١٩) ڕۆژێکیش کە دوژمنانی خوا کۆئەکرێنەوە بۆئەوەی بخرێنە ناو ئاگری دۆزەخ، بەرودوایان ئەخرێنە پاڵ یەك تا بڵاوەی لێ نەکەن.

(٢٠) تا کاتێ کە هاتن بۆسەر ئاگری دۆزەخ گوێچکەیان و چاویان و پێستی لەشیان شایەتییان لێ ئەدەن کە گوێیان بۆ چ قسەیەکی خراپ ڕاگرتووەو چ کارگەلێکی خراپیان بە چاوی خۆیان دیوەو بە پێستی لەشیان کردووە.

وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٖ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُواْ فَٱلنَّارُ مَثْوٗى لَّهُمْۖ وَإِن يَسْتَعْتِبُواْ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ ۞ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِيٓ أُمَمٖ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِۖ إِنَّهُمْ كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَذَابٗا شَدِيدٗا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُۖ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾



(٢١) کافرەکان بە پێستی لەشی خۆیان ئەڵێن : بۆ شایەتیتان لیّداین لەسەر ئەو کردەوە خراپانەی کردوومانن؟ ئەوانیش ئەڵێن : ئەو خوایەی هەموو شتێکی هێناوەتە گۆو ئێوەی یەکەمجار لە دنیادا دروست کردووەو سەرەنجامیش بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە، ئەو خوایە هێنایینیە گۆ.

(٢٢) ئێوە کاتی خۆی کە تاوانتان ئەکرد خۆتان لە ترسی ئەوە دانەئەپۆشی کە گوێچکەو چاوو پێستتان شایەتیتان لیّبدەن، بەڵکو لە ترسی ئابڕوو چوونتان لە ناو خەڵکا خۆتان دائەپۆشیو بەدزییەوە تاوانتان ئەکردو، گومانتان وابوو خوا بە زۆر لەو کردەوانەتان نازانێ کە ئەیانکەن. واتە کاتێ کە تاوانتان ئەکرد خۆتان لە بەرچاوی خەڵك دوورئەخستەوە بۆ ئەوەی پێتان نەزانن و ئابڕووتان نەچێو لەوە نەئەترسان ڕۆژی قیامەت ئەندامەکانی لەشتان لێتان دێنەگۆو شایەتیتان لای خوا لیّ ئەدەن و لە خوا خۆیشی نەئەترسان کە بەکارو کردەوەکانتان ئەزانێ، بەڵام وا ئێستا بۆتان دەرکەوت کە نەك هەر خوا ئاگای لە هەموو تاوانەکانتان هەیە، تەنانەت ئەندامەکانی لەشیشتان بە فەرمانی خوا لێتان دێنەگۆو شایەتیتان لیّئەدەن.

(٢٣) ئەو گومانی بیّئاگایی لە تاوانە کە بە خوای خۆتانتان ئەبرد، ئەوە بوو بەربادی کردن و کوتانی بەزەویداو ڕەنج بەخەسارو دۆڕاوی کردن.

(٢٤) بۆیە ئێستا ئەگەر خۆیان لەبەر ئەو سزایەدا ڕائەگرن کە ئەیاندرێ، با خۆیان ڕابگرن و ئاگری دۆزەخ ماواو مەنزڵیانەو، ئەگەر داوای گەڕانەوە بۆ ژیانی جارانیشیان ئەکەن تا ئەگەر گەڕانەوە تۆبە بکەنو بێنە سەر ڕێی ڕاست، ئەوە دوای خەیاڵ کەوتوون و ناگەڕێنرێنەوە بۆ ئەو ژیانە.

(٢٥) لەبەر بەدڕەفتارییان چەند هاوچەشنێکمان لە شەیتانەکان بۆ ڕەخساندن ژیانی دنیاو ئارەزووبازیی دنیاو پشتگوێخستنی دواڕۆژو ئینکارکردنی قیامەتیان لەپێش چاوا جوان کردن و ئیتر بڕیاری سزادانیان لە ڕۆژی قیامەتا لەسەر چەسپی کە لەسەر میللەتە لە خواعاسییەکانی پێش خۆیشیان لە ئادەمزادو جنۆکە چەسپیبوو. بەڕاستی ئەمانە گشتیان کۆمەڵێکی ڕەنج بەخەسارو دۆڕاو بوون.

(٢٦) کافرەکان وتیان : گوێ ڕامەگرن بۆ ئەم قورئانەو کاتێ کە موسوڵمانەکان ئەیخوێننەوە ئێوە دەس بکەن بە قسەی پڕوپووچ و هەراوزەنا بۆ ئەوەی سەریان لیّ تێك بچێ، بەڵکو بەم چەشنە زاڵ بن بەسەر کۆمەڵی موسوڵمانانا.

(٢٧) سا بەڕاستی سزایەکی سەخت بەو کافرانە ئەچێژینو تۆڵەی خراپترینی ئەو کارانەیان لیّ ئەکەینەوە کە لە دنیادا ئەیانکردن.

(٢٨) ئەو سزایەیش کە ئێمە سزای ئەو کافرانەی پیّ ئەدەین سزای دوژمنانی خوایە کە ئاگری دۆزەخەو، لەو ئاگری دۆزەخەدا ئەو خانووەیان هەیە کە تا هەتایە تیا ئەبن، لە سزای ئەوەدا کە ئینکاری ئایەتەکانی ئێمەیان ئەکرد.

(٢٩) کافرەکان لە ڕۆژی قیامەتا ئەڵێن : خوایە ! ئەو دوو بنیادەم و جنۆکەیەمان پیشان بدە کە گومڕایان کردین بۆ ئەوەی لەژێر پێمانا بییانفلیقێنینەوە تا لەوانە بن کە لە بنیبنەوەو لەژێرپێدان.

إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ۚ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ ۖ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ اسْتَكْبَرُوا فَالَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْأَمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾



(٣٠) بەڕاستی ئەو کەسانەی وتوویانە: پەروەردگاری ئێمە زاتی خوایەو، پاش ئەو دان پیانانەیان لەسەر باوەڕ بەو قسەیان و فەرمانبەرداری کردنی خوا بەردەوام بوون، ئەوانە فریشتە دێنە خوارەوە بۆ سەریان و پێیان ئەڵێن : لە هیچ مەترسن و خەفەتی هیچ مەخۆن و خۆش مژدە بن بەو بەهەشتەی لەسەر زمانی پێغەمبەران گفتتان پێ‌ئەدرا کە بۆتان ئەبێ.

(٣١) هەروا پێیان ئەڵێن : ئێمە لە ژیانی دنیاو لە قیامەتا دۆستی ئێوەین و، بۆتان هەیە لە قیامەتا ئەوەی نەفستان حەزی لێ بکاو هەرچییش داوای بکەن.

(٣٢) ئەمەیشتان لەلایەن خوایەکی پەروەردگاری بەخشندەی میهرەبانەوە بۆ ئامادە ئەکرێ.

(٣٣) قسەی کێ جوانترە لە قسەی کەسێ کە خەڵك بانگ بکا بۆ لای خواو کردەوەی باش بکاو بڵێ : من بەڕاستی لە موسوڵمانانم.

(٣٤) کردەوەی چاك و کردەوەی خراپ یەکسان نین. تۆیش چاری کردەوەی خراپ بە کردەوەی چاك بکە لە بەرانبەری کردەوە خراپەکەی خراپەکەردا. کە وات کرد ئەبینی ئەو کەسەی دوژمنایەتی لە نێوان تۆو ئەوا هەیە وەك دۆستێکی گەرم وایە بۆت لە خۆشەویستیدا.

(٣٥) کەسیش ناگەیەنرێتە ئەم پلەیە کە بتوانێ لە بەرانبەری خراپەی خراپەکەردا چاکە بکاو خۆی بەرانبەر خراپەکەی ئەو ڕابگرێ ئەوکەسە نەبێ کە بەشێکی گەورەی لە سەبرو لێبووردن و چاوپۆشی لەلایەن خواوە پێ بەخشرابێ.

(٣٦) ئەگەر وەسوەسەو خولیای خراپەکردنێکیش لەلایەن شەیتانەوە دای لە دڵت ویستت لە بەرانبەری خراپەی خراپەکارێکا تۆیش خراپە بکەی ، پەنا بگرە بە خوا لە شەیتان ، خوا گوێی لە ڕازی دڵتەو بە هەموو شتێ ئەزانێ.

(٣٧) شەوو ڕۆژو خۆرو مانگ بەشێکن لەبەڵگەکانی بوون و خوایەتیی خوا. سوجدە نە بۆ خۆرو نە بۆ مانگ مەبەن، سوجدە بۆ ئەو خوایە بەرن ئەوانی دروست کردووە ئەگەر ئێوە خوا ئەپەرستن.

(٣٨) ئەگەر ئەو کافرانە خۆیان بە گەورە داناو سوجدەیان بۆ خوا نەبرد، ئەوە لای خوا هیچ قیمەتی نییە چونکە ئەو فریشتانەی لای خوان بە شەوو بە ڕۆژ تەسبیحاتی بۆ ئەکەن و هیچیش لەو تەسبیحاتکردنە بێزار نابن.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ
ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ
قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ۗ أَفَمَن
يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ
إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ
وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ
خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ
لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾
وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ
وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ
يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ
فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ
بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا
فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾



(٣٩) یەکێ لە بەڵگەکانی توانایی خوا ئەوەیە سەیری زەوی ئەکەی کپ و ماتە، جووڵەو ژیانی پێوە دیار نییە، کەچی کە بارانی بەسەرا ئەبارێنین و ئاوی بەسەرا ڕەوان ئەکەین ئەکەوێتە جووڵەو لە شوێنی خۆیا هەڵئەتۆقێ‌و گیای لێ ئەڕوێ‌و سەر دێنێتە دەرەوە. بەڕاستی ئەو خوایەی کەوا زەوی ئەژیێنێتەوە هەر ئەوە مردوویش لە قیامەتا زیندوو ئەکاتەوە. ئەو توانی بە هەموو شتێ ئەشکێ‌و هەموو شتێکی پێ ئەکرێ.

(٤٠) بێ‌گومان ئەوانەی لە ڕێگەی ڕاست لائەدەن لە بارەی نیشانەکانی خوایەتیی ئێمەوە لە ئێمە ون نابن و ئەیانناسین و پێیان ئەزانین و سزای شایانی خۆیانیان ئەدەین و ئەیانخەینە دۆزەخەوە. جا کەسێ باشە بخرێتە ئاگری دۆزەخەوە، یا کەسێ بەئەمینی‌و بێ‌ترس و لەرز لە سزای دۆزەخ ڕۆژی قیامەت دێتە حوزووری ئامادەی لێپرسینەوە ئەبێ؟ کەواتە ئێوە کە جیاوازی لە نێوان چاك و خراپا ناکەن، چی ئەکەن بیکەن، هەرچی ئەکەن خوا چاوی لێتانە چی‌ئەکەن. (٤١) بێ‌گومان ئەو کەسانەی ئینکاری قورئان ئەکەن لە کاتێکا کە دێتە لایان، ئەوانە کەسانێکی عەنادکارو لەخوایاخین و بەڕاستی قورئان کتێبێکی پڕقەدرو حورمەت و خاوەن عیززەتە.

(٤٢) کتێبێکە شتی هیچوپووچی نە لەپێشیەوەو نە لەدوایەوە تیا نییە، واتە نە لە باسی ڕابووردووی‌و نە لە باسی داهاتوویا شتی ناڕاست و نادروست نییەو، لە لایەن خوایەکەوە هاتووەتە خوارەوە کە خاوەن حیکمەت و ستایش کراوە. (٤٣) ئەی موحەممەد! دڵ گران مەبە لەو قسانەی کافرەکان دەرحەقت ئەیانکەن. هیچ بە تۆ ناوترێ لەو قسانە بەولاوە بە پێغەمبەرانی پێش خۆیشت وتراون. کەواتە چۆن ئەوان تەحەمولی ئەو قسانەی کافرانی سەردەمی خۆیانیان کرد، تۆیش تەحەمولی قسەی کافرانی سەردەمی خۆت بکە.بێ‌گومان خوای تۆ بۆ پێغەمبەرانی خۆی لێبووردووەو، بۆ دوژمنەکانیشیان سزا سەخت و بە ئازارە. (٤٤) ئەگەر ئەم قورئانەمان بە زمانێکی غەیری عەرەبی بناردایەتە خوار بۆسەر ئەم کافرانە ڕازی نەئەبوون و ئەیانوت: ئەوە بۆ ئایەتەکانی ڕوون نەکراونەتەوەو بە زمانێکی‌وا نەهاتوونەتە خوار تێی‌بگەین؟ چۆن ئەبێ کتێبی پێغەمبەرێ بە زمانێکی عەجەمی بێ‌و پێغەمبەرەکە خۆی عەرەب بێ! دەی ئێستا کە بە زمانی خۆیان هاتووەتە خوار بۆ سەریان، بۆ ئیمانی پێ‌ناهێنن و شوێنی ناکەون؟ تۆ، ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئەم قورئانە بۆ ئەوکەسانەی ئیمانیان پێ هێناوە ڕێگاپیشاندەرو دەرمانی دەردی دین و دنیایە. ئەوانەیش کە ئیمانی پێ ناهێنن گوێیان گرانی‌و کەڕیی تیایەو مایەی دڵ کوێرییە بۆیان. ئەوانە کە قورئانیان بۆ ئەخوێنرێتەوەو ناچێ بە گوێیانا وەك ئەوە وان لە شوێنێکی دوورەوە هاواریان لێ بکرێ‌و بانگ بکرێن. لە بیابانی سەرگەردانیدان هیچ قسەیەك ناگاتە گوێیان.(٤٥) بەڕاستی ئێمە کتێبمان دا بە مووسا کە تەوراتە، جا لەناو قەومەکەیا خیلاف پەیدابوو لە بارەی ئەو کتێبەوە، هەندێکیان باوەڕیان پێ‌کردو هەندێکیان نە. ئەگەر خودا هەر لە پێشەوە قسەی خۆی نەکردبوایەو بڕیاری خۆی نەدابوایە کە قیامەت شوێنی لێپرسینەوەو سزادان و پاداش‌دانەوەیە، ئەو کافرانە هەر کاتی خۆی لەسەر ئەو ئینکارکردنی تەوراتەیان بەرباد ئەکران. بەڕاستی ئەو کافرانە لە گومانێکی سەرلێشێوێندان لەبارەی قورئانەوە. (٤٦) هەرکەسێ چاکە بکا بۆ خۆیی ئەکاو، هەرکەسیش خراپە بکا هەر بۆ خۆیی ئەکاو، خوایش ستەمکار نییە بۆ بەندەکانی‌و ناحەقی لەگەڵ کەسیان ناکا.

۞ إِلَيۡهِ يُرَدُّ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِۚ وَمَا تَخۡرُجُ مِن ثَمَرَٰتٖ مِّنۡ أَكۡمَامِهَا وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ أَيۡنَ شُرَكَآءِي قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٖ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَدۡعُونَ مِن قَبۡلُۖ وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ ﴿٤٨﴾ لَّا يَسۡـَٔمُ ٱلۡإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلۡخَيۡرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٞ قَنُوطٞ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنَّا مِنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّجِعۡتُ إِلَىٰ رَبِّيٓ إِنَّ لِي عِندَهُۥ لَلۡحُسۡنَىٰۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٖ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٖ ﴿٥١﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرۡتُم بِهِۦ مَنۡ أَضَلُّ مِمَّنۡ هُوَ فِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمۡ فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمۡۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطُۢ ﴿٥٤﴾



(٤٧) هەر بۆ خوا ئەگەڕێتەوە زانستی کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت و، هیچ بەری میوەیەك لە قۆزاخەکەی خۆی نایەتە دەرەوەو هیچ مێیینەیەك ئاوس نابێو نازێو بەچکەی نابێ بەگوێرەی پێزانینی خوا نەبێو، کە لە قیامەتیشا خوا بانگ ئەکاتە کافرەکان و پێیان ئەڵێ: هاوڕێکانم کوان کە ئێوە بە خەیاڵی خۆتان کردبووتانن بە هاوبەشی من و هاوارتان لێ ئەکردن؟ ئەوانیش لە وەڵامی خوادا ئەڵێن: ئێمە خەبەرمان دایتێ کەوا کەسمان تیا نییە شایەتی بدا ئەوانە هاوبەشی تۆن لە خوایەتییا.

(٤٨) ئەوانەیان لێ ون ئەبن کە لە دنیادا بانگیان ئەکردن و هاواریان بۆ ئەبردن و ئەیانپەرستن و دڵنیا ئەبن لەوە کە شوێنێ نییە بۆی هەڵبێن و پەنای پێ بەرن.

(٤٩) ئادەمزاد هەرگیز لە داوای چاکە بۆ خۆیو گەڕان بەدوایا ماندوو نابێو، ئەگەر ناخۆشیو تەنگانەیەکی هاتەڕێ نائومێدو بێهیوا ئەبێ لە ڕەحمەتی خوا (مەبەستی لە ئادەمزاد لەم ئایەتەدا ئادەمزادی کافرە چونکە ئادەمزادی موسوڵمان هەرگیز لە ڕەحمەتی خوا نائومێد نابێ). (٥٠) ئەگەر لە بەری میهرەبانیی خۆمان خێروبێرێکی پێ بچێژین پاش ئەوەی زیانێکی پێ گەیشتبێو ناڕەحەتییەکی تووش بووبێ، ئەڵێ: ئەم خێروبێرە هەر هیی خۆمەو لە خۆمەوە دەسگیرم بووەو باوەڕم وا نییە قیامەت بەرپا ببێو سزا بدرێم و، ئەگەر بیشبێو بگەڕێمەوە بۆ لای خوای خۆم بەڕاستی پایەو پلەی باشم ئەبێ لای. جا مادەم وایە ئێمە لەمەولا خەبەر بە کافرەکان ئەدەین و بۆیان ئەگێڕینەوە چییان کردووە لە دنیاداو لە سزایەکی قورس و سەختیان پێ ئەچێژین.

(٥١) کاتێ نان و نیعمەت و خێروبێر بەسەر ئادەمزادا بڕێژین، لە سوپاسی ئەو نیعمەتە لائەداو شوکری خوا ناکا لەسەریو تەنشتی تێ ئەکا. کاتێکیش شەڕو مەینەتی پێ بگا ئەو کاتە خاوەنی پاڕانەوەیەکی بەرپانە واتە ئەکەوێتە پاڕانەوەو لالانەوەیەکی زۆری بێسەروبن لە خوا کە ئەو مەینەتەی لێ لابدا.

(٥٢) تۆ، ئەی موحەممەد! بەو کافرانە بڵێ: ئەگەر ئەم قورئانە لای خواوە هاتبێتە خوارو ئێوە ئینکاری ئەوە بکەن کە لەخواوەیە، ئەو کاتە کێ گومڕاترە لەوکەسەی لەناو دوژمنایەتییەکی زۆر تۆخی دوور ڕۆیشتوودایە؟

(٥٣) ئێمە لەمەوپاش بەڵگەو نیشانەکانی خۆمانیان لە جیهان و لە نەفسی خۆیانا پیشان ئەدەین تا بۆیان دەرکەوێ قورئان ڕاستەو کەلامی خوایەو لە خواوە هاتووەتە خوار بۆ سەر پێغەمبەر. ئاخۆ بەس نییە بۆ ئادەمزاد بۆ گێڕانەوەی لە گوناه و لە بێفەرمانیی خوا ئەمە کە خوای تۆ ئاگای لە هەموو شتێ هەیە؟

(٥٤) بێدارەوە بن و بزانن! ئەم کافرانە دوودڵو بەگومانن لەوە کە ئەگەنەوە بە خوای خۆیان و سزای کردەوەی خۆیانی لێ وەرئەگرن. بێدارەوە بن و بزانن! خوا دەوری بە هەموو شتێکا داوەو ئاگای لە هەرچییە کە لەم جیهانەدا هەیە.

## سُورَةُ الشُّورَىٰ

مرتبتها ٤٢ — آياتها ٥٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣﴾ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ ۚ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۚ فَرِيقٌ فِي ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِيُّ وَهُوَ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٩﴾ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾



## سوورەتی ( الشُّورَىٰ )

**مەککەیی‌یە ئایەتەکانی ٢٣و٢٤و٢٧ی نەبێ‌و، (٥٣) ئایەتە**

(١) و (٢) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم دوو وشەیە چییە.

(٣) هەروەك ئەم ئایەتانەی کە بە وەحی لە خواوە هاتوون بۆ تۆ، خوا وەحی ئەنێرێ بۆ لای تۆو بۆ لای ئەو پێغەمبەرانەیش کە بەر لە تۆ بوون، ئەو خوایە کە خاوەن عیززەت و خاوەن حیکمەتە.

(٤) هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هیی ئەو خوایەیەو، ئەو خوایە خوایەکی بەرزو باڵایە بەسەر هەرچی لەم دنیایەدا هەیەو خوایەکی مەزنە.

(٥) نزیکە ئاسمانەکان لەبەر گەورەیی ئەو خوایە، لەلای سەرروویانەوە تا خوار درز بەرنو لەت بن و، فریشتە بۆ سوپاسی خوا سوبحانەللا ئەکەن و داوای لێبووردنی گوناەو بێ‌فەرمانیی لێ‌ئەکەن بۆ هەموو خەڵکی دانیشتووی سەرزەوی . بێدارەوە بن ، خەڵکینە ! خوا خوایەکی بەخشندەو بەرەحمە.

(٦) ئەوکەسانەیش چەند پشت و پەنایەکیان لەخوار خواوە بۆ خۆیان ڕاگرتووەو کردوویانن بە هاوبەشی خواو ئەیانپەرستن، خوا نیگابانە بەسەریانەوەو ئاگای لێیانەو تۆ چاودێری ئەوان نیت. خوا خۆی تۆڵەی ئەو هاوبەش‌بۆخوادانانەیان لێ ئەکاتەوە.

(٧) هەروەها قورئانێکی عەرەبی‌زوبانمان وەحی‌کردووە بۆ تۆ بۆ ئەوەی خەڵکی مەککەو ئەوانەی لەدەوروبەری مەککە ئەژین، بترسێنێ لە سزای ڕۆژی قیامەت و، بۆ ئەوەی خەڵك لە ڕۆژی کۆکردنەوەیان بۆ لێپرسینەوە بترسێنی کە ڕۆژی قیامەتەو هیچ گومانی تیا نییە ، جا لە پاش کۆکردنەوەو لێپرسینەوەیان ئەکرێن بە دوو بەشەوە، بەشێکیان لە بەهەشتدا ئەبن و بەشێکیان لە دۆزەخدا.

(٨) ئەگەر خوا بیویستایە هەموو ئەم خەڵکەی ئەکرد بە یەك ئوممەت یا هەموو موسوڵمان یا هەموو کافر، بەڵام وای نەویستووە. کێی مەیل لێ بێ بەر ڕەحمەتی خۆیی ئەخاو هیدایەتی ئەداو، ستەمکارانیش بێ‌دۆست و یارمەتیدەر لێیان ئەگەڕێ با سزای خوانەپەرستیی خۆیان بچێژن.

(٩) بەڵکو ئەم کافرانە دۆستیان لە غەیری خوا بۆخۆیان ڕاگرتووە کە ئەو بتانەن ئەیانپەرستن، کەچی هەر خوا خۆی دۆستی ڕاستەقینەیە کە ئادەمزاد بیکا بە دۆستی خۆی‌و پشتی پێ ببەستێ‌و، هەر ئەوە مردوو زیندوو ئەکاتەوەو هەر ئەوە توانی بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ.

(١٠) هەر کاروبارێکی دین و دنیا کە ئێوەو کافرەکان تیایا ناکۆك بوون، بڕیارتیادانی ئەگەڕێتەوە بۆ خوا، ئەو ڕاستو چەوتی تیا لێك ئەکاتەوە. ئەو خوایە خوای پەروەردگاری منە، من لە هەموو شتێکا پشت بەو ئەبەستم و لە هەموو گیروگرفتێکا بۆ لای ئەو ئەگەڕێمەوە.

فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ۖ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٢﴾ ۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ۚ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ۚ ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا تَفَرَّقُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١٤﴾ فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ ۖ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ۖ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ۖ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ۖ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ۖ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ۖ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾



(١١) ئـەو خوایەیـە کـە ئاسمانـەکان و زەویی دروست کـردووە. هـاوجووتی نێـرو مێی لە خۆتان بۆ دروست کـردوون و، لـە ئاژەڵو ڕەشەوڵاخ و وڵاخی بەرزەو هـەموو چوارپێیەکیش هـاوجووتی نێـرو مێـی بـۆ دروسـت کـردوون. لـەم هـاوجووت و نێـرو مـێ دروسـتکردنەوە لـە خۆتـان، زۆرتـان ئەکات و بڵاوتان ئەکاتەوە بەسەر زەویدا. هیچ شتێ وێنەی خوا نییەو خوا خوایەکی شـنەواو بینایـە گـوێی لـە هەرچـییەکە بووترێو چاوی لە هەر شتێکە بکرێ.

(١٢) کلیلی گەنجینەکانی ئاسمـان و زەوی هیی خوان. ڕزق و ڕۆزی بەربڵاو ئـەکا بـۆ هـەر کەسـێ مـەیلی لێ بـێو، لـە هەرکەسێکیشی ئەگرێتەوە مەیلی لێ بێ. بێگومان ئەو بە هەموو شتێ زانایە.

(١٣) ئەوەی بۆ داناون لە دین و ئایین کـە کـاتی‌خۆی نـووح پێغەمبەریشـی ڕاسـپاردبوو لەسـەری بـڕواو، ئـەوەی کـە وەحیمـان کـردووە بـۆ خـۆت و ئـەوەی بـە ئیبراهیم و مووسـاو عیسـامان سپاردبوو لەسەری بڕۆن کە ئەوەتە دینی خوا ڕابگرن و پشـتگوێی مەخـەن و بـەش بـەش و کۆمەڵ کۆمەڵ مەبن تیایاو گشت لەسـەر یەك ڕێ بڕۆن. زۆر گەورەو گرانە لای ئەوانەی هاوبەش بۆخوا دائەنێن مل بۆ ئەوە کەچ بکەن کە تـۆ بانگیـان ئەکـەی بۆی کە خوا بەیەك دانانە. خوا هەرکەسی مەیل لەسەر بێ هەڵیئەبژێرێ بۆ لای خۆیو هیدایەتی هەرکەسـێ ئـەدا بـۆ لای خۆی کە بگەڕێتەوە بۆ لای.

(١٤) ئوممەتانی پێغەمبەرانی پێشوو پارچە پارچەو بەش بەش نەبوون پاش ئەوە نەبێ کە زانیارییان لە خواوە بۆ هات کەوا پارچە پارچە بوون و بەش بەش بوون گومڕاهییە. لەبەر گومڕاهیو لە ڕێلادانیش لـەناو خۆیانـا پارچـە پارچـەو بەش بەش بوون. ئەگەر خوای پەروەردگاری تۆیش پێشـتر قسـەی خـۆی نەکردبوایـەو بڕیـاری نەدابوایـە کـە سـزادانی تاوانباران دوانەخا بۆ ڕۆژی قیامەت حوکمی سزادانیان لەنێوانا ئەدراو هەر لە دنیادا بـەرباد ئـەکران. ئەوانـەیش کـە پاش ئەو ئوممەتانە کیتابی خوایان هاتووەتەسەرو بە میرات گەیشتووە پێیان، لە دوودڵیو گومانێکی دڵ داخورپێندان دەرحەق بەم قورئانە.

(١٥) جا لەبەر ئەوە کە خەڵك بڵاوەیان لێ کردووەو لە ڕێگا لایان داوە، تـۆ بانگیـان بکـەرەوە بـۆ دەسـت گـرتن بـە پەیمانی خواوەو بەردەوام بە لەسەر کاری خۆت وەك فەرمانت پێ دراوەو مەکەوەرە شوێن ئـارەزووی نەفسـی خـەڵکیو بڵێ: ئیمانم هێناوە بەوەی کە خوا ناردوویەتییە خوارەوە لە کتێبی ئاسمانیو فەرمانم پێدراوە کە دادپەروەری بکەم لە نێوانتانا. خوای گەورە پـەروەردگاری ئێمـەیش و ئێوەیشـەو ئێمـەیش کـردەوەی خۆمانمـان هەیـەو ئێـوەیش کـردەوەی خۆتانو هیچ دوژمنایەتیو ناکۆکییەك لەنێوان ئێمەو ئێوەدا نییە. خـوا لـە ڕۆژی قیامـەتا پێکـەوەمان کۆئەکاتـەوەو سەرەنجامی هەموومان هەر بۆ لای ئەوە.

وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ
دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾
ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ
لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ ﴿١٧﴾ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ
بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ
أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾
ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ
﴿١٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن
كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن
نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ
مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ
وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢١﴾ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ
مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ
لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٢﴾



(١٦) ئەوكەسانەی دەمەدەم ئەكەن لە بارەی خواو پێغەمبەری خواو كتێبی خواوە پاش ئەوە كە كاتی خۆی فەرمانەكانی پەسەندكران و وەرگیران و بەگوێكردنی تەوراتیان گرتەگەردن، ئەوانە بەلگەو دەلیلیان لای خوا بێ قیمەت و هیچوپووچەو قارو تووڕەیی خوایان لەسەرەو سزایەكی گرانیان بۆ هەیە.

(١٧) خوا ئەو خوایە كتێبی ناردووەتە خوارو تەرازووی دادی بڕیار داوە بۆ جیهانو، تۆ چوزانی؟ لەوانەیە ڕۆژی قیامەت نزیك بێ.

(١٨) ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نییە پەلەپەلیانە بۆیو، ئەوانەیش باوەڕیان پێی هەیە لە هاتنی ئەترسن و ئەزانن حەقەو ڕاستەو دێ. بێدار بن! ئەوانەی دەمەدەم ئەكەن لەبارەی هاتنی قیامەتەوە لە گومڕاهییەكی زۆر دوور ڕۆیشتوودان.

(١٩) خوا خاوەن لوتفە لەگەڵ بەندەكانی خۆی، ڕزق و ڕۆزی ئەدا بە هەركەس مەیلی لێ بێو، هەر ئەو بەهێزو خاوەن عیززەتە.

(٢٠) هەركەس بەروبوومی كشتوكاڵی قیامەتی ئەوێ لەو بەروبوومەی بۆ زیاد ئەكەین و هەركەسیش بەروبوومی دنیای ئەوێ بەشی ئەدەین لێیو لە ڕۆژی قیامەتا هیچ بەشی نییە.

(٢١) یاخێر ئەم كافرانە چەند هاوبەشێكیان هەیە ئایینێكی وایان بۆ داناون خوا ڕێی پێ نەداوە. ئەگەر وتەی هەموو وتە بڕەوەیەكیش نەبوایە كە ئەوەتە خوا سزای تاوانی دنیا ئەخاتە ڕۆژی قیامەت، هەر لە دنیادا سزا ئەدران و تۆڵەیان لێ ئەسەنرایەوەو، بەڕاستی ستەمكاران سزایەكی سەختیان بۆ هەیە.

(٢٢) ئەبینی ستەمكاران، بە هۆی ئەو كارو كردەوە خراپانەوە كە لە دنیادا كردوویانن، لە قیامەتا لەو وەزعە ئەترسن كە تیایان و لە ڕاستییشا سزای ئەو كردەوانەیان دێ بەسەرا. ئەوانەیش كە ئیمانیان بووەو كردەوەی چاكیان كردووە لەناو باخ و باخاتی بەهەشتان، چی داوا بكەن لەلایەن خوای خۆیانەوە بۆیان هەیەو، لوتف و گەورەیی مەزنیش هەر ئەمەیە.

ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰۗ وَمَن يَقۡتَرِفۡ حَسَنَةً نَّزِدۡ لَهُۥ فِيهَا حُسۡنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗاۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخۡتِمۡ عَلَىٰ قَلۡبِكَۗ وَيَمۡحُ ٱللَّهُ ٱلۡبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَعۡفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۚ وَٱلۡكَٰفِرُونَ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ ﴿٢٦﴾ ۞ وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ وَهُوَ ٱلۡوَلِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٨﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٖۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ ﴿٢٩﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٣١﴾



(٢٣) ئەم پاداشەیە كە خوا مژدەی بەخشینی ئەدا بەو بەندانەی كە ئیمانیان هێناوەو كردەوەی چاكیان كردووە لە دنیادا. جا تۆ ئەی موحەممەد ! بە موسوڵمانان بڵێ: من بەرانبەر بە گەیاندنی ئەم ئاینەو دانی ئەم مژدە خۆشانە داوای هیچ مزو كرێیەكتان لێ ناكەم لەوە بەولاوە كە ئەم نزیكیەم لێتانەوەتان لا خۆشەویست بێو قەدری ڕابگرن بە فەرمانبەرداریی خواو ئەو پەیامەی بۆم هێناون و، هەركەسیش چاكەیەك بكا پاداشتی چاكەكەی بۆ زیاد ئەكەین. خوا گوناە بەخش و پاداش دەرەوەیە.

(٢٤) یاخێر ئەڵێن : ئەم پێغەمبەرە درۆی بە زوبانی خواوە هەڵبەستووە. خوا ئەگەر مەیلی لێ بێ دڵت مۆر ئەكا. خوا شتی بەتاڵو هیچوپووچ مەحو ئەكاتەوەو ڕاست كە قورئانە ئەچەسپێنێو جێگیری ئەكا بە بڕیاری خۆیو، خوا ئاگای لە هەرچییەكە لەناو سینەو دڵی ئەم خەڵكەدایە.

(٢٥) خوا ئەو خوایە كە تۆبەو پاشگەزبوونەوە لە بەندەگانی خۆی قوبوول ئەكاو چاوپۆشی لە خراپە ئەكاو ئەزانێ ئێوە چی ئەكەن.

(٢٦) خوا بەدەنگ تكاو پاڕانەوەی ئەوانەوە ئەڕوا كە ئیمانیان هێناوەو كردەوەی چاكەیان كردووەو لە فەزڵو ڕەحمەتی خۆی پاداشیان بۆ زیاد ئەكاو، كافرانیش سزای قورس و سەختیان بۆ هەیە.

(٢٧) ئەگەر خوا ڕزق و ڕۆزی گوشادو فرە بكا بۆ بەندەكانی، خۆیان لێ ئەگۆڕێو ئەكەونە خراپەكردن لە زەیدا. بەڵام چەندی خواست لەسەر بێ بۆیان ئەنێرێتە خوارەوە بە ئەندازەیەكی دیاری. ئەو ئاگادارە لە بەندەكانیو بینایەو چاوی لێیانە ئەزانێ چۆن ئەجووڵێنەوە.

(٢٨) خوا ئەو خوایە باران ئەبارێنێتە خوار بۆسەر زەوی پاش ئەوەی ئەم خەڵكە بەهۆی بێبارانییەوە نائومێد ئەبن، ڕەحمەتی خۆی بەسەر زەوی و كشتوكاڵو باخ و باخات و لەوەڕو ئادەمزادو گیاندارانا بڵاوئەكاتەوەو هەر ئەو دۆست و سەرپەرشتی ستایشكراوی هەموو جیهانە.

(٢٩) لە بەڵگەو نیشانەكانی گەورەیی خوایە دروستكردنی ئاسمانەكان و زەویو ئەو ڕەوەندانەی بە ئاسمانەكان و زەویدا بڵاوی كردوونەتەوەو، ئەو خوایە هەر كاتێ مەیلی لێ بێ ئەتوانێ هەموو ئەو ڕەواندانە كۆبكاتەوە.

(٣٠) هەرچیتان تووش ببێ لە دەردو بەڵاو مەینەت لە شوومیی ئەو تاوانانەوەیە بە دەستی خۆتان كردووتانن و لەگەڵ ئەوەیشا لە زۆر لەو تاوانانەتان خۆش ئەبێ كە كردووتانن و لە بەرابەریا تووشی هیچتان ناكا، واتە ئێوە موستەحەقی زیاتریشن لەوەی كە تووشتان ئەبێو دێتە ڕێتان.

(٣١) ئێوە لەوانە نین بتوانن خوا بێدەسەڵات بكەن و كارێك بكەن نەتوانێ لەم سەرزەوییەدا چیی بوێ لێتان بكاو، بۆ ئێوەیش لە خوا بەولاوە هیچ دۆست و یارمەتیدەرێ نییە.

وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ (٣٢) إِن يَشَأْ يُسْكِنِ الرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ (٣٣) أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ (٣٤) وَيَعْلَمَ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ (٣٥) فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٣٦) وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ (٣٧) وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (٣٨) وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ (٣٩) وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ (٤٠) وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَٰئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ (٤١) إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ ۚ أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٤٢) وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ (٤٣) وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن وَلِيٍّ مِّن بَعْدِهِ ۗ وَتَرَى الظَّالِمِينَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ (٤٤)



(٣٢) له بەڵگەو نیشانەکانی توانایی خوان ئەو کەشتییانەی بە دەریادا ئەڕۆن و ئەوەندە گەورەن یەکی بەقەدەر شاخێ ئەبن‌و ئەڵێی شاخن ڕێ‌ئەکەن.
(٣٣) ئەگەر خوا خواستی لەسەر بێ با ڕائەوەستێنێ‌و نایهێڵێ بوەزێ‌و ئیتر ئەو کەشتییانە لەبەر نەبوونی با کە بایەوانەکانیان بجوولێنێ لە شوێنی خۆیانا بەسەر کۆڵی دەریاوە ڕەق ڕائەوەستن و ناجووڵێن. بەڕاستی لەم دیاردەیەدا چەندین بەڵگەو نیشانەی توانایی خوا هەیە بۆ هەر بەندەیێ خۆڕاگرو سوپاسگوزاری لوتفی خوابێ لەگەڵ ئادەمزاد.
(٣٤) یا ئەگەر خواستی لەسەر بێ بەهۆی ئەو کارو کردەوە خراپانەوە ئەوانەی لەناو کەشتییەکانان کردوویانن، ئەو کەشتییانە بەرباد ئەکاو، چاویش لە زۆر لە تاوانەکانیان ئەپۆشێ.
(٣٥) ئەوانەی لەبارەی ئایەتەکانی ئێمەوە دەمەدەم ئەکەن، ئەزانن هیچ دەرفەتێکیان نییە بۆ دەربازبوون لە سزای ڕۆژی قیامەت، لەگەڵ ئەوەیش هەر بەردەوامن لەسەر کوفرو بێباوەڕی.
(٣٦) ئەوەی دراوە پێتان لە نیعمەت و ڕزقو ڕۆزی هەمووی مایەی ڕابواردنی ژیانی دنیایەو ئەوەیش کە لای خوایە کە پاداشی ڕۆژی قیامەتە لە هەموو خێرو بەرەکەتی دنیا چاکترەو بۆ هەمیشە ئەمێنێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمانیان بە خواو بە ئایینەکانی خوا هێناوەو پشت بە خوا ئەبەستن و بەو پشت ئەستوورن.
(٣٧) بۆ ئەوانەیش کە خۆیان لە تاوانە گەورەکان ئەپارێزن و نایانکەن و خۆ دوورئەگرن لە داوێن‌پیسی‌و، کە ڕقیان هەڵئەسێ لەو کەسانە ئەبوورن کە ڕقیان لێیان هەڵساوەو تۆڵەیان لێ‌ناسێننەوە. (٣٨) بۆ ئەوکەسانەیش کە فەرمانبەرداریی خوای خۆیان ئەکەن و نوێژەکانیان ئەکەن و نایانفەوتێنن و لە کاتی خۆیانیان دواناخەن و کاروباری ناوخۆیان بە پرس و ڕاوێژو گوێ بۆ یەکتر شل کردن بەڕێوەئەبەن و لەو ڕزق و ڕۆزییەی پێمان داون خەرج ئەکەن لە ڕێی خوادا بۆ ئەو کەسانەی موستەحەقن. (٣٩) بۆ ئەوکەسانەیش کە ئەگەر ستەمکاران ستەمیان لێ‌کردن، لەسەر حەقی خۆیان دێنە دەنگ و لەناو خۆیانا یارمەتیی یەکتر ئەدەن تا بەسەر ئەو ستەمکارانەدا زاڵ ئەبن و حەقی خۆیانیان لێ ئەسێننەوە. ئەم سێ ئایەتەی ڕابووردن، هەر سێ بەسراون بە ئایەتی ژمارە (٣٦)ەوە.
(٤٠) تۆڵەی خراپە خراپەیەکی لە وێنەی خۆیەتی ، جا هەرکەسێ لە خراپەکەرەکە ببووریێ‌و لێی خۆش ببێ ئەوە پاداشی لەسەر خوایەو خوا پاداشی ئەداتەوەو، خوا ئەوانەی خۆش ناوێ ستەمکارن و لە پێشا خراپە لەگەڵ یەکێکی‌تر ئەکەن. (٤١) بەڕاستییش ئەوی تۆڵەی خۆی بسێنێتەوە لە ستەمکار پاش ئەوەی کە ستەمی لێ کرا، ئەوە هیچ تاوانێکی لەئەستۆدا نییەو هیچ ناحەقییەکی نەکردووە. (٤٢) تاوان لە ئەستۆی ئەو کەسانەدایە ستەم لە خەڵك ئەکەن و کاری ناڕەوا بە ناحەق لە زەویدا ئەکەن. ئەوانە سزایەکی سەختیان بۆ هەیە لە ڕۆژی قیامەتا.
(٤٣) بەڕاستییش ئەو کەسانەی خۆیان ڕابگرن و تۆڵە نەسێننەوەو لە ستەمکار ببوورن و چاوپۆشی لە ستەمەکەی بکەن، ئەوانە ئەم کردەوەیەیان کردەوەیەکە لە کارە بەرزو بەنرخ و مەردانەکانە.
( ٤٤) هەرکەسێکیش خوا سەری لێ بشێوێنێ‌و گومڕای بکا، ئەوە پاش ئەوەی خوا نائومێدی کرد هیچ دۆستێکی نییە پشتی پێ ببەستێ‌و، لە ڕۆژی قیامەتا ستەمکاران ئەبینی کە عەزابی خوا بە چاوی خۆیان ئەبینن ئەکەونە

وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَـٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِىٍّ ۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۚ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴿٤٧﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ كَفُورٌ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَـٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَـٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ۞ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾



هاوارو دادو فوغان و ئەڵێن : ئایا ڕێگەیەك هەیە بتوانین لەو ڕێگاوە بگەڕێینەوە بۆ دنیاو ئیتر لەوێ مرۆی چاك و خاوەن باوەڕ بین و بێ فەرمانیی خوا نەكەین؟

(٤٥) ئەیانبینی پیشانی ئاگری دۆزەخ ئەدرێن و لەحاڵێكان لەبەر زەلیلیی خۆیان كزو ملكەچن . بەلاچاوێك سەیری خەڵك ئەكەن . خاوەن ئیمانەكانیش لەو كات و شوێنەدا ئەڵێن : بەڕاستی زیان كردوو ئەوانەن خۆیان و كەسوكاریان لە ڕۆژی قیامەتا لەكیس چووەو ڕەوانەی دۆزەخ ئەكرێن. بێدار بنەوە! بەڕاستی ستەمكاران لەو دنیا لە عەزابێكی بەردەوامان.

(٤٦) كافرەكان لە ڕۆژی قیامەتا كەسێك شك نابەن دۆستیان بێ‌و بتوانێ یارمەتییەكیان بداو بگاتە فریایان لە خوا بەولاوە كە ئەویش دۆستیان نییەو یارمەتییان نادا، چونكە گومڕابوون و، هەركەسیش خوا گومڕای بكا هیچ ڕێگایەكی ڕزگاربوونی بۆ نییە.

(٤٧) بێن بە دەنگ فەرمانی پەروەردگاری خۆتانەوە بەر لەوەی ڕۆژێكی وا بێت گێڕانەوە بۆ دواوەی نەبێ لەلایەن خواوە كە ڕۆژی قیامەتەو لەو ڕۆژەدا هیچ دالدەو پەنایەكتان بۆ نییەو هیچ دەرفەتێكی ئینكاركردنی ئەو كردەوانەتان نابێ كە لە دنیادا كردووتانن.

(٤٨) جا ئەگەر هەر ملیان باداو گوێیان بۆ شل نەكردی، قەیدی نییەو گوێ مەدەرێ . ئێمە تۆمان نەناردووە بۆ سەریان بۆ ئەوەی نیگابانیان بی. تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە كە پەیامی خوایان پێ ڕابگەیەنی. ئێمە كاتێ كە ڕەحمەتی خۆمان بە ئینسان ئەچێژین پێی خۆش ئەبێ‌و، ئەگەر نارەحەتییەكیشیان تووش ببێ بەهۆی كردەوەی لەوەپێشی دەستی خۆیانەوە، دەست ئەكەن بە ناشوكری كردن. بەڕاستی تەبیعەتی ئینسان وایە هەمیشە ئینكاری نیعمەتی خوا ئەكاو لە یادی خۆیی ئەباتەوە.

(٤٩) مولكی ئاسمانەكان و زەوی هیی خوایە. ئەوەی خواستی لێ بێ دروستی ئەكا. منالی مێینە ئەبەخشێ بە هەركەسێ خواستی لێ بێ‌و هەركەسیشی خواست لێ بێ نێرینەی پێ ئەبەخشێ.

(٥٠) یا نێرینەو مێینە بە جووت ئەبەخشێ بە هەركەسێ خواستی لێ بێ‌و، هەركەسیش مەیلی لێ بێ نەزۆك و بێبەری ئەكا. بێگومان خوا زانایە بە هەموو شتێك و توانایشە ئەتوانێ هەرچیی بوێ بیكا.

(٥١) هەرگیز هیچ كەسێ ئەوەی بۆ نەلواوە خوا قسەی لەگەڵ بكا بەوە نەبێ كە فریشتەی وەحیی بنێرێتە سەر كە جیبرەئیلە، یا لە پشتی پەردەوە هەروەك لە تووری سینادا قسەی لەگەڵ مووسا كرد، یا پێغەمبەرێكی بنێرێتەسەرو چیی مەیل لەسەر بێ وەحیی بۆ بكا تا ئەویش بە خەڵكی بگەیەنێ. خوا بەرزو باڵاو خاوەن حیكمەتە.

وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾

## سُورَةُ الزُّخْرُفِ

ترتيبها ٤٣ — آياتها ٨٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِىٍّ فِى ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِىٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٧﴾ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠﴾



(٥٢) هەروەها گەیاندمانە لای تۆ فریشتەیێ بە فەرمانی خۆمان. تۆ بەر لەوە نەتئەزانی نە کتێب چییەو نە باوەڕ چییە. بەڵام ئێمە ئەو وەحیەمان کرد بە ڕووناکییەك هەرکەسمان خواست لێ بوایە لە بەندەکانی خۆمان بەو ڕووناکییە ڕێمان پیشان ئەداو، تۆیش بەڕاستی خەڵك ڕێ بەدێیی ئەکەی بۆسەر ڕێگەیەکی ڕاست کە ڕێگەی ئیسلامەتییە.

(٥٣) ئەو ڕێگە ڕاستەیش بریتییە لە ڕێگەی ئەو خوایە کە هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هەمووی هی ئەوە. کەواتە ئاگاداربن ! سەرەنجامی هەموو کارێ بۆ لای خوا ئەگەڕێتەوەو هەموو لە دەستی خۆیایەتی.

## سوورەتی (الزخرف)

**مەککەیی‌یە ئایەتی ٥٤ی نەبێ‌و، (٨٩) ئایەتە**

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چییە.

(٢) سوێند ئەخۆم بەو کتێبە کە ڕێگای هیدایەت ڕوون ئەکاتەوە.

(٣) ئێمە ئەم کتێبی خۆمانەمان کردووە بە کتێبێکی خوێنراوەی عەرەبی، بەهیوای ئەوەی واتاکەی تێ‌بگەن چونکە کتێبێ لەوانەبێ بخوێنرێتەوەو بە زمانی خۆیشتان بێ دیارە ئەگەر ئارەزووتان لێ بێ زۆر چاك تێی ئەگەن ئەڵێ چی.

(٤) بەڕاستی ئەم قورئانە لەناو (لوح المحفوظ)دا کە هەموو کتێبەکانی خوای بۆ پێغەمبەران تیایەو لای ئێمە هەڵگیراوەو پارێزراوە، پایەیەکی بەرزی هەیەو خاوەن حیکمەتە.

(٥) جا ئاخۆ ئێمە ئەم قورئانە لە ئێوە دوور ئەخەینەوەو دەسبەرداری ڕاگەیاندنی پێتان ئەبین هەر لەبەرئەوە ئێوە خێڵێکی لە ڕاستی لادەرن؟ دیارە نەخەیر.

(٦) ئێمە چەندین پێغەمبەرمان لەناو میللەتانی پێشینا ناردووە.

(٧) ئەو میللەتانە هیچ پێغەمبەرێکیان نەئەهاتە لا ئیللا گاڵتەیان پێ ئەکرد.

(٨) ئێمەیش میللەتانی لەوان بەهێزترو توندو تیژمان بەرباد کردو، حیکایەت و سەرگوزەشتەو پەندی ئەو میللەتە پێشینانە کە بەرباد کراون، لە قورئانا ڕابووردووەو باس کراوە.

(٩) ئەگەر لەو کافرانە بپرسی کێ ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە؟ لە وەڵاما ئەڵێن: خوای خاوەن عیززەت و زانا بەهەمووشتێ دروستی کردوون.

(١٠) ئەو خوایەی زەویی بۆ کردوون بە ئارامگاو جێگای ژیان و تیا حەسانەوەو چەندین ڕێگەوبانی دوورو نزیکی بۆ هاتوچۆ پیاکردن تیا دروست کردووە بۆتان، بەهیوای ئەوەی شارەزا بن لەو شوێنانەی ئەچن بۆیان و ڕێگایان بدۆزنەوەو ون نەبن.

وَٱلَّذِي نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَنشَرۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ
كَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ
لَكُم مِّنَ ٱلۡفُلۡكِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مَا تَرۡكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسۡتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ
ثُمَّ تَذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ رَبِّكُمۡ إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ وَتَقُولُواْ سُبۡحَٰنَ
ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا
لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ وَجَعَلُواْ لَهُۥ مِنۡ عِبَادِهِۦ جُزۡءًاۚ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ
لَكَفُورٞ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخۡلُقُ بَنَاتٖ وَأَصۡفَىٰكُم
بِٱلۡبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحۡمَٰنِ مَثَلٗا
ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي
ٱلۡحِلۡيَةِ وَهُوَ فِي ٱلۡخِصَامِ غَيۡرُ مُبِينٖ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ
ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ أَشَهِدُواْ خَلۡقَهُمۡۚ سَتُكۡتَبُ
شَهَٰدَتُهُمۡ وَيُسۡـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ لَوۡ شَآءَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَا عَبَدۡنَٰهُمۗ
مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ
كِتَٰبٗا مِّن قَبۡلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسۡتَمۡسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلۡ قَالُوٓاْ
إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢٢﴾



(١١) ئەو خوایەیش ئاوی لە ئاسمانەوە بە ئەندازەی دیاری داپەڕاندووە بۆ سەرزەوی‌و بەو ئاوە شارێکی بێ‌بەروبووم و بەهرەمان زیندوو کردووەتەوەو ژیاندووەتەوەو، لە ڕۆژی قیامەتیشا هەر بەو جۆرە ئێوە زیندوو ئەکرێنەوەو لە گۆڕ دەرئەهێنرێن.

(١٢) ئەو خوایەیش کە هەموو جووتە نێرو مێکانی لە هەموو گیانلەبەرانا دروست کردووەو، لە کەشتی‌و لە چوارپێیش شتی‌وای بۆ دروست کردوون سواریان بن.

(١٣) تا ڕێك لەسەر کۆڵیان دانیشن و ئەوجا کە لەسەر کۆڵیان دانیشتن بیری نیعمەتی خوای خۆتان بکەنەوەو بڵێن: خاوێنی‌و بێگەردی بۆ ئەو خوایە ئەم ولاخە بەرزانەو ئەم کەشتییانەی بۆ ڕام کردووین و ئێمە لەوانە نەبووین بتوانین لە خۆمانەوە ئەمانە ڕاگیر بکەین و ڕامیان بکەین و بییانخەینە ژێر بار.

(١٤) ئێمە ئەیشگەڕێینەوە بۆ لای خوای خۆمان.

(١٥) ئەم کافرانە بەشێ لە بەندەکانی خوایان داناوە بۆ خوا کە گوایە ئەوانە ئەولادی ئەون وەك ئەوە کە وتوویانە فریشتە کچی خوان. بەڕاستی ئادەمزاد کافرە بە خواو بە ئاشکرا کوفری خوای خۆی ئەکاو کوفرەکەی دەرئەبڕێ.

(١٦) یاخود خوا لەوانەی کە خۆی دروستیان ئەکا کچی بۆ خۆی بڕیار داوەو ئێوەی هەڵاوێردووە بەوە کە کوڕی داونێ؟

(١٧) کەچی ئەگەر مژدەی لەدایکبوونی وێنەی ئەوە بدرێ بە یەکێکیان کە خۆیان بە نموونە بۆ خوایان هەڵبژاردووە کە کچە کە ئەوەبوو وتبوویان خوا فریشتەکانی خۆیی بە کچ دروست کردووە، ڕووی لە خەفەتبارییا ڕەش هەڵئەگەڕێ‌و، لە ڕقانا کە لە دڵیا پەنگی خواردووەتەوە، خەم و پەژارە سەرو سیمای دائەگرێ، چونکە ئەوان کچیان بەلاوە زۆر هیچ و ناچیز بووەو زۆر جار کە کچیان بووە لە داخانا زیندەبەچاڵیان کردووە.

(١٨) ئایا ئەم کافرانە نەوەیەك بۆ خوا قەرار ئەدەن وەکو کچ بێ کە لەناو خشڵ‌و متومووروواو بە نەرمی‌و نیانی پەروەردە ئەکرێ‌و، کە کەوتیشە هەرایەکەوە ناتوانێ مەبەستی خۆی دەرببڕێ‌و داکۆکی لە خۆی بکا؟

(١٩) فریشتە کە بەندەکانی خوان، ئەم کافرانە بە کچیان داناون و وتوویانە: ئەمانە کچی خوان. ئایا ئەمانە لە کاتی دروستکردنی فریشتەدا لەوێ بوون و بە چاوی خۆیان دییان کە خوا بە مێنگەی دروست کردن؟ ئەم شایەتییەی ئەمانە داویانە لە بارەی فریشتەوە کە گوایە کچن، لەسەریان ئەنووسرێ‌و لە ڕۆژی قیامەتا پرسیاریان لێ ئەکرێ لەسەری.

(٢٠) کافرەکان ئەڵێن: ئەگەر خوا مەیلی لێ بوایە ئێمە ئەم بتانەمان نەپەرستایە، ئەمان ئەپەرستن. ئەوانە هیچ لەم بابەتە نازانن و هەر لەخۆڕایی قسەی پووچ ئەکەن.

(٢١) یان ئاخۆ بەرلەوەی قورئان بێتە خوارەوە بۆسەریان کتێبێکمان ناردووەتە سەریان شتی وای تیا نووسرابێ کەوا ئەمە خواستی خوای لەسەرە، بۆیە ئەوان ئەو بتانە ئەپەرستن و ئێستا پشتیان بەو کتێبە بەستووە کە گوایە ئەوەی تیا نووسراوەو بە گوێرەی ئەوە قسە ئەکەن؟

(٢٢) نەخەیر شتی وا نییەو هیچ کتێبێکی خواییان پێش قورئان بۆ نەهاتووەتە خوارو، مەسەلەکە ئەوەندەیە ئەڵێن: باوك و باپیری خۆمانمان لەسەر ئەم ئایینی بتپەرستییە دیوەو، ئێمە لەسەر شوێن‌پێی ئەوان ڕێی خۆمان ئەدۆزینەوە.

وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ ۖ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿٢٩﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾



(٢٣) هەر بەم جۆرە ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە لە هیچ ئاوەدانییەکا ئادەمزاد بترسێنێ لە خوا، ئیللا دەست ڕۆیشتووەکانی ئەو ئاوەدانییە بەو پێغەمبەرەیان وتووە: ئێمە باوك و باپیرەی خۆمانمان لەسەر ئایینێ دیوەو ئێمە بە شوێنپێی ئەوانا ئەڕۆین و چاولێکەرییان ئەکەین.

(٢٤) جا تۆ پێیان بڵێ: ئەی ئەگەر من شتێکی ڕێپیشاندەرترتان لەوەی باوك و باپیری خۆتانتان لەسەر دیوە، بۆ بهێنم، هەر شوێنی من ناکەون و لەسەر ئەوەی خۆتان و باوك و باپیرتان ئەمێننەوە؟ ئەوانیش لە وەڵاما وتیان: ئێمە باوەڕمان بەوە نییە کەوا بە ئێوەدا نێرراوە.

(٢٥) جا ئێمەیش تۆڵەی ئەو بێباوەڕییەیانمان لێسەندنەوە، دە سەیرکەن سەرەنجامی ئەو کەسانە چۆن بوو کە پێغەمبەرانی خوا بە درۆزن ئەزانن و باوەڕیان پێ ناکەن.

(٢٦) یادی ئەوە بکەرەوە کە ئیبراهیم بە باوکیو بە خێڵەکەی خۆیی وت: بەڕاستی من بەریم لەو شتەی ئێوە ئەیپەرستن.

(٢٧) مەگەر ئەو خوایەی دروستی کردووم. ئەو بەڕاستی ڕێی ڕاستم پیشان ئەدا.

(٢٨) ئیبراهیم ئەو وشەی خوابەیەکزانین و بت نەپەرستنەی کرد بە وشەیەکی بەردەوام لەناو هەموو پاشماوەکانی خۆیو کوڕاکوڕیا بە هیوای ئەوەی هەموو کافرەکان لە بت پەرستی بگەڕێنەوەو پەشیمان ببنەوەو خوا بە یەك بزانن.

(٢٩) بەڵکو منیش مۆڵەت و ڕابواردنم بۆ ئەو کافرانە خۆیان و بۆ باوك و باپیرانیان ڕەخساند تا قورئانی ڕاست و پێغەمبەری ڕاست و دروستیان هاتە سەر کە هەمووشتێکی بۆ ڕوون کردنەوە.

(٣٠) بەڵام کە پێغەمبەری ڕاستیان لە خواوە هاتە لا تا لە خەوی بێئاگایی بێداریان کاتەوە، وتیان: ئەم قورئانە جادووەو، باوەڕمان پێی نییەو ئینکاری ئەکەین.

(٣١) کافرەکان لە مەیدانی ڕەخنەگرتنا وتیان: ئەوە بۆچی ئەم قورئانە بۆسەر پیاوێکی مەزنی یەکێ لە دوو ئاوەدانیی مەککەو تایف نەهاتووەتەخوار؟

(٣٢) بۆچی؟ ئەوان ڕەحمەتی خوا دابەش ئەکەن بەسەر ئادەمزادا؟ نەخەیر، ئێمەین مایەکانی ژیانمان لەم دنیایەدا دابەش کردووە هەندێکمان چەندین پلە بەسەر هەندێکی تریانا بەرزکردووەتەوەو هەندێکیانمان کردووە بە گەداو هەندێکیان بە دارا، تا هەندێکیان هەندێکی تریان بچەوسێننەوەو بۆ سوودی خۆیان بیانخەنە ژێر بارو بێگار، بەڵام ڕەحمەتی خوا لە هەموو ئەو سەروەت و سامانە چاکترە کە ئەوان کۆی ئەکەنەوە.

(٣٣) ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە کە ئادەمزاد هەموو ئەبوون بە یەك میللەتی کافری خوانەناس، بڕیارمان ئەدا بۆ هەموو ئەوانەی کافرو خوانەناسن ماڵەکانیان سەربانی زیوو پلەکانەی زیویان بێ بەسەریا سەرکەون.

وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾



(٣٤) دەرگای زیوینیش بە ماڵەکانیانەوە بێ‌و چەرپای زیوینیی‌وا بەسەریانەوە پاڵ بدەنەوە.

(٣٥) زینەتی ڕازاندنەوەیشمان بۆ ماڵەکانیان ئەکردو، هەموو ئەو شتانەیش لە مایەی ڕابواردنی ژیانی ئەم دنیایە بەولاوە نین و، لای خوا ئەو دنیا هەیە بۆ ئەوانەی خۆیان لە بێ‌فەرمانیی خوا دوور ئەگرن.

(٣٦) هەرکەسێ لە یادی خوا شەوکوێر ببێ‌و گوێی نەداتێ جنۆکەیەکی بۆ ئامادە ئەکەین ئەو جنۆکەیە ئەبێ بە هاوڕێ‌و هاودەنگی.

(٣٧) ئەو جنۆکانەی ئەبن بە هاوڕێی ئەو جۆرە کەسانە ڕێیان لێ ئەگرن لەوەی ڕووبکەنە خوا، کەچی ئەوان خوا بەوە دائەنێن کە ڕێی ڕاستیان دۆزیوەتەوەو سەرلێشێواو نین.

(٣٨) تا کە هەرکام لەو کافرانە ئەمرێ‌و قیامەتی دێ‌و ئەبرێتە مەیدانی لێپرسینەوە، بۆ حوزووری خوا، بە جنۆکەکەی هاوڕێی ئەڵێ: بریا مەودایەکی ئەوەندەی مەودای نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا دوورمان لە نێوانا بوایە لە دنیاداو هەرگیز یەکترمان نەدیایە تا وا سەرت لێ نەشێواندمایە. تۆ هاوڕێیەکی خراپ بووی بۆم.

(٣٩) ئەمڕۆ خۆزگەو ئاوات خواستن هیچ دادتان نادا چونکە کاتی خۆی ستەمتان لە خۆتان کردو ئێستا گشتتان لە سزادرانا هاوبەشن.

(٤٠) ئایا تۆ ئەتوانی مرۆی نەشنەوا شنەوا بکەی، یا مرۆی کوێر وا لێ بکەی ڕێ دەربکا، یا کەسێ لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بێ وای لێ بکەی ڕێگای هیدایەت بدۆزێتەوە؟

(٤١) جا یا تۆ ئەبەینەوە بۆ خۆمان و ئەتمرێنین و ئەگەر وامان کرد پاشان تۆڵەی بەرودوا لەوان ئەسێنینەوە،

(٤٢) یا ئەتهێڵینەوەو هەندێ لەو سزایەت پیشان ئەدەین کە گفتمان بەو کافرانە داوە بەو سزایە سزایان بدەین و، ئێمە دەسەڵاتمان بەسەریانا ئەشکێ.

(٤٣) دەی تۆ توند دەس بەو شتەوە بگرە کە بە وەحی هاتووەتە خوارەوە بۆت کە قورئانە، تۆ بێ‌گومان لەسەر ڕێگایەکی ڕاستی.

(٤٤) بەڕاستی ئەم قورئانە مایەی شەرەف و سەربەرزی‌و ناو مانەوەیە بۆ خۆت و بۆ خێڵەکەت و لەمەولایش لە ڕۆژی قیامەتا پرسیارتان لێ ئەکرێ ئاخۆ ئەو ئەرکەی ئەم قورئانە خستوویەتە ئەستۆتان بەجێتان هێناوە ؟

(٤٥) پرسیار لە میللەتان و زانایانی ئایینی ئەو پێغەمبەرانەمان بکە کە بەر لە تۆ ناردوومانن ئاخۆ لە خوای بەخشندەو میهرەبان بەولاوە خواگەلێکی ترمان داناوە لەلایەن خەلکەوە بپەرسترێن و ڕێمان داوە بە پەرستنی هیچ بتێك ؟

(٤٦) بەڕاستی ئێمە مووسامان نارد لەگەڵ ئایەت و موعجیزەی خۆمان بۆسەر فیرعەون و کۆمەڵەکەی دەورووبەری‌و، مووسا هات پێی‌وتن: من فروستادەی پەروەردگاری هەموو جیهانم بۆ سەرتان.

(٤٧) کاتێ ئەویش هات بۆ لایان بەو موعجیزانەوە خوا دابوونی پێی، سەیرت ئەکرد پێی پێئەکەنن.

وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا وَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ۞ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾



(٤٨) هیچ موعجیزەیەکمان لەسەر دەستی مووسادا پیشانی فیرعەون و تاقمەکەی نەئەدا ئیللا گەورەتر بوو لە هەر هاوچەشنێکی خۆی و، بە سزاو بەڵای ناهەموار گرتماننەوە بەڵکو بگەڕێنەوە بۆسەر ڕێی ڕاست.
(٤٩) فیرعەون و داروودەستەکەی بە مووسایان وت : ئەی کابرای جادووگەر ! داوا لە خوای خۆت بکە، بەو گفت و پەیمانەی لەنێوانتانایە با ئەم سزایەمان لەسەر هەڵگرێو لای بدا، ئەو کاتە ئێمەیش دێینە سەر ڕێی هیدایەت.
(٥٠) جا کاتێ کە مووسا لە خوا پاڕایەوەو ئێمەیش عەزابەکەمان لەسەر فیرعەون و کۆمەڵەکەی هەڵگرت، کوتووپڕ گفتەکەی خۆیانیان شکاندو لە قسەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە.
(٥١) جا فیرعەون بانگی کردە خێڵەکەیو وتی : ئەی خێڵەکەم ! ئایا پادشایەتیی میسر هیی من نییەو، ئەم جۆگەو ڕووبارانەی بە بەر کۆشك و سەراکانما ئەڕۆن، هیی من نین؟ ئایا ئێوە بە چاوی خۆتان سەیر ناکەن؟
(٥٢) یا سەیر ئەکەن و ئەبینن من چاکترم لەم کابرا ناچیزو داماوە سووکە کە دەسەڵاتی هیچی نییەو دەمی گۆ ناکاو قسەی بۆ ناکرێو لەوانەیە نەتوانێ مەبەستی خۆی دەربڕێ بەجۆرێ کە مرۆ لێی حاڵی ببێ؟ (٥٣) ئەگەر ڕاست ئەکا پێغەمبەرەو خوا ناردوویە، ئەی بۆ هەندێ بازن و بازووبەندی زێڕی لە خواوە بۆ هەڵنەدراوە تا گەورەیی خۆی لەناو خەڵکا پێ نیشان بداو خەڵکی پێ لە دەوری خۆی خڕکاتەوە؟ یان بۆ فریشتەی خوای شان بەشان لەگەڵ نەهاتوون یارمەتیی بدەن؟
(٥٤) فیرعەون پاش ئەم قسانەی، خێڵەکەی خۆی بە نەفام و تێنەگەیشتوو داناو ئەوانیش لەڕاستیدا وابوون و هەرچیی وت چوو بەگوێیاناو بەگوێیان کرد. بێگومان خێڵەکەی کۆمەڵێکی فاسق و لە ڕاستی لاداوبوون.
(٥٥) کە بەم کردارو ڕەوشتەیان ڕقی ئێمەیان هەستاند، تۆڵەمان لێ سەندن و هەموومان بەجارێ لە ئاوی نیلا نوقم کردن و خنکاندمانن. (٥٦) کردمانن بە پەندو عیبرەت و نموونە بۆ خەڵکانیتر.
(٥٧) جارێکیان یەکێ لە کافرەکانی مەککە کەوتە موجادەلە لەگەڵ پێغەمبەر لەسەر ئەو ئایەتە کە بە کافرەکان ئەفەرموێ: ئێوە خۆتان و ئەوانەی ئەیانپەرستن هەمووتان سووتەمەنیی دۆزەخن و، وتی: خۆ گاورەکانیش عیسا ئەپەرستن، کەواتە ئەگەر ئەو ببێ بە سووتەمەنیی دۆزەخ[٣] جا کە ئەم کافرە ئەم قسەیەی کرد کافرەکانی تری مەککە زۆریان پێ خۆش بوو گوایە بە خەیاڵی خۆیان لایان وابوو ئەم کابرایە توانیویە پێغەمبەر دەمکوت بکا، چونکە گوایە ئایەتەکە وائەگەیەنێ حەزرەتی عیسایش لە دۆزەخا ئەسووتێ لەگەڵ ئەوەیش کە پێغەمبەری خوایەو دیارە شتی وایش نابێو، کەواتە ئەبێ ئایەتەکەی موجادەلەی لەبارەوە لەگەڵ ئەکرد ڕاست نەبێ.
(٥٨) [٤] کافرەکان وتیان : ئایا خواکانی ئێمە ، کە بتەکانمانن، لای تۆ چاکترن یان عیسای کوڕی مەریەم ؟[٥] هەر بۆ دەمەدەم ئەیهێننەوەو، لەوە زیاتریش ئەمانە خێڵێکن زۆر بەتوندی دوژمانیەتی ئەکەن و حەزیان لە عەنادو کەللەڕەقییە، ئەگینا ئەزانن هیچ مەجالێ نییە بۆ قیاس کردنی پێغەمبەرێکی خوا کە خەڵکی بانگ کردووە بۆ خوابەیەکزانین لە بتێ کە لە پارچە تەختەیەك یا پارچە بەردێ دروست کراوەو بتپەرستەکان ئەیپەرستن و، مەگەر هەر ئەوەندە سوودی ببێ فڕێ بدرێتە دۆزەخەوەو بکرێ بە پارچەیەك لە سووتەمەنییەکانی. (٥٩) عیسای کوڕی مەریەم لە بەندەیەکی خوا بەولاوە نییە کە نیعمەتی پێغەمبەرایەتیمان پێبەخشیوەو کردوومانە بە نموونەو پەند بۆ کۆمەڵی بەنیئیسرائیل[٦] . (٦٠) ئێمە تواناو خاوەن دەستین، ئەگەر مەیلمان لێ بوایە وەك عیسامان بێ باوك دروست کرد ئیوەیشمان تەفروتوونا ئەکردو فریشتەمان لە جێی ئێوە دروست ئەکرد تا جێگەی ئێوە لەسەر زەوی بگرنەوە

وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٦﴾ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾



(٦١) بەڕاستی عیسا نیشانەی نزیکبوونەوەی ڕۆژی قیامەتە چونکە جووەکان ویستیان هەڵیواسن ئێمە شێوەیمان گۆڕی بە یەکێ لەوان و، ئەومان هەڵبڕی بۆ ئاسمان و، لە نزیکی ڕۆژی قیامەتا ئەینێرینەوە خوارەوە بۆ سەر زەوی‌و، جووەکان یەکێکیان لە خۆیان کە بە عیسایان زانی کرد بە دارا. کەواتە ئێوە گومانتان نەبێ لەم گۆڕینەی عیساو بەرزکردنەوەیا بۆ ئاسمان و، شوێنی ئەو ڕێ‌پیشاندانە بکەون کە من ڕێم پیشان داون و ئەمەی من بانگتان ئەکەم بۆی ڕێگای ڕاستە.

(٦٢) ئاگاداربن! با شەیتانیش ڕێی ئەوەتان لێ نەگرێ کە شوێن ڕێی ڕاست بکەون. بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە.

(٦٣) کاتێ عیسا بە موعجیزەوە هات بۆسەر بەنی ئیسرائیل، پێی وتن: بەڕاستی من حیکمەت و زانستم لای خواوە بۆ هێناون بۆ ئەوەی ڕێی ڕاستتان پیشان بدەم و هەندێ لەو شتانەتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە ئێوە ناکۆکن تیایاناو هەر یەکێکتان شتێکی تیا ئەڵێ. کەواتە لە خوا بترسن و هەرچیم پێ‌وتن بەگوێم بکەن.

(٦٤) بەڕاستی خوا پەروەردگاری منیش و ئێوەیشە، کەواتە عیبادەتی بکەن و بیپەرستن و ڕێگەی ڕاست ئەمەیە کە ئەو بپەرستن.

(٦٥) جا کۆمەڵۆ تاقمەکانی دەوروپشتی عیسا لەناوخۆیانا ناکۆکییان تێکەوت و، هەر کۆمەڵێکیان شتێکی ئەوت. کەواتە هاوار بۆ ئەوانەی ستەم و ناحەقییان کردو شوێنی ڕێی ڕاست نەکەوتن! هاوار بۆ ئەوان لە سزای ڕۆژێکی پڕ دەردو ئازار کە ڕۆژی قیامەتە!

(٦٦) ئایا چاوەڕوانیی هیچ ئەکەن ئەوە نەبێ کە ڕۆژی قیامەت بێ بەسەریانا بە شێوەیەکی لەپڕو ئەوان هەستی پێ نەکەن و بە خۆیان نەزانن کە ئەدا بە سەریانا؟

(٦٧) دۆست و برادەران لەو ڕۆژەدا هەندێکیان دوژمنی هەندێکیانن چونکە تێ‌ئەگەن کە ئەوان بوون بەهۆی گومڕاه بوونیان، تەنها دۆست و برادەرانی وا نەبێ لە دنیادا لەخواترس بووبن ئەوانە هەر لەسەر دۆستایەتیی خۆیان ئەمێننەوە.

(٦٨) ئەی بەندەکانی من! ئێوە ئەمڕۆ هیچ ترستان لەسەر نییەو هیچ خەم و خەفەت نایەت بەسەرتانا.

(٦٩) ئەو بەندانەی من کە ئیمانیان هێناوەو بە دڵۆ بە زوبان گوێڕایەڵ بوون بۆ هەموو فەرمانێکی ئێمە.

(٧٠) وەرن خۆتان و هاوسەرەکانتان بچنە ناو بەهەشتەوە شادمان و دڵخۆش بن.

(٧١) ئەگەڕێن بەسەریانا بە کاسەی زێڕین و پیاڵەوەو، لە بەهەشتا هەیە ئەوەی نەفسی ئادەمزاد ئارەزووی بکاو چاو لەزەتی لێ وەربگرێ‌و ئێوە هەمیشە لە بەهەشتا ئەمێننەوە.

(٧٢) ئەوەیش ئەو بەهەشتەیە کە دراوە بە ئێوە بەهۆی ئەو کردارە باشانەوە کە ئەتانکردن.

(٧٣) هەیە بۆ ئێوە لەو بەهەشتەدا میوەجاتێکی زۆرو لەو میوانە ئەخۆن.

إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾ وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾ أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾



(٧٤) بەڕاستی تاوانباران هەمیشە لە سزای دۆزەخدا ئەبن.
(٧٥) سزای دۆزەخیان لێ سووك ناکرێو ئەوان لەو سزایەدا بێئومێدن.
(٧٦) کە ئەمە حاڵیانە ئێمە ستەممان لێ نەکردوون، بەڵکو ئەوان خۆیانن ستەمکار.
(٧٧) ئەوانەی لەناو ئاگری دۆزەخان هاوار ئەکەنە دەرگاوانی دۆزەخ کە ناوی (مالیك)ەو پێی ئەڵێن: ئەی مالیك! بەڵکو کارێ بکەی خوا گیانمان بکێشێو بمرین و بحەسێینەوە، ئەویش ئەڵێ: نەخێر، ئێوە بۆ هەمیشە لەم شوێنەدا ئەمێننەوە.
(٧٨) خوا ئەفەرموێ: بەڕاستی ئێمە حەقو ڕاستمان بۆ هێنان کە پەیمانی خۆمان و پێغەمبەری خۆمان و کتێبی خۆمانە، بەڵام بەشی زۆری ئێوە خۆشتان لە حەق و ڕاستی نایەت.
(٧٩) یان ئەوان بڕیاری کارێکیان داوە کە ئەوەیە بەرپەرچی قورئان بدەنەوەو بەدەست هەڵبەستی دابنێن؟ ئێمەیش بڕیاری خۆمانمان داوە کە ئەوەتە بەربادیان بکەین و دوایان ببڕین.
(٨٠) یان ئاخۆ گومان ئەبەن ئێمە گوێمان لە ڕازو نهێنیو پچەپچی ئەوان نییە؟ نەوەڵڵا وا نییەو فروستادەی ئێمە وان لایانو بەسەر سەریانەوە وەستاون هەرچی ئەکەنو ئەڵێن ئەوان ئەینووسنەوە.
(٨١) تۆ، ئەی موحەممەد! بەو کافرە هاوبەشبۆخوادانەرانە بڵێ: ئەگەر خوا مناڵێکی ببێ من یەکەمی ئەوانەم ئەیپەرستن، بەڵام ئەزانم نییەتیو کەسی نەکردووە بە مناڵی خۆی تا بیپەرستم.
(٨٢) پاکیو خاوێنی لەوە کە وەك ئادەمزاد وابێو ژنی ببێ، بۆ خوایە کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییەو پەروەردگاری عەرشەو بەرییە لەو شتانەی هاوبەشبۆدانەرەکانی وەسفی پێ ئەکەن و ئەڵێن واو وایە.
(٨٣) دەسا لێیان گەڕێ با هەر بە بیرو بۆچوونی هیچوپووچەوە خەریك بن و خەریکی گاڵتەبازاڕی دنیای خۆیان بن تا بەو ڕۆژەی خۆیان ئەگەن کە وەعدەیان پێ دراوە.
(٨٤) خوا ئەو خوایە لە ئاسمانا خوایەو ئەپەرسترێو لە زەویدا خوایەو ئەپەرسترێو خاوەن حیکمەتەو هەموو شتێ ئەزانێ. (٨٥) زۆر گەورەیە ئەو خوایەی دارایيو سامانی ئاسمانەکان و زەویو چی لە نێوانیانا هەیە هەمووی هەر بۆ ئەوەو هەر خۆی ئەزانێ کەی دنیا ئەبڕێتەوەو قیامەت دێو ئێوەیش هەموو بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە.
(٨٦) ئەوانەی کافرە هاوبەشبۆخوادانەرەکان بانگیان لێ ئەکەن و ئەیانپەرستن و بانگ لە خوا خۆی ناکەن و ڕاستەوخۆ نایپەرستن، حەقی تکاکردنیان لای خوا لە ڕۆژی قیامەتا نییە، بەڵام ئەوانەی کە شایەتیی ڕاست بدەن و هەر خوا خۆی بە پەرستراوی بە حەق بزانن خوا یەکەو هاوبەشی نییە، ئەوانە حەقی تکا کردنیان هەیە لای.
(٨٧) ئەم هاوبەشبۆخوادانەرانەی هاوار ئەکەنە بت و بت ئەپەرستن، ئەگەر لێیان بپرسی: کێ دروستی کردوون، لە وەڵاما ئەڵێن: خوا. کەواتە ئیتر چۆن لە پەرستنی ئەو خوایە هەڵئەگەڕێنەوەو ئەچن بت ئەپەرستن؟.
(٨٨) لای خوایە ئاگاداری لەوەی کە پێغەمبەر بە خوا ئەڵێ: ئەی پەروەردگاری من! ئەم کافرە هاوبەشبۆخوادانەرانە خێڵێکن ئیمان ناهێنن و هەروا بە کافری ئەمێننەوە.
(٨٩) دەی کەواتە لێیان گەڕێو وازیان لێ بهێنەو بانگیان مەکە بۆ ئیمان هێنان و پێیان بڵێ: ئاشتی و ئارامیو، نە من دەنگ و نە ئێوە دەنگ بێ لە نێوانمانا. بێگومان ئەوانە لەمەوپاش ئەزانن سەرەنجام چۆن ئەبێو چی ڕووئەدا.

# سُورَةُ الدُّخَانِ

ترتيبها ٤٤ — آياتها ٥٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦﴾ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴿٩﴾ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ ۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ۞ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ ۖ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾



## سوورەتی (الدُّخَانِ)

مەککەییە ئایەتی ١٥ی نەبێ‌و، (٥٩) ئایەتە

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی پێی چییە.
(٢) سوێند ئەخۆم بە قورئانێ کە ڕێگای هیدایەت ڕوون ئەکاتەوە.
(٣) بەڕاستی ئێمە ئەم قورئانەمان لە شەوێکی پیرۆزا ناردووەتە خوارەوە. بەڕاستی ئێمە بە ناردنەخوارەوەی ئەم قورئانە ئەوکەسانەمان ترساند کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا نین.
(٤) لەو شەوەدا کە قورئانمان تێدا ناردووەتە خوارەوە، هەر کارێ کە حیکمەتی تێدابێ بەش بەش ئەکرێ.
(٥) مەبەست لە کاری حیکمەت تێدا بوو هەر کارێکە لەلایەن ئێمەوە بێ. بەڕاستی ئێمە ڕەوانەکەری ڕەهبەرانین.
(٦) ناردنی ئەو ڕەهبەرانەیش لە ڕووی ڕەحمەتەوەیە لەلایەن خواوە، خوا هەر خۆی گوێی لە هەموو شتێکەو بە هەموو شتێ ئەزانێ.
(٧) ئەو خوایە کە خوای ئاسمانەکان و زەوی و هەرچییەکە لەنێوانیانا بێ، ئەگەر ئێوە مرۆی خاوەن باوەڕن.
(٨) هیچ خوایەك نییە بەڕاستی بپەرسترێ ئەو نەبێ. ژیان بە گیانداران ئەبەخشێ‌و ئەیشیانمرێنێ. خوای ئێوەو باوك و باپیرە پێشینەکانتانە. (٩) بەڵام ئەوانە خاوەن باوەڕ نین، گومانیان لە خوایەتیی خوادا هەیەو لە گاڵتەبازاڕی خۆیانا گاڵتە بە ڕاستی‌و لەخواوە هاتنی قورئان ئەکەن. (١٠) سا تۆ، ئەی موحەممەد ! چاوەڕوانی ڕۆژێ بە ئاسمان دووکەڵێکی دیارو ئاشکرا ئەهێنێ. مەبەست لە ساڵە قاتی‌و برسییەتییە چونکە لە کاتی وادا ئادەمزادی برسی لەبەر لاوازبوونی هێزی بینایی خۆی ئاسمانی وەك دووکەڵێکی خەست دێتە پێش چاو، یا مەبەست ئەو دووکەڵەیە ڕۆژی قیامەت دنیا دائەگرێ. (١١) ئەو دووکەڵە خەڵك هەموو دائەگرێ. ئەم دووکەڵە سزایەکی بەئازارە.
(١٢) خەڵکەکە لەتاو ئەو وەزعە نابارە لە خوا ئەپاڕێنەوەو ئەڵێن: خوایە ! ئەم سزایەمان لەسەر هەڵگرە، بەڕاستی ئێمە خاوەن ئیمانین و باوەڕمان بە تۆ هەیە.
(١٣) ئەمانە چۆن بیرئەکەنەوەو عیبرەت بەمە وەرئەگرن و ئیمان دێنن لەکاتێکا کە پێغەمبەرێکیان هاتە سەر هەموو شتێکی بەتەواوی بۆ ڕوون کردنەوە. (مەبەست لەو پێغەمبەرە حەزرەتی موحەممەدە).
(١٤) کەچی کە پێغەمبەرەکە هاتە سەریان باوەڕیان پێ نەکردو گوێیان نەدایەو پشتیان تێکردو وتیان : ئەمە خۆی هیچ نازانێ، فێرکراوەو شێتیشە. (١٥) بەڕاستی ئێمە کەمێك ئەو سزایەتان لەسەر لائەدەین، بێ‌گومانیش ئێوە کەللەڕەقن و سەرەنجام هەر ئەگەڕێنەوە بۆ سەر کافری‌و کەللەڕەقییەکەی خۆتان.
(١٦) لەو ڕۆژەدا تۆڵە ئەسێنینەوە کە پەلامارە گەورەکە ئەبەین. بەڕاستی ئێمە تۆڵەی خۆمان ئەسێنینەوە. مەبەست لە ڕۆژی بەدر یان ڕۆژی قیامەتە. (١٧) بەڕاستی ئێمە بەر لەم کافرانەی مەککە تاقمەکەی فیرعەونمان تاقی کردەوە بەوە کە پێغەمبەرێکی خاوەن پایەی وەك مووسا هاتە سەریان.
(١٨) وتی: ئەو بەندانەی خوام بدەنەوە کە بەنی ئیسرائیلییەکانن. من بەڕاستی فروستادەیەکی ئەمینی خوام هاتووم بۆ لاتان بۆ ئەم مەبەستە.

وَأَن لَّا تَعْلُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ لِى فَٱعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتْرُكِ ٱلْبَحْرَ رَهْوًا ۖ إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم مِّنَ ٱلْءَايَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌا۟ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ أَهْلَكْنَٰهُمْ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾



(١٩) خۆیشتان لە خوا بە زلتر مەزانن. من بەڕاستی بەڵگەیەکی ئاشکرام هێناوەتە سەرتان کە موعجیزەکانمە.
(٢٠) من پەنایش بە خوای خۆم و خوای ئێوەیش ئەگرم لەوە کە سووك و ڕەزیل و بەردەبارانم بکەن.
(٢١) ئەگەر باوەڕیشم پێ ناکەن و ئیمانم پێ ناهێنن لێم دوورکەونەوەو لێم گەڕێن.
(٢٢) جا پاش ئەوە کە بۆی دەرکەوت ئەوانە کۆمەڵێکی نامەردو سەرکێشن و چاوەڕوانیی چاکەیان لێ ناکرێ، لە خوای خۆی پاڕایەوەو وتی: خوایە! ئەمانە کۆمەڵێکی تاوانکارن.
(٢٣) جا ئێمەیش بە مووسامان ڕاگەیاند: بە شەو بەندە بەنی ئیسرائیلییەکانم بخەرەڕێو بیبانبە، سوپای دوژمن بە دواتانەوەن.
(٢٤) دەریا بە کراوەیی‌و بە ئارامی بەجێبهێڵە، بەڕاستی ئەوانەی بەدواتانەوەن سەربازگەلێکن بڕیاری خنکانیان لەو ئاوەدا دراوە.
(٢٥) چەندین باخ و باخات و سەرچاوەو کانیاویان لەپاش خۆیان بەجێهێشت.
(٢٦) چەندین کشتوکاڵ‌و زەرعاتی زۆرو شوێنی چاك و خۆشیان لە پاش خۆیان بەجێهێشت.
(٢٧) چەندین جۆرە نازو نیعمەت و مایەی ڕابواردنی دنیایان لەپاش خۆیان بەجێهێشت کە ڕایان ئەبوارد تیایانا.
(٢٨) بەو جۆرە دەرمان پەڕاندن و پاشماوەکانیانمان بە میرات دا بە تاقمێکی تر.
(٢٩) نە ئاسمان و زەوی فرمێسکی خەفەتبارییان بۆ ڕشتن و، نە دوایشخران بۆ ماوەیەکی تر.
(٣٠) بەڕاستی ئێمە بەنی ئیسرائیلییەکانیشمان لەو سزای سووك و سەفیلییە ڕزگار کرد کە..
(٣١) بەدەست فیرعەونەوە ئەیانچێشت. بەڕاستی فیرعەون کابرایەکی لووتبەرزی لەسنووردەرچووی بەلەسەبوو بوو.
(٣٢) بەڕاستی ئێمە بەنی‌ئیسرائیلمان هەڵاوێردبوو بەسەر هەموو خەڵکی تری سەردەمی خۆیاناو ئەمانزانی شایانی ئەوەن هەڵیانوێرین.
(٣٣) ئەوەندەیشمان موعجیزە بە پێغەمبەرەکانیان و خێرو بەرەکەت بە خۆیان دابوو، نان و نیعمەتێکی ئاشکرا، یا تاقیکردنەوەیەکی دیار بوو بۆیان.
(٣٤) بێ‌گومان کافرە هاوبەش‌بۆخوادانەرەکانی قورەیش ئەڵێن:
(٣٥) لەم مردنی یەکەمەمان بەولاوە هیچ مردنێکی تر نییەو ئێمە هەرگیز زیندوو ناکرێینەوە.
(٣٦) ئێوە، ئەی موحەممەدو ئەی ئەوانەی ئیمانتان پێ هێناوە! ئەگەر ڕاست ئەکەن مردوو زیندوو کردنەوە هەیە، باووباپیرانمان بۆ زیندووکەنەوەو بیانهێننە بەردەمان. ئەمەیش پاشماوەی قسەی هاوبەش‌بۆخوادانەرەکانە کە بە پێغەمبەریان وتووە. (٣٧) ئاخۆ ئەم کافرانەی مەککە لە بارەی هێزو تواناوە چاکترن یا تاقمەکەی توببەعی یەمەنی‌و ئەوانەی پێش ئەوان بوون وەك کۆمەڵی عادو سەموود کە تەفروتوونامان کردن؟ ئەوانە بەڕاستی تاوانکاربوون.
(٣٨) ئێمە ئاسمان و زەوی‌و چی لە نێوانیانا هەیەمان بە گاڵتەو لەخۆڕایی دروست نەکردووە.
(٣٩) ئێمە ئاسمانەکان و زەویمان بە مەبەستی ڕاست نەبێ، کە ناسینی خواو پەرستنیەتی، دروست نەکردوە. بەڵام بەشی زۆری ئەم خەڵکە بەمە نازانن.

إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾

## سُورَةُ الجَاثِيَةِ

ترتيبها ٤٥ — آياتها ٣٧



(٤٠) ڕۆژی لێك‌جوێكردنه‌وه‌ی ڕاست و چه‌وت كه‌ ڕۆژی قیامه‌ته‌، واده‌ی به‌سه‌ركردنه‌وه‌ی هه‌موو ئه‌م خه‌ڵكه‌یه‌ كه‌ هه‌ركه‌سه‌ حه‌قی خۆی ئه‌درێته‌ ده‌ست.

(٤١) ڕۆژی لێك جوێكردنه‌وه‌ی ڕاست و چه‌وت ڕۆژێكه‌ هیچ دۆستێ سوودی بۆ دۆستی خۆی نابێ‌و كه‌سیان له‌لایه‌ن كه‌سه‌وه‌ یارمه‌تی نادرێ.

(٤٢) مه‌گه‌ر كه‌سێ كه‌ خوا میهره‌بانیی له‌گه‌ڵ نواندبێ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ خاوه‌ن باوه‌ڕ بووبێ‌و لێی بووردبێ‌و تكای تكاكارانی له‌باره‌وه‌ قوبووڵ كردبێ. به‌ڕاستی خوا خاوه‌ن عیززه‌ت و به‌ڕه‌حم و میهره‌بانه‌.

(٤٣) به‌ڕاستی دره‌ختی زه‌ققووم،

(٤٤) خۆراكی گوناهبارانه‌.

(٤٥) ئه‌و زه‌ققوومه‌ وه‌ك تڵپی ڕۆن زه‌یتوون وایه‌ له‌ناو سكا ئه‌كوڵێ.

(٤٦) وه‌ك كوڵانی ئاوی گه‌رمی هاتووه‌ كوڵ.

(٤٧) بیگرن و توند به‌كێشی كه‌ن بۆ ناوه‌ڕاستی دۆزه‌خ.

(٤٨) پاشان ئاوی كوڵبه‌كوڵ بكه‌ن به‌ سه‌ریا.

(٤٩) بۆ گاڵته‌ پێكردن و سه‌ركۆنه‌كردنیش پێی بڵێن: ده‌فه‌رموو بیخۆو بیچه‌ژه‌، تۆ به‌ڕاستی گه‌وره‌و خاوه‌ن شان و شكۆی!

(٥٠) به‌ڕاستی ئه‌مه‌ ئه‌وه‌یه‌ ئێوه‌ كاتی خۆی گومانتان لێی هه‌بوو و باوه‌ڕتان پێ نه‌ئه‌كرد.

(٥١) به‌ڕاستی ئه‌و كه‌سانه‌ی له‌ دنیادا له‌ خوا ترساون له‌ پایه‌و شوێنێكی واداان له‌ ده‌ردو ئازار ئه‌مینن.

(٥٢) له‌ به‌هه‌شتاو، له‌سه‌ر سه‌رچاوه‌و كانیاون.

(٥٣) جلوبه‌رگی ئاوریشمی ناسك و ئه‌ستوور له‌به‌رئه‌كه‌ن و له‌ به‌رانبه‌ری یه‌كه‌وه‌ دائه‌نیشن.

(٥٤) مه‌سه‌له‌كه‌ به‌م جۆره‌یه‌و حۆریی سپی ڕه‌نگ و چاوگه‌وره‌یشیان لێ ماره‌ ئه‌كه‌ین و پێكه‌وه‌ ئه‌یانكه‌ین به‌ هاوجووتی یه‌ك.

(٥٥) له‌ به‌هه‌شتا داوای هه‌ر جۆره‌ میوه‌یه‌ك ئه‌كه‌ن كه‌ حه‌زی لێ بكه‌ن و، له‌ هه‌موو مه‌ترسییه‌ك ئه‌مینن.

(٥٦) مه‌رگ ناچێژن له‌ به‌هه‌شتا له‌و مه‌رگه‌ به‌ولاوه‌ كه‌ یه‌كه‌م جار له‌ دنیادا چه‌شتوویانه‌و مردوون و، په‌روه‌ردگاری خۆیان ئه‌یانپارێزێ له‌ ئاگری دۆزه‌خ.

(٥٧) ئه‌مه‌ گشتی له‌ لوتف و كه‌ره‌می خوای تۆوه‌یه‌ له‌گه‌ڵیان و ده‌سكه‌وتی گه‌وره‌یش هه‌ر ئه‌مه‌یه‌.

(٥٨) ئێمه‌ ئه‌م قورئانه‌مان به‌ زمانی خۆت كه‌ زمانی عه‌ره‌بییه‌ بۆ ئاسان كردی‌و به‌ زمانێكی ترمان نه‌نارد كه‌ نه‌یزانی‌و خه‌ڵكه‌كه‌ تێی نه‌گه‌ن، به‌ڵكو ئه‌مه‌ خوایه‌ بیرێ بكه‌نه‌وه‌و موسوڵمان بن و بێنه‌ سه‌ر ڕێی ڕاست.

(٥٩) تۆ چاوه‌ڕوان به‌ ئه‌وان چییان به‌سه‌ر دێ‌و، ئه‌وانیش به‌ڕاستی چاوه‌ڕوانن تۆ سه‌ره‌نجامی كارت چۆن ئه‌بێ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِى خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٥﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ فَبِأَىِّ حَدِيثٍ بَعْدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩﴾ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِى عَنْهُم مَّا كَسَبُوا۟ شَيْـًٔا وَلَا مَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا هُدًى وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾



## سوورەتی (الجاثیة)

مەککەیی‌یە ئایەتی ١٤ی نەبێ‌و، (٣٧) ئایەتە

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چییە.

(٢) هاتنە خوارەوەی ئەم کتێبە کە قورئانە لە خوای خاوەن عیززەت و حیکمەتەوەیە.

(٣) بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی نیشانەو بەڵگەی زۆریان لەسەر خوایەتیی خوا تیایە بۆ کەسانێ کە باوەڕیان بە خوا هەبێ.

(٤) لە دروستکردنی ئێوەو لەو گیانلەبەرانەدا کە خوا بڵاویان ئەکاتەوەو بەسەر زەویدا ئەگەڕێن نیشانەی زۆر هەیە لەسەر خوایەتیی خوا بۆ کەسانێ کە باوەڕێکی دامەزراوو متمانەداریان بە خوا هەبێ.

(٥) لە گۆڕانی شەوو ڕۆژدا بەیەکتروهاتنی هەر کامیان لە جێی ئەوی تریان و، لەو ڕزق و ڕۆزییەدا کە خوا بەهۆی بارانەوە لە ئاسمانەوە دایئەپەڕێنێ‌و زەویی پاش مردن‌و وشك بوونەوەی پێ زیندوو ئەکاتەوەو سەوزی ئەکاو، لە گۆڕینی بادا کە هەرجارە لە لایەکەوە هەڵئەکا، لە هەموو ئەمانەدا بەڵگەو نیشانەی زۆری خوایەتیی خوا هەیە بۆ کەسانێ کە عەقڵ‌و هۆشیان هەبێ.

(٦) ئەوانە ئایەتەکانی خوان بەڕاستی ئەیانخوێنینەوە بەسەرتا، ئیتر ئەوانە پاش خواو پاش ئایەتەکانی خوا بە چ قسەیەك باوەڕ ئەکەن و ئیمان دێنن؟

(٧) هاوار بۆ هەموو بوختانکەرێکی گوناهبار کە ..

(٨) گوێی لە ئایەتەکانی خوا ئەبێ ئەخوێنرێنەوە بە سەریاو لەگەڵ ئەوەیش لەسەر بێ‌باوەڕیی خۆی سوور ئەبێ‌و خۆی لەوە بە زلتر ئەزانێ کە باوەڕ بەخوا بکا وەك بڵێی ئەو ئایەتانەی بەر گوێ نەکەوتبێ. دەسا مژدەی ئازارێکی سەختی بدەرێ. (٩) ئەگەر شتێ لە ئایەتەکانی ئێمەی پێ‌بگاو پێ بزانێ کە ئەوانە ئایەتی ئێمەن، ئەیانکا بە گاڵتەجاڕی خۆی‌و گاڵتەیان پێ‌ئەکا هەرچەند شتی وایشیان تیا نییە بۆ گاڵتە پێ‌کردن بشێ. ئەو جۆرە کەسانەی شتی وا ئەکەن سزایەکی وایان بۆ هەیە سووك و سەفیلیان ئەکا.

(١٠) دۆزەخیان لە دواوەیەو هەرچییەکیان پەیدا کردوە هیچ سوودیان ناداو، هەرکەسێکیشیان لە خوا بەولاوە کردووە بە دۆست و پشت و پەنا بۆ خۆیان ئەوانەیش هیچ دادیان نادەن و، سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە.

(١١) ئەم قورئانە مایەی هیدایەت و ڕێ‌دەرکردنە بۆ ئەوانەی شوێنی ئەکەون و، ئەوانەیش کە باوەڕ بە ئایەتەکانی خوای خۆیان ناکەن ئازاری سەختی سزایەکی زۆر توندو بە شیددەتیان بۆ هەیە.

(١٢) خوا ئەو خوایە دەریای بۆ ڕام کردوون بۆ ئەوەی کەشتی بە فەرمانی خوا پیا بێن و بچن و لە بەخشندەیی و کەرەمی ئەو بۆ خۆتان دەردەست بکەن و، بەڵکو سوپاسی خوا بکەن.

(١٣) هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە خوا هەمووی بۆ ڕام کردوون. ئەمە هەمووی لەوەوەیەو، ئەم ئاسمان و زەوی بۆ ڕام کردنە نیشانەو بەڵگەی زۆری تیایە لەسەر گەورەیی ئەو بۆ هەر کۆمەڵە خەڵکێ کە بیربکەنەوە.

قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾



(١٤) بلـێ بەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوە چاوپۆشـی لەوانـە بکـەن کـە چـاوەڕوانی ڕۆژی قیامەت نین بۆئـەوەی خـوا جـەزای هەر کۆمەڵـە خـەڵکێ بداتـەوە بـەگوێرەی ئەوەی لە دنیادا ئەیانکرد.

(١٥) هەرکەسێ کارێکی چاکی کردبێ بۆ خۆیی کردووەو سوودەکەی بـۆ خۆیـەتیو، هەرکەسیش خراپەی کردبێ ئەو خراپەیەی دەرهـەقی خـۆی کـردووەو، پاشـانیش هـەمووتان بـە چـاك و خراپتانـەوە ئەگەرێنەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆتان.

(١٦) بەڕاسـتی ئێمـە تـەورات و حوکمڕانیو پێغەمبەرایەتیمان دا بە خێڵی بەنی ئیسرائیل و ڕزق و ڕۆزیمان دانـێ لـە خۆراکی پاك و پەسەندو گـەورەمان کـردن بەسەر خەڵکانی سەردەمی خۆیانا.

(١٧) بەڵکەو دەلیلی ڕۆشنیشمان لەبارەی کاروبـاری ئـایین و دنیایانـەوە دانـێو ئـەوانیش تـا زانیارییـان لـەبارەی ئـەو کاروباری ئایینیو دنیاییانەوە بۆ نەهات ناکۆکییان تێ نەکـەوت و، ئـەو نـاکۆکی کەوتنە نێوانەیشیان لەبەر بەخیلی بەیەك بردن و دەسدرێژیکردنە سەر یەکیان بـوو. بێگومان خوا لە ڕۆژی قیامەتا لە بـارەی ئەو شتانەوە کە لە دنیادا تیایانا ناکۆك بوون، بڕیاری خۆی لەبەینیانا ئەدا.

(١٨) جا پاش بەنیئیسرائیل و بەسەرچوونی سەردەمی ئەوان، ئێمە تۆمان لەسەر ڕێوشوێنێکی ڕاستی ئـایین دانـا. دەی شوێنی ئـەو ڕێوشـوێنە بکـەوەو بیگرەبـەرو دوای ئارەزووبـازیی ئەوانـە مەکـەوە کـە چـاك و خراپیـان پـێ لێـك ناکرێتەوە.

(١٩) بێگومان ئەوانە بەکەڵکی تـۆ نایـەن و ئەگـەر خـوا بییـەوێ شـتێکت لێ بکـا بـەفریات ناگـەن و هیچیـان لـە بەرانبەری خوادا پێ ناکرێو، ستەمکاران دۆست و پشت و پەنای یەکترن و، خوایش دۆست و پشت و پەنای ئەوانەیـە خۆیان لە گوناە ئەپارێزن.

(٢٠) ئەم باسانەی ئێمە بۆتیان ئەکەین مایەی چاوڕۆشنین بۆ نادەمزادو، ڕێپیشاندان و ڕەحمەتن لە خواوە بۆ کەسانێ کە باوەڕیان بە پێغەمبەری خوا بێ.

(٢١) ئایا ئەو کافرانەی کردەوەی خراپیان لە دنیادا کردووە بەهیوای ئەوەن وەك ئەوانەیان مامەڵە لەگەڵ بکـەین کـە ئیمانیان بووەو کردەوەی چاکیان کردووەو، ژیان و مەرگیان چون یەك بێو، وەك لە دنیادا بەخۆشی ڕایانبواردووە پاش مەرگیش ئازارو سزا نەبینن؟ هەرگیز وا نابێو، بەم بڕیاری هاوسانیی ژیان و مەرگ دانەی کافران بۆخۆیان بڕیـارێکی نابارو ناپەسەند ئەدەن.

(٢٢) خودا ئاسمانەکان و زەویی لەسەر ڕاگرتنی حەق دروست کردووەو بۆئەوەی دروست کردوون هەرکەسـێ بـەگوێرەی ئەوە جەزای بدرێتەوە کە لە دنیادا کردوویەتیو کەسیان ستەم و ناحەقیی لەگەڵ ناکرێ.

أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾



(٢٣) ئایا کەسێ ئارەزووی نەفسی خۆی بۆ خۆی کردبێ بە خوای خۆیو بەگوێرەی ئەوە بجوولێتەوە هەر وەك بلێی بیپەرستێو، خوا ئەو کەسەی بەو کردەوەیەی گومرا کردبێ، لەگەڵ ئەوەیشا کە زانیاریی داوەتێ چاك چییەو خراپ چییەو، خوا گوێچکەیو دڵی مۆرکردبێو قسەیەکی چاك نەچێ بەگوێیاو نەیەت بەدڵیاو پەردەیەکی بەسەر چاویا هێنابێ هیچ بەدی نەکا، کەسێکی وا پاش ئەوە کە خوا وای لێ کرد، لە خوا بەولاوە کێ ئەتوانێ ڕێی ڕاستی پیشان بدا؟ دەی ئاخۆ بیرناکەنەوە؟

(٢٤) کافرەکان وتیان: لە ژیانی ئەم دنیایەمان بەولاوە ژیانێکی‌تر نییەو پاش ئەم ژیانە ئەمرین و ژیان ئەبڕێتەوەو، لە چەرخ و گەردوون بەولاوە کەس نامانمرێنێو هیچ زانیارییەکیشیان لەم بارەوە نییەو لە خۆیانەوە قسە ئەکەن و هەر بە خەیاڵو گومانی خۆیان وا ئەڵێن.

(٢٥) کە ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیشیان بەسەردا ئەخوێنرێتەوە، هیچ بەڵگەیەك شك نابەن بۆ لەڕوودا وەستان و بەرپەرچدانەوەی لەوە زیاتر کە ئەڵێن: ئەگەر ڕاست ئەکەن و قسەی ئێوەیە دەی بڕۆن باوك و باپیرانمان بۆ زیندوو بکەنەوەو بیانهێنن بۆمان.

(٢٦) تۆیش لە وەڵامیانا پێیان بڵێ: خوایە کەوا ئێوە لە نەبوون دروست ئەکاو گیان ئەکا بەبەرتاناو پاشانیش ئەتانمرێنێو پاشتریش کۆتان ئەکاتەوەو ڕاپێچتان ئەکا بۆ حیساب و کیتابی ڕۆژی قیامەت کە هیچ گومانی تیا نییەو دێ، بەڵام بەشی زۆری ئەم خەڵکە نەزانن و ئاگایان لەمە نییە.

(٢٧) مۆڵکی ئاسمانەکان و زەوی هیی خوایەو ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا ئەبێو وادەی لێپرسینەوەو بەسەرکردنەوە دێ، بە تاڵکاران و بێباوەڕان ئەو ڕۆژە ئەیدۆڕێنن و زەرەرمەند ئەبن.

(٢٨) لەو ڕۆژەدا ئەبینی پەیڕەوانی هەر ئایینێ بۆخۆیان کۆبوونەتەوە بۆ لێپرسینەوە. پەیڕەوانی هەر ئایینێ بانگ ئەکرێن بۆسەر نامەو دەفتەری کردەوەی دنیایان. لەو ڕۆژەدا پێیان ئەوترێ: ئەمڕۆ جەزای کردەوەی چاك و خراپی دنیاتان ئەدرێتەوەو بە پاداش و سزای خۆتان ئەگەن.

(٢٩) پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو دەفتەرەیە کە ئێمە بۆ کردەوەی هەر یەکێك لە ئێوەمان ڕاگرتووە، بەڕاستی قسە ئەکاو سیاهەی کردەوەی خۆتانتان بەسەرا ئەخوێنێتەوە. ئێوە هەرچیتان لە دنیادا ئەکرد ئێمە ڕوونووسمان ئەکردو لای خۆمان ئەمانئووسی کە فلانە کردەوەتان کردووە چاك یا خراپ، بۆ ئەوەی پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا بە پێی ئەوە مامەڵەتان لەگەڵ بکرێ.

(٣٠) جا ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە، خوای خۆیان ئەیانخاتە بەر ڕەحمەتی خۆیو، دەسکەوتی ئاشکراو مەزنیش بۆ ئادەمزاد هەر ئەوەیە.

(٣١) ئەوانەیش کەوا کافر بوون و باوەڕیان بە خوای خۆیان نەبوو، پێیان ئەوترێ: ئەوە نەبوو ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەرا ئەخوێنرانەوەو ئێوەیش خۆتان بە زل ئەزانیو نەئەچوون بە گوێتاناو کۆمەڵێکی تاوانباربوون؟

(٣٢) کە پێیشتان بوترایە: گفتی خوا ڕاستەو قیامەت دێو گومانی تیا نییە، ئەتانوت: ئێمە نازانین قیامەت چییەو تەنها خەیاڵو گومانی ڕووتەو لەوە بەولاوە نییەو، ئێمە لەوە دڵنیا نین کە بەڕاستی قیامەت دێ.

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾

## سُورَةُ الأحقاف

مكية — آياتها ٣٥ — ترتيبها ٤٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾



(٣٣) جا وا خراپیی کردەوەی خۆیانیان بۆ دەرکەوت و، ئەوی بە درۆیان ئەزانیو گاڵتەیان پێ ئەکرد بۆیان ئیسپات بوو و بەڕاستی هاتە پێش چاویان.

(٣٤) پێیان ئەوترێ: ئێمەیش ئێوە فەرامۆش ئەکەین وەك چۆن ئێوە گەیشتن بەم ڕۆژەی خۆتانتان فەرامۆش کردو لە یادی خۆتانتان بردەوە. مەڵبەندو ماوای ئێوە ئاگری دۆزەخەو کەسێکتان نییە یارمەتیتان بدا.

(٣٥) ئەمەیش بەهۆی ئەوەوەیە ئایەتەکانی خواتان کردبوو بە گاڵتەجاڕی خۆتان و گاڵتەتان پێ ئەکردن و ژیانی دنیا لە خۆتانی بایی کردبوون. دەی کەواتە ئەمڕۆ لە ئاگری دۆزەخ دەرناکرێنە دەرەوەو داوایان لێ ناکرێ خوای خۆیان ڕازی بکەن چونکە تازە کاتی خوا ڕازیکردن بەسەرچووە.

(٣٦) کەواتە حەمدوسەنا هەر بۆ خوای پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە کە خوای هەموو جیهانەکانە.

(٣٧) گەورەیی‌و پایەبڵندی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر بۆ خوایەو هەر ئەوە خاوەنی عیززەت و حیکمەتە.

جوزئی بیستوشەشەم

## سووڕەتی (الأحقاف)

**مەککەیی‌یە ئایەتی ١٠و ١٥و٣٥ی نەبێ و، (٣٥) ئایەتە**

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەیە چییە.

(٢) هاتنەخوارەوەی ئەم کتێبە کە قورئانە لەلایەن خوای خاوەن عیززەت و حیکمەتەوەیە.

(٣) ئێمە ئاسمانەکان و زەوی‌و نێوانیانمان لەسەر حەق و ڕاستی‌و لەسەر وادەیێکی دیاری نەبێ دروست نەکردووەو، ئەو کەسانەش کە کافرن و ئینکاری خواو پێغەمبەری خوا ئەکەن خۆیان لائەدەن لەوەی ترسێنراون لێی کە سزای ڕۆژی قیامەتەو، بیری لێ‌ناکەنەوە .

(٤) تۆ، ئەی موحەممەد، بەو کافرانە بڵێ : ئا خەبەرم بدەنێ ئەوەی کە ئێوە بانگیان لێ ئەکەن و ئەیانپەرستن لە غەیری خوا، هیچ شتێکیان لە بەشەکانی زەوی دروست کردووە، یا هیچ بەشدارییەکیان لە ئاسمانا هەیە؟ ئا کتێبێکم بۆ بێنن لەم قورئانە هاتبێتە خوارەوە یا پاشماوەیەکی زانستی پێشینانم پیشان بدەن ئەم مەسەلەیەی تیابێ، ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن.

(٥) کێیە ئەوەی گومڕاترە لەوکەسەی هاوار ناکاتە خواو هاوار ئەکاتە بتێ یا کەسێ کە بەدەنگیەوە نایەت و وەڵامی ناداتەوە ئەگەر هەر لە ئێستاوە تا ڕۆژی قیامەت هاواری لێ بکاو بانگی بکا، چونکە هیچی پێ ناکرێو دەسەڵاتی هیچی نییەو، ئەو بانگو هاوار لێکراوانە تەنانەت لە بانگکردن و هاوارلێکردنەکەی ئەمانیش بێ‌ئاگان؟

وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾



(٦) کە ئادەمزادیش کۆئەکرێنەوە بۆ لێپرسینەوەی کاری دنیایان، ئەم بانگ و هاوار لێکراوانە ئەبن بە دوژمن بۆیان و بەدرۆیان ئەخەنەوە لەوەدا کە پەرستبنیانو دێنە دەنگ و ئەڵێن : ئێمە کەی بۆ ئەوە شیاوین کەس بمانپەرستێ؟

(٧) کە ئایەتەکانی ئێمەیشیان بەسەرا بخوێنرێتەوە کە ڕووناك و دیارن، ئەو کافرانە بەرانبەر بەو قورئانە حەق و ڕاستەی خوا کە هاتووەتە سەریان ئەڵێن : ئەمە جادوویەکی ئاشکراو ڕوونە.

(٨) بەڵکو ئەڵێن: موحەممەد خۆی بەدرۆ هەڵیبەستووە. تۆیش لە وەڵامیانا بڵێ: ئەگەر من هەڵمبەستبێو خوا لەسەر ئەوە سزام بدا، خۆ ئێوە خاوەنی هیچ دەسەڵاتێ نین لە ئاستی خوادا بۆ من. خوا خۆی لە هەمووکەس باشتر ئەزانێ ئێوە خۆتان نوقمی چ لێشاوێکی درۆو دەلەسە کردووە. خوا خۆی بەسە بۆ ئاگاداری لە ئەحواڵ لە نێوان من و ئێوەداو هەر خوا خۆی بەخشندەو بەڕەحمە.

(٩) تۆ، ئەی موحەممەد، بەو کافرانە بڵێ: من شتێکی تازە بابەت نیم لەناو پێغەمبەرانا بۆ شتێکتان بانگ بکەم کە پێغەمبەرانی پێش خۆم خەڵکیان بۆ ئەو شتە بانگ نەکردبێ، یەکێکی هەروەك ئەوانم. ئیددیعای زانینی عیلمی غەیب ناکەم و نازانم چیم لێ ئەکرێو چییش لە ئێوە ئەکرێ، شوێنی هیچ ناکەوم ئەوە نەبێ کە بە وەحی لە خواوە بۆم دێو، لە ترسێنەرێکی ئاشکراو ڕوون زیاتر نیم.

(١٠) تۆ، ئەی موحەممەد، بەو کافرانە بڵێ : پێم بڵێن ئەگەر ئەمەی من بەئێوەی ڕائەگەیەنم کە قورئانە لە خواوە بێو ئێوە ئینکارتان کرد کە لە خواوە بێو شایەتێکی بەنیئیسرائیلی ڕاست بووەوە شایەتی لەسەر وێنەی ئەم قورئانە دا کە ئەو بابەتانەی تەوراتی مووسان کە لەگەڵ قورئانا وەك یەکن و، لەمەوە گەیشتە ئەو ئەنجامە کە قورئانیش لە خواوەیەو ئیمانی پێهێنا کەچی ئێوە هەر لووتبەرزی بنوێنن و ئیمان نەهێنن، ئەنجامەکەی چی ئەبێ لەوە زیاتر کە ئێوە شوێنی ڕاستی ناکەون و خوایش هیدایەتی کۆمەڵە خەڵکێ نادا کە ستەمکاربن.

(١١) کافرەکان بە موسوڵمانان ئەڵێن : ئەگەر ئەو موسوڵمانبوونو ئیمانهێنانەیان شتێکی چاك بوایە پێشمان نەئەکەوتن تیایا. ئێستایش کە هیدایەتی ئەم موسوڵمانبوونەیان دەسگیر نەبوو، ئەڵێن: ئەم قورئانە بوختانێکی کۆنە. (١٢) لە پێش ئەم قورئانەیش تەوراتی کتێبی مووسا پێشەوا بوو بۆ خەڵك و ڕەحمەتی خوا بوو بۆیان. ئەم قورئانەیش کتێبێکی بە زمانی عەرەبی هاتووەو باوەڕ بە ڕاستیی تەورات ئەکاو بۆ ئەوە هاتووە ستەمکاران بتۆقێنێو مژدەی دوارۆژی چاکیش بێ بۆ ئەوانەی چاکە ئەکەن.

(١٣) بێگومان ئەو کەسانەی باوەڕیان هەیەو ئەڵێن خوای تاك و تەنیا پەروەردگارمانەو پاشانیش بەردەوام بوون لەسەر ئەم باوەڕەی خۆیان و پاشگەزنەبوونەتەوە لێی، ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتا ترسیان لەسەر نییەو خەم و خەفەت ناخۆن چونکە ناخۆشییان نایەتەرێو کارێکی ئەوتۆیان لە مەیدانی بیروباوەڕا نەکردووە لێی پەشیمان بن.

(١٤) ئەوانە خاوەنی بەهەشتن و بۆ هەمیشە تیایا ئەمێننەوە لە پاداشی ئەو کردەوە باشانەیانا کە ئەیانکردن لە دنیادا.

وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۖ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾



(١٥) ئامۆژگاریی ئادەمزادمان کردووەو ڕامان سپاردووە کە چاکە بکا لەگەڵ باوك و دایکی : دایکی نۆ مانگ لە ناوسکیا بە دەردوئازارەوە هەڵیگرتووەو بە دەردو ئازاریشەوە لێی بووەتەوەو بوویەتی. هەڵگرتنی لەسکیداو لە شیربڕانەوەی سیی مانگی ڕەبەق ئەخایەنێ. کاتێ ئەگاتە تەمەنی هەرە بەهێزیو عومری ئەبێ بە چل ساڵ ئەو کاتە وای لێدێ بیری بکاتەوەو قەدری ئەو ڕەنج و مەینەتە بزانێ کە دایك و باوکی پێیانەوە کێشاوە. ئەو کاتە ڕوو ئەکاتە خواو ئەڵێ: خوایە وام لێ بکە سوپاسی ئەو نیعمەت و خێروبەرەکەتەت بکەم کە داوتمێ و بە باوك و دایکمت داوەو توانی ئەوەم بۆ بڕەخسێنە کارێکی چاکی وا بکەم تۆ لێی ڕازی بیو، نەوەم بکە بە نەوەیەکی چاك و خوا پەرست و خزمەتگوزارو، وا من پەشیمان بوومەوە لەهەر خراپەیێ کردبێتم و گەڕامەوە بۆ لای تۆو من لە موسوڵمانانم.

(١٦) ئەوانەن ئەو کەسانەی باشترین کردەوەکانیان لێوەرئەگرین و لە خراپەو کەموکورتییان خۆش ئەبین و لەناو ئەهلی بەهەشتیانا دایئەنێین بەپێی ئەو گفتە ڕاستەی لە دنیادا گفتیان پێ ئەدرا.

(١٧) ئەوکەسەی کەوا بە باوك و دایکی خۆی ئەوت: هاوار لە عەقڵی ئێوە ! وەعدی ئەوەم ئەدەنێ کەوا لەو دنیا زیندوو ببمەوەو لە گۆڕ بێمە دەرەوە، کەچی چەندین سەدە لەپێش منەوە خەڵك مردوون و کەسیان زیندوو نەبوەتەوە، واتە : شتی وا چۆن ئەبێ؟ باوك و دایکیشی لە خوا ئەپاڕانەوە کە بیخاتە سەر ڕێی ڕاست و، پێیان ئەوت: هەتیو، بەدبەخت! ئیمان بێنەو با بەسیبێ کوفرکردن! ئەو گفتەی خوا داویە ڕاستەو دێتەدی. ئەویش لەجیاتیی ئەوەی تۆبە بکاو پاشگەز ببێتەوە لەو کوفرکردنانەی، ئەیوت: ئەمەی ئێوە ئەیڵێن لە ئەفسانەو پڕوپووچی پێشینان بەولاوە نییە.

(١٨) ئەم کابراو کەسانی وەك ئەم کەسانێکن ئەو بڕیارەی خوایان تیا جێبەجێ ئەکرێ کە لەگەڵ ئوممەتی پێش ئەوانیشا جێبەجێ ئەکرێ لە جنۆکەو ئادەمزاد کە ئەوەتە دۆزەخیان لێ ئەئاخنرێ. ئەمانە کەسانێك بوون هەر لە سەرەتاوە دۆڕاندبوویان و زەرەرمەند بووبوون.

(١٩) بۆ هەر تاقمێ لەمانە، موسوڵمانیان و کافریان، پلەوپایەی خۆیان هەیە لە پاداش و سزا لە بەرانبەر ئەو کردەوە چاك یا خراپانەدا کە کردوویانن و هەرکەسە خوا هەقی خۆی ئەداتە دەست و کەسیان ستەمی لێناکرێ.

(٢٠) بیر لەو ڕۆژە بکەنەوە کە کافران ئەبرێنە بەر ئاگری دۆزەخ و پیشانی ئەو ئاگرە ئەدرێن و پێیان ئەوترێ : ئێوە ئازو نیعمەتی خۆتانتان هەر لە ژیانی دنیاتانا بۆ خۆتان بردو لەزەتتان لێ وەرگرت. ئەمڕۆ ئیتر ئەو سەردەمە بەسەرچووە. دەی سزای خۆتان وەرگرن کە مایەی سەر شۆڕیو سەفیلیتانە، بەهۆی ئەوەوە کە لە دنیادا خۆتان بە ناحەق بە زل ئەزانیو فەرمانی خواتان بەجێنەئەهێناو لە ئەستۆتان نەئەگرت.

۞ وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ آلِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ وَلَٰكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾



(٢١) باسی هوودی برای خێڵی عاد بکە کە خێڵەکەی خۆی لە وڵاتی ئەحقاف ترساندو بەر لەویش و لە سەردەمی ئەویشا پێغەمبەرانی تر بەسەرچووبوون و هەمان پەیامیان بە خەڵکەکاندا ڕاگەیاندبوو، باسی هوود بکە کە بە خێڵەکەی خۆیی وت : لە خوا بەولاوە کەسی‌تر مەپەرستن، من ترسی سزای ڕۆژێکی سەختم بۆ ئێوە هەیە کە داتانپلۆسێو کەس بەفریاتان نەگا.

(٢٢) ئەوانیش لەجیاتیی ئەوەی گوێی بۆ شل بکەن و بە فەرمانی بجووڵێنەوە، وایان وەڵام دایەوە پێیان وت: ئایا تۆ هاتووی بۆلامان بۆئەوەی لە خواکانی خۆمانمان هەڵبگێڕیتەوە ، دەی سا ئەو سزایەمان بۆ بهێنە کە ئەڵێی بۆمان دێ ئەگەر لە ڕاستگۆیانی.

(٢٣) هوودیش پێی‌وتن: خوا خۆی ئەزانێ کەی ئەو سزایەتان بۆ دێ، من هیچی لێ نازانم. کاری من ئەوەیە ئەو پەیامەی خوا پیایا ناردووم پێتان بگەیەنم و، من بە خێڵێکی نەفام و نەزانتان ئەزانم.

(٢٤) جا کە غەزەبەکەی خوایان دی لە شێوەی پەڵەهەورێکا هاتبوو ڕووی کردبوە چەم و شیوەکانیان کە کشتوکاڵیان تیایانا ئەکردو ئاژەڵیان تیایانا ئەلەوەڕاند، وتیان: ئەمە هەورێکە هاتووە بارانمان بۆ ببارێنێ. نەخێر هەورێ نییە هاتبێ بارانتان بۆ ببارێنێ. ئەو غەزەبەی خوایە کە پەلەپەلتان بوو هەر ئەتانوت : بۆ نەهات؟ بایەکە سزایەکی سەختی بەدەمەوەیە بۆتان.

(٢٥) بەسەر هەر شتێکا هەڵکا بە فەرمانی خوای خۆی وێرانی ئەکاو ، هات بەسەریاناو بە جۆرێ بەربادو تەفروتووناکردن وایان لێ‌هات لە خانوەکانیان بەولاوە هیچیان بەرچاوی کەس نەئەکەوت. ئێمە سزای خێڵی تاوانباران بەم جۆرە ئەدەینەوە.

(٢٦) ئێمە بەڕاستی ئەو خێڵی عادەمان بە جۆرێ دامەزراندبوو و پایەو مایەو هێزو سامانمان دابوونێ، وەزعی وامان بۆ ئێوە نەلواندووەو، گوێچکەو چاوو دڵمان دابوونێ پێیان ببینن و بیربکەنەوەو تێبگەن، کەچی نە گوێیان و نە چاویان و نە دڵیان سوودی هیچیان نەبوو بۆیان چونکە ئینکاری ئایەتەکانی خوایان ئەکردو، ئەگەر سوودیان ببوایە ئینکاریان نەئەکردن لەبەرئەوە ئەو شتەی گاڵتەیان پێ‌ئەکرد کە عەزابی خوا بوو، هات بەسەریاندا.

(٢٧) بەڕاستی ئێمە ئەو دێهاتانەمان بەرباد کرد کە بە دەوروبەری ئێوەدان، ئەی خەڵکی مەککە، چەندین نیشانەی غەزەب و تووڕەیی خۆمانمان پیشان دان بەڵکو لەو ڕەوشتەیان پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا.

(٢٨) دەی بۆ ئەو بتانەی ئەو کافرانە لە خوار خواوە کردبوونیان بە خوای خۆیان بە مەبەستی نزیکبوونەوە لە خوا بەهۆی ئەوانەوە، بۆ یارمەتییان نەدان و بەفریایان نەگەیشتن؟ بەڵکو ون بوون لێیان و، ئەوەیش بوختانەکەیان بوو و ئەو بوختانە بوو کە ئەیانکرد.

وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءُ ۚ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ ۖ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٤﴾ فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ ۚ بَلَاغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٣٥﴾

## سُورَةُ مُحَمَّدٍ

آياتها ٣٨ — مدنية ٤٧



(٢٩) باسـی ئـەوەیش بکـە کـە چـەند کەسێکمان لە جنۆکە بادایەوە بەلای تۆدا هاتبوون گـوێ بـۆ خوێنـدنی قورئـان شـل بکـەن. کاتـێ هاتنـە مەجلیسـی قورئـان خوێندنەکەوە بە یەکتریان وت : بێ‌دەنگ بـن و گـوێ شـل کـەن بـا بیبیسـین. کـە قورئانخوێندنەکە بڕایەوە، گەڕانەوە بۆ ناو خێڵەکـەی خۆیـان بـۆ ترسـاندنیان لـە موسوڵمان‌نەبوون و بێ‌فەرمانیی خوا.

(٣٠) بە خێڵەکـەی خۆیانیـان وت : ئـەی عەشرەتەکەمان ! بەڕاستی ئێمـە گوێمـان لـە خوێندنـەوەی کتێبێـك بـوو پـاش سەردەمی مووسا هاتووەتەخوارو هەرچی کتێبێ لەپێش خۆیا نازڵ بووە بۆسەر هەر پێغەمبەرێ ئـەم باوەڕی پێ‌ئـەکاو خـەڵك ڕێنمایی ئەکا بـۆ ڕاستیو بـۆ ڕێگایـەکی ڕاست کە ڕێگای خوابەیەکزانینە.

(٣١) ئـەی خێڵەکـەی خۆمـان! بـەدەم بانگەوازی خواوە بڕۆن و ئیمانی پێ‌بهێنن با ئەویش لە گوناهەکانتان خۆش ببێو لە سزایەکی پـڕ ئـێش و ئـازار پـەناتان بـدا.

(٣٢) هەرکەسـێکیش بـەدەم بانگـەوازی خواوە نەچێو گـوێی بـۆ شـل نـەکا، خـۆ ناتوانێ خوا بێ‌دەسەڵات بکا لەم سەرزەوییەداو، کەسیش شك نابا پشت و پەنای بێ ئەگەر خوا خۆی پشت و پـەنای نەبێ. ئەوانە کە گوێ بۆ بانگەوازی خوا شل ناکەن لە گومڕاهییەکی ئاشکراو دیاردان.

(٣٣) ئایا ئەمانە نابینن کەوا ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووەو بە دروست کردنیانەوە ماندوو نـەبوە ، ئەیشتوانێ مردوو زیندوو بکاتەوە؟ بەڵێ وەڵلا، ئەتوانێ زیندووی بکاتەوەو بەڕاستی ئەو دەسەڵاتی بەسـەر هـەموو شتێکا ئەشکێ.

(٣٤) باسی ئەو ڕۆژەیش بکە کە کافرەکان ئەبرێنە سـەر ئـاگری دۆزەخ و پیشـانیان ئـەدرێ کـە ئـاگرێوا بـۆ کـافران ئامادە کراوە لەو دنیاداو پێیان ئەوترێ : ئەم ئاگرە ڕاست نییە؟ ئەوانیش ئەڵێن : بەڵێ وەڵلا، ڕاستە. خوایش ئـەوجا پێیان ئەڵێ: دە کەواتە بەرانبەر بەوەی لە دنیادا کفرتان ئەکرد سزاو عەزابی دۆزەخ بۆخۆتان بچێژن.

(٣٥) کەواتە تۆ ، ئەی موحەممەد! خۆت ڕاگرە لەسەر دەردو ئازاری ئەم کافرانە وەك چۆن پێغەمبەرە ئولولعەزمـە دڵ قایمەکانیتر خۆیان ڕاگرت و، پەلەی هاتنی سزای خوایان بۆ مەکە ، بێ‌گومان ئەو سزایە سەرەنجام هەر دێتە سەریان. ئەو ڕۆژەی کە ئەو سزایەی وەعدەیان پێ‌دراوە بێتە سەریان، بەچاوی خۆیان ئەبینن، لەبەر ناڕەحەتی و سـەختیی ئـەو سزایە وا ئەزانن سەعاتە وەختێ نەبێ لە جیهانا نەماونەتەوەو نەژیاون، ئەمەی پێتان ڕائەگەیەنم تەبلیغێکە لـەخواوە پێتانی ڕائەگەیەنم. جا ئاخۆ لە کۆمەڵی تاوانبارانی لەڕێگالاداو بەولاوە، کەس بەرباد ئەکرێ؟

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿١﴾ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُوا۟ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن
رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ
ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ ﴿٣﴾ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ
إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ
أَوْزَارَهَا ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم
بِبَعْضٍ وَٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ
وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ ٱلْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ إِن تَنصُرُوا۟ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٩﴾ ۞ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلِلْكَٰفِرِينَ أَمْثَٰلُهَا ﴿١٠﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿١١﴾



## سوورەتی (محمد)

**مەدینەیی‌یە ئایەتی ١٣ی نەبێ و، (٣٨) ئایەتە**

(١) ئەوانەی کافر بوون و بەری خەلکیان گرتووە لەوە کە بە ڕێگای خوادا بڕۆن کە ئایینی ئیسلامە، ئەوانە هەر کردەوەیەکی باشیشیان کردبێ خوا بە فیڕۆی داوە، چونکە کردەوەی چاکیش لەگەڵ کافریدا هیچ سوودێ نابەخشێ.

(٢) ئەوانەیش کە ئیمانیان هێناوە بە خواو کردەوەی چاکەیان کردووەو ئیمانیان هێناوە بەو قورئانەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆسەر موحەمەد کە ئەو قورئانەیش ڕاستەو لە خوای خۆیانەوە هاتووە، ئەوانە خوا کردەوەی خراپیان بە ئیمانەکەیان دائەپۆشی و حاڵیان باش ئەکا.

(٣) ئەمەیش بۆیە وایە، واتە بۆیە کوفر کردەوەی چاکە بێ‌مایە ئەکاو، ئیمان خراپە دائەپۆشێ، چونکە ئەوانەی کافرن شوێنی شتی هیچوپووچ کەوتوون و ئەوانەی ئیمانیان هێناوە پەیڕەوییان لە ڕاستی کردووە کە لەلای خواوە هاتووە. خوا ئاوەها نموونە بۆ خەڵك ئەهێنێتەوە لە حاڵ و وەزعی خۆیان کە تاقمێ کافرو تاقمێ موسوڵمانن.

(٤) جا کاتێ کە لەگەڵ کافران لە جەنگا ڕوویەڕوو بوونەوەو بەیەك گەیشتن لە گەردنیان بدەن تا کاتێ کە زۆرتان لێ کوشتن و بە زاندتانن و ماوەکانیانتان بەدیل گرت توند بیانبەستنەوە بۆئەوەی ڕانەکەن، جا دوای بڕانەوەی جەنگەکە یا بە پیاوەتی بەرەڵڵایان ئەکەن و منەتیان ئەنێنە سەر یا ئەیانگۆڕنەوە بە دیلی خۆتان لای ئەوان و ئەوانەی خۆتانیان لای ئەوان پێ ئازاد ئەکەن. ڕێگای مامەڵە لەنێوان موسوڵمانان و کافرانا وایە تا ئەو ڕۆژەی جەنگ بە یەکجاری ئەبڕێتەوەو باری قورسی خۆی لەکۆڵ دائەگرێ و، کەس لەم جیهانەدا نامێنێ دوو جۆر نەبێ یا موسوڵمان یا کافری ئاشتیخوازو جەنگ نەکەر. ئەگەر خودا مەیلی لێ بوایە موحتاجی ئەوەی نەئەکردن بچنە جەنگەوە لەگەڵ کافران و هەر بۆخۆی حەقی لێ ئەسەندن و بەربادی ئەکردن، بەڵام مەیلی وا نییەو ئەیەوێ هەندێکتان بە هەندێکتان واتە موسوڵمانان بە کافران تاقی بکاتەوەو دەرەکەوێ ئاخۆ تاقەت و توانی ئەوەیان هەیە لە ڕێی خوادا بچن بۆ غەزاو لە ڕێگای ئایینی ئیسلاما گیانی خۆیان بەخت بکەن و، ئەوانەی لە ڕێگای خوادا کوژراون خوا قەت کردەوەکانیان بە فیڕۆ ناداو بێ مایەی دەرناکا.

(٥) خوا ڕێگای دەرگای بەهەشتیان پیشان ئەداو کاروباریان بۆ چاك ئەکا.

(٦) ئەیشیانخاتە ناو بەهەشتەوەو بۆیشی باس کردوون کەوا بەهەشت چۆنە.

(٧) ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هێناوە ئەگەر ئێوە یارمەتیی خوا بدەن، خوایش یارمەتیی ئێوە ئەداو پێتان لە مەیدانی غەزادا لە دژی کافران قایم ئەکاو ئەچەسپێنێ. (٨) ئەوکەسانەیش کە کافرن ئەوە ئازارو زەحمەت بەشیان بێ و خوا کردەوەیان بە هیچوپووچ دەرکا. (٩) ئەمەیش لەبەرئەوەیە خۆشیان لەو کتێبانە نایەت کە خوا لە ئاسمانەوە ناردوونیەتە خوارەوەو، خوایش لەبەرئەوە ڕەنج بە خەسارو مایە پووچی دەرکردوون.

(١٠) ئایا ئەمانە نەگەڕاون بە زەویدا بۆئەوە سەیرکەن سەرەنجامی ئەو کەسانە چۆن بووە کە لەپێش ئەوانا بوون؟ خوا ماڵەکانیانی بەسەرا کاول کردن و، بۆ کافرانی لە چەشنی ئەوانیش کە لەم چەرخەدا هەن چەند قاتێ لە وێنەی ئەو ماڵوێرانییە هەیە. (١١) ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کە خوا پشت و پەناو یارمەتیدەری ئەوانەیە کە ئیمانیان هێناوەو کاری چاکیان کردووەو، کافرانیش کەس دۆست و پشت و پەناو یارمەتیدەریان نییە.

إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن
تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ
وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ
ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ
مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم ﴿١٤﴾ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ
ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ
يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ
وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ
وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ
حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ
أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ
ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا
ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ
ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ
وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾



(١٢) ئەو کەسانەی کەوا ئیمانیان هێناوەو کاری چاکیان کردووە، خوا ئەیانخاتە بەهەشتی واوە جۆگەو ڕووباری سافی لەبنەوە ئەڕواو، ئەوانەیش کە کافرن ڕائەبوێرن و وەك چوارپێ بۆخۆیان ئەلەوەڕێن و سەرەنجامیش ئاگری دۆزەخ ماواو مەنزڵیانە.

(١٣) زۆر ئاوەدانیی وا هەبوون لە ئاوەدانییەکەی تۆ بەهێزتر بوون کە بوو بە مایەی دەرکردنت لە مەککەو کۆچکردنت بۆ مەدینە، هەموومان بەرباد کردن و کەس یارمەتیدەریان نەبوو و بە فریایانا نەگەیشت.

(١٤) ئایا کەسێ کە بەڵگەو دەلیلی ڕوونی لە خوای خۆیەوە بە دەستەوە بێ وەك کەسێ وایە کردەوەی ناشیرینی خۆی لە پێش چاو جوان کرابێ و شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆی کەوتبێ؟

(١٥) نموونەی ئەو بەهەشتەی گفتی بەوانە پێ دراوە کە خۆیان لە کوفرو گوناه ئەپارێزن، ئەوەیە جۆگەو ڕووباری ئاوی بۆگەن نەکردوو و جۆگەی شیری تام نەگۆڕاوو جۆگەی شەرابی مایەی لەزەت و خۆشی بۆ ئەوانەی ئەیخۆنەوەو، جۆگەی هەنگوینی پاڵفتەکراوی تیایە. هەموو جۆرە میوەیەکیشی بۆیان تیایە لەگەڵ عەفوو لێبووردن لە خوای خۆیانەوە. جا ئایا کەسانێ خوا بەهەشتی وای دابنێ وەك ئەوانە وان هەمیشە لەناو ئاگرا ئەمێننەوەو ئاوی کوڵ بەکوڵیان ئەکرێ بە گەروودا کە ڕیخۆڵەیان دائەفرەتێنێ؟

(١٦) ئەم منافقانە هیی وایان تیایە دێ گوێت بۆ شل ئەکا کە قسە ئەکەی تا کاتێ کە لای تۆ هەڵئەسن و ئەچنە دەرەوە ئەڵێن بەو کەسانەی کە زانیارییان پێ دراوەو شت ئەزانن، کە مەبەست لێیان شارەزایانی ناو هاوڕێکانی پێغەمبەرن، بۆ گاڵتە پێکردن پێیان ئەڵێن: ئەوە ئێستا موحەمەد چیی وت؟ ئەمانە ئەوکەسانەن کە خوا دڵ و دەروونی مۆرکردوون و ئیتر قسەی چاك ناچێتە دڵیان و شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆیان کەوتوون.

(١٧) ئەو کەسانەیش کە کەوتوونەتە سەر ڕێی ڕاستی موسوڵمانەتی و هیدایەتیان وەرگرتووە، خوا هیدایەتیان بۆ زیاتر ئەکاو هێزی خۆ لەگوناەپاراستنیان ئەداتێ.

(١٨) ئایا ئەو کافرانە چاوەڕێی شتێکیتر ئەکەن لە ڕۆژی قیامەت بەولاوە لەپڕ بێتە سەریان؟ ئەوەتا نیشانەکانی هاتوون و هاکا خۆیشی هات. جا چۆن بیریان بۆ ئەکرێتەوە کە هاتە سەریان؟

(١٩) جا تۆ باوەڕو متمانەت بێ کە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی نییە لە خوا بەولاوەو داوای لێبووردن لە خوا بکە بۆ گوناهی خۆت و بۆ هەموو موسوڵمانان لە پیاوو لە ئافرەت و، خوا خۆی شوێنی هەڵسووڕان و ئۆقرەگرتنتان ئەزانێ کە دنیاو قیامەتە.

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ ۖ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ ۙ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ ۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ۙ ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ ۖ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُوا۟ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾



(٢٠) خاوەن ئیمانەکان ئەڵێن: ئەوە بۆچی سوورەتێ نەهاتووەتە خوار فەرمانی غەزای کافران بدا؟ جا کە سوورەتێکی ئاشکراو بێپێچوپەنا هاتە خوارو باسی جەنگی تیا کرابوو، واتە فەرمانی غەزاکردنی تیا بوو، ئەبینی ئەوانەی دڵیان کرمۆڵەو نەخۆشیی تیایە وەك کەسێ سەیرت ئەکەن بێهۆشیی نزیکبوونەوەی مەرگی بەسەرا هاتبێ، دەسا هاوار بۆ ئەوانە.

(٢١) ئەرکی سەرشانی ئەوانە ئەوەیە بە گوێی فەرمانی خواو پێغەمبەر بکەن و قسەیەکی چاك بکەن وەك ئەوە کە بڵێن: ئامادەین بۆ هەموو فەرمانێ. جا کاتێ مەسەلەکە بوو بە ڕاست و بڕیاری غەزادرا، ئەگەر لەگەڵ خوادا ڕاستیان بکردایە کە باسی ئامادەیی خۆیانیان بۆ غەزا کرد، باشتر ئەبوو بۆیان.

(٢٢) دەی ئاخۆ لەوانەیە ئەگەر پشتتان لە جێبەجێکردنی فەرمانی غەزاکردن هەڵکرد بکەونە وێرانکاریو ڕیشەو ڕەچەڵەکی خۆتان بنبڕ بکەن؟ واتە ئێوە کە لەگەڵ خوای خۆتان ڕاست نەبن و فەرمانی غەزای بۆ بەجێ نەهێنن لەوانەیە یاخی بن و دەس کەن بە تاڵان و چەپاوکردنی ماڵی خەڵك و قەلاچۆکردنی خۆتان لەناو خۆتانا.

(٢٣) ئەو جۆرە کەسانە کەسانێکن خوا لەعنەتی لێ کردوون و لە ڕەحمەتی خۆیی دوور خستوونەتەوەو کەڕو کوێری کردوون. (٢٤) ئەمانە بۆ بیر لە قورئان ناکەنەوەو لێی ورد نابنەوە تا لێی حاڵی بن، یان دڵیان قوفڵی لێ دراوەو کلیل و کلۆم کراوەو هیچی تێ ناچێ؟

(٢٥) بێگومان ئەوانەی پاشەوپاش گەڕاونەتەوە دوای ئەوەی کە هیدایەتیان بۆ دەرکەوت کە ئایینی ئیسلامە، ئەوانە شەیتان ئەو کردەوەی لا جوان کردوون و هیواو ئاواتی خۆشی خستووەتە بەردەمیان.

(٢٦) ئەمەیش لەبەر ئەوەیە وتبوویان بەوانەی خۆشیان لەو قورئانە نایەت کە خوا ناردوویەتیە خوار: ئێمە لەمەولا لە هەندێ کارا بە گوێتان ئەکەین و، خوایش ئاگای لە ڕازو نهێنکارییەکانیان هەیە. ئەوانەی خۆشیان لە قورئان نەهاتووە جوولەکەکانی مەدینەن و، ئەوانەیش کە بەوانیان وتووە: بە گوێتان ئەکەین منافقە دووڕووەکانن و، ئەو کارەیش کە بە گوێیان ئەکەن تیایا بەشداری‌نەکردنە لە غەزادا شان بە شانی پێغەمبەرو موسوڵمانان بەرانبەر بە کافرەکان. (٢٧) ئەی ئەبێ حاڵیان چۆن بێ و چی بکەن کاتێ کە فریشتەی گیانکێشان گیانیان ئەکێشن، ئەدەن بەسەرو چاوو ڕووی خۆیان و بەلاقنگیانا؟ واتە: ئەی ئەوکاتە چۆن خۆیان لەدەست مردن دەرباز ئەکەن، خۆ ئەویش غەزا نییە خۆیانی لێ بدزنەوەو نەچن بۆ بەشداری تیا کردنی؟

(٢٨) ئەمەیش لەبەر ئەوەیە ئەم منافقە دووڕووە بەدەم‌موسوڵمان و بەدڵ‌کافرانە شوێنی ئەو کردەوانە ئەکەون کە خوا خۆشی لێیان نایەت و حەز بە ڕەزامەندیی خوا ناکەن، بۆیە خوایش کاروکردەوەی ئەوانی پووچ و بێ مایە کردووە. (٢٩) یاخێر، ئەمانەی نەخۆشی لە دڵیانایەو دڵیان کرمۆڵە وا گومان ئەبەن خوا ئەو کینەیەی لە دڵیانایە دەری ناخاو پەردەی لە ڕوو لانادا؟

وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّوا۟ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٣٢﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓا۟ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾



(٣٠) ئەگەر مەیلمان لیٚ بووایە ئەوانەمان پیشانت ئەداو تۆیش بە سەرو سیمایانا ئەتناسین و ئێستایش بە قسەوەرچەخاندنیانا ئەیانناسی کە لە جیاتیی ئەوەی بە ئاشکرا قسە بکەن بەمەعناوە قسە ئەکەن و، خوا ئاگای لە کارو کردەوەی هەمووتانە.

(٣١) بەڕاستی ئێمە گیرۆدەی دەردو بەڵاتان ئەکەین و تاقیتان ئەکەینەوە تا بزانین کێتان لەڕێی خوادا تێئەکۆشێ و خۆی لەسەر دەردو مەینەت ئەگرێو، تا بەراوردی دەنگوباس و حاڵ و ئەحواڵتان بکەین و بزانین هەر یەکێکتان ئەڵێ چی و چی ئەکا؟

(٣٢) بەڕاستی ئەوکەسانە کەوا کافرن و ڕێ لە خەڵك ئەگرن و ناهێڵن ڕێگای خوا بگرنەبەرو دەمبازی لە ئاست پێغەمبەرا ئەکەن پاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوتووە ڕێگای خواناسی کامەیە، ئەوانە هیچ زیانێ بە خوا ناگەیەنن و هیچیان لە دەست نایەت و خوایش مایەپووچیان ئەکاو هەرچییان کردووە ئەیدا بە با.

(٣٣) ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە! فەرمانبەرداریی خواو پێغەمبەری خوا بکەن و کارو کردەوەی چاکی خۆتان بە نافەرمانیی پێغەمبەر بێئایەومایەمەکەن.

(٣٤) بێگومان ئەوانەی کافر بوون و ڕێگایان لە خەڵك گرتووە کە ڕێی خوا بگرنەبەرو پاشانیش بە کافری مردوون، ئەوانە خوا نایانبەخشێ و لێیان خۆش نابێ.

(٣٥) هەرگیز سست مەبن بانگیان بکەن بۆ ئاشتی، ئەوەك گومانی ئەوەتان پێ بەرن ئەو ئاشتیخوازییەتان لە لاوازی و بێکارەییتانەوەیە. ئێوە بەرزو باڵان و لە سەرەوەن ئەوەك ئەوان و، خواتان لەگەڵەو خوا هەرگیز کارتان پووچو بێمایە ناکا.

(٣٦) ژیانی دنیا تەنها هەر گاڵتەبازی و فەرامۆشکارییەو، ئێوە ئەگەر خاوەن باوەڕبن و خۆتان لە گوناە بپارێزن خوا پاداشی خۆتانتان ئەداتەوەو داوای ماڵ و داراییەکانیشتان لیٚ ناکا.

(٣٧) ئەگەر خوا داوای پارەو داراییتانتان لیٚ بکاو سوور بێ لەسەر داواکەی و هەر دەسبەردار نەبێ، ئێوە ڕژدی پیشان ئەدەن و کە وایشتان کرد خوا بەم کارەتان ئەوەی لە دڵتانایە لە پیسکەییو پوولەکییەتیو پارەپیسیو دنیادۆستی هەمووی دەرئەخاو خەڵك هەموو پێتان ئەزانن.

(٣٨) ئەوەتا ئێوە ئێستا بانگ ئەکرێن بۆئەوە دارایی لە ڕێی خوادا خەرج بکەن و هیی واتان تیایە پیسکەیی ئەکاو هیچ لەڕێی خوادا خەرج ناکاو، هەرکەسیش پیسکەیییەکەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە. خوا دەوڵەمەندەو موحتاجی کەس نییەو ئێوە هەموو موحتاجن و، ئەگەر ئێوە پشت لە خوا هەڵکەن خوا خەڵکانێکی تر لەجیاتیی ئێوە دێنێ و لەجێی ئێوەیان دائەنێ و ئیتر ئەوانە وەك ئێوە نابن فەرمانبەرداریی خوا ئەکەن.

## سُورَةُ الفَتْحِ

ترتيبها ٤٨ — آياتها ٢٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَٰنًا مَّعَ إِيمَٰنِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ لِّيُدْخِلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٨﴾ لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾



## سوورەتی (الفتح)

مەدینەیی‌یەو، (٢٩) ئایەتە

(١) بەڕاستی ئێمە، بەهۆی سولحی حودەیبییەوە، دەرگای فوتووحاتمان لە وڵاتی عەرەبستانا بۆ کردیتەوە. یاخود گفتی ئەوەت ئەدەینێ بە گرتنێکی دیارو ئاشکرا مەککە بگری و، ئەوەبوو گرتی.

(٢) بۆئەوەی، بەهۆی ئەو تێکۆشانەتەوە لە پێناوی بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلاما، خوا لە گوناهی لەمەوپێش و لەمەوپاشت خۆش ببێ. مەبەست لە گوناهی پێغەمبەران هەر کردەوەیەکە، بەش بەحاڵی ئەوان، بۆ ئەوە بشێ سەرزەنشتیان بکرێ لەسەری.

(٣) بۆ ئەوەیش کە خوا بە سەرکەوتنێکی بەهێز بەسەر دوژمنانتا سەربخا.

(٤) خوا ئەو خوایە ئارامی‌و متمانەی ناردە خوارەوە بۆ سەر دڵی موسوڵمانان تا لە جەنگا لەگەڵ کافران دڵەکوتەیان پێ‌نەکەوێ و لەوە نەترسن کەو ئەو کافرانە زاڵ ببن بەسەریاناو باوەڕیان بە خوای خۆیان زیاد لەوەی کە هەیانە زیاترو قایمتر ببێ. سەربازو لەشکری ئاسمانەکان و زەویش هیی خوان و، خوا بە هەموو شتێ ئەزانێ و خاوەنی حیکمەتە.

(٥) خوا بۆیە موسوڵمانانی زاڵ کرد بەسەر کافرانا تا قەدری نیعمەتی خوا بزانن بەسەریانەوەو سوپاسی نیعمەتی بکەن و، ئەویش موسوڵمانان بە پیاوو ئافرەتیانەوە بخاتە ناو بەهەشتگەلێکی واوە جۆگاو ئاو بە بەینیانا ئەڕواو هەمیشە لەو بەهەشتانەدا ئەمێننەوەو، گوناهەکانیان داپۆشێ‌و، ئەمەیش بەلای خواوە بەهرەیەکی مەزنە.

(٦) تا سزای پیاوان و ژنانی منافق و دووڕوویش بدا کە بە دەم موسوڵمان و بە دڵ کافرن و، سزای ئەو پیاوو ژنانەیش بدا کە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن و گومانی خراپ بە خوا ئەبەن و ئەڵێن: خوا یارمەتیی پێغەمبەرو موسوڵمانان نادا. هەموو ئەو خراپەی کافرەکان بۆ پێغەمبەرو موسوڵمانانیان ئەوێ، خوا بەسەر خۆیانیانای ئەهێنێتەوەو، غەزەبی لێ گرتوون و لە ڕەحمەتی خۆیی دوورخستوونەتەوەو دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون کە سەرەنجامێکی ئێجگار زۆر خراپە.

(٧) لەشکری ئاسمانەکان و زەوی هەر هیی خوایەو خوا خاوەن عیززەت و حیکمەتە.

(٨) ئەی موحەممەد! ئێمە تۆمان ناردووە بۆ ئەوەی ببی بە شایەت لەسەر گوفتارو کرداری ئوممەت و، مژدەی بەهەشتیان بدەیتێ ئەگەر فەرمان بەرداریی خوا بکەن و، لە سزای خوایان بترسێنی کە لە ڕۆژی قیامەتا سزایان ئەدا ئەگەر گوێی بۆ شل نەکەن.

(٩) بۆ ئەوەی ئیمان بە خواو بە پێغەمبەری خوا بهێنن و بە بەهێزکردنی ئایینەکەی بەهێزی بکەن و قەدرو حورمەتی بگرن و قورس تەماشای بکەن و بەیانی و ئێوارە لە هەموو ناتەواوییەك پاك و خاوێنی ڕابگرن.

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلْمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا۟ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾



(١٠) بێ‌گومان ئەوانەی بەیعەتت پێ ئەکەن و دەست ئەخەنە ناو دەستت، ئەوانە بەیعەت بە خوا ئەکەن و دەست ئەخەنە ناو دەستی خواو دەستی خوا لە بانی دەستیانە. جا هەر کەسێ ئەو بەیعەت و پەیمانە بشکێنێ ئەوە بە زیانی خۆی ئەیشکێنێ و، هەر کەسێکیش بە وەفا بێ بۆ ئەو بەیعەت و پەیمانەی عەهدی لەگەڵ خوا کردووە لەسەری ئەوە خوا پاداشێکی مەزنی ئەداتەوە.

(١١) بێ‌گومان، ئەو عەرەبە دەشتەکییانەی پاش کەوتن و بەدەم بانگەوازەوە نەهاتن بۆ غەزای بتپەرستەکانی قورەیش لە صولحی حودەیبییەدا، کە چاویان پێت کەوتەوە پێت ئەڵێن: ماڵ و دارایی و ژن و منالّمان خەریکیان کردین و نەمانتوانی بێین لە غەزادا بەشداری بکەین. ئەمانە بە زوویان شتێ ئەڵێن کە لەناو دڵیانا نییەو باوەڕیان پێی نییە. جا تۆیش لە وەڵاما پێیان بڵێ: کێ دەسەڵاتی خوای هەیە بەرانبەر بە ئێوەو ئەتوانێ بیگێڕێتەوە ئەگەر ئەو بییەوێ زیانێکتان پێ بگەیەنێ یا ئەگەر بییەوێ قازانجێکتان بێنێتەڕێ؟ بەڵام خوا خۆی خەبەرداره لە هەرچی ئێوە ئەیکەن و ئەزانێ بۆچی نەهاتن و، بڕو بیانوو داد نادا لای.

(١٢) ئێوە لەبەر ئەوە نەبوو نەهاتن بۆ غەزاو بەشداریتان تیا نەکرد کە بە ماڵ و دارایی و ژن و منالّتانەوە خەریك بوون. لەبەر ئەوە بوو کە گومانتان وابوو هەرگیز پێغەمبەرو موسوڵمانان بە ساغی لەم غەزایە ناگەڕێنەوە بۆ ناو کەسوکاریان و ئەم گومانە لە دڵتانا ڕازێنرابووەوەو گومانی خراپیان بردو تاقمێکی فەوتاوو ڕەنجبەخەساربوون لای خوا چونکە بیروباوەڕێکی بۆگەنتان هەیە.

(١٣) هەرکەسێکیش ئیمانی بەخواو پێغەمبەری خوا نەبێ کافرەو، ئێمەیش ئاگری دۆزەخمان بۆ کافران ئامادە کردووە.

(١٤) مولکی ئاسمانەکان و زەوی هیی خوایەو، خوایش مەیلی لە بەخشینی هەرکەس بێ ئەیبەخشێ و مەیلی لە سزادانی هەرکەسیش بێ سزای ئەداو، هەمیشەیش خوا بەخشندەو بە ڕەحمە.

(١٥) بێ‌گومان ئەو عەرەبە دەشتەکییانەی پاش کەوتن و بەدەم بانگەوازی غەزاوە نەهاتن و بەشدارییان تیا نەکرد، ئەڵێن: ئەگەر لەمەولا جارێکی تر چوون بۆ دەسکەوت و غەنائیمی جەنگ، لێمان گەڕێن با ئێمەیش بکەوینە دووتانو لەگەڵتان بێین. ئەمانە ئەیانەوێ فەرموودەی خوا بگۆڕن کە فەرموویە: نابێ هەرگیز لەگەڵتان بێن. تۆیش پێیان بڵێ: هەرگیز ناکەونە دوومان و لەگەڵمان نایەن. خوا پێشتر وای فەرمووە. ئەنجا ئەوان پێتان ئەڵێن: بۆ ئەوە نییە ناهێڵن لەگەڵتان بێین کە خوا وای فەرمووە، لەبەر ئەوەیە بەخیلیمان پێ ئەبەن و ناتانەوێ هیچمان لەو ماڵی تالآنییە دەسگیر ببێ: نەخێر وانییە، بەڵام ئەمانە کەمێ نەبێ لە ڕاستی تێناگەن.

قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِنْ تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ وَإِنْ تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُمْ مِنْ قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾ لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ ۗ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ وَمَنْ يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾ ۞ لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنْزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِ وَكَفَّ أَيْدِيَ النَّاسِ عَنْكُمْ وَلِتَكُونَ آيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَاطًا مُسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ اللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَاتَلَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوَلَّوُا الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلُ ۖ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾



(١٦) بەو عەرەبە دەشتەکییە لە غەزای بتپەرستان پاش کەوتووانە بڵێ: ئێوە لەمەولا بانگ ئەکرێن بۆ جەنگ کردن لەگەڵ کۆمەڵێکی بەهێزی جەنگاوەری چەکی ڕەسا بەدەست، لەگەڵیان بجەنگن یا ئەوان موسوڵمان ببن و بێنە ژێر ڕکێفی ئایینی ئیسلامەوە. ئەگەر بەدەم ئەو بانگەوە بچن و بڕۆن بۆ ئەو جەنگە، خوا پاداشێکی جوان و باشتان ئەداتەوە. خۆ ئەگەر وەك لەوەپێش پشتتان هەڵکرد ئەو جارەیش پشت هەڵکەن و خۆ لە جەنگ بدزنەوە، سزایەکی پڕئازارو سەختتان ئەدا.

(١٧) کوێر گوناهی ناگا ئەگەر نەچێ بۆ غەزاو، شەل گوناهی ناگا ئەگەر نەچێ بۆ غەزاو، نەخۆش گوناهی ناگا ئەگەر نەچێ بۆ غەزا. هەرکەسیش گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەری خوا بێ، خوا ئەیخاتە بەهەشتگەلێکی واوە جۆگەلە ئاوی بە بندا ئەڕواو، هەرکەسیش پشت لە فەرمانی خوا بکاو ملی لێ وەرچەرخێنێ خوا سزایەکی ئەدا.

(١٨) بەڕاستی خوا ڕازی بوو لە موسوڵمانان کاتێ کە لەژێر درەختەکەی سەر ئاوی حودەیبییەدا دەستیان خستە ناو دەستت و بەیعەتیان پێ کردی و ئەیزانی چ موسوڵمانەتییەك لە دڵیانایەو، لە پاداشی ئەوەدا ئارامی و دامرکانەوەی خستە ناو دڵیانەوەو ترسی دوژمنی لە دڵا نەهێشتن و فەتح و وڵات گرتنێکی نزیکی لە دوژمنان لە پاداشا پێ بەخشین.

(١٩) غەنیمەتێکی زۆریش کە ئەیگرن و، خوا غالّب و زاڵە بەسەر دوژمنانیاو خاوەن حیکمەتە.

(٢٠) خوا وەعدەی غەنیمەتێکی زۆری داونەتێ کە هەر لە ئێستاوە تا ڕۆژی قیامەت وەری ئەگرن و بە پەلەیش ئەم غەنیمەتەی ئەمجارەی بۆ ڕێکخستن کە غەنیمەتەکەی غەزای خەیبەرەو، دەستی دوژمنەکانتانی لێ گێڕانەوە، کە مەبەست کافرانی مەککە یا جوولەکەی خەیبەرو ئەو خێڵە عەرەبانەیە لەگەڵیان هاوپەیمان بوون. بۆ ئەوەیش ئەم ڕووداوە ببێ بە نیشانە بۆ موسوڵمانان بۆ ئەوە کە ئێوە لای خوا زۆر بە قەدرو حورمەتن و، بۆ ئەوەی ڕێگایەکی ڕاستتان پێشان بدا کە ڕێگای غەزایە لەپێناوی پایەبەرزیی ئایینی ئیسلاما.

(٢١) غەنیمەتی تریشی بۆ داناون کە هێشتا دەستان پێی نەگەیشتووە، خوا خۆی ئاگای لێیەو ئەزانێ ئەکەوێتە دەستان و خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ.

(٢٢) ئەگەر کافرەکانی مەککە جەنگیان لەگەڵ بکردنایەو ڕازی نەبوونایە بە سوڵحەکەی حودەیبییە، لە جەنگەکەدا ئەشکان و هەڵئەهاتن و پشتیان پێ هەڵئەکردو، ئیتر پاش ئەوە نە دۆست و نە یاریدەدەریان لەناو خێڵە عەرەبەکانی دەوروبەری مەککەدا بە دەست نەئەکەوت، چونکە کە لە جەنگەکەدا دۆڕاندیان کەس ناوێرێ جارێکی تر هاوکارییان لەگەڵ بکا.

(٢٣) ئەمە قانوونی خوایە، ئەو قانوونەی کە لەمەوپێشەوە جێبەجێ کراوەو بەپێی ئەم قانوونە پێغەمبەران هەمیشە بەسەر دوژمنانیانا زاڵ بوون و، هەرگیزاو هەرگیزیش نابینی قانوونێ خوا داینابێ هیچ گۆڕینێکی بەسەرا بێ.

وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ عَنۡهُم بِبَطۡنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعۡدِ أَنۡ أَظۡفَرَكُمۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَٱلۡهَدۡيَ مَعۡكُوفًا أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥۚ وَلَوۡلَا رِجَالٞ مُّؤۡمِنُونَ وَنِسَآءٞ مُّؤۡمِنَٰتٞ لَّمۡ تَعۡلَمُوهُمۡ أَن تَطَـُٔوهُمۡ فَتُصِيبَكُم مِّنۡهُم مَّعَرَّةُۢ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۖ لِّيُدۡخِلَ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ لَوۡ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبۡنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذۡ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا وَأَهۡلَهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٢٦﴾ لَّقَدۡ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءۡيَا بِٱلۡحَقِّۖ لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمۡ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَۖ فَعَلِمَ مَا لَمۡ تَعۡلَمُواْ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتۡحٗا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴿٢٨﴾



(٢٤) خوا ئەو خوایە کە دەستی کافرانی گرت لەوە کە دەس‌درێژی بکەنە سەرتان دەستی ئێوەیشی گرت لەوە کە دەسدرێژی بکەنە سەر ئەوان لەناو شاری مەککەدا پاش ئەوە کە ئێوەی زاڵ کرد بەسەر ئەواناو، خوا چاوی لەهەر کارێکە کە ئێوە ئەیکەن.

(٢٥) ئەوانە ئەو کافرانەن ڕێی زیارەت و تەوافی مەسجیدولحەرامی مەککەیان لێ گرتن و ڕێگەی بە دیاری بردنی حەیوانیان بۆ مەککە لێ گرتن کە بە ڕاگیراوی هێڵرابووەوەو نەیانهێشت بگاتە جێی خۆیو، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە حەزمان نەکرد ئێوە پیاوان و ژنانێکی موسوڵمانی تێکەڵ بە کافران بووی لەناوئەواناژیاو بکوژن، بێ‌ئەوەی پێ بزانن بەوە کە بکەونە ژێرپێتان و بیانشێلن و، تووشی ناخۆشیی کوشتنی ئەو موسوڵمانانەو خوێنبژاردنیان ببن، دەستی ئێوەمان لەو کافرانە نەئەگرتەوە. واتە: بۆیە نەمانهێشت ئەو جەنگە ڕووبدا لە نێوان ئێوەو کافرەکانی مەککەدا نەوەك ئەو پیاوو ژنە موسوڵمانانەی لە مەککە مابوون بەربکەون و بکەونە ژێر پێتانەوەو ئێوەیش بە هۆی ئەوەوە تووشی نارەحەتی ببن. ئەمەیش بۆ ئەوە بوو خوا هەر کەسی حەز لێ بێ بیخاتە بەر ڕەحمەتی خۆیو بیخاتە سەر ڕێگای ئیسلامەتی. ئەگەریش ئەو موسوڵمان و کافرانەی مەککە تێکەڵ نەبوونایەو لێك جیا بوونایە، کافرەکانیانمان بەدەستی ئێوە سزا ئەدا بە سزایەکی سەخت.

(٢٦) یادی ئەوە بکەرەوە کە کافرەکان غیرەتیان خستە دڵی خۆیان، غیرەتی کۆنی سەردەمی نەزانیی پێش ئیسلامەتی کە ناهێڵێ نادەمزاد مل بۆ ڕاستی کەچ بکاو، موسوڵمانەکانیش ویستیان لە سزای ئەوەدا هێرشیان بەرنەسەر، بەڵام خوا ئارامیی خستە ناو دڵێ پێغەمبەرو موسوڵمانان و، گفتی لەخواترسان و وەفا بە عەهدو پەیمانی خستە ئەستۆیان و لەڕاستییشا ئەمان شایەنی ئەوەو خاوەنی ئەوە بوون و خوا ئاگای لە هەموو شتێ هەیەو بە هەموو شتێ ئەزانێ.

(٢٧) بێ‌گومان خوا ڕاستی کرد لەگەڵ پێغەمبەری خۆی لەو خەوە ڕاستەیا کە دیبووی و بەگوێرەی ئەو خەوە ئێوە بە ئیزنی خوا ئەمین و بێ‌ترس ئەڕۆنە ناو مەسجیدولحەرام و هەندێکتان سەرتان ئەتاشن و هەندێکیشتان مووی سەرتان کورت ئەکەنەوەو لە کەس ناترسن. خوا شتێکی ئەزانی کە ئێوە نەتانئەزانی، بۆیە چوونە مەککەو هاتنەدیی خەوەکەی دواخست بۆ ساڵێکی‌ترو بێجگە لەوەیش فەتحێکی نزیکی مەککەی بڕیاردا.

(٢٨) خوا ئەو خوایە پێغەمبەری خۆی ناردووە لەگەڵ ڕێ بەدێیی کردنی خەڵك و ئایینی ڕاست کە ئایینی ئیسلامە بۆ ئەوەی سەری‌خا بەسەر هەموو ئایینەکاناو خوایش بەسە بۆ شاهیدی لەسەر ئەم پایە بەرزەی کە بە موسوڵمانانی بەخشیوە.

مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾

## سُورَةُ الحُجُرَاتِ

ترتيبها ٤٩ — آياتها ١٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَرْفَعُوٓا۟ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ وَلَا تَجْهَرُوا۟ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَٰتَهُمْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ ۚ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾



(٢٩) موحەممەد پێغەمبەری خوایەو، ئەوانەیش کە لەگەڵینی لەسەر کافران توندو سەختگیرن و، لەناو خۆیانا بە ڕەحم و میهرەبانن. ئەیانبینی لە حاڵەتی ڕوکووع و سوجدە بردنان، داوای لوتف و ڕەزامەندی لە خوا ئەکەن. نیشانەیان بەناوچەوانیانەوە بەهۆی لە ئەنجامی سوجدەبردنیانەوەیە. بەیانی حاڵ و سیفەتیان لە تەورات و لە ئینجیلا بەم جۆرەیەو ئەمەیە: وەك چێنراوێ کە سەوز بووبێ و لقوپۆپی دەرکردبێ و هێزی پەیدا کردبێ و ئەستوور بووبێ و لەسەر ساقی خۆی ڕاوەستابێ و بە هێزو پتەوی و پێگەیشتنی خۆی کشتیارەکانی شادمان کردبێ و دڵیان پێی خۆش بێ تا ڕقی کافرەکانی پێ هەستێنێ. خوا گفتی داوە بەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە لەناو ئەمانەدا کەوا لە گوناهیان خۆش ببێ و پاداشێکی گەورەیان بداتەوە.

## سوورەتی (الحُجُرَاتِ)

**مەدینەیی‌یەو، (١٨) ئایەتە**

(١) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەری خوا! مەکەونە پێش خواو پێغەمبەری خوا، واتە لەهەر مەسەلەیەکا کە ئەوان هێشتا بڕیاریان تیا نەدابێ، ئێوە دەستپێشخەری مەکەن و لە خۆتانەوە بڕیار مەدەن و لە خوا بترسن و خۆتان لە بێ فەرمانی کردنی بپارێزن. بێ‌گومان خوا گوێی لە هەموو شتێکەو بە هەموو شتێ ئەزانێ.

(٢) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! لەکاتی وتووێژا دەنگ بەسەر دەنگی پێغەمبەرا هەڵمەبڕن و بە دەنگی بەرزیش قسەی لەگەڵ مەکەن، وەك لەناو خۆتانا بە دەنگی بەرز قسە لەگەڵ یەکتر ئەکەن نەبادا کردەوەی چاکتان بێ‌مایە دەرچێ و بە فیڕۆ بڕواو ئێوەیش پێ‌نەزانن کەوا ئەو کارە کارێکی خراپەو ڕەنجتان ئەدا بە با.

(٣) بێ‌گومان ئەوانەی دەنگی خۆیان لای پێغەمبەرا نزم ئەکەنەوەو بە ئەدەبەوە قسە ئەکەن ئەوانەن کە خوا دڵی تاقی کردوونەتەوەو بۆ لەخواترسان ئەشێن، ئەوانە لێبووردنیان بۆ هەیە لەلایەن خواوەو پاداشی گەورەیان بە نسیب ئەبێ.

(٤) بەڕاستی ئەوانەی لەودیوی دیواری ژوورەکانەوە بانگت لێ‌ئەکەن ( مەبەستی لە بانگ لێکراوەکە پێغەمبەرە ) بەشی زۆریان نافامن و عەقڵیان نییە.

وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا۟ حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ
رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟
أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٦﴾
وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ
وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ
ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾
فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾ وَإِن طَآئِفَتَانِ
مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا
عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ
فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ
﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ
عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا
مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ
ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَـٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿١١﴾



(٥) ئەگەر ئەوانە سەبریان بکردایە تا تۆ لە ماڵ دەرئەچی و دێی بۆ لایان، باشتر ئەبوو بۆیان و خوایش بەخشندەو بەرەحمە.

(٦) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر فاسقێ خەبەرێکی بۆ هێنان دەستبەجێ بەڕاستی مەزانن و بکەونە پەیجۆر تا بۆتان دەرئەکەوێ ڕاستیو درۆیی هەواڵەکە چۆنە، نەوەك بێ ئاگاو بە نەزانیی خۆتان کۆمەڵە خەڵکێ گرفتارو تووش بکەن و پاشان لەوکارەی کردووتانە پەشیمان ببنەوە.

(٧) بزانن کەوا پێغەمبەری خوا لەناوتانایەو ئەگەر لە زۆر شتا کە داوای لێ ئەکەن بە گوێتان بکا تووشی دەردی سەری ئەبن، بەڵام ئێوەیش لەبەر ئەوەی کە سوورن لەسەر قازانجی ئایینی ئیسلام، داوای ئەو شتانە ئەکەن و، خوا ئیسلامەتی و باوەڕی لا خۆشەویست کردوون و جوانی کردووە لە دڵتاناو کافری و گوناه و تاوانباریی لابێزراندوون و، پیاوی عاقڵ و فامیدەیش ئەوانەن حەزیان لە موسوڵمانەتی و فەرمانبەرداریی خواو پێغەمبەری خوایەو ڕقیان لە کافریو تاوان و گوناهبارییە.

(٨) ئەمەیش لە گەورەیی و نیعمەتی خواوەیەو، خوا بە هەموو شتێ ئەزانێ و خاوەن حیکمەتە.

(٩) ئەگەر دوو تاقم لە ئیمانداران لەناو خۆیانا بوو بە جەنگیان، نێوانیان چاك بکەن و ئاشتیان بکەنەوە. جا ئەگەر تاقمێکیان تەجاوزی کرد بۆسەر ئەویان، لەگەڵ ئەو تاقمەیان بجەنگن کە تەجاوزو دەسدرێژیی کردووە تا ئەگەڕێتەوە بۆ ملکەچکردن بۆ فەرمان و قانوونی خوا. جا ئەگەر بەشێوەیەکی دادپەروەرانە گەڕایەوە بۆ گرتنەبەری ڕێگای فەرمانبەرداریی خوا، ئەوا ئێوەیش ئاشتیان بکەنەوەو دادپەروەری لە نێوانیانا بەجێبهێنن. خوا خۆشی لەو کەسانە دێ کە دادپەروەرن.

(١٠) ئەوانەی ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا هەیە برای یەکەن. کەواتە ئێوەیش، ئەی موسوڵمانینە، نێوانی جووتە برایانی خۆتان چاك بکەن و ئاشتیان بکەنەوەو لە خوا بترسن، بەڵکو هیوای ئەوە هەبێ خوا ڕەحمتان پێ بکاو میهرەبانیتان لەگەڵ بنوێنێ.

(١١) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! با هیچ کۆمەڵە پیاوێ گاڵتە بە کۆمەڵە پیاوێکی تر نەکا، لەوانەیە ئەو کۆمەڵە پیاوە گاڵتە پێکراوە لە کۆمەڵە پیاوە گاڵتە پێکەرەکە چاکتر بن و، با هیچ کۆمەڵە ئافرەتێ گاڵتە بە کۆمەڵە ئافرەتێکی تر نەکا، لەوانەیە کۆمەڵە ئافرەتە گاڵتە پێکراوەکە لە کۆمەڵە ئافرەتە گاڵتە پێکەرەکە چاکتربنو، غەیبەتی یەکتر مەکەن چونکە کە غەیبەتی یەکترتان کرد ئەوە وەك ئەوە وایە خۆتانتان عەیبدار کردبێ لەبەر ئەوە کە موسوڵمانان هەموو یەکن و، ناوو ناتۆرەی ناشیرین و خراپیش بە یەکترا هەڵمەدەن، زۆر بەدناوییە بۆ موسوڵمان ئەمە کە پاش ئیمان هێنانی بە خواو موسوڵمانبوونی ناوبانگی بە لەدیندەرچوون بزڕێ و، هەر کەسیش تۆبە نەکا لە گوناهی ئەم کردەوانەو پاشگەز نەبێتەوە لێیان، ئەوانە ستەمکارن و ستەمیان لە خۆیشیان و لە خەڵکیش کردووە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجْتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ
وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن
يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ
رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ
شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ
عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ۞ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن
قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَٰلِكُمْ شَيْـًٔا إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾
إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُواْ
وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلْ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمْ وَٱللَّهُ
يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ
﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُواْ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم بَلِ ٱللَّهُ
يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ
يَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾



(١٢) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! خۆتان لە گەلێ گومانبردن دوور بگرن، چونکە هەندێ گومانبردن بە خەڵك گوناهەو، مەکەونە پەیجۆری زانینی شتی پەنامەکیی موسوڵمانان کە تایبەت بە خۆیانەو، با هەندێکیان غەیبەتی هەندێکتان نەکا. ئایا یەکێ لە ئێوە حەزئەکا گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوا؟ ئەوەتان پێ خۆش نییە. لە خوای خۆیشتان بترسن و بێگومان خوا تۆبە قوبوولکەرو میهرەبانە.

(١٣) ئەی خەڵکینە! بێگومان ئێمە هەموو ئێوەمان لە پیاوو ژنێ دروست کردووە کە ئادەم و حەووان و، ئێوەمان کردووە بە چەند نەتەوەو هەر نەتەوەیەك بە چەند خێڵ و هۆز کە بچنەوە سەر یەك بنەچە، بۆ ئەوەی لەناو خۆتانا یەکتر بناسن. بەڕاستی بە قەدرو حورمەتترتان لای خوا ئەوەتانە زۆرتر لە خوا بترسێ و خۆی لە گوناە بپارێزێ. خوا هەموو شتێ ئەزانێ و لە هەموو شتێ ئاگادارو شارەزایە.

(١٤) عەرەبە دەشتەکییەکان وتیان: ئیمانمان هێناوە. پێیان بڵێ: ئیمانتان نەهێناوە، چونکە ئیمان باوەڕی بە دڵە، بەڵام بڵێن: بەدەم موسوڵمان بووین و، باوەڕ هێشتا نەچوەتە ناو دڵتانەوەو، ئەگەر فەرمانبەرداریی خواو پێغەمبەری خوا بکەن خوا هیچ لە پاداشی کردەوەکانتان ناتەواو ناکاو پڕبەپێستی چاکەتان پاداشتان ئەداتەوە. خوا گوناهبەخش و بەڕەحم و میهرەبانە.

(١٥) بەڕاستی ئیمانداران ئەوانەن باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا کردووەو پاش ئەوەیش نەکەوتوونەتە گومان و دوودڵییەوەو بەدارایی‌و بەگیانی خۆیان تێکۆشاون لە ڕێگای خواداو، مرۆی ڕاستگۆ ئەمانەن.

(١٦) تۆ پێیان بڵێ: ئەوە ئێوە خوا لە ئایینی خۆتان ئاگادار ئەکەن و سوێندی بۆ ئەخۆن کەوا موسوڵمانن؟ لەکاتێکا کە خوا ئاگادارەو ئەزانێ چی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیەو بە هەموو شتێ ئەزانێ.

(١٧) منەتت ئەنێنە سەر کەوا موسوڵمان بوون. تۆ پێیان بڵێ: منەتم مەنێنە سەر بە موسوڵمان بوونتان، خوا منەتتان ئەنێتەسەر کەوا هیدایەتی داون بۆ باوەڕ بە خواو بە پێغەمبەری خواو بۆ موسوڵمانەتی، ئەگەر ڕاست ئەکەن باوەڕتان هەیەو موسوڵمانن.

(١٨) بەڕاستی خوا بە هەموو نهێنییەکی ئاسمانەکان و زەوی ئەزانێ و چاوی لە هەموو کردەوەیەکی ئێوەوەیە، ئیتر چۆن هیچی لێ ئەشاررێتەوە؟

## سُورَةُ قٓ

مرتيبها ٥٠ — آياتها ٤٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْمَجِيدِ ﴿١﴾ بَلْ عَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ۖ ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ﴿٣﴾ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظٌۢ ﴿٤﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ ﴿٥﴾ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٧﴾ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٨﴾ وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ جَنَّٰتٍ وَحَبَّ ٱلْحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴿١٠﴾ رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ ۖ وَأَحْيَيْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلْخُرُوجُ ﴿١١﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ﴿١٢﴾ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ لُوطٍ ﴿١٣﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ ۚ كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ ۚ بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٥﴾



## سوورەتی ( قٓ )

**مەککەیی‌یەو، ئایەتی ٣٨ی نەبێ و، (٤٥) ئایەتە**

(١) خوا خۆی ئەزانێ مەبەستی لەم وشەی (ق)ە چییە. قەسەم بە قورئانی خاوەن شان و شکۆ. (٢) بەڵکو ئەم خەڵکە سەریان لەوە سوورما کەوا کەسێکیان لە خۆیان هاتە سەر لە سزای دوارۆژیان ئەترسێنێ و، کافرەکان ووتیان: هاتنی ئەم پیاوە کەوا لە سزای دوارۆژمان ئەترسێنێ، شتێکی سەیرە.
(٣) ئایا ئێمە کە مردین و ڕزین و بووین بە خۆڵ، زیندوو ئەکرێینەوە؟ ئەمە گەڕانەوەیەکی دوور لە عەقڵە. (٤) ئێمە بەڕاستی ئەزانین زەوی چەند لە لەشی ئەوان کەم ئەکاتەوە کە ئەیڕزێنێ و ئەیکا بە خۆڵ و، کتێبێ لای ئێمە هەیە بەدرێژی بەسەرهاتی هەموو کەسێکی تیایە چیی لێ‌دێ و چیی بەسەردێ.
(٥) بەڵکو ئەوان ئەو ڕاستییەیان بە درۆ دانا کاتێ هاتە لایان کە پێغەمبەرەو قورئانی لە خوای بۆ هێنان و، ئەوان لە حاڵێکی سەرلێشێواویدان و هەر تاوێ لە بارەی پێغەمبەرەوە شتێ ئەڵێن. جارێ ئەڵێن: شاعیرەو جارێ ئەڵێن: سیحربازەو جارێ ئەڵێن: درۆزنەو ... تاد.
(٦) ئایا ئەمانە سەیری ئاسمانیان نەکرد بەسەر سەریانەوە چۆنمان دروست کردووەو ڕازاندوومانەتەوە بە مانگ و ڕۆژو ئەستێرەو، هیچ کون و کەلەبەرێکی تیا نییە؟ (٧) ئەی ئایا ئەمانە سەیری زەوییان نەکرد چۆنمان تەخت کردووەو پانمان کردووەتەوەو چەندین کێوی بڵندمان تیا چەقاندووەو لە هەموو جۆرە درەخت و گژوگیاو سەوزەیەکی جوانمان تیا ڕواندووە؟
(٨) بۆ بەرچاو ڕوونکردنەوەو بۆ ئەوەی ببێ بە مایەی بیرکردنەوە بۆ هەموو بەندەیەکی بۆ لای خوا گەڕاوە کە تێفکرێ ئەبێ خوایەك هەبێ دنیایەکی وا جوانی دروست کردبێ و چاکەو خراپە بێ‌سەرەنجام نەهێڵێتەوە.
(٩) دایشمانباراندووە لە ئاسمانەوە ئاوێکی پیرۆز کە ئاوی باران و بەفرەو، بەو ئاوە پیرۆزە باخ و باخاتمان ڕواندووەو دانەوێڵەی درواوەمان پێ سەوز کردووەو پێگەیاندووە.
(١٠) دارخورمای گەورەو بەرزو بڵندیشمان ڕواندووە کە چرۆی بەیەکاچووی ڕیزکراوی هەیە.
(١١) ئەمە گشت بۆ ئەوەی ببێ بە ڕزق و ڕۆزی بۆ بەندەکانی خواو، هەروا بەو ئاوە پیرۆزە وڵاتی چۆڵ و هۆڵ و مردوویشمان ئاوەدان کردووەتەوەو، زیندوو بوونەوەو لە گۆڕ دەرچوونیش هەر بەم جۆرەیەو بۆ خوا ئاسانە.
(١٢) بەر لە کافرەکانی مەککەیش، ئەوانەی نووحیان نێرابووە سەرو، کۆمەڵە خاوەن چاڵاوەکانیش کە حەنظەلەی کوڕی صەفوانیان نێرابووە سەرو، خێڵی سەموودیش، پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بە درۆزن دانا.
(١٣) هەروەها خێڵی عادو فیرعەون و براکانی لووطیش.
(١٤) دارستاندارەکانی خێڵی شوعەیب و، خێڵی توببەعی حیمیەریی یەمەنییش، گشتیان پێغەمبەری خۆیانیان بە درۆزن دانا، لەبەر ئەوە ئەو هەڕەشەیەی لێم کردبوون تیایانا هاتە دی. (١٥) ئایا ئێمە دروستکردنی یەکەمجاری ئادەمزاد سەری لێ‌شێواندین و ماندووی کردین تا هیی دووەم جارمان پێ نەکرێ؟ نەخەیر، بەڵام ئەمانە لەبارەی دروستکردنەوەی جاری دووهەمەوە سەریان لێ تێکچووەو کەوتوونەتە گومان و دوودڵییەوە.

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَىَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾ يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴿٣٠﴾ وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴿٣٢﴾ مَّنْ خَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾



(١٦) بەڕاستی ئێمە ئادەمزادمان دروست کردووەو ئەزانین چی بە دڵیا دێ و، ئێمە لە ڕەگی لاملی ئادەمزاد نزیکترین لێیەوە، واتە لە ئادەمزادەوە. (١٧) ئێمە لە ڕەگی لاملی ئادەمزاد خۆی نزیکترین لێیەوە لەوکاتەدا کە دوو فریشتەی گوفتارو کردار نووسینی ئادەمزاد، کردارو گوفتاری وەرئەگرن و یەکیان لە لای ڕاستیەوەو ئەویان لە لای چەپیەوە دانیشتووە.

(١٨) ئادەمزاد قسەیێ چییە نایکا ئیللا فریشتەیەکی چاودێریکەری ئامادە بۆ نووسینی لەلاوەیە هەرچیی بە دەما بێ هەمووی لای خۆی ئەنووسێ.

(١٩) ئەی ئادەمزادی باوەڕ بە خواو بە زیندوو بوونەوەی دوارۆژ نەبوو! وا بێهۆشیی مردن کاتی سەرەمەرگ هات و دایگرتی. ئەوە ئەو شتە بوو کە تۆ بە خەیاڵی خۆت خۆتت لێ لائەداو پێت ناخۆش بوو و بیرت لێ نەئەکردەوە.

(٢٠) فوویش کرا بە کەڕەنای سووردا و هەرچی مردوو هەیە هەموو زیندوو بوونەوە. ئەوە ڕۆژی هاتنەدیی ئەو هەڕەشەیە لە پیاوخراپان ئەکرا.

(٢١) هەمووکەسێکیش هات بۆ سارای مەحشەر بۆ لێپرسینەوەو حیساب و کیتاب لەگەڵ کردن و هەر یەکێ دوو کەسی لەگەڵە، یەکیان لێخوڕێکە ئەیهێنێ بۆ مەیدانی حەشرو ئەویشیان شایەتێکە ڕاستیی ئەو شتانە باس ئەکا کە لەو ئادەمزادە ڕوویان داوە. (٢٢) ئەی ئادەمزاد، یا ئەی ئادەمزادی بێ باوەڕ! تۆ ئەم ڕۆژەت فەرامۆش کردبوو و لەیادی خۆتت بردبووەوە، وا ئێستا ئێمە پەردەی سەرچاوتمان لاداو، چاوت ئێستا زۆر تیژەو هەموو شتێ بە باشی ئەبینی.

(٢٣) فریشتەی هاوڕێی ئادەمزادە زیندووکراوەکە عەرزی خوای کرد: ئەمە دەفتەری گوفتارو کرداری دنیای ئەم کابرایە هەموو نووسراوەو لای منەو حازرو ئامادەیە. (٢٤) جا خوا فەرمان ئەدا بە هاوڕێ لێخوڕەکەو بە شایەتەکەی ئادەمزادەکەو پێیان ئەڵێ: هەموو کافرێکی کەللەڕەق کە بەگوێی فەرمانی خوای نەکردووە، فڕێی بدەنە ناو دۆزەخەوە.

(٢٥) ئەو کافرە کەللەڕەقەی کە ڕێگای چاکەو خێرو خێراتکردنی لە خەڵك ئەگرت یا بە دڵ پێی ناخۆش بوو و دەسدرێژیی ئەکردە سەر خەڵك و گومانی هەبوو لە بوونی خوادا. (٢٦) کە هاوبەشی بۆ خوا دائەناو خوای تری لەگەڵیا ڕائەگرت، دەی بیخەنە ناو سزای سەختی ئاگری دۆزەخەوە. (٢٧) جا لەویا ئەوکافرە لای خوا شکات لەو کەسە یا ئەو شەیتانە ئەکا کە لە دنیادا گومڕای کردووەو ئەوکەسە یا شەیتانەکەیش داکۆکی لە خۆی ئەکاو بە خوا ئەڵێ: ئەی پەروەردگاری ئێمە! من توغیانم پێ نەکردووە، ئەو بۆخۆی لە گومڕاهییەکی دوور ڕۆیشتوودا بوو.

(٢٨) خوایش بە هەردووکیان ئەڵێ: لای من بەگژی یەکترا مەچن. من کاتی خۆی هەڕەشەی خۆمم لێکردبوون.

(٢٩) قسە لای من هەر یەك قسەیەو ناگۆڕێ و، من ستەمکاریش نیم لە بەندەکانی خۆم.

(٣٠) یادی ئەو ڕۆژە بکەرەوە کە ئێمە بە دۆزەخ ئەڵێین و لێیئەپرسین: ئاخۆ پڕ بوویت لەوانەی ئەبێ تیایا سزا بدرێن؟ ئەویش لە وەڵاما ئەڵێ: زیاتر هەیە بۆمیان بنێرن؟

(٣١) بەهەشتیش نزیك ئەکرێتەوە بۆ لە خوا ترساوان و دوور نابێ لێیانەوە. (٣٢) پێیشیان ئەوترێ: ئەمە ئەو شوێنەیە کە گفتتان پێ درابوو بۆ ئێوەو بۆ هەرکەسێ بگەڕێتەوە بۆ لای خواو نیگاداریی ئەو سنوورانە بکا خوا دایناون.

(٣٣) بۆ هەرکەسێ لە پەنامەکیدا لە خوا ترسابێ و بە دڵێکی تۆبەکارەوە گەڕابێتەوە بۆ لای خوا.

(٣٤) پێیان ئەوترێ: بێترس و لەرز بڕۆنە ناو بەهەشت. ئەمڕۆ ڕۆژی مانەوەی هەمیشەییە کە ئیتر مردنی لەدوا نییە.

(٣٥) هەرچییان ئارەزوو لێ بێ بۆیان هەیە لەو بەهەشتەداو لەوەیشمان زیاتر لایە بۆیان.

وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا فِي الْبِلَادِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَاسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ الْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا الْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾

## سُورَةُ الذَّارِيَاتِ

ترتيبها ٥١ — آياتها ٦٠

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ الدِّينَ لَوَاقِعٌ ﴿٦﴾



(٣٦) خەڵكی چەندین سەدەمان بەر لەم کافرانی مەککەیە بەرباد کردو فەوتاند کە ئەوان لەمان زۆر بەهێزترو بە هەڵمەتتر بوون و بە وڵاتانا گەڕابوون بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لە مەرگ، بەڵام هیچ دەرفەتێکیان دەسگیر بوو؟

(٣٧) بەڕاستی لەم بابەتانەدا کە لەم سوورەتەدا باسمان کردن مایەی بیر لێکردنەوەو پەندوەرگرتن هەیە بۆ کەسێ دڵێکی فامیدەی هەبێ یا گوێ شل کاو ئامۆژگاری وەربگرێ و زەینی لای خۆی بێ لە شت بگا.

(٣٨) بەڕاستی ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیانا هەیەمان لە شەش ڕۆژدا دروست کردو هیچ ماندوویەتییەکیشمان پێ نەگەیشت.

(٣٩) دەی تۆ خۆت بگرە بەرانبەر ئەو قسانەی دەرحەقت ئەیانکەن و بەر لەوەی سبەینان خۆر هەڵبێ و بەر لەوەی ئاوایش ببێ نوێژ بکەو خوای خۆت پاك و بێگەرد ڕاگرە.

(٤٠) بە شەویش هەروا نوێژ بکەو لە پاش سوجدەبردنی ئەو نوێژانەیش هەروا شەونوێژو نوێژی وەتر بکە. نوێژی پێش خۆرهەڵاتن نوێژی بەیانی و، نوێژی پێش خۆراوا نوێژی نیوەڕۆو عەسرو، نوێژی شەویش نوێژی مەغریب و عیشاو، نوێژی پاش سوجدە بردنیش نوێژی وەترو شەونوێژە.

(٤١) گوێ شل کە لەو ڕۆژەدا کە بانگکەر لە شوێنێکی نزیکەوە، بانگ ئەکا، واتە هەر کەس گوێی لێ ئەبێ وائەزانێ لەنزیکی خۆیەوە بانگی لێ ئەکەن.

(٤٢) ئەو ڕۆژە ئەو ڕۆژەیە کە خەڵك بەڕاست گوێیان لە دەنگە دەنگ و هاوار هاوارە. ئەو ڕۆژە ڕۆژی لەگۆڕهاتنەدەر و ڕووکردنە سەحرای مەحشەرە.

(٤٣) بەڕاستی ئێمە مردووان زیندوو ئەکەینەوەو زیندووان ئەمرێنین و سەرەنجام هەر بۆ لای ئێمەیە.

(٤٤) گەڕانەوەی مردووان بۆ لای ئێمە لە ڕۆژێکا ئەبێ کە زەوی بە پەلە دڕنیان پێئەداو درزی تێئەبێ و مردووەکان بە پەلە لە گۆڕەکانیان دێنەدەر. ئەمە کۆکردنەوەیەکی ئەم خەڵکەیە بۆ ئێمە زۆر ئاسانە.

(٤٥) ئێمە لە ئێوە چاکتر ئەزانین ئەو کافرانە ئەڵێن چی و، تۆ زۆرت بەسەریانا نییە. تۆ تەنها هەقی گەیاندنی قورئانت بەم خەڵکە هەیە. دەسا خواو ڕۆژی قیامەت بە ئایەتی قورئان بخەرەوە یادی هەرکەس لە هەڕەشەی من ئەترسێ.

## سوورەتی (الذاريات)

مەککەیی‌یەو، (٦٠) ئایەتە

(١) قەسەم بەو بایانەی خۆڵ هەڵئەگرن و بڵاوی ئەکەنەوە! (٢) ئەمجا قەسەم بەو پەڵە هەورانەی باری قورسی باراناویان هەڵگرتووە! (٣) ئەمجا قەسەم بەو پەڵە هەورانەی بەئاسانی بە هەوادا ئەڕۆن!

(٤) ئەمجا قەسەم بەو فریشتانەی بەشی گیانلەبەران بەسەریانا بەش ئەکەن!

(٥) ئەوەی گفتتان پێدراوە ڕاستەو دێتەدی.

(٦) پاداشدانەوەی چاکەو خراپەی چاکان و خراپانیش لە ڕۆژی قیامەتا، ڕووئەدا.

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ ﴿٧﴾ إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ﴿٨﴾ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ ﴿٩﴾ قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى غَمْرَةٍ سَاهُونَ ﴿١١﴾ يَسْـَٔلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٢﴾ يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾



(٧) قەسەم بە ئاسمانێ کە ڕێگای تیایە بۆ هاتوچۆی ئەستێرە گەڕۆکەکان!
(٨) بەڕاستی ئێوە قسەی جیاجیاو بێسەروبەر لە بارەی پێغەمبەرەوە، یا لە بارەی قورئانەوە، یا لە بارەی ئایینی ئیسلامەوە، یا لە بارەی ڕۆژی قیامەتەوە ئەکەن.
(٩) ئەو کەسەی لە عیلمی خوادا لە باوەڕ هەڵگێڕرابێتەوە، بەوجۆرە قسانە لە باوەڕ هەڵئەگێڕرێتەوە.
(١٠) یاخوا بە کوشت چن ئەوانەی لە گۆترە لەخۆیانەوە قسە ئەکەن.
(١١) ئەوانەی لە گێژاوی درۆو دەلەسە کردنا غافڵ و بێئاگان لە ترسی خوا.
(١٢) ئەپرسن: کەی ڕۆژی تۆڵەدانەوە دێتەدی؟
(١٣) ئەو ڕۆژەی ئەوان لەسەر ئاگری دۆزەخ ڕائەگیرێن و ئەسووتێنرێن.
(١٤) پێیان ئەوترێ: فەرموون نارەحەتیی خۆتان بچێژن. ئەمە ئەوەیە کەوتبوونە پەلەپەل بۆی.
(١٥) بەڕاستی ئەوانەی لە خوا ئەترسن لە ناو باخ و باخات و کانیاوی بەهەشتان.
(١٦) خوا چ نازو نیعمەتێکی پێ بەخشیون وەری ئەگرن بۆخۆیان، چونکە ئەمانە لەمەوبەر کە لە دنیادا بوون پیاوچاك بوون و چاکەیان ئەکرد.
(١٧) تەنها لە ماوەیەکی کەمی شەوا ئەنووستن. (١٨) لە بەرەبەیانیشا داوای خۆشبوون و لێبوردنیان لە خوا ئەکرد. (١٩) لە داراییشیانا بەشێ بۆ سواڵکەرو نەدار هەبوو لەسەر خۆیانیان پێویست کردبوو.
(٢٠) زەوییش گەلێ نیشانەو بەڵگەی لەسەر بوونی خواو توانایی خوا تیایە بۆ کەسانێ باوەڕیان بە بوونی خوا هەبێ.
(٢١) لە خودی خۆیشتانا ئەو بەڵگەو نیشانانە هەن، دەی ئەوە ئێوە بینا نین و ناڕوانن تا عیبرەت بگرن؟
(٢٢) ڕزق و ڕۆزیتان لە ئاسمانایە، چونکە هەمووی لە بارانەوە دێ و بارانیش لەسەرەوە دائەپەڕێ. ئەو بەهەشتەیش کە گفتتان پێدراوە لە ئاسمانایە، یا چونکە پاداشی کاری چاك بۆ خاوەن باوەڕان لە ئاسمانا نووسراوە ( مەبەست لە پاداشەکەیش بەهەشتە، کە وای لێدێتەوە بەهەشت لە ئاسمانا بێ ).
(٢٣) سا قەسەم بە خوای ئاسمان و زەوی! ئەمەی وتمان ڕاستە وەك ڕاستیی ئەوە کە ئێوە قسە ئەکەن.
(٢٤) ئایا تۆ باسی میوانە پڕقەدرو حورمەتەکانی ئیبراهیمت پێگەیشتووە؟
(٢٥) کاتێ کە چوونە ماڵەوە بۆ لای، وتیان: سەلامت لێ بێ، ئەویش وتی: سەلام لە ئێوەیش بێ، ئێوە کۆمەڵێکی نەناسن، من ناتانناسم کێن؟ (٢٦) جا هەڵسا و بێئەوەی میوانەکانی پێبزانن چوو بۆ لای ژنەکەی و گوێرەکەیەکی قەڵەوی هێنا. دیارە گوێرەکەکە سەربڕاو بووەو ئامادە کراوە بۆ خواردن.
(٢٧) گوێرەکەکەی لێ نزیك خستنەوە، واتە خستیە بەردەستیان و وتی: نافەرموون بخۆن؟
(٢٨) کە دیی لێیان نەخوارد، ترس کەوتە دڵیەوە لێیان. ئەوانیش کە هەستیان بە ترسانەکەی کرد، وتیان: مەترسەو مژدەیان دایە کەوا کوڕێکی زانای بۆ لەدایك ئەبێ.
(٢٩) ژنەکەی ئیبراهیم کە لەم مژدەیە ئاگادار بوو بە قیژەو هاوارەوە هاتە لایان و ئەیدا بە سەرو چاوی خۆیاو وتی: من پیرەژنێکی نەزۆکم.
(٣٠) ئەوانیش وتیان: پەروەردگاری تۆ وای فەرموە، ئەو خۆی خاوەن حیکمەتەو زانایە.

۞ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ وَفِى مُوسَىٰٓ إِذْ أَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ وَفِى عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَىْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ وَفِى ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا۟ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُوا۟ مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٤٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْي۟دٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلْأَرْضَ فَرَشْنَٰهَا فَنِعْمَ ٱلْمَٰهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ إِنِّى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ وَلَا تَجْعَلُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ إِنِّى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥١﴾



(٣١) ئیبراهیم کە دڵی لە میوانەکانی هێمن بووەوە لێی پرسین، وتی: دەی ئێوە نیشتان چییە وا بەکۆمەڵ هاتوون ئەی فروستادەکان؟

(٣٢) ئەوانیش وتیان: ئێمە نێررابووینە سەر کۆمەڵێکی تاوانبار.

(٣٣) بۆ ئەوەی بەردەگڵینە ببارێنین بەسەریانا.

(٣٤) بەردە گڵینەی وا لای خوای خۆتەوە نیشانەدار کرابوون بۆ ئەو تاوانبارە لەسنوردەرچووانە.

(٣٥) جا چی خاوەن باوەڕ لە ئاواییەکەدا هەبوو کردمانە دەرەوە بۆ ئەوەی بەر بەردەبارانی بەردە گڵینەکە نەکەون.

(٣٦) کەچی لە تاقەماڵێکی موسوڵمان بەولاوەمان لەو ئاواییەدا نەدییەوە.

(٣٧) نیشانەیەکی دیاریشمان لەو ئاواییەدا جێهێشت بۆ ئەو کەسانەی لە سزای پڕ دەردو ئازار ئەترسن.

(٣٨) لە باسی مووسایشا نیشانەو بەڵگەی گەورە هەیە لەسەر توانایی خوا کە ئەوەبوو بە موعجیزەیەکی ئاشکراوە ناردمانە سەر فیرعەون.

(٣٩) کەچی فیرعەون لەوە لایدا کە گوێ بۆ مووسا شل بکاو پشتی بە هێزو توانی خۆی بەست و وتی: ئەم مووسایە یا سیحربازە یا شێتە.

(٤٠) ئێمەیش خۆیو لەشکرەکەیمان گرت و فڕێمان دانە ناو دەریاو گلەییش هەر لەسەر خۆیەتی، خەتای خۆی بوو خۆی و لەشکرەکەی وا تووش کرد. (٤١) باسی قەومی عادیش بەڵگەو نیشانەی زۆری توانایی خوای تیایە، ئەوەبوو بایەکی بێ خێرو قازانج و نەزۆك و دوابڕمان ناردە سەریان.

(٤٢) بەسەر هەرچییەکیا هەڵکردایە دەسبەرداری نەئەبوو وەك ئێسکی ڕزیوو پرتووکاوی لێ ئەکرد.

(٤٣) هەروا باسی خێڵی سەموودیش بەڵگەو نیشانەی زۆری گەورەیی خوای تیایە کاتێ کە لەلایەن خواوە پێیان وترا: تا ماوەیەك بۆخۆتان لێدەن و ڕابوێرن. (٤٤) ئەوانیش لە فەرمانی خوای خۆیان لایان داو جا هەوره تریشقە دای پیایاناو ئەوانیش بە ڕۆژی ڕووناك سەیریان ئەکرد چۆن تریشقەکە دێ و پیایانا ئەدا.

(٤٥) ئیتر وایان لێ هات نەیانتوانی لە جێی خۆیانا ڕاست بنەوەو لەوانەیش نەبوون کەسێ یارمەتییان بداو زاڵ بن.

(٤٦) قەومی نووحیشمان بەر لەوان فەوتاندو لەناومان بردن. قەومی نووح کۆمەڵە خەڵکێکی فاسق و گوناهبار بوون. (٤٧) ئاسمانیشمان بەهێز دروست کردو ئێمە ئەتوانین گەورەتریشی بکەین.

(٤٨) زەوییشمان تەخت کردووە بۆ ئەوەی ئۆقرەی تیا بگرن و ئێمە تەختکەری زۆر چاکین.

(٤٩) ئێمە لە هەموو جۆرە گیاندارو درەخت و سەوزەو گژوگیایەك جووتێکی نێرومێمان دروست کردووە بۆ ئەوەی ئێوە بیربکەنەوە کە خوا ئەم دنیای بەپێی قانوونێکی ڕێکوپێك دروست کردووە.

(٥٠) دەی لە چنگی شەیتانی ئادەمزادخەڵەتێن هەڵبێن و ڕابکەن بۆ لای خواو بە فەرمانی ئەو بجووڵێنەوە. من لای ئەوەوە هاتووم بۆ سەر ئێوە تا بتانترسێنم و ڕوونی بکەمەوە بۆتان لە چیتان ئەترسێنم.

(٥١) خوایەکی تر لەگەڵ خوادا قەرارمەدەن و کەسی لەگەڵ مەپەرستن. من لای خواوە هاتووم بۆ سەر ئێوە تا بتانترسێنم و ڕوونیشی بکەمەوە لە چیتان ئەترسێنم.

كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوْاْ بِهِۦۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٍ ﴿٥٤﴾ وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٥﴾ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبًا مِّثْلَ ذَنُوبِ أَصْحَٰبِهِمْ فَلَا يَسْتَعْجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوْمِهِمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾

## سُورَةُ ٱلطُّورِ

ترتيبها ٥٢ — آياتها ٤٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾ فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ ﴿٣﴾ وَٱلْبَيْتِ ٱلْمَعْمُورِ ﴿٤﴾ وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ ﴿٥﴾ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ﴿٦﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ ﴿٨﴾ يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا ﴿١٠﴾ فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى خَوْضٍ يَلْعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾



(٥٢) هـەروەك كافرەكـانی قـورەیش، كافرەكـانی بەرلـەوانیش هـیچ تاقمێكیـان پێغەمبەرێكیان نەهاتەسەر، ئـیللا پێیـان ئەوت: سیحربازە یاخود شێتە.

(٥٣) ئایا ئەم كافرانە تاقم تاقم یـەكتریان ڕاسپاردووە وا بە پێغەمبەرەكانیان بڵێن و ئەم قسە پڕوپووچانەیان لـە ڕوودا بكـەن؟ نەخـەیر! هەریەكـەیان لـە خـودی خۆیانـا توغیانیان كردووەو لە ڕاستییان لاداوە.

(٥٤) دە پشـتیان لێ هەڵبكـەو گوێیـان مەدەرێ، گلەیی لەتۆ ناكرێ كەوا ئەمانـە بە كافری ئەمێننەوەو موسوڵمان نابن.

(٥٥) ئامۆژگـارییش هـەر بكـە چـونكە ئامۆژگاری سـوود ئـەدا بەوانـەی خـاوەنی ئیمانن یا ڕوویان لە ئیمان هێنانە.

(٥٦) مـن جنۆكـەو ئـادەمزادم بـۆ هـیچ دروسـت نـەكردووە بـۆ ئـەوە نـەبێ كـە بمپەرستن.

(٥٧) مـن ڕزق و ڕۆزیـم لێیـان نـاوێ و نامـەوێ خواردەمـەنیم دەرخـوارد بـدەن چـونكە خـۆراكخـۆر نـیم و پێویسـتم بـە خواردەمەنی نییەو خۆراكی هەموو خۆراك خۆرێكیش بە دەست منە.

(٥٨) بەڕاستی خوا ڕۆزیـدەری هەموانـەو بەهێزو توانایەو زۆریش بەهێزە.

(٥٩) بەڕاسـتی ئەوانـەی سـتەم و ناحەقییان لەگەڵ پێغەمبەر كردووە، بەشە سزای وەك بەشە سزای هاوڕێ كافرەكانی سەردەمەكانی پێشووی خۆیانیان بـۆ هەیـە، جـا بـا پەلەپـەلی سزادانیانیان نەبێ لێم، سەرەنجام هەر بۆیان تاین ئەبێ.

(٦٠) كەواتە هاوار بۆ ئەوانەی كافر بوون لە سزای ئەو ڕۆژەیان كەوا گفتیان دراوەتێ پێی.

## سووڕەتی ( الطُّور )

مەككەیی‌یەو، (٤٩) ئایەتە

(١) قەسەم بە كێوی طووری سینا.

(٢) قەسەم بە كتێبێكی نووسراو كە مەبەست لێی قورئان یا هەرچییەكە لە (لوح المحفوظ)دا نووسرابێ.

(٣) لە لاپەڕەی پێستە حەیوانێكا نووسرابێ كە بڵاوكرابێتەوە، واتە بڵاوكرابێتەوە بۆ ئەوەی بخوێنرێتەوە.

(٤) قەسەم بە خانووی ئاوەدان بە پەرستنی خوا تیایا كە مەبەستماڵی كەعبەیە.

(٥) قەسەم بە بانی بەرزكراوە كە ئاسمانە بەسەر ئەرزەوە.

(٦) قەسەم بە دەریای هاتووەكوڵ كە دەریاكان لە ڕۆژی قیامەتاو لە تێكچوونی زەویدا دێنەكوڵ.

(٧) بێگومان سزای خوای تۆ بۆ كافران ڕووئەداو دێتەدی. (٨) هیچ چارەسەرێكی بۆ نییە بەری لێ بگرێ.

(٩) لەو ڕۆژەدا كە ئاسمان توند ئەسووڕێتەوە بە سووڕانەوە. (١٠) كێوەكانیش ئەكەونە گەڕانێكی توند.

(١١) جا لە ڕۆژێكی وادا هاوار بۆ ئەوانەی باوەڕیان بە خواو فەرموودەی پێغەمبەری خوا نەكردووە.

(١٢) ئەوانەی لە وتارو ڕەفتاری پووچ و بەتاڵا گاڵتە ئەكەن.

(١٣) لەو ڕۆژەدا كە ئەو كافرانە بە زۆر بە پاڵ پاڵیان پێوە ئەنرێ بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.

(١٤) پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو ئاگرەیە كەوا بە درۆتان دائەناو باوەڕتان پێ نەئەكرد.

أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓا۟ أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ ۖ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ ۚ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾



(١٥) جا ئاخۆ ئەم ئاگرو دۆزەخە سیحرو جادووە، یان ئێوە کوێرن و بە چاوی خۆتان نایبینن؟

(١٦) بڕۆنە ناوی، خۆتانی تیا ڕابگرن یا نەگرن چونیەکە بۆتان، ئێوە جەزاتان بە گوێرەی کردەوەی خۆتان ئەدرێتەوە.

(١٧) بێگومان ئەوانەی لە خوای خۆیان ترساون لە دنیادا لەناو بەهەشت و نازو نیعمەتان.

(١٨) لەزەت وەرئەگرن بەوەی خوای خۆیان پێی داون و خوا لە ئاگری دۆزەخی پاراستوون.

(١٩) بخۆن و بخۆنەوەو خۆش و گەوارا بێ بۆتان بەهۆی ئەو کردەوە باشانەوە کە کردووتانن.

(٢٠) حاڵیان وایە پاڵ ئەدەن بە چەندین تەختی ڕیزکراوەوەو لەگەڵ حۆریی جوانی چاوقەوی جووتمان کردوون.

(٢١) ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو نەوەیان بە باوەڕەوە شوێنیان کەوتوون، ئەوانەو هەموو نەوەکانیشیان ئەخەینە ڕیزی ئەوان لە پایەی پاشەڕۆژاو هیچ لە کردەوەی وەچە پێشووەکان کەم ناکەین کە نەوەکانیان بە هۆی ئەوانەوە ئەو پایەیان دەسگیر ئەبێ و، هەرکەس بە کرداری خۆیەوە پابەندەو بەگوێرەی ئەوە پاداشی ئەدرێتەوە.

(٢٢) یارمەتییشیان ئەدەین لە بەهەشتا بە میوەو بە گۆشتی هەر گیاندارو پەلەوەرێ ئارەزوویان لێ بێ.

(٢٣) لەناو خۆیانا لە بەهەشتا پیاڵە شەرابی وا دەست بە دەست ئەدەن بە یەکتر کە نە خواردنەوەی گوناهەو نە پێیشی سەرخۆش ئەبن تا قسەی پڕوپووچ و هەلەق و مەلەق بکەن.

(٢٤) خوڵام و خزمەتکاری وای خۆیان بەدەوریانا ئەخولێنەوە بۆ خزمەت کردن و فەرمان بەجێهێنانیان، وەك دوڕی لەناو سەدەفا داپۆشراو وان.

(٢٥) هەندێکیان ڕووئەکەنە هەندێکی تریان لەناو خۆیانا پرسیارو وەڵام ئەکەن.

(٢٦) ئەڵێن: ئێمە لەمەوبەر لەناو خۆمانا لە عەزابی خوا ئەترساین.

(٢٧) خوایش لوتفی لەگەڵ کردین و منەتباری کردین و لە سزای ئاگری دۆزەخی پاراستین کە کار ئەکاتە کون و کەلەبەرەکانی لەش.

(٢٨) ئێمە لەمەوبەر کە لە دنیادا بووین هاوارمان هەر لەو ئەکرد. بەڕاستی هەر ئەو خاوەن ئیحسان و میهرەبانە

(٢٩) دەی پەندو ئامۆژگاریی خۆت بۆ ئەو خەڵکە بکەو گوێ مەدەرە قسەو قسەڵۆکی کەس، تۆ لەسایەی نیعمەتی خوای خۆتەوە نە جادووگەرو ئیددیعایغەیبزانینکەریت و نە شێتیشی.

(٣٠) یان ئەڵێن: ئەم کابرا شیعردانەرێکە چاوەڕوانی ئەوەین دڵداخورپێنی مەرگ بێ بەسەریاو بمرێ؟

(٣١) تۆیش، ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: چاوەڕوان بن، منیش لەگەڵ ئێوە لە چاوەڕوانانم.

أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَامُهُم بِهَٰذَا ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ ۚ
بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِ إِن كَانُوا صَادِقِينَ
﴿٣٤﴾ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا
السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ
رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ ۖ فَلْيَأْتِ
مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ ﴿٣٩﴾
أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ
يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾
أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ اللَّهِ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ وَإِن يَرَوْا كِسْفًا
مِّنَ السَّمَاءِ سَاقِطًا يَقُولُوا سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَاقُوا
يَوْمَهُمُ الَّذِي فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِي عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا
وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ
بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَارَ النُّجُومِ ﴿٤٩﴾

## سُورَةُ النَّجْمِ

ترتيبها ٥٣ — آياتها ٦٢



(٣٢) یـان عەقڵـە سووکەکەیان فـەرمانیان ئەداتێ ئەم قسە بێسـەروبەرانە بکـەن، یـان هــەر خۆیــان قــەومێکن لــە عــەنادو کەللەڕەقیدا لەسنوور لایان داوە؟
(٣٣) یان ئـەڵێن: ئـەم قورئانـەی بـۆ خـۆی هەڵیبەسـتووە؟ نەخـەیر ئەمانـە تـاقمێکن ئیمانیــان نییــەو هەرچــی ئــەڵێن لــەوەوە ئەیڵێن.
(٣٤) دەی بـا قسـەیەکی وا بهێـنن ئەگـەر ڕاست ئەکەن.
(٣٥) یا بۆ بیر لە بـوونی خۆیـان ناکەنـەوە: بێئەوەی دروستکەرێ هەبێ دروستی کردبن دروست بوون، یان خۆیان خۆیانیـان دروسـت کردووە؟
(٣٦) یــان ئــەوان ئاسمانــەکان و زەوییــان دروست کردووە؟ مەسەلەکە ئەوەیە ئەمانـە ڕوو لە شتی ڕاست و یەقین ناکەن و هەر لـە دووی گومان و خەیاڵات ئەگەڕێن.
(٣٧) یـا ئەمانـە گەنجینـەی ئاسمانـەکان و زەوییان لەژێر دەستایەو بـە دەسـتی ئەوانـە خـەڵاتی پێغەمبـەری بـە کـێ بـدەن، یـان ئەمانـەن بەسـەر هـەموو شـتێکا زاڵــن و چییان ئارەزوو لێ بێ ئەیکەن؟
(٣٨) یا ئەمانە پەیژەیەکیان هەیە بەسەریا سەرئەکەون بۆ ئاسمانەکان و گوێ لە قسـەی فریشتەکان ئەگرن؟ ئەگەر وایـە بـا ئـەوەیان کە گوێی لێگرتووە بە دەلیلێکی ئاشکراوە بێت ئیسپاتی بکا سەرکەوتووەو گوێی گرتووەو چیی گوێ لێ بووە بیگێڕێتەوە.
(٣٩) یان خوا کچی هەیەو ئێوە کوڕتان هەیە؟ (٤٠) یـان لـەوە زویـرن کـە تـۆ داوای کرێیـەکیان لێ ئەکـەی و ئـەوانیش باریان بە هۆی بژاردنەوەی ئەو کرێوە قورس کراوە؟ (٤١) یان دەفتەری غەیب و شتی نهێنییان لایـەو ئـەوان لـەڕووی ئـەو دەفتەرەوە زانستی ئەنووسنەوەو ئەزانن چی ڕووئەدا. (٤٢) یان ئەیانەوێ فێڵت لێ بکەن و بەپێی ڕاوێژەکـەی (دار النـدوە) لەناوت بەرن؟ ئەوانەی کافرن خۆیان فێڵیان لەگەڵ ئەکرێو لە ئەنجامی ئەوەدا لەناوئەچن و بەرباد ئەبن.
(٤٣) یاخود باوەڕیان وایە کە لە خوا بەولاوە خوایەکیان هەیە؟ خوا پاك و دوورە لەوە کە ئـەوان هاوبەشـی بـۆ دائـەنێن.
(٤٤) ئەوکافرانە ئەوەندە عەنادکارو بێباوەڕن تەنانەت ئەگەر چەند پارچـەیەکی ئاسمـانیش ببیـنن لـە ئاسمانـەوە بکەوێتـە خوارەوە بەسەریانا، ئەڵێن: پەڵە هەوری نیشتووەسەریەکەو بارانی لێوە ئەبارێ!
(٤٥) دە کەوایە لێیان گـەڕێ تـا بـەوڕۆژەی خۆیـان ئەگـەن کـە لـە هۆشـی خۆیـان ئەچـن تیایـا کـە ئـەو ڕۆژەیـە هـەموو زیندوویەکی تیا ئەمرێ.
(٤٦) ئەو ڕۆژەی کە هەرچی فڕوفێڵی دنیایانە بایی پوولێ سوودی نابێ بۆیان و کەس بە فریایان ناگا یارمەتییەکیان بدا.
(٤٧) بەڕاستی ئەوانەی کە ستەمکار بوون و لە دنیادا ئازاری خەڵکیان داوە سزایەکی تریشیان هەیە جگە لە سـزای ڕۆژی قیامەت، بەڵام بەشی زۆریان ئەوە نازانن.
(٤٨) دەی سا تۆ خۆت بگرە بۆ فەرمانی خوای خۆت و ورە بەرمەدە کە جارێ خـوا لێیـان گـەڕاوەو تـا کـاتی خـۆی دێ سزایان ناداو، خوای خۆت پاك و بێگەرد ڕاگرەو کاتێ لەخەو هەڵئەستی یا ڕاسـت ئەبیتـەوە بـۆ نوێـژ سـوپاس و ستایشـی بکە. (٤٩) شەویش هەر تەسبیحات و سوپاس و ستایشی بۆ بکەو کاتی ئاوابوونی ئەستێرەکانیش کە ڕۆژ ئەبێتەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ ۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾



## سووره‌تی (النجم)

**مه‌ککه‌یی‌یه ئایه‌تی ٣٢ی نه‌بێ و، (٦٢) ئایه‌ته**

(١) قه‌سه‌م به ئه‌ستێره که ئاوا ئه‌بێ، یا به به‌شێ له ئایه‌ته‌کانی قورئان که دێنه خواره‌وه. (٢) هاوڕێکه‌تان، که موحه‌ممه‌ده‌و به پێغه‌مبه‌ری هاتووه‌ته سه‌رتان، نه ڕێی ڕاستی لێ وێڵ بووه‌و نه بیروباوه‌ڕی پڕوپووچی هه‌ڵگرتووه. (٣) له ئاره‌زووی نه‌فسی خۆیشیه‌وه قسه ناکا. (٤) ئه‌وه‌ی که ئه‌و ئه‌یخوێنێته‌وه به‌سه‌رتانا له وه‌حی به‌ولاوه نییه که له خواوه وه‌حیی بۆ ئه‌کرێ. (٥) فریشته‌یه‌کی فره به‌هێز که جیبره‌ئیلی فریشته‌ی وه‌حیه ئه‌م وه‌حیه‌ی فێرکردووه که له خواوه بۆی ئه‌هێنێ. (٦) خاوه‌نی عه‌قڵێکی زۆر کامڵ و ته‌واوه‌و، به‌و شێوه‌ی ڕاسته‌قینه‌ی خۆیه ڕاوه‌ستا که خوا وای دروست کردووه. (٧) له حاڵێکا که له که‌ناری ئاسمانی به‌رزا بوو. (٨) پاشان له پێغه‌مبه‌ر نزیك بووه‌وه‌و داپه‌ڕی بۆ لای. (٩) به جۆرێ که پێوانه‌ی نێوانی ئه‌وو پێغه‌مبه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی دوو که‌وان یا له‌وه نزیکتر بوو، واته ئه‌وه‌نده‌ی دوو که‌س به‌رانبه‌ری یه‌ك دانیشن و هه‌ریه‌که که‌وانه‌که‌ی خۆی له به‌رده‌می خۆیا دانێ.

(١٠) جا جیبره‌ئیل وه‌حیی کرد بۆ لای به‌نده‌ی خوا که پێغه‌مبه‌ره ئه‌وه‌ی که خوا به هۆی ئه‌وه‌وه وه‌حیی کردبوو بۆ لای.

(١١) دڵی پێغه‌مبه‌ر درۆی نه‌کرد له‌گه‌ڵ چاوی له‌وه‌دا که به چاوی خۆی بینیی. واته: ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر به دڵ حاڵیی بوو و به چاوی دڵ تێیگه‌یشتبوو گشتی ڕاست بوو، واته: دڵی پێغه‌مبه‌ر به چاوی ووت: ئه‌وه‌ی تۆ دیت هه‌ر ئه‌وه بوو منیش تێیگه‌یشتم، به‌و مه‌عنا که دڵ و چاو وه‌ك یه‌ك و هاوجووت بوون له تێگه‌یشتن و بینینی جیبره‌ئیلا. (١٢) ئایا ئێوه موجاده‌له‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌که‌ن له‌باره‌ی ئه‌وه‌وه که دیویه‌تی؟ (١٣) به‌ڕاستی پێغه‌مبه‌ر جارێکی‌تریش جیبره‌ئیلی دیوه له داپه‌ڕینێکی ترا. (١٤) لای داری سیدره‌تولمه‌نته‌هادا. (١٥) که جه‌ننه‌تولمه‌ئوا، که جێگای ئه‌رواحی ئه‌هلی ته‌قوایه، له نزیکی ئه‌و داره‌وه‌یه. (١٦) له‌و کاته‌دا که داری سیدره‌تولمونته‌های داپۆشیبوو ئه‌وه‌ی که داپۆشیبوو که شتێکی ئه‌وه‌نده مه‌زن بوو و ئه‌وه‌نده زۆر داپۆشیبوو نه باسی ئه‌کرێ‌و نه ئه‌یشژمێررێ. (١٧) چاوی پێغه‌مبه‌ر نه لای‌دا له‌وه‌ی که ئه‌یبینی و نه ئه‌م‌لاو ئه‌ولای کرد. (١٨) به‌ڕاستی له نیشانه گه‌وره‌کانی خوای خۆی دی. (١٩) پێم بڵێن: ئایا ئێوه لات و عوززاتان دیوه؟ (٢٠) مه‌ناته سێهه‌مه‌که‌ی تریشتان دیوه؟ واته: پێم بڵێن ئه‌مانه شایانی ئه‌وه‌ن که‌سێ بیپه‌رستێ؟ ئه‌مانه ناوی سێ بتن له‌و بتانه‌ی خێڵه عه‌ره‌به‌کانی حیجاز په‌رستوویانن. (٢١) ئایا ئێوه خۆتان نه‌وه‌ی نێرینه‌تان هه‌یه‌و بۆ خوایش نه‌وه‌ی مێیینه هه‌یه؟ (٢٢) ئه‌گه‌ر وابێ ئه‌مه دابه‌شکردنێکی ناڕه‌واو نادادپه‌روه‌رانه‌یه ئه‌وه‌ی بۆ خۆتان ناتانه‌وێ بۆ ئه‌وی دانێن! (٢٣) ئه‌و بتانه‌ی ئێوه ئه‌یانپه‌رستن له چه‌ند ناوێ به‌ولاوه نین که خۆتان و باوو باپیرانتان لێتان ناون نه خوان و نه هیچ و هیچ سیفه‌تێکی خوایه‌تییان تیایه‌و خوا هیچ به‌ڵگه‌یه‌کی بۆ خوایه‌تیی ئه‌و بتانه نه ناردووه‌ته‌خواره‌وه. ئه‌وانه‌ی ناوی خوایان له‌م بتانه ناوه ته‌نها شوێنی گومان و خه‌یاڵ و شتێ ئه‌که‌ون که نه‌فسی خۆیان ئاره‌زووی ئه‌کا، که‌چی هیدایه‌ت و ڕێ‌پیشاندانیشیان له خواوه بۆ هاتووه‌و ئه‌بوو شوێنی ئه‌و هیدایه‌ت و ڕێ پیشاندانه‌ی خوا بکه‌ون، به‌ڵام شوێنی نه‌که‌وتن و شوێنی چاولێکه‌ریی باوو باپیرانیان و خه‌یاڵ و هه‌واو هه‌وه‌سی نه‌فسی خۆیان که‌وتن. (٢٤) یا ئایا ئاده‌مزاد ئاره‌زووی هه‌رچی بکا بۆی ئه‌بێ؟ دیاره نه‌خێر! (٢٥) چونکه دنیاو قیامه‌ت هه‌مووی هیی خوایه، چیی لێیان به هه‌رکه‌سێ ئه‌دا ئه‌یداو چی نادا نایدا. (٢٦) چه‌ندین فریشته له ئاسمانه‌کان و زه‌ویدا هه‌ن تکاکارییان هیچ سوودێ به که‌س ناگه‌یه‌نێ پاش ئه‌وه نه‌بێ خوا ڕێگایان بدا تکا بۆ هه‌رکه‌سێ بکه‌ن که خۆی مه‌یلی لێ بێ و پێی ڕازی بێ.

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾
وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ
ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن
سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا
فِى ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟
بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَـٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ ۚ
إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ
وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ ۖ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ
بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ
﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ
مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ
﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ
يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ
﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾



(٢٧) بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە ناوی فریشتەکان وەك ناوی کچ ئەهێنن.

(٢٨) هیچیش لە مەسەلەکە نازانن و ئاگایان لێ نییەو شوێنی گومان ئەبێ ناوکەون و گومانیش لەبارەی زانینی ڕاستییەوە هیچ دادێ نادا و سوودی نییە.

(٢٩) دەی خۆت لادە لە کەسێ کە پشتی لە ناوهێنان و پەرستنی ئێمە کردبێ و لە ژیانی دنیا بەولاوە هیچی نەویستبێ.

(٣٠) دنیاو ئارەزووی دنیا ئەو ڕادەیەیە کە پایەی زانستی ئەوانەی پێ گەیشتووەو لەوە تێپەڕی نەکردووە. بێ‌گومان خوای تۆ لە هەرکەس باشتر ئەزانێ کێ ڕێی خۆی وێڵ کردووەو لێی تێکچووەو باشتریش ئەزانێ کێ هیدایەتی خوای وەرگرتووە.

(٣١) ئەوەی لە ئاسمانەکان و لە زەوییایە هیی خوایە تا سزای ئەو کەسانە بدا کە خراپەیان کردووە بەگوێرەی کرداری خۆیان و، پاداشی ئەوانەیش بداتەوە کە چاکەیان کردووە بە باشتر لە چاکەکەی خۆیان کە بەهەشتە.

(٣٢) کە چاکەکەرەکانیش ئەوانەی خۆیان لە گوناهی گەورەو لە کاری نالەباری بێ‌ناموسی دوورئەگرن، گوناهی بچووك و وردە نەبێ ئەوە خوا لێی خۆش ئەبێ و، لێبووردن و بەخششی خوای تۆیش بە دەرەتان و بەربڵاوە. خوا لە ئێوە خۆتان شارەزاترە لە حاڵ و ئەحواڵتان چ لەوکاتەدا کە ئێوەی لە خۆڵ دروست کردو چ لەوکاتەیشا کە هێشتا ناولەمەن لە سکی دایکەکانتانا، کەواتە خۆتان بە خاوێن و بێ گوناه دامەنێن، ئەو خۆی لە هەموان شارەزاترە کێ خۆی لە گوناه پاراستووە.

(٣٣) ئایا تۆ ئەو کابرات دیوە کە پشتی لە موسوڵمانەتی هەڵکردو پاشگەز بووەوە؟

(٣٤) کە کەمێکی ماڵی خۆی دا بە برادەرەکەی و ئەوی کەی لێ گرتەوەو نەیدایە؟

(٣٥) ئایا ئەوکابرایە ئاگای لە ئەسراری خوا هەیەو پێی ئەزانێ؟

(٣٦) یان خەبەری ئەوەی نەدراوەتێ کە لە پەڕە وەحیەکانی مووسادا هەیەو..

(٣٧) لە پەڕە وەحیەکانی ئیبراهیمیشا هەیە؟ ئەو ئیبراهیمەی چیی لە ئەستۆی خۆی گرتبوو بەجێی‌هێناو خۆی دا بە دەستی خێڵە بت پەرستەکەیەوە فڕێیان دایە ناو ئاگرەوەو، ئەوەیش کە لە پەڕەکانی مووساو ئیبراهیما هەیە ئەوەیە..

(٣٨) کەوا هیچ تاوانبارێ تاوانی کەسێکی تری ناگرێتە ئەستۆو،

(٣٩) کەسیش هیچی دەسگیر نابێ بەرهەمی کردەوەی خۆی نەبێ و،

(٤٠) سەعی و تێکۆشانیشی لە ڕۆژی خۆیا کە ڕۆژی قیامەتە ئەبینرێ و،

(٤١) پاشانیش جەزای پڕبەپێستی خۆیی بەرانبەر بە کردەوەکانی ئەدرێتەوەو،

(٤٢) ئەنجامی کاریش بۆ لای خوای خۆت ئەگەڕێتەوەو،

(٤٣) هەر خوا خۆیشیەتی ئادەمزاد پێئەکەنێنێ و ئەیگریێنێ، واتە دڵی خۆش یا خەفەتبار ئەکاو،

(٤٤) هەر ئەو خۆیشیەتی ئادەمزاد ئەمرێنێ و زیندوویشی ئەکاتەوەو،

وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ
عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ
ٱلشِّعْرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾
وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ
أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾
هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلْـَٔازِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيْسَ لَهَا مِن
دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ
وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ۩ ﴿٦٢﴾

## سُورَةُ القَمَرِ

ترتيبها ٥٤ — آياتها ٥٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟
وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُوا۟ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ۚ
وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ
مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ ۖ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ
﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ ۘ يَوْمَ يَدْعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَىْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾



(٤٥) هەر ئەو خۆیشیەتی هەردوو هاوجووتی نێرو مێی دروست کردووە.
(٤٦) لە دڵۆپە تۆمێ کاتێ کە ئەکرێتە منالدانی مێیینەوەو،
(٤٧) دروستکردنەوەی دووبارەیشی هەر لەسەر ئەو خوایە خۆیەتی و،
(٤٨) هەر ئەو خوایە خۆیشیەتی ئادەمزاد دەوڵەمەند ئەکاو وای لێ ئەکا قنیات بکا بەوەی کە هەیەتی و،
(٤٩) هەر ئەو خۆیەتی خوای ئەستێرەی گەلاوێژیشەو، (٥٠) هەر ئەویش بوو خێڵی کۆنی عادی فەوتاندو،
(٥١) سەموودیشی فەوتاندو کەسی لێ نەهێشتنەوەو،
(٥٢) خێڵی نووحیشی بەر لەوان فەوتاند. خێڵی نووح لە خێڵی عادو سەموود ستەمکارترو توغیانکردووتر بوون و،
(٥٣) شارستانی موئتەفیکەیشی سەرەوژێر کرد کە هیی قەومی لووط بوو،
(٥٤) ئیتر شارستانی موئتەفیکە ئەوەی بەسەرا هات کە بەسەریا هات.
(٥٥) کەواتە تۆ، ئەی موحەممەد، لە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆت بە گومانی؟ (٥٦) ئەم قورئانە یەکێکە لەو کتێبە ترسێنانەی زووتر بە هۆی پێغەمبەرانەوە هاتوون بۆ بەرەی ئادەمزاد. (٥٧) ئەوەی نزیکە ڕوویدا، کە ڕۆژی قیامەتە، نزیك بووەتەوە. (٥٨) لەخوا بەولاوە کەس نییە بتوانێ لایبدا. (٥٩) دەی ئایا سەیرتان لەم قورئانە دێ و،(٦٠) پێی پێئەکەنن و گاڵتەی پێ ئەکەن و ناگرین لە خەفەتی ئەو زیانانەی لە خۆتانتان داوەو،
(٦١) ئێوە بێئاگایانەیش ڕائەبوێرن.(٦٢) کەواتە دەی سوجدە بەرن بۆ خواو سەری بۆ بخەنە سەر زەوی‌و بیپەرستن.

## سوورەتی (القمر)

**مەککەیی‌یە ئایەتەکانی ٤٤ — ٤٦ی نەبێ و، (٥٥) ئایەتە**

(١) ڕۆژی قیامەت نزیك بووەوەو مانگ لەت بوو. (٢) ئەگەریش ئەم کافرانە نیشانەیێ ببینن بەڵگە بێ بۆ توانایی خوا، گوێی نادەنێ و موبالاتی پێ ناکەن و ئەڵێن: ئەمە جادووەو شتێکی باوو بەردەوامە.
(٣) پێغەمبەریش بە درۆزن دائەنێن و شوێنی ئارەزووی نەفسی خۆیان ئەکەون و، هەرکارێکیش بگری لەئەنجامێکا ئەگیرسێتەوە بە سەرکەوتن بێ یا بە ژێرکەوتن لە دنیاداو، بە بەختیاری یا بە چارەڕەشی لە قیامەتا.
(٤) بەڕاستی ئەم کافرانە ئەوەندە دەنگوباسی ئوممەتانی پێش خۆیانیان لە قورئانا بۆ باس کراوە کەوا چۆن فەرمانی خواو پێغەمبەرانی خوایان جێبەجێ نەکردو چۆن خوایش غەزەبی لێ‌گرتن و بەربادی کردن، جۆرێ لە لووت دان و ڕێی خراپە لێگرتنی تیابێ بۆ هەرکەسێ لە سزای خوا بترسێ.
(٥) ئەو دەنگوباسەی پێشینان کە لە ڕێگای قورئانەوە گەیشتووەتە ئەم کافرانە حیکمەتێکی ئەوتۆیە گەیشتووەتە پایەی بەرزی خۆی‌و، لەوە بەولاوە ترساندن و هەڕەشە سوودێکی نییەو داد نادا.
(٦) مادام وایە پشتیان لێ هەڵکەو گوێیان مەدەرێ، ئەو ڕۆژەی کە بانگ‌کەر، کە ئیسرافیلی مەئمووری مراندن و زیندووکردنەوەی خەڵکە لە ڕۆژی قیامەتا، بانگیان ئەکا بۆ شتێکی ناخۆش و نا بەدڵ کە ڕووکردنە مەیدانی مەحشەرو لێپرسینەوەی کردەوەیانە لە دنیادا.

خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴿٧﴾
مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ ﴿٨﴾ ۞ كَذَّبَتْ
قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا
رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ
﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾
وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ
كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ
عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ
﴿١٧﴾ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ
رِيحًا صَرْصَرًا فِى يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ
نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ
لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٢٢﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرًا
مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ
مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ
ٱلْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾



(٧) چاویان شۆڕە لە ترسی کردەوەکانی دنیایان و لە گۆڕەکانیان دێنەدەر. ئەڵێی کوللەی بە زەویدا بڵاوە لێ کردوون.
(٨) مل دائەنەوێنن و بە پەلەپەل بەدەم بانگی چوون بۆ مەحشەرەوە ئەچن. کافران ئەو ڕۆژە ئەڵێن: ئەمڕۆ ڕۆژێکی سەختە.
(٩) بەر لەوانیش قەومەکەی نووح نووحیان بە درۆزن دانا، نووحی بەندەی ئێمەیان بە درۆزن داناو وتیان: شێتەو نەیانئەهێشت ئامۆژگارییان بکا.
(١٠) نووحیش هاواری کردە خوای خۆی و وتی: خوایە! من بەدەست ئەم کافرانەوە بەزیوو ژێرکەوتووم، دەرەقەتیان نایەم، یارمەتیم بدەو سەرم بخە.
(١١) ئێمەیش دەرگای ئاسمانمان کردەوە بە باراندنی بارانێکی شەستەباران کە بە خوڕ ئەهاتە خوار.
(١٢) زەویشمان هەڵقوڵاند بە چەندین کانیاوو سەرچاوە وەك بڵێی زەوی هەمووی کەوتووەتە سەرئاو، جا ئاوی ئاسمان و ئاوی زەوی لەسەر فەرمانێ کە لە خواوە دەرچووبوو، بەیەك گەیشتن.
(١٣) نووحیشمان لەسەر کەشتییەکی خاوەن پارچە تەختەو بزماری زۆرێ پیاداکوتراو، هەڵگرت.
(١٤) کەشتییەکە لەبەرچاوی ئێمەو بە چاودێریی ئێمە بەسەر ئاوا ئەڕۆیشت، ئەمەیش پاداشی ئەو پێغەمبەرە بوو کە ئوممەتەکەی ئینکاریان کردو باوەڕیان پێ نەکردو دوای‌نەکەوتن.
(١٥) بەڕاستی ئێمە کەشتییەکەیشمان پاش بڕانەوەی تۆفانەکە هێشتەوە بۆ ئەوەی نیشانە بێ بۆ لەوەپاش لەسەر توانایی خوا. دەی کەسێ هەیە بیر لەمە بکاتەوەو پەندو ئامۆژگاریی لێ وەربگرێ؟
(١٦) دەی سزاو ترساندنی من بۆ کافرەکانی ئوممەتی نووح چۆن بوو؟
(١٧) بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئامادە کردووە بۆ هەرکەس بیخوێنێتەوەو تێی‌بگاو یادی خوای پێ بکاتەوە. دەی کەسێ هەیە بییەوێ یادی خوا بکاتەوەو پەندو ئامۆژگاریی لێ وەربگرێ؟
(١٨) خێڵی عادیش پێغەمبەرەکەی خۆیانیان بە درۆزن داناو باوەڕیان پێ نەکرد. دەی سزاو ترساندنی من بۆ خێڵی عاد چۆن بوو؟ (١٩) بەڕاستی ئێمە بایەکی توندی ساردی پڕ دەنگە دەنگ و هاژەهاژمان لە ڕۆژێکی شوومی وادا ناردە سەریان شوومییەکەی نە نەبڕایەوە. (٢٠) ئادەمزادی هەڵئەگرت، ئەتوت ڕیشەی دارخورمای هەڵکەنراوی لە زەویدا کەوتوون. (٢١) دەی سا سزاو ترساندنی من چۆن بوو؟ (٢٢) بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئامادە کردووە بۆ هەرکەس بیخوێنێتەوەو تێی‌بگاو یادی خوای پێ بکاتەوە. دەی کەسێ هەیە بییەوێ یادی خوا بکاتەوەو پەند وەربگرێ؟ (٢٣) خێڵی سەموود باوەڕیان بەو ترساندنانە نەکرد کە پێغەمبەرەکەیان لە خوای ئەترساندن پێیان.
(٢٤) وتیان: چۆن ئەبێ ئێمە شوێنی یەك کەس لە خۆمان بکەوین کە تەنها خۆی بێ و کەسی لەگەڵ نەبێ؟ ئەگەر شتی وا بکەین دیارە ئێمە لە گومڕاهی‌و شێتیداین.
(٢٥) ئایا لەناو ئێمەدا کەلامی خوا هەر بۆ سەر ئەو هاتووە؟ نەخەیر وا نییەو، ئەو فروستادەی خوا نییە، بەڵکو درۆزنێکی زۆر خراپ و خۆپەسەندە؟ (٢٦) سبەینێ ئەزانن کێ درۆزنی زۆر خراپ و خۆپەسەندە.
(٢٧) ئێمە ئەو وشترەیان بۆ ئەنێرین کە داوایان کردووە، بۆئەوەی تاقییان بکەینەوەو دەرکەوێ ئاخۆ ڕاست ئەکەن ئەگەر بۆمان ناردن ئیمان دێنن، جا چاوەڕوان بەو سەبریان لێ بکە بزانە چی ئەکەن و سەرەنجام چۆن ئەبێ.

وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ ۖ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْا۟ صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَكَانُوا۟ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٣٢﴾ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍۭ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ ۖ نَّجَّيْنَٰهُم بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا۟ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِۦ فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا۟ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُوا۟ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدْ جَآءَ ءَالَ فِرْعَوْنَ ٱلنُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَٰهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٤٢﴾ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُو۟لَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾



(٢٨) ئاگاداریشیان بکە کەوا ئاوەکەیان بەش کراوە لەنێوانیانا ڕۆژێ بۆ ئەوانەو ڕۆژێ بۆ وشترەکەیە، هەر بەشێ ئامادە کراوە بۆ خاوەنی خۆی.

(٢٩) جا ئەوانیش خۆیان لەسەر ڕاگرتنی ئەو جۆرە دابەشکردنەی ئاوەکە پێ ڕاگیر نەکرا. بانگیان کردە هاوڕێکەی خۆیان، ئەویش زاتی کرد وشترەکە سەربڕێ و چوارپەلی بڕییەوە.

(٣٠) دەی سزاو ترساندنی من بۆ ئەوان چۆن بوو؟ (٣١) بەڕاستی ئێمە دەنگێکی بەسام و پڕترس و لەرزمان نارده سەریان، نیتر ئەوانیش بەو دەنگە وەك پلوپووشی وشکەڵاتووی ناو دەستی کەسێکیان لێ هات کە بۆ فڕێدانە بەر ئاژەڵی ناوپەچەی ئامادە کردبێ.

(٣٢) ئێمە بەڕاستی قورئانمان ئامادە کردووە بۆ یادکردنەوەی خوا کەسێ بیخوێنێتەوەو یادی خوای پێ بکاتەوە. جا ئاخۆ کەسێ هەیە یادی خوا بکاتەوە؟

(٣٣) بەر لەوان قەومی لووطیش ئەو ترساندنانەیان بە درۆ دانا کە نێررانە سەریان و لە سزای خوایان ترساندن.

(٣٤) بەڕاستی ئێمە بایەکی توندمان هەڵکردە سەریان بەردی بەسەرا ئەباراندن، کەسیان لێ دەرنەچوو تەنیا ماڵ و منداڵە موسوڵمانەکەی لووط نەبێ لە بەرەبەیانێکا ڕزگارمان کردن. بەڵێ ژنەکەی لووط کە لەگەڵ کافرەکان بوو ئەویش فەوتا، وەك لە ئایەتی‌ترا باسی کراوە. (٣٥) ئەم ڕزگارکردنەیشیان نیعمەت بوو لەلایەن ئێمەوە بۆیان و، ئێمە ئاوا پاداشی هەرکەسێ ئەدەینەوە کە سوپاسی نیعمەتمان بکا بە پەرستن و فەرمانبەرداری کردنمان. (٣٦) بەڕاستی لووط خێڵەکەی خۆی لە هەڵمەت و تێسرەواندنی ئێمە ترساند، بەڵام ئەوان گومانیان ئەکرد لە ڕاستیی هەڕەشەو ترساندنەکانی ئێمە. (٣٧) ئەوانیش ویستیان کاری بێ‌ڕەوشتانە لەگەڵ میوانەکەی لووط بکەن. ئێمەیش ڕووناکیی چاویانمان کوژاندەوەو چاومان وەك ڕوویان تەخت کردو ئیتر هیچیان نەما پێی ببینن. دەی سا با سزای من و ئەنجامی هەڕەشەو ترساندنەکانم بچێژن. (٣٨) بەڕاستییش سبەینانێ سزایەکی درێژەکێشاو دای بەسەریاناو لێیان نەگەڕا تا تاقی لێ بڕین. (٣٩) دەی‌سا سزای من و ئەنجامی هەڕەشەو ترساندنەکانم بچێژن. (٤٠) ئێمە بەڕاستی قورئانمان ئامادە کردووە بۆ یادکردنەوەی خوا کەسێ بیخوێنێتەوەو یادی خوای پێ بکاتەوە. جا کەسێ هەیە یادی خوا بکاتەوە؟ (٤١) بەڕاستی هەڕەشەو ترساندنی خوا بە زمانی مووساو هاوروونەوە هاتە سەر دەستەو دائیرەی فیرعەون. (٤٢) ئەوانیش هەموو نیشانەو بەڵگەکانی ئێمەیان لەسەر پێغەمبەرایەتیی مووساو هاروون بەدرۆ دانا، جا ئێمەیش ئەوانمان بە گرتنی خاوەن عیززەت و توانێك گرت و لەناومان بردن. (٤٣) جا ئەی کافرانی قورەیش! ئایا کافرەکانی ئێوە لەو گشتە کۆمەڵە کافرانەی ناومان هێنان و لەناومان بردن چاکترن، یا ئێوە ڕزگاری‌نامەیەکتان لە سزا لە کتێبە ئاسمانییەکانا هەیە؟ (٤٤) یاخود ئەڵێن: ئێمە کۆمەڵێکین زاڵ و کەس ناتوانێ بمانبەزێنێ؟. (٤٥) ئەم کۆمەڵە کافرە لەمەولا لە جەنگدا ئەبەزن و پشت پێ هەڵئەکەن. (٤٦) بەڵکو ڕۆژی قیامەت وادەی سزادانی سەرەکییانەو، ڕۆژی قیامەتیش بەڵایەکی لە شکانی دنیا ناڵەبارترو تاڵ و سەختترە. (٤٧) بێ‌گومان تاوانبارەکان لە گومڕاهی و ئاگری ناو دۆزەخی ڕۆژی دواییدان. (٤٨) لەو ڕۆژەدا لەسەر ڕوو بەسەر ئاگری دۆزەخا ڕائەکێشرێن و پێیان ئەوترێ: لێکەوتنی ئاگری دۆزەخ بچێژن. (٤٩) بەڕاستی ئێمە هەموو شتێکمان لەسەر ئەندازەو هەڵسەنگاندن و بە پێی حیکمەتێك دروست کردووە.

وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ
أَشۡيَاعَكُمۡ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ
فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ
فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴿٥٥﴾

## سُورَةُ الرَّحۡمَٰنِ

مدنية ٥٥ — آياتها ٧٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴿٣﴾
عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ﴿٤﴾ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ﴿٥﴾ وَٱلنَّجۡمُ
وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ﴿٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ
﴿٧﴾ أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ
وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴿١٠﴾
فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ
وَٱلرَّيۡحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ خَلَقَ
ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ
مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ ﴿١٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾



(٥٠) فەرمانی ئێمە لە تاقە یەك وشە بەولاوە نییە وەك ئیشارەتێك بە چاو.
(٥١) بەڕاستی ئێمە هاووێنەكانی ئێوەمان لە كافریو خوانەناسیدا تەفرو توونا كرد، جا كەس هەیە بیربكاتەوەو پەندو عیبرەت وەربگرێ؟
(٥٢) هەرچیش ئەوان كردوویانە لە كتێبەكانی كردەوەیانا هەیەو پارێزراوە.
(٥٣) هەموو كردەوەیەكی بچووك و گەورەیش لە دەفتەری كارا نووسراوە.
(٥٤) بەڕاستی ئەوانەی لەخوا ئەترسن لەناو بەهەشت و لە كەناری ئاوی ڕەوانان.
(٥٥) لە نشینگەی پەسەندو بەدڵا دائەنیشن لای پادشایەكی توانا كە خاوەندی ئەم جیهانەیە.

### سوورەتی (الرحمن)

**مەدینەیی‌یە یا مەككەیی‌یە یا بەش بەشەو، (٧٨) ئایەتە**

(١) خوای فرە بەڕەحم و میهرەبان.
(٢) موحەممەدی پێغەمبەری خۆی فێری قورئان كرد.
(٣) ئادەمزادی دروست كرد.
(٤) نیشانی دا كە چۆن بتوانێ ئەوەی لە دڵیایە بیڵێو دەری ببڕێ.
(٥) مانگ و ڕۆژ ڕەوتی خۆیان ئەكەن و ڕێی خۆیان ئەبڕن لەسەر حیسابێكی دیاری بۆ هەڵهاتن و ئاوا بوونیان.
(٦) گیای لە زەوی سەردەرهێناوی بێ‌ساق و درەختی بەرزی ساقدار سوجدەی بەگەورەزانین بۆ خوا ئەبەن.
(٧) خوا ئاسمانی بەرز ڕاگرتووە بەسەر زەویدا و ترازووی داناوە بۆ هاتوچۆی ئەستێرەكانی ئاسمان یا بۆ پاراستنی حەقی هەر كەسێ تا كەس ناحەقی لەكەس نەكا.
(٨) بۆئەوەی ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزاد، لە ڕاگرتنی ترازوو لانەدەن و حەقی هیچ كەسێ بە لای كەسی ترا دانەشكێنن.
(٩) ترازوو ڕابگرن بە دادپەروەری و لە كێشانەدا زیان بە كەس مەگەیەنن كە بۆ خۆتان قورس و بۆ ئەوانی سووك بكێشن. (١٠) خوا زەویی داناوە بۆ ئادەمزادو پەرییان.
(١١) هەیە لە زەویدا میوەو دارخورمای خاوەن بەرگ كە بۆ ئەوەیە خورماكەی تێدا پەروەردە ببێ.
(١٢) دانەوێڵەی وەك گەنم و جۆو هیی تری خاوەن كاو، ڕێحانەیشی تیایە.
(١٣) دەی كەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە كام نیعمەت لە نیعمەتەكانی خوای خۆتان بێ‌باوەڕن و ئینكاری ئەكەن؟
(١٤) خوا ئادەمزادی دروست كردووە لە گڵێكی وشكی وەك سواڵەت.
(١٥) پەرییانیشی دروست كردووە لە بڵێسەیێكی سافی ئاگر، واتە لە ئاگری پاك و ساف و بێگەردی دروست كردوون كە هیچی تری تێكەڵ نییە.
(١٦) دەی كەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە كام نیعمەت لە نیعمەتەكانی خوای خۆتان بێ‌باوەڕن و ئینكاری ئەكەن؟

رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾



(١٧) خوا خوای دوو خۆرهەڵاتی بەهارو پاییزو دوو خۆرنشینی بەهارو پاییزە.
(١٨) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟ (١٩) دوو دەریای سوێرو شیرینی ناردووە تا سنووریَ کە تیا ئەگەنەیەك. (٢٠) لەنێوان ئەو دوو دەریایەدا پەردەیەکی قودرەتی هەیە بە هۆی ئەو پەردەوە هیچ کام لە دوو دەریا سوێرو شیرینەکە دەسدرێژی ناکا بەسەر ئەویانا.
(٢١) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟ (٢٢) مرواری و مەرجان لەو دوو دەریا سوێرو شیرینەوە دێنەدەر.
(٢٣) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟ (٢٤) خوا گەلەکەشتیی بایەوان هەڵدراویشی هەیە کە بەناو دەریادا ئەڕۆن و وەك چیا وان لە بەرزیو گەورەییدا.
(٢٥) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟ (٢٦) هەموو ئەوانەی بەسەر ئەرزەوەن فەوتاوو لەناوچوون.
(٢٧) تەنها زاتی خوای پەروەردگاری تۆ ئەمێنێتەوە کە لە هەموو کەسیَو لە هەموو شتیَ بێئیحتیاجەو فەزڵ و گەورەییی بەسەر هەموانا هەیە.
(٢٨) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟ (٢٩) خوا خوایەکی وایە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و لە زەویدان پرسیارو داوای لیَ ئەکەن لە هەموو بابەتیَ و، لە هەموو کات و ساتێکا لە بەجێهێنانی نیازێك و دروستکردنی شتێکایە.. (٣٠) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٣١) بێگومان لەمەولا دەمان بەتاڵ ئەبیَ بۆ لێپرسینەوەو حیساب و کیتاب لەگەڵ کردنتان لەو دنیادا ئەی جووتە کۆمەڵەکەی ئادەمزادو پەرییان. (٣٢) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟ (٣٣) ئەی کۆمەڵی پەری و ئادەمزاد ئەگەر ئەتوانن لە ئەتراف و لاکانی ئاسمانەکان و زەوییەوە دەرچن، دەرچن. ناتوانن دەرچن بە زۆرو هێز نەبیَو خۆ زۆرو هێزیشتان نییە، یا ناتوانن دەرچن بە دەسەڵاتیَ نەبیَ کە خوا بتانداتیَ و بۆ خۆتان هیچتان بۆ ناکریَ. (٣٤) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟ (٣٥) ئەنێررێتە سەرتان چەند بڵێسەییَ لە ئاگرو مسی تواوەو کە ئەوەتان نێررایە سەر ئیتر زاڵ نابن و ناتوانن لە ئەتراف و لاکانی ئاسمان و زەوی دەرچن. (٣٦) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٣٧) جا کاتیَ کە ئاسمان لەت لەت بوو و سوور هەڵگەڕاو بوو بە گوڵاڵە سوورەیەکی وەك چەرمی سوور، (٣٨) ئەوکاتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٣٩) لەو ڕۆژەدا کە مردووان زیندوو ئەکرێنەوەو ئەبرێن بۆ ئەو وێستگەیەی تیایدا ڕائەوەستێنرێن، پرسیار ناکریَ نە لە ئادەمزادو نە لە پەری لە بارەی تاوانەکانیانەوە، چونکە بە سەرو سیمایاندا دیارە کیَو چ کارەن. (٤٠) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟

يُعۡرَفُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ بِسِيمَٰهُمۡ فَيُؤۡخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلۡأَقۡدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ
﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَ حَمِيمٍ ءَانٖ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٤٥﴾ وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيۡنَانِ
تَجۡرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ
زَوۡجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشِۭ
بَطَآئِنُهَا مِنۡ إِسۡتَبۡرَقٖۚ وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ
وَلَا جَآنّٞ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلۡيَاقُوتُ
وَٱلۡمَرۡجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلۡ جَزَآءُ
ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٦١﴾ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٦٣﴾ مُدۡهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا
عَيۡنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾



(٤١) تاوانباران بە سەرو ڕوویانا ئەناسرێنەوە کە خەم و پەژارە دایگرتوون، بە پێشەسەرو بە پێ ئەگیرێن و ئەدرێنەبەر بۆناو دۆزەخ.
(٤٢) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٤٣) ئەمە کەوا لە بەرچاوتانایە ئەو دۆزەخەیە کەوا تاوانباران بە درۆی دائەنێن و باوەڕی پێناکەن. (٤٤) لەنێوان ئاگری ئەوو ئاوێکی فرە گەرمی کوڵبەکوڵا دێن و دەچن.
(٤٥) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٤٦) بۆ ئەوانەیش کە لەوەی خوای خۆی ترساون کە ئەوەستێ بۆ حیساب و کیتاب کردن لەگەڵ بەندەکان، دوو بەهەشت هەیە: بەهەشتێکیان بۆ ئادەمزادەکانیان و ئەویان بۆ پەرییەکانیان.
(٤٧) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٤٨) ئەو دوو بەهەشتە دارو درەخت و میوەو لق و پۆپی زۆریان هەیە. (٤٩) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟(٥٠) ئەو دوو بەهەشتە دوو کانیاوی ڕەوانیان تیایە.
(٥١) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟(٥٢) لەو دوو بەهەشتەدا لەهەر میوەیێ دوو جۆری ناسراوو نەناسراو یا دوو جۆری تەڕو وشك هەیە. ( ٥٣) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٥٤) ئەوانەیش کە لەو بەهەشتانەدان پاڵ ئەدەنەوە بە ڕایەخی واوە ناوەکەی ئاوریشمی ئەستوورە، ئیتر ئەبێ دەرەکەی چی بێ و، لێکردنەوەی میوەی بەهەشتەکانیش نزیکەدەستەو هەستانەوەی ناوێ. (٥٥) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟(٥٦) لەو بەهەشتانەدا حۆریی وا هەن چاویان تەنها لە مێردەکانی خۆیانەو ناڕواننە کەسی ترو بەر لە مێردەکانیان کەسی تر، نە ئادەمزادو نە پەری، لاقەی نەکردوون و دەستی پێ نەگەیاندوون. (٥٧) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟(٥٨) ئەو حۆرییانە لە سووریدا ئەڵێی یاقووت و لە سپێتیدا ئەڵێی مەرجانن، واتە ڕەنگیان سوورو سپییە. (٥٩) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟(٦٠) ئایا پاداشی کردەوەی چاك لە پاداشی چاك بەولاوە شتێکی ترە؟(٦١) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٦٢) لە دوو بەهەشتە وەعدە پێدراوەکەیش بەولاوە دوو بەهەشتی تر بۆ بەهەشتییە دەستەڕاستەکان هەیە.
(٦٣) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟(٦٤) ئەو دوو بەهەشتە لەبەر زۆریی دارو درەخت کە دەوریان داوە ڕەشباو دیارن.
(٦٥) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟(٦٦) لەم دوو بەهەشتەی ترا دوو کانیاو هەن ئاویان بەهێز لێ هەڵئەقوڵێ. (٦٧) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟

فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِىٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾

## سُورَةُ الوَاقِعَةِ

مكية — آياتها ٩٦ — ترتيبها ٥٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾ وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴿٧﴾ فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾



(٦٨) لەو دوو بەهەشتەدا میوەو دارخورماو هەنار هەیە.
(٦٩) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٧٠) ئافرەتانی چاك و جوان و لە شێوەو لە ڕەوشتا لەو بەهەشتانەدا هەن.
(٧١) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٧٢) ئەو ئافرەتانە حۆرین و لەناو ڕەشماڵەکانیانا ماونەتەوە.
(٧٣) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٧٤) بەر لە مێردەکانیان کەسی تر، نە ئادەمزادو نە پەری، لاقەی نەکردوون و دەستی پێ نەگەیاندوون.
(٧٥) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟
(٧٦) پاڵیان داوەتەوە لەسەر سەرین و پشتیی سەوزو ڕایەخی جوانی ساختی عەبقەر لەوانەی لەوێ دروست ئەکرێن.
(٧٧) دەی کەواتە ئێوە، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان، بە کام نیعمەت لە نیعمەتەکانی خوای خۆتان بێباوەڕن و ئینکاری ئەکەن؟ (٧٨) پیرۆزو موبارەکە ناوی خوای پەروەردگارت. کە خاوەنی شان و شکۆو قەدرزانینی هەر خاوەن قەدرێکە.

## سوورەتی (الواقعة)

**مەککەیی‌یە ئایەتی ٨١ و ٨٢ی نەبێ و، (٩٦) ئایەتە**

(١) کاتێ کە قیامەت ڕووی دا، (٢) کەسێ نابێ ڕوودانەکەی بە درۆ بزانێ چونکە ڕوویداوەو هەموان بە چاوی خۆیان ئەیبینن. (٣) سەری هەندێ نزم و شۆڕ ئەکاو سەری هەندێکی تریش بەرز ئەکاتەوە. ئەوانەی باوەڕیان بە خوا نەبوەو ئینکاری قیامەتیان کردووە پێی سەرشۆڕو، ئەوانەی باوەڕیان پێیان هەبوەو لە خوا ترساون پێی سەربەرزن چونکە پاداشی باوەڕەکەیان وەرئەگرن. (٤) کاتێ کە زەوی لەرییەوە بە لەرەیەکی توند، بەجۆرێ هەرچی کۆشك و تەلار بەسەریەوەیە هەموو ڕووخان، (٥) شاخەکانیش پارچە پارچە بوون و شکان بە شکان و وردوخاش بوون و،
(٦) بوون بە تۆزی بڵاوبووەوە بە دەشت و دەرا. (٧) ئێوەیش، ئەی بەرەی ئادەمزادو پەرییان کە زیندووکراونەتەوە بۆ حیساب و کیتاب لەگەڵ کردن، سێ جۆر بوون. (٨) جۆری خاوەن بەرەکەت، تۆ چوزانی جۆری خاوەن بەرەکەت چین؟
(٩) جۆری خاوەن نەگبەتییش، تۆ چوزانی جۆری خاوەن نەگبەتی چین؟ (١٠) جۆری لەپێشیش کە بەڕاستی لەپێشن کە ئەوانەن هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی هەر ئایینێ لە ئایینەکانی خوادا باوەڕیان پێ کردووەو ئیمانیان پێ هێناوە.
(١١) ئەوانە ئەوانەن کە نزیك خراونەتەوە لە بارەگای خواو پایەیان بڵند کراوە.
(١٢) ئەوانەن کە لە بەهەشتی (جنات النعیم) دان. (١٣) ئەمانە کۆمەڵێکی زۆرن لە پەیڕەوانی پێغەمبەرانی پێشوو. (١٤) کەمێکیشن لە دوایینەکان کە ئوممەتی پێغەمبەری ئیسلامن. (١٥) لەسەر تەختی خەوی بەتاڵی زێڕوزیوتەنراوە کە دوڕو یاقووتی پێوە کراوە. (١٦) پاڵیان لەسەر داوەتەوە لە بەرانبەری یەکترا.

يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ
﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ
﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ
ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا
تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ
ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ
﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا
مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ
أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ
ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ
وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ
عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا
وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ
ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾



(١٧) بەسەریانا ئەگەڕێن بۆ خزمەتکردنیان چەند مێردمندالێکی هەمیشە بەو حالە ماوەو نەگۆڕاو.
(١٨) بە پیالەی بێدەسك و لوولەو گۆزەی دەسك و لوولەدارو بە کاسەی شەرابی ساف و بێگەردەوە.
(١٩) سەریان بە خواردنەوەی ئەو شەرابە نایەتە ئێش و هۆشیان لەدەس ناچێ و سەرخۆش نابن.
(٢٠) ئەو مێردمندالانە میوەیان بەسەردا ئەگێڕن لەو جۆرەی خۆیان هەلێئەبژێرن.
(٢١) گۆشتی پەلەوەریشیان بۆ دێنن لەو جۆرەی خۆیان حەزی لێ ئەکەن.
(٢٢) حۆریی چاو قەوییشیان هەیە.
(٢٣) لە وێنەی مرواریی لەناو سەدەفا داپۆشراو.
(٢٤) هەموو ئەمە لە پاداشی ئەو کردەوە باشانەدا کە لە دنیادا ئەیانکردن.
(٢٥) لە بەهەشتا واتەیێ نابیسن کە بێسوودو هیچوپووچ بێ یا تاوانبارکردنیانی تیابێ. (٢٦) تەنها هەر وتەی (سەلام .. سەلام) ئەبیسرێ.
(٢٧) هەرچی ئەوانەی خاوەنی لای ڕاستن، واتە دەفتەری کرداریان ئەدرێتە دەستی ڕاستیان، تۆ چوزانی ئەوانەی خاوەنی لای ڕاستن، چین؟
(٢٨) لەناو مۆردی دڕك لێکراوەدان.
(٢٩) لەناو دارمۆزی بەر لە خوارەوە بۆ سەرەوە ڕیزکراودان. (٣٠) لە پەنای سێبەری پەل کشاویشدان کە هەرگیز کورت نابێتەوەو زیادو کەم ناکا.
(٣١) لای ئاوی داکراوان واتە هەرکاتێ بیبیانەوێ بۆیان دائەکرێ بیخۆنەوە.
(٣٢) لەناو میوەی زۆریشدان. (٣٣) کە نە ئەبڕێتەوەو نە لێیان ئەگیرێتەوە.
(٣٤) لەناو فەرش و ڕایەخی بەرزکراوەدان کە چین لەسەر چین لەبان یەك دانراون.
(٣٥) ئێمە ئەو حۆرییانەمان بە دروست کردن دروست کردووە.
(٣٦) بە کچی و دەسبۆنەبراوی دروستمان کردوون. (٣٧) سپی پێست و هەموو هاوتەمەنن.
(٣٨) بۆئەوانەمان دروست کردوون کە خاوەنی دەستی ڕاستن، واتە دەفتەری کرداریان ئەدرێتە دەستی ڕاستیان.
(٣٩) کۆمەلێکی زۆرن لە ئوممەتی پێغەمبەرانی پێشوو.
(٤٠) کۆمەلێکی زۆریشن لە ئوممەتی پێغەمبەری موسولمانان.
(٤١) خاوەنانی دەستەچەپیش، تۆ چوزانی خاوەنانی دەستە چەپ چین؟
(٤٢) لە ئاگری گەرمایەکی سەخت و لە ئاوێکی لەڕادەبەدەر گەرمدان.
(٤٣) لە سێبەری دووکەلێکی ڕەشی دۆزەخدان. (٤٤) نە ساردە وەك سێبەری‌تر و نە هیچ سوودێکیش ئەبەخشێ.
(٤٥) ئەمانە لە دنیادا خاوەنی نازو نیعمەت و ڕابواردن بوون.
(٤٦) لەسەر تاوانە گەورەکەیش سوور بوون کە هاوبەش بۆ خوا دانانە.
(٤٧) هەمیشەیش ئەیانوت: ئایا ئێمە کاتێ کە مردین و بووین بە گڵ و ئێسکە ڕزیو، زیندوو ئەکرێینەوە؟
(٤٨) یا تەنانەت باوك و باپیرە پێشینەکانیشمان زیندوو ئەکرێنەوە؟
(٤٩) تۆیش، ئەی موحەممەد، لە وەلاما پێیان بلێ: بەڕاستی هەموو ئەوانەی زوو مردوون و هەموو ئەوانەی لەوەدوا مردوون، (٥٠) گشتیان لە کاتێکی دیاری‌کراوا کە ڕۆژی قیامەتە کۆئەکرێنەوە.

ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾
فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ
شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا
تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ
ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾
عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ
عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ
﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ
حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ
﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ
أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ
﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ
نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ
﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ فَلَآ أُقْسِمُ
بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾



(٥١) پاشان ئێوەیش ئەی گومڕاهە پێغەمبەران بەدرۆزنداندەرەکان کە باوەڕتان بەخواو بە پێغەمبەرانی خوا نییە،
(٥٢) لەبەری تاڵی داری زەققووم ئەخۆن
(٥٣) ئەوەندەی لێ ئەخۆن سکتانی لێ ئەئاخنن. (٥٤) جا لەبەر تینوێتیی زۆرتان ئاوی کوڵبەکوڵیش بەسەر ئەو بەری داری زەققوومەدا ئەخۆنەوە. (٥٥) پاشانیش هەر ئەخۆنەوە وەك حوشتری تینوو.
(٥٦) ئەم خواردەمەنییەی باسمان کرد ئەو خواردەمەنییەیانە کە لە ڕۆژی لێپرسینەوەیاندا ئەیاندرێتێ، جا ئاخۆ لەوەپاش کە لە دۆزەخا سەقامگیر ئەبن ئەبێ چییان بدرێتێ؟! (٥٧) ئێمە ئێوەمان دروست کردووە، دەی ئەوە بۆ باوەڕ ناکەن.
(٥٨) لە بارەی ئەو ئاوی تۆوەوە خەبەرم بدەنێ کە فڕێی ئەدەنە منداڵدانی هاوسەرەکانتانەوە؟
(٥٩) ئاخۆ ئێوەن ئەو ئاوەتان لە سکی دایکا کردووە بە ئادەمزادێکی ڕێکوپێك و تەواو، یان ئێمەین ئەیکەین بەو ئادەمزادە؟
(٦٠) ئێمەین ئەجەل و کاتی مەرگمان لەنێوانتانا بۆ هەر یەکێکتان دیاری‌کردووەو لەوکاتە دیاری کراوەدا ئەیمرێنین و کەس لێمان پێش ناکەوێ و لەدەستمان هەڵنایەت و ڕێمان لێ ناگرێ،
(٦١) کەوا لەجیاتیی ئێوە کەسانی تری وەك ئێوە دروست بکەین و پێیان بگەیەنین بە جۆرێك و بە خوورەوشتێکەوە کە خۆتان هیچتان ئاگا لێ نییە. (٦٢) بەڕاستی ئێوە ئەزانن ئادەمزاد یەکەمجار چۆن پەیدا ئەبێ، دەی بۆ بیرناکەنەوە کەوا کەسێ بتوانێ یەکەمجار ئادەمزاد لە دڵۆپێ ئاو دروست بکا ئەیشتوانێ جارێکی تریش پاش مردنی دروستی بکاتەوەو گیانی بکاتەوە بە بەرا؟ (٦٣) خەبەرم بدەنێ لە بارەی ئەو تۆوەوە کە عەرزی بۆ ئەکێڵن و دایئەچێنن، (٦٤) ئێوەن ئەیڕوێنن یان ئێمەین ڕواندوومانە؟ (٦٥) ئەگەر بمانویستایە ئەو تۆوە داچێنراوەمان کەوا سەوز بوو هەڵچوو، ئەکرد بە پووش و پەلاشێکی وشك، ئەوکاتە ئیتر ئێوە هەر باستان ئەکرد کە چۆن وای لێ هات و قسەو باسی جۆربەجۆرتان لێوە ئەکرد. (٦٦) ئەتانوت: ئێمە زیان لێکەوتووین کە ئەو گشتە ڕەنجەمان داو هەمووی بە فیڕۆ چوو. (٦٧) بەڵکو ئەتانوت: ئێمە بێ بەش و نائومێد بووین لە بەروبوومی ئەو گشتە کشتوکاڵە.
(٦٨) یان خەبەرم بدەنێ لە بارەی ئەو ئاوەوە کە ئەیخۆنەوە. (٦٩) ئایا ئێوە لە هەورەوە باراندووتانەتە خوار، یا ئێمەین باراندوومانە؟ (٧٠) ئەگەر بمانویستایە تاڵ و تفتمان ئەکرد بە جۆرێ ئاگر بەربداتە دەم و نەخورێتەوە. دەی سوپاسی خوا ناکەن کە وای لێ نەکردووەو بە شیرینی بۆی باراندوون؟
(٧١) یان خەبەرم بدەنێ لەبارەی ئەو ئاگرەوە کە هەڵیئەگیرسێنن. (٧٢) ئایا ئێوە ئەو درەختەتان دروست کردووە کە چیلکەیەکی لێ ئەدەن لە چیلکەی درەختێکی ترو ئاگریان لێ ئەبێتەوە، یان ئێمەین دروستمان کردووە؟
(٧٣) ئێمە ئەو ئاگرەمان کردووە بە مایەی بیرکردنەوە لە خوا کە خوایەکە ئاگری لە دارێکی تەڕا دروست کردووە کە ئاگرو تەڕی یەك ناکەون و، کردوویشمانە بە مایەی قازانج و سوود بۆ ئەو کەسانەی لە دەشت و چۆڵەوانی ئەژین تا ئاگری پێ بکەنەوەو دەوروبەری خۆیانی پێ ڕوون بکەنەوە، یا بۆ ئەوانەی سکیان خاڵییەو برسییانە تا چێشتی پێ لێ بنێن و خۆیان تێر بکەن. (٧٤) کەواتە تۆ ناوی خوای مەزنت پاك و بێگەرد ڕاگرەو بڵێ: ( سبحان ربي العظيم ).
(٧٥) من سوێند ئاخۆم بەو شوێنانەی ئەستێرەکانیان لێوە ئاوا ئەبن
(٧٦) بەڕاستیش ئەم سوێنە ئەگەر بزانن، سوێنێکی مەزنە چونکە سوێنپێخوراوی نیشانەی مەزنیی ئەو خوایەیە کە دروستی کردووە.

إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ﴿٩٣﴾ وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٩٦﴾

## سُورَةُ الحَدِيدِ

ترتيبها ٥٧ — آياتها ٢٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢﴾ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾



(٧٧) کەوا ئەم قورئانە بەڕاستی قورئانێکی زۆر پڕسوودە چونکە هەموو سوودو قازانجێکی دنیاو قیامەتی بۆ ئادەمزاد تیایە. (٧٨) لەناو کتێبێکی پارێزراوا نووسراوە کە لەوحولمەحفووزە.
(٧٩) دەستی نابێ لێ بکەوێ هیی ئەوانە نەبێ کە پاکن لە کافری و لەش پیسیو بێ دەسنوێژی.
(٨٠) لە خوای پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە هاتووەتە خوار. (٨١) دەی سا ئاخۆ ئێوە سستی و کەمتەرخەمی بەرانبەر ئەم قورئانە ئەنوێنن؟
(٨٢) ئەوەیش ئەکەن بە سوپاسی خوا بەرانبەر بەوە کە نیعمەتی قورئانی داونەتێ، ئەوە کە ئینکاری ڕاستیی قورئان ئەکەن و بە درۆی دائەنێن؟!
(٨٣) دەی بۆچی لەوکاتەدا کە گیانی نەخۆشی حاڵی سەرەمەرگ ئەگاتە قوڕگیو ئەوەندەی نەماوە دەرچێ، (٨٤) ئێوەیش لەوکاتەدا بەدەوری کابرادان سەیر ئەکەن وا خەریکە گیانی دەرئەچێ.
(٨٥) ئێمەیش لەوکاتەدا لە ئێوە نزیکترین لە کابرای حاڵی سەرەمەرگەوە، بەڵام ئێوە چاوتان لێ نییە. (٨٦) بۆ ئێوە ئەگەر لەژێر دەسەڵاتی خوادا نین و ئینکارکردنەکەیتان ڕاست و بەجێیە، (٨٧) بۆ گیانی کابرای حاڵی سەرەمەرگ ناگێڕنەوە بۆ جێی خۆی و مەنعی مردنی لێ ناکەن و چاکی ناکەنەوە، ئەگەر ڕاست ئەکەن؟ (٨٨) بەڵام وا نییە کە ئێوە ئیددیعا ئەکەن و نەخۆشی حاڵی سەرەمەرگ، ئەو جارە بێ یا جارێکی تر بێ، هەر ئەمرێ. جا کە مرد ئەگەر لەوانە بوو کە بە کرداری چاکی دنیایان لە خواوە نزیکن، (٨٩) ئەوە ئەنجامی حەسانەوەو ڕزق و ڕۆزیی پاك و خۆش و بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتە.
(٩٠) ئەگەریش لەوانە بێ کە دەفتەری کرداریان ئەدرێتە دەستی ڕاستیان، (٩١) ئەوە پێی ئەوترێ: ئەی ئەوکەسەی دەفتەری کردارت دراوەتە دەستی ڕاستت، سەلامی خوات لێ بێ لە هەموو ئەو برادەرانەتەوە کە دەفتەری کرداریان دراوەتە دەستی ڕاستیان. (٩٢) خۆ ئەگەر لەوانەیش بێ کە خواو پێغەمبەران و قورئان و ڕۆژی قیامەت بە درۆئەخەنەوەو بە درۆیان دائەنێن و ڕێی ڕاستیان ون کردووە، (٩٣) ئەوە خۆراکی بۆ ئامادەکراوی پێشوازی لێ کردنی ئاوی کوڵبەکوڵە. (٩٤) لەگەڵ فڕێدانە ناو ئاگری دۆزەخەوە. (٩٥) بێگومان ئەمەی کە وترا ئەو شتەیە هیچ گومانێکی تیا نییەو ڕاست و دروستە. (٩٦) کەواتە ناوی خوای مەزنت پاك و بێگەرد ڕاگرەو بڵێ : ( سبحان ربي العظيم ).

## سوورەتی ( الحديد )

مەدینەیی یەو، (٢٩) ئایەتە

(١) گەورەیی و بێگەردیی خوا ئەگەیێنێ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیەو خوا خاوەن عیززەت و حیکمەتە.
(٢) موڵکی هەموو ئاسمانەکان و زەوی بەتەنها بۆ ئەوە. ئەوە هەموو گیانداری ئەژێنێو ئەمرێنێو ئەوە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ. (٣) ئەوە یەکەم و پێش لە هەموو بوویەك و، ئەوە لەدوای فەوتاندنی هەموو بوویەك ئەمێنێ و، ئەوە بەو هەموو شتانەدا دیارە کە دروستی کردوون و، ئەوە نهێنی کە کەس پەی بە زاتی ناباو نازانێ چییەو، ئەوە بە هەموو شتێ ئەزانێ.

هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَهُوَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَأَنفَقُوا۟ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَٰتَلَ أُو۟لَٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَٰتَلُوا۟ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١١﴾



(٤) ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان و زەویی لە شەش ڕۆژا دروست کردو، پاشان گەورەیی خۆی بەسەر عەرشا دەرخست. ئەزانێ بەوەی ئەچێتە ناو زەوییەوەو ئەوەی لە زەوی دێتەدەرو ئەوەی لە ئاسمانەوە دائەبارێتە خوارو ئەوەی سەرئەکەوێ بۆ ئاسمان. لەهەر کوێ بن ئەوتان لەگەڵە چونکە ئاگای لێتانەو لەژێر دەسەڵاتی ئەوان و، خوا چاوی لە هەموو کارو کردەوەیەکتانە.

(٥) مولکی ئاسمانەکان و زەوی هیی ئەوەو هەموو کاروباریێ بۆ خوا ئەگەڕێتەوە.

(٦) شەو ئەبا بەناو ڕۆژاو ڕۆژ ئەبا بەناو شەواو ئەزانێ چی لە دڵی کێدایە.

(٧) باوەڕ بە خواو بە پێغەمبەری خوا بکەن و لەو سامان و داراییە خەرج بکەن کە خوا ئێوەی لەجێی خۆی داناوە لە تەسەڕروفتیاکردنیا، ئەگینا هیی ئەوەو هیی ئێوە نییە، چونکە ئەوانەی باوەڕیان بە خواو پێغەمبەری خوا کردووە لەناو ئێوەداو سامان و دارایی لەڕێی خوادا خەرج ئەکەن پاداشێکی گەورەیان بۆ هەیە.

(٨) بۆ باوەڕ بەخوا ناکەن لە کاتێکا کە پێغەمبەر بانگتان ئەکا بۆ ئەوەی باوەڕ بە پەروەردگاری خۆتان بکەن و خوا پەیمانی لێ وەرگرتوون کەوا باوەڕی پێ بکەن ئەگەر ئێوە بە بەڵگە باوەڕ ئەکەن. پەیمانەکەیش ئەوەیە کە خوا عەقڵی داونەتێ بیربکەنەوەو دەرفەتی وردبوونەوەو بیرکردنەوەی بۆ ڕەخساندوون کە تێبگەن خوا ڕاستەو هەیەو ئەبێ هەموو کەسێ باوەڕی پێ بکا.

(٩) خوا ئەو خوایە کە ئایەتی ڕۆشن و ئاشکرا نازڵ ئەکا بۆسەر بەندەی خۆی بۆئەوەی لە تاریکیی نەزانی و خوا نەناسییەوە دەرتان کاو بتانخاتە ڕووناکیی باوەڕو خواناسین و، خوا بەڕاستی میهرەبان و بە ڕەحمە لەگەڵتان.

(١٠) بۆ ئەبێ دارایی و سامان لە ڕێی خوادا خەرج نەکەن لەکاتێکا کە هەرچی میراتی ئاسمانەکان و زەوی هەیە هەمووی بۆ خوا ئەمێنێتەوەو کەس هەتا هەتایە نابێ بە خاوەنی هیچ؟ ئەوەی لە ئێوە بەر لە گرتنی مەککە سامانو داراییی خۆی لە ڕێی خوادا خەرج کردبێ و غەزای کردبێ لە ڕێی خوادا لەگەڵ کەسێکا کە پاش گرتنی مەککە دارایی و سامانی لە ڕێی خوادا خەرج کردبێ و غەزای کردبێ وەك یەك نین و یەکسان نین. ئەوانەی پێش گرتنی مەککە دارایی و سامانیان خەرج کردووەو غەزایان لەڕێی خوادا کردووە. پلەو پایەیان لەوانە گەورەترە کە لەوەودوا دارایی و سامانیان خەرج کردووەو غەزایان کردووەو، هەموویشیان خوا گفتی پاداشی چاکی داونێ و خوا ئاگادارە لەوەی کە ئەیکەین.

(١١) کێیە ئەوەی قەرز ئەدا بە خوا بە قەرزدانێکی جوان واتە بە دڵێکی ساف و نیازێکی پاك، تا خوایش دووقات قەرزەکەی بداتەوەو پاداشێکی پڕ قەدرو حورمەتیشی بۆ هەیە سەرەڕای بەدووقاتدانەوەی قەرزەکەی؟

يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم
بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ
هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا
فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ
ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ
أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ
ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا
مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ
﴿١٥﴾ ۞ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ
وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ
فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾
ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ
لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُوا۟
ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾



(١٢) لەو ڕۆژەدا کە پیاوانی خاوەن باوەڕو ژنانی خاوەن باوەڕ ئەبینی ڕووناکیی باوەڕیان وەك چرا لەبەردەمیانەوەو لای ڕاستیانەوە ڕێگەی بەهەشتیان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، فریشتەکان پێیان ئەڵێن: مژدەتان پێ ئەدەین ئەمڕۆ بە بەهەشتگەلێ جۆگای ئاو لە بن دارەکانیانەوە ئەڕواو هەتا هەتایە لەو بەهەشتەدا ئەمێننەوەو گەیشتنی مەزنیش بە مراز هەر ئەوەیە.

(١٣) هەر لەو ڕۆژەدا پیاوو ئافرەتە دووڕووە بەدەمموسوڵمان و بەدڵکافرەکان بە خاوەن باوەڕەکان ئەڵێن: سەیرمان کەن بەڵکو تۆزێ لە ڕووناکییەکەتان وەربگرین و، لە وەڵاما پێیان ئەوترێ: بگەڕێنەوە بۆ دواوە بۆ دنیا لەوێ لە دووی ڕووناکی بگەڕێن. ئا لەوکاتەدا شوورەیەك لەنێوان ئەوان و خاوەن باوەڕەکانا دروست ئەکرێ دەرگایەکی هەیە ئەودیوی لەبەرچاو نەبووی دەرگاکە ڕەحمەتی خوای تیایە چونکە دیوی بەهەشتەو، دیوە دیارەکەی کە لای کافرەکانەوەیە سزاو عەزابی تیایە چونکە دیوی دۆزەخە.

(١٤) کافرەکان بانگ ئەکەنە موسوڵمانەکان: ئێمە لە دنیادا لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ ئەی بۆچی ئێستا ئێوە ئەچن بۆ بەهەشت و ئێمە ئەبرێین بۆ دۆزەخ؟ موسوڵمانەکانیش لە وەڵاما پێیان ئەڵێن: بەڵێ وەڵڵا، بەدیمەن لەگەڵمان بوون، بەڵام ئێوە خۆتانتان بە دووڕوویی تووش کردو کەوتنە خۆمەڵاس دان بۆ لێدانی موسوڵمانان و کەوتنە گومان و دوودڵییەوە لە موسوڵمانەتی و، هیوای پووچ و بەتاڵ لە خوای خۆتانی بایی کردن تا فەرمانی مردنتان هات و شەیتان و تەماعی دنیا ئاگایان لە خوا پێ نەهێشتن.

(١٥) ئیتر ئەمڕۆ تۆڵەو بریتیتان وەرناگیرێ لەجیاتیی سزای دۆزەخ و لە کافرە بەئاشکراکانیش هەروا وەرناگیرێ. ماواو جێگای هەمووتان ئاگری دۆزەخەو هەر ئاگری دۆزەخ شوێنی شایانتانەو خراپ سەرەنجامێکە.

(١٦) ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوکەسانەی ئیمانیان هێناوە دڵیان لە کاتی هێنانی ناوی خواو بۆ ئەو قورئانە ڕاستەی هاتووەتە خوار ترسی لێ بنیشێ و وەك ئەوانە نەبن پێشتر کتێبیان لە خواوە بۆ هاتە خوارو ماوەیەکی دوورودرێژیان بەسەرا تێپەڕی و دڵیان ڕەق بوو و وای لێ هات ناوی خوا کاری تێ نەکاو زۆریان فاسقن؟

(١٧) بزانن کەوا خوا زەویی وشکی مردووی بێگژوگیا زیندوو ئەکاتەوە بەوە کە پاش مردنی و گژوگیا تیا نەمانی، گژوگیای تیا ئەڕوێنێتەوە. ئێمە بەڕاستی ئایەتەکانی خۆمانمان ڕوون کردووەتەو بۆ ئێوە عەقڵتان پێ بشکێ و تێ بگەن کە خوا چەند توانایە.

(١٨) بە ڕاستی ئەو پیاوانەی کە سەدەقەو خێراتی واجب و سوننەت ئەدەن بە کەسانی موستەحەق و ئەو ژنانەی کە سەدەقەو خێراتی واجب و سوننەت ئەدەن بە کەسانی موستەحەق و ئەوانەی ماڵی خۆیان بە دڵێکی ساف و نیازێکی پاك بە قەرز ئەدەن بە خوا بە قەرزێکی جوان، ئەوانە خێرو حەسەنات و قەرزەکانیان بۆ دووقات ئەکرێتەوەو پاداشێکی باش و دەس بڵاوانەیان بۆ هەیە.

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٩﴾ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢١﴾ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٢٢﴾ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٤﴾



(١٩) ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرانی خوا ئەوانە کەسانێکن بەڕاستی ڕاستگۆو لە ڕۆژی قیامەتا ئەکرێن بە شایەت لەسەر ئوممەتانی تر لای خواو پاداشی خۆیانیان هەیەو ڕووناکییان لە ڕۆژی قیامەتا بۆ هەیەو، ئەوانەیش کە کافر بوون و ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانا، ئەوانە هاوڕێی دۆزەخن.

(٢٠) بزانن کەوا ژیانی ئەم دنیایە یاری و گاڵتەکردن و خۆڕازاندنەوەو خۆبەزلنیشاندانە لەناو خۆداو زۆرکردنی سامان و دارایی و نەوەیە، هەروەك کشتوکاڵێ بەجۆرێکی وا ڕوابێ و پێگەیشتبێ کشتوکاڵکەرەکان زۆریان دڵ پێ خۆش بوو بێ و پێی سەرسام بووبن، پاشان وشك ببێ و سەیرکەی زەرد هەڵگەڕاوەو بووە بە پووش و کەوتووەتە بن پێ، چۆن هەمووی بێمایە ئەبێ، ژیانی دنیایش هەر وایە. ژیانی دنیا بەم جۆرەیە. ژیانی ئەو دنیایش سزایەکی سەختە بۆ ئەوەی بیری لێ نەکردبێتەوەو خۆی بۆ ئامادە نەکردبێ‌و، بەخشین و لێبووردن و ڕەزامەندیی خوایە بۆ ئەوەی فەرمان بەرداریی لە فەرمانی خوا کردبێ‌و، ژیانی دنیا لە هۆیەکی ڕابواردن بەولاوە نییە بۆ کەسێ بەم دنیایە بایی بووبێ.

(٢١) تێکۆشن لە پێشکەوتنا بۆ لای بەخشینی گوناهەکانتان لەلایەن خوای خۆتانەوەو بەرەو بەهەشتێ کە گوشادییەکەی وەك گوشادیی ئاسمانەکان و زەوی وایەو ئامادە کراوە بۆ ئەوانەی باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەرانی خوا کردووە. گەیشتن بەم لێخۆشبوون و بەم بەهەشتە فەزڵ و لوتفی خوایە بە هەرکەسێکی ئەدا کە خۆی مەیلی لێ بێ‌و، خوا خاوەنی فەزڵ و لوتفی گەورەیە.

(٢٢) هیچ دەردو بەڵاو مسیبەتێ نادا لە شوێنی خۆی، وەك وشکەساڵی و سن و کوللەو شتی وا لە زەویداو، وەك نەخۆشی‌و برینداری‌و شتی وا لە خودی خۆتانا، ئیللا بەرلەوەی کە ئەو مسیبەتە دروست بکەین لەکتێبێکا نووسراوەو بڕیار دراوە کە ( لوح المحفوظ )ەو، ئەمەیش کارێکی ئاسانە بۆ خوا.

(٢٣) باسی نووسرانی ئەو مسیبەتانەمان کرد کە لە موقەددەرنامەدا نووسراون، بەر لەوەی ڕوو بدەن و بێن بەسەرتانا، تا بزانن ئەوانە قەزاوقەدەری خوان و ئیتر نە خەفەت بخۆن بۆ ئەو شتانەی لە دەستان چوون و نە شادمانیش بن بەوەی خوا پێی‌داون و، خوا خۆشی نایەت لە هیچ کەسێ کە خۆی بە زل بزانێ و فیز بکا بەسەر خەڵکی ترا.

(٢٤) خۆبەزلزانیی‌و فیزبەسەرخەڵکاکەریش ئەوانەن کە خۆیان ڕژدن و فەرمان بە خەڵکیش ئەدەن کە ڕژدی بکەن و، هەرکەسیش پشت لە فەرمانی خوا هەڵکا ئەوە هیچ بایەخێکی نییە، خوا ئیحتییاجی بە کەس نییەو لە هەموو ڕوویەکەوە ستایشی ئەکرێ.

لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ
وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ
بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ
بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ
وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ
وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰ آثَارِهِم
بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ
وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً
ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا
رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ
وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ
وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِ وَيَجْعَل لَّكُمْ
نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ
أَهْلُ الْكِتَابِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ اللَّهِ وَأَنَّ
الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾



(٢٥) بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرەکانی خۆمانمان بە موعجیزەی ئاشکراو دیارەوە ناردووەو هەریەکە کیتابی خۆیمان لەگەڵ ناردووەو سەنگوترازووی مامەڵەمان لەگەڵ ناردوون تا خەڵك داد بەرپا بکەن و، ئاسنیشمان ناردووەتە خوارەوە هێزێکی زۆر توندو چەند جۆرە سوودو قازانجی بۆ خەڵك تیایە ئەدەواتی جەنگ و کشتوکاڵ و پیشەسازی و شتی تری لێ دروست ئەکەن‌و، ئەوکاتە خوایش بزانێ کێ لە پەنامەکی‌و نادیارەوە یارمەتیی ئەوو پێغەمبەرانی ئەدا، بەڕاستی خوا بەهێزو خاوەن عیززەتە.

(٢٦) ئێمە بەڕاستی نووح و ئیبراهیممان بە پێغەمبەری نارد بۆ سەر ئادەمزادو پێغەمبەرایەتی و کتێبی خۆمانمان خستە ناو نەوەکانیان، لە ئەنجاما کەسانی وا لە ناو نەوەکانیانا هەبوون کە ڕێگەی هیدایەتیان گرتبوەبەرو، زۆریشیان فاسق و لە ڕێ دەرچوو بوون.

(٢٧) لەپاشا هاتین بە شوێنی نووح و ئیبراهیما پێغەمبەرانی تری خۆمانمان نارد وەك پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرائیل و، عیسای کوڕی مەریەممان بەدوایانا ناردو ئینجیلمان پێ داو، بەزەیی و میهرەبانیمان لەگەڵ خەڵك خستە دڵی ئەوانەی شوێنی کەوتن و خۆیشیان ڕەبەنی و خۆلەخەڵكدوورگرتن و زیادەخواپەرستییەکیان داهێنا بۆ خۆیان ئێمە نەمانبڕیبوو بەسەریانا، بەلاَم ئەوان بە نیازی دەس‌خستنی ڕەزامەندیی خوا بۆ خۆیانیان داهێنا، کەچی بەڕاستی چاودێریی ڕێوڕەسمی ئەو ڕەبەنییەیان نەکرد، جا کێیان لەوەپاش ئیمانیان بە ئایینی ئیسلامیش هێنا پاداشی خۆیمان دایەوەو زۆریشیان فاسق و لەڕێلادەرن.

(٢٨) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە لە خوا بترسن و ئیمان بە پێغەمبەری خوا بهێنن، دوو بەشتان لە ڕەحمەتی خۆی ئەداتێ، بەشێ لەسەر ئیمانتان بە ئایینە پێشووەکەتان و بەشێکیش لەسەر ئیمانتان بە ئیسلام و، ڕووناکییەکیشتان بۆ دروست ئەکا لە دنیاو قیامەتا پێی بڕۆن بەڕێداو لە گوناهیشتان خۆش ئەبێ و، خوا گوناهبەخش و بەڕەحمە.

(٢٩) تا ئەهلی کیتاب کە جوولەکەو گاورەکانن بزانن ناتوانن ڕێ لە هیچ لوتف و گەورەییەکی خوا بگرن لەگەڵ هەرکەس کە مەیلی لێ بێ لوتف و گەورەیی لەگەڵ بکاو، لوتف و گەورەیی هەر بەدەست خوا خۆیەتی بە هەرکەسی بدا ئەیداو خوا خاوەنی لوتف و گەورەیی مەزنە.

# سُورَةُ المُجَادَلَة

ترتيبها ٥٨ — آياتها ٢٢

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَآئِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمۡۖ إِنۡ أُمَّهَٰتُهُمۡ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔي وَلَدۡنَهُمۡۚ وَإِنَّهُمۡ لَيَقُولُونَ مُنكَرٗا مِّنَ ٱلۡقَوۡلِ وَزُورٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمۡ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُواْ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۚ ذَٰلِكُمۡ تُوعَظُونَ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٣﴾ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ مِن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّاۖ فَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ فَإِطۡعَامُ سِتِّينَ مِسۡكِينٗاۚ ذَٰلِكَ لِتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ كُبِتُواْ كَمَا كُبِتَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ وَقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٥﴾ يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْۚ أَحۡصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿٦﴾





## سوورەتی (المجادلة)

مەدینەیی یەو، هەندێکیش وتوویانە دە ئایەتی پێشووی مەککەیین و، (٢٢) ئایەتە

(١) بەڕاستی خوا گوێی لە قسەی ئەو ژنەوە بوو کە لەگەڵت کەوتبوە موجادەلە لەبارەی مێردەکەیەوەو دادی خۆی ئەبردە لای خواو، خوا گوێی لە گفتوگۆی ئێوەوەیە. خوا شنەواو بینایە.

(٢) ئەو پیاوانەی (ظیهار) ئەکەن بەرانبەر بە ژنەکانیان و پێیان ئەڵێن: ((پشتت بۆ من پشتی دایکمە))، ژنەکانیان دایکیان نین، دایکیان تەنها ئەوانەن لێیان کەوتوونەوەو بەوەڵەدیان هێناون. ئەوانەی قسەی وا ئەکەن قسەیەکی نارەواو نا پەسەندو درۆو ساختە ئەکەن و، خوایش بەڕاستی بەخشندەو لە گوناه بووردووە.

(٣) هەروا ئەو پیاوانەی ظیهار ئەڵێن بەرانبەر ژنەکانیان و پاشانیش ئەگەڕێنەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی کە وتوویانەو پەشیمان ئەبنەوە لەوەی بە ژنە ظیهارپێوتراوەکانیان وتووە واتە ژنەکانیان تەڵاق نادەن و بە ژنی خۆیانیان ئەزانن، ئەوە فەرزە لەسەریان بەرلەوەی لەگەڵ ژنەکانیان جووت بن و بگەن بە یەك بەندەیەك ئازاد بکەن. ئەمە ئەو ئامۆژگارییەیە خوا ئامۆژگاریتان ئەکا پێی و خوا چاوی لە هەموو کارو کردەوەیەکتانەوەیە.

(٤) ئەو کەسەیش بەندەی شك ئەبرد ئازادی بکا ڕۆژووی دوو مانگی دوابەدوای یەکی لەسەرە بەرلەوەی لەگەڵ ژنەکەی بەیەك بگەن. خۆ ئەگەر نەیشیتوانی لەبەر نەخۆشی یا پیری یا هەر هۆیەکی تر دوو مانگ دوابەدوای یەك بەڕۆژوو بێ، ئەوە خۆراکی ژەمێکی شەست هەژاری لەسەرە. ئەم حوکمەیش بۆ ئەوەیە باوەڕتان بە خواو پێغەمبەری خوا هەبێ و بەپێی فەرمانی ئەوان بجوولێنەوە: بە چی ڕازین بیکەن و، لە چی ڕازی نین نەیکەن و، ئەمانەی کە وتمانن سنوورێکن خوا دایناون و کەس نابێ بییانشکێنێ. کافریش کە سنووری خوا ناپارێزن و بە پێی ئارەزووی خۆیان ئەجوولێنەوە، سزایەکی سەختیان هەیە.

(٥) بێگومان ئەوانەی دوژمنایەتی لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوا ئەکەن ڕسوا ئەکرێن وەك ئەوانەی تری بەر لە خۆیان ڕسوا کران.بەڕاستیش ئێمە کۆمەڵێ ئایەتی ڕوون و ئاشکرامان ناردووەتە خوارەوە تا خەڵك بییانخوێننەوەو تێیان بگەن و باوەڕیان پێ بکەن و ئەوانەیش کە باوەڕ ناکەن و بە کافری ئەمێننەوە سزایەکیان بۆ هەیە ڕەزیل و سەفیلیان ئەکا.

(٦) لەو ڕۆژەدا کە خوا گشتیان زیندوو ئەکاتەوەو خەبەریان ئەداتێ کەوا لە دنیادا چییان کردووە، خوا بۆخۆی سەرژمێری کردووە ئەوان لە یادیان چووەتەوەو خوا ئاگای لە هەموو شتێکە.

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ
مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ
وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم
بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ
نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ
وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ
بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِيٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ ۚ حَسْبُهُمْ
جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا
تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوْا۟
بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ
مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا
إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا۟ فِي ٱلْمَجَٰلِسِ فَٱفْسَحُوا۟ يَفْسَحِ
ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُوا۟ فَٱنشُزُوا۟ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾



(٧) ئایا تۆ نازانی کەوا خوا بێگومان هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەبێ ئەو پێی ئەزانێ؟ سێ کەس پێکەوە چپەیەك بکەن ئەو چوارەمیانەو پێنج کەس پێکەوە چپە بکەن ئەو شەشەمیانەو کەمتر بن لەوە یا زیاتر بن لە هەر شوێنێ بن ئەو لەگەڵیانەو، پاشانیش لە ڕۆژی قیامەتا خەبەریان ئەداتێ کە لە دنیادا چییان کردووە. خوا بە هەموو شتێ ئەزانێ.

(٨) تۆ تەماشای ئەوانە ناکەی کە پێیان وترا چپە نەکەن و کەچی ئەگەڕێنەوە بۆ چپەکردن کە نەهیان لێ کرابوو بیکەن و، بە چپەچپ قسەی گوناهبارانە ئەکەن و، باسی دوژمنایەتیکردن لەگەڵ پێغەمبەرو موسوڵمانان و بێفەرمانیی پێغەمبەر ئەکەن و، کە دێنە لات بە جۆرێ سەلام و مەرحەبات لێ ئەکەن کە خوا بەوجۆرە سەلام و مەرحەبای لێ نەکردووی و لە جیاتیی (السلام علیك) ئەڵێن (السام علیك) واتە: مردنت بۆ تاین بێ و، لە دڵی خۆیشیانا ئەڵێن: ئەگەر ڕاستە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ئەی بۆ خوا لەسەر ئەم قسانەمان سزامان نادا؟ پێویست بە سزای دنیا نییە، دۆزەخ سەرو زیادیانە ئەڕۆنە ناوی و دۆزەخیش بەدترین سەرەنجامە.

(٩) ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە کە چپەچپتان کرد بە چپە قسەیێ مەکەن کە گوناه بێ یا باسی دوژمنایەتی لەگەڵ خەڵك و دەستدرێژی کردنە سەریان و بێ فەرمانیی پێغەمبەر بێ وەك چپەی کافرەکان و دووڕووە بە دیەن موسوڵمان و بە دڵ کافرەکان. چپەیەك بکەن کە قسەی چاکە کردن و لە خوا ترسان بێ و لەو خوایە بترسن کە حەشرتان بۆ لای ئەو ئەکرێ.

(١٠) بە چپە قسەی گوناه و دەستدرێژی کردنە سەر خەڵك هەر کاری شەیتانەو مەبەستی لێی ئەوەیە دڵی موسوڵمانانی پێ خەفەتباربکاو هیچ زیانێکیشیان پێ ناگەیەنێ مەگەر بە ئیزنی خواو ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ و، کەواتە با ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هەیە پشت بە خوا ببەستن.

(١١) ئەی کەسانێ کە ئیمانتان بە خواو بە پێغەمبەری خوا هەیە ئەگەر لە مەجلیسێکا دانیشتبوون و پێیان وتن: درێ بدەن با خەڵکی تریش کە دێن جێیان ببێتەوە دانیشن، درێ بدەن با خوایش دەرووی خێرتان لەهەموو ڕوویەکەوە لێ بکاتەوەو جێگاو گوزەران و هەموو خێرو خۆشییەکتان بۆ گوشاد بکا. ئەگەریش وترا: هەڵسن و بڵاوەی لێ بکەن، هەڵسن و بڕۆن. ئەوانەی خاوەن باوەڕو خاوەن زانستن، خوا چەند پلە بەرزیان ئەکاتەوەو، خوا ئاگادارە لە هەر کارو کردەوەیێ کە ئەیکەن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَٰجَيْتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَةً ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَأَطْهَرُ ۚ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ءَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىْ نَجْوَىٰكُمْ صَدَقَٰتٍ ۚ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا۟ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٣﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٦﴾ لَّن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ ۖ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٨﴾ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْأَذَلِّينَ ﴿٢٠﴾ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾



(١٢) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەر! ئەگەر چپەتان کرد لەبەر دەستی پێغەمبەرا، واتە ئەگەر بە چپە قسەتان کرد لەگەڵ پێغەمبەر، ئەوە بەر لە چپەکردنەکە خێرێ بکەن و بیدەن بە موستەحەقێك، ئەوە چاکترو پاکترە بۆ ئێوە. ئەگەر نەتانبوو خوا بەخشندەو بەرەحمە.

(١٣) ئەوە، لەوە ترسان کە ئەگەر لە بەردەستی چپەکەتانا، واتە بەر لە چپە کردنەکەتان لەگەڵ پێغەمبەر، خێراتێ بکەن، لات بکەون؟ ئەگەر خێراتەکەتان نەکردو خوا لێتان خۆش بوو، نوێژەکانتان بکەن و زەکات بدەن و بە گوێی خواو پێغەمبەری خوا بکەن و خوا شارەزاو ئاگادارە لە هەر کارێ ئەیکەن.

(١٤) ئەوە ناڕوانی بۆ کەسانێ دۆستایەتی لەگەڵ کۆمەڵێ ئەکەن خوا غەزەبی لێ گرتوون نە لە ئێوەن و، نە لەوان واتە نە لە کافرە غەزەب لێگیراوەکانیشن چونکە دووڕوون و بە دەم موسوڵمان و بە دڵ کافرن، سوێندی درۆ ئەخۆن کە لەگەڵ کافرەکان نین و ئەیشزانن کە سوێندەکەیان درۆیە.

(١٥) خوا سزایەکی سەختی بۆ ئامادە کردوون. بێگومان ئەوەی ئەوان ئەیانکرد کارێکی زۆر خراپ بوو.

(١٦) سوێندەکانی خۆیان کردووە بە قەڵغان بۆ پاراستنی خۆیان و ماڵ و موڵکیان لەوە کە موسوڵمانان تۆڵەیان لێ بسێننەوە لەسەر دەستتێکەڵکردنیان لەگەڵ کافرەکان و، بەو ئەمینبوونەیان لەوە کە موسوڵمانان تۆڵەی ئەو دەست تێکەڵ کردنەیان لەگەڵ کافران لێ بسەننەوە، ڕێیان لە خەڵك گرت کەوا ڕێی ئیسلامەتی بگرنەبەر، لەبەرئەوە سزایەکی وایان بۆ هەیە سووك و سەفیلیان بکا.

(١٧) نە دارایی و سامانیان و نە منداڵیان بە هیچ جۆرێ هیچ دادیان نادەن و سوودیان نابێ بۆیان لە ئاستی خوادا، ئەوانە هاوڕێی ئاگری دۆزەخن و هەمیشە لەو ئاگرەدا ئەژین.

(١٨) لەو ڕۆژەدا کە خوا هەموویان، ئەوانیش و کافرە دیارەکانیش، زیندوو ئەکاتەوەو، دەست ئەکەن بە سوێند خواردن بۆ خوا بە درۆ وەك ئێستا سوێندی درۆ بۆ ئێوە ئەخۆن کەوا موسوڵمانن و بەڕاستی لەگەڵ ئێوەن و، لایان وایە چۆن ئێستا بەو سوێندە درۆیانەیان پاکانە بۆ خۆیان لای ئێوە ئەکەن لە قیامەتیشا پاکانە بۆ خۆیان لای خوا ئەکەن. ئاگاداربن! ئەوانە درۆزنن و درۆزنێکی وان وا ئەزانن درۆکانیان بەسەر خوایشا ئەگوزەرێنن.

(١٩) شەیتان زاڵ بووە بەسەریاناو یادی خوای لەبیر بردوونەتەوە. ئەوانە کۆمەڵەی سەر بە شەیتانن. ئاگاداربن! کۆمەڵەی سەر بە شەیتان هەر خۆیان دۆڕاوو زیانتووشهاتوون.

(٢٠) بێگومان ئەوانەی موخالەفەی خواو پێغەمبەری خوا ئەکەن، لەناو گرۆهی زەلیل و داماوەکانی ڕۆژی قیامەتان. (٢١) خوا لە لەوحەی قەزاو قەدەری خۆیا نووسیویە: من و پێغەمبەرانی من زاڵ ئەبین بەسەر دوژمنانا. بەڕاستی خوا بە هێزو زاڵە بەسەر خواستەکانی خۆیا.

لَا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ
حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوۡ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ أَوۡ أَبۡنَآءَهُمۡ
أَوۡ إِخۡوَٰنَهُمۡ أَوۡ عَشِيرَتَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ
ٱلۡإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٖ مِّنۡهُۖ وَيُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ
عَنۡهُۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱللَّهِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٢٢﴾

## سُورَةُ الحَشۡرِ

ترتيبها ٥٩ — آياتها ٢٤

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ
﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمۡ
لِأَوَّلِ ٱلۡحَشۡرِۚ مَا ظَنَنتُمۡ أَن يَخۡرُجُواْۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمۡ
حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنۡ حَيۡثُ لَمۡ يَحۡتَسِبُواْۖ وَقَذَفَ
فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَۚ يُخۡرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيۡدِيهِمۡ وَأَيۡدِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٢﴾ وَلَوۡلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمُ
ٱلۡجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴿٣﴾



(٢٢) کەسانی وا نابینی باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەری خواو بە ڕۆژی قیامەت هەبێ، دۆستایەتی لەگەڵ کەسانێکی وا بکەن کە موخالەفەی خواو پێغەمبەری خوا بکەن، با ئەو کەسانەیش کە موخالەفەی خواو پیغەمبەری خوا ئەکەن باوکیان بن یا کوڕیان بن یا برایان بن یا عەشیرەتیان بن، چونکە ئەوانە ئیمانیان هەیەو خوا باوەڕی بە خۆی و بە پێغەمبەر لەناو دڵیانا نووسیوەو بە گیانێکی خۆی پشتی گرتوون کە ئەو ڕووناکیی باوەڕەیە خستوویەتیە دڵیانەوەو، لە قیامەتیشا ئەیانخاتە بەهەشتگەلێکەوە جۆگای ئاو بە بەریانا ئەڕواو هەمیشە لەو بەهەشتانەدا ئەمێننەوە. خوا لەوان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازین. ئەوانە دەستەو کۆمەڵی خوان و، دەستەو کۆمەڵی خوایش هەر ئەوانن کەوا ڕزگار ئەبن لە دەردو ئازاری قیامەت.

## سوورەتی ( الحَشۡرِ )

**مەدینەیی‌یەو، (٢٤) ئایەتە**

(١) هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە لە پاك و بێ عەیبیی خوا ئەدوێ و، هەر خوا خاوەن عیززەت و حیکمەتە.

(٢) خوا ئەو خوایە کافرە جوولەکەو گاورەکانی لە یەکەمین دەرکردنیانا لە نیمچە جزیرەی عەرەب کردە دەرەوە بۆ وڵاتی شام. ئێوە گومانتان نەئەبرد کەوا دەرئەچن و خۆیشیان گومانیان وابوو کە قەڵاکانیان کە خۆیانیان تێیانەدا حەشار ئەدا ڕێی ئەوەیان بۆ ئەگرێ کە دەسەڵاتی خوا بەسەریانا زاڵ ببێ، بەڵام خوا لە لایەکەوە بۆیان هات و دای بەسەریانا ئەوان بۆی نەچوو بوون و بە خەیاڵیانا نەهاتبوو. ترسی خستە دڵیانەوەو وای لێ کردن بە دەستی خۆیان و بە دەستی موسوڵمانان ماڵی خۆیانیان وێران و کاول ئەکرد، دەی عیبرەت لەو ڕووداوە وەرگرن ئەی کەسانێ کە چاوتان هەیەو شت ئەبینن و، تێبگەن هەرکەسێ دوژمنایەتی لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوا بکا سەرەنجامی وا ئەبێ.

(٣) ئەگەر خوا نەینووسیایە لەسەریان ماڵ و ئاواییەکانی خۆیان چۆڵ کەن بە پێی ئەو ڕێکەوتنەی لەسەری ڕێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەر، هەر لە دنیادا سزای ئەدان چونکە موسوڵمانان هێرشیان ئەهێنایە سەریان و وایان پێ ئەکردن کەوا بە جوولەکەی بەنی قورەیزەیان کردو، لە ڕۆژی قیامەتیشا ئازاری ئاگری دۆزەخیان بۆ هەیە.

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾



(٤) ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کە ئەمانە دوژمنایەتییان لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوا کردو هەر کەسیش دوژمنایەتی لەگەڵ خوا بکا، خوا بەڕاستی سزای سەختە.

(٥) هەر دارخورماییێکتان بڕیبێ یا بە ڕاوەستاوی لێی گەڕابن لەسەر بنج و ڕیشەی خۆی، ئەوە بە فەرمان و ڕێگادانی خوا بووەو بۆ ئەوەی فاسقەکان ڕسوا بکا.

(٦) هەر دەسکەوتێ خوا گێڕابێتیەوە لە کافرەکانەوە بۆ سەر پێغەمبەرو دابێتی بەو، ئەوە خۆ ئێوە ئەسپ و چوارپێتان بۆ تاو نەداوە بڕۆن دەستی بەسەرا بگرن تا بڵێن حەقی خۆمانە، بەڵام خوا پێغەمبەرانی خۆی زاڵ ئەکا بەسەر هەر کەسێکا کە خۆی مەیلی لێ بێ و خوا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە.

(٧) هەر دەسکەوتێ خوا گێڕابێتیەوە لە خەڵکی ئەو دێهاتانەوە کە موسوڵمانان دایان بەسەریاناو داگیریان کردن، ئەوە بۆ خواو بۆ پێغەمبەری خواو بۆ خزم و خوێشانی پێغەمبەرو بۆ هەتیوو هەژارو ڕێبوارانی موسوڵمانانە، بۆ ئەوەی دەست بە دەستی پێ نەکرێ لە نێوان دەوڵەمەندەکانتاناو ببەن بۆ خۆیان و، پێغەمبەریش هەرچیی دانێ لێی وەربگرن و هەرچییشی نەدانێ و وتی لێی گەڕێن، لێی گەڕێن و لە خوا بترسن، خوا سزای سەختە.

(٨) ئەو ماڵی گەڕاوەی کافرانە دابەش ئەکرێ لەناو هەژارانی ئەسحابەکانی پێغەمبەرا کە لە ماڵ و موڵکی خۆیان دەرکراون و لە مەککەوە کۆچیان کردووە بۆ مەدینەو، داوای کەرەم و ڕەزامەندیی خوا ئەکەن و یارمەتیی خواو پێغەمبەری خوا ئەدەن و ئەوانەن ڕاست و ڕاساڵن.

(٩) هەروەها بۆ ئەوانەیش لە ماڵ و مەنزڵی خۆیانا جێگیر بوون و لەگەڵ باوەڕ بە خواو پێغەمبەری خوادا ڕاهاتوونو بەرلەوەی کۆچکردووەکان کۆچ بکەن ئیمانیان هێناوەو خۆشیان دێ لەوانەی کۆچیان کردووە بۆ لایان و هیچ دڵگرانییەك لە خۆیانا شك نابەن بەرانبەر بەوەی دراوە بە کۆچکردووەکان و، کۆچکردووەکان ئەخەنە پێشی خۆیانەوە با خۆیشیان موحتاج بن و، هەر کەسێکیش پارێزرابێ لە پیسکەیی دڵ و دەروونی خۆی ئەوە لەو کەسانەیە کە ڕزگار بوون.

وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ ﴿١٠﴾ ۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ نَافَقُوا يَقُولُونَ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِنْ قُوتِلْتُمْ لَنَنْصُرَنَّكُمْ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنْ أُخْرِجُوا لَا يَخْرُجُونَ مَعَهُمْ وَلَئِنْ قُوتِلُوا لَا يَنْصُرُونَهُمْ وَلَئِنْ نَصَرُوهُمْ لَيُوَلُّنَّ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنْصَرُونَ ﴿١٢﴾ لَأَنْتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِمْ مِنَ اللَّهِ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَفْقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَاتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرًى مُحَصَّنَةٍ أَوْ مِنْ وَرَاءِ جُدُرٍ بَأْسُهُمْ بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٤﴾ كَمَثَلِ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ قَرِيبًا ذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنْسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنْكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦﴾



(١٠) هەروەها ماڵی گەڕاوەی کافران بۆ ئەو هەتیوو هەژارو ڕێبوارانەیشە کە پاش کۆچکردووەکان و یارمەتیدەرەکان موسوڵمان بوون و ئەڵێن: خوایە لێمان خۆش ببەو هەروا لەو برایانەیشمان کە پێشمان کەوتوون لە موسوڵمان بووناو، کینەو بەخیلی مەخەرە دڵمانەوە بەرانبەر بەوانەی باوەڕیان بە خواو پێغەمبەری خوا هەیە، خوایە تۆ میهرەبان و بە ڕەحمی.

(١١) ئەوە تۆ سەیری دووڕووەکان ناکەی بە برا کافرە جوولەکەو گاورەکانیان ئەڵێن: بەڕاستی ئەگەر ئێوە لە ماڵ و موڵکی خۆتان دەرکران، ئێمەیش لەگەڵتان دەرئەچین و، لە هەرچییەکدا زیانی ئێوەی تیا بێ هەرگیز بەگوێی کەس ناکەین و، ئەگەر جەنگتان لەگەڵ کرا یارمەتیتان ئەدەین و، خوایش شایەتە ئەوانە بەڕاستی درۆ ئەکەن.

(١٢) ئەگەر ئەو کافرانە دەرکران ئەو دووڕووانە لەگەڵیان دەرناچن و، ئەگەر جەنگیان لەگەڵ کرا یارمەتییان نادەن و، ئەگەر چوویشنە مەیدانی جەنگەوە بۆ یارمەتیدانیان هەڵدێن و پشت پێ هەڵئەکەن و، پاش ئەوەیش کافرەکان یارمەتی نادرێن و ئەشکێن و، یارمەتیی کەس سوودی بۆیان نابێ.

(١٣) بەڕاستی ئێوە بە سامترن لە دڵی ئەو کافرانەدا لە خوا، واتە لە ئێوە زۆرتر ئەترسن تا لە خوا، ئەوەیش لەوەوەیە کە ئەو کافرانە هیچ نافامن، ئەگەر هیچیان بفامییایە چۆن لە ئادەمزاد زۆرتر ئەترسان تا لە خوا؟

(١٤) ئەو کافرانە ناکەونە جەنگ لەگەڵتان لە دێهاتێکی قایمکراوا نەبێ یا لەودیوی دیواری قەڵاوە کە لەوێوە بتاندەنە بەر بەردو تیر. کە لەناو خۆیانا بەگژی یەکترا بچن بەهێزن و سەخت ئەجەنگن، وا ئەزانی هەموو یەك پارچەن و پێکەوە، بەڵام دڵیان پەرێشانەو هەر کۆمەڵێکیان بیرو بۆچوونێکیان هەیە، ئەمەیش بەهۆی ئەوەوەیە کۆمەڵێکی نەفام و بێ عەقڵن.

(١٥) وەك ئەوانەی پێش خۆیان بە ماوەیەکی کەم، سەرەنجامی بەدی کرداری خۆیانیان چەشت و لەو دنیایش سزایەکی پڕ ئازاری سەختیان بۆ هەیە.

(١٦) میسالی ئەم دووڕووانە لە هاندانی جوولەکەدا کە بە گژ موسوڵمانانا بچن وەك میسالی شەیتان وایە کە کەوتە بن کلێشەی ئادەمزادو پێی وت: کافر ببەو باوەڕت بە خواو پێغەمبەری خوا نەبێ. جا کە کافر بوو حاشای لێ کردو وتی: من بێ بەریم لە تۆ، من لە خوای پەروەردگاری هەموو جیهانەکان ئەترسم.

فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٤﴾

## سُورَةُ المُمۡتَحنَةِ

آياتها ١٣ — ترتيبها ٦٠



(١٧) جا سەرەنجامی هەردولایان ئەوەبوو کە هەردوولا لەناو ئاگری دۆزەخدان و هەمیشە تیایا ئەمێننەوەو، ئەمەیش پاداشی ستەمکارانە.

(١٨) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە! لە خوا بترسن و، با هەرکەسێ سەرنج بدا چیی لەپێش خۆیەوە ئامادە کردووە بۆ سبەینێی و لە خوا بترسن، بەڕاستی خوا خەبەردارە لە هەرچی کە ئەیکەن.

(١٩) وەك ئەو کەسانە مەبن کە خوایان فەرامۆش کردووەو لە بیری خۆیانیان بردووەتەوەو خوایش خۆیانی لەبیر بردوونەتەوە. ئەوانە کۆمەڵێکی فاسق و لە ڕێ لاداون.

(٢٠) هاوسان نین ئەوانەی بەهەشتین و ئەوانەی دۆزەخین. بەهەشتییەکانن ئەوانەی بە کەرەمی خوا بەختەوەر بوون.

(٢١) ئەگەر ئێمە ئەم قورئانەمان بناردایەتە خوارەوە بۆ سەر کێوێ لە جیاتیی ئەوەی کە بۆسەر ئادەمزادمان ناردووەتە خوارەوە، ئەو کێوەت ئەدی لە ترسی خوا سامی لێ نیشتووەو و پارچە پارچە بووە. ئێمە ئەم جۆرە نموونانە ئەهێنینەوە بۆ خەڵك بە هیوای ئەوەی بیربکەنەوە لە خواو لە توانایی خواو لە دوارۆژو پاداش و سزای ئەو دنیا.

(٢٢) خوا ئەو خوایە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە لەو زیاتر، بە هەموو ڕازو نهێنی و ئاشکراو لەبەر چاوێ ئەزانێ، هەر خۆی میهرەبان و بەڕەحمە لە دنیایش و لە قیامەتیشا.

(٢٣) خوا ئەو خوایە هیچ پەرستراوێکی بەڕاستی لەوبەولاوە نییە. پادشای هەموو جیهانە، پاکە لە هەموو ناتەواوییەك، سەلامەتە لە هەموو کەموکورتییەك، ئاسایش بەخشی هەمووانە. ئاگادارو پارێزگاری هەموو شتێکە. زاڵە بەسەر هەرچییەکا بییەوێ بیکا. چیی بوێ بکرێ خەڵك وا لێ ئەکا ئەوە بکەن. گەورەترە لەوە کە پێویستی بە هیچ ببێ و هیچ ناتەواوییەکی تیا بێ. پاك و خاوێنە لەوەی کە هاوبەش بۆ دانەرەکانی هاوبەشی بۆ دائەنێن.

(٢٤) ئەو خوایەیە هەموو جیهانی دروست کردووەو، لە نەبوونەوە هێناویەتە بوون و، وێنەی هەر دروستکراوێکی کردووە بەوجۆرەی خۆی ئەیەوێ. ناوە هەرە جوانەکانی هەیە. هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە هەموو بێگەردی و بێعەیبیی ئەو ئەڵێن و (سبحان الله)ی بۆ ئەکەن و، هەر خۆی خاوەن عیززەت و خاوەن حیکمەتە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ (١) إِن يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ (٢) لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ (٣) قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۖ رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ (٤) رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (٥)



## سوورەتی (المُمتَحنَة)

مەدینەیی‌یەو، (١٣) ئایەتە

(١) ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە، دوژمنی من و خۆتان حسێب مەکەن بە دۆست دەنگوباسی پێغەمبەرو هاوڕێیانی بگەیەنن پێیان بەهۆی پێوەندی خۆشەویستییەکەوە کە لەنێوان ئێوەو ئەوانا هەیە، کەچی ئەوان باوەڕیان نییە بەو ڕاستییە کە پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرەو لە خواوە هاتووە بۆتان و، پێغەمبەریش و ئێوەیش لە مەککە دەرئەکەن و لەبەر ئەوە کە ئیمانتان بە خوای پەروەردگاری خۆتان هەیە. ئەگەر ئێوە جارێ دەرچوون بۆ غەزا لە ڕێگای منداو بۆ وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی من، حسێبیان مەکەن بە دۆستی خۆتان بە هۆی خۆشەویستییەکەوە کە لەنێوان ئێوەو ئەوانا هەیە، ڕازو نیازی پێغەمبەرو موسوڵمانانیان پێ ڕابگەیەنن و، من زاناترم چیتان لێ شاردوونەتەوەو پێتان نەوتوون و چیتان بۆ دەرخستوون. هەرکەسیش کارێکی وا بکا ئەوە ڕێگای ڕاستی لێ تێکچووە.

(٢) ئەگەر دەستیان بڕوا بەسەرتاناو زەفەرتان پێ بەرن دوژمنتان ئەبن و دوژمنانە لەگەڵتان ئەجووڵێنەوەو دەست و زمانتان بە خراپە بۆ درێژ ئەکەن و ئەتانکوژن و دەسدرێژیتان ئەکەنەسەرو بە خراپ ناوتان ئەهێنن و باستان ئەکەن و حەزئەکەن پاشگەز ببنەوە لە موسوڵمانەتی و کافر ببنەوە.

(٣) مەڵێن: ئەمانە خزم و کەسوکارمانن. خزم و کەسوکارو منداڵتان هیچ دادتان نادەن لە ڕۆژی قیامەتا. خوا لەو ڕۆژەدا بەهۆی سام و ترسی ئەو ڕۆژەوە لە یەکتان جوێ ئەکاتەوەو هەرکەس خەمی خۆیەتی و لەگەڵ کردەوەی دنیای خۆی ئەژی و خوا خەبەردارە لە دنیادا چیتان کردووە.

(٤) بەڕاستی چاولێکەرییەکی جوانتان بۆ هەیە لە ئیبراهیم و ئەوانەدا کە لەگەڵی بوون لە باوەڕ بەخوای تەنهادا کە ئەوەبوو وتیان بە قەومەکەیان: ئێمە بێبەریین لە ئێوەو لەو شتانەی ئەیانپەرستن و خوای تاك و تەنیا ناپەرستن. ئێمە باوەڕمان بە ئێوەو ئایینی ئێوە نییەو دوژمنایەتی و حەزلێ‌نەکردنی بۆ هەمیشە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا دەرکەوتووە تا ئەو ڕۆژەی باوەڕ بە خوای بێ‌شەریك و تەنیاو تاك ئەکەن. تەنها لەوەدا چاو لە ئیبراهیم ناکرێ کە بە باوکیی وت: بابە ! داوای لێبووردنت بۆ ئەکەم لە خواو دەسەڵاتی هیچیشم بۆت نییە لای خوا. خوایە ! ئێمە پشتمان بە تۆ بەستووەو بۆ لای تۆ هاتووینەتەوەو سەرەنجام هەموو هەر لای تۆیە. ئەمەیش بەشێکە لە قسەی ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵی بوون لەگەڵ قەومە بێ‌باوەڕەکەیان.

(٥) خوایە ! مەمانکە بە مەیدانی تاقیکردنەوە بۆ کافران بەوە کە زاڵیان بکەی بەسەرماناو ئەوانیش سزامان بدەن و ئێمەیش لە ئەنجامی ئەو سزادانەدا دڵمان بگۆڕێ‌و، لێمان خۆش ببە. خوایە هەر تۆ خاوەن عیززەت و حیکمەتی.

لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ ۚ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦﴾ ۞ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً ۚ وَٱللَّهُ قَدِيرٌ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُوا۟ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾



(٦) بەڕاستی چاولێکەرییەکی جوانتان بۆ هەیە لە ئیبراهیم و ئەوانەدا کە لەگەڵی بوون بۆ هەرکەس ڕجای لێبووردنی خواو ڕزگاریی ڕۆژی قیامەتی هەبێ. هەرکەسیش پشت لەم جۆرە چاولێکەرییە هەڵکا هەر خۆی زەرەر ئەکا چونکە هەر خوا بێ‌ئیحتییاجە بەم خەڵکەو ستایش کراوە لەلایەن هەموانەوە.

(٧) ئومێد هەیە خوا دۆستایەتییەك بخاتە نێوان ئێوەو ئەوانەوە کە دوژمنایەتیتان لەگەڵ کردوون لە خزم و خوێشە هاوبەش‌بۆخوادانەرەکانتان، خوا توانایە ئەتوانێ ئەمە بکاو خوا بەخشندەو بەرەحمە.

(٨) خوا مەنعتان ناکا لە دۆستی لەگەڵ ئەو کافرانەی جەنگیان لەگەڵ نەکردوون بەهۆی ئایینەوە کە ئێوە موسوڵمان بوونو ئەوان بتپەرست بوون و لە وڵاتی خۆتانیان دەرنەکردوون، خوا ڕێتان لێ ناگرێ پیاوەتی لەگەڵ ئەوانە بکەن و بە داد لەگەڵیان بجووڵێنەوە، خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ بەداد لەگەڵ خەڵك ئەجووڵێنەوە.

(٩) خوا مەنعتان لە یارمەتیدان و دۆستایەتی‌لەگەڵ‌کردنی ئەوانە ئەکا کە جەنگیون لەگەڵتان لەسەر ئایین و لە وڵاتی خۆتانیان دەرکردوون و پشتی خەڵکی تریان گرتووە بۆ دەرکردنتان. خوا مەنعتان ئەکا لە دۆستایەتی‌کردن لەگەڵیان و ئەوانەی دۆستایەتییان لەگەڵ ئەکەن زاڵم و ستەمکارن.

(١٠) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! ئەگەر ژنانی خاوەن ئیمان هاتنە لاتان بە کۆچکردوویی لە شوێنی خۆیانەوە، تاقییان بکەنەوەو بەراوردی حاڵیان بکەن بزانن وەك بە زمان موسوڵمانن بە دڵیش موسوڵمانن؟ خوا خۆی زاناترە بە باوەڕی ئەو ژنانە ئاخۆ ڕاست ئەکەن یا نە ؟ ئەگەر زانیتان خاوەن ئیمانن مەیاندەنەوەو مەیانگێڕنەوە بۆ کافرەکان. نە ئەم ژنە خاوەن باوەڕانە حەڵاڵن بۆ کافرەکان و نە کافرەکان حەڵاڵن بۆ ئەمان و، ئەو مارەبییەی مێردی ئەو ژنە خاوەن باوەڕانە داویانە بە ژنەکانیان کە هاتوون بۆ ناو ئێوە بیدەنەوە بە مێردەکانیان و، گوناهباریش نابن ئەو ژنانە مارە ببڕن بۆ خۆتان ئەگەر مارەبیی خۆیانیان بدەنێ. دەستیش مەگرن بە نیکاحی ژنانی کافرەوەو لای خۆتان مەیانهێڵنەوەو بەرەڵلایان کەن با بڕۆنەوە بۆ ناو کافرەکان و، هەر مارەبییەکتان تیا مەسرەف کردوون داوای بکەنەوە لە کافرەکان و با ئەوانیش داوای هەر مارەبییەك بکەنەوە کە لە ژنە موسوڵمان بووەکانیانایان مەسرەف کردووە کە هاتوون بۆ ناو ئێوە. ئەمە فەرمانی خوایە لەم مەسئەلەیەدا بڕیاری ئەدا لە نێوانتاناو خوا زاناو خاوەن حیکمەتە.

(١١) ئەگەر کەسانێ لە ژنەکانتان لە دەستی ئێوە دەرچوون و چوون بۆ لای کافرەکان و کافرەکان مارەبیی ئەو ژنانەیان نەدایەوە پێتان و پاشان سەرە هاتە سەر ئێوەو نۆبەی ئەوە هات کە ئێوە مارەبیی ژنانی لای کافرەکانەوە هاتوو بۆناوتان بدەنەوە بە مێردەکانیان، ئەوە ئەو مارەبییانە مەدەنەوە بە کافرەکان بەڵکو بیدەن بەو موسوڵمانانەی لای خۆتان کە ژنەکانیان چوون بۆ ناو کافرەکان و کافرەکان مارەبییەکانیانیان بۆ نەگێڕاونەتەوەو، لەو خوایە بترسن کە باوەڕتان پێی هەیە چونکە ئەگەر مرۆڤ بەڕاستی باوەڕی بە خوا هەبێ ئەبێ لێی بترسێ.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْءَاخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴿١٣﴾

## سُورَةُ الصَّفِّ

ترتيبها ٦١ — آياتها ١٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾



(١٢) ئـەی پێغەمبـەری خـوا! كاتـێ ژنانی ئیمانبەخواهێناو هاتن بـۆ لات و ویستیان بەیعەتت پێ بكـەن و عەهـدو پەیمانت بدەنێ كەوا: هاوبـەش دانـەنێن بۆ خواو هـیچ نەكـەن بـە شـەریكی لـە خوایـەتییاو، دزی نەكـەن و، داوێـن پیسی نەكەن و، منالّی خۆیـان نـەكوژن و، بوختان هەڵنەبەستن لەنێوان دەست و پێی خۆیانـا، واتـە نـە منـالّی حـەلاڵی كەس بكەن بە زۆڵ و نـە زۆڵ بكـەن بـە منـالّی حـەلاڵی خۆیـان و، لـە هـیچ فەرمان بە چاكەیەكا كە تـۆ فـەرمانیان ئەدەیتێ بێگوێییت نەكەن، ئەوە تۆیش بەیعەتیان لەگـەڵ بكـەو بەیعەتەكـەیان لێ قوبووڵ بكەو داوا لـە خـوا بكـە لـە خـەتاو تاوانیـان ببـوورێ، خـوایش گوناهبەخش و بەرِەحمە.

(١٣) ئەی كەسانێ كە ئیمانتان هێناوە ! دۆسـتایەتی لەگـەڵ قـەومێك مەكـەن كە خوا غەزەبی لێ گرتـوون و نائومێـد بـوون لـەوەی كـە لـەو دنیـا هیچـیان دەسگیر ئەبێ و لە سـزای دۆزەخ رِزگـار ئەبن، وەك ئەو كافرانەی بە كافری مردوون و خراونەتە گۆرِ چۆن ئەوانیش لەوە نائومێد بـوون كـە زینـدوو ببنـەوە تـا چاكە بكەن یا لەو دنیا پاداشی چاكەیان بدرێتەوە.

## سوورەتی ( الصَّفِّ )

مەدینەیییەو، هەندێكیش وتویانە مەككەیییەو (١٤) ئایەتە

(١) هەرچـی لـە ئاسمانـەكان و لـە زەویـدا هەیـە گـەورەیی و بێگـەردیی خـوا ئەگـەیێنێو، خـوا خـاوەن عیـززەت و حیكمەتە.

(٢) ئەی كەسانێ كە ئیمانتان هێناوە ! بۆ بە دەم شتێ ئەڵێن كە بە كردەوە نایكەن ؟

(٣) ئەوە لای خوا زۆر بێزارو ناپەسەندە بە دەم شتێ بڵێن كە بە كردەوە نایكەن.

(٤) بەرِاستی خوا ئەو كەسانەی خۆشئەوێ كە لە رِێگەی ئەوا رِیز رِیز ئەجەنگن ئەڵێی بینایەكی پتەوو دارِێژراون.

(٥) یادی ئەوە بكەرەوە كە مووسا بە قەومەكەی خۆیی وت : ئەی قەومەكەم ! بۆچی دڵم ئێشێنن كە ئەیشزانن مـن خوا ناردوومیەتە سەر ئێوە ؟ كە ئەوانیش لەجیاتیی ئەوەی شوێنی كەون لە رِێی رِاست لایان دا، خـوایش دڵـی لـەوە لادان كە شتی رِاست وەربگرێ. خوا هەرگیز هیدایەتی كۆمەڵێ نادا كە لە رِاستی لایان دابێ.

وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا
لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا
جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ
عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰٓ إِلَى ٱلْإِسْلَٰمِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ
﴿٧﴾ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ
ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ
عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هَلْ أَدُلُّكُمْ
عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾
يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ
طَيِّبَةً فِى جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ وَأُخْرَىٰ تُحِبُّونَهَا ۖ نَصْرٌ
مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوٓا۟
أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّۦنَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ
قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَكَفَرَت طَّآئِفَةٌ ۖ فَأَيَّدْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا۟ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾



(٦) یادی ئەوەیش بکە کە عیسای کوڕی مەریەم بە بەنیئیسرائیلی وت : ئەی بەنی ئیسرائیل ! من فروستادەی خوام بۆ لای ئێوەو باوەڕم بەو کتێبەی خوا هەیە کە لە پێش دەستمایە کە تەوراتەو مژدەی پێغەمبەرێکیشم پێیە کە پاش من دێ ناوی (ئەحمەد)ە، کەچی کە ئەو پێغەمبەرە بە بەڵگەو دەلیلی ئاشکراو ڕوونەوە هات باوەڕیان پێ نەکردو وتیان : ئەم بەڵگەو دەلیلە جادوویەکی ئاشکراو ڕوونە.

(٧) کێ لەوکەسە ستەمکارترە درۆ بەدەم خواوە هەڵبەستێ کەچی ئەو بانگ بکرێ بۆ موسوڵمانبوون و بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای بۆ بهێنرێتەوە لەسەر ڕاستیی ئایینی ئیسلامو، ئەو بەو بەڵگەو دەلیلانە بڵێ: ئەمانە سیحرو جادوون ؟ خوا هەرگیز هیدایەتی تاقمی ستەمکار نادا.

(٨) ئەوانە ئەیانەوێ ڕووناکیی خوا بکوژێننەوە بەو قسانەی ئەیانکەن و، خوایش ڕووناکیی خۆی تەواو ئەکاو ئەیگەیەنێتە هەموو لایەك با کافرەکانیش پێیان خۆش نەبێ.

(٩) خوا خوایەکی وایە پێغەمبەری خۆی ناردووە بە قورئانەوە کە هۆی هیدایەتدانی خەڵکە بۆ ئیسلامەتی و، بە ئایینی ڕاستەوە کە ئایینی ئیسلامە بۆئەوەی ئەم ئایینە بەرزکاتەوە بەسەر هەموو ئایینێکا با هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش پێیان خۆش نەبێ.

(١٠) ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە ! ئایا بازرگانییەکی واتان پیشان بدەم ڕزگارتان بکا لە سزایەکی سەخت ؟

(١١) ئەو بازرگانییەیش ئەوەیە ئیمان بێنن بە خواو بە پێغەمبەری خواو غەزا بکەن لە ڕێی خوادا بە دارایيتان و بە خودی خۆتان، ئەوە چاکترە بۆتان ئەگەر ئێوە بزانن.

(١٢) تا خوایش تاوانەکانتان بپۆشێ و بتانخاتە ناو بەهەشتێکی وا جۆگەی ئاو بەژێریا گوزەر ئەکاو، بتانخاتە خانووبەرەی جوان و باش لە بەهەشتی (عەدن)، ئا ئەمەیشە بەمەرام گەیشتنی مەزن.

(١٣) نیعمەتێکی تریش هەیە حەزی لێئەکەن ئەویش یارمەتیدانتانە لەلای خواوەو دەرگابۆکرانەوەیەکی نزیکە کە کرانەوەی دەرگای مەککەیە لە ڕووتانا بە گرتنی ئەو شارەو، تۆ، ئەی موحەممەد، مژدە بە موسوڵمانان بدە بەم نیعمەتە.

(١٤) ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە ! ببن بە یارمەتیدەری ئایینی خوا وەك چۆن عیسای کوڕی مەریەم بە (حەواری) یەکانی وت : کێ یارمەتیم ئەدا بۆلای خوا ؟ حەوارییەکان وتیان : ئێمە یارمەتیدەری خواین و پشتی ئایینی خوا ئەگرین، جا تاقمێ لە بەنیئیسرائیلییەکان ئیمانیان پێهێناو تاقمێکیشیان کافربوون پێی و ئیمانیان پێ نەهێنا، ئێمەیش لایەنی خاوەن ئیمانەکانیانمان لەدژی دوژمنەکانیان گرت و زاڵ بوون بەسەریانا.

## سِوورەتی ( الجُمُعَة )

**مەدینەیی‌یەو، (١١) ئایەتە**

(١) گـــەورەیی و بێگـــەردیی خـــوا ئەگـەیێنێ هەرچـی لـە ئاسمانـەکان و لـە زەویدا هەیە، ئەو خوایەی کە پادشایەکی بێ‌عەیب و خاوەن عیززەت و حیکمەتە.

(٢) خـــوا ئـــەو خوایـــە لـــەناو نەخوێندەوارەکانا پێغەمبەرێکی ناردووە ئایەتەکانی خوایان بەسەرا ئەخوێنێتـەوەو پاکیـان ئەکاتـەوە لـە کـوفرو لـە خـووی بـەدو، قورئـان و حیکمـەت و قسـەی بـەجێیان فێرئـەکا کـە حـەدیثـی پێغەمبـەرەو، بەڕاسـتی بەرلـەوەی ئـەم پێغەمبـــەرە بێتـــە ســـەریان لـــە گومڕاهییەکی دیارو ئاشکرادا بوون.

(٣) کەسانێکی تریشیان لێ فێرئـەکا کـە هێشتا نەهاتوونەتە پاڵیـان و لەمـەوپاش دێن و خوا خاوەن عیززەت و حیکمەتە.

(٤) ئەمـــەیش فـــەزڵی خوایـــە بـــە هەرکەسێکی ئەدا کـە مـەیلی لێ بـێ و، خوا خاوەنی فەزڵی گەورەو مەزنە.



## سُورَةُ الجُمُعَةِ

ترتيبها ٦٢ — آياتها ١١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ وَءَاخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا۟ بِهِمْ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤﴾ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓا۟ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾



(٥) نموونەی ئەوکەسانە وایە کە تەوراتیان لە خواوە خرایە سەرشان کە خەڵکی پێ فێـر بکـەن و پاشـان ئـەو بارەیـان هەڵنەگرت و خەڵکیان فێـر نـەکرد، وەك گوێدرێـژێ بـارێ کتێبـی لێ بـار بکـرێ چۆن هـیچ سـوود لـەو بـارە کتێبـە وەرناگرێ، ئەوانیش وابوون هیچ سوودیان لە تەورات وەرنەگرت. زۆر ناشیرین و خراپە نموونـەی ئەوانـەی باوەڕیـان بـە ئایەتەکانی خوا نەکردو، خوایش هیدایەتی کەسانێ نادا زاڵم و ستەمکار بن.

(٦) تۆ، ئەی پێغەمبەر ! بەو جوولەکانە بڵێ : ئەگەر ئێوە گومان ئەبـەن کـەوا ئێـوە تـەنها خۆتـان و کەسـی تـر نـا دۆستی خوان و لەو دنیا سەربەرزو شادمان ئەبن، ئەگەر ڕاست ئەکەن ئاواتی مەرگی خۆتـان بخـوازن، چـونکە ئەگـەر بەپێی قسەکەی خۆتان بێ ئەبێ بەهەشتی بەرین جێتان بێ و حەزبکەن بمرن تا ڕاست و ڕەوان بڕۆن بۆ بەهەشت.

(٧) بەڵام بە هۆی ئەو کارە ناپەسەندو گوناهانەیانەوە کە کردوویانن و بەدەستی خۆیان لەپێش خۆیانا ناردوونیـان بـۆ ئەو دنیایان، هەرگیز ئاواتی مەرگی خۆیان ناخوازن و خوایش ئاگای لە حاڵی ستەمکارانە.

(٨) تۆ ئەی پێغەمبەر ! پێیان بڵێ : ئەو مەرگەی ئێوە لە ترسی هەڵدێن، هەر وەختێ بـێ هـەر پیاتانـدا ئەگاتـەوەو تووشتان دێ. جا کە مردن و لەو دنیا زیندوو کرانەوە ئەگێڕرێنەوە بۆ لای ئـەو خوایـەی ئاگـای لـە هـەموو کـارێکی ئاشکراو نهێنیی بەندەکانی هەیەو خەبەردارتان ئەکا کەوا لە دنیادا چیتان ئـەکردو، لەسـەر ئـەو کـردەوە خراپانـەتان لێتان ئەپرسێتەوە.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩﴾ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١﴾

## سُورَةُ المُنَافِقُون

مدنية ٦٣ — آياتها ١١

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ﴿٣﴾ ۞ وَإِذَا رَأَيۡتَهُمۡ تُعۡجِبُكَ أَجۡسَامُهُمۡۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡۖ كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞۖ يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ هُمُ ٱلۡعَدُوُّ فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٤﴾



(٩) ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە! کاتێ بانگ دراو موسولمانان بانگ کران بۆ نوێژ لە ڕۆژی جومعەدا، بە هەڵەداوان بڕۆن بۆ یادکردنەوەی خوا بە گوێگرتن بۆ خوتبەی نوێژی جومعەو کردنی نوێژی جومعەو، دەستبەرداری کڕین و فرۆشتن و مامەڵەکردن بن، ئەوە باشترو سوودمەندترە بۆتان لە بازرگانییەکەتان ئەگەر بزانن.

(١٠) جا کە نوێژەکەی جومعە بەجێهێنرا ئیتر بڵاو ببنەوە بە زەویداو لە ڕێگای کاسبی و کاری دەستی خۆتانەوە داوای ڕزق و ڕۆزی بکەن لە خواو لە هەر کوێیەکا بۆتان ڕێکەوت ناوی خوایش بەزۆری بهێنن بەڵکو لە سزای خوا ڕزگار بن.

(١١) کاتێ کە ئەو کۆمەڵە نوێژکەرەی دەورت بازرگانییەکی ڕەخساویان دی یاخود کارێکی وا نادەمزاد لە یادی خوا بێ‌ئاگا بکا بڵاوەی لێ ئەکەن لە دەورت و ئەڕۆن بەدەم بازرگانییەکە، یا کارە ئادەمزاد لەیادی‌خوا بێ‌ئاگاکەرەکەوەو تۆ بە پێوە جێ‌دێڵن. تۆیش پێیان بڵێ : ئەوەی لای خوا هەیە لە ڕزق و ڕۆزیی دنیاو بەهەشتی قیامەت لە ڕابواردنەکەو لە بازرگانییەکەیش چاکترەو، خوایش باشترین ڕۆزی دەهەندەیە.

## سوورەتی (المنافقون)

مەدینەیی‌یەو، (١١) ئایەتە

(١) کە دووڕووەکان دێنە لات، ئەڵێن : ئێمە شایەتی ئەدەین تۆ پێغەمبەری خوای و، خوایش ئەزانێ بەڕاستی تۆ پێغەمبەری ئەوی و، خوا شایەتییش ئەدا کەوا دووڕووەکان درۆنەکەن کە ئەڵێن: شایەتی ئەدەین، چونکە شایەتی پێوستە دڵ و زوبانی تیا هاوجووت و موافیقی یەك بن و، دووڕووەکانیش دڵ و زوبانیان یەك نین.

(٢) ئەوانە سوێندەکانی خۆیانیان کردووە بە قەڵغان بۆ پاراستنی خۆیان و بەوجۆرە ڕێ لە خەڵك ئەگرن کەوا ڕێگەی خودا بگرنەبەر. بێ‌گومان ئەمانە کارێکی خراپ ئەکەن.

(٣) ئەم حاڵەیش لەبەر ئەوەیە کە ئەو دووڕووانە لەپێشا ئیمانیان هێنابوو پاشان کافر بوون و ئەنجا لە کافرییەکەیانا قاڵ بوون تا مۆر نرا بە دڵیانەوە، ئێستا ئەوانە نافامن.

(٤) کە ئەیانبینی لەشولاریانت زۆر لا جوانەو ئەتخاتە سەرسوڕمان. کە قسەیش ئەکەن ئەبیستی و گوێی بۆ شل ئەکەی چونکە زمان لووس و قسەخۆشن، لەبەر ئەوە کە هیچیان پێ نییەو بۆشن ئەڵێی تەختەن پاڵ دراونەتەوە. ئەوەندە بەدگومان و لەخۆبەشکن، هەر هاوارێ لە مەدینەوە بکرێ وا ئەزانن بۆ سەر ئەوانە چونکە موسولمانان بە دوژمنی خۆیان ئەزانن. ئەوانەن دوژمن، چونکە بەدیمەن لەگەڵتانن و لەڕاستیدا دژتانن، کەواتە خۆتیان لێ بپارێزە. خوا بیانکوژێ چۆن لە ڕێی حەق و ڕاست لائەدرێن !

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾

## سُورَةُ التَّغَابُنِ

ترتيبها ٦٤ — آياتها ١٨



(٥) کە پێیان بووترێ: وەرن با پێغەمبەر داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکا لە خوا، سەر بادەدەن بەم لاو بەو لاداو ئەیانبینی مەنعی خۆیان ئەکەن لە هاتن بۆ لات و خۆیان لەوە بە زلتر ئەزانن کە پێغەمبەر داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکا لە خواو فیزیان نایە بێن.

(٦) بەش بە حاڵی ئەوان یەکسانە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی لە خوا یا داوای لێخۆشبوونیان بۆ نەکەی، هەرگیز خوا لێیان خۆش نابێ. بەڕاستی خوا هیدایەتی خێڵی فاسقان نادا.

(٧) ئەوانە ئەوانەن بە یارمەتیدەرە مەدینەییەکان ئەڵێن : پارەو دارایی خۆتان خەرج مەکەن بۆ ئەو موسوڵمانە مەککەییە کۆچکردووە هەژارانەی لای پێغەمبەرن و بەدەوروبەریان، با لەبرسانا بڵاوەی لێ بکەن‌و بەجێی بهێڵن. هەموو گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەوی هی خوان، بەڵام دووڕووەکان نەفامن و تێناگەن.

(٨) دووڕووەکان ئەڵێن : ئەگەر لەم غەزایە گەڕاینەوە بۆ مەدینە پیاوە خاوەن عیززەتەکان (کە خۆمانین) زەلیلەکان (کە گوایە پێغەمبەرو هاوڕێکانینی) لەو شارە دەرئەکەن، بەڵام خاوەن عیززەت ئەوان نین، عیززەت و زاڵبوون و سەرکەوتن هەر بۆ خواو پێغەمبەری خواو موسوڵمانانە، بەڵام دووڕووەکان نازانن خاوەن عیززەتی ڕاستی کێیە.

(٩) ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە بە خواو پێغەمبەری خوا ! با دارایی و ئەولادتان لە یادی خواتان بێ‌ئاگا نەکەن. هەرکەسیش شتی وا بکاو لە یادی خوا بێ‌ئاگا بێ، ئەوانە زەرەرمەندو زیان لێکەوتوون.

(١٠) لەو ڕۆزییەی داومانەنەتێ و کردوومانە بە ڕۆزی بۆتان خەرج بکەن بۆ پاشەکەوتی ئەو دنیا، بەر لەوەی نیشانەی مردنی یەکێکتان دەرکەوێ و ئەو کاتە بڵێ : خوایە ! بۆچی ئاکامم دواناخەی بۆ ماوەیەکی نزیک تا لەم فرسەتەدا خێرو حەسەنات بکەم و یەکێ بم لە پیاوچاکان ؟

(١١) بەڵام خوا هیچ گیانلەبەرێ پاش ناخا کە ئاکامی مەرگی هات و، خوا شارەزایە لە هەموو کارو کردەوەیەکتان.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤﴾ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟ وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٦﴾ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن لَّن يُبْعَثُوا۟ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلْنَا وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾



## سوورەتی (التغابن)

مەدینەیی‌یەو هەندێکیش ئەڵێن مەککەیی‌یەو، (١٨) ئایەتە

(١) هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە گەورەیی و بێگەردیی خوا ئەگەیێنێ. خاوەنێتی و ستایش بۆ ئەوەو هەر ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ.

(٢) خوا ئەو خوایە ئێوەی دروست کردووە،، جا هەندێکتان کافرو هەندێکتان خاوەن باوەڕن و، خوایش چاوی لەهەر کارێکەوەیە کە ئێوە ئەیکەن.

(٣) ئاسمانەکان و زەویی بە حیکمەتی پڕی خۆی دروست کردووەو ئێوەی نەخشاندووەو جوانیشی نەخشاندوون و، سەرەنجامیش گەڕانەوە هەر بۆ لای ئەوە.

(٤) زانایە بە هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیەو، زانایە بە هەرچی ئەیشارنەوەو هەرچی دەریئەخەن و، خوا زانایە بە هەرچی لەناو سنگدایە واتە لەناو دڵدایە.

(٥) ئایا دەنگوباسی ئەوانەتان پێ‌نەگەیشتووە کە لە سەردەمەکانی پێشوودا کافر بوون و لە ئەنجامی ئەو کافرییەیاندا پاداشی کاری خۆیانیان چەشت و لە قیامەتیشا سزایەکی پڕ ئێش و ئازاریان هەیە؟

(٦) ئەوەیش لەبەرئەوە بوو کە پێغەمبەرەکانیان بە موعجیزەوە ئەهاتنە لایان کەچی ئەوان لەجیاتیی ئەوەی ئیمانیان پێ بهێنن ئەیانوت : چۆن ئەبێ ئادەمزاد هیدایەتمان بدەن ! بەو جۆرە کافر بوون و پشتیان لە خوا هەڵکردو خوایش ئیحتیاجی پێیان نەبوو و خوا دەوڵەمەندو ستایش کراوە.

(٧) کافرەکان بە خەیاڵی خۆیان گومانیان وایە کە هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە. تۆیش، ئەی پێغەمبەر ! پێیان بڵێ : بەڵێ وەڵڵا! قەسەم بە خوای پەروەردگارم بەڕاستی گشتتان زیندوو ئەکرێنەوەو پاشان پێتان ڕائەگەیەنرێ کە چیتان کردووە لە دنیاداو ئەمەیش بۆ خوا کارێکی ئاسانە.

(٨) کەواتە ئیمان بهێنن بە خواو بە پێغەمبەری خواو بەو ڕووناکییەی نازڵمان کردووەتە خوار کە قورئانەو، خوا خەبەرداره لەو کارو کردەوانەی ئێوە ئەیانکەن.

(٩) لەوڕۆژەدا کە خوا کۆتان ئەکاتەوە بۆ ڕۆژی کۆکردنەوەی ئادەمزادو پەریو فریشتە کە ڕۆژی یەك یەك بە زیان کردوو ناو بردنە، کافر زیان کردووە چونکە ئیمانی نەبوەو بەهەشتی بۆ نەبوەو دۆزەخ بووە بە جێگەی، لەبەرئەوە هەریەکەیان باسی زیانکردوویی خۆی بۆ ئەویان ئەکا. موسوڵمانانیش پێیان ئەڵێن : ئەگەر ئیمانتان بهێنایە ئەو بەهەشتەی بووە بە جێگەی ئێمە، ئەبوو بە جێگەی ئێوەیش. جا هەرکەرس باوەڕی بە خوا هەبێ و کردەوەی چاك بکا خوا تاوانەکانی دائەپۆشێ و ئەیخاتە بەهەشتێکی واوە جۆگەو ڕووباری بە بنا ئەڕواو بۆ هەمیشە تیایا ئەمێنێتەوەو سەرکەوتنی مەزنیش هەر ئەوەیە.

وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٠﴾ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ ۚ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿١٢﴾ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٣﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَاللَّهُ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنفِقُوا خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ ۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾

## سُورَةُ الطَّلَاقِ

ترتيبها ٦٥ — آياتها ١٢



(١٠) ئەوکەسانەیش کە لە دنیادا کافر بوون و ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ داناوە، ئەوانە هاوڕێی ئاگرن و هەتا هەتایە تیایا ئەمێننەوەو سەرەنجامیان سەرەنجامێکی زۆر خراپە.

(١١) هیچ دەردو نەهاتییەك تووشی کەس نایەت بە ڕەزامەندیی خوا نەبێ. هەرکەسیش ئیمانی هەبێ بە خوا، خوا هیدایەتی دڵی ئەداو، خوا بە هەموو شتێ ئەزانێ.

(١٢) بە فەرمانی خواو بە فەرمانی پێغەمبەری خوا بجووڵێنەوەو، ئەگەر پشتتان لە فەرمانی ئەوان هەڵکرد هیچ زیانێ بە پێغەمبەر ناگا چونکە ئەو هەر ئەوەندەی لەسەرە کە نامەی خوا بە ڕۆشنی بگەیەنێ و گەیاندوویشیەتی.

(١٣) خوا خوایەکە هیچ پەرستراوێکی بەحەق لەو بەولاوە نییە. دەی با ئەوانەی خاوەن باوەڕن پشت بە خوا ببەستن و بەو پشتئەستوور بن.

(١٤) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ! بێگومان هەندێ لە ژنەکانتان و لە منداڵەکانتان دوژمنتانن، خۆتان بپارێزن لێیان. ئەگەر لێیشیان خۆش بن و چاوپۆشییان لێ بکەن و تاوانیان بپۆشن، خوایش بەڕاستی بەخشندەو بەڕەحمە.

(١٥) بێگومان منداڵ و دارایی ئێوە لە مایەی تاقیکردنەوەتان بەولاوە نین تا دەرکەوێ ئاخۆ بە منداڵ و بە دارایی بایی ئەبن و خواتان لەیادئەچێتەوە یا نە. خوایش ئەجرو پاداشی گەورەی لایە بۆ هەرکەسێ ڕێگای ئەو بگرێ.

(١٦) دەی چەندتان پێ ئەکرێ لە خوا بترسن و فەرمانی ببیسن و بەگوێی بکەن ماڵی دنیا خەرج بکەن بۆ دنیاو بۆ قیامەتی خۆتان و، هەرکەسێ لە ڕژدیی نەفسی خۆی پارێزرابێ ئەوە ئەو کەسانە بەختەوەری هەردوو دنیان.

(١٧) ئەگەر دارایی خۆتان بە قەرز بدەن بە خوا لەگەڵ ساغیی دڵ و دەروونی خۆتانا، خوا بە دووقات ئەتانداتەوەو لە گوناهتان خۆش ئەبێ‌و، خوا لەجیاتیی بەخشینی کەم پاداشی زۆر ئەداتەوەو بەحیلمیشە زوو سزای تاوانبار نادا.

(١٨) خوا زانایە بە هەموو شتێکی نهێنی و ئاشکراو، خاوەن عیززەت و شەوکەتەو خاوەن حیکمەتە.

# سوورەتی (الطَّلاق)

**مەدینەییەو، (١٢) ئایەتە**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ وَٱلَّٰٓـِٔى لَمْ يَحِضْنَ ۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾ ذَٰلِكَ أَمْرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴿٥﴾



(١) ئەی پێغەمبەر! کە ویستتان ژن تەڵاق بدەن لەگەڵ دەستکردنیان بە ماوەی عیددە تەڵاقیان بدەن، واتە با ژنەکان لە پاکیدا بن و پێش تەڵاقدانەکەیشیان نەچووبنە لایان ئەوەك سکیان پڕبووبێ بە منداڵ، ماوەی عییددەکەشیان بۆ ڕابگرن و بیژمێرن با کەم و زیاد نەکاو، لە خوای خۆیشتان بترسن، لەو ماڵەیان مەکەنە دەرەوە کە تیا تەڵاق دراون مەگەر کاتێ کارێکی شەرماوەری ئاشکراو دیار بکەن. ئەمانەی بەیان کران سنورگەلێکن خوا دایناون، هەرکەسیش لە سنووری خوا دابنابێ لابدا ستەمی لە خۆی کردووە. تۆ نازانی ڕووداوی دنیا چۆن ئەبێ، لەوانەیە خوا پاش ئەو تەڵاقدانە کاری ڕێك بخا ببێ بە مایەی ئەوەی پیاوەکە ژنەکە بهێنێتەوە ژێر نیکاحی خۆی. کەواتە با ژنەکە لەشوێنی خۆیا بمێنێتەوەو لەگەڵ مێردەکەی دۆست بن.

(٢) کاتێ کە ژنە تەڵاقدراوەکان گەیشتنە ئاخری ماوەی عیددە بەسەرچوونیان، یا بەچاکی ڕایان بگرن یا بە چاکی لێیان جوێ ببنەوەو دوو پیاوی ساغ و ڕاست لە خۆتان بکەن بە شایەت. ئێوەیش ئەی کەسانێ کە گیراون بە شایەت، هەر کاتێ پێویستی کرد لەبەر خوا شایەتیی خۆتان بدەن و هیچ مەبەستێکی تری تێکەڵ مەکەن. ئەمە ئەو ئامۆژگارییەیە خوا ئامۆژگاریی هەرکەسێکی پێ ئەکا کە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هەبێ و، هەرکەسیش لە خوا بترسێ خوا کەلێنێکی بۆ ئەکاتەوە ڕزگاری ببێ پێی لە تەنگوچەڵەمە.

(٣) ڕۆزیشی لەلایەکەوە بۆ ئەنێرێ خۆی گومانی نەبردبێ. هەر کەسیش پشت بەخوا ببەستێ خوای بەسەو پێویستی بە کەسی تر نییە. خوا کاری خۆی ئەگەیەنێتە هەر ڕادەیەك خۆی مەیلی لێ بێ. خوا بۆ هەر شتێ ئەندازەیەکی داناوە.

(٤) ئەو ژنانەیش کە ئائومێد بوون لەوەی حەیزیان پیا بێت لە ژنانی ئێوە، ئەگەر کەوتنە گومانەوە لە عییدەیانا کە سەرەتاکەی کەیەو بڕانەوەی کەیە، ئەوە عییدەیان سێ مانگە ڕابووری بەسەریانا، هەروا ئەو ژنانەیش کە هەر لە بنەڕەتەوە حەیزیان پیا نەهاتووە، ئەو ژنانەیش کە سکیان هەیە ماوەی عیددەیان ئەوەیە سکەکەیان دانێن. هەرکەسیش لەخوا بترسێ و ئاگای لەم سنورە شەرعیانە بێ کە خوا دایناون خوا کاری بۆ ئاسان ئەکا.

(٥) ئەمەی وتمان فەرمانی خوایە ناردوویەتیە خوارەوە بۆ ئێوەو، هەر کەسیش لە خوا بترسێ خوا تاوانەکانی دائەپۆشێ و پاداشیشی لەسەر کرداری چاکی بۆ گەورە ئەکا.

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟
عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُو۟لَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ
فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن
تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ
وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا
إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ
عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا
عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾
أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ
قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ
لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ
وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا
ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ
سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ
ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾



(٦) ئەو عیددەدارە تەڵاقدراوانە لە ماوەی عیددەکەیانا بە گوێرەی توان و دەسەڵاتی خۆتان لەو شوێنەدا دابنێن کە خۆتانی تیا دائەنیشن و زیانیان پێ مەگەیەنن بۆ ئەوەی تەنگیان پێ هەڵبچنن و ناچاری دەرچوونیان بکەن لەو شوێنەی تیا نیشتەجێن. خۆ ئەگەر دووگیانیش بوون ئەوا مەسرەفیان بۆ بکەن تا سکەکەیان دائەنێن. پاش ئەوە ئەگەر مناڵەکەیان بۆ شیرپێدان و بۆیان بەخێوکردن کرێی خۆیانیان بدەنێ و لەبارەی چۆنیەتیی شیر پێدان و بەخێوکردنی مناڵەکەو کرێپێدانی دایکیەوە لەناو خۆتانا گفتوگۆو پرس و ڕاوێژ بکەن بە شێوەیەکی باش، واتە بەگوێرەی ئەندازەی دارایی و دەسەڵاتی باوکەکەو پێویستی دایکەکە. خۆ ئەگەر کارەکەیش زەحمەت بوو و نەتانتوانی ڕێککەون و ڕێگە چارەیەك بدۆزنەوە لەم بارەوە، ئەوە ئافرەتێکی تر ئەبێ بە دایەنی مناڵەکەو شیری ئەداتێ.

(٧) با دەوڵەمەندو گوزەرانخۆش پارە سەرف بکا بۆ ژنی شیرپێدەری منالەکەی بەئەندازەی دەوڵەمەندیی خۆی و، ئەوەیش کە ڕزقی بەسراوە با بە ئەندازەی خۆی و بەگوێرەی ئەوەی خوا پێی داوە مەسرەف بکا. خوا بار ناخاتە سەر شانی کەس بە گوێرەی توان و تاقەتی ئەوکەسە نەبێ. خوا لە پاش تەنگی گوشادی دێنێ.

(٨) زۆر ئاوایی هەبوون سەرکێشییان کرد لە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا. ئێمەیش بە لێپرسینەوەیەکی سەخت لێمان پرسینەوەو بە سزایەکی نابار سزامان دان.

(٩) سەرەنجام ئەو دێهاتە سزای کافریی خۆیان چەشت و پاشینەی کاریان زیان و دۆڕان بوو.

(١٠) ئەوانە خوا سزایەکی سەختی بۆ ئامادە کردوون، کەواتە ئێوە ئەی هۆشمەندەکان کە ئیمانتان هێناوە، لە خوای خۆتان بترسن، بەڕاستی خوا کەسێکی ناردووەتە سەر ئێوە کە خواتان وەبیردێنێتەوە.

(١١) کە بریتییە لە پێغەمبەرێ ئایەتی ڕێ‌ڕوونکەرەوەتان بەسەرا ئەخوێنێتەوە بۆ ئەوەی خاوەن باوەڕو ئیمان هاوردووەکان کە چاکەیان کردووە لە دنیادا، لە تاریکییەوە بخاتە ڕووناکی و، هەرکەسیش باوەڕی بە خوا ببێ و کاری چاك بکا خوا ئەیخاتە بەهەشتێکی ئەوتۆ کە جۆگەو ڕووباری بە بنا ئەڕواو هەمیشە تیا ئەمێننەوە. بەڕاستی خوا بژێوییەکی باشی بەمانە بەخشیوە.

(١٢) خوا ئەو خوایە حەوت ئاسمانی دروست کردووەو زەوییشی ئەوەندەی ئەو ئاسمانانە دروست کردووەو فەرمانی ئەو لەنێوان ئەم ئاسمان و زەوییانەدا ئەڕوا تا بزانن خوا بەسەر هەموو شتێکا توانایەو زانستی ئەو دەوری هەموو شتێکی داوە.

## سُورَةُ التَّحْرِيمِ

ترتيبها ٦٦ — آياتها ١٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١﴾ قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَٰنِكُمْ وَٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِۦ وَأَظْهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُۥ وَأَعْرَضَ عَنۢ بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتْ مَنْ أَنۢبَأَكَ هَٰذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٣﴾ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوْلَىٰهُ وَجِبْرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧﴾



## سووره‌تی (التَّحْرِيمِ)

مه‌دینه‌یی‌یه‌و، (١٢) ئایه‌ته

(١) ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر! تۆ بۆچی شتێ له‌خۆت حه‌رام ئه‌که‌ی که خوا بۆی حه‌ڵاڵ کردووی؟ ڕه‌زامه‌ندیی ژنه‌کانتت له‌م کاره‌دا ئه‌وێ! ئێستاش که ئه‌وه‌ت کردووه خوا به‌خشنده‌و به‌ڕه‌حمه.

(٢) به‌ڕاستی خوا کردنه‌وه‌ی گرێی سوێنده‌کانتانی بۆ بڕیار داون به‌دانی که‌فاره‌ت له به‌رانبه‌ری ئه‌و سوێنانه‌داو، خوا گه‌وره‌ی ئێوه‌یه‌و خوا زاناو خاوه‌ن حیکمه‌ته.

(٣) کاتێ که پێغه‌مبه‌ر قسه‌یه‌کی به په‌نامه‌کی بۆ یه‌کێ له حه‌ره‌مه‌کانی گێڕایه‌وه، جا که ئه‌و حه‌ره‌مه‌ی پێغه‌مبه‌ر قسه‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر که بۆ ئه‌وی کردبوو- گێڕایه‌وه بۆ که‌سانێکی ترو خوایش پێغه‌مبه‌ری ئاگادارکرد که‌وا ئه‌و حه‌ره‌مه‌ی قسه‌که‌ی ئه‌وی که به په‌نامه‌کی بۆی گێڕابووه‌وه، بۆ که‌سانێکی تر گێڕاوه‌ته‌وه‌و، پێغه‌مبه‌ریش هه‌ندێ له‌و قسه گێڕراوانه‌ی دیسانه‌وه بۆ حه‌ره‌مه‌که‌ی گێڕایه‌وه‌و هه‌ندێکیانی بۆ نه‌گێڕایه‌وه، حه‌ره‌مه‌که‌ی پێی وت: کێ خه‌به‌ری دایتێ من قسه‌کانتم گێڕاوه‌ته‌وه که بۆت کردبووم؟ پێغه‌مبه‌ریش وتی: خوا ئاگاداری کردم که هه‌موو شتێ ئه‌زانێ‌و له هه‌موو شتێ خه‌به‌رداره.

(٤) جا له‌سه‌ر ئه‌م ڕووداوه که سه‌ره‌تاکه‌ی وابووه پێغه‌مبه‌ر شتێکی بۆ حه‌فصه‌ی حه‌ره‌می گێڕاوه‌ته‌وه‌و ئه‌ویش چووبوو بۆ عائیشه‌ی گێڕابووه‌وه، خوا ڕووی قسه ئه‌کاته ئه‌و دوو حه‌ره‌مه‌ی پێغه‌مبه‌رو پێیان ئه‌فه‌رموێ: ئه‌گه‌ر ئێوه په‌شیمان ئه‌بنه‌وه له‌وه‌ی کردووتانه‌و تۆبه ئه‌که‌ن لای خوا، ئه‌وه چاکه‌و سوودی هه‌یه بۆتان، چونکه دڵتان لایداوه له حه‌ق و کارێکتان کردوه که پێویستی به تۆبه‌لێ‌کردن بێ. خۆ ئه‌گه‌ر پشتی یه‌کیش ئه‌گرن له‌دژی پێغه‌مبه‌ر، ئه‌وه ئه‌و هیچ زیانێکی پێ‌ناگاو، خوا دۆستی ئه‌وه‌و جوبره‌ئیل و باشانی ناو خاوه‌ن باوه‌ڕه‌کان و، له‌مانه‌یش به‌ولاوه فریشته‌کانی خوایش پشتیوانینی. (٥) زۆر نزیکه ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ر ده‌سبه‌رداری ئێوه ببێ‌و ته‌ڵاقتان بدا، خوا له‌جیاتیی ئێوه ژنی له ئێوه چاکتری بداتێ، ژنانی موسوڵمانی خاوه‌ن باوه‌ڕی نوێژوتاعه‌تکه‌ری تۆبه له‌گوناهکه‌ری خواپه‌رستی ڕۆژووگر له بێوه‌ژن و له کچ.

(٦) ئه‌ی ئه‌وانه‌ی که خاوه‌ن باوه‌ڕن! خۆتان و ژن و منداڵتان له ئاگرێ بپارێزن که سووته‌مه‌نییه‌که‌ی ئاده‌مزادو به‌رده‌و فریشته‌ی زبرو توندو تووڕه‌ی به‌سه‌ره‌وه‌یه، خوا هه‌ر فه‌رمانێکیان بداتێ بێ‌فه‌رمانیی ناکه‌ن و هه‌رچییان ئه‌مر پێ‌بکرێ ئه‌یکه‌ن.

(٧) ئه‌ی که‌سانێ که کافربوون! ئه‌مڕۆ عوزرو بڕوبیانوو مه‌هێننه‌وه. جه‌زاتان هه‌ر له‌سه‌ر ئه‌و کرده‌وانه‌تان ئه‌درێته‌وه که کردووتانن.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٩﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖۖ كَانَتَا تَحۡتَ عَبۡدَيۡنِ مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾



(٨) ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە! بگەڕێنەوە بۆ لای خواو تۆبەیەکی خاوێن و بێگەرد بکەن، بەڵکو خوای خۆتان لە کردەوە خراپەکانتان ببورێو بتانخاتە بەهەشتی واوە کە جۆگەو ئاوی بە بنا ئەڕوا، لەو ڕۆژەدا کە خوا پێغەمبەرو خاوەن باوەڕەکانی تەکی ڕسوا ناکاو، حاڵیان وایە ڕووناکییان لەبەردەمیان و لای ڕاستیانەوە ئەڕواو ئەڵێن: خوایە ئەم ڕووناکییەمان بۆ تەواو بکەو لێمان خۆش بە، تۆ توانی هەموو شتێکت هەیە.

(٩) ئەی پێغەمبەر! غەزای کافرەکان و دووڕووەکان بکەو توند بە لەگەڵیان. ماوای ئەوان دۆزەخەو دۆزەخ ماوایەکی خراپە.

(١٠) خوا نموونەی هێناوەتەوە بۆ ئەوانەی کافربوون، ژنەکەی نووح و ژنەکەی لووطی کردووە بە نموونە. ئەم دوو ئافرەتە لەژێر نیکاحی دوو بەندەی پیاوچاکی ئێمەدا بوون کەچی خیانەتیان لەگەڵ کردن، بەناو لەسەر ئایینی مێردەکانیان بوون و لەڕاستیدا لەگەڵ کافرەکانی دوژمنی مێردەکانیان بوون، بۆیە مێردەکانیان نەیانتوانی هیچ سوودێکیان لە ڕاستی خوادا بگەیەننێ و، پێیان وترا: بچنە ناو ئاگری دۆزەخ لەگەڵ ئەو کافرانەی تێی ئەچن.

(١١) خوا نموونەیشی هێناوەتەوە بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، ژنەکەی فیرعەونی کردووە بە نموونە، ئەوە بوو وتی: خوایا خانوویەکم لای خۆت لە بەهەشتا بۆ بینا بکەو، لە فیرعەون و کارو کردەوەی فیرعەون و لە خێڵی ستەمکارانم ڕزگار بکە.

(١٢) هەروا مەریەمی کچی عیمرانیش کە فەرجی خۆی پاراست و ئێمەیش لە ڕێگای فریشتەی خۆمانەوە- فوومان پیاکردو، ئەویش باوەڕی بە وشەکانی خوا کرد کە عیسا لەنێوان ڕانەکانیەوە - ڕانەکانی دایکی- پێی وت بەخەڵکیان بڵێو، بەو کتێبانەی کە خوا ناردبوونیە خوارەوە بۆسەر پێغەمبەران و، لەخواپەرستان بوو.

## سُورَةُ المُلْكِ

مكية — آياتها ٣٠ — ترتيبها ٦٧

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾



## سووڕەتی (المُلْكِ)

مەککەیی‌یەو، (٣٠) ئایەتە

(١) زۆر گەورەو پایەدارو پڕبەرەکەتە ئەو خوایەی فەرمانداریی جیهان هەمووی بە دەستی ئەوەو توانی هەموو شتێکی هەیە.

(٢) ئەو خوایەی مردن و ژیانی دروست کردووە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە کام لە ئێوە گوفتارو ڕەفتاری لە هیی خەلکی تر جوانترەو، هەر خوایە خاوەن عیززەت و گوناهبەخش.

(٣) ئەو خوایەی حەوت ئاسمانی چین لەسەر چین دروست کردووە، لە دروست کراوی خوادا فەرق و جیاوازی نابینی. جارێکی تریش چاو بگێڕە، بزانە هیچ کەلێن و کەلەبەرێ لە کاری خوادا ئەبینی؟

(٤) پاشانیش دوو جاریتر چاو بگێڕەوە، چاوت بە نائومێدی ئەگەڕێتەوە بۆ لات چونکە هیچ کەلێن و کەلەبەرێکی لە کاری خوادا بەدی‌نەکردووەو، لە ڕوانینی بەم لاو بەولادا ماندوو بووە.

(٥) بەڕاستی ئێمە ئاسمانی لە ئاسمانەکانی تر لە زەوییەوە نزیکمان بە کۆمەلێ چرا ڕازاندووەتەوە کە ئەستێرەکان و مانگو ڕۆژن و ئەو ئەستێرانەمان کردووە بە هۆی ڕەجمکردن و دوورخستنەوەی شەیتانەکان و ئاگری دۆزەخیشمان ئامادەکردووە بۆیان.

(٦) بۆ هەموو ئەوانەیش کە کافر بوون و ئینکاری خوای خۆیانیان کردووە سزای دۆزەخ هەیەو، سزای دۆزەخیش سەرەنجامێکی زۆر خراپە.

(٧) کە فڕێ ئەدرێنە ناو دۆزەخەوە دەنگێکی ناهەمواری وەك دەنگی زەڕەی کەری لێوە ئەبیسن و وەك مەنجەلێ پێیانەوە ئەکولێ.

(٨) ئەو ئاگری دۆزەخە وەختە لە ڕقانا لەو کافرانەی تێی فڕێ ئەدرێن، پارچە پارچە ببێ. هەرچەند تیپێ لەو کافرانەی تێ فڕێ‌ئەدرێ دەرگاوانەکانی لێیان ئەپرسن: ئەوە پێغەمبەرێکتان نەهاتە لا لەم ڕۆژەتان بترسێنێ؟

(٩) ئەوانیش ئەلێن: بەلێ وەڵلا. بەڕاستی پێغەمبەرمان هاتەسەرو لەم ڕۆژەی ترساندین، بەلام ئێمە باوەڕمان پێ‌نەکردو بە درۆزنمان داناو وتمان: حاشا خوا هیچ ئایەتێکی نەناردووەتە خوار. ئێوە، ئەی ئەوانەی خۆتان بە فروستادەی خوا دائەنێن، لە گومڕاهییەکی گەورەدان.

(١٠) ئەیشلێن: ئەگەر ئێمە گوێچکەمان ببوایە بۆ بیستنی قسەی پێغەمبەران یا هۆش و فامان بوایە بیرمان بکردایەتەوە، ئێستا لە ئەهلی دۆزەخ نەئەبووین.

(١١) بەم جۆرە پێ لە تاوانی خۆیان ئەنێن، دەسا با خوا ئەهلی دۆزەخ لە ڕەحمەتی خۆی دوورخاتەوە.

(١٢) بێ‌گومان ئەوانەی لە پەنامەکییا لە خوای خۆیان ئەترسن گوناه بەخشراون و پاداشێکی گەورەیان بۆ هەیە.

وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا
يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ
﴿١٥﴾ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ
تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ
فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ
كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَۚ مَا
يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي
هُوَ جُندٞ لَّكُمۡ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ إِنِ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ
﴿٢٠﴾ أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي يَرۡزُقُكُمۡ إِنۡ أَمۡسَكَ رِزۡقَهُۥۚ بَل لَّجُّواْ فِي عُتُوّٖ
وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن يَمۡشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجۡهِهِۦٓ أَهۡدَىٰٓ أَمَّن يَمۡشِي سَوِيًّا
عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٢٢﴾ قُلۡ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ
وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۖ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلۡ هُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمۡ
فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ
صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٢٦﴾



(١٣) قسەی خۆتان بە نهێنی بکەن یا بە ئاشکرای بکەن، چۆنی ئەکەن بیکەن، هەمووی لای خوایە کە خوا ئاگای لە هەرچی هەیە لە دڵی خەڵکا بێ.

(١٤) ئایا کەسێ ئەم خەڵکەی دروست کردبێ، بە خەیاڵاتی دڵیان نازانێ، کە زانستیشی ئەگاتە هەموو دەرو ناوو نهێنیو ئاشکرای ئەم خەڵکە؟

(١٥) خوا ئەو خوایە زەویی ڕام کردووە بۆتان، دە بڕۆن بگەڕێن بە هەموو لایەکیاو لەو ڕزق و ڕۆزییە بخۆن کە خوا دروستی کردووەو، سەرەنجامیش کە پاش مردن زیندوو ئەکرێنەوە بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە.

(١٦) ئایا ئێوە ئەمینن لەو خوایەی هێزو قودرەتی لە ئاسمانایە، ئەرزتان پێوە ڕۆبەرێو لەپڕ بکەوێتە لەرزەو بخولێتەوە؟

(١٧) یاخود ئایا ئێوە ئەمینن لەو خوایەی کە هێزو قودرەتی لە ئاسمانایە بەرد بەسەرتانا ببارێنێ، جا ئەو کاتە ئەزانن هەڕەشەو ترساندنی من چۆن بوو؟

(١٨) بەڕاستی کافرەکانی پێش ئەوانیش پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆزن داناو باوەڕیان پێنەکردن، دەی ناڕەزایی من لەوان چۆن بوو؟

(١٩) ئایا ئەمانە سەیری پەلەوەریان نەکردووە بەڕاسەریانەوە کە ڕیز ئەبەستن بە ئاسمانا و باڵەکانیان لە بەیەکادان ئەگرنەوەو ڕائەوەستن کەس ڕاگیریان ناکا لەو کاتەدا نەکەونە خوارەوە تەنها خوا نەبێ؟ خوا بەڕاستی چاوی لە هەموو شتێکەوەیە.

(٢٠) یان ئەمە کێیە کە لەشکری ئێوەیەو بێ ڕەزامەندیی خوا یارمەتیتان ئەدا؟ کافرەکان لە هیچ حاڵێکا نین لە حاڵی لەخۆبایی‌بوونا نەبێ.

(٢١) یان ئەمە کێیە ئەگەر خوا ڕزق و ڕۆزیی خۆی لێ‌گرتنەوە، ڕزق و ڕۆزیتان ئەداتێ؟ بەڵام ئەم کافرانە بە کەللەڕەقی و لە حەق لادانا ڕۆچوون.

(٢٢) ئایا کەسێ لەپەوڕوو بڕوا بەڕێدا شارەزاتری ڕێیە، یان ئەوەی کە قنج قنج بە ڕێیەکی ڕاستا بڕوا؟

(٢٣) تۆ ئەی پێغەمبەر! بڵێ: خوا ئەو خوایە کە دروستی کردوون و گوێو چاوو دڵی بۆ دروست کردوون، بەڵام ئێوە زۆر کەم سوپاسی نیعمەتی خوا ئەکەن.

(٢٤) تۆ ئەی پێغەمبەر! بڵێ: خوا ئەو خوایە لە زەویدا دروستی کردوون و بۆ لای ئەویش کۆئەکرێنەوە.

(٢٥) ئەو کافرانە ئەڵێن: ئەو گفتەی ئێوە ئەیدەن، ئەگەر ڕاست ئەکەن، کەی ئەبێ و کەی دێتەدی؟

(٢٦) تۆیش، ئەی پێغەمبەر، لە وەڵاما پێیان بڵێ: زانینی ئەمە تەنها لای خوایەو منیش لە مرۆیەك بەولاوە نیم کە هاتووم خەڵك لە عەزابی خوا بترسێنم و دین و ئایینیان بۆ ڕوون کەمەوە.

فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ ﴿٣٠﴾

## سُورَةُ القَلَمِ

ترتيبها ٦٨ — آياتها ٥٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴿٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٧﴾ فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾



(٢٧) جا کاتێ ئەو سزا وەعدەپێدراوەیان بینی لێیانەوە نزیك بوو، ڕووی ئەو کافرانە ناشیرین بوو و خەم و پەژارە دایگرتن و پێیان وترا: ئەمەی ئەیبینن ئەو شتەیە داواتان ئەکردو پەلەپەلتان بوو بۆ هاتنی.

(٢٨) تۆ پێیان بڵێ: خەبەرم بدەنێ ئەگەر بێتو خوا من و هەموو ئەوانەی لەگەڵمن لەناومان بەرێ یان ڕەحممان پێبکاو ڕزگارمان بکا، ئەی کێیە کافرەکان ڕزگار بکا لە سزایەکی پڕ ئێش و ئازار؟

(٢٩) تۆ پێیان بڵێ: ئەوەی ڕەحممان پێئەکاو ڕزگارمان ئەکا خودای میهرەبانەو، ئێمە ئیمانمان پێهێناوەو پشتمان پێبەستووەو لەمەولایش ئێوە ئەزانن کێ لە گومڕاهییەکی ئاشکرادایە!

(٣٠) تۆ بڵێ: خەبەرم پێبدەن ئەگەر ئاوەکانتان بە زەویدا ڕۆچوون، کێیە ئاوێکی ساف و خاوێنتان بۆ بهێنێ؟

## سوورەتی (القَلَم)

مەککەییە لە ئایەتی ١٧ەوە ئەبێ تادوایی ئایەتی ٣٣و، لە ئایەتی ٤٨ەوە ئەبێ تا دوایی ئایەتی ٥٠و، (٥٢) ئایەتە

(١) پیتی (ن). سوێند بێ بە قەڵەم و بەوەیش کە قەڵەمەکان یا خاوەن قەڵەمەکان ئەینووسن.

(٢) تۆ کە خوا نیعمەتی پێغەمبەریی پێ بەخشیوی، شێت نیت. (ئەمە شتە سوێند لەسەر خوراوەکەیە).

(٣) بەڕاستییش تۆ پاداشێکی هەرگیز نەبڕاوەت بۆ هەیە.

(٤) بەڕاستییش تۆ خوو و ڕەوشتێکی زۆر گەورەیشت هەیە.

(٥) جا لەمەولا تۆیش ئەبینیو خەڵکیش ئەبینن.

(٦) کام لاتان شێتن ئێوە یا ئەوان؟

(٧) بێگومان خوای تۆ زاناترە بەوکەسەی کە ڕێی خۆی ون کردووەو هەر ئەویش زاناترە کەوا هیدایەت دراوان و ڕێدەرکردووان کێن.

(٨) کەواتە هەرگیز بەگوێی ئەوانە مەکە کە باوەڕ بە خواو بە پێغەمبەرایەتیی تۆ ناکەن و بە درۆزنت دائەنێن لە ئیددیعای پێغەمبەرایەتیدا.

(٩) حەزئەکەن تۆ نەرمییان لەگەڵ بنوێنی تا ئەوانیش نەرمیت لەگەڵ بنوێنن.

(١٠) هەرگیز بەگوێی هیچ فرەسوێندخۆرێکی پەست مەکە.

(١١) کە عەیب لە خەڵك ئەگرێو قسە دێنێو قسە ئەباو فیتنە ئەنێتەوە لەناو خەڵکا.

(١٢) کە ڕێ لە چاکە ئەگرێو دەسدرێژی ئەکاتە سەر خەڵك و تاوانبارە.

(١٣) کە ڕوو درژو بەدخووەو سەرەڕای هەموو ئەمەیش زۆڵ و حەرامزادەیە.

(١٤) بۆیەیش ئەم گشتە سیفەتە بەدانەی هەیە چونکە داراییو کوڕگەلی هەیە.

(١٥) کە ئایەتی ئێمەی بەسەرا ئەخوێنرێتەوە ئەڵێ: ئەفسانەی پێشینانە.

سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾ إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾



(١٦) لەمەوپاش سەری لووتی داخ ئەکەین و نیشانەیەکی لەسەر دائەنێین لە هەموو لایێ بەو نیشانەدا بناسرێتەوە.
(١٧) ئێمە کافرانی مەککەمان تاقی کردەوە وەك کۆمەڵە خاوەن باخەکەمان تاقی‌کردەوە کە ئەوەبوو سوێندیان خوارد سبەینێ زوو ئەیچنن و بەرەکەی لێ ئەکەنەوە تا فەقیرو هەژار پێ‌نەزانن و بێن داوایان لێ بکەن چەردەیەکیان لێ بدەنێ.
(١٨) نایشڵێن: مەگەر خوا مەیلی لێ نەبێ‌و (إن شاء الله)یش ناکەن. (١٩) پاش ئەوە لەکاتێکا کە ئەوان نووستبوون بەڵایەکی ناباری وەك زوقمێکی بێ‌ئامان لە خواوە هات بەسەر باخەکەیانا. (٢٠) وای‌لێ‌هات وەك هەموو بەرەکەی لێ‌کرابێتەوە.
(٢١) کە کەوتنە سبەینێ بانگیان کردە یەکتر: (٢٢) هەستن بڕۆن بۆسەر باخەکەتان ئەگەر ئەتانەوێ بەرەکەی لێ بکەنەوە.
(٢٣) جا هەڵسان چوون بۆ سەر باخەکەیان و لەناو خۆیانا بە پەنامەکی پرس و ڕاوێژیان ئەکرد. (٢٤) ئەیان وت: دەسوبرد کەن با ئەمڕۆ هیچ هەژارێ نەیێ بەسەرتانا بۆ ناو باخەکە داواتان لێ‌بکا بەشی بدەن.
(٢٥) کە ڕۆیشتن بۆ سەر باخەکە وایان ئەزانی ئەتوانن نەهێڵن هەژاران بێنە سەریان داوایان لێ‌بکەن بەشیان لێ بدەن، کەچی هەر ئەوەیان توانی بۆ خۆیان ناڕەحەت بن. (٢٦) کە گەیشتن و چاویان بە باخەکەیان کەوت میوەی بەدارەوە نەمابوو هەمووی وەریبوو، وتیان: بەڕاستی ئێمە ڕێمان ون کردووە، ئەمە باخەکەی ئێمە نییە. (٢٧) بەڵام کە وردبوونەوەو زانییان باخەکە باخەکەی خۆیانە، وتیان: نەخەیر، ئێمە نائومێدو بێ‌بەش بووین لە بەروبوومی باخەکەمان. (٢٨) برا ناوبجیبیەکەیان وتی: پێم نەوتن بۆ (إن شاء الله) ناکەن و ناڵێن ئەگەر خوا مەیلی لەسەر بێ ئەڕۆین بەری باخەکەمان ئەڕنینەوە؟ (٢٩) ئەوجا ئەوانیش بەجارێ وتیان : خاوێنی‌و بێ‌گەردی هەر بۆ خوایە، بەڕاستی ئێمە ستەمکار بووین (إن شاء الله) مان نەکرد.
(٣٠) جا ڕوویان کردە یەك و کەوتنە لۆمەو سەرزەنشت کردنی یەکتر. (٣١) وتیان: هاوار بۆ ئێمە. ئێمە غەڕڕا بووبووین و توغیانمان کردبوو. (٣٢) بەڵکو پەروەردگاری ئێمە، لە بەرەکەتی تۆبەکردن و پەشیمان بوونەوەمانەوە، لە جیاتیی ئەو باغە باغێکی چاکتر لەومان بداتێ. ئێمە بێ گومان حەزمان لە ڕەزامەندیی خوایەو ئەگەڕێینەوە بۆ لای ئەوو داوای لێبووردنی لێ ئەکەین. (٣٣) سزای خوا لە دنیادا ئاوایە کە سزای خاوەنەکانی ئەو باخەمان داو، بێ‌گومان سزای ڕۆژی قیامەتیش گەورەترە ئەگەر ئادەمزاد بییانزانییایە. (٣٤) بەڕاستی هەیە بۆ ئەوانەی خۆیان لە گوناە ئەپارێزن بەهەشتگەلی پڕ لە نازو نیعمەت. (٣٥) بۆچی ئێمە موسوڵمانانی فەرمانبەردار وەك تاوانباران لێ ئەکەین و وەك ئەوان مامەڵەیان لەگەڵ ئەکەین؟ (٣٦) چیتان لێ قەوماوە، ئێوە حوکمی وا چۆن ئەدەن و بەشتی وا چۆن باوەڕ ئەکەن؟
(٣٧) یان ئێوە کتێبێکی ئاسمانیتان هەیە شتی‌وای تیا نووسرابێ‌و تیایای بخوێننەوە؟ (٣٨) هەیشە بۆ ئێوە لەو کتێبەدا هەر حوکم و بڕیارێ کە خۆتان هەڵیبژێرن و بە ئارەزووی خۆتان بێ.(٣٩) یاخێر چەند عەهدو پەیمانێکی جەخت لەسەرکراوتان بەسەر ئێمەوە هەیە تا ڕۆژی قیامەت، کەوا هەرچی بڕیار بدەن بۆتان هەبێ‌و بێتەدی؟
(٤٠) لەو کافرانە بپرسە: کێیان کەفیل و زامنی ئەوەیە کە ئێمە عەهدو پەیمانی وامان بۆ ئەوان لەئەستۆدایە؟
(٤١) یان چەند هاوبەشێکیان لەم ئیددیعایەیانەدا هەیە؟ ئەگەر ڕاست ئەکەن با هاوبەشەکانیان بێنن شایەتییان بۆ بدەن.
(٤٢) لەو ڕۆژەدا کە عالەم لە مەینەتی ڕۆژی حەشردان و لاق هەڵئەماڵرێ و کافرەکان بانگ ئەکرێن بۆ سوجدە بردن بۆ خواو ناتوانن سوجدە بەرن (لاق هەڵماڵین کینایەیە لە ڕۆژی تەنگانەو خۆئامادەکردن بۆ هەڵاتن).

خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ﴿٤٧﴾ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ مَذۡمُومٞ ﴿٤٩﴾ فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكۡرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجۡنُونٞ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٥٢﴾

## سُورَةُ الحَاقَّةِ

ترتيبها ٦٩ — آياتها ٥٢

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٣﴾ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ﴿٧﴾ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ ﴿٨﴾



(٤٣) چاویان شۆڕەو زەلیلی و سووکی دایگرتوون و کاتێ کە هێشتا لە دنیادا بوون بانگ ئەکران بۆ سوجدە بردن بۆ خواو ساغ بوون ئەیانتوانی سوجدە بەرن و نەیانئەبرد.

(٤٤) دە لێم گەڕێ بۆ ئەوانەی ئەم قورئانە بە درۆو دەستهەڵبەست دائەنێن، لەمەوپاش نزیکیان ئەکەینەوە لە سزادران بە شێوەیێ کە خۆیان پێی نەزانن.

(٤٥) ماوەی تەمەنیشیان بۆ درێژە پێئەدەم با زۆرتر لەخۆبایی بن تیایا. بێگومان کاری من بۆ گرفتارکردنی دوژمن زۆر بەهێزو پتەوە.

(٤٦) یان تۆ داوای کرێیان لێ ئەکەیو ئەوان باری ئەو کرێیەیان لەسەر شان قورسەو پێیان نادرێ؟

(٤٧) یان عیلمی غەیبیان هەیەو ئاگایان لەو شتانەیە کە کەسی تر ئاگای لێیان نییەو، لە ڕووی ئەو شتە غەیبییانەوە کە پێیان ئەزانن چییان مەبەست بێ ئەینووسنەوە؟

(٤٨) دە تۆ خۆت بگرەو سەبر بکە لە بەرانبەر فەرمانی خواداو وەك یونس پێغەمبەر مەبە کە نەهەنگ قووتی دابوو، ئەوەبوو هاواری ئەکردە خواو پڕی دڵی بوو لە ناڕەحەتی.

(٤٩) ئەگەر لەو کاتەدا نیعمەتی خوا نەیگرتایەتەوە، فڕێ ئەدرایە بیابانێکی چۆڵ و، گلەییش لەسەر خۆی بوو چونکە سەبرو ئۆقرەی لێ بڕابوو.

(٥٠) جا خوا بە فەزڵ و ڕەحمەتی خۆی هەڵیبژاردو کردی بە یەکێ لە پیاوە چاکەکان.

(٥١) بێگومان زۆر نزیکە کاتێ کە گوێیان لە قورئان خوێندنت ئەبێ، بە بەچاوەوەکردنت هەڵتبخلیسکێنن و، ئەیشڵێن: ئەم پیاوە بەڕاستی شێتە، واتە بەجۆرێ بە دوژمنانە بۆت ئەڕوانن بۆیان بکرێ هەر لەویادا ئەتفەوتێنن.

(٥٢) کەچی ئەو قورئانەیش تەنها بیرخەرەوەیەکە بۆ هەموو جیهان کە ڕێی چاکە بگرنەبەرو دەسبەرداری خراپە بن.

## سوورەتی (الحاقة)

مەککەیییەو، (٥٢) ئایەتە

(١) ئەو کارەساتەی پێویستە بێتەدی،

(٢) چۆن کارەساتێکە ئەو کارەساتەی پێویستە بێتە دی !

(٣) چی تۆی زانا کردووە تا بزانی ئەو کارەساتە چییە کە پێویستە بێتەدی!

(٤) خێڵی سەموودو خێڵی عاد باوەڕیان نەکرد بەو کارەساتەی هەموو جیهان ئەکوتێتەوە کە ڕۆژی قیامەتە.

(٥) هەرچی خێڵی سەموود بوون بەهۆی نەفسی توغیانکردووی خۆیانەوە بەرباد کران کە ئەوە بوو چوار پەلی وشترەکەی صالحیان بڕییەوە، یا بەهۆی بوومەلەرزەیەکەوە کە لەگەڵ ناڵەو نرکەیەکی زۆر توندا ڕوویداو ماڵوێرانی کردن. (٦) هەرچی خێڵی عادیش بوون، بە بایەکی سەختی توند فەوتێنران.

(٧) خودا حەوت شەوو هەشت ڕۆژ لەسەریەك ئەو بایەی هەڵکرد بەسەریانا، جا ئیتر خەڵکەکە وایان لێهات ئەتدین هەموو کەوتبوون، ئەتوت: بنە دارخورمای قوڕۆڵ و کرمێن.

(٨) جا ئایا ئێستا هیچ پاشماوەیەکیان ئەبینی مابێتەوە؟

وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوۡاْ رَسُولَ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ ﴿١٢﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴿١٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ ﴿١٦﴾ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ﴿١٧﴾ يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴿١٩﴾ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ﴿٢١﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ﴿٢٣﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ ﴿٢٥﴾ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿٣٤﴾



(٩) فیرعەون و ئەوانەیش بەر لە فیرعەون بوون و دانیشتووانی دێهاتی موئتەفیکەی خێڵی لووطیش تاوانی ناشیرینیان کرد.
(١٠) بێفەرمانیی پێغەمبەری خوای خۆیانیان کرد، خوایش بە گرتنێکی لە ڕادەبەدەر توندو سەخت گرتنی.
(١١) کاتێ کە ئاوی تۆفان زیادیکردو سەری کرد ئێوەمان لە کەشتیی ڕەوانا هەڵگرت (واتە باپیرە گەورانی ئێوەمان هەڵگرت).
(١٢) تا ئەو کارەساتە بکەین بە یادگار بۆ ئێوەو تا گوێچکەیەکی پەندوەرگر تێی بگاو لەبەری بکا.
(١٣) جا کاتێ کە یەك فوو پیاکردن فووکرا بە (صوور)دا.
(١٤) زەوی‌و شاخەکانیش لە جێی خۆیان هەڵگیران و بەیەك جار دران بەیەکا،
(١٥) لەو ڕۆژەدا ئەوەی ڕووئەدا، ڕووئەداو، ڕۆژی قیامەت بەرپا ئەبێ.
(١٦) ئاسمانیش لەت لەت ئەبێ. ئاسمان لەو ڕۆژەدا ئەم ئاسمانەی ئێستا نییە، ئاسمانێکی لاوازو بێهێزە.
(١٧) فریشتەکانیش لەو ڕۆژەدا لە سووچەکانی ئاسماندان چاوەڕوانی فەرمانی خودان و، لەو ڕۆژەدا هەشت فریشتە عەرشی خوا هەڵئەگرن بەسەر سەری ئەو فریشتانەی ترەوە کە لە سووچەکانی ئاسماندان.
(١٨) لەو ڕۆژەدا ئێوە، ئەی ئادەمزادو پەرییان، پیشان ئەدرێن لە حزووری خوادا هیچ شتێکتان کە شارراوە بێ لەویا ناشارڕێتەوە.
(١٩) جا ئەوەی کارنامەکەی بدرێتە دەستی ڕاستی، کارنامەکەی پیشانی خەڵك ئەداو ئەڵێ: فەرموون کارنامەکەم بخوێننەوە. (٢٠) من ئەمزانی بە حیساب و کیتابی خۆم ئەگەم و، سوپاس بۆ خوا وا پێی‌گەیشتم.
(٢١) ئەوکەسە لە ژیانێکی وادایە مرۆ ڕەزامەندە لێی. (٢٢) لە بەهەشتێکی بەرزو بڵنددایە.
(٢٣) بەری درەختەکانی لە دەستی مرۆوە نزیکەو بە ئاسانی بۆی لێ ئەکرێتەوە.
(٢٤) پێیان ئەوترێ: بخۆن و بخۆنەوە بەگەوارایی، نۆشی گیانتان بێ، بە پیرۆزیی ئەو کارە باشانەی لە ڕۆژانی ڕابووردوودا کردووتانن.
(٢٥) کەسێکیش کارنامەکەی بدرێتە دەستی چەپی، ئەوە بە هۆی ئەنجامشەڕیی خۆیەوە ئەڵێ: خۆزگە کتێبی کارنامەکەم نەدرایەتە دەستم. (٢٦) نەیشمزانیبایە حیساب و کیتابم چییەو چۆنە.
(٢٧) خۆزگە ئەو مردنە کە مردم مردنێ بووایە وای بڕاندمایە هەرگیزاو هەرگیز زیندوو نەبوومایەتەوە.
(٢٨) هەرچی پارەو داراییم هەبوو دادی نەدام و سوودی نەبوو بۆم.
(٢٩) سامان و دەسەڵاتم بەسەر خەڵکا، یا ئەو بەڵگانەی لەدنیادا ئەمهێنانەوە بۆ ئیسپاتکردنی ڕاو بۆچوونی خۆم، هەمووبم لە دەس چوو. (٣٠) خوا بە دۆزەخەوانەکان ئەفەرموێ: بیگرن و کۆت و زنجیری کەن.
(٣١) پاشان بیخەنە ئاگرە سەختەکەی دۆزەخەوەو مەیخەنە شوێنێکی تر.
(٣٢) ئەنجا بیپێچن بە زنجیرێکی حەفتا گەزییەوە. (٣٣) ئەم کابرا باوەڕی بە خوای مەزن نەبوو.
(٣٤) هانی خەڵکیشی نەئەدا نان بە فەقیرو هەژار بدەن.

فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾

## سُورَةُ المَعَارِج

ترتيبها ٧٠ — آياتها ٤٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ ﴿١﴾ لِّلْكَٰفِرِينَ لَيْسَ لَهُۥ دَافِعٌ ﴿٢﴾ مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ﴿٣﴾ تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا ﴿٧﴾ يَوْمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلْمُهْلِ ﴿٨﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ﴿٩﴾ وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾



(٣٥) جا بۆیە ئەمڕۆ هیچ دۆست و یاوەرێکی لێردا نییە.
(٣٦) هیچ خۆراکێکیشی لە ئاوی دەس و سەرو لەش شۆری دۆزەخیەکان بەولاوە نادرێتێ.
(٣٧) لە تاوانباران بەولاوە کەس ئەو خۆراکە ناخوا.
(٣٨) من سوێند ناخۆم بەوەی ئەیبینن و،
(٣٩) بەوەی نایبینن.
(٤٠) ئەم قورئانە وتەی فروستادەیەکی بەقەدرە لای خوا لە زمانی ئەوەوە بە خەڵکی ئەگەیەنێ (مەبەست پێغەمبەرە، دروودی خوای لێ بێ).
(٤١) ئەم قورئانە وتەی شاعیرێك نییە، بەڵام ئێوە کەم جار وا ئەبێ ئیمان بێنن.
(٤٢) هەروا ئەم قورئانە وتەی کاهینێکیش نییە؛ ئێوە کەم وا ئەبێ بیر بکەنەوە.
(٤٣) ئەم قورئانە لە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانەوە هاتووەتە خوار.
(٤٤) ئەگەر ئەم پێغەمبەرە هەندێ قسەی بەدەممانەوە هەڵبەستایە،
(٤٥) قۆڵی ڕاستیمان ئەگرت،
(٤٦) ئەنجا ڕەگی دڵیشیمان ئەبڕی بە لێدانی گەردنی.
(٤٧) هیچ کامیش لە ئێوە ڕێی ئەو یا ئەم کارەمان لێ ناگرێ.
(٤٨) بەڕاستی ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە بۆ ئەوانەی خۆیان لە گوناه ئەپارێزن.
(٤٩) ئێمە بەڕاستییش ئەزانین لەناو ئێوەدا کەسانێك هەن ئەم قورئانە بە درۆ دائەنێن و باوەڕی پێ ناکەن.
(٥٠) بەڕاستیش ئەم قورئانە مایەی داخ و دەردەدڵە بۆ کافران کە لەو دنیا بە چاوی خۆیان ئەبینن ئەوانەی باوەڕیان پێکردووە لە پاداشتی باوەڕپێکردنەکەیا ئەچنە بەهەشت.
(٥١) بەڕاستییش قورئان ڕاستی ڕاستەقینەیە.
(٥٢) کەواتە ناوی خوای گەورەی خۆت بە پاك و بێگەرد ڕاگرەو (سبحان الله)ی بۆ بکە.

## سووڕەتی (المعارج)

**مەککەییەو، (٤٤) ئایەتە**

(١) دوعاکەرێ دوعای بۆ ڕوودانی سزایەك کرد کە ڕوونەداو دێتەدی.
(٢) بۆ کافرەکان دێتەدیو، هیچ کەسێ نییە بەری ڕوودانی بگرێ.
(٣) ئەو سزایەیش لە خواوە دێ کە خاوەنی چەند پایەو پلەیە لە ئاسمان و ژوور ئاسمانەکانا.
(٤) فریشتەکان و جیبرەئیل سەرئەکەون بۆ لای ئەو، واتە بۆ شوێنێ کە ئەو بڕیاری داوە بۆیان. ئەو سزایەیش لە ڕۆژێکا ڕوونەدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە کە ڕۆژی قیامەتە.
(٥) کەواتە پەلەت نەبێو سەبرێکی جوان بکە، ئەو دوعایەی ئەو دوعاکەرە کردی سەرەنجام هەر دێتەدی.
(٦) بێگومان ئەوان ئەو ڕۆژە بە دوور ئەزانن کە ئەو سزایەی تیا دێتەدی و،
(٧) ئێمەیش بە نزیکی ئەزانین. (٨) ڕۆژێکە کە ئاسمان وەك شتێکی بە ئاستەم تواوەی لێ دێو،
(٩) کێوەکانیش وەك خوریی شیکراوەی ڕەنگاوڕەنگیان لێ دێو، (١٠) خزمیش لە خزمی ناپرسێتەوە.

يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ ﴿١٣﴾ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّا إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُوا مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ ﴿١٨﴾ ۞ إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا الْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ الَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ ﴿٢٤﴾ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ ﴿٢٥﴾ وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٢٦﴾ وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٢٧﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ ﴿٢٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٢٩﴾ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٣٠﴾ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٣١﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٣٢﴾ وَالَّذِينَ هُم بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ ﴿٣٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُولَٰئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾ فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ ﴿٣٦﴾ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ عِزِينَ ﴿٣٧﴾ أَيَطْمَعُ كُلُّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ ﴿٣٨﴾ كَلَّا إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّمَّا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾



(١١) ئەو خزمانە پیشانی یەکتر ئەدرێن، تاوانبار لەو ڕۆژەدا ئاواتی ئەوە ئەخوازێ کوڕەکانی بکا بە قوربانی خۆی تا خۆی لە سزای ئەو ڕۆژە ڕزگار ببێ.
(١٢) ژنەکەیشی و براکەیشی بکا بە قوربانی خۆی.
(١٣) خێڵەکەیشی کە لە تەنگانەدا داڵدەی ئەدەن هەروا بکا بە قوربانی خۆی.
(١٤) هەرچییش لەسەر ڕووی زەوی هەیە هەمووی بکا بە قوربانی خۆی، ئەنجا ئەم کەسوکارو خێڵ و عەشرەت بەقوربانیخۆکردنە ڕزگاری بکا لە سزای دۆزەخ.
(١٥) نەخێر خوا نەکا ئەوە ڕزگاری بکا، ئەو ئاگری دۆزەخە بڵێسەیەکە،
(١٦) ئەندامەکانی لەشی مرۆ دائەماڵێ.
(١٧) بانگ ئەکاتە ئەو کافرانەی پشتیان پێ هەڵکردو لایان داو شوێنی بانگەوازی ئیسلامەتی نەکەوتن و،
(١٨) دارایی و پارەیان کۆکردەوەو خستیانە ناو تووروەکەو هەڵیانگرت.
(١٩) ئادەمزاد بە هەڵپەکەری بۆ کۆکردنەوەی پارە دروست کراوە.
(٢٠) کە زیانێکی تووش ببێ ئەکەوێتە هاوارو فریاد.
(٢١) کە خێروبێرێکیشی هاتەڕێ دەستی خۆی ئەگرێتەوەو بەشی کەسی لێ نادا.
(٢٢) تەنها نوێژکەرەکان وا نین، (٢٣) ئەو نوێژکەرانەی کەوا بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان و،
(٢٤) ئەوکەسانەیش کە لە پارەو سامان و داراییاندا بەشێکی دیاریکراو هەیە،
(٢٥) بۆ ئەو هەژارانەی سواڵ لە خەڵك ئەکەن و ئەو هەژارانەی کە سواڵ ناکەن و هیچیان دەسگیر نابێ.
(٢٦) هەروەها ئەوانەیش وا نین کە باوەڕیان بە ڕۆژی جەزادانەوەی چاکەو خراپە هەیە کە ڕۆژی قیامەتە.
(٢٧) ئەوانەیش کە لە عەزابی خوای خۆیان ئەترسن. (٢٨) بەڕاستی عەزابی خوای ئەوان کەس لێی ئەمین نابێ.
(٢٩) ئەو کەسانەش کە عەورەتی خۆیان ئەپارێزن. (٣٠) تەنها لە هاوجووت یان کەنیزەکی مولکی دەستی خۆیان نەبێ، ئەمانە سەرزەنشتیان ناکرێ چونکە هاوجووت و کەنیزەك حەڵاڵی خۆیانن.
(٣١) جا هەرکەس بە دوای لە هاوجووت و کەنیزەکی مولکی خۆی بەولاوەدا گەڕا، ئەوانە دەسدرێژیکەرن.
(٣٢) ئەوانەیش کە ئەمانەتی کەسێکیان لابێ یا پەیمانێکیان بە کەسێ دابێ پارێزگاریی ئەو ئەمانەتە یا ئەو پەیمانە ئەکەن. (٣٣) ئەو کەسانەیش کە شایەتییەکیان لابێ شایەتییەکە ئەدەن و نایشارنەوە.
(٣٤) ئەو کەسانەیش کە نوێژەکانیان ئەکەن و نایانفەوتێنن.
(٣٥) ئەوانە گشت لەناو بەهەشتان و حورمەتیان ئەگیرێ.
(٣٦) دەی چییانە ئەو کافرانەی بە دەوروبەرتان بەپەلە بەرەو ڕووت دێن و ملیان درێژ ئەکەن؟
(٣٧) کۆمەڵ کۆمەڵ لای ڕاست و چەپتەوە بڵاوەیان لێ کردووە؟
(٣٨) ئاخۆ هەریەکێ لەوانە بە تەمایە بخرێتە بەهەشتی پڕ نازو نیعمەتەوە؟
(٣٩) نەخەیر ناخرێتە بەهەشت. ئێمە ئەوانمان دروست کردووە بۆ ئەوەی خۆیان ئەیزانن کە خواپەرستی و خۆپێگەیاندنە بە کارو کردەوەی چاك و بیروباوەڕی بڵندو باڵا، جا کە وا نەکەن چۆن ئەبێ بە هیوای بەهەشت بن؟

فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٤١﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾

## سُورَةُ نُوحٍ

آياتها ٢٨ — ترتيبها ٧١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ ۖ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى دَعَوْتُ قَوْمِى لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِىٓ إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ وَإِنِّى كُلَّمَا دَعَوْتُهُمْ لِتَغْفِرَ لَهُمْ جَعَلُوٓا۟ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَٱسْتَغْشَوْا۟ ثِيَابَهُمْ وَأَصَرُّوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ ٱسْتِكْبَارًا ﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّى دَعَوْتُهُمْ جِهَارًا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّىٓ أَعْلَنتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا ﴿٩﴾ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾



(٤٠) من سوێند ناخۆم بە پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرنشین ئێمە ئەتوانین

(٤١) ئەمانە لەناوبەرین و لە بریتیی ئەمانە کەسانێ بهێنین لەمان چاکتر بن و ڕەوشتیان لەگەڵ پێغەمبەر وەك ئەمان نەبێ و ئیمانی پێ بهێنن و، کەسیش ناتوانێ ڕێمان لێ بگرێ ئەگەر بمانەوێ وا بکەین.

(٤٢) دە لێیان گەڕێ با هەر خەریکی قسەی هیچوپووچ و خەیاڵی بەتاڵ بن و یاریو گاڵتە بکەن تا تووشی ئەو ڕۆژە ئەبن کە گفتیان پێ دراوە.

(٤٣) ئەو ڕۆژەی کە بە هەڵەداوان لە گۆڕەکانیان ڕاست ئەبنەوە وەك بڵێی پەلەی لای ئەو بتانەیانە کە بۆ پەرستن قنج کراونەتەوە.

(٤٤) چاویان شۆڕەو داماویو سووکی دایگرتوون. ئەوە ئەو ڕۆژەیە کاتی خۆی وەعدەیان ئەدرایێ بە هاتنی.

## سوورەتی ( نوح )

مەککەیی‌یەو ، (٢٨) ئایەتە

(١) بەڕاستی ئێمە نووحمان ڕەوانەکرد بۆ لای قەومەکەی و فەرمانمان دایێ کەوا قەومەکەت بترسێنە لە بێ‌فەرمانی‌کردنی خوا بەرلەوەی عەزابێکی پڕ ئێش و ئازاریان بۆ بێ.

(٢) ئەویش چووە لایان و پێی وتن: ئەی قەومەکەم! من بەڕاستی لەسزاترسێنێکی ڕێگای ئاین ڕوونکەرەوەم بۆ ئێوە.

(٣) هاتووم پێتان ئەڵێم: خوا بپەرستن و لێی بترسن و فەرمانبەرداریم بکەن.

(٤) کە ئەوەتان کرد خوا لە گوناهتان خۆش ئەبێو لەناوچوونتان دوائەخا تا ئەو وادەیەی بۆتان دیاری کراوە. ئەگەر ئێوە بزانن ئەجەلی خوا کە هات دواناخرێ.

(٥) نووح وتی: خوایە! من قەومەکەی خۆمم بە شەوو بە ڕۆژ بانگ کرد بۆ خواپەرستی،

(٦) بەڵام بانگ کردنەکەی من هەڵاتن نەبێ لە فەرمانبەرداریی خوا هیچی بۆ زیاد نەکردن.

(٧) بەڕاستی منیش هەرچەند بانگم ئەکردن بۆ ئەوەی کارێك بکەن تۆ لێیان خۆش ببی، پەنجەیان ئەخستە گوێچکەیان تا هیچ نەبیسن و جلەکانیان ئەدا بە خۆیاناو خۆیان پێ‌دائەپۆشی و سوور ئەبوون لەسەر کافریی پڕبەدڵ و خۆیان لەوە بە زلتر ئەزانی کە مل بۆ فەرمانبەرداریی خوا کەچ بکەن.

(٨) پاش ئەوەیش من بە ئاشکرا بانگم کردن بۆ باوەڕکردن بە خوا.

(٩) پاش ئەوەیش بە جاڕدان بانگم کردن و بە نهێنییش هەر بانگم کردن، واتە بە هەموو جۆرێ کە بە باشم زانیبێ بانگم کردوون.

(١٠) پێم وتن: داوای لێخۆشبوون بکەن لە خوای خۆتان، خوا زۆر گوناهبەخشە.

يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل
لَّكُمْ جَنَّـٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَـٰرًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾
وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَـٰوَٰتٍ
طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾
وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ
إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا
سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾ قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِى وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ
مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا۟
لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ
وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا۟ كَثِيرًا ۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَـٰلًا ﴿٢٤﴾
مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ
دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا
كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ
مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴿٢٨﴾



(١١) بارانی ئاسمانتان به خورِ بۆ ئه‌نێرێ.
(١٢) یارمه‌تیشتان ئه‌دا به‌ ماڵ و منداڵ و، باخ و باخات و جۆگه‌و ڕووبارتان بۆ دروست ئه‌کا.
(١٣) ئه‌وه‌ ده‌ردتان چییه‌، بۆ قه‌درو حورمه‌تی خوا ڕاناگرن که‌ بانگتان ئه‌کا بۆ باوه‌ڕپێ‌کردنی؟
(١٤) که‌ خوایش ئێوه‌ی دروست کردووه‌و به‌ چه‌ند قۆناغیا تێپه‌ڕاندوون: ئاوبوون له‌ منداڵدانی دایکا بوون به‌ پارچه‌ خوێن و، پاشان به‌ پارچه‌ گۆشت و، ئێسقانیشی خسته‌ له‌شتان و کردنی به‌ منداڵێکی ڕێکوپێك و، له‌ سکی دایکی ده‌رهێنان.
(١٥) نابینن چۆن خوا حه‌وت ئاسمانی چین له‌سه‌ر چین دروست کردووه‌ و،
(١٦) مانگیشی له‌ ئاسمانه‌کانا کردووه‌ به‌ مایه‌ی ڕووناکی و خۆری کردووه‌ به‌ چرای جیهان ئارا؟
(١٧) خوا ئێوه‌ی سه‌وز کردووه‌ له‌ زه‌ویدا به‌ سه‌وزبوون.
(١٨) پاشان ئه‌تانخاته‌وه‌ زه‌وی و دووباره‌ له‌وێ ده‌رتان ئه‌کاته‌وه‌ به‌ ده‌رکردن.
(١٩) خوا زه‌ویی بۆ کردوون به‌ ڕایه‌خ،
(٢٠) بۆئه‌وه‌ی ڕێگه‌ی پان و به‌رینی لێ بگرنه‌به‌ر بۆ په‌یداکردنی بژێویی خۆتان.
(٢١) نووح وتی: خوایه‌! ئه‌م قه‌ومه‌ له‌ فه‌رمانم ده‌رچوون و که‌وتنه‌ دوای که‌سانێ که‌ ماڵ و منداڵیان له‌ زیان به‌ولاوه‌یان بۆ زیاد نه‌کردن، واته‌ که‌سانێ که‌ ماڵ و ئه‌ولاد له‌ جیاتیی ئه‌وه‌ی بۆیان ببن به‌ مایه‌ی سوپاسی نیعمه‌تی خوا، بوون به‌ مایه‌ی له‌خۆباییبوونیان که‌ ئه‌وانه‌یش، گه‌وره‌و سه‌ره‌که‌کانی قه‌ومه‌که‌ی بوون.
(٢٢) که‌وتیشنه‌ دوای که‌سانێ که‌ فێڵی گه‌وره‌ گه‌وره‌یان کرد بۆئه‌وه‌ی نه‌هێڵن ئه‌وان له‌ خوا بترسن و باوه‌ڕی پێ بکه‌ن.
(٢٣) وتیشیان پێیان: ده‌سبه‌رداری بته‌کانی خۆتان مه‌بن و واز له‌ (ودّ) و (سوواع) و (یه‌غووث) و (یه‌عووق) و (نه‌سر) مه‌هێنن، (ئه‌مانه‌ ناوی بته‌کانیانن).
(٢٤) ئه‌مانه‌ خه‌ڵکێکی زۆریان گومڕا کردووه‌، تۆیش خوایه‌ له‌ گومڕایی به‌ولاوه‌ هیچ بۆ سته‌مکاران زیاد مه‌که‌.
(٢٥) جا ئه‌م قه‌ومی نووحه‌ به‌هۆی تاوانه‌کانیانه‌وه‌ له‌ تۆفانا نوقم کران و خنکێنران و له‌وێوه‌ خرانه‌ ناو ئاگری دۆزه‌خه‌وه‌و هیچ یارمه‌تیده‌رێکیان ده‌سگیر نه‌بوو له‌ ناو ئه‌و بتانه‌دا که‌ ئه‌یانپه‌رستن و خوایان نه‌ئه‌په‌رست.
(٢٦) نووحیش له‌ خوا پاڕایه‌وه‌و وتی: ئه‌ی په‌روه‌ردگاری من! که‌س له‌م کافرانه‌ به‌سه‌ر ڕووی زه‌وییه‌وه‌ مه‌هێڵه‌.
(٢٧) تۆ ئه‌گه‌ر لێیان گه‌ڕێی‌و بیانهێڵیته‌وه‌ هه‌موو به‌نده‌کانت گومڕا ئه‌که‌ن و له‌کافری‌له‌حه‌ق‌لاده‌ر به‌ولاوه‌ که‌س به‌وه‌ڵه‌د ناهێنن.
(٢٨) ئه‌ی په‌روه‌ردگاری من! له‌ گوناهی خۆم و باوك و دایکم خۆش ببه‌و، له‌ هه‌رکه‌س خۆش ببه‌ که‌ به‌ خاوه‌ن باوه‌ڕی هاتبێته‌ماڵم و، له‌ هه‌موو پیاوان و ژنانی خاوه‌ن باوه‌ڕ خۆش ببه‌و، سته‌مکارانیش له‌ به‌ربادی و به‌ فه‌ناچوون به‌ولاوه‌ هیچیان بۆ زیاد مه‌که‌.

## سُورَةُ الجِنّ

ترتيبها ٧٢ — آياتها ٢٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا ﴿٢﴾ وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةً وَلَا وَلَدًا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطًا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمْ ظَنُّوا۟ كَمَا ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَبْعَثَ ٱللَّهُ أَحَدًا ﴿٧﴾ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴿١٠﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ ۖ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا ﴿١٣﴾



## سووره‌تی ( الجِنّ )

**مه‌ککه‌یی‌یه‌و، (٢٨) ئایه‌ته**

(١) تۆ، ئه‌ی موحه‌ممه‌د! بڵێ: من وه‌حیم له لایه‌ن خواوه بۆ كراوه كه‌وا تاقمێ له په‌رییان (جنۆكه) گوێیان له قورئان خوێندنم گرتبوو. كه گه‌ڕابوونه‌وه بۆ ناو په‌رییه‌كانی تر پێیان وتبوون: ئێمه گوێمان له قورئانێكی عه‌جایب و سه‌یر بوو.

(٢) ڕێگا به خه‌ڵك پیشان ئه‌دا بۆ خواناسین، ئێمه‌یش ئیمانمان پێهێناو باوه‌ڕمان پێكردو ئێمه هه‌رگیز كه‌س به هاوبه‌ش بۆ په‌روه‌ردگاری خۆمان دانانێین.

(٣) وه‌حییشم بۆ كراوه كه‌وا په‌رییه‌كان له ناو خۆیانا ئه‌یانوت: به‌ڕاستی زۆر به‌رزه پایه‌ی خوای ئێمه، نه ژنی ڕاگرتووه بۆ خۆی‌و نه منداڵ.

(٤) هه‌روه‌ها ئه‌یشیانوت: نه‌فامه‌كه‌ی ئێمه - كه مه‌به‌ست لێی شه‌یتانه - قسه‌ی بێسه‌روبه‌ری ده‌رباره‌ی خوا ئه‌كرد وه‌ك ئه‌وه كه گوایه خوا ژن و منداڵی هه‌یه.

(٥) ئه‌یشیانوت: ئێمه گومانمان وابوو نه ئاده‌مزادو نه په‌ری درۆ به‌ده‌م خواوه هه‌ڵنابه‌ستن، كه‌چی ده‌ركه‌وت وا نییه‌و زۆر ئاده‌مزادو په‌ری هه‌ن درۆ به‌ده‌م خواوه هه‌ڵئه‌به‌ستن.

(٦) ئه‌یشیانوت: چه‌ند پیاوێك له ئاده‌مزاد په‌نایان ئه‌گرت به چه‌ند پیاوێ له سه‌ركرده‌كانی په‌رییان كه له شه‌ڕو ئافه‌تی په‌رییه‌كانی ژێرده‌ستیانیان بپارێزن، كه‌چی ئه‌م ئاده‌مزادانه، به‌م په‌ناگرتنه‌یان به په‌رییان، ئه‌و په‌رییانه‌یان زیاتر گومڕا كرد كه به‌ڕاستی خۆیان به شتێكی وا بزانن شایانی په‌نا پێگرتن بن.

(٧) ئه‌یشیانوت: ئاده‌مزاده‌كان گومانیان وابوو، وه‌ك ئێوه ئه‌ی په‌رییه‌كان، كه‌وا خوا كه‌س پاش مردن زیندوو ناكاته‌وه. (٨) ئه‌یشیانوت: ئێمه ویستمان ئاسمان تاقی‌بكه‌ینه‌وه كه‌چی دیمان پڕكراوه له پاسه‌وانی سه‌ختگیرو به‌هێز له‌و گڕه - ئه‌ستێره فه‌زاسمانه‌ی ڕاوی په‌رییانی بۆگوێگرتن‌هاتوو ئه‌كه‌ن.

(٩) ئه‌یشیانوت: ئێمه جاران له چه‌ند شوێنێكی ئاسمانا دائه‌نیشتین بۆ گوێگرتن تا بزانین فریشته‌كان باسی چی ئه‌كه‌ن، به‌ڵام ئێستا هه‌ركه‌س گوێ بگرێ گڕ- ئه‌ستێره‌ی فه‌زاسم خۆی بۆ مه‌ڵاس داوه.

(١٠) ئه‌یشیانوت: ئێمه نازانین خوا به‌م پاسه‌وان و گڕ - ئه‌ستێره فه‌زاسم دانانه له‌سه‌ر ئاسمان، نیازی خراپی له‌گه‌ڵ ئه‌هلی زه‌وی بووه یا چاكه‌ی بۆ ویستوون؟

(١١) ئه‌یشیانوت: ئێمه‌یش په‌ریی خێرخواو بێئازاریشمان تیایه‌و هیی واشمان تیایه له‌مانه ئایه‌خترن و چاكه‌یان بۆ كه‌س ناوێ‌و، ئێمه ڕێگاو شێوه‌ی جیاجیامان گرتبوه‌به‌ر بۆ خۆمان.

(١٢) ئه‌یشیانوت: ئێمه زانیویشمانه كه‌وا له هه‌ر شوێنێكی زه‌وییا بین ناتوانین كارێ بكه‌ین خوا ده‌ستی پێمان نه‌گاو نایشتوانین به هه‌ڵاتن بێده‌سه‌ڵاتی بكه‌ین به‌سه‌ر خۆمانا.

(١٣) ئه‌یشیانوت: ئێمه كه گوێمان له قورئان بوو، ئیمانمان پێهێنا. هه‌ركه‌سیش ئیمان به خوای خۆی بهێنێ با ترسی ئه‌وه‌ی نه‌بێ كه زیانی تووش ئه‌بێ یا زه‌لیلی‌و ناڕه‌حه‌تیی دێته‌ڕێ.

وَأَنَّا مِنَّا ٱلْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ
تَحَرَّوْا۟ رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾
وَأَلَّوِ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَـٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِّنَفْتِنَهُمْ
فِيهِ ۚ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾ وَأَنَّ
ٱلْمَسَـٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ
يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَدْعُوا۟ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ
بِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّى
لَن يُجِيرَنِى مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَـٰغًا
مِّنَ ٱللَّهِ وَرِسَـٰلَـٰتِهِۦ ۚ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ
خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ
مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ قُلْ إِنْ أَدْرِىٓ أَقَرِيبٌ
مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُۥ رَبِّىٓ أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا
يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ
يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟
رِسَـٰلَـٰتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًۢا ﴿٢٨﴾



(١٤) هەروەها ئەیشیانوت: ئێمە ئێستا موسوڵمانیشمان تیایەو لە ئیسلامەتی لاداویشمان تیایە، جا ئەوانەی کە موسوڵمان بوون بەدوای ڕزگاریو بەختەوەرییا گەڕاون.

(١٥) هەرچی لەئیسلامەتیلاداوەکانیشن، سووتەمەنیی ئاگری دۆزەخن.

(١٦) ئەیشیانوت: ئەم لەئیسلامەتیلاداوانەیش، لە ئادەمزادو لە پەری، ئەگەر لەسەر ڕێی ڕاستی ئیسلامەتی بڕۆیشتنایە ئاوێکی زۆرمان ئەدانێو نەمانئەهێشت کشتوکاڵ و باخ و باخات و مەڕو ماڵاتیان تینوویان ببێ.

(١٧) بۆ ئەوەی تاقییان بکەینەوە لەو ڕاستیو خواپەرستییەیانا ئاخۆ سوپاسی نیعمەتی خوا ئەکەن یان نەء، هەرکەسیش سەرپێچی لە یادی خواو ناوهێنانی بکا خوا ئەیخاتە ئازارێکی سەخت و نابار.

(١٨) وەحییش کراوە بۆم کەوا مزگەوت هەر بۆ خواپەرستی دروست کراوە، دەی لە مزگەوتا ناوی کەس وەك هاوبەشی خوا مەهێنن و عیبادەتی مەکەن.

(١٩) لەو کاتەیشا کە بەندەی خوا کە پێغەمبەرە هەستابوو نوێژی ئەکردو عیبادەتی خوای ئەکرد، ئەو پەرییانە کەڵەکەیان کردبوو بەدەوریا وەخت بوو پێیەوە بنووسێن. (٢٠) تۆیش، ئەی موحەممەد، بڵێ: من تەنها لە خوای خۆم ئەپاڕێمەوەو عیبادەتی تەنها ئەو ئەکەم و کەس ناکەم بە هاوبەشی.

(٢١) تۆ بیشڵێ: من دەسەڵاتی هیچ قازانج پێگەیاندن و زیان لێدانێکم بۆتان نییە.

(٢٢) تۆ بیشڵێ: کەس پەنام نادا لە عەزابی خواو لە خوا بەولاوە هیچ پەنایێ گومان نابەم بۆ خۆم.

(٢٣) تەنها ئەوەیشم پێ ئەکرێ خوا چیم پێ ڕابگەیەنێو چ پەیامێکم بە وەحی بۆ بنێرێ بیگەیەنم بە خەڵك و، هەرکەسیش سەرکێشی لە خواو پێغەمبەری خوا بکا، ئەوە ئاگری جەهەنمی بۆ ئامادە کراوە بۆ هەمیشە تیا ئەمێننەوە. (٢٤) جا لەو کافرانە گەڕێ تا کاتێ ئەوەی وەعدەیان پێدراوە بە چاوی خۆیان ئەیبینن، ئەو کاتە ئەزانن کێ لە هەموو کەسێ تەنهاو بێیارمەتیدەرترو ژمارەی خەڵکی دەوروبەری کەمترە، واتە پێغەمبەر یا کافرە ناحەزەکانی. (٢٥) تۆ بڵێ: من نازانم ئەوەی وەعدەتان پێ دراوە کە ڕۆژی قیامەتە، نزیکەو بەم نزیکانە ئەبێ، یان خوای من ماوەیەکی بۆ بڕیار ئەدا. (٢٦) خوا هەموو شتێکی نهێنی ئەزانێو کەس لە نهێنیی خۆی ئاگادار ناکا. مەبەست لە (نهێنی) لێرەدا ڕۆژی قیامەتە.

(٢٧) تەنها فروستادەیێ نەبێ کە خوا خۆی لێی ڕازی بێو هەڵیبژاردبێ بۆ زانینی ڕازو نهێنی. ئەو فروستادەیە خوا لەبەردەمیەوەو لە پشتیەوە چەند فریشتەیێ ئەنێرێ بن بە نیگابان بۆی، نەهێڵن پەرییان ئاگادار بن لەو نهێنییانەی خوا ئەوی لێیان ئاگادار کردووە. مەبەست لە (فروستادە)یش پێغەمبەرە.

(٢٨) تا عیلمی خوا تەعەللوق بەوەوە ببەستێ کەوا ئەو خەڵکە پەیامی خوایان پێگەیێنراوەو خوا ئیحاطەی تەواوی داوە بە هەرچی مەعلوماتێ لای ئەو پێغەمبەرانە هەیەو هەموو شتێکی بە ژمارە ڕاگرتووە.

## سُورَةُ المُزَّمِّلِ

ترتيبها ٧٣ — آياتها ٢٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ وَذَرْنِى وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُو۟لِى ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾



## سووره‌تی (المُزَّمِّل)

مه‌ککه‌یی‌یه ئایه‌تی ١٠و ١١و ٢٠ی نه‌بێ و، (٢٠) ئایه‌ته

(١) ئـه‌ی که‌ســێ کـه‌وا خـۆت بــه جله‌کانته‌وه پێچاوه‌ته‌وه.
(٢) هه‌موو شه‌و که‌مێکی نـه‌بێ هه‌سته بۆ شه‌ونوێژ.
(٣) نیـوه‌ی یـا کـه‌مێکی لێ داشـکێنه. واته نیوه‌ی شه‌و یا که‌مێك له نیوه‌ی شه‌و که‌متر شه‌ونوێژ بکه.
(٤) یا که‌مێ له نیوه‌که‌ی زیـاد بکـه بـۆ شـه‌ونوێژو، قورئـانیش بخوێنـه بـه‌ئارام به‌جۆرێ که حه‌رفه‌کانی قورئان دیار بن و گوێگر تێیان بگا.
(٥) بێ‌گومان ئێمه له‌مـه‌وپاش وته‌یـه‌کی قورس ئه‌خه‌ینه ئه‌ستۆی تۆ که وه‌رگرتن و ڕاگـرتن و ڕاگه‌یانـدن و ڕه‌فتـار پـێ‌کردنی ئه‌رکێکی قورسه.
(٦) بێ‌گومـان نوێـژێ بـه شـه‌و بکـرێ گـرانتره لـه نوێـژێ بـه ڕۆژ بکـرێ چونکه نوێژکه‌ر له‌خه‌و هه‌ڵده‌ستێ بـۆی لـه ڕووی وتنـی ئایـه‌ت و دوعاکانیشـه‌وه ڕاسـتره چونکه دنیا کش‌وماته‌و هـیچ شـتێ نییـه سه‌ر له نوێژکه‌ر بشێوێنێ.
(٧) بێ‌گومان به ڕۆژ هاتوچوویه‌کی درێژو خـه‌ریك بـوونێکی زۆرت بـه کاروبـاری ژیانـه‌وه هه‌یـه، له‌بـه‌ر ئـه‌وه لـه ڕۆژدا لـه نوێژه فه‌رزه‌کان و سوننه‌ته‌کانی به‌رودوایان به‌و لاوه‌ت بۆ ناکرێ وه‌ك له شه‌وا که ده‌س به تاڵ ئه‌بیت. (٨) ناوی خوای خۆت بهێنه‌و به دابڕان بۆی دابڕێ له هه‌موو شتێکی تر.
(٩) خـودا خـودای ڕۆژهه‌ڵات و ڕۆژئاوایـه و لـه‌و بـه‌ولاوه خوایـه‌ك نییـه به‌ڕاسـتی عیبـاده‌تی بـۆ بکـرێ، ده‌ی هـه‌موو کاروبارێکی خۆت به‌و بسپێره. (١٠) خۆت بگره بۆ گوێ‌لێ‌بوونی وته‌ی نابه‌جێی ئه‌و کافرانه‌و لێیان دوورکه‌وه‌ره‌وه به لێ دوورکه‌وتنه‌وه‌یه‌کی جوان واته وه‌ڵامیان مه‌ده‌ره‌وه‌و گوێیان مه‌ده‌رێ.
(١١) لێم گه‌ڕێ بۆ ئه‌و کافره خاوه‌ن سامان و داراییانه که پێغه‌مبه‌رایه‌تیی تۆ به درۆ ئـه‌زانن و ئینکـاری ئه‌کـه‌ن و به نان و نیعمه‌ته‌که‌یان ئه‌نازن و، که‌مێك مۆڵه‌تیان بده بزانه سه‌ره‌نجام به چ ده‌ردێکیان ئه‌به‌م!
(١٢) ئێمه کۆت و زنجیری قورس و دۆزه‌خمان لایه.
(١٣) خۆراکی وامان لایه ئه‌گیرێته گه‌روو و پیا ناچێته خوارو، سزای پڕ ئێش و ئازارمان لایه.
(١٤) ڕۆژێ که زه‌وی دێته له‌رزه‌و ته‌کان‌دان و چیاکانیش تۆزو لمی بڵاوبووه‌وه‌ن، که ئه‌و ڕۆژه‌یش ڕۆژی قیامه‌ته.
(١٥) بێ‌گومان ئێمه پێغه‌مبه‌رێکمان بۆ ناردوون که شایه‌ته له‌سه‌ر بیروباوه‌ڕو گوفتـارو ڕه‌فتارتـان، وه‌ك چـۆن کـاتی خۆی پێغه‌مبه‌رێکمان نارده سه‌ر فیرعه‌ون.
(١٦) فیرعه‌ونیش له فروستاده‌که عاسی بوو، ئێمه‌یش به گرتنێکی سه‌خت گرتمان.
(١٧) ده‌ی سا ئێوه‌یش، ئه‌گه‌ر ڕێگای کافری هه‌ڵبژێرن بۆ خۆتان، چۆن خۆتان ئه‌پارێزن له ڕۆژێ که منداڵ پیر ئه‌کا که ڕۆژی قیامه‌ته؟ (١٨) ئاسمان به‌هۆی سه‌ختیی ئه‌وڕۆژه‌وه له‌ت ئه‌بێ. وه‌عده‌یێ که خوا دابێتی جێ‌به‌جێ ئه‌کرێ.
(١٩) بێ‌گومان ئه‌مه‌ی بۆم باس کردن بیرخه‌ره‌وه‌یه‌که بۆتان. جا هه‌رکه‌سـێ بییـه‌وێ ئامۆژگـاری وه‌رگـرێ، ڕێگایـه‌ك ئه‌گرێته‌به‌ر نزیك ببێته‌وه پێی له خوای خۆی که ڕێگای له‌خواترسان و فه‌رمانبه‌رداری کردنیه‌تی.

۞ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ
ٱلَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ
عَلَيْكُمْ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ
وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ
يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟
ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ
عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿٢٠﴾

## سُورَةُ المُدَّثِّرِ

ترتيبها ٧٤ — آياتها ٥٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾
وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴿٧﴾
فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ
غَيْرُ يَسِيرٍ ﴿١٠﴾ ذَرْنِى وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا
مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ
أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾



(٢٠) بیٚگومان خوای تۆ ئەزانیٚ کە تۆ نزیکەی دووسیێیەکی شەوو جارجار نیوەی شەو و جارجار سیێیەکی شەو بەپیێوەی بۆ شەونویێژو کۆمەڵیێکیش لە موسوڵمانانی هاوڕیێت لەمەدا لە گەڵتن و شەو هەڵئەستنەوە بۆ شەونویێژ. خوا خۆیشی ئەندازەی شەوو ڕۆژ ڕائەگریٚ و ئەزانیٚ ئیێوە بۆتان ناژمیێرریٚ چەند سەعات شەونویێژتان کردووە، لەبەر ئەوە لیێتان خۆش بوو کە هەرچەندتان شەونویێژ پیٚ بکریٚ هەر ئەوەندە بکەن، چەندتان پیٚ‌کرا قورئان بخویێنن ئەوە بەسە. خوا ئەزانیٚ لەمەولا ئیێوە لیێتان نەخۆش ئەکەویٚو، هیی تری واتان تیا ئەبیٚ بە زەویدا ئەگەڕیێن کاسبی ئەکەن و داوای ڕق و ڕۆزی لە خوا ئەکەن و، هیی تری وایشتان تیا ئەبیٚ لە غەزادا ئەبن و شەڕ ئەکەن لە ڕیێی خوادا. لەبەر ئەوە چەندتان پیٚ‌کرا قورئان بخویێنن و نویێژەکانتان بکەن و زەکاتی ماڵتان بدەن و قەرز بدەن بە خوا بە قەرزدانیێکی جوان، واتە خیێرو خیێرات بکەن کە بە دڵ پیێتان خۆش بیٚو، هەرچییش پیێشی بخەن بۆ خۆتان و بەر لە مردنتان بیکەن بە خیێرو حەسەنات لای خوا ئەیبیننەوە بە چاکترو زیاتر لەوەی کردووتانەو بەخشیوتانەو، داوای لیێبووردنیش لە خوای خۆتان بکەن خوا گوناهبەخش و بەڕەحم و میهرەبانە.

## سوورەتی (المُدَّثِّر)

مەککەییەو، (٥٦) ئایەتە

(١) ئەی کەسیٚ کە خۆت بە بەرگی ناوماڵ پیێچاوەتەوە.
(٢) هەستە خەڵك لە عەزابی خوا بترسیێنە. (٣) خوای خۆیشت بە گەورە بگرە.
(٤) جلوبەرگیشت لە پیسیو چڵکنی پاك کەرەوەو خاویێنی ڕاگرە.
(٥) دوور بە لە هەرچی ببیٚ بە مایەی سزای خوا.
(٦) شت مەبەخشەو لەگەڵیدا منەت بنیێتە سەر ئەو کەسەی پیێت بەخشیوەو بەخشراوەکەت بە زۆر بزانی.
(٧) لەپیێناوی ڕەزامەندیی خوای خۆتدا خۆت لەسەر ئازارو سزای دوژمن ڕاگرە.
(٨) جا کاتیٚ کە فوو کرا بە صووردا، (٩) ئەو ڕۆژە ڕۆژیێکی سەخت و ئەرك‌گرانە.
(١٠) بۆ کافران ئاسان نییە.
(١١) لیێم گەڕیٚ بە تەنها خۆم بۆ ئەو کابرایەی خۆم دروستم کردووە.
(١٢) سامانیێکی زۆرو زەبەندەیشم داوەتیٚ.
(١٣) چەندین کوڕیشم داوەتیٚ کە هەمیشە لەگەڵینی.
(١٤) کاروباریشم بە باشی بۆ ڕیێکخستووەو شان و شکۆو سەرەکایەتیم بۆ ڕەخساندووە.
(١٥) پاش ئەوەیش بەتەمایە بۆی زیاتر بکەم.
(١٦) نەخەیر، با بە تەمای زیاتر نەبیٚ، چونکە بەرانبەر بە ئایەتەکانی ئیێمە کەللەڕەق و نەملچە.
(١٧) لەمەولا کەندو کۆسپی وای دیێنمەڕیٚ زۆر بە مەینەت بەسەریا سەرکەویٚ.

إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗۙ وَمَا جَعَلۡنَا عِدَّتَهُمۡ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيَسۡتَيۡقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗا وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡبَشَرِ ﴿٣١﴾ كَلَّا وَٱلۡقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذۡ أَدۡبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَآ أَسۡفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرٗا لِّلۡبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِي جَنَّٰتٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴿٤٧﴾



(١٨) ئەو بیری کردەوەو لە دڵی خۆیا داینا بەرانبەر بە قورئان چی بڵێ؟
(١٩) یاخوا بە کوشت چێ! چۆنی لە دڵی خۆیا بڕیار دا بەرانبەر بە قورئان چی بڵێ؟
(٢٠) ئەمجاریش هەر یاخوا بە کوشت چێ! چۆنی لە دڵی خۆیا بڕیار دا بەرانبەر بە قورئان چی بڵێ؟ (٢١) جا تەماشای کرد.
(٢٢) ئەنجا ڕووی گرژکردو چارەی ترش کرد.
(٢٣) ئەنجا پشتی لەوە هەڵکرد کە شوێنی پێغەمبەر بکەوێو خۆی لە موسوڵمانان بە زلتر زانیو فیزی کرد بە سەریانا.
(٢٤) جا وتی: ئەم قورئانە لە جادوویەکی گێڕراوە بەولاوە نییە کە ئەگێڕرێتەوەو کەسانێ فێری ئەبن. (٢٥) ئەم قورئانە لە قسەی ئادەمزاد بەولاوە نییە.
(٢٦) لەمەولا ئەیهاوێمە سەقەرەوە.
(٢٧) تۆ چوزانی سەقەر چییە؟
(٢٨) هەرچیی تێ فڕێبدرێ لێی ناگەڕێ و بەجێی ناهێڵێ، ئەیبرژێنێ.
(٢٩) توێژی سەرووی پێستی ئەوانە ڕەش هەڵئەگەڕێنێ کە فڕێ ئەدرێنە ناوی.
(٣٠) نۆزدە فریشتە یا نۆزدە تاقم فریشتەی بەسەرەوەیە. (٣١) فریشتە نەبێ نەمانکردووە بە کاربەدەستی ئاگری سەقەرو، ژمارەی ئەم سەقەرەوانانەمان بۆیە کردووە بە نۆزدە تا ببێ بە مایەی تووشبوونی کافران کە ئەم نۆزدە کەسە یا ئەم نۆزدە تاقمە بە کەم ئەزانن: چۆن شتی وا عەقڵ ئەیبڕێ نۆزدە کەس یا نۆزدە تاقم کاروباری سزادانی ملیۆنەها دۆزەخی بەڕێوەبەرن و، تا ئەهلی کیتاب لە جوولەکەو گاور یەقین پەیدا بکەن بە پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەر، چونکە لە تەورات و ئینجیلیشا هەروا باسی سەقەر کراوە کە نۆزدە کەس یا نۆزدە تاقمی بەسەرەوەیەو، ئەوانەیش کە ئیمانیان هێناوە بە پێغەمبەر ئیمانیان زۆرتر ببێ کە ئەبینن ئەهلی کیتابیش باوەڕ بە ڕاستیی ئەم قسەیە ئەکەن و، جوولەکەو گاورو موسوڵمانان هیچ گومانیان لەم مەسەلەیەدا نەبێو، بۆ ئەوەیش کەوا ئەوانەی باوەڕیان دانامەزراوەو دوودڵن و کافرەکانیش بڵێن: خوا مەبەستی لەم نۆزدە کەسە یا نۆزدە تاقمە چییەو، نۆزدە چ خاسیەتێکی تیایە؟ خوا هەرکەس گومڕا بکا ئاوای گومڕا ئەکا ئەم جۆرە قسانە بکاو، هیدایەتی هەرکەسیش بدا وای هیدایەت ئەدا باوەڕی بە هەرچی هەبێ کە خوا بیفەرموێو، لەخوا خۆیشی بەولاوە کەس نازانێ لەشکری خوا کێن و چەندن و، ئەم سەقەرەو ئەم نۆزدەیەتیی ژمارەی سەقەرەوانانە بۆ ئەوە نەبێ کە ئادەمزاد بیر لە خواو توانایی خوا بکاتەوە، بۆ هیچیتر نییە.
(٣٢) نەخەیر، من سوێند ئەخۆم بە مانگ. (٣٣) سوێندیش ئەخۆم بە شەو کە پشت پێ هەڵئەکاو ڕۆژ ئەبێتەوە.
(٣٤) سوێندیش ئەخۆم بە بەرەبەیان کە ڕۆشن ئەبێتەوە. (٣٥) کەوا سەقەرو عەزابی سەقەر یەکێکە لە بەڵا گەورەکان.
(٣٦) کە ئادەمزادیان پێ ئەترسێنرێ. (٣٧) بۆ هەرکەس لە ئێوە کە بییەوێ پێش بکەوێ بە فەرمانبەرداریی خوا یا پاش بکەوێ بە نافەرمانی کردنی. (٣٨) هەرکەسێ بگری لە گرەوی کرداری خۆیایەتی.
(٣٩) تەنها ئەوانە نەبێ کە دەفتەری کرداریان ئەدرێ بە دەستی ڕاستیانەوە.
(٤٠) ئەوانە لە بەهەشتدان و، (٤١) لەوێوە لە تاوانباران ئەپرسن: (٤٢) چی ئێوەی خستە ناو سەقەرەوە؟
(٤٣) ئەوانیش لە وەڵاما ئەڵێن: ئەوە خستینیە سەقەرەوە کەوا لە ڕیزی نوێژکەرانا نەبووین و،
(٤٤) خۆراکمان نەئەدا بە هەژارو، (٤٥) لەگەڵ هەرزەگۆیانا بە بیروباوەڕی پووچ و بێدینیانەوە خەریک ئەبووین و،
(٤٦) باوەڕمان بە ڕۆژی جەزادانەوە نەبوو. (٤٧) تا شتە ڕاستەکە هات بۆمان کە مردنە.

فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ فَمَا لَهُمْ عَنِ ٱلتَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ ﴿٤٩﴾ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ ﴿٥٠﴾ فَرَّتْ مِن قَسْوَرَةٍۭ ﴿٥١﴾ بَلْ يُرِيدُ كُلُّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً ﴿٥٢﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلْءَاخِرَةَ ﴿٥٣﴾ كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذْكِرَةٌ ﴿٥٤﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ أَهْلُ ٱلتَّقْوَىٰ وَأَهْلُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴿٥٦﴾

## سُورَةُ القِيَامَةِ

ترتيبها ٧٥ — آياتها ٤٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾ بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ﴿٧﴾ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ﴿٨﴾ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴿٩﴾ يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ ﴿١٢﴾ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ ﴿١٥﴾ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾



(٤٨) ئیتر كە تا مردن كافربوون و بەو جۆرە مردن، تكای تكاكاران سوودیان پێ ناگەیەنێ. (٤٩) دەی كە مادام وایەو چارەنووسیان وا ئەبێ، بۆچی ئێستا پشت لە هەر وەبیرهێنانەوەیەكی ڕۆژی قیامەت هەڵئەكەن؟ (٥٠) ئەڵێی گوێدرێژی وەحشین، (٥١) كە لە شێر هەڵاتبن.
(٥٢) بەڵكو هەركام لەوان بگری ئەیەوێ بە تەنها بۆ خۆی چەند لاپەڕەی نووسراوی بدرێتە دەست كە خوا بە تایبەتی بانگی كا تیایا بۆ ئیسلام بوون.
(٥٣) نەخێر، بەڵكو ئەوەیش نییە، ئەمانە هەر لەبنەڕەتەوە لە ڕۆژی قیامەت ناترسن.
(٥٤) لێ گەڕێن لەمانەی ئەمانە. ئەم قورئانە بیرخەرەوەی ڕۆژی جەزایە.
(٥٥) جا هەركەس مەیلی لێیە با بیری ڕۆژی جەزا بكاتەوە.
(٥٦) بیریش ناكەنەوە تا خوا مەیلی لێ نەبێ. خوا شایانی ئەوەیە بەندەكان خۆیان لە بێفەرمانی كردنی بپارێزن و، ئەویش شایانی ئەوەیە لە گوناهیان خۆش ببێ.

## سوورەتی (القیامة)

مەككەییە‌یەو، (٤٠) ئایەتە

(١) سوێند ناخۆم - مەبەستی لەوەیە سوێند ئەخۆم - بە ڕۆژی قیامەت.
(٢) سوێندیش ناخۆم بەو نەفسەی هەست بە تاوانباریی خۆی ئەكاو لەبەر ئەوە سەرزەنشت و لۆمەی خۆی ئەكا. -لێرەشا هەر مەبەستی لەوەیە سوێند ئەخۆم. سوێند لەسەرخوراوەكە نەوتراوە، واتە ڕۆژی قیامەت و مردووزیندووكردنەوە هەیە- .
(٣) ئایا ئادەمزاد وا گومان ئەبا كەوا ئێسك و پرووسكەكانی كۆناكەینەوەو گۆشتی پێناپۆشین و گیانی ناكەینەوە بەرا؟ (٤) نەخێر وا نییە. ئێمە ئەتوانین سەرپەنجەكانیشی دروست كەینەوە كە سەرپەنجەی هیچ كەسێ وەك هیی هیچ كەسیتر نییە. (٥) بەڵام ئادەمزادی كافر ئەیەوێ لە دواڕۆژەكانی ژیانیشیا هەر لەسەر كافریو بێدینیی خۆی بەردەوام بێ. (٦) ئەپرسێ: ڕۆژی قیامەت كەی ئەبێ؟ چونكە بە درۆی ئەزانێو گاڵتەی پێدێ.
(٧) كاتێ كە چاو ئەبڵەق و سەرسام بوو لە ترساناو، (٨) مانگ ڕۆشنایی نەماو، (٩) ڕۆژو مانگ پێكەوە كۆكرانەوەو لە نەمانی ڕۆشناییو لە هەڵاتنا لە ڕۆژاواوە وەك یەكیان لێ هات، (١٠) ئادەمزاد لەو ڕۆژەدا تێئەگا مەسەلەكە ڕاستەو درۆ نییەو ئەڵێ: بۆ كوێ ڕابكەم؟ (١١) نەوەڵڵا، هیچ دالدەو پەنایەك نییە ڕابكەی بۆ لای.
(١٢) ئارام و ئۆقرەگرتن لەو ڕۆژەدا تەنها لای خوای پەروەردگاری خۆتە. (١٣) ئادەمزاد لەو ڕۆژەدا خەبەردار ئەكرێ لە ژیانیا چیی كردووەو چیی نەكردووە. (١٤) بەڵكو ئادەمزاد خۆی بەڵگەیە لەسەر خۆی كە چیی كردووەو چیی نەكردووە. (١٥) با هەرچی بروبیانوویشی هەیە هەمووی بهێنێتەوە. (١٦) لێرەوە ڕووی گفتوگۆ لە ئایەتەكانا ئەكرێتە پێغەمبەرو خوا پێی ئەفەرموێ: ئەی موحەممەد! زمانی خۆت بە قورئانەكەوە مەجووڵێنە بۆ ئەوەی بەپەلە بیخوێنیتەوە -واتە بەرلەوەی جیبرەئیل هەموو ئایەتەكەت بۆ بخوێنێتەوە، تۆ مەكەوەرە پەلەپەل بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەوا بیخوێنیتەوە تا بێتە بەرت و لەوە مەترسە كە بۆت لەبەرنەكرێ . (١٧) بێگومان لەسەر ئێمەیە كۆیكەینەوە لە دڵتاو بە زمان پێتی بخوێنینەوە. (١٨) كە ئێمە بە زمانی جیبرەئیل خوێندمانەوە تۆیش شوێنی خوێندنەوەكەی ئەو بكەوەو بیخوێنەوە. (١٩) پاشانیش لەسەرمانە بۆت ڕوون كەینەوەو لێكیبدەینەوە بۆت.

كلا بل تحبون العاجلة ﴿٢٠﴾ وتذرون الآخرة ﴿٢١﴾ وجوه يومئذ ناضرة ﴿٢٢﴾ إلى ربها ناظرة ﴿٢٣﴾ ووجوه يومئذ باسرة ﴿٢٤﴾ تظن أن يفعل بها فاقرة ﴿٢٥﴾ كلا إذا بلغت التراقي ﴿٢٦﴾ وقيل من راق ﴿٢٧﴾ وظن أنه الفراق ﴿٢٨﴾ والتفت الساق بالساق ﴿٢٩﴾ إلى ربك يومئذ المساق ﴿٣٠﴾ فلا صدق ولا صلى ﴿٣١﴾ ولكن كذب وتولى ﴿٣٢﴾ ثم ذهب إلى أهله يتمطى ﴿٣٣﴾ أولى لك فأولى ﴿٣٤﴾ ثم أولى لك فأولى ﴿٣٥﴾ أيحسب الإنسان أن يترك سدى ﴿٣٦﴾ ألم يك نطفة من مني يمنى ﴿٣٧﴾ ثم كان علقة فخلق فسوى ﴿٣٨﴾ فجعل منه الزوجين الذكر والأنثى ﴿٣٩﴾ أليس ذلك بقادر على أن يحيي الموتى ﴿٤٠﴾

## سورة الإنسان

ترتيبها ٧٦ — آياتها ٣١

بسم الله الرحمن الرحيم

هل أتى على الإنسان حين من الدهر لم يكن شيئا مذكورا ﴿١﴾ إنا خلقنا الإنسان من نطفة أمشاج نبتليه فجعلناه سميعا بصيرا ﴿٢﴾ إنا هديناه السبيل إما شاكرا وإما كفورا ﴿٣﴾ إنا أعتدنا للكافرين سلاسل وأغلالا وسعيرا ﴿٤﴾ إن الأبرار يشربون من كأس كان مزاجها كافورا ﴿٥﴾



(٢٠) نەخەیر، پەلە مەکە، بەلام ئێوەی ئادەمزاد هەر حەزتان لە پەلەیە، بۆیە بۆ دنیاو پایەو مایەی دنیا هەوڵ ئەدەن و،
(٢١) دەس لە دوارۆژ هەڵئەگرن کە ڕۆژی قیامەتە. (٢٢) لەو ڕۆژی قیامەتەدا چەندین ڕوو جوان و گەشن.
(٢٣) چونکە بۆ خوای خۆیان ئەڕوانن.
(٢٤) هەر لەو ڕۆژی قیامەتەدا چەندین ڕوویش زۆر گرژو مۆنن. (٢٥) چاوەڕوانی ئەوەن کارێکی وایان پێبکرێ پشتیان بشکێنێ، واتە فڕێبدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، چونکە ئەزانن لە دنیادا چییان کردووە.(٢٦) نەکەن دنیاتان لا لە قیامەت لەپێشتر بێ. کاتێ کە گیان ئەگاتە وردەگرێی ژوور قەفەزەی سنگ و،
(٢٧) لە لایەن ئەوانەوە کە هاتوونەتە سەر کابرای حاڵی سەرەمەرگ، ئەوترێ: کێ نووشتەیەکی بۆ ئەکا بەڵکو نەمرێ و،
(٢٨) کابرا خۆیشی گومانی وایە ئەوە ئیتر جوێبوونەوەی هەمیشەییەو،
(٢٩) ئەم لاقی ئەپێچرێ بەو لاقیەوە چونکە لە توانیا نامێنێ بییانبزوێنێ،
(٣٠) ئەوە ئیتر لەو ڕۆژەدا ڕاپێچان بۆ حزووری خوای خۆتە.
(٣١) چونکە ئەو کابرا نە خێرو حەسەناتی کردووەو نە نوێژی کردووە.
(٣٢) بەڵکو خواو پێغەمبەری بە درۆ داناوەو باوەڕی پێنەکردوون و پشتی تێکردوون. (٣٣) ئەنجا بە فیزەوەو بە شانازی کردنەوە بەم بێباوەڕییەی خۆی، چووەتەوە بۆ ناو ژن و منالەکانی.
(٣٤) ئەم مەرگ و پاشان عەزابی دۆزەخەت زۆر بۆ باشترە، دەك سا پیرۆزت بێ. (٣٥) ئەمجاریش ئەم مەرگ و پاشان عەزابی دۆزەخەت زۆر بۆ باشترە، دەك دیسان سا پیرۆزت بێ. (٣٦) ئایا ئادەمزاد گومانی وایە هەروا بێ لێپرسینەوە لێی ئەگەڕێن؟ (٣٧) ئایا ئەو تۆوێ نەبووە لە ئاوی پیاو ئەهێنرێتەوەو ئەکرێتە منداڵدانی ئافرەتەوە؟
(٣٨) پاشانیش بووە بە پارچە خوێنێك و ئەوجا بە پارچە گۆشتێك و، جا خوا کردوویە بە ئادەمی و ڕێکیخستووەو سەرو سیمای داوەتێ؟ (٣٩) جا خوا هەردوو جۆرەکەی لێ دروست کردووە کە نێرو مێ یا ژن و مێردن؟
(٤٠) ئایا ئەو خوایەی ئەمەی کردووە ناتوانێ مردوویش زیندوو بکاتەوە؟

## سوورەتی (الإنسان)

مەدینەیییەو، (٣١) ئایەتە

(١) بەڕاستی ماوەیێ لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمزادا هاتووە لەو ماوەیەدا شتێکی ناوبراو نەبوە، واتە بە ئادەمزاد ناو نەبراوە. (٢) بێگومان ئێمە ئادەمزادمان لە تۆمێ دروست کردووە کە تێکەڵە لە ئاوی پیاو و ژن یا تێکەڵ لە شێوەی سەرو ڕوخسارو شان و مل و دەست و سنگ و سك و پێیەکان و، ئەیگەیەنینە قۆناغی باڵغ بوون و گەورەبوونو بەراوردی ئەکەین لە بیروباوەڕو کارو کردەوەداو، بۆ ئەم بەراوردە شنەواو بینامان کردووەو ئەگەر ئەم حەواسانەی نەبوایە لایقی تەکلیف لێ کردن نەئەبوو.
(٣) ئێمە ئادەمزادمان شارەزا کردووە بە ڕێگای خێرو شەڕ، جا یا وەری ئەگرێو سوپاسی خوای خۆی ئەکا یا ئینکاری ئەکاو گوێی بۆ ناگرێ. (٤) ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ کافران کۆمەڵێ زنجیر پێیان ڕائەکێشرێن بۆ دۆزەخ و کۆمەڵێ کۆت ئەکرێنە ملیان و، ئاگری بڵێسەداری دۆزەخیش کە پێی ئەسووتێنرێن. (٥) بەڕاستی خاوەن ئیمانە پیاوچاکەکانیش لە کاسەیێ ئاو ئەخۆنەوە کافووری تێکراوە تا تام و بۆنو چەشی خۆشتر بێ.

عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِٱلنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُۥ مُسْتَطِيرًا ﴿٧﴾ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَـٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ﴿١٦﴾ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَـٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوٓا۟ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَـٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَآءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا ﴿٢٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾



(٦) ئـەو كـافوورەیش لـە كانییەكـە بەنـدەكانی خـوا لێـی ئەخۆنـەوە، هەڵیئـەقوڵێنن بـە هەڵقوڵانـدن لـە هـەر كوێیەكا دڵیان بیگرێ.

(٧) ئەو بەندانەی خوا وەفا ئەكەن بە هەر نـەزرێ لەسـەر خۆیانیـان نـەزركردبێ‌و لـە ڕۆژێ ئەترسـن كـە شـەڕو مسـیبەتی بـە هەموو لایەكا بڵاو ئەبێتەوە.

(٨) لە خۆشەویستیی خواداو بـۆ خـاتری خوا خواردەمەنی ئەدەن بە گەدا كە بەشی خۆی شك ناباو بە هەتیوو بە دیل.

(٩) پێشیان ئەڵێن: خواردنتان هەر لەبـەر ڕەزامەنـدیی خـوا ئـەدەینێ‌و نامانـەوێ لێتـان نـە پاداشمـان بدەنـەوەو نـە سوپاسیشمان بكەن.

(١٠) بە ڕاستی ئێمـە لـە خـوای خۆمـان ئەترسین كە گرفتاری ناڕەحەتیی ڕۆژێكـی تووش و سەختمان بكا.

(١١) خـوایش لـە شـەڕی ئـەو ڕۆژەی پاراستن و گەیاندنی بـە ڕووی گـەش و بـە شادمانی بەرانبەر بە گرژی و مۆنیی ڕۆژە سەخت و تووشەكە.

(١٢) لـە پاداشـی سـەبركردن و خۆڕاگرتنیشـیاندا بەهەشـتی دانـێ تیـا دانیشن و ئاوریشمی دانێ لەبەری‌كەن.

(١٣) پـاڵ ئەدەنـەوە لـە بەهەشـتا بـە قەنەفـەوە نـە هـەتاو ئـەبینن لـەو بەهەشتەداو نە سەرمای سەخت.

(١٤) سێبەری درەختەكانی بەهەشت نزیكە بەسەر سەریانەوەو چنینی میوەی درەختـەكانی بەهەشـتیان بـۆ ئاسـان كراوە بە ئاسان كردن.

(١٥) ئەگەڕێن بە سەریانا بە كاسەی زیوین و بە كووپی بێ‌دەسكی وەك ئاوێنە.

(١٦) وەك ئاوێنە لەشێوە تیا دەركەوتنا، بەڵام لەڕاستیدا زیوین كە خۆیان چۆنیان بـە دڵ بـوون ئـاوا دروست كـراون بۆیان. (١٧) شەرابێكیان لەو كاسانەدا دەرخوارد ئەدرێ كە زەنجەفیلی تێكەڵ كراوە.

(١٨) ئەو زەنجەفیلەیش لە سەرچاوەیەكەوەیە پێی ئەڵێن سەلسەبیل.

(١٩) مێردمنداڵانێكی تازە هەڵچوویش ئەگەڕێن بەسەریانا ئەم شەرابەیان دەرخوارد ئەدەن، كە هەمیشـە هـەر لـەو تەمەنەدا ئەمێننەوەو، ئەگەر بییانبینی وا ئەزانی مرواریی هەڵڕژاون.

(٢٠) كە ئەو بەهەشتە ببینی نازو نیعمەت و سامانێكی زۆر لەویادا ئەبینی.

(٢١) ئەو مێرد منداڵە شەرابگێڕانە كراسی ئاوریشمی سەوزیان لەبەرایە هیی ناسك و هیی ئەستوورو، بازنی زیویان كراوەتە دەستومەچەك و، خوای خۆیان شەرابی خاوێنی پێ نۆش كردوون.

(٢٢) جا بەو خاوەن باوەڕە پیاوچاكانە ئەوترێ: ئەم خێروبێرەی پێتان دراوە پاداشی بیروباوەڕو كـردەوەی چـاكتانەو، ڕەنج و تەقەلاتان بۆ فەرمانبەرداریی خوا، لای خوا بە خۆڕایی نەڕۆیشتووەو پاداشی دراوەتەوە.

(٢٣) بێ‌گومان ئێمە قورئانمان پارچە پارچەو بەش بەش نازڵ كردووە بۆ سەر تۆ.

(٢٤) دەی سا خۆت ڕابگرەو سەبرت ببێ بۆ هەر بڕیارێ خـوای خـۆت بـۆی بڕیـار دابـیو، بـەگوێی هـیچ مرۆیـەكی گوناهبارو فرەكافر مەكە.

(٢٥) بەیانی و ئێوارەیش ناوی خوای خۆت بهێنە.

وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ﴿٢٧﴾ نَّحْنُ خَلَقْنَٰهُمْ وَشَدَدْنَآ أَسْرَهُمْ ۖ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَآ أَمْثَٰلَهُمْ تَبْدِيلًا ﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا ﴿٣١﴾

## سُورَةُ المُرسَلات

مرتبتها ٧٧ — آياتها ٥٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْمُرْسَلَٰتِ عُرْفًا ﴿١﴾ فَٱلْعَٰصِفَٰتِ عَصْفًا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْفَٰرِقَٰتِ فَرْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُلْقِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٥﴾ عُذْرًا أَوْ نُذْرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتْ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ نُسِفَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتْ ﴿١١﴾ لِأَىِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴿١٢﴾ لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ﴿١٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمْ نُهْلِكِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾



(٢٦) هەندێ كاتی شەویش سوجدەی بۆ بەرەو شەوگاریش تەسبیحاتێكی درێژی بۆ بكە.

(٢٧) ئەم لەخوابێخەبەرانە شتی حازربەدەستیان حەز لێیە كە ڕابواردنی دنیایەو، پاش مردنیان ڕۆژێكی قورس و گرانبار لە پاش خۆیان بەجێدێڵن بێئەوەی هیچیان بۆ كردبێ كە ئەویش ڕۆژی قیامەتە.

(٢٨) ئێمە ئەوانمان دروست كردووەو جمگەكانی لەشیانمان بە دەمار توند كردووە بە یەكەوەو هەر كاتێكیش مەیلمان لێ بێ وێنەی ئەوان ئەگۆڕین بە قەومێكی تر كە بە تەواوی لەوان جیا بن.

(٢٩) ئەم ئایەتانەی ڕابووردن بیرخەرەوەن بۆ ئێوە كە بیر لە ڕۆژی قیامەت بكەنەوە، جا هەركەس بیەوێ با ڕێگایێ بگرێتە بەر بۆ لای خوای خۆی.

(٣٠) نایشتوانن ڕێگای لای خوا بگرنەبەر تا خوا خۆی نەیەوێ ڕێگای لای ئەو بگرنەبەر. بەڕاستی خوا بە هەموو شتێ ئەزانێو خاوەن حیكمەتە.

(٣١) خواستی لەسەر هەركەسێ بێ ئەیخاتە بەر ڕەحمەتی خۆیو، بۆ ستەمكارانیش سزایەكی پڕ ئێش و ئازاری ئامادە كردووە.

## سوورەتی (المُرسَلات)

مەككەییە ئایەتی (٤٨)ی نەبێو، (٥٠) ئایەتە

(١) سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی كۆمەڵ كۆمەڵ ئەنێررێن بۆ جێبەجێ كردنی فەرمانی خوا.

(٢) ئەنجا سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی بە پەلە ئەجوولێن بۆ شوێنی مەبەست.

(٣) ئەنجا سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی باڵەكانیان بڵاوئەكەنەوە كاتێ دائەپەڕن وەحی دێننە خوارەوە بۆ پێغەمبەران.

(٤) ئەنجا سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی ڕاست و چەوت لێك جوێئەكەنەوە كە وەحی لە خواوە دێنن بۆ پێغەمبەران.

(٥) ئەنجا سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی وەحی ئەگەیەنن بە پێغەمبەران.

(٦) ئەو وەحیەی ئەبێ بە ڕێنوما بۆ ئەوانەی شوێنی ڕاستی ئەكەون و، بە مایەی ترساندن بۆ ئەوانەی لە ڕێی ڕاستی لائەدەن. (٧) سوێند ئەخۆم بە گشت ئەمانە، ئەوەی گفتتان ئەدرێتێ كە هاتنی ڕۆژی قیامەت و سزادانی بێباوەڕانو پاداشدانەوەی خاوەن باوەڕانە شتێكە دێتەدی و ئەبێ بە ڕاست.

(٨) جا كاتێ كە ئەستێرەكان كوژێنرانەوەو تیشكیان نەماو، (٩) كاتێ كە ئاسمان درزی تێكەوت و، (١٠) كاتێ كە چیاكان وێران كران و دران بە دەم باوەو، (١١) كاتێكیش كە پێغەمبەران كاتیان بۆ دیاری كرا بۆ شایەتی دان لە حزووری خوادا،(١٢) بۆ چ ڕۆژێ دواخراوە شایەتیدانەكانیان لەسەر خەڵك: كێ چاكەی كردووەو كێ خراپەی كردووە؟

(١٣) بۆ ئەو ڕۆژەی هەموو شتێكی تیا ئەبڕێتەوە. (١٤) جا تۆ چوزانی ئەو ڕۆژەی هەموو شتێكی تیا ئەبڕێتەوە چۆن ڕۆژێكە؟ (١٥) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەكردن لە دنیادا.

(١٦) ئایا ئێمە باوەڕنەكەرە پێشووەكانمان نەفەوتاند و، (١٧) پاشان ئەوانی پاش ئەوانیشیان بە دوادا ئەهێنین؟

(١٨) ئێمە وا ئەكەین لەگەڵ تاوانباران لە هەر چەرخ و سەردەمێكا بن.

(١٩) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەكردن لە دنیادا.

أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ
مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾
أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ
شَٰمِخَٰتٍ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾
ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَٰثِ
شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ
كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾
هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ جَمَعْنَٰكُمْ وَٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ
لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى
ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا
بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ
لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ
يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾



(٢٠) ئایا ئێمە ئێوەمان لە ئاوێکی ناچیز دروست نەکردووە؟
(٢١) جا ئەو ئاوەمان لە ئارامگەیەکی دامەزراوا کە منداڵدانی دایکە، دانەناوە،
(٢٢) بۆ ماوەیەکی زانراو؟.
(٢٣) جا ماوەی بەمناڵبوونی ئەو ئاوەمان بڕیارداو، ئێمە بڕیاردەری چاکیشین.
(٢٤) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەکردن لە دنیادا.
(٢٥) ئایا ئێمە زەویمان نەکردووە بە کۆکەرەوەی ئێوە،
(٢٦) بە زیندووتان و مردووتانەوە؟
(٢٧) چەندین کێوی دامەزراوی بەرزیشمان تیا دروست کردووەو ئاوی شیرین و گەوارامان داوەتە دەرخواردتان.
(٢٨) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەکردن لە دنیادا.
(٢٩) بڕۆن بۆ لای ئەو دۆزەخەی بە درۆتان دائەناو باوەڕتان پێنەئەکرد.
(٣٠) بڕۆن بۆ لای سێبەرێکی سێ لق کە سێبەری دووکەڵی دۆزەخە.
(٣١) کە سێبەرێکی نە ساردو خۆشە مرۆ لە ژێریا بحەسێتەوەو، نە لە گەرمای گڕی ئاگری دۆزەخیشی ئەپارێزێ.
(٣٢) ئاگری دۆزەخ پزیسکی وا فڕێئەدا ئەوەندەی کۆشکێ ئەبێ.
(٣٣) ئەو پزیسکەیە لە کۆمەڵێ حوشتری زەرد ئەچێ. (٣٤) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەکردن لە دنیادا. (٣٥) ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەنا زمانیان گۆ ناکا تا لەسەر خۆیان بێنە دەنگ و داکۆکی لە خۆیان بکەن. (٣٦) ڕێگەیشیان نادرێ تا عوزر لەو کردەوە خراپانە بهێننەوە کە کردوویانن. (٣٧) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەکردن لە دنیادا! (٣٨) ئەمڕۆ ڕۆژی لێکجوێکردنەوەی ئەوانەیە لەسەر حەق بوون لەوانەی دوای گومڕایی کەوتبوون. ئێوەو میللەتە پێشینەکانمان تیا کۆکردووەتەوە تا هەرچی ئەوانەن لەسەر حەق بوون لە هەموو میللەتەکانا جوێیان کەینەوە لەوانەی دوای گومڕایی کەوتوون تیایانا. (٣٩) جا ئەگەر فڕوفێڵێ شك ئەبەن لێمی بکەن بۆ ئەوەی خۆتان لە سزای دۆزەخ ڕزگار بکەن، لێمی بکەن بزانین چیتان لێوە دەسگیر ئەبێ؟
(٤٠) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەکردن لە دنیادا!
(٤١) بێگومان ئەوانەی خۆیان لە بێفەرمانیی خوا پاراستووەو لە خوا ترساون، لە سایەی درەختەکانی بەهەشتان و لەسەر کانیاوەکانینی. (٤٢) وایشن لەناو میوەجاتا لەوەی خۆیان حەزیان لێیە. (٤٣) بخۆن و بخۆنەوە، نۆشی گیانتان بێ بەرانبەر بەو کارە باشانەی ئەتانکردن. (٤٤) بێگومان ئێمە پاداشی چاکەکاران بەم جۆرە ئەدەینەوە.
(٤٥) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەکردن لە دنیادا!
(٤٦) بخۆن و ماوەیەکی کەم ڕابوێرن ئەی بێباوەڕەکان، ئێوە بێگومان تاوانبارن.
(٤٧) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەکردن لە دنیادا!
(٤٨) کە پێشیان بوترێ: دانەون و ڕوکووع بەرن بۆ خوا، نایبەن!
(٤٩) هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆزن دائەناو باوەڕیان پێنەئەکردن لە دنیادا!
(٥٠) ئیتر ئەمانە کە ئیمانیان بە قورئان نەهێنا، پاش قورئان باوەڕ بە چ فەرموودەیێ ئەهێنن؟!

## سُورَةُ النَّبَإِ

آياتها ٤٠ — ترتيبها ٧٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴿٣﴾ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَٰتًا ﴿١٧﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ كِتَٰبًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾



جوزئی سیهەم

## سوورەتی (النَّبَإِ)

مەککەیی‌یەو، (٤٠) ئایەتە

(١) لە چی پرسیار ئەکەن لەناو خۆیانا؟
(٢) لەو هەواڵە گەورەیە، (٣) کە قسەیان لە بارەیەوە یەك نییەو هەر تاقمێکیان شتێ ئەڵێن، تاقمێکیان بێگومانن لە ڕوودانیاو تاقمێکیان ئینکاری ئەکەن و تاقمێکیان دوودڵن ئاخۆ ڕووئەدا یا ڕونادا، کە ئەویش ڕۆژی قیامەتە.
(٤) با لێگەڕێن لەم پرسیارو پرسیارکارییە، لەمەولا ئەزانن.(٥) با ئەمجاریش لێگەڕێن، لەمەولا ئەزانن.
(٦) ئەوە بۆ ئەم زەوییە پان و بەرینە ناکەن بە بەڵگەی توانایی خوا کە هەموو شتێکی پێ ئەکرێ و ئەتوانێ ڕۆژی قیامەتیش بهێنێ؟ ئێمە ئایا زەویمان نەکردووە بە ڕایەخ لە ژێر پێیانا؟
(٧) کێوەکانیشمان نەکردووە بە مێخ و کوتاومانن بە زەویدا بۆ ئارام گرتنی؟
(٨) ئێوەیشمان جووت جووت دروست کردووە بە نێرو مێ.
(٩) نووستنیشتانمان کردووە بە مایەی حەسانەوەی لەشتان.
(١٠) شەویشمان کردووە بە پۆشاك هەمووتان لە ژێر خۆیا دائەپۆشێ.
(١١) ڕۆژیشمان کردووە بە مایەی ژیان و پەیداکردنی گوزەران. (١٢) حەوت ئاسمانی سەختیشمان بە ڕاسەرتانەوە دروست کردووە.
(١٣) چرایەکی تیشکدەرەوەیشمان دروست کردووە. مەبەست لێی ڕۆژە.
(١٤) لە هەوری گوشراویشەوە کە با ئەیگوشێ ئاوێکی بە خوڕ ڕژاومان داباراندووە، مەبەست لێی بارانە.
(١٥) بۆ ئەوەی دانەوێڵەی بۆ ئادەمزادو گژوگیای بۆ گیانداران لە زەوی پێ دەرکەین و بڕوێنین و،
(١٦) باخ و باخاتی چڕوپڕو بەیەکاچوویشی پێ سەوز بکەین. (١٧) بەڕاستی ڕۆژی قیامەت کە ئادەمزادی چاك و خراپی پێ لێك ئەکرێنەوە، کاتێکە خوا دیاریی کردووە بۆ بڕانەوەی ئەم دنیایەو هاتنی ئەو دنیا.
(١٨) ڕۆژێکە فووی تیا ئەکرێ بە صووردا و ئێوەی ئادەمزادیش پۆل پۆل دێن بۆ مەیدانی لێپرسینەوە.
(١٩) ئاسمان لێك ئەکرێتەوەو درزەکانی ئەبن بە دەرگا.
(٢٠) چیاکانیش لە شوێنی خۆیان هەڵئەکەنرێن و بە هەواوە ئەخرێنە گەڕو، کە مرۆ بە حەواوە ئەیانبینێ وا ئەزانی بە ڕاستی چیان بە حەواوە ئەفڕن، بەڵام چیا نین و بوون بە تۆز بەحەواوە، وەك ئەو لمی تراویلکەیەی تینوو بە ئاوی ئەزانێ و هیچیش نییە. (٢١) بێگومان دۆزەخ لە کەمیندایە بۆ ئەوانەی سزا ئەدرێن.
(٢٢) سەرەنجامی ئەوانەیە کە لە بێفەرمانی خوادا توغیانیان کردوە. (٢٣) چەندین سەدەو ڕۆژگاری بێژمارە تیایا ئەمێننەوە، (٢٤) نە ئاوی ساردی تیا ئەچەژن و نە شەربەتی شیرین، (٢٥) ئاوی گەرم و کێم و زووخ نەبێ.
(٢٦) ئەمەش پاداشێکی دەقاندەق و پڕبەپێستی بیروباوەڕو کارو کرداریانە. (٢٧) ئەمانە هیچ بە هیوای لێپرسینەوەو حیساب و کیتاب نەبوون. (٢٨) ئایەتەکانی ئێمەیشیان بە درۆ ئەزانی و باوەڕیان پێ نەئەکردن.
(٢٩) ئێمەیش هەموو چاکەو خراپەو هەموو شتێکی هەموو کەسێکمان بە ژمارە ژماردووەو هیچمان لێ ون نابێ.
(٣٠) دەی بیچێژن، ئێمەیش لە سزا بەولاوە هیچتان بۆ زیاد ناکەین.

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَائِقَ وَأَعْنَابًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّابًا ﴿٣٥﴾ جَزَاءً مِّن رَّبِّكَ عَطَاءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ رَّبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ الْيَوْمُ الْحَقُّ فَمَن شَاءَ اتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِ مَآبًا ﴿٣٩﴾ إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا ﴿٤٠﴾

## سُورَةُ النَّازِعَاتِ

ترتيبها ٧٩ — آياتها ٤٦

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالنَّازِعَاتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَالنَّاشِطَاتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَالسَّابِحَاتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَالسَّابِقَاتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَالْمُدَبِّرَاتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَارُهَا خَاشِعَةٌ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَإِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَإِذَا كُنَّا عِظَامًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَىٰ ﴿١٥﴾



(٣١) بەڕاستی بۆ ئەوانەیش لە خوای خۆیان ئەترسن ڕزگاری هەیە لە سزای دۆزەخ.
(٣٢) باخ و باخاتی بەهەشت و جۆرەها میوەیان بۆ هەیە.
(٣٣) حۆرییانی تازە پێگەیشتووی تازە مەمك بندانراوی هاوتەمەنیان بۆ هەیە.
(٣٤) پیاڵەی پڕ لە شەراب و شەربەتی بەهەشتیان بۆ هەیە.
(٣٥) نە قسەی هیچوپووچ ئەبیسن لە بەهەشتاو نە درۆو دەلەسە. (٣٦) ئەمەیان بە پاداش لە خوای پەروەردگاری تۆوە ئەدرێتێو، بەخششێکی بەسە بۆیان بەرانبەر بە بیرو کردەوەی چاکیان لە دنیادا.
(٣٧) ئەو پەروەردگارە کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و چی لە نێوانیانایەو میهرەبانە، ناتوانن بێ ئەوەی ئەو ڕێیان بدا قسە بکەن لەگەڵی.
(٣٨) لە ڕۆژێکا کە جیبرەئیل و فریشتەکانی تر پۆل پۆل ئەوەستن کەس قسە ناکا کەسێ نەبێ خوای میهرەبان ئیزنی دابێو قسەی ڕاست و باش بکا. (٣٩) ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی ڕاستە، جا هەرکەسێ مەیلی هەیە با ڕێی گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆی بگرێتەبەر بە فەرمانبەرداری لێ کردنی.
(٤٠) وا ئێمە ئێوەمان لە سزایەکی نزیك ترساند لە ڕۆژێکا ئەبێ مرۆ سەیر ئەکا پێش مردنی خۆی چ کردەوەیەکی بۆ خۆی پێش خستووە ئەیبینێ و، کافریش کە هیچ چاکەیەکی خۆی بەدی ناکات ئەڵێ: بریا هەر گڵ بوومایە لە دنیاداو دروست نەکرابام.

## سوورەتی (النازعات)

مەککەیی‌یەو، (٤٦) ئایەتە

(١) سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی گیانی کافران ئەکێشن بەئازارو ئێش! (٢) سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی گیانی موسوڵمانان ئەکێشن بە ئاسانی! (٣) سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی وەك مەلەوان لە ئاسمانەکانا دێن و ئەچن بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خوا. (٤) سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوادا پێش ئەکەون. (٥) سوێند ئەخۆم بەو فریشتانەی بە فەرمانی خوا کاروباری جیهان ڕێك ئەخەن. سوێند لەسەر خوراوەکە لە ئایەتەکانا نەوتراوەو وای لێ دێتەوە: ئەم خەڵکە هەموو زیندوو ئەکرێنەوە بۆ لێپرسینەوەو پاداش و سزا دانەوە هەرکەس بەگوێرەی کردەوەی خۆی لە دنیادا، بە نیشانەی ئەوەی لە ئایەتەکانی پاشەوەدا وتراوە. (٦) لە ڕۆژێکا ئەوانەی ئەلەرێنەوە وەك ئەرزو چیاکان، ئەلەرێنەوە. (٧) ئەوانەیش کە بە دوایانا دێن ئەکەونەوە دوویان وەك ئاسمان و ئەستێرەکان بن.
(٨) لەو ڕۆژەدا چەندین دڵ ترسولەرز دایان ئەگرێ. (٩) چاوی خاوەنی ئەو دڵانە لە ترسانا شۆڕەو بۆ ئەرز ئەڕوانێ.
(١٠) ئەو کافرانە ئەڵێن: ئایا ئێمە پاش مردن بە ڕێی خۆمانا ئەگێڕرێینەوە بۆ زیندەگانی؟
(١١) ئەڵێن: ئایا ئێمە کە بوو بووین بە ئێسکی ڕزیوو پرتووکاو، ئەگێڕرێینەوە بۆ ژیان؟ (١٢) ئەڵێن: ئەگەر ئەمە ڕوویدات ئەوە گەڕانەوەیەکی زیاناوییە، چونکە ئێمە کە لە دنیادا بووین ئەو زیندووکردنەوەیەمان بە درۆ ئەزانی.
(١٣) با بە زەحمەتی نەزانن، تەنها یەك هاوارە ئەکرێ بە صووردا و، (١٤) ئیتر هەرچی مردوو هەیە هەموو هەر یەکە لە شوێنی خۆیەوە بێدار ئەبێتەوە. (١٥) ئایا باسی هەواڵ و سەرگوزشتەی موسای کوڕی عیمرانت بۆ هاتووەو پێگەیشتووە؟

إِذْ نَادَاهُ رَبُّهُ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴿١٧﴾
فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَاهُ
الْآيَةَ الْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ
فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الْآخِرَةِ وَالْأُولَىٰ
﴿٢٥﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٢٦﴾ أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا
﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا ﴿٢٩﴾
وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا ﴿٣١﴾
وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا ﴿٣٢﴾ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ ﴿٣٣﴾ فَإِذَا جَاءَتِ الطَّامَّةُ
الْكُبْرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ الْإِنسَانُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ
لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ الْجَحِيمَ
هِيَ الْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ
﴿٤٠﴾ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا
﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَاهَا ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَاهَا ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرُ
مَن يَخْشَاهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا ﴿٤٦﴾

## سُورَةُ عَبَسَ

ترتيبها ٨٠ — آياتها ٤٢



(١٦) كاتێ كە خوای خۆی لە دۆڵی پیرۆزی (توور) بانگی لێ کرد.
(١٧) پێی وت: بڕۆ بۆ سەر فیرعەون. فیرعەون توغیانی کردووە.
(١٨) پێی بڵێ: دەرفەتی ئەوەت هەیە خۆت لە کافری و لە توغیان کردن خاوێن کەیتەوە؟
(١٩) منیش ڕێت پیشان بدەم بۆ لای خوای خۆت تا لێی بترسی؟
(٢٠) مووسایش ڕۆیشت بۆ لای فیرعەون و موعجیزە گەورەکەی خۆی پیشان دا.
(٢١) فیرعەونیش مووسای بە درۆزن داناو لێی عاسی بوو.
(٢٢) جا پشتی لە بەگوێکردنی مووسا هەڵکردو کەوتە هەوڵ و تەقەلا بۆ سەرنەکەوتنی.
(٢٣) جا سیحربازەکانی کۆکردەوەو جاڕی دا بەناو خەڵکا.
(٢٤) بە خەڵکەکەی وت: من پەروەردگاری هەرە گەورەی ئێوەم.
(٢٥) جا خواش غەزەبی بەرو دوای لێگرت.
(٢٦) ئەم سەرەنجامی فیرعەونە پەندو ئامۆژگاریی تیایە بۆ هەرکەسێ لە خوای خۆی بترسێ.
(٢٧) ئەی کافرینە! ئاخۆ دروستکردنی ئێوە زەحمەتترە یا دروستکردنی ئاسمان کە خوا بینای کردووە؟ (٢٨) سەقفەکەی بەرزکردووەتەوەو ڕێکوپێکی کردووە.
(٢٩) شەوی ئاسمانی تاریك کردووەو تیشکی ڕۆژی چێشتەنگاوی دەرخستووەو ڕووناك کردووە.
(٣٠) پاش ئەوە زەوییشی پان و بەربڵاو کردووە.
(٣١) ئاوی لێ دەرکردووەو کانیاوی تیا هەڵقوڵاندووەو گژوگیاو لەوەڕی تیا ڕواندووە.
(٣٢) کێوەکانیشی دامەزراندووەو جێگیری کردوون.
(٣٣) بۆ ڕابواردن و ژیانی خۆتان و وڵاخ و ئاژەڵتان.
(٣٤) جا کە بەڵا زۆر گەورەکە هات کە ڕۆژی قیامەتە.
(٣٥) ئەو ڕۆژەی ئادەمزاد بیرئەکاتەوە لە دنیادا چیی بۆ خۆی کردووەو، (٣٦) دۆزەخ دەرئەخرێ بۆ هەرکەسێ ببینێ،
(٣٧) ئا لەو کاتەدا هەرکەسێ لە دنیادا توغیانی کردبێ‌و فەرمانی خوای گوێ نەدابێتێ‌و،
(٣٨) ژیانی دنیاو ڕابواردنی دنیای بەسەر ژیانی پاش زیندووکردنەوەدا هەڵاوێردبێ،
(٣٩) ئەوە دۆزەخ شوێن‌و ماوایەتی.
(٤٠) هەرکەسیش لە گەورەیی خوای خۆی ترسابێ‌و ڕێی لە نەفسی خۆی گرتبێ لە شوێنکەوتنی ئارەزووبازی،
(٤١) ئەوە بەهەشت شوێن و ماوایەتی. (٤٢) ئەی پێغەمبەر! لە بارەی قیامەتەوە لێت ئەپرسن: کەی دێ‌و دائەمەزرێ؟
(٤٣) تۆ لە چ پایەیەکدای تا بزانی قیامەت کەی ئەبێ‌و کەی نابێ؟
(٤٤) سەرەنجامی ئەم باسە بۆ لای خوا خۆی ئەگەڕێتەوەو ئەو پێی ئەزانێ. (٤٥) تۆ تەنها ترسێنەرێکی بۆ هەرکەسێ لە هاتنی قیامەت بترسێ تا خۆی بۆ ئامادە بکا بە گوێ ڕایەڵ کردن بۆ فەرمانەکانی خوا.
(٤٦) قیامەت بە جۆرێ سامناکە کاتێ کە ڕووئەدا ئەم خەڵکە کە بە چاوی خۆیان ئەیبینن وا ئەزانن لە ئێوارە وەختێ یا چێشتەنگاوێ زیاتر لە دنیادا نەژیاون.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾ قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا يَقْضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴿٣٢﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ عَلَيْهَا غَبَرَةٌ ﴿٤٠﴾ تَرْهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَفَرَةُ ٱلْفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾



## سووره‌تی ( عَبَسَ )

**مه‌ككه‌یی‌یه‌و، (٤٢) ئایه‌ته**

(١) ڕووی گرژكردو وه‌ریگێڕا.
(٢) له‌وه كه كوێره‌كه هاته لای. مه‌به‌ست له كوێره‌كه عه‌بدوللّای كوڕی ئوممو مه‌كتوومه كه هاتبوو بۆ لای پێغه‌مبه‌ر.
(٣) تۆ چوزانی؟ له‌وانه‌یه ئه‌و كوێره به پرسیاركردن له تۆ خۆی له گوناه خاوێن كاته‌وه.
(٤) یا هه‌ر هیچ نه‌بێ به هۆی پرسیاركردن له تۆو ئامۆژگاری‌كردنی تۆوه بیر بكاته‌وه‌و ئه‌و بیركردنه‌وه‌یه‌ی سوودی پێ‌بگه‌یه‌نێ.
(٥) به‌لّام كه‌سێ كه خۆی به بێ ئیحتیاج ئه‌زانێ له ئیسلامه‌تی،
(٦) تۆ خۆتی بۆ ئاماده ئه‌كه‌ی و ڕووی تێ‌ئه‌كه‌ی و قسه‌ی بۆ ئه‌كه‌ی.
(٧) هیچ تاوانێ له‌سه‌ر تۆ نییه ئه‌گه‌ر ئه‌و خۆی له گوناه خاوێن نه‌كاته‌وه.
(٨) ئه‌مما ئه‌وه‌ی كه به‌هه‌لّه‌داوان هاتووه بۆلای تۆو،
(٩) له خوای خۆی ئه‌ترسێ،
(١٠) تۆ خۆتی لێ خه‌ریك ئه‌كه‌یت و گوێی ناده‌یتێ. (١١) جارێكی تر شتی وا مه‌كه. ئه‌م قورئانه بیرخه‌ره‌وه‌یه.
(١٢) هه‌ر كه‌س ئاره‌زووی لێ بێ ئه‌یخوێنێته‌وه‌و ڕه‌فتاری پێ ئه‌كا.
(١٣) له چه‌ند په‌ڕه‌یه‌كی به‌قه‌درو قیمه‌تو، (١٤) پایه بلّندو خاوێندایه له‌وه كه ده‌ستی شه‌یتانی بگاتێ. (١٥) به ده‌ستی چه‌ند بنووسێكه‌وه له (لوح المحفوظ)یان وه‌رگرتووه كه فریشته‌كانن. (١٦) لای خوا به قه‌درن و خاوێنن له گوناه.
(١٧) به‌كوشت چێ ئاده‌مزاد، چه‌ند كافره! چی وا كافری كردووه؟ (١٨) خوا ئه‌م ئاده‌مزاده‌ی له چی دروست كردووه؟
(١٩) له تۆمێ دروستی كردووه جا ئاماده‌ی كردووه‌و ئه‌ندامه‌كانی له‌شی ڕێكوپێك كردووه.
(٢٠) پاشان ڕێی ده‌رچوونی له سكی دایكی بۆ ئاسان كردووه. (٢١) پاش ئه‌وه‌یش مراندوویه‌تی و خستوویه‌تیه گۆڕه‌وه.
(٢٢) ئه‌وجا هه‌ركاتێ مه‌یلی لێ بێ زیندووی ئه‌كاته‌وه‌و ئه‌یبا بۆ لێپرسینه‌وه. (٢٣) با ئاده‌مزاد واز بێنێ له ڕه‌وشته به‌ده‌كانی. ئه‌و هێشتا ئه‌وه‌ی جێ‌به‌جێ نه‌كردووه كه خوا فه‌رمانی داوه بیكا.
(٢٤) با ئاده‌مزاد بڕوانێ بۆ ئه‌و خۆراكه‌ی ئه‌یخوا. (٢٥) ئێمه باراناومان له ئاسمانه‌وه ڕشتووه به ڕشتن.
(٢٦) پاشان زه‌ویمان له‌ت كردووه به له‌تكردن. (٢٧) جا دانه‌وێلّه‌مان تیا ڕواندووه. (٢٨) ترێو شیناییشمان تیا ڕواندووه. (٢٩) دار زه‌یتوون و دار خورمایشمان تیا ڕواندووه. (٣٠) باخ و باخاتی چڕوپڕیشمان تیا ڕواندووه.
(٣١) میوه‌و له‌وه‌ڕیشمان تیا ڕواندووه. (٣٢) بۆ ڕابواردنی خۆتان و ئاژه‌لّ و ولّاخه‌كانتان.
(٣٣) جا كه ده‌نگه ئاده‌مزادكه‌ڕكه‌ره‌كه هات كه ده‌نگی فووكردنه به صوورا، (٣٤) ئه‌و ڕۆژه‌ی كه بنیاده‌م له برای خۆی هه‌لّدێ. (٣٥) له دایكی و باوكی هه‌لّدێ. (٣٦) له ژنی خۆی و له كوڕه‌كانی هه‌لّدێ.
(٣٧) هه‌ریه‌كێ له‌وانه له‌و ڕۆژه‌دا كارێكی تایبه‌تی خۆی هه‌یه بێ‌نیازی ئه‌كا له خه‌لّكی ترو ناهێلّێ بیپه‌رژێته سه‌ر كه‌س. (٣٨) له‌وڕۆژه‌دا هه‌ندێ ڕوخسار ڕووناكن و تیشك ئه‌ده‌نه‌وه. (٣٩) پێئه‌كه‌نن و شادمانن.
(٤٠) هه‌ندێ ڕوخساریش گه‌ردو تۆزیان لێ نیشتووه. (٤١) ڕه‌شایی و تاریكی دایانپۆشیون.
(٤٢) ئه‌و ڕوخسارانه، واته خاوه‌نانی ئه‌و ڕوخسارانه، ئه‌وانه‌ن كه كافرو فیسق و فوجووركارن.

## سُورَةُ التَّكوِير

ترتيبها ٨١ — آياتها ٢٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلْعِشَارُ عُطِّلَتْ ﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴿٥﴾ وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ﴿٦﴾ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴿٧﴾ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتْ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتْ ﴿١١﴾ وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ ﴿١٣﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ ﴿١٤﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلْغَيْبِ بِضَنِينٍ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿٢٥﴾ فَأَيْنَ تَذْهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾

## سُورَةُ الانفِطار

ترتيبها ٨٢ — آياتها ١٩



## سووره‌تی ( التَّكوِير )

**مه‌ككه‌یی‌یه‌و، (٢٩) ئایه‌ته**

(١) كه رۆژ پێچرایه‌وه، واته هه‌لگیرا یا تیشكی نه‌ما و،
(٢) كه ئه‌ستێره‌كانیش لێڵ بوون و ،
(٣) كه چیاكان خرانه ڕێ، وه‌ك په‌ڵه هه‌ورێ با به ئاسمانا بیگێڕێ‌و،
(٤) كه وشتری ئاوسی نزیكه‌زان به‌ره‌ڵڵا كرا واته خاوه‌نه‌كه‌ی له‌به‌ر ده‌ردی خۆی نه‌یئه‌په‌رژایه سه‌رێ‌و،
(٥) كه گیانله‌به‌رانی كێوی له هه‌موو جۆرێ كۆكرانه‌وه‌و كه‌وتنه ناویه‌ك و،
(٦) كه ده‌ریاكان هێنرانه كوڵ و،
(٧) كه گیاندارانی ئاده‌مزاد هه‌موو هاوجووت كران چاك له‌گه‌ڵ چاك و خراپ له‌گه‌ڵ خراپ و،
(٨) كاتێ كه كچی زینده‌به‌چاڵ كراو لێی پرسرا: (٩) تاوانی چی بوو كوژرا؟
(١٠) كه نامه‌ی ڕه‌فتاری هه‌ركه‌سێ بڵاوكرایه‌وه بۆ لێپرسینه‌وه‌و،
(١١) كه ئاسمان گوروا، وه‌ك پێستی ئاژه‌ڵ ئه‌گورێ و، (١٢) كه دۆزه‌خ سه‌خت هه‌ڵگڕێنراو، (١٣) كه به‌هه‌شت نزیك كرایه‌وه بۆ خاوه‌ن باوه‌ڕان..
(١٤) ئه‌وكاته هه‌مووكه‌سێ ئه‌زانێ چیی له دنیادا ئاماده كردووه بۆ دوارۆژی خۆی. (١٥) ده‌ی سوێند ناخۆم - مه‌به‌ستی له‌وه‌یه سوێند ئه‌خۆم - به‌و ئه‌ستێرانه‌ی ئه‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ ئه‌و شوێنانه‌ی لێیانه‌وه هه‌ڵهاتوون،
(١٦) ئه‌و ئه‌ستێرانه‌ی كه گه‌ڕۆكن و له‌ژێر تیشكی ڕۆژا ون ئه‌بن،
(١٧) سوێند ناخۆم به شه‌ویش كه تاریك دادێ یا ڕوون ئه‌بێته‌وه. {وشه‌ی (عسعس) هه‌ردوو مه‌عناكه‌ی ئه‌گه‌یێنێ} . (١٨) به به‌یانیش كه هه‌ناسه ئه‌دا، واته كه ڕۆژ ئه‌بێته‌وه (واته: سوێند بێ به هه‌موو ئه‌مانه).
(١٩) ئه‌م قورئانه وته‌ی فروستاده‌یه‌كی گه‌وره‌یه لای خواوه هاتووه، كه جیبره‌ئیله.
(٢٠) خاوه‌ن هێزه‌و لای خودای خاوه‌نی عه‌رش به‌قه‌درو حورمه‌ته.
(٢١) له‌و شوێنه‌دا فه‌رمانبه‌رداریی لێ‌كراوه له‌لایه‌ن فریشته‌كانه‌وه‌و ئه‌مینه له گه‌یاندنی وه‌حیا به پێغه‌مبه‌ران.
(٢٢) ئه‌م هاوڕێیه‌ی ئێوه‌یش كه له گه‌ڵتانه - مه‌به‌ستی له پێغه‌مبه‌ره - شێت نییه.
(٢٣) ئه‌م هاوڕێیه‌ی ئێوه جیبره‌ئیلی دیوه له ئاسۆی دیاردا كه ئاستی جێگه‌ی هه‌ڵهاتنی خۆره.
(٢٤) ئه‌م هاوڕێیه‌ی ئێوه ڕژد نییه له گه‌یاندنی ئه‌و ئایه‌تانه‌دا كه له غه‌یبه‌وه به وه‌حی بۆی دێن، واته ئه‌یانگه‌یه‌نێ به خه‌ڵك و نایانشارێته‌وه لێیان.
(٢٥) ئه‌و ئایه‌تانه‌یش به وه‌حی هاتوونه‌ته خوار بۆ ئه‌و و، قسه‌ی شه‌یتانی له ڕه‌حمه‌تی‌خوادوور نین خستبنیه سه‌ر زمانی ئه‌و هاوڕێیه‌تان.
(٢٦) ده‌ی ئیتر بۆ كوێ ئه‌ڕۆن، واته گومانی پووچ و به‌تاڵ بۆ ئه‌به‌ن؟
(٢٧) ئه‌م قورئانه له بیرخه‌ره‌وه بۆ هه‌موو خه‌ڵكی جیهان به‌ولاوه نییه.
(٢٨) بۆ هه‌ركه‌سێكتان بییه‌وێ ڕاست بڕواو ڕێی ڕاست بگرێته‌به‌ر.
(٢٩) تا خوای په‌روه‌ردگاری هه‌موو جیهانه‌كانیش نه‌یه‌وێ و مه‌یل نه‌كا ئێوه مه‌یلی گرتنه‌به‌ری ڕێی ڕاست ناكه‌ن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ ﴿١﴾ وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ ﴿٢﴾ وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴿٣﴾ وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾ يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ ﴿٦﴾ الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ كَلَّا بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ ﴿١٤﴾ يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئًا ۖ وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾

## سُورَةُ المُطَفِّفِينَ

ترتيبها ٨٣ — آياتها ٣٦

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٦﴾



## سوورەتی (الانفطار)

**مەککەیی‌یەو، (١٩) ئایەتە**

(١) کاتێ کە ئاسمان درزی‌بردو،
(٢) کاتێ کە ئەستێرەکان پرژوبڵاو بوونەوەو،
(٣) کاتێ کە دەریاکان هەڵقوڵێنران و هەموو بوون بە یەك دەریاو،
(٤) کاتێ کە گۆڕەکان ژێرەوژوور کران،
(٥) هەموو کەسێ ئەزانێ چ کارێکی چاك یا خراپی بۆ خۆی پێش خستووەو لە پێش مردنیا کردوویەو چ کارێکی نەکردووە.
(٦) ئەی ئادەمزاد! چی تۆی بایی‌کرد لە ئاستی خوای بەخشندەی خۆت؟
(٧) ئەو خوایەی کە دروستی کردووی و رێکوپێکی کردوویەو ئەندامەکانی لەشتی هەریەکە بە پێی ئەندازەی خۆی لە جێی خۆیا داناوە.
(٨) بە هەر وێنەیێ کە خۆی ویستبێتی ئەندامەکانی لەشتی پێکەوە بەستووە؟
(٩) بایی مەبە لە ئاستی خوای خۆت، بەڵام ئێوە ئایین بە درۆ ئەزانن.
(١٠) بێ‌گومان چەندین فریشتەی نیگابان بەسەر ئێوەوە نیگابانی ئەکەن.
(١١) خاوەن پایەو قەدرن چاکەو خراپەتان ئەنووسنەوە.
(١٢) ئەزانن ئێوە چی‌ئەکەن.
(١٣) بەڕاستی ئەوانەی بیرو کرداریان چاك بووە لە نازو نیعمەتی بەهەشتدان.
(١٤) ئەوانەیش کە لە ڕاستی لایانداوەو بیروکرداریان خراپ بووە لە دۆزەخدان.
(١٥) ئەو دۆزەخییانە لە ڕۆژی جەزادانەوەدا ئەکەونە ناوی و گەرماکەی ئەچێژن.
(١٦) لێشی ون نابن چونکە بۆ هەمیشە تیا ئەمێننەوە.
(١٧) تۆ چوزانی ڕۆژی جەزادانەوە چییە؟ (١٨) پاشانیش چوزانی ڕۆژی جەزادانەوە چییە؟
(١٩) ئەو ڕۆژەیە کە هیچ کەسێ خاوەنی دەسەڵاتی کردنی هیچ شتێ نییە بۆ کەسێکی ترو فەرمان لەو ڕۆژەدا هەر فەرمانی خوا خۆیەتی.

## سوورەتی (المطففین)

**مەککەیی‌یەو ، (٣٦) ئایەتە**

(١) هاوار بۆ ئەوانەی لە کێشانەو پێوانەدا زیادوکەم ئەکەن.
(٢) ئەوانەی کە شتی خەڵکیان بۆ خۆیان پێوا بەتەواوی حەقی خۆیان وەرئەگرن.
(٣) کە شتیشیان بۆ ئەوان پێوا یا کێشا زەرەریان لێ ئەدەن و کەمیان بۆ دائەنێن.
(٤) ئایا ئەوانە گومان نابەن کەوا پاش مردن زیندوو ئەکرێنەوە،
(٥) لە ڕۆژێکی مەزندا، یا بۆ ڕۆژێکی مەزن کە ڕۆژی قیامەتە؟
(٦) ئەو ڕۆژەی خەڵك هەموو ڕائەوەستن بۆ پەروەردگاری جیهان کە لە چاکەو خراپەی هەموو ئادەمزاد ئەپرسێتەوەو بڕیاری پاداشدانەوەی یا سزادانیان ئەدا.

كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرْسِلُوا۟ عَلَيْهِمْ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾



(٧) بـا ناتـەواوپێوو ناتەواوكێشـەكان دەسـبەرداری ئـەم كـارە خراپـەیان بـبن، سیاهەی كردەوەی پیاوخراپان لە (سیججین) دایە.
(٨) تۆ چوزانی سیججین چییە؟
(٩) كتێبێكی نووسراوە.
(١٠) هـاوار لـەورۆژەدا بـۆ ئەوانـەی باوەڕیان نییە،
(١١) ئەوانـەی ڕۆژی جەزادانـەوە بـە درۆ ئەزانن و باوەڕی پێناكەن.
(١٢) ئەو ڕۆژەیش بە درۆ نازانـێ هـەموو مرۆیەكی لەحەقلادەری تاوانبار نەبێ.
(١٣) كـە ئایەتـەكانی ئێمـەی بەسـەرا ئەخوێنرێتـەوە ئـەڵێ: ئەمـە ئەفسـانەی پێشینانە.
(١٤) با دەس لە قسەی هیچوپووچی لـەم جۆرە هەڵگرن. ئـەو تاوانانـەی ئـەیانكردن وەك خاڵێكی ڕەش بووە بە ژەنـگ بەسـەر دڵیانـەوەو دڵـی داگرتـوون، بۆیـە نـاتوانن ڕاسـت و چـەوت لێـك جویَكەنـەوەو ئـەم جۆرە قسانە ئەكەن.
(١٥) بـا واز لـەم تاوانانـە بێـنن كـە وەك ژەنگ دڵیانی داگرتووە. ئەمانە لەو ڕۆژی قیامەتـەدا ڕێیـان لێ ئـەگیرێ كـە وەك موسوڵمانان خوای خۆیان ببینن.
(١٦) پـاش ئەمـەیش ئەوانـە ئەچنە نـاو دۆزەخ و بە ئاگری دۆزەخ ئەسووتێنرێن.
(١٧) جا پێیشیان ئەوترێ: ئەم دۆزەخە ئەوەیە باوەڕتان پێ نەئەكردو بە درۆتان ئەزانی.
(١٨) بـا ناتـەواوپێوو ناتەواوكێشـەكان واز لـەم سـەنگسـووكی و كـەم پێوییـەیان بێـنن. سـیاهەی كـارو كـردەوەی پیاوچاكان لە (عیللیین)دایە. (١٩) تۆ چوزانی عیللییون چییە؟ (٢٠) كتێبێكی نووسراوە.
(٢١) فریشـتەكانی لـەخواوەنزیك ئامـادەی پێشـوازی لێ كردنـی ئـەبن كـە فریشـتەی كـارو كـردەوەی چـاكاننـووس هەڵیئەبڕن بۆ ئاسمان. (٢٢) بێگومان كەسانی بیرو كردار چاك لە نازو نیعمەتی بەهەشتدان.
(٢٣) لەسەر كورسیو قەنەفە دائەنیشن و سەیری ئەو نازو نیعمەتە ئەكەن خوا پێیداون.
(٢٤) لە سیمایانا گەشیی نازو نیعمەت ئەناسیتەوە.
(٢٥) لە شەرابی سەربەمۆری بێگەردیان پێنۆش ئەكرێ.
(٢٦) سەرقاپی پیاڵەی شەرابەكەیان بە میسـك سـەربەمۆرە. دەسـا بـا ئەوانـەی لـەناو خۆیانـا ئەكەونـە ململانـێ و هەركەسێ شتی چاكی بۆ خۆی ئەوێ، بۆ دەستخستنی نازو نیعمەتی وا بكەونە ململانێ.
(٢٧) ئەو ئاوەی ئەكرێتە شەرابەكەیانەوە تێكەڵی ئاوی كانیاوی (تەسنیم)ە.
(٢٨) كانییەكە نزیكانی بارەگای خوا ئاوی لێ ئەخۆنەوە.
(٢٩) تاوانبارەكان لە دنیادا بە خاوەن باوەڕەكان پێئەكەنین.
(٣٠) كە بەلای موسوڵمانانیشا تێپەڕینایە بە چاو ئەكەوتنە ئیشارەتی گاڵتە پێكردنیان.
(٣١) كە بیشگەڕانایەتەوە بۆ ناو ماڵ و خێزانیان بە پێپێكەنین و پێ ڕابواردنیانەوە ئەگەڕانەوە.
(٣٢) ئەگەر بیشیاندینایە ئەیانوت: ئەمانە كۆمەڵێكی گومڕاو سەرلێشێواون.
(٣٣) ئەم كافرانە نەیشنێررابوونە سەر موسوڵمانان بۆ پارێزگارییان و ئاگاداری لێ كردن و ڕێپیشاندانیان.
(٣٤) بۆیە ئەمرۆیش موسوڵمانەكان بە كافرەكان پێئەكەنن كە تووشی چارەنووسێكی وا ڕەش هاتوون.

عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾

## سُورَةُ الانشِقَاقِ
(ترتيبها ٨٤ — آياتها ٢٥)

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ﴿١﴾ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ﴿٣﴾ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ﴿١١﴾ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ﴿١٥﴾ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَۤ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ ﴿٢٥﴾



(٣٥) بەسەر کورسی و قەنەفەوە سەیریان ئەکەن لە چ حالێکان!
(٣٦) جا ئاخۆ کافرەکان پاداشی کارو کردەوەی خۆیان درانەوە؟

## سوورەتی (الانشقاق)

**مەککەیی‌یەو، (٢٥) ئایەتە**

(١) کاتێ کە ئاسمان لەت بوو،
(٢) فەرمانبەرداریی خوای خۆی کردو شایان کرا بۆ بیستنی فەرمانی خواو،
(٣) کاتێ کە زەوی تەخت کراو کێوو گردو تەپۆڵکەی بە ڕووەوە نەماو،
(٤) هەرچیی لە ناویا هەیە هەمووی فڕێدایە دەرەوەو خۆی بە یەکجاری خاڵی کردەوەو،
(٥) فەرمانبەرداریی خوای خۆی کردو شایان کرا بۆ بیستنی فەرمانی خوا،
(٦) تۆ ئەی ئادەمزاد لەو ڕۆژەدا بە پەلە ئەڕۆی بۆ لای خوای خۆت و پێی‌ئەگەی.
(٧) جا هەرکەسێ کتێبی کارنامەی خۆی بدرێتە دەستی ڕاستی،
(٨) ئەوە لەوەپاش بە ئاسانی لێی ئەپرسرێتەوەو،
(٩) بە دڵی خۆشەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ناو خێزان و کەسوکاری خۆی.
(١٠) هەر کەسێکیش کتێبی کارنامەی لەلای پشتیەوە بدرێتە دەستی چەپی،
(١١) ئەوە ئەکەوێتە هاوارو باوکەڕۆو،
(١٢) ئەچێتە ناو ئاگری دۆزەخ.
(١٣) ئەو لە دنیادا لەناو کەس و کارو خێزانی خۆیا دڵ شاد بووە.
(١٤) ئەو گومانی وابوو هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ لای خوا.
(١٥) نەخەیر وا نییەو ئەگەڕێتەوە بۆ لای خواو خوا چاوی لێیەو ئەیبینێ.
(١٦) من سوێند ناخۆم - مەبەستی ئەوەیە سوێند ئەخۆم - بە سوورایی کەناری ئاسمانی پاش ڕۆژ ئاوابوون و،
(١٧) بە شەوو بە هەرچی لە ژێر جلی تاریکیی خۆیا داپۆشیوەو،
(١٨) بە مانگ کە پڕئەبێتەوە لە شەوی چواردەیا.
(١٩) ئێوە ئەی بەرەی ئادەمزاد! لە ژیانتاناو پاش مردنتان سواری کۆڵی چەندین حاڵەتی یەك لە دوای یەکی هەرکامیان وەك ئەوی تریان سەخت و ناڕەحەت ئەبن، وەك مردن و پاش مردن و زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت و لێپرسرانەوە لە حوزووری خوادا.
(٢٠) دەی ئەوە دەردیان چییە ئیمان ناهێنن؟
(٢١) کە قورئانیان بەسەرا بخوێنرێتەوە سوجدەی خوا بەگەورەزانین نابەن؟
(٢٢) لەمە گەڕێ، ئەوانەی کافرن قورئان بە درۆ دائەنێن.
(٢٣) خوا خۆیشی لە هەمووکەس چاکتر ئەزانێ ئەمانە چییان لە دڵایە.
(٢٤) دەی مژدەی سزایەکی سەختیان بدەرێ.
(٢٥) بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو چاکەیان کردووە ئەوانە پاداشێکی نەبڕاوەیان بۆ هەیە.

## سُورَةُ البُرُوجِ

ترتيبها ٨٥ — آياتها ٢٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ﴿١﴾ وَٱلْيَوْمِ ٱلْمَوْعُودِ ﴿٢﴾ وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ ﴿٣﴾ قُتِلَ أَصْحَٰبُ ٱلْأُخْدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلْوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذْ هُمْ عَلَيْهَا قُعُودٌ ﴿٦﴾ وَهُمْ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ شُهُودٌ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُوا۟ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٨﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ ﴿١١﴾ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطٌۢ ﴿٢٠﴾ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴿٢٢﴾

## سُورَةُ الطَّارِقِ

ترتيبها ٨٦ — آياتها ١٧



## سووڕەتی (البُروج)

مەککەیی‌یەو، (٢٢) ئایەتە

(١) قەسەم بە ئاسمانە خاوەن بورجەکان!
(٢) قەسەم بەو ڕۆژەی وەعدەی پێدراوە کە ڕۆژی قیامەتە!
(٣) قەسەم بەو کەسەی لە ئەحوالی هەموو عالەم ئاگادارە کە خوایەو! بەوشتە سەیرو عەجاییانەی لەوڕۆژەدا ئەبینرێن، یا قەسەم بە پێغەمبەرو ئوممەتەکەی یا بە پێغەمبەران و ئوممەتەکانیان!
(٤) قەسەم بە هەموو ئەوانەی وتران، لە ڕەحمەتی خوا دوورخراونەتەوە ئەوانەی خەنەکیان هەلکەند.
(٥) خەنەکە هەلکەنراوەکە کە ئاگری پڕسووتەمەنییە.
(٦) کاتێ کە خۆیان لە کەناری ئاگرەکەدا دانیشتبوون و،
(٧) ئاگایان لێ بوو چییان بە خاوەن باوەڕەکان ئەکردو بە ئاگر سزایان ئەدان و، لە ڕۆژی قیامەتیشا شایەتی لەسەر یەك ئەدەن لەبارەی ئەو کارەوە کە بە موسوڵمانەکانیان ئەکرد لە دنیادا.
(٨) لەبەر هیچیش ڕقیان لێیان نەبوو لەبەر ئەوە نەبێ کە ئیمانیان هێنابوو بە خوای خاوەن عیززەت و ستایش کراو.
(٩) کە خاوەنی مولکی ئاسمانەکان و زەوییەو ، خوا ئاگای لە هەموو شتێ هەیە.
(١٠) بێگومان ئەوانەی پیاوو ژنە موسوڵمانە خاوەن باوەڕەکانیان تووشی ئازارو ناڕەحەتی کردو پاشانیش پەشیمان نەبوونەوەو تۆبەیان نەکرد، ئەوانە سزای دۆزەخیان بۆ هەیەو سزای سووتاندنیان بۆ هەیە.
(١١) بەڕاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە بەهەشتەهایەکیان بۆ هەیە جۆگەو ڕووبار بەژێریانا ئەڕواو، گەیشتنی گەورەیش بە نیعمەتی خوا ئەمەیە.
(١٢) بەڕاستی خوا سەختگیرە.
(١٣) بەڕاستی هەر خوایە لە سەرەتاوە ئادەمزاد دروست ئەکاو هەر ئەویشە لەو دنیا زیندووی ئەکاتەوەو دروستی ئەکاتەوە.
(١٤) هەر ئەویشە بەڕاستی گوناهبەخش و خاوەن خۆشەویستی بۆ ئەوانەی فەرمانبەرداریی لێ ئەکەن.
(١٥) خاوەنی عەرشەو پڕشکۆیە.
(١٦) هەرچی خواستی لەسەر بێ ئەیکا.
(١٧) ئایا هەواڵی لەشکرەکانت پێگەیشتووە کە چیمان پێکردن؟
(١٨) فیرعەون و سەموودو دەستەو لەشکرەکانیان کە باوەڕیان بە پێغەمبەرەکانیان نەکردو ئێمەیش غەزەبمان لێ گرتن؟
(١٩) لێگەڕێ لەوان. ئەمانەی مەککە لەوان خراپترن چونکە سەرگوزەشتی ئەوانیش ئەزانن و هێشتا هەر ئیمان ناهێنن. کافران هەمیشە هەر وان. پێغەمبەران بە درۆزن دائەنێن و ئیمانیان پێناهێنن.
(٢٠) خوایش لە دوایانەوە گەمارۆی داون و ناتوانن لە دەستی دەرباز بێن.
(٢١) گوێ مەدەرە قسەی کافرەکانی مەککە. ئەو قورئانەی ئەوان باوەڕی پێناکەن قورئانێکی پڕشکۆیە.
(٢٢) لە (لوح المحفوظ)دا نووسراوەتەوەو دەستی هیچ جۆرە گۆڕین و شێواندنێکی ناگاتێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ ﴿٢﴾ النَّجْمُ الثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴿٤﴾ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴿١٠﴾ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ ﴿١١﴾ وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ ﴿١٤﴾ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا ﴿١٧﴾

## سُورَةُ الْأَعْلَىٰ

ترتيبها ٨٧ — آياتها ١٩

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴿١﴾ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَىٰ ﴿٥﴾ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٨﴾ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ الذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا الْأَشْقَى ﴿١١﴾ الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾



## سووڕەتی (الطَّارِق)

**مەککەیی‌یەو ، (١٧) ئایەتە**

(١) قەسەم بە ئاسمان و بەو ئەستێرەی بە شەو دەرئەکەوێ! (٢) تۆ چوزانی ئەو ئەستێرەی بە شەو دەرئەکەوێ چییە؟
(٣) ئەو ئەستێرەیە بە تیشکی خۆی پەردەی تاریکی ئەسمێ.(٤) قەسەم بەوانە هیچ نەفسێ نییە نیگابانێکی لەسەر نەبێ!
(٥) دەسا با ئادەمزاد وردبێتەوە لە چی دروست کراوە؟ (٦) لە ئاوێکی هەڵقوڵاو دروست کراوە. (٧) لە نێوان پشتی پیاوو ئێسکی سنگی ئافرەتەوە دەرئەچێ.
(٨) بێ‌گومان خوا ئەیشتوانێ جارێکی‌تر ئەو ئادەمزادە دروست کاتەوە. (٩) لەو ڕۆژەدا کە نهێنییەکان چاك و خراپیان لێك جوێ‌ئەکرێنەوە. (١٠) ئادەمزاد لەو ڕۆژەدا نە خۆی هێزی هەیە داکۆکی لە خۆی بکاو، نە یارمەتیدەرێکیشی هەیە بگاتە فریای و یارمەتی بدا. (١١) قەسەم بە ئاسمانی خاوەنی جووڵەو هەڵسووڕانەوە کە لەپاش تەواوکردنی هەر خولێکی ئەگەڕێتەوە ئەو شوێنەی خولی جووڵەکەی لێوە دەست پێ‌کردووە. (١٢) قەسەم بە زەوی کە خاوەنی ئەو گژوگیاو دارو درەختانەیە لە درزی ئەوەوە دێنەدەر. (١٣) ئەم قورئانە فەرموودەیەکە ڕاست و چەوت لێك جوێ‌ئەکاتەوەو، (١٤) وتارێکی وا نییە بە گاڵتە وترابێ. (١٥) بێ‌گومان کافرەکانی مەککە تەگبیر ئەکەن و پیلان ئەنێنەوە بۆ لەکارخستنی قورئان لە دڵی خەڵکا. (١٦) منیش تەگبیری خۆمیان لێ ئەکەم و ڕایانئەکێشم بۆ تۆڵەلێ‌سەندنەوەیان و بۆ زاڵکردنی قورئان بەسەر پیلانەکانی ئەوانا. (١٧) دەی مۆڵەتی ئەو کافرانە بدە بۆ ماوەیێ و پەلەت نەبێ بۆ سزادانیان، منیش چەردەیەك مۆڵەتیان ئەدەم و لێیان ئەگەڕێم تا سەرەنجام تۆڵەی حەقی خۆیانیان لێ ئەسێنمەوە.

## سووڕەتی (الأَعْلَىٰ)

**مەککەیی‌یەو، (١٩) ئایەتە**

(١) ناوی بەرزی خوای خۆت خاوێن ڕابگرە لەوە کە هەر ناتەواوییەکی بدرێتە پاڵ. (٢) ئەو خوایەی کە شتەکانی لە نەبوون دروست کردووەو ڕێکی خستوون و، (٣) ئەو خوایەی ئەندازەی هەموو مەوجوودێکی گرتووەو شارەزای کردووە بۆ ئەو ئامانجەی بۆی دروست کراوەو، (٤) ئەو خوایەی لەوەڕو لەوەڕگای شین کردووە تا چوارپێ‌و ئاژەڵ لێی بلەوەڕێن و،
(٥) پاشان ئەو لەوەڕەی وەرگێڕاوە بە پووشێکی ڕەش. (٦) ئێمە وات لێ‌ئەکەین ئەو ئایەتانە بخوێنیتەوە کە بە هۆی جیبرەئیلەوە نازڵیان ئەکەینە سەرت، بە جۆرێکی وا کە پاش نازڵ کردنەکەیان لەبیرت نەچنەوە.(٧) ئەو ئایەتانە نەبێ کە خوا خۆی ئەیەوێ لەبیرت بچنەوە، چونکە نەسخیان ئەکاتەوە، ئەو خۆی بێ‌گومان زانایە بە هەرچی ئاشکراو نهێنییەك کە هەیە. (٨) ئێمە ئامادەت ئەکەین بۆ ئاسانترین ڕێگا بۆ لەبەرکردنی ئایەتەکانی قورئان. (٩) دەی تۆ ئامۆژگاریی خەڵك بکە ئەگەر ئامۆژگاری سوودی ببێ. (١٠) سەرەنجام هەرکەسێ لە خوای خۆی بترسێ بیرئەکاتەوەو سوود لە ئامۆژگاری وەرئەگرێ‌و، (١١) ئەوەیش زۆر خراپکار بێ خۆی دوور ئەگرێ لەبیرکردنەوەو سوودوەرگرتن لە ئامۆژگاری.
(١٢) ئەو مرۆ زۆر خراپکارەی پاش لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت ئەچێتە ناو ئاگرە گەورەکە.
(١٣) پاش چوونە ناو ئاگرەکەیش نە ئەمرێ لەناویا تا بحەسێتەوەو، نە ئەیشژی ژیانێکی وا چەردەیێ ئیسراحەت و حەسانەوەی تیا بێ. (١٤) بەڕاستی ڕزگاری ئەبێ ئەو کەسەی خۆی لە تاوان خاوێن ئەکاتەوەو،
(١٥) ناوی خوای خۆی بە دڵ و بە زوبان بهێنێ و ئەوجا نوێژەکانیشی بکا.

بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَـٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾

## سُورَةُ الغَاشِيَةِ

ترتيبها ٨٨ — آياتها ٢٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَـٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِى مِن جُوعٍ ﴿٧﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿١٠﴾ لَّا تَسْمَعُ فِيهَا لَـٰغِيَةً ﴿١١﴾ فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِىُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ ﴿٢٠﴾ فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾



(١٦) کەچی ئێوە ژیانی دنیا هەڵئەبـژێرن بەسەر ژیانی قیامەتدا.

(١٧) بەڵام ئەو دنیا باشترو پایەدارترە.

(١٨) ئەمـە کـە ئـەوەی خـۆی لـە تـاوان خاوێن کاتەوە ڕزگاری ئەبێ.. تـا دوایـی، لە نووسراوە پێشووەکانا هەیە.

(١٩) ئـەو نووسـراوانەی خـوا نـازڵی کردوونەتـە خـوارەوە بـۆ سـەر ئیـبراهیم و مووسا.

## سوورەتی (الغَاشِيَة)

**مەککەیی‌یەو، (٢٦) ئایەتە**

(١) ئایـا باسـی ئـەو بـەڵا سـەختەت هاتووەتـەلا کـە ئـادەمزاد دائـەگرێ، کـە ڕۆژی قیامەتە؟

(٢) لەو ڕۆژەدا چەندەها سەروڕوو ملکەچ و زەلیلن.

(٣) کارئەکـەن و مانـدوو ئـەبن لـەناو دۆزەخا زنجیر بەدوای خۆیانا ڕائەکێشن.

(٤) ئەڕۆنە ناو ئاگری گەرم و پڕتینەوە.

(٥) ئاویـان لـە سەرچـاوەیەکی گـەرم ئەدرێتێ.

(٦) لە وشترخوار بەولاوە خۆراکیان نییە.

(٧) نـە مـرۆ قەڵـەو ئـەکاو نـە برسـێتی ئەشکێنێ.

(٨) چەندەها سەروڕوو لەو ڕۆژەدا لە نازو نیعمەتان.

(٩) ڕازیـن بـەوەی لـە دنیـادا کردوویانـە چونکە پاداشەکەی ئەبینن.

(١٠) لە بەهەشتێکی بەرزدان.

(١١) تۆ، یا ئەوان، لەو بەهەشتەدا قسەی هیچوپووچ نابیسن.

(١٢) کانیاوێکی ڕەوانی تیایە. (١٣) چەندین تەختگەلی بەرزو بڵندیشی تیایە.

(١٤) چەندین پەرداغی دانراویشی تیایە.

(١٥) چەندین پشتیی ڕیزکراویشی تیایە.

(١٦) چەندین فەرشی ڕاخراویشی تیایە.

(١٧) ئەوە بۆ ئەو کافرانە سەیری وشتر ناکەن چۆن خولقێنراوە؟

(١٨) بۆ سەیری ئاسمان ناکەن چۆن بەرزکراوەتەوە؟

(١٩) بۆ سەیری چیاکان ناکەن چۆن دامەزرێنراون؟

(٢٠) بۆ سەیری زەوی ناکەن چۆن تەخت کراوە؟

(٢١) تۆ ڕێی چاکەو خراپەیان بیرخەرەوە، قەیدی نییە گوێیشت لێ نەگرن، تۆ هەر بیرخەرەوەیت.

(٢٢) تۆ خاوەن دەسەڵات و زاڵ نیت بەسەر ئەوانا.

(٢٣) بەڵام کەسێ پشت لە خوا هەڵکاو کافر بێ،

(٢٤) ئەوە خوا سزای هەرە گەورەی ئەدا.

(٢٥) بێگومان سەرەنجام گەڕانەوەی ئەو کافرانە بۆ لای ئێمەیە.

(٢٦) پاشانیش لێپرسینەوەیان لەسەر ئێمەیە ئێمە حیساب و کیتابیان لەگەڵ ئەکەین.

## سُورَةُ الفَجْرِ

مكية ٨٩ — آياتها ٣٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ وَٱلشَّفْعِ وَٱلْوَتْرِ ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَسْرِ ﴿٤﴾ هَلْ فِى ذَٰلِكَ قَسَمٌ لِّذِى حِجْرٍ ﴿٥﴾ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴿٧﴾ ٱلَّتِى لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٨﴾ وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُوا۟ ٱلصَّخْرَ بِٱلْوَادِ ﴿٩﴾ وَفِرْعَوْنَ ذِى ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ طَغَوْا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١١﴾ فَأَكْثَرُوا۟ فِيهَا ٱلْفَسَادَ ﴿١٢﴾ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ ﴿١٣﴾ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ۖ بَل لَّا تُكْرِمُونَ ٱلْيَتِيمَ ﴿١٧﴾ وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿١٨﴾ وَتَأْكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكْلًا لَّمًّا ﴿١٩﴾ وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا ﴿٢٠﴾ كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِا۟ىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴿٢٣﴾



## سوورەتی (الفَجْرِ)

مەککەیی‌یەو، (٣٠) ئایەتە

(١) سوێند بە کاتی بەرەبەیان.
(٢) سوێند بە دە شەوەی یەکەمی مانگی قوربان (ذي الحجة).
(٣) سوێند بە هەموو مەخلووقات کە هەرکامیان بگری جووتەو، بە خالق کە خوایەو تاك و تەنیایە.
(٤) سوێند بە شەو کاتێ کە بەسەرئەچێ.
(٥) ئایا لەم سوێندانەدا واتای سوێند لای مرۆی خاوەن هۆش هەیە؟
(٦) نەتدی خوای تۆ چیی کرد بە خێڵی عاد؟
(٧) عادی شاری ئیرەمی خاوەن کۆشك و تەلاری پڕ لە کۆڵەکەی ئەستوور.
(٨) کە وێنەی لەناو شارانا دروست نەکرابوو.
(٩) ئەی نەتدی چیی کرد بە خێڵی سەموود کە تاشەبەردیان لە شیوی (وادي القرى) بڕیبوو و کردبوویان بە شوێن و ماوا بۆ خۆیان؟
(١٠) ئەی نەتدی چیی‌کرد بە فیرعەونی خاوەن دەوارو هەسوون، یا فیرعەونی مێخ داکوت بۆ سزادانی هەر کەسێ بیویستایە سزای بدایە؟
(١١) ئەو عادو سەموودو فیرعەونەی هەریەکە لە وڵاتی خۆیا توغیانی کردبوو و(١٢) بە کوفرو ستەم پڕیان کردبوو لە فیتنەو فەسادو خراپە.
(١٣) جا خواکەی تۆیش جۆرەها سزای بەسەریانا ڕژاند.
(١٤) بێ‌گومان خوای تۆ چاودێرییان ئەکاو ئەیانبینێ چی ئەکەن.
(١٥) هەرچی ئادەمزادە هەر دنیای مەبەستە! کاتێ کە خوا، بۆ تاقیکردنەوەی، قەدری گرت و نازو نیعمەتی بەسەرا ڕژاند، ئەڵێ: خوای خۆم قەدری گرتووم.
(١٦) ئەگەریش وای تاقیکردەوە کە ڕزق و ڕۆزیی لێ کەم کردەوە ئەڵێ: خوای خۆم سووکیی پێ کردووم.
(١٧) نەخەیر مەسەلە بەو جۆرە نییە. نە ڕزق و ڕۆزی زۆرکردن مەعنای ئەوەیە خوا حورمەتی کەسە ڕزق و ڕۆزی زۆر کراوەکەی گرتووەو، نە ڕزق و ڕۆزی کەم کردنیش مەعنای ئەوەیە خوا بە سووکی ڕوانیویەتە کەسە ڕزق و ڕۆزی کەم کراوەکە. بەڵام ئێوە خۆتان حەزتان لە پیاوەتی کردن نییەو قەدری هەتیو ناگرن و،
(١٨) هانی خەڵك نادەن خۆراك بدەن بە هەژاران و،
(١٩) ماڵی میراتی ئەخۆن بێ‌جیاوازی خستن لە نێوان میراتی حەڵاڵ و حەراماو، بەشی منداڵ و هەتیو و ئافرەتی بێ‌دەسەڵات جیاناکەنەوە بۆیان و،
(٢٠) ماڵی دنیاتان زۆر زیاد لە ڕادەی مەعقوول خۆش ئەوێ.
(٢١) واز لەم کارو کردەوانە بێنن. کاتێ کە زەوی جار لەدوای جار بکوترێتەوەو هەمووی تەخت ببێ‌و،
(٢٢) خوای تۆو فریشتەکان پۆل پۆل بێن و (مەبەست لە هاتنی خوا دەرکەوتنی نیشانەکانی توان و دەسەڵاتیەتی)،
(٢٣) ئەو ڕۆژە دۆزەخیش ئەهێنرێتە بەرچاوی خەڵك.. لەوڕۆژەدا ئادەمزاد بیرئەکاتەوە کە هەڵوێستی لە دنیادا چی بووە، بەڵام بیرکردنەوە چ دادێکی ئەدا لەوکاتەداو سوودی چییە بۆی؟

يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾

## سُورَةُ البَلَدِ

(ترتيبها ٩٠) (آياتها ٢٠)

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٞ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهۡلَكۡتُ مَالٗا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾ أَلَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ عَيۡنَيۡنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ﴿١٠﴾ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ ﴿١٤﴾ يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ ﴿٢٠﴾

## سُورَةُ الشَّمۡسِ

(ترتيبها ٩١) (آياتها ١٥)



(٢٤) ئادەمزاد لەوكاتەدا ئەڵێ: بریا لە دنیادا بیری پاك و كرداری چاكم پێش خۆم بخستایە بۆ ژیانی ئەمڕۆم.
(٢٥) لەو ڕۆژەدا كەس بە چەشنی سزای خوا كەس سزا ناداو،
(٢٦) كەس بە چەشنی كۆت و زنجیركردنێ كە خوا ئەیكا كەس كۆت و زنجیر ناكا.
(٢٧) لەو ڕۆژەدا لەلایەنی خواوە بانگ ئەكرێتە هەموو خاوەن باوەڕانی گوفتارپاك و كردارچاك و، پێیان ئەوترێ: ئەی گیانی خاوەن متمانەو دامەزراو!
(٢٨) وەرەوە بۆ لای خوای خۆت بە ڕەزامەندیی خۆت و لەگەڵ ڕەزامەندیی خوایش لێت. (٢٩) وەرە ناو بەندە باشەكانم و، (٣٠) وەرە بەهەشتی منەوە.

## سوورەتی (البَلَد)

**مەككەییەو، (٢٠) ئایەتە**

(١) سوێند ناخۆم (مەبەستی ئەوەیە سوێند ئەخۆم) بەم شارە (كە مەبەستی مەككەیە)، (٢) لە حاڵێكا كە تۆ نیشتەجێی ئەم شارەی.
(٣) سوێند ناخۆم بە باوكێ كە ئیبراهیمەو بەوەی لە نەوەی ئەو بەوەڵەد بووە كە مەبەست لێی پێغەمبەرە.
(٤) ئێمە بەڕاستی، ئادەمزادمان لە هەموو ژیانیا لە ماندوویەتی و ئەركا دروست كردووە. (٥) ئایا ئادەمزاد (دیارە مەبەستی لە هەندێ كەسە لەوانەی بەربەرەكانێی پێغەمبەریان ئەكرد) گومان وائەبا كەس دەسەڵاتی بەسەریا ناشكێ؟ (٦) بەفیزەوە ئەڵێ: من ماڵێكی زۆرم خەرج كردووە.
(٧) ئایا لای وایە كەس نەیدیوەو كەس پێ‌نازانێ ئەو پارە زۆرەی لە چیدا خەرج كردووە؟
(٨) ئایا ئێمە دوو چاومان بۆ دروست نەكردووە پێیان ببینێ‌و؟ (٩) زوبانێك و دوو لێومان بۆ دروست نەكردووە بە زوبانەكەی بدوێ‌و بە لێوەكانی زمان و ددانی داپۆشێ؟ (١٠) هەردوو مەمكی دایكیشیمان پیشان داوە شیریان لێ بخوا، یا ڕێگای چاكەو خراپەمان پیشان داوە تا چاكە بكاو خراپە نەكا.
(١١) دەی بۆچی سوپاسی ئەو نیعمەتانەی نەكرد بەوە كە خۆی هەڵكوتێتە ناو كارێكی قورسی پڕبایەخەوە؟
(١٢) تۆ چوزانی كاری قورسی پڕبایەخ چییە؟ (١٣) كردنەوەی كۆتی بەندەیی لە گەردنێكە، واتە ئازادكردنی بەندەیەكە. (١٤) یاخود نان دەرخوارددانێ لە ڕۆژێكی قاتی و قڕی و برسێتیدا،
(١٥) بە هەتیوێكی خزمی خۆی، (١٦) یا بە هەژارێكی تۆزو خۆڵاوی. (١٧) پاش ئەمەیش و لەمەیش بەولاوە لەو كەسانە بێ كە ئیمانیان هێناوەو، خەڵكیان ڕاسپاردووە كە لەڕێی خوادا سەبرو تەحەمولیان ببێ‌و خۆیان بگرن و، خەڵكیان ڕاسپاردووە كە میهرەبان بن لەگەڵ هەركەس پێویستی بە میهرەبانی بێ.
(١٨) پیاوی خاوەن بەرەكەت ئەوانەن وا ئەكەن، یا ئەوانەی كارنامەیەیان لە ڕۆژی قیامەتا ئەدرێتە دەستی ڕاستیان، ئەوانەی ئەم كارانە ئەكەن. (١٩) ئەوانەیش كە ئینكاری ئایەتەكانی ئێمە ئەكەن، ئەوانن خاوەنی شوومی و بەدبەختی، یا ئەوانەن كارنامەیان لە ڕۆژی قیامەتا ئەدرێتە دەستی چەپیان.
(٢٠) ئاگرێكی دەرگاداخراو بەسەر ئەم جۆرە كەسانەوەیە. خوا پەنامان بدا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا ﴿١﴾ وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴿٢﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ﴿٣﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰهَا ﴿٤﴾ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ﴿٥﴾ وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا ﴿٦﴾ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَىٰهَآ ﴿١١﴾ إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشْقَىٰهَا ﴿١٢﴾ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ نَاقَةَ ٱللَّهِ وَسُقْيَٰهَا ﴿١٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنۢبِهِمْ فَسَوَّىٰهَا ﴿١٤﴾ وَلَا يَخَافُ عُقْبَٰهَا ﴿١٥﴾

## سُورَةُ اللَّيْلِ

ترتيبها ٩٢ — آياتها ٢١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ﴿١﴾ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ﴿٢﴾ وَمَا خَلَقَ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ﴿٤﴾ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴿١١﴾ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ وَإِنَّ لَنَا لَلْءَاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ ﴿١٣﴾ فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾



## سوورەتی (الشمس)

**مەککەیی یەو، (١٥) ئایەتە**

(١) سوێند بە خۆرو بە ڕووناکییەکەی!
(٢) سوێند بە مانگیش کە بە شوێنیا دێ!
(٣) سوێند بە ڕۆژیش کە خۆر جوان دەرئەخا واتە خۆری تیا دەرئەکەوێ!
(٤) سوێند بە شەویش کە ڕۆژ دائەپۆشێو ناهێڵێ ڕووناکییەکەی بگات!
(٥) سوێند بە ئاسمان و بەو خوایەی دروستی کردووە! (٦) سوێند بە زەویو بەو خوایەی ڕایخستووەو تەختی کردووە!
(٧) سوێند بە نەفسی ئادەمزاد و بەو خوایەی وای دروست کردووە کە ئامادەی کردووە بۆ هەموو سیفەت و کردارەکانی.
(٨) جا نیشانی داوە لەفەرمانی خوا دەرچوونی کامەیەو لەخواترسانی کامەیە.
(٩) سوێند بە هەموو ئەوانە، ئەو کەسەی نەفسی خۆی پاك کاتەوە لە سیفاتی خراپ و ناشیرین ڕزگاری ئەبێو!
(١٠) ئەوەی پەردەی نەفامیو نەزانیو بێشەرمیی بدا بەسەرا نائومێدو بێبەش ئەبێ. (١١) خێڵی سەموود بەهۆی توغیان و غەرڕاییی خۆیانەوە ئینکاری پێغەمبەرایەتیی صالحیان کردو بە درۆزنیان دانا. (١٢) کاتێ کە خراپترین پیاوی خێڵەکە ڕاست بووەوە وشترەکەی صالح پێغەمبەر سەربڕێ، (١٣) صالحی پێغەمبەری خوایش پێیوتن: لەو وشتری خوایە گەڕێن و سەری مەبڕن و وازی لێ بێنن بەشە ئاوی خۆی بخواتەوە، ئەگینا خوا غەزەبتان لێ ئەگرێ. (١٤) ئەوانیش صالحیان بەدرۆخستەوەو وشترکەیان پەیکردو چوارپەلیان بڕییەوەو وشترەکە مرد. خوایش بەهۆی گوناهی خۆیانەوە غەزەبی لێ گرتن و سزای دان و هەڕەشەکەی صالحی لێ هێنانەدی و،
(١٥) لە ئەنجامی ئەو غەزەبلێگرتن و سزادانەیشیان ناترسێ.

## سوورەتی (اللیل)

**مەککەیی یەو، (٢١) ئایەتە**

(١) سوێند بە شەو کاتێ کە دنیا دائەگرێ. (٢) سوێند بە ڕۆژ کە باش دەرئەکەوێ.
(٣) سوێند بەو خوایەی نێرو مێیی دروست کردووە. (٤) سوێند بە هەموو ئەمانە گومانی تیا نییە هەوڵ و تەقەلای ئێوە جۆرەهای جیاجیای هەیە. (٥) جا هەر کەسێ ماڵی خۆی بدا لە ڕێی خواداو لە خوا بترسێو،
(٦) باوەڕیشی بە وشەی جوان بێ کە ڕستەی (لا إله إلا الله)یە، (٧) ئەوە ئێمە ئامادەی ئەکەین بۆ ئیسراحەت و ژیانی ئاسان کە ژیانی ناو بەهەشتە. (٨) هەر کەسێکیش ڕژدی بکا لە خەرجکردنا لە ڕێی خواداو خۆی بە ژیانی دنیا بێئیحتیاج بزانێ لە نیعمەتی ئەو دنیاو، (٩) باوەڕی بە وشەی جوانی (لا إله إلا الله) نەبێو بە درۆی بزانێ،
(١٠) ئەوە ئێمە ئامادەی ئەکەین بۆ ژیانی هەرە نارەحەت کە ژیانی دۆزەخە.
(١١) کە تێیشگلاو کەوتە چاڵی گۆڕەوە ماڵ و داراییەکەی سوودی ناگەیەنێتێ.
(١٢) بێگومان لەسەر ئێمەیە خەڵك شارەزا بکەین بۆ ڕێگای هیدایەت و خواناسی.
(١٣) بەڕاستی دنیاو قیامەتیش هەر هیی ئێمەیە. (١٤) جا بۆیە وا من ئەتانترسێنم لە ئاگرێ بڵێسەی لێ ئەبێتەوە

لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ﴿١٥﴾ ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٦﴾ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾

## سُورَةُ الضُّحَىٰ

آياتها ١١ — ترتيبها ٩٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾ وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ﴿٦﴾ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴿٨﴾ فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ﴿٩﴾ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ ﴿١٠﴾ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾

## سُورَةُ الشَّرْحِ

آياتها ٨ — ترتيبها ٩٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ﴿٨﴾

حزب ٦٠



(١٥) ناچێته ناوی‌و ناچه‌ژێ مه‌گه‌ر ئه‌وله‌هه‌موان‌خراپتره‌ی (١٦) خواو پێغه‌مبه‌رانی خواو ڕۆژی قیامه‌تی به‌ درۆ داناوه‌و پشتی لێ هه‌لکردوون. (١٧) له‌خواترسترین که‌سیشی لێ دوور ئه‌خرێته‌وه که ئه‌وکه‌سه‌یه هاوبه‌شی بۆ خوا دانه‌نابێ‌و خۆی له گوناه دوور گرتبێ‌و، (١٨) مالی خۆی بدا به موسته‌حه‌ققان و به‌وه خۆی خاوێن بکاته‌وه. (١٩) که‌سێکیش نه‌بێ نیعمه‌تێکی به‌سه‌ر ئه‌م له‌خواترسه‌وه بێ که ئه‌و به‌م خێروحه‌سه‌ناتکردنه‌ی پاداشی بداته‌وه. (٢٠) به‌لاّم مه‌به‌ستی ئه‌م له خێرو حه‌سه‌ناته‌که‌ی ته‌نها ڕه‌زامه‌ندیی خوای بلندو بالای خۆی بێ.

(٢١) ئه‌م مرۆ له‌خواترسه خێروحه‌سه‌ناتکه‌ره له‌مه‌وپاش، واته له ڕۆژی قیامه‌تا، ڕازی ئه‌بێ به‌و پاداشه‌ی خوا ئه‌یداته‌وه.

### سوورەتی (الضحى)

**مه‌ککه‌یی‌یه‌و، (١١) ئایه‌ته**

(١) سوێند به‌کاتی چێشته‌نگاو!

(٢) سوێند به شه‌و کاتێ که خه‌لك ئارام ئه‌گرن! (٣) خوای تۆ نه ده‌سبه‌ردار بووه لێت و پێوه‌ندی پێوه بڕیوی و، نه زویر بووه لێت و قینی لێت هه‌ستاوه. (٤) بێ‌گومان دواڕۆژیش باشتره بۆت له‌م دنیایه. (٥) له‌مه‌ولایش خوای خۆت پایه‌و پله‌ت ئه‌داتێ‌و تۆیش پێی ڕازی ئه‌بی. (٦) ئه‌و تۆی به هه‌تیوی نه‌دی‌و جێی‌کردیته‌وه‌و؟ (٧) تۆی بێ‌ئاگا نه‌دی له ئایین و ئه‌حکامی خوایی‌و هیدایه‌تی دای‌و ڕێگای به‌دوای خوادا گه‌ڕانی پیشان دای‌و کردیتی به پێغه‌مبه‌رو؟ (٨) تۆی به هه‌ژارو خاوه‌ن خێزان نه‌دی‌و ده‌ولّه‌مه‌ندی کردی؟ (٩) مادام وایه، له به‌رانبه‌ری ئه‌م گشته نیعمه‌ته‌ی خوادا، که هه‌تیوێکت به‌رده‌ست که‌وت ئه‌و مالّ و داراییه‌ی داگیر مه‌که بۆ خۆت که به میرات بۆی ماوه‌ته‌وه. (١٠) که سوالکه‌رێکیش هات داوای شتێکی لێ کردی لێی تووڕه مه‌به‌و ده‌ست مه‌نێ به ڕوویه‌وه. (١١) باسی ئه‌و نیعمه‌تانه‌ی خوایش بۆ خه‌لك بگێڕه‌وه که داونی پێت، که باشترین جۆری ئه‌و باسی نیعمه‌تی خوا گێڕانه‌وه‌یش به کرده‌وه ئه‌وه‌یه به‌شی هه‌ژاران و ده‌ست کورتانی لێ بده‌ی.

### سوورەتی (الشرح)

**مه‌ککه‌یی‌یه‌و، (٨) ئایه‌ته**

(١) ئایا سنگتمان بۆ گوشاد نه‌کردی تا وای لێ هات بۆ موناجاتی خواو بانگکردنی خه‌لك بۆ ئیسلامه‌تی بشێ؟

(٢) ئه‌و باره گرانه‌یشمان له‌سه‌ر شانت داگرت، (٣) که قورس بوو به‌سه‌ر پشتته‌وه، که باری گرانی نه‌توانینی گه‌یاندنی نامه‌ی پێغه‌مبه‌رایه‌تییه به خه‌لك و، توانیت به باشی بیبانگه‌یه‌نیتێ و هه‌رچیت له‌و ڕێگادا دێته‌ڕێ ته‌حه‌مولی بکه‌ی‌و، (٤) ناووبانگتمان بۆ هه‌میشه له دنیادا به‌رز کرده‌وه. (٥) ئه‌مه بۆیه بوو چونکه به‌ڕاستی له‌گه‌لّ هه‌ر ناڕه‌حه‌تییه‌کا ڕه‌حه‌تییه‌ك هه‌یه. (٦) له‌گه‌لّ هه‌ر ناڕه‌حه‌تییه‌کا ڕه‌حه‌تییه‌ك هه‌یه.

(٧) جا که له ئه‌رکی گه‌یاندنی نامه‌ی پێغه‌مبه‌رایه‌تی ئه‌بیته‌وه خۆت به خوا په‌رستییه‌وه ماندوو بکه‌و،

(٨) هه‌ر له خوای خۆت بپاڕێره‌وه، هه‌ر ئه‌وه ئه‌توانێ چاری گیروگرفته‌کانت بکاو داواکانت بۆ بێنێته‌دی.

## سُورَةُ التِّينِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ ﴿١﴾ وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ﴿٣﴾ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِٱلدِّينِ ﴿٧﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾

## سُورَةُ العَلَقِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجْعَىٰٓ ﴿٨﴾ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ﴿٩﴾ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ﴿١٠﴾ أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوْ أَمَرَ بِٱلتَّقْوَىٰٓ ﴿١٢﴾ أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾



## سووره‌تی (التِّين)

خیلافی تیایه مه‌ككه‌یی‌یه یا مه‌دینه‌یی‌یه‌و، (٨) ئایه‌ته

(١) سوێند به هه‌نجیرو به زه‌یتوون!
(٢) سوێندیش به كێوی (توور)ی سینا!
(٣) سوێندیش به‌م شاری ئه‌مین و كه‌س تیا نه‌ترساوه كه مه‌ككه‌یه!
(٤) سوێند به هه‌موو ئه‌مانه! ئێمه ئاده‌مزادمان له جوانترین شێوه‌ی ڕێكوپێكیدا دروست كردووه.
(٥) پاشانیش كه پیر ئه‌بێ ئه‌یگێڕینه‌وه بۆ پایه‌یێ له خوار هه‌موو پایه‌یه‌كه‌وه كه ئه‌وه‌ته پشتی كۆم ئه‌بێ‌و ئه‌گه‌ر نه‌مرێ له جێی خۆیا ئه‌كه‌وێ‌و ناتوانێ بجوولێ.
(٦) به‌ڵام ئه‌وانه‌ی ئیمانیان هێناوه‌و كرده‌وه‌ی چاكیان له دنیادا بووه، ئه‌وانه با وایش پیر ببن و بگه‌نه ئه‌و كلۆڵی و داماوییه، له قیامه‌تا پاداشێكی نه‌بڕاوه‌یان بۆ هه‌یه.
(٧) كه‌واته پاش ئه‌مه هه‌مووی، چی وات لێ‌ئه‌كا باوه‌ڕ به ڕۆژی جه‌زادانه‌وه نه‌كه‌ی؟
(٨) ئایا خوایه‌ك كه ئه‌مه كرده‌وه‌ی بێ كاری له هه‌موو حوكمڕانێ ڕێكوپێكترو به‌ڕێوجێتر نییه؟ (به‌ڵێ وه‌للا).

## سووره‌تی (العَلَق)

مه‌ككه‌یی‌یه‌و ، (١٩) ئایه‌ته

(١) قورئان بخوێنه له‌گه‌ڵ هێنانی ناوی ئه‌و خوایه‌ی خۆتا كه دروستكردنی هه‌ر دروستكراوێ كاری ئه‌وه.
(٢) ئه‌و خوایه‌ی ئاده‌مزادی له پارچه‌یێ خوێن دروست كردووه. (٣) بخوێنه‌و خوای تۆ له هه‌موو به‌خشنده‌یێ به‌خشنده‌تره یا به‌خشنده‌ی تاقانه‌یه. (٤) ئه‌و خوایه‌یه كه ئاده‌مزادی به‌هۆی قه‌ڵه‌مه‌وه فێره خوێندن كردووه.
(٥) ئاده‌مزادی فێری ئه‌و شتانه كردووه كه پێشان نه‌یزانیون. (٦) ئه‌وه‌ی ئینكاری نیعمه‌تی خوا ئه‌كا به‌سه‌ر ئاده‌مزاده‌وه با ده‌سبه‌ردار ببێ له‌و كاره‌ی، به‌ڕاستی ئاده‌مزاد عاده‌تی وایه توغیان ئه‌كاو غه‌ڕڕا ئه‌بێ له خۆی،
(٧) هه‌ر ئه‌وه‌نده خۆی ببینێ بێ‌نیازه له خه‌ڵك و پێویستی پێیان نییه. (٨) بێ‌گومان سه‌ره‌نجام گه‌ڕانه‌وه بۆ لای خوای خۆته ئه‌ی ئاده‌مزاد، واته: ئه‌گه‌ڕێیته‌وه بۆ لای ئه‌و. (٩) ئایا تۆ كه‌سێكی وات دیوه مه‌نعی (١٠) به‌نده‌یه‌كی خوا بكا له نوێژكردن كاتێ نوێژ بكا؟ (١١) پێم بڵێ: ئه‌گه‌ر ئه‌و مه‌نع كه‌ره كه مه‌نعی به‌نده‌كه ئه‌كا له نوێژ كردن، خۆی له‌سه‌ر ڕێی هیدایه‌ت بووایه، (١٢) یا فه‌رمانی به‌خۆله‌گوناهپاراستن بدایه، (١٣) پێم بڵێ: ئه‌گه‌ر بهاتایه‌و به‌نده نوێژكه‌ره‌كه باوه‌ڕی به ڕێی هیدایه‌ته‌كه‌ی ئه‌و نه‌بوایه‌و پشتی تێ‌هه‌ڵكردایه، (١٤) ئه‌م نه‌یئه‌زانی خوا چاوی لێیه چی ڕووئه‌داو ئه‌وی تر چی ئه‌كا؟ واته: ئه‌ی ئێستا كه ئه‌م خۆیه‌تی ئه‌م كاره خراپه ئه‌كا، بۆ نازانێ خوا چاوی لێیه كه ناهێڵێ به‌نده نوێژكه‌ره‌كه نوێژه‌كه‌ی بكا؟ (١٥) ده‌ی سا با واز له‌م كاره به‌ده‌ی بهێنێ. ئه‌گه‌ر ده‌سبه‌رداری ئه‌مڕێگرتن له‌نوێژكرنی پێغه‌مبه‌ره نه‌بێ، به مووی پێشه‌سه‌ری ڕاینه‌كێشین و تووڕی ئه‌ده‌ینه ناو ئاگری دۆزه‌خ.
(١٦) ئه‌و پێشه‌سه‌ره درۆزنه تاوانباره‌ی، واته ئه‌و پێشه‌سه‌ره‌ی كه پێشه‌سه‌ری كابرایه‌كی درۆزنی تاوانباره.
(١٧) جا با ئه‌وكاته دانیشتووانی كۆڕه‌كه‌ی خۆی بانگ كا یارمه‌تیی بده‌ن. (١٨) ئێمه‌یش كلیله‌وانه‌كانی دۆزه‌خ بانگ ئه‌كه‌ین به قژی پێشه‌سه‌ری به‌كێشی‌كه‌ن. (١٩) لێگه‌ڕێ له‌م ڕه‌وشتی به‌ده‌ت ئه‌ی كابرای كافرو، تۆیش، ئه‌ی موحه‌ممه‌د، هه‌رگیز به‌گوێی مه‌كه‌و سوجده به‌ره بۆ خوای خۆت و لێی نزیك به‌ره‌وه.

## سُورَةُ القَدرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ﴿٢﴾ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ﴿٥﴾

## سُورَةُ البَيِّنَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٞ مِّنَ ٱللَّهِ يَتۡلُواْ صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٞ قَيِّمَةٞ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ﴿٧﴾



### سووره‌تی (القدر)

**خیلافی تیایه مه‌ککه‌یی‌یه یا مه‌دینه‌یی‌یه‌و، (٥) ئایه‌ته**

(١) به‌ڕاستی ئێمه قورئانمان له‌و شه‌وه‌دا ناردووه‌ته خواره‌وه بۆ پێغه‌مبه‌ر که ناوی (لیله القدر)ه. مه‌به‌ست له‌م ناردنه‌خواره‌وه ده‌ستپێکردنی ناردنه خواره‌وه‌یه‌تی، ئه‌گینا ناردنه خواره‌وه‌ی هه‌مووی ٢٣ ساڵی خایاندووه.

(٢) تۆ چوزانی (لیلة القدر) چییه‌و چ پایه‌یه‌کی هه‌یه؟

(٣) (لیلة القدر) له هه‌زار مانگ چاتره یاخود خواپه‌رستی له‌م شه‌وه‌دا خێری له خواپه‌رستنی هه‌زار مانگ زیاتره.

(٤) فریشته‌کانی خێرو ڕه‌حمه‌ت و جیبره‌ئیلی ئه‌مین له‌م شه‌وه‌دا دێنه خواره‌وه بۆ ڕێکخستنی هه‌ر کاروبارێ له‌و ساڵه‌دا ئه‌بێ بکرێ.

(٥) ئه‌و شه‌وه شه‌وی سه‌لامه‌تییه‌و خوا له‌و شه‌وه‌دا تا به‌ره‌به‌یان ته‌نها ئه‌و بڕیارانه ئه‌دا که مایه‌ی سه‌لامه‌تین و له شه‌وه‌کانی تر‌ا سه‌لامه‌تییش و ده‌ردو به‌ڵایش بڕیار ئه‌درێن.

### سووره‌تی (البینة)

**خیلافی تیایه مه‌ککه‌یی‌یه یا مه‌دینه‌یی‌یه‌و، (٨) ئایه‌ته**

(١) کافره‌کان له ئه‌هلی کیتاب و له هاوبه‌ش بۆ خوا دانه‌ره‌کان له‌وانه نه‌بوون واز له ئایینی خۆیان بێنن و لێی جیاببنه‌وه‌و ده‌سبه‌ردار بن لێی، تا شاهیدێکی به حه‌ق و ده‌لیلێکی ڕاستیان دێته‌سه‌ر.

(٢) ئه‌و شاهیدی به‌حه‌ق و ده‌لیلی ڕاسته‌یش پێغه‌مبه‌رێکه خوا ناردبێتی چه‌ند لاپه‌ڕه‌یه‌کی خاوێن له هه‌موو که‌موکورتی‌و ناته‌واوییه‌ك بخوێنێته‌وه.

(٣) له‌و لاپه‌ڕانه‌دا چه‌ند نووسراوێکی ڕاست و حه‌قگۆ هه‌بن.

(٤) جیایی نه‌که‌وته نێوان ئه‌وانه‌ی کتێبیان له خواوه پێدرابوو، که جووله‌که‌و گاورن، پاش ئه‌وه نه‌بێ که به‌ڵگه‌ی ڕاستیان بۆ هات که قورئانه. واته ئه‌و کافرانه پێش هاتنی پێغه‌مبه‌ر (د.خ) ئه‌یانوت: ئێمه هه‌ر له‌سه‌ر ئایینی خۆمان ئه‌مێنینه‌وه‌و یه‌کپارچه بوون، تا پێغه‌مبه‌ری وه‌عده‌پێدراومان بۆ دێ که پێغه‌مبه‌رێکی وا بێ قورئانمان به‌سه‌را بخوێنێته‌وه. که‌چی که ئه‌و پێغه‌مبه‌ره هات، له‌جیاتیی ئه‌وه‌ی باوه‌ڕی پێ‌بکه‌ن و ئیمانی پێ‌بهێنن ناکۆکییان که‌وته نێوان و که‌مێکیان ئیمانیان هێناو به‌شی زۆریان له‌سه‌ر ئایینی پێشووی خۆیان مانه‌وه‌و هه‌ندێکیشیان دوودڵ بوون.

(٥) که‌چی فه‌رمانیان نه‌درابوویه به‌وه نه‌بێ که خواپه‌رستی بکه‌ن و ئایینی خۆیان به خاوێنی و سافی و بێگه‌ردی جێبه‌جێ بکه‌ن و له ئایینی به‌تاڵ لابده‌ن بۆ ئایینی ڕاست و نوێژه‌کانیان بکه‌ن و زه‌کات بده‌ن و ئایینی میلله‌تی ڕاستیش ئه‌مه‌یه.

(٦) بێ‌گومان ئه‌وانه‌ی کافر بوون له جووله‌که‌و گاورو هاوبه‌ش‌بۆخوادانه‌ره‌کان له ئاگری دۆزه‌خدان و هه‌میشه تیا ئه‌مێننه‌وه‌و ئه‌وانه خراپترین مه‌خلووقاتی خوان.

(٧) بێ‌گومان ئه‌وانه‌یش که ئیمانیان هێناوه‌و کرده‌وه‌ی باشیان کردووه، ئه‌وانه چاکترین مه‌خلوقاتی خوان.

جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾

## سُورَةُ الزَّلزَلَةِ

ترتيبها ٩٩ — آياتها ٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾

## سُورَةُ العَادِيَاتِ

ترتيبها ١٠٠ — آياتها ١١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ۞ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي ٱلْقُبُورِ ﴿٩﴾



(٨) پاداشـی ئەوانـە لای خـوای خۆیـان بەهەشـتگەلێکە جۆگـەو ڕووبـاری ئـاوی ڕەوان بـەژێریانا ئـەڕواو هـەتا هەتایـە تیایانا ئەمێننـەوە. خـوا لـەوان ڕازییـەو ئـەوانیش لـە خـوا ڕازیـن و، ئـەم پلـەو پایـەیش بـۆ کەسـێکە لـە خـوای خۆی بترسێ.

## سوورەتی (الزلزلة)

**خیلافی تیایە مەککەیی‌یە یا مەدینەیی‌یەو،(٨) ئایەتە**

(١) کـە زەوی بوومەلـەرزەی پێ‌کـەوت ئەو بوومەلەرزەیەی خوا بۆی بڕیارداوەو،
(٢) زەوی هەرچی شـارراوەی نـاو خۆی هەیـە هـەمووی هەڵڕشـتە دەرەوە، یـا هەرچی مـردووی تیـا نێـژراوە هـەمووی خستە دەرەوەو،
(٣) ئادەمزادیش لـە سەرسـامییا وتـی: ئەوە زەوی چییەتی وای بەسەرهاتووە؟
(٤) لەو ڕۆژەدا زەوی دەنگوباسـی خۆی وا ئەگێڕێتەوە کە:
(٥) بێ‌گومـان خـوای تـۆ وەحیـی بـۆ کردووەو فەرمانی داوەتێ وا بکا.
(٦) لـەو ڕۆژەدا ئـادەمزاد پـۆل پـۆل لـە گۆڕەکانیان دێنەدەر تا جەزای کاروکرداری دنیای خۆیان ببینن.
(٧) جا هەرکەسێ بە قورسایی گەردیلەیێ چاکەی کردبێ پاداشەکەی ئەبینێ‌و،
(٨) هەرکەسیش بە قورسایی گەردیلەیێ خراپەی کردبێ سزاکەی ئەبینێ.

## سوورەتی (العادیات)

**خیلافی تیایە مەککەیی‌یە یا مەدینەیی‌یەو، (١١) ئایەتە**

(١) سوێند بەو ئەسپانەی لە مەیدانی شەڕا ئەدەنە غارو ئەپرمێنن!
(٢) ئەنجا سوێند بەو ئەسپانەی لە غارکردنیانا سمیان ئەدا لە بەردو ئاگری لێ‌ئەبێتەوە.
(٣) ئەنجا سوێند بەو ئەسپانەی لە بەرەبەیانا هەڵئەکوتنە سەر دوژمن!
(٤) جا بەو هەڵکوتاندنە سەر دوژمنەیان تۆزو گەرد بەرزئەکەنەوە.
(٥) جا ئەکەونە ناو کۆمەڵی دوژمنەوە.
(٦) سوێند بێ بەمانە! ئادەمزاد بەڕاستی ئینکاری نیعمەتی خوای خۆی ئەکاو،
(٧) خۆیشی بۆ خۆی شایەتی ئەم ئینکاری نیعمەتی خوا کردنەیەو،
(٨) زۆریشی حەز لەماڵی دنیایە.
(٩) دەی ئاخۆ نازانێ کاتێ چی مردوو لەناو گۆڕان زیندوو کرانەوەو،

وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ ﴿١٠﴾ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ ﴿١١﴾

## سورة القارعة

ترتيبها ١٠١ — آياتها ١١

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا الْقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ ﴿٣﴾ يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾ وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ ﴿٥﴾ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌ ﴿١١﴾

## سورة التكاثر

ترتيبها ١٠٢ — آياتها ٨

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ ﴿٥﴾ لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ ﴿٧﴾ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ﴿٨﴾



(١٠) چی چاکەو خراپە لە دڵی ئەم و ئەوا شاررراوەتەوە هـەمووی کۆکرایـەوە بـۆ لێپرسینەوەی خاوەنەکانیان،

(١١) بێگومان خـوای خۆیـان لـەو ڕۆژەدا ئاگادارە لێیان و جەزای هەر یەکێکیان بە گوێرەی کردەوەی دنیای ئەداتەوە.

## سوورەتی (القارعة)

**مەککەیی‌یە و، (١١) ئایەتە**

(١) ئەو ڕووداوەی کە جیهان ئەکوتێتەوە.

(٢) ئـەو ڕووداوە چـیە کـە جیهـان ئەکوتێتەو؟

(٣) تـۆ چـوزانی ئـەو ڕووداوە چـییە کـە جیهان ئەکوتێتەوە؟

(٤) ئەو ڕۆژە کە ئەو ڕووداوە جیهانی تیا ئەکوتێتـەوە ڕۆژێکـە خـەڵك لـە زۆری‌و پەرێشـانی‌و بڵاوبوونـەوەدا وەك پەپوولـەی بڵاو وان.

(٥) کێوەکانیش وەك خوریی شیکراوە وان.

(٦) جـا هەرکـەس لـەو ڕۆژەدا تـرازووی قورس بێ واتە چاکەی زۆر بێ،

(٧) ئەوە لە ژیانێکایە، واتە ژیانێ ئەژی، مرۆ لێی ڕازی بێ.

(٨) ئـەو کەسـەیش تـرازووی سـووك بـێ، واتە چاکەی کەم و نابوود بێ،

(٩) ئەوە (هاوییە) دایکیەتی، واتە کۆشی هاوییە جێیەتی.

(١٠) تۆ چوزانی هاویە چییە؟ (١١) ئاگرێکی گەرمە.

## سوورەتی (التكاثر)

**خیلافی تیایە مەککەیی‌یە یان مەدینەیی‌یەو،**
**(٨) ئایەتە**

(١) خۆ زۆرکردن و شانازی کردن بە زۆریی ژمارەی عەشرەت و خزم و کەسوکارەوە بەجۆرێ خەریکی کردوون،

(٢) تەنانەت چوویشن بۆ سەرقەبران بۆ ژماردنی گۆڕی مردووانتان. یان خەریکبوون بـە زۆرکردنـی مـاڵ و داراییـەوە وای خەریك کردن و خوای لەبیربردنەوە دەستان لێ هەڵنەگرت تا مردن و چوونە ناو گۆڕ.

(٣) لەم خووە بەدە گەڕێن. بەڕاستی لەمەولا ئەزانن چەند هەڵەن ئەگەر دوارۆژی خۆتان بزانن.

(٤) ئەمجاریش بەڕاستی لەمەولا ئەزانن چەند هەڵەن ئەگەر دوارۆژی خۆتان بزانن.

(٥) لەم خووە بەدە گەڕێن. ئەگەر بە زانینی یەقینی بزانن چی دێتە ڕێتان،

(٦) دۆزەخ بە ڕاستی ئەبینن.

(٧) پاشانیش بەڕاستی بە چاوی خۆتان ئەیبینن.

(٨) پاشانیش بەڕاستی پرسیارتان لێ ئەکرێ لە بارەی ئەو نـازو نیعمەتـەوە لـە دنیـادا پێتـان درابـوو و یـادی خـوای لەبیربردنەوەو سوپاستان نەکردو فەرمان بەرداریتان نەکرد.

## سُورَةُ العَصۡرِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡعَصۡرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴿٣﴾

## سُورَةُ الهُمَزَةِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ﴿٢﴾ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ ﴿٩﴾

## سُورَةُ الفِيلِ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمۡ يَجۡعَلۡ كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٖ ﴿٢﴾ وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ مِّن سِجِّيلٖ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ ﴿٥﴾



### سوورەتی (العَصر)

**مەککەیی‌یە و، (٣) ئایەتە**

(١) قەسەم بە چەرخی زەمان!

(٢) بەڕاستی هەموو ئادەمزاد ژین بەخەسارو زەرەرمەندن.

(٣) تەنها ئەوانەیان نەبێ ئیمانیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووەو یەکتریان ڕاسپاردووە بیروباوەڕو گوفتارو ڕەفتاریان ڕاست و دروست بێ‌و، یەکتریان ڕاسپاردووە لەبەرانبەری گوناها خۆیان بگرن و نەیکەن، یا کە لە ڕێی خوادا تووشی دەردو بەڵا هاتن خۆیان بگرن.

### سوورەتی (الهُمَزة)

**مەککەیی‌یە و، (٩) ئایەتە**

(١) هاوار بۆ هەموو ئەوانەی عەیب و عار لە خەڵك دەردێنن و هەموو ئەوانەی ناووناتۆرە لە خەڵك ئەنێن.

(٢) بۆ هەموو عەیب و عار لە خەڵك دەرهاوەرو ناووناتۆرە لەخەڵکنەرێ کە پارەی کۆکردووەتەوەو جار لەپاش جار ئەیژمێرێ.

(٣) وا ئەزانێ ئەو پارەیەی هەیەتی هەتا هەتایە ئەیهێڵێتەوەو ناهێڵێ هەرگیز بمرێ.

(٤) با واز لەم کردەوەو بیرو بۆچوونانەی بهێنێ. بەڕاستی ئەو فڕێ ئەدرێتە ناو (حوتەمە)وە کە وشەی (حوتەمە) واتە: ئەو ئاگرەی هەرچیی تێ‌بکەوێ دایئەڕزێنێ.

(٥) تۆ چوزانی (حوتەمە) چییە؟

(٦) ئەو ئاگرە هەڵگیرساوەی خوایە..

(٧) کە تەنانەت ناوەڕاستی دڵانیش ئەگرێتەوە، واتە ئازارەکەی ئەگاتە ناو کورۆکی دڵ.

(٨) بێ‌گومان ئەو ئاگرە بەسەر ئەوعەیب لەخەڵكدەرهاوەرو ناووناتۆرە لەخەلکنەرانەدا قەپات کراوە لە ژووری تایبەتیی دۆزەخدا.

(٩) کە حاڵی ئەو کەسانە وایە بەسراون بە ستوونی ڕاکێشراوەوە.

### سوورەتی (الفِیل)

**مەککەیی‌یە و، (٥) ئایەتە**

(١) ئایا تۆ نەتدی خوای تۆ چیی کرد بە خاوەن فیلەکان کە فیلیان هێنابوو ماڵی کەعبە لە مەککە برووخێنن؟

(٢) ئایا هەموو فروفێڵەکانیانی پووچەڵ نەکردەوەو سەری لێ نەشێواندن؟

(٣) باڵدارێکی پۆل پۆلیشی ناردە سەریان (کە بە تەیرە ئەبابیلە ناوی دەرکردووە).

(٤) ئەو باڵدارە بەردەبارانی ئەکردن بە وردەبەردێکی لە گڵمتکی ڕەق،

(٥) وەك گەڵای دارێکی لێ کردن کرم خواردبێتی، واتە وردە بەردەکە بەر هەر کوێیەکیان ئەکەوت دایئەڕزاند.

## سُورَةُ قُرَيْشٍ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴿٤﴾

## سُورَةُ المَاعُونِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾

## سُورَةُ الكَوْثَرِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾



## سووره‌تی (قُرَيْش)

مه‌ککه‌یی‌یه‌و، (٤) ئایه‌ته

(١) بۆیه خاوه‌ن فیله‌کانمان به‌و ده‌رده برد تا خێڵی قوره‌یش که له مه‌ککه نیشته‌جێ بوون، ئولفه‌تیان بمێنێ.

(٢) ئولفه‌تیان بمێنێ به گه‌شتی بازرگانیی زستانه‌و هاوینه‌یانه‌وه، زستانان بۆ یه‌مه‌ن و هاوینان بۆ شام و، ژیانیان لێ تێك نه‌چێ‌و له‌سه‌ر دابونه‌ریتی زوویان به‌رده‌وام بن.

(٣) که‌واته با به‌نده‌گیی خوای ئه‌م خانه‌ی مه‌ککه‌یه بکه‌ن و بیپه‌رستن،

(٤) ئه‌و خوایه‌ی که به هۆی ئه‌م گه‌شتی زستانه‌و هاوینه‌یانه‌وه بۆ بازرگانی له یه‌مه‌ن و شام، خۆراکی داونێ بۆ رزگارکردنیان له برسێتی و ئه‌مینی کردوون له ترسی پادشایانی یه‌مه‌ن و رۆمییه‌کانی حوکمرانی شام، یا له ترسی خێڵه عه‌ره‌به ده‌شته‌کییه‌کانی ده‌وروبه‌ری مه‌ککه.

## سووره‌تی (المَاعُون)

خیلافی تیایه مه‌ککه‌یی‌یه یان مه‌دینه‌یی‌یه‌و، (٧) ئایه‌ته

(١) تۆ ئه‌و کابرایه‌ت دیوه که باوه‌ری به رۆژی جه‌زا نییه که رۆژی قیامه‌ته؟

(٢) ئه‌وه ئه‌و که‌سه‌یه پاڵ به هه‌تیوه‌وه ئه‌نێ‌و، له خۆیی دوور ئه‌خاته‌وه که دێ داوای لێ ئه‌کا خێرێکی پێ بکاو،

(٣) هانی خه‌ڵك نادا خۆراك بده‌ن به هه‌ژار.

(٤) ده‌ی هاوار بۆ ئه‌و نوێژکه‌رانه‌ی (٥) له نوێژه‌کانی خۆیان بێ‌ئاگان و زۆر جار نایانکه‌ن و گوێیان ناده‌نێ.

(٦) ئه‌وانه‌ی که ریا ئه‌که‌ن و نوێژه‌کانیان هه‌ر بۆ به‌رچاوی خه‌ڵك ئه‌که‌ن و به‌پێی ئه‌وه ناجووڵێنه‌وه که نوێژکردنی به باوه‌ری ته‌واوه‌وه پێویستی ئه‌کا له‌سه‌ر نوێژکه‌ر که ئه‌وه‌ته له هه‌موو هه‌ڵسوکه‌وتێکیا خوای له‌یادبێ‌و ئه‌وی مه‌به‌ست بێ‌و خراپه نه‌کا.

(٧) که که‌سێکیش پێویستی به قاپێ بێ ئه‌یگرنه‌وه لێی و نایده‌نێ و به‌ده‌نگ هیچ موحتاجێکه‌وه ناچن.

## سووره‌تی (الكَوْثَر)

مه‌ککه‌یی‌یه و، (٣) ئایه‌ته

(١) به‌راستی ئێمه خێروبێرێکی زۆرمان داویتێ. یا ئاوی که‌وسه‌رمان داویتێ که ناوی جۆگه‌یه‌که له به‌هه‌شتدا.

(٢) ده‌ی تۆیش نوێژ بکه بۆ خوای خۆت و قوربانیی بۆ بکه.

(٣) به‌راستی ئه‌وه‌ی خۆشی له تۆ نایێ خۆی وه‌جاخ کوێرو ئه‌وه براوه‌یه.

## سُورَةُ الكَافِرُونَ

ترتيبها ١٠٩ — آياتها ٦

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴿١﴾ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾

## سُورَةُ النَّصْرِ

ترتيبها ١١٠ — آياتها ٣

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ ۚ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا ﴿٣﴾

## سُورَةُ المَسَدِ

ترتيبها ١١١ — آياتها ٥

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴿٥﴾



## سووره‌تی (الكافرون)

**مه‌ككه‌یی‌یه و، (٦) ئایه‌ته**

(١) تۆ، ئه‌ی موحه‌ممه‌د، به كافره‌كان بڵێ: ئه‌ی كافرینه! (ڕووی ده‌می ئه‌م ئایه‌تانه له هه‌ندێ كافری تایبه‌تییه كه خوا خۆی زانیویه ئه‌مانه كافر بوون و كافرن و هه‌ر كافریش ئه‌بن).

(٢) من له‌مه‌ولا ئه‌وه ناپه‌رستم كه ئێوه ئه‌یپه‌رستن.

(٣) ئێوه‌یش له‌مه‌ولا ئه‌وه ناپه‌رستن كه من ئه‌یپه‌رستم.

(٤) ئێستایش من ئه‌وه ناپه‌رستم كه ئێوه ئه‌یپه‌رستن و له‌مه‌وپێشیش نه‌مپه‌رستووه.

(٥) ئێوه‌یش هه‌رگیز ئه‌وه‌تان نه‌په‌رستووه كه من ئه‌یپه‌رستم.

(٦) ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆم بۆ خۆم.

## سووره‌تی (النصر)

**مه‌ككه‌یی‌یه و، (٣) ئایه‌ته**

(١) كاتێ كه یارمه‌تیی خوایی هات و مه‌ككه گیراو، (٢) خه‌ڵكی جزیره‌ی عه‌ره‌بت دی پۆل پۆل دێنه ڕیزی ئایینی خواوه،

(٣) سوبحانه‌ڵڵا بكه بۆ خوای خۆت و له گه‌ردی هه‌موو ناته‌واییه‌كی به خاوێن ڕابگره‌و سه‌ناو ستایشی بكه‌و داوای لێخۆشبوونی لێ بكه. به‌ڕاستی ئه‌و تۆبه وه‌رگره له هه‌ركه‌سێ داوای لێخۆشبوونی لێ بكا.

## سووره‌تی (المسد)

**مه‌ككه‌یی‌یه‌و، (٥) ئایه‌ته**

(١) یاخودا وشك بن هه‌ردوو ده‌ستی ئه‌بووله‌هه‌ب و، وشكیش بوون.

(٢) پاره‌و داراییه‌كه‌ی‌و هه‌رچیی په‌یدا كردووه هیچی سوودی نه‌بوو بۆی و دادی نه‌دا.

(٣) له‌مه‌وپاش ئه‌چێته ناو ئاگرێكی به كڵپه‌و بڵێسه‌وه.

(٤) ژنه‌كه‌یشی هه‌ر ئه‌چێته ناو ئه‌و ئاگره‌وه، ژنه‌كه‌ی كه كۆڵه‌داری بۆ ئاگری فیتنه‌و ئاژاوه به كۆڵه‌وه‌یه‌و پێیه‌وه به ماڵانا ئه‌گه‌ڕێ.

(٥) له قیامه‌تیشا گوریسێكی تاڵلوولدراوی له ملایه داری بۆ ئاگری دۆزه‌خ پێ ئه‌گوێزێته‌وه وه‌ك له دنیادا داری بۆ ئاگری فیتنه‌و ئاژاوه هه‌ڵئه‌گرت.

## سُورَةُ الإِخْلَاصِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾

## سُورَةُ الفَلَقِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾

## سُورَةُ النَّاسِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾



## سوورەتی (الإخلاص)

**خیلافی تیایە مەككەیی‌یە یا مەدینەیی‌یەو، (٤) ئایەتە**

(١) تۆ، ئەی موحەممەد، بڵێ: ئەو شتەی من ئێوەی بۆ بانگ ئەكەم ئەوەیە كە خوا تاك و تەنیایە.

(٢) هەر ئەو خوایە لە تەنگانەدا پشت و پەنایە.

(٣) كەسی لێ نەبوەو، لە كەسیش پەیدا نەبوەو،

(٤) كەسیش هاوچەشن و هاوپایەی نییە.

## سوورەتی (الفلق)

**خیلافی تیایە مەككەیی‌یە یا مەدینەیی‌یەو، (٥) ئایەتە**

(١) تۆ، ئەی موحەممەد، بڵێ: من پەنائەگرم بە پەروەردگاری رووناكیی بەرەبەیان.

(٢) لە شەڕو خراپەی هەرچی ئەو پەروەردگارە دروستی كردووەو،

(٣) لە شەڕو خراپەی تاریكەشەو كاتێ كە ئەو تاریكەشەوە ئەچێتە ناو هەموو شتێكەوە، واتە لەو شەڕو خراپانەی لە تاریكەشەوا رووئەدەن.

(٤) لە شەڕو خراپەی ژنانی جادووگەریش كە تاڵە بەن و دەزوو گرێ ئەدەن و فووی پیا ئەكەن و وردەتفی لێ ئەپرژێنن.

(٥) لە شەڕو خراپەی مرۆی حەسوودیش لە كاتی حەسەدبردنەكەیانا.

## سوورەتی (الناس)

**خیلافی تیایە مەككەیی‌یە یا مەدینەیی‌یەو، (٦) ئایەتە**

(١) ئەی موحەممەد تۆ بڵێ: من پەنا ئەگرم بە پەروەردگاری هەموو ئادەمزادو پەرییان.

(٢) ئەو پەروەردگارەی كە پادشای هەموو ئادەمزادو پەرییانە.

(٣) كە خواو پەرستراوی هەموو ئادەمزادو پەرییانە (واتە ئەبێ هەموویان بیپەرستن، هەرچەندە هەندێكیشیان نەیپەرستن).

(٤) پەنا ئەگرم بەو خوایە لە شەڕو خراپەی ئەو شەیتانە وەسوەسەخەرە دڵانە كە هەر كە ناوی خوا هێنرا ئەكشێتە دواوە.

(٥) ئەو شەیتانە كە وەسوەسەو وتوویرە ئەخاتە سنگی خەڵك، (٦) لە پەریو لە ئادەمزاد.

فهرس السور